# تَيْسِيرُ الْكَرِيمِ الرَّحْمَٰنِ

## فِي تَفْسِيرِ كَلَامِ الْمَنَّانِ

به كوردى

نووسینی: العلامة عبد الرحمن بن ناصر السعدي رحمه الله

وەرگێڕانی: عباس محمد امين

بەرگی یەکەم

سوورەتی (الفَاتِحَة) تا سوورەتی (النِّسَاء)

# تَيْسِيرُ الكَرِيْمُ الرَّحْمَن فِي تَفْسِيرِ كَلاَمِ المَنَّانِ
## به كوردى

**بەرگی یەکەم**

**سوورەتی (الفاتحة) تا سوورەتی (النساء)**

ناوی کتێب: تَيْسِيرُ الكَرِيْمُ الرَّحْمَن فِي تَفْسِيرِ كَلاَمِ المَنَّانِ بە کوردی (بەرگی یەکەم)
بابەت: تەفسیری قورئانی پیرۆز
ناوی نووسەر: العلامة عبدالرحمن بن ناصر السعدي (رحمه الله)
وەرگێڕانی: عباس محمد امین
دیزاینی بەرگ: ناوەندی ڕێنوێن
دیزاینی تێکست: دانا حەسەن
نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠١٩
چاپ: ناوەندی ڕێنوێن
تیراژ: (١٠٠٠) دانە
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (٤٩)ــی ساڵی (٢٠١٩)ــی پێ دراوە.



ناوەندی ڕێنوێن
07701932749 - 07501269689
hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com
سلێمانی - بازاڕی ئاوباریک - نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)

# پێشەکی سەرپەرشتیاری پرۆژە

## بە ناوی خوای بەبەزەیی‌و میهرەبان

سوپاس‌و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە مرۆڤی فێری نووسین کردوە بە قەڵەم، مرۆڤی شارەزا کردوە بەو شتانەی کە نەیدەزانی، صەڵات‌و سەلام لەسەر گەورەی نەوەی ئادەمی، وە لەسەر یارو یاوەرانی سەلامێکی زۆری بێ ئەندازە.

پاشان:

بە ڕاستی جیاوازی زمان لە نێوان ئادەمیزاد یەکێکە لە بەڵگەو نیشانەکانی خوا کە بە هۆیەوە منەتی کردوە بەسەرمانەوە، وەک فەرموویەتی: ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَٰنِكُمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّلْعَٰلِمِينَ ﴿٢٢﴾ ﴾الروم.

خوا پێغەمبەرەکەی ناردووە وەک ڕەحمەت‌و میهرەبانیەک بۆ جیهانیان بە گشتی، وە کتێبەکەی دابەزاندووەو کردویەتی بە هیدایەت بۆ هەموو ئادەمیزاد لە هەموو کات‌و ساتێکدا.

لەم پێناوەدا حەقی خۆیەتی لەسەر ئەهلی دین‌و ئیمان وتەی پەروەردگاریان بگەیەنن بە هەموو شوێنێکی ئاوەدان، ئەمەش ئەوە دەخوازێت فەرمایشت‌و ڕاڤەی فەرمایشتەکانی بگەیەنرێت بە هەموو زمانەکان‌و زاراوەکان.

کاتێ کە خەڵکی ئەمڕۆ و لەم سەردەمەدا کە سەردەمی عەولەمەو جیهانگیریە، حەزو ئارەزوویان بۆ خوێندنەوەو یادخستنەوە کەم بووەتەوە، بۆیە پێویستە لەسەر خەڵکانی جێگای متمانەو باوەڕ تەفسیرێک هەڵبژێرن بۆ وتەی خوای میهرەبان، دەربڕینی‌و عیبارەتی کورت بێت بە بێ کەمتەرخەمی‌و ناتەواوی، بە زمانی سەردەم نووسرابێت، ماناو مەبەستەکانی پەروەردگاری جیهانیان لەخۆ بگرێت بە کورتی.

بەچـاک زانـرا تەفسـیری زانـای گـەورە هەڵبژێردرێـت کە نـاو نراوە بـە (تیسـیر الکریم الرحمـن في تفسـیر کلام المنـان) لەبـەر ناوبانگـی نووسـەرەکەی بە زانسـتو خۆپارێزی لەناو ئەهلـی عیلمـدا، وە بۆ ئـەوەی ئـەم کتێبە ببێتـە هیدایەتو چرایـەک بۆ ئوممەتـی کوردی، پلـەو پایـەی بەرز تـر بکاتەوە بـەم ئاینە مەزنـە. داوا لە خوای پـاکو بێگـەرد دەکەین کە زانسـتەکەمان تەنهـاو تەنهـا لـە پێنـاو ئەودا بێـت، ڕێگە نـەدات شـتێکی تێدا بێـت بۆ هیچ کەسـێک، سـوپاسو سـتایش بۆ پەروەردگـاری جیهانیان.

# پێشەکی وەرگێڕ

## بە ناوی خوای هەمیشە بەرزی بێ هاوتا

سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ خوای بەخشەر، سوپاسێک شایستە بێت بە ئەو زاتە مەزنە، بە ڕاستی خزمەت کردنی قورئان، گەورەترین شەرەفە، چی لەوە گەورەترە کاتەکانی تەمەن بە ڕاڤەکردنی وتەکانی خوای بەرزو مەزنەوە بەسەر ببەیت؟! دیارە خوا خێری هەر کەسێکی بوێت سەرقاڵی دەکات بە خزمەتکردنی ئاینەکەی.
ئنجا هەر لێرەوە زۆر سوپاسی ئەو سەربازە ونە دەکەم (کە حەزی نەکرد ناوی بهێنم)، بە ڕاستی ئەو هاندەرو هاوکارم بوو، پاشان سوپاسی (خێزانم) دەکەم کە بە ڕاستی ئەویش زۆر ماندوو بووەو هاوکارێکی باشم بووە، وە سوپاسی هەموو ئەوانەش دەکەم کە خوا شەرەفی خزمەتکردنی ئەم تەفسیرەی پێبەخشین.
حەز دەکەم زۆر بە کورتی گرنگترینی کارەکانی خۆمان ڕوون بکەینەوە بۆتان لە وەرگێڕانی ئەم تەفسیرەدا:
١)- بە گشتی هەر نووسینێک لە ناو ئەم () کەوانە بێ، هی کتێبەکە نیە، بەڵکو خۆمان تێهەڵکێشمان کردوە بۆ زیاتر تێگەیشتنی خوێنەری بەڕێز.
٢)- ئەگەر دەقێک خرابێتە نێو کەوانەو ڕاڤەیش کرابوو، ئەوە لە کتێبەکەدا نەهاتووە، ئێمە بۆمان زیاد کردوە، بۆ نموونە: (﴿ وَإِلَى ٱلسَّمَآءِ كَيۡفَ رُفِعَتۡ ﴾ واتە: وە لە ئاسمان کە چۆن بەرز کراوەتەوە).
٣)- دەستەواژە عەرەبیەکان لەگەڵ فەرموودەکان لە ناو ئەو دوو کەوانەدان () و {}، ڕاڤەکانیشیان کەوانەیان بۆ نەکراوە، بۆ نموونە: (أنا عالِمٌ، وَأَنْتَ جَاهِلٌ) واتە: من زانامو

تـۆ نەزانی، بـە هەمان شـێوە فەرموودەکانیش بـەو جـۆرەن، وەک: {لَيْسَ الشَّـدِيدُ بِالصُّرَعَةِ وَلَكِـنَّ الشَّـدِيدَ الَّـذِي يَمْلِـكُ نَفْسَـهُ عِنْـدَ الْغَضَـبِ} واتـە: ئازایەتی لە تووڕە بـوونو پەلە کردندا نیـە، بەڵکـو ئازایەتـی ئەوەیە نەفسـی خۆت بگری لـە کاتی تورەییـدا، وە وێنـەی ئەوانەش.

٤)- هەنـدێ جـار ڕاڤـەی دەقەکـە لـە پێش هاتنـی دەقەکە کـراوە، بۆیـە ئێمـە دوای ئەوە ڕاڤەمـان نەکـردوە، بۆ نموونە: هیـچ یارمەتیەک نادرێن لە سـزای خوا ﴿ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴾.

٥)- لـە زۆر شـوێنی ئـەم تەفسـیرە تەنها وشـە گرانەکان شـی کراونەتەوە، ئێمە هەسـتاوین شـیکردنەوەکەمان تـەواو کـردوە بـۆ خوێنەری خۆشەویسـت، چونکـە لەوانەیـە هەندێک خوێنـەران شـارەزای زمانـی عەرەبـی نەبـن، ﴿ فَمَالِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ قِبَلَكَ مُهْطِعِينَ ﴾ واتـە: (دەی چییانـە ئـەو بێبڕوایانـە دێـن بۆ لات) بـە پەلە (مسـرعين).

عباس محمد امين

بۆ هەر تێبینیەک پەیوەندی بەم ژمارەیەوە بکەن:

٠٧٧٠٢١٥٤١٢٤

# پێشەکی زانای بەڕێز:

## موحەممەدی کوڕی صاڵحی عوثەیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت

ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییان، صەڵاتو سەلام لەسەر پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ، وە لەسەر ئالو بەیتو یارو یاوەرانی، وە ئەوەی شوێنیان کەوتووە بە چاکی تا ڕۆژی دوایی.

پاشان: بە ڕاستی تەفسیری پێشەوامان (عبد الرحمن)ی کوڕی ناصری سەعدی ڕەحمەتی خوای لێ بێت، بە ناوی (تیسیر الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان) لە چاکترینی تەفسیرەکانە، چەندین تایبەتمەندی زۆری هەیە:

لەوانە: دەربڕینی بە شێوەیەکی ئاسان، (ئایەتەکانی وا) ڕوون کردوەتەوە بە جۆرێک کەسی زاناو ڕۆچوو لە زانستو زانیاریی، وە کەسی ئاسایی لێ تێدەگات.

لەوانە: خۆی بە دوور گرتووە لە تێهەڵکێش کردنو درێژە پێدانێک کە هیچ سوودێکی نیە، جگە لە لە دەستدانی کات بۆ خوێنەرو پەرشو بڵاوی بیرو بۆچوونی.

لەوانە: خۆی بە دوور گرتووە لە باسکردنی ڕا جیاوازەکان، مەگەر ڕاجیاوازیەکی زۆر بەهێز بێت، پێویست بە باس کردن بکات، ئەمەش تایبەتمەندیەکی گرنگە بۆ خوێنەر، چونکە تێگەیشتنی جێگیر دەکات لەسەر یەک شت.

لەوانە: شوێن پێهەڵگرتنی زانایانی پێشین لە ئایەتەکانی سیفات، نە تەحریفو لادانی تێدایە، نە لێکدانەوەیەک پێچەوانەی مەبەستی خوا بێت، بە ڕاستی ئەوە کۆڵەکەیە لە چەسپاندنی بیرو بڕوادا.

لەوانە: وردەکاریی هەڵهێنجان، لەوەی کە دەقەکان بەڵگەن لەسەری، لە سوودو بڕیارو

حیکمەتـەکان، ئەمـەش بە ڕوونـی دەردەکەوێ لـە هەندێ دەقەکانـدا، بۆ نموونـە لە ئایەتی دەسـتنوێژ لە سـوورەتی (المائدة)، پەنجا حوکمو بڕیـاری هەڵهێنجـاوەو دەرهێناوە، وە وەک چیرۆکی داوودو سـولەیمان لە سـوورەتی (ص)دا.

لەوانـە: لـە ڕاسـتییدا ئـەوە کتێبی تەفسـیرو پەروەردەیە لەسـەر ڕەوشـتە بـەرزو چاکەکان، وەک ڕوون دەبێتـەوە لـە تەفسـیری وتـەی خـوای بـەرز لـە سـوورەتی (الأعـراف) کـە دەفەرمـوێ: ﴿ خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَٰهِلِينَ ١٩٩ ﴾، (واتـە: فەرمانیـش بـدە بـە چاکـەو چاکـە کـردنو ڕوو وەرگێـڕە لـە نەفامـانو نەزانان).

بـەم بۆنەیـەوە ئاماژە دەکەم بۆ هەموو ئەوانـەی گرنگی دەدەن بە دەسـتکەوتنو پەیداکردنی کتێبەکانـی تەفسـیر، با کتێبخانەکـەی خاڵی نەبێت لەم تەفسـیرە بە نرخە.

داوا دەکـەم لـە خوا سـوود بگەیەنێ بە نووسـەرەکەیو بەو کەسـەش کـە دەیخوێنێتەوە، بە ڕاسـتی ئـەو بەخشـندەو میهرەبانە، صەلاتو سـەلام لەسـەر پێغەمبەرمان موحەممـەد ﷺ، وە لەسـەر ئـالو بەیتو یـارو یاوەرانی، وە ئەوەشـی شـوێنیان کەوتـووە بە چاکی.

محمد الصالح العثیمین

لە ١٥/ ڕەمەزان ١٤١٦ ه

# پێشەکی نووسەر

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ستایش بۆ ئەو خوایەی قورئانی دابەزاندووە بۆ سەر بەندەکەی، جیاکەرەوەیە لە نێوان حەڵاڵو حەرام، وە لە نێوان بەختەوەرانو بەدبەختانو هەقو ناهەق.
بە میهرەبانی خۆی کردوویەتی بە ڕەحمەت بۆ ئادەمیزاد بە گشتیو بۆ خۆپارێزانیش بە تایبەتی، لە گومڕایی بێبڕواییو سەرپێچیو نەفامی، بۆ لای ڕووناکی بڕوا بوونو خۆپارێزیو زانست، وە دایبەزاندووە وەک شیفایەک بۆ دڵەکان لە نەخۆشیەکانی گومانو هەواو هەوەسەکان، دڵنیاییو زانستی پێ بە دەست دەهێنێ لە داخوازیە بەرزەکان.
شیفایە بۆ جەستەکانیش لە نەخۆشیو ئازارەکانی، هەواڵیداوە ئەم قورئانە هیچ گومانو دوودڵیەکی تێدانیە بە هیچ جۆرێک لە جۆرەکان، ئەویش لەبەر ئەوەیە کە هەقی مەزنی لە خۆ گرتووە لە هەواڵو فەرمانو قەدەغەکراوەکانی، بە پیرۆزی دایبەزاندووە، خێرو زانستێکی زۆرو بێشوماری تێدایە، وە نهێنیە سەرسووڕهێنەرەکانو داخوازیە بەرزەکان، هەموو خێرو بەرەکەتو بەختەوەریەک لە دونیادا دەستەبەر ببێ، هۆکارەکەی هیدایەت وەرگرتنە بە قورئانو شوێنکەوتنێتی، هەواڵیداوە کە بە ڕاستی قورئانی پیرۆز بە ڕاستدانەرو چاودێرە بەسەر هەموو کتێبەکانی پێشوو، ئەوەی قورئان شایەتی بۆ دابێت تەنها ئەوە ڕاستە، ئەوەیشی ئەو ڕەتی کردبێتەوە، بێگومان ئەوە ڕەتکراوەیە، چونکە هەموو کتێبەکانی لە خۆ گرتووەو شتی زیاتریشی تێدایە بەسەریانەوە، خوای پەروەردگار دەربارەی فەرموویەتی: ﴿ يَهۡدِي بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضۡوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ ﴿١٦﴾ ﴾ المائدة. (واتە: خوا ڕێنمایی کەسێکی پێ دەکات شوێنی ڕەزامەندی

ئـەو بکەوێـت بـۆ ڕێگاکانـی ئارامـیو ئاشـتی)، ئـەو ڕێنمایـی کارە بـۆماڵی ئاشـتی، وە ڕوونکـەرەوەی ڕێگـای گەیشـتنە پێـی، هانـی لەسـەر دەدات، ڕێگـای گەیشـتن بـە ماڵی پـڕ لـە ئازار ئاشـکرا دەکاتو دەیترسـێنێ لێی، خـوا هەواڵـی دەربـارەی داوە، فەرموویەتی: ﴿ الٓر كِتَٰبٌ أُحۡكِمَتۡ ءَايَٰتُهُۥ ثُمَّ فُصِّلَتۡ مِن لَّدُنۡ حَكِيمٍ خَبِيرٍ ١ ﴾هـود. (واتـە: ئەمـە کتێبێکـە ئایەتەکانـی پتـەوو داڕێـژراوە، پاشـان ڕوون کراونەتـەوە لـە لایـەن خوای کار دروسـتی زانـاوە)، ئایەتەکانـی ڕوون کردۆتـەوە بە تەواوتریـن ڕوون کردنەوە، وردبینـی تێدا کردوە بـە تەواوتریـن وردبینـی، وە درێـژەی پێداوە بـە ڕوون کردنـەوەو جیاکردنـەوەی هەق لە ناهـەقو ڕێنمایـی لـە گومڕایی، بـە درێـژە پێدانێک کە نادیـاریو ئاڵۆزی لەسـەر لابردوە، چونکـە لـە لایـەن خـوای کار دروسـتی زانـاوە هاتـوە، هـەواڵ نـادات مەگەر بە ڕاسـتیو دڵنیایـی نەبێـت، فەرمانیـش نـاکات مەگەر بـە دادپـەروەریو چاکـە نەبێت، هیـچ قەدەغە نـاکات مەگـەر لە شـتێک کـە زیانـی دونیـاو دوارۆژی تێدابێ.

خـوای بـەرز سـوێندی خـواردوە بـە قورئـانو وەسـفی کـردوە کـە بێگومان (مجیـد) وە (المجـد): فراوانـی وەسـفەکانو مەزنیـان، ئەویـش لەبـەر فراوانـی ماناکانـی قورئـانو گەورەییـان، وە وەسـفی کـردوە بـە (ذو الذکر) واتە: یـادی پـێ دەهێنرێتەوە زانسـتەکانی خـواو ڕەوشـتە جوانـەکانو کردەوە چاکـەکان، ئەو کەسەیشـی لە خوا بترسـێ ئامۆژگاری پـێ وەردەگرێ.

خوای بەرزومـەزن فەرموویەتی: ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ قُرۡءَٰنًا عَرَبِيّٗا لَّعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ٢ ﴾یوسف، (واتـە: بـە ڕاسـتی ئێمـە ناردوومانەتـە خـوارەوە قورئانێـک بـە عەرەبـی بـۆ ئـەوەی ژیر بـنو لێـی تـێ بگـەن) جـا دایبەزاندوە بـەم زمانە بـۆ ئـەوەی عەقڵی لـێ وەربگریـنو لێی تێبگەیـن، فەرمانـی پـێ کردوین بە سـەرنجدانو ڕامانو بیرکردنـەوە تێیـدا، وە هەڵهێنجانی زانسـتەکانی، لەبـەر ئـەوە سـەرنجدانو بیـر کردنـەوە لێـی کلیلـی هەمـوو خێرێکـەو بـە دەسـتهێنانی زانسـتەکانو نهێنیەکانە.

سـوپاسو سـتایشو پیاهەڵـدان تەنهـا بـۆ خـوا، کـە کتێبەکـەی کـردوە بـە ڕێنمایـیو شـیفاو ڕەحمـەتو ڕووناکـی، وە بە بەرچـاو ڕوونیو یادخـەرەوە، وە خێـرو بەرەکەت، وە هیدایـەتو مـوژدە بۆ سـەرجەم مسـوڵمانان، جـا ئەگەر ئەمـە زانرا، ئـەوە هـەژاری هەموو ئـەرک پێسـپێردراوێک دەزانـێ بۆ ناسـینی ماناکانـیو ڕێنمایـی پـێ وەرگرتنیان.

هەقـی خۆیەتـی بەنـدە هەمـوو تواناکانی بخاتـە گـەڕ، وە کۆششـەکانی بە تـاڵ بکاتەوە لە

فێـر بوونیو تێگەیشـتن لێـی، بە نزیکتریـن ڕێگـا بیگەیەنێ بـەو ئامانجە.
بـە ڕاسـتی تەفسـیری زانایـان ڕەحمەتـی خوایان لـێ بێ بـۆ کتێبـی خـوا زۆرن، تیایاندایە ئەوەنـدە درێـژەی بە هەنـدێ لێکۆڵینـەوەکان داوە لە مەبەسـتەکان دەرچـووە، وە تیایاندایە ئەوەنـدە کورتـە کورتر لـەوەی چارەسـەری هەنـدێ لە وشـەکانی زمانەوانـی بکات.
جـا ئـەوەی پێویسـتە لەمـەدا مانـای دیاریکـراو کـە مەبەسـتە دابنرێـت، وشـەش ببێتـە هۆکارێـک بـۆی، با تەماشـای میانەی قسـەکان بـکات، وە ئەوەیشـی لەو پێنـاوەدا هاتووە، تاوتوێـی بـکات لـە نێوانـی خـۆیو نێـوان هاوشـێوەکەی لـە جێگایەکـی تـردا، وە بزانێ کـە بـە ڕاسـتی ئـەو قورئانـە هاتـوە بـۆ ڕێنمایی خەڵکـی بە گشـتی، زانـاو نەفامیان، شـار نشـینو دەشـت نشـینیان، جـا تێڕوانین لە سـیاقی دەقـەکان لەگەڵ زانسـت بـە بارودۆخی پێغەمبـەر ﷺ و ژیاننامـەی لەگـەڵ هـاوەڵانو دوژمنانیـدا، لە کاتـی دابەزینـی گەورەترین یارمەتیـدەرە لـە سـەر زانیـنو تێگەیشـتن لـە مەبەسـتەکەی، بـە تایبـەت ئەگەر زانسـتو زانیـاری زانسـتەکانی عەرەبـی بدرێتـە پاڵـی بـە هەمـوو جۆرەکانی.
جـا هـەر کەسـێک سـەرکەوتوو بکـرێ بـۆ ئـەوە، ئـەوە هیـچ لەسـەری نامێنـێ جگە لە ڕووتێکـردن نەبـێ، بـە سـەرنجدانو تێگەیشـتنو زۆر بیرکردنەوە لـە وشـەو ماناکانی، وە ئەوەیشـی لەخـۆی گرتووە، ئەوەیشـی کە دەبێتـە بەڵگە لەسـەری بە دەربڕینو تێگەیشـتن، جـا ئەگەر کۆششـەکانی لـەوەدا بەکارهێنا، ئـەوە پەروەردگار بەخشـندەترە لـە بەندەکەی، هـەر دەبـێ دەرگـای زانسـتی خۆی لـێ بکاتەوە لـە کاروبارێکدا کـە لە توانـای خۆیدا نیە.
کاتـێ کـە خوا منەتی کرد بەسـەر مـنو براکانمدا، بە سـەرقاڵ بوون بە کتێبـە پیرۆزەکەی بـە پێـی توانامان، حەزم کرد وێنەی تەفسـیری خوا بکێشـم لەوەی کە ئاسـانە، وە ئەوەیشـی خـوا منەتی کـردوە بەسـەرماندا، تـا ببێتـە یادخەرەوە بـۆ بەدەسـتهێنەرانو کەرەسـتەیەک بـۆ بەرچـاو ڕوونـەکانو یارمەتیـدەر بـۆ ئەو کەسـانەی ئـەو ڕێگایـان گرتۆتە بـەر، وە بۆ ئـەوەی بیبەسـتمەوە تـا لە دەسـت نەچێ، مەبەسـتم لـەوەدا هیچ نیـە تەنها مانای مەبەسـتو ڕاسـتەقینە نەبـێ، خـۆم سـەرقاڵ نەکـردوە لە شـیکردنەوەی وشـەکانو گرێیـەکان، بۆ ئەو مانایـەی کە باسـم کرد، چونکـە ڕاڤەزانانی قورئـان دوای خۆیانیان بێنیاز کـردوە لەوە، خوا پاداشـتیان بداتـەوە بە چاکترین پاداشـت.
تەنهـا ئومێـدم بـە خوایەو پشـت بـەو دەبەسـتم، بۆم ئاسـان بـکات ئـەوەی مەبەسـتمە، وە زەلیلـی بـکات ئـەوەی کـە دەمـەوێ، چونکە بـە ڕاسـتی ئەگەر خوا ئاسـانی نـەکات، هیچ

ڕێگایـەک نیـە بـۆ بـە دەسـتهێنانی، وە ئەگەر ئەو هـاوکاری نـەکات لەسـەری، بەندە هیچ ڕێگایەکـی نیـە بۆ بـە دەسـتهێنانی ئامانجەکەی.

داوا دەکـەم لـە خـوا ئـەم کارە بگێـڕی بـە دڵسـۆزی لـە پێنـاو خۆیـدا، وە سـوودی پـێ بگەیەنـێ بـە سـوود گەیاندنێکـی گشـتگیر، بـە ڕاسـتی ئـەو بەخشـندەو میهرەبانـە.

خوایـە صـەڵاتو سـەلام بنێرە بۆ سـەر موحەممـەد ﷺ، وە ئـاڵو بەیتیو یـارو یاوەرانی، وە سـڵاوی بـۆ بنێرە بە سـڵاوێکی زۆر.




## تەفسیری سوورەتی (الفاتحة)
## مەککیە (٧) ئایەتە
## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٧): ﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ① الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ② الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ③ مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ ④ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ⑤ اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ ⑥ صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ ⑦ ﴾:

﴿ بِسْمِ اللَّهِ ﴾ تەنها بە ناوە بەرزو مەزنەکانی خوا ﷻ دەست پێدەکەم، لەبەر ئەوەی ئاخاوتنی (إسم) تاکەو دراوە پاڵ (مفرد مضاف)ە، هەموو ناو جوانەکانی خوا دەگرێتە خۆی.

﴿ اللَّهِ ﴾ خوا پەرستراوە، شایستەی ئەوەیە کە بە تاکو تەنها بپەرسترێ بە پەرستن، چونکە وەسف کراوە بە سیفەتی پەرستراوێتی، ئەویش سیفەتە تەواوەکانە.

﴿ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴾ دوو ناون، بەڵگەن لەسەر ئەوەی خوا ﷻ خاوەن میهرەبانیو بەزەییەکی بەرفراوانی مەزنە، بە میهرەبانی خۆی دەوری هەموو شتێکی داوە، وە هەموو زیندویەکیش، ئەو میهرەبانیو بەزەییەی خۆی بۆ لە خوا ترسانو پارێزکاران نووسیوە، ئەوانەی شوێنی پێغەمبەرانو نێردراوانی کەوتوون، ئا ئەوانە بەزەیی خوا ﷻ دەیانگرێتەوە بە ڕەهایی، جگە لە ئەوان بەشێکیان لەو میهرەبانیە بۆ هەیە.

دڵنیابەو بزانە، یەکێک لە گرنگترینی ئەو بنەمایانەی کە پێشینی ئەم ئۆممەتە لەسەری یەکدەنگن، بریتیە لە: بڕوا بوون بە ناوو سیفەتەکانی خوا ﷻ، وە ئەو حوکمانەی لە سیفەتەکان وەردەگیرێن، بۆ نموونە: بڕوا دێنن بەوەی خوا ﷻ (رحمن رحيم)ە، بە بەزەییو میهرەبانە، خاوەن ئەو میهرەبانیەیە کە پێی وەسف کراوە، کە پەیوەستە بە بەزەیی پێکراو (المرحوم) هەموو نازو نیعمەتەکان شوێنەوارێکن لە شوێنەوارەکانی

میهرەبانی ئەو، بە هەمان شێوە لە سەرجەم ناوەکاندا، دەوترێ: (العلیم) واتە: خوا زۆر زانایەو خاوەن زانستە، بە هەموو شتێک دەزانێ، دەوترێ: خوا (قدیر)ە، واتە: خاوەن توانایەکە، توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ﴾ بریتیە لە پیاهەڵدانی خوا ﷻ بە هەموو سیفەتە تەواوەکان، وە بە هەموو کردەوەکانی کە لە بازنەی چاکەو دادپەروەری ئەودا دەسوڕێنەوە، هەموو ستایشێکی تەواو لە گشت ڕووەکانەوە تایبەتە بەو.

﴿ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ (رب) پەروەردگار، پەروەردەکاری هەموو جیهانییانە -ئەوانیش بریتین لە غەیری خوا- دروستی کردوون، وە ئامرازەکانی بۆ ئامادە کردوون، نازو نیعمەتە مەزنەکانی خۆی داباراندوە بەسەریاندا، کە ئەگەر لە دەستی بدەن ئەوە ژیانو مانەوەیان نامێنێ، جا هەر نیعمەتێکیشیان هەبێ لە لایەن خوای بەرزو مەزنەوەیە.

## پەروەردە کردنی خوا ﷻ بۆ دروست کراوەکان دوو جۆرە:

پەروەردە کردنی گشتیو تایبەتی:

<u>یەکەم</u>: پەروەردە کردنی گشتی: بریتیە لە دروستکردنی دروستکراوەکان، وە ڕۆزی پێدانو ڕێنمایی کردنیان لەوەی کە بەرژەوەندی ئەوانی تێدایە، کە بە هۆی ئەو بەرژەوەندیانەوە مانەوەیان بۆ هەیە لە دنیادا.

<u>دووەم</u>: پەروەردە کردنی تایبەتی: بریتیە لە پەروەردە کردنی دۆستەکانی، پەروەردەیان دەکات بە ئیمان، وە پشتگیریان لێ دەکات بۆ ئەو مەبەستە، وە بۆیان تەواو دەکات، کۆسپو لەمپەرەکانی نێوان خۆیو ئەوان لادەبات، حەقیقەتی ئەم پەروەردەیە: پەروەردە کردنی سەرکەوتنە بۆ هەموو خێرێکو پارێزراویە لە هەموو شەڕو خراپەیەک.

دەگونجێ نهێنی ئەم مانایە (رب) ئەوە بێ کە زۆرێک لە پێغەمبەران (علیهم السلام) بەو وشەیە پاڕابنەوە، بە ڕاستی هەموو داوا کاریەکانیان لە نێو پەروەردەی تایبەتی خودایە.

فەرموودەی خوا ﷻ ﴿ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ (واتە: پەروەردگاری جیهانیان) دەبێتە بەڵگە لەسەر تاکو تەنیایی خوا ﷻ لە بەدیهێنانو بەڕێوەبردنو بەخشینی نیعمەتەکانو تەواویی بێنیازیی خوا، وە بەڵگەیە لەسەر ئەوپەڕی هەژارییو پێویستی جیهانیان بە خوا، لە هەموو ڕووەکانەوە.

﴿ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴾ واتــە: خــاوەن، ئــەو زاتەیە کــە بە ســیفەتی خاوەنداریێتی وەســفکراوە کــە لــە شــوێنەوارەکانی خاوەنداریێتــی ئــەو ئەوەیــە فەرمــان دەکاتو قەدەغــە دەکات، پاداشــت دەداتــەوەو تۆڵەش دەســێنێتەوە، وە هەڵســوکەوت بە بەندەکانــی دەکات بە جۆرەها هەڵسوکەوت.

وە وشــەی (ملــک)ی پاڵداوەتــە لای ڕۆژی قیامــەت ﴿ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴾[1] ئەویــش ئــەو ڕۆژەیــە کە خەڵکــی ســەرەنجامی کردەوەکانیــان وەردەگرنەوە، چاک بە چاکــەو خراپیش بــە خراپــە، چونکــە لــەو ڕۆژەدا تــەواوی خاوەنداریێتــیو دادگەریــیو کاربەجێــی خــوا بۆ دروســتکراوەکان دەردەکــەون، وە خاوەنداریێتــی دروســتکراوەکان کۆتایی دێــت، تەنانەت لەو ڕۆژەدا هەموو دەســتەڵاتدارو پادشــاو ژێر دەســتەو چەوســێنراوانو ئازادەکان یەکســانن بــە بــێ جیــاوازی، وە هەموویــان گوێڕایەڵــی مەزنی خــوا ﷻ دەبــن، ملکەچی هێــزو تواناو دەســەڵاتی ئــەو دەبــن، چاوەڕوانــی بڕیاری ئــەو دەکــەن، ئومێدی ئــەوە دەکەن پاداشــتیان بداتــەوە، دەترســن لە تۆڵەو ســزای، بۆیــە تایبەتی کــردوە بە باســکردن، ئەگەرنــا تەنها ئەو خــاوەن ڕۆژی دوایــیو ڕۆژەکانی دیکەیشــە.

﴿ إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ﴾ واتــە: تەنهــا تــۆ دەپەرســتینو تەنهــا داوای یارمەتــی لە تۆ دەکەیــن، چونکــە بێگومــان پێــش خســتنی کارتێکــراو (معمــول) کورتهەڵێنــان (الحصر) دەگەیەنــێ، ئــەوەش چەســپاندنو جێگیــر کردنــی حوکمــە بــۆ ئەو شــتەی باســکراوە کە پەرســتنی خوایــە، وە ڕەتکردنــەوەی پەرســتنی جگــە لــە خوایــە، هــەروەک ئــەوەی بڵێی: (نعبــدُک) خوایــە تــۆ دەپەرســتم، غەیــری تــۆ ناپەرســتم، داوای یارمەتیو کۆمەکــی لە تۆ دەکــەمو، داوای یارمەتــیو کۆمەکــی لــە غەیــری تــۆ ناکەم.

لێــرەدا خــوا ﷻ (العبادة) پێش خســتووە بەســەر (الإســتعانة)دا ئەمەش لە بابەتی پێشخســتنی گشــتی (عــام) بەســەر تایبەتیــە (خــاص)ە وەکــو گرنگــی دان بە پێشخســتنی مافــی خوای بەرز بەســەر مافــی بەندە.

(العبــادة) واتــە: پەرســتش، ناوێکــی گشــتگیرو کۆکەرەویــە بــۆ هەمــوو ئەوانــەی خوا ﷻ خۆشــی دەویو پێیــان ڕازیــە لــەو قســەو کردەوانــەی ئاشــکراو پەنهانن.

(الإســتعانة) واتــە: بریتیــە لــە پشــت بەســتن بــە خــوا ﷻ لــە بەدەســتهێنانی ســوودەکانو دوورخســتنەوەی زیانــەکان، لەگەڵ متمانــە بوون پێی لە بەدەســتهێنانی ئەوانەدا، وە هەســتان

---

١) مالك: مضاف. یوم: مضاف إلیە. وەرگێڕ.

بــە بەندایەتــی خواو پشــت بەســتن پێــی هــۆکارو ئامرازێکــە بۆ خۆشــبەختی هەمیشــەیی‌و ڕزگــار بــوون لە هەمــوو خراپەکان، هیــچ ڕێگــاو دەرچەیەکی دیکــە نیە بۆ بەدەســتهێنانی خۆشــبەختی‌و ڕزگــار بــوون لــە خراپــەکاری، تەنها بە هەســتان بــەو دووانە نەبێ، پەرســتن کاتــێ دەبێتــە پەرســتنێکی ڕاســتەقینەو وەرگیــراو ئەگــەر لــە پێغەمبــەرەوە ﷺ وەربگیرێ‌و تەنهــا مەبەســت پێــی ڕەزامەنــدی خوا ﷻ بێــت، ئا بــەم دووانە دەبێتــە عیبادەت‌و پەرســتن.

جا باســی پشــت بەســتن (الإستعانة)ی لە دوای پەرســتش‌و عیبادەت کردوە، لەگەڵ ئەوەی پشــت بە خوا بەســتن هــەر دەچێتــەوە نێو پەرستشــەوە، چونکە بەنــدە بــۆ ئەنجامدانی هەموو پەرستشــەکان پێویســتی بە پشــت بەســتن هەیە بە خــوا ﷻ، بێگومــان ئەگەر خوا پشــتیوانی لــێ نــەکات، ئــەوەی دەیەوێــت لــە جێبەجــێ کردنــی فەرمانــەکان‌و دوور کەوتنــەوە لــە قەدەغەکــراوەکان بە دەســتی ناهێنێت.

پاشــان خــوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ﴾ واتــە: ڕێنماییمــان بکــەو ڕێمان پێشــان بــدە، وە ســەرکەوتوومان بکــە بــۆ ڕێگای ڕاســت، ئەویش ڕاســتە ڕێگای ئاشــکراو ڕوونــە کــە دەمانگەیەنێتــە لای خــواو بەهەشــتەکەی، ئەویــش ناســینی هــەق‌و کار پــێ کردنیەتــی، هیدایەتمــان بدە بــۆ ڕێگەی ڕاســت، وە هیدایەتمان بــدە بۆ نێو ڕێگەی ڕاســت.

جــا هیدایــەت بــۆ ڕێگەی ڕاســت، واتــە: پابەند بوونە بــە ئاینــی ئیســلامەوە، وە وازهێنان لە هەمــوو ئاییــن‌و ڕێبازەکانی دیکەی غەیری ئیســلام.

وە هیدایــەت بــۆ نێــو ڕێگــەی ڕاســت: ئــەم هیدایەتــە هەمــوو وردەکاریەکانــی نــاو ئایــن دەگرێتــەوە بە زانســت‌و بە کــردەوە، ئەم پاڕانەوەیە لــە کۆکەرەوەترینی نێــو پاڕانەوەکانەو، بــە ســوودترینیانە بــۆ بەنــدە، بۆیــە پێویســتە لەســەر ئادەمیــزاد لــە هەمــوو ڕکاتێکــی نــاو نوێژەکانیــدا بــەم پاڕانــەوە لە خــوا بپاڕێتــەوە ﴿ ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ﴾ لەبــەر گرنگی‌و پێویســتی زۆری پێی.

وە ئــەم ڕێگا ڕاســتە بریتیە لــە: ﴿ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ ﴾ (ڕێگەی ئەوانــەی نازو نیعمەتت بەســەریاندا ڕشــتووە) لە پێغەمبەران‌و ڕاستگۆیان‌و شــەهیدان‌و چاکەکاران، ﴿ غَيۡرِ ﴾ جگە لە ڕێگــەی ﴿ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ ﴾ (ئەوانەی خەشــمت لێیــان گرت)، ئەوانەی هەقیان ناســی‌و وازیــان لــێ هێنــا، وەک جوولەکــەکان‌و وێنەی ئــەوان، وە جگە لــە ڕێگای ﴿ ٱلضَّآلِّينَ ﴾ (گومڕایــان) ئەوانــەی وازیــان لــە هــەق‌و ڕاســتی هێنا، لەســەر نەفامیــی‌و گومڕایــی بوون، وەک گــاورەکان‌و وێنەی ئەوان.

لە ڕاستیدا ئەم سوورەتە لەگەڵ ئەوەی چەندە کورتو پوختە، بێگومان ئەوەی ئەم سوورەتە لە خۆی گرتووە، هیچ سوورەتێکی دیکە لە سوورەتەکانی قورئان لە خۆیان نەگرتووە، هەر سێ جۆری یەکتا پەرستیەکەی تێدایە: یەکتاپەرستی پەروەردگارێتی (توحید الربوبیة) لەم فەرمودەوەی خوا ﷻ وەردەگیرێ کە دەفەرموێ: ﴿رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾.

وە یەکتاپەرستی پەرستراوێتی (توحیـد الإلهیـة)، ئەویـش بە تـاکو تەنها دانانـی خوایە لە پەرسـتندا، ئەمیـش لـە وشـەی: ﴿لِلَّهِ﴾ وەردەگیرێ، وە لـە وتـەی: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾ (واتە: تەنیا تۆ دەپەرسـتین).

وە یەکتاپەرسـتی لـە نـاوو سـیفەتەکانی (توحیـد الأسـماء والصفـات) ئەویـش چەسـپاندنی سـیفەتەکانی خوایـە، بـە کەمـاڵو تەواوێتـی، کـە بـۆ خـۆی چەسـپاندوویەتی، وە پێغەمبەرەکەشـی بۆی چەسـپاندوە، بەبێ لەکار خسـتنو شـێواندنو لێک چوانـدن، بێگومان وشـەی: ﴿ٱلْحَمْدُ﴾ بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوە، هـەروەک پێشـتر باسـکرا.

هەروەهـا ئـەم سـوورەتە جێگیر کـردنو چەسـپاندنی پێغەمبەرایەتیشـی لە خـۆی گرتووە، لـەم دەقەدا کـە فەرموویەتـی: ﴿ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ﴾: لەبەر ئـەوەی ڕێنمایی کردن بۆ ڕێگەی ڕاسـت بەبێ پەیامـی پێغەمبەرایەتـی ناکرێ.

وە سـزاو پاداشـت لەسـەر کـردەوەکان جێگیـر دەکات، وەک فەرموویەتـی: ﴿مَـٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ﴾ (خاوەنـی ڕۆژی سـزا)، بێگومـان پاداشـت دانەوە بـە دادپەروەری دەبـێ، چونکە وشـەی (الدیـن) بە مانـای پاداشـت هاتوە بە دادپـەروەری هاتـوە، وە هەروەها چەسـپاندنی قـەزاو قەدەریشـی لـە خـۆ گرتـووە، بـە ڕاسـتی بەنـدە بکـەری حەقیقـی ڕاسـتەقینەی کردەوەکەیەتـی، بـە پێچەوانـەی (القدریـة) وە (الجبریـة) یـەکان.

بەڵکـو ئـەم سـوورەتە وەڵامـی هەمـوو بیدعـەکارانو گومڕایانیشـی تێدایـە، لـە وتـەی خـواﷻ کـە فەرموویەتـی: ﴿ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ﴾ چونکە ئەمە ناسـینی هـەقو کار پێ کردنیەتـی، وە هەمـوو بیدعـەکارو گومڕایەکیش پێچەوانەی ئـەو ڕێگە ڕاسـتە دەجوڵێتەوە.

هەروەهـا ئـەم سـوورەتە دڵسـۆزی دینداریی کردن بۆ خـوا ﷻ لە خۆ دەگرێ، لە پەرسـتنو پشـت پـێ بەسـتندا، وەکـو فەرموویەتـی: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ (واتـە: تەنها تۆ دەپەرسـتینو تەنهـا داوای کۆمەکی لە تـۆ دەکەین).

سوپاسو ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانیان.



## تەفسیری سوورەتی (البقرة)

## مەدەنییە، (٢٨٦) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٥): ﴿ الٓمٓ ۝١ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ۝٢ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ۝٣ وَٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ وَبِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ ۝٤ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ۝٥ ﴾:

﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ پێشتر قسە لەسەر (البسملة) کرا[٢]. ﴿ الٓمٓ ﴾ بەڵام ئەو پیتە پچڕاوانەی لە سەرەتای سوورەتەکان هاتوون، بێدەنگی چاکترە تیایدا لە دەست خستنە ناو ماناکانی، بەبێ هیچ بەڵگەیەکی شەرعی، لەگەڵ جەخت کردنەوەی ئەوە کە بێگومان خوا ﷻ بەبێ مانا دایبەزاندوە، بەڵکو لەبەر حیکمەتێکە کە ئێمە نایزانین.

﴿ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ ﴾ واتە: ئەم کتێبە مەزنە، کتێبێکە بە حەقیقەت زانیاری ڕوونی لە خۆگرتوە، کە کتێبەکانی پێشوو لە خۆیان نەگرتوە، لە زانیاریی مەزنو ڕاستی ڕوونو ئاشکرا.

خوای بەرز کە دەفەرموێ: ﴿ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ ﴾ واتە: جا هیچ گومانێکی تێدانیە بە هیچ جۆرێک لە جۆرەکانی گومان، نەفی کردنی گومان لە قورئان دژەکەی دەچەسپێنێ، لە کاتێکدا دژی گومانو دوو دڵی یەقینو دڵنیاییە، ئەم کتێبە زانیاریی دڵنیاکەرەوە لە خۆ دەگرێ، کە هەموو گومانو دوودڵیەک دەسڕێتەوەو لایدەبات.

ئەمەش یاسایەکی بە سوودە، بە ڕاستی مەبەست لە نەفیو ڕەتکردنەوە وەسفکردنو

---

٢) لە سوورەتی فاتحة.

پیاهەڵدانــە، هــەر دەبــێ پێچەوانەکەی لە خــۆ بگرێ، کە بریتیــە لە تەواویەتــیو کەماڵی، چونکــە ڕەتکردنەوە نەبوونــە، نەبوونی پەتیش وەســف پیاهەڵدانــی تێدانیە.

کاتــێ ئــەم قورئانــە دڵنیایــی لــە خــۆ گــرت، دیــارە ڕێنمایــیو هیدایەتیــش بە دەســت نایــەت تەنهــا بــە دڵنیایی نەبــێ، بۆیــە فەرموویەتــی: ﴿ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ﴾ (الــهُدى) ڕێنمایی پــێ بــە دەســت دێنێ لە گومڕایــیو گومــانو دوودڵیــەکان، وە ڕێنمایی تێدایــە بۆ گرتنە بــەری ڕێگــای بــە ســوود، فەرموویەتــی: ﴿ هُدًى ﴾ کارتێکــراو (معمــول)ی لابــردوە، نەیفەرمــووە: هیدایــەتو ڕێنماییــە بــۆ بەرژەوەنــدی فلانــە کەس، بــۆ ئــەوەی مانایەکی گشــتگیر بگەیەنێــت، بێگومــان ئــەوە هیدایەتە بــۆ بەرژەوەندی هــەردوو دونیــا، ڕێنماییە بــۆ بەنــدەکان لە بابەتــە بنەڕەتی (أصــول)ی و لاوەکــی (فرع)یــەکان، ڕوونکەرەوەیە بۆ جیــا کردنــەوەی هــەق لــە ناهــەق، ڕاســت لــە ناڕاســت، وە ڕوونکەرەوەیە بۆیــان چۆن ڕێگــای ڕاســت دەگرنەبەر لــە دونیــاو دوارۆژیاندا.

لە شــوێنێکی تردا فەرموویەتــی: ﴿ هُدًى لِّلنَّاسِ ﴿١٨٥﴾ ﴾البقرة، گشــتاندوویەتی، لەم شــوێنەو جگــە لــەم شــوێنەدا ﴿ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ﴾ چونکــە (قورئان) خــۆی لە خــودی خۆیدا هیدایەتــە بــۆ هەموو خەڵکــی، بەدبەختەکان ســەریان پێی بڵنــد نابێت، هەرگیــز هیدایەتی خــوا وەرناگــرن، تەنها ئــەوە نەبــێ حوججەیان لەســەر دەکرێت (إقامة الحجة)، وە هیچ ســوودێکیان لێــی وەرنەگرتــووە بە هــۆی گومڕاییانــەوە، جگە لــە پارێــزکاران، ئەوانەی دەســتیان بــە هۆکارێکــی مەزنــەوە گرت بۆ بــە دەســتهێنانی هیدایــەت، ئەویــش تەقوایە کــە حەقیقەتەکــەی: خۆپاراســتنە لــەوەی دەبێتــە مایــەی تووڕەیی خــوا ﷻ، بــە جێبەجێ کردنــی فەرمانەکانــیو دورکەوتنــەوە لــە قەدەغەکراوەکانــی، بــەو شــێوە هیدایەتــی پێ وەردەگــرن، وە چاکتریــن ســوودی لێوەردەگرن.

خوا فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّكُمْ فُرْقَانًا ﴿٢٩﴾ ﴾الأنفال، (واتــە: ئــەی ئەوانــەی بڕواتــان هێنــاوە! ئەگــەر پارێــز لــە خوا بکــەن جیاکــەرەوە «ی هــەقو ناهەق»تــان پــێ دەدات). وە پارێــزکاران ئەوانــەن کــە ســوودیان وەرگرتــوە لە بەڵگەکانــی قورئــانو بەڵگەکانــی گەردوون.

## چونکە لە ڕاستییدا ڕێنمایی (هدایة) دوو جۆرە:

یەکـەم: ڕێنمایـی ڕوونکردنـەوە (هدایـة البیـان)، دووەم: ڕێنمایـی سەرخسـتن‌و یارمەتیدان (هدایـة التوفیـق)، کـە بێگومـان خۆپارێـزان هـەردوو ڕێنماییەکانیـان بـە دەسـت هێناوە، وە غەیـری پارێـزکاران ڕێنمایی سـەرکەوتنیان (هدایـة التوفیـق)ی بە دەسـت نەهێناوە، وە ڕێنمایـی ڕوونکردنەوە (هدایـە البیان) بەبێ کـردەوە پێ کردنی پێی ناوترێـت ڕێنماییەکی ڕاسـتەقینەو تەواو.

پاشـان وەسـفی خۆپارێـزان دەکات بـە عەقیدەو کـردەوەی پەنهان‌و ئاشـکرا، لەبـەر ئەوەی تەقـواو خۆپارێزی ئەوە دەخـوازێ، فەرموویەتـی: ﴿ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ ﴾ (ئەوانەی بڕوایان بە پەنهـان هەیـە) حەقیقەتی ئیمـان: بریتیە لە بەڕاسـت دانانی تـەواوی ئەوەی کـە پێغەمبەران هەواڵیـان پێـداوە، کە ملکەچی ئەندامەکانی جەسـتە دەگرێتـەوە، گرنگی ئیمان لەو شـتانەدا نیـە کـە بـە چـاو دەبینرێـن لـە هەسـتەوەرەکان، چونکە بـەو شـێوە مسـوڵمان‌و بێبـڕوا لە یەکتـر جیـا ناکرێنـەوە، بەڵکو گرنگـی بڕوا، بـڕوا هێنانە بە شـتە پەنهانـەکان، ئەوانەی کە نایبینیـن، بـەڵام بڕوامـان پێیەتی لەبـەر ئەوەی خـواو پێغەمبەرەکـەی ﷺ هەواڵیـان پێداوە، جـا ئـەم ئیمانە مسـوڵمان‌و بێبـڕوای پێ جیـا دەکرێتـەوە، چونکە بەڕاسـت دانانێکـی پەتیە تەنها بـۆ خـواو پێغەمبەرەکانیەتی.

بـڕوادار بـڕوای بـە هەمـوو ئەوانـە هەیە کە خـوا ﷻ هەواڵـی پێـداوە، یـان پێغەمبەرەکەی هەواڵـی پێـداوە، یەکسـانە بینیبێتی یـان نەیبینیبـێ، وە یەکسـانە عەقڵی بیبڕێت یـان عەقڵی پـەی پـێ نەبردبـێ‌و لێی تێنەگەیشـتبێ، بـە پێچەوانەی زەندیقـەکان کە غەیـب‌و پەنهان بە درۆ دادەنێـن‌و بڕوایـان پێـی نیە، چونکـە عەقڵیان کورت بـڕو کەمتەرخەمەو پـەی پێنابات، بۆیـە بـە درۆی دادەنێـن، چونکـە بە زانسـتە کەمەکەیانەوە پەیبیان بە زانسـتی خـوا نەبردوە، ئەوانـە عەقڵیـان تێکچـووە، خەونەکانیان شـپرزەو پەرش‌و بـڵاو بووە، وە عەقڵـی بڕوادارانی بەڕاسـت دانەرانـی نـەش‌و نما کردوە، ئەوانـەی هیدایەتیـان وەرگرتوە بـە ڕێنمایی خوا ﷻ.

دەچێتـە نـاو بڕواهێنـان بە پەنهـان، بڕوابوون بـە هەموو ئەوانەی خـوا ﷻ هەواڵـی پێداوە لە شـتە پەنهانەکانی ڕابـردوو و داهاتوو، وە حاڵـی ڕۆژی دوایی‌و حەقیقەتی وەسـفەکانی خواو چۆنیەتیان، ئەوەیشـی کە پێغەمبـەران هەواڵیان پێداوە، بڕوایان بە سـیفەتە بەرزەکانی خوا ﷻ

هەیە، یەقینو دڵنیان ئەگەر چی چۆنیەتیەکەشی تێنەگەنو نەزانن.
پاشـان فەرموویەتـی: ﴿ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾ نەیفەرمـوو: نوێــژ دەکەن، یان بۆ نوێــژ دێن، چونکە تەنهـا ڕواڵەتـی ئاشـکرا بـەس نیە تیایـدا، جـا بەجێهێنانـی نوێــژ، بەجێهێنانیەتی بە ئاشـکرا بـە جێبەجێکردنـی پایەکانـیو پێویسـتیەکانیو مەرجەکانـی، وە بـە جێهێنانیەتی بـە پەنهان لـە ناخـەوە، بەجێهێنانـی ڕووحـی نوێــژ، ئەویــش ئامادەبوونی دڵـە تیایـدا، وە وردبوونەوەو ڕامانـە لـەوەی کـە دەیڵێـتو لـەوەی کـە دەیـکات، ئـا ئەم نوێــژە ئـەو نوێژەیـە خوا ﷻ دەربـارەی فەرموویەتـی: ﴿ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ۗ وَلَذِكْرُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ ﴿٤٥﴾ ﴾العنكبوت، (واتـە: بێگومـان نوێــژ خاوەنەکـەی قەدەغـە دەکات لە هەموو قسـەیەکی ناقـوولاو لـە هەمـوو کردەوەیەکـی خراپ). ئـەو نوێژەیە کە پاداشـتی لەسـەر دادەمـەزرێو خاوەنەکەی پاداشــت وەردەگرێ، مرۆڤ پاداشــت وەرناگرێ لــە نوێژەکەیدا تەنهـا ئەو کەسـە نەبێ عەقـڵو دڵی لە لای بێت، کـە ئەمە فەرزو سـونەتەکانیش دەگرێتەوە.
پاشـان فەرموویەتـی: ﴿ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴾ دەچێتـە نێویـەوە بەخشـینە پێویسـتەکان، وەکو زەکاتو بژێـوی خێزانەکانو خزمو کەسـەکانو کۆیلەو ژێردەسـتەکان وێنـەی ئەوانیش، بـە هەمان شـێوە ئەو بەخشـینانەیش کە ویسـتراوو (مُستَحب)ن بـە هەمـوو ڕێگاکانی خێر، وە باسـی ئەوانـەی نەکـردوە کـە پێیـان دەبەخشـرێت، لەبـەر زۆری هـۆکاریو جۆریەتی خاوەنەکانـی، چونکە بەخشـین لـەو ڕووەی کـە نزیکبوونەوەیە بۆ لای خـوا ﷻ، وە بە پیتی (مِنْ) هێناویەتـی، کـە بەڵگەیـە لەسـەر هەندێک (التبعیض)، تـا ئاگاداریان بکاتـەوە، ئەو هیچـی لێیـان ناوێت تەنها بەشـێکی کەم نەبێـت لە ماڵەکانیـان، زیانیان پـێ ناگاتو قورس نیـە بەسـەریانەوە، بەڵکو بە بەخشـینی سـوود وەردەگرنو براکانیشـیان سـوودمەند دەبن.
کـە دەفەرمـوێ: ﴿ رَزَقْنَٰهُمْ ﴾ ئاماژەیـە کـە ئـەو مـاڵو سـامانانەی لەبـەر دەسـتتان دایە، بە هێـزو بـازووی خۆتان بـە دەسـتتان نەهێناوە، بەڵکـو ئەوە ڕزقـی خوایە کە پێی بەخشـیون، وە نـازو نیعمەتـی ئـەوە بەسـەرتانەوە، فەزڵیشـی داون بەسـەر زۆرێ لـە بەنـدەکان، دەی کەوابـوو ئێـوەش شـوکری خـوا ﷻ بکەن بە بەخشـینی هەنـدێ لـەو نـازو نیعمەتانەی کە بـە هۆیانـەوە فـەزڵو چاکـەی کـردوە بەسـەرتانەوە، دەسـا ئێـوەش سوپاسـگوزاری بکەن بـە بەخشـینی هەندێـک لـەوەی پێی بەخشـیون، دڵـی بـرا هەژارەکانتانی پێ خـۆش بکەن، ئەوانـەی فەقیرو هـەژارو نـەدارو بێدەرەتانن.

بـە زۆری لـە قورئانـدا خـوا ﷻ نوێـژو زەکاتی پێکـەوە باس کـردوە، چونکـە نوێژ کردن دڵسـۆزی بـۆ خـوا لەخـۆ دەگرێـت، زەکاتو بەخشـینیش چاکەکـردن لەگـەڵ بەندەکانی خـوادا لـە خۆ دەگرێـت، جا ناونیشـانی خۆشـبەختی بەندە، دڵسـۆزیەتی بۆ پەرسـتراوی، وە کۆشـش کردنیەتـی لە سـوود گەیانـدن بە خەڵکی. هـەر وەکو چـۆن ناونیشـانی بەدبەختی بەنـدە نەبوونـی ئـەم دوو ئەرکـە پیرۆزەیـە تیایـدا (نوێـژو زەکات)، ئـەو کات نازانـێ دڵسـۆزیو چاکـە چیە؟

ئنجـا فەرمـووی: ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ﴾ ئەویـش قورئـانو سـوننەتە، خـوای بـەرز فەرموویەتـی: ﴿وَأَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ ﴿١١٣﴾﴾النسـاء (واتـە: خـوا قورئـانو فەرمـوودەی بـۆ سـەر تـۆ دابەزانـدوە)، خۆپارێـزان بڕوایـان هەیـە بـە هەمـوو ئەوانـەی پێغەمبـەر ﷺ هێناویەتـی، جیـاوازی ناکـەن لـە نێـوان هەنـدێ لـەوەی کـە بۆی دابەزیـوە، بـڕوا بە هەندێکـی بهێنن‌و بڕواش بـە هەندێکـی نەهێنن، یان بـە نکووڵی کردن، یـان بـە لێکدانەوەی ماناکـەی بە شـێوەیەک دوور لە مەبەسـتی خـواو پێغەمبەرەکەی بێت، هـەر وەکـو چـۆن بیدعـەکاران دەیکـەن، ئەوانـەی دەقـەکان لێکدەدەنـەوە بـە پێچەوانەی وتەکانیـان، سـەرەنجامەکەی بـە ڕاسـت دانەنانـی ماناکەیەتی، ئەگـەر چی بە دەم بە ڕاسـتی دابنێنـن، بـەڵام بـە ڕاسـتی بڕواییان پێـی نیە.

ئنجـا فەرمـووی: ﴿وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ﴾ بـڕوا بە کتێبەکانـی ڕابردوو دەگرێتـەوە، وە هەروەها بڕواهێنـان بـە کتێبـەکانو پێغەمبـەران، بـە تایبـەت تـەوراتو ئینجیـلو زەبـوور، ئەمە لە تایبەتمەنـدی بڕوادارانـە کـە بڕوایـان بـە هەمـوو کتێبـە پیـرۆزەکان هەیە، وە بـە هەموو پێغەمبـەران، جیـاوازی ناکـەن لە نێـوان هیـچ یەکێکیاندا.

پاشـان فەرموویەتـی: ﴿وَبِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ﴾ (الأخـرة) واتـە: دواڕۆژ، ناوێکـە بەکاردەهێنرێ بـۆ دوای مـردن، تایبەتـی کـردوە بـە بـاس کردن پـاش ئـەوەی بە گشـتی باسـی ئیمانی کـردوە، چونکـە بڕوا بوون بـە ڕۆژی دوایـی یەکێکە لـە پایەکانی ئیمـان، وە لەبەر ئەوەی گەورەتریـن هاندەرە لەسـەر ئـارەزوو (الرغبە)و تـرس (الرهبـة)و کار کـردن، وە (الیقین) دڵنیایـی: بریتیـە لـەو زانسـتە تـەواوەی کەمتریـن گومـان هەڵناگـرێو کـرداری چاکە بە دوای خۆیـدا دەهێنێ.

﴿أُوْلَٰٓئِكَ﴾ واتـە: ئەوانـەی وەسـف کـراون بەم سـیفەتە سـتایش کراوانـە، ﴿عَلَىٰ هُدٗى مِّن

رَبِّهِمۡ ﴾ واتـە: لەسـەر ڕێنمایيەکـی مەزنـن، چونکە نەناسـراو (نکـرة) بۆ مـەزن دانانە، جا چ ڕێنمایيـەک مەزنترە لەو سـيفەتانەی کە باسـکران، کە بيـرو باوەڕی ڕاسـتەقينەو کردەوەی ڕاسـتو تەندروسـت لەخۆ دەگـرێ، وە ئایـا هيدايـەتو ڕێنمايیەکی ڕاسـتەقينە هەيە جگە لـە ڕێنمايـی بـڕواداران، جگە لـەو ڕێنمايیە ئـەوەی پێچەوانـەی بێت ئـەوە گومڕایيە.

لـەم جێگايـەدا (علـی)ی بەکارهێناوە، کە بەڵگەيە لەسـەر بـەرزیو بڵندی، وە بـۆ گومڕایی (في) بـەکار هێنـاوە، هەروەکـو چۆن لـە وتەی خوای بـەرزدا هاتـوە: ﴿ وَإِنَّآ أَوۡ إِيَّاكُمۡ لَعَلَىٰ هُدًى أَوۡ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴿٢٤﴾ ﴾سبأ، (واتـە: وە ئێمـە يـان ئێـوە لەسـەر ڕێنمایيـن، يـان لـە نێـو گومڕایيەکـی ڕوونو ئاشـکراين)، بێگومان ئـەوەی هيدايەتـی وەرگرتووە، بە هيدايەتـەوە سـەر بەرزو سـەر بڵندە، وە خـاوەن گومڕایی نقـوم بووە تيايداو بـێ نرخو نزمە.

پاشـان فەرمووبەتـی: ﴿ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴾: (ئا ئەوانە سـەرفرازن)، (الفـلاح): بريتيە لە سـەرکەوتنو بەدەسـتهێنانی داواکـراوەکانو ڕزگـار بوون لە لێ ترسـاوەکان، سـەرفرازی کـورت کردوەتـەوە لەوانـدا، چونکـە هيـچ ڕێگايەک نيـە بۆ سـەرکەوتن تەنها بـە گرتنە بـەری ڕێگاکانـی ئـەوان نەبێـت، جـا جگە لـەو ڕێگايە ئـەوە ڕێگـای خراپـەکارو تياچوو خەسـارەتمەندانە، کـە خاوەنەکـەی بـەرەو لەناوچـوون دەبـات، لەبـەر ئەمـە کاتـێ باسـی سـيفەتی بـڕواداری ڕاسـتەقينە دەکات، باسـی سـيفەتی بێبڕواکانيـش دەکات، ئەوانـەی کوفرەکەيـان ئاشـکرا کـردوەو نکووڵيـان لێـی کردوە، جـا خـوا فەرموويەتی:

إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ سَوَآءٌ عَلَيْهِمْ ءَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ
لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٦﴾ خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَعَلَىٰ سَمْعِهِمْ ۖ وَعَلَىٰٓ
أَبْصَٰرِهِمْ غِشَٰوَةٌ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٧﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ
مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَمَا هُم بِمُؤْمِنِينَ ﴿٨﴾
يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ
وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿٩﴾ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا ۖ
وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْذِبُونَ ﴿١٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ
لَا تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ قَالُوٓا۟ إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ ﴿١١﴾ أَلَآ إِنَّهُمْ
هُمُ ٱلْمُفْسِدُونَ وَلَٰكِن لَّا يَشْعُرُونَ ﴿١٢﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ
ءَامِنُوا۟ كَمَآ ءَامَنَ ٱلنَّاسُ قَالُوٓا۟ أَنُؤْمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُ ۗ
أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلسُّفَهَآءُ وَلَٰكِن لَّا يَعْلَمُونَ ﴿١٣﴾ وَإِذَا لَقُوا۟
ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوْا۟ إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمْ قَالُوٓا۟ إِنَّا
مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ ﴿١٤﴾ ٱللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ وَيَمُدُّهُمْ
فِى طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١٥﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشْتَرَوُا۟ ٱلضَّلَٰلَةَ
بِٱلْهُدَىٰ فَمَا رَبِحَت تِّجَٰرَتُهُمْ وَمَا كَانُوا۟ مُهْتَدِينَ ﴿١٦﴾

(٦-٧): ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ سَوَآءٌ عَلَيْهِمْ ءَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٦﴾ خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَعَلَىٰ سَمْعِهِمْ ۖ وَعَلَىٰٓ أَبْصَٰرِهِمْ غِشَٰوَةٌ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٧﴾﴾

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ سَوَآءٌ عَلَيْهِمْ ءَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدات بێگومان ئەوانە بێبڕوان، واتە: وەسف کراون بە کوفرو پێی ڕەنگ کراون، تا بووەتە وەسفێکی پەیوەست پێیانەوە، هیچ ڕێگرییەک ناتوانێت ڕێیان لێ بگرێت، ئامۆژگاری سوودی نیە بۆیان، ئەوان بەردەوامن لەسەر بێبڕواییان، جا بۆ ئەوان وەک یەکە ئاگاداریان بکەیتەوە، یان ئاگاداریان نەکەیتەوە ئەوان بڕواناهێنن، حەقیقەتی کوفر: بریتیە لە ئینکاری کردنی ئەو پەیامەی پێغەمبەر هێناویەتی، یان نکوڵی لە هەندێکی، بێبڕوایان بانگەواز کردن هیچ سوودێکی نیە بۆیان، تەنها ئەوە دەبێتە بیانوو برین لە سەریان (إقامة الحجة)، وەک بێ ئومێد کردنی پێغەمبەر ﷺ وایە لە تەماح کردن لە بڕواهێنانیاندا، تۆ ئەی موحەممەد ﷺ خەمیان بۆ مەخۆو نەفس‌و دەروونی خۆت تووشی حەسرەت‌و ئاخ هەڵکێشان مەکە.

ئنجا باسی هۆکارەکانی بەردەم بڕوانەهێنانیانی کردوە، فەرموویەتی: ﴿خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَعَلَىٰ سَمْعِهِمْ﴾ واتە: مۆری داوە بەسەر دڵو دەروونیاندا، وە بەسەر گوێیاندا، بە مۆرێکی وا (کە هەرگیز) بڕواو ئیمان ناچێتە ناویانەوە، وە پێیایدا تێپەڕ نابێ، هەرگیز سوود لەوە وەرناگرن کە قازانجی هەیە بۆیان، وە گوێ ناگرن لەوەی کە سوودی بۆیان هەیە.

﴿وَعَلَىٰٓ أَبْصَٰرِهِمْ غِشَٰوَةٌ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ بەربەست‌و داپۆشەر کە دەبنە بەربەست لە بینینی ئەوەی کە سوودی هەیە بۆیان، ئەمانەش زانست‌و خێرە لەسەریان داخراوە هیچ ئومێدێکی چاکەیان لێناکرێ، لەبەر ئەوەی ڕێگری ئەوەیان لێکراوەو دەرگاکانی

بڕواهێنانیـان لـێ داخـراوە، بە هۆی کوفـرو ئینـکاریو کەللەڕەقیانەوە، پاش ئـەوەی هەقو ڕاسـتیان بـۆ ڕوون بوەتـەوە، هـەروەک چـۆن خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ وَنُقَلِّبُ أَفْئِدَتَهُمْ وَأَبْصَـٰرَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَنَذَرُهُمْ فِى طُغْيَـٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١١٠﴾ ﴾ الأنعام (واتـە: وە «چ شـتێک وای لێکـردوون کـە هەسـت بکـەنو بزانـن» کـە دڵەکانیـانو چاوەکانیان هەڵدەگێڕینـەوە تاکـو بـڕوا نەهێنـن، وەک چـۆن یەکەمجـار بڕوایـان نەهێنـاوە وازیان لێ دێنیـن لەسەرکێشـی خۆیانـدا سەراسـیمەبن). ئـا ئەوە سـزای بۆ پێـش هاتووە لـە دونیادا. پاشـان باسـی سـزای دواخـراو (ڕۆژی دوایـی) دەکات، فەرموویەتـی: ﴿ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾ ئەویـش بریتیـە لـە سـزای ئاگـری دۆزەخو توڕەیـی خەشـمو قینـی بەردەوامی خـوای باڵادەسـت، پاشـان خـوا ﷻ لـە وەسـفو پێناسـەی دوو ڕووەکان ئەوانـەی بـە ڕووکـەش مسـوڵمانن‌و لـە ناخـەوە بێبـڕوان فەرموویەتـی:

(٨-١٠): ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَمَا هُم بِمُؤْمِنِينَ ﴿٨﴾ يُخَـٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿٩﴾ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْذِبُونَ ﴿١٠﴾ ﴾:

بێگومـان بزانـە: نیفـاقو دوو ڕووی بریتیـە لـە ئاشـکراکردنی خێـرو شـاردنەوەی شـەڕو خراپـە، دووڕوویـی بیروبـڕوا (النفـاق الإعتقـادي)، وە دووڕوویی کرداری (النفـاق العملي) دەچێتـە نـاو ئەم پێناسـەوە.

جـا دوو ڕوویـی کرداری: وەکـو ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ باسـی کـردوەو فەرموویەتی: {آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلاَثٌ: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ} (أخرجه البخـاري برقم: (٣٣)، ومسـلم برقـم: (١٠٩) عَـنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

واتـە: دووڕوویـی سـێ (شـتە): ئەگەر قسـەی کـرد درۆ دەکات، ئەگـەر بەڵێنـی دا نایباتە جـێ، وە ئەگـەر ڕاسـپاردەی لادانرا خیانەتـی لێدەکات. لـە ڕیوایەتێکی تردا هاتـووە: {وَإِذَا خَاصَمَ فَجَرَ} (أخرجـه أحمد برقـم: (٦٧٦٨)، والبخـاري برقم: (٣٤)، ومسـلم برقـم: (٥٨)، وأبو داود برقـم: (٤٦٨٨)). واتـە: ئەگـەر دەمەقاڵێو شـەڕە قسـەی کرد، دەمی پیسـە.

دووڕوویـی بیروبـاوەڕی (النفـاق الإعتقـادي): خاوەنەکـەی لـە بازنـەی ئیسـلام دەکاتـە دەرەوە، ئەوەیـە خـوا ﷻ وەسـفی دوو ڕووەکانـی پێـدەکات لـەم سـوورەتەو غەیـری ئەم سـوورەتە، دوو ڕوویـی پێـش کۆچکردنـی پێغەمبـەر ﷺ لـە مەککـەوە بـۆ مەدینـە بوونی نەبـوو، وە پـاش ئەوەیشـی کـە کۆچـی کـرد، کاتـێ کە جەنگـی بـەدر ڕوویـدا، خوا ﷻ

بڕوادارانــی سەرخســتو ســەربەرزی کــردن، خەڵکانێــک لە شــاری مەدینە زەلیلو ڕیســوا بــوون، ئەوانەی کە مســوڵمان نەبــوون، هەندێکیان ئیسـلامەتیان ڕاگەیاندو ئاشـکرایان کرد بــە هــۆی تــرسو فرووفێڵەوە، لەبــەر ئــەوەی خوێنیان حــەڵاڵ نەبــێو ماڵیان پارێــزراو بێ، جــا ئەوان لــە نێــوان مســوڵماناندا دەمانەوە، لــە ڕووکەشــدا بڕوادار بــوون، لە حەقیقەتیشــدا لــە مســوڵمانان نەبوون.

لــە بەزەیــیو نەرمو نیانــی خوا لە بەرانبەر بڕواداران ئەوەیە کە حاڵو وەســفی ئەوانی ئاشــکرا کــرد بە شــێوەیەک دەتوانن جیایــان بکەنەوە، بۆ ئەوەی مســوڵمانان پێیــان هەڵنەخەڵەتێن، تا ئــەو کاتــەی واز دێنن لــە زۆربەی کــردەوە خراپەکانیان، خــوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ يَحۡذَرُ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ أَن تُنَزَّلَ عَلَيۡهِمۡ سُورَةٞ تُنَبِّئُهُم بِمَا فِي قُلُوبِهِمۡۚ قُلِ ٱسۡتَهۡزِءُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ مُخۡرِجٞ مَّا تَحۡذَرُونَ ٦٤ ﴾التوبـة، (واتــە: دووڕوووەکان بیمــی ئەوەیــان هەیە کە ســووڕەتێکیان دابەزێتــە ســەر، هەواڵــی ئەوەیــان بداتــێ کە لــە دڵیان دایــە «لــە دەغەڵیو نیــازی خراپ» بڵــێ: وە گاڵتــە بکەن «بە ئیســلامو مســوڵمانان» بە دڵنیایی ئــەوەی خۆی لــێ دەپارێزن خوا وەدەری دەخــات). خوا وەســفی کــردوون بە ســەرچاوەو بنەڕەتی دووڕوویــی، فەرموویەتی: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ ﴾ بێگومــان ئــەوەی ئــەوان بــە زمــان دەیڵێــن لــە نــاو دڵیانــدا نیە، خــوا بــە درۆی خســتنەوە، بــە فەرمایشــتی خۆی کە فەرموویەتــی: ﴿ وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ ﴾چونکــە ئیمانــی ڕاســتەقینە ئەوەیــە دڵو زمانــی وەکــو یەکــدی لێبــکات، بــەڵام ئەمــەی دووڕووەکان فێڵ کردنە لە خــواو بەنــدە بڕوادارەکانی

(المخادعة) فێــڵ کــردن: ئەوەیە کە کەســی فێڵکەر شــتێک بــۆ فێڵ لێکراو ئاشــکرا بکاتو پێچەوانەکەیشــی بشــارێتەوە، هەتا بگات بــە ئامانجەکەی لەوەی کە دەیــەوێ هەڵیبخەڵەتێنێ. جــا دووڕووەکان لەگەڵ خــواو بەندەکانیدا ئــەم ڕێگایەیان گرتەبەر، فرووفێڵەکانیان بەســەر خۆیانــدا شــکایەوە، بــە ڕاســتی ئەمەش لە شــتە سەرســووڕ هێنەرەکانــە، چونکــە فێڵکەر یان ئەوەیــە فێڵەکەی ســەردەکەوێو ئەوەی مەبەســتێتی دەســتی دەکەوێ، یان ســەلامەت دەبێ، نــە بــۆی دەبێو نــە لەســەری دەبــێ، (نە ســوودی بــۆی دەبــێو نەبەســەریدا دەشــکێتەوە) بــەڵام ئەوانــە فێــڵو تەڵەکەکانیــان بەســەر خۆیانــدا شــکایەوە، وەک ئــەوەی کاربکەن بۆ لەناوبــردنو فەوتانــی خۆیــان، بێگومــان خــوا ﷻ بــە فێڵــی ئــەو دوو ڕووانە هیــچ زیانێکی پێناگــات، بــە هەمان شــێوە بەندە بڕوادارەکانیشــی هیچ زیانێکیــان پێناگات، بــڕواداران هیچ زەرەرێــک ناکــەن ئەگەر دوو ڕووەکان ئیمانیان ئاشــکرا بکەن، تا بەو شــێوە مــاڵو خوێنیان

پارێزراوبێ، وە فێڵەکانیشیان دەکەوێتە گەردنی خۆیان،، بەو نیفاقو دووڕوویییەیان ڕیسوایی‌و ئابڕوو چوونیان بۆ دەبێ لە دونیادا، وە دڵتەنەگی بەردەوامیشیان بۆ دەبێ بە هۆی ئەوەی بڕواداران بە بەردەوام هێز پەیدا دەکەن‌و سەرکەوتن بەدەست دەهێنن. دوایی لە دوارۆژدا سزایەکی بە ئێشی توونەدیان بۆ هەیە، بە هۆی درۆکردن‌و کوفرو خراپەکاریانەوە، لە کاتێکدا ئەوان بە هۆی نەفامی‌و بێ عەقڵیانەوە هەست بەوە ناکەن.

کە خوا فەرموویەتی: ﴿ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ ﴾ مەبەست لە نەخۆشی لێرەدا: نەخۆشی گومان‌و دوو دڵیی‌و دووڕوویییە، چونکە دڵ ڕووبەڕووی دوو نەخۆشی دەبێتەوە لە ساغی‌و هاوسەنگی دەیبەنە دەر، ئەوانیش: نەخۆشی گومانە پووچەڵەکان (مرض الشبهات)، وە نەخۆشی حەزو ئارەزووە (مرض الشهوات)، جا بێبڕوایی‌و دووڕوویی، وە گومان‌و بیدعە، هەموویان لە نەخۆشییەکانی گومانە خراپەکانن، وە زیناو حەزو ئارەزوو بۆ بەدڕەوشتی‌و سەرپێچی‌و ئەنجامدانی، لە نەخۆشی حەزو ئارەزووەکانە، وەکو چۆن خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿ فَيَطْمَعَ ٱلَّذِى فِى قَلْبِهِۦ مَرَضٌ وَقُلْنَ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴿٣٢﴾ ﴾ الأحزاب (واتە: ئارەزووی ئەوە دەکات کە لە دڵی نەخۆشدا هەیە). ئەوە ئارەزووی زیناو داوێن پیسی کردنە، تەندروستو پارێزراو ئەو کەسەیە پارێزراو بێ لەم دوو نەخۆشییە، دڵنیایی‌و ئیمان‌و ئارامی بە دەست هێنابێ لە هەموو سەرپێچییەک، ئەوە بە بەرگی سەلامەتی‌و لەش ساغی داپۆشراوە.

فەرمودەی خوا دەربارەی دووڕووەکان: ﴿ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْذِبُونَ ﴾ ڕوونکردنەوەیە بۆ کاربەجێی خوا لە دیاریکردنی سەرپێچییەکان بەسەر سەرپێچیکاراندا، بێگومان ئەو کەسە بە هۆی تاوانەکانی پێشوویانەوە تووشی بەڵا دەبن بە تاوانەکانی داهاتوویان، کە تۆڵەیان بۆ پێویست دەکات، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿ وَنُقَلِّبُ أَفْـِٔدَتَهُمْ وَأَبْصَـٰرَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٍ ﴿١١٠﴾ ﴾ الأنعام، (واتە: وە «چ شتێک وای لێکردوون هەست بکەن‌و بزانن» کە دڵەکانیان‌و چاوەکانیان هەڵدەگێڕینەوە تاکو بڕوا نەهێنن، وەک چۆن یەکەمجار بڕوایان نەهێناوە). وە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ فَلَمَّا زَاغُوٓا۟ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْ ﴿٥﴾ ﴾ الصف، (واتە: کاتێک لە ڕێی ڕاستی خوا لایاندا، خوا زیاتر لایدان‌و لاڕێتری کردن). وە هەروەها خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَتْهُمْ رِجْسًا إِلَىٰ رِجْسِهِمْ ﴿١٢٥﴾ ﴾ التوبة، (واتە: بەڵام ئەوانەی دڵیان نەخۆشی «نیفاقی» تێدایە «ئەو سوورەتە» پیسی زێدەی خستە گەڵ پیسییەکەیان).

جا سزای سەرپێچی سەرپێچی تره بە دوایدا، هەروەکو چۆن سزای چاکە چاکەی تره بە دوایدا، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَيَزِيدُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْاْ هُدًى ﴿٧٦﴾ ﴾مریم. (واتە: خوا ڕێنمایی زیاد دەکات بۆ ئەوانەی ڕێنماییان وەرگرتوە).

(١١-١٢): ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُواْ فِى ٱلْأَرْضِ قَالُوٓاْ إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ ﴿١١﴾ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلْمُفْسِدُونَ وَلَٰكِن لَّا يَشْعُرُونَ ﴿١٢﴾ ﴾

﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُواْ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾ واتە: ئەگەر ئەو دووڕووانە قەدەغەکران لە نانەوەی ئاشووبو خراپەکاری لەسەر زەوی، ئەویش بریتیە لە: کارکردن بە کوفرو تاوانو گوناهەکان، وە ئاشکرا کردنی نهێنی بڕواداران بۆ دوژمنانیانو دۆستایەتیو پشتگیری کردنی بێبڕوایان.

خوا دەفەرموێ: ﴿ قَالُوٓاْ إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ ﴾ جا کۆیان کردەوە لە نێوان خراپەکاری لەسەر زەویداو ئاشکرا کردنیان بەوەی ئەو کارە خراپەکاری نیە بەڵکو چاکەکاریە، ڕاستیەکانیان پێچەوانە کردەوە، وە کۆیانکردەوە لە نێوان کاری بەتاڵو پووچو بڕوایشیان وابوو کە هەقو ڕاستیە، ئەوە تاوانەکەی مەزنترە، لەو کەسەی کە گوناهو تاوان دەکات پێی وایە ئەو کارەی دەیکات گوناهو تاوانە، ئا ئەو (کەس)ە نزیکترە لە سەلامەتی، وە ئومێد دەکرێ بگەڕێتەوە لە گوناهو تاوان.

چونکە لە قسەکانیاندا کە دەڵێن: ﴿ إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ ﴾ چاکەکاریی کورت کردۆتەوە لەواندا -وە لەو چوارچێوەیەدا (ئەمە دەگەیەنێ) بڕواداران لە چاکەکاران نین- خوا ﷻ بانگەشەکەیانی هەڵگێڕایەوە بە سەریاندا، بە وتەی خۆی: ﴿ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلْمُفْسِدُونَ وَلَٰكِن لَّا يَشْعُرُونَ ﴾ بە ڕاستی هیچ خراپەکاریەک مەزنتر نیە لەو کەسەی کوفر بە ئایەتەکانی خوا دەکات، وە ڕێگری دەکات لە ڕێگای خوا، بە عەقڵی خۆی دەیەوێ خواو دۆستەکانی هەڵبخەڵەتێنێ، لەگەڵ ئەوەدا دۆستایەتی دوژمنانی خواو پێغەمبەرەکەی دەکات، وا دەزانێ ئەو کارە چاکەکاریە، ئایا لە دوای ئەم خراپەکاریەوە خراپەکاریەکی دیکە هەیە لەمە گەورەتر بێ؟! بەڵام ئەوان شتێک نازانن سوودو کەڵکی هەبێ بۆیان، ئەگەر زانیاریەکیشیان هەبووبێ، ئەوە ئەو زانیاریە بەڵگەو حوجە بووە بە سەریانەوە، بێگومان تاوان کردن لەسەر زەویدا خراپەکاریە، چونکە تەنها خراپەکاری لە خۆدەگرێ، خراپەکاری لەسەر زەویدا دەبێتە مایەی بەڵاو لەناوچوونی دانەوێڵەو بەرووبوومو داروو درەختو ڕووەکەکان، (دیارە ئەمەش بەڵاو نەگبەتیەکانی

تاوانــە)، بە ڕاسـتی چاکســازی لەســەر زەویدا بــە گوێڕایەڵی خــواو بڕوابوون پێـی دەبێ، ئا لەبــەر ئەمە خــوا بەدیهێنراوەکانی دروســت کردوەو لەســەر زەویدا نیشــتەجێی کردوون، وە ڕزقو ڕۆزی پێبەخشـیون، بـۆ ئــەوەی بەکاریبێنــن لــە گوێڕایەڵــیو بەندایەتیکردنی خوادا، جـا ئەگــەر بــە پێچەوانەکــەی کاری کرد ئەوە فەســادی لەســەر زەویــدا بڵاوکردۆتەوە، وە ئــەوەی کە لــە پێناویــدا دروســتکراوە ئەو تێکــی داوە.

(١٣): ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءَامِنُوا۟ كَمَآ ءَامَنَ ٱلنَّاسُ قَالُوٓا۟ أَنُؤْمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُ ۗ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلسُّفَهَآءُ وَلَٰكِن لَّا يَعْلَمُونَ ﴿١٣﴾ ﴾:

واتــە: ئەگەر بــە دووڕووەکان بوتــرێ بڕوابهێنن وەکو چۆن ئــەو خەڵکانە بڕوایــان هێناوە، واتــە: وەکــو بڕواهێنانــی هــاوەڵان (خوا لێیــان ڕازی بێ) ئەویــش بڕواهێنانە بــە دڵو زمان، ئــەوان بــە گومانــی پووچەڵــی خۆیــان وتیــان: ﴿ أَنُؤْمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُ ﴾ ئایــا بڕوابهێنین هــەروەک ئــەم گێلو نەفامانــە بڕوایان هێنــاوە؟ (خوا ڕوو ڕەشــیان بکات) مەبەســتیان پێی هاوەڵانــە خــوا لێیان ڕازی بــێ، بە گومانــی دووڕووەکان نەفامی مســوڵمانان وای پێویســت کــردوە کــە بڕوابهێنــن، وە واز لــە خــاکو نشــتیمان بهێنــنو دژایەتــی بێبڕوایــان بکەن، عەقــڵو ژیــری لای ئەمــان پێچەوانــەی ئەمەیــە، بۆیە نەفامــیو گێلیــان داوە پاڵیــان، وە لەو چوارچێوەیــەدا خۆیــان عاقڵو تێگەیشــتوو ژیرن.

خــوای گــەورە بەرپەرچی ئەوەی دایــەوە بەســەریاندا، وە هەواڵیدا کە بە ڕاسـتی ئەوانە تەنها گەمــژەو کــەم عەقڵن، چونکــە حەقیقەتــی گەمژەیــی: نەفامی مرۆڤــە بــە بەرژەوەندیەکانی خــۆی، وە کۆشــش کردنێتــی لــەوەی کــە زیانی هەیە بــۆی، ئەم ســیفەتە جێبەجــێ بووە بە ســەریاندا، هەروەکــو چــۆن عەقــڵو ژیری مرۆڤ دەناســێنن بــە بەرژەوەندیەکانــی خۆیان، وە هەوڵــدان بــۆ ئــەوەی ســوودی هەیــە، وە پاڵنانــی ئــەوەی کــە زیانــی هەیــە بــۆی، ئەم ســیفەتە جێبەجــێ بووە بەســەر هــاوەڵانو بــڕواداران، جــا پەنــدو ئامۆژگاری بە وەســفو ســەلماندنەکانە، نــەک بــە بانگەشــەی بــێ بنەماو قســەی بە تــاڵ، پاشــان فەرموویەتی:

(١٤-١٥): ﴿ وَإِذَا لَقُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوْا۟ إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمْ قَالُوٓا۟ إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ ﴿١٤﴾ ٱللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ وَيَمُدُّهُمْ فِى طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١٥﴾ ﴾:

﴿ وَإِذَا لَقُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوْا۟ إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمْ قَالُوٓا۟ إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ ﴾ ئەمــە لــە وتەکانیانــە بــە زمانیــان کــە لــە دڵەکانیانــدا نیــە، بێگومــان ئەوان کاتــێ لەگــەڵ بڕوادارانــدا کۆدەبنــەوە، وا دەریدەخەن کە لەســەر ڕێبازی ئەوانــن، وە ئەوان

لەگەڵیانــدان، جـا کاتــێ گەڕانەوە بۆ لای شـەیتانەکانیان، واتـە: دەســەڵاتدارو گەورەکانیان لــە خراپەکاریــدا وتیــان: لــە ڕاسـتیدا ئێمــە لەگــەڵ ئێوەدایــن، ئێمــە هــەر گاڵتەجــاڕی بە بــڕواداران دەکەیــن، بــەوەی کــە دەڵێین لەگەڵتاندایــن و لەسـەر ڕێبــازی ئێوەیــن، ئەمە حاڵی پەنهــان و ئاشــکرای ئەوانــە، فێــڵ و پلانــی خــراپ تەنهــا ســەری خاوەنەکــەی دەگرێتەوە.

خــوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ ٱللَّهُ يَسۡتَهۡزِئُ بِهِمۡ وَيَمُدُّهُمۡ فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ ﴾ ئەمــە پاداشــتی ئەوانــە لەســەر گاڵتــە کردنیــان بــە بەندەکانی خــوا، جا لــە گەمــەو گاڵتەکردنەکانــی (خوا بــە ئــەوان) ئەوەیــە کــە ڕازاندوویەتیەوە لــەوەی تیایدان لــە گومڕاییو سەرلێشـێواوی و ئەو حاڵەتــە پیــس و بۆگەنــە، هەتــا وا گومانیان بــردووە ئــەوان لەگــەڵ بڕوادارانن، وە لــە گاڵتە کردنەکانــی پێیــان لــە ڕۆژی دواییدا ئەوەیە کە لەگــەڵ بڕواداراندا ڕووناکیەکی ئاشــکرایان پێدەبەخشــێ، جـا ئەگــەر بــڕواداران کەوتنــە ڕێکــردن بــە ڕووناکیەکەیانــەوە، ڕووناکــی دووڕووەکان دەکوژێتــەوە، وە لــە تاریکیــدا دەمێننــەوە پــاش ڕۆشــنایی بە سەرلێشــێواوی و دوودڵــی، ئــای چەنــدە مەزنە بــێ ئومێــد بــوون پــاش تامەزرۆیــی، وەک خــوا دەفەرموێ: ﴿ يُنَادُونَهُمۡ أَلَمۡ نَكُن مَّعَكُمۡۖ قَالُواْ بَلَىٰ وَلَٰكِنَّكُمۡ فَتَنتُمۡ أَنفُسَكُمۡ وَتَرَبَّصۡتُمۡ وَٱرۡتَبۡتُمۡ وَغَرَّتۡكُمُ ٱلۡأَمَانِيُّ حَتَّىٰ جَآءَ أَمۡرُ ٱللَّهِ وَغَرَّكُم بِٱللَّهِ ٱلۡغَرُورُ ﴾ الحدیـد (واتــە: دووڕووەکان بــە بەهەشــتیەکان دەڵێن: ئــەی ئێمــە لەگــەڵ ئێــوەدا نەبوویــن؟ ئەوانیــش دەڵێن: بەڵــێ، لەگەڵمــان بوون، بــەڵام ئێوە خۆتــان تووشــی دووڕووایەتــی کــردو چاوەڕوانــی ئەوەتــان دەکرد تووشــی بــەڵا ببین، لە دوو دڵــی و گومانــدا دەژیان).

کــە خــوا دەفەرمــوێ: ﴿ وَيَمُدُّهُمۡ ﴾ واتــە: بۆیــان زیــاد دەکات، ﴿ طُغۡيَٰنِهِمۡ ﴾ واتــە: خراپەکاریــی و بێبڕواییان ﴿ يَعۡمَهُونَ ﴾ واتە: ســەرگەردان و ڕاراو سەرلێشــێواون، دیارە ئەمە لــە گاڵتــە کردنــی خوایە ﷻ پێیــان. لە پاشــان خــوا ﷻ حاڵەتــی ڕاســتەقینەی دووڕووەکانی دەرخســتووەو فەرموویەتی:

(١٦): ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلضَّلَٰلَةَ بِٱلۡهُدَىٰ فَمَا رَبِحَت تِّجَٰرَتُهُمۡ وَمَا كَانُواْ مُهۡتَدِينَ ١٦ ﴾:

﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ﴾ واتــە: دووڕووەکان کــە بەو ســیفەتانە وەســفکراون ﴿ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلضَّلَٰلَةَ بِٱلۡهُدَىٰ ﴾، واتــە: حەزیــان لــە گومڕایــی بــوو، وەکــو چــۆن کڕیــار حــەزی لــە شــمەکە بیکــڕێ، کــە لە حەزوو ئارەزوویــدا پارەو ســامانی زۆر خەرج دەکات بۆ ئەو مەبەســتە، ئەمە لــە چاکترینــی نموونەکانــە، بێگومــان خــوا ﷻ گومڕایی کە ئەوپــەڕی خراپەیە بەشــمەکی

چوانـدووە، وە ڕێنمایـی کـە ئەوپـەڕی چاکەیـە بـە نرخـی چووانـدوە، ئەمانـە ئەوانەن کە گومڕاییـان کڕیـە بە ڕێنمایـی، چونکە حەزیـان لێیەتی، ئا ئەمـە بازرگانیەکەیانە، بەڕاسـتی خراپتریـن بازرگانـی، خراپتریـن کڕیـن‌و فرشـتن، کڕیـن‌و فرۆشـتنی ئەوانـە، ئەگـەر هەرکەسـێ دینـارێ ببەخشـێ بەرانبـەر بە درهەمـێ زەرەری کـردوە، ئەی چۆن بەخشـینی گەوهەرێـک لـە بـری درهەمێکـدا زەرەر نیـە؟ جـا چـۆن کەسـێ هیدایـەت ببەخشـێ لە بەرانبـەر گومڕاییـداو نەگبەتـی‌و بەدبەختـی هەڵبژێرێ بە سـەر بەختەوەری‌و خۆشـبەختیدا، وە ئـارەزووی کارە نـزم‌و بـێ نرخـەکان بکات بەسـەر کارە بـەرزو بڵندەکانـدا؟! بێگومان بازرگانیەکـەی قازانجـی نەکـردوە، بەڵکـو گەورەتریـن زەرەری تێـدا کـردوە، وەک خوا دەفەرمـوێ: ﴿ فَٱعۡبُدُواْ مَا شِئۡتُم مِّن دُونِهِۦۗ قُلۡ إِنَّ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ وَأَهۡلِيهِمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ أَلَا ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡخُسۡرَانُ ٱلۡمُبِينُ ﴿١٥﴾ ﴾ الزمـر.(واتـە: بڵـێ: بـە ڕاسـتی زەرەرمەنـدان ئەوانەن کە خۆیـان‌و کـەس‌و کارو منداڵەکانیـان زەرەرمەند بوونـە، ئاگاداربن لە ڕۆژیـی دوایی دا ئەوە زەرەرو زیانێکـی ڕوون‌و ئاشـکرایە).

خـوا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَا كَانُواْ مُهۡتَدِينَ ﴾ دڵنیاییـە بـۆ گومڕاییەکەیـان، ئـەوان هیچ ڕێنماییەکیـان بـە دەسـت نەهێنـا، ئەمـە وەسـف‌و پیاهەڵدانە ناشـیرنەکانیانە. پاشـان باسـی وێنەیانـی کـردو ئاشـکرایانی کـرد بـە ئەوپەڕی ئاشـکرا کـردن، جـا فەرموویەتی:

مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ ٱلَّذِى ٱسْتَوْقَدَ نَارًا فَلَمَّآ أَضَآءَتْ مَا حَوْلَهُۥ
ذَهَبَ ٱللَّهُ بِنُورِهِمْ وَتَرَكَهُمْ فِى ظُلُمَٰتٍ لَّا يُبْصِرُونَ ﴿١٧﴾ صُمٌّۢ
بُكْمٌ عُمْىٌ فَهُمْ لَا يَرْجِعُونَ ﴿١٨﴾ أَوْ كَصَيِّبٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فِيهِ
ظُلُمَٰتٌ وَرَعْدٌ وَبَرْقٌ يَجْعَلُونَ أَصَٰبِعَهُمْ فِىٓ ءَاذَانِهِم مِّنَ
ٱلصَّوَٰعِقِ حَذَرَ ٱلْمَوْتِ ۚ وَٱللَّهُ مُحِيطٌۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٩﴾ يَكَادُ ٱلْبَرْقُ
يَخْطَفُ أَبْصَٰرَهُمْ ۖ كُلَّمَآ أَضَآءَ لَهُم مَّشَوْا۟ فِيهِ وَإِذَآ أَظْلَمَ عَلَيْهِمْ
قَامُوا۟ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَذَهَبَ بِسَمْعِهِمْ وَأَبْصَٰرِهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ
كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٠﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعْبُدُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى
خَلَقَكُمْ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٢١﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ
ٱلْأَرْضَ فِرَٰشًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ
بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْ ۖ فَلَا تَجْعَلُوا۟ لِلَّهِ أَندَادًا وَأَنتُمْ
تَعْلَمُونَ ﴿٢٢﴾ وَإِن كُنتُمْ فِى رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا۟
بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِۦ وَٱدْعُوا۟ شُهَدَآءَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن
كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا۟ وَلَن تَفْعَلُوا۟ فَٱتَّقُوا۟ ٱلنَّارَ
ٱلَّتِى وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ ۖ أُعِدَّتْ لِلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٤﴾

(١٧-٢٠): ﴿ مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ ٱلَّذِى ٱسْتَوْقَدَ نَارًا فَلَمَّآ أَضَآءَتْ مَا حَوْلَهُۥ ذَهَبَ ٱللَّهُ بِنُورِهِمْ وَتَرَكَهُمْ فِى ظُلُمَٰتٍ لَّا يُبْصِرُونَ ﴿١٧﴾ صُمٌّۢ بُكْمٌ عُمْىٌ فَهُمْ لَا يَرْجِعُونَ ﴿١٨﴾ أَوْ كَصَيِّبٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فِيهِ ظُلُمَٰتٌ وَرَعْدٌ وَبَرْقٌ يَجْعَلُونَ أَصَٰبِعَهُمْ فِىٓ ءَاذَانِهِم مِّنَ ٱلصَّوَٰعِقِ حَذَرَ ٱلْمَوْتِ ۚ وَٱللَّهُ مُحِيطٌۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٩﴾ يَكَادُ ٱلْبَرْقُ يَخْطَفُ أَبْصَٰرَهُمْ ۖ كُلَّمَآ أَضَآءَ لَهُم مَّشَوْا۟ فِيهِ وَإِذَآ أَظْلَمَ عَلَيْهِمْ قَامُوا۟ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَذَهَبَ بِسَمْعِهِمْ وَأَبْصَٰرِهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٠﴾ ﴾:

﴿ مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ ٱلَّذِى ٱسْتَوْقَدَ نَارًا فَلَمَّآ أَضَآءَتْ مَا حَوْلَهُۥ ذَهَبَ ٱللَّهُ بِنُورِهِمْ وَتَرَكَهُمْ فِى ظُلُمَٰتٍ لَّا يُبْصِرُونَ ﴾ واتـە: وێنەی پڕواو پـڕی دوڕووەکان کـە لەسـەری دەڕۆن، وەک ئەو کەسـە وایە ئاگرێکی هەڵگیرسـاندبێ، لە تاریکیەکـی زۆردابـێو پێویسـتی زۆری بە ئاگر هەبـێ، وەری بگرێ لە غەیـری خۆی، ئەو کەسـە هیـچ کەلوپەلێکـی لـەلا نەبێ، بەڵکـو ئاگرەکـە لێـی دوور بێت، هەر کـە ئاگرەکە هەڵگیرسـاو دەورووبـەری ڕوونـاک کـردەوە، ئەویـش تەماشـای دەورووبـەری خـۆی کـرد کـە ڕووناکـی تیادایـە، گومانی بـرد کە ئەو توانـای هەیـەو زاڵە بەسـەر ئاگرەکەداو سـوودی لێوەردەگـرێ، وە دڵـی زۆر پێـی خـۆش بـوو، لـە کاتێکدا ئـەو بەو شـێوەیە بوو، خـوا ﷻ ڕووناکیەکـەی بـردو کوژاندیـەوەو ڕوناکیەکـەی نەما، ئنجـا لە ناو تاریکسـتانی مەزنـدا مایـەوەو وێـڵ بـوو، بۆیـە لە نـاو چەنـد تاریکسـتانیەکدا مایـەوە: تاریکایی شـەو، تاریکایـی هـەورەکان، تاریکایـی بـاران، وە ئـەو تاریکاییـەی بـە دەسـتی هێنـاوە لە پاش ڕووناکیەکـە، جـا دەبـێ چـۆن بێـت حاڵـی ئـەو وەسـفکراوە؟ بـە هەمان شـێوە ئـەو دوو ڕووانـەش، ڕووناکـی ئیمانیـان لـە بڕوادارانـەوە وەرگـرت، نەبـووە سـیفەتیش بۆیـان، جا سـوودیان لێوەرگـرت، بـە هـۆی ئـەوەوە خوێـنو مـاڵو منداڵیـان پارێـزراوە، وە جۆرێ لـە ئەمـنو ئاسایشـیان لـە دونیـادا بەدەسـت هێنا، لـە کاتێکدا ئـەوان بـەو شـێوەیە بوون،

مـردن هێرشـی كـردە سـەریان، دایڕنیـن لە سـوود وەرگرتـن لـەو ڕووناكیە، وە تووشـی خـەمو پەژارەو سـزا بـوون، وە چەندیـن تاریكیان بۆ بەدەسـت هـات: تاریكایی نـاو گۆڕ، تاریكایـی بێبڕوایـی، تاریكـی دووڕوویـی، تاریكی تـاوانو گونـاه بە هەمـوو جۆرەكانی، وە لـە پـاش ئـەوە تاریكـی نـاو دۆزەخ كـە خراپترین جێگایـە، لەبـەر ئەمەیە خـوای بەرز فەرموویەتـی: ﴿ صُمٌّ ﴾ واتـە: لـە بیسـتنی خێرو چاكە كـەڕن، ﴿ بُكْمٌ ﴾ واتە: لە قسـەی چاكەكـردن لاڵـن، ﴿ عُمْىٌ ﴾ واتـە: لە بینینی هەقو ڕاسـتی كوێـرن ﴿ فَهُمْ لَا يَرْجِعُونَ ﴾ چونكـە ئـەوان وازیـان لە هـەقو ڕاسـتی هێنا پـاش ئـەوەی كـە ناسـیبوویان، ناگەڕێنەوە بـۆ لای بـە پێچەوانەی ئـەو كەسـەی وازی لە هـەق هێناوە بە هـۆی نەفامـیو گومڕاییەوە، بەڕاسـتی ئەو كەسـە عاقڵ نابێـت، وە ئەوە نزیكترە لـەوەی بگەڕێتەوە بۆ نـاو دووڕووەكان.
پاشـان خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ أَوْ كَصَيِّبٍ مِّنَ السَّمَاءِ ﴾ یانـی: یاخـود وێنەیـان وەكـو بارانێكـی بەخـووڕ وایـە، كـە لـە ئاسـمانەوە زۆر بـە خێرا بێتـە خـوارێ، ﴿ فِيهِ ظُلُمَاتٌ ﴾ تاریكـی شـەو، وە تاریكـی هـەورو تاریكی بارانـی تێدابـێ ﴿ وَرَعْدٌ ﴾ بریتیە لـەو هەورە تریشـقەی كـە لـە نـاو هەورەكانـەوە دەبیسـترێ، ﴿ وَبَرْقٌ ﴾ بریتیـە لـەو ڕووناكییـە برووسـكەدارەی لەگـەڵ هەوردایـە.
﴿ كُلَّمَا أَضَاءَ لَهُم ﴾ (هـەر كاتێـك بـۆی ڕوونـاك كردبانـەوە) ئـەو هەورە بروسـكەی كـە لـە نـاو تاریكاییەكانـدا دەردەچـێ، ﴿ مَّشَوْا فِيهِ وَإِذَا أَظْلَمَ عَلَيْهِمْ قَامُوا ﴾ واتـە: دەوەسـتان، جـا حاڵـی دووڕووەكانیش بەم شـێوەیەیە، كاتـێ گوێیان لە قورئـانو فەرمانو قەدەغەكراوەكانـیو پەیمـانو هەڕەشـەكانی دەبـێ، بـە جـۆرێ پەنجەكانیـان دەكـەن بەنـاو گوێیانـدا، پشـت لـە فەرمـانو قەدەغەكـردنو پەیمـانو هەڕەشـەكەیان دەكەن، جا هەڕەشـەكەی دەیانترسـێنێ، وە پەیمانەكـەی بێتاقەتیـان دەكات، ئـەوان تـا بتوانـن پشـتی تێدەكـەنو حەزیـان لێـی نیـە وەكـو ئەو كەسـەی بارانە بـە لێزمەكـەی بەسـەردا دەبارێو گوێـی لـە هـەورە بروسـكە دەبـێو پەنجەكانـی دەخاتە نـاو گوێیەوە لە ترسـی مردنـدا، ئا ئەمـە سـەلامەتیان بـۆ دەسـتەبەر دەكات، بـەڵام دووڕووەكان سـەلامەتیان بۆنیـە، بێگومان خـوای بـەرز دەوری داون بـە تواناو زانسـتی، لە دەسـتی دەرناچـنو ڕزگاریان نابـێ، بەڵكو كردەوەكانیـان بـۆ تۆمـار دەكات، وە پاداشـتیان دەداتـەوە لەسـەری بە چاكترین پاداشـت.
وە كاتـێ كـە تووشـی بـەلا بوون بـە كـەڕیو لاڵـیو كوێـری مەعنەویـی، وە ڕێگاكانی بڕوایـان لەسـەر داخـرا، خـوای بـەرز فەرموویەتـی: ﴿ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَذَهَبَ بِسَمْعِهِمْ

﴿ وَأَبْصَـٰرِهِمْ ﴾ واتــە: هەســتەوەرەکان، ئەمە ئاگادار کردنەوەو ترســاندنیانی تێدایە بە ســزای دونیایــی، بــۆ ئەوەی ئاگــادار بــن‌و دابچەڵەکێن، لــە هەندێ لــە خراپــەکاری‌و دووروویــیان.
﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴾ هیــچ شــتێک خوا دەستەوسـان ناکات، لە تواناو دەســەڵاتی ئەگــەر هەر شــتێکی بوێ دەیکات بەبــێ هیچ ڕێگری‌و بەربەســتێک، لەم دەقەو هاوشــێوەی ئــەم دەقــە، بەرپەرچدانــەوەی قەدەریەکانــە، ئەوانەی کــە دەڵێــن کردەوەکانیــان ناچێتە ناو قــودرەت‌و توانــای خــواوە، چونکە کردەوەکانیــان لە کۆی ئەو شــتانەیە کە لەنــاو ئەم دەقە پیرۆزەدا جێیان دەبێتــەوە: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴾.
(٢١-٢٢): ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعْبُدُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٢١﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ فِرَٰشًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْ ۖ فَلَا تَجْعَلُوا۟ لِلَّهِ أَندَادًا وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾:
﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعْبُدُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٢١﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ فِرَٰشًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً ﴾ ئەمــە فەرمانێکــی گشــتیە بــۆ هەمــوو خەڵکــی بــە فەرمانێکــی گشــتی ئەویــش: بریتیــە لــە عیبادەتــی کۆکــەرەوە بــۆ جێبەجــێ کردنــی فەرمانەکانــی خــواو دوورکەوتنــەوە لە قەدەغەکراوەکانی، وە بە ڕاســت دانانــی هەواڵەکەی، کــە خــوا فەرمانی پێــیان کــردوە، وە لــە پێناویدا بە دیهێنــاون، وەک خــوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾الذاریـات، (واتــە: جنۆکــەو مرۆڤــم بە دی نەهێنــاون مەگەر بــۆ پەرســتش کردنم).
لــە پاشــان بەڵگەی هێناوەتەوە لەســەر پێویســت بوونــی بەندایەتی بــە تاک‌و تەنهــا، بەوەی پەروەردگارتانــە کــە پــەروەردەی کردوون بــە جۆرەها نــازو نیعمەت بە دیهێنــاون، لە پاش نەبوونەوە.
وە پێش ئێوەیشــی دروســت کردوە بە نازو نیعمەتی ئاشــکراو نهێنی‌و دایباراندوە بەســەرتاندا، جــا زەوی بــۆ ڕاخســتوون‌و لەســەری ئۆقــرە دەگرن، ســوودو کەڵکــی لێوەردەگــرن وەک مــاڵ‌و کشــت‌و کاڵ‌و کێــڵان، وە جگە لــەوەش جۆرەها ســوودو کەڵکی دیکە، ئاسمانیشــی کردۆتــە بینــاو ســەقفێک بــۆ حەســانەوەتان، وە ســوودو قازانجێکــی زۆری تێــدا داناوە کە تیایاندایــە لــە پێویســتیەکانی ئێوە وەکــو خۆرو مانگ‌و ئەســتێرەکان.
﴿ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً ﴾ ئاســمان: بریتیــە لــە هەرشــتێ کــە بــە ســەرووی تــۆوە بێــت، بــەڵام توێژەرەوانــی قورئــان فەرموویانــە: مەبەســت لە ئاســمان لێــرەدا هەورە، کــە خوا ﷻ

ئـاوی لـێ دابەزانـدووە ﴿فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ﴾ وەکـو دانەوێڵـەو بەرووبوومـەکان، لـە خورمـاو میوەجـاتو کشـتووکاڵ، وە جگە لەوانیـش ﴿رِزْقًا لَّكُمْ﴾ واتـە: ڕزقو ڕۆزیتان بـۆ بەدەسـت دێ، بژێوی ژیانی پـێ دابین دەکـەن، وە پێیەوە دەژینو لەزەتـی لێوەردەگرن ﴿فَلَا تَجْعَلُوا۟ لِلَّهِ أَندَادًا﴾ کەواتـە: هاوتـا بۆ خوا ﷻ پەیـدا مەکەن لـە بەدیهێنراوەکان کـە بیانپەرسـتن هەروەکـو چـۆن خـوا ﷻ دەپەرسـتن، وە خۆشـتان بوێـن هەروەکو چۆن خواتـان خۆشـدەوێت، ئـەوان وەک ئێـوە بەدیهێنـراون ڕزقو ڕۆزی پێـدراونو کاریان بۆ بەڕێوەدەبرێـت، هیچیـان لـە دەسـتدا نیـە، تەنانـەت بـە قـەد مسـقاڵە زەڕەیـەک، وە هیـچ سـوودو زیانێکیـان بۆتـان نیـە ﴿وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ (واتە: ئێـوەش دەزانن) کـە بێگومان خـوا هاوبـەشو هاوتای نیـە، لـە دروسـتکردنو ڕزقو ڕۆزیو بەڕێوەبردنـدا، وە بە هەمان شـێوە لـە پەرستنیشـدا، جـا چـۆن ئێـوە لەگـەڵ خـوا پەرسـتراوێکی دیکـە دەپەرسـتن، لەگـەڵ ئـەوەدا دەزانن کـە بەتـاڵو پووچە؟ بەڕاسـتی ئەمە لـە سەرسـووڕهێنەرترینی هەرە سەرسـووڕهێنەرەکانەو لـەو پـەڕی گێلـیو گەمژایەتیە.

ئـەم دەقـە پیرۆزە کـۆی کردۆتـەوە لە نێـوان فەرمانکـردن بـە بەندایەتی کردن بـە خوای تـاکو تەنهـاو، قەدەغەکردنی بەندایەتی بۆ غەیـری ئەو، وە ڕوونکەرەوەی بەڵگەی ئاشـکرا لەسـەر پێویسـتی پەرسـتنی بەندایەتـی کردنـیو پووچەڵـی بەندایەتی جگە لە خـوا، ئەویش لە باسـکردنی یەکتاپەرسـتی پەروەردگاریـە، کە تـاکو تەنهایی خوا لـە بەدیهێنانو ڕزقو ڕۆزیو بەڕێوەبردنـی لـە خـۆوە گرتـووە، جا ئەگەر هـەر یەکە دان بەوە دابنـێ کە خوا ﷻ لـەوەدا هاوەڵـی نیـە، بە هەمان شـێوە دەبێ دان بەوەشـدا بنێ کە شـەریکو هاوبەشـی نیە لە عیبـادەت کردنـدا، ئەمـەش لـە ڕوونترینی بەڵگـە عەقڵیەکانە لەسـەر تـاکو تەنهایی خوای بەرز، وە بـە تاڵیو نارەوایـی هاوەڵدانان.

وتـەی خـوا ﷻ: ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ دەگونجـێ ماناکـەی ئـەوە بـێ: کـە ئەگـەر ئێـوە بەندایەتـی خـوای تاکو تەنها بکـەنو بەو شـێوەیە خۆتـان بپارێزن لە تووڕەییو خەشـمو قیـنو سـزای ئـەو، ئـەوە ئێـوە هـۆکاری پێویسـتتان گرتۆتـە بـەر بـۆ ئـەو مەبەسـتە، وە دەگونجـێ ماناکـەی ئـەوە بـێ ئێـوە ئەگـەر بەندایەتی خـوا بکەن ئـەوە دەبن بـە یەکێک لـە پارێـزکارانو لـە خواترسـان، (ئەوانـەی کە وەسـف کراون بـە تەقواو لە خوا ترسـان)، وە هـەردوو ماناکە ڕاسـتو دروسـتەو بەسـتراون بە یەکترەوە، هەر کەسـێک بـە تەواوەتی خواپەرسـتی کردبـێ ئـەوە لـە خواناسـانو خۆپارێزانـە، وە هەر کەسـێ لە خۆپارێـزان بێ،

ڕزگاربوونـی بـۆ دەسـتەبەر دەبـێ لـە سـزای خـواو خەشـمو قیـنو تووڕەیی ئەو، پاشـان خـوای بـەرز فەرموویەتی:

(٢٣-٢٤): ﴿ وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا وَلَن تَفْعَلُوا فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ ۖ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ ﴿٢٤﴾ ﴾:

ئەمـە بەڵگـەی ژیـری (عەقڵ)یە لەسـەر ڕاسـتو دروسـتی پێغەمبـەری خوا ﷺ و، ڕاسـتی ئـەو پەیامـەی کـە هێناویەتـی، جـا فەرموویەتـی: ﴿ وَإِن كُنتُمْ ﴾ ئەی گەلـی عینادو کەللـە ڕەقـان دژ بـە پێغەمبەر ﷺ، ئـەی ئەوانەی بانگەوازەکـەی ڕەت دەکەنـەوەو وادەزانن درۆ دەکات، هـەردەم ئێـوە لـە گومـانو دوودڵیـدان، لـەوەی کە دامـان بەزاندووە بۆ سـەر بەندەکەمـان، ئایـا ئـەو هەقـە، یان جگـە لەو؟ ئـا ئەمە لێـرەدا کارێکـی دوولەتکـەرە، کە جیـاکاری لـە نێـوان ئێوەو ئـەوی تێدایـە، ئەویش ئەوەیـە کە پێغەمبـەر وەکو ئێـوە مرۆڤە، لـە ئێـوە زمانپـاراو تـرو خوێنەوارتـر نیـە، ئێـوە باش دەیناسـن، لـەو کاتـەوە لـە نێوانتانا بووەو پێگەیشـتوە، نـە دەنووسـێو نەدەخوێنێتەوە، کتێبێکـی بۆ هێنـاون، فەرموویەتی: ئەوە لـە لایـەن خواوەیە، ئێـوە وتتان: ئـەو قورئانـە قسـەی خۆیەتـیو بوختانێکە هەڵیبەسـتووە، جـا ئەگـەر ئـەوەی ئێـوە دەیڵێن وایـە، ئەوە سـوورەتێک لـە وێنەی ئـەو قورئانـە بهێننەوە، وە هـەر کەسـێک خۆتـان حەزتان پێیەتی لە دۆسـتو پشـتیوانەکانتان پشـتی پێ ببەسـتن، بێگومـان ئەمـە کارێکـی ئاسـانە بـۆ ئێوە، بـە تایبەتی ئێـوە کە خاوەنـی ڕەوانبێـژیو زمان پاراویـیو وتـارن، وە دوژمنێکـی سەرسـەختی پێغەمبـەرن ﷺ، جـا ئەگـەر سـوورەتێکتان هێنـا لـە وێنـەی ئـەو قورئانە، ئەوە قسـەکەتان ڕاسـتە وەک ئەوەی کـە دەیڵێـن، وە ئەگەر نەتانتوانـی سـوورەتێک هـاو وێنـەی بهێننـەوە، و بێتوانـا بـوون بە ئەوپـەڕی بێتوانـا بوون، کـە بێگومـان هەرگیـز ناتوانن، بـەڵام ئـەم هەڵسـەنگاندنە هەڵسـەنگاندنێکی بـە ویژدانانەو دادپەروەرانەیە.

ئـا ئەمـە ئایـەتو نیشـانەیەکی گەورەیـەو بەڵگەیەکـی ڕوونو ئاشـکرایە، لەسـەر ڕاسـتی پێغەمبـەرو ڕاسـتی ئـەو پەیامـەی هێناویەتـی، بۆیـە پێویسـتە لەسـەرتان شـوێنی بکـەون، خۆتـان بپارێـزن لەو ئاگرەی کـە لە گەرماییـدا زۆر توونـدو بەتینەو گەیشـتۆتە ئەوپەڕی، سـوتەمەنیەکەی مـرۆڤو بـەردە، وەکـو ئاگـری دونیـا نیـە، ئامادە کـراوە بـۆ بێبڕوایـان، ئەوانـەی کوفـر بە خـواو پێغەمبەرەکـەی دەکەن، کەوابـوو خۆتان بپارێزن لـە کوفر کردن

بـە پێغەمبەرەکـەی، پـاش ئـەوەی بۆتان دەرکـەوت ئـەو پێغەمبـەری خوایە.
ئـەم دەقـەو وێنـەی ئەم دەقـە ناو دەبـرێ بـە بەڵگـەی بەربەرەکانـێ (التحدی): کـە بریتیە لـە دەستەوسـانی بەدیهێنـراوەکان، لە هێنانـەوەی وێنەی ئـەم قورئانە، خـوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ قُل لَّئِنِ ٱجۡتَمَعَتِ ٱلۡإِنسُ وَٱلۡجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأۡتُواْ بِمِثۡلِ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ لَا يَأۡتُونَ بِمِثۡلِهِۦ وَلَوۡ كَانَ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٖ ظَهِيرٗا ﴿٨٨﴾ ﴾الإسراء (واتـە: پێیـان بڵـێ: ئەگەر جنۆکـەو مرۆڤەکان کۆببنـەوە لەسـەر ئـەوەی وێنـەی ئـەو قورئانە بێنـن، ناتوانـن وێنەکـەی بێنـن، هەرچەندە هەندێکیـان ببنە پاڵپشـت بـۆ هەندێکـی دیکەیان).
جـا چـۆن بەدیهێنراوێک کـە لە گڵ دروسـتکراوە، قسـەکانی وەک قسـەی پەروەردگاری پـەروەردکاران بـێ، یـان چـۆن بـێ توانایەکـی هـەژار لـە هەمـوو ڕووەکانـەوە دەتوانێ قسـەیەک بێنـێ وەک قسـەی خـوای پەروەردگـار بـێ، کـە خاوەنـی تـەواوی ڕەهـاو دەوڵەمەنـدی فراوانـە لـە هەمـوو ڕووەکان؟ ئەوە لـە توانای مرۆڤـدا نیە، هەر کەسـێک کە شـارەزایی‌و زەوقـی هەبـێ لـە جۆرەکانی قسـە کردن (الـکلام)، ئەگـەر ئەم قورئانـە مەزنە بـەراوردی جگـە لـە خۆی بـکات لـە قسـەی ڕەوانبێژان، ئـەوە جیـاوازی تـەواو گەورەی بـۆ دەردەکـەون، وە کـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ ﴾تا کۆتایـی دەقەکە، بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی، ئەو کەسـەی ئومێـدی هیدایەتی لێدەکـرێ لە گومڕایـی، بریتیە لە گومانکارێکـی سـەرگەردان، کـە هەق‌و ڕاسـتی لـە گومڕایـی جیاناکاتەوە، جا ئەم کەسـە ئەگـەر هـەق‌و ڕاسـتی بـۆ دەربکـەوێ، ئـەوە شـایەنی ئەوەیـە سـەرکەوتوو ببـێ، ئەگـەر ڕاسـتگۆ بێت لـە گەڕان بـە دوای ڕاسـتیدا.
بەڵام کەسـی عینادو سـەرکەش، کە هەق دەناسـێ‌و وازی لێدێنێ، ئەمـە ئومێدی گەڕانەوەی لێناکـرێ، چونکـە وازی لـە هـەق هێنـاوە پـاش ئەوەی بـۆی دەرکەوتـووە، لەبـەر نەفامی وازی لێنەهێنـاوە، هیـچ بـرو بیانوو پاسـاوێکی بۆ نیە.
هەروەهـا کەسـی دوو دڵو گومانـاوی ئەوەی کە ڕاسـتگۆ نیە لـە گەڕان بە دوای ڕاسـتیدا، بەڵکـو ئـەو پشـت تێکـەرەو کۆشـش کارنیـە لـە خواسـتن‌و لـە شـوێنکەوتنیدا، زۆر جار ئەمانـە خـوا تەوفیقیـان ناداو سـەرکەوتوو نابن، وە لە وەسـفی پێغەمبەریش ﷺ بـە بەندایەتی کـردن (العبودیـة) لـەو شـوێنە بـەرزو مەزنـەدا، بەڵگەیە لەسـەر ئـەوەی کـە گەورەترینی وەسـفەکانی پێغەمبـەر ﷺ هەڵسـانیەتی بـە بەندایەتـی کردنـی، کـە هیـچ کەسـێک لـە یەکەمینـەکان‌و دوایینـەکان پێـی ناگـەن لـە بەندایەتـی کردنـدا، هەروەکـو چۆن وەسـفی

کـردوە بـە بەندایەتی، لە پلـەو پایـەی شـەوڕۆیدا (الإسراء)، وەک فەرموویەتی: ﴿ سُبۡحَـٰنَ ٱلَّذِیٓ أَسۡرَىٰ بِعَبۡدِهِۦ ﴿١﴾ ﴾، (واتـە: پاکـیو بێگـەردی بـۆ ئـەو خوایـەی شـەوڕۆیی بـە بەندەکـەی خـۆی کرد)، وە لە پلـەو پایـەی دابەزیندا کە فەرموویەتـی: ﴿ تَبَارَكَ ٱلَّذِی نَزَّلَ ٱلۡفُرۡقَانَ عَلَىٰ عَبۡدِهِۦ ﴿١﴾ ﴾الفرقـان. (واتـە: گەورەیـیو مەزنایەتی بۆ ئـەوەی جیاکەرەوە «ی هـەقو ناهـەق کـە قورئـان»ە دایبەزانـدووە بۆ سـەر بەندەکـەی خۆی).

وە لـە وتـەی خـوا ﷻ: ﴿ أُعِدَّتۡ لِلۡكَـٰفِرِینَ ﴾ وە نموونـەی ئـەوەش لـە ئایەتەکانـدا بەڵگەیە بـۆ ڕێـڕەوەی ئەهلی سـوننەو جەماعە، کە بـە دڵنیایی بەهەشـتو دۆزەخ دروسـتکراون، بە پێچەوانـەی موعتەزیلـەکان، هەروەهـا بەڵگـەی تێدایـە، کە بەڕاسـتی یەکتاپەرسـتان ئەگەر هەندێـک لە گوناهـە مەزنەکانیش ئەنجام بدەن بـۆ هەتا هەتایی لە ئاگـری دۆزەخ نامێننەوە، چونکـە خـوا فەرموویەتـی: ﴿ أُعِدَّتۡ لِلۡكَـٰفِرِینَ ﴾ جا ئەگـەر گوناهکارانی یەکتاپەرسـت بە هەمیشـەیی لـە نـاو ئاگـردا بمێننـەوە، ئـەوە تەنها بـۆ بێبڕوایان سـازو ئامـادە نەکـراوە، بە پێچەوانـەی خەواریـجو موعتەزیلە.

وە هەروەهـا بەڵگەی تێدایە بە ڕاسـتی سـزا شایسـتەیە بـە هۆکارەکانیـەوە، ئەویش کوفرە، وە جۆرەهـا سـەرپێچیو تاوانکردنە بـە جیاوازیانەوە.


وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ
تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنْهَا مِن ثَمَرَةٍ
رِّزْقًا قَالُواْ هَٰذَا ٱلَّذِي رُزِقْنَا مِن قَبْلُ وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهًا
وَلَهُمْ فِيهَآ أَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ وَهُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٥﴾ إِنَّ
ٱللَّهَ لَا يَسْتَحْيِۦٓ أَن يَضْرِبَ مَثَلًا مَّا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا فَأَمَّا
ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ وَأَمَّا
ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَيَقُولُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًا
يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرًا وَيَهْدِي بِهِۦ كَثِيرًا وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ
إِلَّا ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٦﴾ ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ
مِيثَٰقِهِۦ وَيَقْطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفْسِدُونَ
فِي ٱلْأَرْضِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٢٧﴾ كَيْفَ
تَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَٰتًا فَأَحْيَٰكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ
ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٨﴾ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ
لَكُم مَّا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ
فَسَوَّىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٩﴾

(٢٥): ﴿ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنْهَا مِن ثَمَرَةٍ رِّزْقًا قَالُواْ هَٰذَا ٱلَّذِي رُزِقْنَا مِن قَبْلُ وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهًا وَلَهُمْ فِيهَآ أَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ وَهُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٥﴾ ﴾:

کاتێ کە باسی پاداشتی بێبڕوایانی کرد، ئنجا باسی پاداشتی بڕوادارانی کرد، ئەوانەی خاوەن کردەوە چاکەکانن، لەسەر نەخشە ڕێگای خوا ﷻ لە قورئاندا، هاندانو ترساندنی پێکەوە کۆ کردوەتەوە، بۆ ئەوەی بەندە بترسێو بە ئومێد بێت، جا فەرموویەتی: ﴿ وَبَشِّرِ ﴾ (واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ، وە ئەو کەسەیشی لە جێگای ئەو بانگەواز دەکات ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ لە ناخی دڵەکانیانەوە، ﴿ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾ (واتە: کارو کردەوەی چاکەیان کردوە)، بە ئەندامەکانی جەستەیان، ئیمانی خۆیانیان سەلماندوە بە کردەوەی چاک.

وە وەسفی کارە چاکەکانیانی کردوە بە (الصالحات)، چونکە بە کاری چاک بارودۆخی بەندە چاک دەبێ، وە کاروبارەکانی دینو دونیای، هەر بەم هۆیەوە خراپی بارودۆخیان دەڕواتو نامێنێ، جا مرۆڤ بەمە دەبێتە یەکێک لە چاکەکاران، ئەوانەی کە شایستەن لە دراوسێیەتی خوای میهرەبان بن لە بەهەشتەکەیدا.

موژدەیان پێ بدە ﴿ أَنَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ ﴾ واتە: باغو باخاتێکی کۆکەرەوە لە داروو درەختی سەرسوڕهێنەرو بەرهەمی جوانو سێبەری درێژو لقو پۆی بەرز، بەوەوە بووتە بەهەشتێک ناوەوەی بە باخو باخات پاراستووە، ئەوەی تیایدا نیشتەجێیە نازو نیعمەت وەردەگرێت.

﴿ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ﴾ واتە: ڕووباری ئاوو، شیرو هەنگوینو شەرابو ئەرەق، شانازی پێوە دەکەن چۆن بیانەوێت، بۆ هەر جێگایەک بیانەوێت بەکاری دێنن، ئەو داروو درەختانە ئاوی لێ دەخۆنەوە، جۆرەها بەروبووم بە بەرهەمی ڕەنگاو ڕەنگ پێشکەش دەکات.

﴿ كُلَّمَا رُزِقُوا مِنْهَا مِن ثَمَرَةٍ رِّزْقًا قَالُوا هَٰذَا الَّذِي رُزِقْنَا مِن قَبْلُ ﴾ (هەرکاتێ لەوێ خواردەمەنیەکیان پێبدرێ لە میوەجات، دەڵێن: ئەمە ئەوەیە کە لەمەو پێش پێماندرا). واتە: ئەمە لەو ڕەگەزەیەو لەسەر ئەو وەسفەیە، هەموویان لە یەکتر دەچن لە جوانیو لەزەتدا، هیچ بەرهەمێکی تایبەتی تیادا نیە، وە هیچ کاتێکی بەتاڵیان نیە لە چێژ وەرگرتن، ئەوان بەردەوام چێژ وەردەگرن بە خواردنی.

وە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأُتُوا بِهِ مُتَشَابِهًا ﴾ وتراوە: لە ناودا لە یەک دەچن، جیاوازن لە تامو چێژدا، وە وتراوە: لە یەک دەچن لە ڕەنگدا، لەناودا جیاوازن، وە وتراوە: هەندێکیان لە هەندێکی دیکە دەچن لە جوانیو لەزەتو خۆشیدا، دەگونجێ ئەمەیان ڕاستتر بێ، پاشان کاتێ باسی شوێنی نیشتەجێ بوونو بژێویو میوەجاتەکانیانی کرد، ئنجا باسی ژنەکانیانی کرد، وەسفی کردوون بە تەواوترین وەسف، زۆر بە کورتی ڕوونی کردوەتەوە، فەرموویەتی:

﴿ وَلَهُمْ فِيهَا أَزْوَاجٌ مُّطَهَّرَةٌ ﴾ (واتە: لەو بەهەشتانەدا بۆ ئەوان ژنانی پاکیزە هەیە) نەیفەرمووە: پاکیزەن لە فلان عەیب. لەبەر ئەوەی هەموو جۆرەکانی پاکیزەیی بگرێتەوە، ئەوان ڕەوشتیان زۆر بەرزو پاکە، دروستکردنیان پاکە، زمانیان پاکە، چاوەکانیان پاکە، مێردەکانیان زۆر خۆش دەوێو لەلای مێردەکانیان خۆشەویستن، وە بە ئەدەبن لە قسەکردنو کردەوەدا، بەدیهێنانیان پاکە لە سوڕی مانگانەو خوێنی پاش منداڵبوونو مەنی (ئاو هاتنەوە)و میزو پیسی سەرئاوو بەلغەمو تفو بۆنی ناخۆش، بەهەمان شێوە پاکن بە جوانیەکی زۆر سەرنج ڕاکێشو تەواو کە پیاو شەیدا دەکەن، هیچ ناتەواویەکیان تێدا نیە، ڕەوشتیان ناشرین نیە، بەڵکو جوانو شۆخو شەنگن، جگە لە هاوسەرەکانیان چاو بۆ کەسی دیکە هەڵنابڕن، زمانیان پارێزراوە لە هەموو قسەیەکی ناشرین.

لەم دەقە پیرۆزەدا باس لە مژدەدەرو مژدە پێدراوو شوێنی مژدەدان دەکات، وە هۆکاری گەیەنەر بۆ ئەم مژدەیە، جا مژدەدەر: بریتیە لە پێغەمبەر ﷺ ئەو کەسەی لە جێگای بانگەواز دەکات لە ئوممەتەکەی، مژدەپێدراو: بریتیە لە بڕواداران، ئەوانەی کاری چاکە دەکەن، شوێنی مژدەدان: بریتیە لەو بەهەشتانەی کە وەسفکراون بەو وەسفە، وە هۆکاری پێویست بۆ ئەوە، بریتیە لە ئیمانو کردەوەی چاکە، هیچ ڕێگایەک نیە بۆ گەیشتن بە ئەم مژدەیە، تەنها بەو دووانە نەبێت، ئەمە گەورەترین مژدەیە بەدەستهاتووە لەسەر

دەستی باشترینی بەدیهێنراوەکان، بە چاکترین هۆکارەکان.
وە بەڵگەی تێدایە لەسەر ڕەوایەتی مژدەدانی بڕواداران، وە چالاک کردنیان لەسەر کردەوەکان، بە باس کردنی پاداشتو بەرهەمەکانی، بێگومان بەم مژدەیە ئەنجامدانی کاروو کردەوەکان ئاسانو سووک دەبن، گەورەترین مژدە بۆ مرۆڤەکان هاوکاریو یارمەتی خوایە بۆ ئیمانو کردەوەی چاک، ئەمە یەکەمین مژدەو بنەڕەت ترینیانە، لە دوای ئەوە مژدەی کاتی مردنە، وە لە پاش ئەوە گەیشتنی بەو نازو نیعمەتە بەردەوامو نەبڕاوەیەیە، داوا دەکەین لە خوای گەورە لەوانمان بگێڕێ.
(٢٦-٢٧): ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسْتَحْيِۦٓ أَن يَضْرِبَ مَثَلًا مَّا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا ۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ ۖ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَيَقُولُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَـٰذَا مَثَلًا ۘ يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرًا وَيَهْدِى بِهِۦ كَثِيرًا ۚ وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلْفَـٰسِقِينَ ﴿٢٦﴾ ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مِيثَـٰقِهِۦ وَيَقْطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَـٰسِرُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾:
خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسْتَحْيِۦٓ أَن يَضْرِبَ مَثَلًا مَّا ﴾ واتە: ئەمە چ نموونەیەکە ﴿ بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا ﴾ چونکە نموونەکان گشتگیرن لەسەر حیکمەتو دەرکەوتنی هەق، وە خوا ﷻ شەرم ناکات لە هەق، وەک بڵێی لەوەیدا وەڵامێک بێ بۆ ئەو کەسەی نکووڵی لە هێنانەوەی نموونە دەکاتەوە لە شتە بچووکو بێ نرخەکان، وە ڕەخنەیان لە خوا گرتبێ لەوەدا، کە شوێنی ڕەخنەگرتنی تێدا نیە، بەڵکو ئەوە لە فێر کردنی خوایە بۆ بەندەکانیو بەزەیی بوونیەتی پێیان، پێویستە وەربگیرێو سوپاسو ستایشی خوای لەسەر بکرێ، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ ﴾ لێی تێدەگەنو بیری لێ دەکەنەوە، ئەگەر وێنای هەقیان بە گشتگیری بۆ دەرکەوت، ئەوە زانستو بڕوایان پێی زیاد دەکات، وە ئەگەر وێنای هەقیان لا شاراوە بوو، ئەوە دەزانن خوا ﷻ هەر ئاوا بە هاوەنتە نموونەی نەهێناوەتەوە، بەڵکو بۆ حیکمەتێکی ڕاگەیەنراوو نیعمەتێکی تەواو باسی کردوە.
﴿ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَيَقُولُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَـٰذَا مَثَلًا ﴾ ڕەخنە دەگرنو سەرگەردان دەبن، کوفر لەسەر کوفرەکەیان زیاد دەکەن، هەروەکو بڕواداران بڕوا لەسەر بڕواکانیان زیاد دەکەن، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرًا وَيَهْدِى بِهِۦ كَثِيرًا ﴾ ئەمە حاڵی بڕواداranو بێبڕوایانە لە کاتی دابەزینی دەقەکانی قورئاندا.

خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿وَإِذَا مَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٞ فَمِنۡهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمۡ زَادَتۡهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنٗاۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَزَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنٗا وَهُمۡ يَسۡتَبۡشِرُونَ ١٢٤ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ فَزَادَتۡهُمۡ رِجۡسًا إِلَىٰ رِجۡسِهِمۡ وَمَاتُواْ وَهُمۡ كَٰفِرُونَ ١٢٥﴾التوبة: (واتـە: وە هەر کات سـووڕەتێک دابەزێنـرا لـەوان «دوو ڕووان» کەسـی وا هەیـە دەڵـێ: کامەتان ئەم سـووڕەتە ئیمانـی زیـاد کـردن؟ هەڵبەتـە ئەوانـەی بڕوایان هێنـاوە ئیمانی بۆ زیـاد کردن، لـە حاڵێکدا کـە دڵخـۆش بـوون . بەڵام ئەوانـەی دڵیان نەخۆشـیی نیفاقی تێدایە «ئەو سـووڕەتە» پیسـی زێـدەی خسـتە گـەڵ پیسـییەکەیان، وە بە بێبڕوایـی مردن).

هیـچ نیعمەتێـک مەزنتر نیـە بەسـەر بەندەکانەوە لـە نیعمەتـی دابەزاندنی دەقەکانـی قورئانی پیـرۆز، لەگـەڵ ئەوەشـدا بـۆ هەندێـک کـەس دەبێتـە بـەڵاو نارەحەتـیو سـەرگەردانیو گومڕایـیو زیـاد بوونی شـەڕ بەسـەر شـەڕەکانیانەوە، وە بـۆ خەڵکێکی تـر دەبێتە خەڵاتو بەزەیـیو زیـاد بوونـی چاکـە بەسـەر چاکەکانیانـەوە، پـاکو بێگـەردی بـۆ ئـەو خوایەی جیـاوازی خسـتوەتە نێـوان بەندەکانیـەوە، وە تـاکو تەنهایـە بـە هیدایـەتو گومڕایی.

پاشـان باسـی حیکمەتی خۆی کردوە لە گومڕاکەرانـی ئەوانەی گومڕای کـردوون، بێگومان ئـەوە دادپەروەریە لە لایەن ئـەوەوە، فەرموویەتـی: ﴿وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلۡفَٰسِقِينَ﴾ واتە: ئەوانـەی کـە لـە فەرمانـی خـوا ﷻ دەرچـوون، دوژمنانـی پێغەمبـەر ﷺ، ئەوانـەی تـاوانو گونـاە بـووە بـە وەسـفیان بـە هیـچ شـتێکی دیکـە نایگۆڕنـەوە، بۆیـە حیکمەتـی خوا ﷻ وایخواسـتووە کـە گومـڕا بن، چونکـە ئەوان شایسـتەی هیدایـەتو ڕێنمایی نیـن، هەروەکو چـۆن حیکمـەتو فەزڵـی خـوا ﷻ وایخواسـتووە، هیدایەتـی ئـەو کەسـە بدات کە وەسـف کـراوە بە ئیمـانو بڕواو خـۆی بە کارو کـردەوەکان ڕازاندۆتەوە، فاسـق بـوون دوو جۆرە: جۆرێکیـان خاوەنەکـەی لە دیـن دەر دەکات، ئەویش ئـەو تاوانەیە کە دەبێتـە مایەی ئەوەی خاوەنەکـەی لـە ئیمـان بباتـە دەرەوە، وەک ئـەوەی لـەم دەقـەو نموونـەی ئـەم دەقـە باس کـراوە، وە جۆرێکـی دیکەیـان خاوەنەکەی لە ئیمانو بـڕوا دەرناکاتـە دەرەوە، هەروەک لە وتـەی خوای بـەرزدا هاتـوە، فەرموویەتـی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ ٦﴾الحجرات، (واتـە: ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! ئەگـەر لـە فەرمـان دەرچوێک هەواڵێکـی بۆ هێنـان ڕوونی بکەنـەوەو لێـی بکۆڵنەوە).

پاشـان وەسـفی فاسـقو تاوانبارانی کردوە، فەرموویەتی: ﴿ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهۡدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مِيثَٰقِهِۦ﴾ ئەمـە گشـت ئـەو پەیمانانـە دەگرێتەوە کە لـە نێـوان ئـەوانو پەروەردگاریان

دایـە، وە ئـەوەی کـە لـە نێـوان ئـەوانو بەندەکاندایـە لەنـاو یەکتـردا، ئەوەی کـە جەختی کردۆتـەوە لەسـەریان، بـە بەڵێنـە قـورسو گرانـەکان، ئـەوان هەرگیز گـوێ بـەو بەڵێنو پەیمانانـە نـادەن، بەڵکو هەڵیان دەوەشـێننەوەو دەیان شـکێنن، وە واز لـە فەرمانەکانی دێننو قەدەغـە کـراوەکان ئەنجـام دەدەن، وە ئەو بەڵێـنو پەیمانانەی لـە نێوان خۆیـانو خەڵکیدایە نایبەنـە سـەرو هەڵیدەوەشـێننەوە ﴿ وَيَقۡطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾ ئـا ئەمـە زۆر شـت لەخـۆ دەگـرێ، بێگومـان خـوا فەرمانـی پێکردوویـن کـە پەیوەندیەکانـی نێوانـی خۆمـانو ئـەو بەهێـز بکەیـن، بـە بڕواهێنـان پێـی، وە بەجێهێنانـی بەندایەتـی کردنـی، وە نێوانـی ئێمـەو پێغەمبەرەکەی ﷺ بـە بڕواهێنان پێیو خۆشەویسـتنیو رێـز گرتنـی، وە جێبەجـێ کردنـی مافەکانی، وە لـە نێوان ئێمـەو دایکو بـاوکو هاوەڵو دۆسـتو نزیـکان، وە سـەرجەم بەدیهێنـراوەکان، بـە بەجێهێنانی سـەرجەم ئـەو مافانەی کە خـوا فەرمانـی پێکردوویـن بیگەیەنین.

وە بـڕواداران ئـەوەی خـوا فەرمانـی پـێ کـردوون گەیاندوویانـە، وە پێـی هەسـتاون بـە چاکترین شـێوە، بەڵام فاسـقو تاوانبـاران پچڕاندوویانەو پشـت گوێیان خسـتووە، بە تاوانو سـەرپێچیو پچڕاندنـی پەیوەندی خزمایەتـیو بڵاو کردنـەوەی خراپەکاریی لەسـەر زەویدا. ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ﴾ واتە: کەسـانێک ئەوە سـیفەتیان بێ ﴿ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴾ (واتە: زەرەرمەندن لە) دونیـاو دوارۆژ، زەرەرمەندی کورتکردۆتەوە تێیاندا، چونکە زەرەرمەندیەکەیان گشـتییەو لـە هەمـوو بارووددۆخێکـدا هیـچ جـۆرە قازانجێکیان بـۆ نیە، چونکـە هەمـوو کردەوەیەکی چـاک مەرجـە بـۆ ئیمـان، ئـەوەی بـڕوای نەبـێ کردەوەشـی بـۆ نیـە، ئـەو زەرەرمەندیو خەسـارەتە، بریتیە لە خەسـارەتی کوفـرو بێبڕوا بوون، بـەڵام ئەو زەرەرمەندیـەی کە هەندێ جـار دەبێتـە کوفـرو هەندێ جـار دەبێتە سـەرپێچی، هەندێ جـار کەمتەرخەمیە لـە وازهێنان لـە کاری پەسـندکراو، کـە لـە فەرمـوودەی خـوای بـەرزدا باسـکراوە: ﴿ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ ﴿٢﴾ ﴾ العصر، (واتـە: بەڕاسـتی مرۆڤـەکان لـە زەرەرمەندیـدان)، ئەمە گشـتگیرە بۆ هەمـوو بەدیهێنـراوان، تەنیـا ئەو کەسـە نەبێ کە وەسـفکراوە بـە ئیمانو کـردەوەی چاک، ئامۆژگـاریو ئارامگرتـن، وە حەقیقەتەکەیشـی لـە دەسـتدانی خێـرو چاکەیـە، کـە مرۆڤ دەتوانـێ بەدەسـتی بهێنـێو لەژێر دەسـتی خۆیاندایە.

(٢٨): ﴿ كَيۡفَ تَكۡفُرُونَ بِٱللَّهِ وَكُنتُمۡ أَمۡوَٰتٗا فَأَحۡيَٰكُمۡۖ ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ ثُمَّ يُحۡيِيكُمۡ ثُمَّ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾:

پاشـان فەرموویەتی: ﴿ كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَاتًا فَأَحْيَاكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾ ئەمـە پرسـیارو ئیسـتفهامە بـە مانـای سەرسـامیو سەرزەنشـتو نكوڵیكـردن دێ، واتـە: چـۆن بێبـاوەڕی دەكـەن بەرانبەر بەخوا كـە ئێوەی لە نەبوونـەوە بـە دیهێنـاوە، وە جۆرەها نازو نیعمەتی ڕشـتووە بەسـەرتاندا، پاشـان كـە تەمەنتان تـەواو دەبـێ دەتانمرێنـێ، پاداشـتان دەداتـەوە لە ناو گـۆڕدا، پاشـان دەتانژێنێتـەوە لە دوای زیندووبوونەوەتـان، ئنجـا دەگەڕێنـەوە لای ئەو، پاداشـتتان دەداتـەوە بە پاداشـتێكی تەواو؟! جـا مـادام ئێوە لـە ژێر هەڵسـوكەوتو بەڕێوەبـردنو چاكەی ئـەو دابن، وە لە ژێـر فەرمانە ئایینیەكانـی بـن، ئنجـا لـە دوای ئـەوە لە ژێـر (ئومێدو ترسـی) سـزاو (پاداشـتو تۆڵەیی) ئەوبـن، ئایـا لێتـان دەوەشـێتەوە پێـی كافر بـن، ئایە ئەمـە تەنهـا نەفامیەكی مـەزنو گێلیو گەمژەیـی نیـە، بەڵكـو ئـەوە شایسـتەیە بـە ئێـوە بـڕوای پـێ بهێنـنو خۆپارێـزی بكەنو سوپاسـگوزاری بن، لە سـزای بترسـنو ئومێدیشـتان بـە پاداشـتی هەبێ.

(٢٩): ﴿ هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ اسْتَوَىٰ إِلَى السَّمَاءِ فَسَوَّاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ ۚ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٩﴾ ﴾

﴿ هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ﴾ واتـە: بـۆ ئێـوە دروسـتی كـردوە، بـە چاكـەی خـۆی لەگەڵتانـداو بە بەزەیی هاتنـەوە پێتان، هەرچی لەسـەر زەوی دایـە، بۆ ئەوەیە ئێـوە سـوودو كەڵكـی لێوەربگـرنو بەهرەمەند بن لێـیو پەنـدی لێوەربگرن.

ئـەم دەقـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی بنـەڕەت لـە شـتەكاندا ڕێگـە پێدانـەو پاكیـە (الإباحة والطهـارة)، چونكـە لە سـیاقی منـەت كردنەوە هاتـوە، بەوە پیسـیەكان دەردەچـێ، بێگومان قەدەغەكردنـی لـە ناوەڕۆكی دەقەكە وەردەگیرێت، وە خوا ﷻ بۆ سـوودی ئێمـە بەدیهێناوە، ئـەوەی زیانـی هەیـە ئـەوە لـە دەرەوەی ئەوەیـە، وە لـە تـەواوی نیعمەتەكانـی، ڕێگـری لێكردوویـن لـە هەمـوو شـتە پیسـەكان، لەبـەر پـاكو خاوێنی بـۆ ئێمە.

خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ ثُمَّ اسْتَوَىٰ إِلَى السَّمَاءِ ﴾ (واتە: پاشـان ویسـتی ئاسـمان دروسـت بـكات)، وشـەی: ﴿ اسْتَوَىٰ ﴾ لـە قورئاندا بە سـێ مانـا هاتووە:

جارێـك بـە حەرفـی جـر (تعـدى) نـاكات، {واتـە: فیعلە كـە نابێتـە (متعـدي)[٣] بەڵكـو بە

---

٣) فیعلـی (متعـدي) ئـەو فیعلـە یـە مانـای بـە (فاعـل) تـەواو نابـێ بەڵكـو پێویسـتی بـە (مفعـول بـە) هەیـە بـۆ تەواوكردنـی ماناكـەی. نموونـە: (ضرب زیـدٌ عمـراً). وەرگێـڕ.

لازم[٤] دەمێنێتــەوە، لێرەدا وشــەی (إســتوی) (فعـل مـاضي لازم)ە. ماناكەی بەم شـێوە دەبێت: كەمـاڵو تـەواو}، وەكو چۆن خـوا ﷻ دەربارەی مووسـا ﷺ فەرموویەتی: ﴿ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَٱسْتَوَىٰٓ ﴿١٤﴾ ﴾ القصـص، (واتــە: لــەو كاتەی پێگەیشــتو تــەواو بوو).

جارێكیــش بە مانــای: بەرز بووەوە دێت (عــلا) و (ارتفع)، ئەویش كاتێــك بكرێتە (متعدي) بــە (علی) هەروەكو چــۆن لە وتەی خــوادا هاتــوە: ﴿ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ﴿٥٤﴾ ﴾ الأعراف، (واتــە: لــە پاشــان بــەرزو بڵنــد بــوو بەســەر بارەگاكــە)، وە دەفەرمــوێ: ﴿ لِتَسْتَوُۥا عَلَىٰ ظُهُورِهِۦ ﴿١٣﴾ ﴾ الزخـرف، (واتــە: تــا لەســەر پشــتیان (وڵاغــەكان وشــترە بــەرزەكان) بەرزو سەقامگیربن).

جارێكیــش بــە مانــای: مەبەســت ڕوو تێكــردن دێ، ئەگــەر بكرێتــە (متعد) بە پیتــی (إلی)، هــەروەك لــەم دەقــەدا هاتــووە، واتــە: كاتــێ كە خــوا ﷻ مەبەســتی بــووە، كاتــێ كە خوا زەوی دروســت كــردوە مەبەســتی ئەوە بووە ئاســمانەكانیش دروســت بــكات: ﴿ فَسَوَّىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ ﴾ جــا دروســتی كــردوە، هەروەهــا قایــمو پتــەوو وردەكاری تێــدا كــردوە ﴿ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴾ (واتــە: خــوا بــە هەمــوو شــتێك زانایە).

(وە فەرموویەتــی): ﴿ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي ٱلْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا ﴿٢﴾ ﴾ سـبأ، (واتــە: خوا دەزانێو زانســتی هەیە بەوە كــە دەچێتە نێــو زەویو ئەوەی لێی دەردەچــێو ئەوەی لە ئاســمان دادەبــەزێو ئەوەی بۆ ئاســمان بەرز دەبێتــەوە)، وە دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعْلِنُونَ ﴿١٩﴾ ﴾ النحــل، (واتــە: ئــەوەی دەیشــارنەوەو بەنهێنی دەیكــەنو ئــەوەی ئاشــكرای دەكەن خوا هەمــووی دەزانێو زانســتی پێی هەیــە)، (واتە: خوا نهێنــیو شــاراوە دەزانــێ). ﴿ وَإِن تَجْهَرْ بِٱلْقَوْلِ فَإِنَّهُۥ يَعْلَمُ ٱلسِّرَّ وَأَخْفَى ﴿٧﴾ ﴾ طـه. (واتە: خوا لــە نهێنیو لە نهێنــی شــاراوەتریش دەزانێ).

زۆرجار خوا ﷻ بەراورد لە نێوان دروســتكراوەكانیدا بۆ دروســتكردنو چەســپاندنی زانســتو زانیاریەكــەی دەكات، هــەروەك لــەم ئایەتــەدا، وە هەروەهــا لە فەرموودەی خــوای بەرزیش كــە دەفەرمــوێ: ﴿ أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٤﴾ ﴾ الملــك، (واتە: ئایا خــوا نازانێ چــی بەدیهێناوە، (لــە كاتێكدا) كە خوا وردبینو وردكارو شــارەزایە). چونكە دروســتكردنی دروســتكراوەكان لــە لایەن ئەوەوە بەهێزترین بەڵگەیە لەســەر زانســتو حیكمــەتو توانای.

---

٤) لازم: ئــەو فیعلەیــە كــە بــە فاعــل مانــای دەبەخشــێت پێویســتی بــە (مفعول بـە) نیــە بــۆ تەواو كردنــی ماناكەی. وەكــو: (سـافر محمـدٌ). وەرگێڕ.

وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً قَالُوٓاْ
أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ
بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّيٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ وَعَلَّمَ
ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ فَقَالَ
أَنۢبِـُٔونِي بِأَسْمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣١﴾ قَالُواْ سُبْحَٰنَكَ
لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٣٢﴾ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ
أَنۢبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسْمَآئِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُل
لَّكُمْ إِنِّيٓ أَعْلَمُ غَيْبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ
وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴿٣٣﴾ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُواْ لِأَدَمَ
فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٣٤﴾ وَقُلْنَا
يَٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ
شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٣٥﴾ فَأَزَلَّهُمَا
ٱلشَّيْطَٰنُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ وَقُلْنَا ٱهْبِطُواْ بَعْضُكُمْ
لِبَعْضٍ عَدُوٌّ وَلَكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٣٦﴾ فَتَلَقَّىٰٓ
ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٣٧﴾

(٣٠-٣٤): ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً قَالُوٓاْ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّيٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِي بِأَسْمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمْ ﴿٣١﴾ قَالُواْ سُبْحَٰنَكَ لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٣٢﴾ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسْمَآئِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّيٓ أَعْلَمُ غَيْبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴿٣٣﴾ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُواْ لِأَدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٣٤﴾﴾:

﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً﴾ ئەمە سەرەتاو دەستپێکە لە باسکردنی فەزڵو پلەی ئادەم ﷺ باوکی مرۆڤایەتی، بەراستی خوا - کاتێ ویستی دروستی بکات- هەواڵیدا بە فریشتەکان بەو کارە، پێی ڕاگەیاندن کە خوا دەیکاتە جێنشینی خۆی لەسەر زەوی، جا فریشتەکان (علیهم السلام) فەرموویان: ﴿أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا﴾ (کەسێک دەکەیتە جێنشین لەسەر زەوی) بە گوناهو سەرپێچی کردن تێیدا ﴿وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ﴾ (وە خوێنی تێدا بڕێژێ)، ئەمە تایبەت کردنە لە دوای گشتاندن، لەبەر ڕوونکردنەوەی زۆر خراپە کردنو ئەنجامدانی کوشتن، ئەمەش بە پێی گومانەکانیان، ئەو جێنشینەی دادەنرێ لەسەر زەویدا لە داهاتوودا ئەو کارەی لێ ڕوودەدات، جا ئەوان خوای گەورەیان بە پاکو مەزن ڕاگرت لەوەدا، وە هەواڵیان دا کە ئەوان هەڵدەستن بە پەرستنی خوا بە شێوەیەکی پاکو بەدەر لە خراپە، (بۆیە) وتیان: ﴿وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ﴾ واتە: (ئەی خوایە) ئێمە تۆ بە پاک ڕادەگرین پاکێتیەک شایشتە بێت بە ستایش کردنو گەورەییت بەو پاکیەتیەی کە لێت دەوەشێتەوە بە سوپاسگوزاری کردنو حەمد کردنو بە گەورە گرتنت.

﴿ وَنُقَدِّسُ لَكَ ﴾ دەگونجـێ ماناکـەی ئەوە بێ: بـە پاکت ڕادەگریـن، (لام)ی ﴿ لَكَ ﴾ سـوودی تایبـەت کـردنو دڵسـۆزی بگەیەنێـت (للتخصیـص والإخـلاص). وە دەگونجێت ماناکـەی ئـەوە بـێ: ئێمـە تـۆ بـە پـاک ڕادەگریـن بـە نەفسـی خۆمـان، واتە: بـە پاکت ڕادەگریـن بـە ڕەوشـتی جـوان، وەکو خۆشویسـتنو ترسـانو بە مـەزن دانـان، وە بە پاکی ڕاتدەگریـن لە ڕەوشـتی خراپو ناشـرین.

خـوا ﷻ بـە فریشـتەکانی فەرمـوو: ﴿ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ ﴾ (ئـەوەی مـن دەیزانـم) دەربـارەی ئەو جێنشـینە ﴿ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴾ (واتـە: ئـەوە ئێـوە نایزانـن) چونکە قسـەکانتان بـە گوێرەی گومانـی ئێـوە بـوو، من شـارەزام بـە ئاشـکراو پەنهانەکان.

بزانـە: بێگومـان ئەو چاکەی بەدەسـت هاتـووە بە دروسـتکردنی ئەم دروسـتکراوە چەندەها قـات زیاتـرە لـەو خراپەی کـە لەخـۆی گرتووە، بـە ڕاسـتی خـوا ویسـتوویەتی لەناویاندا پێغەمبەرانو ڕاسـتگۆیانو شـەهیدانو چاکەکاران هەڵبژێرێ، بۆ ئەوەی نیشـانەو ئایەتەکانی دەربکەوێـت بـۆ بەدیهێنراوەکانـی، وە تـا عیبادەتـەکان بـە دەسـت بێـت، کـە بە دەسـت نەدەهـات بەبـێ بەدیهێنانـی ئـەو جێنشـینە، وەکو: جیهـادو هاوشـێوەی، وە تـا دەربکەوێ ئـەوەی شـاراوەیە لە ئـارەزوو غەریزەکانـی نەوەکانی ئادەم، لە خێرو شـەڕ بـە تاقیکردنەوە، وە بـۆ ئـەوەی ڕوون ببێتـەوە دوژمن لە دۆسـتی، وە تا دەربکـەوێ ئەوەی لە ناخی ئیبلیسـدا شـاردراوەتەوە لـە شـەڕو خراپـە، کـە پێی وەسـف کـراوە، ئـا ئەمانـە حیکمـەتو دانایی مەزنـن، هەندێکیان بەسـە بـۆ ئەوە.

پاشـان کاتـێ کـە قسـەی فریشـتەکان ئاماژەیە بۆ فـەزڵو چاکەیان، لەسـەر ئـەو خەلیفەی خـوا ﷻ داینـاوە بـۆ سـەر زەوی، خـوا دەیـەوێ فەزڵـی ئادەمیـان بـۆ ڕوون بکاتـەوە، وە تـەواوی حیکمەتـی خـواو زانسـتی، جـا ﴿ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا ﴾ (واتـە: نـاوی شـتەکان، ناوی شـتەکانو ناوەڕۆکیـان، ناووناوەڕۆکی فێر کـردوە)، واتە: وشـەو ماناکان، تەنانـەت نـاوی گـەورە وەکـو (قَصْعَة) تەشـت، وە نـاوی بچوککـراوە وەکـو (قُصَيْعَة)یە، واتە: تەشـتۆکە.

﴿ ثُمَّ عَرَضَهُمۡ ﴾ واتـە: ناوەڕۆکەکانـی خسـتە ڕوو ﴿ عَلَى ٱلۡمَلَـٰٓئِكَةِ ﴾ وەکـو تاقیکردنەوەیـەک بۆیـان، ئایـا دەیانزانـن یـا نایزانـن؟ ﴿ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِي بِأَسۡمَآءِ هَـٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴾ (واتـە: خـوا پێـی فەرموون: نـاوی ئەمانەم پـێ بڵێـن: ئەگەر ئێوە ڕاسـت دەکـەن) لـە قسـەو گومانەکانتانـدا، کـەوا دەزانـن ئێـوە چاکتـرن لـەم جێنشـینە ﴿ قَالُواْ

﴿سُبۡحَٰنَكَ﴾ واتــه: ئـه‌ی په‌روه‌ردگـار بـه پاكـت ده‌گریـن لـه‌و ره‌خنانـه‌ی كـه گرتمان‌و پێچه‌وانـه‌ی فه‌رمانـی تـۆ جولاینـه‌وه، ﴿لَا عِلۡمَ لَنَآ﴾ (واتـه: ئێمه هیـچ زانیاریمـان نیه) به هیـچ جـۆرێ لـه جـۆره‌كان، ﴿إِلَّا مَا عَلَّمۡتَنَآ﴾ (واتـه: جگه لـه‌وه نه‌بێ كه خـۆت فێرت كردوویـن)، ئه‌وه‌ش له فه‌زڵ‌و به‌خشـنده‌یی خۆته‌وه‌یـه ﴿إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ (العليم) زۆر زانـا، كـه به زانسـتی ده‌وری هه‌موو شـتێكی داوه، هیچ شـتێكی لێ په‌نهـان نابێ، وه هیچ شـتێكی لـێ ون نابـێ ته‌نانـه‌ت بـه قه‌د مسـقاڵه زه‌ڕه‌یـه‌ك لـه ئاسـمانه‌كان‌و زه‌ویدا.

﴿ٱلۡحَكِيمُ﴾ ئـه‌و كه‌سـه‌یه كه خـاوه‌ن داناییه‌كـی تـه‌واوه، كه هیـچ به‌دیهێنراوێـك لێی ده‌رناچـێ، وه هیـچ فه‌رمـان پێكراوێـك لێی ڕیزپـه‌ڕ نابێ، فه‌رمـان ناكات به هیچ شـتێك ئیـلا حیكمه‌تێكـی تێدایـه، وه حیكمه‌تیـش (الحِكْمَةُ): بریتیـه له دانانی شـتێك له شـوێنی شایسـته‌دا، جـا دانیانا بـه زانیـاری‌و حیكمه‌تی خوا، وه كـه‌م‌و كورتیان له زانینـی كه‌مترین شـتدا، وه دانیاننـا بـه چاكه‌و به‌خششـی خـوا به‌سـه‌ریانه‌وه، وه دانیانا به‌وه‌دا كـه هیچ نازانن جگـه لـه‌وه نه‌بێ كه خـوا فێری كـردوون.

جـا لـه‌و كاته‌دا خـوا فه‌رمـووی: ﴿يَٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئۡهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡ﴾ واتـه: ناوی ئه‌و شـتانه‌ی كه خوا خسـتوویه‌تیه ڕوو بۆ فریشـته‌كان، ده‌سته‌وسـان بـوون به‌رانبه‌ریان.

﴿فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡ﴾: واتـه: فـه‌زڵ‌و چاكـه‌ی ئـاده‌م بـۆ فریشـته‌كان ڕوون بوویه‌وه، له‌گـه‌ڵ حیكمـه‌ت‌و زانسـتی خـوا له دانانـی ئه‌م جێنشـینه‌دا.

خـوا فه‌رمـووی: ﴿قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكُمۡ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ غَيۡبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ (واتـه: ئـه‌ی پێم نه‌وتـن مـن ئاگادارم بـه نهێنی ئاسـمانه‌كان‌و زه‌وی). (غه‌یـب‌و په‌نهان) ئه‌وه‌یه كـه له ئێمه په‌نهـان‌و شـاراوه بێـت، لـه ئێمـه نادیاربـێ‌و نه‌مـان بینیبێ، جـا ئه‌گـه‌ر زانابوو بـه په‌نهان، ئـه‌وه زانسـتی بـه ئاشـكراو دیـار لـه پێشـتره ﴿وَأَعۡلَمُ مَا تُبۡدُونَ﴾ واته: ئـه‌وه‌ی ده‌ری ده‌خـه‌ن ﴿وَمَا كُنتُمۡ تَكۡتُمُونَ﴾ واتـه: ئه‌وه‌ی ده‌یشـارنه‌وه.

پاشـان خـوا فه‌رمانـی پێكردوون بـه كڕنووش بـردن بۆ ئاده‌م، وه‌كـو ڕێز لێنانێـك بۆ ئه‌وو بـه مه‌زن دانانـی، وه وه‌كـو به‌ندایه‌تی كردنی خـوا ﷻ، ئه‌وانیـش فه‌رمانه‌كانـی خوایان جێ به‌جـێ كردو ده‌ستپێشـخه‌ریان كرد لـه كڕنوش بردندا (بـۆ ئاده‌م).

﴿إِلَّآ إِبۡلِيسَ﴾ (واتـه: ته‌نهـا ئیبلیس كڕنووشـی نه‌بـرد) ڕێگری كرد لـه كرنووش بردن‌و لـووت بـه‌رزی نواند به‌رانبه‌ر فه‌رمانی خوا به‌سـه‌ر ئاده‌مـه‌وه، وتی: ﴿قَالَ ءَأَسۡجُدُ لِمَنۡ خَلَقۡتَ طِينٗا ٦١﴾ الإسراء، (واتـه: ئایـا كڕنـووش بـه‌رم بۆ ئه‌وه‌ی له گـڵ به دیت هێنـاوه) ئه‌و

پشــت تێکــردنو لــووت بەرزیــە لە لایــەن شــەیتانەوە دەرەنجامی ئــەو کوفرەی بــوو کە لە ناخیــدا شــاردبوویەوە، جــا ئەوکاتــە دوژمنایەتیەکەی بۆ خواو بــۆ ئــادەمو بێبڕوایی کردنو لووت بــەرزی بە تەواوەتــی دەرکەوت.

## لەم دەقە پیرۆزانەدا، پەندو ئامۆژگاری بەدیدەکرێ:

یەکــەم: چەســپاندنی قســەی خــوای بــەرز، بــەردەوام ئەو قســەکەر بــووە، قســە دەکات بە ویســتی خــۆی زانــاو دانــاو کاربەجێیە.

دووەم: هەروەهــا مرۆڤ ئەگەر حیکمەتو دانایی خوای ﷻ لە هەندێ لە دروســتکراوەکانداو فەرمــانو پێویســتیەکاندا بــۆ دەرنەکــەوت، ئــەوە پێویســتە ملکەچی بــێ، وە لۆمــەی عەقڵی بــکاتو دان بە حیکمەتی خــوادا بنێ.

ســێیەم: وە هەروەهــا گرنگــی دانــی خــوا ﷻ بە کاروبــاری فریشــتەکانو چاکەخــوازی لە گەڵیانــدا، بــە فێرکردنیــان لەوەی کــە نایزانــنو ئاگادارکردنەوەیــان لەوەی فێــری نەبوون.

چوارەم: چاکەو پلەو پایەی زانستی لە خۆگرتووە لە چەند ڕوویەکەوە:

خوا زانستو کاربەجێی خۆی ﷻ بە فریشتەکان ناساندووە.

خــوا ﷻ پلــەو فەزڵــی ئادەمی پــێ ناســاندوون لــە ڕووی زانســتەوە، بێگومان ئەوە باشــترین ســیفەتە لــە مرۆڤدا.

خــوا ﷻ فەرمانــی پێکــردوون بە ســوژدە بــردن بۆ ئــادەم وەکــو ڕێزگرتنێک بــۆی، کاتێ کە فــەزڵو زانســتی دەرکەوت.

بێگومــان تاقیکردنــەوە بــۆ کەســێکی دیکەیــە، کاتــێ کــە بــێ توانــا ئەبــن لــەوەی کــە تاقیکراونەتــەوە، پاشــان خاوەنــی فــەزڵو چاکــەی پێدەناســێنێ، ئــەوە تەواوترە لــەوەی کە ســەرەتا پێی ناســاندبوون.

گرنگــی دان بــە باروودۆخی باوکــی مرۆڤایەتــیو جنۆکــەکان، وە ڕوونکردنــەوەی فەزڵی ئــادەمو بەخششــی خــوا بەســەریەوە، وە دژایەتــی ئیبلیس بۆ ئــادەم، جگە لەمانــەش چەندین وانەو پەنــدی دیکــەی تێدایە.

(٣٥-٣٦): ﴿ وَقُلْنَا يَـٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا
هَـٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٣٥﴾ فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيْطَـٰنُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ ۖ وَقُلْنَا
ٱهْبِطُوا۟ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ وَلَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَـٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٣٦﴾ ﴾:

﴿ وَقُلْنَا يَـٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا ﴾ کاتێـک خـوا ئادەمـی دروسـتکردو پایـەداری کـرد، نیعمەتەکانـی تـەواو کرد بەسـەریەوە، بەوەی کـە لە خودی خـۆی هاوسـەری بـۆ بەدیهێنـا بـۆ ئـەوەی بحەسـێتەوەو ئارام بگـرێ لـە پاڵیـەوە، فەرمانی پێکـردن لـە بەهەشـتدا نیشـتەجێ بن‌و لـە هەمـوو خواردمەنیەک بخـۆن‌و بخۆنەوە بـە تێرو تەسـەلی ﴿ رَغَدًا ﴾ واتـە: بـە فراوانـی نۆشـی بکـەن ﴿ حَيْثُ شِئْتُمَا ﴾ (واتە: لـە هەموو جۆرەکانـی بەروبـوومو میوەجـات)، وە خـوا ﷻ پێـی فەرمـوو: ﴿ إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعْرَىٰ ﴿١١٨﴾ وَأَنَّكَ لَا تَظْمَؤُا۟ فِيهَا وَلَا تَضْحَىٰ ﴿١١٩﴾ ﴾طـه، (واتـە: بـۆت هەیـە ئەی ئـادەم تا لـە بەهەشـتدا بیـت نەبرسـی ببـیو نـەڕووت، وە نەتینو بیـت تێیـدا وە نەگەرمـات بێ).

﴿ وَلَا تَقْرَبَا هَـٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ ﴾ (واتـە: نزیکـی ئـەم درەختـە مەکـەون) ئـەم درەختـە جۆرێکە لـە جۆرەکانـی درەختـی بەهەشـت، تەنهـا خـوا دەزانـێ چ جـۆرە درەختێکـە، هـۆکاری قەدەغەکردنەکـەی دەگەڕێتـەوە بـۆ تاقیکردنـەوەی خوایـی، یـان لـە پێنـاو حیکمەتێـک زانـراو نیـە لای بەنـدەکان ﴿ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴾ (واتە: تا لـە سـتەمکاران نەژمێردرێن) بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی نەهـی کـردن لێرەدا بـۆ قەدەغـە کردنە، چونکە سـتەمی بـە دوای خۆیـدا هێناوە.

بـە بـەردەوام وەسوەسـەو ختـورەی بۆ دروسـت دەکـردن‌و درەختەکـەی لەبەرچـاو جوان کـردن تـا هەڵیخەڵەتانـدن ﴿ وَقَاسَمَهُمَآ ﴾ (واتـە: سـوێندی بـۆ خـواردن بـە خـوا)، پێی وتـن: ﴿ إِنِّى لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّـٰصِحِينَ ﴿٢١﴾ ﴾الأعـراف، (واتـە: مـن بـۆ هەردووکتـان دڵسـۆزو ئامۆژگـاری کارم). پێـی سەرسـام بـوون‌و بـە قسـەیان کـرد، ئەویش لـەو نـازو نیعمەت‌و خۆشـیە دەریهێنـان، دەرکرانە دەرەوە بـۆ ماڵی ماندوو بوون‌و ناخۆشـی‌و هەوڵ‌و تێکۆشـان.

﴿ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ﴾ واتـە: ئـادەم‌و نەوەکانـی دوژمنن بـۆ ئیبلیس‌و نەوەکانـی، زانراوە بێگومـان دوژمـن هـەوڵ ئـەداو کۆشـش دەکات بـۆ زیـان گەیانـدن بـە دوژمنەکـەی، وە گەیاندنـی خراپـە پێـی بـە هەمـوو ڕێگاکانیـەوە، وە بێبەشـبوونی لـە خێـر بـە هەمـوو ڕێگایـەک، لـە چـوار چێـوەی ئەمـەدا ئاگـادار کردنـەوەی نەوەکانـی ئادەمە لە شـەیتان، وەکـو خوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ إِنَّ ٱلشَّيْطَـٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ۚ إِنَّمَا يَدْعُوا۟ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُوا۟ مِنْ أَصْحَـٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٦﴾ ﴾فاطـر. (واتـە: بـە ڕاسـتی شـەیتان بـۆ ئێـوە دوژمنەو بـە دوژمنی بزانـن، ئـەو کۆمـەڵ‌و تاقمەکەی بانـگ دەکات تاکـو ببنە خاوەنـی دۆزەخ‌و بچنـە ئاگر). وە فەرموویەتـی: ﴿ أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِى وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّۢ ۚ بِئْسَ لِلظَّـٰلِمِينَ

بَدَلًا ﴿٥٠﴾ ﴾الكهف. (واتــە: ئایـا شـەیتانو نەوەكانــی جگـە لە خـوا بە دۆســت دەگرن؟! ئــەوان بــۆ ئێــوە دوژمنــن، گۆڕینەوەیەكی خراپــە بۆ ســنووربەزێنو ســتەمكاران).
پاشــان باســی كۆتایــی دابەزاندنیانــی كــرد بــۆ ســەر زەوی، جـا فەرموویەتــی: ﴿ وَلَكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ ﴾ واتــە: شــوێنی نیشــتەجێیو ئۆقــرە گرتنــە ﴿ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴾ كۆتایــی هاتنــی ئەجەلەكانتانــە، پاشــان دەگوازرێنــەوە لەســەر زەوی بۆ ئــەوماڵو شــوێنەی كە بۆی بەدیهێنــراون، وە بــۆ ئێــوە دروســتكراوە، ئەویشــی تێدایــە كــە مــاوەی ئــەم ژیانــە (ژیانی دونیــا) كاتیــە، شــوێنی نیشــتەجێ بوونــی ڕاســتەقینە نیە، بەڵكــو تەنیـا شــوێنی پەڕینەوەیە، زنجیــرەی لێ وەدەســت بخــەی بۆ ئــەو مــاڵو شــوێنەی (دوا ڕۆژ)، تەمــەنو ژیانت خەرج مەكــە بــۆ ئۆقرەگرتــن تیایدا.
(٣٧): ﴿ فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٣٧﴾ ﴾:
﴿ فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ ﴾ واتــە: ئــادەم خواســتیەوەو وەریگــرت، وە خــوا ئیلهامی كــرد ﴿ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ ﴾ (واتــە: لــە پەروەردگاریــەوە چەنــد وشــەیەكی وەرگــرت)، كــە بریتــی بــوو لەم فەرمــوودەی خــوا: ﴿ رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا ﴿٢٣﴾ ﴾الأعـراف. (واتــە: پەروەردگارمان ســتەممان لــە خۆمــان كــرد)، ئــادەم دانــی نــا بــە تاوانەكەیــداو داوای لــێ بووردنــی لــە خــوا كرد، ﴿ فَتَابَ عَلَيْهِ ﴾ خــوا ﷻ تەوبــەی لــێ وەرگــرتو بەزەیــی پێــدا هاتــەوە ﴿ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴾ بــۆ هەر كەســێک تەوبــەو داوای لێخۆشــبوونی لێ بــكات، تەوبــەو داوای لێبوردن دوو جــۆرە: یەكــەم: تەوبەی پشــتگیری كردنە (لە لایــەن خــواوە)، دووەم: وەرگرتنی تەوبە ئەگــەر مەرجەكانــی هاتبــووە جێ.
﴿ ٱلرَّحِيمُ ﴾ میهرەبانــە بەرانبــەر بەندەكانــی، لــە میهرەبانی پێیــان ئەوەیە كە ســەركەوتووی كــردوون بــۆ تەوبــەو داوای لێخۆشــبوون، وە لێیــان خۆش بووەو چــاک بــووە لەگەڵیاندا.


قُلْنَا اهْبِطُوا مِنْهَا جَمِيعًا فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى فَمَن تَبِعَ
هُدَايَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٣٨﴾ وَالَّذِينَ كَفَرُوا
وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿٣٩﴾
يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ اذْكُرُوا نِعْمَتِيَ الَّتِي أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَوْفُوا بِعَهْدِي
أُوفِ بِعَهْدِكُمْ وَإِيَّايَ فَارْهَبُونِ ﴿٤٠﴾ وَآمِنُوا بِمَا أَنزَلْتُ مُصَدِّقًا
لِّمَا مَعَكُمْ وَلَا تَكُونُوا أَوَّلَ كَافِرٍ بِهِ ۖ وَلَا تَشْتَرُوا بِآيَاتِي
ثَمَنًا قَلِيلًا وَإِيَّايَ فَاتَّقُونِ ﴿٤١﴾ وَلَا تَلْبِسُوا الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ وَتَكْتُمُوا
الْحَقَّ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٤٢﴾ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ
وَارْكَعُوا مَعَ الرَّاكِعِينَ ﴿٤٣﴾ ۞ أَتَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبِرِّ
وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ الْكِتَابَ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٤٤﴾
وَاسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلَاةِ ۚ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى الْخَاشِعِينَ
﴿٤٥﴾ الَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَاقُو رَبِّهِمْ وَأَنَّهُمْ إِلَيْهِ رَاجِعُونَ ﴿٤٦﴾
يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ اذْكُرُوا نِعْمَتِيَ الَّتِي أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَنِّي فَضَّلْتُكُمْ
عَلَى الْعَالَمِينَ ﴿٤٧﴾ وَاتَّقُوا يَوْمًا لَّا تَجْزِي نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْئًا
وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا شَفَاعَةٌ وَلَا يُؤْخَذُ مِنْهَا عَدْلٌ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٤٨﴾

(٣٨-٣٩): ﴿ قُلْنَا ٱهْبِطُواْ مِنْهَا جَمِيعًا فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَن تَبِعَ هُدَاىَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَـٰتِنَآ أُوْلَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾:

﴿ قُلْنَا ٱهْبِطُواْ مِنْهَا جَمِيعًا ﴾ (واتـە: ئنجـا وتمـان هەمووتـان دەبـێ دابەزنە خـوارەوە) دابەزاندنـە خـوارەوەی دووبـارە کردۆتـەوە، تاکـو ئـەوەی باسـی کـرد لەسـەری بونیات بنـرێ، ئـەوەش فەرمـوودەی خوایـە ﷻ ﴿ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى ﴾ واتـە: ئەوجار هـەر کات لەلایەن منەوە ڕێ پێشـاندەرێکتان بـۆ هـات، واتـە: پێغەمبـەرو کتێبێـک ڕێنماییتـان بـکات بـۆ ئـەوەی نزیـک بـن لـە ڕەزامەنـدی منـەوە ﴿ فَمَن تَبِعَ هُدَاىَ ﴾ (واتـە: ئـەوەی شـوێن ڕێنمایی من کـەوت) لە ئێـوە، بـەوەی بڕوا بـە پێغەمبەرەکەمو کتێبەکـەم بهێنـێو ڕێنماییان لێ وەربگـرێ، ئەویش بە بەڕاسـتدانانی هەمـوو هەواڵەکانـی پێغەمبـەرانو کتێبە پیـرۆزەکان دەبێـت، وە جێبەجێکردنی فەرمـانو دوورکەوتنەوە لـە قەدەغەکـراوەکان ﴿ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾ (واتە: نە ترسـیان بـۆ داهاتـوو، نـە خەمباریـش دەبـن بۆ ڕابـردوو).

لـە ئایەتێکـی دیکـەدا هاتـوە: ﴿ فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَاىَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ ﴿١٢٣﴾ ﴾طه. (واتـە: ئـەوەی شـوێن ڕێنماییەکـەم بکەوێـت نـە گومـڕا دەبـێو نـە بەدبەخت).

## خوا بۆ شوێنکەوتنی ڕێنمایی خۆی چوار شتی داناوە:

نەفـی کـردنو دوورخسـتنەوەی ترسو خـەمو پـەژارە، وە جیاوازی لـە نێوانیاندا: ناخۆشـیو گیروگرفـت ئەگەر بەسـەر چووبێ ئـەوە خەمو پـەژارە ڕوودەدات، وە ئەگـەر ڕووی نەدابێت تـرس دروسـت دەکات، ئـەو دووانـەی دوورخسـتوەتەوە بـۆ هەر کەسـێ شـوێنی هیدایەتی بکـەوێ، وە ئەگـەر دوور خرانـەوە، ئـەوە پێچەوانەکـەی بەدەسـت دێـت، ئەویـش ئەمـنو

ئاسایشـی تـەواوە، بـە هەمـان شـێوە نەفـی کـردنو ڕەتکردنـەوەی گومڕایـیو بەدبەختی بۆ ئـەو کەسـەی شـوێنی ڕێنماییەکانـی کەوتـوە، ئەگـەر دوورخرانـەوە ئـەوە پێچەوانەکەیـان دەسـتەبەر دەبێـت، ئەویـش هیدایەتو خۆشـبەختیە، هەر کەسـێک شـوێنی هیدایەتی خوا ﷻ بکـەوێ، ئەمنو ئاسـایش لە دنیـاو دوارۆژدا بەدەسـت دەهێنێـت، وە هەموو ناخۆشـیەکی لێ دووردەخرێتـەوە، لـە تـرسو خـەمو گومڕایـیو بەدبەختـی، ئەوەی بـە نرخو چاکـەو نەفس حـەزی پێـدەکات بـۆی دەسـتەبەر دەبێ، ئەوەشـی خراپو بـەدەو لێی دەترسـی، لێـی دوور دەخرێتەوە.

ئەمە پێچەوانەی ئەو کەسـەیە کە شـوێنی هیدایەتـی نەکەوتووە، بێبڕوایی پێدەکاتو نیشـانەو ئایەتەکانـی بـە درۆ دەخاتـەوە، ئنجـا دەفەرمـوێ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ﴾ (واتـە: ئەوانـە هاوەڵـی ئاگـرن)، واتـە: پەیوەسـت پێیـەوە، وەک پەیوەسـتبوونی هـاوڕێ بـۆ هاوڕێیەکەی، قەرزکـەر بـە قـەرز لـێ کراوەکـەی ﴿هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ (واتـە: ئـەوان تێیـدا دەبـن بـە هەمیشـەیی) لێـی دەرناچـنو سـزایان لێدانابڕێتو سـەریش ناخرێن.

لەم دەقانەو هاوشـێوەکانیدا دابەشـبوونی خەڵکیـە لە جنۆکەو مرۆڤ، بۆ خاوەنی خۆشـبەختیو بەدبەختـی، سـیفەتی هـەردوو دەسـتەکەی تێدایـە، وە کردەوەکانیـش کـە ئـەوە دەخـوازن، بێگومـان جنۆکـە وەکـو مـرۆڤ وایـە لـە پاداشـتو سـزادا، هـەر وەکـو ئەوانیـش وەکو مرۆڤەکانـن لـە فەرمـانو قەدەغەکردندا.

پاشـان خـوا ﷻ نـازو نیعمـەتو چاکەکانـی یـادی نەوەکانـی ئیسـرائیلی خسـتەوە، جـا فەرمووییەتـی:

(٤٠-٤٣): ﴿يَٰبَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱذْكُرُواْ نِعْمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَوْفُواْ بِعَهْدِيٓ أُوفِ بِعَهْدِكُمْ وَإِيَّٰيَ فَٱرْهَبُونِ ﴿٤٠﴾ وَءَامِنُواْ بِمَآ أَنزَلْتُ مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَكُمْ وَلَا تَكُونُوٓاْ أَوَّلَ كَافِرٍۭ بِهِۦ وَلَا تَشْتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنًا قَلِيلًا وَإِيَّٰيَ فَٱتَّقُونِ ﴿٤١﴾ وَلَا تَلْبِسُواْ ٱلْحَقَّ بِٱلْبَٰطِلِ وَتَكْتُمُواْ ٱلْحَقَّ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٤٢﴾ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱرْكَعُواْ مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴿٤٣﴾﴾

﴿يَٰبَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ مەبەسـت لە (ئیسـرائیل) یەعقووبە ، دواندنەکەش لەگەڵ دەسـتەکانی نەوەکانـی ئیسـرائیل دایـە، ئەوانـەی لە مەدینـەو دەورووبەری نیشـتەجێ بـوون، وە ئەوانەش دەگرێتـەوە کـە لـە دوای ئەوانـەوە دێـن، فەرمانـی پێکـردوون بـە فەرمانێکی گشـتگیر، جا فەرموویەتـی: ﴿ٱذْكُرُواْ نِعْمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ﴾ ئەویـش تێکڕایـی نیعمەتەکانـی خـوا دەگرێتـەوە کـە لـەم سـوورەتەدا هەندێکی بـاس دەکات، مەبەسـت پێی یادکردنـەوە ئەوەیە

بــە دڵ دانــی پیابنێو بــە زمانی وەسـفی بکاو بە ئەندامانی جەسـتە بــەکاری بهێنــێ لەوەی کە خــوا پێی خۆشــەو پێــی ڕازیە.

﴿ وَأَوۡفُواْ بِعَهۡدِيٓ ﴾ بریتیــە لــەو پەیمانەی خــوا بۆیان، لە برواهێنــان بە خــواو پێغەمبەرەکانیو چەسـپاندنی شــەریعەتەکەی ﴿ أُوفِ بِعَهۡدِكُمۡ ﴾ ئەویش پاداشتە لەســەر ئەو پەیمانە.

وە مەبەســت لــەوەدا: ئەوەیــە خــوا باســی کــردوە، وەک فەرموویەتــی: ﴿ وَلَقَدۡ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَبَعَثۡنَا مِنۡهُمُ ٱثۡنَيۡ عَشَرَ نَقِيبٗاۖ وَقَالَ ٱللَّهُ إِنِّي مَعَكُمۡۖ لَئِنۡ أَقَمۡتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَيۡتُمُ ٱلزَّكَوٰةَ وَءَامَنتُم بِرُسُلِي وَعَزَّرۡتُمُوهُمۡ وَأَقۡرَضۡتُمُ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا لَّأُكَفِّرَنَّ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَلَأُدۡخِلَنَّكُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۚ فَمَن كَفَرَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ مِنكُمۡ فَقَدۡ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ١٢ ﴾المائدة، (واتــە: بێگومــان (کاتــی خــۆی) خــوا پەیمانی لە نــەوەی ئیســرائیل وەرگرتــو دوازدە ڕابەرمــان تێدا هەڵبــژاردن، ئنجــا خــوا پێی فەرموون کە: من بە ڕاســتی لەگەڵتانم، ســوێند بێت بــە خوا ئەگەر نوێژەکانتــان بــە چاکی ئەنجام بــدەنو زەکات بدەنو بــڕوا بهێنن بە هەمــوو پێغەمبەرانی منو پشــتیوانیان لێبکــەن، قەرزی چاکو جــوانو ڕێکو پێکی بــدەن بە خەڵکی لەبــەر خوا (لەبەر ڕەزامەنــدی ئــەو زاتــە هەمــوو چاکەیــەک ئەنجــام بــدەنو چاوەڕێی پاداشــت لەو بــن) ئەوە بێگومــان لــە هەڵەکانتان خۆش دەبمو چاوپۆشــیان لێدەکــەمو دەتانخەمە باخەکانی بەهەشــتەوە کــە چەندەهــا ڕووبار بــە ژێــر درەختەکانیــدا دەڕوات، جا ئــەوەی لــەوەو دوا بێبــڕوا بێت لە ئێــوە، ئــەوە مانــای وایە کــە بەڕاســتی ڕێگەو ڕێبــازی ڕاســتو ڕەوانی لــێ ونبووە).

پاشــان فەرمانــی پێکــردوون بــەو هــۆکارەی کــە هەڵگــرە بۆیــان لەســەر بــە وەفابــوون بــە پەیمانەکەیــەوە، ئەویــش ترســانە لــە خوای تاکو تەنها، هەر کەسـێک لەو بترسـێ پێویسـتە شــوێنی فەرمانەکانــی بکــەوێو دووربکەوێتــەوە لــە قەدەغەکراوەکانی.

پاشــان فەرمانی پێکــردوونو بە فەرمــان کردنێکی تایبەت، کــە بڕوایان تەواو نابێو ڕاســتو دروســت نابــێ تەنها بەوە نەبێ، جــا فەرموویەتی: ﴿ وَءَامِنُواْ بِمَآ أَنزَلۡتُ ﴾ (واتــە: بڕوابێنن بەوەی دامبەزاندووە کــە قورئانە).

بریتیــە لــەو قورئانــەی کــە دایبەزانــدووە بــۆ ســەر بەنــدەو ڕەوانەکراوەکــەی موحەممەد ﷺ فەرمانــی پێکــردوون بــە برواهێنانو شــوێن کەوتنی، ئەوەش ئــەوە پێویســت دەکات بڕوا بەو کەســە بهێنن کــە بــۆی دابەزیوە.

باســی هۆکاری بــڕوا پێ بوونیانی بــە قورئان کــردوە، فەرموویەتــی: ﴿ مُصَدِّقٗا لِّمَا مَعَكُمۡ ﴾

(واتــە: پڕاوپــڕە لەگــەڵ قورئانــدا نــە پێچەوانــەو نــە دژیەتــی، جــا ئەگــەر گونجــاوە لەگەڵ کتێبەکــەی ئێــوەداو پێچەوانــەی نیــە، ئەوە هیــچ بەربەســتێک نیە لە پێشــتان تــا بڕوانەهێنن، چونکــە ئــەوەی ئــەو هێناویەتی، هەمــان پەیامــی پێغەمبەرانە، ئێوە ئــەی خــاوەن کتێبەکان لە هەمــوو کەس لە پێشــترن بــە بڕواپێهێنانــیو بەڕاســت دانانی.

بە هەمان شێوە لە فەرمودەی خوادا ﷻ: ﴿ مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَكُمْ ﴾ ئاماژە هەیە بۆ ئەوەی ئەگەر ئێوە بڕواتان پێ نەهێنا، ئەوە دەگەڕێتەوە بەسەرتاندا، بە بە درۆدانانی ئەو کتێبانەی لەبەر دەستاندایە، چونکە ئەوەی ئەو هێناویەتی، بریتیە لە هەمان شت کە بۆ مووساو عیساو جگە لەوانیش لە پێغەمبەران دابەزیوە، بە درۆدانانتان بۆ موحەممەد ﷺ بەدرۆدانانی کتێبەکانی لای خۆتانە.

بــە هەمــان شــێوە ئەو کتێبانــەی کە لەبەر دەســتان دایە ســیفەتی ئــەم پێغەمبــەرەی تێدایە، کە ئــەم قورئــانو مــژدەی پێیە، جا ئەگــەر بڕوای پــێ نەهێنن ئــەوە هەندێ لــە کتێبەکانی خۆتان بــە درۆ دەخەنــەوە، وە هــەر کەســێک هەنــدێ لەوە بــە درۆبخاتەوە کــە بۆی دابەزیــوە، ئەوە هەمــووی بــە درۆ دانــاوە، هەروەکــو چۆن هــەر کەســێک بێبڕوایــی بــە پێغەمبەرێک بکات ئــەوە بێبڕوایی بەرانبــەر هەموو پێغەمبــەران کردوە.

جــا کاتێــک فەرمانــی پێکــردوون بــە بڕواهێنــان پێــی، قەدەغــەی لێکــردوونو ئاگــاداری کردوونەتــەوە لــە پێچەوانەکــەی، کــە بریتیە لــە بێبڕوایی کــردن پێــی، فەرموویەتی: ﴿ وَلَا تَكُونُوٓاْ أَوَّلَ كَافِرٍۭ بِهِۦ ﴾ واتــە: بــە پێغەمبــەرو قورئــان.

کــە دەفەرمــوێ: ﴿ أَوَّلَ كَافِرٍۭ بِهِۦ ﴾ (واتە: مەبن بە یەکەمیــن بێبڕوا پێــی) ڕەوانبێژترو پاراوترە لــە وتــەی: (وَلاَ تَكْفُرُوا بـه) (واتــە: بێبڕوایــی مەکــەن پێی)، چونکــە ئەگەر ئــەوان یەکەمین بێبــڕوا بــن پێی، ئــەوە دەستپێشــخەریانی تێدایــە بــۆ بێبڕوابوون پێی، بــە پێچەوانــەی ئەوە کە لەســەریان پێویســتە، گوناهــو تاوانی خۆیــان دەدرێ بە کۆڵیانــدا لەگەڵ تاوانــی ئەوانەی کە لە دوای ئــەوان پەیڕەویان دەکەن.

پاشــان باســی بەربەســتی بەردەم بڕواهێنانیــان دەکات، ئەویش بریتیە لــە هەڵبژاردنی کەلوپەلی ئــەم دنیایە بەســەر بەختیاریو خۆشــبەختی هەمیشــەیی، جــا فەرموویەتــی: ﴿ وَلَا تَشْتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنًا قَلِيلًا ﴾ (واتــە: ئایەتو نیشــانەکانم بــە نرخێکی کەم مەفرۆشــنو بە کــەم مەیگۆڕنەوە)، ئەویــش بریتیــە لە بەدەســت هێنانی پلەو پایــەو خواردنەکان کــە وا گومان دەبــەن دەبڕێتەوە، ئەگــەر بــڕوا بهێنن بــە خــواو پێغەمبەرەکەی ﷺ، بۆیــە ئایەتەکانــی خوایان بەوانــە گۆڕیەوەو بە چاکیــان زانیو پەســندیان کرد.

﴿ وَإِيَّىَ ﴾ واتــە: تەنهــا لە مــن ﴿ فَٱتَّقُونِ ﴾ (واتــە: خۆتان بپارێــزن) بێگومان ئەگــەر ئێوە لــە خــوای تــاكو تەنها بترســن، ئــەوە لە خــوا ترســانتان ئیمان پێــش دەخات بەســەر کرینی ئایەتەکانــی خــوادا بــە نرخێکی کــەم، هەروەکو چــۆن ئێوە ئەگــەر نرخێکی کــەم هەڵبژێرن بەڵگەیە لەســەر نەمانــی تەقوا لــە دڵەکانتاندا.

پاشــان فەرموویەتــی: ﴿ وَلَا تَلْبِسُواْ ﴾ واتــە: تێکەڵــی مەکــەن ﴿ ٱلْحَقَّ بِٱلْبَـٰطِلِ وَتَكْتُمُواْ ٱلْحَقَّ ﴾ (واتــە: ڕەواو نــاڕەوا تێکــەڵ بــە یەکــدی مەکەنو هەقەکــە مەشــارنەوە)، قەدەغەی کــردن لــە دوو شــت: تێکــەڵ کردنی هەق بــە ناهــەق، وە شــاردنەوەو ئاشــکرا کردنی هەق، چونکــە مەبەســت لــە خــاوەن کتێــبو زانســت، جیاکردنــەوەی هــەق لــە ناهــەقو ئاشــکرا کردنــی هەقو دەرخســتنی، تا بــەوە هیدایەت خــوازان هیدایەت وەربگــرن، وە گومڕاکارانیش بگەڕێنــەوە، بــۆ ئــەوەی حوججە بکرێ لەســەر ئینــکارو کەللەڕەقــەکان، چونکە خــوا بە تێرو تەســەلی ئایەتەکانــی باســکردوەو ڕوونــی کردۆتــەوە، بــۆ ئــەوەی ڕێبــازی ڕێ پیشــاندەران ڕوون ببێتــەوە لــە ڕێبــازی موجریــمو تاوانبــاران، هــەر کەســێک کار بەمە بکات لــە خاوەن زانســتەکان، ئەوە جێنشــینی پێغەمبەرانــەو ڕێ پیشــاندەری ئۆممەتەکانە.

وە هــەر کەســێک هــەق تێکــەڵ بــە باتــڵ بــکات، وە نەتوانــێ لــە یەکتــر جیایــان بکاتەوە، لەگــەڵ ئــەوەش کــە زانســتی پێی هەبــێ، وە ئەو هــەقو مافەی لایەنــی بیشــارێتەوە، فەرمانی پــێ بکــرێ بــە ئاشــکرا کردنــی، ئەوە لــە بانگخوازانــی دۆزەخــە، چونکــە خەڵکی لــە بواری ئاینەکەیــان پەیــڕەوی هیــچ کــەس ناکــەن جگە لــە زاناکانیــان، جا بــۆ خۆتــان یەکێک لەم دوو حاڵەتانــە هەڵبژێرن.

پاشــان فەرموویەتــی: ﴿ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾ واتــە: بــە ئاشــکراو نهێنــی ﴿ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ ﴾ ئەوانــەی کــە شایســتەن ﴿ وَٱرْكَعُواْ مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴾ واتــە: نوێــژ بکــەن لەگــەڵ نوێژخوێناندا (بــە کۆمــەڵ)، بێگومــان ئەگــەر ئێــوە ئەوەتــان کرد لەگــەڵ بــڕوا بوونتــان بــە پێغەمبەرانو ئایەتەکانــی خــوا، ئــەوە بێگومان کۆتــان کردۆتەوە لــە نێوان کــردەوەی پەنهانو ئاشــکرادا، وە لــە نێــوان دڵســۆزی بۆ پەرســتراو (خوای مــەزن)و چاکە کــردن لەگەڵ بەندەکانیــدا، وە لە نێــوان ئــەو بەندایەتیانەی بــە دڵو جەســتەو ســامان دەکرێن.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱرْكَعُواْ مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴾ (واتە: نوێژ بکەن لەگەڵ نوێژ خوێناندا) بە هەمان شێوە کڕنووش بردن ڕوکنو پایەیەکە لە پایەکانی نوێژ، لەبەرئەوە نوێژی بە کڕنووش دەربڕیوە، وە دەربڕین بە بەشێک لە عیبادەت، بەڵگەیە لەسەر فەڕز بوونی ئەو بەشە تیایدا.

(٤٤): ﴿ أَتَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾:
﴿ أَتَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبِرِّ ﴾ (واتــە: ئایـا فەرمـان بەسـەر خەڵکیـدا دەدەن) بـە ئیمـانو چاکـە ﴿ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ ﴾، (وە خۆشـتان لـە بیـر دەکـەن)، واتە: واز لـە خۆتان دێنـن لە فەرمان کـردن بەمـە، لـە کاتێکـدا: ﴿ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴾ (واتـە: لـە حاڵێکـدا کە ئێـوە کتێبـی ئاسـمانی دەخوێننـەوە، ئایا نافامـن؟!). وە عەقڵـی بە (عقـلاً) ناوهێنـاوە، چونکە ئـەوەی چـاکو بە سـوودە پێـی دەگەیەنێ، وە هـەر بە هۆی عەقڵیشـەوە لەو شـتانە تێدەگات کـە زیانـی پـێ دەگەیەنێت، ئەمەش لەبـەر ئەوەیە کە بە ڕاسـتی عەقڵ خاوەنەکـەی هاندەدات کـە یەکـەم کەس بـێ کار بـەوە بکات کـە فەرمانـی پێـدەکات، وە یەکـەم کەس بـێ واز لـەوە بهێنـێ کـە قەدەغـەی لێدەکات، هـەر کەسـێ فەرمان بە کەسـێکی تر بـکات بە کاری چـاکو بـۆ خـۆی ئەنجامی نـەدات، یـان قەدەغەی بکات لـە خراپـەو خـۆی وازی لێنەهێنێ، بەڵگەیـە لەسـەر کەم عەقڵـیو نەفامی، بە تایبـەت ئەگەر زانا بێـت بەوە، بێگومان ئـەوە بیانوو حوججەی لەسـەر کراوە.

بـە ڕاسـتی ئـەم دەقـە، ئەگەر چـی بـە هـۆی نەوەکانـی ئیسـرائیلەوە دابەزیوە، گشـتگیرە بۆ هەمـوو کەسـێک، چونکـە خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴿٢﴾ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴿٣﴾ ﴾الصـف. (واتـە: ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! بـۆ ئـەوەی کـە دەیڵێـن کاری پێناکـەن؟ لـەلای خـواوە تاوانو گوناهێکـی مەزنـە «کاتێـک قسـەیەک» دەڵێـنو کاری پێناکەن).

لەم ئایەتەدا ئەوە ناخوێنرێتەوە کە مرۆڤ ئەگەر ئەوەی خوا ﷻ فەرمانی پێکردوە بەجێی نەهێنێ، ئەوە واز لە فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە دەهێنێ، چونکە دەقەکە بەڵگەیە لەسەر سەرزەنشت کردن سەبارەت بە هەردوو ئەرکەکە (واجب)، ئەگەرنا زانراوە دوو ئەرک پێویستە لەسەر مرۆڤ: فەرمان کردن بە غەیری خۆیو ڕێگری لێکردنی، وە فەرمان کردن بە خۆیو ڕێگری لێکردن لە خۆی، جا وازهێنان لە دانەیەکیان نابێتە ڕوخسەتو ڕێگەپێدان لە وازهێنان لەوی تریان، بێگومان کەماڵو تەواوی مرۆڤ ئەوەیە بە هەردوو ئەرکەکە هەڵسێت، وە ناتەواوی تەواو ئەوەیە واز لە هەردووکیان بهێنێت، بەڵام جێبەجێ کردنی دانەیەکیان جگە لەوی دیکە، ئەوە لە پلەی یەکەمدا نیە، وە کۆتاییش نیە، بەهەمان شێوە دەروونەکان دروست کراون لەسەر ملکەچ نەبوون، بۆ ئەو کەسەی قسەکەی پێچەوانەی کردەوەکەیەتی، جا پەیڕەوی کردنیان بە کردەوەکان پاراوترە لە پەیڕەو کردنیان بە قسە ڕووتەکان.

(٤٥-٤٨): ﴿ وَٱسْتَعِينُواْ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ۚ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى ٱلْخَٰشِعِينَ ﴿٤٥﴾ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمْ وَأَنَّهُمْ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ﴿٤٦﴾ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱذْكُرُواْ نِعْمَتِىَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَنِّى فَضَّلْتُكُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٧﴾ وَٱتَّقُواْ يَوْمًا لَّا تَجْزِى نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْـًٔا وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا شَفَٰعَةٌ وَلَا يُؤْخَذُ مِنْهَا عَدْلٌ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾

﴿ وَٱسْتَعِينُواْ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ﴾ واتە: پەنا ببەنە بەر ئارامگرتن‌و نوێژ (بۆ گەیشتن بە مەبەست) خوا فەرمانی پێ کردوون لە هەموو کاروبارەکانیان پشت بە ئارامی ببەستن بە هەموو جۆرەکانیەوە، ئەویش ئارام گرتنە لەسەر گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوا ﷻ هەتا ئەنجامیان دەدات، وە ئارامگرتن لە سەرپێچی خوا ﷻ هەتا وازیان لێدەهێنێ، ئارام گرتن لەسەر قەزاو قەدەرە بە ئێشەکانی خواو ڕق لێنەبونەوەیان، جا بە ئارام گرتن‌و بەند کردنی نەفس لەسەر ئەوەی خوا فەرمانی پێکردوە بە ئارامگرتن لەسەری، یارمەتیەکی مەزنە لەسەر هەموو کارێ لە کارەکان، ئەوەی هەوڵبدا بۆ ئەوەی ئارامی بە دەست بێنێ بە دڵنیاییەوە خوا ئارامی پێ دەبەخشێ، هەروەها نوێژیش کە تەرازووی ئیمانە، (خاوەنەکەی) لە خراپەو تاوان قەدەغە دەکات، پەنای پێ دەبا لە هەموو کاروبارێک لە کاروبارەکان.

﴿ وَإِنَّهَا ﴾ واتە: نوێژ ﴿ لَكَبِيرَةٌ ﴾ واتە: قورس‌و گرانە ﴿ إِلَّا عَلَى ٱلْخَٰشِعِينَ ﴾ (واتە: مەگەر لەلای ئەوانە نەبێ کە لە خواترسن) بێگومان ئاسان‌و سووکە لەسەریان، چونکە ملکەچی‌و ترسان لە خوا ئومێد بوون بەوەی لەلایەتی کارکردن پێی پێویست دەکات، بە سینەیەکی فراوان‌و چاوەڕوانی پاداشتەوە، وە ترسانی لە تۆڵەو سزا، بە پێچەوانەی کەسێک بەو شێوە نەبێ، بێگومان ئەوە هیچ هۆکارێک نیە بانگی بکات، وە ئەگەر ئەنجامی بدات دەبێتە قورسترین‌و گرانترین شت بەسەریەوە.

(الخشوع): بریتیە: لە ملکەچی دڵ‌و ئاسودەیی، وە وەستان‌و لەسەرخۆبوونی بۆ خوای بەرز، وە خۆشکاندنەوەو خۆ بە کەم زانینی لەبەر دەستی خوادا بە زەلیلی‌و هەژاری، بە بڕواپێبوونەوە بە ئومێدی دیدارو پێگەیشتنی.

بۆیە فەرموویەتی: ﴿ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ ﴾ واتە: ئەوانەی دڵنیان‌و یەقینیان هەیە ﴿ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمْ ﴾ (ئەوان بە خزمەتی خوا دەگەن) پاداشتیان دەداتەوە بە کردەوەکانیان ﴿ وَأَنَّهُمْ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ﴾ (واتە: ئەوان دڵنیان بۆلای ئەو دەگەڕێنەوە) ئەم ئومێد بوونە وایان لێدەکات کردەوەکانیان لەسەر سووک‌و ئاسان بێ، وە لە کاتی بەڵاو ناخۆشیدا دڵیان دەداتەوەو خەم‌و ناخۆشیەکانیان لێ دەڕەوێنێتەوە، وە دووریان دەخاتەوە لە ئەنجامدانی گوناە، ئا ئەوانە

نـازو نیعمەتـی بەردەوامیان بۆ هەیە لـە ژووره بەرزو بڵندەکان، هەر کەسـێک بـڕوا نەهێنێ بە دیـداری پەروەردگـاری، ئەوە نوێژو جگە لەویش لە عیبادەتەکان قورسـترین شـتە لەسـەری.
پاشـان بیـر خسـتنەوەی نیعمەتەکانی دووبـارە کردۆتەوە بەسـەر نەوەکانی ئیسـرائیل، وەک پەنـدو ئامۆژگـاریو ئاگادارکردنـەوەو هاندانێـک بۆیان، وە ترسـاندوونی بـە ڕۆژی قیامەت ئـەو ڕۆژەی کـە: ﴿ لَّا تَجْزِى ﴾ واتـە: سـوودی پێناگەیەنـێو بێنیازی نـاکا ﴿ نَفْسٌ ﴾ واتە: (هیـچ کەسـێک) ئەگەر چی نەفسـی پیرۆزی پێغەمبـەرانو پیاوچاکانیـش بێ ﴿ عَن نَّفْسٍ ﴾ ئەگـەر لـە هـۆزو خزمـە نزیکەکانیش بێـت ﴿ شَيْـًٔا ﴾ واتـە: نە گـەورە نە بچـووک، بەڵکو مـرۆڤ تەنهـا کردەوەکانی کە پێشـی خسـتوە سـوودی دەبـێ بۆی.
﴿ وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا ﴾ واتـە: هیـچ کـەس ناتوانـێ تـکا بـۆ کەسـێکی دیکـە بـکات، تەنهـا بە مۆڵـەتو ڕەزامەنـدی خـوا نەبـێ، دەربـارەی ئەو کەسـەی کـە تکای بـۆ دەکـرێ، وە ڕازی نابـێ بـە هیـچ کردەوەیەک ئیلا مەبەسـت پێـی ئەو نەبـێ، وە دەبێ لەسـەر ڕێگای سـوننەت بـێ ﴿ وَلَا يُؤْخَذُ مِنْهَا عَدْلٌ ﴾ واتـە: هیـچ بارمتـەو فیدیەیەکـی لـێ وەرناگیـرێ، وەک خوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَوْ أَنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفْتَدَوْا۟ بِهِۦ مِن سُوٓءِ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٧﴾ ﴾الزمـر، (واتـە: بەڕاسـتی ئەگەر هی ئەو کەسـانە بووایە سـتەمیان کرد هەمووی ئـەوەی لەسـەر زەوی دایـە، ئەوەنـدەی تریشـی لەگەڵـدا بێ لـە جیاتـی خۆیانـدا دایاندەنا بۆ ڕزگـار بوونیـان لە سـزا) ئەوەیـان لـێ وەرناگرێ.
﴿ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴾ (واتـە: خراپەیان لێ لانادرێ)، سـوود وەرگرتنی لە خەڵکی ڕەتکردۆتەوە بـە هەر شـێوەیەک لە شـێوەکان، کـە فەرموویەتـی: ﴿ لَّا تَجْزِى نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْـًٔا ﴾ ئەوە لە بەدەسـتهێنانی سـوودو قازانجەکانە ﴿ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴾ ئەمە لە ڕەتکردنەوەی زیانبەخشەکانە، ئـەم ڕەتکردنـەوە بۆ ئـەو کارەیە کە لە داهاتوو سـوود ناگەیەنـێ، ﴿ وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا شَفَـٰعَةٌ وَلَا يُؤْخَذُ مِنْهَا عَدْلٌ ﴾ ئەمـە ڕەتکردنـەوەی تکاکـردنو وەرگرتنـی بارمتە دەگەیەنێ، بەڕاسـتی ئەمـە ئـەوە پێویسـت دەکات کـە دڵـی بپچڕێنـێ لە پەیوەسـت بـوون بـە بەدیهێنـراوەکان، لەبـەر ئـەوەی دەزانـێ ئەوان بـە ئەنـدازەی مـسـقاڵە زەڕەیەکیش سـوودیان نیە، بێگومـان دڵی دەبەسـتێتەوە بـە خـوا ﷻ کە سـوودو قازانجـی پێبگەیەنـێ، زیانەکانی لەسـەر لابـدات، جا با تەنهـا ئەو بپەرسـتێو هاوەڵـی بۆ پەیدا نـەکات، وە تەنهـا داوای یارمەتی لـەو بکات.

وَإِذْ نَجَّيْنَٰكُم مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ
يُذَبِّحُونَ أَبْنَآءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ ۚ وَفِى ذَٰلِكُم بَلَآءٌ
مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴿٤٩﴾ وَإِذْ فَرَقْنَا بِكُمُ ٱلْبَحْرَ فَأَنجَيْنَٰكُمْ
وَأَغْرَقْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴿٥٠﴾ وَإِذْ وَٰعَدْنَا مُوسَىٰٓ
أَرْبَعِينَ لَيْلَةً ثُمَّ ٱتَّخَذْتُمُ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَنتُمْ ظَٰلِمُونَ
﴿٥١﴾ ثُمَّ عَفَوْنَا عَنكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٥٢﴾
وَإِذْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْفُرْقَانَ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿٥٣﴾
وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ إِنَّكُمْ ظَلَمْتُمْ أَنفُسَكُم بِٱتِّخَاذِكُمُ
ٱلْعِجْلَ فَتُوبُوٓا۟ إِلَىٰ بَارِئِكُمْ فَٱقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ذَٰلِكُمْ
خَيْرٌ لَّكُمْ عِندَ بَارِئِكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ
ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٤﴾ وَإِذْ قُلْتُمْ يَٰمُوسَىٰ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ
جَهْرَةً فَأَخَذَتْكُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴿٥٥﴾ ثُمَّ بَعَثْنَٰكُم
مِّنۢ بَعْدِ مَوْتِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٥٦﴾ وَظَلَّلْنَا عَلَيْكُمُ
ٱلْغَمَامَ وَأَنزَلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْمَنَّ وَٱلسَّلْوَىٰ ۖ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ
مَا رَزَقْنَٰكُمْ ۖ وَمَا ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٥٧﴾

**(٤٩-٥٧):** ﴿ وَإِذْ نَجَّيْنَٰكُم مِّنْ ءَالِ
فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ يُذَبِّحُونَ
أَبْنَآءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ ۚ وَفِى ذَٰلِكُم
بَلَآءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴿٤٩﴾ وَإِذْ فَرَقْنَا بِكُمُ
ٱلْبَحْرَ فَأَنجَيْنَٰكُمْ وَأَغْرَقْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ
وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴿٥٠﴾ وَإِذْ وَٰعَدْنَا مُوسَىٰٓ أَرْبَعِينَ
لَيْلَةً ثُمَّ ٱتَّخَذْتُمُ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَنتُمْ
ظَٰلِمُونَ ﴿٥١﴾ ثُمَّ عَفَوْنَا عَنكُم مِّنۢ بَعْدِ
ذَٰلِكَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٥٢﴾ وَإِذْ ءَاتَيْنَا
مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْفُرْقَانَ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ
﴿٥٣﴾ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ إِنَّكُمْ
ظَلَمْتُمْ أَنفُسَكُم بِٱتِّخَاذِكُمُ ٱلْعِجْلَ فَتُوبُوٓا۟
إِلَىٰ بَارِئِكُمْ فَٱقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ
عِندَ بَارِئِكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ
ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٤﴾ وَإِذْ قُلْتُمْ يَٰمُوسَىٰ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ جَهْرَةً فَأَخَذَتْكُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ وَأَنتُمْ
تَنظُرُونَ ﴿٥٥﴾ ثُمَّ بَعَثْنَٰكُم مِّنۢ بَعْدِ مَوْتِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٥٦﴾ وَظَلَّلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْغَمَامَ
وَأَنزَلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْمَنَّ وَٱلسَّلْوَىٰ ۖ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ ۖ وَمَا ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ
يَظْلِمُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾:

**ئەمە دەستپێکێکە لە ژماردنی نازو ونیعمەتەکانی خوا ﷻ بەسەر نەوەکانی ئیسرائیلەوە بە شێوەیەکی تێرو تەسەل، فەرموویەتی: ﴿ وَإِذْ نَجَّيْنَٰكُم مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ ﴾ (واتە: وە یاد بکەنەوە ئەوکاتەی ڕزگارمان کردن) لە فیرعەونو دەسەڵاتدارانیو سەربازەکانی، ئەوان لە ڕابردوو ئەوەیان دەکرد: ﴿ يَسُومُونَكُمْ ﴾ سەرپەرشتی دەکردنو، بەکاری دەهێنانو ئیشی پێ دەکردن ﴿ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ ﴾ واتە: بە توندترینو خراپترین شێوە سزای دەدان، بەوەی کە ئەوان: ﴿ يُذَبِّحُونَ أَبْنَآءَكُمْ ﴾ (واتە: کوڕە کانتانیان سەردەبڕی)، لە ترسی ئەوەی زۆر ببن ﴿ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ ﴾ (واتە: کچو ئافرەتەکانتانیان دەهێشتەوە بۆ خزمەتکاری)، واتە: نەیدەکوشتن، ئێوە لە نێوان دوو حاڵەت بوون کوژرانو زەلیلو ڕیسوا کردن بە ئەنجامدانی کاری قورس، دەیهێشتنەوە بە شێوەی منەت کردن بەسەریانداو خۆی**

بەسەریاندا بەرز دەنواند، بەڕاستی ئەمە ئەوپەڕی ئیهانەو ڕیسواكردنە، خوا ﷻ منەتی كرد بەسەریاندا بە ڕزگار بوونی تەواو، وە خنكاندنی دوژمنەكەیان لە پێش چاوی خۆیان، هەتا چاوەكانیان ئۆقرە بگرێ.

﴿ وَفِي ذَٰلِكُم ﴾ واتە: لەم ڕزگار بوونەتاندا ﴿ بَلَاءٌ ﴾ واتە: چاكەیەكی ﴿ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴾ (مەزنە لە پەروەردگارتانەوە) ئەمە ئەوە لەسەرتان پێویست دەكات سوپاسگوزاری بكەنو كارو فەرمانەكانی جێبەجێ بكەن.

پاشان باسی فەزڵو منەتی خۆی دەكات بەو پەیمانەی كە دای بە مووسا عليه السلام بۆ ماوەی چل شەو، بۆ ئەوەی تەوراتی بۆ دابەزێنێ كە نیعمەتی مەزنو بەرژەوەندی گشتی لە خۆ دەگرێت، پاشان ئەوەندە چاوەڕوان نەبوون پێش تەواو بوونی ماوەكە دەستیان داوە گوێرەكە پەرستن پاش ڕۆیشتنی مووسا عليه السلام.

﴿ وَأَنتُمْ ظَٰلِمُونَ ﴾ (لە كاتێكدا ئێوە ستەمكار بوون) زانا بوون بە ستەمەكەتان، بێگومان بەڵگەو حوججەتان لەسەر پێویست كراوە، ئا ئەوە مەزنترین ستەمو گەورەترین تاوانە.

پاشان خوا ئەو فەرمانەی پێكردوون بە تەوبەو داوای لێخۆشبوون لەسەر زمانی نێردراوەكەی مووسا عليه السلام، بەوەی هەندێكتان هەندێكتان بكوژن، خوا ﷻ لێتان خۆشبوو بە هۆی ئەوەوە ﴿ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾ (واتە: بەڵكو شوكرانەی) خوا بكەن.

﴿ وَإِذْ قُلْتُمْ يَٰمُوسَىٰ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى اللَّهَ جَهْرَةً ﴾ (واتە: ئێوە بە مووساتان وت: بڕوا بە تۆ ناهێنین تاكو خوا بە ئاشكرا نەبینین)، ئەمە ئەوپەڕی ستەمو بوێریو چاونەترسیە بەسەر خواو پێغەمبەرەكەیەوە ﴿ فَأَخَذَتْكُمُ الصَّٰعِقَةُ ﴾ (واتە: لەپڕ هەورە تریشقەیەك لێیدان): یان مردن، یان لە هۆش خۆیان چوونو بێئاگابوون، ﴿ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴾ (واتە: ئێوە دەتان بینی) ئەوەی ڕوویدا، هەر یەكەو تەماشای هاوڕێیەكەی دەكرد ﴿ ثُمَّ بَعَثْنَٰكُم مِّنۢ بَعْدِ مَوْتِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾: (واتە: پاشان زیندوومان كردنەوە لە دوای مردنتان بەڵكو سوپاسگوزاری بكەن).

پاشان باسی نیعمەتەكانی دەكات بەسەریانەوە لەسەر گەردان بوون لە بیابانی چۆڵو هۆڵو لە سێبەرو فراوانی ڕۆزیەكان، هەروەكو فەرموویەتی: ﴿ وَظَلَّلْنَا عَلَيْكُمُ الْغَمَامَ وَأَنزَلْنَا عَلَيْكُمُ الْمَنَّ ﴾ (واتە: هەورمان بەسەرتاندا كردە سێبەر، گەزۆمان بەسەرتاندا دابەزاند)، ئەوە ناوێكی گشتگیرە بۆ هەموو ڕزقو ڕۆزیەكی چاك كە دەستەبەر بێت بەبێ ماندوو بوون، لەوانەش: زەنجەفیلو دۆمەڵانو نانو جگە لەوانەش.

﴿ وَٱلسَّلْوَىٰ ﴾ باڵندەیەکی بچووکە پێی دەوترێ: (السماني): شەلاقە، گۆشتی خۆشە، دابەزێنراوەتە خوارەوە بۆیان لە گەزۆو شەلاق، کە بەسیان بوو وەکو بژێوی ژیانیان، ﴿ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ ﴾ (واتە: بخۆن لەو خواردنە پاکو خۆشانەی کە پێم بەخشیون)، واتە: ڕزقو ڕۆزیەک کە وێنەی دەست ناکەوێت بۆ ئەوانەیشی لە شاردا بە خۆشترین شێوە دەژین، بەڵام ئەوان بەردەوام بوون لەسەر دڵڕەقیانو زۆری تاوان کردنیان.

﴿ وَمَا ظَلَمُونَا ﴾ (واتە: سنووریان بەسەر ئێمە نەبەزاندوەو ستەمیان لە ئێمە نەکردوە)، واتە: بەو کردەوانەی کە پێچەوانەی فەرمانەکانمان بوون، بێگومان سەرپێچی کردنی سەرپێچیکاران زیان بە خوا ﷻ ناگەیەنێ، هەروەک گوێڕایەڵی گوێڕایەڵان! سوودی پێناگەیەنێ ﴿ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴾ (واتە: بەڵکو تەنیا ستەمیان لە خۆیان کردوە). زیانەکانیان بەسەر خۆیاندا شکایەوە.

وَإِذْ قُلْنَا ادْخُلُوا هَٰذِهِ الْقَرْيَةَ فَكُلُوا مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ
رَغَدًا وَادْخُلُوا الْبَابَ سُجَّدًا وَقُولُوا حِطَّةٌ نَّغْفِرْ لَكُمْ
خَطَايَاكُمْ ۚ وَسَنَزِيدُ الْمُحْسِنِينَ ﴿٥٨﴾ فَبَدَّلَ الَّذِينَ
ظَلَمُوا قَوْلًا غَيْرَ الَّذِي قِيلَ لَهُمْ فَأَنزَلْنَا عَلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا
رِجْزًا مِّنَ السَّمَاءِ بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ ﴿٥٩﴾ ۞ وَإِذِ اسْتَسْقَىٰ
مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ فَقُلْنَا اضْرِب بِّعَصَاكَ الْحَجَرَ ۖ فَانفَجَرَتْ
مِنْهُ اثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا ۖ قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ ۖ كُلُوا
وَاشْرَبُوا مِن رِّزْقِ اللَّهِ وَلَا تَعْثَوْا فِي الْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٦٠﴾
وَإِذْ قُلْتُمْ يَا مُوسَىٰ لَن نَّصْبِرَ عَلَىٰ طَعَامٍ وَاحِدٍ فَادْعُ لَنَا
رَبَّكَ يُخْرِجْ لَنَا مِمَّا تُنبِتُ الْأَرْضُ مِن بَقْلِهَا وَقِثَّائِهَا
وَفُومِهَا وَعَدَسِهَا وَبَصَلِهَا ۖ قَالَ أَتَسْتَبْدِلُونَ الَّذِي هُوَ
أَدْنَىٰ بِالَّذِي هُوَ خَيْرٌ ۚ اهْبِطُوا مِصْرًا فَإِنَّ لَكُم مَّا سَأَلْتُمْ ۗ
وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ الذِّلَّةُ وَالْمَسْكَنَةُ وَبَاءُوا بِغَضَبٍ مِّنَ
اللَّهِ ۗ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا يَكْفُرُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَيَقْتُلُونَ
النَّبِيِّينَ بِغَيْرِ الْحَقِّ ۗ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا وَّكَانُوا يَعْتَدُونَ ﴿٦١﴾

(٥٨-٥٩): ﴿وَإِذْ قُلْنَا ادْخُلُوا هَٰذِهِ الْقَرْيَةَ فَكُلُوا مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ رَغَدًا وَادْخُلُوا الْبَابَ سُجَّدًا وَقُولُوا حِطَّةٌ نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطَايَاكُمْ ۚ وَسَنَزِيدُ الْمُحْسِنِينَ ﴿٥٨﴾ فَبَدَّلَ الَّذِينَ ظَلَمُوا قَوْلًا غَيْرَ الَّذِي قِيلَ لَهُمْ فَأَنزَلْنَا عَلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا رِجْزًا مِّنَ السَّمَاءِ بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ ﴿٥٩﴾﴾:

﴿وَإِذْ قُلْنَا ادْخُلُوا هَٰذِهِ الْقَرْيَةَ فَكُلُوا مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ رَغَدًا وَادْخُلُوا الْبَابَ﴾ بە هەمان شێوە ئەمەش لە نیعمەتەکانی خوایە ﷻ بەسەریانەوە لە دوای سەرپێچی کردن، فەرمانی پێکردن بەچوونە ناو شارێکەوە، کە دەبێتە مایەی سەربەرزیو وڵاتو شوێنی نیشتەجێ بوون بۆیان، وە ڕۆزی فراوانو خۆشیان بۆ دەستەبەر دەبێ تێیدا، وە با چوونە ناوەوەیان بە ملکەچیەوە بێو بە کرداربێ بۆ خوا ﷻ، ئەویش چوونە ژوورەوەیە لە دەرگاوە ﴿سُجَّدًا﴾ واتە: ملکەچیو زەلیلی، وە بە قسەش ئەوە بێژن: ﴿حِطَّةٌ﴾ واتە: لە گوناهەکانیان خۆش ببێ بە داوای لێ بووردن کردنیان لە خوای بە بەزەیی.

﴿نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطَايَاكُمْ﴾ (واتە: خوا فەرمووی: هەڵەو گوناهەکانتان دەبورم)، بە داوای لێبووردن کردنتان ﴿وَسَنَزِيدُ الْمُحْسِنِينَ﴾ (واتە: بۆ چاکەکاران زیاتریش دەکەین) بە کردەوەکانیان واتە: پاداشتێکی بە پەلەو دواخراو، ﴿فَبَدَّلَ الَّذِينَ ظَلَمُوا﴾ (واتە: کەچی ئەوان ستەمکار بوون)، نەیفەرموو، (فبدلوا) (هەموویان گۆڕیان)، چونکە ئەوان هەموویان نەیانگۆڕی ﴿قَوْلًا غَيْرَ الَّذِي قِيلَ لَهُمْ﴾ (واتە: بەقسەیەک پێیان نەوترا بوو) لە جیاتی بڵێن: (حطة) هەڵبوەڕێنە، وتیان: (حبة في حنطة) واتە: دەنکێک لە گەنم، وەک گاڵتەکردن بە فەرمانی خواو بە کەم دانانی، جا ئەگەر ئەوان قسەیان گۆڕی بە سووکو ئاسانیەوە، ئەوە گۆڕینیان بە کردار زۆر لە پێشترە، لەبەر ئەمە بوو چوونە ناویەوە بە خشانو پشتاو پشتەوە، وە کاتێ ئەو سەرپێچیە گەورەترین هۆکار بوو، بۆ

تووشبوون بە سزا، خوا فەرمووی: ﴿فَأَنزَلْنَا عَلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟﴾ (واتە: دامانبەزاند بە سەر ئەوانەی ستەمیان کردو سنووریان بەزاند) لەوان: ﴿رِجْزًا﴾ واتە: سزاو ئازارێک، ﴿ٱلسَّمَآءِ﴾ (واتە: لە ئاسمانەوە) بە هۆی لە فەرمان دەرچوونیانو گوناهەکانیان.

(٦٠): ﴿وَإِذِ ٱسْتَسْقَىٰ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ فَقُلْنَا ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْحَجَرَ ۖ فَٱنفَجَرَتْ مِنْهُ ٱثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا ۖ قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ ۖ كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ مِن رِّزْقِ ٱللَّهِ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٦٠﴾﴾:

﴿وَإِذِ ٱسْتَسْقَىٰ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ﴾، (ٱسْتَسْقَىٰ) واتە: داوای ئاوێکی کرد بۆیان تا لێی بخۆنەوە، ﴿فَقُلْنَا ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْحَجَرَ﴾ یان بەردێکی تایبەت زانراو بووە لەلایەوە، یان هەر بەردێکی دیکە بێ ﴿فَٱنفَجَرَتْ مِنْهُ ٱثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا﴾ (کە لێیدا دوازدە کانی لێ هەڵقولا) نەوەکانی ئیسرائیل دوازدە هۆز بوون ﴿قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ﴾ (واتە: بێگومان هەموو تیرەیەک) لە نەوەکانی ئیسرائیل ﴿مَّشْرَبَهُمْ﴾ واتە: شوێنی خۆی دەناسی لەو کانیانە، هەندێکیان هەندێکی دیکەیان بێزار نەکەن، بەڵکو لێی بخۆنەوە بە لەسەرخۆییەوە، نەک بە قورسیو نارەحەتیەوە لەبەر ئەمەیە فەرمووی: ﴿كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ مِن رِّزْقِ ٱللَّهِ﴾ واتە: ئەوەی کە پێی بەخشیون بەبێ ماندوو بوونو زەحمەتی ﴿وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ﴾ واتە: سەر زەوی وێران مەکەن.

(٦١): ﴿وَإِذْ قُلْتُمْ يَٰمُوسَىٰ لَن نَّصْبِرَ عَلَىٰ طَعَامٍ وَٰحِدٍ فَٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُخْرِجْ لَنَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ مِنۢ بَقْلِهَا وَقِثَّآئِهَا وَفُومِهَا وَعَدَسِهَا وَبَصَلِهَا ۖ قَالَ أَتَسْتَبْدِلُونَ ٱلَّذِى هُوَ أَدْنَىٰ بِٱلَّذِى هُوَ خَيْرٌ ۚ ٱهْبِطُوا۟ مِصْرًا فَإِنَّ لَكُم مَّا سَأَلْتُمْ ۗ وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلذِّلَّةُ وَٱلْمَسْكَنَةُ وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ ۗ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَيَقْتُلُونَ ٱلنَّبِيِّۦنَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ۗ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ ﴿٦١﴾﴾:

﴿وَإِذْ قُلْتُمْ يَٰمُوسَىٰ﴾ واتە: بیر بکەنەوە، کاتێ بە مووسا عليه السلامتان وت لە ڕووی بێزاری دەربڕین لە نیعمەتەکانی خوا ﷻو بە کەم زانینیان ﴿لَن نَّصْبِرَ عَلَىٰ طَعَامٍ وَٰحِدٍ﴾ (ئارام ناگرین لەسەر یەک جۆرە خواردن) واتە: جۆرێک لە خواردن، ئەگەر هەروەکو ڕابوردو جۆراو جۆریش بوو، بەڵام نەدەگۆڕا ﴿فَٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُخْرِجْ لَنَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ مِنۢ بَقْلِهَا﴾ واتە: ئەو ڕووەکانەی کە لە دارو درەخت نین، لەسەر ڕەگو لقو پێیەکانیان بوەستن ﴿وَقِثَّآئِهَا﴾ واتە: ئەوانیش تروزیو خەیارە ﴿وَفُومِهَا﴾ واتە: سیر، وە نیسکو پیازیش کە زانراون، مووسا عليه السلام پێی وتن: ﴿أَتَسْتَبْدِلُونَ ٱلَّذِى

﴿ هُوَ أَدْنَىٰ ﴾ ئەویش ئەو خواردنانەیە کە باسکرا ﴿ بِٱلَّذِي هُوَ خَيْرٌ ﴾ ئەویش گەزۆو شەلاقە؟! ئەمە شایانی ئێوە نیە، بێگومان ئەم خواردنەی کە ئێوە داواتان کرد، بۆ هەرشوێنێک دابەزن دەیبیننەوە، بەڵام ئەو خواردنەی خوا ﷻ منەتی کردوە بەسەرتاندا ئەوە چاکترینی نیعمەتەکانو بەرێزترینیانە، دەی چۆن داوای گۆڕینی دەکەن؟

جا ئەوەی کە ڕوویدا لێیانەوە گەورەترین بەڵگەی تێدایە لەسەر کەمی ئارام گرتنیانو بە کەم تەماشا کردنی بۆ فەرمانەکانی خوا ﷻو نازو نیعمەتەکانی، ئەویش پاداشتی دانەوە بەپێی کردەوەکانی خۆیان، بۆیە فەرمووی: ﴿ وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلذِّلَّةُ ﴾ (واتە: درا بەسەریاندا زەلیلی) کە بەچاو دەبینرێ بەسەر ڕواڵەتو جەستەیانە ﴿ وَٱلْمَسْكَنَةُ ﴾ (واتە: داماویو نەداری) بە دڵەکانیانەوە، نەفسیان شکۆدار نیە، وە ڕەوشتو ئاکاریان بەرز نیە، بەڵکو دەروونیان دەروونێکی تەپیو بێ ڕێزو سەرزەنشتکراوە، ورەو غیرەتیان داڕوخاوەو خراپترین ورەیە ﴿ وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ ﴾ واتە: ئەو دەستکەوتانەی کە پێی گەڕانەوە سەرکەوتوو نەبوو، تەنها ئەوە نەبێ بەخەشم تورەیی خواوە گەڕانەوە، ئای چی دەستکەوتێکی خراپیان بەدەست هێناوەو لە چی دۆخێکی خراپدان ﴿ ذَٰلِكَ ﴾ ئەوەی شایستەی بوون، خەشمو توورەیی خوا بوو ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ﴾ کە بەڵگەن لەسەر ڕاستی، وە ڕوونکراوەتەوە بۆیان، جا کاتێ بێبڕواییان پێ کرد سزای دان بە غەزەبو توورەیی بەسەریانەوە، بەوەی کە ﴿ وَيَقْتُلُونَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ﴾ (واتە: پێغەمبەرانیان بە ناهەق دەکوشت).

دەفەرموێ: ﴿ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ﴾ ناشرینیەکی زیاترە، ئەگەرنا زانراوە کوشتنی نێردراو هەق نیە، بەڵام لەبەر ئەوەی نەفامو نەخوێنەوارەکانیان وا گومان نەبەن، ﴿ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ ﴾ بەوەی سەرپێچی خوایان کرد ﴿ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ ﴾ (واتە: وە دەستدرێژیان دەکرد)، بۆ سەر بەندەکانی خوا ﷻ بەڕاستی تاوانو سەرپێچی هەندێک هەندێکی تر بەدوای خۆیدا دەهێنێ، بێئاگایی گوناهی بچووکی لێ دەبێتەوە، پاشان لەویشەوە تاوانی گەورە، پاشان لە ویشەوە جۆرەها بیدعەو کوفرو جگە لەوەش. داوای سەلامەتی دەکەین لە خوای گەورە لە هەموو بەڵاو نارەحەتیەک.

بزانە! بێگومان دواندن لەم دەقە پیرۆزانەدا بۆ ئۆمەتی نەوەکانی ئیسرائیلە، ئەوانەی لە سەردەمی دابەزینی قورئان بوون، وە ئەم کردەوانەی کە باسکراوەو ئەوانی پێ دوێنراوە، ئەوە کردەوەی پێشینیانە، دراوەتە پاڵ ئەوان لە پێناو چەندین سوودی دیاریکراو، لەوانە:

یەکـەم: ئەوانـە زۆر وەسـفی خۆیـان دەکـردو خۆیـان بـە پـاک دادەنـا، وایـان دەزانـی فـەزڵو پلەیـان زیاترە بەسـەر موحەممـەد ﷺو ئەوانەی کە بڕوایـان پێی هێنـاوە، خوا حاڵی پێشـینانیانی ڕوونکـردەوە، ئەوەی کە لای ئەوان چەسـپابوو، هەموو یەکێکیـان دەیزانی، کە بـاوکـو باپیرانیـان خاوەنـی ئارامیو ڕەفتارو ڕەوشـتی بەرز نەبـوون، جا ئەگـەر ئەمە حاڵی پێشـینانیان بێـت- لەگـەڵ ئـەوەدا گومـان دەکـرێ ئەوان لە پێشـتر بـن لە پێشـینەکانیان- دەبـێ چ گومانێک بـە دوێنراوان ببـردرێ ؟!

دووەم: بـە ڕاسـتی نیعمەتی خـوا لەسـەر پێشـینەکانیانەوە، نیعمەتێکی بەردەوامە بـۆ ئەوانەی لـە دوای ئەوەوە هاتوون، وە نیعمەت بەسـەر بـاوکـو باپیراندا نیعمەتە بەسـەر منداڵەکانیش، بۆیـە بەو شـێوە دوێنـراون، چونکە نـازو نیعمەتەکە ئەوانیـش دەگرێتەوە.

سـێیەم: بێگومـان دواندن بۆیـان بەکارو کـردەوەی غەیری خۆیـان، بەڵگەیە لەسـەر ئەوەی بێگومـان ئـەم ئۆممەتـە لەسـەر یـەک ڕێبـازو ئایـن کۆبوونـەوە، یەکتـر تـەواو دەکەنو هـاوکاریو یارمەتـی یەکتـر دەدەن لەسـەر بەرژەوەندیەکانـی ئۆممـەت، کـە وەک ئـەوە وایـە پێشـینو دواییینیـان لەیەک کاتـا بێـت، هەروەکـو ڕووداوی هەندێکیان لـە هەمووان ڕوویدابـێ، چونکـە ئەگەر هەندێکیان کارێکـی چاکە بکەن، بەرژەوەندیەکـەی بۆ هەمووان دەگەڕێتـەوە، وە ئەگـەر کاری خراپـەش بکـەن زیانەکەی بـۆ هەمـووان دەگەڕێتەوە.

چـوارەم: بێگومـان زۆربـەی کردەوەکانیـان قەدەغەیان لێنەکـردوە، جا کەسـی ڕازی بوون بـە گوناه بەشـدارە لەگـەڵ تاوانکارو گوناهـکاردا، جگـە لەمانەش لە حیکمـەتو دانایی تر کە کـەس نایزانـێ جگە لـە خوا خـۆی نەبێ.


إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ مَنۡ
ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَلَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ عِندَ
رَبِّهِمۡ وَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿٦٢﴾ وَإِذۡ أَخَذۡنَا
مِيثَٰقَكُمۡ وَرَفَعۡنَا فَوۡقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُواْ مَآ ءَاتَيۡنَٰكُم
بِقُوَّةٖ وَٱذۡكُرُواْ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ ثُمَّ تَوَلَّيۡتُم
مِّنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَۖ فَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ لَكُنتُم مِّنَ
ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٦٤﴾ وَلَقَدۡ عَلِمۡتُمُ ٱلَّذِينَ ٱعۡتَدَوۡاْ مِنكُمۡ فِي ٱلسَّبۡتِ
فَقُلۡنَا لَهُمۡ كُونُواْ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ﴿٦٥﴾ فَجَعَلۡنَٰهَا نَكَٰلٗا لِّمَا
بَيۡنَ يَدَيۡهَا وَمَا خَلۡفَهَا وَمَوۡعِظَةٗ لِّلۡمُتَّقِينَ ﴿٦٦﴾ وَإِذۡ قَالَ
مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تَذۡبَحُواْ بَقَرَةٗۖ قَالُوٓاْ
أَتَتَّخِذُنَا هُزُوٗاۖ قَالَ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنۡ أَكُونَ مِنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ
﴿٦٧﴾ قَالُواْ ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَۚ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا
بَقَرَةٞ لَّا فَارِضٞ وَلَا بِكۡرٌ عَوَانُۢ بَيۡنَ ذَٰلِكَۖ فَٱفۡعَلُواْ مَا
تُؤۡمَرُونَ ﴿٦٨﴾ قَالُواْ ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوۡنُهَاۚ قَالَ إِنَّهُۥ
يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٞ صَفۡرَآءُ فَاقِعٞ لَّوۡنُهَا تَسُرُّ ٱلنَّٰظِرِينَ ﴿٦٩﴾

(٦٢): ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ مَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَلَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ وَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿٦٢﴾﴾:

پاشـان خـوا ﷻ دادوەری کـرد لـە نێـوان کۆمەڵـی خـاوەن کتێبەکانـداو فەرمـووی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ مَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَلَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ وَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿٦٢﴾﴾ ئـەم دادوەریـە تایبەتە بە خـاوەن کتێبـەکان، چونکـە ئەسـتێرە یـان فریشـتە پەرسـتەکان (الصائبیـن) بۆچوونی ڕاسـتو تـەواو ئەوەیـە کـە بێگومـان ئـەوان لـە دەسـتەی گاورەکانن جـا خـوا هەواڵیدا ئەوانـەی ئیمانـدارن لـەو ئۆممەتانـە جولەکـەو گـاورو خاچپەرسـت، هەرکامێـک لەمانـە بـڕوای هێنـا بە خواو بـە ڕۆژی دوایـی، وە نێردراوەکانیان بە ڕاسـت زانـی، بێگومان ئەوانە پاداشـتی مـەزنو ئاسایشـی تەواویان بۆ هەیە، نە ترسـیان هەیـەو نە خەفـەت دەخۆن، بەڵام ئەوانەیـان بێبـڕوا بووە بە خـواو بـە پێغەمبەرەکانیو بـە ڕۆژی دوایی، ئـەوە پێچەوانەی ئەم حاڵەیـە، تـرسو خـەمو خەفەتـی لەسـەرە.

بۆچوونـی ڕاسـت ئەوەیـە ئـەم حوکمـە دەربـارەی ئـەم دەسـتەو تاقمانـە تەنهـا لـە نێوان خۆیاندایـە، نـەک سـەبارەت بـە بڕواهێنـان بـە موحەممـەد ﷺ بێگومـان ئەمـە هەواڵێکـە دەربـارەی ئەوانـەی پێـش هاتنـی موحەممـەد ﷺ هەبـوون، وە ئەمـە بارودۆخـی ئـەوان دەگرێتـەوە، ئـەوەش سروشـتو ڕێگـای قورئانە، ئەگـەر لە نەفـسو دەروونیان لە سـیاقی ئایەتەکانـدا هەنـدێ گومـان دروسـت ببـێ، ئـەوە هەردەبـێ ئەو گومانـە لاببـات، چونکە دابەزێنـراوە لەلایـەن کەسـێکەوە زانیـاری دەربـارەی هەمـوو شـتەکان هەیە، پێـش هاتنە بوونیـان، وە لـە میهرەبانـیو بەزەیـی قورئانە کـە دەوری هەمـوو شـتەکانی داوەو هەمووی

گرتۆتەوە.

ئـەوەش -خوا زاناتـرە- کاتێ کە باسـی نەوەکانی ئیسـرائیلی کردو سەرزەنشـتی کردن، وە باسـی گونـاهو خراپەکاریەکانیانـی کرد، لەوەیـە لە هەندێ نەفـسو دەروونـدا وا تێبگا کە ئـەو سەرزەنشـتە هەمـوو ئەوانی گرتۆتـەوە، بەڵام خوا ﷻ ویسـتی ڕوونی بکاتـەوە ئەوانەی کـە زەمو خراپـە نایانگرێتـەوە بەوەسـفکردنی، هەروەها کاتێ بـە تایبەت باسـی نەوەکانی ئیسـرائیلی کـردوە، وا گومـان دەبـرێ کـە تایبەتـە بەوانـەوە، خـوا ﷻ باسـی حوکمێکی گشـتگیری کـردوە، کـە هەمـوو دەسـتەکان بـە گشـتی دەگرێتـەوە، بـۆ ئـەوەی هـەق دەربکـەوێو گومـانو ئاڵۆزیـش نەمێنـێ، پاکـی بـۆ ئـەو خوایەی لـە کتێبەکەیـدا داینـاوە ئـەوەی عەقڵـی جیهانیانـی پـێ دەدرەوشـێنێتەوە، پاشـان خـوای بـەرزو مەزن سەرزەنشـتی نەوەکانـی ئیسـرائیل دەکات بـەوەی کـە پێشـینیان کردوویانە.

(٦٣-٦٤): ﴿ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَـٰقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُوا۟ مَآ ءَاتَيْنَـٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱذْكُرُوا۟ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ ثُمَّ تَوَلَّيْتُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ ۖ فَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ لَكُنتُم مِّنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ﴿٦٤﴾ ﴾:

یـاد بکەنەوە ﴿ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَـٰقَكُمْ ﴾ (واتە: کـە پەیمانمان لێوەرگرتن) ئـەوە پەیمانێکی قـورسو جەخت لێکرایەوە بە ترسـاندنیان، بـە بەرزکردنەوەی کێوی (الطور) بەسـەریانەوە، وە پێیـان وتـراوە: ﴿ خُذُوا۟ مَآ ءَاتَيْنَـٰكُم ﴾ لـە تـەورات ﴿ بِقُوَّةٍ ﴾ واتـە: بـە ڕاسـتیو تێکۆشـانو ئارامگرتـن لەسـەر فەرمانەکانـی خـوا ﴿ وَٱذْكُرُوا۟ مَا فِيهِ ﴾ (واتە: یـاد بکەنەوە لـەوەی) لـە کتێبەکەتاندایـە بـەوەی بیخوێننـەوەو فێـری بـن ﴿ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴾ (واتە: بەڵکـو خۆتـان بپارێـزن) لە سـزاو تووڕەیی خـوا ﷻ، یـان ببنە خـاوەن تەقـواو خۆپارێزی. لـە پاش ئـەم جەختکردنەوەیە ﴿ تَوَلَّيْتُم ﴾ (واتە: دیسـان پشـتتان هەڵکرد) بە ڕاسـتی ئەوە گەورەترین سـزاتان لەسـەر پێویسـت دەکات، بەڵام ﴿ فَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ لَكُنتُم مِّنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ﴾ (واتـە: ئەگـەر بەخشـشو بەزەیی خـوا نەبووایە بەسـەرتانەوە، ئەوە ئێـوە لە زیانمەنـدان دەبوون).

(٦٥-٦٦): ﴿ وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ ٱلَّذِينَ ٱعْتَدَوْا۟ مِنكُمْ فِى ٱلسَّبْتِ فَقُلْنَا لَهُمْ كُونُوا۟ قِرَدَةً خَـٰسِـِٔينَ ﴿٦٥﴾ فَجَعَلْنَـٰهَا نَكَـٰلًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهَا وَمَا خَلْفَهَا وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٦٦﴾ ﴾:

﴿ وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ ﴾[٥] واتـە: بـە ڕاسـتی زانیوتانەو چەسـپیوە لە لاتـان حاڵی ﴿ ٱلَّذِينَ ٱعْتَدَوْا۟

---

٥) (واتـە: بەسـەرهاتی ئەوانەتـان زانـی کـە لـە ڕۆژی شـەممەدا دەسـتدرێژیان کـردو پێمـان

﴿ مِنكُمْ فِي ٱلسَّبْتِ ﴾ ئەوانــەش ئــەو کەســانەن کــە خــوا باســی چیــرۆکو داســتانەکانیانی بــە دوورو درێــژی کــردوە لــە ســوورەتی (الأعـراف)دا، کــە دەفەرمــوێ: ﴿ وَسۡـَٔلۡهُمۡ عَنِ ٱلۡقَرۡيَةِ ٱلَّتِي كَانَتۡ حَاضِرَةَ ٱلۡبَحۡرِ إِذۡ يَعۡدُونَ فِي ٱلسَّبۡتِ إِذۡ تَأۡتِيهِمۡ حِيتَانُهُمۡ يَوۡمَ سَبۡتِهِمۡ شُرَّعٗا وَيَوۡمَ لَا يَسۡبِتُونَ لَا تَأۡتِيهِمۡۚ كَذَٰلِكَ نَبۡلُوهُم بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ ١٦٣ ﴾ (واتــە: وە لــە بــارەی ئــەو شــارەوە کە لــە نزیک دەریــاوە بوو پرســیاریان لێ بکە کە لە شــەممەدا دەســتدرێژییان دەکــرد، کاتێک ماســییەکان ڕۆژی «بە گەورەگرتنــی» شــەممەیان بــە خۆوە دەرخســتن دەهاتن، بــەڵام کە لە «بە گــەورە گرتنی» شــەممەدا نەدەهاتنــە بەردەســتیان، بەو شــێوەیە «لە ســۆنگەی ئەوەوە کە لــە ڕێ دەردەچوون تاقیمــان دەکردنەوە).

ئــەم تاوانــە مەزنــە خەشــمو قینــی خــوای پێویســت کــردوە لەســەریان، وە کردوونــی بــە ﴿ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ﴾ واتــە: مەیمونێکــی بێنرخــی دوورخــراوە، وە خــوا ئەم ســزایەی کردوە بــە: ﴿ نَكَٰلٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهَا ﴾ واتــە: بــۆ خەڵکــی ئــەو ســەردەمە ﴿ وَمَا خَلۡفَهَا ﴾ واتــە: بــۆ ئەوانــەی لــە دوای ئەوانــەوە دێــن، تــا بەڵگــەو حوججــەی خــوا ﷻ لە ســەر بەنــدەکان پێویســت ببــێ، وە بۆ ئــەوەی دووربکەونەوە لە ســەرپێچی کردنــی، بەڵام ئــەوە نابێتە پەندو ئامۆژگاریەکــی بــە ســوود تەنهــا بــۆ خۆپارێــزان نەبــێ، وە جگــە لــەوان ســوودو پەند لە ئایــەتو نیشــانەکان وەرناگرن.

---

وتــن: بینــە مەیموونــی پەســت، وە گێرامــان (واتــە: ئــەو ڕووداوە) بــە مایــەی پەنــد وەرگرتــنو ســـلەمینەوەی خەڵکــی ڕۆژگــاری خۆیــانو هــی دوای خۆشــیان، وە بــە ئامۆژگاریــی بــۆ پارێــزکاران).

(٦٧-٧٤): ﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تَذْبَحُوا۟ بَقَرَةً ۖ قَالُوٓا۟ أَتَتَّخِذُنَا هُزُوًا ۖ قَالَ
أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٦٧﴾ قَالُوا۟ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِىَ ۚ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا
بَقَرَةٌ لَّا فَارِضٌ وَلَا بِكْرٌ عَوَانٌۢ بَيْنَ ذَٰلِكَ ۖ فَٱفْعَلُوا۟ مَا تُؤْمَرُونَ ﴿٦٨﴾ قَالُوا۟ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ
يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوْنُهَا ۚ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ صَفْرَآءُ فَاقِعٌ لَّوْنُهَا تَسُرُّ ٱلنَّٰظِرِينَ
﴿٦٩﴾ قَالُوا۟ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِىَ إِنَّ ٱلْبَقَرَ تَشَٰبَهَ عَلَيْنَا وَإِنَّآ إِن شَآءَ ٱللَّهُ لَمُهْتَدُونَ ﴿٧٠﴾
قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا ذَلُولٌ تُثِيرُ ٱلْأَرْضَ وَلَا تَسْقِى ٱلْحَرْثَ مُسَلَّمَةٌ لَّا شِيَةَ فِيهَا ۚ قَالُوا۟ ٱلْـَٰٔنَ
جِئْتَ بِٱلْحَقِّ ۚ فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿٧١﴾ وَإِذْ قَتَلْتُمْ نَفْسًا فَٱدَّٰرَْٰٔتُمْ فِيهَا ۖ وَٱللَّهُ مُخْرِجٌ مَّا
كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴿٧٢﴾ فَقُلْنَا ٱضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَا ۚ كَذَٰلِكَ يُحْىِ ٱللَّهُ ٱلْمَوْتَىٰ وَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ
تَعْقِلُونَ ﴿٧٣﴾ ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ فَهِىَ كَٱلْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً ۚ وَإِنَّ مِنَ ٱلْحِجَارَةِ لَمَا
يَتَفَجَّرُ مِنْهُ ٱلْأَنْهَٰرُ ۚ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ ٱلْمَآءُ ۚ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ
ٱللَّهِ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٧٤﴾ ﴾:

﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تَذْبَحُوا۟ بَقَرَةً ۖ قَالُوٓا۟ ﴾ واتە: بیرخۆتانی بخەنــەوە ئــەوەی بەســەرتان هــات لەگــەڵ مووســا ﷺ، لــەو کاتەی کەســێکتان کوشــت، جیــاوازیو دووبەرەکــی کەوتــە نێوانتــان، تــا کارەکــە تــەواو ئاڵــۆز بــوو لــە نێوانتانــدا، خەریــک بــوو شــەڕێکی گەورە ڕووبدات، مووســا ﷺ پێی وتــن بۆ ڕوونکردنــەوەو زانینی بکوژەکــە: مانگایــەک ســەر ببــڕن، پێویســت بــوو ئــەوان پەلــەو دەستپێشــخەری بکەن بۆ جێبەجێکردنــی فەرمانەکەی، وە پشــتی تێنەکەنو ڕەخنەی لێنەگرن، بــەڵام ئەوان یاخیبوون، هیچیــان نەویســت تەنها ڕەخنــە نەبێ. جــا وتیــان: ﴿ أَتَتَّخِذُنَا هُزُوًا ﴾ (واتە: ئایــا گاڵتەمان پێدەکەیــت؟) پێغەمبــەر مووســا فەرمــووی: ﴿ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴾ بێگومــان نەفــام ئــەو کەســەیە کــە قســەیەک دەکات قســەکانی هیچ ســوودێکی نیــە، ئەو کەســە گاڵتە بــە خەڵکــی دەکات.

قَالُواْ ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَ إِنَّ ٱلۡبَقَرَ تَشَٰبَهَ عَلَيۡنَا وَإِنَّآ
إِن شَآءَ ٱللَّهُ لَمُهۡتَدُونَ ٧٠ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٞ لَّا ذَلُولٞ
تُثِيرُ ٱلۡأَرۡضَ وَلَا تَسۡقِي ٱلۡحَرۡثَ مُسَلَّمَةٞ لَّا شِيَةَ فِيهَاۚ قَالُواْ
ٱلۡـَٰٔنَ جِئۡتَ بِٱلۡحَقِّۚ فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُواْ يَفۡعَلُونَ ٧١ وَإِذۡ
قَتَلۡتُمۡ نَفۡسٗا فَٱدَّٰرَٰٔتُمۡ فِيهَاۖ وَٱللَّهُ مُخۡرِجٞ مَّا كُنتُمۡ تَكۡتُمُونَ
٧٢ فَقُلۡنَا ٱضۡرِبُوهُ بِبَعۡضِهَاۚ كَذَٰلِكَ يُحۡيِ ٱللَّهُ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَيُرِيكُمۡ
ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ٧٣ ثُمَّ قَسَتۡ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ
فَهِيَ كَٱلۡحِجَارَةِ أَوۡ أَشَدُّ قَسۡوَةٗۚ وَإِنَّ مِنَ ٱلۡحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ
مِنۡهُ ٱلۡأَنۡهَٰرُۚ وَإِنَّ مِنۡهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخۡرُجُ مِنۡهُ ٱلۡمَآءُۚ وَإِنَّ
مِنۡهَا لَمَا يَهۡبِطُ مِنۡ خَشۡيَةِ ٱللَّهِۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ
٧٤ ۞ أَفَتَطۡمَعُونَ أَن يُؤۡمِنُواْ لَكُمۡ وَقَدۡ كَانَ فَرِيقٞ مِّنۡهُمۡ
يَسۡمَعُونَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُۥ مِنۢ بَعۡدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمۡ
يَعۡلَمُونَ ٧٥ وَإِذَا لَقُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا
خَلَا بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٖ قَالُوٓاْ أَتُحَدِّثُونَهُم بِمَا فَتَحَ ٱللَّهُ
عَلَيۡكُمۡ لِيُحَآجُّوكُم بِهِۦ عِندَ رَبِّكُمۡۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ٧٦

بەڵام مرۆڤی ژیرو عاقڵ پێی وایە گەورەترین ناتەواوی لە دینو عەقڵدا گاڵتە کردنە بە کەسێک وەکو خۆی وایە، ئەگەر چی فەزڵیشی درابێ بەسەریدا، فەزڵو چاکە وا دەخوازێ لێی کە سوپاسی پەروەردگاری بکا، وە بەرانبەر بە بەندەکانی بە سۆزبێ، جا کاتێ مووسا ئەوەی پێ وتن، زانیان کە ئەوە راستە، وتیان: ﴿ ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَۚ ﴾ (واتە: داوامان بۆ بکە لە پەروەردگارت پێمان بڵێ ئەو مانگایە کامەیەو) تەمەنی چەندە؟ ﴿ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٞ لَّا فَارِضٞ ﴾ واتە: گەورەیەو پیر نیە ﴿ وَلَا بِكۡرٌ ﴾ واتە: بچووکیش نیە ﴿ عَوَانُۢ بَيۡنَ ذَٰلِكَۖ فَٱفۡعَلُواْ مَا تُؤۡمَرُونَ ﴾ (واتە: مامناوەندە) لە نێوان ئەو دووانەدا (زوو ئەنجامی بدەن ئەوەی فەرمانتان پێکراوە) واز بێنن لەو توونوو تیژیو کەللەرەقییە! ﴿ قَالُواْ ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوۡنُهَاۚ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٞ صَفۡرَآءُ فَاقِعٞ لَّوۡنُهَا ﴾ واتە: (وتیان: داوا لە پەروەردگارت بکە، بۆمان روون بکاتەوە، رەنگی چۆن بێ، فەرمووی: خوا دەفەرموێ: رەنگی زەردێکی) تەواو تۆخ بێ، ﴿ تَسُرُّ ٱلنَّٰظِرِينَ ﴾ واتە(دڵی تەماشاکاران خۆش دەکات) بە هۆی جوانیەکەیەوە.

﴿ قَالُواْ ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَ إِنَّ ٱلۡبَقَرَ تَشَٰبَهَ عَلَيۡنَا ﴾ (واتە: وتیان: داوامان بۆ لە پەروەردگارت بکەچۆن بێ ئەو مانگایە؟ بەراستی مانگاکەمان لێ تێکچوو) نەگەیشتووینەتە ئەوەی تۆ دەتەوێ ﴿ وَإِنَّآ إِن شَآءَ ٱللَّهُ لَمُهۡتَدُونَ ﴾ (وە ئەگەر خوا بیەوێ ئێمە لە رێی راست گرتووان دەبین).

﴿ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٞ لَّا ذَلُولٞ ﴾ (واتە: رانەهێنرابێ بۆ کار کردن) ﴿ تُثِيرُ ٱلۡأَرۡضَ ﴾ بە کێڵانی زەوی ﴿ تَسۡقِي ٱلۡحَرۡثَ ﴾ واتە: ئاودێریو کشتوکاڵی پێنەکرابێ ﴿ مُسَلَّمَةٞ ﴾ (واتە: بێ نەنگ بێ) لە ناتەواوی یان کار کردن ﴿ لَّا شِيَةَ فِيهَاۚ ﴾ واتە: هیچ رەنگێکی

تێـدا نەبـێ، جگە لـەو ڕەنگەی کە پێشـتر پێی وەسـف کراوە.

﴿ قَالُواْ ٱلۡـَٔـٰنَ جِئۡتَ بِٱلۡحَقِّۚ فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُواْ يَفۡعَلُونَ ﴾وتیـان: ئێسـتا هەواڵـی ڕاسـتت هێنـا بـە بەڵگەی ڕوونو ئاشـکرا، ئەمـە نەفامی ئـەوان دەردەخـا، ئەگەرنا لـە یەکەمجارەوە ئـەو هـەقو ڕاسـتی بـۆ هێنابـوون، ئەگـەر ئـەوان هـەر مانگایەکیـان هەڵبژاردایـە ئـەوە مەبەسـتەکە دەسـتەبەر دەبـوو، بـەڵام قورسـیان کـرد بـە پرسـیار کردنێکـی زۆر، خـوای گـەورەش لەسـەری قـورس کـردن، وە ئەگـەر نەیـان وتبایـە (إن شاء الله) ئـەوە هـەر نەیـان دەدۆزیـەوە، ئیتـر ﴿ فَذَبَحُوهَا ﴾واتە: ئـەو مانگایان سـەربڕی کە وەسـفکرابوو بەو سـیفەتانە ﴿ وَمَا كَادُواْ يَفۡعَلُونَ ﴾(واتـە: خەریـک بـوو ئەو سـەربڕینە نەکـەن) بە هۆی عینـادیو کەللەڕەقیانەوە.

کاتـێ کە سـەریان بڕی، پێمـان وتـن: ئەندامێکی مانگا سـەربڕاوەکە لـە کوژراوەکە بدەن، جـا ئەندامێکـی دیاریکـراو بـێ، یان دیـاری نەکرابـێ، لە دیـاری کردنیدا هیچ سـوودێک نیـە، دوایی بـە هەندێکـی لێیاندا خـوا مردووەکـەی زیندوو کـردەوە، ئەوەی ئاشـکرا کرد کە شـاردبوویانەوە، هەواڵیـدا بە بکوژەکەی، وە لـە زیندووبوونەوەیدا-کە بـە چاوی خۆیان بینیـان- بەڵگەیـە لەسـەر زیندووکردنـەوەی مـردوو ﴿ لَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴾(واتـە: بۆ ئەوەی تێبگـەن) دووربکەونـەوە لـەوەی زیانـی هەیە بۆتـان. ﴿ ثُمَّ قَسَتۡ قُلُوبُكُم ﴾(واتـە: دڵیان بـە توونديو وشـکو ڕەق بـوو، ئامۆژگـاری هیـچ کاریگەریەکی بۆیـان نەبوو ﴿ مِّنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ ﴾واتـە: پـاش ئـەوەی کـە خوا ئـەو نیعمەتـە مەزنەی پـێ بەخشـین، وە ئـەو هەموو موعجیـزە گەورانـەی پێ پیشـاندان، بۆیە نەدەبـوو ئێـوە دڵەکانتان ڕەق ببـێ، چونکە ئەوەی بینیتـان وایدەخواسـت دڵ نـەرمو ملکەچ بن.

پاشـان وەسـفی دڵ ڕەقیەکەیانـی دەکات، دەفەرمـوێ: ﴿ كَٱلۡحِجَارَةِ ﴾ (وەکـو بـەردە) کـە ڕەقیەکـەی لـە ئاسـن توونددتـرە، چونکـە ئاسـنو مـس ئەگـەر لـە ئاگـر بتوێنرێنەوە دەتاوێنـەوە، بـە پێچەوانەی بـەردەکان. وە کە دەفەرمـوێ: ﴿ أَوۡ أَشَدُّ قَسۡوَةٗ ﴾واتە: دڵەکان کـورت هەڵنەهێنـراون لـە ڕەقـی بـەردەکان، وە ﴿ أَوۡ ﴾بە واتـای (بل) نایەت، لە پاشـان باسـی ئـەوە دەکات کـە بـەردەکان چاکترن لـە دڵەکانی ئـەوان، جـا فەرموویەتی: ﴿ وَإِنَّ مِنَ ٱلۡحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنۡهُ ٱلۡأَنۡهَٰرُۚ وَإِنَّ مِنۡهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخۡرُجُ مِنۡهُ ٱلۡمَآءُۚ وَإِنَّ مِنۡهَا لَمَا يَهۡبِطُ مِنۡ خَشۡيَةِ ٱللَّهِ ﴾(واتـە: بەڕاسـتی بـەردی وا هەیـە لـە چەنـد لاوە جۆگـەی ئـاوی لێهەڵدەقوڵـێ، وە بێگومـان هـی وایـان هەیـە کـە لەت لـەت دەبێو ئـاوی لێ دێتـە دەرێ،

وە بەڕاستی هەی وایان هەیە لە ترسی خوا لە لووتکەی شاخەکان بەردەبێتەوە) ئا بەم شتانە فەزڵی بەردەکان دراوە بەسەر دڵەکانتاندا.
پاشان خوا ﷻ هەڕەشەی لێکردوون بە توندترین هەڕەشە ﴿وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ﴾ بەڵکو خوا زانایە بە کردەوەکانتان، گەورەو بچووکیان دەپارێزێ، وە بە تەواوترین شێوە پاداشتان دەداتەوە.
بزانە زۆرێک لە توێژەرانی قورئان -ڕەحمەتی خوایان لێ بێ- لە چیرۆکو سەرگوزەشتەی نەوەکانی ئیسرائیل چیرۆکێکی زۆریان هێناوەتەوە، وە ئایەتەکانی قورئانیان لەسەر داناوە، کردوویانە بە تەفسیر بۆ کتێبی خوا، بە بەڵگەی فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ: {وَحَدِّثُوا عَنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَلاَ حَرَجَ} (أخرجه أحمد برقم: (٦٤٨٦)، والبخاري برقم: (٣٢٧٤)) (واتە: لە بەنی ئیسرائیلەوە ڕیوایەت بکەن بەبێ هیچ نارەحەتیەک).
ئەوەی من دەیبینم بەڕاستی ئەوە -ئەگەر دروستیش بێ گواستنەوەی قسەکانیان لە ڕوویەکەوە- دەبێ بە تەنها بێ‌و نەبەستراوە بێ، دانەبەزێنرابێتە سەر کتێبی خوا، بێگومان نابێت ئەوە بکرێت بە تەفسیر بۆ کتێبی خوا، ئەگەر لە لایەن پێغەمبەرەوە پشتڕاست نەکرابێتەوە، لەبەر ئەوو پلەو پایەی هەیەتی هەروەکو پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {لا تُصَدِّقُوا أَهْلَ الْكِتَابِ، وَلا تُكَذِّبُوهُمْ} (أخرجه البخاري برقم: (٤٢١٥)). (واتە: خاوەن کتێبەکان نە بەڕاستیان دابنێن‌و نە بە درۆیان دابنێن).
جا ئەگەر گومان هەبێ لە پلەو پایەیدا، بێگومان شتێکی زانراوە لە پێویستیەکانی ئاینی ئیسلامە کە بەڕاستی بڕوا پێهێنانی قورئان واجب‌و پێویستە، وە بێژەکانی‌و ماناکانی براوەتەوە، کەواتە: دروست نیە ئەو چیرۆکانەی گوازراونەتەوە بە گێڕانەوەی نادیار، کە بە زۆری گومانی ئەوەی لێدەکرێت درۆبێت، یان زۆربەی درۆ بێت، بکرێنە مانا بۆ کتێبی خوا ﷻ، هیچ کەس لەمەدا گومانی نیە، بەڵام بەهۆی بێئاگابوون لەمە ئەوەی ڕویدا کە ڕویدا، خوا ﷻ پشتگیرو یارمەتیدەرە.
(٧٥-٧٨): ﴿أَفَتَطۡمَعُونَ أَن يُؤۡمِنُواْ لَكُمۡ وَقَدۡ كَانَ فَرِيقٞ مِّنۡهُمۡ يَسۡمَعُونَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُۥ مِنۢ بَعۡدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ٧٥ وَإِذَا لَقُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَا بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٖ قَالُوٓاْ أَتُحَدِّثُونَهُم بِمَا فَتَحَ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمۡ لِيُحَآجُّوكُم بِهِۦ عِندَ رَبِّكُمۡۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ٧٦ أَوَلَا يَعۡلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعۡلِنُونَ ٧٧ وَمِنۡهُمۡ أُمِّيُّونَ لَا يَعۡلَمُونَ ٱلۡكِتَٰبَ إِلَّآ أَمَانِيَّ وَإِنۡ هُمۡ إِلَّا يَظُنُّونَ ٧٨﴾:

﴿ أَفَتَطْمَعُونَ أَن يُؤْمِنُوا۟ لَكُمْ وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَسْمَعُونَ كَلَـٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُۥ مِنۢ بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴾ ئەمـە یەکلاکردنـەوەو پچڕاندنی ئومێـدی بڕوادارانە لە بڕواهێنانـی خـاوەن کتێبـەکان، واتـە: بە تەمـای بڕواهێنانیان مەبـن، حاڵەتی ئـەوان ئومێدی ئـەوەی لێناکرێـت، چونکە ئـەوان دوای تێگەیشـتنیان دەسـتکاریان دەکـرد، مانایەکیان بۆ دادەنـا خـوا ﷻ نەیدەویسـت، تـا خەڵکـی واتێبگەیەنن کە ئـەوە لەلایەن خـواوە هاتووە، لە کاتێکـدا لەلایـەن خـواوە نەهاتبـوو، جـا ئەگەر ئەمـە حاڵیان بێت لـە کتێبەکەیانـدا کە بە شـەرەفو ئاینـی خۆیانی دەزانـن، ڕێگری خەڵـک دەکەن لـە ڕێگای خوا، چـۆن ئومێدیان لێدەکـرێ بـڕوا بە ئێـوە بێنن؟! ئـا ئەمە لە شـتە هـەرە دوورەکانە.

پاشـان باسـی حاڵەتـی دووڕوویـی خـاوەن کتێبەکانـی کـردوە، فەرموویەتـی: ﴿ وَإِذَا لَقُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا ﴾ بڕواهێنانیـان بـۆ بـڕواداران دەردەخسـت بـە قسـەو تەنها بە زمانیـان، بەبـێ ئـەوەی لـە دڵیانـەوە بێـت ﴿ وَإِذَا خَلَا بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ ﴾ ئەگەر کەس لـە دەوروو بەریـان نەبوایـە جگە لە خـاوەن ئاینەکـەی خۆیـان، هەندێکیان بـە هەندێکی دیکەیـان دەوت: ﴿ أَتُحَدِّثُونَهُم بِمَا فَتَحَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ ﴾ واتـە: ئایـا ئێـوە بڕواهێنانیـان بـۆ ئاشـکرا دەکـەن، وە هەواڵیـان دەدەنـێ ئێوەش وەکـو ئەوانن، ئـەوە دەبێتە بەڵگـەو حوججە بۆ ئـەوان لەسـەر ئێوە؟

(جولەکـەکان لـە نێـوان خۆیـان) دەڵێـن: دانمـان بـەوەدا نـاوە، کە ئـەوەی (مسـوڵمانان) لەسـەرین هـەقو ڕەوایـە، وە ئـەوەی ئـەوان (خۆیـان) لەسـەری دەڕۆن بەتـاڵو پووچـە، ئەمـە دەکەنـە بەڵگە بەسـەرتانەوە لـە لای پەروەردگارتان ﴿ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴾ واتـە: ئایا ئێوە عەقڵتـان نیـە نافامـن؟ واز لـەوە بێنن کە بەڵگەیـە بەسـەرتانەوە؟ ئەمە قسـەی هەندێکیانە بۆ هەندێکـی تر.

أَوَلَا يَعْلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٧٧﴾
وَمِنْهُمْ أُمِّيُّونَ لَا يَعْلَمُونَ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّآ أَمَانِيَّ وَإِنْ هُمْ
إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٧٨﴾ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ يَكْتُبُونَ ٱلْكِتَٰبَ بِأَيْدِيهِمْ
ثُمَّ يَقُولُونَ هَٰذَا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ لِيَشْتَرُوا۟ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا
فَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتْ أَيْدِيهِمْ وَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا يَكْسِبُونَ
﴿٧٩﴾ وَقَالُوا۟ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعْدُودَةً قُلْ
أَتَّخَذْتُمْ عِندَ ٱللَّهِ عَهْدًا فَلَن يُخْلِفَ ٱللَّهُ عَهْدَهُۥٓ أَمْ
تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨٠﴾ بَلَىٰ مَن كَسَبَ سَيِّئَةً
وَأَحَٰطَتْ بِهِۦ خَطِيٓـَٔتُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ هُمْ
فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٨١﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ
أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٨٢﴾ وَإِذْ أَخَذْنَا
مِيثَٰقَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ لَا تَعْبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ
إِحْسَانًا وَذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَقُولُوا۟
لِلنَّاسِ حُسْنًا وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ ثُمَّ
تَوَلَّيْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا مِّنكُمْ وَأَنتُم مُّعْرِضُونَ ﴿٨٣﴾

ئنجـا دەفەرمـوێ: ﴿أَوَلَا يَعْلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ﴾ (واتـە: ئایـا نازانـن كـە بـە دڵنیایـی خوا ئاگـاداره بـەوەی پەنهانی دەكـەنو ئەوەی ئاشـكرای دەكـەن) ئەگەرچـی ئـەوەی لـە ناخـی ئەواندایـە لـە نێوانـی خۆیـان دەیشـارنەوە، وادەزانـن ئـەوان بـەو نهێنیەیـان بەڵگـە بەسـەریانەوە ناكەوێتە دەسـتی بڕواداران، بە ڕاسـتی ئەمـە نەفامیەكی گەورەیـە، خوا ﷻ بە نهێنیو ئاشـكرایان دەزانـێ، بۆ بەندەكانی دەریدەخـات ئەوەی ئەوان لەسـەری دەڕۆن.

﴿وَمِنْهُمْ﴾ واتـە: هەنـدێ لـە خـاوەن كتێبـەكان، ﴿أُمِّيُّونَ﴾ واتـە: عـەوامو نەخوێنـدەوارن لـە خـاوەن زانسـتەكان نین ﴿لَا يَعْلَمُونَ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّآ أَمَانِيَّ﴾ واتـە: هیـچ بەشـێكیان نیـە لـە كتێبی خـوادا تەنها خوێندنــەوە نەبـێو بـەس، وە هیچ هەواڵێكیـان نیە دەربارەی پێشـینانی خۆیـان، ئەوانەی كە دەیزانـن بە چاكترین زانسـت، وە ئەوانـە تەنها شـوێنی گومانو لاسـاییكردنەوە كەوتبوون لە خـاوەن زانسـتەكانیانەوە.

لـەم دەقانـەدا باسـی زانـاو نەخوێنـدەوارو دووڕووەكانـی كـردوە، وە ئەوەیشـی كـە دووڕوو نەبـووە لـە وانـن، جـا زاناكانیـان پەیوەسـتن بـەو گومڕاییـەی لەسـەری دەڕۆن، نەخوێندەوارەكانیـش شـوێنی ئـەوان كەوتبـوونو لاسـاییان دەكردنـەوە، هیـچ بەرچـاو ڕوونیەكیـان نیـە، هیـچ تەمایەكتـان نیـە لـەو دوو دەسـتەیەدا.

(٧٩): ﴿فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ يَكْتُبُونَ ٱلْكِتَٰبَ بِأَيْدِيهِمْ ثُمَّ يَقُولُونَ هَٰذَا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ لِيَشْتَرُوا۟ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا فَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتْ أَيْدِيهِمْ وَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا يَكْسِبُونَ ﴿٧٩﴾﴾:

﴿فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ يَكْتُبُونَ ٱلْكِتَٰبَ بِأَيْدِيهِمْ ثُمَّ يَقُولُونَ﴾ خـوا ﷻ هەڕەشـەی لەوانـە كردوە كـە دەسـتكاری كتێبـی خوایـان كـردوە، ئەوانەی بـە دەسـتكاریكردنو ئەوەی بە دەسـتی خۆیـان دەینووسـن، دەڵێـن: ﴿هَٰذَا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ﴾ (واتە: ئـەم نامەیە لە لایـەن خواوەیە)

ئەمــە ئاشــکرا کردنی پووچو بەتاڵو شــاردنەوەی هەق دەگرێتەوە، لە ڕاســتیدا ئەوان ئەمەیان کــرد لەگــەڵ ئــەوەدا دەیانزانــی ﴿ لِيَشۡتَرُواْ بِهِۦ ثَمَنٗا قَلِيلٗاۖ ﴾(بۆ ئەوەی شــتێکی کەمی پــێ بکــڕن)، وە دونیا هەمــووی لەســەرەتاوە تا کۆتایــی نرخێکــی کەمــە، پووچەڵیەکەیان کردۆتــە داوێــک بۆ ئــەوەی هەرچی لــە دەســتی خەڵکیدایە بــۆ خۆیانی ببەن، جا ســتەمیان لێکردوون لــە دوو ڕووەوە:

لە ڕووی ئاڵۆزکردنو شێواندنی ئاینەکەیان لە پێش چاویان.

وە لــە ڕووی بردنــی ماڵەکانیــان بــە ناهەق، بەڵکو بــە ناهەقترین شــێوە، کە مەزنتــرە لەوەی بــە زۆرەملــێو دزێتی لێیــان وەربگرن.

بۆیە هەڕەشــەی لێکــردوون بەم دووانە، فەرموویەتــی: ﴿ فَوَيۡلٞ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتۡ أَيۡدِيهِمۡ ﴾ واتــە: لــە دەســتکاری، وە نارەوایەتــی ﴿ وَوَيۡلٞ لَّهُم مِّمَّا يَكۡسِبُونَ ﴾ (واتە: هــاوار بۆ ئەوان لــەوەی کە پەیدای دەکەن) لە ســەروەتو ســامان، (الويل): ســزای توندو ئاخ هەڵکێشــانە، لە چوار چێوەی ئەوەیشــدا هەڕەشــەی توونــد دەگرێتەوە.

شــێخی ئیســلام کاتێ باســی ئــەم دەقانــەی کــردوە وتویەتی: لەو دەقــەی کــە فەرموویەتی: ﴿ أَفَتَطۡمَعُونَ ﴾ تاکــو ﴿ يَكۡسِبُونَ ﴾ بەڕاســتی خــوا ﷻ سەرزەنشــتی ئەوانــەی کردوە کە وشــەکان لە شــوێنی خۆیان دەگۆڕنو دایناێن، ئەمــەش ئەوە دەگرێتەوە کەســێک قوڕئانو ســوننەت بکاتــە بەڵگــە بۆ بیدعــەو خورافیات. بەهەمان شــێوە سەرزەنشــتی ئەوانــەی کردوە کــە هیچ لــە کتێــب نازانن تەنهــا ئــاواتو گومانی باتــڵ نەبێت، ئەویــش ئــەوە دەگرێتەوە کەســێک واز لــە بیــر کردنــەوەو ڕامــان لــە قوڕئــان بهێنێ، هیــچ نەزانــێ تەنها فێــر بوونی خوێندنــەوەی پیتەکانــی نەبێــت، وە ئــەوەش دەگرێتــەوە کەســێک کتێبێ بە دەســتی خۆی بنوسێت پێچەوانــەی کتێبــی خــوا ﷻ بــێ (بۆ ئــەوەی دونیا بــە دەســت بێنێ) بڵێــت: ئەمە لــە لایەنــی خواوەیــە: وەکو ئــەوە وایــە بڵێت: ئەمە شــەریعەتو ئاینــە، ئەمە مانــای قوڕئانو ســوننەتە، ئەمــە ڕێبازی پێشــینە، ئەمە بنەمای ئاینە، کە پێویســتە لەســەر هەمووان بــڕوا بەمە بکــەن، وە ئەوەیــش دەگرێتــەوە ئــەوەی لــە لایەتــی لە قوڕئــانو ســوننەت بیشــارێتەوە، بۆ ئــەوەی دژەکــەی نەیکاتــە بەڵگە بــۆ ئەو هەقــەی کــە دەیڵێت. ئــەم کاروبارانــە زۆرن لە لای ئەوانــەی شــوێنی هــەواو ئارەزوویان کەوتوون بە گشــتی وەکــو: (الرافضة) (بەشــێ لە شــیعەکان)، بەدرێژیــش وەکــو زۆرێک لەوانــە دەدرێنە پاڵ شــارەزایانی شــەریعە (فقهاء).

(٨٠-٨٢): ﴿ وَقَالُواْ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامٗا مَّعۡدُودَةٗۚ قُلۡ أَتَّخَذۡتُمۡ عِندَ ٱللَّهِ عَهۡدٗا

فَلَن يُخْلِفَ ٱللَّهُ عَهْدَهُۥٓ ۖ أَمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨٠﴾ بَلَىٰ مَن كَسَبَ سَيِّئَةً
وَأَحَٰطَتْ بِهِۦ خَطِيٓـَٔتُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٨١﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟
وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٨٢﴾ ﴾

﴿ وَقَالُوا۟ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعْدُودَةً ﴾ خوا ﷻ باسی (کردەوە) ناشرینەکانیانی کردوە، پاشان لەگەڵ ئەمەدا باسی ئەوەی کردوە، ئەوان لەگەڵ ئەمەدا خۆیان زۆر بە پاک دادەنێن، وتەزکیەی نەفسی خۆیان دەکەن، وە شایەتی بۆ ئەدەن بەرزگاربوون لە ئاگری دۆزەخو سەرکەوتن‌و بەدەستهێنانی پاداشت، وە دەڵێن: ئاگری دۆزەخ نایانسوتێنێ تەنها چەند ڕۆژێکی ژمێردراو نەبێ، واتە: ئەوەندە کەمە بە پەنجەی دەستەکان دەژمێردرێت، دوو شتیان پێکەوە کۆ کردەوە بێ ڕێزیو ئاسایش.

کاتێ کە دەرکەوت ئەمە تەنها قسەو بانگەشەی بێ بنەمایە، خوا ﷻ ڕەتی کردەوە بەسەریاندا، فەرمووی: ﴿ قُلْ ﴾ بە ئەوان بڵێ: ئەی پێغەمبەر ﷺ ﴿ أَتَّخَذْتُمْ عِندَ ٱللَّهِ عَهْدًا ﴾ (واتە: ئایا پەیمانتان لە خواوە وەرگرتووە) بە برواهێنان بە خواو بە پێغەمبەرانیو بە گوێڕایەڵی کردنی، ئەم بەڵێنە کە پێویستکارە بۆ ڕزگاربوونی خاوەنەکەی ناگۆڕێو ئاڵوگۆڕی بەسەردا نایەت؟ ﴿ أَمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾ خوا ﷻ هەواڵیداوە، ڕاستی بانگشەکەیان وەستاوە لەسەر یەکێک لەو دوو کارانەی کە سێیەمیان بۆ نیە: یان دەبێ لەلای خواوە بەڵێنیان وەرگرتبێ، ئەو کاتە بانگەشەکەیان ڕاستو دروست دەبێ، یان ئەوەیە لەخۆیانەوە بەناو خواوە قسەیان کردوە، ئەوەش دەبێتە درۆ، ئەوە زیاتر پێی ڕیسواو سەرشۆڕ دەبن، بە ڕاستی خوا ﷻ حاڵیانی زانیوە کە ئەوان لە لای ئەوەوە بەڵێنیان وەرنەگرتووە، بە هۆی بە درۆدانانی زۆرێک لە پێغەمبەرانیان، هەتا گەیشتنە ئەو حاڵەتەی دەستەیەکیان لێکوشتن، وە وازیان لە گوێڕایەڵی خوا ﷻ هێناو پەیمانیان شکاند، بەو شێوەیە دەرکەوت ئەوانە لە خۆیانەوە قسە بەدەم خواوە دەکەنو دروستی دەکەن، شتانێک دەڵێن هیچی لێنازانن، وە قسە کردن بەدەم خواوە بەبێ زانست لە مەزنترینی قەدەغەکراوەکانەو ناشرینترینیانە.

پاشان خوا ﷻ باسی بڕیارو حوکمێکی گشتی کرد بۆ هەر تاکێک، نەوەکانی ئیسرائیلو جگە لەوانیش دەچنە ناویەوەو دەیگرێتەوە، ئەویش ئەو بڕیارو حوکمەی کە حوکمی غەیری ئەو نیە، نە خەیاڵو ئاواتەکانی ئەوانە بە سیفەتی لە نێو چووەکانو ڕزگار بووەکانی فەرمووی: ﴿ بَلَىٰ ﴾ واتە: نەخێر کارەکە بەو شێوە نیە وەک ئەوەی باستان

کـرد، بێگومان ئەوە قسـەیەکە هیـچ حەقیقەتێکی نیە، بەڵکـو ﴿مَن كَسَبَ سَيِّئَةً﴾ ئەوە نەناسـراوە (نكرة) لە سـیاقی مەرجـدا (شرط) هاتوە، مەبەسـت لێرەدا هاوەڵدانانـە، بە بەڵگەی ئەو فەرمایشـتەی خـوا ﷻ: ﴿وَأَحَاطَتْ بِهِۦ خَطِيٓـَٔتُهُۥ﴾واتـە: دەوری بکەرەکەی بداتو، هیـچ کەلێـنو هەناسـەی بـۆ نەهێڵێتـەوە، ئەمە نابـێ تەنهـا هاوەڵدانـان نەبێ، بەڕاسـتی هەر کەسـێک ئیمانی هەبێ تـاوان دەوری نادات و ناپۆشـێ.

﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ خەواریجـەکان ئـەوە دەکەنـە بەڵگـە لەسـەر کوفری خـاوەن گوناهو تـاوان، نەخێر وانیـە، ئـەوە بەڵگەیە بەسـەریانەوە هەروەکو دەیبینـی، ئـەوە دیاردەیەکـە لـە هاوەڵدانانـدا، بەهەمان شـێوە هەر خـاوەن باتڵێـک بەڵگە بە ئایـەت، یان فەرموودەی دروسـت (صحیح) لەسـەر قسـە پووچەکـەی دەهێنێتـەوە، جا دەبێ ئـەوەی دەیکاتـە بەڵگـە بۆ خـۆیو بەڵگەی پـێ دێنێتـەوە ببێتە بەڵگە بەسـەریەوە.

﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ (ئەوانـەی ئیمانیـان هێناوە) بە خـواو فریشـتەکانیو بەکتێبەکانیو بە ڕەوانەکراوەکانـیو بـە ڕۆژی دوایـی، ﴿وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ کـردەوەکان چـاک نابن تەنهـا بە دوو مـەرج نەبێ:

یەکەم: دەبێ تەنها بۆ خوا ﷻ بێ.

دووەم: دەبێ بە پێی شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەر بێ.

پوختـەی ئـەم دوو دەقـە، ئەوانە خاوەن ڕزگابـوونو سـەرفرازیین، ئەوانەن کـە خاوەنی ئیمانو کـردەوەی چاکـن، ئەوانەیشـی لەنـاو چـوون، خاوەنـی ئاگـرن، ئەوانـەن هاوەڵیـان بۆخوا ﷻ دانـاوەو بێبـروان پێی.

(٨٣): ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ لَا تَعْبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَانًا وَذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسْنًا وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ ثُمَّ تَوَلَّيْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا مِّنكُمْ وَأَنتُم مُّعْرِضُونَ ﴿٨٣﴾﴾:

ئـەم شـەریعەتانە لە بنەماکانـی ئاینن، کە خوا لە هەموو شـەریعەتێکدا فەرمانـی پێکردوە، چونکە بەرژەوەندیـە گشـتیەکان دەگرێتەوە لە هەموو کاتو شـوێنێکدا، نەسـخو هەڵوەشـاندنەوە تیایدا ڕوونـادات، وەکـو بنەماکانی ئایـن، لەبەر ئەمە خـوا فەرمانـی پێکردووین پێیـان، فەرموویەتی: ﴿وَٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشْرِكُواْ بِهِۦ شَيْـًٔا﴾ تـا کۆتایی دەقەکـە، جا وتەی خوا ﷻ: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ ئەمـە لـە دڵرەقـی جولەکەکانە، هـەر فەرمانێکیان پێکرابایە سـەرپیچیان دەکـردو قبووڵیـان نەدەکرد، مەگەر بە سـوێندێکی قوورسو گـرانو پەیمانێکی پتـەو بووایە.

﴿ لَا تَعۡبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ ﴾ (واتــە: هیــچ شــتێک نەپەرســتن جگــە لــە خــوا) ئەمــە فەرمانێکە بە بەندایەتــی خــوا بــە تــاکو تەنهــاو قەدەغەکردنــە لــە شــیرکو هاوەڵدانــان بۆی، ئەمــەش لە بنەماکانــی ئاینــە، هیــچ یەکێک لــە کــردەوەکان وەرناگیرێــن، ئەگەر ئەمــە بنەمــاو بنەرەتیان نەبــێ، ئــا ئەمە مافــی خوایــە بەســەر بەندەکانیەوە.

پاشــان فەرموویەتــی: ﴿ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَانٗا ﴾ واتــە: چاکــە بکــەن لەگــەڵ دایــکو باوکتانــدا بــە چاکتریــن شــێوە، ئەمەش هەمــوو چاکەیەکــی گوفتــارو کــردار دەگرێتەوە، کــە چاکە بێ بــۆ ئــەوان، وە قەدەغەکردنــی خراپــەی تێدایــە بەرانبــەر دایــکو بــاوک، یــان چاکەنەکــردن لەگەڵیانــداو خراپەکــردن بەرانبەریــان، چونکــە واجــبو پێویســت ئەوەیــە چاکەیــان لەگەڵدا بکــرێ، وە فەرمانکــردن بــە شــتێ قەدەغەکردنــە لــە دژەکەی.

وە بــۆ چاکــە دوو دژ هەیە: خراپــە، ئەوە گەورەترین تاوانــە، وە وازهێنان لە چاکــە بەبێ خراپە، ئەمــەش قەدەغەیــە، بەڵام واجب نیــە بە یەکەمەوە ببەســترێتەوە، وە بــە هەمان شــێوە وتراوە: لە پەیوەنــدی خزمایەتــیو هەتیوو نەدارانــدا، وە درێژیو وردەکاریو ئیحســانو چاکە ناژمێردرێ، بەڵکــو ســنووری بــۆ دادەنرێ وەکو چۆن لە پێشــەوە باســمان کرد.

پاشــان فەرمانــی کــردوە بــە چاکەکــردن لەگــەڵ خەڵکیدا بــە گشــتی، فەرموویەتی: ﴿ وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسۡنٗا ﴾ لــە وتــەی چاکو جوانیــش فەرمانکردنە بــە چاکەو قەدەغەکردنــە لە خراپە، وە فێــر کردنی زانســتو ســڵاو کردنو ڕووخۆشــیو جگــە لەوانەش هەمــوو وتەیەکی جوانو چاک.

کاتــێ کــە مــرۆڤ ناتوانێ هــاوکاری هەمــوو خەڵکی بکات بــە ماڵەکــەی، فەرمانــی پێکردوە بــەوەی لــە توانایدایــە بە چاکەکــردن لەگــەڵ هەمــوو بەدیهێنراوەکانــدا، ئەویــش چاکەکردنی بــە قســە، لــە چوارچێــوەی ئــەوەدا قەدەغــە کردنــە لــە قســەی ناشــرین بــە خەڵکــی تەنانەت بێبروایانیــش، بۆیــە خــوای بــەرز فەرموویەتــی: ﴿ وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ ٤٦ ﴾العنکبوت، (واتــە: گفتوگــۆ لەگــەڵ خــاوەن کتێبــەکان مەکــەن مەگــەر بــە جوانتریــن شــێوە)، وە لــە ڕەوشــتی مرۆڤدا کــە خــوا ﷻ بەندەکانی لەســەر پــەروەردە کردوە، ئەوەیــە دەبــێ مــرۆڤ پــاک بێــت لــە وتــەو کردەوەکانیــدا، خراپــەکارو دەم پیــسو تانەدەر نەبــێ، بەڵکــو دەبێ ڕەوشــتی بەرزبــێو زۆر لەســەرخۆبێ، لەگــەڵ هەموو کەسێکدا گونجاوبێ، ئارامگربــێ لەســەر ئــەو ئێشو ئــازارەی کــە لەلایەن خەڵکیــەوە تووشــی دەبــێ، جێبەجێکاری فەرمانــی خوابــێ، ئومێدی بــە پاداشــتی هەبێ.

پاشــان فەرمانــی پێکــردوون بــە ئەنجامدانــی نوێــژو پێدانــی زەکات، وەکــو چــۆن لە پێشــەوە باســکراوە کە نوێژ دڵســۆزی بۆ پەرســتراو لە خۆدەگــرێو زەکاتیش چاکە لەگــەڵ بەندەکانیدا لــە خۆدەگرێ.

﴿ ثُمَّ ﴾ لــە دوای فەرمــان پێکردنتــان بــەم فەرمانــە چاکانە، کە ئەگــەر مرۆڤێکــی عاقڵو ژیر تەماشــایان بــکات بــۆی دەردەکەوێ کە بە ڕاســتی لە چاکەکانــی خوا ﷻ بەســەر بەندەکانیەوە، ئەوەیــە کــە فەرمانی پێکــردوون پێیــان، وە فەزڵو چاکــەی پێیانــداوە بەســەریاندا، پەیمانی لێ وەرگرتوون ﴿ تَوَلَّيْتُمْ ﴾ (پشــتان تێکردوە)، لەســەر شــێوەی پشــت تێکردن، چونکە پشــت تێکەر جاری وایە پشــت دەکاتو مەبەســتی گەڕانەوەشــی هەیە بۆ ئەو شــتەی پشــتی تێکردوە، بــەڵام ئەوانــە هیــچ حــەزوو ڕەغبەتێکــی گەڕانەوەیــان نیە لــەو کارانــەدا، پەنا دەگریــن بە خوا لە سەرشــۆڕیی.

خــوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ ئەمــە جیاکردنەوە (إستثناء)ە تــا وا تێنەگات کە ئەوان هەموویان پشــتیان تێکــردوە، هەواڵی داوە کەمێــک لەوان خواپاراســتوویەتیو جێگیری کردوە.


وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ لَا تَسْفِكُونَ دِمَآءَكُمْ وَلَا تُخْرِجُونَ
أَنفُسَكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ ثُمَّ أَقْرَرْتُمْ وَأَنتُمْ تَشْهَدُونَ ﴿٨٤﴾
ثُمَّ أَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ تَقْتُلُونَ أَنفُسَكُمْ وَتُخْرِجُونَ فَرِيقًا
مِّنكُم مِّن دِيَٰرِهِمْ تَظَٰهَرُونَ عَلَيْهِم بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ
وَإِن يَأْتُوكُمْ أُسَٰرَىٰ تُفَٰدُوهُمْ وَهُوَ مُحَرَّمٌ عَلَيْكُمْ
إِخْرَاجُهُمْ أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ ٱلْكِتَٰبِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ
فَمَا جَزَآءُ مَن يَفْعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمْ إِلَّا خِزْيٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ
ٱلدُّنْيَا وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يُرَدُّونَ إِلَىٰٓ أَشَدِّ ٱلْعَذَابِ وَمَا ٱللَّهُ
بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٨٥﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشْتَرَوُا۟ ٱلْحَيَوٰةَ
ٱلدُّنْيَا بِٱلْءَاخِرَةِ فَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ
﴿٨٦﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَقَفَّيْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ
بِٱلرُّسُلِ وَءَاتَيْنَا عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَيَّدْنَٰهُ بِرُوحِ
ٱلْقُدُسِ أَفَكُلَّمَا جَآءَكُمْ رَسُولٌۢ بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ أَنفُسُكُمُ
ٱسْتَكْبَرْتُمْ فَفَرِيقًا كَذَّبْتُمْ وَفَرِيقًا تَقْتُلُونَ ﴿٨٧﴾ وَقَالُوا۟ قُلُوبُنَا
غُلْفٌۢ بَلْ لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَقَلِيلًا مَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٨٨﴾

(٨٤-٨٦): ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ لَا تَسْفِكُونَ دِمَآءَكُمْ وَلَا تُخْرِجُونَ أَنفُسَكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ ثُمَّ أَقْرَرْتُمْ وَأَنتُمْ تَشْهَدُونَ ﴿٨٤﴾ ثُمَّ أَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ تَقْتُلُونَ أَنفُسَكُمْ وَتُخْرِجُونَ فَرِيقًا مِّنكُم مِّن دِيَٰرِهِمْ تَظَٰهَرُونَ عَلَيْهِم بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَإِن يَأْتُوكُمْ أُسَٰرَىٰ تُفَٰدُوهُمْ وَهُوَ مُحَرَّمٌ عَلَيْكُمْ إِخْرَاجُهُمْ أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ ٱلْكِتَٰبِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ فَمَا جَزَآءُ مَن يَفْعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمْ إِلَّا خِزْيٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يُرَدُّونَ إِلَىٰٓ أَشَدِّ ٱلْعَذَابِ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٨٥﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشْتَرَوُا۟ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا بِٱلْءَاخِرَةِ فَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٨٦﴾﴾:

ئـەم کارەی کـە باسـکراوە لـەم ئایەتـەدا کاری ئەوانە بـووە کە لە سـەردەمی وەحـی دا لە مەدینـە بـوون، بـەو شـێوەیە ئـەوس‌و خەزرەج ـلـە پشـتیوانان- پێـش هاتنـی پێغەمبەر ﷺ بتپەرسـت بـوون، ئـەوان لەسـەر نەریتـی جاهلیـەت یەکتریان دەکوشـت، جا سـێ دەسـتە دابـەزی بـۆ ناویان لـە دەسـتەکانی جوولەکـە: (بَنُـو قُرَيْظَـة، بَنُـو النضـير، وَبَنُـو قَيْنُقَـاع) هەر دەسـتەیەک لـە جوولەکـە هاوپەیمانێتـی لەگـەڵ دەسـتەیەکی خەڵکی مەدینە دەبەسـت.
جـا ئەگـەر کوشـتاروو شـەڕیان کردبایە جوولەکـەکان یارمەتـی هاوپەیمانیەکانیـان دەدا، لەسـەر دەسـتەکەی تـر لـە جوولەکە، جا ئـەوکات جوولەکە جوولەکەی دەکوشـت‌و شـار بـەدەری دەکـرد، وە مـاڵ‌و سـەروەت‌و سـامانەکەی دەبرد، پاشـان ئەگەر جەنـگ کۆتایی پـێ بهاتایـەو دیـل بکەوتایەتـە نێوان ئەو دوو دەسـتە ئـەوە بە فدیـە ئازادیـان دەکردن.
ئـەو سـێ کارە لەسـەر هەموویـان فەرزکرابـوو، جـا فەرزکرابـوو لەسـەریان هەندێکیـان خوێنـی هەندێکیـان نەڕێـژن، وە هەندێکیـان هەندێکـی دیکەیـان دەربـەدەر نەکـەن، وە ئەگـەر دیلێـک کەوتە نێوانیان، ئەوە پێویسـتە لەسـەریان ڕزگـاری بکەن، کاریـان بە کۆتا

دانەیـان کـرد (ئەویـش ئازادکردنـی دیلـە) وە وازیـان لـەو دوو دانـەی تر هێنـا، خوا ﷻ ئـەوەی ڕەتکـردەوە بەسـەریانو فەرمـووی: ﴿ أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ ٱلْكِتَٰبِ ﴾ ئەویـش ئازادکردنـی دیلـە، ﴿ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ ﴾ ئەویـش کوشـتنو دەربەدەرکردنـە.

گەورەتریـن بەڵگـەی تێدایـە کـە بـە ڕاسـتی ئیمـان بریتیـە: لـە ئەنجامدانـی فەرمانەکانو دوورکەوتنـەوە لـە قەدەغـەکان، وە ئەوانەیشـی فەرمانـی پێکـراوە لـە ئیمانـە، خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ فَمَا جَزَآءُ مَن يَفْعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمْ إِلَّا خِزْىٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾ (واتـە: جـا تۆڵـەی ئەو کەسـانە کـە وا بکەن لە ئێـوە هەر ڕیسـوایىو بەدناویـە لە ژیانـی دونیادا) بـە ڕاسـتی ئـەوە ڕوویدا، خوا سەرشـۆڕی کـردنو پێغەمبەرەکەیشـی زاڵ کرد بەسـەریاندا، جـا ئـەوەی کوشـتی کوشـتی، وە ئەوەی بـە کۆیلەو کەنیـزە لێیگرتـن گرتنـی، وە ئەوەی دەربـەدەری کـرد، دەربـەدەری کـردن ﴿ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يُرَدُّونَ إِلَىٰٓ أَشَدِّ ٱلْعَذَابِ ﴾ (واتە: وە لـە ڕۆژی دوایـی دەگەڕێنرێنـەوە بـۆ) مەزنتریـن سـزا ﴿ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴾ (واتـە: خوا بـێ ئاگانیـە لـەوەی دەیکەن).

پاشـان خـوا ﷻ هەواڵیـداوە دەربارەی هـۆکاری بێبڕوا بوونیـان بە هەندێک لـە کتێبەکەی، وە بـڕوا هێنانیـان بـە هەندێکـی دیکەی، جـا فەرموویەتـی: ﴿ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشْتَرَوُا۟ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا بِٱلْءَاخِرَةِ ﴾ (واتـە: ئەمانـە ئەوانەن کە ژیانـی دونیایان کڕی بـە دواڕۆژ) وایان دەزانی ئەگـەر هـاوکاری هاوپەیمانەکانیان نەکەن، ئەوە نەنگیان بەسـەردا دێـت، ئاگریان هەڵبژارد بەسـەر عەیـبو عـارو نەنگیـدا، بۆیـە فەرموویەتـی: ﴿ فَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴾ (واتە: ئیتر سـزایان لەسـەر سـووک ناکـرێ) بەڵکو ئـەو سـزایە دەمێنێتەوە بەو توونديـەی خۆیـەوە، وە هیـچ حەوانەوەیەکیـان بۆ نابێ لـە کاتێک لـە کاتەکاندا، ﴿ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴾ (واتـە: وە نـە سـەر دەخرێنو) وە نە ناخۆشـیان لەسـەر لادەچێ.

(٨٧): ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَقَفَّيْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ بِٱلرُّسُلِ ۖ وَءَاتَيْنَا عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَيَّدْنَٰهُ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ ۗ أَفَكُلَّمَا جَآءَكُمْ رَسُولٌۢ بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ أَنفُسُكُمُ ٱسْتَكْبَرْتُمْ فَفَرِيقًا كَذَّبْتُمْ وَفَرِيقًا تَقْتُلُونَ ﴿٨٧﴾ ﴾.

﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَقَفَّيْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ بِٱلرُّسُلِ ۖ وَءَاتَيْنَا عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱلْبَيِّنَٰتِ ﴾ خـوا ﷻ منـەت دەکات بەسـەر نەوەکانـی ئیسـرائیل کە مووسـای قسـە لەگەڵ کـراوی[٦] (کلیـم الله) بـۆ ڕەوان کـردنو تەوڕاتیشـی پێـدا، وە دوا بـە دوای ئـەو پێغەمبەرانـی ناردوە

---

٦) (واتە: ڕاستەوخۆ خوا دواندیو قسەی لەگەڵ کرد). وەرگێر.

ئەوانـەی کـە حوکمیان بە تـەورات دەکرد، تـا کۆتایی پێهێنان بە عیسـای کـوری مەریەم، وە بەڵگـەو نیشـانەی ئاشـکرای پێـدا کـە مـرۆڤ بـە هۆیەوە بـروا دێنـی ﴿ وَأَيَّدْنَٰهُ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ ﴾ واتـە: پشـتیوانی لێکردوە بـە گیانی پـاک (روح القدس). زۆربـەی توێژەرەوانی قورئـان وتوویانـە: ئـەوە جبریلە ﷺ، وتراویشـە: ئـەوە ئـەو ئیمانەیە کە خـوا ﷻ یارمەتی بەندەکەی پـێ دەدات.

پاشـان لەگـەڵ ئـەم نیعمەتـەی کـە کـەس ناتوانـێ ئەنـدازەی بـکات، کاتـێ کـە هاتووە بـۆ ناوتـان (پێغەمبەرێـک لـە پێغەمبـەران) ﴿ بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ أَنفُسُكُمُ ٱسْتَكْبَرْتُمْ ﴾ (واتـە: بە جـۆرێ لەگـەڵ هـەواو ئارەزووتانـدا نەگونجـا، لـووت بەرزیتـان دەکـرد) لـە بـروا بوون پێیـان ﴿ فَفَرِيقًا كَذَّبْتُمْ ﴾ (دەسـتەیەک) لـە پێغەمبـەران (تـان بـە درۆ دانـان) ﴿ وَفَرِيقًا تَقْتُلُونَ ﴾ هـەواو هەوەسـتان بەسـەر رێنمایی پێشخسـت، دونیاتان پێش دوارۆژ خسـت، لـە سـەرکۆنەکردنو توونـد کردنـی تێدایـە کە ئاشـکرایە ناشـاردرێتەوە.

(٨٨): ﴿ وَقَالُوا۟ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ ۚ بَل لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَقَلِيلًا مَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٨٨﴾ ﴾:

﴿ وَقَالُوا۟ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ ۚ بَل لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَقَلِيلًا مَّا يُؤْمِنُونَ ﴾ واتـە: بیانوویـان هێنایـەوە لە برواهێنـان کاتـێ بانگـت کردن بـۆ لای، ئەی پێغەمبـەر ﷺ، بـەوەی کە دڵیان داپۆشـراوە، تێناگـەن لـەوەی تـۆ دەیڵێی، جا بـە بروای خۆیـان بیانوویان هەیـە لەبەر نەبوونی زانسـتو زانیـاری، ئەمـەش درۆیەکـی دیکەیـە لەوانەوە، بۆیە خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ بَل لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفْرِهِمْ ﴾ واتـە: ئـەوان دەرکـراونو نەفریـن لێکراون، بـە هـۆی بێبڕواییانەوە، بـڕوادار زۆر کەمـە لەناویانـدا، یان بڕوایـان زۆر لاوازە، بێبڕواییـان زیاترە.

وَلَمَّا جَآءَهُمْ كِتَٰبٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ
وَكَانُوا۟ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَلَمَّا
جَآءَهُم مَّا عَرَفُوا۟ كَفَرُوا۟ بِهِۦ ۚ فَلَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ
﴿٨٩﴾ بِئْسَمَا ٱشْتَرَوْا۟ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ أَن يَكْفُرُوا۟ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ
بَغْيًا أَن يُنَزِّلَ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۖ
فَبَآءُو بِغَضَبٍ عَلَىٰ غَضَبٍ ۚ وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ مُّهِينٌ
﴿٩٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءَامِنُوا۟ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُوا۟ نُؤْمِنُ بِمَآ أُنزِلَ
عَلَيْنَا وَيَكْفُرُونَ بِمَا وَرَآءَهُۥ وَهُوَ ٱلْحَقُّ مُصَدِّقًا لِّمَا
مَعَهُمْ ۗ قُلْ فَلِمَ تَقْتُلُونَ أَنۢبِيَآءَ ٱللَّهِ مِن قَبْلُ إِن كُنتُم
مُّؤْمِنِينَ ﴿٩١﴾ ۞ وَلَقَدْ جَآءَكُم مُّوسَىٰ بِٱلْبَيِّنَٰتِ ثُمَّ
ٱتَّخَذْتُمُ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَنتُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿٩٢﴾ وَإِذْ
أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُوا۟
مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱسْمَعُوا۟ ۖ قَالُوا۟ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا
وَأُشْرِبُوا۟ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْعِجْلَ بِكُفْرِهِمْ ۚ قُلْ بِئْسَمَا
يَأْمُرُكُم بِهِۦٓ إِيمَٰنُكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٩٣﴾

(٨٩-٩٠): ﴿ وَلَمَّا جَآءَهُمْ كِتَٰبٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ وَكَانُوا۟ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُوا۟ كَفَرُوا۟ بِهِۦ ۚ فَلَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٨٩﴾ بِئْسَمَا ٱشْتَرَوْا۟ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ أَن يَكْفُرُوا۟ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بَغْيًا أَن يُنَزِّلَ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۖ فَبَآءُو بِغَضَبٍ عَلَىٰ غَضَبٍ ۚ وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿٩٠﴾ ﴾:

واتە: کاتێ کە کتێبیان بۆ هات لە لایەن خواوە لەسەر دەستی باشترینی بەدیهێنراوەکانو کۆتا پێغەمبەران، کە بەڕاستدانەری ئەو تەوراتە بوو کە لە لایان بوو، بەڕاستی زانیاریان هەبوو پێی دڵنیابوون، بۆیە ئەگەر جەنگ لە نێوان ئەوانو بتپەرستەکاندا ڕووی بدایە لە سەردەمی نەفامیدا، داوای سەرخستنیان بەو پێغەمبەرە دەکرد، وە هەڕەشەی هاتنی ئەویان دەکرد، کە ئەگەر هات لەگەڵیدا جەنگ لە دژی بتپەرستان دەکەن، کاتێ ئەم کتێبەو پێغەمبەرەیان بۆ هات دەیانناسی، کەچی بێبڕوا بوون پێی بە هۆی لووت بەرزیو ئێرەییەوە، خوا ﷻ بە ویستی خۆی دایدەبەزێنی بۆ هەر کەسێک کە بیەوێت لە بەندەکانی، خوا ﷻ نەفرینی لێکردن، وە غەزەبو خەشمو قینی خۆی بەسەرا داگرتن، یەک لە دوای یەک، بە هۆی زۆری کوفرکردنیان، وە گومانە ناپاکەکانیان بە دوای یەکداو هاوەڵدانانیان.

لە دوارۆژدا ﴿ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴾ واتە: (بێبڕوایان) لە دوارۆژ سزایەکی ڕیسواکەریان بۆ هەیە) واتە: بە ئێشو ژان، ئەویش فڕێدانە ناو دۆزەخو لە دەستدانی نازوو نیعمەتە بەردەوامەکانە، بە ڕاستی خراپترین حاڵ حاڵی ئەوانە، وە خراپترین شتێک کە ئەنجامیان داوە گۆڕینەوەی بڕوایە بە خواو بە کتێبەکانیو بە پێغەمبەرانی (علیهم السلام)، بە کوفر کردن پێیو بە کتێبەکانیو بە پێغەمبەرەکانی، لەگەڵ ئەوەدا دەیانزانیو دڵنیا بوون، ئەوە دەبێتە مایەی گەورە کردنی سزاکانیان.

(٩١-٩٣): ﴿ وَلَمَّا جَآءَهُمْ كِتَٰبٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ وَكَانُوا۟ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُوا۟ كَفَرُوا۟ بِهِۦ ۚ فَلَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٨٩﴾ بِئْسَمَا

ٱشۡتَرَوۡاْ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمۡ أَن يَكۡفُرُواْ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بَغۡيًا أَن يُنَزِّلَ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۖ فَبَآءُو بِغَضَبٍ عَلَىٰ غَضَبٖۚ وَلِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٞ مُّهِينٞ ﴿٩٠﴾ ﴾

﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ ءَامِنُواْ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُواْ نُؤۡمِنُ ﴾ واتە: ئەگەر فەرمان بە جوولەکە بکرێ بە بڕواهێنانیان بەوەی خوا ﷻ دایبەزاندوە بۆ سەر پێغەمبەرەکەی ﷺ، کە ئەویش قورئانە، لووت بەرزیان دەنواندو فیزیان دەکرد، وە ﴿ قَالُواْ نُؤۡمِنُ بِمَآ أُنزِلَ عَلَيۡنَا وَيَكۡفُرُونَ بِمَا وَرَآءَهُۥ ﴾ (واتە: دەیانوت: ئێمە بڕوا بەوە دەهێنێن کە بۆ خۆمان نێردراوەتە خوارەوە، وە بێبڕوا دەبوون بەوانەی کە دوای «تەورات» نێردراوە) وەکو قورئان. واتە: جگە لە تەورات لە کتێبەکانی دیکە، لەگەڵ ئەوەدا وا پێویست بوو بڕوایان بە هەموو کتێبەکان بهێنابایە بە ڕەهایی، یەکسانە بۆ ئەوان دابەزیبێ، یان بۆ جگە لەوان، ئا ئەمە ئیمانی بە سوودە، بڕواهێنان بەوەی خوا ﷻ دایبەزاندوە بۆ سەر هەموو پێغەمبەران.

بەڵام جیاکاری لە نێوان پێغەمبەرانو کتێبەکاندا، وە بڕوابوون بە هەندێکی جگە لە هەندێکی دیکە، ئەمە پێی ناوترێ ئیمان، بەڵکو خۆی لە خۆیدا کوفرە، لەبەر ئەمە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡفُرُونَ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُواْ بَيۡنَ ٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيَقُولُونَ نُؤۡمِنُ بِبَعۡضٖ وَنَكۡفُرُ بِبَعۡضٖ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُواْ بَيۡنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١٥٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ حَقّٗاۚ وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٗا مُّهِينٗا ﴿١٥١﴾ ﴾النساء (واتە: بەڕاستی ئەوانەی کافرن بە خواو پێغەمبەرەکانی، وە دەیانەوێ جیاوازی بخەنە نێوان خواو پێغەمبەرەکانی، وە دەڵێن بڕوا بە هەندێک لە پێغەمبەران دێنین، وە بڕوا ناهێنین بە هەندێکی تریانو دەیانەوێ لەو نێوانەدا ڕێگایەک بۆ خۆیان بەدەست بهێنن * ئا ئەوانە بەڕاستی کافری تەواون، وە ئامادەمان کردوە بۆ کافران سزایەکی ڕیسواکەر).

لەبەر ئەمەیە لێرەدا خوای گەورەو بەرز ڕەتیکردوەتەوە بەسەریاندا بە ڕەتکردنەوەیەکی جوانو شیاو، وە پەیوەستی کردوون بە پەیوەستکرنێک ڕزگار بوونیان نیە لێی، هەروەها ڕەتیکردوەتەوە بەسەریاندا بە بێبڕوابوونیان بە قورئان بە دوو شت: فەرموویەتی: ﴿ وَهُوَ ٱلۡحَقُّ ﴾(واتە: ئەو قورئانە هەقە) جا ئەگەر ئەوە هەق بێ لە هەموو ئەوانەی لە خۆی گرتووە، لە هەواڵو فەرمانو قەدەغەکان، ئەوە لەلای پەروەردگاریانەوەیە، بێبڕوایی پێی لە دوای ئەوە بێبڕوابوونە بە خوا، وە بێ بڕوابوونە بەو هەقەی کە دایبەزاندووە.

پاشان فەرموویەتی: ﴿ مُصَدِّقٗا لِّمَا مَعَهُمۡ ﴾واتە: لەگەڵ (تەورات) دەگونجێ لە هەموو ئەوانەی بەڵگەیە لەسەری لە هەقو ڕاستیوو زاڵە بەسەریدا. کەواتە، ئەی بۆچی بڕوا دێنن بەوەی دابەزیوەتە

سەرتان (لە تەورات)، بێبڕواییش دەکەن بە هاوتاکەی (کە قورئانە)؟ ئایا ئەمە دەمارگیریو شوێنکەوتنی هەواوو ئارەزوو نیە غەیری هیدایەت؟ وە هەروەها قورئان بە ڕاستدانەری کتێبەکانی ئەوانە، ئەمەش ئەوە دەخوازێ کە قورئان بەڵگەیە بۆیان لە ڕاستی ئەوەی لە بەردەستیاندایە لە کتێبەکان، هیچ ڕێگایەکیان نیە بۆ چەسپاندنی (تەورات) تەنها بەم قورئانە نەبێ، جا ئەگەر بێبڕوایی‌و نکوولیان لێکرد، وەکو ئەو کەسەیان لێدێت بانگەشەی شتێک بکات بە بەڵگەو ڕوونکردنەوە، هیچی نەبێ جگە لەوە، بانگەشەکەیشی تەواو نەبێ تەنها بە سەلامەتی بەڵگەکەی نەبێ، پاشان ئەو بێت بەڵگەکەی خۆی ناشرین بکات‌و بە درۆی بزانێت، ئایا ئەمە گەوجێتی‌و شێتی نیە؟ جا کوفر کردنیان بە قورئان، کوفر کردنە بەوەی لەبەر دەستیاندایەو هەڵوەشاندنەوەیەتی.

ئنجا خوا ﷻ بانگەشەی بڕوابوونیانی هەڵوەشاندەوە، بەوەی دابەزیوە بۆیان، بەوە کە دەفەرموێ: ﴿ قُلْ ﴾ پێیان بڵێ: ﴿ فَلِمَ تَقْتُلُونَ أَنْبِيَاءَ اللَّهِ مِنْ قَبْلُ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ ۝٩١ وَلَقَدْ جَاءَكُمْ مُوسَىٰ بِالْبَيِّنَاتِ ﴾ بە بەڵگەی ئاشکراو ڕوونکەرەوە بۆ هەق، ﴿ ثُمَّ اتَّخَذْتُمُ الْعِجْلَ مِنْ بَعْدِهِ ۝٩٢ ﴾ واتە: لە دوای هاتنی ئەو ﴿ وَأَنْتُمْ ظَالِمُونَ ﴾ لەوەدا هیچ بیانوویەکتان نیە.

﴿ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ الطُّورَ خُذُوا مَا آتَيْنَاكُمْ بِقُوَّةٍ وَاسْمَعُوا ﴾ واتە: گوێ بیست بوونی‌و وەرگرتنی، وە گوێڕایەڵی‌و بەدەممەوەهاتنی ﴿ قَالُوا سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا ﴾ واتە: ئەمە بووبە حاڵی ئەوان ﴿ وَأُشْرِبُوا فِي قُلُوبِهِمُ الْعِجْلَ ﴾ واتە: خۆشەویستی گوێرەکەو خۆشەویستی پەرستنەکەی‌و بە دڵەکانیانەوە نووسابوو، بە هۆی کوفرەکەیانەوە، وە دڵیان ئاودار بوو بە خۆشویستنی.

﴿ قُلْ بِئْسَمَا يَأْمُرُكُمْ بِهِ إِيمَانُكُمْ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ ﴾ واتە: ئێوە بانگەشەی بڕوا بوون دەکەن‌و بە خۆتان هەڵدەدەن بە ئایین‌و ڕێبازی هەق، لە کاتێکدا ئێوە پێغەمبەرانی خواتان کوشتووە، وە کاتێ کە مووسا لەناوتان پەنهان بوو، لە دوای ئەو گوێرەکەتان کردە پەرستراو جگە لە خوا، فەرمان‌و قەدەغەکراوەکانیتان وەرنەدەگرت مەگەر لە پاش هەڕەشەکردن‌و بەرز کردنەوەی کێوی طوور بەسەرتانەوە نەبێ، جا بە زمانتان پابەند بوون‌و بە کردەوەش هەڵتان وەشاندەوە، کوا ئەم ئیمانەی بانگەشەی بۆ دەکەن، ئەی کوا ئەم ئاینە؟


قُلْ إِن كَانَتْ لَكُمُ الدَّارُ الْآخِرَةُ عِندَ اللَّهِ خَالِصَةً مِّن دُونِ النَّاسِ فَتَمَنَّوُا الْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٩٤﴾ وَلَن يَتَمَنَّوْهُ أَبَدًا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ۗ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ ﴿٩٥﴾ وَلَتَجِدَنَّهُمْ أَحْرَصَ النَّاسِ عَلَىٰ حَيَاةٍ وَمِنَ الَّذِينَ أَشْرَكُوا ۚ يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ وَمَا هُوَ بِمُزَحْزِحِهِ مِنَ الْعَذَابِ أَن يُعَمَّرَ ۗ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ اللَّهِ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿٩٧﴾ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّلَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَرُسُلِهِ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَالَ فَإِنَّ اللَّهَ عَدُوٌّ لِّلْكَافِرِينَ ﴿٩٨﴾ وَلَقَدْ أَنزَلْنَا إِلَيْكَ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ ۖ وَمَا يَكْفُرُ بِهَا إِلَّا الْفَاسِقُونَ ﴿٩٩﴾ أَوَكُلَّمَا عَاهَدُوا عَهْدًا نَّبَذَهُ فَرِيقٌ مِّنْهُم ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠٠﴾ وَلَمَّا جَاءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْ عِندِ اللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ نَبَذَ فَرِيقٌ مِّنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ كِتَابَ اللَّهِ وَرَاءَ ظُهُورِهِمْ كَأَنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٠١﴾

(٩٤-٩٦): ﴿قُلْ إِن كَانَتْ لَكُمُ الدَّارُ الْآخِرَةُ عِندَ اللَّهِ خَالِصَةً مِّن دُونِ النَّاسِ فَتَمَنَّوُا الْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٩٤﴾ وَلَن يَتَمَنَّوْهُ أَبَدًا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ۗ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ ﴿٩٥﴾ وَلَتَجِدَنَّهُمْ أَحْرَصَ النَّاسِ عَلَىٰ حَيَاةٍ وَمِنَ الَّذِينَ أَشْرَكُوا ۚ يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ وَمَا هُوَ بِمُزَحْزِحِهِ مِنَ الْعَذَابِ أَن يُعَمَّرَ ۗ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾﴾:

﴿قُلْ﴾ پێیان بڵێ: لە رووی راستکردنەوەی بانگەشەکەیان ﴿إِن كَانَتْ لَكُمُ الدَّارُ الْآخِرَةُ﴾ (واتە: ئەگەر) بەهەشت (بۆ ئێوەیە) ﴿خَالِصَةً مِّن دُونِ النَّاسِ﴾ (واتە: بە تایبەتیو بێ ئەوەی کەس بێ بە هاوبەشتان) هەروەکو برواتان وایە کە بێگومان ناچێتە بەهەشتەوە تەنها جوولەکە، یان گاور نەبێ، وە ئاگر تووشیان نابێ تەنها چەند رۆژێکی دیاریکراو نەبێ کە (بە پەنجەکان دەژمێردرێن)، جا ئەگەر ئێوە راست دەکەن لەم بانگەشەتاندا، ﴿فَتَمَنَّوُا الْمَوْتَ﴾ (واتە: داوای مردن بکەن) ئەمە جۆرێکە لە پاڕانەوە (مباهلة) لە نێوان ئەوانو نێوان پێغەمبەری خوا ﷺ.

هیچ دەرچەیەک نیە دوای ئەم پەنا بردنە، وە تەنگەبەر کردنەیان پاش عینادییو سەرکێشیان، تەنها یەکێک لەم دووانە نەبێ: یان ئەوەیە بڕوا بە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ دێنن، یان ئەوەیە لە خوا ﷻ دەپاڕێنەوە کاریان بۆ ئاسان بکات، ئەویش داوای مردنە، کە دەیانگەیەنێتە ئەو ماڵەی تایبەت کراوە بۆیان، بەڵام ئەوان ئەوەیان رەتکردەوە.

هەموو کەس دەزانی ئەوان لەوپەڕی کەللە رەقیو عینادیدان، وە دژایەتی کردنی خواﷻو پێغەمبەرەکەی، لەگەڵ ئەوەدا زانیاریان هەیە بەوە، لەبەر ئەمە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَلَن يَتَمَنَّوْهُ أَبَدًا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ﴾ (واتە: هەرگیز حەز ناکەن بمرن، بە هۆی ئەو گوناهانەی کە بە دەستی خۆیان پێشیان خستوە) لە کوفرو تاوان، چونکە

ئــەوان دەزانن ئــەوە ڕێگایە بۆیــان بــەرەو پاداشــتدانەوەی وەرگرتنی کردەوە پیســەکانیان. جا مردن ناخۆشــترین شــتە بەلایانــەوە، ئەوان لە هەموو کەس ســوورترن بۆ ژیــان، تەنانەت لــەو هاوەڵدانەرانــەی کــە بڕوایان بــە هیچ یەکێک لــە پێغەمبــەرانو کتێبە پیــرۆزەکان نیە، پاشــان باســی زۆر حــەزوو خۆشەویســتیان دەکات بــۆ دونیــا، وەکــو فەرموویەتــی: ﴿ يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ ﴾ (هــەر یەکێکیــان ئــاوات دەخــوازێ کــە هەزار ســاڵ بژی) ئــا ئەمــە ئەوپــەڕی پێداگریو ســووربوونە لەســەر ژیانی دونیا، ئاواتی شــتێکیان خواســتووە کــە مەحاڵــەو قــەت نایەتــە دی، لــە کاتێکــدا ئــەوان ئەگەر ئــەو تەمەنــەی باســکرا بژین، هیــچ ســوودێکی نیــە بۆیــانو نابێتە بەربەســت لە بەردەم ســزای خــوادا، ﴿ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴾ (وە خــوا بینەرە بەوەی کە دەیکەن، ئەمە)، هەڕەشــەیە بۆیان لەســەر پاداشــت دانــەوەی کردەوەکانیان.

(٩٧-٩٨): ﴿ قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ اللَّهِ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ (٩٧) مَن كَانَ عَدُوًّا لِّلَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَرُسُلِهِ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَالَ فَإِنَّ اللَّهَ عَدُوٌّ لِّلْكَافِرِينَ (٩٨) ﴾

واتــە: ئــەی موحەممــەد ﷺ بــەو جوولەکانــە بڵــێ: ئەوانەی کــە وتیــان: ئــەوەی ڕێگریمان لێــدەکات لــە بڕواهێنــان ئــەوە دۆســتو پشــتیوانەکەتە جبریــل ﷺ، خۆ ئەگــەر جگە لەو فریشــتەیەکی تــر بوایــە لە فریشــتەکانی خــوا ﷻ بڕوایــان پێدەهێنــاو بەڕاســتیان دەزانی، بەڕاســتی ئــەم هەڵوێســتەتان دژو پێچەوانەیەو لووت بەرزیە بەســەر خوادا، چونکــە بێگومان جبریــل ﷺ قورئانــی دابەزانــدووە لــە لایــەن خــواوە بــۆ ســەر دڵــی تــۆ، وە هــەر ئەویش پەیامــی دابەزانــدووە بۆ ســەرجەم پێغەمبەرانــی پێش تۆ، خوا خــۆی فەرمانی پێکــردوەو بەو کارە ڕایســپاردوە، بــە ڕاســتی ئــەو تەنهــا نێردراوێکەو هیچــی تر نیە.

لەگــەڵ ئــەوەی ئەم کتێبــە جبریل دایبەزانــدووە ـبەڕاســتدانەری کتێبەکانــی پێش خۆیەتی- پێچەوانــەو دژیــان نیــە، وە ڕێنمایــی تــەواوی تێدایــە لــە هەموو جــۆرە گومڕاییــەکان، وە مــوژدەی تێدایــە بــە خێــری دونیــاو دواڕۆژ بۆ کەســێک بــڕوای پــێ بهێنێ، جــا دژایەتی کردنــی جبریــل ﷺ کە بەو شــێوەیە وەســف کــراوە، بێبــڕوا بوونە بــە خــواو ئایەتەکانی، وە دژایەتیشــە لــە دژی خواو پێغەمبەرو فریشــتەکانی، بە ڕاســتی دژایەتیکردنیــان بۆ جبریل لەبــەر خــودی خــۆی نەبــوو، بەڵکو لەبــەر ئەوە بــوو کــە دایبەزاندووە لــە لایەن خــواوە لە هــەقو ڕاســتی بــۆ ســەر پێغەمبەرانی خوا ﷺ، جــا ئەو کات کوفــرو دژایەتــی بەرانبەر ئەو

کەسە دەبێ کە دایبەزاندوەو ناردوویەتی، وە ئەو ئەوەیشی پێی ناردوەو وە ئەوەیشی بۆی نێردراوە. ئەمەیش ڕووی ئەم بابەتەیە.

(٩٩): ﴿ وَلَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ ۖ وَمَا يَكْفُرُ بِهَآ إِلَّا ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٩٩﴾ ﴾:

خوا ﷻ بە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ ﴾ (واتە: سوێند بە خوا بێگومان بۆمان ناردوویت چەند نیشانەیەکی ڕوونو ئاشکرا کە قورئانە) هیدایەتی پێ دەستەبەر دەبێ بۆ کەسێک بە دوایدا بگەڕێ، بەڵگەو حوججە کردنو بیانوو بڕینە لەسەر ئەو کەسەی عینادیو کەللەڕەقی دەکات، ئەو قورئانە لە ڕوونیو بەڵگەهێنانەوە لەسەر هەقو ڕاستی گەیشتۆتە ئاستێکی زۆر مەزن، وە گەیشتۆتە قۆناغو حاڵەتێ کە ڕێگری لە وەرگرتنی ناکات تەنها کەسێ نەبێ لە فەرمانی خوا ﷻ دەرچووبێو گوێڕایەڵی نەکات، وە لووت بەرزی لە بەرانبەردا بنوێنێ بەوپەڕی لووت بەرزیو خۆبەزل زانین.

(١٠٠): ﴿ أَوَكُلَّمَا عَٰهَدُواْ عَهْدًا نَّبَذَهُۥ فَرِيقٌ مِّنْهُم ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾:

ئا ئەمە سەرسووڕمانی تێدایە لە زۆری پەیمانەکانیانو ئارام نەبوونیان لەسەر جێبەجێکردنو وەفا بوون پێیان ﴿ أَوَكُلَّمَا ﴾ (هەر جارێک) ئەمە دووبارە بوونەوە دەگەیەنێ، هەرکاتێک پەیمانێک بدەن پەیمانەکە دەشکێنن. هۆکاری ئەمە چیە؟

هۆکارەکەی ئەوەیە زۆربەیان هەر بڕواناهێنن، جا بڕوانەبوونیان ئەوەی پێویست کردوە کە پەیمانەکان هەڵبوەشێننەوە، جا ئەگەر بڕواهێنانیان ڕاست بووایە ئەوە وەکو ئەوەبوو کە خوا ﷻ دەربارەیان فەرمووی: ﴿ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُواْ مَا عَٰهَدُواْ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ﴿٢٣﴾ ﴾ الأحزاب، (واتە: لە بڕواداران پیاوانێک هەن ڕاستگۆ بوون لەوەی پەیمانیان لەسەری بە خوا دابوو).

(١٠١-١٠٣): ﴿ وَلَمَّا جَآءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ نَبَذَ فَرِيقٌ مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ كَأَنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٠١﴾ وَٱتَّبَعُواْ مَا تَتْلُواْ ٱلشَّيَٰطِينُ عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَٰنَ ۖ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَٰنُ وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحْرَ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَٰرُوتَ وَمَٰرُوتَ ۚ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ ۖ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ ۚ وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ ۚ وَلَقَدْ عَلِمُواْ لَمَنِ ٱشْتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنْ خَلَٰقٍ ۚ وَلَبِئْسَ مَا

شَرَوْاْ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ ﴿١٠٢﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوْاْ لَمَثُوبَةٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ خَيْرٌ لَّوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ ﴿١٠٣﴾ ﴾.

﴿ وَلَمَّا جَآءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ ﴾ واتە: کاتێک ئەم پێغەمبەرە بەخشندەیان بۆ هات بە کتێبێکی مەزنەوە بەهەقو ڕاستی کە یەکدەگری لەگەڵ ئەوەی لە لای ئەوانە لەتەورات، ئەوان پێیان وابوو پابەندن بە کتێبەکەیانەوە، کاتێ بێ بڕوابیان کرد بەم پێغەمبەرە ﷺ، وە بەوەی کە هێناویەتی ﴿ نَبَذَ فَرِيقٌ مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ ﴾ (واتە: دەستەیەک لەوانەی خاوەن کتێب بوون)، ئەو کتێبەی کە خوا ﷻ بۆی دابەزاندبوون، فڕەیاندایە ﴿ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ ﴾ (واتە: پشت خۆیان) ئەمە ڕەوانترە لە پشتێکردن، وەکو ئەوە وایە لەم کردەوەیاندا لە نەفامەکان بن، ئەوان ڕاستی ئەو پێغەمبەرە ﷺ باش دەزانن، وە ڕاستی ئەو پەیامەی کە هێناویەتی.

بەم شێوەیە ڕوون بوویەوە ئەم دەستەیە لە خاوەن کتێبەکان هیچیان بەدەستەوە نەما کاتێ کە بڕوایان بەم پێغەمبەرە ﷺ نەهێنا، جا کوفر کردنیان پێی، بوو بە کوفر کردن بە کتێبەکەیان لەو ڕووەی کە هەر هەستیان پێنەکرد.

بێگومان لە قەدەرو حیکمەتی خوا ﷻ ئەوەیە، هەر کەسێ واز لە شتێ بهێنی سوودی هەبێ بۆی، وە بتوانی سوودی لێوەربگرێ، بەڵام نەیەوێت، تووشی بەلا دەبێ، بەسەرقاڵبوون بەوەی زیانی هەیە بۆی، جا هەر کەسێ واز لە عیبادەتی خوای بەسۆز بهێنێ، تووشی پەرستنی بتەکان دەبێ، هەر کەسێک واز لە خۆشەویستی خوا ﷻو ترسو ئومێدی بهێنێ، تووشی خۆشویستنو ترسو ئومێد لە غەیری خوا دەبێ، هەر کەسێک ماڵی لە پێناو خوادا نەبەخشێ، ئەوە لە پێناو گوێڕایەڵی شەیتاندا دەیبەخشێت، هەر کەسێک واز لە زەلیلی بوون بهێنێ لە ترسی پەروەردگاری، تووشی زەلیل بوون دەبێ بۆ بەندەکان، وە هەر کەسێک واز لە هەق بهێنێ تووشی باتڵی ناهەق دەبێ.

بە هەمان شێوە ئەو جوولەکانە کاتێ کتێبی خوایان پشت گوێ خست، شوێنی ئەوە کەوتن کە شەیتانەکان دەیانخوێندەوەو جادوویان بۆ خەڵکی دەکرد، پێیان وابوو سولەیمان ﷺ جادووی بەکاردەهێنا، وە بە هۆی ئەو جادووەوە ئەو دەسەڵاتە مەزنەی بەدەست هێناوە، ئەوان لەو گومانە خراپەدا درۆزن بوون، سولەیمان ﷺ جادووی بەکار نەهێنا بەڵکو خوای ڕاستگۆ بە پاکی ڕاگرت لە فەرمایشتەکەیدا کە فەرمووی:

وَٱتَّبَعُواْ مَا تَتۡلُواْ ٱلشَّيَٰطِينُ عَلَىٰ مُلۡكِ سُلَيۡمَٰنَۖ وَمَا كَفَرَ
سُلَيۡمَٰنُ وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ
ٱلسِّحۡرَ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلۡمَلَكَيۡنِ بِبَابِلَ هَٰرُوتَ وَمَٰرُوتَۚ
وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنۡ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحۡنُ فِتۡنَةٞ فَلَا
تَكۡفُرۡۖ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنۡهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيۡنَ ٱلۡمَرۡءِ
وَزَوۡجِهِۦۚ وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنۡ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ
وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمۡ وَلَا يَنفَعُهُمۡۚ وَلَقَدۡ عَلِمُواْ لَمَنِ
ٱشۡتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنۡ خَلَٰقٖۚ وَلَبِئۡسَ مَا شَرَوۡاْ بِهِۦٓ
أَنفُسَهُمۡۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ١٠٢ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوۡاْ
لَمَثُوبَةٞ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِ خَيۡرٞۚ لَّوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ١٠٣
يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقُولُواْ رَٰعِنَا وَقُولُواْ ٱنظُرۡنَا
وَٱسۡمَعُواْۗ وَلِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٞ ١٠٤ مَّا يَوَدُّ
ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ وَلَا ٱلۡمُشۡرِكِينَ
أَن يُنَزَّلَ عَلَيۡكُم مِّنۡ خَيۡرٖ مِّن رَّبِّكُمۡۚ وَٱللَّهُ يَخۡتَصُّ
بِرَحۡمَتِهِۦ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ١٠٥

﴿وَمَا كَفَرَ سُلَيۡمَٰنُ﴾ واتە: بە فێربوونی جادوو، ئەو هەرگیز فێری نەبوو بوو ﴿وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُواْ﴾ (واتە: بەڵكو شەیتانەكان كافر بوون) بەو جادوو كردنەو داهێنانی.

﴿يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحۡرَ﴾ لە گومڕا كردنو پێداگرییان لەسەر هەڵخەڵەتاندنی نەوەكانی ئادەم، هەروەها جوولەكەكان شوێنی جادوو كەوتبوون، ئەوەی دابەزیبوو بۆ سەر دوو فریشتەكە هارووتو مارووت، كە لە زەوی بابل بوون لە زەوی عێراق، جادوو بەسەریاندا دەبەزی وەك تاقیكردنەوەو بەڵایەك لە لایەن خواوە بۆ بەندەكانی، جادوویان فێر دەكردن.

﴿وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنۡ أَحَدٍ حَتَّىٰ﴾ (كەسیان فێر نەدەكرد تا) ئامۆژگاریان دەكردو ﴿يَقُولَآ إِنَّمَا نَحۡنُ فِتۡنَةٞ فَلَا تَكۡفُرۡ﴾ (واتە: دەیانوت: ئێمە هەر بۆ تاقیكردنەوە هاتووین): فێری جادوو مەبە، بێگومان ئەوە كوفرە، قەدەغەیان لێ دەكرد لە جادوو كردن، ئاگاداریان دەكردەوە لە پلەو پایەی، جا فێر كردنی جادوو لە لایەن شەیتانەكانەوە بۆ ساختەو گومڕا كردن بوو، وە دانەپاڵو ڕازاندنەوە بۆ لای ئەو كەسەی خوا ﷻ بەری كردوە، ئەویش سولەیمان بوو ﵇، وە فێركردنی ئەو دوو فریشتەیە بۆ تاقیكردنەوە بوو لەگەڵ ئامۆژگاری كردنیان، تا نەبێتە بەڵگە بۆیان.

بێگومان ئەو جوولەكانە شوێنی جادوو دەكەوتن كە شەیتانەكان فێری بوو بوون، وە ئەو جادووەی كە فریشتەكان دەیانزانی، وازیان لە زانستی پێغەمبەران هێناو ڕوویان كردە زانستی شەیتانەكان، هەر یەكەو شەیدای ئەوە بوو كە لەگەڵی دەگونجا.

پاشان باسی خراپەو تێكدەرەكانی جادوو دەكات دەفەرموێ: ﴿فَيَتَعَلَّمُونَ مِنۡهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيۡنَ ٱلۡمَرۡءِ وَزَوۡجِهِۦ﴾ (واتە: ئنجا لێیانەوە فێری جادووی وادەبوون كە

ژنو مێـردی پـێ لە یـەک جیا بکەنـەوە) لەگەڵ ئەوەی کە خۆشەویسـتی هاوسـەرو (ژنو مێـرد) ئەندازەگیـرو قیـاس ناکرێ بە خۆشەویسـتی غەیـری خۆیان، چونکە خـوا دەربارەی ئەم خۆشەویسـتیەیان فەرموویەتـی: ﴿ وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ﴿٢١﴾ ﴾الروم. (واتە: خـوا لـە نێوانتان ئـەی هاوسـەران سـۆزو خۆشەویسـتیو بەزەییو میهـری دانـاوە). لەمەدا بەڵگـە هەیـە لەسـەر ئەوەی کـە بەڕاسـتی جـادوو حەقیقەتی هەیـە، وە زیـان دەگەیەنێ بە مۆڵەتـی خـوا، واتە: بە ویسـتی خـوا، مۆڵەتیـش دوو جۆرە:

یەکەم: مۆڵەتی قەدەری: کە پەیوەستە بە ویستی خوا، وەکو لەو ئایەتەدایە.

دووەم: مۆڵەتـی شـەرعی: وەکـو لـە فەرمایشـتی خـوا ﷻ لـە ئایەتـی ڕابـردوو فەرمـووی: ﴿ فَإِنَّهُۥ نَزَّلَهُۥ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ﴿٩٧﴾ ﴾البقـرة، (ئـەو دایبەزانـدووە بـۆ سـەر دڵـی تـۆ بـە مۆڵەتـی خوا).

لـەم دەقـەو هاوشـێوەکانیدا هـۆکارەکان هەرچەنـدە بەهێـزو کاریگـەر بن، ئـەوە بێگومان شـوێنی قـەزاو قـەدەر کەوتـوونو کاریگەریان سـەربەخۆ نیە، هیـچ کەسـێک پێچەوانەی ئـەم بنەمایـە نیـە لە دەسـتەکانی ئـەم ئوممەتـە، جگـە لـە قەدەریـەکان نەبێـت، دەربارەی کـردەوەی بەنـدەکان، پێیـان وایـە کـردەوەکان سـەربەخۆن شـوێنی ویسـتی خـوا ﷻ نەکەوتـوون، دەریـان هێناوە لـە توانای خـوا ﷻ، پێچەوانـەی قورئانو سـوننەتی پێغەمبەرو کۆدەنگـی هـاوەڵان، شـوێنکەوتوانیان جوڵاونەتـەوە.

پاشـان باسـی ئەوەی کردوە فێربوونـی جادوو زیانێکی تـەواوو پەتی هەیە، هیچ سـوودێکی تێـدا نیـە، نـە ئاینـیو نـە دنیایـی، وەک چـۆن هەنـدێ لە سـوودەکان بـەدی دەکـرێ لە هەنـدێ گوناهـو سـەرپێچیەکان، وەکو خوای بـەرز دەربارەی ئـارەقو قومـار فەرموویەتی: ﴿ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا ﴿٢١٩﴾ ﴾البقـرة، (واتـە: پێیـان بڵـێ: ئـارەقو قومـارو تـاوانو گوناهـی مەزنیـان تیادایـەو سوودیشـیان هەیـە بـۆ خەڵکـی «وەک کڕینو فرۆشـتنو بردنەوەی سـامانو بەدەسـتهێنانی قازانج» بـەڵام تاوانو گوناهەکانیـان مەزنتـرە لە سـوودەکانیان).

جـا ئـەم جـادووە زیانێکی تـەواوو پەتی هەیـە، لـە بنەڕەتدا هیـچ خواسـتو داواکاریەکی بـۆ نیـە، جـا قەدەغەکـراوەکان بە گشـتی: یـان زیانێکـی تەواویان هەیـە، یـان زیانەکەی گەورەتـرە لـە قازانجەکـەی، وەکو چۆن فەرمـان پێکراوەکان: یـان بەرژەوەنـدی تەواویان تێدایـە، یـان چاکەیـان زۆرترە لـە خراپە.

﴿ وَلَقَدۡ عَلِمُواْ ﴾ واتــە: جوولەکــەکان ﴿ لَمَنِ ٱشۡتَرَىٰهُ ﴾ (واتە: هەر کەسێک جادوو بکــرێ) واتــە: دڵــی چوو بووە ســەر جــادوو کــردن، هەروەکــو کڕیــار دڵی دەچێتە ســەر کــەلو پەلو شــتو مــەک، ﴿ مَا لَهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنۡ خَلَٰقٖ ﴾ (واتە: لــە ڕۆژی دواییدا) بێبــەش دەبێ، بەڵکو جادووگەر پێویســتە ســزا بــدرێ، جا کارو کردەوەی ئــەوان بەرانبەر بە ئــەو لە نەفامیــان نەبوو، بەڵکو خۆشەویســتی دنیایــان دابوو بەســەر دواڕۆژدا، ﴿ وَلَبِئۡسَ مَا شَرَوۡاْ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمۡۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ﴾ (واتــە: بەڕاســتی زۆر بەدە ئەو شــتەی کــە ئیمانی خۆیانیان پێی فرۆشــت) زانســتێک کــردەوە بەرهــەم بهێنــێ، ئەنجامیان نەدا.

(١٠٤-١٠٥): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقُولُواْ رَٰعِنَا وَقُولُواْ ٱنظُرۡنَا وَٱسۡمَعُواْۗ وَلِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١٠٤﴾ مَّا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ وَلَا ٱلۡمُشۡرِكِينَ أَن يُنَزَّلَ عَلَيۡكُم مِّنۡ خَيۡرٖ مِّن رَّبِّكُمۡۚ وَٱللَّهُ يَخۡتَصُّ بِرَحۡمَتِهِۦ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿١٠٥﴾ ﴾:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقُولُواْ ﴾ مســوڵمانان کاتــێ لــە خزمــەت پێغەمبــەر ﷺ دەمانــەوە بــۆ فێربوونــی زانســتو زانیــاری دەربــارەی کاروبــاری ئاینیــان دەیانــوت: ﴿ رَٰعِنَا ﴾ واتــە: ڕەچــاوی بارودۆخمــان بکــە، مەبەســتیان پێــی مانایەکــی ڕاســتو دروســت بوو.

وە جوولەکــەکان مەبەســتیان لــە وتنــی: ﴿ رَٰعِنَا ﴾ مانا خراپەکــەی بوو، ئــەو هەڵەیان قۆزتــەوە، تــا پێغەمبەریــان بەمــە دەدوانــد، مەبەســتیان پێی مانای خــراپ بوو، خــوا ﷻ ئەم وشــەیەی قەدەغەکــرد لــە بــڕواداران، بۆ ئەوەی ئــەو دەرگایــە دابخات.

لــەم دەقــەدا بەڵگەی تێدایە لە: قەدەغە کردن لە شــتی ڕەواو دروســت، ئەگەر ببێتە وەســیلەو کەرەســتەیەک بــۆ قەدەغەکــراو، هەروەها ڕەفتارو ڕەوشــتی بــەرزو بەکارهێنانی وشــەیەک دیلالــەت لــە جوانــیو چاکــی بــکات، وە نەبوونــی فاحیشــەو وازهێنان لــە وتەی بــێ ماناو ناشــرین، یــان ئەو قســانەی جۆرێک لە شــپرزەییو شــێواندنی تێدایــە، فەرمانــی پێکردوون بــە قســەیەک کــە تەنها چاکــە هەڵدەگــرێ، جــا فەرموویەتــی: ﴿ وَقُولُواْ ٱنظُرۡنَا ﴾ (واتە: پەلەمــان لێ مەکــەنو چاوەڕێمــان بکەن) بێگومان ئەوە بەســە مەبەســتەکەی پێ دەســتەبەر بێ، بــێ هیچ خۆپاراســتنێک.

﴿ وَٱسۡمَعُواْ ﴾ (واتــە: ببیســتن) باســی بیســتراوی نەکــردوە، تــا فەرمانەکە گشــتگیر بێ لەســەر بیســتن، بیســتنی قورئــانو بیســتنی ســوونەت دەگرێتــەوە، کــە بریتیە لــە دانایی لە

ڕووی مانــاو وتــەو وەڵامدانــەوەوە، هەروەهــا ئــەدەبو گوێڕایەڵیشــی تێدایە.
پاشــان هەڕەشــەی لــە کافــران کــردوە بــە ســزایەکی بــە ئێشــی ئــازار بەخــش، هەواڵیــدا دەربــارەی دوژمنــکاری جوولەکەو بتپەرســتان بەرانبەر بــڕواداران، بێگومان ئــەوان حەزیان پــێ نیــە ﴿أَن يُنَزَّلَ عَلَيۡكُم مِّنۡ خَيۡرٖ﴾ واتــە: زۆر بــێ یــا کــەم ﴿مِّن رَّبِّكُمۡ﴾ حەســوودیتان پــێ دەبــەن، وە ڕقیــان لێتانە کــە خوا ﷻ فەزڵــی خۆی پێ تایبــەت کردوون، بێگومــان ﴿ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ﴾ (خــاوەن چاکــەی مەزنە).
لــە بەخشــەکانی خوا بــە ســەرتانەوە دابەزاندنــی کتێبە بۆ ســەر پێغەمبەرەکەتــان، بۆئەوەی پاکتــان بکاتــەوەو فێــری قورئانو حیکمــەتو داناییتــان بــکات، وە فێرتان بــکات ئەوەی پێشــتر نەتــان زانیبوو.

(١٠٦-١٠٧): ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ ۗ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٠٦﴾ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿١٠٧﴾﴾.

﴿مَا نَنسَخْ﴾ (النسخ): بریتیە لە سڕینەوە، جا حەقیقەتی نەسخ ئەرک پێسپێردراوانە لە بڕیارو حوکمێکی شەرعیو ڕێگە پێدراوەوە بۆ حوکمێکی دیکە، یان بە لادانی، جولەکەکان ئینکاری نەسخیان دەکرد، وە پێیان وا بوو کە دروست نیە، لە کاتێکدا لە تەوراتدا باسکراوە، جا ئینکاری کردنیان لە نەسخ بێبڕواییو شوێنی هەواو ئارەزووە.

• مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ
أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٠٦﴾ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ
ٱللَّهَ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ
ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿١٠٧﴾ أَمْ تُرِيدُونَ أَن تَسْـَٔلُوا۟ رَسُولَكُمْ
كَمَا سُئِلَ مُوسَىٰ مِن قَبْلُ ۗ وَمَن يَتَبَدَّلِ ٱلْكُفْرَ بِٱلْإِيمَٰنِ
فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿١٠٨﴾ وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ
لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعْدِ إِيمَٰنِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا
مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْحَقُّ ۖ فَٱعْفُوا۟
وَٱصْفَحُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ
قَدِيرٌ ﴿١٠٩﴾ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ ۚ وَمَا تُقَدِّمُوا۟
لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ
بَصِيرٌ ﴿١١٠﴾ وَقَالُوا۟ لَن يَدْخُلَ ٱلْجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا
أَوْ نَصَٰرَىٰ ۗ تِلْكَ أَمَانِيُّهُمْ ۗ قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ
صَٰدِقِينَ ﴿١١١﴾ بَلَىٰ مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَلَهُۥٓ
أَجْرُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١١٢﴾

خوا ﷻ هەواڵیداوە دەربارەی حیکمەتو دانایی لە سڕینەوەدا، بێگومان ئەو نایسڕێتەوە ﴿أَوْ نُنسِهَا﴾ واتە: لە بیر بەندەکانی بباتەوەو لە دڵەکانیان لابدات ﴿نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ﴾ وە سوود بەخشتر بۆتان ﴿أَوْ مِثْلِهَآ﴾ (یان وەک ئەو).

بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە لە ڕاستیدا سڕینەوە لەبەر ئەوە نیە کە بەرژەوەندی کەمتری تێدایە لە یەکەم، چونکە فەزڵو چاکەی خوا ﷻ بەردەوام لە زیادبووندایە، بەتایبەت لەسەر ئەم ئوممەتە کە خوا ﷻ ئاینەکەی بۆ ئاسان کردوە بە ئەوپەڕی ئاسانکاری، وە هەواڵیداوە هەر کەسێک تانەو تەشەر لە سڕینەوە بدات ئەوە تانەو تەشەری لە موڵکو توانای ئەو داوە، وەک فەرموویەتی: ﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٠٦﴾ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ جا ئەگەر (خوا) خاوەنی ئێوە بێت، کار ڕاپەڕێنەرتان بێ، بە کار ڕاپەراندنی خاوەنی چاکەکارو بە بەزەیی، لە قەزاو قەدەرو فەرمانو قەدەغە کراوەکانیدا، هەر وەکو چۆن هیچ بەربەستێکی لەسەر نیە، لە ئەندازەکردنی ئەوەی بۆ بەندەکانی دیاری دەکات لە جۆرەها ئەندازەگیری، بە هەمان شێوە ڕەخنەی لێناگیرێت لەو شەریعەتو بڕیارانەی بۆ بەندەکانی دایدەنا.

جا بەندە ژێر دەستەو ڕامکراوە لە ژێر فەرمانی ئاینیو قەدەری پەروەردگاریدا، ئەو چیەتی لەو ڕەخنەگرتنە. هەروەها ئەو پشتیوانو سەرخەری بەندەکانیەتی، پشتیوانیان دەکات لە بەدەستهێنانی سوودو قازانجەکاندا، وە سەریان دەخات لە ڕەتکردنەوەی زیانەکاندا، بە هەمان شێوە لە پشتیوانی خوا ﷻ بۆ بەندەکانی ئەوەیە کە شەرعو یاسای بۆ داناون بە پێی حیکمەتو بەزەیی خۆی بۆیان.

وە ئەوەی سەرنج بدات لەوەی ڕوویداوە لە قورئانو سوننەتدا دەربارەی نەسخ، داناییو بەزەیی خوا بەرانبەر بەندەکانی، وە گەیاندنیان بە بەرژەوەندیەکانیان بە شێوەیەک هەست بە بەزەیی ئەو ناکەن.

(١٠٨-١١٠): ﴿ أَمۡ تُرِيدُونَ أَن تَسۡـَٔلُواْ رَسُولَكُمۡ كَمَا سُئِلَ مُوسَىٰ مِن قَبۡلُۗ وَمَن يَتَبَدَّلِ ٱلۡكُفۡرَ بِٱلۡإِيمَٰنِ فَقَدۡ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿١٠٨﴾ وَدَّ كَثِيرٞ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ لَوۡ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِكُمۡ كُفَّارًا حَسَدٗا مِّنۡ عِندِ أَنفُسِهِم مِّنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلۡحَقُّۖ فَٱعۡفُواْ وَٱصۡفَحُواْ حَتَّىٰ يَأۡتِيَ ٱللَّهُ بِأَمۡرِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿١٠٩﴾ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَمَا تُقَدِّمُواْ لِأَنفُسِكُم مِّنۡ خَيۡرٖ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ﴿١١٠﴾ ﴾:

﴿ أَمۡ تُرِيدُونَ أَن تَسۡـَٔلُواْ رَسُولَكُمۡ ﴾ (واتە: یان ئێوەش دەتانەوێ، داوای شتێ ناقولا بکەن لە پێغەمبەرەکەتان) خوا ﷻ قەدەغەی کردوە کە بەندە بڕوادارەکان وەک جوولەکەکان پرسیار لە پێغەمبەرەکەیان بکەن: ﴿ كَمَا سُئِلَ مُوسَىٰ مِن قَبۡلُ ﴾: مەبەست لەوەدا پرسیاری کەللەڕەقانەو ڕەخنە ئامێزە، وەکو چۆن خوا فەرموویەتی: ﴿ يَسۡـَٔلُكَ أَهۡلُ ٱلۡكِتَٰبِ أَن تُنَزِّلَ عَلَيۡهِمۡ كِتَٰبٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِۚ فَقَدۡ سَأَلُواْ مُوسَىٰٓ أَكۡبَرَ مِن ذَٰلِكَ فَقَالُوٓاْ أَرِنَا ٱللَّهَ جَهۡرَةٗ ﴿١٥٣﴾ ﴾النساء.

(واتە: خاوەن کتێبەکان داوات لێدەکەن کە لە ئاسمانەوە کتێبێکیان دابەزێنیتە سەر، بێگومان لەوە گەورەتریان لە مووسا داوا کرد، وتیان: خوامان بە ئاشکرا پێشان بدە).

وە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَسۡـَٔلُواْ عَنۡ أَشۡيَآءَ إِن تُبۡدَ لَكُمۡ تَسُؤۡكُمۡ ﴿١٠١﴾ ﴾المائدة، (واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە پرسیار مەکەن دەربارەی شتانێک ئەگەر بۆتان دەربکەوێ بۆتان خراپ بێو نارەحەتتان بکات)، ئەمەو وێنەی ئەمە قەدەغەیان لێکراوە.

بەڵام پرسیاری ڕێنماییو فێر بوون ئەمە ستایش کراوەو خوا فەرمانی پێکردوە، هەروەکو چۆن فەرموویەتی: ﴿ فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٧﴾ ﴾الأنبياء، (واتە: پرسیار لە خاوەن زانستەکان بکەن ئەگەر ئێوە نازانن)، وە دانیان پێدادەنێ لەسەری، وەکو فەرموویەتی:

﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ﴿٢١٩﴾ ﴾البقرة، (واتە: پرسیارت لێدەکەن دەربارەی شەراب‌و قومار)، وە دەفەرموێ: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْيَتَـٰمَىٰ ﴿٢٢٠﴾ ﴾البقرة، (واتە: پرسیارت لێدەکەن دەربارەی بێ باوکان)، وە نموونەی ئەوانەش.

لە کاتێکدا بابەتە قەدەغەکراوەکان زەم‌و سەرزەنشت کراوە، هەندێ جار خاوەنەکەی دەبا بەرەو کوفرو بێبڕوایی، وەک خوا فەرموویەتی: ﴿ وَمَن يَتَبَدَّلِ ٱلْكُفْرَ بِٱلْإِيمَـٰنِ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴾ (واتە: هەر کەسێک بێبڕوایی بگۆڕێتەوە بە بڕواو ئیمان، ئەوە بێگومان ڕێی ڕاستی ون کردوە).

پاشان هەواڵیداوە دەربارەی حەسوودی زۆرێک لە خاوەن کتێبەکان، ئەوان حاڵیان گەیشتووەتە ئەوەی، حەزیان کردوە: ﴿ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعْدِ إِيمَـٰنِكُمْ كُفَّارًا ﴾ (واتە: بتانکەنەوە بە بێبڕوا دوای بڕواهێنانتان) کۆششی زۆریان بۆ ئەوە کرد، پیلانیان گێڕاو ئەنجامیاندا، پیلانەکەیان گەڕایەوە بۆ سەرخۆیان، هەروەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَقَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ ءَامِنُوا۟ بِٱلَّذِىٓ أُنزِلَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَجْهَ ٱلنَّهَارِ وَٱكْفُرُوٓا۟ ءَاخِرَهُۥ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٧٢﴾ ﴾ (ال عمران)، (واتە: وە دەستەیەک لە خاوەن کتێبان لە نێو خۆیاندا وتیان: پێش نیوەڕۆ بڕوابێنن بەوەی بۆ سەر بڕواداران نێرراوەتە خوار، دوای نیوەڕۆش بێبڕوایی پێشان بدەن، بەڵکو «لە ئیسلام» هەڵگەڕێنەوە)، ئەمە لە ئێرەیی‌و حەسوودیانەوە بووە کە لێیانەوە دەردەچێت.

جا خوا ﷻ فەرمانی پێداون لە بەرانبەر خراپەی ئەواندا، لێیان ببورن‌و دڵو دەروونتان بێگەرد بکەن، تا خوا فەرمانی خۆیتان بۆ دەنێرێ، پاشان دوای ئەوە خوا ﷻ فەرمانی خۆی بۆ هێنان بە جەنگ‌و جیهاد کردن، وە شیفای دەروونی بڕوادارانیدا، ئەوەی لێیان کوشتن ئەوە کوژرا، ئەوەی لێیان کردنە کۆیلە لێیان کردنە کۆیلەو ئەوەی دەریان پەڕاندن دەریان پەڕاندن، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴾ (واتە: بەڕاستی خوا لەسەر هەموو شتێک بە توانایە).

پاشان خوا فەرمانی پێکردوون بە بەجێهێنانی نوێژو دەرکردنی زەکات، وە ئەنجامدانی هەموو کارو کردەوەیەک کە دەبێتە مایەی نزیک بوونەوە لە خوا، وە بەڵێنی پێدان ئەوان هەر خێرو چاکەیەک بکەن، ئەوە بێگومان لای خوا ﷻ بە فیرۆ ناچێ، بەڵکو دەیبیننەوە بە فراوانی‌و بە چاکترین شێوە پاراستوویەتی، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾ (بێگومان خوا بەوەی دەیکەن بینایە).

(١١١-١١٢): ﴿ وَقَالُوا۟ لَن يَدْخُلَ ٱلْجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوْ نَصَـٰرَىٰ ۗ تِلْكَ أَمَانِيُّهُمْ ۗ قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَـٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿١١١﴾ بَلَىٰ مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ

مُحۡسِنٞ فَلَهُۥٓ أَجۡرُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ وَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿١١٢﴾ ﴾:

﴿ وَقَالُواْ لَن يَدۡخُلَ ٱلۡجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوۡ نَصَٰرَىٰۗ تِلۡكَ أَمَانِيُّهُمۡۗ قُلۡ هَاتُواْ بُرۡهَٰنَكُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴾ واتە: جوولەکەکان وتیان: کەس ناچێتە بەهەشت مەگەر یەکێ جوولەکە بێ، وە گاورەکانیش وتیان: کەس ناچێتە بەهەشتەوە مەگەر یەکێک گاور بێ.

هەر یەکەیان بە تەنها حوکمیاندا بە بەهەشت بۆ خۆیان، ئەمە تەنها ئاواتێکی وەرنەگیراوە، مەگەر بە بەڵگەو سەلماندن، جا ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن بەڵگەکانتان بهێنن، وە بە هەمان شێوە هەر کەسێک بانگەشەیەک بکات حەتمەن دەبێ بە بەڵگە ڕاستی بانگەشەکەی بسەلمێنێ، وە ئەگەرنا، دەبێ بانگەشەکەی بەسەرخۆیدا هەڵگێڕێتەوە، وە هەموو بانگەشەکارێک پێچەوانەی بانگەشەکەی بجولێتەوە بێ سەلماندن، ئەو کات هیچ جیاوازیەک لە نێوانیاندا نیە، جا بەڵگە دەیسەلمێنێ بانگەشەکار ڕاست دەکات یان درۆ، وە کاتێک کە ئەوان بەڵگەو سەلماندنیان بە دەستەوە نەبوو، دەردەکەوێ درۆیان کردوە لەو بانگەشەیە.

پاشان خوا ﷻ باسی بەڵگەی ڕوونو گشتی کرد بۆ هەموو کەسێ، جا فەرموویەتی: ﴿ بَلَىٰ ﴾ بە ئاواتخواستنو بانگەشەکردنی ئێوە نیە، بەڵکو ﴿ مَنۡ أَسۡلَمَ وَجۡهَهُۥ لِلَّهِ ﴾ واتە: بە دڵسۆزی کار بۆ خوا بکات، وە بە ڕاستیو لە دڵەوە ڕووی تێبکات، ﴿ وَهُوَ ﴾ لەگەڵ دڵسۆزیەکەیدا ﴿ مُحۡسِنٞ ﴾ (چاکەکار بێت) لە بەندایەتیکردنی پەروەردگاریدا، بەندایەتی بۆ بکات بەپێی شەریعەتەکەی، بە ڕاستی ئەوانە لە ئەهلی بەهەشتن، ئەوانە پاداشتیان لای پەروەردگاریان بۆ هەیە، ئەویش بەهەشتە کە هەموو ئەو نازو نیعمەتانە لە خۆدەگرێ، ﴿ وَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴾ ئەوەی خوازراوەو حەزی لێدەکرێ دەستەبەربووە بۆیان، وە ڕزگاریان دەبێ لە مەترسی.

ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ هەر کەسێک بەو شێوەیە نەبێ ئەوە لە ئەهلی ئاگرو تیاچووانە، ڕزگار بوون نیە تەنها بۆ ئەوانە نەبێ کە بە دڵسۆزی خوا ﷻ دەپەرستنو شوێنی پێغەمبەرەکەی دەکەون.

(١١٣): ﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ لَيْسَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ عَلَىٰ شَىْءٍ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ لَيْسَتِ ٱلْيَهُودُ عَلَىٰ شَىْءٍ وَهُمْ يَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ ۗ كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ مِثْلَ قَوْلِهِمْ ۚ فَٱللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ (١١٣) ﴾


وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ لَيْسَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ عَلَىٰ شَىْءٍ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ
لَيْسَتِ ٱلْيَهُودُ عَلَىٰ شَىْءٍ وَهُمْ يَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ ۗ كَذَٰلِكَ
قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ مِثْلَ قَوْلِهِمْ ۚ فَٱللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ
يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ (١١٣) وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن
مَّنَعَ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ أَن يُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ وَسَعَىٰ فِى خَرَابِهَآ ۚ
أُو۟لَٰٓئِكَ مَا كَانَ لَهُمْ أَن يَدْخُلُوهَآ إِلَّا خَآئِفِينَ ۚ لَهُمْ فِى
ٱلدُّنْيَا خِزْىٌ وَلَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ (١١٤) وَلِلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ
وَٱلْمَغْرِبُ ۚ فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا۟ فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ (١١٥)
وَقَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًا ۗ سُبْحَٰنَهُۥ ۖ بَل لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضِ ۖ كُلٌّ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ (١١٦) بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ
وَإِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ (١١٧) وَقَالَ
ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ لَوْلَا يُكَلِّمُنَا ٱللَّهُ أَوْ تَأْتِينَآ ءَايَةٌ ۗ
كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِم مِّثْلَ قَوْلِهِمْ ۘ تَشَٰبَهَتْ
قُلُوبُهُمْ ۗ قَدْ بَيَّنَّا ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ (١١٨) إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ
بِٱلْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ۖ وَلَا تُسْـَٔلُ عَنْ أَصْحَٰبِ ٱلْجَحِيمِ (١١٩)

بەو شێوەیە هەواو ئارەزوو ئیرەیی خاوەن کتێبەکانی گەیاندە ئەوەی کە هەندێکیان هەندێکی دیکەیان گومڕا بکەن، وە هەندێکیشیان هەندێکی دیکەیان تەکفیر بکەنو بە کافری دابنێن، هەروەکو چۆن نەخوێندەوارەکان لە بتپەرستانی عەرەبو جگە لەوان ئەو کارەیان دەکرد. جا هەر دەستەیەکیان دەستەیەکی دیکەی بە گومڕا دادەنا، خوا ﷻ لە ڕۆژی دواییدا بە دادوەری خۆی بڕیاری دادپەروەرانە لە نێوانیاندا دەدات، کە بەندەکانی پێ ئاگادار کردۆتەوە، بە حەقیقەت ڕزگاربوونو دەربازبوون نیە، تەنها بۆ کەسێ نەبێ سەرجەم پێغەمبەرانو نێردراوانی بەڕاست دانایێ، فەرمانەکانی پەروەردگاری جێبەجێ کردبێ، وە دوورکەوتبێتەوە لە قەدەغەکراوەکانی، جگە لەوانە لە تیاچووانە.

(١١٤): ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ أَن يُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ وَسَعَىٰ فِى خَرَابِهَآ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ مَا كَانَ لَهُمْ أَن يَدْخُلُوهَآ إِلَّا خَآئِفِينَ ۚ لَهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا خِزْىٌ وَلَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ (١١٤) ﴾

﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ أَن يُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ ﴾ واتە: هیچ کەس لەوە ستەمکارترو تاوانبارتر نیە، کە قەدەغەی مزگەوتەکانی خوا ﷻ بکات لە یادکردن تیایانداو ئەنجامدانی نوێژو جگە لەوانەش لە هەموو جۆرە عیبادەتەکانی دیکە.

﴿ وَسَعَىٰ ﴾ واتە: هەوڵ دەداتو هەموو تواناکانی بەکاردەهێنێ ﴿ فِى خَرَابِهَآ ﴾ (بۆ وێرانکردنیان)، هەستەوەریو مەعنەویی، جا تێکدانی هەستەوەری (الحسي): ڕووخانو تێکدانو پیس کردنیەتی. وە تێکدانی مەعنەویی: ڕێگریکردنە لە خەڵکی یادی خوای تێدا

بکەن، ئەمەش گشتگیرە بۆ هەر کەسێ بەم وەسفانە وەسف کرابێ، دەچێتە چوارچێوەی ئەمەوە هەریەکە لە خاوەن فیلو قورەیشیەکان، کاتێ کە ڕێگریان کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی حودەیبیە، بەهەمان شێوە گاورەکان کاتێ کە (بیت المقدس)یان تێکدا، وە جگە لەوانیش لەو ستەمکارانەی کە هەوڵی تێکدانیان داوە، دوژمنایەتی خوایان کردوە، خوای مەزنیش پاداشتی داونەتەوە بەوەی کە ڕێگری لێکردوون بچنە ژوورەوە، بە شەرعو بە قەدەر، مەگەر بە زەلیلیو ترسو سامەوە بچنە ناویەوە، جا کاتێ بەندەکانی خوایان ترساند، خوا ﷻ ترساندنی.

هاوبەشدانەران ڕێگری پێغەمبەریان کرد (لە چوونە مەککە)، دوای ماوەیەکی کەم کە بەسەر پێغەمبەری خوادا ڕەت بوو، خوا ﷻ مۆڵەتی ئازاد کردنی مەککەی پێدا، وە ڕێگری کرد لەوەی هاوبەش دانەران نزیک ماڵەکەی بکەونەوەو فەرمووی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡمُشۡرِكُونَ نَجَسٞ فَلَا يَقۡرَبُواْ ٱلۡمَسۡجِدَ ٱلۡحَرَامَ بَعۡدَ عَامِهِمۡ هَٰذَاۚ ﴿٢٨﴾ ﴾التوبة. (واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بێگومان هاوبەش دانەران پیسن، کەواتە با نزیکی مزگەوتی بەڕێز نەکەونەوە پاش ئەم ساڵەیان).

هەرچی ئەوەی خاوەن فیلەکانە خوای گەورە باسی کردوە چی بەسەر هێنان، وە گاورەکانیش خوا ﷻ مسوڵمانانی زاڵ کرد بەسەریاندا خاکو وڵاتیانیان پێ چۆڵ کردن.

هەروەها هەموو ئەوانەی بەو شێوەیە وەسف کراون، هەر دەبێ دادپەروەری خوا ﷻ بیانگرێتەوە، ئەمە لە نیشانە مەزنەکانە، خوا ﷻ هەواڵی پێداوە پێش ڕوودانی، زانایان ئەم دەقەیان بە بەڵگە هێناوەتەوە، کە دروست نیە بێبڕوایان جێگیر بکرێن لە چوونە ناوەوەی مزگەوتەکان.

﴿ لَهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا خِزۡيٞ ﴾ واتە: ڕیسواییو سەرشۆڕی، وەک لە پێشەوە باسکرا، ﴿ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴾ (واتە: ئەوان لە دنیادا ڕیسوا دەبن، وە لە ڕۆژی دواییدا سزای مەزنیان بۆ هەیە) ئەگەر هیچ تاوانێک لەوە گەورەتر نەبێ لەوەی کەسێک ڕێگری لە مزگەوتەکانی خوا ﷻ بکات، بۆ ئەوەی یادی ئەوی تێدا بکرێ، کەواتە: هیچ کەسێکیش ئیمانی مەزنتر نیە لەو کەسەی کە هەوڵو کۆشش ئەکات بۆ ئاوەدانکردنەوەی مزگەوتەکان (لە هەردوو لایەنی) هەستەوەریو مەعنەویەکان (الحسي والمعنوي)، وەکو خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ إِنَّمَا يَعۡمُرُ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ مَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ ﴿١٨﴾ ﴾التوبة. (واتە: بەڕاستی مزگەوتەکانی خوا ﷻ ئاوەدان دەکاتەوە کەسێک کە بڕوای هێنابێ بە خواو بە ڕۆژی دوایی). بەڵکو خوا ﷻ فەرمانی کردوە بە بەرز ڕاگرتنو بە مەزنداناننو بە ڕێز لێگرتنی ماڵەکەی، فەرموویەتی: ﴿ فِي بُيُوتٍ أَذِنَ ٱللَّهُ أَن تُرۡفَعَ وَيُذۡكَرَ فِيهَا ٱسۡمُهُۥ ﴿٣٦﴾ ﴾النور. (واتە: لە مزگەوتەکاندا خوا ﷻ

مۆڵەتی داوە کە بە گەورەو پاک ڕابگیرێ‌و زیکرو یادی خوای تێدا بکرێ). مزگەوتەکان ئەحکامی زۆر لەخۆ دەگرن، ئەنجامەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕۆکی ئەم دەقانە.
(١١٥): ﴿ وَلِلَّهِ ٱلۡمَشۡرِقُ وَٱلۡمَغۡرِبُۚ فَأَيۡنَمَا تُوَلُّواْ فَثَمَّ وَجۡهُ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ وَٰسِعٌ عَلِيمٞ ١١٥ ﴾:
﴿ وَلِلَّهِ ٱلۡمَشۡرِقُ وَٱلۡمَغۡرِبُ ﴾ (واتە: ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوا هی خوایە) بە تایبەتی باسی کردوون، چونکە لە نیشانە مەزنەکانن، ئەوانە سەرچاوەی ڕووناکی خۆرهەڵات‌و خۆر نشینن، جا ئەگەر خوا خاوەنی ئەوانە بێت، ئەوە خاوەنی هەموو ڕووەکانە.
﴿ فَأَيۡنَمَا تُوَلُّواْ ﴾ بە ڕووخسارتان ڕوو بکەنە هەر لایەک، ئەگەر ڕووکردنتان لە نوێژەکاندا بە فەرمانی ئەو بوو، یان فەرمانتان پێدەکات بە ڕووکردنە کەعبە، پاش ئەوەی کە فەرمانتان پێکراوە بە ڕووکردنە (بيت المقدس)، یان فەرمانتان پێدەکرێ بە نوێژ کردن لە گەشت کردندا، بەسەر ئامێری گواستنەوەو نموونەی ئەوە، بێگومان ڕووگە هەر چۆنێک بەندە ڕووی تێبکات یان لێی بگۆڕێ، کە بیەوێ نوێژ بکات، پاشان بۆی دەربکەوێ هەڵەی کردوە، یان بیانووی هەبێ لە ڕووکردنە ڕووگە، وەک ئەوەی دوژمن هەڵیواسیبێ، یان نەخۆش بێ، وە هاوشێوەی ئەوانە، ئەم کاروبارانە، یان ئەوەیە بەندە تێیدا عوزری هەیە، یان فەرمان پێکراوە.
بە هەر حاڵ، ئەگەر ڕووبکاتە هەر ڕوویەک لە ڕووەکان، لە دەرەوەی موڵکی پەروەردگاری بێت ﴿ فَثَمَّ وَجۡهُ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ وَٰسِعٌ عَلِيمٞ ﴾ (واتە: ئەوە ڕووگەی خوا لەوێیە، بێگومان خوا ﷻ بەزەیی‌و میهرەبانی فراوانەو زانایە)، ئەم دەقە ڕووخسار (الوجه) بۆ خوا دەچەسپێنێ، لەو ڕووەی کە شایستەیە بە بەرزی خوا، بە ڕاستی خوا ﷻ ڕووخساری هەیەو هیچ ڕووخسارێک لەو ناچێ، خوای بەرز فەزڵ‌و چاکەو سیفەتە مەزنەکانی بەرفراوانە، زانایە بە نهێنی‌و نیازەکانتان، لە بەرفراوانی‌و زانستی خوا ئەوەیە کە هەموو کاروبارێکی بۆ فراوان کردوون، وە کارەکانیشی لێوەرگرتوون، وە سوپاس‌و ستایش بۆ خوا.
(١١٦-١١٧): ﴿ وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدٗاۗ سُبۡحَٰنَهُۥۖ بَل لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ كُلّٞ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ ١١٦ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَإِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ١١٧ ﴾:
﴿ وَقَالُواْ ﴾ واتە: جوولەکەو گاورو بتپەرستەکان، وە هەر کەسێ وتبێتی: ﴿ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدٗا ﴾ واتە: خوا ﷻ منداڵی بۆ خۆی داناوە. شتێکیان داونەتە پاڵی کە شایستەی گەورەیی‌و مەزنی ئەو نیە، وە خراپەیان کرد بە ناشرینترین شێوەو ستەمیان لە خۆیان کردوە.
خوای بەرز ئارامگرە لەسەر ئەو ڕەفتارانەیان، بێگومان لەسەرخۆو نەرم‌و نیانە لەگەڵیانداو لێیان دەبورێ‌و ڕزق‌و ڕۆزیان پێدەدات، لەگەڵ ئەوەدا ئەوان بە ناتەواوی دادەنێن ﴿ سُبۡحَٰنَهُۥ ﴾

واتە: پاکیو بێگەردی بۆ ئەو خوایە، لە هەموو وەسفێک کە بتپەرستانو ستەمکاران دەیدەنە پاڵی، کە شایستەی گەورەیی ئەو نیە، پاکی بۆ ئەو خوایەی خاوەن کەماڵو تەواوی ڕەهایە لە هەموو ڕووەکانەوە، ئەوەی کە ناتەواوی بەسەردا نایەت لە هیچ ڕووێکەوە.

وە لەگەڵ ئەوەدا خوا ﷻ قسەکانیان ڕەتدەکاتەوە، بەڵگەی بیانوو بڕی لەسەر پاکو بێگەردی خۆی بۆ هێناونەتەوە، جا فەرموویەتی: ﴿بَل لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ هەموویان موڵکو بەندەی خوان، کاروباریان بەڕێوە دەبات وەک چۆن خاوەندار کاروباری کۆیلەکانی بەڕێوە دەبات، ئەوان ملکەچی ئەون، ڕامکراونو لە ژێر دەسەڵاتی ئەودان، جا ئەگەر هەموویان بەندەی ئەو بنو پێویستیان بەو هەبێ، ئەویش بێنیاز بێ لێیان، دەی چۆن دەبێ کەسێک لەوان ببێت بە منداڵی، وە منداڵیش دەبێ لە ڕەگەزی باوکی بێت، چونکە بەشێکە لە باوکی!

خوای بەرز خاوەندارو زاڵە، ئێوە موڵکی ئەونو زاڵە بەسەرتاندا، ئەو دەوڵەمەندو بێنیازە، ئێوەش هەژارو نەدارن، جا چۆن دەبێ لەگەڵ ئەمەدا منداڵی هەبێ؟ بە ڕاستی ئەمە لەوپەڕی پڕوو پووچیدایە (قنوت): دوعاکردن دوو جۆرە: دوعاکردنی گشتی، ئەویش دوعای هەموو بەدیهێنراوەکانە بە گشتی، لە ژێر بەڕێوەبردنی بەدیهێنەردان.

دووەم: دوعای تایبەت: ئەویش دوعای عیبادەت کردنە. جۆری یەکەم هەر وەکو چۆن لەم دەقەدا باسکرا ﴿كُلٌّ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ﴾ (واتە: هەموو فەرمانبەری ئەون)، وە جۆری دووەم وەک چۆن خوا فەرموویەتی: ﴿وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ ٢٣٨﴾البقرة. (واتە: وە لە نوێژدا بوەستن بۆ خوا ﷻ بە گەردن کەچی).

پاشان فەرموویەتی: ﴿بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ واتە: بەدیهێنەری ئاسمانو زەویە، بە وردترینو چاکترین شێوە (بەدیهێناون)، ﴿وَإِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴾، (واتە: وەکاتێ کە ویستی شتێ بکات، هەرئەوەندەی پێ ئەوێ کە پێی بڵێ ببە، ئیتر ئەبێ) هیچی لێگیر نابێ، وە هیچیش ناتوانێ ڕێگری لێبکات.

(١١٨-١١٩): ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ لَوۡلَا يُكَلِّمُنَا ٱللَّهُ أَوۡ تَأۡتِينَآ ءَايَةٞۗ كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِم مِّثۡلَ قَوۡلِهِمۡۘ تَشَٰبَهَتۡ قُلُوبُهُمۡۗ قَدۡ بَيَّنَّا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يُوقِنُونَ ١١٨ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗاۖ وَلَا تُسۡـَٔلُ عَنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡجَحِيمِ ١١٩﴾:

﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ لَوۡلَا يُكَلِّمُنَا ٱللَّهُ﴾ واتە: نەزانەکانو خاوەن کتێبەکانو جگە لەوانیش دەیانوت: بۆچی خوا قسەمان لەگەڵ ناکات، وەکو چۆن قسەی لەگەڵ پێغەمبەران کردوە؟ ﴿أَوۡ تَأۡتِينَآ ءَايَةٞ﴾ (یان نیشانەیەکمان بۆ ناهێنێ) مەبەستیان پێی ئایەتو نیشانەی

پێشنیار کراو بوو، کە پێشنیازیان دەکرد بە عەقڵە خراپو بۆچوونە لاوازەکانیان، بوێریان پێدەکرد بەسەر دروستکراوداو، لووت بەرزیشیان دەنواند بەسەر پێغەمبەراندا، وەکو دەیانوت: ﴿لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ جَهْرَةً ﴿٥٥﴾﴾ البقرة. (واتە: بڕوات پێ ناهێنین، تا خوا نەبینین بە ئاشکرا)، ﴿يَسْـَٔلُكَ أَهْلُ ٱلْكِتَـٰبِ أَن تُنَزِّلَ عَلَيْهِمْ كِتَـٰبًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ۚ فَقَدْ سَأَلُوا۟ مُوسَىٰٓ أَكْبَرَ مِن ذَٰلِكَ ﴿١٥٣﴾﴾ النساء. (واتە: ئەی موحەممەد! خاوەن کتێبەکان داوات لێدەکەن کە بۆیان بێنیتە خوارەوە کتێبێک لە ئاسمانەوە، جا بە ڕاستی داوای گەورەتریان لەوە لە موسا کرد). وە دەیانوت: ﴿لَوْلَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مَلَكٌ فَيَكُونَ مَعَهُۥ نَذِيرًا ﴿٧﴾ أَوْ يُلْقَىٰٓ إِلَيْهِ كَنزٌ أَوْ تَكُونُ لَهُۥ جَنَّةٌ ﴿٨﴾﴾ الفرقان. (واتە: بۆچی فریشتەیەک نەنێردراوەتە خوارەوە بۆلای، بۆ ئەوەی لە گەڵیدا ترسێنەر بێ، یان گەنجینەیەکی لە ئاسمانەوە بۆ فرێ بدرایە، یان باخێکی ببووایە). وە خوا (لەسەر زاریان) دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا۟ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفْجُرَ لَنَا مِنَ ٱلْأَرْضِ يَنۢبُوعًا ﴿٩٠﴾﴾ الإسراء. (واتە: وتیان: هەرگیز بڕوات پێ ناهێنین، هەتا لەم زەویەدا کانیاوێکمان بۆ هەڵنەقوڵێنی).

ئەمە خووڕەوشتو پیشەیان بوو لەگەڵ پێغەمبەرانیاندا، داوای ئایەتو نیشانەی کەللەڕەقیو عینادیان دەکرد، بە پێچەوانەی ئایەتی ڕێنمایی، مەبەستیشیان ڕوونکردنەوەی هەق نەبوو، بێگومان پێغەمبەران کۆمەڵە بەڵگەو نیشانەیەکیان لەگەڵ خۆیان هێنا، کە شایستەی ئەوە بوو مرۆڤ بڕوایان پێ بکات، لەبەر ئەمەیە خوا فەرموویەتی: ﴿قَدْ بَيَّنَّا ٱلْـَٔايَـٰتِ لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾ (نیشانەی زۆرمان باسکردوە بۆ کۆمەڵێک بە شوێن دڵنیایدا دەگەڕێن).

هەموو دڵنیاکارێک، لە ئایەتو نیشانەکانی خوا ﷻ تێدەگات، وە سەلماندنە ئاشکراکانیشی، کە بەو نیشانانە یەقینو دڵنیایی بۆ دروست دەبێو هەموو گومانو دوو دڵیەکی لێ دوور دەکەوێتەوە.

پاشان خوا ﷻ باسی هەندێ ئایەتی کورتی گشتگیری کردوە، کە بەڵگەن لەسەر ڕاستی پێغەمبەرو ڕاستی ئەو پەیامەی کە هێناویەتی، دەفەرموێ: ﴿إِنَّآ أَرْسَلْنَـٰكَ بِٱلْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا﴾ (واتە: بێگومان ئێمە تۆمان نارد بە ئاینێکی ڕاستو دروستەوە، بە مژدەدەرو ترسێنەر) ئەمە هەموو ئەو ئایەتانە دەگرێتەوە کە هێناویەتی، ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ سێ شت: یەکەم: لە خودی پەیامەکە، دووەم: لە ژیانی پێغەمبەر ﷺ، وە ڕێنماییو ئامۆژگاریەکانی، سێیەم: لە زانیاری ئەوەی کە هێناویەتی لە قورئانو سوننەت. جا یەکەمو دووەم دەچنە چوارچێوەی ئەم فەرمودەی خوا ﷻ: ﴿إِنَّآ أَرْسَلْنَـٰكَ﴾ وە سێیەم: دەچێتە ناو فەرموودەی خوا: ﴿بِٱلْحَقِّ﴾.

جا ڕوونکردنەوەی خاڵی یەکەم کە بریتیە لە -خودی پەیامەکە- بێگومان پێغەمبەر ﷺ لە دۆخی خەڵکی سەر زەوی دەزانی پێش هاتنی، وە ئەوەی ئەوان لەسەری دەڕۆشتن لە بتپەرستیو ئاگرو خاچ پەرستیو گۆڕینەوەی ئاینەکانیان، تا وایان لێهاتبوو تاریکی کوفر داگیری کردبوون، تەنها کەمێک نەبێ لە پاشماوەکانی خاوەن کتێب، کە بۆ ماوەیەکی کەم پێش هاتنی پەیام بۆ پێغەمبەر ﷺ لەناو چوونو فەوتان.

بێگومان زانراوە خوا ﷻ دروستکراوەکانی دروست نەکردوە بە خۆڕاو بە هاوەنتە، وە هەروا وازی لێنەهێناون، چونکە داناو زانایە، بە تواناو بەسۆزو میهرەبانە، جا لە داناییو بەزەیی بەرانبەر بەندەکانی ئەوەیە کە ئەم پێغەمبەرە مەزنەی بۆ ناردوون، فەرمانیان پێدەکات بە بەندایەتی خوای بەبەزەیی، تاکو تەنها کە هیچ هاوەڵو شەریکێکی نیە، جا تەنها بە پەیامەکەی مرۆڤی عاقڵ حەقیقەتو ڕاستی ئەوەی بۆدەردەکەوێ، ئەویش ئایەتێکی گەورەیە کە ئەو پێغەمبەری خوایە.

دووەم: هەر کەسێک پێغەمبەری ناسیبێ بە ناسینێکی تەواو، وە زانیاری هەبێ دەربارەی ژیانی پێش پێغەمبەرایەتی، وە گەشە کردنی لەسەر تەواوترینی سیفەتەکان، پاشان لە دوای ئەوە ڕێزو ڕەوشتە بەرزەکانی زیادی دەکردو دەگەشانەوە لە پێش چاوی خەڵکی، جا هەر کەسێک بیناسیایەو تەماشای حاڵی بکردایە، دەیزانی ئەمە تەنها لە ڕەوشتی پێغەمبەرانی کامڵو تەواوە، چونکە خوا ﷻ وەسفەکانی داناوە بە گەورەترین بەڵگە لەسەر ناسینی خاوەنەکانیان، وە ڕاستیو درۆیان.

سێیەم: ئەویش زانینی ئەو پەیامەیە کە هێناویەتی لەو شەریعەتە مەزنە، وە قورئانی پیرۆز هەموو هەواڵە ڕاستو دروستەکانو فەرمانە چاکەکانو قەدەغە کردن لە هەموو خراپەیەکو موعجیزە ڕوونو ئاشکراکان لە خۆ دەگرێ، هەموو ئایەتەکان دەچنە ناو ئەم سیانەوە.

خوای بەرز کە دەفەرموێ: ﴿بَشِيرًا﴾ واتە: بۆ هەر کەسێ کە گوێڕایەڵیت بکات بە خۆشبەختیو بەختیاری دنیاو دواڕۆژ ﴿وَنَذِيرًا﴾ بۆ هەر کەسێ کە سەرپێچیت بکات لە بەدبەختیو ڕیسوایی دنیاو دواڕۆژ، ﴿وَلَا تُسْـَٔلُ عَنْ أَصْحَٰبِ ٱلْجَحِيمِ﴾ واتە: تۆ بەرپرسیار نیت لێیان، بەڵکو تەنها گەیاندنت لەسەرەو لێپرسینەوەش لەسەر ئێمەیە.


وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ ٱلْيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ ۗ قُلْ
إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ ۗ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم بَعْدَ ٱلَّذِى
جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ ۙ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿١٢٠﴾ ٱلَّذِينَ
ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَتْلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ أُو۟لَٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۗ وَمَن
يَكْفُرْ بِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿١٢١﴾ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتِىَ
ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَنِّى فَضَّلْتُكُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٢٢﴾ وَٱتَّقُوا۟ يَوْمًا
لَّا تَجْزِى نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْـًٔا وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا عَدْلٌ وَلَا تَنفَعُهَا
شَفَٰعَةٌ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿١٢٣﴾ ۞ وَإِذِ ٱبْتَلَىٰٓ إِبْرَٰهِۦمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٍ
فَأَتَمَّهُنَّ ۖ قَالَ إِنِّى جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا ۖ قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِى ۖ قَالَ
لَا يَنَالُ عَهْدِى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٢٤﴾ وَإِذْ جَعَلْنَا ٱلْبَيْتَ مَثَابَةً لِّلنَّاسِ
وَأَمْنًا وَٱتَّخِذُوا۟ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِۦمَ مُصَلًّى ۖ وَعَهِدْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِۦمَ
وَإِسْمَٰعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِىَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلْعَٰكِفِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ
﴿١٢٥﴾ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِۦمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا بَلَدًا ءَامِنًا وَٱرْزُقْ أَهْلَهُۥ
مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ مَنْ ءَامَنَ مِنْهُم بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ۖ قَالَ وَمَن كَفَرَ
فَأُمَتِّعُهُۥ قَلِيلًا ثُمَّ أَضْطَرُّهُۥٓ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلنَّارِ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٢٦﴾

(١٢٠): ﴿وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ ٱلْيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ ۗ قُلْ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ ۗ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم بَعْدَ ٱلَّذِى جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ ۙ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿١٢٠﴾﴾:

﴿وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ ٱلْيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ ۗ قُلْ﴾ خوا ﷻ هەواڵ بە پێغەمبەرەکەی دەدات، کە هەرگیز جوولەکەو گاورەکان لێی ڕازی نابن تا شوێنی ئاینەکەیان نەکەوێ، چونکە ئەوان بانگخوازن بۆ لای ئەو ئاینەی کە لەسەری دەڕۆن، وە وا تێدەگەن کە ئەو ئاینە هیدایەتو ڕێنماییە، جا تۆش پێیان بڵێ: ﴿إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ﴾ (بە ڕاستی ڕێنمایی خوا ﷻ) کە منی پێ نێردراوە ﴿هُوَ ٱلْهُدَىٰ﴾ (هەر ئەو ڕێنماییە). بەڵام ئەوەی ئێوە لەسەری دەڕۆن، ئەوە هەواو ئارەزووە، بە بەڵگەی: ﴿وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم بَعْدَ ٱلَّذِى جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ ۙ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ﴾ (واتە: وە ئەگەر دوای ئارەزووەکانی ئەوان بکەویت، دوای ئەو زانینەی کە لە لایەن خواوە بۆت هاتووە، هیچ سەرپەرشتیکەرو یاریدەدەرێکت نابێ لەلایەن خواوە)، ئا ئەمە قەدەغەکردنێکی مەزنی تێدایە لە شوێنکەوتنی هەواو ئارەزووی جولەکەو گاور، وە خۆشبهاندن پێیان بەتایبەت ئەوەی پەیوەندی بە ئاینەکەیانەوە هەیە، دواندنە کە هەرچەندە لەگەڵ پێغەمبەردایە ﷺ بێگومان ئومەتەکەیشی هەر لەو چوار چێوە دایە، چونکە (الإعتبار بعموم المعنی لا بخصوص السبب) واتە: ڕەچاو کردن بە مانای گشتی ئایەتەکانە نەک بە تایبەتی قسە لەگەڵ کراو، وەک چۆن (إن العبرة بعموم اللفظ، لا بخصوص السبب) واتە: بە ڕاستی پەندو عیبرەت بە کۆی قسەکردنە، نەک بە تایبەتمەندی هۆکار، پاشان دەفەرموێ:

(١٢١-١٢٣): ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَتْلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ أُو۟لَٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۗ وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿١٢١﴾ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتِىَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَنِّى فَضَّلْتُكُمْ عَلَى

ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٢٢﴾ وَٱتَّقُوا۟ يَوْمًا لَّا تَجْزِى نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْـًٔا وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا عَدْلٌ وَلَا تَنفَعُهَا شَفَٰعَةٌ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿١٢٣﴾ ﴾

﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ ﴾ خـوای بـەرز هـەواڵ دەدات ئەوانـەی کـە کتێبی پێـداون، وە منەتـی کـردوە بەسـەریاندا بە منەتێکـی ڕەهـا ﴿ يَتْلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ ﴾ واتە: ئەوان شـوێنی دەکـەون بـە چاکتریـن شـوێنکەوتن، وە، خوێندنـەوە، واتـە: شـوێنکەوتن، حەڵاڵـە کان حـەڵاڵ دەکـەنو قەدەغە کراوە کانیشـی قەدەغـە دەکـەن، وە کار بـە بڕیارە کانـی دەکەنو بڕوایـان بـەو ئایەتانـە هەیـە کـە مەبەسـتە کانیان ڕوون نیـە، ئـا ئەوانـە خۆشـبەختن لـە خـاوەن کتێبـە کان، ئەوانـە نیعمەتە کانی خوایان ناسـیو سوپاسـگوزاری بـوون، وە بڕوایان بـە سـەرجەم پێغەمبـەران هێنـا، جیاوازیـان لـە نێـوان هیـچ یە کێکیانـدا نە کـرد، ئـا ئەوانە بـرواداری ڕاسـتەقینەن، نـە ک ئەوانـەی کە وتیـان: ﴿ نُؤْمِنُ بِمَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا وَيَكْفُرُونَ بِمَا وَرَآءَهُۥ ﴿٩١﴾ ﴾البقـرة، (واتـە: ئێمـە بڕوا بـەوە دەهێنین کە بـۆ خۆمـان نێردراوەتە خوار، وە بێبـڕوا ئەبوون بـە ئەوانەی دوای «تەورات» نێـردراوە). لەبەر ئەمە هەڕەشـەی لێکردوون بـە فەرمـوودەی خـۆی: ﴿ وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴾ ئـەو ئایەتەی لە پـاش ئەمە دێ لە پێشـەوە تەفسـیر کـراوە (واتـە: ئایەتی ژمـارە: ١٢٣).

(١٢٤-١٢٥): ﴿ وَإِذِ ٱبْتَلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٍ فَأَتَمَّهُنَّ ۖ قَالَ إِنِّى جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا ۖ قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِى ۖ قَالَ لَا يَنَالُ عَهْدِى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٢٤﴾ وَإِذْ جَعَلْنَا ٱلْبَيْتَ مَثَابَةً لِّلنَّاسِ وَأَمْنًا وَٱتَّخِذُوا۟ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ۖ وَعَهِدْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَٰعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِىَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلْعَٰكِفِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ﴿١٢٥﴾ ﴾

﴿ وَإِذِ ٱبْتَلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٍ فَأَتَمَّهُنَّ ۖ قَالَ ﴾ خـوا ﷻ هـەواڵ دەدا دەربـارەی بەنـدەو خۆشەویسـتی ئیبڕاهیـم ﷺ کـە یـە ک دەنگـن لەسـەر پێشـەوایەتیو گەورەیـی، کـە هەموودەسـتەو تاقمـە کان لە خـاوەن کتێب بانگەشـەیان دەکـرد، بەڵکو بەهەمان شـێوە بت پەرسـتانیش: بەڕاسـتی خـوا تاقیکردەوە بـە چەند بڕیـارو فەرمایشـتێکی فەرمـان پێکردنو قەدەغـە لێکـردن، هەروەکـو چـۆن ئـەوە نەریتـی خوایـە لـە تاقیکردنـەوەی بەندە کانیـدا، بۆئـەوەی درۆزن دەربکـەوێ کـە جێگیـر نابێ لە کاتـی بـەڵاو تاقیکردنەوەدا لە ڕاسـتگۆ، کـە خـوا ﷻ پلـەو پایـەی بەرزدە کاتـەوە، و ڕێـزو شـکۆی زیاتـر دە کاتو کردەوە کانی پاڵفتـە دە کات، وە کـو چـۆن ئاڵتـوون پاڵفتـە دە کـرێ، گەورەترینیـان لـەم پلـەو پایـەدا ئیبڕاهیـم بوو ﷺ.

تـەواوی ئـەو کردەوانـەی خـوا پێـی تاقیکـردەوە ئەنجامیـدا، لەسـەر ئەمـە خوا سوپاسـی کـرد، بـە بەردەوام خـوا سوپاسـگوزار کراوە، شایسـتەی سـوپاس‌و شـوکرانە بژێرییە، خوا فەرموویەتـی: ﴿ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا ﴾ واتـە: پەیڕەویـت دەکـەن لـە هیدایەتـدا، وە بە شـوێنتدا دەڕۆن بـۆ بەدەسـتهێنانی خۆشـبەختی هەتا هەتایـی، بۆ ئەوەی بە بەردەوام وەسـف بکرێـت‌و پاداشـتی بـێ پایانت پـێ بـدرێ، وە لەلایـەن هەموو کەسـەوە بە مەزن تەماشـا بکرێـی، ئـا ئەمە -سـوێند بە خوا- چاکتریـن پلەیە کێبڕکێـکاران کێبڕکێی لەسـەر دەکەن، بەرزتریـن پلەیـە چاکـەکاران خۆیانـی بـۆ ئامـادە بکـەن، وە باشـترین حاڵەتە بە دەسـتیان هێنـاوە خـاوەن عەزیمـەت لـە پێغەمبـەران‌و شـوێنکەوتوانیان، لـە هەمـوو ڕاسـتگۆیەک شـوێنیان کەوتبـێ، بانگخـواز بێت بـۆ لای خـوا ﷻ‌و ڕێگاکەی.

کاتـێ ئیبراهیم ﷺ گەیشـت بـەم پلە بەرزە، ئنجـا داوای کرد بۆ نەوەکانی بـۆ ئەوەی پلەی ئەوانیـش بـەرز ببێتـەوە، هەروەهـا ئەمەیش لـە پێشـەوایەتی‌و ئامۆژگاریەتی بـۆ بەندەکانی خـوا ﷻ، وە پـێ خۆشـبوونیەتی کـە هیدایەت دەریـان تێـدا زۆر بێت، ئەو خـاوەن ئەو ورە بەرزەو پلـە مەزنەیە.

خـوا ﷻ بـە بەزەیـی‌و بە سـۆزەوە وەڵامـی دایـەوە، هەواڵـی بەربەسـتی بەدەسـتهێنانی ئەو شـوێنەی پێـداو فەرمـووی: ﴿ لَا يَنَالُ عَهْدِي الظَّالِمِينَ ﴾ واتـە: پێشـەوایەتی لـە ئاییـن بـە دەسـت نایەنـێ ئـەو کەسـەی سـتەم لە خـۆی بـکاو زیان بـە خـۆی بگەیەنێـت، پلەی دابەزێنێـت، لەبـەر ئـەوەی سـتەم ناگونجـێ لەگـەڵ ئـەم پلـەو پایەدا، بەڕاسـتی ئـەوە پلەو پایەیەکـە کەرەسـتەکەی ئارامگرتـن‌و دڵنیاییە، دەرنجامەکەیشـی دەبێ خاوەنەکەی لەسـەر پایەیەکـی مـەزن بێـت لە ئیمـان‌و کـردەوەی چاک‌و ڕەوشـتی جـوان خووە ڕاسـتەکان‌و خۆشەویسـتی‌و تـەواو ترسـان‌و ملکەچـی‌و ڕووکردنە خوا، سـتەم لـە کوێ‌و ئـەم پلەو پایە لە کـوێ؟!

تێگەیشـتن لـەم ئایەتە ئەوەیـە، کە ئەم ئایەتـە بەڵگەیە لەسـەر ئەوەی کە جگە لە سـتەمکار پلـەی پێشـەوایەتی بەدەسـت دەهێنێـت، بـەڵام لەگـەڵ بەجێهێنانـی هۆکارەکانـی، پاشـان خـوا ﷻ نموونەیەکـی بـاس کـردوە بەڵگەیـە لەسـەر مانـەوەی پێشـەوایەتی ئیبراهیم ﷺ، ئەویـش: ئـەم ماڵـە بەڕێزەیە (بیـت الحرام) کـە کردوویەتی بـە ڕووکێک لـە ڕوکنەکانی ئیسـلام، گوناهو تـاوان ناهێڵێت.

لە شـوێنەوارەکانی ئیبراهیمی خەلیل‌و نەوەکانی، کە پێشـەوایەتی ئەو دەسـەلمێنێت، خاڵەکە

ئـەوی پـێ دێتە یاد، خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ وَإِذْ جَعَلْنَا ٱلْبَيْتَ مَثَابَةً لِّلنَّاسِ ﴾ واتە: (وە یاد بکـەوە کاتێـک کەعبەمان گێـڕا بە) سـەرچاوەیەک بـەرەو لای بچـن‌و ڕووی تێبکەن، بۆ بەدەسـت هێنانـی بەرژەوەندیـە دینی‌و دنیاییەکانیـان، وە لێی دوانەکـەون ﴿ وَأَمْنًا ﴾ هەموو کەسـێک لێـی ئەمین‌و سـەلامەت بـێ، تەنانـەت ئاژەڵەکانیـش، وە هەروەهـا بێگیانەکانیش وەک داروو درەختەکان.

بۆیـە لە سـەردەمی نەفامیدا سـەرەڕای ئەوەی بتپەرسـت بـوون، بەوپەڕی ڕێـزەوە ڕێزیان لێ دەگـرت، جـاری وا بوو کەسـێکیان بکوژی باوکی خـۆی دەبینی لە حەرەمـدا هەڵنەدەچوو، کاتـێ کە ئیسـلام هـات، ڕێـزو مەزنـی زیاتـر بـوو، ﴿ وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ﴾ (واتـە: شـوێنی ئەو بـەردەی ئیبراهیم ؑ لەسـەری ڕادەوەسـتا بکەنە جێگای نوێـژ). ڕەنگە مەبەسـت لەو شـوێنە ناسـراوە ئەوە بێ، کە ئێسـتا لە بەرانبەر دەرگای کەعبەیە، مەبەسـتیش لەمـەدا دوو ڕکات (نوێـژی) سـووڕانەوە (تـەواف) بـێ، چاکتـر وایـە لـە پشـت شـوێنی ئیبراهیـم بـێ، وە زۆربـەی ڕاڤەزانانی قورئان لەسـەر ئـەو ڕایەن.

وە ڕەنگـە مەبەسـت لـە (مقـام) شـوێن، تاکـی پاڵـدراو (مفرد مضـاف) بێ، کە ئـەو کات هەمـوو شـوێنەکانی ئیبراهیـم لـە حـەج دەگرێتـەوە، ئەویـش دروشـمەکانن بە گشـتی لە: تـەواف کـردن، هاتـو چـوون لە نێـوان صەفـاو مـەڕوە، وەسـتان لـە عەرەفـەو موزدەلیفە، شـەیتان ڕەجـم کردن، وە ئـاژەڵ سـەربڕین‌و جگە لەوانەش لـە مەناسـکەکانی حەج کردن.

کەواتـە: مانـای فەرمـوودەی خـوا ﷻ ﴿ مُصَلًّى ﴾ واتـە: پەرسـتگا، واتە: پەیـڕەوی بکەن لـە درووشـم‌و پەرستشـەکانی حەج (شـعائر الحـج)، ڕەنگە ئەم مانایە لە پێشـتر بـێ، چونکە مانـای یەکەمیش لـە خـۆ دەگـرێ، ﴿ وَعَهِدْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَٰعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِيَ ﴿١٢٥﴾ ﴾ البقـرة. واتـە: وەحـی‌و نیگامـان بۆیـان کـردوە، وە فەرمانمـان پێیـان کـردوە بـە پـاک ڕاگرتنـی ماڵـی خـوا ﷻ لە هاوبەش دانـان‌و کوفرو سـەرپێچیکردن، وە لە پیسـی‌و پۆخڵی‌و قێزەونـەکان، بـۆ ئـەوەی ﴿ لِلطَّآئِفِينَ ﴾ (واتـە: بـۆ تـەواف کاران) لەوێدا، ﴿ وَٱلْعَٰكِفِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ﴾ واتـە: بـۆ نوێـژ خوێنـان تێیدا، تـەواف پێشـخرا لەبەر تایبـەت بوونی بـە مزگەوتـی حـەرام (کەعبە)، پاشـان مانـەوە بە نیەتـی پەرسـتن (الإعتـکاف) چونکە لە مەرجـی ئیعتیـکاف ئەوەیـە کە لە مزگـەوت بێت بـە ڕەهایی، پاشـان نوێژ، لەگـەڵ ئەوەدا نوێـژ پیرۆزتـرە، لەبـەر ئەم واتایـە، خوا ﷻ ماڵـی بەڕێزی (بیـت الحرام) داوەتـە پاڵ خۆی لەبەر ئـەم سـوودانە، لەوانە:

یەکـەم: بێگومـان ئـەوە گرنگـی دانـی ئیبراهیمو ئیسـماعیل دەخـوازێ بـە پاککردنەوەی، چونکـەماڵـی خوایـە، ئـەوەی لـە تواناياندایە بـەکاری دێنن بـۆ پـاک ڕاگرتنی.
دووەم: بێگومـان دانەپاڵـی ماڵـی خوا ﷻ بۆ لای ناوی خـوا، ڕێزو مەزنی ئـەو ماڵە دەخوازێ، لـەم چوارچێوەیـدا فەرمانی بە بەندەکانی کـردوە بە گەورەو بەڕێزەوە تەماشـای بکەن.
سـێیەم: ئـەم دانەپاڵـە هۆکارێکـی سـەرەکیە بـۆ سـەرنج ڕاکێشـانی دڵـەکان بـۆ لای (ئەم شـوێنە پیرۆزە).
(١٢٦): ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَـٰذَا بَلَدًا ءَامِنًا وَٱرْزُقْ أَهْلَهُۥ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ مَنْ ءَامَنَ مِنْهُم بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ ۖ قَالَ وَمَن كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُۥ قَلِيلًا ثُمَّ أَضْطَرُّهُۥٓ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلنَّارِ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ١٢٦ ﴾:
واتـە: کاتێـک کـە ئیبراهیـم ﷺ دوعای کـرد بۆ ئەم ماڵـە، کە خـوا بیکاتە شـوێنێکی پڕ لـە ئارامـیو ئاسـایش، وە ڕزقو ڕۆزی دانیشـتوانەکەی بـدات لـە جۆرەها میوەجـات. ئنجا ئیبراهیـم ﷺ ئـەم پاڕانەوەی پەیوەسـت کـردوە بە بـڕواداران وەک ئـەدەبو حورمەتێک لەگـەڵ خـوادا، پاڕانەوەکـەی پەیوەسـت کـرد بـە بـڕواداران، کاتـێ کە دوعـای یەکەمی گشـتگیریو ڕەهایـی تێـدا بـوو، ئنجـا وەڵامـی دایـەوە بە پەیوەسـت کـردن بـە جگە لە ستەمکار.

کاتێـک کـە بۆیـان پاڕایـەوە بـە ڕزقو ڕۆزی، وە پەیوەسـتی کـرد بـە بڕوادارانـەوە، ڕزقو ڕۆزی خـوا ﷻ گشـتگیرو بەرفراوانـە، بـڕوادارو بێبـڕواو سـەرپێچیکارو گوێڕایـەڵ دەگرێتـەوە، خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ وَمَن كَفَرَ ﴾ واتـە: ڕزقو ڕۆزی هەموویـان دەدەم بـە مسـوڵمانو کافریانـەوە، بـەڵام مسـوڵمان بـەو ڕزقو ڕۆزیـە یارمەتـی وەردەگـرێ بۆ عیبادەتکردنـی خوا ﷻ، پاشـان لـە دونیادە گوازرێتەوە بۆ خۆشـگوزەرانی بەهەشـت، هەرچی بێبڕوایشـە چێژێکـی کـەم لە دنیـادا وەردەگـرێ، ﴿ ثُمَّ أَضْطَرُّهُۥٓ ﴾ واتە: ناچـاری دەکەمو لـە دنیـاداو بـە زۆر دەری دەکـەم ﴿ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلنَّارِ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴾ (واتـە: بـەرەو سـزای ئاگـرو خراپترین ئـاکام).

وَإِذۡ يَرۡفَعُ إِبۡرَٰهِـۧمُ ٱلۡقَوَاعِدَ مِنَ ٱلۡبَيۡتِ وَإِسۡمَٰعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلۡ
مِنَّآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿١٢٧﴾ رَبَّنَا وَٱجۡعَلۡنَا مُسۡلِمَيۡنِ
لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَآ أُمَّةٗ مُّسۡلِمَةٗ لَّكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبۡ عَلَيۡنَآۖ
إِنَّكَ أَنتَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٢٨﴾ رَبَّنَا وَٱبۡعَثۡ فِيهِمۡ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ
يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ
وَيُزَكِّيهِمۡۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١٢٩﴾ وَمَن يَرۡغَبُ عَن مِّلَّةِ
إِبۡرَٰهِـۧمَ إِلَّا مَن سَفِهَ نَفۡسَهُۥۚ وَلَقَدِ ٱصۡطَفَيۡنَٰهُ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ
وَإِنَّهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٣٠﴾ إِذۡ قَالَ لَهُۥ رَبُّهُۥٓ أَسۡلِمۡۖ
قَالَ أَسۡلَمۡتُ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٣١﴾ وَوَصَّىٰ بِهَآ إِبۡرَٰهِـۧمُ بَنِيهِ
وَيَعۡقُوبُ يَٰبَنِيَّ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰ لَكُمُ ٱلدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ
إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٣٢﴾ أَمۡ كُنتُمۡ شُهَدَآءَ إِذۡ حَضَرَ يَعۡقُوبَ
ٱلۡمَوۡتُ إِذۡ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعۡبُدُونَ مِنۢ بَعۡدِيۖ قَالُواْ نَعۡبُدُ
إِلَٰهَكَ وَإِلَٰهَ ءَابَآئِكَ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ إِلَٰهٗا
وَٰحِدٗا وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ﴿١٣٣﴾ تِلۡكَ أُمَّةٞ قَدۡ خَلَتۡۖ لَهَا مَا كَسَبَتۡ
وَلَكُم مَّا كَسَبۡتُمۡۖ وَلَا تُسۡـَٔلُونَ عَمَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٣٤﴾

**(١٢٧-١٢٩):** ﴿ وَإِذۡ يَرۡفَعُ إِبۡرَٰهِـۧمُ ٱلۡقَوَاعِدَ مِنَ ٱلۡبَيۡتِ وَإِسۡمَٰعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلۡ مِنَّآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿١٢٧﴾ رَبَّنَا وَٱجۡعَلۡنَا مُسۡلِمَيۡنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَآ أُمَّةٗ مُّسۡلِمَةٗ لَّكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبۡ عَلَيۡنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٢٨﴾ رَبَّنَا وَٱبۡعَثۡ فِيهِمۡ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَيُزَكِّيهِمۡۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١٢٩﴾ ﴾:

**دەفەرمـوێ:** ﴿ وَإِذۡ يَرۡفَعُ إِبۡرَٰهِـۧمُ ٱلۡقَوَاعِدَ مِنَ ٱلۡبَيۡتِ وَإِسۡمَٰعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلۡ مِنَّآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿١٢٧﴾ رَبَّنَا وَٱجۡعَلۡنَا مُسۡلِمَيۡنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَآ أُمَّةٗ مُّسۡلِمَةٗ لَّكَ ﴾ واتـە: باسـی ئیبراهیـمو ئیسـماعیل ﷺ بکـە، لە دانانـی بناغـەی ماڵـی حەرامدا، وە بـەردەوام بوونیان لەسـەر ئـەو کارە مەزنـەی، وە حاڵیان چـۆن بـوو لـە تـرسو ئومێـد بووندا تـا پاڕانـەوە لە خـوا ﷻ کـە کارەکەیـان لێوەربگرێ بـۆ ئـەوەی سـوودی گشـتی تێدا بـە دەسـت بـێ، وە پاڕانـەوە بـۆ خۆیـانو نەوەکانیان بە مسـوڵمان بـوون، کـە حەقیقەتەکەی ملکەچـی دڵو گوێڕایەڵـی کردنـی پەروەردگارە، کە گەردنکەچـی ئەندامەکانـی جەسـتەش لەخـۆ دەگرێ.

﴿ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا ﴾ واتـە: فێرمـان بکە لـەو ڕووەی کە بە چاوی خۆمان ببینینو تەماشـای بکەیـن، تـا بەندایەتـی کردنمـان باشـترو چاکتربـێ، دەگونجێ مەبەسـت لە (المناسـك): کردەوەکانـی حـەج بێـت بـە گشـتی، هەروەکـو چـۆن لـە میانـەی شـوێنەکەدا ئاماژەی پێدەکات.

وە دەگونجـێ مەبەسـت: لەوە گشـتگیرتر بـێ ئەویش ئاینە بە گشـتیو هەموو پەرستشـەکانە، هەروەکـو بێژەو لەفزەکە گشـتیە بەڵگەیە لەسـەر ئەمە، چونکە (النسـك): بـە واتای بەندایەتی دێـت، بـەڵام زاڵە بەسـەر بەندایەتـی کردنەکانی حـەج وەکـو زاڵبوونێکی عورفـی، بەرهەمی پاڕانەوەکانیـان دەگەڕێتـەوە بۆ سـەرکەوتن بۆ زانسـتی بە سـوود، وە کـردەوەی چاک.

لەبەر ئەوەی بەندە بە هەر شێوەیەک بێ، هەردەبێ تووشی کەمتەرخەمی بێ‌و پێویستی بە گەڕانەوە دەبێ، فەرموویان: ﴿وَتُبۡ عَلَيۡنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ﴾ (واتە: پەروەردگارمان! تەوبەمان لێ وەربگرە، بێگومان تۆ زۆر تەوبە وەرگری بە بەزەیی)، ﴿رَبَّنَا وَٱبۡعَثۡ فِيهِمۡ﴾ واتە: لە نەوەکانمان ﴿رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ﴾ تاکو بەرزتر بێ پلەکانیان، ملکەچ بن بۆی، وە بە تەواوی بیناسن ﴿يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِكَ﴾ بە بێژەو لەبەر کردنو پاراستنی ﴿وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ﴾(واتە: قورئانو داناییان فێر بکاتو پاکیان بکاتەوە).

﴿وَيُزَكِّيهِمۡ﴾ بە پەروەردە کردن لەسەر کردەوە چاکەکان، وە بەری بوون لە کردەوە پیسو چەپەڵەکان، تا ببنە پاککردنەوەی نەفسو دەروونەکان ﴿إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ﴾ واتە: زاڵە بەسەر هەموو شتێکداو هیچ بەربەستێک نیە لە بەردەم هێزو دەسەڵاتی خوادا، ﴿ٱلۡحَكِيمُ﴾ ئەوەی شتەکان لە شوێنی خۆیان دادەنێت، بۆ خاتری زاڵیو کاربەجێی خۆت ئەم ڕەوانکراوەیان بۆ نێو ڕەوانە بکەن، خوا پاڕانەوەکەی لێ قبوولْ کردن، ئەم پێغەمبەرە بەخشندەیەی نارد، کە بە هۆی ئەوەوە ڕەحمی بە نەوەکانیان کردوە بە تایبەت، وە هەموو خەڵکی بە گشتی، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {أنا دَعْوَةُ أبي إبْراهِيم} (أخرجه الحالكم برقم: (٣٥٦٦)، وصححه)، واتە: من پاڕانەوەکەی ئیبراهیمی باوکمم.

کاتێک خوا ئیبراهیمی مەزن کرد بەم مەزن کردنە، وە هەواڵی دا دەربارەی تەواوی سیفەتەکانی، خوا ﷻ فەرمووی:

(١٣٠-١٣٤): ﴿وَمَن يَرۡغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبۡرَٰهِـۧمَ إِلَّا مَن سَفِهَ نَفۡسَهُۥۚ وَلَقَدِ ٱصۡطَفَيۡنَٰهُ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَإِنَّهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٣٠﴾ إِذۡ قَالَ لَهُۥ رَبُّهُۥٓ أَسۡلِمۡۖ قَالَ أَسۡلَمۡتُ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٣١﴾ وَوَصَّىٰ بِهَآ إِبۡرَٰهِـۧمُ بَنِيهِ وَيَعۡقُوبُ يَٰبَنِيَّ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰ لَكُمُ ٱلدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٣٢﴾ أَمۡ كُنتُمۡ شُهَدَآءَ إِذۡ حَضَرَ يَعۡقُوبَ ٱلۡمَوۡتُ إِذۡ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعۡبُدُونَ مِنۢ بَعۡدِيۖ قَالُواْ نَعۡبُدُ إِلَٰهَكَ وَإِلَٰهَ ءَابَآئِكَ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ إِلَٰهٗا وَٰحِدٗا وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ﴿١٣٣﴾ تِلۡكَ أُمَّةٞ قَدۡ خَلَتۡۖ لَهَا مَا كَسَبَتۡ وَلَكُم مَّا كَسَبۡتُمۡۖ وَلَا تُسۡـَٔلُونَ عَمَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٣٤﴾﴾:

﴿وَمَن يَرۡغَبُ﴾ واتە: (هیچ کەس) ڕوو وەرناگێڕێت ﴿عَن مِّلَّةِ إِبۡرَٰهِـۧمَ﴾ (واتە: لە ئاینی ئیبراهیم) دوای ئەوەی لە پلەو پایەی زانی ﴿إِلَّا مَن سَفِهَ نَفۡسَهُۥ﴾ واتە:

(مەگـەر کەسـێک) خـۆی نەفـامو گێـل کردبێو پشـت گوێـی خسـتبێ، وە فرۆشـتبێتی بـە مامەڵەیەکـی فێـڵ لێکـراو، واتـە: ژیـرو عەقڵو تـەواو نیە ئەو کەسـەی پشـتی کردوە لـە میللەتـی ئیبراهیـم ﷺ، پاشـان هەواڵیداوە دەربـارەی حاڵـی ئیبراهیم لە دنیـاو دوارۆژدا، دەفەرمـوێ: ﴿وَلَقَدِ ٱصۡطَفَيۡنَٰهُ فِي ٱلدُّنۡيَا﴾ واتـە: هەڵمانبـژاردو سـەرکەوتوومان کردوە بۆ کارو کـردەوەکان، کـە بـە هۆیـەوە بوو بـە یەکێک لـە هەڵبژێـردراوەکان.

﴿وَإِنَّهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ (واتـە: ئەوانـەی لـە ڕۆژی دواییـدا لـە چاکەکانـن) ئەوانـە خاوەن پلـەو پایەی بـەرزن ﴿إِذۡ قَالَ لَهُۥ رَبُّهُۥٓ أَسۡلِمۡۖ قَالَ﴾، جێبەجـێ کردنی فەرمانی پەروەردگـاری (وتـی:) ﴿أَسۡلَمۡتُ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾، بـە دڵسـۆزیو یەکتاپەرسـتیەوە، وە خۆشەویسـتیو گەڕانـەوە بـۆ لای، یەکتاپەرسـتی بوو بە سـیفەت لە ئیبراهیم ﷺدا، پاشـان بـە میـرات مایەوە بـۆ نەوەکانـیو ئامۆژگاری پێکـردن، وە کـردی بە وشـەیەکی مایەوەو باقـی لـە دوای خـۆی، تا گەیشـتە یەعقـووب ﷺ ئەویـش ڕۆڵـەو نەوەکانی پێ ڕاسـپارد.

جـا ئێـوە ئـەی نەوەکانـی یەعقـووب، باوکتـان بـە تایبەتـی ئامۆژگـاریو وەسـیەتی بـۆ کـردوون، پێویسـتە لەسـەرتان بە تەواوی ملکـەچ بنو شـوێنی کۆتایی پێغەمبـەران (علیهم السـلام) بکەون، کـە پێی فەرمـوون: ﴿يَٰبَنِيَّ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰ لَكُمُ ٱلدِّينَ﴾ واتـە: هەڵیبژارد وەک میهرەبانـیو چاکەیـەک بۆتـان، دەی ئێـوەش پێی هەڵسـنو شـوێنی شـەریعەتەکەی ئـەو بکـەونو ڕەوشـتی ئـەو لە خۆتانـدا بنەخشـێنن، بـەردەوام بن لەسـەر ئەمە هەتـا مردن یەخەتـان پێدەگرێ، بێگومان هەر کەسـێک لەسـەر شـتێک بژی لەسـەر ئـەوە دەمرێ، هەر کەسـێکیش لەسـەر شـتێ بمرێ لەسـەر ئەوە زینـدوو دەکرێتەوە.

کاتێـک جوولەکـەکان وایاندەزانـی ئـەوان لەسـەر میللەتـی ئیبراهیمـن، وە لـە پـاش ئـەو یەعقـووب ﷺ، خـوا ﷻ ڕەتـی کـردەوە بەسـەریانداو فەرمـووی: ﴿أَمۡ كُنتُمۡ شُهَدَآءَ﴾ واتـە: (یـان) ئێـوە ئامـادە بـوون لەوێـدا ﴿إِذۡ حَضَرَ يَعۡقُوبَ ٱلۡمَوۡتُ﴾ واتـە: کاتـێ کـە لـە سـەرەمەرگدا بـوو هـۆکارە سـەرەتاییەکانی هاتبـووە پێـش، بـە کوڕەکانـی وت: وەکو تاقیکردنەوەیـان، لەبـەر ئـەوەش تـا بەرچـاو ڕوون بـێ لـە ژیانیدا، بـە جێبەجـێ کردنی ئەو ڕاسـپاردەیەی پێ کـردوون، ﴿مَا تَعۡبُدُونَ مِنۢ بَعۡدِيۖ﴾ (واتە: دوای من کێ دەپەرسـتن)؟ ئەوانیـش وەڵامیـان دایـەوە بـەوەی چـاوی پـێ ڕوون دەبێتـەوە، ﴿قَالُواْ﴾ وتیان: ﴿نَعۡبُدُ إِلَٰهَكَ وَإِلَٰهَ ءَابَآئِكَ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ إِلَٰهٗا وَٰحِدٗا﴾ واتـە: هاوبەشـی بـۆ بڕیـار نادەیـن، وە هیـچ شـتێکی بـۆ ناکەینـە هاوتـا، ﴿وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ﴾ یەکتاپەرسـتیو

کردەوەیـان پێکەوە کۆکـردەوە.
بێگومـان ئـەوەی زانـراوە ئـەوان ئامـادەی سـەرەمەرگی یەعقـووب نەبوون، چونکـە ئەوان هێشـتا نەهاتبوونـە دونیا، جـا ئەگەر ئامادە نەبـوون، خـوا هەواڵیدا دەربـارەی یەعقووب کە ئـەو وەسـیەتی کـردوە بـۆ منداڵەکانی بـە شـوێنکەوتنی ئاینـی حەنیفیە کە ئیسـلامە. نەک بە ئاینـی جوولەکە.
پاشـان خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ ﴾ (واتە: ئەو پێغەمبەرانە دەسـتەیەک بـوون) تێپەڕیـن، ﴿ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ ﴾ واتـە: هـەر کەسـێک کـردەوەی بـۆ خۆیەتـی، وە هـەر کـەس سـزاو پاداشـت دەدرێتـەوە بـە پێـی ئـەوەی کردوویەتـی، هیچ کـەس بـە تاوانی کەسـێکی تـر سـزا نادرێت، وە هیچ شـتێک سـوود بـە بەنـدە ناگەیەنێ جگـە لە ئیمـانو تەقوا نەبـێ، جا سـەرقاڵ بوونتـان بەوانـەوە، وە بانگەشـەکردنتان کە ئێوە لەسـەر میللەتـی ئەوانن، وە ڕازی بوونتان تەنها قسـەی بـێ کردەوەی بێ، کارێکـی بە تاڵەو دوورە لـە ڕاسـتیی، بەڵکـو ئـەوەی پێویسـتە لە سـەرتان، ئەوەیە کە تەماشـای حـاڵو باری خۆتـان بکـەن کـە لەسـەری دەڕۆن، ئایـا دەگونجێ بـۆ ڕزگار بوون یـان نا؟

وَقَالُواْ كُونُواْ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ تَهْتَدُواْۗ قُلْ بَلْ مِلَّةَ إِبْرَٰهِـۧمَ
حَنِيفًاۖ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ (١٣٥) قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ
أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ
وَٱلْأَسْبَاطِ وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَآ أُوتِيَ ٱلنَّبِيُّونَ مِن
رَّبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ (١٣٦)
فَإِنْ ءَامَنُواْ بِمِثْلِ مَآ ءَامَنتُم بِهِۦ فَقَدِ ٱهْتَدَواْۖ وَّإِن تَوَلَّوْاْ
فَإِنَّمَا هُمْ فِي شِقَاقٍۖ فَسَيَكْفِيكَهُمُ ٱللَّهُۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ
(١٣٧) صِبْغَةَ ٱللَّهِ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ صِبْغَةًۖ وَنَحْنُ لَهُۥ
عَٰبِدُونَ (١٣٨) قُلْ أَتُحَآجُّونَنَا فِي ٱللَّهِ وَهُوَ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ
وَلَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ وَنَحْنُ لَهُۥ مُخْلِصُونَ (١٣٩)
أَمْ تَقُولُونَ إِنَّ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ
وَٱلْأَسْبَاطَ كَانُواْ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰۗ قُلْ ءَأَنتُمْ أَعْلَمُ أَمِ
ٱللَّهُۗ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَتَمَ شَهَٰدَةً عِندَهُۥ مِنَ ٱللَّهِۗ وَمَا ٱللَّهُ
بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ (١٤٠) تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْۖ لَهَا مَا كَسَبَتْ
وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْۖ وَلَا تُسْـَٔلُونَ عَمَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ (١٤١)

(١٣٥): ﴿ وَقَالُواْ كُونُواْ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ تَهْتَدُواْۗ قُلْ بَلْ مِلَّةَ إِبْرَٰهِـۧمَ حَنِيفًاۖ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ (١٣٥) ﴾:

﴿ وَقَالُواْ كُونُواْ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ تَهْتَدُواْۗ قُلْ بَلْ مِلَّةَ إِبْرَٰهِـۧمَ حَنِيفًاۖ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾ هه‌ر یه‌ك له‌ جووله‌كه‌و گاوره‌كان بانگی مسولْمانانیان كرد، بۆ چوونه‌ ناو ئایینه‌كه‌یان وایان ده‌زانی ئه‌وان هیدایه‌تدراوو ڕێنمایی كراون، جگه‌ له‌وانیش گومڕاو سه‌رگه‌ردانه‌. ﴿ قُلْ ﴾ پێی بڵێ: به‌ وه‌ڵامێكی یه‌كلاكه‌ره‌وه‌، ﴿ بَلْ ﴾ به‌ڵكو په‌یڕه‌وی ﴿ مِلَّةَ إِبْرَٰهِـۧمَ حَنِيفًا ﴾ (ئاینی پاكی ئیبراهیم) واته‌: به‌ ڕووكردنه‌ خواو پشت كردن له‌ غه‌یری خوا، هه‌ڵسان به‌یه‌كتاپه‌رستی‌و وازهێنان له‌ شیرك‌و بتپه‌رستی، ئه‌مه‌ له‌ شوێنكه‌وتنیدا هیدایه‌ت‌و ڕێنمایی هه‌یه‌، وه‌ له‌ پشت تێكردن له‌ میلله‌تی ئیبراهیم كوفرو گومڕایی هه‌یه‌.

(١٣٦): ﴿ قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَآ أُوتِيَ ٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ (١٣٦) ﴾:

ئه‌م ئایه‌ته‌ پیرۆزه‌، هه‌موو ئه‌وانه‌ ده‌گرێته‌وه‌ كه‌ پێویسته‌ بڕوای پێ هه‌بێت، بزانه‌ به‌ڕاستی ئیمان كه‌ به‌ ڕاست دان پێدانانی دڵه‌ به‌ ته‌واوه‌تی به‌م بنه‌مایانه‌، وه‌ دانپێدانانێك كارو كرده‌وه‌كانی دڵو ئه‌ندامه‌كانی جه‌سته‌ له‌ خۆی بگرێت، جا به‌م جۆره‌، ئیسلام ده‌گرێته‌وه‌و ده‌چێته‌ ناوی، وه‌ هه‌موو كرده‌وه‌ چاكه‌كانیش ده‌چنه‌ ناویه‌وه‌، ئه‌وانه‌ له‌ ئیمانن‌و شوێنه‌وارێكن له‌ شوێنه‌واره‌كانی، جا هه‌ر كه‌ ئیمان به‌ ڕه‌ها(مطلق) هاتبوو ئه‌وه‌ی باسمان كرد ده‌چێته‌ نێویه‌وه‌، هه‌روه‌ها ئیسلامیش ئه‌گه‌ر به‌ ڕه‌هایی هات ئیمان ده‌چێته‌ نێوی‌و ده‌یگرێته‌وه‌، ئه‌گه‌ر به‌راورد كرا له‌ نێوانیاندا، ئه‌وه‌ ئیمان ده‌بێت به‌ ناوێك بۆ ئه‌وانه‌ی له‌ناو دڵ دان، له‌ دان پیانان‌و به‌ ڕاست دانان، ئیسلامیش ده‌بێته‌ ناو بۆ كرده‌وه‌

ڕواڵەتـیو ئاشـکراکان، هەروەهـا ئەگـەر کۆبکرێتـەوە لـە نێوان بـڕواو کـردەوە چاکەکان.
جـا خـوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ قُولُوٓاْ ﴾ واتە: بـە زمانەکانتان کە دڵەکانتان لەسـەریەتی، ئا ئەوە قسـەی تەواوە کە پاداشـتو تۆڵەی لەسـەر ڕێکدەخرێـت، هەروەکو دەربڕین بـە زمان بە بێ بیـرو بـڕوای دڵ، دووڕوویـیو کوفرە، وە قسـەی بێ کرداریـش لە دڵدا هیـچ کاریگەریەک دروسـت ناکاتو سوودیشـی کەمە، ئەگەر چی بەندە پاداشتیشـی لەسـەر وەردەگـرێ، ئەگەر قسـەکەی چـاک بـوو، وە بنچینـەی بڕوایشـی لەگەڵـدا بوو، بـەڵام جیـاوازی هەیە لـە نێوان قسـەی ڕووت، قسـەیەک کردەوەی دڵی پێـوە گرێدرابێت. وە لە وتـەی خوا ﷻ ﴿ قُولُوٓاْ ﴾ ئاماژەیەکـە بـۆ ڕاگەیانـدن، بـە عەقیدەو ئاشـکرا کـردنو بانگەواز بـۆ کردنـی، چونکە ئەوە بنەماو بنچینـەی ئاینە.
وە لـە وتـەی خـوا ﷻ ﴿ ءَامَنَّا ﴾ وە نموونـەی ئەویـش، لـەوەی کـە تیایدایە لـە کردەوە پێکـردن، دراوەتە پـاڵ هەموو ئۆممەت، ئاماژەیە لەسـەر ئەوەی کە پێویسـتە لەسـەر ئۆممەت دەسـت بگرن بە پەیامی خواوە، هاندانیشـە لەسـەر یەکگرتـن، تا بانگەشـەکانیان یەک بێتو کردەوەکانیشـیان یەکگرتـوو بـێ، وە قەدەغە کردن لـە پەرتەوازەی لە خۆ دەگرێ، ئەوەشـی تێدایـە کە بە ڕاسـتی بـڕواداران وەک یەک جەسـتە وان.
وە کـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ ﴾ ... تـا کۆتایـی، بەڵگەیـە لەسـەر ئەوەی دروسـتە مـرۆڤ ئیمان پاڵبداتە لای نەفسـی خۆیەوە، بەڵکو پێویستیشـە، بـە پێچەوانەی ئەوەی بڵـێ: (أنـا مؤمـن) (من بـڕوادارم)و نموونـەی ئەوە، بێگومان ئەمـە ناوترێ مەگەر ببەسـرێتەوە بـە ویسـتی خـواوە (إن شـاءالله) ئەگـەر خـوا بیـەوێ، چونکـە جۆرێ لـە خۆبەپـاک دانانی نەفسـی تێدایـە (تزکیـة النفس)، وە شـایەتی دان لەسـەرخۆی بە بـڕوای تێدایە.
جـا فەرموودەی خـوا ﷻ ﴿ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ ﴾ واتە: بەوەی خوا ﷻ بوونـی هەیەو تاکو تەنهایە، وەسـفکراوە بە هەموو وەسـفێکی تـەواو، پاکە لە هەمـوو کەمو کورتیەک، شایسـتەی ئەوەیە بـە تـاکو تەنها بپەرسـترێ، وە هاوبەشـی بـۆ دانەنرێ لـە هیچ شـتێکدا، لە هیـچ ڕووێک لە ڕووەکانەوە.
﴿ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا ﴾ قورئـانو فەرمـوودە دەگرێتـەوە، لەبـەر فەرموودەی خـوا ﷻ ﴿ وَأَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ ﴿١١٣﴾ ﴾النساء: (واتـە: خـوا کتێـبو دانایـیو (فەرمـوودەو پێغەمبەرایەتـی) بەسـەر تـۆ دابەزانـدوە)، دەچێتـە ناویـەوە بڕوابوون بـەوەی لـە کتێبی خواو فەرمـوودەی پێغەمبەرەکەدا هاتووە، لە سـیفەتەکانی خواو سـیفەتەکانی پێغەمبەرەکانیو ڕۆژی

دوایــیو پەنهانــی ڕابــردوو داهاتــوو، وە بڕوابوون بە ســەرجەم حوکمە شــەرعیو فەرمانەکان، وە بڕیارەکانی پاداشــتو جگــە لەوانەش.

﴿ وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ ﴾ تــا کۆتایــی ئایەتەکە، بڕوا بــوون بە هەموو کتێبــە دابەزێنراوەکان بۆ ســەر ســەرجەم پێغەمبــەران دەگرێتــەوە، وە بڕوابوون بە ســەرجەم پێغەمبەران بە گشــتیش، وە بــە تایبــەت ئەوانــەی لە دەقەکــەدا ناویان هاتــووە، لەبەر هێنانیــان بە شــەریعەتە مەزنەکان، جا پێویســت لــە بڕوابوون بە پێغەمبــەرانو کتێبەکان، ئەوەیــە بڕوای پێیان هەبێت بە گشــتی، پاشــان ئــەوەی دەزانێ دەربارەیــان بە وردیو تەفصیلی پێویســتە بڕوایان پــێ بهێنێ.

وە خــوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ ﴾ واتــە: (جیــاوازی لــە نێــوان هیــچ یەکێــک لــە پێغەمبــەران ناکەین) واتــە: بەڵکو بڕوا بە هەموویــان دەهێنین، ئەمــە تایبەتمەندی مســوڵمانانە، کــە پێــی جیادەبنــەوە لە هەمــوو ئەوانەی بانگەشــەی ئــەوە دەکەن لەســەر ئاینن.

جــا جوولەکــەو گــاورو خاچپەرســتەکانو غەیــری وانیــش -ئەگــەر وا بزانن ئــەوان بڕوایان بەســەرجەم پێغەمبــەرانو کتێبــەکان هێنــاوە- بێگومــان ئــەوان بێبڕوایــی دەکەن بــە جگە لە ئــەوە، جیــاوازی دەخەنــە نێــوان پێغەمبــەرانو کتێبەکانــەوە، بڕوایان بــە هەندێکــی هەیە، وە بێبــڕوان بــە هەندێکــی دیکــەی، بــە درۆ دانانەکەیــان بە ڕاســت دانانیــان دەخاتــە درۆوە، بە ڕاســتی ئــەو پێغەمبەرەی کە پێیــان وابوو بڕوایــان پێی هێنــاوە، تێکڕای پێغەمبەرانی بەڕاســت دانــاوەو بــە تایبەتیــش موحەممــەد ﷺ، جــا ئەگــەر ئــەوان موحەممەد بــەدرۆ دابنێن، ئــەوە بە ڕاســتی پێغەمبەرەکانیــان بــە درۆ داناوە لــەوەی هەواڵــی پێیانداوە، ئــەو کاتە دەبێتــە بێبڕوایی بــە پێغەمبەرەکەیان.

کــە دەفەرمــوێ: ﴿ وَمَآ أُوتِيَ ٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمۡ ﴾ (واتــە: بــەوەی کــە دراوە بــە هەمــوو پێغەمبــەران لــە لایــەن پەروەردگاریانــەوە) بەڵگەیە لەســەر ئەوەی بەخششــی ئایــن: بریتیە لە بەخششــی ڕاســتەقینە کــە گرێــدراوە بــە خۆشــبەختی دنیــاو دواڕۆژ. فەرمانــی پێنەکردووین بــەوەی دراوە بــە پێغەمبــەران لە موڵکو مــاڵو نموونەی ئەوانــە، بەڵکو فەرمانــی پێکردووین بــڕوا بهێنین بــەوەی پێیان بەخشــراوە لە کتێبــەکانو شــەریعەتەکان، وە ئەوەیشــی تێدایە کە پێغەمبــەران ڕاگەیەنــەری پەیامی خوای مەزنــن، وە نێوەندن لە نێوان خواو دروســتکراوەکانیدا لــە گەیاندنــی پەیامەکانیــان، هیچ شــتێکیان لەو کاروبــارەدا بە دەســت نیە.

لــە فەرمــوودەی خــوا: ﴿ مِن رَّبِّهِمۡ ﴾ ئاماژە هەیە بۆ ئــەوە کە لە تەواویەتــی پەروەردگارێتی خــوا بــۆ بەندەکانــی، ئەوەیــە کــە کتێبەکانــی بەســەریاندا دادەبەزێنــێ، وە ڕەوانەکراوانــی بۆ

ڕەوانەکــردوون، پەروەردگارێتــی خــوا ﷻ وا ناخــوازێ هــەر بــە هەوەنتــە وازیــان لێبهێنێو فەرامۆشــیان بکات.

جـا ئــەوەی بــە پێغەمبــەران دراوە، بێگومان ئــەوە لــە لایــەن پەروەردگاریانەوەیــە، جیاوازی تێدایــە لــە نێــوان پێغەمبەرانو ئەوەی بانگەشــەی پێغەمبەرایەتــی دەکات، تەنها بــە زانینی ئەوە بانگەشــەی بــۆ دەکەن جیــاوازی دەکرێت لــە نێوانیاندا، جـا پێغەمبەران بانگــەواز ناکەن تەنها بــۆ خێــر نەبــێ، هیچ شــتێکیش قەدەغــە ناکــەن تەنها شــەڕو خراپە نەبــێ، هەر یەکــێ لەوان، ئــەوی دیکــە بــە ڕاســت دادەنێتو شــایەتی ڕاســتی بــۆ ئــەدات، بەبــێ پێچەوانــەو دژایەتی، چونکــە لە لایــەن پەروەردگاریانەوەیــە ﴿ وَلَوۡ كَانَ مِنۡ عِندِ غَيۡرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ ٱخۡتِلَٰفٗا كَثِيرٗا ٨٢ ﴾النسـاء. (واتــە: ئەگــەر لــە لای جگە لە خــواوە بووبا، ئــەوە جیاوازیەکی زۆریــان تێدا دەبینی).

ئەمــە بــە پێچەوانــەی ئــەو کەســەی بانگەشــەی پێغەمبەرایەتــی دەکات، بێگومــان دەبــێ لــە هــەواڵو فەرمــانو قەدەغــە کراوەکانیاندا دژ بــە یەک هەبــێ، هەروەکو چۆن ئــەوە دەزانرێ لــە تاقیکردنــەوەی حاڵــی هەموویــان، وە ئەوەیشــی کــە بانگەشــەی بــۆ دەکــەن. کاتێــک کــە خــوا ﷻ ڕوونــی کــردەوە هەمــوو ئەوانــەی بــڕوای پێدەهێنــێ بــە گشــتیو تایبەتی، وە قســەکردنیش بێنیــازی نــاکات لــە کــردەوە، خــوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ﴾ واتــە: ئێمــە ملکەچــی مەزنی ئەویــن، گوێڕایەڵــی دەکەین بــە بەندایەتی بۆ کردنــی، بەوەی لە ناخماندایــەو بەوەیشــی ئاشــکرای دەکەیــن، بــە دڵســۆزیەوە بەندایەتی بــۆ ئەنجـام دەدەین، بە بەڵگــەی پێشخســتنی کارتێکــراو (معمول) کــە بریتیە لە: ﴿ لَهُۥ ﴾ بەســەر کارکــەر (العامل) کــە بریتیە لــە: ﴿ مُسۡلِمُونَ ﴾

بێگومـان ئــەم ئایەتــە پیــرۆزە چەندە کــورتو پووختــە، هەر ســێ جۆرەکەی یەکتاپەرســتی دەگرێتــەوە: یەکتاپەرســتی پەروەردگارێتــی، یەکتاپەرســتی پەرســتراوێتی، یەکتاپەرســتی لە ناوو ســیفەتە بــەرزەکان.

وە بــڕوا بــوون بــە ســەرجەم پێغەمبــەرانو کتێبــەکان دەگرێتــەوە، وە تایبەت کردنــی بەڵگە لەســەر پلــەو پایــە لــە دوای گشــتاندن، وە لەســەر بەڕاســت دانــان بــە دڵو زمــانو ئەندامانی جەســتە، دڵســۆز بــوون بۆ خــوا لەوانەی باســکران، وە لەســەر جیــاوازی لــە نێــوان پێغەمبەرە ڕاســتگۆکانو ئــەو کەســانەی کە بــە درۆ بانگەشــەی پێغەمبەرایەتــی دەکەن، وە لەســەر فێر کردنــی خوا ﷻ بــۆ بەندەکانی کە چۆن قســە دەکــەن، وە بەزەیی خواو چاکەی بەســەریانەوە

بـەو نـازوو نیعمەتـە ئاینیانەی کە پەیوەسـتە بـە خۆشـبەختی دونیـاو دوارۆژیان.
پـاکو بێگـەردی بۆ ئـەو خوایـەی کتێبەکەی کردۆتـە ڕوونکـەرەوە بۆ هەموو شـتێک، وە هیدایـەتو ڕەحمەت بـۆ کەسـانێک بروابهێنن.

(١٣٧): ﴿فَإِنْ ءَامَنُوا۟ بِمِثْلِ مَآ ءَامَنتُم بِهِۦ فَقَدِ ٱهْتَدَوا۟ ۖ وَّإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّمَا هُمْ فِى شِقَاقٍ ۖ فَسَيَكْفِيكَهُمُ ٱللَّهُ ۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١٣٧﴾﴾:

﴿فَإِنْ ءَامَنُوا۟﴾ واتـە: ئەگەر خاوەن کتێبـەکان بڕوایان هێنـا ﴿بِمِثْلِ مَآ ءَامَنتُم بِهِۦ﴾ (بە وێنـەی ئـەوەی کـە ئێـوە بڕواتان هێنـاوە) ئـەی بـڕواداران! لە هەمـوو پێغەمبـەرانو هەموو کتێبـە پیـرۆزەکان، ئەوانـەی یەکەم کەس چووە ناویانـەوە، وە لە پێشـترینیان: کۆتایترینیانو باشـترینیان موحەممـەد ﷺ و قورئانـە، وە ملکـەچ بوونە بۆ خـوای تاکو تەنهـا، جیاوازیان لە نێـوان هیـچ یەکێک لە پێغەمبەرانـی خوادا نەکـردوە، ﴿ٱهْتَدَوا۟﴾ (ئەوە بێگومـان هیدایەت دراون) بـۆ ڕێگـای ڕاسـت، کـە گەیەنەرە بـۆ بەهەشـتانێکی پڕ لە نـازو نیعمـەت، واتە: هیچ ڕێگاچارەیـەک نیـە لـە بـەردەم هیدایەتدا تەنهـا بـەم بڕواهێنانە نەبـێ، نەک وەکو ئـەوان بە قسـەی خۆیان دایـان نابوو، کـە دەیانـوت: ﴿كُونُوا۟ هُودًا أَوْ نَصَـٰرَىٰ تَهْتَدُوا۟ ﴿١٣٥﴾﴾ البقرة، (واتـە: ببنـە جوولەکـە، یـان نەصرانـی، بێگومـان ڕێنمایتـان دەبێـت). وایـان دەزانـی کـە هیدایـەتو ڕێنمایـی تایبەتـە بەوەی ئـەوان لەسـەری دەڕۆن، هیدایـەت (الـهُدى): بریتیە لە زانسـت بـە هـەقو کارکـردن پێـی، وە دژو پێچەوانەکـەی گومـڕا بوونە لە کـردەوەدا پاش زانسـت، ئەویـش ئـەو دوو بەرەکیەی کـە ئەوان لەسـەری بوون، کاتـێ کە پشـتیان تێکردو بـە ڕوویا وەسـتانەوە، جـا (المشـاق): بریتیە لـەوەی لەلایەک بێـت، خـواو پێغەمبەرەکەی ﷺ لەلایەکـی دیکەبـن، لـە (مشـاقة) دوژمنایەتـیو دژایەتـی پێویسـت دەبـێو دوژمنکاریەکی زۆرو تـەواو، لـە پێویسـتکاریەکانی ئەوەیـە هەمـوو تواناکانـی دەخەنـە کار بـۆ ئازاردانـی پێغەمبـەر ﷺ، لەبـەر ئەوەیـە خـوا پەیمانـی داوە بـە پێغەمبەرەکـەی ﷺ لـە دەسـتی چەپەڵـی ئـەوان بیپارێـزێ، چونکە بیسـەری هەمـوو دەنگەکانە بە جیـاوازی هەموو زمانـەکانو جۆراو جـۆری هەمـوو داواکاریـەکان، ئاگادارە بـەوەی لـە پێشـیانەوەیە، وە ئەوەی لە پشـتیانەوەیە، بـە نادیـارو ئاشـکراکانەوە، بـە ڕواڵـەتو پەنهـان، جا مـادام وایە، خوات بەسـە لە پاراسـتنی شـەڕوو خراپـەی ئەوان.

بێگومـان خـوا بەڵێنەکـەی هێنایە جێ بـۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ و دەسـەڵاتی دا بەسـەریاندا، هەتا هەندێکی لێ کوشـتنو هەندێکی لـی کردنە کۆیلەو کەنیزەک، وە هەندێکـی دەرپەڕاندن، وە

ترسی خستە ناو دڵیانەوەو ڕاوی نان، موعجیزەی تێدایە لە موعجیزەکانی قورئان، ئەویش هەواڵدانە بە شتێک پێش ڕوودانی، جا ڕوویدا وەک ئەوەی هەواڵی پێ درابوو.

(١٣٨): ﴿ صِبْغَةَ ٱللَّهِ ۖ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ صِبْغَةً ۖ وَنَحْنُ لَهُۥ عَـٰبِدُونَ ﴿١٣٨﴾ ﴾:

﴿ صِبْغَةَ ٱللَّهِ ﴾ واتە: پەیوەستی ڕەنگی خوا ﷻ بن ئەویش ئاینە کەیەتی، وە پێی هەستن‌و بە چاکترین شێوە ئەنجامی بدەن، بە هەموو کردەوە ئاشکراو پەنهانەکان، وە هەموو بیروباوەڕەکان لە هەموو کاتەکاندا، هەتا ببێتە ڕەنگ‌و بۆیەو سیفەتێ لە سیفەتەکانتان، جا ئەگەر ببێتە سیفەتێک لە سیفەتەکانتان، ئەوە پێویست دەکات کە ئێوە ملکەچی فەرمانەکانی بن بە ویست‌و ئارەزوو خۆشویستنەوە، دینداریی دەبێتە سروشت بۆتان هەروەکو چۆن ڕەنگ لە جل‌و بەرگدا دەبێتە سیفەت، ئنجا خۆشبەختی دنیاو دوارۆژ بەدەست دەهێنن، لەبەر ئەوە ئاین مرۆڤ هاندەدات بۆ ڕەوشتی مەزن‌و کردەوەی جوان‌و ئاکارە مەزنەکان، لەبەر ئەمە فەرموویەتی: ﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ صِبْغَةً ﴾ (واتە: کێ باشترە لە خوا ﷻ لە ڕەنگ ڕشتندا)، بێگومان هیچ کەس باشتر نیە لە ڕەنگ ڕشتنی ئەودا.

ئەگەر ویستت نموونەیەک بزانیت بۆ ئەوەی جیاوازی نێوان ڕەنگ‌و بۆیەی خوایی‌و ڕەنگ‌و بۆیەی غەیری خوایت بۆ دەربکەوێ، شتەکە بە دژو پێچەوانەکەی بپێوە، جا دەبینی کەسێک کە بڕوایەکی ڕاست‌و دروستی هێنابێ بە پەروەردگارەکەی، وە شوێنەواری دڵکەچی‌و ملکەچی‌و ملدانی ئەندامەکانی لەگەڵ بێت، بەردەوام هەوڵ دەدات ڕازاوەبێ بە هەموو سیفەتێکی چاک‌و کارو کردەوەی جوان‌و ڕەوشت‌و هەڵس‌و کەوتی تەواو، وە خۆی دوور بگرێ لە هەر وەسفێکی ناشیرین‌و ناتەواوو سەرزەنشت کراو، وەسف کرابێ: بە ڕاستگۆیی لە گوفتارو کرداریدا، وە ئارامگرتن‌و لە سەرخۆیی‌و داوێنپاکی‌و ئازایەتی‌و چاکەکاریی بە گوفتارو کردار، وە خۆشەویستی‌و ملکەچ بوون بۆ خواو ترسان لێی‌و ئومێد بوون پێی، دڵسۆز بێ بۆ خواو چاکەکار بێ لەگەڵ بەندەکانیدا، ئەمە قیاس بکە بە بەندەیەک بێبڕوایی بە پەروەردگاری بکات‌و لێی ڕابکات، وە ڕوو بکاتە غەیری خواو، بە سیفەتە ناشرینەکان وەسف بکرێت: لە کوفرو هاوبەش دانان‌و درۆو خیانەت‌و فێڵ‌و تەڵەکەو پیسی‌و خراپەکاریی بەرانبەر بە خەڵکی، لە گوفتارو کرداریدا، دڵسۆزی نەبێ بۆ پەرستراوو چاکەخواز نەبێ لەگەڵ بەندەکانیدا، بێگومان ئەو کات جیاوازیەکی مەزنت بۆ دەردەکەوێ لە نێوانیاندا، وە بۆت ڕوون دەبێتەوە کە هیچ ڕەنگێک چاکتر نیە لەوەی خوا

ڕەنگــی کردبــێ بــە ڕەنگی خــۆی، ئەمە ئــەوەش دەگرێتەوە هیــچ ڕەنگو بۆیەک ناشــیرینتر نیــە لەو کەســەی کە خــۆی بە غەیــری ئایینی خــوا ڕەنــگ کردوە.

﴿ وَنَحْنُ لَهُۥ عَـٰبِدُونَ ﴾(واتــە: ئێمــە پەرســتش تەنهــا بــۆ ئــەو دەکەیــن) ڕوونکردنەوەیە بۆ ئــەم ڕەنگە، ئەویش هەســتانە بەم دوو بنچینەیە: دڵســۆزیو شــوێنکەوتن، چونکــە (عیبادەت): ناوێکــی گشــتگیرە بــۆ هەمــوو ئەوانــەی خــوا خۆشــی دەوێو پێی ڕازیــە، لە کردەوەو قســە ئاشــکراو پەنهانەکانــدا، وە بــەو شــێوەیە نابــێ تــا خــوا نەیــکات بە شــەریعەت لەســەر زمانی پێغەمبەرەکــەی، دڵســۆزی (إخــلاص): ئەوەیــە کــە بەندە تەنها مەبەســتی خوای تــاکو تەنها بــێ لــەو کردەوانەدا، جــا پێشخســتنی کارتێکــراو (معمــول) ڕێگــەدەدات بــە کورتهەڵهێنان (حصر).

وە فەرموویەتــی: ﴿ وَنَحْنُ لَهُۥ عَـٰبِدُونَ ﴾وەســفی کــردوون بــە (اسم فاعــل) کــە بەڵگەیــە لەســەر چەســپاندنو جێگیــر کــردن، تــا بەڵگەبــێ لەســەر وەســف کردنیــان بــەوە، وە ببێتە ڕەنــگو بۆیەیەکــی پەیوەســتکراو بۆیان.

(١٣٩): ﴿ قُلْ أَتُحَآجُّونَنَا فِى ٱللَّهِ وَهُوَ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ وَلَنَآ أَعْمَـٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَـٰلُكُمْ وَنَحْنُ لَهُۥ مُخْلِصُونَ ﴿١٣٩﴾ ﴾

(الــمحاجة): بریتیــە لــە دەمەدەمــێو گفتوگــۆ لــە نێــوان دوو کــەس یــان زیاتر، پەیوەســتە بــەو بابەتانــەی کــە مایەی خیــلافو جیاوازیــن، تا هەریــەک لــە دژەکان دەیەوێت قســەی خــۆی ســەربخاتو قســەی دژەکەی پووچــەڵ بکاتــەوە، هەر یــەک لەوانە کۆشــش دەکات بــۆ بیانــوو بڕینی کەســی بەرانبەر، ئەوەی پێویســتە لەســەریو لێــی داوا دەکــرێ، ئەوەیە کە مشــتومڕەکە بــە چاکترین شــێوە ئەنجامی بدات، بە نزیکترین ڕێگا کەســی گومــڕا بهێنێ بۆ لای هــەقو ڕاســتی، وە بیانووی ئینــکارو کەللەڕەق ببــڕێو ببێتە بەڵگەو حوججە بەســەریەوە، هــەقو ڕاســتی ڕوون بکاتــەوەو باتڵو پووچیش ئاشــکرا بــکات، ئەگەر لــەم بازنەیە دەرچوو ئــەوە دەبێتــە ڕێڕەوێــک بۆ چەقە چــەقو دەمە دەمــێ کردنێ کە هیــچ ســووودێکی تێدا نیە، خراپــەو شــەڕ بــە دوای خۆیدا دەهێنــێ، جا خــاوەن کتێبەکان پێیــان وابوو ئەوان لە پێشــترن بــە خــوای گەورە لە مســوڵمانان، ئــەوەش تەنها بانگەشــەیەکە پێویســتی بە بەڵگەو ســەلماندن هەیە.

جــا ئەگــەر پەروەردگــاری هەمووتــان یــەک بــێ، جگە لــە خــوا ﷻ هیــچ پەروەردگارێکی دیکەتــان نەبــێ، هــەر یەکێک لــە ئێمەو لە ئێــوە کارو کــردەوەی خۆی هەیــە، کەواتە ئێمەو

ئێـوە یەکسـانین بـەوە، ئەمە ئەوە پێویسـت نـاکات کە یەکێک لـەو دوو گـرووپو کۆمەڵە لـە پێشـتر بـێ لە لای خـوا ﷻ لـەوی دیکە، چونکـە جیاوازی کـردن لەگەڵ هاوبـەش بوون لـە شـتێک بەبـێ جیاوازیەکـی کاریگـەر داوایەکـی پووچەڵـە، وە جیـاوازی کردنـە نێوان لەیەکچـوودا، وە لـووت بەرزیەکـی ئاشـکرایە، بەڵکـو تەنها فـەزڵو چاکە بە دڵسـۆز بوونی کـرداره چاکەکانـە بـۆ خـوای تاکـو تەنهـا، ئـەم حاڵەتەش وەسـفە بـۆ بـرواداران، کەواتە: دەردەکەوێـت بـرواداران لـە پێشـترن بـۆ خـوا ﷻ لـە غەیـری خۆیـان، چونکـە دڵسـۆزی ڕێگایەکـە بـۆ ڕزگاربـوون، ئـا ئەمە ئـەو جیاوازیە لە نێـوان دۆسـتەکانی خواو دۆسـتەکانی شـەیتان، بە وەسـفە ڕاسـتەقینەکان کە خاوەن عەقڵەکان تەسـلیمی دەبـن، بەربەرەکانی ناکات مەگـەر کەسـێکی لووتبـەرزی نەفـام نەبێ، جـا لـەم دەقـەدا ڕێ پێشـاندەرێکی ورد هەیە بۆ ڕێگای مشـتو مڕکـردن، بە ڕاسـتی کارەکان بونیاد نراون لەسـەر کۆکردنـەوەی نێوان دوو لەیـەک چـوو، وە جیاوازی لـە نێـوان دوو دژیەکدا.

(١٤٠): ﴿ أَمْ تَقُولُونَ إِنَّ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطَ كَانُوا۟ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ ۗ قُلْ ءَأَنتُمْ أَعْلَمُ أَمِ ٱللَّهُ ۗ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَتَمَ شَهَٰدَةً عِندَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿١٤٠﴾ ﴾:

(واتـە: یاخـود ئێوە ئەڵێن: ئیبراهیمو ئیسـماعیلو ئیسـحاقو یەعقـووب کوڕەکانی یەعقووب، جولەکـە بـوون یان گـاور). ئەمە بانگەشـەیەکی دیکـەی ئەوانە، مشـتو مـڕو دەمەدەمێکی دیکەیـە دەربـارەی ڕەوانەکراوانـی خـوا، پێیـان وابـوو ئـەوان لە پێشـترن لە مسـوڵمانان بەو پێغەمبەرانـەی باس کران. خـوا بەرپەرچی دانـەوەو فەرمـووی: ﴿ ءَأَنتُمْ أَعْلَمُ أَمِ ٱللَّهُ ﴾ (واتە: ئایـا ئێوە زاناتـرن، یان خوا؟) خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ مَا كَانَ إِبْرَٰهِيمُ يَهُودِيًّا وَلَا نَصْرَانِيًّا وَلَٰكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٦٧﴾ ﴾ آل عمـران، (واتـە: ئیبراهیـم نەجولەکـە بوو و نە گـاور بـوو، بەڵکـو ڕاسـت ڕەوێکی مسـوڵمان بوو، وە لـە هاوبـەش دانەران نەبـوو)، کەچی ئـەوان دەڵێـن: بەڵکـو جوولەکە بوو یـان گاور.

جـا یان ڕاسـتگۆو زانـان، یان خوای گـەورە زانایە بـەوە، یەکێک لـەو دوانە حەتمیـەو دەبێ ببـێ، وێنـەی وەڵامەکـە نادیارو شـاراوەیە، لە هەمـان کاتدا لـە ئەوپەڕی ڕوونیو ئاشـکرایی دایـە، تەنانـەت لەبـەر ڕوونـی پێویسـت نەبووە بوتـرێ: (بـل الله أعلـم وهو أصـدق) (واتە: بەڵکـو خـوا زاناتـرەو ڕاسـتگۆترە)، وە نموونەی ئـەوەش، چونکـە بەلای هەموو کەسـێکەوە ڕوونـە، وەکـو چۆن ئەگـەر بوترێ: شـەو ڕوناکتـرە یـان ڕۆژ؟ وە ئاگر گەرمتـرە، یان ئاو؟

وە هاوبەش دانان چاکترە، یان یەکتاپەرستی؟ وە نموونەی ئەوانەش.

ئەوەی کەمێک عەقڵو ژیری هەبێ ئا ئەمە دەیزانێ، تەنانەت ئەوان بە خودی خۆیان ئەوە دەزانن، دەزانن بێگومان ئیبراهیمو جگە لەویش لە پێغەمبەران هەرگیز جولەکەو گاور نەبوون، ئەوان ئەم زانستو شایەتییەیان شاردەوە، بۆیە ستەمیان مەزنترین ستەم بوو. لەبەر ئەمە خوا فەرموویەتی: ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَتَمَ شَهَٰدَةً عِندَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ ﴾ (واتە: کێ لەو کەسە ستەمکارترە کە شایەتیەکی لە خوا وەرگرتبێو بیشارێتەوە)، ئەمە شایەتیە لە لای ئەوان، ئەسپەردەی خوایە، نەک هی خەڵک، پێویست بوو گرنگیان بدایە بە بەجێهێنانیو پێی هەستابان، بەڵام ئەوان شاردیانەوەو پێچەوانەکەیان دەرخست: شاردنەوەی هەقو دەرنەبڕینی هەق، وە دەرخستنی نارەواییو بانگەواز کردنیان بۆی پێکەوە کۆکردنەوە، ئایا ئەمە مەزنترین ستەم نیە؟ بەڵێ، سوێند بە خوا ئەمە مەزنترین ستەمە، لە داهاتوویەکی نزیکدا خوا سزایان دەدات بە توندترین شێوە.

بۆیە خوا فەرموویەتی: ﴿ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴾ بەڵکو خوا کارو کردەوەکانیانی هەژمار کردووەو پاداشتەکەیشی بۆ هەڵگرتوون، خراپترین سزا سزای ئەوانە، وە خراپترین شوێن ئاگری دۆزەخە بۆ ستەمکاران، ئەمە ڕێگای قورئانە لە باسکردنی زانستو تواناد‌ا، لە دوای ئایەتەکان کە ئەو کردەوانەی لە خۆ گرتووە کە لەسەری پاداشت دەدرێنەوە.

ئەوە سوودی بەڵێنو هەڕەشە دەبەخشێ، وە هاندانو ترساندن لێی، هەروەها سوودی باسکردنی ناوە جوانەکان لە پاش هاتنی بڕیارو حوکمەکان، بێگومان فەرمانی ئاینیو پاداشتی شوێنەوارێکە لە شوێنەوارەکانی ناوە جوانەکانی پەروەردگار، وە پێویستکەرێکە لە پێویستکەرەکانی، ناوە جوانەکانیش داخوازی کارن بۆ ئەوە. پاشان خوا فەرموویەتی:

(١٤١): ﴿ تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ وَلَا تُسْـَٔلُونَ عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ١٤١ ﴾

پێشتر تەفسیرەکەی باسکرا، (بەڵام) دووبارەی کردۆتەوە، لەبەر پچڕاندنی پەیوەندی بە دروستکراوەکانەوە، ئەوەی پشتی پێ دەبەسترێ ئەوەیە کە مرۆڤ وەسفی پێکراوە، نەک کردەوەی پێشینو باوکو باپیرانی، سوودی ڕاستەقینە بە کردەوەکانە، نەک بەوەی دەدرێتە پاڵ باوکو باپیران.



سَيَقُولُ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَ ٱلنَّاسِ مَا وَلَّىٰهُمْ عَن قِبْلَتِهِمُ ٱلَّتِى كَانُوا۟ عَلَيْهَا ۚ قُل لِّلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ ۚ يَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٤٢﴾ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ۗ وَمَا جَعَلْنَا ٱلْقِبْلَةَ ٱلَّتِى كُنتَ عَلَيْهَآ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ ٱلرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ ۚ وَإِن كَانَتْ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ ۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤٣﴾ قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِى ٱلسَّمَآءِ ۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَىٰهَا ۚ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۚ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُۥ ۗ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ لَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ ﴿١٤٤﴾ وَلَئِنْ أَتَيْتَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ بِكُلِّ ءَايَةٍ مَّا تَبِعُوا۟ قِبْلَتَكَ ۚ وَمَآ أَنتَ بِتَابِعٍ قِبْلَتَهُمْ ۚ وَمَا بَعْضُهُم بِتَابِعٍ قِبْلَةَ بَعْضٍ ۚ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ ۙ إِنَّكَ إِذًا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٥﴾

(١٤٢): ﴿ سَيَقُولُ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَ ٱلنَّاسِ
مَا وَلَّىٰهُمْ عَن قِبْلَتِهِمُ ٱلَّتِى كَانُوا۟ عَلَيْهَا ۚ قُل لِّلَّهِ
ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ ۚ يَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ
مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٤٢﴾ ﴾.

﴿ سَيَقُولُ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَ ٱلنَّاسِ ﴾ واتە: بێگومان ئایەتی یەکەم موعجیزەو دڵدانەوەو دڵ ئارامکردنی بڕواداراني تێدایە، وە ڕێ پێگرتن‌و وەڵامەکەی لە سێ ڕووەوەیە، سیفەتی بیانوگرو ڕێ پێگر، وە سیفەتی ملکەچی‌و خۆ بەدەستەوەدانی بۆ بڕیارو حوکمی خواو ئایینیەکەی.

خوا ﷻ هەواڵیداوە ئەو ڕێ دەگرێ لە بڕوبیانووی ئەو گێل‌و گەوجانە لە خەڵکی، ئەوانەی کە بەرژەوەندی خۆیان نازانن، بەڵکو بە فیرۆی دەدەن‌و دەیفرۆشن بە خراپترین نرخ، ئەوانە جوولەکەو بتپەرستەکانن، ئەوانەش کە بەوان دەچن لە بیانوو گران بە بڕیارو حوکم‌و یاساکانی خوا، وە ئەوەش کە مسوڵمانان فەرمان پێکراو بوون، بە ڕووکردنە (بيت المقدس) ئەو ماوەی کە لە مەککە نیشتەجێ دەبن، لە پاشان دوای کۆچکردنیان بۆ مەدینە نزیکەی ساڵو نیوێک، خوا لەو بڕیارەیدا کە ئاماژە بە هەندێکی دەکات، دانایی‌و کارلەجێیی خوا ئەوەی خواست کە فەرمانیان پێ بکات ڕووبکەنە کەعبە، هەواڵی پێیانداوە کە هەر دەبێ بە گەوج‌و گێلەکان بڵێ لە خەڵکی: ﴿ مَا وَلَّىٰهُمْ عَن قِبْلَتِهِمُ ٱلَّتِى كَانُوا۟ عَلَيْهَا ﴾ کە ڕووکردنە (بيت المقدس) بووە، واتە: چ وای لێکردن ڕوو لە (بيت المقدس) وەربگێڕن؟ لەو بیانووگرتنەی کە لە سەر بڕیارو یاساو فەزڵو چاکەی خوا گرتیان، خوا هەواڵی ئەو بیانووگرتنەو ڕووداوەی پێدان، بۆی بە دیارخستن، ئەو بیانووگرتنە تەنها لەوانە ڕوودەدات کە وەسفکراون بە گێلی‌و گەوجی‌و کەم عەقڵی، بایەخیان پی مەدەن، بێگومان سەرچاوەی ئەو قسەیە زانرا، ژیر بایەخ بە بیانوو گرتنی گێل‌و گەوج نادات، مێشکو بیری خۆی بۆ تەرخان ناکات، ئایەتەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هیچ کەس بیانوو ناگرێت لە بڕیارو حوکمی

خـوای (دادگـەر)، مەگـەر کەسـی گێلو نەفـامو کەللـەڕەق نەبێ، بەڵام ژێری سـەر ڕاسـتی بـڕوادار، بڕیارەکانـی خواو حوکمەکانـی پەروەردگاری بـە ملکەچیو خۆ بە دەسـتەوەدانەوە وەر دەگـرێ، وەک خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ﴿٣٦﴾﴾الأحـزاب، (واتـە: بـۆ هیـچ بڕوادارێکـی نێـر یـان مـێ نیـە، ئەگەر خـواو پێغەمبەرەکـەی فەرمانێکیـان کرد، لـە فەرمانەکانیان سەرپشـک بن)، ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ﴿٦٥﴾﴾النسـاء، (واتـە: ئەی موحەممـەد ﷺ سـوێند بە پەروەردگـارت بڕوایان نەهێنـاوەو نیە تاکو تۆ نەکەنـە ناوبژیوانو حەکـەم لـەوەی کـە کێشـەیەک ڕوودەدات لـە نێوانیـان)، هەروەها دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ﴿٥١﴾﴾النـور، (واتـە: بێگومـان (ئـەوە) تەنیا قسـەی بڕوادارانە، ئەگـەر بانگ کرابـان بۆ لای خـواو پێغەمبەرەکەی تاکـو بڕیـار بدەن لـە نێوانیـان بڵێن: گوێبیسـت بوویـنو گوێڕایـەڵو جێ بەجـێ کارین بۆ فەرمـانو بڕیارەکە).

بێگومـان لە فەرموودەی خوا (وشـەی) (ٱلسُّفَهَآءُ) پێ نیازت دەکات لەوەی ڕەدی قسـەکانیان بدرێتـەوەو بایەخیـان پـێ بدرێ، لەگـەڵ ئەوەش خوا ﷻ ئـەو گومانەی واز لـێ نەهێناوە تاکو لایـداوەو ئاشـکرای کـردوە، ئـەوەی دەکەوێتە سـەر هەندێـک لە دڵـەکان لـە بیانوو گرتن، خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿قُل﴾ وەڵامە بۆیـان، ﴿قُل لِّلَّهِ الْمَشْرِقُ وَالْمَغْرِبُ يَهْدِي مَن يَشَاءُ إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ واتـە: ئەگـەر خۆرهـەڵاتو خۆر ئـاوا موڵکی خوا بـێو هیچ لایەکیش نیـە لـە موڵکی خـوا دەربچێ، لەگـەڵ ئەوەشـدا ڕێنمایی ئـەوەی بیەوێت دەیکات بـۆ ڕێگەی ڕاسـت، لـە ڕێنماییـدا هیدایەتـی ئێـوەش دەدات بـۆ ئـەو ڕووگەیـە کـە ڕێبـازی باوکتـان ئیبراهیمـە، جـا لەبەر چ شـتێکە بیانووگر بیانـوو دەگرێت بـە ڕوو کردنـە ڕووگەکەتان، کە لـە ژێـر دەسـەڵاتو خاوەندارێتی خوادایە؟ خـۆ ڕووتـان نەکردۆتە لایەک، کـە موڵکی ئەو نەبێـت؟ ئەمـە ئـەوە پێویسـت دەکات ملکەچـی فەرمانی ئەو بـن، چونکە ئەوە لە بەخشـشو ڕێنمایـیو چاکـەی خوایـە بـە سـەرتانەوە، کـە ڕێنوێنی کـردن بۆ ئـەوە، جا ئـەوەی بیانوو دەگـرێ لـە ئێـوە، بیانوو لە بەخششـی خـوا دەگـرێو ئیرەییتان پـێ دەبات.

وە کاتێـک کـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿يَهْدِي مَن يَشَاءُ إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ ڕەهـا دەبردرێتـە سـەر بەسـتراوە بەنددار (مطلق)، بێگومـان ڕێنماییو گومڕایـی هەردووکیان هۆکاریـان هەیە، کار لەجێیـیو دانایـی خـواو دادوەری خـوا پێویسـتیان دەکاتو دەیانهێنێتە کایـەوە، لە یەک

جێ زیاتـر لـە پەرتووکەکەی ئـەو ڕێنمایـی بۆ دەسـتەبەر دەبێـت، بێگومـان وەک خوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ يَهْدِي بِهِ اللَّهُ مَنِ اتَّبَعَ رِضْوَانَهُ سُبُلَ السَّلَامِ ﴿١٦﴾ ﴾ (المائدة) (واتـە: خـوا ڕێنوێنی ئەو کەسـە دەکات بە قورئان شـوێن ڕەزامەندی خـوا بکەوێتو ڕێگەی ئیسـلامو ئاشـتی گرتبێتە بەر).

لـەو ئایەتـەی باسـی هۆکاری پێویسـتی کردوە بـۆ هیدایەت دانی ئـەم ئۆممەتە بـە ڕەهایی لە هەموو جۆرەکانی هیدایەت، باسـی منەتو بەخششـی خـوای کرد بەسـەریانەوە، فەرموویەتی:

(١٤٣): ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ۗ وَمَا جَعَلْنَا الْقِبْلَةَ الَّتِي كُنتَ عَلَيْهَا إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ الرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ ۚ وَإِن كَانَتْ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى الَّذِينَ هَدَى اللَّهُ ۗ وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ بِالنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤٣﴾ ﴾:

﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا ﴾ واتـە: ئەوانەی هێڵی ناوەڕاسـتیان گرتووەو هەڵبژێردراون، جگـە لـە ناوەنـدو ناوەڕاسـت دەورووبـەری لـە مەترسـی دایـە. جـا خوا ئـەو ئۆممەتـەی لە هەمـوو کاروبارەکانـی ئاییـن ناوەنـد کـردوە، ناوەنـدن لـە پێغەمبـەران، لـە نێـوان ئەوانەی زێدەڕۆیـان تێـدا کـردوە، وەکـو گـاورەکان، وە لـە نێـوان ئەوانـەی بـێ ڕێـزو ڕەق بـوون لەگەڵیانـدا وەک جوولەکـەکان، بـەوەی کـە ئۆممەتـی موحەممـەد ﷺ بڕوایان بـە هەموویان هێناوە، بەو شـێوازەی کە لێیان دەوەشـێتەوە، (ئەو ئۆممەتە) ناوەندیشـە لە یاسـاو شـەریعەت، نـە وەک جولەکە توونـدوو پێداگرن نەوەک گـاورەکان کەمتەرخەمـن، وە دەربارەی پاکو خاوێنـیو خواردنـەوەکان، نـەوەک جوولەکـەکان ئەوانەی نوێژیان دروسـت نەبـوو مەگەر لـە پەرسـتگاکەو خەڵوەتگاکانیانـدا بووایـە، ئاو پیسـیەکانیانی پـاک نەدەکردنـەوە، بێگومان پـاکو خاوێنیـەکان قەدەغـە کـرا لەسـەریان، وە نـەوەک گـاورەکان ئەوانەی هیچ شـتێک بـە پیسـی نازانن، هیچ شـتێک قەدەغەو حـەڕام ناکـەن، بەڵکو بـە ڕەوایان بینیـوەو حەڵاڵیان کـردوە هەمـوو ئـەو گیاندارانەی بەسـەر زەویـدا ڕێدەکەن.

بەڵکـو پـاکو خاوێنی (ئۆممەتی موحەممـەد ﷺ) تەواوترین پاکو خاوێنیە، خوا لە خۆشـیو خاوێنەکانـیو خـواردو خواردنەوەو پۆشـاکو جـلو بەرگو هاوسـەرگیری بۆیـان حەڵاڵ کردوە، وە پیسـیەکانی لەسـەر حەڕام کـردوون، بۆ ئـەو ئۆممەتە لە دینو ئاینـدا تەواوترینن، وە لە ڕەوشـتو هەڵسو کەوتدا شـکۆدارترینن، لە کردەوەشـدا چاکترینن، خوا لە زانسـتو حیکمـەتو دادپـەروەریو چاکـەی پـێ بەخشـیون، کە بـە هیچ یەکێـک لـە ئۆممەتەکانی

پێشـینی نەبەخشـیوە، بەو شـێوە بوون بـە ﴿ أُمَّةً وَسَطًا ﴾ تەواون تاکـو ببنە ﴿ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ ﴾ (گەواهیـدەر بەسـەر خەڵکـی سـەر زەوی) بە هـۆی دادپەروەریـیو بڕیاردانیان بە دادگـەری، بڕیـار دەدەن بەسـەر تێکـڕای خـاوەن ئاینەکان، بەڵام جگـە خۆیان بڕیـار نادرێ بەسـەریاندا، جـا ئـەوەی ئەو ئۆممەتە شـایەتی بۆ بـدات بە وەر گرتـن ئەوە وەرگیـراوەو قبوڵ کـراوە، وە ئەوەی شـایەتی بۆ بـدات بە ڕەتکردنـەوە ئـەوە ڕەت کراوەتەوەو قبـوڵ نەکراوە.
ئەگـەر وتـرا: چـۆن بڕیـارو حوکمیان لەسـەر جگە لـە خۆیـان وەردەگیرێت، لـە کاتێکدا هەریـەک لەوانـەی کـە دژی یەکتـر دەجولێنـەوە وتـەی یەکتر قبـوڵ ناکـەن؟ وتراوە: بەڵکـو تەنهـا قسـەی یەکێـک لـە بەرانبـەرو دژەکان لەبـەر تۆمـەت بـوون وەرناگیرێت، بـەڵام ئەگـەر تۆمـەت نەبوو یـان نەمـاو ڕەتکرایـەوە، دادپەروەریش دەسـتەبەر بوو، وەک چـۆن لەم ئۆممەتـەدا هەیە، تەنهـا مەبەسـت بڕیاردانە بـە دادپەروەریـیو ڕەوایەتی، مەرجی ئـەوەش هەبوونـی زانیاریـیو دادپەروەریـە، ئـەو دووانـەش لـەو ئۆممەتـەدا بوونیـا هەیـە بۆیـە وتەکانیـان وەردەگیـرێ، ئەگـەر کەسـێک گومانـی هەبـێ لە فـەزڵو چاکـەو پلەو پایـەی ئۆممەتـی (موحەممەد ﷺ) داوای پشـتگیریو (تزکیـة) بکات بۆی، ئـەوە تەواوترینی بەدیهێنـراوەکان پێغەمبەرەکەیانـە (موحەممـەد ﷺ) لەبەرئەوەیـە، خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ﴾ (واتـە: پێغەمبەریـش بەسـەرتانەوە ئـەی ئۆممەتـی موحەممەد ﷺ شـایەدو گەواهـی دەرە).
لـە شـایەتی دانـی ئەم ئۆممەتەی بۆسـەر بێجگە لـە خۆیان، ئەوەیـە کاتێک کـە ڕۆژی دوایی دێو خوا پرسـیار لـە پێغەمبەران دەکات دەربـارەی ڕاگەیاندنی پەیامەکەیـان، وە ئەو ئۆممەتە بەدرۆکارانـە کـە نکوڵـی پەیامـی پێغەمبەرانیـان کـرد، پێغەمبـەران ئـەو ئۆممەتـە دەکەن بە شاهیدو بەڵگە بەسـەریانەوە.
وە ئـەم ئایەتـە بەڵگەیە لەسـەر ئـەوەی، کە یەکدەنگە ئـەم ئۆممەتـە بەڵگەیەکی ڕاسـتەقینەو بڕاوەیـە، کـە ئـەوان پارێـزراوو مەعصومـن لـە هەڵـە، لەبـەر بەڕەهایـی فەرمـودەی خـوا: ﴿ وَسَطًا ﴾ چونکـە ئەگـەر بگونجـێ لەسـەر هەڵـە ڕێکبکەون، ئـەوە نەدەبوونـە ئۆمەتێکی نێوەنـد، مەگـەر لە هەندێـک کاروبـار نەبێت، چونکە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ لِّتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ ﴾ ئەمـەش ئـەوە دەخـوازێ کـە ئـەوان ئەگـەر شـایەدی بـدەن لەسـەر بڕیارو حوکمێـک کـە خوا حەڵاڵی کردبـێ، یان حەڕامـی کردبێ، یان پێویسـتی کردبـێ، ئەوە ئەو ئۆممەتـە پارێـزراوە لێـی، ئـەو ئایەتە بە مـەرج گرتنـی دادپـەروەری تێدایە لە بڕیـار دان، بە

هەمان شێوە شایەتیو فتوا دانیش.

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ وَمَا جَعَلْنَا ٱلْقِبْلَةَ ٱلَّتِي كُنتَ عَلَيْهَآ ﴾ بریتییە لە ڕووکردنە (بیت المقدس) یەکەمجار، ﴿ إِلَّا لِنَعْلَمَ ﴾ واتە: زانستێکە پەیوەستە بە تۆڵەو پاداشت، ئەگینا خۆی بەرزو زانایە بە هەموو کاروئیشەکان پێش بوونیان، بەلام ئەم زانستە (پێش بوونو وجودیان) پاداشتو تۆڵەی پێوە پەیوەست نەکراوە، لەبەر تەواوی دادپەروەرییو بیانوبڕینی بەندەکانی، بەڵکو ئەو کاتەی کاروکردەوەکان هەبوون ئەوە پاداشتو تۆڵەی لەسەر دەکەوێت، واتە: ئەو ڕووگەمان شەرعاندو دامانناو تا بزانینو تاقیان بکەینەوە (لە مەیدانی ژیانی دنیا)، ﴿ مَن يَتَّبِعُ ٱلرَّسُولَ ﴾ (واتە: هەر کەس پەیڕەوی پێغەمبەر ﷺ دەکات)و بڕوای پێ دێنێو لە هەر حاڵێک پەیڕەوی لێ دەکات، چونکە ئەو بەندەی فەرمان پێ کراوە مشوور لێ خوراوە، لەبەر ئەوەش پەرتووکەکانی پێشین هەواڵیان دابوو کە ڕوو دەکاتە کەعبە، کەسی بە ویژدان ئەوەی مەبەستی هەقە، ئەمە بە هۆی ئەوەوە بڕواو گوێڕایەڵی بۆ پێغەمبەر ﷺ زیاد دەبێ.

بەلام ئەوەی پاشگەزبێتەوەو ﴿ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ ﴾ پشت بکاتە هەقو شوێن هەواو هەوەس بکەوێت، ئەوە کوفری بەسەر کوفریەکەی زیاد دەبێو سەرگەردانی بەسەر سەرگەدانیەکەیو، بەڵگەی ناڕەوا دێنێتەوە، کە لەسەر گومان بونیاتنراوەو هیچ ڕاستیەکی بۆ نیە.

﴿ وَإِن كَانَتْ ﴾ واتە: ڕوو وەرگێرانت لە (بیت المقدس)، ﴿ لَكَبِيرَةً ﴾ واتە: قورسو گرانە، ﴿ إِلَّا عَلَى ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ ﴾ بەمە نازو نیعمەتی خوایان بەسەر خۆیانەوە زانی، شوکرانە بژێریان کردو دانیان نا بە چاکەی خوا کە ڕوو کردنە ئەو ماڵە مەزنەیە (واتە: کەعبە)، کە پلەداریەکەی لەسەر تێکڕای زەوی چوونو مەبەست کردنیەتی، وە گێڕاویەتی بە ڕوکنێک لە ڕوکنەکانی ئیسلام، وە لابەری تاوانو گوناهەکانە، لەبەر ئەوەیە لەسەر ئەوانە (هاوەلانی پێغەمبەر ﷺ و ئوممەتەکەی) سووکو ئاسان بوو، وە لەسەر جگە لەوانیش قورسو گران بوو.

پاشان خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَـٰنَكُمْ ﴾ واتە: لە خوا ناوەشێتەوە، بەڵکو ئەوە لە قەدەغە کراوەکانی خوایەو خوا قەدەغەی کردوە لەسەر خۆی، خوا هەواڵیداوە کە هەرگیز نابێ کردەوەی بڕوادارەکان بە فیڕۆ بدات.

لەمەدا موژدەیەکی مەزن هەیە بۆ ئەو کەسانەی کە خوا بەخششو منەتی کردوە

بەسەریانەوە بە ئیسلامو ئیمان، بەوەی خوا بڕواکەیان دەپارێزێو بە فیڕۆی نادات، پاراستنی خواش دوو جۆرە:

یەکەم: پاراستن لە بە فیڕۆ چوونو پوچەڵ بوونەوە بە پاراستنی خۆی بۆیان، لە هەموو تێکدەرو لابەرێک، وە کەم کەرەوە لە دەردو بەڵاو دڵەڕاوکێ، وە هەواو هەوەس ڕێگرو بەربەستەکان.

دوووەم: پاراستنی بۆی لە نەشو نماکردنی گەشە پێدانی بۆیان، وە پشتگیری کردنی بۆ ئەو کارو شتانەی بڕوایان پێی زیاد دەبێو دڵنیاییان پێی تەواوتر دەبێ، هەروەک سەرەتا بۆ ئێوەی کرد بەوەی ڕێنوێنی کردن بۆ بڕواهێنان، ئاواش بۆتان دەپارێزرێ، نازو نیعمەتەکانی تەواو دەکات بە نەشو نماکردنی، وە نەشو نماکردنی پاداشتو خەڵاتەکەی، وە پاراستنی لە هەموو لێڵییەک، بەڵکو ئەگەر بەڵاو موصیبەتەکان هاتنو ڕوویاندا، کە مەبەست لێیان بە دیارکەوتنی بڕواداری ڕاستگۆیە لە درۆزن، ئەوە بڕواداران سافو بێ خلت دەکاتو ڕاستگۆییان دەردەخات، هەروەک بڵێی لەوەوە ئاگاداریو وریایی هەبێ دەربارەی ئەوەی دەوترێ، فەرموودەی خوا: ﴿وَمَا جَعَلْنَا ٱلْقِبْلَةَ ٱلَّتِي كُنتَ عَلَيْهَآ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ ٱلرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ﴾ ڕەنگە ببێتە هۆکارێک، بۆ وازهێنانی هەندێک لە بڕواداران لە بڕواکەیان، ئەو گومانەی لاداو ڕەتی کردەوە، بە فەرموودەی خۆی: ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمْ﴾، بە ئەندازە کردنی ئەو بەڵاو تاقیکردنەوەیە، یان جگە لەوەش.

دەچێتە ئەو چوار چێوەوە هەرکەسێ لە بڕواداران بمرێ پێش گۆڕینی ڕووگە،، بێگومان خوا بڕواکەیان بە فێڕۆ نادات (واتە: نوێژ کردنیان بەرەو «بیت المقدس» بە فیڕۆ نادات)، لەبەر ئەوەی لە کاتی خۆی گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خواو پێغەمبەرەکەی بوون، وە گوێڕایەڵی خوا جێبەجێ کردنی فەرمانەکانیەتی لە هەموو کاتێکدا بە گوێرەی فەرمانەکە. ئەم دەقە دەبێتە بەڵگە بۆ (أهل السنة والجماعة) کە کردەوەی چاکە دەچێتە ناو بڕوا هێنانەوە.

کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ واتە: (خوا) زۆر بە بەزەییە لەگەڵیانو بەزەیەکەی مەزنە، لە بەخشندەییو بەزەیی خوا بۆیان ئەوەیە نازو نیعمەتەکانی بۆیان تەواو بکات، کە سەرەتا دایباراند بەسەریاندا، وە تا جیای بکاتەوە لێیان ئەوەی چوەتە ناو ئیمانەوە بە زمانی جگە لە دڵی، وە تاقیان بکاتەوە ئیمانیان پێی زیاد بکاتو پلەیان

پێـی بەرز ببێتـەوە، ڕوویان پـێ بکاتـە پلەدارترین ماڵـەکان (ی خوا)و شـکۆدارترینیان (کە کەعبەیە).

(١٤٤): ﴿ قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَىٰهَا فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّواْ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُۥ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ لَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ ﴿١٤٤﴾ ﴾:

خـوا بە پێغەمبەرەکـەی ﷺ دەفەرمـوێ: ﴿ قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِ ﴾ واتە: زۆری چاوگێڕانـیو ڕوو وەرسـوڕانی بە هەمـوو لایەکەوە، بە پەرۆشـیو چاوەڕوانی لەبـەر دابەزینی وەحـی کە فەرمانـی ڕووکرانە کەعبـەی پێ بـکات، فەرمـووی: ﴿ وَجْهَكَ ﴾ نەیفەرموو: (بصـرک) واتـە: چاوەکانـت، لەبەر زێدە بایـەخ پێدان، لەبەر ئـەوەی ڕوو وەرگێـڕان هێنەری چـاو وەرگێڕانە، ﴿ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ ﴾ واتـە: ڕووت پێ دەکەینە لای خۆمان لەبەر پشـتگیری ئێمە بـۆ تـۆ، ﴿ قِبْلَةً تَرْضَىٰهَا ﴾ واتە: خۆشـت دەوێـت، ئەویش بریتیە لـە کەعبە، لەمـەدا فەزڵو پلـەو پایـەی گەورەیی پێغەمبـەر ﷺ بە دەر دەکـەوێ، دەبینـرێ خوای بـەرز خێرایی دەکات لـە ڕازی کردنـی ئـەو، لە پاشـان ڕاشـکاوانە فەرمانـی ڕووکردنە کەعبـەی پێـداو فەرمووی: ﴿ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ﴾ واتـە: ڕووت بکـە لای مزگەوتـی حەرام کەعبە. وە (الوجە) ڕوو: ڕووی پێشـەوەیە لە لاشـەی مرۆڤ، ﴿ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ ﴾ واتە: لە وشـکانیو دەریـاو لە خۆرهەڵاتو خۆرئاواو سـەرو خـوار، ﴿ فَوَلُّواْ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُۥ ﴾ واتـە: لای ئەو، ڕووی ئەو.

بـە مـەرج گرتنـی ڕوو کردنە کەعبـەی تێدایە بـۆ هەموو نوێژە فـەرزو سـوننەتەکان، ئەوەیە ئەگـەر توانـرا ڕوو لـە خودی کەعبـە بکرێت، ئەگەرنـا کەعبە بەسـە ڕووی تـێ بکرێت، بە ڕاسـتی وەرگێڕانی جەسـتە نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە، چونکە فەرمان بەکارو شـتێک قەدەغەکردنە لـە دژو پێچەوانەکـەی. کاتـێ کە خـوا ﷻ لە پێشـتر باسـی بیانووگـرانو ڕەخنەگرانی کرد لەسـەر ئـەوە، لە خـاوەن کتێبـەکانو جگـە لەوانیش، باسـی وەڵامەکانیشـیانی کـرد، لێرەدا باسـی ئـەوە دەکات کـە خـاوەن کتێبـەکان، زاناکانیـان دەزانـن تـۆ ئـەی موحەممـەد ﷺ لەسـەر ڕەوایەتییـت، لەبـەر ئـەوە لـە کتێبەکانیانـدا دەیبینـن، لەبـەر کەللەڕەقـیو سـنوور بەزێنیـەوە ڕەخنـەو بیانـوو دەگرن، مـادام ئـەوان هەڵەی خۆیـان دەزانن، بایەخیان پـێ مەدەو لێیـان بگـەڕێ، چونکـە مرۆڤ کـە ڕەخنەو بیانـووی لێ دەگیـرێ خەمی پێ دەخـواو ئەگەر کارەکـە گومانـاوی بـێ، کەچـی ڕەنگـە هەق لـە لای ئەویـش بێ.

بـەڵام ئەگـەر دڵنیـا بوو کە هـەق لەگـەڵ ئـەوەو ڕەخنەگریـش کەللەڕەقە، نارەوایی قسـەی ئـەوی بـۆ دەردەکەوێ، ئەوە شـایانی بایەخ پـێ دان نیە، بەڵکـو چاوەڕوان دەکـرێ ڕەخنەگر تۆڵـەی دنیـاو دوارۆژی لـێ بکرێتـەوە، لەبـەر ئەوەیە خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعۡمَلُونَ﴾ بەڵکـو کردەوەکانیان لەسـەریان دەنووسـێو دەیپارێزێ لەسەریشـی سـزایان دەدات، هەرەشـەی بـۆ ڕەخنەگران تێدایەو، دڵخۆشـکردنو دڵدانەوەشـی بۆ بـڕواداران تێدایە.

(١٤٥): ﴿وَلَئِنۡ أَتَيۡتَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ بِكُلِّ ءَايَةٖ مَّا تَبِعُواْ قِبۡلَتَكَۚ وَمَآ أَنتَ بِتَابِعٖ قِبۡلَتَهُمۡۚ وَمَا بَعۡضُهُم بِتَابِعٖ قِبۡلَةَ بَعۡضٖۚ وَلَئِنِ ٱتَّبَعۡتَ أَهۡوَآءَهُم مِّنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلۡعِلۡمِ إِنَّكَ إِذٗا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ١٤٥﴾:

پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە تەواوەتـی پێداگـری لەسـەر هیدایەت دانـی خەڵکی هـەر توانایەکی هەبـوو لـە دڵسـۆزیو ئامۆژگاری بۆی سـەرف دەکـردنو دڵخۆشو نـەرم بوو بـە هیدایەت دانیـان، غەمبـار دەبوو ئەگـەر ملکەچـی نەبوونایەت بـۆ فەرمانەکانـی خوا، جا لـە کافرەکان هەبـوو، یاخـی دەبوون لـە فەرمانی خـواو لووت بەرزیـان دەکـرد بەسـەر ڕەوانەکراوانی خوا بـە ئەنقەسـتو دوژمنایەتـی وازیـان لە هیدایـەت دەهێنـا لەوانـەش: جوولەکەو گـاورەکان، خـاوەن کتێبەکانـی پێشـوو، ئەوانـەی کافر بوون بـە موحەممـەد ﷺ دڵنیاش بـوون کە هەقە، نـەک لەبـەر نەزانیـنو نەفامیـی، لەبـەر ئەوە خـوا ﷻ هەواڵیـدا کە تـۆ ئـەی موحەممەد ﷺ ئەگـەر ﴿أَتَيۡتَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ بِكُلِّ ءَايَةٖ﴾ واتـە: بە هەر بەڵگەیـەک وتەکانت ڕوون بکەیتـەوە، ئەوەی تـۆ بانگەوازی بۆ دەکەیـت دەربخات، ﴿مَّا تَبِعُواْ قِبۡلَتَكَ﴾ واتە: شـوێنت ناکـەونو پەیڕەویـت لێ ناکەن، چونکە شـوێنکەوتنی ڕووگە، بەڵگەیە لەسـەر شـوێنکەوتنی ئـەو (موحەممـەد ﷺ)، چونکـە باسـەکە باسـی ڕووگەیـە، بـەڵام حـاڵ هـەر وایە (واتـە: لە هەمـوو فەرمـانو پەیـڕەوی کردنەکان هەروایـە، وە نەبێ تەنیا لـە ڕووکردنـە ڕووگەوە بێ)، چونکـە ئـەوان کەللـە ڕەقـن، ڕەوایەتیو هەقیان ناسـیوە وازیشـیان لـێ هێنـاوە، بەڵگەکانو نیشـانەکان کەسـانێک سـوودی لێ وەردەگرن کـە خوازیاری هـەق بنو لێیـان ڕوونو دیار نەبـێو دڵیـان تێکچووبـێ، ئـەوە بەڵگـەو نیشـانە ڕوون کـەرەوەکان بۆی دەردەخـەن، بەڵام ئـەوەی بڕیـاری داوە کـە شـوێنی هەق نەکەوێـت، بۆ ئـەو هیچ چـارەی تێدانیە.

هەروەهـا لـە نێـوان خۆیانیشـدا جیاوازیـان هەیـە، هەندێکیـان شـوێن ڕووگـەی هەندێکیان ناکـەون، کەواتـە: ئەوان لەلایان نامۆ نیە کە شـوێنی ڕووگەی تۆ نەکـەون ئەی موحەممەد ﷺ ئـەوان دوژمنی تەواوو حەسـوودن، کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَمَآ أَنتَ بِتَابِعٖ قِبۡلَتَهُمۡ﴾ ڕەوانبێژترو

جوانتــرە لــەوە بفەرمــوێ: (وَلاَ تَتَّبعْ) واتە: شــوێنی مەکەوە، چونکــە ئەمە ئــەوە دەگەیەنێ کە موحەممــەد ﷺ وەســفکراوە بــە پێچەوانــەی ئەوان، ناشــێ ئەوە لــەوەوە رووبــدات، نەیفەرموو: (ولـو أتـوا بـكل آيـة)، (واتــە: ئەگەر بــە هەموو نیشــانەیەک بۆیان بێــی)، چونکــە بەڵگەیان نیە لەســەر قسەکانیان.

بەهەمــان شــێوە ئەگــەر هــەق بــە بەڵگــە دڵنیاکەرەوەکانیــەوە دەرکــەوت، پێویســت ناکات وەڵامــی گومانــاوی لەســەری بهێنرێتــەوە، چونکە ســنووری نیــە، وە دەزانێ هەمــوو ئەوانەی هەقی رِوونو ئاشــکرا رەتدەکەنەوە ئــەوە پووچو بەتاڵە، جا کەوابێ شــیکردنەوەی گومانەکان لە بابەتی خۆبەخشــینە.

﴿وَلَئِنِ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءَهُم﴾ تەنهــا فەرمــووی: ﴿أَهْوَاءَهُم﴾ نەیفەرمــوو (دینهــم) رێبــازو ئایینەکەیــان، چونکە ئــەوەی ئەوان لەســەرین تەنها هــەواو هەوەســە، تەنانەت خۆیان لــە دڵــی خۆشــیانەوە دەزانن کــە ئایین نیە، هــەر کەس واز لــە ئایین بێنــێ، هەر دەبێ شــوێن هــەواو هــەوەس بکەوێت.

خــوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿أَفَرَءَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ ﴿٢٣﴾﴾ (واتــە: ئــەی موحەممــەد ﷺ) تۆ نابینــی ئەوەی هــەواو هەوەســی کردۆتە پەرســتراوی خۆی دەیپەرســتێ).

﴿مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ الْعِلْمِ﴾ بــەوەی تــۆ لەســەر هەقی ئەوانیش لەســەر نارەوایەتی، ﴿إِنَّكَ إِذًا﴾ واتــە: ئەگــەر شــوێنیان بکەوێت، ئەمــە ئاگــادار کردنــەوەو ورياکردنەوەیە، تاکــو ئــەم رِستەیەی جیــا نەبێتــەوە لە پێــش خــۆی، واتە: گــرێ بدرێ بــە پیــش خۆیەوە) ئەگەر لــە تێگەیشتنیشــەوە بێ.

﴿لَّمِنَ الظَّالِمِينَ﴾ واتــە: دەچێتــە رِیزی ئــەوانو لــەوان هەژمار دەکرێ، جا چ ســتەمێک مەزنتــرە لــەو ســتەمەی کــە یەکێــک هــەقو ناهــەق بزانــێو ناهــەق پێشــی هەق بخــات، ئا ئەمــە ئەگــەر چی دواندنەکــە لەگەڵ پێغەمبــەر ﷺ بووە، ئوممەتەکەشــی دەگرێتــەوە، هەروەها ئەگــەر ئــەو ﷺ ئــاوای کردبا، کە (حاشــای ئەو)، دەبووە کەســێکی ســتەمکار لەگــەڵ ئەو پلە بــەرزیو چاکــە زۆرانــەی، جگە لــەو ئەولاترەو لە پێشــترە.

ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ
وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٤٦﴾ ٱلْحَقُّ
مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿١٤٧﴾ وَلِكُلٍّ وِجْهَةٌ
هُوَ مُوَلِّيهَا فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ أَيْنَ مَا تَكُونُوا۟ يَأْتِ بِكُمُ ٱللَّهُ
جَمِيعًا إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٤٨﴾ وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ
فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَإِنَّهُۥ لَلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ
وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿١٤٩﴾ وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ
وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا۟
وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُۥ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَيْكُمْ حُجَّةٌ إِلَّا ٱلَّذِينَ
ظَلَمُوا۟ مِنْهُمْ فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَٱخْشَوْنِى وَلِأُتِمَّ نِعْمَتِى عَلَيْكُمْ
وَلَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٥٠﴾ كَمَآ أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولًا مِّنكُمْ يَتْلُوا۟
عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ
وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُوا۟ تَعْلَمُونَ ﴿١٥١﴾ فَٱذْكُرُونِىٓ أَذْكُرْكُمْ
وَٱشْكُرُوا۟ لِى وَلَا تَكْفُرُونِ ﴿١٥٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟
ٱسْتَعِينُوا۟ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٣﴾

پاشان خوا فەرموویەتی:

(١٤٦-١٤٧): ﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٤٦﴾ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿١٤٧﴾ ﴾:

خوا ﷻ هەواڵیداوە کە خاوەن کتێبەکان بڕیاریان داوەو دانیان پیاناوەو دەزانن کە موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایە، ئەوەی پێی هاتوە (واتە: قورئان) هەقەو ڕاستەو لەوە دڵنیان، هەروەک چۆن دڵنیان لە ڕۆڵەو کوڕەکانیانو لێیان تێک ناچێو تێکەڵیان ناکەن لەگەڵ غەیری منداڵەکانیان، ناسینیان بۆ موحەممەد ﷺ گەیشتۆتە ئەو ئاستە، کە هیچ گومانو دوو دڵیان تێدا نەماوە، بەڵام دەستەیەک لەوان کە زۆرینەیانن بێبروان پێی، ئەو هەقەیان شاردۆتەوە لەگەڵ ئەوەی لێیشی دڵنیانو دەشزانن، ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَتَمَ شَهَٰدَةً عِندَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ ﴿١٤٠﴾ ﴾البقرة، (واتە: کێ ستەمکارترە لەو کەسەی شایەتیەکی لەلایەن خواوە لەلایێو شاردبێتیەوە).

ئەمەش دڵدانەوەی تێدایە بۆ پێغەمبەر ﷺ و بڕواداران، ئاگادار کردنەوەشیانە لە خراپەو گومانەکان، دەستەیەکیش لەوان هەقەکەیان نەشاردۆتەوەو دەزانن، لەوانە هەبوو بڕوای پێ هێنابوو، هەشیان بوو بە نەزانینەوە پێی بێبڕوا بوو، جا زانا لە سەریەتی هەق دەربخاو ڕوونی بکاتەوەو جوانی بکات، ئەوەندەی لە توانای دایە لە دەربڕینو نموونە هێنانەوەو سەلماندنی بەڵگەو جگە لەوانەش، پووچەڵ کردنەوەی ناڕەوایەتیو جیاکردنەوەی لە ڕەوایەتی، وە ناشیرین کردنو لەبەرچاو خستنی لە دەروونەکاندا، بە هەموو ڕێگایەک بەرەو ئەوەی بیات، ئەوانەی هەقیان شاردۆتەوە، کارەکەیان پێچەوانە کردۆتەوە، حاڵو باریان پێچەوانەبوویەوە.

﴿ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ ﴾ واتە: ئەو ڕاستیەی لە هەموو شتێک ڕاسترە، کە پێ بوترێ (الحق)، لەبەر ئەوە داواکاریە بەرزو بڵندەکانو کاروبارە چاکەکان لە خۆ دەگرێ، وەک پاککردنەوەی

دڵو دەروون، وە هاندانی لەسەر بە دەست هێنانی بەرژەوەندیەکانو ڕەتکردنەوەی خراپەکان، چونکە لە لایەن پەروەردگارتەوە سەرچاوەی گرتووە، ئەوە یەکێکە لە پەروەردە کردنی خوا بۆ تۆ، کە ئەو قورئانەی بۆ دابەزاندووی، لە پەروەردەکردنی عەقڵو هۆشو دڵو دەروونەکانی تێدایە، لەگەڵ هەموو بەرژەوەندیەکانیش.

﴿ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴾ واتە: کەمترین گومانو دوو دڵیت بۆ پەیدا نەبێت تێیدا، بەڵکو بیری لێبکەرەوەو لێی وردبەرەوە، تاکو بەو بیر کردنەوە دڵنیا دەبی، چونکە بیرکردنەوە تێیدا حەتمەن دەبێتە لابردنی گومانو گەیشتن بە یەقین.

(١٤٨): ﴿ وَلِكُلٍّ وِجْهَةٌ هُوَ مُوَلِّيهَا ۖ فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ أَيْنَ مَا تَكُونُوا۟ يَأْتِ بِكُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٤٨﴾ ﴾:

﴿ وَلِكُلٍّ وِجْهَةٌ هُوَ مُوَلِّيهَا ۖ فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ ﴾ واتە: هەر خاوەن ئایینو ڕێبازێک لە پەرستنەکەیدا ڕووگەیەکی هەیە ڕووی تێ دەکات، بایەخو گرنگی لە ڕووکردنە ڕووگە نیە، چونکە ڕووکردنە ڕووگە لەو شەرعو یاسایانەیە کە حاڵو کاتەکان دەیگۆڕن، لادانو گواستنەوەی لە لایەکەوە بۆ لایەکی دیکەی تێدەکەوێ، بەڵام ئەوەی جێی بایەخو گرنگی پێدانە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خوایە، لە نزیکبونەوەیە لێیو دۆستایەتیو پشتگیری کردنیو داوای پلەی بەرزو بەڕێز لە لای، ئا ئەمەیە ناونیشانی خۆشبەختی، ئەگەر کەسەکان بەوە وەسف نەکرێن، ئەوە زەرەرمەندی دونیاو دوارۆژ دەبن، هەروەکو ئەگەر هەر کەسێک پێی وەسفکراوبێ ئەوە بە تەواوەتی لەسەر هەقە، ئەمە کارێکە یەکدەنگی لەسەرە لە نێو هەموو شەریعەتەکاندا، چونکە خوا بەدیهێنراوانی لە پێناو ئەوەدا بەدیهێناوەو فەرمانی ئەوەی پێکردوون.

فەرمان کردن بە پێشبڕکێ کردن بۆ چاکە، ئەندازەیەکی زیاترە لە فەرمان بە چاکەکان، چونکە بەڕاستی پێشبڕکێ کردن بۆ چاکە کردن، کردەوە پێکردن لەخۆ دەگرێ، هەر یەکێک پێشبڕکێ بکات بەرەو چاکەکان لە دونیادا، ئەوە لە پێشترە بۆ بەهەشتەکان لەدوا ڕۆژدا، کە بێگومان پێشبڕکێکاران لە بەرزترین پلەوپایە دان.

چاکەکان (الخیرات): هەموو فەرزو سونەتەکان دەگرێتەوە لە نوێژو ڕۆژوو زەکاتو حەجو عومرەو جەنگو جیهاد، وە سەرجەم سوودو بەرژەوەندیەکان.

لەو کاتەی کە بەهێزترین شت دڵو دەروونی (مرۆڤ) هاندەدات لەسەر پەلەکردن بەرەو چاکەو چالاکیان دەکات، ئەوەیە کە خوا دایناوە لەسەری پاداشت دەدرێنەوە، پاشان خوا

فەرموویەتی: ﴿ أَيۡنَ مَا تَكُونُواْ يَأۡتِ بِكُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴾ کۆتان دەکاتەوە بۆ ڕۆژی قیامەت، بە تواناو دەسەلاتەکەی، هەر کەسێک بە پێی کردەوەکەی پاداشت یان سزا دەدرێتەوە، ﴿ لِيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔواْ بِمَا عَمِلُواْ وَيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ بِٱلۡحُسۡنَى ٣١ ﴾النجم، (واتە: تاکو سزایان بدات ئەوانەی تاوانو خراپەیان کردوە بەپێی ئەو کردەوانەی کە کردوویانە، پاداشتی ئەوانەش بداتەوە کە کردەوەی چاکەیان ئەنجام داوە).

بەم دەقە بەرزو پیرۆزە بەڵگە دەهێنرێتەوە لەسەر ئەنجامدانی هەر چاکەیەک کە کردەوەی پێ وەسف کرابێ، وەک: نوێژ لە یەکەم کاتی خۆیدا، وە دەستپێشخەری لە ئەنجامدانی ڕۆژو حەجو عومرەو دانی زەکاتو ئەنجامدانی سوننەتەکانو پەرستنەکانو ئادابەکانیان، ئەی خودایە! ئەمە ئایەتێکی چەندە سوود بەخشو پڕ واتایە!!

(١٤٩-١٥٠): ﴿ وَمِنۡ حَيۡثُ خَرَجۡتَ فَوَلِّ وَجۡهَكَ شَطۡرَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِۖ وَإِنَّهُۥ لَلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ١٤٩ وَمِنۡ حَيۡثُ خَرَجۡتَ فَوَلِّ وَجۡهَكَ شَطۡرَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِۚ وَحَيۡثُ مَا كُنتُمۡ فَوَلُّواْ وُجُوهَكُمۡ شَطۡرَهُۥ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَيۡكُمۡ حُجَّةٌ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡ فَلَا تَخۡشَوۡهُمۡ وَٱخۡشَوۡنِي وَلِأُتِمَّ نِعۡمَتِي عَلَيۡكُمۡ وَلَعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ ١٥٠ ﴾:

﴿ وَمِنۡ حَيۡثُ خَرَجۡتَ ﴾ لە گەشتو غەیری گەشت کردنەکانتان، چونکە ئەوە بۆ گشتییە، ﴿ فَوَلِّ وَجۡهَكَ شَطۡرَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ ﴾ واتە: هەر دوو لای کەعبە.

پاشان بە گشتی ئوممەتی (موحەممەد ﷺ)ی دواندوەو فەرموویەتی: ﴿ وَحَيۡثُ مَا كُنتُمۡ فَوَلُّواْ وُجُوهَكُمۡ شَطۡرَهُۥ ﴾ (واتە: لە هەر شوێنو جێگایەک بوون ڕووتان بکەنە لای ئەو (کەعبە)و فەرموویەتی: ﴿ وَإِنَّهُۥ لَلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَ ﴾ تەئکیدی کردۆتەوە بە (إنَّ) و بە (لام) (واتە: لامەکەی سەر ﴿ لَلۡحَقُّ ﴾ وای کردوە، ڕووی کردۆتە کەعبە نەک لە جێبەجێ کردنی فەرمانی بوویێ).

﴿ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ﴾ بەڵکو چاودێرە بەسەرتانەوە لە هەموو بارودۆخێکتاندا، لەگەڵی بە ئەدەب بن، چاودێربن بە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانیو دوورکەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکانی، بە ڕاستی لە کارو کردەوەکانتان بێ ئاگا نیە، بەڵکو سزاو پاداشت دەدرێنەوە لەسەریان بە تەواترین سزاو پاداشت، ئەگەر چاکە بێ، ئەوە چاکە دەبێ (پاداشتەکانتان)، وە ئەگەر خراپەش بێت ئەوە خراپ دەبێ.

لێرەوە فەرموویەتی: ﴿ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَيۡكُمۡ حُجَّةٌ ﴾ واتە: ڕووکردنە کەعبەی پیرۆزم بە فەرمانو شەرع بۆتان دانا، تا بیانوو ڕەخنەو بەڵگەی خەڵکی لە خاوەن کتێبەکانو هاوبەش

دانەرانتان لێ ببڕم، چونکە ئەگەر لەسەر ڕووکردنە (بیت المقدس) بمایەتەوە، ئەوە ڕەخنەو بەڵگەی ئاراستە دەبوو، خاوەن کتێبەکان لە کتێبەکانیاندا جێگیر بووە کە ڕووگەی چەسپیو دامەزراو بریتیە لە کەعبە، ماڵی حەرام، هاوبەش دانەرانیش وا دەبینن ئەوەی کە لە شانازی پێوە دەکەن ئەو ماڵە مەزنەیە (کەعبە)، کە ڕێبازی ئیبراهیمە، وە ئەگەر موحەممەد ﷺ ڕووی تێ نەکردایە، ڕەخنەیان ئاراستە دەکرد، دەیانوت: چۆن بانگەشەی ئەوە دەکات لەسەر ڕێبازی ئیبراهیمەو لە نەوەکانی ئەوە، لەگەڵ ئەوەشدا وازی لە ڕووکردنە ڕووگەی ئەو هێناوە؟ جا بە ڕووکردنە (کەعبە) بەڵگە کەوتە سەر خاوەن پەرتووکەکانو هاوبەش دانەرانو ڕەخنەو بیانوویان لەسەری نەما، تەنها ئەوانە نەبێ کە سنوور بەزێنو ستەمکارن لەوان، واتە: هەر یەکێکیان ڕەخنەو بیانوویەک بگرێت ئەوە ستەمکارو سنوور بەزێنە تێیدا، وە پشت ڕاستکردنەوەی نیە (بەڵگەی بۆ نیە) تەنها شوێن حەزوو ئارەزوو ستەم کەوتووە، جا ئەوە ڕێگا نیە بۆ قایل کردنیو بەڵگەهێنانەوە بەسەریەوە، بەهەمان شێوە ئەو بیانوو ڕەخنانەی ئەوان دەیهێننەوە مانای نیە کە ببێتە مایەی گوێ لێ گرتنو بایەخ پێدان، لەبەر ئەوەیە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿فَلَا تَخْشَوْهُمْ﴾، چونکە ڕەخنەو بیانووەکەیان پووچو ناڕەوایە، ناڕەواو پووچیش وەک ناوەکەی فەرامۆش کراوە، خاوەنەکەشی بەجێهێڵراوە، ئەمەش بە پێچەوانەی خاوەن هەقو ڕەوایەتیە بێگومان هەق هێزو شکۆی هەیە، ئەوەی شوێنی بکەوێ سامی دەبێتو لێی دەترسرێ، خوا ﷻ فەرمانی بە ترسان لە خۆی کردوە ئەو ترسەی کە بنچینەی هەموو چاکەیەکە، ئەو کەسەی لە خوا نەترسێو واز لە تاوانو سەرپێچیەکانی ناهێنێتو فەرمانەکەی جێبەجێ ناکات.

ڕوو وەرگێڕانی مسوڵمانان بەرەو کەعبە ئاشووبێکی گەورەی لێکەوتەوە، خاوەن پەرتووکەکانو دووڕووانو هاوبەش دانەران بڵاویان کردەوە، وە قسەی زۆرو گومانی زۆریان تێدا کرد، لەبەر ئەوەیە خوا ﷻ بە دوورو درێژی باسیکردو بە تەواوی ڕوونی کردەوە، دڵنیای لێکردەوە بە جۆرەها دڵنیاکردنەوە، کە ئەم دەقانە لە خۆیان گرتوە.

لەوانە: سێ جار فەرمانی پێکرد لە کاتێکدا یەک جار بەس بوو.

لەوانە: باسکراوو زانراو ئەوەیە کە فەرمان یان بۆ پێغەمبەرە ﷺ، کە ئەوکاتە ئۆممەتەکەشی دەگرێتەوە، بە شوێنکەوتنی، یان بە گشتی بۆ ئۆممەتەکەیە، لەو ئایەتەوە فەرمانی تایبەتی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کردوە، کە دەفەرموێ: ﴿فَوَلِّ وَجْهَكَ﴾ وە بە ئۆممەتەکەشی بە گشتی فەرموویەتی: ﴿فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ﴾.

لەوانە: هەموو ئەو ڕەخنەو بیانووە پووچانەی هێناوە کە کەللەڕەقو یاخی بووان هێناویانەتەوە، وە هەمووی ڕەتکردوەتەوە گومان بە گومان، وەک لە پێشدا ڕوونکراوەتەوە.

لەوانە: ئومێدی شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺی بڕی کە ڕوو بکاتە ڕووگەی خاوەن کتێبەکان.

لەوانە: فەرموودەی خوا: ﴿ وَإِنَّهُۥ لَلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ ﴾ تەنها هەواڵی ڕاستگۆی مەزن ئارامی بۆ دڵ دێنێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا فەرمووی: ﴿ وَإِنَّهُۥ لَلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ ﴾

لەوانە: خوا هەواڵیدا -کە ئەو زانایە بە پەنهانەکان- خاوەن کتێبەکان بە دڵنیایی ڕاستی ڕووکردنە کەعبەیان لەلا بڕاوەتەوەو دانی پیانراوە، بەڵام ئەوان ئەو شایەتیە دەشارنەوە لەگەڵ ئەوەی زانیارییان هەبوو.

لەبەر ئەوەی فەرمان پێدان بە ڕووکردنە ڕووگە، نیعمەتێکی گەورەیە، جا بەزەیی‌و لوتفی بەو ئۆممەتە بەردەوام لە زیادبوون دایە، هەر کاتێک یاسایەکی شەرعیان بۆ دادەنێ ئەوە نیعمەتێکی مەزنە، فەرموویەتی: ﴿ وَلِأُتِمَّ نِعْمَتِي عَلَيْكُمْ ﴾ بنەڕەتی نازو نیعمەت ڕێنماییە بۆ ڕێبازو ئایینیەکەی، بە ڕەوانەکردنی پێغەمبەرەکەی ﷺ دابەزاندنی کتێبەکەی، پاشان دوای ئەوە نیعمەتە تەواوکەرەکانی بۆ ئەو بنەڕەتە لەبەر زۆریان ناژمێردرێن‌و دەورنادرێن، لەو کاتەی خوا پێغەمبەرەکەی ﷺ ڕەوانە کردو گەشتی مردنی نزیکی کردەوە لە دنیادا، بێگومان خوا ﷻ نیعمەتی خۆی ڕشت بەسەریدا، بە ئۆممەتەکەشی بەخشی‌و نیعمەتەکەی خۆی لەسەر ئەوان تەواو کرد، کە بۆی دابەزاند: ﴿ ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ۚ ﴿٣﴾ ﴾المائدة، (واتە: ئەمڕۆ ئایین‌و ڕێبازەکەتانم بۆ تەواو کردن، نیعمەتی خۆمم بەسەرتان تەواوکرد، وە ڕازیم ئیسلام ئایین‌و ڕێبازتان بێ).

سوپاس‌و ستایش بۆ خوای شایستە لەسەر بەخششەکەی، کە ناتوانین سەرژمێریان بکەین، چ جای هەڵسان بە شوکرانە کردن لەسەریان، ﴿ وَلَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴾ واتە: هەق دەناسن‌و کاریشی پێ دەکەن، خوای بەرزو مەزن -لە بەزەیی بە بەندەکان- بێگومان هۆکارەکانی ڕێنمایی‌و هیدایەتی بۆ ئاسان کردوون، ئاگاداری کردوونەتەوە بۆ گرتنەبەری ڕێگاکانی، بە تەواوی بۆیانی ڕوونکردۆتەوە، تا بەوە گەیشتووە کە لە هەقو ڕەوایەتی، خوا کەللەڕەقانی داناوە کە دەمەدەمێی تێدا دەکەن، بە هۆیەوە هەق دەردەکەوێ، نیشانەو بەڵگەکانیشی ئاشکرا دەبن، وە پوچەڵی‌و ناڕەوایی دەردەکەوێ، کە ئەوە هیچ حەقیقەتی نیە، خۆ ئەگەر هەڵنەسایەت بە ڕوونکردنەوەی هەق، ڕەنگە حاڵو باری ناهەق بۆ زۆرینەی خەڵکی دەرنەکەوتبایە، بە دژو پێچەوانەکانی کاروبارەکان دەردەکەون‌و ڕوون دەبنەوە، خۆ ئەگەر شەو نەبووایە چاکی‌و

باشی ڕۆژ دەرنەدەکەوت، ئەگەر ناشیرنی نەبووایە پلەی جوانی بەدەر نەدەکەوت، ئەگەر تاریکی نەبووایە، سوودی ڕووناکی نەدەزانرا، ئەگەر ناڕەواو ناهەقی نەبووایە هەقو ڕاستیو ڕوونو ئاشکرا دەرنەدەکەوت، هەموو سوپاسو ستاشیەکان بۆ خوای شایستە لەسەر ئەوە (نیعمەتە زۆرانە).

(١٥١-١٥٢): ﴿ كَمَآ أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولًا مِّنكُمْ يَتْلُواْ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ تَعْلَمُونَ ﴿١٥١﴾ فَٱذْكُرُونِىٓ أَذْكُرْكُمْ وَٱشْكُرُواْ لِى وَلَا تَكْفُرُونِ ﴿١٥٢﴾ ﴾:

﴿ كَمَآ أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولًا مِّنكُمْ ﴾ خوا ﷻ فەرموویەتی: بێگومان لە بەخشینەکانمان بەسەرتانەوە، لە ڕووکردنە کەعبە، وە تەواوکردنیان بە یاساو شەرعو نیعمەتە تەواوکەرەکانێتی، ئەوە شتێکی زیادو تازە نیە لە چاکەکانمان، وە یەکەمیشیان نیە، بەڵکو بنەڕەتو تەواوی نیعمەتەکانمان پێ بەخشیون، باشترینی (نیعمەتەکانمان بەسەرتانەوە) ڕەوانەکردنی ئەو پێغەمبەرە بەرێزەیە ﷺ کە لە خۆتانە، کە ئێوە ڕەچەڵەکو ڕاستگۆیی، وە ئەمانەت پارێزیو پاکیو دڵسۆزیو ئامۆژگاریەکانی دەزانن‌و شارەزان.

﴿ يَتْلُواْ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِنَا ﴾ ئەمە دەقە قوڕئانیەکانو غەیری ئەوانیش دەگرێتەوە، کە ئەو ئایەتەکانتان بەسەردا دەخوێنێتەوەو هەقو ناهەق ڕوون دەکاتەوە، هیدایەت لە گومڕایی جیادەکاتەوە، سەرەتا یەکتاپەرستی خوای پێ پێشاندان، پاشان ڕاستگۆیی پێغەمبەرەکەی ﷺو پێویستی بڕوابوون پێی، پاشان هەواڵی دەربارەی گەڕانەوەو پەنهانەکان پێدان، تاکو ڕێنماییو زانیاری تەواو دڵنیاییتان بۆ دەستەبەر ببێ.

﴿ وَيُزَكِّيكُمْ ﴾ واتە: دڵو دەروونو ڕەوشتتان پاک دەکاتەوە، بە پەروەردە کردنتان لەسەر ڕەوشتی جوانو پاککردنەوەی لە ڕەوشتە نزمو ناشرینەکان، ئەوەش وەکو پاک کردنەوەیان لە هاوبەش بۆ خوا دانان، لە ڕووپامایی، بۆ دڵسۆزی، لە درۆوە بۆ ڕاستگۆیی، لە ناپاکی بۆ پاکیی، لە لووت بەرزی بۆ خاکی بوون، لە خراپی ڕەوشتو هەڵسو کەوت، بۆ جوان ڕەفتارییو ڕەوشتی جوان، لە ڕقو کینەو پشت لێکردنو پەیوەندی پچڕاندن، بۆ خۆشەویستیو بەیەک گەیشتنو شیرین بوونو سۆزداریی، جگە لەوانەش لە جۆرەکانی پاکبوونەوە (تزكية).

﴿ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَٰبَ ﴾ واتە: قوڕئان بێژەکانیو ماناکانی، ﴿ وَٱلْحِكْمَةَ ﴾ وتراوە: بریتیە لە فەرموودە، وە دەڵێن: (الحكمة)، شارەزابوونی نهێنیەکانی شەریعەتو تێگەیشتنە

تیایاندا، وە دانانی شتەکانە لە شوێنی خۆیان، لەسەر ئەمەوە فێربوونی فەرموودە دەچێتە نێو فێربوونی (قورئان)، چونکە فەرموودە، ڕوونکەرەوەی قورئانو تەفسیرو دەربڕینیەتی، ﴿ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُوا۟ تَعْلَمُونَ ﴾ چونکە ئەوان پێشهاتنی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر ﷺ لە گومڕاییەکی ڕوونو ئاشکرادا بوون، نە زانیارییان هەبوو نە کردەوە، هەر زانیاریی‌و کردەوەیەک کە ئەو ئوممەتە بە دەستی هێنابێ‌و پێی گەیشتبێ ئەوە لەسەر دەستی ئەو بووە، وە بە هۆی ئەوەوە بووە، ئەو نیعمەتە بریتی نیە لە گشت نیعمەتەکان بە ڕەهایی، بەڵکو ئەوە مەزنترین نیعمەتە لە بەخشینی (پەروەردگار) بۆ سەر بەندەکانی، کاری ئەوانیش شوکرانە کردنی خوایەو بەجێهێنانی فەرمانەکانیەتی.

لەبەر ئەوەیە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ فَٱذْكُرُونِىٓ أَذْكُرْكُمْ ﴾ خوا فەرمانی کردوە کە زیکرو یادی بکرێ، وە بەڵێنیشی داوە ئەوەی زیکرو یادی بکات، باشترین پاداشتی هەیە، بە هەمان شێوە زیکرو یادی دەکات، هەروەک لەسەر زمانی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {مَنْ ذَكَرَنِي فِي نَفْسِهِ، ذَكَرْتُهُ فِي نَفْسِي وَإِنْ ذَكَرَنِي فِي مَلإٍ، ذَكَرْتُهُ فِي مَلإٍ خَيْرٍ مِنْهُمْ} (أخرجه أحمد برقم: (٩٣٤٠)، والبخاري برقم: (٦٩٧٠)، ومسلم برقم: (٢٦٧٥)).

(واتە: ئەوەی لە دڵو دەروونیدا یادم بکات، منیش یادی دەکەم، ئەوەی لە ناو ئاوەدانی یادم بکات، من لە ناو ئاوەدانیەکی چاکتر لەوان یادی دەکەم).

باشترین جۆری یادی خوا ئەوەیە کە دڵو زمان بەیەکەوە یادی بکەن، ئەوەش بریتیە لەو یادەی کە ناسینی خواو خۆشەویستی خواو پاداشتی زۆری ئەو لێ بەرهەم دێت، یادو زیکر بریتیە لە چڵە پۆپەی شوکرانە بژێری، لەبەر ئەوەیە خوا بە تایبەت فەرمانی پێکردوە، لە پاش ئەوەی فەرمانی بە شوکرانەی گشتی کردوە، فەرموویەتی: ﴿ وَٱشْكُرُوا۟ لِى ﴾ واتە: لەسەر ئەو نیعمەتانەی، پێی بەخشیون، بەڵاو نارەحەتیەکانی لەسەرتان لاداوە، دەگونجێ شوکرانەبژێری نیعمەت بێ بە دڵ، (واتە: بە دڵ) دان بنێی بە نیعمەتەکان، بە زمانیش باس بکرێ‌و مەدح بکرێ، وە بە ئەندامەکانیش گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوا بکاتو ملکەچیان بێ، دووربکەوێتەوە لە قەدەغەکراوەکانی، شوکرانە بژێریی هۆکاری مانەوەی ئەو نیعمەتەیە کە هەیە، زیاد بوونیشە بۆ ئەو نیعمەتانەی ونو نادیارن، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ ۝٧ ﴾إبراهيم، (واتە: ئەگەر شوکرانە بژێربن) لە نیعمەتی خۆمتان بۆ زیاد دەکەم.

لە هێنانی فەرمان کردن بە سوپاسگوزاریی، لە دوای نیعمەتە ئاینیەکان، لە زانستو پاکبوونەوەی

ڕەوشتو سەرکەوتن بۆ کارو کردەوەکان، ڕوونکردنەوەیە کە ئەوانە مەزنترین نیعمەتەکانن، بەڵکو ئەوانە نیعمەتی ڕاستەقینەن کە بەردەوام دەبن ئەگەر غەیری ئەوان نەما، دەبێ ئەوانەی پشتگیری کراون بۆ زانست، یان کردار، ستایشی خوا بکەن لەسەری، تا لە بەخششی خۆی بۆیان زیاد بکات، وە سەرسام بوونیان بە خۆ لێ لاداو ڕەتبکاتەوە، تا بە سوپاسو ستایشەوە سەرقاڵ بن.

کاتێک کە سوپاسگوزاری دژەکەی بێبڕواییە، خوا دژەکەی قەدەغە کردوە، فەرموویەتی: ﴿ وَلَا تَكْفُرُونِ ﴾ مەبەست بە کوفر لێرەدا بەرانبەر بە شوکرە، ئەویش بریتیە لە کوفر کردن بە نازو نیعمەتەکانو نکوڵی کردنو بەجێنەهێنانیان، وە دەگونجێ ماناکەی گشتی بێ، جا جۆرەکانی کوفر زۆرن، مەزنترینیان کافر بوونە بە خوا، پاشان جۆرەکانی تاوانو گوناه بە هەموو جۆرو ڕەگەزەکانیەوە، لە شیرکو هاوبەش دانانو خواری ئەوە.

(١٥٣): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسْتَعِينُواْ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٣﴾ ﴾:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسْتَعِينُواْ ﴾ خوای بەرز فەرمانی بە بڕواداران کردوە کە پشت بەستووبنو کۆمەکی وەربگرن بۆ کارەکانی دینو دونیاییان لە ﴿ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ﴾، ئارامگرتن: بریتیە لە بەند کردنی دەروونو واز پێ هێنانی لەوەی کە پێی ناخۆشە، ئەو دەبێتە سێ بەشەوە: ئارامگرتنی لەسەر گوێڕایەڵی خواو جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی، (ئارامگرتن لەسەر) تاوانو سەرپێچی کردنی خوا تاکو وازیان لێ دێنێت، (ئارامگرتن لەسەر) ئەندازەو قەدەرەکانی خوا بە ئێشو ژان تاکو لێیان نەبێتەوە، جا ئارامی بریتیە لە یارمەتیەکی مەزن لەسەر هەموو کارێک، (مرۆڤ هیچ) ڕێگەیەکی نیە غەیری ئارامگری بۆ گەیشتن بە خواستەکانی، بە تایبەتی گوێڕایەڵیە قورسو گرانو بەردەوامەکان، بێگومان ئەو پێویستی بەوەیە ئەوپەڕی ئارام بگرێ لەسەر ناڕەحەتیەکان، جا ئەگەر خاوەنی (ئەو تاعەتە قورسانە) ئارامی بەردەوامی لەگەڵدابێ ئەوە سەرفراز دەبێ، ئەگەر ناخۆشیو بارقورسیەکانی ڕەت بکەنەوەو لابدەن لە ئارامیو بەردەوام بوون لەسەری بە هیچ ناگەنو لە دەستیان دەچێ، بە هەمان شێوە تاوانەکان ئەوانەی کە نەفسو دەروون حەزی پێدەکەن، وە لە توانای بەندەدایە، ئەوە وازلێهێنانی قورسو گرانە مەگەر بە ئارامی نەبێ، وە دەست هەڵبگرێ لە داواکاری دڵو پاڵنەرەکانی لە پێناوی خوادا، وە پشت بە خوا ببەستێو داوای کۆمەکی لێ بکات لە پاراستنی لە تاوانەکان، بە ڕاستی ئەوانە فیتنەی گەورەن، بە هەمان شێوە بەڵا قورسو گرانەکان، بە تایبەتی ئەگەر لەسەریان بەردەوام بێت، ئەوە هێزی دەروونیو جەستەیی لاواز دەکات سەرەنجام خواستەکانی دێنێتە

بوون، ئەگەر خاوەنەکەی بەربەرەکانێ نەکات بە ئارامگرتن، لەبەر خواو پشت بەستن پێیو پەنا بۆ بردنی بە بەردەوامی.

لە پاشان زانیت کە بەندە پێویستی بە خۆڕاگری هەیە، بەڵکو لە هەموو بارودۆخەکاندا ناچارە پەنای بۆ ببات، لەبەر ئەوەیە خوا ﷻ فەرمانی پێ کردوەو هەواڵیداوە کە ئەو ﴿مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ە، واتە: (خوا) لەگەڵ ئەوانەیە کە ئارامیو خۆڕاگری بۆتە ڕەوشتو سیفەت تێیاندابە پشتیوانیو یارمەتیو هاوکاری خوا، هەموو بارگرانیو قورسیەک لەسەریان دەڕواو نامێنێت، ئەمە پشتیوانی تایبەتی خوایە بۆ بەندەکەیو بوونیەتی لەگەڵیدا، کە خۆشەویستیو پاڵپشتیو سەرخستنیو نزیکبوونەوەی خوا وا دەخوازێ، ئەوە ستایشێکی مەزنە بۆ ئارامگران، جا ئەگەر ئارامگران هیچ پلەیەکی چاکەی تریان بۆ بەدەست نەهاتبایە تەنها ئەوەندە نەبێ، ئەوان سەرکەوتوو بوون بە بەدەستهێنانی ئەم لەگەڵ بوونە (المعية) لە لایەن خواوە بەس بوو بۆیان لە پلەو پایەو شکۆی بەرز، بەڵام لەگەڵ بوونی گشتی بریتیە لە لەگەڵ بوونی زانیاریو توانا (العلم والقدرة)، هەروەک لە فەرموودەی خوا ﷻ هاتوە، دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ مَعَكُمۡ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡ ٤﴾الحديد. (واتە: خوا لەگەڵتانە (بە زانیارییو بە توانای) لە هەر شوێنێک بن)، ئەوە گشتییە بۆ هەموو بەدیهێنراوان.

خوا ﷻ فەرمانی کردوە بە پشت بەستنو کۆمەکی وەرگرتن لە نوێژ، چونکە نوێژ بریتیە لە کۆڵەکەی دینو ڕووناکی بڕواداران، ئەوە پەیوەندی نێوان بەندەو پەروەردگارێتی، ئەگەر نوێژی بەندە نوێژی تەواو بێ، هەموو فەرزو سوننەتەکانی تێدا کۆببێتەوە، وە دڵ تێیدا ئامادە بێت کە کاکڵەی نوێژە، جا ئەگەر چووە ناو نوێژەوە هەست بکات لە خزمەتی خوادایەو وەک بەندەیەکی بە ئەمەکو دڵسۆز لە خزمەتی خوادا ئامادە بێ، بە موناجاتو نزاو پاڕانەوەکانی، ئەوە بێگومان ئەو نوێژە لە مەزنترینی کۆمەکەکانە بۆ هەموو کارەکان، بەڕاستی نوێژ ڕێگری دەکات لە خراپەو تاوان، چونکە ئەو ئامادەبوونەی لە ناو نوێژدا ئەوە پێویست دەکات کە بەندە بە دڵ فەرمانەکانی پەروەردگاری جێبەجێ بکات، وە دوور بکەوێتەوە لە قەدەغە کراوەکانی، ئا ئەوە ئەو نوێژەیە کە خوا فەرمانی پێکردوە، پشتی پێ ببەستن لە هەموو کاروبارەکاندا.


وَلَا تَقُولُواْ لِمَن يُقۡتَلُ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتُۢۚ بَلۡ أَحۡيَآءٞ وَلَٰكِن
لَّا تَشۡعُرُونَ (١٥٤) وَلَنَبۡلُوَنَّكُم بِشَيۡءٖ مِّنَ ٱلۡخَوۡفِ وَٱلۡجُوعِ
وَنَقۡصٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِۗ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ (١٥٥)
ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ
(١٥٦) أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ صَلَوَٰتٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَرَحۡمَةٞۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ
هُمُ ٱلۡمُهۡتَدُونَ (١٥٧) إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلۡمَرۡوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِۖ
فَمَنۡ حَجَّ ٱلۡبَيۡتَ أَوِ ٱعۡتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَاۚ
وَمَن تَطَوَّعَ خَيۡرٗا فَإِنَّ ٱللَّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ (١٥٨) إِنَّ ٱلَّذِينَ
يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلۡنَا مِنَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلۡهُدَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا بَيَّنَّٰهُ
لِلنَّاسِ فِي ٱلۡكِتَٰبِ أُوْلَٰٓئِكَ يَلۡعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلۡعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ
(١٥٩) إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ وَأَصۡلَحُواْ وَبَيَّنُواْ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَتُوبُ عَلَيۡهِمۡۚ
وَأَنَا ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ (١٦٠) إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَمَاتُواْ وَهُمۡ
كُفَّارٌ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ لَعۡنَةُ ٱللَّهِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجۡمَعِينَ
(١٦١) خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يُخَفَّفُ عَنۡهُمُ ٱلۡعَذَابُ وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ (١٦٢)
وَإِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلرَّحۡمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ (١٦٣)

(١٥٤): ﴿وَلَا تَقُولُواْ لِمَن يُقۡتَلُ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتُۢۚ بَلۡ أَحۡيَآءٞ وَلَٰكِن لَّا تَشۡعُرُونَ (١٥٤)﴾:

کاتێـک کـە خـوای مـەزن فەرمانـی کرد بـە پشـت بەسـتن بـە ئارامـی لـە هەمـوو کاروبـارەکان، نموونەیەکـی باسـکرد کـە پێویسـتە پشـت بە ئارامی ببەسترێ لە سەری: ئەویـش جیهـادو تێکۆشـانە لە پێنـاو خوادا، کـە بریتیە لـە گەورەتریـن گوێڕایەڵیەکانی جەسـتە، وە قورسـترینو گرانتریـن تاعەتـە لەسـەر دڵو دەروونـەکان، چونکـە خۆی لە خۆیدا قـورسو گرانـە، لەبەر ئـەوەی بەرەو کوشـتنو لە ناوچـوون دەیبات، ئـەوەی کە حەزلێکـەران حـەز دەکـەن لـەم دونیایـەدا بژیـنو پێویسـتیەکانی بەدەسـت بهێنن، هەمـوو ئەوانەی کاری بـۆ دەکەن تەنها کۆششـە بۆ دنیـاو، وە بەرپەرچدانەوەیـە بـۆ دژەکەی.

شـتێکی زانراویشـە کـە بە ڕاسـتی کەسـی ژیـر، واز لـە خۆشویسـتراوی ناهێنـێ، مەگەر بۆ خۆشویسـتراوێکی بـەرزو مەزنتـر لـەو، خـوای بـەرز هەواڵیـداوە، ئـەوەی لـە پێنـاوی ئـەو دەکـوژرێ کـە کوشـتاری کـردوە لە پێنـاو خوا تاکـو وشـەی خـوا (توحیـد) بەرزبێتەوە، ئاییـنو ڕێبازەکـەی دیـار بکـەوێو ئاشـکرابێت، نـەک لە پێنـاو مەبەسـتێکی دیکەی جگە لەوانـە، ئـەو ژیانـی خۆشویسـتراوی لە دەسـت نەچـووە، بەڵکـو ژیانێکـی تـەواوو مەزنتری بـۆ دەسـتەبەر بـووە، لـەوەی ئـەوان گومـانو خەیاڵـی پێ دەبـەنو حیسـابی بۆ دەکـەن، چ (خـوا دەربـارەی) شـەهیدەکان (دەفەرمـوێ): ﴿وَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتَۢاۚ بَلۡ أَحۡيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمۡ يُرۡزَقُونَ (١٦٩) فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ وَيَسۡتَبۡشِرُونَ بِٱلَّذِينَ لَمۡ يَلۡحَقُواْ بِهِم مِّنۡ خَلۡفِهِمۡ أَلَّا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ (١٧٠) يَسۡتَبۡشِرُونَ بِنِعۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضۡلٖ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ (١٧١)﴾ آل عمـران (واتـە: شـەهیدەکان زیندوون لەلای پەروەردگاریـانو ڕزقو ڕۆزی دەدرێـن، دڵخۆشـن بەوەی خوا لە بەخششـی خـۆی پێ داونو

مـوژدەش بەوانـە دەدەن کـە لـە دوای خۆیانو پێیان نەگەیشـتوون، هیچ ترسـێکیان لەسـەر نیـەو غەمباریـش نین، مـوژدە دەدەن بەو نیعمەتە لـە خواوە پێیان دراوە، بە ڕاسـتی بـڕواداران بـە فیڕۆ نـادات).

ئایـا (ژیان)ێـک هەیـە مەزنتـر بـێ لـەو ژیانەی کـە نزیـک بوونەوەیە لـە خوای بـەرز، وە تـامو چێـژ وەرگرتنیان بـە ڕزقو ڕۆزی جەسـتەیی لە خـواردنو خواردنەوە بـە تامەکان، وە ڕۆزی ڕووحـی کە ئەوانیش دڵخۆشـیو شـادمانیو موژدەکانن، نەمانی هەرچـی ترسو غەمە، ژیانـی دوای مـردن بەرزەخـە کـە تەواوتـرە لە ژیانـی دونیـا، بەڵکـو بێگومـان پێغەمبەر ﷺ هەواڵیداوە، ڕووحی شـەهیدان لە بۆشـاییو قەپێلکی باڵندە سـەوزەکانو دەچنـە ڕووبارەکانی بەهەشـت، لـە بەروبوومەکانی دەخـۆنو، دەچن بـەرەو لای لاڵەو چـراکان، کە هەڵواسـراون بە بارەگـای خوا.

لـەم ئایەتـەدا مەزنتریـن هاندان هەیە بۆ جەنگو تیکۆشـان لە پێنـاو خواو بـەردەوام بوونی بە ئارامـی لەسـەری، ئەگەر بەندە هەسـت بـەوە بکات کە چ بۆ کـوژراوان لە پێنـاوی خوا هەیە، لـە پاداشـت ئەوە کـەس لێی دواناکەوێـت، بـەڵام نەبوونی زانیاریـی دڵنیاکەرەوە لە پاداشـتە مەزنـەکانو دەسـتکەوتەکانە، خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱشۡتَرَىٰ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَنفُسَهُمۡ وَأَمۡوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلۡجَنَّةَۚ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيَقۡتُلُونَ وَيُقۡتَلُونَ ١١١﴾التوبـة، (واتـە: بێگومـان (خـوا) لـە بڕوادارانی کڕیـوە گیانیـانو سـامانیان، بەوە کە بەهەشـتی بـۆ دانانو کوشـتار دەکەن لـە پێناو خـوا، دەکوژنو دەشـکوژرێن).

سـوێند بـە خـوا ئەگـەر مـرۆڤ هـەزار گیانـی هەبێ، یـەک لـە دوای یـەک لە پێنـاو خوا بیبەخشـێ، کارێکـی گـەورە نیە لە بەرانبەر ئەو پاداشـتەی خـوا، جا کە پاداشـتەکەیان دەبینن خۆزگـەی هیچ ناخـوازن مەگەر ئەوە نەبـێ کە بگەڕێنرێنـەوە دونیا، تاکو بکوژرێـن لە پێناو خـوا، جار لـە دوای جار.

لـەم دەقەدا بەڵگە هەیە لەسـەر نازو نیعمەتی ژیانـی دوای مردن (بەرزەخ)و سـزاو ئازارەکانی، هەروەکو دەقەکان دەربارەی ئـەوە زۆرو زەوەندن.

(١٥٥-١٥٧): ﴿وَلَنَبۡلُوَنَّكُم بِشَيۡءٖ مِّنَ ٱلۡخَوۡفِ وَٱلۡجُوعِ وَنَقۡصٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِۗ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ١٥٥ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ١٥٦ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ صَلَوَٰتٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَرَحۡمَةٞۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُهۡتَدُونَ ١٥٧﴾:

﴿وَلَنَبۡلُوَنَّكُم﴾ خـوا ﷻ هەواڵیـداوە دەبـێ بەندەکانـی بە بـەڵاو نارەحەتی تاقـی بکاتەوە،

تـا ڕاسـتگۆ لـە درۆزن جیاببێتـەوە، وە کەسـی ئـارام نەگـر لـە ئارامگـر جیاببێتەوە، ئـا ئەوە سـوننەتی خـوای بەرزە لـە بەندەکانیدا، چونکـە ئەگەر خۆشـیەکان بەردەوام بن بـۆ ئیمانداران بـێ ئـەوەی تووشـی بـەڵا بـن، تێکـەڵاوی دروسـت دەبـێ کـە ئـەوەش بریتیە لـە خراپ، حیکمەتـی خـوا ئەوە دەخـوازێ کە چاکـەکارانو خراپەکاران لـە یەکتر جیاببنـەوە، ئەمەش سـوودی تاقیکردنـەوەی بەڵایـە، نـەک لادانو نەمانی ئەوەی لـەلای برواداڕانە لـە ئیمان، یان هەڵگەڕانەوەیـان لـە ئایینەکەیـان، خـوا بـڕوای بـڕواداران بـە فیرۆ نـادات، لەم ئایەتـەدا خوا هەواڵیـداوە کـە بەندەکانـی خـۆی تاقـی دەکاتەوەو تووشـی بـەڵاو نارەحەتیـان دەکات (بە چەنـد شـتێک): ﴿بِشَيْءٍ مِّنَ الْخَوْفِ﴾ لە دوژمنـان ﴿وَالْجُوعِ﴾ واتە: بە شـتێکی کەم لێیان لـە (تـرسو برسـیەتی)، چونکـە ئەگەر بـە هەموو ترسـەکان، یان برسـیەتیەکان بـێ ئەوە لە نـاو دەچن، بـەڵاو تاقیکردنـەوەکان جیاکـەرەوەنو پاککەرەوەن نـەک لەناوبەر.

﴿وَنَقْصٍ مِّنَ الْأَمْوَالِ﴾ ئەمـەش هەمـوو کەم کردنەوەکان دەگرێتەوە کە تووشـی سـامانو مـاڵ دەبـن، لـە بـەڵا لـە ناوبەرەکانی ئاسـمان، (یـان) نوقم بـوونو لەنـاو چـوون، وە بردنی سـامانو ماڵیـان لەلایەن دەسـەڵاتدارە سـتەمکارەکانو ڕێگرەکانـی ڕێگاو غەیـری ئەوانیش.

﴿وَالْأَنفُسِ﴾ واتە: لە دەسـتدانی خۆشەویسـتیانە لە منداڵانو کەسـە نزیکـەکانو هاوەڵان، وە هەمـوو جۆرەکانی نەخۆشـی لەلاشـەی مـرۆڤ، یان لە لاشـەی ئەوەی کە خۆشـیدەوێت.

﴿وَالثَّمَرَاتِ﴾ واتـە: دانەوێڵـەکان، بەروبوومی خورماو دارو درەختەکان سـەوزاییو گشـت سـەرمایەکان، کـە تەزرە، یان سـەرمایەکی توونـد، یان سـوتان، یان هەر بەڵایەکی ئاسـمانی لـە کوللەو نموونـەی ئەویش (تووشـیان دەبێ).

ئەو شـتانە دەبـێ ڕوودەن، چونکە خـوای کارزان هەواڵی پێـداون، ڕوویانـداوە، وەک چۆن هەواڵیـدا ڕوویانـدا، جـا ئەگـەر ڕووبـدات خەڵکـی دەبنـە دوو بەش: بـێ ئـارامو ئارامگران، ئـارام نەگـر دوو بەڵای بـۆ پەیدا بووە لە دەسـتدانی خۆشەویسـت -ئەویـش هاتنەکایەی ئەو بەڵایەیـە- لـە دەسـتدانی مەزنتریش لەو کـە پاداشـت دانەوەیە بـە جێبەجێ کردنـی فەرمانی خـوا بـە ئارامگرتـن، سـەردەکەوێ بـە زەرەرمەنـدیو بێبەش بوون، کـەم بوونـەوەی ئەوەی هەیەتـی لە ئیمـان، ئارامیو ڕەزا بوونو شـوکرانەی لە دەسـت چـووەو خەشـمو تووڕەیی بۆ دەسـتەبەر دەبێ کـە بەڵگەیە لەسـەر ئەوپـەڕی ناتەواوی.

بـەڵام ئـەوەی خـوا پشـتگیری کردبـێ بـۆ ئارامگران لـە پەیـدا بوونی ئـەو بەڵایانـە، خۆی دەگـرێ لە ناخۆشـی بە قسـەو کـردار، چاوەڕوانی پاداشـتە کە دەکات لەلای خـوا، وە دەزانی

کـە ئـەوەی بـە دەسـتی هێنـاوە لە پاداشـت بـە ئارامگرتنەکـەی، مەزنتـرە لـەو بەڵایەی کە تووشـی هاتـووە، بەڵکـو بەڵایەکـە نیعمەتە بۆ ئـەو، چونکە بۆتـە ڕێگا بۆی بۆ بەدەسـتهێنانی ئـەوەی چاکتـرە بـۆی‌و سودبەخشـترە بـۆی، بێگومـان ئـەو پابەنـد بووە بـە فەرمانـی خوا، سـەرکەوتوو بـووە بە پاداشـت، لەبـەر ئەوەیە خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ وَبَشِّرِ ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴾ واتـە: موژدەیان پـێ بدە بەوەی ئەوان پاداشـت بەبێ حیسـاب وەردەگرن، ئارامگـران ئەوانەن کـە سـەرفراز بـوون بـە مـوژدەی مـەزن‌و خەڵاتـی گـەورە، لە پاشـان وەسـفی کـردن بە فەرمـوودەی خـۆی: ﴿ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَـٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٌ ﴾ بریتیـە لـە هـەر کاروبارێـک، کە دڵ، یـان لاشـە، یـان هەردووکیان ئـازار بـدات، لەوانەی کە پێشـتر باسـکران.

﴿ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ ﴾ واتـە: بەنـدەی ژێـر دەسـتی فەرمانەکانـی خـوای مەزنـن، لە ژێـر فەرمان‌و کارەکانـی ئـەودا بەڕێـوە دەچن، هیچ بـۆ ئێمە نیـە، ئەگەر بە شـتێک لەوانە تاقـی بکرێنەوە، ئـەوە بێگومـان خـوای بـە بەزەیـی هەڵسـوکەوت بـە بەندەکانی‌و سـەروەت‌و سـامانەکانیان دەکات، کـەس ناتوانـێ ڕەخنەی لـێ بگرێـت، بەڵکو لە تەواوێتـی‌و بەندایەتـی کردنی بەندە بـە زانیـن‌و زانیاریەتی، بـەوەی کە هـەر بـەڵاو ناڕەحەتیەک بێت ئـەوە لە لایـەن خاوەنێکی کار لـە جێیـە، کـە بە بەزەییترە بـە بەندەکەی لە خۆی، پێویسـتە لەسـەری ڕازی بـێ لە خواو شـوکرانەی بـکات، لەسـەر بەڕێوەبـردن‌و کار ڕاپەڕاندنەکانـی، ئـەوە چاکترە بـۆ بەندەکەی ئەگـەر هەستیشـی پـێ نـەکات، لەگـەڵ ئـەوەی ئێمـە لە ژێـر دەسـەڵات‌و فەرمانـی خوای مەزنیـن‌و بـۆ لای ئـەو دەگەڕێینەوە، لـە ڕۆژی دواییدا هەر کەسـەو بەپێی کردەوەکەی سـزا وەردەگرێـت، ئەگـەر ئارامـمـان گـرت‌و بـە ئومێدی پاداشـت بووین، پاداشـتمان لـەلای ئەو بـە تـەواو فرەوانـی دەبینین، ئەگـەر بـێ ئارامیش بوویـن‌و دڵتەنـگ بووین‌و پێمـان ناخۆش بـوو تەنهـا بەشـمان دەبێتـە دڵتەنگـی‌و لە دەسـتدانی پاداشـت، جـا کە بەنـدە هی خـوا بێ‌و گەڕانەوەشـی هـەر بـۆ لای ئەو بێـت، ئەوە لـە بەهێزتریـن هۆکارەکانـی ئارامگرتنە.

﴿ أُوْلَـٰٓئِكَ ﴾ ئەوانـەی وەسـفکراون بـەو ئارامیەی باسـکراوە، ﴿ عَلَيۡهِمۡ صَلَوَٰتٞ مِّن رَّبِّهِمۡ ﴾ واتـە: پیاهەڵـدان‌و بەرزکردنەوەیـان بە حاڵو باریـان، ﴿ وَرَحۡمَةٞ ﴾ (بەزەییەکـی) مەزن، لە بەزەیـی خـوا ئەوەیـە کە پشـتیوانی لـێ کـردوون‌و ئارامی پـێ بەخشـیون، کە بـەو هۆیەوە پاداشـتیان دەسـت دەکەوێت، ﴿ وَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُهۡتَدُونَ ﴾ ئەوانەی هەق‌و ڕاسـتیان ناسیوە -ئـەوەش لـەم شـوێنەدا دەزانـن کە ئـەوان هی خـوان، وە ئـەوان بـۆ لای ئـەو دەگەڕێنەوە- کارو کردەوەشـیان پـێ کـردوە، ئـەو ئارامیەیان لێـرەدا لە پێنـاو خوایە.

ئـەم دەقـە بەڵگەی ئـەوەی تێدایە هەر کەسـێک ئـارام نەگرێت، ئـەوە بە پێچەوانـەی ئەوانی بـۆ دەبـێ، سەرزەنشـتکردنو تۆڵـەو گومڕایـیو زەرەربـاری لە لایەن خـواوە بـۆ دەبێت، چ جیاوازیەکـی مـەزن هەیە لە نێـوان ئەو دوو دەسـتەدا، چ ماندوبوونێکی گەورەی ئـارام گرانە!!
ئـەو دوو ئایەتە ڕاهێنانو ئاسـان کردنی بەڵاکانە لەسـەر دڵو دەروون پێش ئـەوەی ڕووبدەن، تاکو سـووکو ئاسـان بێـت کـە ڕوودەدات، ڕوونکردنـەوەی بەرانبەرەکەی کـە ڕوودەدات ئەویـش ئارامییـە، وە ڕوونکردنـەوەی ئـەوەش کـە یارمەتیـدەر دەبێ لەسـەر ئارامـی، ئەوەی هەیـە لـە پاداشـت بۆ ئارامگـر، تا حاڵو بـاری جگە لـە ئارامگرتن بزانـرێ بـە پێچەوانەوەی حاڵو بـاری ئارامگر.
بـە ڕاسـتی ئەم تاقیکردنەوەو بەڵا بە سـەرهێنانە سـوننەتی خوایـە، تێپەڕی کردوەو ڕۆیشـتوە، نابینی کە سـوننەتی خـوا (هەرگیز) بگـۆڕدرێ، وە ڕوونکردنـەوەی جۆرەکانی بەڵاکان.
(١٥٨): ﴿ إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلۡمَرۡوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِۖ فَمَنۡ حَجَّ ٱلۡبَيۡتَ أَوِ ٱعۡتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَاۚ وَمَن تَطَوَّعَ خَيۡرٗا فَإِنَّ ٱللَّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ ١٥٨ ﴾:
﴿ إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلۡمَرۡوَةَ ﴾ خـوای بـەرز هـەواڵ دەدا کـە بـە بێگومـان صەفـاو مـەڕوە کـە هەردووکیـان ناسـراون ﴿ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ﴾ واتـە: لـە نیشـانەکانو درووشـمی ئایینـی دیارو ئاشـکران، ئەوانـەی کـە خـوا بـە هۆیانـەوە بەندایەتی لـە بەندەکانـی وەردەگرێ، جـا ئەگەر ئـەوان درووشـمەکانی خوا بن، بێگومـان خوا فەرمانی کـردوە بەرز ڕاگرتنی درووشـمەکانی فەرموویەتـی: ﴿ ذَٰلِكَۖ وَمَن يُعَظِّمۡ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقۡوَى ٱلۡقُلُوبِ ٣٢ ﴾ الحج، واتـە: کـۆی هـەردوو دەقەکـە ئەوە دەسـەلمێنن کـە لە دروشـمەکانی خوای بـەرزو مەزنـن، وە بە گـەورە ڕاگرتنـی دروشـمەکانی لە پارێزگـاریو لە خـوا ترسـانی دڵەکانە.
خۆپارێزیو لە خوا ترسـان پێویسـتە لەسـەر هەمـوو ئەرک پێسـپێردراوێک (مکلـف)، ئەوە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی کـە هاتووچـۆی نێوانی صەفـاو مـەڕوا، پێویسـتیە کە پەیوەسـتە بە حـەجو عەمرە هەروەکو ئـەوەی زۆربەی زانایان ئـەوە ڕایانە، فەرموودەکانـی پێغەمبەریش ﷺ بەڵگـەن لەسـەری، وە پێغەمبەر ﷺیش وای کـردوە، وە فەرموویەتی: {خُـذوا عَنِّي مَنَاسِـكَكُم} (أخرجـه مسـلم: (٣١٣٧)، وأحمـد برقـم: (١٤٤١٩)، عـن جابـر رضي الله عنه).
واتە: پەرستشو کارو درووشمەکانی حەجی ماڵی خوا لە منەوە وەرگرن.
﴿ فَمَنۡ حَجَّ ٱلۡبَيۡتَ أَوِ ٱعۡتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَاۚ ﴾ ئەمـە پاڵنەرێکـە بـۆ ئەو گومـانو دوو دڵیـەی کە مسـوڵمانان هەیانبـوو، دەربـارەی (طـواف)ی نێوان صەفـاو مەڕوە،

چونکـە لەسـەردەمی نەفامیـدا بـە دەوری بتەکاندا دەسـوڕانەوەو دەیانپەرسـتن، خـوای گەورە ئـەو گومـانو دوو دڵیەی لەسـەریان لابـرد، بەڵگە لەسـەر بەسـتنەوەی نەفیکردنـی گوناح بۆ ئـەو کەسـەی (طـواف)ی نێوان صەفاو مـەروە دەکات لە حـەجو عومرەدا، ئەو بـە تەنها هاتوو چـۆ نـاکات، مەگەر لە حـەج یان عومـرە کردن، بـە پێچەوانـەی سـوڕانەوەی دەوری کەعبە (طـواف) کـە لەگـەڵ حەجو عومـرە دەکـرێ، ئەوە پەرسـتنێکە بە تەنهـا دەکرێ.

بـەڵام هەرچی هاتووچـۆی نێوان صەفاو مەروەیە، وە وەسـتان لە عەرەفەو موزدەلیفەو شـەیتان ڕەجـم کردنە، ئەوانە پەیوەسـتن بـە حەجەوە، ئەگەر لەگـەڵ کارەکانی حەج نەکـرێ لەوانەیە بـە تەنهـا بیکەن، نـەک لەگەڵ حـەج، ئـەو کات دەبێتە بیدعـەو داهێنراو، چونکـە بیدعە دوو جـۆرە: جۆرێکیـان بەندایەتـی خـوای پێدەکـرێ، بەبـێ ئـەوەی خوا بڕیـاری لەسـەر دابێت، ئەمـەش لـەو جۆرەیـە ﴿ وَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَإِنَّ ٱللَّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ ﴾، واتـە: عیبـادەت کـردن بە دڵسـۆزیەوە بـۆ خـوا ﴿ خَيْرًا ﴾ لە حـەجو عومـرەو (طـواف)، وە نوێـژو ڕۆژو هاوشـێوەی ئەوانـە، ﴿ فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ ﴿١٨٤﴾ ﴾البقـرة. ئەمـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی بەنـدەی خـوا تـا زیاتر عیبادەتـی خـوا بـکات، خێرو پاداشـتو پلـەو پایەی زیاتـر دەبێت.

وە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی کـورت هەڵهێنانـی (التطـوع) بە خێـرو چاکە، هەر کەسـێک لە خواپەرسـتیدا بیدعـەو داهێنانێـک بکات، کـە خواو پێغەمبەرەکـەی دایان نەنابـێ، ئەوە هیچی دەسـت ناکـەوێ جگە لـە ماندوو بوون، وە خێرو چاکەیشـی دەسـت ناکـەوێ، بەڵکو هەندێ جـار تووشـی خراپـەو گوناهیش دەبێ لەسـەری، ئەگـەر بزانێو بـە ئەنقەسـت ئەنجامی بدات ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ ﴾ (الشـاكر، الشـكور) لـە نـاوە پیرۆزەکانـی خوان، ئـەو خوایەی کە کردەوەیەکـی کەم لە کردەوەکانـی وەردەگرێو لە بەرانبەردا پاداشـتێکی مەزنیـان دەداتەوە، ئەگـەر بەندەکـەی فەرمانەکانـی جێبەجـێ بـکات، ئەویـش پشـتیوانی لێدەکاتو وەسـفو پیاهەڵدانـی دەکات، نـورو ئیمـان دەخاتە نـاو دڵیەوەو جەسـتەی بەهێزو چـالاک دەکات، وە بەرەکـەت دەخاتـە نـاو کاروبارو ژیانیەوە لـە هەموو ڕوویەکـەوە، لە پاش ئەوە لـە داهاتوودا پاداشـتی تـەواوی دەداتـەوە بەبێ کـەمو کورتـی، وە لە سوپاسـگوزاریەکانی بـۆ بەندەکەی، ئـەوەی کـە لەبـەر خاتـری خـوا واز لە شـتێک بهێنـێ، ئەوە خـوای گـەورە لە بـری ئەوەدا شـتێکی باشـتری پێدەبەخشێ، وە هەر کەسـێک بسـتێ لە خوا نزیک ببێتەوە، ئەوە خوا باڵێک لـەو بەنـدە نزیـک دەبێتەوە، ئـەوەی بە ڕێکردن بـێ بۆ لای خـوا، ئەوە ئەویش بـە پەلە بەرەو ڕووی دێ، هـەر کەسـێک کاری بـۆ بکات بە چەندین قات پاداشـتی دەداتـەوە، لەگەڵ ئەوەدا

ئـەو سوپاسـگوزارە بە هەمان شـێوە زاناشـە بەو کەسـەی کە شایسـتەی پاداشـتی تـەواوە، بە پێـی نیـەتو بـڕواو لـە خواترسـانی، بەڵکـو دەیبیننەوە لـەوە زیاتر بـە پێـی نیەتەکانیان، کە ئاگـادارە بەسـەریدا خوای زانـاو کاربەجێ.

(١٥٩-١٦٢): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلۡنَا مِنَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلۡهُدَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِي ٱلۡكِتَٰبِ أُوْلَٰٓئِكَ يَلۡعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلۡعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ ﴿١٥٩﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ وَأَصۡلَحُواْ وَبَيَّنُواْ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَتُوبُ عَلَيۡهِمۡ وَأَنَا ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَمَاتُواْ وَهُمۡ كُفَّارٌ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ لَعۡنَةُ ٱللَّهِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجۡمَعِينَ ﴿١٦١﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يُخَفَّفُ عَنۡهُمُ ٱلۡعَذَابُ وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ ﴿١٦٢﴾ ﴾

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلۡنَا ﴾ ئـەم ئایەتـە هەرچەندە دەربارەی خاوەن کتێبـەکان دابەزیوە، وە ئـەوەی کـە شـاردیانەوە دەربـارەی پێغەمبـەر ﷺ بـەڵام بڕیـارو حوکمەکەی گشـتییە بۆ هەمـوو ئەوانەی وەسـف دەکرێن بە شـاردنەوەی ئـەوەی خوا دایبەزانـدوە، ﴿ مِنَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ ﴾ بەدەرخـەری هەقو ڕاسـتیەو ئاشـکرای دەکـەن، ﴿ وَٱلۡهُدَىٰ ﴾ بریتیە لەو زانسـتەی ڕێنمایی بـەرەو ڕێگـای ڕاسـتی پێوە دەسـتەبەر دەبـێ، ڕێگای خـاوەن خۆشـیو نازو نیعمەتـەکان لە ڕێگـای خـاوەن ئاگـرو دۆزەخیانی پێـوە دەردەکەوێـت، خوا بەڵێـنو پەیمانـی وەرگرتوە لە خـاوەن زانسـتەکان، کـە ڕوونی بکەنـەوە بۆ خەڵکی ئـەوەی خـوا منەتی کردوە بەسـەریاندا لـە شـارەزابوونی کتێب نەیشـارنەوە، جا ئەوەی ئەوە هەڵبوەشـێنێتەوەو دوو خراپەو لە سـنوور دەرچـوو کۆبکاتـەوە: شـاردنەوەی ئـەوەی خـوا دایبەزانـدووە، ناپاکیو غەش کـردن لەگەڵ بەندەکانـی خـوا، ئا ئەوانـە ﴿ يَلۡعَنُهُمُ ٱللَّهُ ﴾ واتە: خـوا دەریـان دەکاو دووریـان دەخاتەوە لە بەزەیـیو میهرەبانی خۆی.

﴿ وَيَلۡعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ ﴾ ئـەوان هەمـوو بەدیهێنراوانـن، نەفرینـی هەمـوو بەدیهێنـراوەکان دەکەوێتـە سـەریان، لەبـەر هـەوڵو کۆشـش کردنیان لە غـەشو ناپاکـی لەگـەڵ خەڵکیو تێکـدانو خـراپ کردنی ڕێبـازو ئاینەکانیان، وە دوور خسـتنەوەیان لە بەزەیی خوا، پاداشـت درانـەوە لـە جـۆری کردەوەکانیـان، هەروەکـو فێـرکاری خەڵکـی بـە چاکـەو خێـر، خواو فریشـتەکان تا ماسـیو نەهەنگەکانی ناو دەریا دوعـای خێریان بۆ دەکەنو پیایـان هەڵدەدەن، لەبـەر هەوڵو کۆششـیان لـە پێناو بەرژەوەنـدی خەڵکیو چـاک کردنی ڕێبـازو ئاینەکانیان، وە نیزیـک بوونەوەیـان لـە بەزەیـی خوا پاداشـت دەدرێنەوە بـە پێـی کردەوەکانیان.

هەرکەسـێ ئەوەی خـوا دایبەزاندوە بیشـارێتەوە، ئەوە دژی فەرمانی خوایـەو دوژمنیەتی، خوا

ئایــەتو بەڵگەکانی بۆ مــرۆڤ دەردەخاو ڕوونیــان دەکاتەوە، ئەمەش دەیانســڕێتەوەو خەڵکی لێیــان کوێــر دەکات، ئەم کەســە هەرەشــەیەکی توونــدی لەســەرە ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ ﴾ واتە: گەڕانــەوە بە پەشــیمان بوونەوە، پشــتیان هەڵکــرد لەو تــاوانو گوناهانەی لەســەری بوون، وە پێداگریــان کــرد لەســەر نەگەڕانــەوەو دووبــارە نەبوونەوەیــان ﴿ وَأَصۡلَحُواْ ﴾ لــەو کردەوە خراپانــەی کردبوویــان، تەنهــا وازهێنان لە ناشــیرینو خراپە بــەس نیە، تــا کاری چاکە نەیەتە بەرهەم.

بەهەمــان شــێوە بەس نیە بۆ ئەو کەســەی کە شــاردویەتیەوە، تا ئــەوەی شــاردویەتیەوە دەری نەخــاتو پێچەوانــەی ئــەوە نەجوڵێتــەوە، ئەمــە خــوا گەڕانەوەکەی لــێ وەردەگــرێ، چونکە تۆبــەی خــوای لــێ قەدەغــە نەکــراوە، ئەگــەر ئــەو هــۆکاری تەوبــە بهێنێتــە جێ ئــەوە خوا تۆبەکــەی لێ وەردەگــرێ، چونکە خوا ﴿ ٱلتَّوَّابُ ﴾ واتە: زۆر لێبوردەیــە لە کاتی گەڕانەوەی بەندەکانــی، لــە دوای گونــاح ئەگــەر گەڕانــەوەو تەوبەیان کرد بــە چاکــەو نیعمەتەکانیش لە دوای ئــەوەی قەدەغــەی کردبوون ئەگــەر گەڕانەوە.

﴿ ٱلرَّحِيمُ ﴾ کــە وەســف کــراوە بە بەزەیــی مەزن کــە هەموو شــتێک دەگرێتــەوە، ئەوەی کــە وەســف کراوە بە میهرەبانــی مەزن دەوری هەموو شــتێکی داوە، لە بەزەیی ئەو پشــتگیری کــردنو سەرخســتنە بۆ تەوبــەو دڵ نەرمیو ڕووکردنە خــوا، ئەگەر گەڕانــەوەو ڕوویان کردە خوا، لە پاشــان بــە بەزەییو ڕەحمــی خۆی تەوبەی لــێ وەرگرتن، ئەمەش حوکمــی تۆبەکارە لە گونــاحو تاوان.

بــەڵام ئــەوەی کافر بــووە، وە لەســەر کوفرەکەی بــەردەوام بــووە تــا مــردوە، نەگەڕاوەتەوە بــۆ لای پەروەردگــاریو ڕووی تێنەکــردوە، زوو تۆبــەی نەکــردوە، ئەوانە ﴿ عَلَيۡهِمۡ لَعۡنَةُ ٱللَّهِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجۡمَعِينَ ﴾ لەبــەر ئــەوەی کوفرەکەیــان بووەتــە ســیفەتو وەســفێکی جێگیــر بۆیــان، نەفرینــی سەریشــیان بووە بە ســیفەتو وەســفی جێگیــرو نەڕۆیشــتوو بۆیان، چونکــە بڕیــارو حوکم لەگەڵ هــۆ (علّة)کەی دەســووڕێتەوە بە بوونو نەبــوون، (واتە: ئەگەر هۆیەکــە بــوو حوکمەکــەش دەبێ، ئەگــەر ئەویش نەبــوو ئەویش نابــێ)، ﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَا ﴾ واتــە: لــە نەفریــن، یــان لە ســزا، هــەردوو ماناکــە پێکــەوە گــرێ دراون، ﴿ لَا يُخَفَّفُ عَنۡهُمُ ٱلۡعَذَابُ ﴾ واتە: بەڵکو ســزایان هەمیشــە توونــدو بەردەوامــە، ﴿ وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ ﴾ واتە: ماوە نادرێــن چونکــە کاتــی ماوەدان -کــە دونیایە- ڕۆیشــتووەو نەمــاوە، هیچ بیانوویان بــۆ نەماوە تا بیانــوی پــێ بهێننەوە.

(١٦٣): ﴿ وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦٣﴾ ﴾
﴿ وَإِلَٰهُكُمْ ﴾ خـوای بـەرز هەواڵ دەدا کە ئەو ڕاسـتگۆترینی وتەبێژانـە، ئەو ﴿ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ﴾ واتـە: تاکـو تەنهایـە، لە زاتـیو ناوەکانـیو سـیفەتەکانیو کردارەکانـی، هیچ هاوبەشـی نیە لـە زاتـی خـۆی هاوتـاو هاووێنـەی نیـە، بەدیهێنـەرو بەڕێوەبـەری جگە لـەو نیە، جـا مادام بەوشـێوەیە، تەنها ئەو شایسـتەیە بە خوا بناسـرێ، بپەرسـترێ، بە هەموو جۆرەکانی پەرسـتن، هیـچ کەسـێک لـە بەدیهێنەرانـی بە هاوبەش بـۆی بڕیـار نەدرێن، چونکە ئـەو بە ﴿ ٱلرَّحْمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ ﴾ وەسـف کـراوە، بـە بەزەیی مەزن کـە بەزەیی هیچ کەسـێک وەکو هـی ئەو نیەو پێـی ناچێـت، بەزەییەکەی هەموو شـتێکی گرتۆتەوە، بـە بەزەیی ئەو بەدیهێنـراوان هاتوونەتە بـوون، بـە بەزەیـی ئـەوە جۆرەهـا تەواوییەکانیان بـۆ هەیە، بە بەزەیـی ئەوە هەمـوو بەڵاکان ڕەت کراوەتـەوە، بـە بەزەیی ئـەوە خۆی بـە بەندەکانی ناسـاندووەو سـیفەتەکانی خۆی باس کـردوە، وە بـۆی ڕوون کردونەتـەوە هەمـوو ئـەوەی پێویسـتیانە لـە بەرژەوەندیەکانی دینو دونیایـان، بـە ڕەوانـە کردنـی پێغەمبـەرانو دابەزاندنی پەرتوکەکانـی. جا مـادام زانرا هەرچی بەنـدەکان هەیانـە نازو نیعمەت لـە خواوەیە، کەسـێک لە بەدیهێنراوان سـوود بە کەسـێکیان ناگەیەنـێ، کەواتـە: بێگومان تەنها خوا شایسـتەیە بۆ هەمـوو جۆرەکانی پەرسـتن، وە بە تاک بگیـرێ لـە خۆشویسـتنو تـرسو ئومێد بـوون، وە بە مەزن گرتنو پشـت پێ بەسـتن، جگە لەوانەش لـە جۆرەکانی فەرمـانو گوێڕایەڵیەکان.

لە خراپترین جۆرەکانی سـتەمو ناشـیرینترینی ناشـیرینیەکانە کە لە پەرسـتنی خـوا لابدەی بۆ پەرسـتنی بەنـدە، وە بەدیهێنـراوی لەگـەڵ بکرێتـە هاوبەش کە لـە خۆڵەو بە دەسـتی خۆیان دروسـتکراوە، یـان بەدیهێنراوێکـی دەستەوسـانو بـێ توانا بپەرسـترێ لە جیاتـی بەدیهێنەرو بەڕێوەبـەرو خاوەنـی توانـاو بەهێـز، کـە زاڵە بەسـەر هەموو شـتێکو هەموو شـتەکان بۆی نـزمو کەمن.

لـەم ئایەتـەدا چەسـپاندنی تـاکو تەنهاییو بەدیهێنـەرو پەرسـتراوێتیو خوایەتـی تێدایە، وە دانپێدانـان بـە ڕەتکردنەوەی جگە لەئەو لـە بەدیهێنراوەکانی، وە ڕوونکردنـەوەی بنەمای بەڵگە لەسـەر ئـەوە، کـە بریتیە لـە چەسـپاندنی بەزەیی خوا ئـەوەی کـە بوونی هەمـوو نیعمەتەکان لـە شـوێنەوارەکانی ئـەوە، وە ڕەت کردنەوەی هەمـوو بەڵاکان، ئەمـەش بەڵگەیەکی کورتو پوختە لەسـەر تـاکو تەنهایی خـوای بەرز.

إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ
وَٱلْفُلْكِ ٱلَّتِي تَجْرِي فِي ٱلْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ
مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن مَّآءٍ فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا
مِن كُلِّ دَآبَّةٍ وَتَصْرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ وَٱلسَّحَابِ ٱلْمُسَخَّرِ بَيْنَ
ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ لَأٓيَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿١٦٤﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ
مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ ۖ وَٱلَّذِينَ
ءَامَنُوٓا۟ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ ۗ وَلَوْ يَرَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ إِذْ يَرَوْنَ
ٱلْعَذَابَ أَنَّ ٱلْقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا وَأَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعَذَابِ ﴿١٦٥﴾
إِذْ تَبَرَّأَ ٱلَّذِينَ ٱتُّبِعُوا۟ مِنَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوا۟ وَرَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ
وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ ٱلْأَسْبَابُ ﴿١٦٦﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوا۟ لَوْ أَنَّ
لَنَا كَرَّةً فَنَتَبَرَّأَ مِنْهُمْ كَمَا تَبَرَّءُوا۟ مِنَّا ۗ كَذَٰلِكَ يُرِيهِمُ ٱللَّهُ
أَعْمَٰلَهُمْ حَسَرَٰتٍ عَلَيْهِمْ ۖ وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿١٦٧﴾
يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ كُلُوا۟ مِمَّا فِي ٱلْأَرْضِ حَلَٰلًا طَيِّبًا وَلَا تَتَّبِعُوا۟
خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ ۚ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿١٦٨﴾ إِنَّمَا يَأْمُرُكُم
بِٱلسُّوٓءِ وَٱلْفَحْشَآءِ وَأَن تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿١٦٩﴾

(١٦٤): ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَٱلْفُلْكِ ٱلَّتِي تَجْرِي فِي ٱلْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن مَّآءٍ فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ وَتَصْرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ وَٱلسَّحَابِ ٱلْمُسَخَّرِ بَيْنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ لَأٓيَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿١٦٤﴾﴾: له پاشان بەڵگەکانی بە دوورو درێژی باس کردوە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ خوای بەرز هەواڵیدا کە بە ڕاستی لەو بەدیهێنراوە مەزنانە نیشانەو بەڵگە هەن، واتە: بەڵگەن لەسەر ئایەتی خوای بەدیهێنەر پەرستراوێتیو خوایەتیو مەزنی دەسەڵاتو بەزەییەکەی، وە تێکرای سیفەتەکانی، بەلام ﴿لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ واتە: بۆ ئەوانەی ژیریان هەیەو بەکاری دەهێنن لەو پێناوەی بۆی بەدیهێنراوە، بە گوێرەی ئەوەی خوا منەتی ژیری بەسەر بەندەکەی کردوە، سوود وەردەگرێ لە بەڵگەو نیشانەکان بە ژیریو بیر کردنەوەو ووردبونەوەکەی دەیانناسێو شارەزایان دەبێ، لە ﴿خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ﴾ واتە: (بەدیهێنانی ئاسمانەکان)، لە بەرزیو فراوانیو ڕێکو پێکیو قایمیدا، ئەوەی خوا لە ناوی داناون لە خۆرو مانگو ئەستێرەکان، ڕێکخستنیان لە پێناو بەرژەوەندی بەندەکانە.

لە بەدیهێنانی ﴿وَٱلْأَرْضِ﴾ (زەوی) تەختکردوە بۆ بەدیهێنراوەکان، تا بتوانن لەسەری ئۆقرە بگرن، سوودی لێوەربگرن، ئەوە بەڵگەیە لەسەر تاکو تەنهایی خوای بەرز لە بەدیهێنانو بەڕێوە بردنو ڕێکخستندا، وە توانای مەزنی خوا لە بەدیهێناندا، وە کارلەجێیی کە پێیەوە تەواو جوانو ڕێکو پێکی کردوون، وە زانستو بەزەیی خوا کە سوودو بەرژەوەندیو پێویستیەکانی خەڵکی داناوە، لەوەدا گەورەترین بەڵگە هەیە لەسەر تەواوی خواو شایستەیە بە پەرستش، چونکە تاکو تەنهایە لە بەدیهێنانو بەڕێوەبردن، وە هەڵسان بە کاروباری بەندەکانی لە ﴿وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ﴾ ئەویش بەدوایەکداهاتنیان بە

بەردەوام ئەگەر یەکێکیان بڕوات ئەوەیتر بە دوایەوە دێ، لە جیاوازیان لە گەرمیو ساردیو ناوەندی، وە لە درێژی ڕۆژو شەوو کورتیو ناوەندیاندا، ئەو وەرزانەی لێی پەیدا دەبن کە بەرژەوەندیەکانی ئەوەی ئادەمی تێدایە، وە هەموو ئەوانەی لەسەر زەوی هەن لە دارو درەختو ڕووەکەکان بە ڕێکخستنو سیستەمو بەڕێوەبردن دەبێت، فەراهەم هێنانیێ عەقڵ تووشی شۆک دەکات، تەنانەت مرۆڤە ژیرەکانیش لە بەرانبەریدا دەستەوسانن، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر توانای بەدیهێنەرەکەی، لەگەڵ زانستو حیکمەتو ڕەحمەتی بەرفراوانی، کە شایستەی ئەوەیە بەتاک بپەرسترێتو خۆشەویستی بۆ دەرببردرێتو هەموو تواناکان بۆ ئەو مەبەستە بخرێتە کار.

﴿ وَٱلْفُلْكِ ٱلَّتِى تَجْرِى فِى ٱلْبَحْرِ ﴾ ئەویش بریتیە لە کەشتیو ئامێرەکانی گواستنەوەو هاووێنەکانیان، لەوانەی کە خوا ﷻ ئیلهامی کردوە بۆ بەندەکانی دروستی بکەن، هەموو کەرەستە ناوەکیو دەرەکیەکانی بۆ فەراهەم هێناون کە توانایان بە سەریاندا هەیە، پاشان ئەو دەریا مەزنەی بۆ ڕام کردون، بە هەمان شێوە ئەو بایانەی کە ئەو هەموو قورساییەیان هەڵگرتوە کە سوودی مرۆڤەکانی تێدایەو بەرژەوەندیەکانیان لەسەر ئەوە وەستاوە، دەی کێ ئیلهامی بۆ کردن دروستی بکەنو توانایان بەسەریادا بشکێت، وە ئەو کەرەستانەیان بۆ بەدیبهێنێ کە کاری پێدەکەن؟ ئایا کێ دەریای بۆ ڕام کردوون بەویستی ئەو بەناویدا ڕێبکەن؟ ئایا کێ سوتەمەنی دروست کردوە بۆ ئەو ئامێری گواستنەوە دەشتو دەریایان کە ماڵو پێویستیەکانیان پێ دەگوازنەوە؟ ئایا ئەم ماڵو سامانانە بە یەکدەنگی بەدەست هاتووە، یان بە تەنها ئەم دروستکراوە لاوازە بەدیهێناوە، کە کاتێ لە سکی دایکی دەرچوو هیچی نەدەزانی، نەزانست نە توانا، پاشان خوا ﷻ توانای بۆ بەدیهێناو بە ویستی خۆی فێری زانستو زانیاری کرد، یان پەروەردگاری تاکو تەنها بە دیهێناوەو ڕامی کردوە، کە هیچ شتێکی لێ گیر نابێ؟ بەڵکو هەموو شتەکان ملکەچی پەروەردگارێتیو مەزنی بوون.

ئەوپەڕی توانای بەندەی لاواز ئەوەیە کە خوا ﷻ کردویەتی بە بەشێک لە بەشەکان، کە ئەم هەموو کاروبارە گرنگانە بەدی هاتوون، ئەمە بەڵگەیە لەسەر میهرەبانیو گرنگیدانی خوا ﷻ بە بەدیهێنراوەکانی، بۆیە پێویستە هەموو خۆشەویستیەکان تەنها بۆ ئەو بێ، وە ترسو ئومێدو هەموو گوێڕایەڵیەکانو زەلیل بوون تەنها بۆ ئەو بێ.

﴿ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن مَّآءٍ ﴾ بریتیە لەو بارانەی دادەبەزێ لە ناو هەورەکانەوە.

﴿ فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ﴾ بـە دیـاری دەخـات لـە جۆرەکانـی بژێـوی‌و قوتەکان‌و جۆرەکانـی ڕووەکـ‌و ئـەوەی لـە پێداویسـتیەکانی بەدیهێنراوانـە کـە بەبێ ئەو پێویسـتیانە ناژین.

ئایـا ئـەوە بەڵگە نیە لەسـەر توانای ئـەوەی دایبەزاندووە، وە بـەو ئاوەوە ئەوەی ویسـتویەتی دەری بچوێنـی دەری چوانـدوە، لەسـەر بەزەیـی‌و میهرەبانـی بەبەندەکانـی، وە هەڵساوە بەبەرژەوەندیەکانیـان، هـەژاری‌و پێداویسـتی زۆریان بۆی لـە هەموو ڕوویێکـەوە؟ ئایا ئەوە پێویسـتی ئـەوە نـاکات کـە ئـەو پەرسـتراوو خوایان بێـت؟ ئایـە ئـەوە بەڵگە نیە لەسـەر زینـدوو کردنـەوەی مـردووەکان‌و سـزاو پاداشـت دانەوەیان بـە پێـی کردەوەکانیان؟

﴿ وَبَثَّ فِيهَا ﴾ واتـە: لـە زەویدا، ﴿ مِن كُلِّ دَآبَّةٍ ﴾ واتە: بـڵاوەی کردۆتەوە بەلایەکانی زەوی لـە ئیمانـدارو زیندەوەرە جـۆراو جۆرەکان، ئەوەی کـە بەڵگەیە لەسـەر تواناو مەزنی، وە تـاکـ‌و تەنهایەکـەی‌و دەسـەڵاتە مەزنەکەیەتـی، ژێر بـار کردنیان بۆ خەڵکی، سـوودی لـێ وەربگرین بە هەموو شـێوەکانی سـوودبینین:

لەوانە: لە گۆشتەکەی دەخۆن، لە شیرەکەی دەخۆنەوە.

لەوانە: سواری پشتیان دەبن.

لەوانە: ئەوەیە کە هەوڵ‌و کۆششکارە لە پێناو بەرژوەندیەکانیان‌و پاسەوانێتی کردنیان.

لەوانـە: پەنـدی لێ وەردەگیـرێ لەگەڵ ئەوەی ئەو لەسـەر زەوی لە هەمـوو زیندەوەرو گیان لـە بەرێکـی بـڵاو کردۆتـەوە، ئەوە خـوای پاکو بـێ گـەردە هەڵدەسـتێ بـە ڕۆزودانیان‌و دابینـکاری قـوت‌و بژێویەکانیـان، هیـچ لـە زینـدەوەرو گیـان لەبەرەکانی سـەر زەوی نیە ئیلـلا ڕۆزیـان لەسـەر خوایە، خـوا شـوێنی هەڵگرتـن‌و پەیدابوونیـان دەزانێ، ﴿ وَتَصْرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ ﴾ سـاردو گـەرم، سـەرو خـوارو خۆرهـەڵات‌و خۆرنشـینی، لـە نێوانـی ئەوانـەش، جارێـک هـەور دەوروژێنـێ، جارێک نێوانیـان ڕێک دەخـات پێکیان دەگەیەنـێ، جارێک دەیانپیتێنـێ‌و چاکیـان دەکات، جارێـک هەڵدەقوڵێـن‌و جارێـک پارچـە پارچـەی دەکات زیانەکـەی لادەبـات، جارێـک دەبێتـە بەزەیـی، جارێک سـزا دێنێ.

کێیـە ئـەو گۆڕانکاریانـەی تیـادا دەکات؟ سـوود گەیەنـەری بەنـدەکان کـە ناتوانـن بـێ نیازبـن لێـی؟ دەسـتەمۆی کـردوە ڕەخسـاندوویەتی تاکو هەمـوو ئاژەڵـەکان بتوانـن تیادا بژیـن، دەگونجـێ بۆ لاشـەو جەسـتەکان‌و دارو بـارەکان، دانەوێڵـەو ڕووەکـەکان، مەگەر ئـەوە زاڵـی دانـای بەزەیـی بـێ، میهرەبـان بەبەندەکانی شایسـتە بـۆ هەموو ملکەچـی‌و دڵ

کەچی‌و خۆشەویستی‌و ڕوو تێکردن‌و پەرستن، لە ژێر دەست کردنی هەور لە نێوان ئاسمان‌و زەوی لەسەر ئەو سووکی‌و تەنکیەی ئاوێکی زۆریشی بەخۆوە هەڵگرتووە، خوا دەیگوازێتەوە بۆ ئەو شوێنەی بیەوێت، بەندەکان‌و شوێنەکانی پێ زیندوو دەکاتەوە، گردەکانی‌و تەختاییەکانی ئاو دەدات، دای دەبەزێنێ بۆ سەر خەڵکی لە کاتی پێویستیدا، ئەگەر زۆریەکەی زیانیان پێبگەیەنێ لێیان دەیگرێتەوە، بە بەزەیی‌و میهرەبانی دایدەبەزێنێ، لایدەدا بە سۆزو چاودێریەوە ئای لە مەزنی دەسەڵاتی، وە زۆری چاکەو نەرم‌و میهری بەخششی!!

ئایا ناشرین نیە بۆ بەندەکانی چێژ لە نازو نیعمەتەکانی وەربگرن لە کاتێکدا بە پێچەوانەی ئەو ڕەفتار دەکەن؟ ئایا ئەوە بەڵگە نیە بۆ سۆزو بەزەیی‌و میهرەبانی ئەو؟ سوپاس‌و ستایش بۆ ئەو لە سەرەتاو لە داواییدا، بە ئاشکراو بە نهێنی.

بە پوختی هەرکەسێ لە بەدیهێنراوەکان ڕابمێنێ‌و عەقڵ‌و هۆشی بخاتە کار دەبینێ پڕە لە حیکمەت‌و داهێنان، دواجار دەزانی ئەوە بەڕاستی‌و بۆ ڕاستی دروستکراوە، ئەوانە پەڕەیەکن لە نیشانەکانی خوا ﷻ بەڵگەن لەسەر تاک‌و تەنهایی خوای مەزن، با بزانرێ هەموو جیهانی خوارەوەو سەرەوە لە ژێر ویست‌و دەسەڵاتی خوای گەورەدان‌و هەردەم پێویستیان بەوە، ئەو دەوڵەمەندە بە زات‌و سیفەتی‌و بێنیازە، هیچ کەس شایستەی پەرستن نیە بێجگە لە ئەو، وە هیچ پەروەردگارێ نیە جگە لە ئەو.

(١٦٥-١٦٧): ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ ۖ وَٱلَّذِينَ
ءَامَنُوٓا۟ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ ۗ وَلَوْ يَرَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ إِذْ يَرَوْنَ ٱلْعَذَابَ أَنَّ ٱلْقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا وَأَنَّ ٱللَّهَ
شَدِيدُ ٱلْعَذَابِ ﴿١٦٥﴾ إِذْ تَبَرَّأَ ٱلَّذِينَ ٱتُّبِعُوا۟ مِنَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوا۟ وَرَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ
ٱلْأَسْبَابُ ﴿١٦٦﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوا۟ لَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَتَبَرَّأَ مِنْهُمْ كَمَا تَبَرَّءُوا۟ مِنَّا ۗ كَذَٰلِكَ
يُرِيهِمُ ٱللَّهُ أَعْمَٰلَهُمْ حَسَرَٰتٍ عَلَيْهِمْ ۖ وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿١٦٧﴾ ﴾:

چەندە سەرسوڕهێنەرو جوانە پەیوەندی ئەم دەقانە بە یەکترەوە، کاتێ خوا باسی تەنهایی خۆی کردو بەڵگەی یەکلاکەرەوەی بۆ ئەو مەبەستە هێنایەوە، کە دەبێتە مایەی دڵنیا بوون‌و لابردنی هەموو دوودڵی گومانێ، لێرەدا باسی کردوە کە ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ ﴾ لەگەڵ ئەم هەموو ڕوونکردنەوەیەدا هەندی لە بەدیهێنراوەکان جگە لە خوا ﷻ دەکەن بە شەریک‌و دەیپەرستن‌و هاوتای دەکەن لەگەڵ خوادا ﷻ بە خۆشەویستی‌و بەندایەتی بۆ کردنی‌و بە گەورە زانینی.

هەر کەسێ لەم دۆخەدا بێ پاش بیانووبڕینو حوججە کردن لە سەریانو ئاشکرا کردنی یەکتاپەرستی، دەردەکەوێ ئەوە کەسێکی یاخیو کەللەڕەقە، یان پشتی کردوە لە بیرکردنەوە لە ئایەتەکانی خواو بیر کردنەوە لە دروستکراوەکانی، بەڵکو سزای بە ئێش لەسەری پێویست بووە، ئەوانەی لەگەڵ خوادا ﷻ شتێکی تر دەکەن بە هاوبەش، لە دروستکردنو ڕزقو ڕۆزی ڕێکخستندا نایکەن بە هاوبەش بەڵکو لە بەندایەتی کردندا، لێیان دەپاڕێنەوە بۆ ئەوەی لێی نزیک ببنەوە.

﴿ يَتَّخِذُ ﴾بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خوا ﷻ هاوبەشو شەریکی نیە، بەلام بتپەرستان هەندی لە بەدیهێنراوەکانیان کردە پەرستراو، ناوێکی ڕووتو ناوەڕۆکێکی بەتاڵ، وەک چۆن خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ شُرَكَآءَ قُلْ سَمُّوهُمْ أَمْ تُنَبِّـُٔونَهُۥ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِى ٱلْأَرْضِ أَم بِظَـٰهِرٍ ﴿٣٣﴾ ﴾الرعد، ﴿ إِنْ هِىَ إِلَّآ أَسْمَآءٌ سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَـٰنٍ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ ﴿٢٣﴾ ﴾النجم. واتە: (ئەوانەی کردووتانە هاوبەشو هاوتا بۆ خوا لە بتەکان تەنها ناوە لێتان ناون ئێوەو باوکو باپیرەتان، خوا بەڵگەی پێیەوە دانەبەزاندووە ئەوەی شوێنی کەوتوونە تەنها گومانو خەیاڵە).

بەدیهێنراو هاوبەشو هاوتای نیە بۆ خوا، چونکە خوا بەدیهێنەرەو جگە لەوانەش بەدیهێنراون، پەروەردگار ڕۆزی دەرەو جگە لەویش ڕۆزی پێ دراون، خوا دەوڵەمەندو بێ نیازە ئێوەش هەژارن، ئەو تەواوە لە هەموو ڕووەکانەوە، بەندەکان لە هەموو ڕوویەکەوە کەمو کورتیان هەیە، خوا سوود گەیەنەرو زەرەر گەیەنەرە، بەدیهێنراو هیچ سوودو زیانو هیچ کارێکی بۆ نیە، بێگومان بە زانستی دڵنیاکەر زانرا پووچەڵیو ناڕەوایەتی قسەی ئەو کەسەی جگە لە خوای پەرستراو هاوتای گرتوە، جا یەکسانە چ (پەرستراو هاوتاکە) فریشتەبێ یان پێغەمبەر بێ یان چاکەکار بێ یان بت بێ یان جگە لەوانەش بەڕاستی خوایە شایستە بۆ خۆشویستنی تەواو ملکەچیو زەلیلی تەواو، لەبەر ئەوەیە خوا وەسفی بڕوادارانی کردوە بە فەرمودەی خۆی ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ ﴾ واتە: لە هاوتا بڕیاردەران بۆ ئەو هاوتایانەی بڕیاریان داوە، چونکە خۆشەویستیەکەیان بۆی یەکلا بووەتەوەو بە پاکی بۆی دەکەن، ئەوان هاوبەشیان بۆ بڕیار داوە، چونکە بڕواداران ئەوەی تەواو شایستەی خۆشویستنە خۆشیان ویستووە، کە خۆشەویستیەکەی بریتیە لە خودی چاکەی بەندەو بەختەوەریو سەرفرازیەکەی، هاوبەش بڕیاردەران ئەوەی شایستەی هیچ خۆشویستنێک نیە خۆشیان ویستووە، وە خۆشویستنی ئەو پەڕی

گومڕایــیو بەدبەختیە.
لەبــەر ئەوەیە خوا هەڕەشــەی بە فەرمــوودەی خۆی لێ کــردوون ﴿ وَلَوْ يَرَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ ﴾ بــە گرتنــی هاوتــاکانو ملکــەچ کــردن بــۆ جگە لــە پەروەردگــاری بەنــدەکان، وە ســتەم کــردن لــە خەڵکــی بــە ڕێگرتن لێیــان، ڕێگــای خواو هــەوڵو کۆششــیان لە پێنــاو ئەوەی زیانیــان پــێ دەگەیەنێت.
﴿ إِذْ يَرَوْنَ ٱلْعَذَابَ ﴾ واتــە: ڕۆژی هەڵســانەوە (قیامــەت) بــە چاوەکانیــان دەبینــن، ﴿ أَنَّ ٱلْقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا وَأَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعَذَابِ ﴾ واتــە: بــە زانیاریــی تــەواوو یەکلاکــەرەوە دەزانــن کــە بەڕاســتی هێزو توانــا هەموو بــۆ خوایــە، هاوتاکانیان هیــچ هێزێکیــان نیە، لەو ڕۆژەدا توانــاو لاوازیــان بــۆ دەردەکەوێ، نە وەکــو ئەوەی لــە دونیاوایان دەزانــی گومانیان دەبــردو خەیاڵیــان دەکــرد کــە کارو شــتێکیان بەدەســتە، ئــەوان (بتــەکانو هاوتــاکان) لە خــوا نزیــک دەخەنــەوەو بەویــان دەگەیەنــن، گومانیــان بەتاڵ بوو هــەوڵو کۆششــەکانیان پووچەڵ بویەوە، ســزای توند بەســەریاندا پێویســت بــوو، وە هاوبەشــەکانیان هیچ کەڵکو ســوودێکیان پێنەگەیانــدن، تەنانەت بــە قەد گەردیلەیەک ســوودیان لــێ وەرنەگرتن، بەڵکو لەوانــەوە زیانیــان بە دەســت هــات، لــەو ڕووەی واتێگەیشــتن ســوودی لێوەردەگرن.
وە پێشــەواکان لــە پەیڕەوانــی خۆیــان بێــزار دەبــنو حاشــا دەکــەن، ئــەو پەیوەندیەی کە لــە دونیــا هەبــوو لــە نێوانیــان دەپچــڕێو نامێنــێ، چونکــە بــۆ غەیــری خــوا بووە، لەســەر جگــە لــە فەرمانی خــوا بووە، گرێــدراوە بــە پوچوبەتاڵیەکەیەوە کــە هیــچ حەقیقەتێکی نیە، کردەوەکانیــان دەپوکێتەوەو حاڵو باریــان نامێنی، بۆیان ڕوون دەبێتــەوە کە ئەوان درۆزنن، ئــەو کردەوانــەی کە ئاواتی ســوود گەیشــتنیان بــوونو دەســتەبەر بوونــی دەرەنجامەکانیان بــوون، بەســەریاندا شــکایەوە بــە ئــاخو خەفــەتو پەشــیمانی، ئــەوان بۆ هەمیشــە لــە ئاگر دەمێننــەوەو قــەت لێــی ڕزگــار نابن، ئایــا لە پاش ئــەو زەرەرمەندیــە زیانی تر هەیــە؟ لەبەر ئــەوەی ئــەوان شــوێن ناهــەق کەوتبــوون، کارو کــردەوەی پووچەڵیــان دەکــرد، ئومێدی چــاوەڕوان نەکراویــان کــرد، هۆگــر بــوون بــە شــتی بەتــاڵو بێمانــا، کارەکانیــان پوچەڵ بوونــەوە، کاتــێ ئــاخو خەفەت ڕوودەدات بــەوەی بێ ئومێد بــوون تیایدا، زیانیــان پێدەگات ئەوپــەڕی زیــان، ئەمە بە پێچەوانەی کەســێ کە پەیوەنــدی کردبێ بە خــواوە، وە بۆ خوا ﷻ صوڵحابــێو بــە دڵســۆزی کاری بــۆ ئەو کردبــێو چاوەڕوانی پاداشــتی ئەو بــێ، ئەمە هەقو ڕاســتی لــە جێگای خۆیــدا داناوە، ئــەوە کردەوەکانی ڕاســتن چونکــە پەیوەندی کــردوە بە

ڕاستیەوە، وە پاداشتی دەبینێتەوە لە لای خوا ﷻ بە بێ دابڕان، وەک خوا فەرموویەتی: ﴿ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ أَضَلَّ أَعْمَٰلَهُمْ ۝١ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَءَامَنُواْ بِمَا نُزِّلَ عَلَىٰ مُحَمَّدٍ وَهُوَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ كَفَّرَ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَأَصْلَحَ بَالَهُمْ ۝٢ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱتَّبَعُواْ ٱلْبَٰطِلَ وَأَنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّبَعُواْ ٱلْحَقَّ مِن رَّبِّهِمْ كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ أَمْثَٰلَهُمْ ۝٣ ﴾محمد، (واتە: ئەوانەی کافر بونەو ڕێگریان لە (بڵاوبوونەوەی دینی) خوا دەکرد کاروکردەوەکانیان پوچەڵ بوویەوە ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوەی چاکەیان کردوە بڕوایان هێناوە بەوەی بۆ سەر محمد (ﷺ)، دابەزیوە کە ئەو ڕەواو هەقەو لە پەروەردگاریانەوە خراپەکانیان دەبورێ‌و حاڵو باری دونیاو دوارۆژیان بۆ چاک دەکات ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە ئەوانەی کافربووینە شوێن ناهەق کەوتوونەو ئەوانەش کە بڕوایان هێناوە شوێنی هەق لە پەروەردگاریان کەوتوونە، هەر ئاوا خوا بۆ خەڵکی نموونان دێنێتەوە).

لەوکاتەوە شوێنکەوتوان خۆزگەی گەڕانەوە بۆ دونیا دەخوازن، بگەڕێنەوە بۆ دونیا خۆیان بەری بکەن لە شوێنکەوتوانیان، بەوەی کە واز لە هاوبەشی دانان بۆ خوا بهێنن، ڕووبکەنە ئەنجامدانی کردەوە بە دڵسۆزی بۆ خوا ﷻ، ئەستەمەو زۆر ئەستەمە، کار لەدەست دەرچوو، کات کاتی ماوەدانو چاوەڕوانی نیە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان درۆزنن، ئەگەر بشگەڕێنرێنەوە، دەگەڕێنەوە بۆ ئەنجامدانی ئەوانەی لێیان قەدەغە کرا بوو، ئەوە تەنیا قسەیەکە دەیکەنو ئاواتێکە خۆزگەی بۆ دەخوازن، تووڕەیی‌و بێزاری بۆ ئەوانەی شوێنیان کەوتبوون لەوکاتەی لێیان بەری بوون، کە گوناهەکەش گوناهو تاوانی خۆیان بوو، جا ئیبلیس سەرکردەی ئەوانەیە کە شوێنی دەکەون، لەگەڵ ئەمەدا بە شوێن کەوتوانی دەڵێ: لەوکاتەی فەرمانو بڕیار کۆتای پێ دێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ ٱلْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ ۖ وَمَا كَانَ لِىَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوْتُكُمْ فَٱسْتَجَبْتُمْ لِى ۖ فَلَا تَلُومُونِى وَلُومُوٓاْ أَنفُسَكُم ۝٢٢ ﴾إبراهيم، (واتە: کاتێک دادوەری دەکرێ ئیبلیس دەڵێ: بەڕاستی خوا بەڵێنی پێتان دا بەڵێنێکی هەق‌و ڕەوان، منیش بەڵێنم پێتاندا نەمهێنایە جێ، من هیچ دەسەڵاتم نەبوو بەسەرتاندا، تەنها بانگم کردنو ئێوەش وەڵامتان دامەوە، سەرزەنشت‌و لۆمەی من مەکەن، خۆتان لۆمەو سەرزەنشت بکەن).

(١٦٨-١٧٠): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ كُلُواْ مِمَّا فِى ٱلْأَرْضِ حَلَٰلًا طَيِّبًا وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ ۚ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ۝١٦٨ إِنَّمَا يَأْمُرُكُم بِٱلسُّوٓءِ وَٱلْفَحْشَآءِ وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ۝١٦٩ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُواْ بَلْ نَتَّبِعُ مَآ أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآ ۗ أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا

يَعۡقِلُونَ شَيۡـًٔا وَلَا يَهۡتَدُونَ ﴿١٧٠﴾ ﴾:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ كُلُواْ مِمَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾ ئـەم دواندنـە هەموو مرۆڤەکان دەگرێتـەوە بڕوادارو بێبـڕوا، خـوا منەتیـان بەسـەردا دەکات، فەرمانـی پێکـردوون بخۆن لـە هەمـوو ئەوانەی لە زەویـدا هەیە، لـە دانەوێڵەو بەروبـوومو میوەجاتو ئاژەڵەکان، حاڵەکـە ئەوەیە، ﴿ حَلَٰلٗا ﴾ واتـە: وەرگرتنـی بۆتان حەڵاڵە، بـە داگیرکردنو دزی نەبـێ، وە بە مامەڵەی حەرام دەسـت نەکەوتبێ، یـان یارمەتیدانـی حەرامکراوێک نەبێت.

﴿ طَيِّبٗا ﴾ واتـە: پیـس نەبـێ، وەک گۆشـتی مـردارەوە بـوو، خوێنو گۆشـتی بـەرازو، هەمـوو پیسـیەکان، ئەم دەقە دەبێتە بەڵگە لەسـەر ئەوەی بە ڕاسـتی ئەسـڵو بنەمـا لە خودی شـتەکاندا حەڵاڵـیو ڕی پێدراویە (إباحـة) بۆ خواردنو سـوود لێ بینینیـان، حەرامکراویش دوو جۆرە:

یەکـەم: یـان لەبەر خـودی خـۆی حەرامکراوە، ئەویـش بریتیە لەو پیسـیەی کـە پێچەوانەو دژی خاوێنە.

دووەم: یـان حەرامکـراوە لەبـەر ئـەوەی بەسـەرداهاتووەو تووشـی بـووە، ئـەوەش ئـەو حەرامکراوەیـە کـە پەیوەسـتە بە مافی خوا، یـان مافی بەندەکانـی تێدایە ئـەوەش پێچەوانەو دژی حەڵاڵـە.

بەڵگەشـی تێدایـە لەسـەر ئـەوەی خـواردن بـە ئەنـدازەی ڕاگرتنی لاشـە پێویسـتە، ئەوەی وازی لـێ بێنـی گوناهبـار دەبـێ لەبـەر ڕواڵەتـی فەرمانەکە.

کاتێـک فەرمانی پێکردن کـە پەیڕەوی فەرمانەکانی بکەن، کە ئەوە سـەرچاوەی چاکەخوازیانە، قەدەغـەی لـێ کردوون لـە شـوێنکەوتنی ﴿ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ ﴾ واتە: ڕێگەکان کـە فەرمانی پێـدەکات، کـە بریتیـە لە هەمـوو سـەرپێچیو گوناهەکان لـە کوفرو لـە فەرمـان دەرچوونو سـتەم، حەرامکردنی (سـوائب) و (حام)یش[٧] دەچێتـە چوار چێوەی ئـەوەوە نموونەی ئەوانەش، هەروەها وەرگرتنـیو خواردنی خواردەمەنیـە حەرامەکانیش دەگرێتەوە.

٧) (السـوائب): کـۆی (السـائبة)یە: کـە بـە واتـای بەرەڵاکـردن دێـت، لـە سـەردەمی نەفامـی ئـەو حوشـترەی فەرخـەی خـۆی بینیبـاو وێـرا گەیشـتبا بەرەڵایـان دەکـردو باریـان لـێ بـار نەدەکـردنو سـواری پشـتی نەدەبـوون، یـان نەزریـان دەکـرد ئەگـەر لـە گەشـت بـە سـەلامەتی گەڕابانـەوە، یـان لـە نەخۆشـی چـاک بووبانـەوە، ئـەو حوشـترەیان بەرەڵـا دەکـردو پشـتیان پارێـزراو دەکـرد لـە پـاوانو ئـاوەکان قەدەغەیـان نەدەکـردن.
(الحـام): ئـەو حوشـترە نێرەیـە کـە دەجـار حوشـتری مێینـەی لـێ ئـاوس بووبـاو بـەر لـە نەوەکانـی خـۆی بینیبایـەو ئـاوا زۆر لـەلای خاوەنەکـەی بمابایـەوە، نەزریـان دەکـردو پشـتیان

﴿ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٌ ﴾ واتــە: دوژمنایەتیە کـەی ئاشـکرایە، لـە فەرمـان پێکردنـی پێتـان تەنهـا فێڵکردنـی لێتـان دەوێـت، تـا بینـە هاوەڵـی ئاگـرو دۆزەخ، پەروەردگارمـان بـە قەدەغەکردنمانــەوە نەوەســتاوە لە شــوێنکەوتنی هەنگاوەکانی شــەیتان، تا هەواڵـی پێمانداوە -کــە ئــەو ڕاســتگۆترینی وتەبێژانــە-، بــە دوژمنایەتــی ئــەو کــە دەخــوازێ لێی ئاگــادارو هۆشــیاربین، لە پاشــان بەوەشــەوە نەوەســتاوە، تــا هەواڵی پێمانــداوە بە دوورو درێژی باســی فەرمانەکانــی کــردوە، ئەو ناشــرینترینی شــتەکانەو مەزنترینیشــیانە لــە خراپــە فەرموویەتی: ﴿ إِنَّمَا يَأۡمُرُكُم بِٱلسُّوٓءِ ﴾ واتــە: ئــەو خراپە بــە خاوەنەکــەی دەگەیەنێ، کە هەمــوو گوناهو تاوانــەکان دەگرێتــەوە، فەرموودەکــەی دەبێتە: ﴿ وَٱلۡفَحۡشَآءِ ﴾ لە بابەتــی گێڕانەوە (عطف) تایبــەت بەســەر گشــتیدا، چونکــە ســەرپێچی کــردن بــە فاحیشــەو بەدڕەوشــتی لــە گوناهو تاوانــە ناشــرینەکانە، وەکو زینــاو خواردنەوەی مەیو کوشــتنو بوختــانو ڕەزیلیو نموونەی ئەوانــەش، لەوانەی بە خراپیــان دادەنێنو ئەوەی عەقڵی هەیە بێــزی لێ دەکات، ﴿ وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴾ ئەمە قســە کردن لەســەر خوا بەبێ زانســتو زانیاری لە شــەرعو قەزاو قــەدەر دەگرێتەوە، ئەوەی وەســفی خــوا بکات بە بێ زانســت، یان پێغەمبەرەکەی ﷺ وەســفی پــێ کــردوە، یان ئــەوەی خوا بــۆ خۆی جێگیــری کــردوە ڕەتی بکاتــەوە، یان ئــەوەی خوا لــە خــۆی ڕەتیکردۆتــەوە بــۆی جێگیر بکات، ئــەوە بێگومان بەبێ زانســتو زانیاری قســەی لەســەر خــوا کردوە، هــەر کــەس وا بزانێ کە خوا هاوبەشــی هەیــەو لێی نزیکــی دەکاتەوە، بێگومــان بەبــێ زانســتو زانیــاری قســەی لەســەر خــوا کــردوە، ئــەوەی بڵــێ: خــوا ئەوەی حــەڕام کــردوە، یان ئــەوەی حەڵاڵ کــردوە، یــان فەرمانی بەو کــردوە، یان قەدەغــەی لەوە کــردوە، بەبــێ بەرچاو ڕوونی، بێگومان بەبێ زانســتو زانیاری قســەی لەســەر خــوا کردوە، ئــەوەی بڵــێ: بەڕاســتی خوا ئــەو چینە (یــان ئەم شــتانەی) لــە بەدیهێنراوەکانــی لەپێناو فڵان بــەدی هێنــاوە بەبــێ ســەلماندن، ئــەوە بێگومــان بەبێ زانســتو زانیاری قســەی لەســەر خوا کــردوە، لــە گەورەترینــی قســە لەســەر خوا بەبــێ زانســتو زانیاری قســە کردنە لەســەری، لــە مەزنترین قســە لەســەر خوا بەبــێ زانیاریــی ئەوەیە کە قســەکەی بگــۆڕدرێ، فەرموودەی خــۆی، یان قســەی پێغەمبەر ﷺ لەســەر ئــەو مانایانــەی کۆمەڵێک لــە کۆمەڵــی گومراکەران لەســەری ڕێککەوتن، لە پاشــان دەڵێن: ئەو خوا ویســتوویەتی (مەبەســتیەتی)، جا قســەکردن لەســەر خــوا بەبــێ زانیاریی لــە گەورەترین حــەڕام کراوەکانەو گشــتگیر تریــانو مەزنترین

---

پارێزراو دەکرد.

ڕێگاکانـی شـەیتانە کە بانگـەوازی بـۆ دەکات، ئەوانەن ڕێگاکانی شـەیتان کـە بانگەوازیان بـۆ دەکات خـۆیو سـەربازەکانی، فێڵو پیلانەکانیان سـەرف دەکەن لەسـەر گومـڕا کردنی خەڵـک بەوەی لـە تواناکانیانـدا هەیە.

بـەڵام خـوا ﷻ فەرمان بـە دادوەرییو چاکە دەکات، وە بەخشـین بەسـەر ئەوانەی کە خزمو نزیکـن، قەدەغـەی خراپەو تـاوانو سـنوور بەزێنی دەکات، بـا مرۆڤ لە خـۆی بروانێ ئەو لەگـەڵ کام بانگەوازکارەکانـە، لـە کام کۆمەڵو ئـەو دوو حیزبەیە؟ ئایا شـوێنی بانگەوازی خوایـی دەکـەوی کـە خێـرو خۆشـبەختی دنیـاو دوارۆژی تێدایـە، هەموو سـەرکەوتنێ لە خزمەتـی ئەودایـە، هەمـوو قازانجـەکان لـە مامەڵـە کردنـە لەگەڵ بەختـەوەری پڕ لـە نازو نیعمەتەکانـی دیـارو نادیـارەکان، قەدەغـە ناکات مەگـەر تەنها لە خراپـە نەبێت.

یـان شـوێن بانگکەری شـەیتان دەکـەویْ کە ئـەو دوژمنی مرۆڤـە، کە ئـەو خراپەی بۆت دەوێـت هەوڵـدەدات هەمـوو توانـاو کۆششـێک بـکات لە پێنـاو لـە ناوبردنت لـە دونیاو دوارۆژی تـۆدا؟ ئـەوەی هەمـوو خراپەیـەک لە جێبەجێ کردنـی فەرمانەکانیەوە سـەرچاوە دەگـرێ، هەمـوو زەرەرمەندیەکانیـش لـە نزیکـیو دۆسـتایەتیەتی ئەوەوەیـە، کـە فەرمان نـاکات مەگـەر بـە خراپـە نەبـێ، قەدەغـەش نـاکات مەگەر لـە چاکـە، لە پاشـان خوا ﷻ هەواڵـدەدات دەربـارەی حاڵـی موشـریکەکان ئەگـەر فەرمانیـان پێکـرا بـە شـوێنکەوتنی ئـەوەی خـوا دایبەزاندووە بەسـەر پێغەمبەرەکەی ﷺ لەوەی لە پێشـتر وەسـفکرا، پشـتی تێ دەکـەنو دەڵێـن: ﴿ بَلْ نَتَّبِعُ مَآ أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآ ﴾ ڕازی بـوون بـە پەیڕەوی بـاو باپیرانیان، لـە بـڕوا بوون بـە پێغەمبـەران خۆیان پاراسـت، لەگەڵ ئەمـەدا، بـاو باپیرانیـان نەفامترینو گومڕاترینـی خەڵـک بـوون، ئـەوە گومانێکـی خەیاڵیـە بـۆ ڕەتکردنـەوەی هـەق، ئەمـە بەڵگـەی ئەوانە لەسـەر پشـت تێکردنیان لە هەقو ڕاسـتی بە حـەزو ئارەزوی خۆیـان، بەبێ ویژدانیـان، ئەگـەر ڕێنماییـان وەربگرتبایە بـۆ ئەوان لە بارتـرو چاکتر بوو، وە هەرکەسـێ مەبەسـتی هـەق بـێ، هاوسـەنگی لـە نێـوان هـەقو ناهەقـدا بـکات، بـە تـەواوی هەقی بۆ ئاشـکرا دەبـێو شـوێنی دەکـەویْ ئەگـەر بە ویـژدان بێ. پاشـان خـوا فەرموویەتی:

وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُوا مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَآ أَلْفَيْنَا
عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآ أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ شَيْـًٔا وَلَا
يَهْتَدُونَ ﴿١٧٠﴾ وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا كَمَثَلِ ٱلَّذِى يَنْعِقُ
بِمَا لَا يَسْمَعُ إِلَّا دُعَآءً وَنِدَآءً صُمٌّۢ بُكْمٌ عُمْىٌ فَهُمْ لَا يَعْقِلُونَ
﴿١٧١﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا كُلُوا مِن طَيِّبَـٰتِ مَا رَزَقْنَـٰكُمْ
وَٱشْكُرُوا لِلَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿١٧٢﴾ إِنَّمَا حَرَّمَ
عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحْمَ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ بِهِۦ لِغَيْرِ
ٱللَّهِ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ إِنَّ ٱللَّهَ
غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٧٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ
ٱلْكِتَـٰبِ وَيَشْتَرُونَ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا أُولَـٰٓئِكَ مَا يَأْكُلُونَ
فِى بُطُونِهِمْ إِلَّا ٱلنَّارَ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ
وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٧٤﴾ أُولَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ
ٱشْتَرَوُا ٱلضَّلَـٰلَةَ بِٱلْهُدَىٰ وَٱلْعَذَابَ بِٱلْمَغْفِرَةِ فَمَآ
أَصْبَرَهُمْ عَلَى ٱلنَّارِ ﴿١٧٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ نَزَّلَ ٱلْكِتَـٰبَ بِٱلْحَقِّ
وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا فِى ٱلْكِتَـٰبِ لَفِى شِقَاقٍۭ بَعِيدٍ ﴿١٧٦﴾

(١٧١): ﴿ وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا كَمَثَلِ ٱلَّذِى يَنْعِقُ بِمَا لَا يَسْمَعُ إِلَّا دُعَآءً وَنِدَآءً صُمٌّۢ بُكْمٌ عُمْىٌ فَهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٧١﴾ ﴾:

كاتـێ خـوا ﷻ روونـی كـردەوە ملكـەچ نەبوونیـان بۆ ئـەوەی ڕەوانە كـراوە لە لایەن پێغەمبەرانـەوە، ڕەتكردنەوەیـان بە لاسـایی كردنـەوە، زانـراوە كـە ئـەوان شایسـتەی هەق نیـن‌و وەڵامـدەرەوە نین بـۆی، بەڵكو بـۆ هەمـوو كەسـێك زانـراوە كـە ئـەوان وازیـان نەهێنـاوە لـە كەللەڕەقیەكەیـان، خـوای بـەرز هەواڵیدا كـە نموونـەی ئەوان -لـە كاتـی بانگكردنیـان بەرەو بـڕوا هێنان - نموونـەی ئاژەڵەكانـە كـە شـوانەكان لێیـان دەخوڕن‌و هیـچ نابیسـتن تەنها دەنگە دەنگـێ نەبـێ، زانیاریـان نیە بـەوەی بانگكەرانیـان دەیڵێن، تەنهـا گوێیان لە دەنگـە دەنگە، ئەویـش تەنهـا بـۆ ئەوەیـە بیانویان ببـڕێ‌و بەڵگەیان لەسـەر پێویسـت بكات، بـەڵام ئەوان تێـی ناگـەن بـە تێگەیشـتنێك كە سـوودیان پـێ بگەیەنێـت، لەبـەر ئەوەیە ئـەوان كەڕن، هـەق نابیسـتن بەبیسـتنی تێگەیشـتن‌و وەرگرتـن، كوێرن تـێ ناڕوانـن، تێرانامێنـن‌و پەند وەرناگـرن، لاڵـن قسـە ناكـەن بـەوەی خێـرو چاكەیـان تێدایە بـۆ ئەوان.

هـۆكاری هەمـوو ئەوانـە ئەوەیـە كە ئـەوان عەقـڵ‌و ژیری دروسـتیان نیـە، بەڵكـو ئەوان گێلـی گێلەكانـن‌و نەفامتریـن نەفامەكانن.

ئایـا ژیـرو عاقـڵ دوو دڵ دەبـێ كاتـێ بانـگ بكرێـت بـۆ سـەر ڕاسـتی‌و ژیـری‌و دور كەوتنـەوە لـە خراپـە، فەرمانـی پـێ بكرێـت بـەوەی چاكـەو چاكسـازی‌و سـەرفرازی‌و بردنـەوەی نـازو نیعمەتـی بۆ ئـەو تێدابـێ، سـەرپێچی ئامۆژگاریكار بكات‌و پشـت بكات‌و پشـت لـە فەرمانـی پەروەردگـاری بكات، خـۆی بخاتە نێـوی ئاگر بـە بەرچـاو ڕوونیەوە، شـوێن نـارەوا بكـەوێ‌و یاخـی بـێ لـە هـەق‌و ڕاسـتی، بێگومـان ئـەو ئەگـەر بـە فێڵبازو سـاختەچی‌و پیـلان گێـڕ وەسـف كرابـێ، ئـەوە گێلترینـی گێلەكانە.

(١٧٢-١٧٣): ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَـٰتِ مَا رَزَقْنَـٰكُمْ وَٱشْكُرُوا۟ لِلَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿١٧٢﴾ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحْمَ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ بِهِۦ لِغَيْرِ ٱللَّهِ ۖ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٧٣﴾ ﴾:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَـٰتِ مَا رَزَقْنَـٰكُمْ وَٱشْكُرُوا۟ ﴾ ئەمە فەرمانە بۆ بڕواداران بە تایبەت لە دوای فەرمانی گشتی، ئەوەش لەبەر ئەوەیە ئەوان بە تەواوی سوودیان وەرگرتوە لە فەرمانەكانو قەدەغەكراوەكان بە هۆی ئیمانیانەوە، فەرمانی پێیان كرد بە خواردنی پاكو خاوێن لە ڕزقو ڕۆزی، شوكرو سوپاسگوزاری بۆ خوا لەسەر بەخشینی ئەو نازو نیعمەتانەی بەسەریانەوە، كە لە گوێڕایەڵیو جێبەجێكردنی فەرمانەكانی بەكاری دەهێنن، وە بەهێزبوونیان بەو هۆیەوە لەسەر ئەوەی بەویان دەگەیەنێ، فەرمانی پێیاندا بەوەی كە پێغەمبەران فەرمانیان پێكردوە لە فەرمایشتی خوا كە دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُوا۟ مِنَ ٱلطَّيِّبَـٰتِ وَٱعْمَلُوا۟ صَـٰلِحًا ۖ إِنِّى بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٥١﴾ ﴾المؤمنون، (واتە: ئەی ڕەوانەكراوان! بخۆن لە خواردنە پاكو خاوێنەكانو كاروكردەوەی چاكیش بكەن).

سوپاسگوزاریی لەم ئایەتەدا ئەنجامدانی كردەوەی چاكەیە، لێرە نەی فەرمووە: (حلالا) حەڵاڵ بێت، چونكە بڕوادار خوا بۆی حەڵاڵ كردوە پاكو خاوێن لە ڕزقو ڕۆزی بە پاكو پوختی، چونكە بڕواكەی دەیپارێزێ لە خواردنو بەدەستهێنانی ئەوەی بۆ ئەو نیە. ئنجا كە دەفەرموێ: ﴿ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴾ واتە: شوكرانە بژێری خوا بكەن، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەر كەس شوكرانەی خوای نەكردبێ، ئەوە خوای بە تاكو تەنهایی نەپەرستووە، هەروەكو ئەو كەسەی شوكرانەی كردبێ بێگومان پەرستوویەتیو ئەوەی فەرمانی پێكراوە ئەنجامی داوە، هەروەها بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە خواردنی پاكو خاوێن (حەڵاڵ) هۆكارە بۆ كردەوەی چاكو وەرگرتنی فەرمانی بە شوكرانە لە دوای نازو نیعمەتەكان، چونكە شوكرانە بژێری ئەو نازو نیعمەتانەی كە هەیە دەیانپارێزی، ئەو نازو نیعمەتانەی كە ونن دەیانهێنێتە پێش، هەروەك چۆن سپڵەیی نازونیعمەتەكانی كە دیار نین دووریان دەخاتەوەو لە دەستیان دەدات، وە ئەو نیعمەتانەشی كە بوونیشیان هەیە نایهێڵێو لە ناویان دەبات.

خوا ﷻ كاتێ باسی ڕێگاپێدانی پاكو خاوێنیەكانی كرد باسی حەڕام كردنی پیسەكانیشی كرد، فەرمووی: ﴿ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةَ ﴾ بریتیە لەوەی مردارەوە

بووبێ بەبێ سەربڕینی شەرعی، چونکە مردارەوە بوو پیسەو زیان بەخشە، لەبەر ئەوەی لە خودی خۆی پیس و پۆخڵ و بێ کەڵکە، چونکە هەندێ جار مردار بوونەکەی لەبەر نەخۆشیە، ئەوە زیانەکەی زیاترە، خوای شەرع دانەر مردارەبووی کوللەو ماسی دەریایی دەرهێناوە لەو گشتاندنە، ئەوان پاک و حەڵاڵن.

﴿ وَٱلدَّمَ ﴾ واتە: خوێنی لەبەر ڕۆیشتوو هەروەکو لە ئایەتەکەی تردا وابەستراوەتەوەو بەنددار کراوە ﴿ وَمَآ أُهِلَّ بِهِۦ لِغَيْرِ ٱللَّهِ ﴾ واتە: سەربڕابێ بۆ غەیری خوا، وەک ئەوەی سەربڕابێ بۆ بتەکان کە بە دەستی خۆیان دروستکراون، وە گۆڕەکان و نموونەی ئەوان، ئەم باسکراوە کورت هەڵهێنەر نیە بۆ هەموو حەرامکراوەکان، بۆ ڕوونکردنەوەی جۆرو ڕەگەزی پیسەکان هێناویەتی، کە دەبێتە بەڵگە بە هۆی تێگەیشتن لە فەرموودەی خوا بە ﴿ طَيِّبَٰتِ ﴾ بۆ هەموو حەرامکراوەکان سوود لە دەقەکەی ڕابردوو وەردەگیرێ لە فەرموودەی خوا: ﴿ حَلَٰلًا طَيِّبًا ﴾ هەروەکو لە پێشتر باسکرا.

بە ڕاستی ئەو پیسیانەی لەسەر ئێمە حەرام کردوە، تەنها لەبەر میهرەبانیو بەزەییەتی بۆمانو پاکبوونەوە لە زەرەرو زیان، لەگەڵ ئەمەشدا ﴿ فَمَنِ ٱضْطُرَّ ﴾ واتە: لەبەر نەبوونی، یان برسیەتی، یان لەبەر ناچاریی (یەکێک) پەنای برد بۆ حەرامکراو ﴿ غَيْرَ بَاغٍ ﴾ واتە: خوازیار نیە بۆ حەرامکراوی لەگەڵ توانا بوونی بۆ حەڵاڵو یان برسی نەبوونی ﴿ وَلَا عَادٍ ﴾ واتە: سنوور نەبەزێنی لە وەرگرتن و خواردنی ئەوەی ڕێگای پێدراوەو بۆی حەڵاڵکراوە لەبەر پێویستیو ناچاری، هەرکەسێ ناچار بوو، وە توانای بەدەستهێنانی حەڵاڵی نەبوو، دەتوانێ بە ئەندازەی پێویست بخوات و زێدەڕۆیی تیادانەکات ﴿ فَلَآ إِثْمَ ﴾ واتە: تاوانو گوناهی لەسەر نیە ﴿ عَلَيْهِ ﴾ ئەگەر نارەحەتیەکە هەڵگیراو بەرز بووەوە، ئەوە کارەکە دەگەڕێتەوە دۆخی پێشووی خۆی، مرۆڤ لەم حاڵەتەدا فەرمانی پێکراوە بە خواردنەوە، بەڵکو قەدەغەی لێکراوە بە دەستی خۆی، خۆی بخاتە هیلاکیو نارەحەتیەوەو نەفسی بکوژێ، کەواتە: پێویستە لەسەری بخوات، ئەگەر واز لە خواردن بهێنێ تا مردن تاوانبار دەبێو دەبێتە بکوژی خۆی، ئەو ڕێگا پێدانەو بەرفرەوانی کردنە لە بەزەیی خوا ﷻ بە بەندەکانی، لەبەر ئەوەشە ئایەتەکەی بەو دوو ناوە بەرێزو پیرۆزەی کۆتایی پێهێناوە کە بە ئەوپەڕی گونجانەوە دەگونجێن لەگەڵی، فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ (واتە: بە ڕاستی خوا داپۆشەری گوناهەکانو بەزەیی گەیەنەرە).

لەبەر ئەوەی حەڵاڵ کردنەکە بەو دوو مەرجە بەستراونەتەوە، مرۆڤیش لەم حاڵەتەدا ڕەنگە بە تەواوی لێی نەکۆڵێتەوە، خوا ﷻ هەواڵیدا کە ئەو میهرەبانەو لێ بوردەیە بەرانبەر ئەو کەسەی کە لەو دۆخەدا هەڵدەکات، بە تایبەت ئەگەر پێویستو ناچاری زاڵ بوو بەسەریدا، بە هۆی نارەحەتیو ماندوو بوونەوە هەستەوەرەکانی لەناو بردو نەیهێشت.

ئەم دەقە دەبێتە بەڵگە بۆ سەر یاساو بنەمایەکی بەناوبانگ: (الضَّرُورَات تبيحُ المَحْظورَات) واتە: پێویستیو ناچاریەکان قەدەغەکراوەکان حەڵاڵو ڕێ پێدراو دەکەن، هەر حەرامکراو قەدەغە کراوێک ئەگەر مرۆڤ ناچارو پێویستی بوو، ئەوە خوا بۆی حەڵاڵ کردوە، ڕێگای پێدەدات،(سوپاسو ستایش بۆ خوا لە سەرەتاو کۆتایو دیارو نادیارەکان).

(١٧٤-١٧٦): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْكِتَـٰبِ وَيَشْتَرُونَ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا أُوْلَـٰٓئِكَ مَا يَأْكُلُونَ فِى بُطُونِهِمْ إِلَّا ٱلنَّارَ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٧٤﴾ أُوْلَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشْتَرَوُا۟ ٱلضَّلَـٰلَةَ بِٱلْهُدَىٰ وَٱلْعَذَابَ بِٱلْمَغْفِرَةِ فَمَآ أَصْبَرَهُمْ عَلَى ٱلنَّارِ ﴿١٧٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ نَزَّلَ ٱلْكِتَـٰبَ بِٱلْحَقِّ ۗ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِى ٱلْكِتَـٰبِ لَفِى شِقَاقٍۭ بَعِيدٍ ﴿١٧٦﴾ ﴾:

ئەمە هەڕەشەیەکی توندە بۆ ئەو کەسەی ئەوە بشارێتەوە کە خوا دایبەزاندووە بۆ سەر پێغەمبەرەکانی (عليهم السلام) لەو زانستەی کە خوا بەڵێنی وەرگرتووە لەسەر شوێنکەوتوانی، کە بۆ خەڵکی ڕونبکەنەوەو نەیشارنەوە، هەر کەسێک لە بری ماڵو سامانی بەجێماوی دونیا، فەرمانی خوا بشکێنێو نەیەوێت، ئا ئەوانە ﴿ مَا يَأْكُلُونَ فِى بُطُونِهِمْ إِلَّا ٱلنَّارَ ﴾ چونکە ئەو نرخەی بەدەستیان هێناوە، بەهۆی خراپترین مامەڵەو مەزنترین حەرامکراوەکان بۆیان دەستەبەر بووە، جا سزاکانیان لە ڕەگەزو جۆری کردەوەکانیانە، ﴿ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ﴾ بەڵکو خەشمی لێگرتوونو فەرامۆشی کردوون، کە ئەمە لەسەریان قورسترە لە سزای ئاگر، ﴿ وَلَا يُزَكِّيهِمْ ﴾ واتە: لە ڕەوشتە نزمەکان پاکیان ناکاتەوە، کاروکردەوەی ئاوایان نیە کە شایستەی وەسفو پیاهەڵدانو پاداشت دانەوە بێ، لەبەر ئەوەی پاکی نەکردنەوە، چونکە ئەوان هۆکارەکانی خۆ پاک نەبوونەوەیان گرتە بەر، چونکە مەزنترین هۆکارەکانی پاکبوونەوە کارکردنە بە پەرتووکی خوا ﷻ، وە هیدایەت وەرگرتنو بانگەواز کردنە بۆی، ئەوانە پشتیان کردوە لە پەرتووکی خواو پشت گوێیان خستووە، گومراییان بەسەر ڕێنوێنیو، سزایان بەسەر لێبوردن (هەڵبژاردوە)، ئەوانە شایەنی هیچ شتێک نین

تەنهـا ئاگـر نەبـێ، چـۆن ئارامـی لەسـەر دەگرن، چـۆن دەتوانـن بەرگـەی بگرن؟!

﴿ ذَٰلِكَ ﴾ ئەوانـەی کـە باسـکراون، بریتیـە لـە پاداشـت دانەوەیـان بـە دادپـەروەری، قەدەغەکردنـی هۆکارەکانـی هیدایـەتو لەوەی پشـتی لـێ هەڵکاو جگـە لـەو هەڵبژێرێ، ﴿ بِأَنَّ ٱللَّهَ نَـزَّلَ ٱلْكِتَـٰبَ بِٱلْحَقِّ ﴾ واتـە: لـە هـەق و دادپـەروەری چاکـە خـوازە بـە چاکەکانـیو، خراپـەکار بـە خراپەکانـی، هەروەها لە وتەی خـوادا: ﴿ ٱللَّهَ نَـزَّلَ ٱلْكِتَـٰبَ بِٱلْحَقِّ ﴾ واتـە: بەڵگەیە لەسـەر ئـەوەی کە خوا دایبەزانـدوە بۆ هیدایەتـی بەدیهێنراوەکانی، بۆئـەوەی ڕاسـتو ناڕاسـت لەیـەک جیابکاتـەوە، بەهەمان شـێوە هیدایەتیش لـە گومڕایی، هەرکەسـێک بـەکاری نەهێنێ بۆ مەبەسـتەکەی هەق وایە بە توندترین شـێوە سـزا بدرێت.

﴿ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِى ٱلْكِتَـٰبِ لَفِى شِقَاقٍۭ بَعِيدٍ ﴾ واتـە: ئەوانـەش لەسـەر ئـەم کتێبـە جیاوازیـان هەیـە، بڕوایـان هێنـاوە بـە هەندێکـی، وە کافـر بـوون بـە هەندێکی تـر، یان ئەوانـەی جێگۆڕکـێو دەسـتکاریان کـردوە بـە گوێـرەی ئارەزووەکانیـان ﴿ لَفِى شِقَاقٍ ﴾ واتـە: دژایەتـیو دوژمنایەتـی ﴿ بَعِيدٍ ﴾ واتـە: لـە ڕاسـتی، لەبـەر ئـەوەی پێچەوانـەی ئـەو پەرتووکەیـان کـردوە کـە هەقـی هێنـاوە، لەسـەریان پێویسـت دەکات ڕێکبکەونو دژایەتـیو پێچەوانـەی نەبـن، کاریان شـێواو شـپرزە بـووە، بەربەرەکانـێو دژایەتیان زۆر بـوو، لـەوەی پەرتەوازەیانـی لـێ کەوتـەوە بـە پێچەوانەی ئـەو خـاوەن کتێبـە پیرۆزانەی بڕوایـان پـێ هێناوە لە هەموو شـتێک حوکـمو بڕیاریـان لێوەرگرتوە، ئـەوان ڕێککەوتنو بـە خۆشەویسـتی کۆبوونەوە لەسـەری.

بێگومـان ئـەو دەقانە هەڕەشـەیان لەخـۆوە گرتووە، بـۆ ئەوانەی ئـەوەی خـوا دایبەزاندووە دەیشـارنەوە، ئەوانـەی پوخڵەواتـی دونیاییان پێش خسـتوە بەسـەر خەشـمو قینیدا، بەڕاسـتی خـوا پاکیـان ناکاتـەوە نـە بـە پشـتگیری کردنیانو نـە بـە لێبـوردن لێیـان، هۆکارەکەی باسـکردوە کـە ئـەوان گومڕاییـان هەڵبـژاردوە بەسـەر هیدایەتـدا، لەسـەر ئـەو بنەمایـە هەڵبژاردنـی سـزا بەسـەر لێبوردنـدا ڕێکدەخرێ.

لـە پاشـان باس لە ناڕەحەتیو ناخۆشـی ئارام نەگرتنیـان دەکات لە ئاگر، لەبـەر کارکردنیان بـەو هۆکارانـەی کـە دەزانـن ئـەوان بـە ئاگریـان دەگەیەنـێ، بـە ڕاسـتی قورئانـی پیرۆز گشـتگیرە لەسـەر هەقو ڕاسـتی کە پێویسـتە کۆدەنگی لەسـەر بکـرێو دووبەرەکـی تێدا نەکـرێ، هەموو ئەوانـەی کە پێچەوانـەی دەجوڵێنەوە، ئـەوە لە ئەوپەڕی دووریـدا لە هەقو ڕاسـتی، خوا باشـتر دەزانێ.

﴿لَيْسَ الْبِرَّ أَن تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ
وَلَٰكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَالْمَلَائِكَةِ
وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ وَآتَى الْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَىٰ وَالْيَتَامَىٰ
وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّائِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ وَأَقَامَ
الصَّلَاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُوا
وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاءِ وَالضَّرَّاءِ وَحِينَ الْبَأْسِ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ
صَدَقُوا وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ
عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالْأُنثَىٰ
بِالْأُنثَىٰ فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ وَأَدَاءٌ
إِلَيْهِ بِإِحْسَانٍ ذَٰلِكَ تَخْفِيفٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ فَمَنِ اعْتَدَىٰ
بَعْدَ ذَٰلِكَ فَلَهُ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٧٨﴾ وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ يَا أُولِي
الْأَلْبَابِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٧٩﴾ كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ
أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ وَالْأَقْرَبِينَ
بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ ﴿١٨٠﴾ فَمَن بَدَّلَهُ بَعْدَمَا سَمِعَهُ
فَإِنَّمَا إِثْمُهُ عَلَى الَّذِينَ يُبَدِّلُونَهُ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٨١﴾

**(١٧٧):** ﴿لَيْسَ الْبِرَّ أَن تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ وَآتَى الْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَىٰ وَالْيَتَامَىٰ وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّائِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ وَأَقَامَ الصَّلَاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُوا وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاءِ وَالضَّرَّاءِ وَحِينَ الْبَأْسِ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾﴾

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿لَيْسَ الْبِرَّ أَن تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ﴾ واتـە: ئـەوە ئـەو چاکـەو ویسـتراوە نیـە لـە بەنـدەکان، زۆر بە دواداچـوونو دەمەدەمێو مانـدوو بـوون تیایـدا هیـچ بەرهـەم ناهێنی، جگـە لـە دووبەرەکـیو نارەحەتی نەبـێ، ئەمەش هـاو وێنەی فەرمـوودەی پێغەمبەرە ﷺ: {لَيْسَ الشَّدِيدُ بِالصُّرَعَةِ وَلَكِنَّ الشَّدِيدَ الَّذِي يَمْلِكُ نَفْسَهُ عِنْدَ الْغَضَبِ} (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٧٢١٨)، وَالْبُخَارِيُّ برقم: (٥٧٦٣)، وَمُسْلِم برقم: (٢٦٠٩)).
واتـە: ئازایەتـی لـە تـوورە بـوونو پەلە کردنـدا نیـە، بەڵکـو ئازایەتـی ئەوەیە نەفسـی خۆت بگـری لـە کاتـی تورەییدا.

﴿وَلَٰكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ﴾ واتـە: (چاکەکاریـی ئەوەیـە بـڕوات وابـێ) بـەوە کـە خـوا پەرسـتراوێکی تاکـەو وەسـفکراوە بـە هەمـوو سیفەتە تـەواوەکان، پاکـە لـە هەمـوو کەمو کورتیـەک.

﴿وَالْيَوْمِ الْآخِرِ﴾ بریتیـە لـە هەمـوو ئەوانـەی خـوا هەواڵی پێـداون لە پەرتووکەکـەی، یان پێغەمبەرەکـەی ﷺ هەواڵـی پێیانداوە لەوانـەی لە دوای مردنـەوە ڕوودەدەن.

﴿وَالْمَلَائِكَةِ﴾ ئەوانـەی خـوا وەسـفی کـردوون بۆمـان لـە کتێبەکەیـدا، وە پێغەمبەرەکەشـی ﷺ وەسـفی کـردوون.

﴿وَالْكِتَابِ﴾ واتـە: ئـەو کتێبانـەی کە خـوا دایبەزانـدووە بۆ سـەر ڕەوانەکراوانـی (علیهم

السـلام) مەزنترینـی پەرتووكەكانیـش قورئانـە، بڕوابێنن بەوەی لـە خۆی گرتووە لـە هەواڵو بڕیـارو حوكمەكان.

﴿ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ ﴾ بە گشتیو بە تایبەتیش كۆتاو پلەدارترینیان موحەممەد ﷺ.

﴿ وَءَاتَى ٱلْمَالَ ﴾ بریتیـە لـە خاوەندارێتـی مـرۆڤ لە سـەروەتو سـامان، زۆر بێ، یـان كەم، واتە: ماڵی ببەخشـێ ﴿ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ﴾ واتە: (لەگەڵ) خۆشەویسـتی (زۆریشـی بۆ) ماڵو سـامان، بەمـە ڕوونی كردۆتەوە كە ماڵو سـامان خۆشەویسـتە لـە لای نەفـسو دەروون، نزیكە لەوەی بەندە دەری نەكاو نەیبەخشـێ.

ئـەوەی بیبەخشـێو دەری بـكات لەگـەڵ ئـەو خۆشەویسـتیەی بـۆی هەیـە، بە هـۆیێ نزیك بوونـەوەی لـە خـوا ﷻ ئـەوە دەیسـلمێنی كە بـڕوادارە، وە لـە بەخشـینی ئەو ماڵو سـامانەی كـە خۆشـی دەوێ، لە كاتێكدا سـاغو سـەلامەتەو ڕەزیلـە، ئومێـدی دەوڵەمەنـدی دەكاتو لە هـەژاری دەترسـێ، هەروەهـا ئەگەر چاكەو بەخشـین لە كەمیـەوە بێت چاكتـرە، لەبەر ئەوەی لـەو حاڵەتـەدا حـەز دەكات دەسـتی پێوە بگرێـت، لەبەر گومـان بردنی لە نەبـوونو هەژاریی.

هەروەهـا دەركـردنو بەخشـینی ماڵـە گرانبەهاكانو ئـەوەی خۆشـی دەوێت لە سـامانەكەی، هـەروەك خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ لَن تَنَالُواْ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ ۝٩٢ ﴾ آل عمـران، (واتـە: ناگاتـە پلـەی هـەرە چاكەكاریـی هەتا لـەوە دەبەخشـن كە زۆرتـان خـۆش دەوێ)، هەمـوو ئەوانە دانو بەخشـینی سـامانو ماڵـە لەگەڵ خۆشویسـتنی.

دوای ئـەوەی باسـی ئەوانـەی كـرد كـە پێیان دەبەخشـرێ، كـە ئەوان لـە پێشـترینی خەڵكن بـۆ چاكـەو خێر لەگـەڵ كردنیان: ﴿ ذَوِي ٱلْقُرْبَىٰ ﴾ (خـزمو نزیكان) ئەوانـەی بە دەردو بەڵاكانیـان ئـازار دەچێـژن، وە بە دڵ خۆشـیان دڵخۆش دەبیـت، ئەوانەی یەكتر سـەردەخەنو خوێـن بـۆ یەكتر دەبژێرن، پاشـان سـەركەوتووترین چاكە، چاكـە كردنە لەگـەڵ نزیكەكان بـە سـامانو وتەو ئامۆژگـاری، بە گوێـرەی نزیكیو پێویسـتیان.

﴿ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ ﴾ ئەوانـەی هیـچ كارێكیـان نیـە، هێزێكیـان نیـە كـە پێـی بـێ نیاز بـن، ئەمە لە بەزەیـی خوایـە بـە بەندەكانی كـە بەڵگەیە لەسـەر ئەوەی ئـەو بەبەزەییتـرە بۆیان لـە باوك بۆ منداڵەكەی، خوا بەڕاسـتی بەندەكانی ڕاسـپاردووەو، پێویسـتی كردوە لەسـەریان لە سامانەكانیان چاكـە بكـەنو ببەخشـن بەوانەی باوكیـان نەماوەو لێیان ون بووە، تا هەسـت بـكات كە باوكی ون نەكـردووەو هەیەتـی، چونكـە پاداشـت بـە پێی كردەوەیـە، هەر كەسـێك بەزەیـی هەبێت بەرانبـەر (منداڵـە) هەتیوی كەسـێكی تر، ئـەوە هەتیوی ئەویـش بەزەیی پـێ دەكرێت.

﴿ وَٱلْمَسَٰكِينَ ﴾ ئەوانـەن کـە پێداویسـتی ڕای وەسـتاندوونو هـەژارو زەبوونـی کـردوون، ئـەوان مافیان هەیە لەسـەر دەوڵەمەنـدەکان بۆ ئەوەی ئـەو نەداریی‌و نەبوونیەیان لەسـەر لابدەن یـان سـووک بکەن، بەوەی لـە توانایان دایەو بۆیـان دەکرێـت ﴿ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ ﴾ بریتیە لەو کەسـەی کە دابـڕاوە لە شـارو جێگای خۆی، خوا بەندەکانی هانداوە لەسـەر بەخشـینی سـامان بـەو کەسـانە، تـا بتوانن گەشـتەکەی پێ تـەواو بکـەن، چونکە گەشـتکردن گومانـی ئەوەی بـۆ دەبـڕێ پێویسـتی لێدابـڕێ بە هـۆی خەرجـی زۆرەوە، جا ئەو کەسـەی کە خـوا نیعمەتی ڕشـتوە بەسـەریداو لە وڵاتـی خۆیەتی‌و لـە حەسـانەوەدایە، پێویسـتە بەپێی توانـا بەزەیی بێت بـە بـرا ڕێبوارەکەیـدا، ئەگەرچـی هاوکاریشـی بـکات بـە جێبەجـێ کردنـی پێویسـتیەکانی گەشـتەکەی، یـان غەدرو سـتەمی لـێ دوور بخاتەوە.

﴿ وَٱلسَّآئِلِينَ ﴾ واتـە: ئەوانـەی بـە هـۆی نەبـوونو نەداریـەوە ناچاربـن‌و داوابکـەن، وەکـو کەسـێک کە تووشـی بـەڵاو موسـیبەتێ بووبـێ، یان کاربەدەسـتان باجیان خسـتبێتە سـەری، یـان داوا لـە خەڵکـی بکات بـۆ چاککردنەوەو ئـاوەدان کردنـەوەی بەرژەوەندیە گشـتیەکان، وەکـو مزگـەوت‌و قوتابخانـەو پـردەکانو هاوشـێوەی ئەوانـە، ئەمـە مافـی ئـەوەی هەیـە ئەگەرچـی دەوڵەمەندیـش بێـت ﴿ وَفِي ٱلرِّقَابِ ﴾ ئازادکـردنو یارمەتی دانی بەنـدە دەچێتە ئـەو چوارچێوەیـەوە، بەخشـینی سـامان بە ئـەو کۆیلە ناونووسـکراوانە (کـە بۆ ئـازاد بوونیان خۆیـان نـاو نووس کـردوە) تاکـو بـە گەورەکەیـان بـدەن، وە پێدانی فدیـە بـۆ ئازادکردنی دیلـەکان کـە لای کافـران، یان سـتەمکارانن.

﴿ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ ﴾ لـە پێشـدا باسـکراوە کـە چەندین جار خـوا ﷻ بەیەکەوەو لەگـەڵ یەکـدی نوێـژو زەکاتی هێنـاوە، لەبەر ئـەوەی چاکتریـن پەرسـتنەکانن‌و تەواوترین نزیککەرەوەکانـن لە خوا (ی پەروەردگار)، پەرستشـەکانی دڵو لاشـەو سـامانیش، بەوانەوەیە برواکێـش دەکـرێو ئـەوەی خاوەنەکەی هەیەتـی لە دڵنیایـی دەزانرێ.

﴿ وَٱلْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَٰهَدُوا۟ ﴾ (العهـد) واتـە: پەیمـان: بریتیە لە پابەنـد بوون بەوەی کـە خـوا دایناوە، یـان پابەندبوونـی بەندەیـە، هەمـوو مافەکانی خـوا دەچێتە نێویـەوە، چونکە خـوا بەندەکانـی پێـوە پابەنـدو پەیوەسـت کـردوە، چونە ژێـر بەڵێـنو پەیمان بەرپـا کردنو ئەداکردنـی لەسـەریان پێویسـت کـردوە، وە مافـی بەندەکان کە پێویسـتی کردوە لەسـەریان، وە ئـەو مافانەیشـی کە بەنـدە پێیانەوە پابەندە وەک سـوێند خـواردنو نەزرەکانو هاوشـێوەی ئەوانەش.

﴿ وَٱلصَّٰبِرِينَ فِي ٱلۡبَأۡسَآءِ ﴾واتـە: هەژاریـی، چونکـە هەژار لە هەمـوو ڕووەکانەوە پێویسـتی بـە ئارامییـە، لەبـەر ئـەوەی ئـازاری دڵو جەسـتەی بەردەوامی بۆ پەیـدا دەبێت، ئـەوەی کە بۆ جگـە لـەو نایێـت. ئەگـەر دەوڵەمەنـدەکان لە نـازو نیعمەتی خۆشـدا بن ئـەو ئـازار دەچێژێ، ئەگـەر برسـی بێت، یان منـداڵو خێزانەکەی برسـیان بێت ئـازار دەچێژێ، ئەگـەر خواردنێک بخـوات بـە گوێرەی نەفسو هـەوای نەبێ ئـازاری پێدەچێـژێ، ئەگەر ڕووتو قـوت بێ، یان نزیکـی ئـەوە بێت ئـازار دەچێژێ، ئەگەر تەماشـای پێش خـۆی بکات، وە ئـەوەی کە گومان دەبـات لـە داهاتوودا تووشـی بـێ ئـازار دەچێژێ، ئەگەر سـەرمای تـوش بـێو نەتوانێ خۆی گـەرم بکاتـەوە خەمبـار دەبێ، هەمـوو ئەوانـەو نموونەی ئەوانەش بـەڵاو ناخۆشـین فەرمان بە ئارامگرتـن کـراوە لەسـەریان، وە ئومێدی پاداشـت لە لایـەن خواوە.

﴿ وَٱلضَّرَّآءِ ﴾واتە: نەخۆشـی بـە هەموو جۆرەکانیانـەوە، لە تاو برینو ئازاری هـەر ئەندامێکی جەسـتە، تاکـو ددانو پەنجـەو نموونـەی ئـەوەش، ئـەوە پێویسـتی بەوەیـە ئارامـی لەسـەر بگیـرێ، چونکـە دڵو دەروون کـزو لاواز دەبێ لاشـەش دەئێشـێ، ئـەوە لەوپـەڕی بارگرانیە لەسـەر دڵـەکان، بـە تایبەتـی ئەگـەر درێژە بکێشـێ، ئـەوە فەرمانی پێکـراوە بـە ئارامگرتنو چاوەڕوانکردنـی پاداشـتی خـوای بەرز.

﴿ وَحِينَ ٱلۡبَأۡسِ ﴾واتـە: کاتـی کوشـتار لـە دژ ئـەو دوژمنانـەی فەرمانـی کوشـتار کـردن لەگەڵیـان دراوە، زەبـرو زەنـگو نارەحەتـیو بارگرانی دەخاتـە سەرجەسـتەو دڵو دەروونیان، مـرۆڤ پەشـۆکاوو شـپرزە دەبـێ لـە کوشـتن، یـان برینـداری، یـان دیـل بـوون، هەربۆیە پێویسـتی بـە ئارامگرتـنو چاوەڕوانـی پاداشـتە، بە ئومێدی پاداشـتی خـوای بەرز، کـە بەڵێنی یارمەتـیو سـەرکەوتنی بە ئارامگـران داوە.

﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ﴾واتـە: ئەوانـەی وەسـفکراون بـەوەی کـە باسـکرا لـە بیرو بـاوەڕو کـردەوەی چـاک، کـە ئەویـش شـوێنەواری ئیمـانو بەڵگـەو ڕووناکیەتـی، ئـەو ڕەوشـتە کـە جوانـی مـرۆڤو تەواوەتـی مرۆڤایەتیـە ئا ئەوانـە ئەوانـەن ﴿ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ ﴾لە بڕواکەیـان، چونکە کاروکردەوەکانیـان بڕواکانیان بە ڕاسـت دەخاتـەوە، ﴿ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُتَّقُونَ ﴾لەبەر ئەوەی وازیـان لـە قەدەغەکـراوەکان هێنـاوەو فەرمانەکانیان بەجێهێنـا، چونکە ئـەم کاروبارانە هەموو ئـاکارو سـیفەتە چاکـەکان لـە خـۆ دەگـرن، بـە لەخـۆ گرتـنو پەیوەسـت، وە لەبـەر ئەوە وەفـا بـە پەیمـانو بەڵێـن هەمـوو ئاین لەخـۆ دەگـرێ، وە لەبەر ئـەوەی عیبادەتە دەق لەسـەر هاتـووەکان لـەم دەقـەدا گەورەترینی عیبادەتەکانـن، هەر کـەس پێیانەوە هەڵسـێو ئەنجامیان

بـدات بێگومـان چاکتـر دەتوانـێ بە غەیـری ئـەوان هەسـتێ، ئەوانـە چاکەکارانی ڕاسـتگۆو پارێزکارن.

بێگومـان زانـرا ئەوەی خوا ڕێکی خسـتوە لەسـەر ئەو سـێ کارانە، لە پاداشـتی دنیـاو دوارۆژ، بێگومـان ناتوانـرێ لـە نموونەی ئـەو جێگایە بە وردو درشـتو درێژی باسـیان بکرێت.

(١٧٨-١٧٩): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِصَاصُ فِي ٱلۡقَتۡلَىۖ ٱلۡحُرُّ بِٱلۡحُرِّ وَٱلۡعَبۡدُ بِٱلۡعَبۡدِ وَٱلۡأُنثَىٰ بِٱلۡأُنثَىٰۚ فَمَنۡ عُفِيَ لَهُۥ مِنۡ أَخِيهِ شَيۡءٞ فَٱتِّبَاعُۢ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَأَدَآءٌ إِلَيۡهِ بِإِحۡسَٰنٖۗ ذَٰلِكَ تَخۡفِيفٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَرَحۡمَةٞۗ فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ بَعۡدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١٧٨﴾ وَلَكُمۡ فِي ٱلۡقِصَاصِ حَيَوٰةٞ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿١٧٩﴾ ﴾:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ﴾ خـوا ﷻ منـەت بەسـەر بەندەکانیـەوە دەکات بـەوەی کە لەسـەری پێویسـت کـردوون، ﴿ ٱلۡقِصَاصُ فِي ٱلۡقَتۡلَىۖ ﴾ واتە: یەکسـانی تێدابێ، بـەوەی بکوژ بکـوژرێ لەسـەر ئەو سـیفەتەی کە کـوژراو پێیەوە کوژراوە، بـۆ بەرپا کردنـی دادپەروەریو دادگەریـی لە نێـوان بەندەکان.

ئاراسـتەی دوواندنەکـە بۆ گشـت بڕوادارانە، ئەمە بەڵگەی ئـەوەی تێدایە کە لەسـەر هەموویان پێویسـتە تەنانـەت بەخێوکـەر نزیکانـی بکوژو، خـودی بکوژیـش، یارمەتی سەرپەرشـتیاری کـوژراو بـدەن ئەگـەر داوای تۆڵـەی کوشـتنەوەی کرد، دروسـت نیە بۆیـان نێوانێـک بخەنە ئـەو سـنوورەوەو ڕێگـری سەرپەرشـتیار بکەن لـە تۆڵە سـەندنەوە، هەروەکو نەریتـی نەفامیو ئەوانـەی بـەوان دەچون لـە پەنادانی کابـرای بکـوژ (تاوانبار).

لە پاشـان درێژەی ئـەوەی ڕوونکردۆتـەوەو فەرموویەتی: ﴿ ٱلۡحُرُّ بِٱلۡحُرِّ ﴾ بـە درکێنراو نێرینە بـە نێرینـەش دەگرێتـە خـۆی، ﴿ وَٱلۡأُنثَىٰ بِٱلۡأُنثَىٰۚ ﴾ (واتـە: مێینـە بە مێینـە) مێینە بـە نێرینەو نێرینـەش بـە مێینـە (دەکـوژرێ)، بـە پێی سـیاقی پێشـێ، وە تێگەیشـتن لە فەرمـوودەی خوا لەگـەڵ بەڵگـەی لـە سـوننەت، لەسـەر ئـەوەی نێرینە بـە مێینـە دەکـوژرێ، لەو گشـتیەتەی دایـکو بـاوک تا بـۆ سـەرەوە (باپیـرە) ناکوژرێنـەوە بـە منداڵیان، لەبـەر هاتنـی فەرموودە لەسـەر ئەوە لەگـەڵ ئەوەی لە فەرمـوودەی خـوا ﴿ ٱلۡقِصَاصُ ﴾ بەڵگەی تێدایە لەسـەر ئەوەی دادپەروەریـی نیـە بـاوک بـە منداڵەکـەی بکـوژرێ، چونکـە لـە دڵی باوکـدا بەزەییو سـۆز هەیـە کـە قەدەغـەی دەکات لـە کوشـتنی منداڵەکـەی، مەگـەر بـە هـۆی کـەمو کورتی لە هـۆشو عەقڵیـدا بێ، یـان ئازارێکـی زۆر توندی باوکی بدات، بە هەمان شـێوە لەو گشـتاندنە دەردەچـێ بێـڕوا بە سـوننەت، لەگـەڵ ئەوەدا دەقەکـە لەگەڵ بـڕواداران دەدوێنێ بـە تایبەت.

بـە هەمـان شـێوە دادپـەروەری نیە کوشـتنی دۆسـتی خـوا لە بـری دوژمنی خـوا، ﴿ وَٱلۡعَبۡدُ بِٱلۡعَبۡدِ ﴾ نێرینەبـێ، یـان مێینـە نرخیـان یەکسـان بێـت یان جیـاواز بێـت. و بە تێگەیشـتن‌و (مفهوم)ەکـەی بەڵگـە هەیـە لەسـەر ئـەوەی ئـازاد بـە کۆیلـە ناکوژرێتـەوە، لەبـەر ئـەوەی یەکسـان نیـن، ﴿ وَٱلۡأُنثَىٰ بِٱلۡأُنثَىٰ ﴾ هەندێـک لـە زانایان دەسـتیان بـە تێگەیشـتن‌و (مفهوم) ەکـەی وەگرتـووە، هەق نیە (لـە لایان) پیاو بـە ژن بکوژرێتەوە، دوای ئەوەی باسـکراو ڕابرد. ئـەم دەقە بەڵگەیە لەسـەر ئەوەی کە ئەسـڵ‌و بنەما ئەوەیە پێویسـتە تۆڵە بکرێتەوە لە کوشـتندا، وە خوێنـدان لـە بری ئـەوە جێگـای دەگرێتەوە، بۆیـە فەرموویەتـی: ﴿ فَمَنۡ عُفِيَ لَهُۥ مِنۡ أَخِيهِ شَيۡءٞ ﴾ واتـە: خاوەنـی کـوژراو لـە بکـوژ خـۆش بـوو، داوای خوێنی کـرد، یـان هەندێک لـە خـاوەن خوێنـەکان لێی خۆش بـوون، ئـەوە تۆڵەی کوشـتنی لەسـەر نامێنـێ‌و خوێن بایی پێویسـت دەبێـت، هەڵبژاردنـی تۆڵە بەکوشـتن یـان هەڵبژاردنی خوێـن بایـی دەگەڕێتەوە بۆ خـاوەن کوژراو،

جـا ئەگـەر لێـی خـۆش بـوو، ئـەوە پێویسـتە لەسـەر خاوەنی کـوژراو کـە لەگـەڵ بکوژدا ﴿ بِٱلۡمَعۡرُوفِ ﴾ بـە چاکـە مامەڵـە بکات، بـا ئەرکێ نەخاتە سەرشـانی کـە لە توانایـان نەبێت، بەڵکـو داواو داخـوازی جـوان‌و باش بـکات‌و شـەرمەزاری نەکات.

لەسـەر بکوژیشـە ﴿ وَأَدَآءٌ إِلَيۡهِ بِإِحۡسَٰنٖ ﴾ بەبـێ درێـژ کردنـەوەو کـەم‌و کورتـی‌و خراپەی کرداریـی‌و گوفتاریـی خوێـن بابیەکـەی بـدات، ئایـا پاداشـتی چاکە نابـێ بە چاکە بـێ؟ جا ئـەوە فەرمـان پێکـراوە لە هەمـوو ئەوەی کە لـە گەردنی خەڵکیـدا جێگیر بوە، فەرمـان کراوە ئـەو کەسـەی کـە مافـی لای خەڵکیە شـوێنی چاکـە بکەوێـت، وە ئەو کەسـەیش کـە مافی لەسـەرە بـە چاکترین شـێوە ئـەدای بکات.

لـە فەرمـوودەی خـوا ﴿ فَمَنۡ عُفِيَ لَهُۥ مِنۡ أَخِيهِ ﴾ ئـەم دەقە هاندانـی تێدایە لە سـەر لێبوردن لە خوێـن بایـی، کە باشـتر وایە ئـازادی بکات بـە خۆڕایی‌و هیچـی لێوەرنەگرێ.

لـە فەرمـوودەی خـوا: ﴿ أَخِيهِ ﴾ بەڵگەیە لەسـەر ئەوەی بکـوژ کافر نابێت، چونکە مەبەسـت بـە برایەتـی لێـرەدا برایەتی ئیمانـە، بە کوشـتنی لـەو ئیمانداریـە دەرناچێت، وە لە پێشتریشـە تێکـڕای سـەرپێچیەکان جگـە لە کوفـر بکەرەکەی پێـی کافر نابێـت، بەڵکو تەنهـا بەم کارە بڕواکەی کـەم دەبێتەوە.

جـا ئەگـەر خـاوەن خوێنـەکان خـۆش بـوون، یـان هەندێک لە ئـەوان، ئـەوە خوێنـی بکوژ پارێـزراو دەبـێ، لە دەسـتی ئەوان‌و غەیـری ئەوانیش، لەبـەر ئەوەیە خـوا فەرموویەتی: ﴿ فَمَنِ

ﭐعۡتَدَىٰ بَعۡدَ ذَٰلِكَ ﴾ واتـە: لـە دوای لێخۆشـبوون ﴿ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴾ واتـە: لـە دوارۆژدا بەڵام کوشـتن‌و نەکوشـتنی لەوەی پێشـوو وەردەگیرێ، لەبەر ئەوەی هاوتای خۆی کوشـتووە، ئـەوە کوشـتنەوەی پێویسـت دەبـێ، بەڵام ئـەوەی کە سـزای بـە ژان‌و ئێش بە کوشـتن ڕاڤە کـردوە، بێگومـان دەقەکـە بەڵگەیە لەسـەر ئـەوەی دەبـێ بکوژرێ، دروسـت نیـە لێی خۆش بـێ، ئەمەش وتـەی هەندێک لـە زانایانە، ڕای دروسـت، ڕای یەکەمە چونکـە تاوانەکەی زیاتر نیـە لـە تاوانی کەسـێکی تر.

پاشـان خـوا ﷻ حیکمەت‌و مەزنی خۆی دەربـارەی تۆڵەکردنەوە ڕوونکردۆتـەوە، فەرموویەتی: ﴿ وَلَكُمۡ فِي ٱلۡقِصَاصِ حَيَوٰةٞ ﴾ واتـە: بەوشـێوەیە خوێنـەکان دەپارێزرێـن، وە دەبێتـە پەنـد بۆ بەدبەخـت‌و خراپـەکاران، چونکـە ئەگەر بزانێ ئـەو دەکوژرێتـەوە، ئەگەرکەسـێک بکوژێ، ئـەوە هەرگیـز دەستپێشـخەری نـاکات بۆ کوشـتن ، ئەگـەر کوژراو بـە بکوژ نیشـان بدرێ، دەتۆقـێ‌و دەپەشـۆکێ، ئەگـەر سـزای بکوژ کوشـتن نەبـێ، ئەوە دەسـت هەڵگرتـن لەخراپە کۆتایـی پێ نایـەت، هەروەها تێکڕای سـنوورە شـەرعیەکان، کوشـتن ئابڕووچون‌و ڕیسـوای بـەدوای خۆیـدا دەهێنـێ، کە ئەویش بەڵگەیە لەسـەر دانایـی‌و لێبوردەیی خوا. وشـەی (الحیاة) ی بە نەناسـراو هێنـاوە، لەبـەر زۆری‌و مەزنی.

کاتێـک کـە ئـەم حوکـم‌و بڕیـارە حەقیقـەت‌و ناوەڕۆکـی نازانرێ، جگـە لە کەسـانی ژیرو تێگەیشـتوو نەبـێ، بۆیـە تایبەتـی کـردون بـە دوانـدن، ئەمـە بەڵگەیە لەسـەر ئـەوەی خوای گـەورە ئـەو بەندانـەی خۆش دەوێت کـە بیرکردنـەوەو هۆشـیان بەکاردێنـن، لەوردبونەوە لە بڕیـارو حوکمەکانـی، وە ئـەو بەرژەوەندیانـەی کـە بەڵگەن لەسـەر تەواویەتـی‌و کارلەجێی‌و دادپـەروەری خوا، ئەوەی لەو ئاسـتەدابێ بەڕاسـتی شایسـتەی پیاهەڵدانە، بـەوەی خاوەن هۆش‌و ژیریـەکان ئەوانـەن کـە دواندنیان ئاڕاسـتە کـراوە، پەروەردگاری پـەروەردە کـراوان بانگی کـردوون، ئەمـە گەورەتریـن پلـەو ڕێزدارییە بـۆ خەڵکانێک کـە ژیرن‌و خـاوەن عەقڵن.

فەرمـوودەی خـوا: ﴿ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴾ ئـەوەی پەروەردگاری بناسـێ، هەرچـی لە ئایین‌و ڕێبازەکـەی‌و شـەرعەکەی هەیە، لـە نهێنییە مەزنەکان،وە لـە دانایە سەرسـوورهێنەرو ئایەت‌و نیشـانە بـەرزەکان، ئـەوە ئەوە پێویسـت دەکات کـە ملکەچ بێ بـۆ فەرمانی خوا، سـەرپێچی‌و گوناهەکانـی بـە گـەورە دەزانـێ‌و وازیـان لـێ دێنـێ، بەمـەش شایسـتەی ئـەوە دەبـێ ببێتە یەکێـک لە پارێـزکاران.

(١٨٠-١٨٢): ﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا ٱلْوَصِيَّةُ لِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ بِٱلْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٨٠﴾ فَمَنۢ بَدَّلَهُۥ بَعْدَ مَا سَمِعَهُۥ فَإِنَّمَآ إِثْمُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يُبَدِّلُونَهُۥٓ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٨١﴾ فَمَنْ خَافَ مِن مُّوصٍ جَنَفًا أَوْ إِثْمًا فَأَصْلَحَ بَيْنَهُمْ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٨٢﴾ ﴾

﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمْ ﴾واتـە: خوا لە سـەرتانی پێویسـت کردوە، ئەی گەلی بـڕواداران: ﴿ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ ﴾ واتـە: هۆکارەکانـی، وەک نەخۆشـی، ئەو نەخۆشـیەی کە نزیکە لـە مـردن، وە ئامادە بوونـی هۆکارەکانـی لەناوچـوون، بێگومان کـە ﴿ تَرَكَ خَيْرًا ﴾ واتە: مـاڵو سـامانێکی (جێ هێشـتبێت) کـە بریتیە لە سـامانو ماڵێکی زۆر بـە گوێرەی عورفـو نەریـت، لەسـەریەتی وەصیـەت بکات بـۆ دایکو بـاوکو کەسـە نزیکەکەی بەباشـی، بە ئەنـدازەی حاڵـی خـۆی بەبـێ زێدەڕۆیـی، بەبـێ ئـەوەی دوورەکان بێبـەش بـکاتو مافی نزیکـەکان بـدات، بەڵکـو بـە گوێـرەی نزیـک بـوونو پێداویسـتی ڕێکیان بخـات، لەبەر ئەوەیە بـە (أفعـل التفضیـل) هێناویەتی.

فەرمـوودەی خـوا: ﴿ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ﴾ بەڵگەیـە لەسـەر پێویسـتی ئـەوە، چونکە هەقو مـاف بریتیـە لە جێگیـر بـوون، بێگومان خـوا کردوویەتیـە هۆکارێک بۆ پێویسـت بوونی پارێزکاری.

بزانـە بەڕاسـتی زۆرینـەی ڕاڤەکارانـی قورئـان پێیـان وایـە کـە ئەم دەقە نەسـخ کـراوە بە ئایەتـی میـرات، هەندێکیشـیان وا دەبینـن کـە دەقەکـە دەربـارەی دایکو باوکو کەسـە نزیکەکانـە، جگـە لـە میراتگران، لەگـەڵ ئەوەی هیـچ بەڵگەیەک لەسـەر تایبـەت کردنی ئـەوە ناگەیەنـێ، چاکتـر لەوەدا ئەوەیە بوترێ: بەڕاسـتی ئـەو وەصیەتە بۆ دایـکو باوکانو خزمـە نزیکـەکان کـورت هەڵهاتـوە، خـوای بەرزیـش گەڕاندویەتیـەوە بۆ نەریـتو باوی کارپێکـراوی نێـوان خەڵک .

ئنجـا بێگومـان خـوا ﷻ ئەندازەی دایـکو بـاوکو کەسـە نزیکەکانی، وە جگـە لەوانیش لـە میراتگـران بـە چاکی دیـاری کردوە لـە ئایەتەکانـی میرات، لـە پاش ئـەوەی کورتو (مجمـل) بـوو، بڕیـارو حوکمەکـە مایەوە بـۆ ئەوانەی میراتیـان وەرنەگرتووە لـەو دایکو باوکانـەی قەدەغـەن لـە میـرات،وە جگـە لەوانیـش لـەو کەسـانەی بـێ بـەش بوونـە بـە کەسـێک، یان، وەسـفێک، مـرۆڤ فەرمان پێکـراوە بە ڕاسـپاردن بۆ ئەوانـە، چونکە ئەوان لـە پێشـترو هەقتـرن، ئـەو وتنـە ئۆممەت لەسـەری یەک دەنگـە، وە دەسـتەبەر دەبـێ پێی

کۆکردنـــەوەی نێــوان ئــەو دوو وتــەی پێشــوو، لەبەر ئــەوەی هەریــەک لەوانە ســەرنجێکی دەوێ بــە ســەرنجدان، هێنراوەکەیان جیــاواز بوو.

بــەم کۆکردنــەوە ڕێککەوتــن لە نێــوان دەقــەکان پەیدا دەبــێ، لەبەر ئەوەی تــا کۆکردنەوە بگونجــێ چاکترە لە بانگەشــەی نەســخ کــردن، بەبێ بەڵگەی دروســت.

لــە کاتێــک ئەو کەســەی وەســیەت دەکات ڕێگــری لێدەکرێ لە وەســیەت کــردن، کە وا گومــان بیات ئــەوەی پاش خۆی ڕایســـپاردوە ڕەنگە بگــۆڕدرێ، بۆیە خــوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ فَمَنۢ بَدَّلَهُۥ ﴾ واتــە: ڕاســپاردە بۆ ئەوانەی باســکران، یان جگە لــەوان، ﴿ بَعۡدَ مَا سَمِعَهُۥ ﴾ واتــە: لــە دوای ئــەوەی تێگەیشــتو هۆشــیکردو ڕێگاکانــیو جێبەجێ کردنە کــەی زانیو ناســی، ﴿ فَإِنَّمَآ إِثۡمُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يُبَدِّلُونَهُۥٓ ﴾ (واتــە: بە ڕاســتی گوناهەکەی تەنیا لەســەر ئەوانەیە کە دەیگۆڕن)، ئەگەرنا ڕاســپاردەکار پاداشــتی کەوتۆتە ســەر خوا، بەڕاســتی گوناهەکەشــی تەنها دەکەوێتە ســەر ئــەوەی گۆڕانــکاری تێداکردوە.

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ هەمــوو دەنگــەکان دەبیســتێ، لەویشــەوەیە قســەی ڕاســپاردەکارو ڕاســپاردەکەی دەبیســتێ، دەبــێ چاودێــری ئــەوە بکات کــە دەیبینێو دەیبیســتێ، ستەمو زێدەڕۆیــی نــەکات لــە ڕاســپاردەکەی، ﴿ عَلِيمٌ ﴾ (واتە: زانایــە) بە نیازو مەبەســتەکەی، وە زاناشــە بە کــردەوەی ئامۆژگاریکــراو، ئەگەر ئامۆژگاریکراو کۆشــش بــکات ، خوا ئەوەی لەنیــازو مەبەســتی دەزانێ، پاداشــتی دەداتــەوە ئەگەر هەڵــەش بــکات، وە ئاگادارکردنەوەی تێدایــە بــۆ ئامۆژگــاری کراو لــەوەی بیگۆڕێ، بەڕاســتی خــوا پێــی زانایە، ئاگــادارو بینەرە بەســەر کارەکــەی، با بترســێ لە خــوا. ئەمــە بڕیــاری وەســیەتێکی دادپەروەرانەیە.

فَمَنْ خَافَ مِن مُّوصٍ جَنَفًا أَوْ إِثْمًا فَأَصْلَحَ بَيْنَهُمْ فَلَآ إِثْمَ
عَلَيْهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٨٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُتِبَ
عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ
لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٨٣﴾ أَيَّامًا مَّعْدُودَٰتٍ ۚ فَمَن كَانَ
مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ۚ وَعَلَى
ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ۖ فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا
فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ ۚ وَأَن تَصُومُوا۟ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١٨٤﴾
شَهْرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلْقُرْءَانُ هُدًى لِّلنَّاسِ
وَبَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْهُدَىٰ وَٱلْفُرْقَانِ ۚ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ
ٱلشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ۖ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ
مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ۗ يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ
ٱلْعُسْرَ وَلِتُكْمِلُوا۟ ٱلْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُوا۟ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا
هَدَىٰكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٨٥﴾ وَإِذَا سَأَلَكَ
عِبَادِى عَنِّى فَإِنِّى قَرِيبٌ ۖ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ ۖ
فَلْيَسْتَجِيبُوا۟ لِى وَلْيُؤْمِنُوا۟ بِى لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴿١٨٦﴾

بەڵام ئەو وەسیەتەی گوناهو لادانو ستەمی زۆری تێدایە، پێویستە ئەوەی ئامادە دەبێ لەلای وەسیەتکار لە کاتی ڕاسپاردەکردنەکەی ئامۆژگاری بە چاکترو دادپەروەرانەتر بکات، وە قەدەغەشی لێ بکات لە ستەمو بەلاڕێبردنو لادان، ئەوە لادانیەتی لە هەڵەکردن بەبێ نیازو مەبەست، وە گوناهیش، کە بریتیە لە بە نیازو مەبەست کردن بۆ ئەوە، ئەگەر ئەوەی نەکرد، دەبێ ئاشتەوایی‌و چاکسازیی لە نێوان وەسیەت بۆ کراوان بکات، وە بگاتە دادپەروەری لە نێوانیاندا لە سەر ڕەزامەندیی‌و ئاشتەوایی ئامۆژگاریان بکات بە بەری بوونو لادانی ئەوەی لەسەر شانی مردووەکەیانە، بێگومان ئەمە چاکەیەکی مەزنی کردوەو گوناهی لەسەر نیە، وەک چۆن لەسەر ئەوەیە کە وەسیەتی دروستی گۆڕیوە لەبەر ئەوەیە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ واتە: لە هەموو گوناهەکان دەبورێ، لەوەش خۆش دەبێ کە دانی بە خۆیدا گرتووەو وازی لە هەندێ مافی خۆی هێناوە، چونکە ئەوەی ببورێ ئەوە خوا لێی دەبورێ، لێبوردەیە بۆ ئەو مردووەیان کە ستەمی لە وەسیەتەکەی کردوە، ئەگەر هەندێکیان لە هەندێکی تریان ببورن بەهۆی ڕزگار کردنی گەردنی مردووەکەیان، بە سۆزە بەرانبەر بەندەکانی، لەبەر ئەوەی شەرع بۆیانی داناوە، بە هۆی ئەوەوە بەزەیی بەیەکتر دەکەنو سۆز بۆ یەکتر دەردەبڕن.

ئەم دەقانە دەبنە بەڵگە لەسەر هاندان لەسەر ڕاسپاردەو وەسیەت کردن، وە لەسەر ڕوون کردنەوەی ئەوە بۆ کێیە؟ وە لەسەر هەڕەشە کردن لە گۆڕینی ڕاسپاردەو وەسیەت، وە هاندانە لە ڕاسپاردەی دادپەروەرانەو دروست.

(١٨٣-١٨٥): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن

قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٨٣﴾ أَيَّامًا مَّعْدُودَٰتٍ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ
مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ
وَأَن تَصُومُوا۟ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١٨٤﴾ شَهْرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلْقُرْءَانُ
هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْهُدَىٰ وَٱلْفُرْقَانِ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ
وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا
يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ وَلِتُكْمِلُوا۟ ٱلْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُوا۟ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ وَلَعَلَّكُمْ
تَشْكُرُونَ ﴿١٨٥﴾ ﴾:

خـوا ﷻ هەواڵی دەدا بەوەی کە منەتی کردوە بەسـەر بەندەکانی، بەوەی ڕۆژووی لەسـەریان پێویسـت کردوە، هەروەکو لەسـەر ئۆممەتەکانی پێشـووی پێویسـت کردبوو، لەبەر ئەوەی لـەو فەرمانو یاسـایانەیە کـە بەرژەوەنـدی تێدایە بـۆ بەدیهێنـراوەکان لە هەمـوو کاتێکدا، وە هاندانیـش لـە خـۆ دەگـرێ بـۆ ئـەم ئۆممەتە، بـەوەی کە دەبـێ ئێـوە پێشـبڕکێ بکەن لەگـەڵ غەیـری خۆتاندا بـۆ تەواوکردنی کارەکان، پەلەکـردن بەرەو ڕەفتـارە چاکەکان، لە ڕاسـتیدا ئـەوە لە کارە قـورسو گرانـەکان نیە، کە ئێـوە پێیانەوە تایبـەت کراون.

پاشـان خـوا ﷻ باسـی کارلەجێیـیو دانایـی خـۆی کـردوە لـە شـەرعیەت بوونـی ڕۆژدا، فەرموویەتی: ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ بەڕاسـتی ڕۆژوو لە گەورەترین هۆکارەکانی پارێزکاریـیە، چونکـە جێبەجێکردنـی فەرمانـی خـواو دوورکەوتنەوە لـە قەدەغەکانـی تێدایە.

ئـەوەی لەخـۆی دەگـرێ لـە پارێـزکاری ئەوەیـە: ڕۆژووگـر خـۆی دەگرێتـەوە لەوانەی خـوا لەسـەری قەدەغە کـردوە لە خـواردنو خواردنـەوەو سـەرجێیو نموونـەی ئەوانە، کە نەفسـی مـرۆڤ ئـارەزووی دەکات، بـە وازهێنـان لێـی ئومێـدو پاداشـتی هەیە، ئەمەشـە لە خۆپارێـزیو لەخوا ترسـانە.

لەوانـە: ڕۆژووگـر نەفـسو دەروونی ڕادێنێ لەسـەر چاودێـری خوای گەورە، ئـەوەی دڵو دەروونـی ئارەزوویـان دەکات وازی لـێ دەهێنـی، لەگەڵ ئەوەی تواناشـی هەیە بەسـەریدا، وازیـان لـێ دێنـێ لەبەر ئـەوەی دەزانێ کە خـوا دەیبینێـتو چاودێرە بەسـەریەوە.

لەوانـە: ڕۆژووگـر شـوێنی ڕۆیشـتنو ڕێچکەکانی شـەیتان بەرتەسـک دەکاتـەوە، چونکە شـەیتان لاواز دەبـێو گوناهـو سـەرپێچیەکانی لێ کـەم دەبێتەوە.

لەوانـە: ڕۆژووگـر بە زۆری خواپەرسـتیەکانی زیـاد دەبێـت، وە عیبادەتیش لە نیشـانەکانی تەقـواو خۆپارێزیە.

لەوانــە: دەوڵەمەند ئەگەر برسـیەتی چەشـت، ئەوە هــەژارو بێدەرەتانەکانــی دەکەوێتەوە یاد، تـا دڵنەوایی‌و هاوکاریان بـکات، ئەمەش لە سـیفەت‌و ڕەفتارەکانی پارێـزکاری‌و تەقوایە.
لەوکاتـەی باسـی پێویسـتی ڕۆژوبوونی کـرد لەسـەریان هەواڵیدا کـە ئەو چەنـد ڕۆژێکی ﴿مَّعۡدُودَٰتٍ﴾ (ژمێـردروان) واتە: کەمـن‌و لەوپەڕی ئاسانیشـدان.
پاشـان ئاسـانی کرد، بە ئاسـانکردنێکی دیکە کە فەرموویەتـی: ﴿فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٖ فَعِدَّةٞ مِّنۡ أَيَّامٍ أُخَرَ﴾ ئەوەش لەبەر بارقورسـی‌و گرانیـە لە زۆربەی کاتەکاندا، خـوا مۆڵەتی ڕۆژوو شـکانی داوە بۆ هەردووکیان (نەخۆش‌و گەشـتیار).
لەبــەر ئــەوەی هەردەبــێ بەرژەوەنـدی ڕۆژو بوون بـۆ هەمـوو برواداڕێک بێــت، فەرمانیان پێکــرا (نەخــۆش‌و گەشـتیارانی بەڕۆژو نەبــن) لە کاتی لاچــوون‌و نەمانی نەخۆشــی‌و تەواو بوونی گەشــت‌و خۆشــی‌و پشــوو دان بیانگرنەوە.
لــە فەرمــوودەی خــوا: ﴿فَعِدَّةٞ مِّنۡ أَيَّامٍ﴾ بەڵگــەی تێدایــە لەســەر ئــەوەی ژمــارەی ڕۆژەکانــی ڕەمــەزان تــەواو بــێ، یــان کــەم دەیانگرێتــەوە، لەســەر ئــەوەش کە دروســتە ڕۆژانــی کورتــی ســەرما لە جیاتــی ڕۆژانــی درێژی گەرمــا، یــان بەپێچەوانــەوە بیگرنەوە.
وە وتــەی خــوا: ﴿وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ﴾ واتــە: ناتوانــن بــەڕۆژوو بــن ﴿فِدۡيَةٞ﴾ لە جیاتــی هــەر ڕۆژێــک کە بــە ڕۆژو نەبــوون تیایــدا﴿طَعَامُ مِسۡكِينٖ﴾ ئەوە لەســەرەتای پێویســت بوونــی ڕۆژوودا بــوو، ئەوکاتــەی کــە ئــەوان ڕانەهاتبــوون بــە ڕۆژوو گرتــن، پێویستەکەشــی حەتمــی بــوو، بارقورســی‌و گرانــی تێدابوو لەســەریان، خوا بە شــێنەیی‌و پلە پلەیــی بــە ئاســانترین ڕێگا ســەری خســتن، بــێ تواناى سەرپشــک کــرد بــۆ ڕۆژوو گرتن لــە نێــوان ئــەوەی یــان بــە ڕۆژوو بێت -کــە باشــترە- یان خــواردن بــدات، لەبــەر ئەمەیە فەرموویەتــی: ﴿وَأَن تَصُومُواْ خَيۡرٞ لَّكُمۡ﴾ (واتــە: ئەگــەر بە ڕۆژوو بــن بۆتان چاکترەو خێرترە).
لــە پــاش ئــەوە خــوا ڕۆژوو گرتنــی ســەپاندو پێویســتی کرد لەســەر کەســی توانــادار، وە ئەوەشــی لــە توانایــدا نیــە ڕۆژوو ناگــرێ‌و لــە ڕۆژانــی دی قەرەبــووی دەکاتەوە.
وتراویشــە: ﴿وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ﴾ واتــە: زۆر لــە خۆیان دەکەن‌و لەســەریان قورس‌و گــران دەبێ بــە قورس‌و گرانیــەک کە هەڵناگیــری، وەکو پیــرو بەســاڵاچوو، فیدیە دەدەن لەبــری هــەر ڕۆژێ خواردنی کەسـێکی هەژار دەدەن، ئەم بۆچوونە ڕاســت‌و دروســتە.
﴿شَهۡرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلۡقُرۡءَانُ﴾ واتــە: ئــەو ڕۆژووەی لە ســەرتان پێویســت

کــراوە بریتیــە لــە مانگــی ڕەمــەزان، مانگی مــەزن ئەوەی کــە لە لایــەن خواوە بەخششــی مەزنتــان بــۆ دەســتەبەر بــووە، ئەویــش قوڕئانــی بــەرزو پیــرۆزە کــە ڕێنمایــی تێدایــە بۆ بەرژەوەندیــە ئایینــیو دونیاییە کانتــان، وە ڕوونکردنــەوەو ئاشــکرا کردنــی هەقــی تێدایــە، هەقــی ڕوون کردوەتــەوە بــە جوانتریــن شــێوە، جیــاوازی کــردوە لــە نێــوان ڕەوایەتــیو نارەوایەتــی، ڕێنوێنــیو گومرایــی،وە کەســی بەختــەوەر و بەدبەخــت.

هەقــی خۆیەتــی مانگێــک ئــەم هەمــوو فــەزڵو چاکــەی هەبــێ بەگــەورە تەماشــا بکرێ، ئەمــەش چاکــەی خوایــە بەســەرتانەوە کــە وەرزەکانــی بــۆ پەرســتنو ڕۆژوو بوونــی تیادا پێویســت بکرێت.

کاتــێ کــە بڕیــاری پێــداو فــەزڵو پایــەی ڕوونکردنــەوە، وە حیکمــەتو دانایــی خوا ﷻ لــە تایبــەت کردنیدا، فەرموویەتــی: ﴿ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهۡرَ فَلۡيَصُمۡهُۖ ﴾ ئــەوە یادکردنو پێویســت بوونــی ڕۆژووگرتنە لەســەر ئــەو کەســەی لەتوانایدایــەو لە شــوێنی خۆیدایە.

لەبــەر ئــەوەی نەســخو هەڵوەشــانەوە بــۆ ســەر پشــک بوونــە لــە نێــوان بــە ڕۆژوو بوونو فیدیــە دان بــە تایبەتــی، مۆڵەتــی بــۆ نەخــۆشو گەشــتیاری دووبارە کــردەوە، تــا گومانی ئــەوە نەبردرێ کــە مۆڵەتەکەش لادراوە هەڵوەشــێنراوەتەوەو نەســخکراوەتەوە، فەرموویەتی: ﴿ يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلۡيُسۡرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلۡعُسۡرَ ﴾ واتــە: خــوا ﷻ دەیەوێــت ڕێگاکانی گەیشــتن بەڕەزامەنــدی خۆیتــان زۆر بــۆ ئاســان بــکات، لەبەر ئەوەیــە هەمــوو ئەوانەی خوا فەرمانــی پێیان کــردوە بــە بەندەکانی لەوپــەڕی ئاســانیدان لــە بنەڕەتدا.

ئەگــەر هەندێــک کۆســپو تەگەرە دروســت بوو کــە دەبووە مایــەی بار قورســیو گرانی، ئــەوە بەشــێوەیەکی تــر بۆی ئاســان کردوە، یــان بەلادانو کەوتنی یان بە ئاســانو ســووک کــردن بە جۆرەها شــێوە ئاســان کردن.

ئەوانــە پوختەیــە ناتوانــرێ درێــژو وردبکرێتــەوە، چونکــە وردکردنەوەو درێــژ کردنەوەی هەمــوو شــەرعیەکانە، وە هەمــوو مۆڵەتو ســووکو ســاناکردنەکانی دەچنــە نێوی.

﴿ وَلِتُكۡمِلُواْ ٱلۡعِدَّةَ ﴾ ئەمــە -خــوا چاکتر دەزانــێ- تا کەســێک گومانی ئــەوە نەکات مەبەســت لــە ڕۆژووی مانگــی ڕەمــەزان بــە هەندێک لــە ڕۆژەکانی بە دەســت دێــت، ئەم گومانــەی بــەوە هەڵگرتــوە بــە فەرمانــی کردن بــە تەواوکردنــی مانگەکــە، وە بــە تەکبیر کــردن (اللــە أکبــر) کــردن لە کاتی تــەواو بوونــی، دەچێتــە ئەو چــوار چێوەیــەوە تەکبیر کــردن لــە کاتی بینینــی مانگی شــەوال، تــا تــەواو بوونی وتــاری جەژن.

(١٨٦): ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُواْ لِي وَلْيُؤْمِنُواْ بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴿١٨٦﴾ ﴾:

ئەمە وەڵامی پرسیارە، هەندێک لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ پرسیاریان لێکردو وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا پەروەردگارمان نزیکە بە (دەنگی نزم) بانگی بکەین، یان دوورە (بە دەنگی بەرز) هاواری لێ بکەین؟ جا ئەم دەقە دابەزی: ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ ﴾ چونکە خوا ﷻ چاودێری بینەرو لێ دیارە، ئاگادارە بە نهێنیو ئەوەی شاردراوەتەوە، دەزانێ بە ناپاکی چاوەکانو ئەوەی لە سینگو دڵەکاندا شاردراونەتەوە، هەروەها بە وەڵامدانەوەی ئەو کەسەش نزیکە کە لێی دەپاڕێتەوە, لەبەر ئەوەش فەرموویەتی: ﴿ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ ﴾ نزاو پاڕانەوە دوو جۆرە:

نزاو پاڕانەوەی پەرستنو نزاو پاڕانەوەی داواکردن، وە نزیکی دوو جۆرە:

نزیک بوونەوە بە زانستی لە هەموو خەڵکی، نزیکیەکیش لە بەندەکانی ئەوانەی بەندایەتی دەکەنو بانگی دەکەنو لێی دەپاڕێنەوە، بە وەڵامدانەوەو یارمەتیو پشتگیری کردنیان.

ئەوەی بە دڵێکی ئامادە نزاو پاڕانەوەیەکی شەرعی بانگی پەروەردگاری کردبێو لێی پاڕابێتەوە، وە هیچ بەربەستو لەمپەرێکی لەبەردەم بانگو پاڕانەوەکەیدا دروست نەکردبێ، وەک خواردنی حەرامو نموونەی ئەو، ئەوە بێگومان خوا بەڵێنی بە وەڵامدانەوەکەی داوە، بە تایبەتی ئەگەر هۆکارەکانی وەڵامدانەوەی پاڕانەوەی هێنابێتەجێ، ئەویش بریتیە لەوەڵامدانەوە بۆ خوا ﷻ بە ملکەچ کردن بۆ فەرمانو قەدەغەکراوە ڕەفتاریو گوفتاریەکان، وە بڕوا بوون پێیو ئەوەی پێویستە بۆ وەڵامدانەوە. لەبەر ئەوەیە فەرموویەتی: ﴿ فَلْيَسْتَجِيبُواْ لِي وَلْيُؤْمِنُواْ بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴾ واتە: سەر ڕاستیو ڕێی ڕاستیان بۆ دەستەبەر دەکات کە بریتیە لە ڕێنمایی بۆ بڕوا بوونو کارو کردەوە چاکەکان، وە گومڕاییو دوو دڵیان لەسەر لا دەبات کە دژو پێچەوانەی بڕواو ئیمانە، لەبەر ئەوەی بڕوا بەخواو وەڵامدانەوە بۆ فەرمانەکانی، هۆکارە بۆ دەستەبەر بوونی زانست، وەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّكُمۡ فُرۡقَانًا ﴿٢٩﴾ ﴾ الأنفال (واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەگەر پارێزکاری لە خوا بکەن، ئەوە جیاکەرەوەی (هەقو ناهەقتان پێ دەبەخشێ). پاشان خوا فەرموویەتی:

(١٨٧): ﴿ أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ
إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ
لَّهُنَّ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتَانُونَ
أَنفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ
فَٱلْـَٔـٰنَ بَٰشِرُوهُنَّ وَٱبْتَغُواْ مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ
وَكُلُواْ وَٱشْرَبُواْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ
مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّواْ ٱلصِّيَامَ
إِلَى ٱلَّيْلِ وَلَا تُبَٰشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَٰكِفُونَ
فِي ٱلْمَسَٰجِدِ تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا
كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ
يَتَّقُونَ ﴿١٨٧﴾ ﴾

أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ هُنَّ
لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ
تَخْتَانُونَ أَنفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ فَٱلْـَٔـٰنَ
بَٰشِرُوهُنَّ وَٱبْتَغُواْ مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ وَكُلُواْ وَٱشْرَبُواْ
حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ
ٱلْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّواْ ٱلصِّيَامَ إِلَى ٱلَّيْلِ وَلَا تُبَٰشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ
عَٰكِفُونَ فِي ٱلْمَسَٰجِدِ تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا كَذَٰلِكَ
يُبَيِّنُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ۝ وَلَا تَأْكُلُوٓاْ
أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ وَتُدْلُواْ بِهَآ إِلَى ٱلْحُكَّامِ
لِتَأْكُلُواْ فَرِيقًا مِّنْ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ بِٱلْإِثْمِ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ
۝ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَهِلَّةِ قُلْ هِيَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَٱلْحَجِّ
وَلَيْسَ ٱلْبِرُّ بِأَن تَأْتُواْ ٱلْبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ
مَنِ ٱتَّقَىٰ وَأْتُواْ ٱلْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَٰبِهَا وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ
لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ۝ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ
يُقَٰتِلُونَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ۝

لە سەرەتای پێویست بوونی بەڕۆژوو بووندا، حەرام کرابوو لەسەر مسوڵمانان لە شەودا لە دوای خەوتنو خواردنو خواردنەوە، جووت بوونو سەرجێی کردن ئەنجام بدەن، بۆ هەندێکیان زۆر قورس بوو، جا خوای بەرز ئەوەی لەسەر سووک کردنو لە تەواوی هەموو شەوانی بە ڕۆژوو بوون بۆی حەڵاڵ کردنو ڕێگەی پێدان بە خواردنەوەو جووت بوون، جا یەکسان بوو خەوتبایەن، یان نەخەوتبایەن، لەبەر ئەوەی ناپاکیان لەگەڵ خۆیاندا دەکرد بە واز هێنانی هەندێک لەوانەی فەرمانیان پێ کرابوو ﴿ فَتَابَ ﴾ خوا (گەڕاوە سەریان تۆبەی لێ قبووڵ کردن)، ﴿ عَلَيْكُمْ ﴾ بەوەی فراوانی کرد بۆتان لە کارێک ئەگەر ئەو فراوانکردنە نەبووایە ئەوە گوناهو تاوان کردنتان بۆ پێویست دەبوو، ﴿ وَعَفَا عَنكُمْ ﴾ (واتە: عەفوی کردنو ئیوەی بەخشی) لەو ناپاکی کردنو گوناهەی ڕۆیشتو ڕابورد.

﴿ فَٱلْـَٔـٰنَ ﴾ لە دوای ئەم مۆڵەتو فراوانکردنەی خوا ﴿ بَٰشِرُوهُنَّ ﴾ لەگەڵیان جووت بنو ماچو دەست لێدانو جگە لەوانەش (ئەنجام بدەن) ﴿ وَٱبْتَغُواْ مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ ﴾ واتە: لە جووت بوون لەگەڵ هاوسەرانتان نیازو نیەتی لە خوا نزیک بوونەوە بکەن، مەبەستی گەورەش لە جووت بووندا بریتیە لە بەرهەم هێنانی منداڵو نەوەو پاراستنی داوێنی خۆیو هاوسەرەکەی، وە بەدەستهێنانی مەبەستەکانی هاوسەرگیریی.

ئەوەش کە خوا بۆ ئێوەی نووسیوەو دایناوە شەوی ڕێزدار (لیلة القدر) کە لەگەڵ شەوانی بەڕۆژوو بوونی ڕەمەزان یەک دەگرێتەوە، نابێ بەم چێژە خۆتانی لێ سەرقاڵو مەشغول بکەنو لە دەستی بدەن، هەر بە چێژەکە دەگەیتەوەو دەستت دەکەوێتەوە، بەڵام شەوی ڕێزدار (لیلة القدر) ئەگەر لەدەست چوو دەست ناکەوێتەوە.

﴿ وَكُلُواْ وَٱشْرَبُواْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ ﴾ ئەمە لوتکەی تەواوە بۆ خواردنو خواردنەوەو جووت بوون، ئەمە ئەوەشی تێدایە ئەگەر ئەو خواردیو یان نموونەی ئەوەی لە گومانی بوو دەرچوون بەرەبەیان (طلوع الفجر) ئەوە هیچی لەسەر نیە.

بەڵگەشی تێدایە لەسەر ویستراوی چاکیەتیو باشی (السحور)، کە باشتر وایە دوابخرێ بە وەرگرتنەی مۆڵەتی خوا لە ئاسان کردنی (عیبادەتەکان) بۆ بەندەکانی.

هەروەها بەڵگەی تێدایە کە دروستە بەرەبەیانی لێ دابێو ئەو لاشەگران بێ بە هۆی جووتبوون، پێش خۆ شوشتنی، ڕۆژووگرتنەکەی دروست دەبێت، چونکە پێویست بووە ڕەوا بوونی جووتبوون، تا دەرکەوتنی بەرەبەیان (طلوع الفجر)، بەرەبەیانی لێ دابێو پێ بگاتو لاشەگرانو جەنابەتداریێ، بەستراو بە هەقەوە هەقە.

﴿ ثُمَّ ﴾ ئەگەر بەرەبەیان دەرکەوت ﴿ أَتِمُّواْ ٱلصِّيَامَ ﴾ واتە: خۆگرتن لە ڕۆژوو شکێنەکان ﴿ إِلَى ٱلَّيْلِ ﴾ بریتیە لە خۆرئاوا بوون.

لەبەر ئەوەی ڕێگادان بە جووتبوون لە شەوانی بە ڕۆژوو بوون، ڕێگا پێدانی گشتی نیە بۆ هەموو کەسو تاکێک، مایەوە (لە مزگەوت) بۆی حەڵاڵ نیە ئەوە بکات، خوا ﷻ بە فەرموودەی خۆی دەریخستو جیای کردەوە، فەرمووی: ﴿ وَلَا تُبَٰشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَٰكِفُونَ فِى ٱلْمَسَٰجِدِ ﴾ واتە: ئێوە وەسفکراو بوون بەوەی (نیەتی مانەوە لە مزگەوتان هێنابوو ئیعتیکافتان کردبوو).

دەقەکە دەبێتە بەڵگە لەسەر شەرعی بوونی مانەوە لە مزگەوت (الإعتکاف) کە بریتیە لە پابەند بوونی بە مزگەوت لەبەر گوێڕایەڵیو جێبەجێ کردنی فەرمانی خوای بەرز، ئیعتیکاف لە هیچ شوێنێکی تر دروست نابێت، تەنها لە مزگەوتدا نەبێ، مەبەست لە مزگەوتیش ئەو مزگەوتانەیە کە هەر پێنج فەرزەکەی تێدا بە کۆمەڵ ئەنجام دەدرێت، ئەوەشی تێدایە کە جووت بوون لە تێکدەرو هەڵوەشێنەری مانەوەو (إعتکاف)کەیە.

﴿ تِلْكَ ﴾ باسکراوەکان -بریتیە لە حەرامکردنی خواردنو خواردنەوەو جووت بوونو نموونەی ئەوانیش لە شکێنەری ڕۆژووەکان، وە حەرام کردنی شکاندنی ڕۆژوو بە بێ عوزرو بیانوو، وە حەرام کردنی جووت بوون لەسەر مانەوە لەمزگەوت، ئەوکەسەی ئیعتیکاف دەکاتو نموونەی

ئەوانەش لە حەڕامکراوەکان ﴿حُدُودُ ٱللَّهِ﴾ (واتە: سنوورەکانی خوا) ئەوانەی سنووری خوان بۆ بەندەکانیو لێیانی قەدەغە کردوە، فەرموویەتی: ﴿فَلَا تَقْرَبُوهَا﴾ گەیەنەرترو ڕەوانبێژترە لە وتنی (فلا تفعلوها) مەیانکەن، چونکە نزیکبوونەوە قەدەغە بوون لە کردنی خودی حەڕام کراوو قەدەغە بوون لە ئامرازەکانی گەیەنەرییان دەگرێتەوە.

بەندە فەرمانپێکراوە بەوازهێنان لە حەڕامکراوەکان، وە دوورکەوتنەوە لێیان هەتا پێی دەکرێ وازبێنێ لە هەر هۆکارێک کە بانگی دەکات بۆ لایان، بەڵام فەرمانەکان خوا دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا﴾ (واتە: ئەوانە سنوورەکانی خوان مەیانبەزێنن) بەزاندنیانی قەدەغە کردوە.

﴿كَذَٰلِكَ﴾ واتە: خوا ﷻ بڕیارو حوکمەکانی ڕابوردووی بۆ بەندەکانی ڕوونکردەوە بە تەواوترین ڕوونکردنەوە، ئاشکرای کردن بە ڕۆشنترینو تەواوترین شێوە.

﴿يُبَيِّنُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ﴾ ئەوان ئەگەر هەقیان بۆ ئاشکرا بوو شوێنی دەکەونو ئەگەر نارەوایەتیشیان بۆ ڕوون بوەوە لێ دووردەکەونەوە، مرۆڤ جاروایە حەڕامی دەکات لەبەر ئەوەی نەیزانیوە کە ئەوە حەڕامکراوە، ئەگەر بیزانیبایە حەڕامکراوە نەی دەکرد، جا ئەگەر خوا نیشانەو بەڵگەکانی بۆ خەڵکی ڕوونکردەوە، ئەوە بیانوو بەڵگەیان بۆ نەماوەتەوە، جا ئەوە هۆکارە بۆ پارێزکاری.

(١٨٨): ﴿وَلَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ وَتُدْلُوا۟ بِهَآ إِلَى ٱلْحُكَّامِ لِتَأْكُلُوا۟ فَرِيقًا مِّنْ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ بِٱلْإِثْمِ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١٨٨﴾﴾:

واتە: سامانەکانتان وەرمەگرن، واتە: سامانی جگە لە هی خۆتان، پاڵی داوەتەوە لای ئەوانەوە، چونکە پێویستە مسوڵمان ئەوەی بۆ خۆی پێ خۆشە بۆ براکەیشی پێی خۆش بێت، سامانی ئەویش ڕێزلێ بگرێ هەروەکو ئەویش ڕێز لە سامانی ئەو دەگرێ، چونکە ئەگەر سامانی جگە لە خۆی بخوات، خەڵکی بوێر دەکات کە ماڵی ئەو بخۆن، لە کاتێکدا کە توانای هەبێ. لەبەر ئەوەی خواردنی دوو جۆرە:

جۆرێکی بە هەقە، جۆرێکیشی بە ناهەقە، جا حەڕامکراوەکە بە تەنها بریتیە لە خواردنی بە ناهەق لەبەر ئەوەیە خوا ﷻ بە ﴿بِٱلْبَٰطِلِ﴾ بەستیەتیەوەو گرێیداوە.

دەچێتە ئەو چوار چێوەوە خواردنی بە داگیر کردنو دزیو ناپاکی لەبەر ئەمانەتو لەلادانراو، یان نموونەی ئەوانەش، هەروەها دەچێتە چوار چێوەیەوە وەرگرتنی بە بەرانبەر بەرانبەری حەڕامکراو، وەک گرێبەستی سوود ڕیباو،و قومارو هەموویان، ئەوانە لە خواردنی سامان بە ناهەقن، لەبەر

ئەوەی لە بەرانبەر شتێکی ڕێگاپێدراو نەبووە، دەچێتە چوار چێوەیەوە وەرگرتنی سامان بە هۆی غەش‌و فێڵ لە کڕین‌و فرۆشتن‌و بەکرێدانو نموونەیان، بەکارهێنانی کرێگرتەکانو خواردنی کرێیەکەیان دەچێتە چوارچێوەیەوە، وە وەرگرتنی کرێ لەسەر کارێک تەواو پێی هەڵنەستایێ‌و تەواوی نەکردبێ، دەچێتە چوار چێوەیەوە وەرگرتنی کرێ لەسەر پەرستش‌و لەخوا نزیکبونەوەکانی کە دروست نین، ئەگەر مەبەستو نیازیشی پێیان خوای بەرزیش بێت، دەچێتەچوار چێوەیەوە وەرگرتنی خێرو زەکاتەکانو وەقفەکانو وەسیەتەکان بۆ کەسێک کە مافی نەبێ تیایاندا، یان لەسەروی مافی خۆی بێ.

هەموو ئەمانەو نموونەشیان لە خواردنی سامانە بە ناهەق، بە هیچ شێوەیەک لە شێوەکان ئەوە حەلاڵو ڕێگا پێدراو نابێت، ئەگەر چی کێشەو ناکۆکی تێکەوت بەرزکرایەوە بۆلای بڕیاردەرو حاکمی شەرعی، ڕاووتەی خۆی بە بەڵگەی بەتاڵ خستە ڕوو زاڵ بوو بەسەر ڕای خاوەن هەق‌و مافدا، جا حاکمیش بەوە بڕیاری بۆدا (واتە: بۆ نارەوایەکەی ) بەڕاستی بڕیاری حاکم حەرام حەلاڵ ناکاتو حەرام ڕێگا پێدراو ناکات، بەڵکو تەنها حوکم دەدات لەسەر ئەوەی بیستوویەتی، ئەگەرنا ڕاستیەتی‌و دروستیەتی کارەکان هەرماوەتەوە، جا لە بڕیاری حاکم بۆ خاوەن نارەوایەتی خۆشی‌و دڵ ڕەحەتی نیە، نەپشودانو نەگوماتی بۆ هەیە، جا ئەوەی بەڵگەی نارەوا بدات بە حاکم‌و حاکمیش بەپێی ئەوە بڕیاری لەسەر بدات، ئەوە بۆی حەلاڵ نابێ‌و دەبێتە خواردنی سامانی غەیری خۆی بە گوناهو نارەوا، ئەویش بەوە زانایە، ئەو تۆڵەکەی زیاترو سزاکەی توندترە، لەسەر ئەوەشەوەیە بریکار ئەگەر زانی بریکارەکەی نارەولو پوچەڵە لەداواکەی، بۆی دروستو حەلاڵ نیە بەرگری لە ناپاک بکات، هەروەکو خوا ﷻ فەرموویەتی:

﴿ وَلَا تَكُن لِّلْخَآئِنِينَ خَصِيمًا ﴿١٠٥﴾ ﴾النساء (واتە: مەبە لایەنگرو بەرگریکار بۆ ناپاکان).

(١٨٩): ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَهِلَّةِ قُلْ هِىَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَٱلْحَجِّ وَلَيْسَ ٱلْبِرُّ بِأَن تَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنِ ٱتَّقَىٰ وَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَٰبِهَا وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٨٩﴾ ﴾:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَهِلَّةِ ﴾ (واتە: پرسیارتان لێدەکەن) ﴿ ٱلْأَهِلَّةِ ﴾ کۆی (هلال)ە واتە: مانگە، ئایا سوودو حیکمەتەکەی چیە؟ یان دەربارەی خودی مانگە.

﴿ قُلْ هِىَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ ﴾ واتە: خوا مانگی دلناوە لەسەر ئەو ڕێکخستن‌و ڕێکو پێکیەی بە میهرەبانی (لوتف)و بەزەیی خۆی لەسەرەتای (ڕۆژانی) مانگ، مانگ بە لاوازی دەردەکەوێ (باریکە) لە پاشان (بەرەبەرە) زیاد دەکات تاکو نیوەی مانگ (تەواو گەورەو باڵتەیی دەبێت)

لە پاشان دەستپێدەکات بە کەم بوونەوە (باریک دەبێتەوە) تاکو مانگە کە تەواو دەبێ، (کۆتایی ڕۆژانی مانگ دەبێت لەپاش چواردەیەوە بەرە بەرە بەرەو باریکی‌و کەمی دەچێتەوە تا وای لێدێت نەبینرێ).

تاکو خەڵکی بە هۆیەوە کاتەکانی پەرستەکانیان لە بەرۆژوو بوونو کاتەکانی زەکاتو کەفاراتەکانو کاتەکانی حەج بزانن.

لەبەرئەوەی حەج کردن دەکەوێتە مانگە دیارو زانراوەکانە کاتێکی زۆریش دەخایەنێت، فەرمووی: ﴿وَٱلۡحَجِّۗ﴾ هەروەها بەوەوە کاتی قەرزەکان دەزانرێ، وە کاتی بە کرێ دانەکانو کاتی (عدة) کانی(٨)و دووگیانی، وە جگە لەوانەش لە پێداویستیەکانی خەڵک دەزانرێ، خوا ﷻ کردوویەتیە ژماردنێک هەموو کەسێک لە گەورەو بچووکو زاناو نەزان دەیزانن، ئەگەر ژماردن بە ساڵی خۆری (شمس)ی بووایە ئەوە نەدەزانرا مەگەر کەم کەسێک لە خەڵکی بیزانیایەت.

﴿وَلَيۡسَ ٱلۡبِرُّ بِأَن تَأۡتُواْ ٱلۡبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا﴾ ئەوە وەکو ئەوەی ئەنصارەکانو جگە لەوانیش لە عەرەبەکان ئەگەر ئیحرامیان ببەستایەت لە دەرگاکانیانەوە نەدەچوونە ماڵەکان پێیان وابوو پەرستش‌و بەندایەتیان ئەنجام دەدە بە گومانی ئەوەی ئەوە کارێکی چاک بووە خوا ﷻ هەواڵیدا کە ئەوە چاک نیە، چونکە خوا ﷻ بە شەرع بۆی دانەناونە جا هەر یەکێک پەرستش بکات بە پەرستشێک کە نەخواو نە پێغەمبەرەکەی ﷺ شەرعیەتیان پێ نەدابێ ئەوە پەرستشی داهێنراوی کردووە جا خوا فەرمانی پێیاندا کە لە دەرگاوە بچنە ناو ماڵەکان لەبەر ئەوەی ئاسانکاری بۆیان تێدایە کە ئەو ئاسانکاریەش بنەمایە کە لە بنەماکانی شەرع (ی خوا).

لە ئاماژەی دەقەکە سوودی ئەوەی لێ وەردەگیرێت کە پێویستە لە هەر کارێک لە کارەکان مرۆڤ لە ڕێگای ئاسانو نزیکەوە ئەنجامی بداو بچێتە ناوی، ئەوەی کە بێگومان بۆی دەبێتە گەیەنەر، فەرمانکار بە چاکەو قەدەغەکار لە خراپە دەبێ بڕوانێتە حاڵو باری ئەوەی فەرمانی پێ دەکات، نەرمی‌و سیاسەت بەکار بهێنێ، تا بگات بە ئامانج یان هەندێ لە ئامانج، مامۆستا دەبێ نزیکترین ڕێگاو ئاسانترینیان بگرێتە بەر، بۆبەدیهێنانی مەبەستەکەی، هەروەها هەر یەکێک هەوڵی کارێکی دا لە کارەکان لە دەرگاکانی خۆیەوە بۆیان هات لەسەری بەردەوام بوو کۆڵنەدان بە یارمەتی خوای پادشاو خاوەن پەرستراو هەردەبێ مەبەستەکەی بۆ بێتەجێ‌و دەستبەر دەبێ.

---

٨) (عدة): ئەو ماوە دیاریکراوەیە کە ئافرەت لە دوای تەڵاقدانی، یان مردنی هاوسەرەکەی ئارام دەگرێ‌و شوو ناکاتەوە چاوەڕێ دەکات.

﴿ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ﴾: ئەوە ئەو چاکەیە کە خوا فەرمانی پێ کردوە، بریتیە لە پابەند بوونی بەردەوام بە پارێزکاریی، بەجێبەجێ کردنی فەرمانەکانیو دوورکەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکانی، ئەوە هۆکارە بۆ سەرفرازی کە بریتیە لە سەرکەوتنو بەدەستهێنانی خوازراو، وە ڕزگاربوون لەوەی لێ دەترسێ، ئەوەی لە خوا نەترسێت سەرکەوتوو سەرفراز نابێ، ئەوەش کە پارێزکارە بۆ خوا لە خوا دەترسێ براوەیەو سەرفرازو سەکەوتوە.

(١٩٠-١٩٣): ﴿ وَقَٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿١٩٠﴾ وَٱقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ وَأَخْرِجُوهُم مِّنْ حَيْثُ أَخْرَجُوكُمْ ۚ وَٱلْفِتْنَةُ أَشَدُّ مِنَ ٱلْقَتْلِ ۚ وَلَا تُقَٰتِلُوهُمْ عِندَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ حَتَّىٰ يُقَٰتِلُوكُمْ فِيهِ ۖ فَإِن قَٰتَلُوكُمْ فَٱقْتُلُوهُمْ ۗ كَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٩١﴾ فَإِنِ ٱنتَهَوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٩٢﴾ وَقَٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِ ۖ فَإِنِ ٱنتَهَوْا۟ فَلَا عُدْوَٰنَ إِلَّا عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٩٣﴾ ﴾

﴿ وَقَٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾ ئەم دەقانە فەرمان بە جەنگ لە ڕێگەی خوا لە خۆ دەگرن، ئەمەش دوای کۆچکردن بوو بۆ مەدینە، لەو کاتەی مسوڵمانان بەهێز بوون بۆ جەنگو کوشتار کردن، خوا فەرمانی پێکردن، لە دوای ئەوە فەرمان پێکراو بوون بە دەست پارێزیو جەنگ نەکردن، وە لە تایبەت کردنی کوشتارو جەنگی بە ﴿ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾ هانی داوە بە دڵسۆزی بۆ خوا، وە کوشتاری قەدەغە کردوە لەسەر مسوڵمانان لە فیتنەو دووبەرەکیدا.

دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمْ ﴾ واتە: ئەوانەی ئامادەن بۆ جەنگ لەگەڵتانو بتانکوژن، ئەوانەن کە ئەرکی شەرعیان لەسەرە لە پیاوان، جگە لەو پیرانەی کە نە ڕاو بۆچوونیان هەیە نەکوشتار کردنیش، هەموو جۆرەکانی سنور بەزاندنو دەستدرێژ کردنی لە جەنگدا قەدەغە کردوە، لە کوشتنی ئەو کەسەی کە جەنگ ناکات، لە ئافرەتانو شێتو منداڵو ڕەهبانەکانو نموونەی ئەوانیش، وە هەتک کردنی کوژراوانو کوشتنی ئاژەڵەکانو داربڕین، وە نموونەی ئەوانیش بەبێ هیچ بەرژەوەندیەک کە چاکەکەی بگەڕێتەوە بۆ مسوڵمانان.

لە دەستدرێژیی کردن ئەوەیە جەنگ لە دژی ئەوانە بکرێ کە سەرانە دەدەن، بێگومان ئەوە دروست نیە.

وَٱقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ وَأَخْرِجُوهُم مِّنْ حَيْثُ أَخْرَجُوكُمْ ۚ وَٱلْفِتْنَةُ
أَشَدُّ مِنَ ٱلْقَتْلِ ۚ وَلَا تُقَٰتِلُوهُمْ عِندَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ حَتَّىٰ يُقَٰتِلُوكُمْ
فِيهِ ۖ فَإِن قَٰتَلُوكُمْ فَٱقْتُلُوهُمْ ۗ كَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٩١﴾ فَإِنِ ٱنتَهَوْا۟
فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٩٢﴾ وَقَٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ
ٱلدِّينُ لِلَّهِ ۖ فَإِنِ ٱنتَهَوْا۟ فَلَا عُدْوَٰنَ إِلَّا عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٩٣﴾ ٱلشَّهْرُ ٱلْحَرَامُ
بِٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ وَٱلْحُرُمَٰتُ قِصَاصٌ ۚ فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱعْتَدُوا۟
عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ
ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٩٤﴾ وَأَنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلْقُوا۟ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ ۛ
وَأَحْسِنُوٓا۟ ۛ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٩٥﴾ وَأَتِمُّوا۟ ٱلْحَجَّ وَٱلْعُمْرَةَ لِلَّهِ ۚ
فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ فَمَا ٱسْتَيْسَرَ مِنَ ٱلْهَدْىِ ۖ وَلَا تَحْلِقُوا۟ رُءُوسَكُمْ حَتَّىٰ يَبْلُغَ
ٱلْهَدْىُ مَحِلَّهُۥ ۚ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ بِهِۦٓ أَذًى مِّن رَّأْسِهِۦ فَفِدْيَةٌ
مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ ۚ فَإِذَآ أَمِنتُمْ فَمَن تَمَتَّعَ بِٱلْعُمْرَةِ إِلَى ٱلْحَجِّ
فَمَا ٱسْتَيْسَرَ مِنَ ٱلْهَدْىِ ۚ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٍ فِى ٱلْحَجِّ
وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ ۗ تِلْكَ عَشَرَةٌ كَامِلَةٌ ۗ ذَٰلِكَ لِمَن لَّمْ يَكُنْ أَهْلُهُۥ حَاضِرِى
ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿١٩٦﴾

﴿ وَٱقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ ﴾ ئەمە فەرمانێکە لـە لایـەن خـواوە بەکوشـتارو کوشـتنیان لەهـەر جێگـاو شـوێنێک بوون، لـە هەموو کاتو هەمـوو سـەردەمێکدا، کوشـتاری بەرگـریو کوشـتاری هێرش بردن. پاشـان خـوا کوشـتنیانی لـەم گشـتیەتەی جەنـگ کردنـدا جیاکردوەتـەوە، فەرمووی: ﴿ عِندَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ﴾ (لـە لای مزگەوتی حەڕام) جەنـگو کوشـتار لـە دژیـان دروسـت نیـە مەگـەر ئـەوان دەستپێشـخەری بکەن، ئـەوان دەکوژرێـنو کوشـتاریان لـەدژ دەکرێـت لەسـەر ئـەو دەسـت درێژیـەی کـە کردویانـە ( لـەلای مزگەوتی حـەڕام) ئـەوەش بەردەوامـە لـە هەمـوو کاتێکـدا، تـا وازدەهێنـن لـە کافربوونیـانو مسـوڵمان دەبـن، جـا خـوا گەڕانـەوەو تۆبەکەیـان لـێ وەردەگرێـت، ئەگـەر ئـەوەی لێیـان دەرکـەوتو هەیـان بوو، لـە کوفر بە خـواو هاوبەش دانـان لـە مزگەوتی حـەڕامو ڕێگری لـە پێغەمبەر ﷺو بـڕواداران لە مزگەوتی حـەڕام، ئەوە لـە بەزەیـی خـواو بەخششـیەتی بـە بەندەکانی.

کاتـێ کـە کوشـتار لـە لای مزگەوتی حـەڕام گومانی ئـەوەی لێدەکـرێ زیان بـەو وڵاتە بگەیەنێـت کـە مزگەوتـی حەڕامـە، خـوا ﷻ هەواڵیدا خراپـەی هاوبەش دانان لە شـیرکو ڕێگـری لـە ئاینـی خـوا لـەلای مزگەوتـی حـەڕام خراپتـرو توونـدتـرە لـە کوشـتن، ئەی مسـوڵمانان ئێـوە هیچ بـارو گوناهێکتان لەسـەر نیە لە کوشـتار کردن لەگەڵیانو کوشـتنیان لـەلای مزگەوتـی حـەڕام، ئـەم دەقـە دەکرێت بـە بەڵگـە لەسـەر بنەمـا بەناوبانگەکە، کە بریتیـە هەڵبژاردنـی سـوکترین خراپە بـۆ لادانی خراپـەی گـەورەو بڵندتر.

پاشـان خـوا ﷻ باسـی ئامانجـی جەنـگ کردنی لـە پێنـاوی خۆیدا کـردوە، کە مەبەسـت لێـی ڕشـتنی خوێنی کافـرانو بردنی مـاڵو سـامانەکانیان نیە، بەڵکو مەبەسـت پێـی ئەوەیە ﴿ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِ ﴾ ئاینـی خوا ﷻ ئاشـکراو دیارو شـەکاوە بێ بەسـەر تێکـڕای ئاینەکان،

هەمـوو دژو پێچەوانەکانـی لـە هاوبەشـیو جگـە لەویـش نەهێڵـێو لایـدا، مەبەسـت لـە فیتنـەو ئاشـووب ئەوەیە، ئەگـەر ئەم مەبەسـتە هاتەدی نەکوشـتن وە نەکوشـتار ڕوونادات، ﴿فَإِنِ ٱنتَهَوْاْ﴾ (ئەگـەر وازیـان هێنـا) لە کوشـتارو کوشـتنتان لـە لای مزگەوتـی حەرام، ﴿فَلَا عُدْوَٰنَ إِلَّا عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ واتـە: ئـەوە ئێوە هیـچ دوژمنکاریو دەسـتدرێژیەک ناکەنە سـەریان، مەگـەر ئەوەی سـتەمی کردبـێو سـنووری بەزاندبێ لە ئـەوان، ئەوە بـە ئەندازەی سـنوور بەزێنی سـتەمەکەی شـایانی تۆڵـە لـێ وەرگرتنەوەیە.

(١٩٤): ﴿ٱلشَّهْرُ ٱلْحَرَامُ بِٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ وَٱلْحُرُمَٰتُ قِصَاصٌ ۚ فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٩٤﴾﴾

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ٱلشَّهْرُ ٱلْحَرَامُ بِٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ﴾ دەگونجـێ مەبەسـت پێـی ئەوەبـێ کـە ڕوویـدا لـە ڕێگرتنـی هاوبـەش دانـەران لـە پێغەمبـەرو هاوەڵانی (خـوا لێیـان ڕازی بێـت)، لـە سـاڵی حودەیبیـە لە چوونـە نـاو مەککـەوە هەڵیانوەشـاندەوە بۆ ئەوەی سـاڵێکی تـر بچنـە ئێـوی، جـا ڕێگـریو بڕیـاری قـەزا کردنەوە کـە لـە مانگـی حەرامـدا بـوو کە بریتـی بـوو لـە (ذو القعدة) دەیێتـە ئەمـە بەئەمە، ئـەوە دەبێتـە ئۆقرەیـی دڵی هـاوەڵان، بە تەواوکردنـی پەرسـتنیان، وە دەگونجـێ ماناکەی ئەوەبێ: ئەگـەر ئێوە کوشـتارتان لەدژیان کـرد لـە مانگـی حەرامـدا، ئـەوە بێگومـان ئەوانیـش لـەو مانگـەدا کوشـتاریان لـە دژتان کـردوە، ئـەوان دەسـتدرێژیکارو سـنوور بەزێنن، لەبـەر ئەوە هیچتان لەسـەر نیـەو تاوانبار نیـن، وە لەسـەر ئـەم (بۆچونـە) فەرمـوودەی خـوا وای لـێ دێـت: ﴿وَٱلْحُرُمَٰتُ قِصَاصٌ﴾ لـە بابەتـی گەڕاندنـەوەی گشـتی بۆ سـەر تایبـەت دەبێ (عطف العام على الخاص) واتە: هەمـوو شـتێک لـە مانگـی حـەرام ڕێزی لـێ دەگیرێت، یـان خاکو شـوێنی حـەرام، یان ئیحـرام بەسـتن، یـان ئەوەی لەوەش گشـتی تـرە، هەمـوو ئەوانەی شـەرع فەرمانـی داوە بە ڕێزلێگرتنـی، ئـەوەی جورئـەت بـکات بەسـەریانو (ڕێـزی لێ نەگـرێ) ئـەوە تۆڵەی لێ دەسـتێنرێ، ئـەوەی کوشـتار بـکات لـە مانگی حـەرام دەکـوژرێ، ئـەوەی هەتکی شـارو شـوێنی حەرام بـکات هەقەکەی لێ وەردەگیرێو سـنوورەکەی بەسـەر جێبەجـێ دەکرێو هیـچ ڕێـزو حورمەتێکـی نامێنێـت، ئـەوەی هاوتاو هاوشـانی خۆی بکـوژێ لە بـری ئەوە دەکوژرێتـەوە، ئـەوەی (کەسـێک) برینـدار بکات، یـان ئەندامێکی ببـڕێ ئـەوە تۆڵەی لێ دەسـتێندرێ، ئـەوەی سـامانی ڕێزلێگرانـیو جگـە لە خۆی بسـێنێ، ئـەوە لە بری ئـەو لێی وەردەگیرێتـەوەو لێ دەسـتێندرێ.

بەلأم ئایا خاوەن ماف بە ئەندازەی مافی خۆی لە سامانەكەی دەبباتو وەری دەگرێ یان نا؟ جیاوازی لە نێوان ڕای زانایان هەیە لەوبارەیەوە، ڕای پەسەند ئەوەیە ئەگەر هۆكاری مافەكە دیارو ئاشكرا بوو: وەك میوان ئەگەر غەیری خۆی ڕێزی نەگرت، وەهاوسەر ئەگەر مێردەكەی بە ئەندازەی پێویست خەرجی پێنەدات، ئەوە دروستە لە سامانەكەی ببات بە ئەندازەی پێویست، ئەگەر هۆكارەكەشی شاراوە بوو: وەكو نكۆڵی كردن لە قەرزی جگە لە خۆی، یان ناپاكی لەو ئەمانەتەی لەلای دانرابوو (ودیعة)، یان دزی لێ بكاتو نموونەی ئەوانەش، ئەوە دروست نیە بۆی لە سامانەكەی ببات لە بەرانبەر ئەو كارە لەبەر ئەوەشە خوا ﷻ فەرموویەتی: وەك جەختكردنەوەیەك لەوەی پێشوودا: ﴿ فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَٱعۡتَدُواْ عَلَيۡهِ بِمِثۡلِ مَا ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ ﴾ ئەوە ڕاڤەیە بۆ سیفەتو چۆنیەتی تۆڵە كردنەوە، كە بریتیە لە وەك یەكبوون لە بەرانبەر دەستدرێژیكار (واتە بە ئەندازەی ئەو بەرهەڵستی بكرێو لێ وەربگیرێتەوە) لەبەر ئەوەی -بە زۆری- دڵو دەروونەكان لەو سنوورە ناوەستێ كە مۆڵەتی تۆڵە سەندنەوەی پێ دراوە، خوا ﷻ فەرمانی كردوە لە پێناو دڵنەوایيو حەسانەوەی دڵە بە پابەند بوون بە لە خوا ترسانو پارێزكاری، كە ئەویش بریتیە لەوەستان لەلای سنوورەكانی ئەوو نەبەزاندنیان، خوا ﷻ هەواڵیداوە كە ئەو ﴿ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴾ (لەگەڵ پارێزكارانە)، واتە: بە یارمەتیدانو سەركەوتن پاڵپشتيو پشتگیریان دەكات.

ئەوەی خوای لەگەڵ دابێ ئەوە بەختەوەری هەمیشەیی بۆ دەستبەر دەبێ، ئەوەش كە پابەندی پارێزكاريو لەخواترسان نەبێت خوا وازی لێ دێنێو ڕیسوای دەكات، دەیداتە دەست نەفسو دەروونی، ئەوكات لەناوچوونی نزیكتر دەبێ لێی نزیكتر لە پەتی خوێن هێنەری دڵ.

(١٩٥): ﴿ وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلۡقُواْ بِأَيۡدِيكُمۡ إِلَى ٱلتَّهۡلُكَةِ وَأَحۡسِنُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٩٥ ﴾:
خوا ﷻ فەرمان دەدات بە بەخشین لە ڕێی ئەودا، كە بریتیە لە دەركردنی سامانەكان لەو ڕێگایانەی كە گەیەنەرن بەرەو خوا، كە ئەویش بریتیە لە هەموو ڕێگاكانی چاكەو خێر لە چاكە كردن بەسەر هەژارو نەدار، یان نزیك، یان بەخشین بەسەر ئەوانەی بەخێو كردنیان لەسەرە، مەزنترینی هەموو ئەوانەو گەورەترینیان، بەخشینە لە پێناو جەنگو كوشتار لە ڕێی خوا، بەڕاستی بەخشین لە جەنگ كردن بە سامان، وەك جیهاد كردن بەجەستە پێویستە، بەرژەوەندی مەزنی تیادایە، یارمەتی دانە لەسەر بەهێز كردنی

مسـولْمانان، وە لەسـەر وێرانکردنی موشـریکو بتپەرستان، وە لەسـەر بەجێهێنانو ڕاوەستانی ئاییـنو ڕێبـازی خـواو بەهێـز کردنـی، جـا جەنـگو کوشـتار کردن لـە ڕێی خـوا بەجێ نایـەت بـە بەخشـین نەبـێ، بۆیە بەخشـین لـەو پێنـاوەدا وەکو گیـانو ڕۆحە بـۆی، بوونی نابـێ بەبـێ ئەو، وە لـە وازهێنانی بەخشـین لە ڕێی خـوادا، دەبێتـە مایەی بەتـاڵ کردنەوەی جەنـگو تێکۆشـان، وە زاڵبوونی دوژمنـان، توندو تیـژو هەڵپە کردنو پەلاماریانە بۆ سـەر (مسـولْمانان)، فەرموودەی خوا ﷻ دەبێتـە: ﴿ تُلۡقُواْ بِأَيۡدِيكُمۡ إِلَى ٱلتَّهۡلُكَةِ ﴾ وەک هۆکارێک بـۆ ئەوە. بە دەسـت خـۆ هەڵدانو بۆ لـە ناوچـوونو هیلاکـەت دەگەڕێتەوە بـۆ دووکار:
وازهێنـان لـەوەی بەنـدە فەرمانـی پێکـراوە، جـا ئەگـەر وازهێنـان لێی پێویسـت بـێ، یان نزیکـی بێـت بۆ لە ناوچوونی جەسـتە، یـان ڕۆحو گیـان، وە کردەوەیەک کـە ببێتە هۆکار بـۆ لەنـاو چـوونو فەوتانی نەفـسو دەروون، وە زۆر شـت دەچنـە ئەم چـوار چێوەیەوە:
لەوانـە واز هێنـان لـە جەنگو کوشـتار لە ڕێـی خوا، یان بەخشـین لە پێناویـدا، کە هۆکارە بـۆ زاڵ بوونی دوژمنان.
لەوانـە نموونـەی مـرۆڤ بە هۆی شـەڕو کوشـتار، یان گەشـتێکی ترسـناک، یان شـوێنی دڕنـدە، یـان مـارەکان، یـان بەسـەرکەوتنی بەسـەر دارو درەخـت، یان کۆشـکو تەلاری ترسـناک، یـان بچێتـە نـاو شـتێکی سـامناکەوە، ئەمـەو نموونـەی ئەوانەش کە بەدەسـتی خـۆی، خـۆی دەخاتـە نـاو لـە نـاو چوونـەوە، وە خۆهاوێشـتنە نـاو لەناوچوون بە دەسـتی خـۆی، بـەردەوام بوونە لەسـەر یاخی بوونو سـەرپێچی کردنی خـوا، وە بێ ئومێـد بوونێتی لـە تۆبـەو گەڕانەوە.
لەوانـەش وازهێنـان لـەوەی خـوا فەرمانی پێیـان داوە لـە فـەرزەکان، واز لێهێنانیـان دەبێتە مایـەی لەنـاو چوونی گیـانو ئایین.
لەبـەر ئـەوەی بەخشـین لـە ڕێـی خـوا جۆرێکە لـە جۆرەکانـی چاکـە، فەرمانی بـە چاکە کـردوە بە گشـتی، فەرمـووی: ﴿ وَأَحۡسِنُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾ ئەوە هەمـوو جۆرەکانی چاکـە دەگرێتـەوە، چونکـە نەی بەسـتۆتەوە بە شـتێک جگە لە شـتێکی تر، چاکـە بە ماڵو سـامانیش دەگرێتەوە هەروەکو پێشـتر باسـکرا.
دەچێتـە چـوار چێـوەی چاکـەوە، چاکە بـە خانەدانیو بـە تـکاو شـەفاعەتکردن، چاکە بە فەرمـان بـە چاکە کـردنو قەدەغە لـە خراپە کـردن، فێر کردنی زانسـتی سـوود گەیەنەرو دابیـن کردنی پێداویسـتیەکانی خەڵکی لە نەهێشـتنی تەنگەبەریەکانیـانو ڕەواندنەوەی غەمو

ناخۆشــیەکانیان، وە ســەردانی نەخۆشەکانیانو شــاردنەوەی مردووەکانیان، وە ڕێگا نیشاندانی گومرایــانو یارمەتــی دانی ئــەوەی کارێک دەکات، بۆ ئــەوەی کاری باشو چــاک نازانێ، نموونــەی ئەوانــەش دەگرێتــەوە، ئەوانــەی لــە چاکەیەو خــوا فەرمانــی پێکــردوە، بەهەمان شــێوە دەچێتــە چوارچێــوەی چاکــەوە چاکە کــردن لەگــەڵ بەندەکانی خــوادا، وەک چۆن پێغەمبــەر ﷺ باســی کــردوە: {أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ} (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٩٤٩٧)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٥٠)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٩))، (واتــە: خــوا وا بپەرســتە هــەروەک ئــەوەی دەیبینــی، ئەگەر تــۆش ئــەو نەبینی ئەوە ئــەو بــە دڵنیایی تــۆ دەبینێ).

ئــەوەی بــەم ســیفەتانە وەســف کرابــێ ئــەوە لەوانەیــە کــە خــوا دەربارەیــان فەرموویەتی: ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُواْ ٱلْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ ﴿٢٦﴾﴾ یونس، (واتــە: بــۆ ئەوانــەی چاکــە دەکــەن زۆر چــاکو زیاتریشــیان بــۆ هەیــە، کــە بینینــی خوایــە بەچاوەکانیــان) خــوا لەگەڵیــدا دەبێت ڕاســتو ڕێکــی دەکاتو ڕێنوێنــی دەکاو یارمەتــی دەدات لەســەر هەمــوو کارو شــتەکان.

کاتــێ کــە خــوا ﷻ لــێ بوویــەوە لــە باســکردنی بڕیــارو حوکمەکانــی ڕۆژوو جەنــگو تیکۆشــان باســی حوکمەکانــی حەجــی کــرد، ئنجــا فەرموویەتــی:

(١٩٦): ﴿وَأَتِمُّواْ ٱلْحَجَّ وَٱلْعُمْرَةَ لِلَّهِۚ فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ فَمَا ٱسْتَيْسَرَ مِنَ ٱلْهَدْيِۖ وَلَا تَحْلِقُواْ رُءُوسَكُمْ حَتَّىٰ يَبْلُغَ ٱلْهَدْيُ مَحِلَّهُۥۚ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ بِهِۦٓ أَذًى مِّن رَّأْسِهِۦ فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍۚ فَإِذَآ أَمِنتُمْ فَمَن تَمَتَّعَ بِٱلْعُمْرَةِ إِلَى ٱلْحَجِّ فَمَا ٱسْتَيْسَرَ مِنَ ٱلْهَدْيِۚ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٍ فِي ٱلْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْۗ تِلْكَ عَشَرَةٌ كَامِلَةٌۗ ذَٰلِكَ لِمَن لَّمْ يَكُنْ أَهْلُهُۥ حَاضِرِي ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿١٩٦﴾﴾:

بەڵگــە دەهێنرێتــەوە بــە فەرمــوودەی خــوای بــەرز: ﴿وَأَتِمُّواْ ٱلْحَجَّ وَٱلْعُمْرَةَ﴾ لەســەر چەند کارێک:

یەکەمیان: پێویستبوونی حەجو عومرەو فەرز بوونیان.

دووەمیان: پێویســتی تەواوکردنیــان بە کۆڵەکەو پێویســتیەکانیان، ئەوانەی کە کاروکردەوەی پێغەمبــەر ﷺ لەســەریان بەڵگەیەو فەرموودەکەی ﷺ: {خُذُوا عَنِّي مَنَاسِكَكُمْ} (أَخْرَجَهُ النَّسَائِيُّ برقم: (٣٠٦٢)) واتە: خواپەرســتیەکانی حــەج کردن لە منەوە وەرگــرنو فێری بن.

سێیەمیان: بەڵگەی تێدایە بۆ ئەوەی کە دەڵێ عومرە پێویستو واجبە.

چوارەمیــان: حــەجو عومــرە پێویســتە تــەواو بکرێن ئەگــەر ســوننەتیش بن مادام دەســتیان پێکرابــێو چووبنــە ناویەوە.

پێنجەمیــان: فەرمــان بــە ئەنجامدانیــان بە تــەواویو چاکــی، ئــەوەش ئەندازەیەکــی زیادەیە لەســەر ئەنجامدانــی ئــەوەی پێویســتە بۆیان.

شەشەمیان: فەرمان بە دڵسۆز بوون بۆ خوا لە ئەنجامدانیاندا.

حەوتەمیــان: ئــەوەی لــە ئیحرامدایــە دەرناچێــت بــە هیچ شــتێک لە شــتەکان، تــا تەواویان نــەکات مەگــەر بــەوەی خوا دەری خســتووە کــە ئەویش ڕێگــە لــێ گیرانەو ئابلۆقــە دانە، لەبــەر ئەوەیــە فەرموویەتــی: ﴿ فَإِنۡ أُحۡصِرۡتُمۡ ﴾ واتــە: ڕێگریتــان لێکــرا بە گەیشــتن بە ماڵی حــەرام بــە نەخۆشــی، یــان بــزر بــوون، یــان دوژمــن، لــە نموونــەی ئەوانــەش لــە جۆری ڕێگــریو ئابلۆقــەدان، کــە ئەویش هــەر ڕێگریە.

﴿ فَمَا ٱسۡتَيۡسَرَ مِنَ ٱلۡهَدۡيِ ﴾ واتــە: ســەربڕن لــەوەی بۆتــان کــرا لــە ئــاژەڵ ئەویــش حەوت حوشــترە، یــان حــەوت چێڵە، یــان مــەڕ (بزن)ێکــە ڕێ لێگیراو ســەری دەبڕێ، وە ســەری دەتاشــێو ئیحرامەکــەی نامێنێو لای دەبات بە هــۆی ڕێ لێگرتنــەوە، هەروەکو پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەکانــی خــوا لێیــان ڕازی بێ وایان کرد لەوکاتەی هاوبەشــدانەران لە ســاڵی حودەیبیە ڕێگەیــان پــێ گرتــن، ئەگەر ئــاژەڵ نەبوو لە بــری ئەوە دە ڕۆژ بــە ڕۆژوو دەبێ، لە پاشــان ئیحرامی نامێنێو حــەڵاڵ دەبێتەوە.

لە پاشــان خــوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ وَلَا تَحۡلِقُواْ رُءُوسَكُمۡ حَتَّىٰ يَبۡلُغَ ٱلۡهَدۡيُ مَحِلَّهُۥ ﴾ ئــەوە لە قەدەغە کراوەکانــی ئیحرامــە لابردنــی موو بە تاشــین، یــان جگە لەتاشــین، چونکە ماناکــەی یەکە، چ لەســەر، یــان لــە جەســتەی بێ، چونکە مەبەســت لــەوەدا پەیــدا بوونی پرچ تێــک ئاڵانو قەدەغــە بوونــە لە خــۆش گوزەرانــیو کەیف کردنو بــە لادانەکــەیو نەهێشــتنی، ئەوەش هەیــە لــە هەمــوو مووەکانی تر.

زۆرێــک لــە زانایــان قیاســی نینــۆک کردنیشــیان کــردوە بەســەر نەهێشــتنی مــوو بــە کۆبوونــەوەی کەیــفو ڕابــواردن، ئــەوە قەدەغەیــە بــەردەوام دەبێت تــا ئاژەڵەکــە دەگاتە جێگــاو شــوێنی خۆی، کە ئەویــش ڕۆژی ســەربڕین (جەژنی قوربان)ە، باشــترە تاشــینەکە لــە دوای ســەربڕینەکە بێــت، هەروەکــو دەقەکــە بەڵگەیە لەســەری.

بــەم دەقەش بەڵگە دەهێنرێتەوە لەســەر ئەوەی کە ئیحرام بە تەماح بەستن، ئەگەر ئاژەڵەکەی لــێ خورێ حــەڵاڵ نابێتــەوەو لە عومرەکــەی پێش ڕۆژی ســەربڕین، ئەگــەر تەوافی کردو ســەعی ســەفاو مــەڕوەی کرد بــۆ عومرە کــرد ئیحــرام بۆ حــەج دەبەســتێ، ناتوانــێ ئیحرام بیەســتێ بەهــۆی لــێ خورینی ئاژەڵــی هەدیەکەی، بەڕاســتی خــوای بەرزو مــەزن قەدەغەی

کـردوە لـەوەی (مـووی بتاشـێ)، تەنهـا لەبەر خۆ بەکـەم زانیـن و ملکەچ بوون بـۆ خوا، وە خۆشـکاندنەوەیە بـۆیو خاکـی بوونیەتـی کـە ئەوە لـە پێنـاو بەرژەوەنـدی بەندەدایە، هیچ زیانێکـی لەسـەر نەبـێ لـەوەدا، جـا ئەگـەر زیانێک پەیـدا بـوو وەک ئازارێک لە سـەریدا بـوو کە بە تاشـینی سـەری سـوودی پێگەیانـد، یان برینـی هەبوو، یـان ئەسـپێو نموونەی ئـەوەی هەبـوو، ئـەوە بـۆی حەلاڵـە کـە سـەری بتاشـێ، بـەلاّم فیدیـەی دەکەوێتە سـەر، ﴿ مِّن صِيَامٍ ﴾ (بـە ڕۆژوو بوونـی) سـێ ڕۆژ، ﴿ أَوْ صَدَقَةٍ ﴾ (یـان سـەدەقەو خێرکردن) بەسـەر هەژارو نـەدار ﴿ أَوْ نُسُكٍ ﴾ (یان سـەربڕینی ئاژەڵ) ئەوەی دەشـێ بـۆ قوربانی، ئەو سەرپشـکە (لـە نێوانـی بە ڕۆژوو بـوونو سـەدەقەو سـەربڕینەکە)، وە سـەربڕینی ئاژەڵەکە چاکتـرە، لـە دوای ئەو سـەدەقە، کە لـە دوای ئەویـش بـە ڕۆژوو بوونەکەیە.

نموونـەی ئـەوەش هەمـوو ئەوانەی لە مانـای ئەوەدان لە نینۆک کردن، یان سـەر داپۆشـین، یـان لەبـەر کردنی پۆشـاکی دڕاو، یـان بۆنخۆش کردن، ئـەوە لە کاتی ناچارییو پێویسـتی دروسـتە، لەگـەڵ واجبوونـی بوونـی ئـەو فیدیانـەی کـە باسـکراون، چونکـە مەبەسـت لە هەموویـان نەهێشـتنی ئەوەیـە کە کەیفو خۆشـگوزەرانی پێـوە دەکرێت.

پاشـان خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ فَإِذَآ أَمِنتُمۡ ﴾ واتـە: ئەگـەر توانیتـان بچنە ماڵی خـوا بەبێ قەدەغـەو بەربەسـتی دوژمـنو جگـە لەویـش، ﴿ فَمَن تَمَتَّعَ بِٱلۡعُمۡرَةِ إِلَى ٱلۡحَجِّ ﴾ بـەوەی عومـرە بگەیەنێتـە حـەج سـوود وەرگرێ بـە چێژ وەرگرتنەکـەی، لە دوای دەسـت بە تـاڵ بوونی لـە عومرەکەی.

﴿ فَمَا ٱسۡتَيۡسَرَ مِنَ ٱلۡهَدۡيِ ﴾ لـە سـەریەتی ئـەوەی بـۆی هەڵدەسـوڕێ لـە سـەربڕینی ئاژەڵـی هـەدی، ئەویـش ئەوەیـە کە بـۆ قوربانی دەبێو دروسـتە، ئەمـەش خوێنی پەرسـتنو کاری حەجیەتـی، لـە بەرانبەر دوو سـەربڕیندایە بـۆی لەیەک گەشـتدا، وە لەبەر بەخشـینی خوایە بەسـەری بـە دەسـتەبەر بوونی سـوود وەرگرتن لـە دوای دەسـت بەتاڵبوونی لـە عومرە، وە پێـش دەسـتکردنەوەو چوونـە نێو حەج، نموونـەی ئەویش (ئیحرام بەسـتنە بە قیـران) لەبەر دەسـتە بەربوونی دوو سـەربڕین بۆی.

تێگەیشـتن (مفهـوم)ی دەقەکـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی کـە ئیحـرام بـە تەنهـا بـۆ حەج دەبەسـترێ (کە پێـی دەوترێ ئیفراد) سـەربڕینی ئاژەڵی لەسـەر نیـە، دەقەکـە دەبێتە بەڵگە لەسـەر دروسـتی، بەڵکـو چاکـی (ئیحـرام بەسـتن بـە تەمەتتـوع)، وە دەبێتە بەڵگە لەسـەر دروسـتی ئەنجامدانـی (عومـرە) لـە مانگەکانـی حەجدا.

﴿فَمَن لَّمْ يَجِدْ﴾ واتــە: ئــەوەی ئاژەڵــی نەبــێ، یــان نرخەکــەی ﴿فَصِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ﴾ یەکـەم دروسـت بوونـی لە کاتـی ئیحرام بەسـتنیەتی بـە عومرە، کۆتاییەکەشـی سـێ ڕۆژ دوای سـەر بڕینـە (دوای ڕۆژی یەکەمـی جەژنـی قوربـان)، ڕۆژانی شـەیتان ڕەجم کردنو مانـەوەی شـەو لە (منی)، بـەڵام چاکتر لەوانـە بەڕۆژووبوونـی حەوتەمو هەشـتەمو نۆیەمە، ﴿وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ﴾ واتـە: لـێ بوونـەوە لـە کارەکانـی حـەج کردن، دروسـتە لـە مەککە بیانـکات، یـان لـە ڕێگا، یـان لەگـەڵ گەیشـتنەوەی بە مـاڵو منداڵی.

﴿ذَٰلِكَ﴾ ئـەوەی باسـکرا لـە پێویسـتی بوونـی هەدی لەسـەر ئەوەی بـە عومـرە ئیحرامی بەسـتبوو، ﴿لِمَن لَّمْ يَكُنْ أَهْلُهُ حَاضِرِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ﴾ بـەوەی ماوەی نوێـژ کورتکردنەوە (قصـر)، یـان زیاتـر لـە مزگەوتی حـەرام دوور بێ، یـان بە گوێـرەی عـورفو نەریت لێ دووربـێ، ئـا ئەوەیە هەدی لەسـەری پێویسـت دەبێ، لەبەر بەدەسـتەبەر بوونـی دوو قوربانی بـۆی لـە یەک گەشـتدا، بـەڵام ئـەوەی مـاڵو خێزانی لـە دانیشـتوانی مزگەوتی حـەرام بێ (لـە مەککـە)، ئەوە هەدی لەسـەر نیـە، چونکە پێویسـت نابێ لەسـەری .

﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ﴾ واتـە: لـە هەمـوو کارو بارەکانتـان، بـە جێبەجـێ کردنـی فەرمانەکانـیو دوورکەوتنـەوە لـە قەدەغەکراوەکانـی، لەوانەشـە جێبەجـێ کردنتـان بـە ئـەو فەرمـان پێ کراوانـەو دوورکەوتنەوەتـان لـەو قەدەغـە کراوانـەی باسـکراوە لـەو دەقە.

﴿وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ واتـە: بـۆ ئەو کەسـەی سـەرپێچی دەکاتو گونـاە ئەنجام دەدات، ئـا ئـەوە پێویسـتکارە بـۆ لـە خـوا ترسـانو پارێـزکاری، ئـەوەی لـە تۆڵـەی خوا بترسـێ، واز دێنـێ لـەوەی کـە تۆڵـەی لەسـەر پێویسـت دەکات، وەک چـۆن کەسـێ بە ئومێـدی پاداشـتی خـوا، کار دەکات بـۆ ئـەوەی دەیگەیەنێت بە پاداشـت، بـەڵام ئەوەی لە تۆڵـە ناترسـێو ئومێـدی پاداشـتی نیە، ئەوە خـۆی دەخاتـە نـاو حەرامکـراوەکانو بوێری دەکات لەسـەر وازهێنـان لـە پێویسـتیەکان (واجبات).

ٱلْحَجُّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَٰتٌ ۚ فَمَن فَرَضَ فِيهِنَّ ٱلْحَجَّ فَلَا
رَفَثَ وَلَا فُسُوقَ وَلَا جِدَالَ فِى ٱلْحَجِّ ۗ وَمَا تَفْعَلُوا۟ مِنْ
خَيْرٍ يَعْلَمْهُ ٱللَّهُ ۗ وَتَزَوَّدُوا۟ فَإِنَّ خَيْرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقْوَىٰ ۚ
وَٱتَّقُونِ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٧﴾ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ
أَن تَبْتَغُوا۟ فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ ۚ فَإِذَآ أَفَضْتُم مِّنْ
عَرَفَٰتٍ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ عِندَ ٱلْمَشْعَرِ ٱلْحَرَامِ ۖ
وَٱذْكُرُوهُ كَمَا هَدَىٰكُمْ وَإِن كُنتُم مِّن قَبْلِهِۦ
لَمِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿١٩٨﴾ ثُمَّ أَفِيضُوا۟ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ
ٱلنَّاسُ وَٱسْتَغْفِرُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٩٩﴾
فَإِذَا قَضَيْتُم مَّنَٰسِكَكُمْ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ كَذِكْرِكُمْ
ءَابَآءَكُمْ أَوْ أَشَدَّ ذِكْرًا ۗ فَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ
رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا وَمَا لَهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنْ خَلَٰقٍ
﴿٢٠٠﴾ وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً
وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿٢٠١﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ
لَهُمْ نَصِيبٌ مِّمَّا كَسَبُوا۟ ۚ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٠٢﴾

(١٩٧): ﴿ ٱلْحَجُّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَٰتٌ ۚ فَمَن فَرَضَ فِيهِنَّ ٱلْحَجَّ فَلَا رَفَثَ وَلَا فُسُوقَ وَلَا جِدَالَ فِى ٱلْحَجِّ ۗ وَمَا تَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ يَعْلَمْهُ ٱللَّهُ ۗ وَتَزَوَّدُوا۟ فَإِنَّ خَيْرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقْوَىٰ ۚ وَٱتَّقُونِ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٧﴾ ﴾:

خوا ﷻ هەواڵدەدات بەوەی کە بێگومان ﴿ ٱلْحَجُّ ﴾ ئەنجام دەدرێ لە ﴿ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَٰتٌ ﴾ (واتە: چەند مانگێکی ژمێردراون) لەلایەن دوێنراوان، مانگەکانی زۆر دیارن بە رادەیەک پێویستیان بە تایبەت کردن نیە، وەک چۆن ڕۆژووگرتن پێویستی بە دیاری کردنی مانگەکەی هەیە، (یان) وەک کاتی پێنج نوێژەکان کە خوا ﷻ دیاری کردووون، بەڵام حەج کردن بێگومان لە ڕێبازی ئیبراهیم بووە ئەوەی کە بەردەوامە لە ڕۆڵەو نەوەکانیشی زانراو ناسراوە لە نێویان.

مەبەست لە مانگە دیاریکراو زانراوەکان لەلای زۆرینەی زانایان: شەوالو (ذو القعدة)و دە ڕۆژی (ذو الحجة)یە ئەوانە بە زۆری ئیحرام بەستنی تێدا ڕوو دەدات.

﴿ فَمَن فَرَضَ فِيهِنَّ ٱلْحَجَّ ﴾ واتە: ئیحرامی تێدا بەست، چونکە ئەگەر سوننەتیش بێ بە دەست پێکردنی دەبێتە فەرز. (واتە کە دەستت پێکرد نابێ وازی لێ بێنی تا تەواوی دەکەیت).

شافیعیو شوێن کەوتووانی ئەم دەقە بە بەڵگە دێننەوە لەسەر ئەوەی کە دروست نیە ئیحرام بۆ حەج ببەسترێت پێش ئەو مانگانە.

منیش دەڵێم: ئەگەر وترابا: بەڵگەی ئەوەی تێدایە بۆ قسەی زۆرینەی زانایان کە دروستە ئیحرام ببسترێت بۆ حەج پێش مانگەکانی ئەوە نزیکتر بوو(لە ڕاستی) چونکە خوا فەرموویەتی: ﴿ فَمَن فَرَضَ فِيهِنَّ ٱلْحَجَّ ﴾ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بەڕاستی فەرز دەکەوێتە ناو ئەو مانگانەی کە باسکرا، جاری واش هەیە ناکەوێتە ناو ئەوانەوە. ئەگەرنا نەیدەبەستەوەو بەندداری نەدەکرد.

کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَا رَفَثَ وَلَا فُسُوقَ وَلَا جِدَالَ فِى ٱلْحَجِّ ﴾ واتە: ئیحرام بەستن پێویستە بۆ حەج کردن بە گەورە دابنرێ، بە تایبەتی ئەوەی لە مانگەکاندا ڕوودەدا، بپارێزێ لە هەر

شتێک کە تێکی دەدات، یان کەمی دەکاتەوە، (وشەی) ﴿ رَفَثَ ﴾ بریتیە لە جووت بوونو پێشەکیەکانی گوفتاریی‌و کرداریی، بە تایبەتی لە لای ژنانو بە ئامادەبوونیان.
وە ﴿ فُسُوقَ ﴾ واتە: لە فەرمان دەرچوون: بریتیە لە هەموو گوناهەکانو لەوانیشە قەدەغەکراوەکانی ئیحرام.
وە ﴿ جِدَالَ ﴾ بریتیە لە: مشتومڕو ڕکابەریی‌و دژایەتی، لەبەر ئەوەی ئاشووب دەنێتەوەو دوژمنایەتی بەرپا دەکات.
مەبەست لە حەج: خۆ بە کەمگرتن‌و شکانەوەیە بۆ خواو نزیک بوونەیە لێی، بەوەی لە توانایدا هەیە لە نزیککەرەوەکان، وە پاکبوونەوەیە لە گوناهەکان، ئەمە بەوەوە دەبێتە (مبرور) چاک، حەجی چاکیش پاداشتی تەنها بەهەشتە، ئەو شتانەی ئەگەر قەدەغە کراوە لە هەموو جێگاو کاتێک، ئەوە لە حەجدا قەدەغە کردنەکەی توندتر دەکرێن.
بزانە لە خوا نزیکبوونەوە نایەتە دی بە وازهێنان لە گوناهەکان، تاکو فەرمانەکان ئەنجام نەدرێن، لەبەر ئەوەیە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَمَا تَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ يَعْلَمْهُ ٱللَّهُ ﴾، ﴿ مِنْ ﴾ی هێناوە، بۆ بە دەق کردنی گشتییە، هەموو چاکەیەک‌و نزیک بوونەوەیەک‌و پەرستنێک لە چوارچێوەی ئەوەدایە، واتە: بەڕاستی خوا پێی زانایە، ئەوە ئەوپەڕی هاندان لەسەرکارە چاکەکان دەگەیەنێ، چونکە ئەمە ئەوە دەخوازێ ئەوەی لە توانادایە دابینی بکەیت تێیدا لە: نوێژو چاکەو صەدەقەو (طواف) سوڕانەوەو، چاکە کردن بە گوفتارو کردار.
پاشان خوا ﷻ فەرمانی کردوە بە لەگەڵ خۆبردنی (پێداویستی‌و کەلو پەلو تێشووی پێویست) بۆ ئەو گەشتە ڕێزدارو پیرۆزە، بێگومان لەگەڵ خۆ بردنی تێشوو بۆ گەشت کردنەکە، خاوەنەکەی بێ نیاز دەکات لە خەڵکانی تر، دوور دەبێ لە سامانو ماڵی خەڵکی بە داواکردن بێت یان بەهەر جۆرێکی تر، بەڵام لە زۆر هەڵگرتنی تێشووی سوودی هەیەو یارمەتی گەشتیارانی تر دەدات، وە نزیکبونەوەی زیاتری تێدایە لە پەروەردگاری جیهانیان، ئەمە ئەو زادو زەخیرەیە کە مەبەست لێی بە جێهێنانی بەڵگەیە، ڕاگرتنی لاشەو گەیشتن پێی‌و کەلو پەلە.
بەڵام زادو زەخیرەی ڕاستەقینە کە سوودەکەی بەردەوام بێت بۆ خاوەنەکەی لە دونیاو دوا ڕۆژدا، بریتیە لە زادو زەخیرەی خۆپارێزی‌و لە خوا ترسان، کە زادو زەخیرەیەکە دەیگەیەنێت بە شوێنی ئۆقرەگرتن‌و مانەوە، ئەوە گەینەرە بۆ تەواوترین تامو چێژ، شکۆدارترین نازو نیعمەتە بەردەوامەکانە بۆ هەمیشەیی، ئەو کەسەی وازی لەو زادەو زەخیرە هێنابێ، ئەوە لێ

پچڕاوەو دابڕاوە، ئەوە سەرچاوەی تووشبونی هەموو خراپەیەکە، وە قەدەغەکراوە لە گەیشتن بە شوێنی دڵنیا کاران، ئەمە پیاهەڵدانە بۆ پارێزکاریو لە خوا ترسان.

ئنجا فەرمانی کردوە بە خاوەن ژیریو هۆشەکانو فەرموویەتی: ﴿وَٱتَّقُونِ يَـٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَـٰبِ﴾ واتە: ئەی ئەوانەی خاوەن ژیریو هۆشی سەنگینن، پارێزکاربنو بترسن لەو پەروەردگارەتان، کە ترسان لێی مەزنترین شتە کە عەقڵو ژیریەکان فەرمانی پێدەکات، ، واز لێ هێنانیشی بەڵگەیە لەسەر نەفامییو پوچەڵی لە بۆچووندا.

(١٩٨-٢٠٢): ﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُوا۟ فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ ۚ فَإِذَآ أَفَضْتُم مِّنْ عَرَفَـٰتٍ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ عِندَ ٱلْمَشْعَرِ ٱلْحَرَامِ ۖ وَٱذْكُرُوهُ كَمَا هَدَىٰكُمْ وَإِن كُنتُم مِّن قَبْلِهِۦ لَمِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿١٩٨﴾ ثُمَّ أَفِيضُوا۟ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ وَٱسْتَغْفِرُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٩٩﴾ فَإِذَا قَضَيْتُم مَّنَـٰسِكَكُمْ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ كَذِكْرِكُمْ ءَابَآءَكُمْ أَوْ أَشَدَّ ذِكْرًا ۗ فَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا وَمَا لَهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ مِنْ خَلَـٰقٍ ﴿٢٠٠﴾ وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿٢٠١﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ لَهُمْ نَصِيبٌ مِّمَّا كَسَبُوا۟ ۚ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٠٢﴾﴾:

﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُوا۟ فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ﴾ کاتێ خوا ﷻ فەرمانی کرد بە خۆپارێزیو لە خوا ترسان، هەواڵیداوە بە بەدەست هێنانی فەزڵو چاکەی بە بازرگانی کردن لە وەرزەکانی حەجو جگە لەویشدا، هیچ گوناهێکی تێدانیە ئەگەر مەبەستی ڕاستەقینەی حەجەکە سەرقاڵی نەکات، بازرگانی حەڵاڵو پاک دراوەتە پاڵ فەزڵو بەخششی خوا، نەک پاڵدرابیتە لای شارەزاییو زانایی بەندە، لەگەڵ بەکارهێنانی هۆکارو بیر چوونەوەی دروستکەری هۆکارەکان، بە ڕاستی ئەمە خۆی لە خۆیدا گوناهو تاوانە.

لەم فەرمایشتەدا: ﴿فَإِذَآ أَفَضْتُم مِّنْ عَرَفَـٰتٍ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ عِندَ ٱلْمَشْعَرِ ٱلْحَرَامِ﴾ بەڵگە هەیە لەسەر چەند شتێک:

یەکەم: وەستان لە عەرەفە، بێگومان زانراوە کە بە ڕووکنێک لە ڕووکنەکانی حەج دادەنرێت، هاتنە خوارەوەو ڕۆیشتن لە (عرفات) نابێو نایەتە جێ مەگەر دوای وەستان (لە عەرەفە).

دووەم: فەرمان کردن بە یادی خوا، لە لای (مشعر الحرام) کە بریتیە لە موزدەلیفە، هەروەها ئەوەش ناسراو زانراوە، شەوی جەژنی سەربڕین (قوربان) لەوێ دەمێنێتەوە لە دوای نوێژی بەیانی تاکو (ئاسمان) تەواو ڕووناک دادێت لە موزدەلیفە دەوەستێ بە نزاو پاڕانەوە کردن، وە

ئەنجامدانی فەرزو سونئەتەکانیش دەچنە ژێر ناوی یادی خوا تێیدا.

سێیەم: وەستان لە موزدەلیفە، لە دوای وەستان لە (عرفة) دێت، هەر وەک چۆن (فاء) و (ترتیب) ڕێکخستن، دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەمە.

چوارەمو پێنجەم: (عرفات) و (مزدلفة) هەردووکیان لە دروشمەکانی حەجن، مەبەست ئەنجامدانو دەرخستنیانە.

شەشەم: (مزدلفة) بە حەرەم حیسابە لەبەر ئەوەی پەیوەستە بە (حرام).

حەوتەم: عەرەفە لە حەڵاڵەکانەو (حرام) نیە، هەروەکو ئەوەی لێوەردەگیرێ (مزدلفە) بەستنەوەیە بە (حرام).

﴿ وَٱذْكُرُوهُ كَمَا هَدَىٰكُمْ وَإِن كُنتُم مِّن قَبْلِهِۦ لَمِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴾ واتە: یادی خوا ﷻ بکەن، لەبەر ئەوەی بەخشینو منەتی بەسەرتانەوە کرد بەوە کە هیدایەتی دان، دوای گومراییتان، لەبەر ئەوەش کە فێری ئەوەی کردن کە نەتاندەزانی، ئا ئەوە لە گەورەترین نیعمەتەکانە ئەوانەی پێویستە شوکرانەیان لە بەرانبەردا بکرێتو یادی بەخشەری نیعمەتەکانی (کە خوایە) بە دڵو زمان بکرێت.

﴿ ثُمَّ أَفِيضُوا۟ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ ﴾ واتە: پاشان بڕۆنو شۆڕببنەوە لە موزدەلیفە هەروەکو خەڵکی دەڕۆنو دێنەخوار، لە ڕۆژگاری ئیبراهیم تاکو ئێستا، مەبەست لەو هاتنە خوارەوەو ڕۆیشتنە زانراو ناسراو بوو لەلای ئەوان، کە بریتیە لە: شەیتان ڕەجم کردنو سەربڕینی ئاژەڵی هەریەکەیانو هاتوچۆی نێوان سەفاو مەڕوەو شەومانەوە لە میناو شەوانی تەشریق (دووی شەوی یەکەمی جەژنی قوربان)و تەواو کردنی کارو پەرستشەکانی دیکەی حەج.

لەبەر ئەوەی ئەو هاتنە خوارو ڕۆیشتنە مەبەست پێ ئەوە بوو کە باسکرا، باسکراوەکانیش کۆتایی کارو پەرستشەکانی حەجن، خوا ﷻ فەرمانیدا لە کاتی دەستبەتاڵ بوون لێیان داوای لێبوردن لەو بکەنو یادی خوا زۆر بکەن، داوای لێبوردن لەبەر ئەو کەمو کورتیانەیە لە لایەن بەندەوە لە بەجێهێنانیو پەرستشەکەیو کەمتەرخەمی تیایاندا، وە یادی خواو شوکرانە بژێری لەسەر نازو نیعمەتەکانی خوا، بە پشتگیری کردنی بۆ ئەو پەرستشە مەزنانەو منەتە گەورانەی پەروەردگار.

بەندە دەبێ هەر ئاوا بێ، هەر کاتێک دەست بەتاڵ بوو لە پەرستشێک، داوای لێبوردن لە خوا بکات لەسەر کەمتەرخەمیو کەمو کوڕیەکانی، وە ستایشی بکات لەسەر ڕێی ڕاستو پشت

گیریکردنی خوا ﷻ نەک پێی وابێ کە پەرستشەکەی تەواو کردوە منەتی پێیەوە بکات لەسەر پەروەردگاری، بیکاتە جێگای مەنزلگەیەکی بەرزو بڵند، ئەوە شایانە بە خەشمو غەزەبو ڕەتکردنەوەی کارەکەی، هەروەکو ئەمە سەرەتا پێویستی بە قبووڵ کردنو پشتگیری کردنە بۆ کردەوەکانی دیکە.

پاشان خوا ﷻ هەواڵیدا دەربارەی حاڵو باری خەڵکی، کە هەموویان داوای خواستەکانیان لێ دەکەن، لادانو ڕەتکردنەوەی ئەوەی زیانیان پێ دەگەیەنێ، بەڵام مەبەستەکانیان جیاوازن، هەیانە ﴿مَن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنۡيَا﴾ واتە: داوای خواستی دونیایی لێدەکات ئەوە لە ئارەزووەکانیەتی، لە دوا ڕۆژدا هیچ پشکو بەشی نیە، لەبەر دڵتێنەچوونو نەویستنی، هەوڵو هیمەتی خۆی کورتهەڵێناوە لەسەر دنیا، هەشیانە نزاو پاڕانەوەی خوا دەکات بۆ بەرژەوەندی هەردوو دونیاو دواڕۆژ، خۆی بە کەمتەرخەم دەزانێ لە کاروبارەکانی دینو دونیایدا، هەریەک لەوانەو لەوانی تریش، بەشیان هەیە لە بە دەستهێنانو کارەکانیان، خوای بەرز پاداشتیان دەداتەوە، بە گوێرەی کارو کردەوەکانیانو نیازو مەبەستیان، سزاو پاداشتێک دەخوێنێتەوە لە نێوان دادپەروەریی‌و بەخششی، سوپاسو ستایشی تەواوی لەسەر دەکرێ.

لەم ئایەتەدا بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی خوا وەڵامی نزای هەموو داواکارو نزاکارێک دەداتەوە، چ مسوڵمان بێ، یان کافر بێ، یان لە فەرمان دەرچووو گوناهبار بێت، بەڵام وەڵامدانەوەی داواو نزاو پاڕانەوەی، ئەوەی لێی دەپاڕێتەوەو داوای لێ دەکات بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی کە خوا خۆشی دەوێ، تەنها لە خواستەکانی دواڕۆژو کاروباری ئایین نەبێ.

چاکەی خوازراو لە دونیا هەموو ئەوانە دەگرێتەوە کە بە لای بەندەوە جوانو چاکن، لە ڕزقو ڕۆزی بێ ماندوبوونی فراوانی حەڵاڵو هاوسەری چاکو منداڵ کە چاوی پێ ڕوون دەبێتەوە، وە پشودانو سرەوتنو زانستی بە سوودو کردەوەی چاک، وە نموونەی ئەوانە لە خواستە ڕێ پێدراوە خۆشەویستەکانە.

چاکەی دواڕۆژیش بریتیە لە ڕزگار بوون لە سزاکانی نێو گۆڕو وەستان لە گۆڕەپانی حەشرو ئاگرو، دەستەبەربوونی ڕەزامەندی خواو بردنەوەی نازو نیعمەتە بەردەوامەکانە، وە نزیک بوونەوەیە لە پەروەردگاری بە بەزەیی، جا ئەو پاڕانەوەو نزایە بووە کۆکەرەوەی تەواوترین پاڕانەوەو نزاکان، لە پێشترینیانە بە پێش خستن، لەبەر ئەوەشە پێغەمبەر ﷺ لەو پاڕانەوەیەی زۆر کردوەو هاندانی لەسەر دەکات.

۞وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ فِيٓ أَيَّامٖ مَّعۡدُودَٰتٖۚ فَمَن تَعَجَّلَ فِي
يَوۡمَيۡنِ فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِ وَمَن تَأَخَّرَ فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِۖ لِمَنِ
ٱتَّقَىٰۗ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُمۡ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ
٢٠٣ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُعۡجِبُكَ قَوۡلُهُۥ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا
وَيُشۡهِدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا فِي قَلۡبِهِۦ وَهُوَ أَلَدُّ ٱلۡخِصَامِ ٢٠٤
وَإِذَا تَوَلَّىٰ سَعَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ لِيُفۡسِدَ فِيهَا وَيُهۡلِكَ ٱلۡحَرۡثَ
وَٱلنَّسۡلَۚ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلۡفَسَادَ ٢٠٥ وَإِذَا قِيلَ لَهُ ٱتَّقِ ٱللَّهَ
أَخَذَتۡهُ ٱلۡعِزَّةُ بِٱلۡإِثۡمِۚ فَحَسۡبُهُۥ جَهَنَّمُۖ وَلَبِئۡسَ
ٱلۡمِهَادُ ٢٠٦ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡرِي نَفۡسَهُ ٱبۡتِغَآءَ
مَرۡضَاتِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ رَءُوفُۢ بِٱلۡعِبَادِ ٢٠٧ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ ٱدۡخُلُواْ فِي ٱلسِّلۡمِ كَآفَّةٗ وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ
ٱلشَّيۡطَٰنِۚ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ٢٠٨ فَإِن زَلَلۡتُم مِّنۢ بَعۡدِ
مَا جَآءَتۡكُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ
٢٠٩ هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن يَأۡتِيَهُمُ ٱللَّهُ فِي ظُلَلٖ مِّنَ ٱلۡغَمَامِ
وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ ٢١٠

(٢٠٣): ﴿وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ فِيٓ أَيَّامٖ مَّعۡدُودَٰتٖۚ فَمَن تَعَجَّلَ فِي يَوۡمَيۡنِ فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِ وَمَن تَأَخَّرَ فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِۖ لِمَنِ ٱتَّقَىٰۗ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُمۡ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ٢٠٣﴾:

﴿وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ فِيٓ أَيَّامٖ مَّعۡدُودَٰتٖ﴾ خـوا ﷻ فەرمـان دەكات بـە يادكردنـی خـۆی لـە ڕۆژە ژمێـردراو دیـارەكان كـە بریتیـن لـە ڕۆژانـی (تشـریق) سـێ ڕۆژی دوای جەژنـی قوربـان، لەبـەر پلـەو پایـەو تایبەتمەندیەكـەی، لەبـەر ئـەوەش حوكمەكانـی دیكـە كارو پیشـەكانی حەج تێیانـدا دەكرێـت، لەبـەر ئـەوەش كـە خەڵكـی میوانـی خوایە تێیانـدا، لەبەر ئەمەیە بـەڕۆژوو بـوون تیایاندا قەدەغـە كراوە، جا یـادو زیكر تیایانـدا تایبەتمەندیەكـی هەیە كە جگـە لـەوان بۆ ڕۆژانـی تر نیە، لەبـەر ئەمەیە پێغەمبـەر ﷺ فەرموویەتی: {أَيَّـامُ التَّشْرِيـقِ أَيَّامُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ وَذِكْـرِ اللهِ}(أَخْرَجَـهُ أَحْمَـد برقـم: (٢٠٧٤١)، وَمُسْـلِمٌ برقـم: (١١٤١))، واتە: ڕۆژانی تەشـریق (سـێ ڕۆژی دوای یەكەم ڕۆژی جەژنـی قوربان)، ڕۆژانی خـواردنو خواردنەوەو یادكردنـی خوان.

شـەیتان ڕەجـم كـردن دەچێتـە چوارچێوەی یـادی خـوا تیایاندا، لە شـوێنی سـەربڕین، وە یـاد كردنـەوە بەسـتراوەكانی دوای نوێژە فـەرزەكان، بەڵكـو هەندێک لە زانایـان وتوویانە: بەشـێوەیەكی گشـتی چاكە(مسـتحب) تیایـدا تەكبیـر كردنـە بـە (الله أكبـر) بـە ڕەهایی، وەک: دە ڕۆژی سـەرەتای (ذو الحجة) ئـەوەش دوور نیە.

﴿فَمَن تَعَجَّلَ فِي يَوۡمَيۡنِ﴾ واتـە: لـە (منـی) دەرچـوو بـێ، پێـش خـۆر ئاوابوونـی ڕۆژی دووەم ﴿فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِ وَمَن تَأَخَّرَ﴾، شـەوی سـێیەم لەوێ مایەوە ڕۆژی دوای شـەیتانی ڕەجـم كـرد ﴿فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِ﴾ (واتـە: گوناهـی لەسـەر نیە) ئەمـە ئاسـانكاریە لە لایەن خـوای گـەورەوە بـۆ بەندەكانـی، لـە ڕێگاپێدانـی هـەردوو كارەكـە (پەلـە كـردن، یـان

مانەوەو دواكەوتن)، بەڵام زانراوە ئەگەر هەردوو كارەكەشی ڕێگاپێدراو بێت، مانەوەو دواكەوتن چاكترە، چونكە پەرستنی زیاترە. كاتێ كە نەهێشتنی گوناهو لادانی ئەوەی لێ تێدگەیەیت لەوەی باسكراوە، جگە لەویش، بە پوختی گوناه لادراوە لەوەی ڕابردوە، بەلام پەیوەستی كردوە بە فەرمودەی خۆی: ﴿لِمَنِ ٱتَّقَىٰ﴾ واتە: پارێزكاری كردوەو لە خوا ترساوە، لە هەموو كاروبارو حاڵەتەكانی حەج، ئەوەی پارێزكاری بكاتو لە خوا بترسێ لە هەموو شتێكدا، لاچونی گوناهەكانی بۆ دەستەبەر دەبێ، بەوەش لە شتێک پارێزكاریو لە خوا ترسانی هەبێ جگە لە شتێكی تر، ئەوە سزاو پاداشتی لە ڕەگەزی كردارەكەیەتی.

﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ بە جێبەجێكردنی فەرمانەكانیو دووركەوتنەوە لە بێ فەرمانیو سەرپێچییەكان.

﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُمۡ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ﴾ بە كردەوەكانتان سزاتان دەداو پاداشتتان دەداتەوە، ئەوەی لێی بترسێو پارێزكار بێت پاداشتی پارێزكاریەكەی لەلای ئەو دەبینێتەوە، ئەوەش كە لێی نەترسێو پارێزكار نەبێت تۆڵەی لێ دەسێنێتەوە بە توندترین تۆڵە، زانیاری بوون بە سزا لە مەزنترین هۆكاری لە خوا ترسانو خۆپارێزیە، لەبەر ئەوەیە خوا ﷻ هانی داوە لەسەر زانیاری بوون پێی.

(٢٠٤-٢٠٦): ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُعۡجِبُكَ قَوۡلُهُۥ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَيُشۡهِدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا فِي قَلۡبِهِۦ وَهُوَ أَلَدُّ ٱلۡخِصَامِ ٢٠٤ وَإِذَا تَوَلَّىٰ سَعَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ لِيُفۡسِدَ فِيهَا وَيُهۡلِكَ ٱلۡحَرۡثَ وَٱلنَّسۡلَۚ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلۡفَسَادَ ٢٠٥ وَإِذَا قِيلَ لَهُ ٱتَّقِ ٱللَّهَ أَخَذَتۡهُ ٱلۡعِزَّةُ بِٱلۡإِثۡمِۚ فَحَسۡبُهُۥ جَهَنَّمُۖ وَلَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ ٢٠٦﴾:

كاتێ خوا ﷻ فەرمانی داوە بە زۆر یاد كردنی، بە تایبەتی لە كاتە چاكەكاندا، كە خێرو بەرژەوەندیو چاكەی تێدایە، خوا ﷻ هەواڵیداوە بە حاڵو باری ئەو كەسەی بە زمانی قسە دەكات، بەلام كردەوەكەی پێچەوانەی قسەكەیەتی، جا قسە، یان مرۆڤ بەرز دەكاتەوە، یان نزمی دەكاتەوە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُعۡجِبُكَ قَوۡلُهُۥ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا﴾ واتە: ئەگەر قسە بكات قسەی ناسک دەكات بۆ بیسەر، ئەگەر بدوێ وا گومان دەبەی قسەیەكی بە سوودت بۆ دەكات، وە زۆر جەخت دەكاتەوە لەوەی دەیڵێت (ڕاست دەكات)، ﴿وَيُشۡهِدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا فِي قَلۡبِهِۦ﴾ هەواڵدەدا: بێگومان خوا دەزانێ ئەوەی لە دڵی دایە وەک ئەوەیە كە لەسەر زمانیەتی، ئەو درۆزنە لەوەدا،

چونکـە قسـەکەی پێچەوانـەی کردەوەیەتـی، ئەگەر ڕاسـتگۆبوایە قسـەو کـردەوەی وەک یـەک دەبـوو، دەکـردەوە، وەکو حاڵی بـڕواداریٚ کـە دوڕوو نەبـێ، بۆیە خـوا دەفەرمویٚ: ﴿ وَهُوَ أَلَدُّ ٱلْخِصَامِ ﴾ واتـە: کاتـێ ڕووبـەڕوی دەبیتـەوە، تووڕەیـیو دەمارگیریـیو توونـدی تێـدا دەبینـی، ئـەوەی لەسـەر ئـەوە دادەمەزرێت لـە سـیفەتە ناشـرینەکانە، وەکو ڕەوشـتی بـڕواداران نیە، ئەوانەی نەرمو ڕەوشـت بەرزیان کردۆتە سـواریەکەیانو لەسـەری دامـەزراون، ملدانیـان بۆ هـەق کردۆتە پیشـەو کاریـانو دڵ فراوانی بۆتە خوو سروشـتیان. ﴿ وَإِذَا تَوَلَّىٰ ﴾ ئـەو کەسـەی قسـەکەی سەرسـامت دەکات ئەگـەر لـەلات ئامـادە بـوو، ﴿ سَعَىٰ فِي ٱلْأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا ﴾ واتـە: هـەوڵو کۆشـش دەکات لەسـەر ئەنجامدانـی سـەرپێچیو تـاوانو خراپەکاریی لەسـەر زەوی ﴿ وَيُهْلِكَ ﴾ بە هـۆی ئەوەوە ﴿ ٱلْحَرْثَ وَٱلنَّسْلَ ﴾ چاندنـی دانەوێڵـەو بەروبومـەکانو ئـاژەڵو مەڕومالاَتەکان دەفەوتێنـێو فەرو بەرەکەتیـان کـەم دەکاتـەوە، بە هـۆی ئەنجامدانی گوناهـو سـەرپێچیەکان ﴿ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْفَسَادَ ﴾ (خـوا خراپەکاریـی خۆشـناویٚ) مـادام خـوا حەزی لە خراپـە نەبێـت، بێگومان ئـەو تـووڕە دەبێ لـەو بەندەیەی کە خراپە لەسـەر زەویـدا دەکات بە ئەوپـەڕی تووڕەبوون، ئەگـەر بـە زمانی قسـەی چاکیـش بڵێ.

لـەم دەقـەدا بەڵگـە هەیە لەسـەر ئـەوەی ئەو قسـانەی کە لەدەمی مـرۆڤ دەردەچـن، بەڵگە نیـە لەسـەر ڕاسـتی یـان درۆ، وە لەسـەر باشـەو خراپـە، تـا کاری چاکـی لەگەڵـدا ئەنجام نـەدات، دەبێ هەڵسـەنگاندنی بارودۆخی شـایەتەکان تەماشـا بکرێت، کەسـی خاوەن هەقو کەسـی خـاوەن ناهەق لە خەڵکی بـە کردەوەکانیـان تاقیبکرێنەوە، وە سـەرنجی بارودۆخیان بـدریٚ، نەخەڵەتـێ بەچاو بەسـتنو خۆ بە باش پێشـاندانو سـاختەکردن.

پاشـان باسـی ئـەو خراپەکارەی کـرد لەسـەر زەوی کـە گوناهو سـەرپێچی خـوا دەکات، ئەگـەر فەرمانی بـە لە خواترسـانو خۆپارێزی پـێ بکرێت، لـووت بەرز دەبێو کەشـخەی دەکات، ﴿ أَخَذَتْهُ ٱلْعِزَّةُ بِٱلْإِثْمِ ﴾ درۆ کـردنو ئەنجامدانـی سـەرپێچیو لـووت بـەرزی پێکـەوە کۆکردۆتـەوە، لەسـەر ئامۆژگاریکارانو دڵسـۆزانی.

﴿ فَحَسْبُهُۥ جَهَنَّمُ ﴾ (دۆزەخـی بەسـە کە) ئەویٚ شـوێنو جێگەی حەوانەوەی سـەرپێچی کارانو لـووت بەرزانە.

﴿ وَلَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴾ واتـە: لانکەو شـوێنو ماڵی سـزای هەمیشـەییو بەردەوامـە، تێیدا لە دەسـت بـەرداریو بـێ ئومێدی هەمیشـەیی دان، سـزایان لەسـەر سـووک ناکـریٚ ئومێدی

پاداشـتیش نابـن، ئەمە سـزایە بـۆ تاوانەکانیـانو بەرانبـەرە بـۆ کردەوەکانیان، پەنـا بە خوا لە حاڵـی ئەوانە.

(٢٠٧): ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡرِي نَفۡسَهُ ٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ رَءُوفُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴿٢٠٧﴾ ﴾:

ئەوانـە ئـەو کەسـانەن کـە سـەرکەوتوو بـوون، نەفسـی خۆیـان هـەرزان فرۆش کـردوە، وە خۆیـان بەخـت کـردوە لەبـەر ڕەزامەنـدی خـواو ئومێد بـوون بـە پاداشـتەکەی، ئەوان (شـتێکی) گرانبەهایـان بەخشـیوە، پەروەردگـاری بـە سـۆز بەرانبـەر بەندەکانـی، کـە لـە بەزەیـیو میهرەکـەی ئەوەیە پشـتگیری کـردونو یارمەتی داون بـۆ ئەوە، بێگومـان بەڵێنی وەفا کردنیشـی بـەوەوە داوەو فەرموویەتـی: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ ٱشۡتَرَىٰ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَنفُسَهُمۡ وَأَمۡوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلۡجَنَّةَۚ ﴿١١١﴾ ﴾ التوبـة. تـا کۆتایـی دەقەکە.(واتـە: بێگومـان خـوا سـامانو گیانـی برواداڕانـی لـێ کڕیـون، بەوەی بەهەشـتیان بـۆ هەیە).

لـەم دەقـەدا هەواڵیداوە ئەوان نەفسـی خۆیانیان فرۆشـتوەو بەخشـیویانە، وە هەواڵـی داوە بە بەزەیـی خـۆی داواکاریەکەیان بۆ دەسـتەبەر دەکات، دوای ئەوە پرسـیار ناکـرێ دەربارەی ئـەوەی بۆیـان دەبـێ لـە ڕێزو قـەدر گرانـی، وە ئەوەی پێـی دەگەن لـە سـەرفرازیو ڕێز لێگیرانیان.

(٢٠٨-٢٠٩): ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱدۡخُلُواْ فِي ٱلسِّلۡمِ كَآفَّةٗ وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴿٢٠٨﴾ فَإِن زَلَلۡتُم مِّنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَتۡكُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٠٩﴾ ﴾:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱدۡخُلُواْ ﴾ ئەمـە فەرمانێکـە لـە لایـەن خـوای بـەرزەوە بـۆ بـڕواداران کـە بچنـە نێـوی: ﴿ فِي ٱلسِّلۡمِ كَآفَّةٗ ﴾ واتە: (بچنـە) نێو هەموو یاسـاکانی ئاییـنو واز لـە هیچـی نەهێنـن، با وەک ئـەو کەسـانە نەبن کە هـەواو هەوەسـی خۆیانیان کـردوە بـە پەرسـتراو، ئەگـەر فەرمانـی شـەرعی لەگـەڵ هـەواو هەوەسـی بگونجـێ ئەوە جێبەجێـی دەکات، ئەگـەر پێچەوانـەی بـوو وازی لـێ دێنـێ، بەڵکـو دەبێ هـەواو هەوەس شـوێنی ئایـن بکەوێ، وە ئـەوەی لە توانایـدا هەیە لـە کاری چاکە درێغی نـەکات، ئەوەش کـە ناتوانـێ بیـکات پێیەوە پابەنـد دەبێو نیـازو نیەتی لـێ دێنێو بـە نیـازو نیەتەکەی پێ دەگات.

کاتـێ کـە چوونـە نـاو ملکەچـیو ئاشـتی بـە تێکڕایـی، تەنهـا بـە پێچەوانـەی ڕێگاکانی

شـەیتان دەبێت، فەرموویەتـی: ﴿ وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ ﴾ واتە: لـە ئەنجامدانی سـەرپێچیکردنی خواو گوناهەکانی، ﴿ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴾دوژمنی ڕوونو ئاشـکرا فەرمـان نـاکات مەگەر بـە خراپەو تـاوانو بەدڕەوشـتیو ئـەوەی زیانی هەیـە بۆتان.

لەبــەر ئەوەی بەنــدە هەر دەبێ کــەمو کورتیو هەڵەی لــێ ڕووبدات، خــوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ فَإِن زَلَلۡتُم مِّنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَتۡكُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُ ﴾ واتــە: لەســەر زانیاریــیو دڵنیایــی، ﴿ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾ (ئەمــە) هەڕەشــەی توونــدو ترســاندنی وای تێدایە کە پێویسـت دەکات واز لـە گونـاه بهێنرێ، چونکە بێگومان ئەگەر کەسـێک سـەرپێچی خوای باڵادەسـتی کارلەجـێ بـکات، ئـەوە سـەرپێچی کارو تاوانبـار بە توونـدی سـزا دەدات، بە گوێـرەی کار لەجێـیو داناییە کـەی، بێگومـان بـە پێی حیکمەتـی خۆی سـەرپێچی کاران سـزا دەدات، یـان ڕزگاریان دەکات.

(٢١٠): ﴿ هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن يَأۡتِيَهُمُ ٱللَّهُ فِي ظُلَلٖ مِّنَ ٱلۡغَمَامِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ ﴿٢١٠﴾ ﴾

﴿ هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن يَأۡتِيَهُمُ ٱللَّهُ ﴾ ئەمــە هەڕەشــەیەکی توونــدو بەڵێندان بە سـزای تێدایە کـە دڵــەکان ڕادەچڵەکێنــێ، خــوا ﷻ دەفەرمــوێ: ئایــا ئەوانــەی هــەوڵو کۆشــش دەکەن بـۆ خراپەکاریــی لە زەویــدا چاوەڕوانی چــی دەکەن، ئەوانــەی شــوێنکەوتەی هەنگاوەکانی شـەیتانن، بـەر هەڵسـتکارن بـۆ فەرمانی خوا مەگــەر چاوەڕوانــی ڕۆژی ســزابن، کە دەوری دراوە بــە مەترسـیەکانو هەڵــەو نارەحەتــیو ئابڕووبــەرەکان، کــە دڵی سـتەمکاران تووشــی دڵەڕاوکــێ دەکات، وەســزای خــراپ ڕەوانە دەکات بۆ ســەر خراپەکاران، ئەوەش بەڕاسـتی (ئــەو ڕۆژەیە) خوا ﷻ ئاســمانەکانو زەوی دەپێچێتەوە ئەسـتێرەکان پەرشو بڵاودەکاتەوەو خــۆرو مانــگ کۆدەکاتــەوەو هەڵیاندەگرێتــەوە، فریشــتە ڕیــزدارەکان دادەبــەزنو دەوری خەڵکــەکان دەدەن، خــوای بەدیهێنــەری بەرزو مــەزن دادەبــەزێ، ﴿ فِي ظُلَلٖ مِّنَ ٱلۡغَمَامِ ﴾ تــا بە دادپــەروەری بڕیــارو دادوەری لە نێــوان بەندەکانی بــکات، تــەرازووەکان دادەنرێنو پــەڕاوەکان بــڵاو دەکرێنەوە، ڕووی بەختەوەران ســپیو گەشـاوە دەبــێو، ڕووی بەدبەختان ڕەش دەبێــت، خــاوەن خێــرو چاکــەکان جیادەکرێنــەوە، لــە خــاوەن شــەڕو خراپــەکان، هەریەکەیــان بــە کــردەوەی خۆی ســزا وەردەگرێ، لێرەوەیە ســتەمکار گاز دەگرێ لەســەر ئــەوەی هەیەتــی کاتێک کــە حەقیقەتی ئــەوەی لەســەریەتی دەیزانێ.

ئــەم دەقــەو وێنەی ئەم دەقــە بەڵگەن بــۆ ڕێــڕەوی ئەهلی ســوننەو جەماعە ئەوانەی ســیفەتە

ئیختیاریـەکان دەچەسـپێنن وەک (الإستواء) بـەرزو جێگیـری سـەر عـەرش‌و دابەزیـن‌و هاتنـی، نموونـەی ئەوانـەش لـەو سـیفەتانەی کە خـوا ﷻ هەواڵی پێـداوە دەربـارەی خۆی، یـان پێغەمبەرەکـەی ﷺ هەواڵـی پێیانـداوە دەربـارەی خـوا، جێگیـری دەکـەن لەسـەر ئەو رووەی کـە لـە گەورەیـی خـوا دەوەشـێتەوە، بەبـێ چواندنـی (بە هـی غەیری خـوا)، بەبێ گۆڕینـی‌و بەبێ پەکخسـتنیان، بـە پێچەوانـەی (معطلة)کان لەگەڵ جـۆراو جۆریان، وەک: جەهمیـەکان‌و موعتەزیلـەکان‌و ئەشـعەریەکان‌و نموونـەی ئـەوان، ئەوانـەی ئەو سـیفەتانە رەتدەکەنـەوە، لـە پێنـاو ئەمەشـدا ئایەتـەکان دەگـۆڕن‌و (تأویل)یـان دەکەن بـە جۆرێک کـە خـوا بەڵگەی لەسـەریان دانەبەزانـدووە، بەڵکو ڕاسـتی گۆڕینەکەیان بریتیە لە ناشـیرین کـردن‌و ڕەخنەگرتـن لـە ڕوونکردنـەوەی خـواو پێغەمبەرەکـەی ﷺ بـە دانانـی ئـەوەی قسـەکانیان بریتیـە لـەوەی ڕێنوێنـی لەو بـاس‌و بابەتـەی پێوە دەسـتەبەر دەبێـت، ئەوانەی بەڵگەی گواسـتراوە (نقل) (واتە: شـەرعیان لە قورئـان‌و فەرموودە) یان لەگـەڵ دانیە، بەڵکو بەڵگـەی ژیـری‌و عەقڵیشـیان نیـە، بەڵام گواسـتراوەی (نقـل)ی بێگومـان دانیان بـەوە ناوە کـە دەقەکان لە قورئـان‌و فەرموودە هاتوون ، ئاشـکراو دیـارەکان، بەڵکو ڕاشـکاویەکەیان بەڵگـەن لەسـەر ڕێـرەوی ئەهلی سـوننەو جەماعە، کە بـە دڵنیایی ئەگـەر لـە ڕواڵەتەکانیان دەربچوێنرێـن دەبنـە بەڵگـە لەسـەر ڕێڕەوە نـارەواو پوچەڵەکەیـان، ئەوە هەروەکـو دەبینی پـێ ڕازی نیـە، لێیـان زیـادو کەم بکرێـت، ئەوەی بە قـەد گەردیلەیـەک بڕوای لـە دڵدایە. بـەڵام لـە ژیری‌و عەقڵیشـدا نیـە بەڵگـە بێت لەسـەر ڕەتکردنـەوەی ئـەو سـیفەتانە، بەڵکو عەقـڵ‌و ژیـری بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی بکـەر تەواوتـرە لـەوەی توانـای نیە لەسـەرکار، کاری خـوا ﷻ ئـەوەی پەیوەسـتە بەخـۆی‌و ئـەوەی پەیوەسـتە بـە بەدیهێنراوانـی بریتیە لە تەواوەتـی (کمال)یـەت، ئەگـەر وادابنێیـن کە جێگیـر کردنیـان بەڵگەیە لەسـەر چواندنی بە بەدیهێنراوانی، پێیان دەوترێ: قسـەکردن لەسـەر سـیفەتەکان شـوێن قسـەکردن لەسـەر خـود (زات) دەکـەوێ، هەروەکـو خـوا خـودو زاتێکـی هەیە خـودو زاتەکان لـێ ناچن‌و پـێ ناچـن، هەر ئەوهـاش خوا سـیفەتانێکی هەیە کـە سـیفەتەکان پێی ناچن، سـیفەتەکانی شـوێن کەوتـەی خـودو زاتـی خۆیـن، سـیفەتی پـێ بەدیهێنراوانیشـی شـوێن کەوتەن بۆ خـودو زاتەکانیـان، لـە جێگیـر کردنیان، بەهیـچ شـێوەیەک لێکچوانـدن ناخوازێ.

هەروەهـا بەوانـەش دەوتـرێ کـە هەندێ لـە سـیفەتەکان جێگیر دەکـەن‌و هەندێکیشـیان ڕەتدەکەنـەوە، یـان نـاوەکان جێگیـر دەکـەن، جگـە لە سـیفەتەکان: یـان هەمـوو جێگیر

دەکرێــن (نــاوو سـیفەتەکان هەموویــان) هەروەکــو خــوا بــۆ خــۆی جێگیری کــردوونو پێغەمبەرەکــەش ﷺ جێگیــری کردوە، یان هەموویــان ڕەت دەکرێنەوە دەبێتــە نکۆڵی کردن بــۆ پەروەردگــاری جیهانیــان، بــەڵام جێگیــر کردنت بــۆ هەندێکیــانو ڕەتکردنــەوەت بۆ هەندێکــی دیکــە، ئــەوە دژ بــە یەکــەو پێچەوانەیــە، جــا جیــاوازی بکــە لــە نێــوان ئەوەی جێگیــرت کــردوەو ئــەوەی ڕەتــت کردۆتــەوە، هیــچ ڕێگایــەک نیــە بــۆ جیاکردنەوەکە، ئەگــەر وتت: ئــەوەی جێگیری کــردوە لێک چوانــدن ناخوازێ، ئەهلی ســوننە پێــت دەڵێن: جێگیر کــردن بــۆ ئەوانــەی ڕەتکردونــەوە لێــک چــوونو لێک چوانــدن ناخــوازێ، ئەگەر بڵێــی: نافامــم لــەوەی ڕەتم کردۆتــەوە مەگەر لێــک چوون (واتــە: لەبەر لێک چــوون ڕەتم نەکردۆتــەوە) ڕەتکەرەوانیــش پێیــان دەڵێــن: ئێمــەش نافامیــن لــەوەی جێگیــرت کــردوە مەگــەر لێــک چــوون، (واتە: ئــەوەی جێگیــرت کــردوە لێک چــوون دەگەیەنــێ) ئەوەی وەڵامــی ڕەتکەرەوانــت پێدایــەوە، ئەهلــی ســوننەتو جەماعــەت وەڵامی نــوێ دەدەنەوە بۆ ئەوانــەی ڕەتکردوونەتەوە.

پوختــەی ئەنجــام ئەوەیە کــە هەر کەس شــتێکی ڕەتکردبێتــەوەو شتێکیشــی جێگیر کردبێ لەوانــەی قورئــانو فەرمــوودە لەســەری جێگیریان کــردوە، ئەمــە دژو پێچەوانەیــە، بەڵگەی شــەرعیو ژیری بــۆ جێگیر نیــە، بەڵکــو پێچەوانەی عەقــڵو نەقڵە.

سل بني إسرائيل كم آتيناهم من آية بينة ومن يبدل نعمة الله من بعد ما جاءته فإن الله شديد العقاب (٢١١) زين للذين كفروا الحياة الدنيا ويسخرون من الذين آمنوا والذين اتقوا فوقهم يوم القيامة والله يرزق من يشاء بغير حساب (٢١٢) كان الناس أمة واحدة فبعث الله النبيين مبشرين ومنذرين وأنزل معهم الكتاب بالحق ليحكم بين الناس فيما اختلفوا فيه وما اختلف فيه إلا الذين أوتوه من بعد ما جاءتهم البينات بغيا بينهم فهدى الله الذين آمنوا لما اختلفوا فيه من الحق بإذنه والله يهدي من يشاء إلى صراط مستقيم (٢١٣) أم حسبتم أن تدخلوا الجنة ولما يأتكم مثل الذين خلوا من قبلكم مستهم البأساء والضراء وزلزلوا حتى يقول الرسول والذين آمنوا معه متى نصر الله ألا إن نصر الله قريب (٢١٤) يسألونك ماذا ينفقون قل ما أنفقتم من خير فللوالدين والأقربين واليتامى والمساكين وابن السبيل وما تفعلوا من خير فإن الله به عليم (٢١٥)

(٢١١): ﴿ سَلْ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ كَمْ ءَاتَيْنَٰهُم مِّنْ ءَايَةٍۭ بَيِّنَةٍۗ وَمَن يُبَدِّلْ نِعْمَةَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢١١﴾ ﴾:

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ سَلْ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ كَمْ ءَاتَيْنَٰهُم مِّنْ ءَايَةٍۭ بَيِّنَةٍ ﴾، بەڵگەیـە لەسـەر ڕەوایەتـیو ڕاسـتیەتی پێغەمبەرانو دڵنیـا بوون لێیـانو ناسـینیان، بە شـوکرانە نەکردنـی ئـەو نیعمەتـە، کە پێویسـت بوو شـوکرانەی ئەو نیعمەتە بکـەن، بەڵکو کافر بـوون پێـیو کوفرانەیـان کـردو نیعمەتی خوایـان بـە کوفـر گـۆڕی: لەبـەر ئـەوە شـایانی ئـەوە بـوون خـوا تۆڵـەی خـۆی بەسـەریان دابەزێنـێو لە پاداشـتی خۆی بێ بەشـیان بکات، خـوا ﷻ سـپڵەییو کوفری نیعمەتـی بـە گۆڕیـن نیعمەتەکـەی لەناوبـرد، چونکـە ئـەوەی خـوا نیعمەتـی دونیایی یان ئایینی بەسـەردا بەخشـی، ئەویش شـوکرانەی نەکردو هەڵنەسـا بە ئەرکو پێویسـتیەکەیو پـەرشو بـڵاوەی پێ کـرد، نامێنـێو دەپووکێتەوەو دەگـوڕێ بە کوفرو تـاوان، کوفر بووە بـە جێگـرەوەی نیعمـەت، بەڵام ئـەوەی شـوکرانەی خوا ﷻ بـکاتو بە ئـەرکو مافەکانی هەڵسـێ ئـەوە نیعمەتەکـەی جێگیـرو چەسـپاو بـەردەوام دەبێت، خـوا لـە نیعمەتەکەی بۆ زیـاد دەکات.

(٢١٢): ﴿ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَيَسْخَرُونَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ فَوْقَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِۗ وَٱللَّهُ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٢١٢﴾ ﴾:

﴿ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَيَسْخَرُونَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾ خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات بەمە، ئەوانـەی کـە بێبـڕوا بـوون بە خـواو بەڵگـەو نیشـانەکانیو پێغەمبەرانـی، وە ملیـان نەدا بۆ یاسـاو شـەرعی خـوا، ئـەوە ژیانـی دونیایان بـۆ ڕازاندرابـووەوە لە چـاوو دڵەکانیـان، هەواو هـەوەسو ویسـتو کارو کردەوەکانیـان هەمـوو لـە پێناو ئەوەدا بـوو، ڕوویـان تێکردبوو وەسـووربوون لەسـەر دەسـتەبەر کردنی، وە بە مەزنیان دەگرتو ئەوەی بەشـداریی بکردایە

لــە کارو پێویســتە کەیان بــە مەزنیــان دادەنــا، بڕواداریــان بــە کەم ســەیر دە کــردو گاڵتەیان پێــی دەکــردن‌و دەیانــوت: ئــا ئەوانەی کــە خــوا منەتــی بەســەریانەوە کردووەو بەخششــی بەســەریانەوە کــردووەو لــە نێــو ئێمەدا! ئــەوە لەبــەر لاوازی ژیری‌و کــورت بینیــان بوو، جا بــە ڕاســتی دونیــا شــوێنی تاقیکردنــەوەو بــەڵاو بارگرانی‌و ناخۆشــیە بــۆ خاوەن بــڕواو بێ بڕوایــان، بەڵکــو بــڕوادار لــە دونیا ئەگەر چی توشــی ناخۆشــی ببێــت، ئەوە ئــارام دەگرێ‌و چاوەڕوانــی پاداشــت دەکات، خــوا بــە هۆی بــڕواو ئارامگرتنەکەیەوە لەســەری ســووکو ئاســان دەکات کــە ئــەوە بۆ جگە لــەو نیــەو نابێ.

بەڕاســتی گرنگــی تــەواوو پلــەداری تــەواو لــە شــوێن‌و ماڵــی مانەوەیــە (کــە دواڕۆژە)، لەبــەر ئەمەیــە خــوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ فَوۡقَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ ﴾ خۆپارێــزان لــە بەرزتریــن‌و بڵندتریــن پلــەدا دەبن، بــە جۆرەها شــێوە تام‌و چێــژ وەردەگــرن، هەروەها جۆرەهــا نــازو نیعمەت‌و خۆشــی‌و ئاســودەیی‌و شــادوومانی.

کافــرەکان لە پلــە هەرە نزمەکانەوە جەزرەبەو ســزا دەدرێن بە جۆرەها ســزایی ڕیســواکەرو بەدبەختــی‌و ناخۆشــی‌و بەردەوامــی‌و هەمیشــەیی، ئــەم دەقــە دڵدانەوەیــە بــۆ بــڕواداران‌و کروزانــەوەو سەرشــۆڕیە بۆ کافــرەکان، لەبەر ئــەوەی ڕۆزیەکانــی دونیــاو دواڕۆژ بەرهەم نایــەت مەگەر بــە ئەندازەو بڕیاری خــوا نەبێ، وە بە ویســتی خوا، خوای بــەرز فەرموویەتی: ﴿ وَٱللَّهُ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيۡرِ حِسَابٖ ﴾ ڕزق‌و ڕۆزی دونیایــی بــۆ بــڕوادارو بێ بڕوا دەســتەبەر دەبێــت، بــەڵام ڕۆزی دڵــەکان لە زانســت‌و بڕواو خۆشەویســتی خواو ترســان لێــی‌و ئومێد بــوون پێــی‌و نموونــەی ئەوانیش، نایبەخشــی مەگــەر بەوەی خۆشــی دەوێت.

(٢١٣): ﴿ كَانَ ٱلنَّاسُ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ فَبَعَثَ ٱللَّهُ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ وَأَنزَلَ مَعَهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ لِيَحۡكُمَ بَيۡنَ ٱلنَّاسِ فِيمَا ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِۚ وَمَا ٱخۡتَلَفَ فِيهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ أُوتُوهُ مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُ بَغۡيَۢا بَيۡنَهُمۡۖ فَهَدَى ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَا ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِ مِنَ ٱلۡحَقِّ بِإِذۡنِهِۦۗ وَٱللَّهُ يَهۡدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٍ ٢١٣ ﴾

﴿ كَانَ ٱلنَّاسُ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ فَبَعَثَ ٱللَّهُ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مُبَشِّرِينَ ﴾ واتــە: مــەردووم، واتــە: هەموویان لەســەر هیدایــەت کۆببوونــەوە، ئەوەش دە ســەدە لــە دوای ڕۆژگاری نــووح ﷺ، کاتێ کە جیاوازیــان هەبــوو دەربــارەی ئاییــن، هەندێکیان کافــر بــوون، کۆمەڵێکی تر لەســەر ئایین مانــەوە، ناکۆکــی پەیــدا بــوو، خــوا ڕەوانەکراوانــی نــارد تاکو یــەکلای بکەنــەوەو حوکم بکــەن لــە نێــوان خەڵکــی‌و بەڵگەو بیانویان لەســەر پێویســت بکــەن، دەوترێ بەڵکــو ئەوان

کۆببوونــەوە لەســەر کوفــرو گومڕاییو بەدبەختــی، نە نووریــان هەبوو، نەبڕواشــیان هەبوو، خــوا ﷻ بــە بەزەیی خــۆی پێغەمبەرانــی بۆ لایان نــارد ﴿مُبَشِّرِينَ﴾ ئــەوەی گوێڕایەڵی خــوا بــکات، بە بەروبومەکانــی گوێڕایەڵی: لــە ڕزقو ڕۆزی، وە هێزی جەســتەو دڵو ژیانی خــۆش، لــەوەش بەرزتــرو بڵندتر ســەرفراز بوونە بــە ڕەزامەندی خواو بەهەشــت.

﴿وَمُنذِرِينَ﴾ هــەر کــەس ســەرپێچی خوا بکات بــە بەرهەمەکانــی گوناهو ســەرپێچی: لە بێبــەش بوونــی ڕۆزیو لاوازیو ڕیســوایو ژیانێکــی تەنــگ، وە لەوانەش خراپتر خەشــمو توورەیــی خواو ئاگــری دۆزەخ.

﴿وَأَنزَلَ مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ﴾ ئــەوە لــە هەواڵــە ڕاســتەکانو فەرمانــە دادپەروەرەکانــە، هەمــوو ئەوانــەی کــە قورئــان لە خۆی گرتــوە، ئەوە هــەقو ڕاســتە، بڕیــاری یەکلاکەرەوە دەدات لــە نێــوان جیاوازکاران لــە بنەڕەتەکان (أصــول) و لاوەکیەکان (فــروع)دا، ئا ئەوەیە پێویســتە لــە کاتــی جیــاوازیو دووبەرەکیــدا، بگەڕێنرێتەوە بــۆ لای قورئــانو فەرموودەی پێغەمبەرەکــەی ﷺ، وە ئەگەر لە کتێبی خواو ســونەتی پێغەمبەرەکــەی بڕیاری یەکلاکەرەوە نەبووایــە بــۆ ناکۆکــیو دووبەرەکیەکان، ئــەوە فەرمانــی گەڕانەوە بۆ لایــان نەدەدرا.

لــە دوای ئــەوەی باســی نیعمەتە بەرزەکــەی خۆی کــرد، بە دابەزاندنــی کتێبەکانی بۆ ســەر (أهــل الکتاب)، کــە ئەوەش وای دەخــوازی کە لەســەری ڕێکبکەونو کــۆک بن، خوا ﷻ هەواڵیــدا بــەوەی ئــەوان هەندێکیان ســنوور بەزێنیــان کرد بەســەر هەندێکــی دیکەیاندا، وە ناکۆکــیو دژایەتــیو جیــاوازی زۆر پەیدا بوو لــە ناویاندا.

جیــاواز بــوون دەربــارەی ئــەو پەرتووکەی کــە دەبووایە ئەوان لە پێشــتر بوایــەن لە خەڵک بــۆ کۆبوونــەوە لەســەری، ئەوەش لــە دوای ئــەوەی زانیاریان پێ هەبــوو، لێی دڵنیــا بوون بە نیشــانەو ئایەتــە ڕوونو ئاشــکراکانو بەڵگەکانــی، لە پاشــان گومــڕا بوون بــە گومڕاییەکی دوور.

﴿فَهَدَى ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ (خــوا ڕێنمایــی ئەوانــە دەکات بڕوایان هێناوە) لــەم ئۆممەتە، ﴿لِمَا ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ مِنَ ٱلْحَقِّ﴾ هەمــوو ئەوانــەی خــاوەن کتێبــەکان تێیدا جیــاواز بوون، وە هەڵەیــان تێــدا کــرد ڕاســتیەکانیان بەهەڵــە دا دەنــا، خوا ئــەم ئۆممەتــەی ڕێنمایــی کرد بۆ ئــەو حەقیقەتــەی کە تێیــدا بــوو، ﴿بِإِذْنِهِۦ﴾ (بە مۆڵەتــی) خوای بــەرزو ئاســانکاری ئەو بۆیــانو بەزەیی بردنــی پێیان.

﴿وَٱللَّهُ يَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ خــوا ﷻ بانگــەوازی هەمــوو خەڵکــی کردوە،

بــە دادپــەروەری خــۆی، بۆ بیانووبریــن‌و حوججە کردن لەســەر خەڵکی، تاکــو نەڵێن: ﴿ مَا جَآءَنَا مِنۢ بَشِيرٍ وَلَا نَذِيرٍ ١٩ ﴾ المائـدة، (واتــە: نە موژدەدەرو نەترسـێنەرمان بــۆ نەهاتوە). بــە بەخشــش‌و بەزەیــی‌و یارمەتــی‌و میهرەبانی خۆی ئــەوەی ویســتی لەبەندەکانــی ڕێنوێنی کرد، ئــەوەش دادپــەروەری‌و حیکمەتــی پەروەردگارە.

(٢١٤): ﴿ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُم ۖ مَّسَّتْهُمُ ٱلْبَأْسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ وَزُلْزِلُوا۟ حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصْرُ ٱللَّهِ ۗ أَلَآ إِنَّ نَصْرَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ ٢١٤ ﴾

﴿ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُم ﴾ خــوای بــەرزو مــەزن هــەواڵ دەدات دەبــێ بەندەکانــی بــە خۆشــی‌و ناخۆشــی‌و نارەحەتی تاقــی بکرێنەوە، هەروەکــو چــۆن پێــش ئەوانــی تاقــی کردۆتــەوە، ئــەوە ســوننەتێکی بەردەوامــی خوایــە، ناگــۆڕێ، هــەر کــەس هەڵســێ بــە جێبەجێ کردنــی ئایین‌و شــەرعی خــوا حەتمــەن دەبێ تاقــی بکاتــەوە، جــا ئەگــەر ئــارام بگــرێ لەســەر فەرمانــی خــوا، وە گــوێ نــەدات بــەو ناخۆشــیانەی دێنــە پێــش، ئــەوە ڕاســتگۆییە، کــە بێگومــان تــەواوی بەختەوەری بەدەســت هێنــاوە، هــەر کەســێکیش ئاشــووب‌و ئــاژاوەی نێــو خەڵکــی بە ســزای خوا تەماشــا بکات، بــەوەی ناخۆشــیەکانی لەســەرە ڕێگــای پــێ بگــرن‌و وازی پــێ بێنن لــە مەبەســتەکەی، وە نارەحەتیــەکان دوری بخەنــەوە لــە مەبەســتەکەی، ئەوە درۆزنە لەبانگەشــەی بــڕوا بوون، جا بەڕاســتی بــڕوا بەخۆزگەو خواســتن تەنها داواکردن نیــە، بەڵکو کردەوەکان ڕاســتیەتیەکەی دەردەخــەن، یــان بــە درۆی دەخەنەوە.

بێگومــان بەســەر ئوممەتەکانــی ڕابــردوو هــات، ئــەوەی خــوا دەربــارەی باســی کــردوە: ﴿ مَّسَّتْهُمُ ٱلْبَأْسَآءُ ﴾ واتە: هەژاریی، ﴿ وَٱلضَّرَّآءُ ﴾ واتە: نەخۆشــی جەســتەیی ﴿ وَزُلْزِلُوا۟ ﴾ (هــەژان‌و لەرینــەوە)، بــە چەندەهــا جۆرە تــرس لە هەڕەشــە بە کوشــتن‌و دوورخســتنەوەو وەرگرتنــی ســامان‌و کوشــتنی خۆشەویســتانی‌و جۆرەهــا زەرەرو زیــان، تاکــو حاڵیانی بەوە گەیانــد لەرینــەوەو هەژاندنیانــی، تــا خــاو بوونــەوە لەســەرکەوتنی خــوا لەگــەڵ ئەوەشــدا دڵنیابــوون پێــی، بەڵام لەبــەر تووندو تەنگــی حاڵەتەکە فەرمــووی: ﴿ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصْرُ ٱللَّهِ ﴾ (واتــە: پێغەمبەرەکــەو ئەوانــەی کــە بڕوایــان هێنابــوو لەگەڵــی بوون بەســەرکەوتنی خــوا؟) کاتــێ کــە دەروو کرایــەوە لــە کاتــی تەنگەبــەری، وە هــەرکات حاڵەتــەکان تەنــگ بــوون، فراوانی دێ، خــوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ أَلَآ إِنَّ نَصْرَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ ﴾

هەروەهـا هـەر كـەس هەڵسـێ بـە ئەنجامدانی هـەق، ئـەوە تاقـی دەكرێتەوە.
هـەر كات لەسـەری توونـدو گران بـوو، ئەگەر ئارامـی گرتو كۆڵـی نەدا لەسـەر ئەوەی لەسـەریەتی ئەوە ناخۆشـی لەسـەر لا دەبرێتو دەبێتە خۆشـی بۆی، وە سـەردەكەوێ بەسەر دوژمنـدا، دەبێتـە چـارەی دەردی دڵـەكان، ئەمـە وەک ئەو دەقەیـە كە دەفەرمـوێ: ﴿ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُواْ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ مِنكُمْ وَيَعْلَمَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٤٢﴾ ﴾آل عمـران، (واتـە: یـان ئایـا پێتان وابـوو شایسـتەی ئەوەبن بچنە بەهەشـت، هەرچەنـدە جاری خـوا لـە واقیعـدا ئەوانەتانی نەزانیوە كـە تێكۆشـاونو خۆڕاگرانی نەزانیون؟، واتـە: هەتا خوا لـە بێژینگتـان نـەداو لـە مەحەكتـان نەدا، وە بـە زمانی حـاڵ واقیعـی خۆتان نەناسـێنن، كە كامەتـان بەڕاسـتی تێكۆشـەرن لە ڕێی خـواداو كامەتـان خۆڕاگرن، وە سـەرەنجام كامەتان شایسـتەی چوونـە بەهەشـتن، هەتا ئەوە نەبـێ، ڕێـی چوونە بەهەشـتتان نابێ).
خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ الٓمٓ ﴿١﴾ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتْرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ﴿٢﴾ وَلَقَدْ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٣﴾ ﴾العنكبوت. (واتـە: ئەلیـفو لام، میـم، ئایـا خەڵكـی پێیـان وایـە، وازیـان لـێ بهێنـرێ كـە وتیـان: بروامـان هێنـاوەو تاقـی ناكرێنـەوەو تووشـی ئاشـووب نابیـن، بێگومـان ئەوانـەی پێـش ئێوەمـان تاقیكـردەوە تاكـو بـە دڵنیایی خـوا ئەوانەی ڕاسـتگۆنو ڕاسـتیان كردوە بناسـێو ئەوانـەش درۆزنـن بیاناسـێ). لە كاتـی تاقیكردنەوەیـە مرۆڤ یـان ڕێزلێگـراو دەبێ، یان سەرزەنشـتو ڕیسـوا كـراو دەبێ.
(٢١٥): ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ ۖ قُلْ مَآ أَنفَقْتُم مِّنْ خَيْرٍ فَلِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ ۗ وَمَا تَفْعَلُواْ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٢١٥﴾ ﴾
﴿ يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ ﴾ واتـە: پرسـیارت لـێ دەكـەن دەربـارەی بەخشـین، ئـەو پرسـیارە گشـتیە، پرسـیار دەربارەی ئـەوەی دەیبەخشـێو ئەوەی دەبەخشـرێ، لـە وەڵامی هەردووكیانـدا خـوا فەرموویەتـی: ﴿ قُلْ مَآ أَنفَقْتُم مِّنْ خَيْرٍ ﴾ واتە: سـامانی زۆر، یان كەم، لـە پێشـترین كـەس بـۆیو شایسـتەترینیان بـەو مافـە، مەزنترینیان كـە مافی بەسـەرتەوە هەیـە، ئەوانیـش دایـكو باوكن، كـە چاكە لەگەڵیـان پێویسـتە، ئازاردانیان حـەرام كراوە، لـە مەزنترین چاكـە لەگەڵیـان بەخشـینە بەسـەریانەوەو بەخێوكردنیانە، وەگەورەترین سـزا دانیـان واز هێنانـە لـە بەخشـین بەسـەریاندا، لەبەر ئـەوەی بەخشـین پێیـانو بەخێوكردنیان پێویسـتە لەسـەر منداڵـی هەبـوو، لـە دوای دایـكو باوكیـش نزیكەكانـن بـە گوێـرەی

جیـاوازی چینەکانیـان نزیکتریـن، ئنجـا نزیکتـر، بـە گوێـرەی پێویسـتیو نزیکـی، جـا بەخشـین بەسـەریاندا چاکەیەو گەیاندنیشـە (صلة الرحم)یشـە.

﴿ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ ﴾ ئەوانـە بچووکەکانـن کـە سەرپەرشـتیاریان نیـە، ئـەوان لەجـێ گومانـی پێداویسـتین، لەبـەر ئـەوەی ناتوانـن بەرژەوەندیەکانیـان بەدەسـت بهێنـن، وە نەبوونـی کاسـبکار، خـوا بەندەکانـی ڕاسـپاردوە چاویان لێیـان بـێ، وەک بەزەییەک لێیـەوە بۆیانو میهرەبانیـەک لەگەڵیـان.

﴿ وَٱلۡمَسَٰكِينِ ﴾، ئەوانـەن کـە خـاوەن پێداویسـتیەکانن، کـە پێویسـتی ئەوانـی وەسـتاندوە، پێیان دەبەخشـرێ لە پێناو نەهێشـتنی پێداویسـتیەکانو بـێ نیازکردنیان لە پێداویسـتیەکان.

﴿ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ ﴾ واتـە: ئـەو کەسـەی بـە تەنیایـەو دابـڕاوە لـە ئاوەدانیو شـوێنی خۆی، یارمەتـی دەدرێ بۆ گەشـتەکەی بە بەخشـین، بە ئەندازەی ئـەوەی بیگەیێنێتە مەبەسـتەکەی. لـە دوای ئـەوەی خوا ﷻ ئەو چینانەی تایبەت کرد لەبەر زۆر پێویسـتیان، پاشـان گشـتاندنی فەرموویەتـی: ﴿ وَمَا تَفۡعَلُواْ مِنۡ خَيۡرٖ ﴾ لـە چاکـەو سـەدەقە بەئەوانـەو غەیـری ئەوانـەش، بەڵکـو لـە هەمـوو جۆرەکانـی جـێ بەجێکردنـی فەرمانەکانـی خـواو نزیـک بوونـەوە لە پەروەردگـار، چونکـە دەچنە ژێر ناوی چاکـە ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٞ ﴾ پاداشـتتان دەداتەوە لەسـەری، بۆتـان دەپارێـزێ، هـەر یەکـەو بەگوێـرەی نیـەتو دڵسـۆزی، کـەمو زۆری بەخشـینو، وە زۆر پێویسـت بـوون بـەو بەخشـینە، وە گـەورەی سـوودو قازانجەکەی.

كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰ أَن تَكْرَهُوا
شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰ أَن تُحِبُّوا شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ
لَّكُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ (٢١٦) يَسْأَلُونَكَ عَنِ الشَّهْرِ
الْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ
اللَّهِ وَكُفْرٌ بِهِ وَالْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِ مِنْهُ
أَكْبَرُ عِندَ اللَّهِ وَالْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ الْقَتْلِ وَلَا يَزَالُونَ
يُقَاتِلُونَكُمْ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ اسْتَطَاعُوا وَمَن
يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُولَٰئِكَ
حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَأُولَٰئِكَ أَصْحَابُ
النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ (٢١٧) إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَالَّذِينَ
هَاجَرُوا وَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أُولَٰئِكَ يَرْجُونَ رَحْمَتَ
اللَّهِ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (٢١٨) يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ
قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَا أَكْبَرُ
مِن نَّفْعِهِمَا وَيَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ الْعَفْوَ كَذَٰلِكَ
يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الْآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ (٢١٩)

(٢١٦): ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰ أَن تَكْرَهُوا شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰ أَن تُحِبُّوا شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ (٢١٦)﴾:

﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ﴾ ئەم دەقە فەرز بوونی جەنگو جیهاد لە ڕێگەی خوای تێدایە، دوای ئەوەی بڕواداران فەرمانیان پێکرابوو وازی لێ بێنن، لەبەر لاوازیو بێ توانایيان بوو بۆ ئەو کارە، پاش ئەوەی پێغەمبەرﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینەو مسوڵمانان زۆر بوون، خوا ﷻ فەرمانی پێکردن کە جەنگو جیهاد بکەن، وە پێشی ڕاگەیاندن کە ئەوە لەسەر دڵەکانیان قورسو ناخۆشە، چونکە ماندوو بوونو نارەحەتی زۆری تێدایە، تووشی جۆرەها ترسو لە ناوچوون دەبن، لەگەڵ ئەوەش خێرێکی زۆر تایبەتە، بە هۆی ئەو پاداشتە گەورەی کە تێیدایە، وە پارێزکاریە لەو سزا بە ئێشەی لەسەری هەیە، سەرکەوتن بەسەر دوژمنانو بە دەستهێنانی دەستکەوتەکانو جگە لە ئەوانەش کە زیاد دەکات، وە ناخۆشيیو قورسایيشی تێدایە، ﴿وَعَسَىٰ أَن تُحِبُّوا شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ﴾ وەک دانیشتنو داوای مۆڵەت کردن بۆ نەچوونە جەنگو جیهاد بۆ پشوو وەرگرتنو کاتی خۆش (بەسەر بردن)، بێگومان ئەوە زۆر خراپە، چونکە سەرشۆڕبوونی مسوڵمانانو زاڵبوونی دوژمنان بەسەر ئیسلامو مسوڵمانان بە دوای خۆیدا دێنێ، وە هۆکارە بۆ لە دەست چوونی پاداشتی مەزنو زەلیلیی سووکیو نەنگییە بۆ خاوەنەکەی، (شایستەی) سزاو تۆڵە سەندنەوە دەبێ.

ئەم دەقانە گشتین دەربارەی هەموو ئەو کارە خێرانەی کە دڵو دەروونەکان حەزی پێ ناکەن -جۆرێ لە نارەحەتيو ناخۆشی تێدایە- ئەوە پەسەندو خێرە بە بێگومان، وە کارە خراپەکانيش دڵو دەروون خۆشیان دەوێو حەزی پێ دەکەن لەبەر خەیاڵو گومان کردنی خۆشيیو حەسانەوەو چێژ وەرگرتن تێیاندا، کە بێگومان ئەوە خراپە.

بەڵام کاری دونیا هەروایە، گشتی نیە، زۆرجار مرۆڤی بڕوادار ئەگەر حەزی لە کارێک کرد،

وە خوا هۆکارەکانی لادانی بۆ ڕەخساند بوو، کە ئەمەش خێری بۆ ئەو تێدا بوو، سەرکەوتنی ئەو لەمە دابوو، سوپاسی خوا بکاتو خێرو چاکە لەوەدا ببینێ کە ڕوویداوە، چونکە دڵنیایە کە خوا لە خودی خۆی بە بەزەیی ترە بۆ بەندەکانی، وە بە تواناترە لەسەر چاکەو بەرژەوەندی بەندەکە لە خودی خۆی، زاناترە لە بەرژەوەندی ئەو بۆی، وەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾ گونجاوترو باشتر وایە بۆ ئێوە لەگەڵ تەقدیری خوا ڕێکبکەون (و پێی ڕازی بن)، لەلاتان وەک یەک بێ خۆشحاڵتان بکات، یان دڵتەنگتان بکات (بۆتان خراپ بێ).

دیارە ئەگەر جەنگو جیهاد پەیوەست نەکرابایەت بە مانگە حەرامەکانەوە، ئەوە مانگەکانی دیکەشی دەگرتەوە، بەڵام خوا ﷻ مانگە قەدەغە کراوەکانی دەرهێناو جیای کردەوەو فەرموویەتی:

(٢١٧): ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ ۖ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ ۖ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَكُفْرٌۢ بِهِۦ وَٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِۦ مِنْهُ أَكْبَرُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَٱلْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ ٱلْقَتْلِ ۗ وَلَا يَزَالُونَ يُقَٰتِلُونَكُمْ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ ٱسْتَطَٰعُوا۟ ۚ وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُو۟لَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢١٧﴾ ﴾:

زۆربەی زانایان لەسەر ئەو بۆچوونەن کە حەرام کردنی کوشتار لە مانگە حەرامەکان لادراوەو نەهێشتراوە (منسوخ)ە، بە فەرمانی کوشتار کردنی هاوبەش دانەران لەهەر جێگایەک بوون، هەندێک لە توێژەرەوانی قورئان ووتوویانە: ئەوە (حەرام بوونی جەنگ لە مانگە حەرامەکان) هەڵنەوشێنراوەتەوە (نسخ)، چونکە ڕەها (مطلق) دەبرێتەوە سەر بەندکراو (مقید)، ئەم دەقەش بەندکراوە، لەبەر گشتیەتیو فەرمان کردن بە جەنگ بەڕەهایی، چونکە لە کۆی تایبەتمەندیو جیاکاریەکانی مانگە حەرام کراوەکانە، بەڵکو گەورەترین جیاکاریەکانە، حەرام بوونی کوشتار تیایاندا، بەڕاستی ئەمە تەنها لە کوشتار کردنی دەستپێشخەری بوو، بەڵام کوشتاری بەرگری ئەوە لە مانگە حەرامەکان دروستە، وەک چۆن دروستە لەماڵی حەرامیش (یانی: مەککەو کەعبە).

ئەم دەقە دابەزیوە بە هۆی ئەوەی کە ڕوویدا لە مەفرەزەی عەبدوڵڵای کوڕی جەحش، کە عەمری کوڕی حەزرەمیان کوشتو سامانەکانیان لێ سەند، ئەو ڕووداوە وەک: «دەوترێ» لە مانگی ڕەجەب بووە، هاوبەش دانەران ئەوانیان شکاندەوە لە جەنگ کردن لە مانگی حەرامدا، ئەوان لە شکانەوەکەیان سنووربەزێنو ستەمکار بوون، بێگومان ئەوان گوناهی وا ئابڕووبەریان ئەنجام دەدا زۆر لەوە گەورە تربوو لەوەی کە مسوڵمانانیان پێ لەکەدار دەکرد، خوا ﷻ دەربارەیان فەرمووی: ﴿ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾ واتە: ڕێگری موشریکو هاوبەش پەیداکەرانیان دەکرد لەوانەی کە

دەیانویست بڕوا بهێنن بە خواو پێغەمبەرەکەی، وە ئازارو ئاشوب نانەوە بەرانبەر بەو کەسەی بڕوای بهێنایەت، وە هەوڵدانیان بۆ ئەوەی هەڵیان بگەڕێننەوە لە ئاینەکەیان، وە بێبڕوایان لە مانگی حەڕامو ماڵی حەڕامدا، کە ئەوە خودی خۆی بەسە بۆ شەڕو خراپە، چ جای ئەوەی کە لە مانگی حەڕامو شوێنی حەڕامیش بێ؟!!

﴿ وَإِخۡرَاجُ أَهۡلِهِۦ مِنۡهُ ﴾ خاوەن مزگەوتی حەڕام، ئەوانیش پێغەمبەرو هاوەڵانی بوون، چونکە لەپێشتر بوون لە بتپەرستان، لە حەقیقەتدا ئەمان ئاوەدانکەرەوەی مزگەوتی حەڕامن، دەریان کردن ﴿ مِنۡهُ ﴾ ڕێگایان نەدا بگەن پێی، لەگەڵ ئەوەی ئەو ماڵە (کەعبە) یەکسانە تیادا چ ئەوەی لەوێ نیشتەجێیە، چ ئەوەی لە دوورەوە دێ ﴿ أَكۡبَرُ مِنَ ٱلۡقَتۡلِ ﴾ لە (گوناهەکەی گەورەترە لە کوشتن) لە مانگی حەڕامدا، جا چۆن دەبێ کە بێگومان هەموویان لەوان کۆبوونەوە؟! کەواتە: زانرا کە ئەوان لە فەرمان دەرچوو و ستەمکارن لە تانەدانیان لە بڕواداران.

لە پاشان خوا ﷻ هەواڵیداوە ئەوان بەردەوامن لە کوشتار کردنی بڕواداران ئامانجیان لەسامانەکانیانو کوشتنیان نەبوو، تەنها ئامانجیان ئەوە بوو لە ئاینەکەیان هەڵیانگەڕێننەوە، لە دوای بڕواهێنانیان کافر ببنەوە، تاکو ببنە هاوەڵی ئاگری دۆرزەخ، ئەوان هەموو تواناکانی خۆیان لەوەدا بەکاردەهێنا هەوڵو کۆششیان دەکرد بەوەی لە توانایاندا هەبوو، ﴿ وَيَأۡبَى ٱللَّهُ إِلَّآ أَن يُتِمَّ نُورَهُۥ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡكَٰفِرُونَ ٣٢ ﴾التوبة، (واتە: خوا دەیەوێ هەر ڕووناکیەکەی (تەوحیدو ئیسلام) تەواو بکاتو بیگەیەنێت ئەگەر بێبڕوایانیش پێیان ناخۆش بێت).

ئەم وەسفکردنە گشتیە بۆ هەموو بێ بڕواکان، بە بەردەوامی کوشتاری جگە لەخۆیان دەکەن، تا هەڵیان بگەڕێننەوە لە ئاینەکەیان، بەتایبەتی خاوەن کتێبەکان لە جولەکەو گاورەکان، ئەوانەی بە هەموو هێزو توانەیەکیان تێدەکوشینو بانگەوازکارانیان بڵاوە پێ دەکردو پزیشکەکانیان دەگەڕاندو قوتابخانەکانیان بونیات دەنا لە پێناو کێش کردنی ئۆممەتەکان بۆ ڕێبازو ئاینەکانیان، ئەوەی لە توانایاندابوو خزاندنیانە ناویان لەو گومانەی کە گومانیان بۆ دروست دەکات لە ئایینو ڕێبازەکەیان.

بەڵام ئەوەی جێگای ئومێدە لە خوا ﷻ -ئەوەیە بەخششو منەتی کردوە بەسەر بڕواداراندا بە ئیسلام، وە ئایینی ڕاستو ڕێکی خۆی بۆ هەڵبژاردوون- ئایینەکەی بۆیان تەواو کردوە، نازو نیعمەتەکەی تەواو بکات بەسەریانەوە، بەوەی هەڵسن بە جێبەجێکردنی ئاینەکەی بەئەنجامدانێکی تەواو، ئەوەی دەیەوێت ڕوناکیەکەی بکوژێنێتەوە سەر شۆڕو ڕیسوای بکات، وە پلانو فرتو فێڵەکانیان بخاتەوە ناو خۆیان، ئاینەکەی سەربخاو وشەی خۆی (لا إله إلا الله) بەرزو بڵند بکات.

ئەم دەقە ڕاستو دروستە لەسەر ئەوانەی کە بوونیان هەیە لە بێ بڕواکان هەر وەکو ڕاستو دروستە لەسەر ئەوانەش کە لە پێشدا هاتبوون: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ لِيَصُدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ ۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾الأنفال، (واتە: بێگومان ئەوانەی کافر بوون سامانەکانیان دەبەخشن لەپێناو ڕێگری کردن لە ڕێگای خوا، ئەوان دەیبەخشن لەپاشان دەبێتە پەشیمانیو هەناسە هەڵکێشان بەسەریانەوە، پاشان دەبەزێنو شکست دەخۆن ئەوانەی کافر بوونە بەرەو دۆزەخ کۆ دەکرێنەوە).

پاشان خوا ﷻ هەواڵیدا ئەوەی هەڵگەڕێتەوە لە ئیسلام، بەوەی کە کوفر هەڵبژێرێت بەسەر ئیسلامو بەردەوام بێت لەسەر ئەوە، تا بە بێبڕوایی دەمرێ: ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْأَخِرَةِ ﴾، لەبەر نەبوونی مەرجەکەی تیادا، کە بریتیە لە ئیسلام، ﴿ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾، بە تێگەیشتن لە دەقەکە (مفهوم)ەکەی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بەڕاستی ئەوەی هەڵگەڕێتەوەو لە پاشان بگەڕێتەوە ناو ئیسلام، ئەوە کردەوەکەی پێش هەڵگەڕانەوەی بۆی دەگەڕێتەوە، بەهەمان شێوە ئەوەی لە گوناهیش بگەڕێتەوەو تەوبە بکات، ئەوە کاروکردەوەکانی پێشتری بۆ دەگەڕێتەوە.

(٢١٨): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ يَرْجُونَ رَحْمَتَ ٱللَّهِ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢١٨﴾ ﴾:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾ ئەم سێ کاروکردەوەیە بریتین لە ناونیشانی بەختەوەرییو جەمسەری خولانەوەی بەندایەتیو عیبادەت کردن، بەوانەوە دەزاندرێ ئەوەی لەگەڵ مرۆڤە لە بردنەوەو دۆڕاندن.

هەرچی ئیمانە پرسیار دەربارەی پلەو پایەی ناکرێت، چۆن پرسیار دەربارەی شتێک دەکرێت کە جیاکردنەوەی نێوان بەختەوەرانو بەدبەختانە، بەهەشتیەکانو دۆزەخیانە؟ ئەگەر مرۆڤ ئیمان هەبێ هەموو کردەوە چاکەکانی لێ وەردەگیرێ، وە ئەگەر ئیمانی نەبێ هیچ کردەوەیەکی لێ وەرناگیرێ نە فەرزو نە سوننەت.

بەڵام کۆچ ﴿ هَاجَرُواْ ﴾ ئەوە بریتیە لە جیابونەوە لە خۆشەویستەکەی کە لەگەڵی ڕاهاتووە، لە پێناو ڕەزامەندی خواﷻ، کۆچکەر وڵاتو سامانو کەسو کارو هاوڕێو برادەرانی جێ دێڵێ، بۆ نزیک بونەوە لەخواو سەرخستنی ڕێبازو ئاینەکەی.

بەڵام تێکۆشان (الجهاد) بریتیە لە بەخشینی وزەو توانست بۆ دەستەو یەخەو جەنگی دوژمنان، وە کۆششو هەوڵی تەواو بۆ سەرخستنی ڕێبازو ئاینی خواو کپکردنی ڕێبازی شەیتان، ئەوە لووتکەی

کارە چاکەکانە، پاداشتەکەی باشترین پاداشتە، ئەوە هۆکارێکی مەزنە بۆ فراوان کردنی بازنەی ئیسلامو ڕیسواکردنی بتپەرستان، وە بڕواداران ئەمین بن لەسەر نەفسو گیانو ماڵو منداڵی خۆیان. ئەوەی هەڵسێ بەو سێ کارو کردەوانە لەسەر دژواریو نارەحەتیەکانی (بڕواو کۆچو جیهاد کردن)، ئەوە بۆ جگە لەوانە بە ئاسانیو چاکترو توندو تۆڵتر پێیانەوە هەڵدەستێ.
هەقی خۆیەتی ئەوان شایستەی ئومێدو بەزەیی خوابن، چونکە ئەوان هۆکاری پێویستی میهرەبانیان بەدەست هێناوەو جێبەجێیان کردوە.
لەمەدا بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی کەبەڕاستی هیواو ئومێد بەجێ نایە مەگەر لەدوای بەجێهێنانی هۆکارەکانی بەختەوەریی نەبێ، بەڵام ئومێد بوون لەگەڵ تەمبەڵیو بەبێ بەجێهێنانی هۆکارەکان ئەوە دەستەوسانیو خۆزگەو فریودانە، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر لاوازی ورەی خاوەنەکەیو کەم عەقڵی، وەک ئەوە وایە کەسێ بە هیوای منداڵ بێت بەبێ هاوسەرگیری، وە چاوەڕوانی بەروبومو دانەوێڵە بکات، بەبێ تۆوکردنو ئاودانو نموونەی ئەوانەش.
لە فەرموودەی خوا: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ يَرۡجُونَ رَحۡمَتَ ٱللَّهِ ﴾ ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە بەندە -ئەگەرچی کاروکردەوەی هەبێ- نابێ پشتیان پێ ببەستێو متمانەیان بخاتە سەر، بەڵکو چاوەڕوانی ئومێدی بەزەیی پەروەردگاری بکات، بە ئومێدی وەرگیرانی کاروکردەوەکانیو لێخۆشبوونی گوناهو تاوانەکانیو داپۆشینی کەمو کورتیەکانی بکات.
لەبەر ئەوەیە خوا فەرموویەتی: ﴿ وَٱللَّهُ غَفُورٞ ﴾ واتە: بۆ ئەوەی گەڕابێتەوەو تۆبەی کردبێ بە تەوبەیەکی ڕاستو دروست ﴿ رَّحِيمٌ ﴾ بەزەییەکەی هەموو شتێکی لە خۆ گرتووە، بەخشندەییو چاکەکانی هەموو زیندوویەکیان گرتۆتەوە.
لەمەدا بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی کە هەر یەکێک بەوکارو کردەوانە هەڵسێ کە باسکران، لێخۆش بوونی خوای بۆ دەستەبەر دەبێت، چاکەکان خراپەکان دەسرنەوە، وە بەزەیی خوای بۆ بەهەرم دێت. جا ئەگەر لێخۆشبوونی بۆ بەرهەم هات، تۆڵەی دونیاو دواڕۆژی لەسەر لادەبرێو دەڕوات، ئەوانەی کە شوێنەواری گوناهو تاوانەکانن، ئەوانەی لێیان بوردراو شوێنەوارەکانیان پوکانەوە، جا ئەگەر بەزەیی بۆ دەستەبەر بوو، ئەوە هەموو خێرو چاکەکانی بۆ بە دەست دێت لە دونیاو دواڕۆژدا، بەڵکو کاروکردەوە باسکراوەکانیان لە بەزەیی خوایە بۆیان، ئەگەر خوا پشتگیری لێ نەکردبایەن نەیاندەویست، ئەگەر خوا توانای لەسەریان پێ نەبەخشیبایە نەیاندەتوانی ئەنجامی بدەن، ئەگەر چاکەی خوا نەبووایە تەواو نەدەبوو و لێیان وەرنەدەگیرا، فەزڵو ستایش بۆ ئەو لەسەرەتاو کۆتا، ئەو خوایەی منەتی کردوە بە هۆکارو ئەنجامەکەی بەسەریانەوە.

پاشان خوا فەرموویەتی:

(٢١٩-٢٢٠): ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا ۗ وَيَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ ٱلْعَفْوَ ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْـَٔايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١٩﴾ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ ۗ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْيَتَٰمَىٰ ۖ قُلْ إِصْلَاحٌ لَّهُمْ خَيْرٌ ۖ وَإِن تُخَالِطُوهُمْ فَإِخْوَٰنُكُمْ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ ٱلْمُفْسِدَ مِنَ ٱلْمُصْلِحِ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَعْنَتَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٢٠﴾ ﴾

واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ بڕواداران دەربارەی حوکمەکانی ئارەقو قومار پرسیارت لێ دەکەن، بێگومان ئەوان لە نەفامیداو لەسەرەتایی ئیسلامیەوە بەکاریان دەهێنا، هەروەکو بڵێی کێشەو نارونیەکیان بۆ پەیدا بوو تیایاندا، لەبەر ئەوەیە پرسیاریان دەربارەی حوکمەکانیان لێ کردیت، خوای بەرزیش فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی کرد ﷺ سوودو زیانەکانیان بۆ ڕوونبکاتەوە، تا بێتە پێشەکی بۆ حەرامکردنیانو وازلێهێنانیان بە تەواوەتی.

هەواڵیدا کە بێگومان گوناهو تاوانو زیانیان، و ئەوەی لێیانەوە سەرچاوە دەگرێ لە لەدەستدانی بیرو هۆشو ماڵ،وە ڕێگریکردن لە یادی خواو نوێژو دوژمنایەتیو ڕقو تووڕەیی، گەورەترە لەوەی گومانی پێ دەبەن، لە دەستکەوتو سامان بە بازرگانیکردن بە ئارەقو دەستکەوتنی بە قومار، وە ئەو جۆشو شادیەی دەرونەکان لەکاتی بەکارهێنانو ئەنجامدانیان، ئەوە ڕونکردنەوەو سەرکۆنەکردنە بۆ نەفسو دەرونەکان، چونکە ژیرو عاقڵ ئەوە پەسەند دەکات کە بەرژەوەندی تێدایە، وە دوور دەکەوێتەوە لەوەی زیانگەیەنەرە، بەڵام بێگومان ئەوان لەگەڵیدا ڕاهاتبوون، قورسە ڕاستەخۆ لەیەکەم جاردا وازهێنان لێیان بسەپێنرێ بەسەریاندا، ئەم دەقەی کردە پێشەکی بۆ حەرامکردنی ئەوەی کە لە فەرموودەی خۆی باسی کردووە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ فِى ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِ ۖ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴿٩١﴾ ﴾المائدة، (واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بە دڵنیاییەوە (بزانن کە) شەرابو قومارو بتەکانو زەلەمەکان پیسن لە کردەوەی شەیتانن، دەسا لێیان دووربکەونەوە بەڵکو سەرفرازبن. بێگومان شەیتان دەیەوێ لە میانەی مەیخۆرییو قورمار کردنەوە، دوژمنایەتییو بوغزو غەرەز بخاتە نێوانتان، وە لە یادی خواو نوێژ بتانگێڕێتەوە، جا ئایا دەست هەڵدەگرن!).

ئەمەش لە میهرەبانیو بەزەییو داناییەتی، لەبەر ئەمە کاتێ کە دابەزی عومەر (خوا لێی ڕازی

بێ) وتی: وازمان هێنا وازمان هێنا.

بەڵام ئارەق: بریتیە لە هەر بێ هۆشکەرێک کە ژیریو (عقل)ی شاردبێتەوەو دایپۆشیبێ، لە هەر جۆرێ بێ.

بەڵام قومار (میسر): بریتیە لە هەموو زاڵبوونو بردنەوەکان کە لەبرو قەرەبوی تیادابێ لە لایەن هەردوولاوە، لە زار (تاولە)و شەترەنج، وە هەموو زاڵبوونو بردنەوەیەکی گوفتاری، یان کرداری لە بەرانبەر قەرەبووی شتێک، جگە لە پێشبرکێی ئەسپو وڵاخی بەرزو وشترو تیرهاوێژی، ئەوانە ڕێگا پێدراون، چونکە دیاری کراون بۆ تێکۆشان (جهاد)، لەبەر ئەوەیە خوا مۆڵەتی پیانداوە:

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ ٱلْعَفْوَ ﴾ ئەمە پرسیارە دەربارەی ئەندازەی ئەوەی کە لە سامانەکانیان دەیبەخشن، خوا کارەکەی بۆ ئاسان کردن، فەرمانی پێیاندا کە لێبوردن ببەخشن، ئەوەی کە ئاسان کراوە لە ماڵەکانیان، وە ئەوەی کە پێداویستیو گرنگیەکانیان بەوەوە گرێنەدراوە، ئەمە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە هەرکەسەو بە پێی توانای خۆی، لە دەوڵەمەندو هەژارو ناوەند، هەموویان توانایان هەیە لەسەر بەخشینی ئەوەی لە سامانەکەی لێی زیادەو پێویستی پێ نیە، ئەگەر لەتە خورمایەکیش بێت.

لەبەر ئەوە خوا فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کرد، کە لە خەڵکی ببوریو چاکەو سەدەقەکانیان وەربگرێ، ئەرکێ نەخاتە سەرشانیان کە لە توانایاندا نەبێ، ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە خوا ﷻ فەرمانێکی پێ نەکردوین پێویستیەکی بە ئێمە هەبێ، یان ئەرکێکی خستبێتە ئەستۆمان لە تواناماندا نەبێ، بەڵکو فەرمانی ئەوەی پێکردوین کە خۆشبەختیمانی تێدایە، وە ئاسانی کردوە لەسەرمان ئەوەی سودی هەیە بۆمانو بۆ براکانمان، شایستەی ئەوەیە تەواوترین سوپاسو ستایش بکرێت.

کاتێ خوا ﷻ ئەو ڕوونکردنەوە تەواوەیدا، نهێنیەکانی یاساو شەرعەکەی بە بەندەکانی نیشانداو فەرمووی: ﴿ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْـَٔايَـٰتِ ﴾، واتە: بەڵگەن لەسەر ڕەوایەتیو بەرهەمهێنن بۆ زانستی سود بەخش ﴿ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١٩﴾ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ ﴾ واتە: تا بیرو هزرتان بەکاربهێنن لە نهێنی یاساو شەرعەکەی، وە بزانن بەڕاستی فەرمانەکانی بەرژەوەندی دونیاو دوارۆژتانی تیادایە، هەروەها تا بیربکەنەوە لە خێرا تەواو بوونی دونیاو ڕەت کردنەوەی،وە لە دوارۆژو مانەوە تێیدا، کە بێگومان ئەوێ ماڵی پاداشتدانەوەیەو شایستەی ئەوەیە ئاوەدان بکرێتەوە.

فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۗ وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡيَتَٰمَىٰۖ قُلۡ إِصۡلَاحٞ لَّهُمۡ
خَيۡرٞۖ وَإِن تُخَالِطُوهُمۡ فَإِخۡوَٰنُكُمۡۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ ٱلۡمُفۡسِدَ مِنَ
ٱلۡمُصۡلِحِۚ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَعۡنَتَكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ٢٢٠
وَلَا تَنكِحُواْ ٱلۡمُشۡرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤۡمِنَّۚ وَلَأَمَةٞ مُّؤۡمِنَةٌ
خَيۡرٞ مِّن مُّشۡرِكَةٖ وَلَوۡ أَعۡجَبَتۡكُمۡۗ وَلَا تُنكِحُواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ
حَتَّىٰ يُؤۡمِنُواْۚ وَلَعَبۡدٞ مُّؤۡمِنٌ خَيۡرٞ مِّن مُّشۡرِكٖ وَلَوۡ أَعۡجَبَكُمۡۗ
أُوْلَٰٓئِكَ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلنَّارِۖ وَٱللَّهُ يَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱلۡجَنَّةِ وَٱلۡمَغۡفِرَةِ
بِإِذۡنِهِۦۖ وَيُبَيِّنُ ءَايَٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ ٢٢١
وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡمَحِيضِۖ قُلۡ هُوَ أَذٗى فَٱعۡتَزِلُواْ ٱلنِّسَآءَ فِي
ٱلۡمَحِيضِ وَلَا تَقۡرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطۡهُرۡنَۖ فَإِذَا تَطَهَّرۡنَ فَأۡتُوهُنَّ
مِنۡ حَيۡثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلۡمُتَطَهِّرِينَ ٢٢٢
نِسَآؤُكُمۡ حَرۡثٞ لَّكُمۡ فَأۡتُواْ حَرۡثَكُمۡ أَنَّىٰ شِئۡتُمۡۖ وَقَدِّمُواْ
لِأَنفُسِكُمۡۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُم مُّلَٰقُوهُۗ وَبَشِّرِ
ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٢٢٣ وَلَا تَجۡعَلُواْ ٱللَّهَ عُرۡضَةٗ لِّأَيۡمَٰنِكُمۡ أَن تَبَرُّواْ
وَتَتَّقُواْ وَتُصۡلِحُواْ بَيۡنَ ٱلنَّاسِۚ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ٢٢٤

﴿وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡيَتَٰمَىٰۖ قُلۡ إِصۡلَاحٞ لَّهُمۡ خَيۡرٞۖ وَإِن تُخَالِطُوهُمۡ فَإِخۡوَٰنُكُمۡۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ ٱلۡمُفۡسِدَ مِنَ ٱلۡمُصۡلِحِۚ﴾ كاتێک خـوا ﷻ ئـەم دەقـەی نـاردە خـوار: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ أَمۡوَٰلَ ٱلۡيَتَٰمَىٰ ظُلۡمًا إِنَّمَا يَأۡكُلُونَ فِي بُطُونِهِمۡ نَارٗاۖ وَسَيَصۡلَوۡنَ سَعِيرٗا ١٠﴾النسـاء (واتـە: بێگومـان ئەوانـەی ماڵـی بێ باوكان بە سـتەم دەخۆن، ئەوە بێگومـان ئاگر دەخـۆنو، دەیخەنە نێو سـكیان، لە داهاتوش دەخرێنـە نێو دۆزەخو گڵپـەی ئاگر).

ئـەوە مایەی نارەحەتـی بوو بۆ مسـوڵمانان، خواردنـی خۆیانیـان جیـا كـردەوە لـە خواردنـی بـێ بـاوكان، لـە ترسـی ئەوەی بیخـۆنو بـە كاری بێنـن، ئەگـەر لـەو حـاڵو بـارەش نەریـت وابـوو كـە تیایـدا هاوبەش بـن پرسـیاریان لـە پێغەمبـەر ﷺ كرد دەربـارەی ئەوە، خـوای بەرزیـش هەواڵـی پێیاندا كە مەبەسـت لەمـە چـاک مامەڵـە كردنە بە سـامانی بـێ باوكانـەوە بـە پاراسـتنو پارێزكاری لـێو بازرگانـی كـردن پێیانـەوە، تێكەڵی لەگەڵیـان لە خـواردن، وە جگە لەویش دروسـتە بـە شـێوەیەک زیـان بەبـێ بـاوكان نەگەیەنێـت، چونكـە ئـەوان براتانن، جـا بـرا تێكەڵی بـرا دەكا، هەمـوو ئەوانـەش بـۆ نیـازو نیـەت دەگەڕێنـەوە، كـە جا ئـەوەی خـوا بزانێ لە نیـازو نیەتەكـەی چاكەخـوازە بـۆ بێ بـاوک، وە تەماحـی نیە لە سـامانەكەیدا ئەگـەر بەبێ مەبەسـت شـتێک چووە سـەری ئـەوە هیچی لەسـەر نیە، ئـەوەش كە خـوا دەزانی لـە نیازو نیەتەكـەی مەبەسـتی بـە تێكەڵیەكەی گەیشـتنە بـە خواردنو بردنی سـامانەكەی، بەڕاسـتی ئـەوە تاوانبـارو گوناهـكار دەبـێو (ئامـرازەكان مەبەسـت لـە حوكمەكانیانـدا هەیە).

لـەم دەقـەدا بەڵگە هەیە لەسـەر دروسـتی جۆرەكانـی تێكەڵاوی لـە خـواردنو خواردنەوەو گرێبەسـتەكانو هاوشـێوەیان، ئـەو مۆڵەتـە میهرەبانـیو چاكەیە لـە لایەن خـوای بەرز، وە بەرفـراوان كردنـە بەسـەر بـڕواداران ئەگینـا ﴿وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَعۡنَتَكُمۡۚ﴾ واتە: لەسـەرتان

گـران بووە بـە مۆڵەت پێـەدان بەوە، تاوانبـار دەبوونو لەسـەرتان قورس دەبـوو، گوناهبار دەبـوون، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ ﴾ واتـە: (خـوا) هێزی تـەواوی هەیەو زاڵە بەسـەر هەموو شـتێکدا لەگـەڵ ئەوەشـدا ﴿ حَكِيمٌ ﴾ هیـچ نـاکات مەگـەر بـە پێـی حیکمەتـی تـەواوی نەبـێ، هێـزو تواناکـەی کار لەجێـیو داناییەکـەی ڕەت ناکاتـەوە، ناوتـرێ: ئەو ئـەوەی دەیەوێ دەیـکات، لەگـەڵ دانایـیو کارلەجێـی بگونجێ یان جیـاواز بـێ، بەڵکو دەوترێ: بەڕاسـتی کاروکردەوەکانـی، بـە هەمـان شـێوە بڕیـارو حوکمەکانـی شـوێن کەوتەن بۆ ئیشـە پڕ لە داناییەکـەی، هیـچ شـتێک بەخۆڕایی بـەدی ناهێنـێ، بەڵکو هەردەبـێ دانـاو کارلەجێی بێ، فەرمـان نـاکات مەگـەر بـەوەی بەرژەوەنـدی تەواوی سـەد لە سـەدی تێدابێ، یان پەسـەند بـێ، هیـچ شـتێکیش قەدەغـە ناکات مەگـەر خراپـەی تەواوی سـەد لە سـەدی تێدابـێ، یا بـە زۆری خراپـەی تێدابـێ، لەبەر تـەواوی کار لـە جێیو دانایـیو ئەو بەزەییـەی هەیەتی.

(٢٢١): ﴿ وَلَا تَنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكَـٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ ۚ وَلَأَمَةٌ مُّؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ ۗ وَلَا تُنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَتَّىٰ يُؤْمِنُوا۟ ۚ وَلَعَبْدٌ مُّؤْمِنٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكٍ وَلَوْ أَعْجَبَكُمْ ۗ أُو۟لَـٰٓئِكَ يَدْعُونَ إِلَى ٱلنَّارِ ۖ وَٱللَّهُ يَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱلْجَنَّةِ وَٱلْمَغْفِرَةِ بِإِذْنِهِۦ ۖ وَيُبَيِّنُ ءَايَـٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٢١﴾ ﴾:

﴿ وَلَا تَنكِحُوا۟ ﴾ واتـە: (مارەی مەکەن) ئافرەتانێک ﴿ ٱلْمُشْرِكَـٰتِ ﴾ کە لەسـەر هاوبەش دانانەکەیـان بەردەوامـن ﴿ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ ﴾ چونکـە ئافرەتـی بـڕوادار -ئەگـەر لە ناشـیرینی گەیشـتبێتە لوتکـە- چاکتـرە لـە ئافرەتـی هاوبـەش دانـەر ئەگـەر لـە جوانـی گەیشـتبێتە ئەوپـەڕی، ئـەوە گشـتیە، بۆ هەمـوو ئافرەتێکـی هاوبەش دانەر بـۆ خوا، دەقەکەی سـورەتی (المائـدة) ئەمـەی تایبەتـی کـردوە، بەوە کـە ئافرەتانـی خـاوەن کتێبـەکان حەڵاڵن، وەک خوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ وَٱلْمُحْصَنَـٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ مِن قَبْلِكُمْ ﴿٥﴾ ﴾المائـدة، (واتە: داوێـن پـاکان لەوانـەی کتێبیان بـۆ هاتووە).

﴿ وَلَا تَنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكَـٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ ﴾ ئەوە گشتییەو هیچ تایبەت کردنێکی تێدا نیە.

پاشـان خـوا ﷻ باسـی حیکمـەتو دانایی کرد دەربـارەی حـەڕام کردنی هاوسـەرگیرێتی مسـوڵمانی نێـر، یان مێی کـرد لەگەڵ ئەوانـەی جیاوازن لە ئاییـنو ڕێبازیـان، فەرموویەتی: ﴿ أُو۟لَـٰٓئِكَ يَدْعُونَ إِلَى ٱلنَّارِ ﴾ واتـە: لـە گوفتـارو ڕەفتارو حـاڵو باریان، تێکـەڵاو کردنیان مەترسـیە لەسـەر ژیانتان(ئەی بـڕواداران)، ترسـناکیەکەش لە ترسـناکیەکانی دونیـا نیە، لە ڕاسـتییدا بریتیـە لە بەدبەختـی هەتاهەتایی.

سـوود لـە هـۆی دەقەکـە وەردەگیـرێ، قەدەغـە کردنـی تێکـەڵاو بـوون لەگـەڵ هەموو هاوبـەش دانـەرو بیدعەکارێکـدا، چونکـە ئەگـەر هاوسـەرگیری دروسـت نەبێـت لەگەڵ ئـەوەی بەرژەوەنـدی زۆری تیادایـە، ئـەوە تێکەڵـی تـەواو لـە پێشـترە، بـە تایبەتـی ئـەو تێکەڵیـەی کـە موشـریکو هاوبـەش دانـەر بـەرز دەکاتـەوە نموونـەی ئـەوەش ئەوەیـە کەمسـوڵمان خزمەتـکاری موشـریک بـۆ خـۆی دیـاری بـکات.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَلَا تَنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكَٰتِ﴾ بەڵگەیە لەسـەر ڕەچاوکردنی سەرپەرشـتیار لە (مەسـەلەی) هاوسەرگیری.

﴿وَٱللَّهُ يَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱلْجَنَّةِ وَٱلْمَغْفِرَةِ﴾ واتـە: (خـوا) بەندەکانـی بانـگ دەکات بـۆ بەدەسـتهێنانی بەهەشـتو لێخۆشـبوون کە شـوێنەوارەکەی لادانـی تۆڵەو سـزاکانە، ئەوەش بـە بانگـەواز کـردن بـۆ هۆکارەکانیـان: لـە کارو کـردەوە چاکـەکانو تۆبەی ڕاسـتەقینە نەصـوح، وە زانسـتی سـوود بەخـش.

﴿وَيُبَيِّنُ ءَايَٰتِهِۦ﴾ واتـە: بڕیارو حوکـمو حیکمەتەکانی، ﴿لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾ ئەو بەیـاد هاتنـەوە ئەوەیـان بۆ پێویسـت دەکات کە لە بیریـان کردبوو، فێـری ئەوەیان دەکات کـە نەیاندەزانـیو پابەندیـان دەکات جێبەجێ بکەن، بـۆ ئەوانەی بـە فیرۆیان دابوو.

(٢٢٢-٢٢٣): ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ ۖ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُوا۟ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ ۖ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ ۖ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ ﴿٢٢٢﴾ نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُوا۟ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ ۖ وَقَدِّمُوا۟ لِأَنفُسِكُمْ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّكُم مُّلَٰقُوهُ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٢٣﴾﴾

﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ ۖ قُلْ هُوَ أَذًى﴾ خـوا ﷻ هەواڵ دەدات دەربارەی پرسـیارکردنیان لە حەیـزو سـووڕی مانگانـە، ئایا ئافـرەت دوای کەوتنە حەیـز چـی دەکات؟ وەک پێش کەوتنە حەیـز وایـە، ئایا بە ڕەهایـی لێـی دوور دەکەوێتەوە هەروەکـو جوولەکەکان وایـان دەکرد؟

خـوا ﷻ هەواڵیـدا کـە کەوتنـە حەیـز ئـازارو زیانـە، جـا ئەگـەر ئـازارو زیـان بـێ، لـە حیکمەتـی خـوای بەرز بـۆ بەندەکانـی وایە کـە قەدەغەیان بکات لـەو ئـازارو زیانانە، بۆیە فەرموویەتـی: ﴿فَٱعْتَزِلُوا۟ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ﴾ واتـە: شـوێنی حەیـز، ئەویـش جـووت بوونـە لـە داوێنـەوە، ئەمـە بە کـۆ دەنگی حـەڕام کـراوە، تایبـەت کردنـی دوورکەوتنەوە لـەوەی کـە کەوتوەتـە حەیـز، بەڵگەیە لەسـەر ئـەوەی دەسـت لێدانـی ئافرەتـی حەیزدارو دەسـت بـۆ بردنـی بەبـێ جـووت بوون لـە دامێنو شـوێنی شـەرعی دروسـتە.

بەڵکــو دەفەرمــوێ: ﴿ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ ﴾ بەڵگەیــە لەســەر ئــەوەی گەیشــتن‌و نزیکبوونــەوە لــە دامێــن‌و شــوێنی شــەرعی تایبــەت ، ئەویــش نێــوان نــاوکو ئەژنۆیــە دەبــێ وازی لــێ بهێنــرێ، هەروەکــو پێغەمبــەر ﷺ ئەگــەر ویســتبای ڕاســتەوخۆ بگــات بە ئافرەتەکــەی‌و ئەویــش لــە حەیزدا بوو، یــان فەرمانی پــێ دەکــرد دامێــن‌و (لەناوکی تاکو ئەژنــۆی) داپۆشــێ، جــا ڕاســتەوخۆ پــێ دەگەیشــت‌و نزیکــی دەبوویــەوە.

ســنووری ئــەم دوورکەوتنــەوە لــە ئافرەتانــی حەیــزدارو نزیــک نەبوونــەوە لێیــان ﴿ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ ﴾ واتــە: خوێنیــان دەپچــڕێ‌و پاک دەبنــەوە، جا ئەگــەر خوێن نەما ئــەو قەدەغەی کــە هەیــە لــە کاتــی نەمانــی خوێنەکــەی لادەچــێ، کە بــۆ حــەڵاڵ بوونــەوەی دوو مەرج هە یە:

یەکــەم: پچڕان‌و وەســتانی خوێن‌و خۆ شوشــتنی لەو کاتــەی خوێن دەوەســتێ، بەمە مەرجی یەکەم لادەچێ.

دووەم: خــوا فەرموویەتــی: ﴿ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ ﴾ واتــە: خۆیان دەشــۆرن ﴿ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللَّهُ ﴾ واتــە: لــە پێشــەوە نــەک لە پشــتەوە، چونکــە ئەو شــوێنی کێــڵان‌و چاندنە.

ئەمــە بەڵگەیــە لەســەر واجب بوونی خۆ شــۆرین بۆ ئافرەتــی حەیزدار، وە وەســتان‌و پچڕانی خوێن مەرجە بۆ دروســتی (خۆشــۆرینەکە).

ئــەم حــەرام کردنــەش لە بەزەیــی پەروەردگارە بــۆ بەندەکانی‌و پاراســتنیانە لە ئــازارو زیان، خــوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ ﴾ واتــە: لــە گوناهەکانیــان بــە بەردەوامی، ﴿ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ ﴾ واتــە: پاکبــووەوەکان لە گونــاه. ئەمە پاکبوونەوەی هەســتی‌و بێ دەســتنوێژیەکان دەگرێتەوە.

وە شــەرعی بوونــی پاکیەتــی ڕەهایــی تێدایــە، چونکە خــوا ئەوکەســەی خــۆش دەوێ بەو شــێوە وەســفکراوە (واتــە: پاکیــی) خۆشــی دەوێــت، لەبــەر ئەوەیــە پاکیەتی ڕەهــا مەرجە بــۆ دروســتی نوێــژو تەواف کــردن، وە دەســت دانــە قورئــان، پاکبوونــەوەی مەعنەوویش دەگرێتــەوە، کــە (پاکبوونەوەیــە) لــە ڕەوشــتە ناشــیرین‌و ڕیســواکەرەکان‌و کــردارە قیزەونــەکان.

﴿ نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ ﴾ لــە پێــش دوا، بــەڵام نابــێ مەگەر لە پێشــەوە (پێشــەوەی ئافــرەت)، چونکــە ئــەوێ شــوێنی کێــڵان‌و چاندنە، ئــەوە بریتیە لــەو جێگایەی کــە منداڵی لێــوە دەبێ.

بەڵگەشـی تێدایـە لەسـەر حەرامـی چوونـە لای لـە دواوە، چونکـە خـوا حەڵاڵـی نەکردوە، چوونـە لای ئافـرەت، مەگـەر لـەو شـوێنەی کێڵانو چاندنـی لێ دەبـێ، فەرمـوودەکان لە پێغەمبـەر ﷺەوە زۆرن دەربـارەی حـەرام کردنـی ئـەوەو نەفرەتکردن بۆ ئەو کەسـە کە ئەم کارە ئەنجـام دەدات.

﴿ وَقَدِّمُواْ لِأَنفُسِكُمۡ ﴾ واتـە: لـە نزیکبوونـەوە بـۆ لای خوا، بـە کردنی چاکـەکان، لەوانەش ئەوەیـە پیـاو ڕاسـتەوخۆ بگـات بـە ئافرەتەکـەیو لەگەڵـی جووت بـێ، بە شـێوەی لە خوا نزیـک بوونـەوەو حیسـاب کردنـی وەرگرتنەوەی پاداشـت لەسـەری، لـە پێناو بەدەسـت هێنانـی وەچـەو منـداڵ کە خـوا بە هۆیانـەوە سـوودیان پـێ دەگەیەنێ.

﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ﴾ واتـە: لـە هەمـوو حاڵەتـەکان پابەنـدی لـە خوا ترسـانو خۆپارێـزی بن، لـە خواوە یارمەتـیو کۆمەک وەربگرن بـۆ (دەسـتهێنانی) زانیاریتان ﴿ أَنَّكُم مُّلَٰقُوهُۗ ﴾ پاداشـتتان دەدات لەسـەر کـردەوە چاکەکانو غەیـری ئەوانیش.

لە پاشـان فەرمووی: ﴿ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾ باسـی مـوژدە پێدراوی نەکردوە، تا گشـتیەتی بگەیەنـێ، بێگومـان موژدەیان بـۆ هەیە لە ژیانـی دونیاو لە دوارۆژیشـدا، وە بەدەسـتهێنانی هەمـوو چاکەیـەکو ڕەتکردنـەوەو لادانی هەمـوو زیانێک کە لەسـەر بڕوا دەبـێ، ئەمەش دەچێتـە نێو ئـەو موژدەیەوە.

بەهەمـان شـێوە خۆشەویسـتی خـوای تێدایـە بۆ بـڕواداران، وە ئـەوەی دڵخۆشـیان دەکات، وە هانـدانو چـالاک کردنیـان بـەوەی خوا بـۆی ئامادە کـردوون لـە پاداشـتەکانی دونیاو دوارۆژ.

(٢٢٤): ﴿ وَلَا تَجۡعَلُواْ ٱللَّهَ عُرۡضَةٗ لِّأَيۡمَٰنِكُمۡ أَن تَبَرُّواْ وَتَتَّقُواْ وَتُصۡلِحُواْ بَيۡنَ ٱلنَّاسِۚ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ٢٢٤ ﴾

مەبەسـت لە سـوێند خـواردن بە مـەزن گرتنـی ئەوەیە کە سـوێندی پێ دەخـورێ، جەخت کردنەوەشـە لەسـەر ئەوەی سـوێندی لەسـەر خوراوە، خوا ﷻ بێگومان فەرمانی بە پاراسـتنی سـوێند کـردوە، جا ئەوە پاراسـتن لەهەموو شـتێک دەخـوازێ، بەڵام خوا ﷻ لـەوەی دەری خسـتووەو جیایکردۆتـەوە، ئەگـەر بەجێهێنانـی سـوێندەکە، بـووە مایـەی ئـەوەی واز لەوە بهێنـی کـە لەلای خـوا خۆشەویسـترە، بەندەکانـی قەدەغە کردوە کـە سـوێندەکانیان بکەنە ڕێگـرو لەمپـەر بـۆ ئـەوەی چاکـە بکـەنو خێـر ئەنجامبـدەن، یـان لەسـتەمو خراپەیەک پارێزکاریی بکەن یان ئاشـتبونەوەو چاکسـازی لـە نێوان خەڵکی بکەن، جا ئەوەی سـوێندی

خـوارد لەسـەر وازهێنان لە پێویسـتی (واجب)ێک ئەوە پێویسـتە سـوێندەکەی بشـکێنێت، حەرامـە بـەردەوام بێ لەسـەر سـوێندەکەی، ئەوەش کە سـوێندی خواردبێ لەسـەر وازهێنان لـە شـتێکی ویسـتراو (مسـتحب)، ئەوە پەسـندە بـۆی سـوێندەکەی بشـکێنێ، ئـەوەش کە سـوێندی خواردبێ لەسـەر ئەنجامدانی حەرامکراوێک، ئەوە پێویسـتە سـوێندەکەی بشکێنێ، بـەڵام ڕێگاپێـدراو (مباح) دەبـێ تیایدا سـوێندەکەی بپارێزێو نەیشـکێنێ.

ئـەم دەقـە دەکرێتـە بەڵگـە لەسـەر بنەمایەکـی بەناوبانـگ کـە ئەوەیـە (ئەگـەر بەرژەوەندیـەکانو چاکـەکان قەڵەباڵغیان کـردو کۆبوونەوە، گرنگترینیـان پێش دەخرێت)، لێـرەدا تەواوکردنـی سـوێندەکەی چاکـەو بەرژەوەندیـە، وە جێبەجێ کـردنو پابەند بوونی فەرمانەکانـی خـوا لەوشـتانەی بەرژەوەندی لـەوە مەزنتری تێدایـە (واتە: چاکەو ئاشـتەوایی نێـوان خەڵکـی بەرژەوەنـدی زیاترە لە سـوێند نەشـکاندنەکە) جا لەبـەر ئەوەیە پێشـخراوە. لـە پاشـان دەقەکە بـەو دووناوە پیـرۆزە کۆتایی پـێ هێناوە فەرموویەتـی: ﴿ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ ﴾ واتـە: بـۆ هەموو دەنگەکان ﴿ عَلِيـمٌ ﴾ بە نیازو مەبەسـتەکان، وە لەوانەش بیسـتنی قسـەی سـوێند خـۆرەکان، وە زانسـتی بـە مەبەسـتەکانیان کـە ئایە چاکە یـان خـراپ، وە لە چوار چێـوەی ئەوەشـدا ئاگـادار کردنـەوەی تیادایـە لەسـزاو پاداشـتی خـوا، بێگومان کـردەوەو نیازەکانتـان لە زانیاری خـوادا جێگیربووەو چەسـپیوە.

لَا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغۡوِ فِيٓ أَيۡمَٰنِكُمۡ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتۡ قُلُوبُكُمۡۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٞ ﴿٢٢٥﴾ لِّلَّذِينَ يُؤۡلُونَ مِن نِّسَآئِهِمۡ تَرَبُّصُ أَرۡبَعَةِ أَشۡهُرٖۖ فَإِن فَآءُو فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٢٢٦﴾ وَإِنۡ عَزَمُواْ ٱلطَّلَٰقَ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴿٢٢٧﴾ وَٱلۡمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصۡنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٖۚ وَلَا يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكۡتُمۡنَ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِيٓ أَرۡحَامِهِنَّ إِن كُنَّ يُؤۡمِنَّ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذَٰلِكَ إِنۡ أَرَادُوٓاْ إِصۡلَٰحٗاۚ وَلَهُنَّ مِثۡلُ ٱلَّذِي عَلَيۡهِنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ وَلِلرِّجَالِ عَلَيۡهِنَّ دَرَجَةٞۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٢٨﴾ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖۗ وَلَا يَحِلُّ لَكُمۡ أَن تَأۡخُذُواْ مِمَّآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ شَيۡـًٔا إِلَّآ أَن يَخَافَآ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِۖ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَا فِيمَا ٱفۡتَدَتۡ بِهِۦۗ تِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَعۡتَدُوهَاۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٢٩﴾ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ مِنۢ بَعۡدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوۡجًا غَيۡرَهُۥۗ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَآ أَن يَتَرَاجَعَآ إِن ظَنَّآ أَن يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِۗ وَتِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِ يُبَيِّنُهَا لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴿٢٣٠﴾

پاشان خوا دەفەرموێ:

(٢٢٥): ﴿ لَّا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغۡوِ فِيٓ أَيۡمَٰنِكُمۡ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتۡ قُلُوبُكُمۡۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٞ ﴿٢٢٥﴾ ﴾:

واتە: خوا بەو سوێندە بێ نیازو مەبەستانەی کە بەسەر زمانتاندا دێت پرسیارتان لێناکات، کە بەندە بە بێ مەبەستو نیاز قسەیان پێ دەکاتو لە ناخو دڵیشەوە دەرناچێت، بەڵکو بەسەر زمانیدا هاتووە وەکو قسەی پیاو لە پێشکەش کردنی قسەکانی دەڵێ: (ناوەڵڵاهی بەرێ وەڵڵاهی)، وەکو سوێند خواردنی لەسەر کارێکی ڕابردوو گومانی ڕاستگۆی خۆی دەبات، لە ڕاستیدا تەنها گرتنو تۆڵە لەسەر ئەوەیە کە دڵی مەبەستیەتیو ویستوویەتی.

لەمەدا بەڵگە هەیە لەسەر ڕەچاوکردنی مەبەست لە قسەکاندا، هەروەکو خۆی ڕەچاوکراوە لە کردەوەکان.

﴿ وَٱللَّهُ غَفُورٌ ﴾ بۆ ئەو کەسەی تەوبە بکات ﴿ حَلِيمٞ ﴾ بەوەی سەرپێچی دەکات، لە کاتێکدا تۆڵەی بۆ پێش نەخستوە، بەڵکو بە لەسەرخۆیی بۆی داپۆشیوەو بەخشیویەتی، لەگەڵ بەتوانایی بەسەریداو لەبەر دەستی دایە.

(٢٢٦-٢٢٧): ﴿ لِّلَّذِينَ يُؤۡلُونَ مِن نِّسَآئِهِمۡ تَرَبُّصُ أَرۡبَعَةِ أَشۡهُرٖۖ فَإِن فَآءُو فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٢٢٦﴾ وَإِنۡ عَزَمُواْ ٱلطَّلَٰقَ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴿٢٢٧﴾ ﴾:

﴿ لِّلَّذِينَ يُؤۡلُونَ مِن نِّسَآئِهِمۡ تَرَبُّصُ أَرۡبَعَةِ أَشۡهُرٖ ﴾ ئەمە لە سوێندە تایبەتەکانە بە ئافرەتو هاوسەر، لە فەرمانی تایبەت، ئەویش بریتیە لە سوێند خواردنی هاوسەر (پیاو) لەسەر وازهێنان لە جووتبوون هاوسەرەکەی بەرەهایی، یان بە بەستراوەیی بە کەمتر لە چوار مانگ یان زیاتر. ئەوەی بە تایبەت سوێند بخوا (إيلاء) بکات لە هاوسەرە ئافرەتەکەی، ئەگەر کەمتر لە چوار مانگ بوو، ئەوە وەکو تێکڕایی سوێندەکان وایە، ئەگەر شکاندی ئەوە لە بری (کەفارەت) دەدا، ئەگەر سوێندەکەشی تەواو بردە سەر ئەوە هیچی لەسەر ناکەوێت، هاوسەرە ئافرەتەکەی

هیچ ڕێگایەکی لەسەر نیە چونکە چوار مانگی بۆ بووە، ئەگەر هەتا هەتایی بێ، یان کاتێکی زیاتر لە چوار مانگ بێت، چوار مانگی بۆ دادەنرێ لە سوێندەکەی، ئەگەر هاوسەرەکەی داوای جووت بوونی کرد، چونکە ئەوە مافەو هەقی خۆیەتی، ئەگەر تەواو بوو فەرمانی گەڕانەوەی پێ دەدرێ بۆ جووت بوون، جا ئەگەر جووتبوو ئەوە هیچی ناکەوێتە سەر تەنها کەفارەتی سوێندەکە نەبێ، ئەگەر ڕێگری کرد ناچار دەکرێ بە جیابوونەوە (تەڵاق)دانی ژنەکەی، ئەگەر قەدەغەی کرد (لە جیابوونەوەکەش) ئەوە حاکم لێ جیادەکاتەوە تەڵاقی دەخات.

بەڵام گەڕانەوە بۆلای ئافرەتە هاوسەرەکەی لە لای خوای بەرز خۆشەویستترو باشترە، لەبەر ئەوەیە فەرموویەتی: ﴿ فَإِن فَآءُو ﴾ واتە: گەڕانەوە بۆ ئەوەی سوێندیان لەسەر وازهێنان لێ خواردبوو کە بریتی بوو لە جووتبوون ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ ﴾ بە هۆی گەڕانەوەیان لەو سوێندەیان خۆش دەبێ کە خواردبوویان.

﴿ رَّحِيمٌ ﴾ لەبەر ئەوە بۆ سوێندەکەیان کەفارەتو هەڵوەشانەوەی بۆ داناون، پێیەوەی پابەندی نەکردوون، کە لەسەریان بکەوێ هەرگیز نەتوانن دەستی لێهەڵگرن، هەروەها بە بەزەییە پێیان، لەبەر ئەوەی بگەڕێنەوە لای خێزانەکانیانو دڵیان پێیان بسوتێو بەزەییان پێیان بێتەوە.

﴿ وَإِنْ عَزَمُوا۟ ٱلطَّلَٰقَ ﴾ واتە: ڕێگریان کرد لە گەڕانەوە، ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە حەز ناکەن بگەڕێنەوە بۆ لای ژنەکانیان، ئەمەش نابێ مەگەر سوور بێ لەسەر جیابوونەوە، ئەگەر ئەم پێویستیە ڕاستەوخۆ بەجێهات ئەوە چاکترە (جیا ببێتەوەو تەڵاقی بدات) ئەگەرنا حاکم ناچاری دەکات لەسەری یان خۆی پێی هەڵدەستێ (واتە تەڵاقی دەخات).

﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ هەڕەشەو بەڵێنی سزای تیادایە بۆ ئەوەی ئەو سوێندە بخواو مەبەست لێ نارەحەتی زیان گەیاندن بێت.

بەم دەقە بەڵگە دەهێندرێتەوە لەسەر ئەوەی (إیلاء) سوێند خواردن بەوازهێنان لە جووتبوون تایبەتە بە هاوسەری ئافرەت، لەبەر فەرموودەی خوا، ﴿ مِن نِّسَآئِهِمْ ﴾ وە لەسەر پێویستی جووت بوون لە هەر چوار مانگ جارێک، چونکە ئەو لە دوای چوار مانگ ناچار دەکرێت، یان لەسەر جووتبوون، یان لەسەر جیابوونەوە، ئەوەش نابێ مەگەر واز لە واجبێک بهێنێ، (واتە: چونکە جووتبوون لەگەڵ ئافرەتی هاوسەر مافێکەو خوا دایناوە پێویستە لە چوار مانگ جارێک ئەنجامبدرێ، یان وازی لێ بهێندرێ، ئەگینا گوناهەو ماف پێشێل کردنە).

(٢٢٨): ﴿ وَٱلْمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍ ۚ وَلَا يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ

﴿فِيٓ أَرۡحَامِهِنَّ إِن كُنَّ يُؤۡمِنَّ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذَٰلِكَ إِنۡ أَرَادُوٓاْ إِصۡلَٰحٗاۚ وَلَهُنَّ مِثۡلُ ٱلَّذِي عَلَيۡهِنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ وَلِلرِّجَالِ عَلَيۡهِنَّ دَرَجَةٞۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ٢٢٨﴾.

﴿وَٱلۡمُطَلَّقَٰتُ﴾ واتە: ئەو ئافرەتانەی هاوسەرەکانیان لێیان جیابونەتەوەو تەڵاقیانداون ﴿يَتَرَبَّصۡنَ بِأَنفُسِهِنَّ﴾ واتە: چاوەڕوان دەبن.

﴿ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٖ﴾ واتە: کەوتنە خوێنو سوڕی مانگانە، یان پاکبونەوە، لەسەر جیاوازی ڕای زانایان دەربارەی مەبەست پێی، لەگەڵ ئەوەی کە دروست ئەوەیە کە (قروء)، کەوتنە حەیزە، ئەو چاوەڕوانیە بینینە، چەندین حیکمەتی تێدایە لەوانە:

زانینی بە تاڵ بوونی منداڵدان بەوەی سێ (قروء)، دووبارە بوونەوە بەسەریدا، دەزانرێ کە لە منداڵدانی کۆرپەلە نیەو (سک پڕ نیە) سەرناکێشێت بۆ تێکەڵبوونی نەژادو باب‌و باپیرەکان، لەبەر ئەوەیە خوا ﷻ هەواڵدانی لەسەریان پێویست کردوە دەربارەی ﴿مَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِيٓ أَرۡحَامِهِنَّ﴾ شاردنەوەی کۆرپەلە لە منداڵدان، یان خوێنی سووڕی مانگانە تیادا حەرامی کردوە لەسەریان، چونکە شاردنەوەی ئەوە سەردەکێشێ بۆ خراپەی زۆر گەورە، شاردنەوەی کۆرپەلەو (سک پڕی) ئەوە پێویست دەکات برێتە پاڵ کەسێک کەهی ئەو نیە، بە حەزکردنو خێرایی کردن بۆ تەواو بوونی (عدة) چاوەڕوانی، جا ئەگەر ئەو منداڵە دراوە پاڵ جگە لە باوکی، پەیوەندی خزمایەتی‌و میرات دەپچردرێ لە نێوان مەحرەمەکاندا، وە خزم‌و کەسەکانی لێی جیا دەکرێتەوە، هەندێ جار لەوەی مەحرەمێکی خۆی مارە بکات (وەک خوشک، یان دایک) دەرنجامی هەموو ئەمانە ئەوەیە کە دراوەتە پاڵ جگە لە باوکی، وە جێگیر بوونی دەرنجامەکانی ئەوانە لە میراتگرتن بۆ ئەوو لە ئەویش دەستەبەر دەبێ (واتە: ئەو دەبێتە میراتگری کەسێک کە هیچی ئەو نیە، وە کەسانێکیش دەبنە میرات گری ئەو کە هیچی ئەو نین)، وە نزیکەکانی کە دراوەتە پاڵ جگە لە باوکی دەبنە نزیکەکان بۆ ئەویش، جا لەوەدا خراپەو بەرەڵای هەیە کە نازاندرێ مەگەر هەر خوا خۆی نەبێ، وە پێداگریشی تێدایە لە بەردەوام بوون لەسەر گوناهە گەورەکان وەک زینا بەسە ئەوەندە خراپەیە بۆی.

بەڵام شاردنەوەی سوڕی مانگانەش بەوەی کە پەلەی لێ بکات‌و هەواڵی درۆ بدات بە پچڕاندنی مافی هاوسەرەکەی‌و خۆ حەلاڵکردن بۆ غەیری ئەو، وە ئەوەشی لەوەوە پەیدا دەبێت لە شەڕو خراپە هەروەکو باسمانکرد لە پێشتر، جا ئەگەر درۆی کردو هەواڵیدا بە نەبوونی سووڕی مانگانە تا چاوەڕوانیەکەی درێژ دەبێتەوە، بۆ ئەوەی لە مێردەکەی (نفقە)ی زیاتر وەربگرێ کە شایستەی نیە، بەڵکو حەرامە لەسەر ئافرەتەکە لە دوو ڕووەوە:

لەو ڕووەوە کە شایستە نیە، وە لەو ڕووەشەوە کە داویەتیە پاڵ بڕیاری شەرعی، لە کاتێکدا ئەو درۆزنە، جاری وایە لە دوای تەواوبوونی چاوەڕوانیەکەش دەگەڕێتەوە، ئەوەش دەبێتە (زینا)و بەرەڵای، چونکە ئەو کات بێگانەیە بۆی، بۆیە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَلَا يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِيٓ أَرْحَامِهِنَّ إِن كُنَّ يُؤْمِنَّ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ ﴾.

شاردنەوەی ئافرەتان لە مێردەکانیان بەڵگەیە لەسەر نەبوونی بڕوابونیان بەخواو بەڕۆژی دوایی، ئەگەرنا بڕوای هەبێ بە خواو بەڕۆژی دوایی، وە بیانزانیایەت لەبری کردەوەکانیان سزا دەدرێن هیچ شتێک لەوانەیان لێ ڕوونادات.

ئەمە بەڵگەی ئەوەی تیادایە کە شایەتی ئافرەت لەوەی هەواڵێپێدەدا دەربارەی خۆی لێی وەردەگیرێ، لەو کاروبارانەی کە کەس نایانبینێ تەنها خۆی نەبێ، وەکو سوڕی مانگانەو سک پڕیو نموونەی ئەوانیش.

لە پاشان خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذَٰلِكَ ﴾، واتە: بۆ هاوسەرو مێردەکانیان مادام لە (عدة) دان، بیانگەڕێننەوە ژێر هاوسەگیرێتیو (نكاح) یان ﴿ إِنْ أَرَادُوٓاْ إِصْلَٰحًا ﴾، واتە: با بە ویستو هۆگریو خۆشەویستیو سۆز بێت.

تێگەیشتنی (مفهوم) دەقەکە ئەوەیە ئەوان ئەگەر مەبەستیان چاکبوونو ئاشتبوونەوە نەبوو ئەوە لە پێشتر نین بە گەڕانەوەیان، بۆیان حەڵاڵ نیە بیانگەڕێننەوە لە پێناو ئەوەی بیەوێ زیان بە ئافرەتەکە بگەیەنێو ماوەی چاوەڕوانیەکەی (عدة) درێژ بکاتەوە لەسەری، ئایە لەگەڵ ئەم مەبەستەدا دەبێتە خاوەن ئافرەتەکە، دوو بۆ چوون هەیە:

زۆرینەی زانایان لەسەر ئەوەن کە خاوەندارێتی دەکات بەڵام بە حەرامی، بەڵام ڕاستو دروست ئەوەیە ئەگەر ئاشتبوونەوەو گەڕانەوەی نەویست ئەوەی بۆ نیە، هەروەکو ئەوە ڕواڵەتی دەقە پیرۆزەکەیە، ئەمە دانایيو حیکمەتێکی ترە لە چاوەڕوانیدا، ئەویش ئەوەیە ڕەنگە ژنو مێردەکە پەشیمان ببێتەوە لەسەر جیابوونەوە لە یەک، ئەو ماوەیەی بۆ دانراوە، تا بیربکاتەوە لە پاشە ڕۆژیو پاشان بڕیاری خۆی بدات.

ئەوە بەڵگەیە لەسەر خۆشویستنی خوا ﷻ بۆ هۆگریو ئاشنایەتی نێوان هاوسەرەکان، وە پێناخۆشبوونێتی بۆ جیابوونەوە، هەروەکو پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {أَبْغَضُ الحَلالِ إلى اللهِ الطَّلاقُ}(أخرجه أبي داود برقم: (٢١٧٨)، وَضَعَّفَهُ الألباني). واتە: بوغزێنراوترین حەڵاڵ لە لای خوا تەڵاقە.

ئەمە تایبەتە بە تەڵاقی گەڕانەوە (طلاق الرجعي)، بەڵام جیابوونەوەی ڕوونو ئاشکرا (طلاق

البائن) مێردەکەی لە پێشتر نیە بە گەڕاندنەوەی، بەڵکو ئەگەر هەردووکیان ڕازی بوون بەگەڕانەوە دەبێ گرێبەستێکی نوێ هەبێ کە هەموو مەرجەکانی تێدابێ.

لە پاشان خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَلَهُنَّ مِثْلُ ٱلَّذِى عَلَيْهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ﴾: واتە: ئافرەتان هەقو مافیان هەیە لەسەر مێردەکانیان، وەک چۆن پێویستە لەسەر ئافرەتان مافی پیاوەکانیان جێبەجێ بکەن.

سەرچاوەی مافەکان لە نێوان هاوسەرەکان دەگەڕێتەوە بۆ زانراو (المعروف) کە بریتیە لە: نەریتی ئاسایی لەو شوێنو وڵاتە، وە ئەو سەردەمو کاتە، لە نموونەی ئافرەتەکە بۆ نموونەی مێردەکەی، وە بە پێی سەردەمو کاتو شوێن دەگۆڕێ.

لەمەدا بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی کە (نفقە)و بەخێوکردنو جلو بەرگو هاوژینایەتیو شوێنی حەوانەوە (مسکن)و بەهەمان شێوە جووتبوون، هەموویان دەگەڕێنەوە بۆ زانراوە باو ناسراو (معروف)، ئەوە پێویست کاری گرێبەستی ڕەهایە، بەڵام گرێبەست لەگەڵ مەرجدا، لەسەر مەرجی هەردوو لایانە، مەگەر مەرجێک حەرامێکی حەڵاڵ کردبێ، یان حەڵاڵی حەرام کردبێ.

﴿ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ ﴾ واتە: بەرزیو فەرمانڕەوایەتیو مافی زیاتر، لەسەر (پیاو)ە، وەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ وَبِمَآ أَنفَقُوا۟ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ ﴿٣٤﴾ ﴾النساء (واتە: پیاوان فەرمانڕەواو چاودێرن بەسەر ئافرەتان خوا هەندێکیانی بەسەر هەندێکیان پلەدار کردوە بەوەی کە لە سامانەکانیان بەخێویان دەکەنو پێیان دەبەخشن...).

پلەی پێغەمبەرایەتیو دادوەریو پێشەوایی بچووکو گەورەو تێکڕایی فەرمانڕەوایەتیەکان تایبەتن بە پیاوان، پیاوان دوو هێندەی ئافرەتەکانیان بۆ هەیە لە زۆربەی کاروبارەکان وەک میراتو نموونەی ئەو.

﴿ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾ واتە: خاوەن عیزەتو هێزو توانا بەزێنە، دەسەڵاتی مەزنی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، ئەوەی هەمو شتەکان بۆی نزمو ملکەچ بوون، بەڵام لەگەڵ تواناو هێزیدا دانایە لە ڕاپەڕاندنی کارەکاندا.

ئافرەتانی سک پڕ لە گشتیەتی ئەو دەقە دەردەچن، چاوەڕوانیو(عدة)یان بە دانانی کۆرپەلەکەیانە، وە ئەوانەی نەگوازراونەتەوەو لەگەڵیاندا جووت نەبوون، ئەوانە (عدة)یان لەسەر نیە، کویلە (ئافرەتە جاریەکان) چاوەڕوانیان دوو جار کەوتنە حەیزە، هەروەکو قسەی

هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێت)، میانەی دەقەکان بەڵگەن کە مەبەست پێی ئافرەتی ئازادە، لەسەر ئەوەی مەبەست پێیان ئافرەتی سەربەست.

(٢٢٩): ﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖۗ وَلَا يَحِلُّ لَكُمۡ أَن تَأۡخُذُواْ مِمَّآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ شَيۡـًٔا إِلَّآ أَن يَخَافَآ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِۖ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَا فِيمَا ٱفۡتَدَتۡ بِهِۦۗ تِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَعۡتَدُوهَاۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ٢٢٩ ﴾

تەڵاق لە سەردەمی نەفامیدا بەردەوام بوو تاکو سەرەتای ئیسلام، پیاو هاوسەرەکەی خۆی تەڵاق دەدا بەڵام بە یەکجاری نا، ئەگەر بیزانیایە زیانی دەبێ بۆ ژنەکە تەڵاقی دەدا، ئەگەر چاوەڕوانی (عدة)کەی نزیکی تەواوو بوون ببووایەتەوە دەیانگەڕاندنەوە، لە پاشان جارێکی دیکە تەڵاقیان دەدانەوە، بەردەوامو بێکۆتا وایان لەگەڵ دەکردن، زیانو ناخۆشی وایان بەسەر دەهات مەگەر خوا بزانێ و پێی زانابێت، خوا ﷻ هەواڵیدا کە ﴿ ٱلطَّلَٰقُ ﴾ واتە: (ئەو تەڵاقەی کە) گەڕاندنەوەی پێ دەبێ ﴿ مَرَّتَانِ ﴾ (دووجارە) تا پیاوی هاوسەر ئەگەر نەیەوێت زیانی پێ بگەینێت بیگەڕێنێتەوە، لەو ماوەیە بە خۆیدا دەچێتەوە، بەڵام لەوە بەسەرەوەتر (واتە سێیەم جار تەڵاقی بدات) شوێنی ئەوە نیە، چونکە ئەوەی لە دووجار زیادی کرد، یان ئەوەیە بوێرو چاو قایمە لەسەر قەدەغەکراو، یان حەز ناکات لە گەڵیدا بێ، بەڵکو مەبەستی زیان گەیاندنە، لەبەر ئەوەیە خوا ﷻ فەرمانی بە مێرد کردوە کە دەست بگرێ بە ژنەکەیەوە بە ﴿ بِمَعۡرُوفٍ ﴾ واتە: ژیانێکی چاک، وەک هاوشێوە بێ لەگەڵ ژنانی دیکە، ئا ئەوەیە ڕای پەسەندو چاک (راجح) ئەگەرنا جیابێتەوە لێی‌و دەستی لێ هەڵگرێ ﴿ بِإِحۡسَٰنٖ ﴾ (بە چاکە) لە چاکەیە هیچ لە سامانەکەی وەرنەگرێ لەسەر جیابوونەوەکەی، چونکە ستەمە، وەرگرتنی سامانە لە بەرانبەر هیچ شتێکدا، لەبەر ئەوەیە فەرموویەتی: ﴿ وَلَا يَحِلُّ لَكُمۡ أَن تَأۡخُذُواْ مِمَّآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ شَيۡـًٔا إِلَّآ أَن يَخَافَآ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ ﴾ ئەوە بریتیە لە (خلع) کردنو خۆکڕینەوە بە چاکە، بەوەی ژنەکە حەزی لە پیاوەکەی نەبێ، لەبەر دروستکراوی (قەدو باڵاو قیافەی) یان ڕەوشتی یان ناتەواوی‌و کەم‌و کورتی ئایینی ڕقی لێ ببێتەوەو بترسێ لەوەی گوێڕایەڵی خوا نەبێت لە پێدانی مافەکانی.

﴿ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَا فِيمَا ٱفۡتَدَتۡ بِهِۦ ﴾ چونکە لە بری بەدەستهێنانی مەبەستەکەیەتی کە ئەویش جیابوونەوەیە، ئەمەش بەشەرعی بوون خۆکرینەوە (خلع) کردنە، ئەگەر لەوەدا دانایی‌و حیکمەت هەبێ (نەک بە خۆڕا).

﴿ تِلْكَ ﴾ واتە: ئەوەی لە پێشتر هات لە بڕیارو حوکمە شەرعیەکان ﴿ حُدُودَ ٱللَّهِ ﴾ واتە: ئەو بڕیارو حوکمانەی بە یاساو شەرع بۆتانی داناوە، فەرمانی کردوە بە پابەند بوون پێیانەوە ﴿ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾ چ ستەمێک مەزنترە لەوەی ئەوەی خۆی بە حەڵاڵدا بکاو لێیەوە بپەڕێتەوە بۆ حەرام، ئەوەی خوا بۆی حەڵاڵ کردوە بەشی نەکات.

**ستەم سێ بەشە:**

یەکەم: ستەمی بەندە لە نێوان خۆیو خوادا.

دووەم: مەزنترین ستەمی بەندەیە کە بریتیە لە هاوبەش بۆ خوا دانان.

سێیەم: ستەمی بەندە لە نێوان خۆیو خەڵکیدا، جا هاوبەش دانان بەبێ گەڕانەوەو تەوبە خوا لێی خۆش نابێت، وە مافی بەندەکانیش خوا واز لە هیچیان ناهێنێ، وە ئەو ستەمەی کە لە نێوان بەندەو پەروەردگاریەتی کەمترە لە هاوبەشدانان لە ژێرو ویستو دانایيو کارلەجێی خوایە.

(٢٣٠-٢٣١): ﴿ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ مِنۢ بَعْدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُۥ ۗ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَآ أَن يَتَرَاجَعَآ إِن ظَنَّآ أَن يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ ۗ وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ يُبَيِّنُهَا لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٢٣٠﴾ وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ ۚ وَلَا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لِّتَعْتَدُوا۟ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُۥ ۚ وَلَا تَتَّخِذُوٓا۟ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ هُزُوًا ۚ وَٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَمَآ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْحِكْمَةِ يَعِظُكُم بِهِۦ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٣١﴾ ﴾:

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ فَإِن طَلَّقَهَا ﴾ واتە: تەڵاقی سێیەم، ﴿ فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ مِنۢ بَعْدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُۥ ﴾ واتە: هاوسەرگیریەکی دروستو ڕاستەقینە، دەبێ جووتبێ لەگەڵیو بچێتە لایەوە، چونکە هاوسەرگیری شەرعی دانامەزرێ بێ گرێبەستو جووتبوون، ئەمەش بە یەکدەنگی (زانایان).

مەرجە کە هاوسەرگیری دووەم هاوسەرگیریەک بێ بە حەزو ئارەزووەبێ، وە لە دڵەوە بێت، ئەگەر مەبەستی ئەوە بێ حەڵاڵی بکات بۆ پیاوی یەکەم، ئەوە مارەیی نایەتو دانامەزرێت، حەڵاکردنیش سوودی نابێ، وە جووتبوونی گەورە (سید)یش سوودی نیە، چونکە ئەوە هاوسەر نیە، جا ئەگەر دووەمەکە هاوسەرگیریی لەگەڵ کرد دڵی تێ چوو وە جووتبوو لەگەڵی، پاشان لێی جیابووەوەو ئافرەتەکەش ماوەی چاوەڕوانی (عدة)کەی تەواو بوو ﴿ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَآ ﴾ واتە: (هیچیان لەسەر نیە) لەسەر هاوسەری یەکەمو ئافرەتە هاوسەرەکەی ﴿ أَن يَتَرَاجَعَآ ﴾ واتە: گرێبەستێکی نوێ لەنێوانیاندا نوێ بکەنەوە، لەبەر پاڵدانە لای (تراجع) گەڕانەوە بۆ

هەردووکیان، ئەوە بەڵگەیە لەسەر ڕەچاوکردنی ڕازی بوونیان، بەڵام بە مەرج گیراوە لە گەڕانەوەکەی هەردووکیان گومان ببەن ﴿ أَن يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ ﴾ بەوەی هەریەکەیان هەڵسێ بەمافی هاوسەرەکەی.

ئەمە ئەگەر پەشیمان بوون لە هاوژینیو پێکەوە ژیانی ڕابردوویان کاتێ جیابونەوەی لێ کەوتەوە، وە سوربوون کە بیگۆڕن بە هاوژینیو پێکەوە ژیانی چاکو خۆش، لێرەوە کە گوناهو هیچیان ناکەوێتە سەر لە گەڕانەوەیان.

لە تێگەیشتنی (مفهوم) دەقە پیرۆزەکەیە، ئەگەر هەردووکیان گومانی ئەوەیان نەبرد کە هەڵدەستن بە جێبەجێکردنی سنوورەکانی خوا، کەوا گومانیان دەبرد دۆخی پێشوویان لە هاوژینی خراپدا هەر ماوەو لانەچوە، ئەوان لەوەدا گوناهبار دەبن، چونکە هەموو کارەکان ئەگەر فەرمانی خوای تیادا بەجێنەهێنرێتو گوێڕایەڵی خوای پێ نەگرێتەبەر، ئەوە حەڵاڵو ڕێگا پێدراو نیە دەستپێشخەری بۆ بکرێ.

ئەمە دەبێتە بەڵگە کە پێویستە لەسەر مرۆڤ ئەگەر ویستی بچێتە ناوکارێک لە کارەکان، بە تایبەتی بەرپرسیاریەتی بچووک، یان گەورە، تەماشای خۆی دەکات، ئەگەر هێزو توانای لە خۆیەوە بینی لەسەر ئەوەو متمانەی بە خۆی هەبوو ئەوە ئازایەتی دەنوێنێو دەیکات، ئەگەرنا دەستی لێ هەڵدەگرێ.

کاتێ کە خوا ﷻ ئەو بڕیارو حوکمە مەزنانەی ڕوونکردەوە، فەرموویەتی: ﴿ وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ ﴾ واتە: یاساو شەریعەتەکانی کە ڕوونی کردوونەتەوەو ئاشکرای کردوون.

﴿ يُبَيِّنُهَا لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴾ چونکە ئەوانن لیێ سوودمەند دەبن (واتە ئەوانەی زانیاریان هەیەو دەیزانن) کە سوودیش دەگەیەنن بە غەیری خۆیان.

لەم دەقەدا پلەو پایەو فەزڵو چاکەی خاوەن زانست دەردەکەوێ، چونکە خوای بەرز ڕوونکردنەوەی سنوورەکانی تایبەت کردوە بەوان، مەبەست پێی ئەوانە، ئەوەشی تێدایە کە خوای مەزن پێی خۆشە بەندەکانی شارەزای سنوورەکانی بین، ئەوەی کە دایبەزاندووە بەسەر پێغەمبەرەکەی ﷺو تێگەیشتن لێیانو فێربوونیان.

وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ
أَوْ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَلَا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لِّتَعْتَدُوا۟ وَمَن
يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُۥ وَلَا تَتَّخِذُوٓا۟ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ هُزُوًا
وَٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَمَآ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْحِكْمَةِ
يَعِظُكُم بِهِۦ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٣١﴾ وَإِذَا
طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ
أَزْوَٰجَهُنَّ إِذَا تَرَٰضَوْا۟ بَيْنَهُم بِٱلْمَعْرُوفِ ذَٰلِكَ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ
مِنكُمْ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ذَٰلِكُمْ أَزْكَىٰ لَكُمْ وَأَطْهَرُ وَٱللَّهُ
يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢٣٢﴾ وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ
كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ وَعَلَى ٱلْمَوْلُودِ لَهُۥ رِزْقُهُنَّ
وَكِسْوَتُهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ لَا تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلَّا وُسْعَهَا لَا تُضَآرَّ
وَٰلِدَةٌۢ بِوَلَدِهَا وَلَا مَوْلُودٌ لَّهُۥ بِوَلَدِهِۦ وَعَلَى ٱلْوَارِثِ مِثْلُ ذَٰلِكَ فَإِنْ
أَرَادَا فِصَالًا عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا وَإِنْ
أَرَدتُّمْ أَن تَسْتَرْضِعُوٓا۟ أَوْلَٰدَكُمْ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِذَا سَلَّمْتُم مَّآ
ءَاتَيْتُم بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢٣٣﴾

پاشان خوا فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾ واتە: (ئەگەر ئافرەتانتان تەڵاقدا) بە تەڵاقی گەڕانەوە (رجعي) بە تەڵاقێک یان دووان.

﴿فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ﴾ واتە: نزیک بوونەوە لە تەواوبوونی ماوەی چاوەڕوانی کراو (عدة) یان. ﴿فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ﴾ واتە: یان دەیانگەڕێننەوە، نیەتتان بەجێهێنانی مافەکانیانە، یان وازیان لێ بێنن بەبێ ئەوەی بیانگەڕێننەوە، بە بێ زیان، لەبەر ئەمەیە خوا فەرموویەتی: ﴿وَلَا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا﴾ واتە: زیانیان پێ نەگات، ﴿لِّتَعْتَدُوا۟﴾ لەم کارەتاندا حەڵاڵ ببەزێنن بۆ حەرام، جا حەڵاڵ: خۆ گرتنەوەیە بە چاکە، حەرامیش: زیانگەیاندنە.

﴿وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُۥ﴾ ئەگەر مافەکە بگەڕێتەوە بۆ خەڵک، ئەوە زیانەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کەسەی دەیەوێت زیان بگەیەنێت.

﴿وَلَا تَتَّخِذُوٓا۟ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ هُزُوًا﴾ لەو کاتەی خوا ﷻ سنوورەکەی خۆی ڕوون کردەوە، بە ئەوپەڕی ڕوون کردنەوە، مەبەستیش لێی کار کردن بوو بەو زانیاریە، وە وەستان لەگەڵیو تێنەپەڕاندنی، چونکە خوای بەرز ئاوا (بەبێ مانا) دابنەبەزاندووە، بەڵکو بە هەقو ڕاستیو گرنگی پێدانەوە دایبەزاندووە، قەدەغەی کردوە گاڵتەی پێ بکرێ، کە بریتیە لە بێ حورمەتی بەرانبەریو جێبەجێ نەکردنی فەرمانەکانی، وەک بەکارهێنانی زیانو لێگرتنەوە، یان جیابوونەوە، یان زۆر جیابوونەوەو تەڵاقدان،، یان کۆکردنەوەی سێ بە یەک (هەرسێ تەڵاق بەیەکەوە)، خوا بە بەزەیی خۆی کردوویەتیە یەک بە دوای یەک، بە بەزەیی پیا هاتنەوەیە پێیو کۆشش لە پێناو بەرژەوەندیەکان.

﴿وَٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ﴾ بە گشتی ستایشو پیا هەڵدان بە زمانەو دان پیادانانیش بە دڵ، وە بە کارهێنانی ئەندامەکانی لاشە لە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خوا.

﴿وَمَآ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْحِكْمَةِ﴾ واتە: (قورئان)و فەرموودە، ئەو دووانە ڕێی چاکیان

بۆ ڕوونکردوونەتەوەو هانیشیان داون، وە لە ڕێگە خراپەکانیش ئاگاداریان کردوونەتەوە، (خوا) خۆی پێناساندوون، ڕووداوەکانی دەربارەی دۆستو دوژمنەکانی بۆ باس کردوون، ئەوەی نەتان دەزانی فێری کردوون.

وتراویشە، مەبەست لە: حیکمەت نهێنیەکانی یاساو شەریعەتە، (قورئان) بڕیارو حوکمی تێدایە، حیکمەتیش ڕوونکردنەوەی دانایی خوایە دەربارەی فەرمانەکانو قەدەغەکراوەکانی، هەردوو ماناکە تەواوو دروستن، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿يَعِظُكُم بِهِۦ﴾ واتە: ئەوەی کە دایبەزاندووە بۆ سەرتان، ئەمە ئەوە بەهێز دەکات کە مەبەست لە: حیکمەت نهێنیەکانی شەریعەتە، چونکە ئامۆژگاری بە ڕوونکردنەوەی حوکمو دانایی دەبێ، وە هاندانە، یان ترساندنە، حوکم کردن پێی، نەزانین ناهێڵێ، حیکمەتیش لەگەڵ هاندانا حەزو دڵ بۆچوون پێویست دەکات، حیکمەتیش لەگەڵ ترساندن، ترس پێویست دەکات.

﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ (خۆپارێزی بکەن) لە هەموو کاروبارەکانتاندا ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ﴾ لەبەر ئەمەیە ئەو بڕیارو حوکمانەی بۆتان ڕوونکردۆتەوە بەوپەڕی ڕوونکردنەوە، کە (بڕیارو حوکمەکان) لەگەڵ بەرژەوەندیەکان دەڕۆن، لە هەموو کاتو شوێنێکدا، سوپاسو ستایشو منەت کردن هەر بۆ خوایە.

(٢٣٢): ﴿وَإِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغۡنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا تَعۡضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحۡنَ أَزۡوَٰجَهُنَّ إِذَا تَرَٰضَوۡاْ بَيۡنَهُم بِٱلۡمَعۡرُوفِۗ ذَٰلِكَ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ مِنكُمۡ يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۗ ذَٰلِكُمۡ أَزۡكَىٰ لَكُمۡ وَأَطۡهَرُۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ٢٣٢﴾:

ئەمە دواندنە بۆ بەخێوکەرو بەرپرسیاری ئافرەتی تەڵاقدراو بە کەمتر لە سێ (تەڵاق)، ئەگەر لە ماوەی چاوەڕوانی (عدة) دەرچوو، هاوسەرەکەی ویستی هاوسەرگیری لەگەڵ بکاتەوە، ئەویش ڕازی بوو بەوە، بۆ بەرپرسی ئافرەتەکە دروست نیە قەدەغەی بکات، چ باوکی بێت، یان جگە لەو. واتە: ڕێگریی بکات لە هاوسەرگیری لەگەڵ (پیاوەکەی) وەک توورەیی‌و پەست بوون لێی‌و بێز بوونەوەو بێزاری لەو کارەی کە کردویەتی لە تەڵاقی یەکەم.

باسی کردوە ئەوەی بڕوای بە خواو ڕۆژی دوایی هەبێت، بڕواکەی ڕێگری دەکات لە نەهێشتنی شووکردنەوەی ژنەکە بە پیاوەکەی خۆی، بە ڕاستی ئەوە (قەدەغە نەکردن لە شوکردنەوەی) باشترە بۆ ئێوەو پاکو خاوێنترە، لەوەی کە بەرپرسی ئافرەتەکە گومانی ئەوە دەبات کە نەهێشتنی هاوسەرگیری (لەگەڵ هاوسەرەکەی) بۆچوونێکی چاکو گونجاوە، لە بەرانبەر تەڵاقی یەکەم ڕێگری لێدەکات بە شووکردنەوە پێی، وەک چۆن کاری لووت بەرزەکانو خۆ بەزل زانەکانە.

جا ئەگەر گومانی ئەوە بیات کە بە ڕاستی پەرژەوەندی لەوەدایە هاوسەرگیری لەگەڵدا نەکاتەوە ئەوە خوا ﴿يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ (واتە: خوا دەزانیو ئێوە نایزانن) پابەندن بە فەرمانی ئەوەی زانایە بە بەرژەوەندیەکانتان، ئەوەی بۆتانی دەوێتو بە توانایە بەسەریاندا، ئاسانکار بۆیان لەو ڕووەوە کە دەیزانن یان جگە لەو ڕووەشەوە.

لەم دەقەدا بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی کە هەر دەبێ بەرپرس لە مارەبڕیندا هەبێ، لەبەر ئەوە قەدەغەی کردوە لە ڕێگریکردنی بەرپرس (ولی)ەکان لە نەهێشتنی بە شوودان، وە قەدەغەیان ناکات مەگەر لەکاروبارێک کە بریتی بێ لەوەی لە ژێر دەستەڵاتی ئەوانەو ئەوان مافیان تێدا هەیە.

پاشان خوا فەرموویەتی:

(٢٣٣): ﴿وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ ۚ وَعَلَى ٱلْمَوْلُودِ لَهُۥ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ لَا تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلَّا وُسْعَهَا ۚ لَا تُضَآرَّ وَٰلِدَةٌۢ بِوَلَدِهَا وَلَا مَوْلُودٌ لَّهُۥ بِوَلَدِهِۦ ۚ وَعَلَى ٱلْوَارِثِ مِثْلُ ذَٰلِكَ ۗ فَإِنْ أَرَادَا فِصَالًا عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا ۗ وَإِنْ أَرَدتُّمْ أَن تَسْتَرْضِعُوٓا۟ أَوْلَٰدَكُمْ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِذَا سَلَّمْتُم مَّآ ءَاتَيْتُم بِٱلْمَعْرُوفِ ۗ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢٣٣﴾﴾

﴿وَٱلْوَٰلِدَٰتُ﴾ ئەم هەواڵە بە مانای فەرمان دێت، دابەزاندنێکە لە جێگای فەرمان پێ دراوە کە پێویست بە فەرمان ناکات، بەوەی ﴿يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ﴾ (واتە: دوو ساڵ منداڵەکانیان شیر دەدەن).

لەبەر ئەوەی سوڕانەوە (الحول) بە تەواوی ساڵ دادەنرێ، وە لەسەر هەموو سووڕانەوە، فەرموویەتی: ﴿كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ﴾ ئەگەر شیرەخۆر دوو ساڵی تەواو کرد، ئەوە شیر خواردنەکەی تەواو بووە، پاشان شیرەکە لە دوای ئەوەوە وەک سەرجەم خۆراکەکانی لێدێت، لەبەر ئەوەشە شیردان لە دوای دوو ساڵ ڕەچاو ناکرێت بۆ حەرام کردن.

لەم دەقەوە ئەوە وەردەگیرێت، وە لە فەرموودەی خوا ﷻ ﴿وَحَمْلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهْرًا ﴿١٥﴾﴾ الأحقاف. بە ڕاستی کەمترین ماوەی هەڵگرتنی کۆرپەلە لە منداڵدان شەش مانگە، دەگونجێ بوونی منداڵ بەو ماوەیە.

﴿وَعَلَى ٱلْمَوْلُودِ﴾ واتە: باوک ﴿رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ ئەمە گشتگیرە ئەگەر لە منداڵدانیدا کۆرپەلەی هەڵگرتبێ، یان تەڵاق درابێ، لەسەر باوکیەتی (باوکی کۆرپەلەکە) ڕۆزی ئافرەتەکە بدات، لەبژێوی ژیانو جلو بەرگو سەرجەم پێویستیەکان .

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەگەر کۆرپەلە لەسکی دایکی بێ کرێی بۆ پێویست نیە جگە لە

بەخێوکردنو بژێوی ژیانو جلو بەرگ دابین کردن، هەر کەسەو بە گوێرەی حاڵو گوزەرانیەتی، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿لَا تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلَّا وُسْعَهَا﴾ لە سەر هەژار پێویست نیە لە دابین کردنی بژێویدا، وەک دەوڵەمەند هاوکاری بکات، ئەوەش بەخێوکردنو دابینکردنی بژێوی ناخرێتە سەر، کە هیچی نیە تاکو دەیبێ.

﴿لَا تُضَآرَّ وَٰلِدَةٌۢ بِوَلَدِهَا وَلَا مَوْلُودٌ لَّهُۥ بِوَلَدِهِۦ﴾ واتە: ڕێگەپێدراو حەڵاڵ نیە دایکی منداڵ بە هۆی منداڵەکەی زیانی پێ بگات، یان قەدەغە بکرێت لە شیردانی منداڵەکەی، یان بژێوی پێی نەدرێ لەسەر ئەوەی کە بۆی پێویست کراوە، لە بە خێوکردنو دابین کردنی بژێوی ژیانو جلو بەرگ کردن، یان کرێی ﴿وَلَا مَوْلُودٌ لَّهُۥ بِوَلَدِهِۦ﴾ بەوەی دایکی منداڵەکە قەدەغە بکرێ لە شیردانی لە ڕووی زیان گەیاندن بە منداڵەکەی، یان دایکەکە زیاد لە پێویست داوا بکات، وە هاوشێوەی ئەوەش لە جۆرەکانی زیانگەیاندن.

فەرموودەی خوا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ﴿مَوْلُودٌ لَّهُۥ﴾ منداڵ بۆ باوکیەتی، چونکە بەو بەخشراوەو لە بەدەستهێنانی ئەوە، لەبەر ئەوەیە دروستە ماڵو سامانی منداڵەکەی ببات، پێی ڕازی بێ یان ڕازی نەبێ، بە پێچەوانەی دایک.

فەرموودەی خوا ﴿وَعَلَى ٱلْوَارِثِ مِثْلُ ذَٰلِكَ﴾ واتە: لەسەر میراتگرانی منداڵەکەیە ئەگەر باوک نەبوو، منداڵەکەش ماڵو سامانی نەبوو، نموونەی ئەوەی لەسەر باوکی بووە لە بەخێوکردنو دابین کردنی بژێوی ژیان بۆ شیردەر جلو بەرگ کردنی، وە بەڵگەشە لەسەر ئەوەی میراتگری دەوڵەمەندی هەبوو، نزیکانی هەژارو نەدار بەخێو بکات ﴿فَإِنْ أَرَادَا﴾ واتە: دایکو باوک ﴿فِصَالًا﴾ لە شیر برینەوەی پێش دوو ساڵ ﴿فِصَالًا عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا﴾ بە ڕەزامەندی هەردووکیان ﴿وَتَشَاوُرٍ﴾ ڕاوێژ کردن بە یەکتر لە نێوانیان، ئایا ئەوە بەرژەوەندی تێدایە بۆ منداڵەکە یان نا؟ ئەگەر بەرژەوەندی تێدابوو، وە هەردووکیشیان ڕازی بوون، ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا﴾ (واتە گوناهیان لەسەر نیە) لە شیر برینەوەی لە پێش دوو ساڵ.

بە پێی تێگەیشتن لە دەقەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەگەر یەکێکیان ڕازی بوون جگە لەوەی دیکە، یان بەرژەوەندی منداڵەکەی تیادا نەبوو، ئەوە دروست نیە لە شیر ببڕێتەوە.

فەرموودەی خوا: ﴿وَإِنْ أَرَدتُّمْ أَن تَسْتَرْضِعُوٓا۟ أَوْلَٰدَكُمْ﴾ واتە: شیردەریان بۆ داوا بکەن، جگە لە دایکەکانیان بەبێ ئەوەی زیانیان پێ بگات، ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِذَا سَلَّمْتُم مَّآ ءَاتَيْتُم بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ واتە: بۆ شیردەرەکان ﴿وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ پاداشتو تۆڵەتان لەسەر ئەوە دەداتەوە بە چاکەو خراپە.

وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ
أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا ۖ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ
فِيمَا فَعَلْنَ فِىٓ أَنفُسِهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ
(٢٣٤) وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُم بِهِۦ مِنْ خِطْبَةِ ٱلنِّسَآءِ
أَوْ أَكْنَنتُمْ فِىٓ أَنفُسِكُمْ ۚ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ سَتَذْكُرُونَهُنَّ
وَلَٰكِن لَّا تُوَاعِدُوهُنَّ سِرًّا إِلَّآ أَن تَقُولُوا۟ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ۚ
وَلَا تَعْزِمُوا۟ عُقْدَةَ ٱلنِّكَاحِ حَتَّىٰ يَبْلُغَ ٱلْكِتَٰبُ أَجَلَهُۥ ۚ
وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ فَٱحْذَرُوهُ ۚ وَٱعْلَمُوٓا۟
أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ (٢٣٥) لَّا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ
مَا لَمْ تَمَسُّوهُنَّ أَوْ تَفْرِضُوا۟ لَهُنَّ فَرِيضَةً ۚ وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى
ٱلْمُوسِعِ قَدَرُهُۥ وَعَلَى ٱلْمُقْتِرِ قَدَرُهُۥ مَتَٰعًۢا بِٱلْمَعْرُوفِ ۖ حَقًّا عَلَى
ٱلْمُحْسِنِينَ (٢٣٦) وَإِن طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ
فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ إِلَّآ أَن يَعْفُونَ
أَوْ يَعْفُوَا۟ ٱلَّذِى بِيَدِهِۦ عُقْدَةُ ٱلنِّكَاحِ ۚ وَأَن تَعْفُوٓا۟ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ۚ
وَلَا تَنسَوُا۟ ٱلْفَضْلَ بَيْنَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ (٢٣٧)

**(٢٣٤):** ﴿ وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا ۖ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا فَعَلْنَ فِىٓ أَنفُسِهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ (٢٣٤) ﴾

﴿ وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا ﴾ واتە: ئەگەر مێردەکەی مرد ژنەکەی چوار مانگو دە ڕۆژ دەمێنێتەوەو چاوەڕوان دەبێ، ئەوە پێویست (واجب) ە، حیکمەتیش لەوەدا ئەوەیە تا هەڵگرتنی کۆرپەلە لە منداڵدان لە ماوەی ئەو چوار مانگەدا دەردەکەوێت، لە سەرەتایی مانگی پێنجەم دەجوڵێ، ئەمە گشتییە تایبەت کراوە بە ئەو ئافرەتانەی کۆرپەلەیان لە سکدایە ماوەی چاوەڕوانیان بە دانانی کۆرپەلەکەیە کە لە منداڵدان هەڵیان گرتبوو.

هەروەها کەنیزەکیش ماوەی چاوەڕوانکردنیان نیوەی چاوەڕوانی ئافرەتی ئازادە، دوو مانگو پێنج ڕۆژە.

وە فەرموودەی خوا: ﴿ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ ﴾ واتە: ماوەی چاوەڕوانی (عدة)یان تەواو بوو ﴿ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا فَعَلْنَ فِىٓ أَنفُسِهِنَّ ﴾ واتە: بگەڕێنەوە بۆ خۆڕازاندنەوەو بۆن خۆش کردنی خۆیان ﴿ بِٱلْمَعْرُوفِ ﴾ واتە: لەسەر شێوەیەک دوور لە حەڕامو ناپەسند. لەمەدا پێویستی تازیەداری هەیە لە ماوەی چاوەڕوانی (عدة) بۆ ئەو ژنەی مێردی مردووە، جگە لەوانەی تەڵاقدراونو جیابونەتەوە، ئەوە کۆ دەنگی لەسەرە لە نێو زانایان. ﴿ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴾ واتە: زانایە بە کردەوەکانتان ئاشکراو نهێنیو ڕواڵەتو نادیارەکان پاداشتان دەدات لەسەری.

لە دواندنی خوا بۆ بەرپرسو بەخێوکەران بە فەرموودەی خۆی دەفەرموێ: ﴿ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا فَعَلْنَ فِىٓ أَنفُسِهِنَّ ﴾ بەڵگە لەسەر ئەوەی کە بەخێوکەرو بەرپرس تەماشای

ئافرەتەکـە دەکات، ئـەو کارەی کـە زیانی هەیە بـۆی لێی قەدەغـە دەکات، ناچاری دەکات لەسـەر ئەوەی پێویسـتە، ئەو بەو شـێوە دوێندراوەو پێویسـتە لەسەری.

(٢٣٥): ﴿ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُم بِهِۦ مِنْ خِطْبَةِ ٱلنِّسَآءِ أَوْ أَكْنَنتُمْ فِىٓ أَنفُسِكُمْ ۚ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ سَتَذْكُرُونَهُنَّ وَلَٰكِن لَّا تُوَاعِدُوهُنَّ سِرًّا إِلَّآ أَن تَقُولُوا۟ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ۚ وَلَا تَعْزِمُوا۟ عُقْدَةَ ٱلنِّكَاحِ حَتَّىٰ يَبْلُغَ ٱلْكِتَٰبُ أَجَلَهُۥ ۚ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ فَٱحْذَرُوهُ ۚ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿٢٣٥﴾ ﴾:

ئەمـە بڕیـارو حوکمـی چاوەڕوانـکارە کـە مێردەکـەی مردبێ، یـان ئەوانـەی (جیابوونەوە لێـی بـە جیابوونـەوەی یەک یـان دوو تەڵاق) لـە ژیانـدا، حەرامە لەسـەر جگە لـە مێردی جیابـووەوە لێـی، بـە ڕاشـکاوانە داخـوازی بـکاتو لـێ بچێتـە پێـش، ئـەوە مەبەسـت لە فەرمودەکـەی: ﴿ وَلَٰكِن لَّا تُوَاعِدُوهُنَّ سِرًّا ﴾ بـەڵام ئامـاژە بۆ کردن، خـوا ﷻ گوناهی تیـادا هەڵگرتووە.

جیـاوازی لـە نێـوان بـە ڕاشـکاویو ئامـاژە بۆ کـردن ئەوەیـە کـە ڕاشـکاوی (التصریح): جگـە لـە مانـای هاوسـەرگیری هیچی تـر ناگەیەنـێ، لەبـەر ئـەوە قەدەغە کـراوە نەوەک پەلـە بـکاتو درۆ لە تـەواو بوونـی مـاوەی چاوەڕوانی (عدة) کەیـدا بکات، بـە هۆی حەز کردنـی لە شـوو کردن.

وە بەڵگـەی تێدایـە لەسـەر حەرامکردنی بـەکار هێنانی ئامـرازو هۆکارەکانی حـەرام کراو، وە دابیـن کردنـی مافـی هاوسـەری یەکـەم، بـە بەڵێـن نەدانـی بـۆ جگـە لەئەو لـە ماوەی چاوەڕوانـی (عدة) کەیدا.

بـەڵام ناڕاسـتەوخۆ (التعریض): ئـەوە نیکاحو هاوسـەرگیریو جگە لە ئەویـش دەگرێتەوە، ئـەوە دروسـتە بۆ هاوسـەری جیابـووەوە بە یەک یـان دوو تـەڵاق، وەک ئەوەی پێـی بڵێ: مـن دەمەوێـت هاوسـەرگیری بکـەم، من حەز دەکـەمو پێم خۆشـە پرسو ڕام پـێ بکەیت لـە کاتـی تەواوبوونـی مـاوەی چاوەڕوانـی (عدة) کـەت، ئەمانـەو نموونەی ئـەوەش، ئەوە دروسـتە، چونکـە وەکـو ڕاشـکاوی (صریـح)ی نیە، نـاخو دڵەکانیـش بانگەشـەی بەهێزی بـۆ دەکەن.

هەروەهـا شـاردنەوەی مـرۆڤ لـە نـاخو دەروونی خـۆی کە هاوسـەرگیری بـکات لەگەڵ ئـەو ئافرەتـەی کە لـە چاوەڕوانی (عـدة) دایە، ئەگـەر چاوەڕوانـیو (عدة) کـەی تەواوبێ، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ أَوْ أَكْنَنتُمْ فِىٓ أَنفُسِكُمْ ۚ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ سَتَذْكُرُونَهُنَّ ﴾

ئـەم درێـژە پێدانـە هەمووی لـە پێشـەکیەکانی گرێبەسـت (عقد)ەکەیە.
بـەڵام بەسـتنی گرێبەسـتی هاوسـەرگیری ڕێگا پێـدراو حەڵاڵ نیـە، ﴿ حَتَّىٰ يَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ ﴾ واتـە: نیـازو نیەتـی چاک بکـەنو نیازی خـراپ مەکەن، ترسـتان لـە تۆڵەی خوا بـێو ئومێدتان بـە پاداشتەکەشـی هەبێ.
﴿ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ غَفُورٌ ﴾ بـۆ ئـەو کەسـەی گوناهـی لـێ ڕوودواەو تۆبـەی کـردوەو گەڕاوەتـەوە بـۆ لای پەروەردگـاری ﴿ حَلِيمٌ ﴾ پەلـەی نەکـردوە لـە تۆڵەسـەندنەوەی گوناهبـاران لەسـەر گوناهـو سـەرپێچیەکانیان، لەگـەڵ ئەوەی تواناشـی هەیە بەسـەریانەوە.
(٢٣٦): ﴿ لَّا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ مَا لَمْ تَمَسُّوهُنَّ أَوْ تَفْرِضُوا لَهُنَّ فَرِيضَةً وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى الْمُوسِعِ قَدَرُهُ وَعَلَى الْمُقْتِرِ قَدَرُهُ مَتَاعًا بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُحْسِنِينَ (٢٣٦) ﴾
﴿ لَّا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ مَا لَمْ تَمَسُّوهُنَّ أَوْ تَفْرِضُوا لَهُنَّ فَرِيضَةً وَمَتِّعُوهُنَّ ﴾ واتـە: ئـەی گەلـی هاوسـەرو (مێـردەکان) گونـاەو تاوانتـان لەسـەر نیـە بـە تەڵاقدانـی ئافرەتان پێـش بەرکەوتـن (گواسـتنەوەیان)و پێویسـت بوونـی مارەیـی، ئەگەر ئەوە شـکانیش بێت بـۆ ئافرەتەکـە، ئـەوە سـاڕێژ دەبێو چـاک دەبێتـەوە بە خۆشـی پێدانـی، لەسـەرتانە (ئەی پیـاوەکان) دڵخۆشـیان بکـەن بـەوەی هەندێـک سـامانو ماڵیـان پـێ ببەخشـن، بۆ چاک بونـەوەو دڵنەوایـی کردنی.
﴿ عَلَى الْمُوسِعِ قَدَرُهُ وَعَلَى الْمُقْتِرِ ﴾ واتە: دەست کورتو کەم دەرامەت ﴿ قَدَرُهُ ﴾.
ئەمـەش دەگەڕێتـەوە بۆ دابو نەریـت، بێگومان ئەوە جیـاواز دەبێ بە جیـاوازی حاڵەتەکان لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ مَتَاعًا بِالْمَعْرُوفِ ﴾ ئەمە هەقێکی پێویسـتە ﴿ عَلَى الْمُحْسِنِينَ ﴾ بۆیان نیـە لێیانی کـەم بکەنەوە.
هەروەکـو چۆن بـوون بە هـۆکاری دڵخۆشـیانو دڵ پەیوەسـت کردنیان، لە پاشـان ئەوەی دڵیـان تێچو بـوو پێیان نەبەخشـین، لەسـەریانە لە بەرانبـەر ئەوە دڵخۆشـیان بکەن.
ئـەی خوایـە چەنـد جوانە ئـەو بڕیـارو حوکمـە خواییە، کـە بەڵگەیـە لەسـەر کار لەجێیو دانایـی بـە شـەرع دانەرەکەیـیو بەزەیی ئـەو پەروەردگارە!! کـێ هەیە حوکـمو بڕیاری لە خـوا چاکتـرو جوانتر بێ بـۆ خەڵکانـێ کە دڵنیایـی تەواویان هەیـە، ئەمە حوکمـی ئافرەتە تەڵاقدراوەکانـە پێـش دەسـت لێـدانو بەرکەوتن، یان پێـش ئـەوەی مارەییان بێ.
پاشـان باسـی بڕیـارو حوکمی پێویسـت کراوی کـرد بۆیان، دەربـارەی ئەو بەشـەی بۆیان دیارو پێویسـت کـراوە، فەرمووی:

(٢٣٧): ﴿ وَإِن طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ إِلَّآ أَن يَعْفُونَ أَوْ يَعْفُوَاْ ٱلَّذِى بِيَدِهِۦ عُقْدَةُ ٱلنِّكَاحِ ۚ وَأَن تَعْفُوٓاْ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ۚ وَلَا تَنسَوُاْ ٱلْفَضْلَ بَيْنَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢٣٧﴾ ﴾

خوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِن طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ إِلَّآ أَن يَعْفُونَ ﴾واتـە: ئەگـەر ئافرەتانتـان تەڵاقـدا پێـش بەرکەوتنیـانو دوای مـارە برینیـان، بـۆ تەلاقدراوەکانە نیـوەی مارەیی پێویسـت هەیە، وە نیوەشـی بـۆ ئێوەیە. ئـا ئەمـە پێویسـتە ئەگـەر لێ خـۆش بـوونو لێبوردنی نەیەتـە نـاوی، بـەوەی (ئافرەتەکە) لـە نیوەکـەی خـۆی خۆش بێـت بۆ هاوسـەرەکەی، ئەگـەر لێ خـۆش بوونەکەی ڕاسـتو دروسـت بێت ﴿ أَوْ يَعْفُوَاْ ٱلَّذِى بِيَدِهِۦ عُقْدَةُ ٱلنِّكَاحِ ﴾ ئەوە مێردو هاوسـەرە لەسـەر (ڕای) دروسـت، چونکـە ئەوە هەڵوەشـاندنەوەی گرێبەسـتەکەی بەدەسـتە، وە لەبەر ئـەوەی (ولی) بەخێوکـەر دروسـت نیە ببەخشـی لـەوەی کە پێویسـتە بۆ ئافـرەت، چونکە ئـەو نەخاوەنەو نەبریکارە.

پاشـان هانیداوە بۆ بەخشـین (عفـو)، ئەوەی ببەخشـێ نزیکترە لە خۆپارێزیو لەخواترسـان، لەبـەر ئەوەی چاکەیەکـە دڵ فراوانی پێویسـت دەکات، وە لەبەر ئەوەش مـرۆڤ نابێ خۆی کەمتەرخـەم بـکات لەچاکـەو باشـە، چاکە لـە بیربکات کـە بریتیە لـە بڵندتریـن پلەکانی مامەڵـەو هەڵـسو کـەوت، چونکـە هەڵسو کـەوتو مامەڵـەی خەڵکـی لەنێـوان یەکتردا لەسـەر دوو پلەیـە: یـان دادوەریو ویـژدان پێویسـتە، بریتیـە لـە وەرگرتنـی پێویسـتو بەخشـینی پێویسـت، یـان پلـەداریو چاکەیـە بریتیە لە بەخشـینێک کـە پێویسـت نیە، وە لـێ بـوردن لەمافـەکانو چـاو پۆشـی لەوەی لـە ناخدایـە، نابێ بۆ مـرۆڤ ئەو پلـەو پایە لە یـاد بـکات، ئەگـەر لـە هەندێـک کاتیشـدا بێت، بـە تایبەتـی ئەگەر لـە نێوانی تـۆو ئەودا مامەڵـەو هەڵسـو کەوت، یان تێـکلاوی هەبوو، بێگومـان خوا پاداشـت دەرەوەی چاکەکارانە بە پلەدارکـردنو ڕێزو بەخشـین، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتـی: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾ (واتـە: بە ڕاسـتی خوا بینـەرە بـەوەی دەیکەن).

حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ
قَٰنِتِينَ ﴿٢٣٨﴾ فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالًا أَوْ رُكْبَانًا فَإِذَآ أَمِنتُمْ
فَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَمَا عَلَّمَكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ تَعْلَمُونَ
﴿٢٣٩﴾ وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا
وَصِيَّةً لِّأَزْوَٰجِهِم مَّتَٰعًا إِلَى ٱلْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ فَإِنْ
خَرَجْنَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِى مَا فَعَلْنَ فِىٓ أَنفُسِهِنَّ
مِن مَّعْرُوفٍ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٤٠﴾ وَلِلْمُطَلَّقَٰتِ مَتَٰعٌ
بِٱلْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٢٤١﴾ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ
ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢٤٢﴾ أَلَمْ تَرَ
إِلَى ٱلَّذِينَ خَرَجُواْ مِن دِيَٰرِهِمْ وَهُمْ أُلُوفٌ حَذَرَ ٱلْمَوْتِ
فَقَالَ لَهُمُ ٱللَّهُ مُوتُواْ ثُمَّ أَحْيَٰهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضْلٍ
عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٢٤٣﴾
وَقَٰتِلُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٤٤﴾ مَّن
ذَا ٱلَّذِى يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ أَضْعَافًا
كَثِيرَةً وَٱللَّهُ يَقْبِضُ وَيَبْصُۜطُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٤٥﴾

**(٢٣٨-٢٣٩):** ﴿حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ ﴿٢٣٨﴾ فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالًا أَوْ رُكْبَانًا فَإِذَآ أَمِنتُمْ فَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَمَا عَلَّمَكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٣٩﴾﴾:

**پاشان خوا فەرموویەتی: ﴿حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ﴾ خوا فەرمان دەكات بە پارێزكاری كردن لە نوێژەكان بە گشتیو لەسەر نوێژی ناوەڕاست بەتایبەتی، ئەویش نوێژی عەسرە، پارێزكاری لەسەر كردنی، وە ئەنجامدانی لە كاتی خۆیدا بە جێبەجێكردنی مەرجو كۆڵەكەو دڵكەچی كردنەوە، وە هەموو ئەوانەی كە پێویستو سوننەتە.**

**بە پارێزكاریش لەسەر نوێژەكان، پارێزكاری لەسەر تێكرای پەرستشەكان دێتە بەرهەم، وە سوودی قەدەغەكردن لە خراپەو تاوان بە دەست دێت، بەتایبەت ئەگەر بە تەواوی بكرێ، وەك فەرمانكراوە بە فەرموودەی خوا: ﴿وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ﴾ واتە: خۆ بەكەم گرتنو زەلیلیو ملكەچیەوە، فەرمانی بەهەڵسانو پاڕانەوەو قەدەغە لە قسەو وتنی تیادایە، وە فەمان بە ملكەچی، ئەمەش لەگەڵ ئاسودەیىو دڵنیایی.**

**﴿فَإِنْ خِفْتُمْ﴾ باسی ئەوەی نەكردوە كە لێی دەترسێ، تا ترسان بێبڕواو ستەمكارو درندە بگرێتەوە جگە لەوانەش لەجۆرەكانی ترسان لێی، واتە: ئەگەر ترسان بەو نوێژەتانەوە لەسەر ئەو وەسفەیە، ئەوە نوێژ بكەن ﴿فَرِجَالًا﴾ واتە: لەسەر پێیەكانتان (بوەستن) ﴿أَوْ رُكْبَانًا﴾ لەسەر وڵاخو وشترو جگە لەوانیش. ئەمە ڕوو كردنە ڕووگەو ڕووتێنە كردنی پێویست دەكات، لەمەشدا زێدە پێداگری هەیە لەسەر پارێزكاری لە كاتەكەی، فەرمانی بەوە كردوە ئەگەر لەگەڵ كەمو كورتی كردن بەزۆرێك لە كۆڵەكەدا (ركن)و مەرجەكانی، بێگومان دروست نیە لەكاتی خۆی دوابخرێ، ئەگەر لە حاڵو باری ناڕەحەتیشدا بێ، نوێژەكەی لەسەر ئەو وێنەیە جوانترو چاكترە، بەڵكو**

لـەوە باشـترە لـە دەرەوەی کاتەکەی ئەنجامـی بدات بـە لەسـەرخۆیی‌و دڵنیاییەوە ﴿ فَإِذَآ أَمِنتُمۡ ﴾ واتـە: ترسـتان لەسـەر نەمـا ﴿ فَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ ﴾ ئەمـە هەمـوو جۆرەکانـی یاد (زکـر) دەگرێتـەوە، لەوانـەش نوێژ بـە تەواوی.

﴿ كَمَا عَلَّمَكُم مَّا لَمۡ تَكُونُواْ تَعۡلَمُونَ ﴾: ئـەوە نـازو نیعمەتێکـی مـەزن‌و منەتێکـی گەورەیـە، دەخـوازێ، لـە بەرانبـەری یـاد (زکـر) سوپاسـگوزاری (شـکر) بکرێـت، تـا نیعمەتەکـە لەسـەرتان بمێنێتـەوەو لەسـەرتان زیـاد بکرێـت.

(٢٤٠): ﴿ وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوۡنَ مِنكُمۡ وَيَذَرُونَ أَزۡوَٰجٗا وَصِيَّةٗ لِّأَزۡوَٰجِهِم مَّتَٰعًا إِلَى ٱلۡحَوۡلِ غَيۡرَ إِخۡرَاجٖۚ فَإِنۡ خَرَجۡنَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ فِي مَا فَعَلۡنَ فِيٓ أَنفُسِهِنَّ مِن مَّعۡرُوفٖۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴿٢٤٠﴾ ﴾:

﴿ وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوۡنَ مِنكُمۡ وَيَذَرُونَ أَزۡوَٰجٗا ﴾ واتـە: ئـەو هاوسـەرانەی کـە دەمـرن‌و هاوسـەرەکانیان لەدوای خۆیان جێ دەهێڵن، پێویسـتە لەسـەریان وەسـیەت بکەن ﴿ وَصِيَّةٗ لِّأَزۡوَٰجِهِم مَّتَٰعًا إِلَى ٱلۡحَوۡلِ غَيۡرَ إِخۡرَاجٖ ﴾ واتـە: وەسـیەت بکـەن کـە پابەنـدی ماڵەکانیـان بـن مـاوەی سـاڵێک، دەرنەچـن لێـەوە ﴿ فَإِنۡ خَرَجۡنَ ﴾ لەخۆیانـەوە ﴿ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ ﴾ ئـەی بەرپـرس‌و بەخێوکەرانیـان ﴿ فِي مَا فَعَلۡنَ فِيٓ أَنفُسِهِنَّ مِن مَّعۡرُوفٖۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴾، واتـە: لـە گـەڕان‌و خۆڕازاندنەوەو بـۆن خۆش کردن‌و نموونـەی ئەوانـەش، زۆرینـەی ڕاڤەکارانـی قورئـان ڕایـان وایە ئـەو دەقەکـە فەرمانەکەی هەڵوەشـاوەتەوە نەسـخ کـراوە بـەم دەقـەی پێـش خـۆی کـە بریتیە لـە فەرمـوودەی خوا: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوۡنَ مِنكُمۡ وَيَذَرُونَ أَزۡوَٰجٗا يَتَرَبَّصۡنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرۡبَعَةَ أَشۡهُرٖ وَعَشۡرٗا ﴿٢٣٤﴾ ﴾البقرة. وە وتـراوە: هەڵینەوەشـاندوەتەوەو نەسـخی نەکـردوە، بەڵکـو دەقـی یەکەم بەڵگەیە لەسـەر ئـەوەی چـوار مانـگ‌و دە ڕۆژ پێویسـتە، ئەوەی لەسەریشـی زیـاد بکرێت ئەوە ویسـتراوە (مسـتحب) دەبێ بکرێ بۆ تەواو کردنی مافی هاوسـەرو مێردەکـەی، وە لەبەر ڕەچاو کردنی ئافرەتـە هاوسـەرەکە، بەڵگـەش لەسـەر ئـەوەی کـە ئەوە ویسـتراو (مسـتحب)ە، ئـەو لێرە گوناهـی لەسـەر بەرپـرس‌و بەخێوکـەر ڕەتکردوەتـەوە ئەگـەر (ئافرەتـە هاوسـەرەکان) دەربچـن پێـش تەواوکردنی سـاڵەکەی، ئەگـەر پابەند بوونـی‌و مانەوە لە شـوێنی حەوانەوەو ماڵەکـەی پێویسـت بوایـە، ئـەوە گوناهی لا نـەدەدا لە سـەر خاوەنەکان.

(٢٤١-٢٤٢): ﴿ وَلِلۡمُطَلَّقَٰتِ مَتَٰعُۢ بِٱلۡمَعۡرُوفِۖ حَقًّا عَلَى ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٢٤١﴾ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴿٢٤٢﴾ ﴾:

﴿ وَلِلْمُطَلَّقَٰتِ مَتَٰعُۢ بِٱلْمَعْرُوفِۖ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ﴾ واتـە: هەمـوو تەلاقدراوێـک مافی هەیـە بەسـەر مێردەکەیـەوە بەهرەمەنـدی بـکات بەباشـی، لـە مـاڵو کـەلو پـەل (متاع)، مافـە بەسـەر هەمـوو خۆپارێـزو لەخوا ترسـێک، ئـەم بەهرەمەندیە پێویسـتە بۆ ئـەو ئافرەتە تەڵاقـدراوەی پێـش جـووت بـوون لەگەڵیـدا، فەرزیـش سـوننەتە لـە مافی کەسـێکی تردا وەک لەپێشـتر باس کرا، ئەمە باشـترین قسـەیە لەوبارەیـەوە، وتراوە: بێگومـان بەهرەمەندی (متعة) پێویسـتە لەسـەر هەمـوو تەڵاقـدراوێ، بە بەڵگەی گشـتیەتی ئـەو دەقە.

بەڵکـو بنەمـا ئەوەیە کـە بەڕاسـتی (مُطْلَق) ڕەهـا دەبرێتەوە بۆ سـەر (مقیـد) بەندکراو، وە لە پێشـتر باسـکرا کـە بەڕاسـتی فـەرزی بەهرەمەندبـوون (متعة) بـۆ تەڵاقـدراوە بەتایبەتی پێـش جـووت بـوون. کاتـێ کـە خـوا ﷻ ئـەو بڕیـارو حوکمـە مەزنانـەی ڕوونکـردەوە کـە حیکمـەتو میهرەبانـیو بەزەیـی ئـەو لـە خۆ دەگـرێ، منەتـی پێیانـەوە کرد بەسـەر بەندەکانیـداو فەرموویەتی: ﴿ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ ﴾ واتە: سـنوورەکانی، وە حـەڵاڵو حەڕامکراوەکانـیو بڕیـارو حوکمـە سـود بەخشـەکان بەئێوە، بەڵکو هۆشـیان لـێ وەرگـرنو تێبگەن لێیان، وە شـارەزایان بن مەبەسـت لێیـان فێربن، بێگومان هەرکەسـێ ئـەوەی زانـی، پێویسـتە کارو کـردەوەی پێ بـکات. لە پاشـان خـوا ﷻ فەرموویەتی:

(٢٤٣-٢٤٥): ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ خَرَجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِمْ وَهُمْ أُلُوفٌ حَذَرَ ٱلْمَوْتِ فَقَالَ لَهُمُ ٱللَّهُ مُوتُوا۟ ثُمَّ أَحْيَٰهُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٢٤٣﴾ وَقَٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٤٤﴾ مَّن ذَا ٱلَّذِى يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ أَضْعَافًا كَثِيرَةًۚ وَٱللَّهُ يَقْبِضُ وَيَبْصُۜطُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٤٥﴾ ﴾:

﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ خَرَجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِمْ وَهُمْ أُلُوفٌ حَذَرَ ٱلْمَوْتِ ﴾ خـوا ﷻ چیرۆکـی ئەوانەمـان بـۆ دەگێڕێتەوە کـە دەرچوون لە شـوێنی خۆیان لەبەر زۆری ژمـارەو یەکدەنگی مەبەسـتەکانیان، ئـەوەی بووبـە هـۆی دەرچوونیـان تیایـدا ترسـی مـردنو پەتـاو تاعـون هاوشـێوەی ئـەوە بوو، مەبەسـتیان لـەو دەرچوونە سـەلامەتیو ڕزگـار بوون بوو لـە مردن، بـەڵام تـرسو خۆپاراسـتن بێنیازی نـاکات لە قـەدەری خوا.

﴿ فَقَالَ لَهُمُ ٱللَّهُ مُوتُوا۟ ﴾ مـردن ﴿ ثُمَّ ﴾ بەڕاسـتی خـوای گـەورە ﴿ أَحْيَٰهُمْ ﴾ یـان بەپاڕانـەوەی پێغەمبەرێـک، یان بـە جگە لەو، وەک بەزەیـی هاتنەوە پێیـانو میهرەبانیەک، وە ڕوونکردنـەوەی بۆ نیشـانەو بەڵگەکانی بۆ بەدیهێنراوانی بە زینـدوو کردنەوەی مردووان،

لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضْلٍ ﴾ واتـە: خـوا خاوەن بەخششـی مەزنە ﴿ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ ﴾ نـازو نیعمەتەكـە شـوكرانەیان زیـاد نـاكات، بەڵكـو بـە نـازو نیعمەتەكانـی خـوا یارمەتیـان وەرگرت لەسـەر سـەرپێچی خـواو گوناهەكانـی، كەمێك لـەوان شـوكرانە بژێر بوون، ئـەوەی نیعمەتی دەناسـیو دانی پیادادەنـا، لەپێنـاو گوێرایەڵـیو جێبەجـێ كردنـی فەرمانەكانـی خـوادا بـەكاری دەهێنـاو خەرجـی دەكرد.

پاشـان خـوا ﷻ فەرمانـی كـرد بە كوشـتاری دوژمنـی بێ بـڕوا لـە پێنـاو بەرزكردنەوەی وشـەی خـوا (لا إلـە إلا الله)و سەرخسـتنی ڕێبازو ئاینەكـەی، جـا فەرموویەتی: ﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ واتـە: نیـازو نیەتەكانتـان چـاك بكـەنو مەبەسـتتان تەنهـا خـوا بێ، وە بزانن دانیشـتن لـە جەنگو كوشـتار كردن هیچ سـودتان پێ ناگەیەنێـت، ئەگـەر گومانـی ئەوەش بـەرن كە ژیـانو مانەوەتان لە دانیشـتن دایـە، نەخێر بەوشـێوە نیـە، لەبەر ئەوەیـە سەرگوزشـتەی ڕابردوی باسـكردوە وەك ڕێخۆشـكردنێك بۆ ئـەو كارو فەرمانـە، وەك چـۆن دەرچوونـی ئەوانـە لـە ماڵەكانیـان لە ترسـی مـردن هیچ سـوودێكی پێنەگەیانـدن، بەڵكـو ئەوەی لێی دەترسـان تووشـیان بـوو بەبێ ئەوەی هەسـتی پێبكـەن، دەی بزانـن ئێـوەش هـەر بەوشـێوەن. لەبەر ئـەوەی جەنگو كوشـتار لـە ڕێگای خـوا تـەواو نابێت تەنها بە بەخشـینو خـەرج كردنی ماڵو سـامان نەبێت لە پێنـاو خوا ﷻ، فەرمانـی كـرد بە بەخشـین لەڕێگاكەیـداو هانی داون لەسـەری، وە بـە قەرز نـاوی هێناوە، فەرموویەتی: ﴿ مَّن ذَا ٱلَّذِي يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا ﴾ لە سـامانەكەی ببەخشـێ لە ڕێگاكانی چاكـە بەتایبەتـی لەجەنگو جیهـاد، وە چاك(الحسـن) بریتیە لە حەڵاڵێ كە مەبەسـت پێی لـە پێناو خـوا ﷻ بێت.

﴿ فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ أَضْعَافًا كَثِيرَةً ﴾ چاكـە بـەدە ئەوەنـدەی خـۆی تـا حـەود سـەد هێندە، بەڵكـو چەنـد ئەوەندەی زۆرتـر، بەگوێرەی حـاڵو باری بەخشـەرو نیەتەكەی، وە سـوودی بەخشـینەكەیو پـڕ كردنـەوەی پێویسـتیەك، لەبـەر ئـەوەی مـرۆڤ ڕەنگە گومانـی ئەوە ببـات كە ئەگەر ببەخشـێ هەژار دەبێ خوا ﷻ ئـەو گومانەی ڕواندوەتـەوەو ڕەتیكردوەتەوە بـە فەرمـوودەی خـۆی: ﴿ وَٱللَّهُ يَقْبِضُ وَيَبْصُۜطُ ﴾ واتـە: ڕۆزی فـراوان دەكات بۆ ئەوەی بیەوێـتو دەشـیگرێتەوە لـەوەی بیەوێـت، هەمـوو ڕەفتـارو هەڵسـوكەوتەكان بە دەسـتی ئـەوە، خولگـەی كاروبـارەكان گەڕاوەیـە بۆ لای ئـەو، دەسـت گرتـن ڕۆزی زۆرو فروان

نـاکات، بەخشـین نایگرێتـەوەو کەمـی ناکاتەوە، لەگـەڵ ئەوەش بەخشـین بەفیـرۆ ناچێت لەسـەر خاوەنەکـەی، بەڵکو لـە ڕۆژدا دەیبیننـەوە ئەوەی لەپێـش خۆیـان ڕەوانەیانکردوە بە تـەواوی‌و بە چەنـد بەرانبەر، لەبەر ئەمەیـە فەرموویەتی: ﴿وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ پاداشـتتان دەداتـەوە بـەکارو کردەوەکانتان.

ئـەم دەقانـە بەڵگـەن لەسـەر ئـەوەی هـۆکارەکان لەگـەڵ قـەزاو قـەدەردا هیـچ سـودێک ناگەیەنـن، بەتایبەتیـش ئـەو هۆکارانەی کە بە هۆیانـەوە واز لە فەرمانەکانی خـوا دەهێنرێ، وە ئەوەشـی تیادایـە: نیشـانەو بەڵگەی گـەورە بەزیندوو بوونـەوەی مردووان بەبـەر چاوەوە لـەم دونیایـە، ئەوەشـی تیادایە: فەرمان بەکوشـتارو بەخشـین لـە ڕێگای خوا، وە باسـکردنی هـۆکارەکان کـە بانگەشـە دەکـەن بـۆ ئـەوەو کـە هانـدەرن لەسـەر ئـەوە، لـە ناونانی بە قـەرزو چەنـد بەرانبـەر بوونـەوەی، بێگومان خوا بـە ویسـتی خـۆی رزق‌و ڕۆزی بەندەکان کـەم دەکاتـەوە، یـان زۆرو فراوانـی دەکات، سـەرەنجامی هەمووتـان هـەر بـۆ لای ئـەو دەگەڕێنەوە.

(٢٤٦-٢٤٨): ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلْمَلَإِ مِنۢ بَنِىٓ
إِسْرَٰٓءِيلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰٓ إِذْ قَالُوا۟ لِنَبِىٍّ لَّهُمُ
ٱبْعَثْ لَنَا مَلِكًا نُّقَٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ
قَالَ هَلْ عَسَيْتُمْ إِن كُتِبَ عَلَيْكُمُ
ٱلْقِتَالُ أَلَّا تُقَٰتِلُوا۟ ۖ قَالُوا۟ وَمَا لَنَآ أَلَّا نُقَٰتِلَ
فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَدْ أُخْرِجْنَا مِن دِيَٰرِنَا
وَأَبْنَآئِنَا ۖ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقِتَالُ تَوَلَّوْا۟
إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ
(٢٤٦) وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ قَدْ بَعَثَ
لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكًا ۚ قَالُوٓا۟ أَنَّىٰ
يَكُونُ لَهُ ٱلْمُلْكُ عَلَيْنَا وَنَحْنُ أَحَقُّ بِٱلْمُلْكِ
مِنْهُ وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِّنَ ٱلْمَالِ ۚ قَالَ إِنَّ
ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰهُ عَلَيْكُمْ وَزَادَهُۥ بَسْطَةً فِى
ٱلْعِلْمِ وَٱلْجِسْمِ ۖ وَٱللَّهُ يُؤْتِى مُلْكَهُۥ
مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ (٢٤٧) وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ ءَايَةَ مُلْكِهِۦٓ أَن
يَأْتِيَكُمُ ٱلتَّابُوتُ فِيهِ سَكِينَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَبَقِيَّةٌ مِّمَّا تَرَكَ ءَالُ مُوسَىٰ وَءَالُ
هَٰرُونَ تَحْمِلُهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ (٢٤٨)﴾:

أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلْمَلَإِ مِنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰٓ إِذْ
قَالُوا۟ لِنَبِىٍّ لَّهُمُ ٱبْعَثْ لَنَا مَلِكًا نُّقَٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ
قَالَ هَلْ عَسَيْتُمْ إِن كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ أَلَّا تُقَٰتِلُوا۟ ۖ
قَالُوا۟ وَمَا لَنَآ أَلَّا نُقَٰتِلَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَدْ أُخْرِجْنَا
مِن دِيَٰرِنَا وَأَبْنَآئِنَا ۖ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقِتَالُ تَوَلَّوْا۟
إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٤٦﴾ وَقَالَ لَهُمْ
نَبِيُّهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكًا ۚ
قَالُوٓا۟ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُ ٱلْمُلْكُ عَلَيْنَا وَنَحْنُ أَحَقُّ
بِٱلْمُلْكِ مِنْهُ وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِّنَ ٱلْمَالِ ۚ قَالَ إِنَّ ٱللَّهَ
ٱصْطَفَىٰهُ عَلَيْكُمْ وَزَادَهُۥ بَسْطَةً فِى ٱلْعِلْمِ وَٱلْجِسْمِ ۖ
وَٱللَّهُ يُؤْتِى مُلْكَهُۥ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٤٧﴾
وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ ءَايَةَ مُلْكِهِۦٓ أَن يَأْتِيَكُمُ
ٱلتَّابُوتُ فِيهِ سَكِينَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَبَقِيَّةٌ مِّمَّا
تَرَكَ ءَالُ مُوسَىٰ وَءَالُ هَٰرُونَ تَحْمِلُهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ۚ
إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٤٨﴾

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلْمَلَإِ مِنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰٓ إِذْ قَالُوا۟ لِنَبِىٍّ لَّهُمُ﴾ خـوا ﷻ سەرگوزشـتەی پیـاو ماقـوڵان دەگێڕێتەوە لە نەوەکانی ئیسـرائیل بـۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ کە ئـەوان گـەورەو پلـەدارو سـەرەگەورەکانیان بـوون، پیاو ماقـوڵو سـەرگەورەکانی تایبەت کـرد بـە باسـکردنی، چونکە لە نەریـت دایـە ئـەوان لـە بەرژەوەندیەکانیـان دەکۆڵنەوە تا لەگەڵـی ڕێـک بکـەونو جگـە لەخۆیـان شـوێن بخەن بـەوەی کە دەیبینـنو پێیان باشـە، ئـەوان چوونـە لای پێغەمبەرێکیـان ﷺ لـە دوای مووسـا ﷺو پێیـان وت: ﴿ٱبْعَثْ لَنَا مَلِكًا﴾ واتە: پاشـایەکمان بۆ دیـاری بکـە، ﴿نُّقَٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ پەرتەوازەیمان کۆبکاتـەوەو بەرەنگاریمـان پـێ بـکات بەرانبەر بـە دوژمنـەکان، ڕەنگە لەو کاتەدا سـەرو سـەرۆکێکیان نەبووبـێ کۆیان بکاتـەوە، هەروەکو نەریتـی تیرەکانی خـاوەن ماڵەکان بوو، هیـچ ماڵـێ ڕازی نەدەبوو کە سـەرۆک لە ماڵەکەی تربێـت، داوایان لـە پێغەمبەرەکەیان ﷺ

کـرد پادشـایەکیان بۆ دیـاری بـکات هەردولاکە پێـی ڕازی بن، دیاریکردنەکـەش تایبەت بێـت بـە نەریتەکانیـان، پێغەمبـەران نەوەکانـی ئیسـرائیل سەرپەرشـتیان دەکـردن، هەرکە پێغەمبەرێکیـان ﷺ بمردبـا پێغەمبەرێکـی تر لە دوایـەوە جێ دەما، لەوکاتەی ئەو قسـەیان بـە پێغەمبەرەکەیـان ﷺ وت ﴿ قَالَ ﴾ کـە پێیانـی وت پێغەمبەرەکەیـان ﷺ ﴿ هَلْ عَسَيْتُمْ إِن كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ أَلَّا تُقَاتِلُوا قَالُوا ﴾ واتـە: ڕەنگـە داوای شـتێک دەکـەن ئەگـەر لەسـەرتان بنوسـرێو دابنـرێ پێیـەوە هەڵناسـن، وازهێنانی بۆیان پێشـنیار کـرد بـەڵام ئـەوان وەریـان نەگرت، پشـتیان بەسـتو پێیـان داگرت لەسـەر سـوربوونو نیـازو نیەتەکەیـانو وتیـان: ﴿ وَمَا لَنَا أَلَّا نُقَاتِلَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَقَدْ أُخْرِجْنَا مِن دِيَارِنَا وَأَبْنَائِنَا ﴾ واتـە: چ شـتێک قەدەغەمـان دەکات لە کوشـتار، بێگومـان ناچارکراوین بۆی، بـەوەی لـە نیشـتیمانمان دەرکراویـن منداڵەکانمـان بـە کۆیلە بـراون، ئەمە ئەوە پێویسـت دەکات کـە کوشـتار بکەین، ئەگـەر لەسەریشـمان پێویسـت نەکرابێو نەنووسـرابێ، چۆن لەگـەڵ ئەوەی پێویسـتیش کراوە لەسـەرمان ئەوەی بـوە بوە، لەبەر ئەوەی نیـازو نیەتەکانیان بـاش نەبـوو، پشـت بەسـتنیان بـە پەروەردگاریـان بەهێـز نەبـوو ﴿ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ الْقِتَالُ تَوَلَّوْا ﴾، ترسـان لـە کوشـتاری دوژمنـان، لاواز بـوون لـە ڕووبـەڕوو بوونـەوە، ئەوەی سـوربوون لەسـەری نەما، ترسـنۆکیو ڕووخاوییو بـێ وورەیی بەسـەر زۆربەیان زاڵ بـوو دایگرتبوون، ﴿ إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ ﴾ خوا پاراسـتنیو جێگیری کـردنو دڵو دەروونی بەهێـز کردن، جـا پابەنـدی فەرمانی خوا بـوونو دڵو دەرونیان لەسـەر ڕووبـەڕو بوونەوەو کوشـتاری دوژمنانیـان بـوو، پلەو پایـەی دونیاو دوارۆژیان دەسـتکەوت، بـەڵام زۆرینەیان سـتەمیان لـە خۆیـان کـردو وازیان لـە فەرمانـی خـوا هێنابـوو، لەبـەر ئـەوە فەرموویەتی: ﴿ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ ﴿٢٤٦﴾ وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ ﴾ وەڵامێـک بـوو بـۆ داواکەیـان، ﴿ إِنَّ اللَّهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكًا ﴾ ئـەوەی لـە لایـەن خـواوە دیاریکـرا، پێویسـت بـوو لەسـەریان وەریانبگرتبایەو ملکـچ بووایەنو وازیان لەپشـت هەڵکـردن لێی بهێنایـەت، بـەڵام تەنهـا لـوت بـەرزیو پشـت هەڵکردنیـان نواند وتیـان: ﴿ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُ الْمُلْكُ عَلَيْنَا وَنَحْنُ أَحَقُّ بِالْمُلْكِ مِنْهُ وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِّنَ الْمَالِ ﴾ واتـە: چـۆن دەبـێ ببێتـە پاشـا ئـەو لەپلەو پایـەو بابو باپیـرە لەئێمـە نزمترە، ئێمە شایسـتەترین بە پاشـایەتی، لەگـەڵ ئەوەشـدا ئـەو هـەژارەو لـە سـامانەکان بـای ئەوەنـدەی نیە پاشـایەتی پـێ بکات، ئەمـەش لەسـەر گومانـی خراپـی خۆیـان بونیادیاننـا، پاشـایەتیو دەسـەڵاتداری پێویسـتە

خەڵکی دەسەڵاتدارو خاوەن موڵکو سامان بەڕێوەی ببات، نەیانزانی سیفەتە تەواوو ڕاستەقینەکان پێویستە پێش بخرێن بەسەر ئەوەوە، لەبەر ئەمەیە پێغەمبەریان ﷺ پێیان فەرموو: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰهُ عَلَيۡكُمۡ﴾ (واتە: خوا هەڵیبژاردووە بەسەرتانەوە)، پێویستی کردووە لەسەرتان ملکەچی بن ﴿وَزَادَهُۥ بَسۡطَةً فِي ٱلۡعِلۡمِ وَٱلۡجِسۡمِ﴾ واتە: پلەداری کردووە بەسەرتانەوە، بەزانستو جەستە، واتە: بەهێزی ڕاو بۆچوونو جەستە، کە ئەو دووانە کاروباری پاشایەتیان پێ تەواو دەبێ، چونکە ئەگەر بۆچوونەکەی تەواو بوو، وە توانی ئەو بۆچوونە تەواو بەهێزەی جێبەجێ بکات، بەو شێوەیە تەواویو کەمالیەت دەستەبەر دەبێت.

هەر کاتێک یەکێک لەو دوو کارەی لە دەست بچێ، ئەوە کارەکەی کەمو کوڕی تێدەکەوێ، جا ئەگەر جەستەی بەهێز بوو لەگەڵ ئەوەدا ڕای لاواز بوو، ئەوە لەدەسەڵاتەکەیدا کەلێنو کونو کەلەبەر تورەیی زاڵ دەبێ، ئەویش پێچەوانەی بە شەرع دانراوەکانو کارە شەرعیەکان دەبێ، ئەگەر بزانێ لە کاروبارەکان هێزێکی نیە بۆ جێبەجێکردنی بۆچوونەکەی، هیچ سوودێکی پێناگەیەنێ، ﴿وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ﴾ پلەو پایەی زۆرو بەخشندەیی، بە بەزەییو چاکە گشتیەکانی خۆی کەس لە کەسێکی تر تایبەت ناکاتو جیای ناکاتەوە، نەپلەدارێک لە بێ پلەیەک، بەڵکو لەگەڵ ئەوەدا ﴿عَلِيمٌ﴾ (زانایە) بەوەی کی شایستەی فەزڵو چاکەیە تیایدا دایدەنێ، بەم قسەیە ئەوەی لە دڵەکانیان بوو لەگومانو شکو تەمو مژاوی لایبرد، وە ڕوونی کردەوە کە مەرجەکانی دەسەڵاتداریو پاشایەتی تیادا هەبووە، بێگومان فەزڵو پلەو پایەی خوا بەهەرکەس بیەوێ دەیبەخشێ، ڕەتبونەوەشی بۆ نیە، بۆ چاکەکانیشی ڕێگری نیە، پاشان بە هەمان شێوە پێغەمبەرەکەیان ﷺ نیشانەیەکی هەست پێکراوی حیسی کە بە چاوی خۆیان ببینن بۆ باسکردن، ئەویش بریتی بوو لە هێنانی ئەو صندوقەی (تابوت)ەی کە سەردەمێکی دوورودرێژ بوو ونیان کردبوو، لەو سندوقەیەوە ئارامی تێدا بوو بۆیان کە دڵەکانیان پێوە جێگیرو ئاسوودە بوو، لەگەڵ هەندێ لە یادگاریو کەلەپوری مووساو هاروون کە بە جێیان هێشتبوو، فریشتە هێنایانو هەڵیان گرتبوو ئەوانیش بەچاوی خۆیان ئەوەیان بینی.

(٢٤٩-٢٥٢): ﴿فَلَمَّا فَصَلَ طَالُوتُ
بِٱلۡجُنُودِ قَالَ إِنَّ ٱللَّهَ مُبۡتَلِيكُم
بِنَهَرٖ فَمَن شَرِبَ مِنۡهُ فَلَيۡسَ مِنِّي وَمَن لَّمۡ
يَطۡعَمۡهُ فَإِنَّهُۥ مِنِّيٓ إِلَّا مَنِ ٱغۡتَرَفَ غُرۡفَةَۢ
بِيَدِهِۦۚ فَشَرِبُواْ مِنۡهُ إِلَّا قَلِيلٗا مِّنۡهُمۡۚ فَلَمَّا
جَاوَزَهُۥ هُوَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ
قَالُواْ لَا طَاقَةَ لَنَا ٱلۡيَوۡمَ بِجَالُوتَ
وَجُنُودِهِۦۚ قَالَ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم
مُّلَٰقُواْ ٱللَّهِ كَم مِّن فِئَةٖ قَلِيلَةٍ
غَلَبَتۡ فِئَةٗ كَثِيرَةَۢ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ مَعَ
ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٢٤٩﴾ وَلَمَّا بَرَزُواْ لِجَالُوتَ
وَجُنُودِهِۦ قَالُواْ رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا
صَبۡرٗا وَثَبِّتۡ أَقۡدَامَنَا وَٱنصُرۡنَا عَلَى
ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٢٥٠﴾ فَهَزَمُوهُم
بِإِذۡنِ ٱللَّهِ وَقَتَلَ دَاوُۥدُ جَالُوتَ وَءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلۡمُلۡكَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَعَلَّمَهُۥ مِمَّا
يَشَآءُۗ وَلَوۡلَا دَفۡعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعۡضَهُم بِبَعۡضٖ لَّفَسَدَتِ ٱلۡأَرۡضُ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ
ذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٢٥١﴾ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ نَتۡلُوهَا عَلَيۡكَ بِٱلۡحَقِّۚ وَإِنَّكَ
لَمِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿٢٥٢﴾﴾

فَلَمَّا فَصَلَ طَالُوتُ بِٱلۡجُنُودِ قَالَ إِنَّ ٱللَّهَ مُبۡتَلِيكُم
بِنَهَرٖ فَمَن شَرِبَ مِنۡهُ فَلَيۡسَ مِنِّي وَمَن لَّمۡ يَطۡعَمۡهُ
فَإِنَّهُۥ مِنِّيٓ إِلَّا مَنِ ٱغۡتَرَفَ غُرۡفَةَۢ بِيَدِهِۦۚ فَشَرِبُواْ مِنۡهُ
إِلَّا قَلِيلٗا مِّنۡهُمۡۚ فَلَمَّا جَاوَزَهُۥ هُوَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
مَعَهُۥ قَالُواْ لَا طَاقَةَ لَنَا ٱلۡيَوۡمَ بِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦۚ
قَالَ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ ٱللَّهِ كَم مِّن فِئَةٖ
قَلِيلَةٍ غَلَبَتۡ فِئَةٗ كَثِيرَةَۢ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ مَعَ
ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٢٤٩﴾ وَلَمَّا بَرَزُواْ لِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦ قَالُواْ
رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا صَبۡرٗا وَثَبِّتۡ أَقۡدَامَنَا وَٱنصُرۡنَا
عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٢٥٠﴾ فَهَزَمُوهُم بِإِذۡنِ ٱللَّهِ
وَقَتَلَ دَاوُۥدُ جَالُوتَ وَءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلۡمُلۡكَ
وَٱلۡحِكۡمَةَ وَعَلَّمَهُۥ مِمَّا يَشَآءُۗ وَلَوۡلَا دَفۡعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ
بَعۡضَهُم بِبَعۡضٖ لَّفَسَدَتِ ٱلۡأَرۡضُ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ ذُو
فَضۡلٍ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٢٥١﴾ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ نَتۡلُوهَا
عَلَيۡكَ بِٱلۡحَقِّۚ وَإِنَّكَ لَمِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿٢٥٢﴾

**﴿فَلَمَّا فَصَلَ طَالُوتُ بِٱلۡجُنُودِ﴾ واتە: لە دوای ئەوەی طالـووت فەرمانڕەوایی نەوەکانی ئیسرائیلی گرتە دەست دەسەڵاتو پاشایەتی بۆ جێگیر بوو، خۆیانی ئامادە کرد بۆ کوشتارو جەنگی دوژمنیان، لەوکاتەی طالـووت جیابۆوەو ڕۆیشت بەسەربازەکانی نەوەکانی ئیسرائیل کە ژمارەیەکی زۆرو زەوەند بوون، تاقیکردنەوە بە فەرمانی خوا، تا جێگیرو دڵئارامی بۆ ڕوونبێتەوە لەوەی کە وا نیە، وتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ مُبۡتَلِيكُم بِنَهَرٖ فَمَن شَرِبَ مِنۡهُ فَلَيۡسَ مِنِّي﴾ ئەوەی سەرپێچیکارە شوێنی ئێمە نەکەوێت، لەبەر نەبوونی ئارامیو جێگیریو سەرپێچی کردنەکەی ﴿وَمَن لَّمۡ يَطۡعَمۡهُ﴾ واتە: لێی نەخواردبێتەوە ئەوە لەمنەو ﴿إِلَّا مَنِ ٱغۡتَرَفَ غُرۡفَةَۢ بِيَدِهِۦ﴾ گوناهی لەسەر نیە لەوەدا، بەڵکو خوا پێتو بەرەکەتی تێ بخاتو بەشی بکات، لەم تاقیکردنەوەیەدا بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی کە**

ئاوەکــە دەبــێ کەم بوبــێ، تــا تاقیکردنەوەکە تــەواو ببــێ‌و بێتە جــێ، زۆربەیان ســەرپێچیان کــردو لە ڕووبارە قەدەغەکراوەکەیان خواردەوە، وە گەڕانەوە بەســەر پشــتداو پاشــگەز بونەوە لەجەنــگ‌و گوشــتاری دوژمنیــان، جــا ماوەیەکــی کــە ئارامیــان نەگــرت لــە نەخواردنەوەی ئاوەکــە، مەزنتریــن بەڵگە بــووە لەســەر نەبوونی ئارامیان لەســەر ئەو جەنگ‌و کوشــتارەی کە درێــژ بوویــەوەو نارەحەتی گــەورەی لــێ بەدیدەهات.

لــە ڕاســتیدا ئەوانــەی کە مابوونــەوە لە ســەربازگەکانیان بــڕواو پشتبەســتنیان بەخــوا بەهێزتر بــوو، بــە بەردەوامــی یــادو زیکری خوایــان دەکرد، پشــتیان کــرد لە هێــزو توانــای خۆیان، وە زیاتــر ئارامیــان بــە خۆیاندا لــە بەرانبەر زۆری دوژمنــدا، بۆیە خــوا ﷻ فەرمویەتی: ﴿ فَلَمَّا جَاوَزَهُۥ ﴾ واتــە: ڕووبارەکە ﴿ هُوَ ﴾ واتە: طالووت ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ ﴾ ئەوانەش کــە گوێڕایەڵــی فەرمانــی خوایــان کردو لــە ڕووبارەکەیــان نەخــواردەوە، کــە خواردنەوەی قەدەغــە کــراو بــوو لەســەریان، تەماشــای کەمــی خۆیــان‌و زۆری دوژمنانیان کــردو وتیان، واتــە: زۆربەیــان وتیــان: ﴿ لَا طَاقَةَ لَنَا ٱلۡيَوۡمَ بِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦۚ ﴾ لەبــەر زۆری چەکو تفــاق‌و ژمارەیــان ﴿ قَالَ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ ٱللَّهِ ﴾ واتــە: دڵنیــان بــەوە، ئەوان خاوەنــی بــڕوای جێگیــرو دڵنیایی دامەزرا بــوون، جێگیر بوون بــۆ ئەوانەی مایــەوە دڵنەوایی‌و ئارامبەخشــن بۆیــان، وە فەرمانیــان پــێ دەکــردن بــە ئارامــی: ﴿ كَم مِّن فِئَةٖ قَلِيلَةٍ غَلَبَتۡ فِئَةٗ كَثِيرَةَۢ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ ﴾ واتــە: بــە ویســت‌و ئیــرادەی خوایــە، فەرمان تەنهــا لە لای خــوای بــەرزە، شــکۆدار ئەوەیــە کە خــوا شــکۆداری کردبــێ، وە ڕیســواش ئەوەیــە کە خوا ڕیســوای کردبــێ، زۆری هیــچ نیــە کە خــوا بیەوێ ڕیســوای بــکات، کەمیش زیانــی نیە کە خوا بیــەوێ ســەری بخــات ﴿ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴾ بەسەرخســتن‌و یارمەتیدان‌و پشــتگیری کــردن، مەزنتریــن ڕاکێشــەر بــۆ یارمەتی خــوا ئــارام گرتنــی بەندەیە لەپێنــاو خــوادا، پەندو ئامۆژگاریەکانــی کەوتــە دڵەکانیــان‌و کاری تێکردن، لەبــەر ئەوەیە ئەوکاتــەی بەدیارکەوتن بــۆ جالــوت‌و ســەربازەکانی ﴿ قَالُواْ ﴾ (وتیــان:) ﴿ رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا صَبۡرٗا ﴾، واتــە: دڵەکانمــان بەهێز بکە، ئارامیمان پێ ببەخشــە، قاچەکانمان چەســپیو بکــە لەراکردن‌و لەرزین‌و ســەرمان بخە بەســەر خەڵکانــی بێ بڕوا، ئــا لێرەوە دەزانیــن کە جالوت‌و ســەربازەکانی کافرو بــێ بــڕوا بــوون، خــوا وەڵامــی پاڕانەوانــەو دوعاکانی دانــەوە، لەبــەر ئــەوەی هۆکارەکانیان بــۆ ئــەو مەبەســتە هێنایــە جــێ، سەریخســتن بەســەریاندا ﴿ فَهَزَمُوهُم بِإِذۡنِ ٱللَّهِ وَقَتَلَ دَاوُۥدُ ﴾، داوود ﷵ لەگــەڵ ســەربازانی طالووتــدا بوو (جالوت) واتە: ڕاســتەوخۆ بەدەســتی

خـۆی فەرمانـڕەواو پاشـای کافرانی کوشـت، ئـەوەش بـە ئازایەتـیو هێـزو خۆڕاگریەکەی ﴿ وَءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ﴾ واتـە: خـوا دایـە داوود ﷺ ﴿ ٱلْمُلْكَ وَٱلْحِكْمَةَ ﴾ واتـە: منەتـی کـرد بـە دانانی وە فەرمانڕەواو پاشـا بەسـەر نەوەکانـی ئیسـرائیل لەگەڵ دانایـیو کارلەجێی، کـە بریتـی بوو لـە پێغەمبەرایەتی کە یاسـاو شـەرعی مەزنو ڕێگای ڕاسـتی لە خـۆ گرتبوو، لەبـەر ئەمـە ئەرمووی: ﴿ وَعَلَّمَهُۥ مِمَّا يَشَآءُ ﴾ لە زانسـتە شـەرعیو زانسـتە ڕامیاریەکان، خـوا دەسـەڵاتو پێغەمبەرایەتی بۆ کۆکردبـووەوە، لەپێش ئـەو دەسـەڵاتو فەرمانڕەوایی بۆ جگـە پێغەمبەران بوو، کاتێ کە خوا ﷻ سـەری خسـتن دڵئـارامو جێگیر بوون لـە ماڵەکانیان، خوایـان پەرسـت بە ئاسـودەییو ئەمـنو ئاسـایشو دڵئارامی، لەبـەر ڕیسـوابونی دوژمنانیانو چەسـپینیان لـە زەویدا، هەمـوو ئەمانە لە شـوێنەواری جەنگو جیهـادن لە ڕێی خـوادا، ئەگەر ئـەو نەبوایـە ئەوەش دەسـتەبەر نەدەبوو، لەبـەر ئەمە فەرموویەتـی: ﴿ وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ ٱلْأَرْضُ ﴾ واتـە: ئەگـەر خوا بەرگری لەوانـە نەکردایەت کـە لـە ڕێگای ئەودا کوشـتار دەکـەن، لە بەرانبـەر پیلانی خراپـەکارانو پەلامـاری کافران، زەوی تێکدەچـوو بـەزاڵ بوونـی بێبـڕواکان بەسـەریداو بەرپاکردنـی دروشـمەکانی کوفرو قەدەغەکردنیـان لە پەرسـتنی خوای بەرزو دەرخسـتنی ڕێبـازو ئاینەکەی: ﴿ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ جەنـگو جیهـادی بـۆ بەشـەرع دانـان کە بـووە مایەی بەختـەوەریو بەرگـری بۆیـان، وە لـەزەوی بەهێـزو جێگیـری کـردن بـەو هۆکارانەی کە دەیـان زانـنو بەو هۆکارانەشـی کـە نایانزانن.

لە پاشـان خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِٱلْحَقِّ ﴾ واتە: بەو ڕاسـتیەیەی کە گومانـی تیادا نیـە، پەند وەرگرتـنو چاوەڕوانیو ئاشـکرابوونی ڕاسـتیەکانی لەخـۆ گرتووە، ﴿ وَإِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾ ئەمە شـایەتیدانی خوایە بـۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ بـە ڕاسـتی ڕوایەتـی پەیامەکـەی، کە لە کـۆی بەڵگەکانی ئەوەیـە خوا هەواڵـی ئۆممەتەکانی رابـردوی داوە، وە پێغەمبـەران (علیهـم الصلاة والسلام)و شـوێن کەوتوانیـانو دوژمنانیانی بۆ گێراوەتـەوە، ئـەوەی ئەگەر خـوا هەواڵـی نەدایە پێیان، ئـەوە زانیـاری نەدەبوو پێیـان، بەڵکو لەناو ئۆممەتەکەیشـدا شـتێک نەبوو دەربـارەی ئەو کاروبارانـە، ئەوە بەڵگەیە کـە پێغەمبەری خـوا ﷺ هـەقو ڕەوایـە، کـە خوا بە هەقو ڕاسـتی ڕەوانـەی کـردوە، وە ڕێبازو ئایینـی ڕەوا، تـا دەرکەوێ بەسـەر هەمـوو ڕێبـازو ئاینەکاندا ئەگەر چـی هاوبەش پەیدا کارانیـش پێیانیش ناخـۆش بێ.

لەم سەرگوزشتەیەدا پەندو ئامۆژگاری هەیە کە خاوەن ژیریەکان بیردەخاتەوە، لەوانە:
کۆبوونــەوەی خاوەن وتەو ڕاو بۆچوونو خاوەن حەلو عەقــد، وە لێکۆڵینەوەیان دەربارەی ئەو ڕێگایــەی کە کاروبارەکانی پێ ڕاســتو دروســت دەبێ، پاشــان کارکردن پێــی، گەورەترین هــۆکارە بۆ ســەرکەوتنو بەرزو بڵندیانو دەســتەبەر بوونــی مەبەســتەکانیان، هەروەکو بۆ ئەو پیــاو ماقولانــە ڕوویدا، کاتــێ گەرانەوە بــۆلای پێغەمبەرەکەیــان بۆ دیاریکردنــی فەرمانڕەواو پاشــایەک کە قســەیان یەک بخاتو پەرتەوازیان کــۆ بکاتــەوە، گوێڕایەڵی بکەن.
لەوانــە: بەڕاســتی هــەقو ڕەوایەتــی هەرکاتــێ بەرهەڵســتی بکــرێو گومانــی بــۆ دروســت بکرێــت، ئــەوە زیاتــر ڕوون دەبێتــەوەو دەردەکــەوێو جیــا دەبێتــەوە، وە دڵنیایــی تــەواوی دەبــێ، هەروەکــو بــۆ ئەوانــە ڕوویدا، کاتێ بەرهەڵســتیان کرد لەســەر شایســتەی طالــوت بۆ فەرمانڕەوایەتــیو پاشــایەتی، وەلامدرانــەوە بــە وەلامێــک کە قەناعەتــی پێوە دەســتەبەر بوو گومانەکانــی ڕواندەوە.
لەوانــە: زانســتو بۆچــوون: لەگــەڵ هێــزی جێبەجــێ کار تــەواوی دەســەلاتەکان پێیانــەوە دروســت دەبــێ، وە بــە نەبوونیــان، یــان نەبوونی یەکێکیــان، کــەمو کورتیان دەبــێو زیانیان دەبێ.
لەوانــە: پشــت بەســتن بە نەفسو دەروون هۆکاری نشوســتیو ڕیســوا بوونە، پشــت بەســتنو داوای یارمەتــی لــە خــواو ئارام گرتنو هانا بــۆ بردنی هۆکاری ســەرکەوتنن، جا یەکەم وەک لــە قســەیان بــۆ پێغەمبەرەکەیــان ﷺ ﴿وَمَا لَنَآ أَلَّا نُقَٰتِلَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَدۡ أُخۡرِجۡنَا مِن دِيَٰرِنَا وَأَبۡنَآئِنَا﴾ هــەروەک بڵــێ دەرەنجامــی ئــەوە ئەوەیە کــە لەوکاتەی کوشــتاریان لەســەر نووســراو پێویســت کــرا پشــتیان تێکــرد، دووەم: لــە فەرمــوودەی: ﴿وَلَمَّا بَرَزُواْ لِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦ قَالُواْ رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا صَبۡرٗا وَثَبِّتۡ أَقۡدَامَنَا وَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٢٥٠ فَهَزَمُوهُم بِإِذۡنِ ٱللَّهِ﴾ لەوانــە: حیکمــەتو دانایی خوا ﷻ جیاکردنــەوەی خــراپو پیســە لە پــاک، وە ڕاســتگۆ لــە درۆزن، ئارامگر لە ترســنۆک، خوا واز لــە بەندەکانــی نایەنــێ لــەوەی لەســەری دەڕۆن، لە تێکــەلاو کردنو جیــا نەکردنەوە.
لەوانــە: لــە بەزەییو ســوننەتی نەگۆڕی خــوا ڕەت کردنــەوەو لادانو زیانی کافــرو دووڕوان لەســەر بڕوادارانــی جەنگــاوەر، جا ئەگەر وای نەکــرد، زەوی تێکدەچوو بــە زاڵ بوونی کوفرو درووشــمەکانی کافران بەســەر بڕواداران.

تِلْكَ ٱلرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ مِّنْهُم مَّن كَلَّمَ ٱللَّهُ
وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَٰتٍ وَءَاتَيْنَا عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱلْبَيِّنَٰتِ
وَأَيَّدْنَٰهُ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقْتَتَلَ ٱلَّذِينَ مِنۢ
بَعْدِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ وَلَٰكِنِ ٱخْتَلَفُوا۟
فَمِنْهُم مَّنْ ءَامَنَ وَمِنْهُم مَّن كَفَرَ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقْتَتَلُوا۟
وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ ۝ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَنفِقُوا۟
مِمَّا رَزَقْنَٰكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ يَوْمٌ لَّا بَيْعٌ فِيهِ وَلَا خُلَّةٌ وَلَا
شَفَٰعَةٌ وَٱلْكَٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ۝ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ
ٱلْحَىُّ ٱلْقَيُّومُ لَا تَأْخُذُهُۥ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ يَعْلَمُ
مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَىْءٍ مِّنْ عِلْمِهِۦٓ إِلَّا
بِمَا شَآءَ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفْظُهُمَا
وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْعَظِيمُ ۝ لَآ إِكْرَاهَ فِى ٱلدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشْدُ مِنَ
ٱلْغَىِّ فَمَن يَكْفُرْ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ
بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَا وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ۝

پاشان خوا ﷻ فەرموویەتی:

(٢٥٣): ﴿تِلْكَ ٱلرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ مِّنْهُم مَّن كَلَّمَ ٱللَّهُ وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَٰتٍ وَءَاتَيْنَا عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَيَّدْنَٰهُ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقْتَتَلَ ٱلَّذِينَ مِنۢ بَعْدِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ وَلَٰكِنِ ٱخْتَلَفُوا۟ فَمِنْهُم مَّنْ ءَامَنَ وَمِنْهُم مَّن كَفَرَ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقْتَتَلُوا۟ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ (٢٥٣)﴾

﴿تِلْكَ ٱلرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ مِّنْهُم مَّن كَلَّمَ ٱللَّهُ وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَٰتٍ﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدات ئەو فەزڵی هەندێ لە پێغەمبەرانی داوە بەسەر هەندێکی تریاندا، بەوەی کە تایبەتی کردوون لە نێو تێکڕای مرۆڤەکان، کە وەحی بۆ ناردوونو ڕەوانەی کردوون بۆ بانگەواز کردنی خەڵک بۆ لای خوا، پاشان هەندێکیانی پلەدار کردوە بەسەر هەندێکیاندا، بەوە کە سیفەتی جوانو کردەوەی ڕاستو بەجێو سوودی گشتی تیادا دانـاون، هەیانە کە خوا قسەی لەگەڵ کردوە، وەک مووسای کوڕی عیمران عليه السلام تایبەتی کردوە بە قسە کردن، هەیانە چەند پلە بەرزی کردۆتەوە لەسەر هەموویان، وەک پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ هەرچ پلەو پایەی چاکە هەیە تیایدا کۆی کردوەتەوە، لە ڕەوشتی بەرز کە بە هۆیانەوە پێش یەکەمەکانو دواینیەکان کەوتووە، ﴿وَءَاتَيْنَا عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱلْبَيِّنَٰتِ﴾ (نیشانەمان بە عیسای کوڕی مەریەم داوە) کە بەڵگەن لەسەر پێغەمبەرایەتی، وە ئەو بەندەو وشەی خوایە کە ئاڕاستەی مەریەمی کردووە، ڕووحە لە خواوە ﴿وَأَيَّدْنَٰهُ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ﴾ (وە پشتگیریمان کردوە بە گیانی پاک) واتە: بە بڕواو یەقینەوە خوا پشتگیری کردووەو بەهێزی کردوە لەسەر ئەوەی فەرمانی پێ کردوە، وتراویشە پاڵپشتی کردوە بە جبرائیل عليه السلام کە لە کاروبارەکان بەردەوام لەگەڵی بووە ﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقْتَتَلَ ٱلَّذِينَ مِنۢ بَعْدِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ﴾ کە کۆبوونەوە لەسەر بڕواو ئیمان دەخوازێ ﴿وَلَٰكِنِ ٱخْتَلَفُوا۟ فَمِنْهُم

﴿ مَّنْ ءَامَنَ وَمِنْهُم مَّن كَفَرَ ﴾ ئـەو جیاوازیـە دەبێتـە مایـەی پەرتەوازەیی‌و دژایەتی‌و کوشـتار، لەگـەڵ ئەمەشـدا ئەگـەر خوا بیوسـتایە لە دوای ئـەو جیاوازیـە جەنگ‌و کوشـتاریان نەدەکرد، ئـەوە بەڵگەیـە لەسـەر ئەوەی ویسـت‌و توانـای خـوا زاڵ‌و جێبەجێکـراوە بۆ هـۆکارەکان، لە کاتێکـدا هـۆکارەکان سـوودبەخش بـن‌و پێچەوانـەی ویسـتی خوا نەبـن، ئەگەر ویسـتی خوا لەسـەر شـتێ هەبوو هەموو هۆکارێک دەپوکێنەوەو هەموو پێویسـتکارێکیش دەڕواو نامێنێت، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ ﴾ ویسـتی خـوا زاڵـە، هەرچـی خوا بیـەوێ جێبەجـێ کـراوە، ئا لەمـەو وێنەی ئەمـەدا بەڵگە هەیە لەسـەر ئەوەی بە ڕاسـتی خوا ﷻ بـەردەوام ئـەوە دەکات کـە ویسـت‌و حیکمەتـی دەیخـوازێ، وە لە کـۆی ئەوانـەی دەیکات ئەوەیـە کـە هەواڵیـداوە دەربـارەی خـۆی، وە پێغەمبەرەکەشـی ﷺ هەواڵیـداوە دەربـارەی، لە بەرزبوونـەوە (الإسـتواء)و دابەزینـی‌و قسـەو کارو کردەوەکانـی کـە تەعبیر دەکـەن بە کارو کـردەوە ئیختیاریەکان.

## سوودە وەدەستهاتووەکان:

چۆن پێویسـتە لەسـەر کەسی ئەرک پێسـێردراو شـارەزای ناسـینی پەروەردگاری بێ، بەهەمان شـێوە پێویسـتە لەسـەری شـارەزای ناسـینی پێغەمبەرانی بێ، ئەوەی پێویسـتە بۆیان‌و قەدەغەیە لەسـەریان‌و ڕێگاپێـدراوەو دروسـتە بۆیـان، هەمـوو ئەوانـە وەردەگیـرێ لەوانەی کـە خوا لە ئایەتەکانیدا وەسـفیانی پێکردوە:

لەوانـە: پێغەمبـەران پیـاون‌و ئافـرەت نین، لـە خەڵکی شـارەکانن نـەوەک دێهاتـەکان، ئەوان هەڵبژێـردراون، خـوا سـیفەتە باشـەکانی بـۆ کۆکردوونـەوەو بژاری کـردوون، ئەوان سـاغ‌و سـەلامەتن لە هەموو ئەو ناشـرینیانەی دراوەتە پـاڵ پەیامەکانیان، لە درۆو ناپاکی‌و شـاردنەوەو کـەم‌و کوڕیـی‌و شـوورەیی‌و ناوزڕاندنیـان، ئـەوان دان نانێـن بـە هەبوونـی هەڵە لـە هەرچی پەیوەسـتە بـە پەیـام سـپاردن (تكليـف)ەکان، بێگومـان خـوا ﷻ تایبەتی کـردوون بە وەحی خـۆی، لەبـەر ئەمەیە پێویسـتە بڕوایان پێ بهێنـرێ‌و گوێڕایەڵـی فەرمانەکانیان بکـرێ، ئەوەی بـڕوای پێیـان نەبێ ئـەوە بێ بڕوایـە، ئەوەی سـووکایەتی بکات‌و نـاوی یەکێکیان بڕوشـێنێ، یـان جوێنـی پێبـدات ئـەوە کافـرەو دەبـێ بکـوژرێ، بەڵگەکانی ئـەو ڕسـتەیە زۆرن، ئەوەی سـەرنجی قورئـان بـدات، حەقیقەتی ئـەوەی بـۆ ڕوون دەبێتەوە.

پاشان خوا ﷻ فەرموویەتی:

(٢٥٤): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِمَّا رَزَقْنَٰكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ لَّا بَيْعٌ فِيهِ وَلَا خُلَّةٌ وَلَا

شَفَٰعَةٌۗ وَٱلۡكَٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٥٤﴾ ﴾

ئەمـە لـە میهرەبانـی خوایـە بـۆ بەندەکانـی کـە فەرمانی پێ کـردوون بـە پێشـکەش کردنی شـتێک لـەوەی خوا پێیـداون، لە ڕزق‌و سـەدەقەو خێری پێویسـت‌و ویسـتراو (مسـتحب)، تا بۆیـان ببێتـە زادو زەخیـرەو پاداشـتی زۆر، لـە ڕۆژێکـدا کـە کارکـەران پێویسـتیان هەیە بە تۆزقاڵێـک لـە چاکـە، هیـچ کڕیـن‌و فرۆشـتنێکی تێدا نیـە، ئەگەر مـرۆڤ بیەوێ بـۆ ڕزگار کردنـی نەفسـی خـۆی بـە ئەنـدازەی ئاسـمانەکان‌و زەوی زێـڕ ببەخشـێ، بـۆ ئـەوەی خۆی بپارێـزێ لە سـزای ڕۆژی قیامەت، لێی وەرناگیرێت، وە هیچ دۆسـت‌و برادەرو خۆشەویسـت‌و خانەدانیـەک سـوودی پـێ ناگەیەنێت، ئەوە ئـەو ڕۆژەیە کـە درۆزن‌و ناهەقان زیانبـارن تێیدا، وە سـتەمکاران ڕیسـوا دەبن، ئا ئەوانە کەسـانێکن شـتێک دادەنێن لە غەیری شـوێنی خۆی، وە مافـی خـواو مافی مرۆڤـەکان واز لێ دێنـن‌و لە حەڵاڵ دەپەڕنـەوە بۆ حـەرام، مەزنترین جۆری سـتەم بێبڕوایـی کوفر کردنـە بەو خوایەی کە پەرستشـی داناوە کـە دەبێ ئەو پەرستشـە تەنها بـۆ خـوا بێ، کەچـی مرۆڤی بێبـڕوا (ئـەم پەرستشـە) دەگوازێتەوە بـۆ بەدیهێنراوێکـی وێنەی خـۆی، لەبەر ئەوەیە خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ وَٱلۡكَٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾(واتـە: کافرەکان سـتەمکارن)، ئـەوە لـە باس‌و بابەتـی کـورت هەڵهێنانـە، واتە: ئەوانـەی کە سـتەمی تەواویان بـۆ جێگیـرە، وەک چۆن خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٞ ﴿١٣﴾ ﴾لقمان.

(٢٥٥): ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُۚ لَا تَأۡخُذُهُۥ سِنَةٞ وَلَا نَوۡمٞۚ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ مَن ذَا ٱلَّذِي يَشۡفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦۚ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡۖ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيۡءٖ مِّنۡ عِلۡمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَۚ وَسِعَ كُرۡسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَۖ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفۡظُهُمَاۚ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٢٥٥﴾ ﴾

﴿ ٱللَّهُ ﴾ئـەم دەقـە پیـرۆزە مەزنتریـن ئایەتەکانـی قوڕئانـەو پلەدارتریـن‌و گەورەترینیانـە، ئـەوەش لەبـەر ئەوەیە کە کاروبـارە گـەورەکان‌و سـیفەتە پیرۆزەکانی پەروەردگـاری لە خۆ گرتـووە، لەبـەر ئەوەیـە فەرمـوودەکان زۆرن لە هانـدان‌و خوێندنـەوەی ئەم دەقـە، وە بکرێتە زیکـرو یـادی پەروەردگـار بۆ مرۆڤ لـە کاتی بەیانیـان‌و ئێـواران‌و خەوتن‌و لـە دوای نوێژە فـەرزەکان، جـا خـوا ﷻ هەواڵـدەدا دەربـارەی خـۆی کـە بـەرزو بەرێـزە بـەوەی کە: ﴿ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾واتـە: هیـچ پەرسـتراوێکی بـە هـەق نیە جگـە لەو، ئـەو پەرسـتراوی هەقە، کە پێویسـتە هەمـوو جۆرەکانـی پەرسـتش‌و گوێڕایەڵـی‌و پەرسـتراوی بـۆ ئەنجـام بـدرێ، لەبەر تـەواوی خـۆی‌و تـەواوی سـیفەتەکانی‌و مەزنـی نـازو نیعمەتەکانـی، وە لەبـەر ئـەوەی بەندە

شایستەیە کـە ببێتە بەندە بـۆ پەروەردگاری، جێبەجێـکاری فەرمانەکانی بـێ‌و دووربکەوێتەوە لـە قەدەغەکراوەکانـی، هەمـوو ئەوانـەی هـەن جگە لە خـوا پووچەڵو بـێ بنەمان، پەرسـتنی جگـە لـە خوا نـاڕەواو بـێ بنەمایـە، لەبـەر ئەوەی جگـە لـە خـوا بەدیهێنراوێکە کـە خاوەنی کـەمو کورتیەو سەرپەرشـتی دەکـرێ‌و کاروباری بەڕێوەدەبـرێ، هەژارو موحتاجـە لە هەموو ڕووەکانـەوە، شـایەنی هیـچ شـتێک نیـە لـە جۆرەکانـی عیبـادەت کـردن، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ ﴾ ئـەو دوو نـاوە پیـرۆزە بەڵگـەن لەسـەر تێکـڕای نـاوە زۆر جوانـەکان، بە بەڵگـە بوونـی (مطابقة) دەقـاو دەق‌و وەک یەک بـوون، وە لەخۆگرتن‌و (تضمنا)و پێویسـت بـوون (الحي) زینـدوو ئەوەیە کـە ژیانێکـی تـەواوی هەبێ کە هەمـوو سـیفاتەکانی خودی لـە خۆ بگرێـت، وەک: بیسـتن‌و بینین‌و زانسـت‌و زانیاریی‌و توانـا وێنەی ئەوانـە، وە (القیوم) ئەوەیـە کـە هەڵسـاوەو وەسـتاوە بـە خـۆدی خـۆی، هەڵسـاوە بـە ڕاگرتنـی جگە لـە خۆی، ئـەوەش هەمـوو کارو کـردەوەکان لە خۆ دەگـرێ، کـە پەروەردگاری جیهانیانی پێ وەسـف کـراوە لـە کارو کردەوەکانی بە ویسـتی خـۆی ئەوەی بیەوێـت، لەبـەرز بوونەوە (الإسـتواء) و دابەزیـن‌و قسـە کـردن‌و بەدیهێنـان‌و ڕۆزی دان‌و مرانـدن‌و ژیاندن، وە تێکـڕای جۆرەکانی تـری بەڕێوەبـردن، هەمـوو ئەوانـە لـە نێو دەسـتەڵاتی خـوای پەروەردگـارن، بۆیـە هەندێک لـە توێـژەران وتوویانە: هـەردوو نـاوی (الحی والقیـوم) مەزنی خـوای مەزنن (اسـم الأعظم)، ئـەو ناوانـەی کە ئەگـەر پێیـان بپاڕێیتەوە لـە خوا وەڵامـت دەداتـەوە، وە پێیـان داوا بکەیت پێت دەبەخشـێت، لـە تەواوێتی زیندوویەتی‌و وەسـتانی ئەوەیە کە خـوا ﴿ لَا تَأۡخُذُهُۥ سِنَةٞ وَلَا نَوۡمٞ ﴾، ﴿ سِنَةٞ ﴾ خەوەنوچکـەو وەنەوز (خەو نایگرێ) ﴿ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾ واتـە: ئـەو خاوەنداره، هەرچـی غەیری خۆی هەیە لـە ژێر فەرمانـن، ئەوە بەدیهێنـەری ڕۆزی دەرو بەڕێوەبـەری کاروبـارە، جگە لەو بەدیهێنـراوە، ڕۆزی پێدراوی بەڕێوەبـراوە، نە بۆ خۆی، نـە بـۆ جگـە لە خۆشـی هیچی لە دەسـت نایە، بـە قـەد گەردیلەیەک نە لـە ئاسـمانەکان نە لە زەوی، بۆیـە فەرموویەتـی: ﴿ مَن ذَا ٱلَّذِي يَشۡفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦۚ ﴾ واتـە: یەکێک نیە لەلای ئـەو تـکا بـکات بەبـێ مۆڵەتـی ئـەو، تکا کـردن گشـتی هی خـوای بـەرزە، بـەڵام خوا ﷻ ئەگـەر ویسـتی ڕێـز لە یەکێـک لـە بەندەکانی بنێ کـە تکای بـۆ بکرێت، تکاکاریـش بەبێ مۆڵەت دەسـت نـاکات بـە تکاکەی.

لە پاشـان فەرموویەتـی: ﴿ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ ﴾ واتە: ئەوەی ڕابردوە لـە هەموو کاروبارەکان ﴿ وَمَا خَلۡفَهُمۡ ﴾ واتـە: ئـەوەی لـە داهاتـوو دێ، جـا زانسـت‌و زانیاریـی خوا ﷻ بـە دوورو

درێژیـیو وردو درشـتەوە دەوری کاروبارەکانـی داوە، هەم پێشـینەکانو هـەم دواینەکان، وە بـە ڕواڵەتیـەکانو پەنهانیەکانـەوە، بەنـدەکان هیچیـان بـۆ نیـە لـە کارو فرمـانو زانیاریەکان بـە قـەد گەردیلەیـەک، مەگـەر ئەوەی خـوا ﷻ فێـری کردبـن، لەبـەر ئەوەیـە فەرموویەتی: ﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِّنْ عِلْمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَ ۚ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ﴾ ئـەوە بەڵگەیـە لەسـەر تـەواوی مەزنیەتـیو فراوانـی دەسـەڵاتەکەی ئەگەر ئـەوە حاڵی کورسـیەکەی بێ، کە هێنـدەی ئاسـمانەکانو زەوی بێت لەسـەر ئـەو مەزنایەتیەی ئـەوانو مەزنیەتی ئـەو تیادایە، جا کورسـی مەزنترینـی بەدیهێنراوەکانـی خوا نیـە، بەڵکو لە کورسـی مەزنتریش هەیـە کە بریتیە لـە عـەرش، ئەوانەش کـە نازانـرێ، تەنها بە خـۆی دەیزانـێ، لە گەورەیـی ئـەو بەدیهێنراوانە هـزرو بیرەکان سەرسـام بـوون، چـاوەکان ماندوو دەبـنو چیـاکان دەجوڵێنو پەشـێو دەبنو کەڵـە پیـاوان دەربارەی دەوەسـتنو دەبەسـترێن، جـا مەزنایەتـی بەدیهێنەرو داهێنەریـان دەبێ چـۆن بێـت؟! ئەوەی بەبـێ مانـدوو بـوونو شـەکەتی ئاسـمانەکانو زەوی ڕاگرتـووە، لەبەر ئەوەیـە فەرموویەتـی: ﴿وَلَا يَـُٔودُهُۥ﴾ واتـە: قـورسو گرانـی بـۆ خـوا نیـە ﴿حِفْظُهُمَا ۚ وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ﴾ (خـوا بـەرزە) بە خودی خۆی لەسـەر عـەرش بەرزو بڵنـدە بەهێزو توانایـە بۆ هەموو بەدیهێنـراوان، بـەرزو بڵنـدە بە ئەنـدازەی تەواوی سـیفەتەکانی ﴿ٱلْعَظِيمُ﴾ ئەو کەسـەی لە گەورەیـیو مەزنیەتی ئـەو هێزو توانای بەهێزو سـتەمکاران دەپووکێتەوە، وە لای شـکۆداریو گەورەیـی ئەو لـووت بەرزی دەسـەڵاتدارو پادشـا زاڵو بەهێز بچـووک دەبێتـەوە، جا پاکو بێگـەردی بۆ ئەو خوایـەی خاوەنی مەزنـیو گەورەیی بێسـنوورە، گەورەو بەهێزو زاڵە بەسـەر هەمـوو شـتێکدا، بێگومـان ئەو دەقـە یەکتاپەرسـتی پەروەردگارێتیو ناوو سـیفەتەکانی لە خۆ دەگـرێ، وە دەوردانـی خاوەنیەتـیو دەسـەڵاتو دەوردانـی زانسـتیو فراوانی دەسـەڵات، وە گەورەیـیو شـکۆداریو مەزنایەتیو بەرزی بەسـەر هەمـوو بەدیهێنراوەکانـی دەگرێتەوە، ئەم دەقـە بـە تەنهـا بیروبـاوەڕی دەربـارەی ناوەکانی خواو سـیفەتەکانی لـە خۆگرتوە بـۆ هەموو نـاوو سـیفەتە بەرزەکان، پاشـان خـوا فەرموویەتی:

(٢٥٦-٢٥٧): ﴿لَآ إِكْرَاهَ فِى ٱلدِّينِ ۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشْدُ مِنَ ٱلْغَىِّ ۚ فَمَن يَكْفُرْ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَا ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٥٦﴾ ٱللَّهُ وَلِىُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَوْلِيَآؤُهُمُ ٱلطَّٰغُوتُ يُخْرِجُونَهُم مِّنَ ٱلنُّورِ إِلَى ٱلظُّلُمَٰتِ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٥٧﴾﴾:

خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات کە زۆر لێکردن لـە ئاییندا نیە، لەبەر نەبوونی پێویسـتی بە زۆر لێکردن،

چونکــە زۆر لێکــردن تەنها لەســەر کارێکی پەنهانو شــاراوە دەبــێ، کە شــوێنەوارەکەی لێڵە، یــان کارێکــە دەروون پێی ناپەســندەو خۆشــی نــاوێ، بــەڵام ئەم ئایینــە ڕێکو ڕاســتەو ڕێگە ڕاســتیەکەی بۆ خــاوەن عەقڵو هۆشــەکان ڕوون بۆتــەوە، ڕێگاکــە دەرکەوتــووەو کارەکانی ئاشــکرا بــووە، ســەر ڕاســتی و گومڕایــی زانــراوە، کەســی ســەرکەوتوو ئەگەر بــە کەمترین تێڕوانیــن تەماشــا بــکات هەڵیدەبژێــرێ، بەڵام ئەوەی ویســتو مەبەســتی خراپ بــێ، وە دڵو دەروونــی پیــس بــێ، کــە هــەق دەبینــێ، ناهــەق بەســەر هەقــدا هەڵدەبژێــرێ، جــوان دەبینێ کەچــی بــە لای ناشــیرین لادەکاتــەوەو ڕووی تێــدەکات، جا خوا پێویســتی بەو جۆرە کەســە نیــە زۆری لــێ بــکات بۆ ئــەوەی ڕوو لــە ئایین بــکات، لەبەر ئــەوەی ئەگەر ئەو جۆرە کەســە بــڕواش بێنــێ هیچ ســوودو ئەنجامێکی نابێ، کەســی زۆر لێکــراو بڕواکەی دروســت نیە، بەڵام ئــەم دەقــە پیــرۆزە بەڵگــە نیــە لەســەر وازهێنان لــە کوشــتارو جەنگ کــردن لەگــەڵ کافری شــەڕ کــەرو دوژمــن، بەڵکــو تەنها ئــەوەی تێدایە کە بــە ڕاســتی حەقیقەتی ئایین لــەو ڕووەوە کــە پێویســت دەکات وەربگیرێــت، لــە لای هــەر بــە ویژدانێک کە مەبەســتی شــوێنکەوتنی هــەق بــێ، بەڵام باســی کوشــتارو جەنــگ کردنی نەکــردوە، بەڵکو پێویســتیو واجــب بوونی جەنــگو جیهاد لــە دەقەکانی دیکــە وەردەگیرێت، بەڵام لــەم دەقە پیرۆزە بەڵگــە دەهێنرێتەوە لەســەر وەرگرتنــی ســەرانە (جزیـة) لە جگــە لە خــاوەن کتێبــەکان (جوولەکەو گــاورەکان)، هــەروەک ئەمە وتــەی زۆرێکە لــە زانایان.

هــەر کــەس بێبڕوا بێت بە تاغــووتو واز بێنێ لــە بەندایەتی کردنی غەیری خــواو گوێڕایەڵی شــەیتان، وە بڕوایەکــی تــەواو بێنێ، ئا ئەمــە گوێڕایەڵو پەرســتنی پەروەردگاری بۆ پێویســت دەبێــت ﴿فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ﴾ واتــە: (ئەوەی دەســت بگــرێ) بە ئاینی ڕاســت کــە بنەماکانــی چەســپیونو کۆڵەگەکانی چەقیــوون، بە متمانەوە، ئەوە دەســتی بــە هۆکارێکی قایــمو پتــەوەوە گرتوە ﴿لَا ٱنفِصَامَ لَهَا﴾ بــەڵام هەر کەس شــتەکە پێچەوانە بکاتــەوە، یانی: کافــر بــێ بــە خواو بــڕوا بــە تاغــووت بێنێ، ئــەوە بێگومــان ئــەو پەتەی کــە بەهێــزو پتەوە بــەری داوە، کــە بــە دڵنیایــی ڕزگاربــوونو پاراســتنی پێوەیە، ئا ئەو کەســە دەســتی گرتوە بە گشــت پووچەڵیــیو ناهەقیەکو داهاتووشــی دۆزەخــە ﴿وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ (وە خوا بیســەری زانایــە بۆیــە) پاداشــتو ســزای هــەر یــەک لەم دوو جــۆرە کەســە دەداتــەوە، بە پێــی ئەوەی زانیاریــان دەربــارەی هەبــووە لــە چاکــەو خراپــە، ئــا ئــەوە ئەنجامی دەســت گرتنو دەســت نەگرتنــە بــە پەتــی بەهێزو قایمــی (خوا کــە قوڕئانە).

ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِۖ
وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَوۡلِيَآؤُهُمُ ٱلطَّٰغُوتُ يُخۡرِجُونَهُم مِّنَ
ٱلنُّورِ إِلَى ٱلظُّلُمَٰتِۗ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا
خَٰلِدُونَ (٢٥٧) أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِي حَآجَّ إِبۡرَٰهِـۧمَ فِي رَبِّهِۦٓ
أَنۡ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلۡمُلۡكَ إِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ رَبِّيَ ٱلَّذِي يُحۡيِۦ
وَيُمِيتُ قَالَ أَنَا۠ أُحۡيِۦ وَأُمِيتُۖ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَأۡتِي
بِٱلشَّمۡسِ مِنَ ٱلۡمَشۡرِقِ فَأۡتِ بِهَا مِنَ ٱلۡمَغۡرِبِ فَبُهِتَ ٱلَّذِي
كَفَرَۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ (٢٥٨) أَوۡ كَٱلَّذِي
مَرَّ عَلَىٰ قَرۡيَةٖ وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا قَالَ أَنَّىٰ يُحۡيِۦ
هَٰذِهِ ٱللَّهُ بَعۡدَ مَوۡتِهَاۖ فَأَمَاتَهُ ٱللَّهُ مِاْئَةَ عَامٖ ثُمَّ بَعَثَهُۥۖ
قَالَ كَمۡ لَبِثۡتَۖ قَالَ لَبِثۡتُ يَوۡمًا أَوۡ بَعۡضَ يَوۡمٖۖ قَالَ بَل
لَّبِثۡتَ مِاْئَةَ عَامٖ فَٱنظُرۡ إِلَىٰ طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمۡ يَتَسَنَّهۡۖ
وَٱنظُرۡ إِلَىٰ حِمَارِكَ وَلِنَجۡعَلَكَ ءَايَةٗ لِّلنَّاسِۖ وَٱنظُرۡ إِلَى
ٱلۡعِظَامِ كَيۡفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ نَكۡسُوهَا لَحۡمٗاۚ فَلَمَّا
تَبَيَّنَ لَهُۥ قَالَ أَعۡلَمُ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ (٢٥٩)

ئنجا باسی ئەو هۆکارە دەکات کە ئەوانەی بەم سەرەنجامە گەیاندوە: ﴿ ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ ئەوە نزیکیو دۆستایەتیان بۆ پەروەردگاریان دەگرێتەوە، بەوەی کە بە دۆستی دادەنێنو هیچ هاوبەشو شەریکێکی بۆ دانانێن، ئەوانە خوایان بە خۆشەویستو دۆستو نزیک گرتووە، هەروەها دۆستایەتیو هاوکاریو پشتگیری دۆستانی خوایان کردوە، وە دژایەتی دوژمنانی خوای گەورەیان کردوە، بە میهرەبانی خۆی دۆستایەتیو پشتگیری کردوون بە چاکە، وە بە بەخششەکانی خۆی منەتباری کردوون، لە تاریکاییەکاندا دەری هێناون کە کوفرو گوناەو نەفامییە بۆ ڕووناکی ئیمانو گوێڕایەڵیو زانست، جا لەسەر ئەمە پاداشتیان بەوە دەدرێتەوە کە سەلامەتیان دەکات لە تاریکاییەکانی نێو گۆڕو حەشرو ڕۆژی دوایی بەرەو نازو نیعمەتی بەردەوامو پشوو ئاسوودەییو دڵخۆشیی، ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَوۡلِيَآؤُهُمُ ٱلطَّٰغُوتُ ﴾ شەیتان پشتگیری کۆمەڵەو حیزبی خۆیو دۆستانی دەکات، ئەو کەسانە جگە لە خوا دۆستو پشتگیریان بۆ خۆیان داناوە، وازیان لە دۆستایەتی خوای پەروەردگار هێناوە، خواش وەک تۆڵەیەک شەیتانیان بەسەردا زاڵ دەکات، ئەوانیش دەیانبەن بەرەو گوناهو سەرپێچی بە حەزو ئارەزووەوە، پەلیان دەکێشێ بۆ خراپە بە پەلکێشان، دەریاندەهێنێ لە ڕووناکی بڕواو زانستو گوێڕایەڵی، بۆ تاریکی کوفرو نەفامییو سەرپێچیی، پاداشتیان لەسەر ئەم ڕەفتارە ئەوەیە کە بێبەش کران لە خێرو چاکە، وە نازو نیعمەتە درەوشاوەو دڵخۆشکەرەکانیان لە دەست داوە، ئا ئەوان لە کۆمەڵو تاقمی شەیتانن، دۆستو نزیکانی ئەویش هەمیشە لە پەشیمانیو داخ لە دڵیدان، بۆیە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾ (واتە: ئەوانەن هاوەڵی ئاگرنو بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە).

(٢٥٨): ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِى حَآجَّ إِبْرَٰهِـۧمَ فِى رَبِّهِۦٓ أَنْ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلْمُلْكَ إِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّىَ ٱلَّذِى يُحْىِۦ وَيُمِيتُ قَالَ أَنَا۠ أُحْىِۦ وَأُمِيتُ ۖ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَأْتِى بِٱلشَّمْسِ مِنَ ٱلْمَشْرِقِ فَأْتِ بِهَا مِنَ ٱلْمَغْرِبِ فَبُهِتَ ٱلَّذِى كَفَرَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٢٥٨﴾ ﴾:

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِى حَآجَّ إِبْرَٰهِـۧمَ فِى رَبِّهِۦٓ ﴾ (واتـە: نابینـی ئـەو کەسـەی کە موناقەشـەی لەگـەڵ ئیبراهیم کـرد دەربارەی پەروەردگار) تەماشـای بوێـری‌و نەفامیی‌و گێلـی‌و دڵڕەقیـی‌و نکوڵی کردنـی ناکەی، کە هیچ گومـان‌و دوودڵیەکی تێدانیـە، بێگومان ئەمـەی ئـەو کەسـەی وا لێکـردوە تەنیـا ﴿ أَنْ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلْمُلْكَ ﴾ (خـوا ماڵ‌و سـامان‌و دەسـتەڵاتی پێـدا ئەویـش) سـنووری بەزانـدو تێپەڕانـد، کاتێـک بینـی ئـەو سـەرۆک‌و ژێـر دەسـتەی هەیـە، ئەمـە وای لێکـرد کـە دەربـارەی پەروەردگاری مشـت‌و مـڕ لەگەڵ ئیبراهیـم ﷺ بـکات، پێـی وا بـوو ئـەوەی خـوا دەتوانێ بیـکات، ئەمیـش دەیتوانـێ، بۆیە ئیبراهیـم وتـی: ﴿ رَبِّىَ ٱلَّذِى يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ﴾ واتـە: پەروەردگـاری من تـاک‌و تەنیایە، لـە بەڕێوەبردنـی گشـت کاروبارەکاندا، بـە تایبەتی زینـدوو کردنەوەو مراندن، چونکە ئەو دووانـە مەزنتریـن جۆرەکانـی بەڕێوەبـردن‌و مشـووری لێخواردنـن، لەبەر ئـەوەی ژیاندن‌و زینـدوو کردنـەوە سـەرچاوەو سـەرەتای ژیانـی دنیایـە، مراندنیـش سـەرچاوەو سـەرەتای ژیانـی دواڕۆژە، ئـەو مشـت‌و مـڕکارە وتـی: ﴿ أَنَا۠ أُحْىِۦ وَأُمِيتُ ﴾ نەیـوت: منـم ئـەو کەسـەی کـە زینـدوو دەکەمـەوەو دەیمرێنم، چونکـە داوای سـەربەخۆیی هەڵسـو کەوت‌و کارەکانـی نەکردبـوو، بەڵکـو تەنهـا وای دانابـوو کـە ئەویـش کارەکان دەکات، پێـی وا بـوو کـە کاتێک ئەو کەسـێک دەکـوژێ ئـەوە دەیمرێنـێ، وە کەسـێکیش کـە ناکوژێ ئـەوە زینـدووی کردۆتـەوە، جـا کـە ئیبراهیـم بینی لە کاتـی مشـت‌ومڕ کردنەکـەدا ئەو کەسـە هەڵـە دەکات‌و شـتەکان تێکـەڵ دەکات، قسـەکانی نابنـە بەڵگـە، بـۆی پەڕیوەو بۆ (بابەتێکـی دی‌و) وتـی: ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَأْتِى بِٱلشَّمْسِ مِنَ ٱلْمَشْرِقِ ﴾ واتـە: (خـوا خـۆر لـە ڕۆژ ئـاوا دەردێنـێ) بـە بەرچاو هەرکەسـێک دەیبینـێ دانی پیادەنـێ، تەنانەت کەسـی بێ بـڕواش، ﴿ فَأْتِ بِهَا مِنَ ٱلْمَغْرِبِ ﴾ ئەمـە ناچـار کردنیەتـی، بـە لادانی بەڵگەکـەی ئەگەر ڕاسـتگۆ بێـت لـە داواکـەی، لـەو کاتەی کـە کارێکـی پێوتـرا: توانـای نیـە، گومانی لێ بـکات‌و بەڵگەکە بشـێوێنێ، وە کەسـی بەرانبـەر هەڵخەڵەتێنێ لـە ڕێگاکەی ﴿ فَبُهِتَ ٱلَّذِى كَفَرَ ﴾ واتـە: دەمکـوت‌و سەرسـام بـوو، هیـچ وەڵامێکـی بـۆ نەمایـەوە، بەڵگەو مشـت‌و مـڕ کردنەکـەی پچـڕاو گومانەکـەی کەوت، ئـا ئەمە حاڵـی دڵـڕەق‌و نکوڵیـی کەرانە، کە

دەیــەوێ ڕووبــەڕوو هەق بوەســتێ، ئەو کەســە دۆڕاوەو شکســت خــواردوە، ئەمەیە خوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴾ (خــوا ڕێنمایــی ئەو کۆمەڵە ســتەمکارانە نــاکات)، بەڵکو لەســەر کوفــرو گومڕایی دەیانهێڵێتــەوە، ئەوان بۆ خۆیان ئەوەیــان هەڵبژارد، ئەگەرنــا مەبەســتیان هەڵبژاردنــی هــەق بووایە ئــەوە ڕێنمایی کــران بــۆی، وە هۆکارەکانی گەیشــتن بــەو هەقەشــیان بــۆ ئاســان کــرا، جا لــەم دەقــەدا بەڵگــەی یەکلاکــەرەوەو تەواو هەیــە لــە تــاکو تەنهایــی پەروەردگــار بــە بەدیهێنــانو بەڕێوەبــردن، جــا لەمــەوە ئەمــە پێویســت دەبــێ کە مــرۆڤ لە گشــت کاتو ســاتێک، وە لە هەمــوو حاڵێکدا تەنها پشــت بــە خوا ببەســتێ لــە پەرستشــەکانی، (إبن القیــم) ڕەحمەتــی خوای لێ بــێ دەڵێ: لــەو گفتو گۆیــەدا ســوودێکی زۆر ورد هەیــە ئەویــش بریتیــە لــەوەی هاوبــەش دانانی جیهــان بریتیە لە پشــت بەســتن بە پەرســتنی ئەســتێرەکانو گــۆڕەکان، پاشــان دروســتکردنی وێنەکانیان، کــە هــەردوو بەڵگــەکان ئەوانــەی ئیبراهیــم بەڵگەی پــێ هێنایــەوە پووچەڵکردنــەوەی ئەو ڕســتەیە کە گوایە ئەو کەســە مشــتو مــڕ کارە دەژێنــێو دەمرێنێ، ئەو زینــدووەی دەمرێ هەرگیــز ناگونجــێ بپەرســترێ، نە لــە کاتی ژیانیــدا، وە نە لــە دوای مردنیــدا، بێگومان ئەو کەســە پەروەردگارێکــی هەیــە کە زاڵو توانــادارە بۆ بەڕێوەبــردن لە ژیانــدنو مراندندا، جا کەســێک ئــەوە حاڵــی بێ چــۆن دەبێ بپەرســترێو وێنەی بت لەســەر شــێوەی بکێشــرێت، وە بپەرســترێ لــە جێگای خــوا، وە بەهەمان شــێوە ئەســتێرەکانیش دیارتریــنو مەزنترینیان بــۆ ئەوەی هەســتی پێبکرێ ئــەو خۆرە، کە ئەویــش پەروەردەکــراو بەڕێوەبــراوەو ژێربار خــراوە بــۆ مەبەســتێک، بــە هیچ جۆرێــک بۆی نیــە هیــچ هەڵســو کەوتێک بــکات، بەڵکو پەروەردگــارو بەدیهێنــەری پــاکو بێگــەردی لە خۆرهەڵاتــەوە دەیهێنــێ، ئەویش ملکەچی فەرمــانو ویســتی خوایە، خــۆر پەروەردەکراو ژێربارخــراوو بەڕێوەبراوە، غەیــری خوا هیچ پەرســتراوێکی دیکــە ناپەرسترێ، کتێبی (مفتــاح دار السـعادة).

(٢٥٩): ﴿ أَوْ كَٱلَّذِى مَرَّ عَلَىٰ قَرْيَةٍ وَهِىَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا قَالَ أَنَّىٰ يُحْىِۦ هَـٰذِهِ ٱللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا فَأَمَاتَهُ ٱللَّهُ مِاْئَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُۥ قَالَ كَمْ لَبِثْتَ قَالَ لَبِثْتُ يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ قَالَ بَل لَّبِثْتَ مِاْئَةَ عَامٍ فَٱنظُرْ إِلَىٰ طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمْ يَتَسَنَّهْ وَٱنظُرْ إِلَىٰ حِمَارِكَ وَلِنَجْعَلَكَ ءَايَةً لِّلنَّاسِ وَٱنظُرْ إِلَى ٱلْعِظَامِ كَيْفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ نَكْسُوهَا لَحْمًا فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥ قَالَ أَعْلَمُ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٥٩﴾ ﴾:

هەروەهــا ئەمــەش بەڵگەیەکی دیکەیە لەســەر یەکتاناســی خوا لــە بەدیهێنــانو بەڕێوەبردنو

مراندنو ژیانـدن، فەرموویەتـی: ﴿ أَوْ كَالَّذِي مَرَّ عَلَىٰ قَرْيَةٍ وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا ﴾ واتە: خەڵكەكانی لـە نێو چوونو دانیشـوانەكەی فەوتا بوون، شـوورەو دیوارەكانـی كەوتبوونو جێـی سـەرنجو هۆگـر بـوون بـوو، بەڵكـو چـۆڵ بوو هیـچ خەڵكـی لـێ نەمابـوو خاپورو سـامناك بـوو، ئـەو پیاوە لە دیـاری وەسـتاو بە سەرسـوورمانەوە، وتـی: ﴿ أَنَّىٰ يُحْيِي هَٰذِهِ اللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا ﴾ بـە دوور دانانـی بـۆ ئـەوەو نەزانینـی بـە دەسـەڵاتو توانـای خـوا ﷻ لـەو كاتـەی خـوا ویسـتی چاكـەی لەگـەڵ بـكات نیشـانەیەكی لـە خـودی كەسـەكەو گـوێ درێژەكـەی پـێ پێشـان بـدات، هەروەها ئـەو خـواردنو خواردنەوەی لـە لای بوو، ﴿ فَأَمَاتَهُ اللَّهُ مِائَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُ قَالَ كَمْ لَبِثْتَ قَالَ لَبِثْتُ يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ ﴾ بـە كـورت كردنـەوەی بـۆ ئـەو ماوەی كـە تێیدا مـرد بـوو، چونكە ئـەو زانیـنو هەسـتەكانی نەماوو حاڵـی پێـش مردنـی پێـوە ئاشـنا بـوو، پێـی وتـرا: ﴿ بَل لَّبِثْتَ مِائَةَ عَامٍ فَانظُرْ إِلَىٰ طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمْ يَتَسَنَّهْ ﴾ واتـە: نەگـۆڕاوە، بەڵكـو لەسـەر حـاڵو بـاری خـۆی ماوەتـەوە لەگـەڵ درێژ بوونەوەی سـاڵەكانیشو جیـاوازی كاتەكانی بەسـەری هاتووە، ئەمە گەورەتریـن بەڵگـەی تێدایـە لەسـەر توانای خوا بـەوەی هێشـتویەتیەوەو پاراسـتوویەتی لە گـۆڕانو تێكچـوون، لەگـەڵ ئـەوەی خـواردنو خواردنەوە لە هەموو شـت زیاتـرو زووتر تێكدەچـن، ﴿ وَانظُرْ إِلَىٰ حِمَارِكَ ﴾ (واتـە: وە سـەیری گـوێ درێژەكەت بكـە) كە مرد بـوو گۆشـتو پێسـتەكەی ڕزیو پارچە پارچـە بوو بوون، ئێسـكەكانی پـەرشو بڵاو بوو بـوون، جومگەو گەینەرەكانـی جیابوو بوونـەوە ﴿ وَلِنَجْعَلَكَ آيَةً لِّلنَّاسِ ﴾ (خوا پێـی فەرمـوو ئـا ئەمـە دەكەینـە بەڵگەو نیشـانە بـۆ خەڵـك) لەسـەر توانای خـواو زیندوو كردنـەوەی مـردووەكان لـە گۆڕەكانیـان، تاكـو ببنـە نموونـەی هەسـت پێكـراوو بینراو بـە چـاوەكان)، كەواتـە: ڕاسـتو دروسـتی ئـەوەی ڕەوانەكـراوان هەواڵیان پێـداوە بزانن ﴿ وَانظُرْ إِلَى الْعِظَامِ كَيْفَ نُنشِزُهَا ﴾ واتـە: هەندێكیـان دەبەینە نـاو هەندێكیان، هەندێكیـان بـە هەندێكیان دەبەسـتینەوە، ﴿ ثُمَّ نَكْسُوهَا لَحْمًا ﴾ بە چاوەكانی تەماشـای كـردن هەروەكـو خـوا ﷻ وەسـفی كـردن ﴿ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ ﴾ (دوای) ئـەوەی توانـای خـوای بەرزی بـۆ دەركـەوتو زانـی ﴿ قَالَ أَعْلَمُ أَنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾ بە پێی سـیاقی دەقەكـە ئەم پیـاوە نكوڵیكەر بـووە، بۆ زیندوو بوونـەوەو خوا خێری پێی ویسـتووە، وە كردوویەتیـە نیشـانەو بەڵگـەش بـۆ خەڵكـی، لە سـێ ڕووەوە ئەمـە دەردەكەوێ:

یەكـەم: كـە دەڵـێ: ﴿ أَنَّىٰ يُحْيِي هَٰذِهِ اللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا ﴾ ئەگـەر پێغەمبـەر، یـان پیاوێكـی

صاڵح بوایـە، ئەمەی نـەدەوت.

دووەم: خـوا نیشـانەو بەڵگـەی لـە خـواردنو خواردنـەوەو گـوێ درێژەکـەیو خـودی کەسـەکەی نیشـاندا، تـا بـە چاوی خـۆی ببینـێو دان بنـێ بـەوەی نکوولّی لێ دەکـرد، لە دەقەکـەدا بـاس نەکـراوە ئەو شـارەی کـە باسـکراوە ئـاوەدان کرابێتەوە بـۆ دۆخی خۆی، وە لە سـیاقی دەقەکەشـدا شـتێک نیە بەڵگەبێ لەسـەر ئەوە، لەوەشـەوە سـوودی زۆری نیە، قازانـجو خاپـوور بووبێ کـە بەڵگە بێت لەسـەر زیندوو کردنـەوەی خوا بۆ مـردووەکان لە ئاوەدانیـەک کاولو خاپـوور بووبـێ، پاشـان خەڵکەکـەی گەڕابنەوە بۆی، یـان جگە لەوان ئاوەدانیـان کردبێتەوە؟! بەڵکو بەڵگەی تەواوو ڕاسـتەقینە لە زیندوو کردنەوەی کەسـەکەیە، هەروەهـا لـە زیندوو کردنـەوەی گوێدرێژەکـەیو مانـەوەی خـواردنو خواردنەوەکەیەتی وەک خۆی.

سـێیەم: ﴿فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥ﴾، واتـە: ئـەو کارەی نەیدەزانـی لێی شـاراوە بوو، بـۆی ڕوون بوویـەوەو بـەم هۆیەوە، ئـەوەی باسـمان کرد خـوا زاناترە.

وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ ۖ قَالَ أَوَلَمْ
تُؤْمِن ۖ قَالَ بَلَىٰ وَلَـٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي ۖ قَالَ فَخُذْ أَرْبَعَةً مِّنَ
ٱلطَّيْرِ فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ ثُمَّ ٱجْعَلْ عَلَىٰ كُلِّ جَبَلٍ مِّنْهُنَّ جُزْءًا
ثُمَّ ٱدْعُهُنَّ يَأْتِينَكَ سَعْيًا ۚ وَٱعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٦٠﴾
مَّثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ
أَنۢبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنۢبُلَةٍ مِّائَةُ حَبَّةٍ ۗ وَٱللَّهُ
يُضَـٰعِفُ لِمَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٦١﴾ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ
أَمْوَٰلَهُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ لَا يُتْبِعُونَ مَآ أَنفَقُوا۟ مَنًّا وَلَآ
أَذًى ۙ لَّهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ
يَحْزَنُونَ ﴿٢٦٢﴾ ۞ قَوْلٌ مَّعْرُوفٌ وَمَغْفِرَةٌ خَيْرٌ مِّن صَدَقَةٍ
يَتْبَعُهَآ أَذًى ۗ وَٱللَّهُ غَنِيٌّ حَلِيمٌ ﴿٢٦٣﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟
لَا تُبْطِلُوا۟ صَدَقَـٰتِكُم بِٱلْمَنِّ وَٱلْأَذَىٰ كَٱلَّذِي يُنفِقُ مَالَهُۥ
رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ ۖ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ
صَفْوَانٍ عَلَيْهِ تُرَابٌ فَأَصَابَهُۥ وَابِلٌ فَتَرَكَهُۥ صَلْدًا ۖ لَّا يَقْدِرُونَ
عَلَىٰ شَيْءٍ مِّمَّا كَسَبُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِي ٱلْقَوْمَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٢٦٤﴾

لە پاشان خوا ﷻ دەفەرموێ:

(٢٦٠): ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ ۖ قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن ۖ قَالَ بَلَىٰ وَلَـٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي ۖ قَالَ فَخُذْ أَرْبَعَةً مِّنَ ٱلطَّيْرِ فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ ثُمَّ ٱجْعَلْ عَلَىٰ كُلِّ جَبَلٍ مِّنْهُنَّ جُزْءًا ثُمَّ ٱدْعُهُنَّ يَأْتِينَكَ سَعْيًا ۚ وَٱعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٦٠﴾ ﴾:

هەروەها ئەمەش گەورەترین بەڵگەی هەست پێکراوە لەسەر توانای خواو زیندوو کردنەوەی مردووان بۆ کۆکردنەوەو پاداشتدانەوەیان، خوا ﷻ هەواڵیدا دەربارەی خۆشەویستی خۆی ئیبراهیم ﷺ کە ئەو پرسیاری لێکردوە بە بەرچاوەکانی پیشانی بدات چۆن مردوو زیندوو دەکاتەوە، چونکە بێگومان بووەو دڵنیا بووە بە هەواڵدانی خوا ﷻ، بەڵام حەزی کردوە بە بەرچاویەوە ببینێ، تا پلەی بینینی دڵنیایی (عین الیقین) ی بۆ پەیدابێ، لەبەر ئەمەیە خوا پێی فەرمووە: ﴿ أَوَلَمْ تُؤْمِن ۖ قَالَ بَلَىٰ وَلَـٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي ﴾ ئەوە بە هاتن و بوونی بەڵگەی دڵنیایی کە بڕوای پێ زیاد دەکاو دڵنیایی پێ تەواو دەبێ کۆشش دەکات بۆ گەیشتنە ئەهلی عیرفان، جا پەروەردگاری پێ فەرمووە: ﴿ فَخُذْ أَرْبَعَةً مِّنَ ٱلطَّيْرِ فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ ﴾ واتە: (چوار باڵندە) بگرە تا ئەوە بەچاو ببینیت و لەسەر دەستەکانت (ڕووبدات)، ﴿ ثُمَّ ٱجْعَلْ عَلَىٰ كُلِّ جَبَلٍ مِّنْهُنَّ جُزْءًا ﴾ واتە: (دوایی) پارچە پارچەیان بکە، پارچەکانی هەندێکیان لەگەڵ هی هەندەکەیتریان تێکەڵ بکە هەر یەکەو لەسەر چیایەک دابنێ، واتە: لە چیاکانی کە لێیانەوە نزیک بووە، هەر بەشەو لە شوێنێک دابنێ، ﴿ ثُمَّ ٱدْعُهُنَّ يَأْتِينَكَ ﴾ (دوایی بانگیان بکە، دێنە لات) واتە: ژیان دەچێ بە بەریانداو بە تەواوی زیندوو دەبنەوە، دێن بۆ لای بەهێزو بەخێرایی، ئیبراهیم وای کرد، ئەوەی دەیویست بەدیهات، ئەوە نیشانەی خاوەندارێتی و دەستەڵاتەکانی ئاسمانەکان و زەوییە بۆ خوا کە پێشانیدا، وەک دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ

﴿نُرِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلۡمُوقِنِينَ ٧٥﴾الأنعام، (واتـه: وه هـەر بـەو شـێوەیەش موڵکـی فـراوانو سەرسـوڕهێنەری ئاسـمانەکانو زەوییمان پێشـانی ئیبراهیـم دا (تاکـو بەرچـاوی ڕۆشـن بـێ)، وه بـۆ ئـەوەی لـە بـڕوا پتـەوان بێ).
پاشـان فەرموویەتی: ﴿وَٱعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ﴾ واتە: خاوەنی هێـزی مەزنە بەدیهێنراوانی ژێـر فەرمانی کردوە، هیچ شـێک لەوانـە لێی یاخی نابـێ، بەڵکو ئەوان ملکەچـن بۆ عیزەتی خـواو گـەردن کەچن بـۆ شـکۆداریو مەزنیەتیە کـەی، لەگـەڵ ئـەوەش کارو کردەوەکانی خـوا ﷻ بەپێـی حیکمەتەکانیەتی، هیچ شـتێکی بـێ ماناو بێ هـودە ناکات.
(٢٦١): ﴿مَّثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنۢبَتَتۡ سَبۡعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنۢبُلَةٖ مِّاْئَةُ حَبَّةٖۗ وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ٢٦١﴾
ئەمـە ڕوونکردنەوەیـە بـۆ زیـاد کردنـی چەنـد بەرانبـەری (قەرزێکـە کـە لەبـەر خـوا دەدرێ) وەک باسـی کردوەو دەفەرمـوێ: ﴿مَّن ذَا ٱلَّذِي يُقۡرِضُ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ أَضۡعَافٗا كَثِيرَةٗۚ وَٱللَّهُ يَقۡبِضُ وَيَبۡصُۜطُ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ٢٤٥﴾آل عمران. (واتـە: کێیـە ئـەو کەسـەی دەسـتقەرز لەگـەڵ خـوادا بـکات بـە قەرزێکـی بـاش، تاکـو ئەویش بـە چەنـد بەرانبـەری زۆر بـۆی قەرەبـوو بکاتـەوە! وە خـوا (ڕۆزیـی) وە تەنـگ دێنـی و فراوانـی دەکات، وە بـۆ لای ئەویـش دەگێردرێنـەوە)، لێـرەدا فەرموویەتـی: ﴿مَّثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ واتـە: لـە گوێڕایەڵـیو جێبەجـێ کردنـی فەرمانەکانیو ڕەزامەنـدی پەروەردگـار خەرجی دەکـەن ﴿كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنۢبَتَتۡ سَبۡعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنۢبُلَةٖ مِّاْئَةُ حَبَّةٖ﴾ ئەمـە ئامـادە کردنـە بـۆ وێنـەی زیـاد کردنـی چەنـد بـارەو هێنـدەی خۆی، بـەم نموونـە، ئـەوەی بەندە بـە چاوەکانـی دەیبینـێ، ئەم چەنـد بارەش بـە بەرچـاو ڕوونی دەیبینـێ، شـایەتی ئیمـان بەهێز دەبێ بە شـایەدی بینین بـە چـاو، دڵو دەروون ملکەچ دەبێ بـۆ بەخشـینو دڵ پێـی فـراوان دەبـێ، وە ئومێـدەوار دەبـێ بـۆ ئەم چەنـد بەرانبـەرە زۆرو منەتـە گەورەیـە ﴿وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ﴾ ئەمە چەند بەرانبـەرە ﴿لِمَن يَشَآءُ﴾ واتە: بـە گوێرەی حاڵـی بەخشـەرو دڵسـۆزیو ڕاسـتگۆیی، وە بە گوێـرەی حاڵـی بەخشـینەکەیو حەڵاڵیو سـوودیو جێگرتنـی دەبـێ، ئەگـەر ئاوابـێ ﴿وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ﴾ زیاتـر لـەم چەنـد بەرانبەرە ﴿لِمَن يَشَآءُ﴾ پاداشـتیان دەداتـەوە بەبێ ژمـارە ﴿وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ﴾ خوا خاوەنی بەخشـشو فراوانـی بەخشـینە، کـە وەرگـر پـێ گەیشـت لـێ کـەم ناکاتـەوە، سـواڵکەریش تەنگـی نـاکات، بەخشـەر گومانـی ئەوە نـەکات کە ئـەو چەنـد بەرانبـەرە جۆرێک لـە زێدەڕۆیی

تێدایـە، چونکـە خـوا ﷻ هیچ شـتێک نیـە گەورەیـیو مەزنی بەسـەردا بکات، بەخشـینیش چەنـد زۆریـش بێـتو لێی کەم ناکاتـەوە، لەگەڵ ئەمەشـدا ئەو ﴿ عَلِيمٌ ﴾ە، بەو کەسـەی شایسـتەی ئـەم چەنـد بەرانبەرەیـەو وەکـێ شایسـتە نیـە، چەنـد بەرانبـەر لە شـوێنی خۆی دادەنـێ لەبـەر تەواوەتـی زانسـتو حیکمەتەکەی.

(٢٦٢-٢٦٣): ﴿ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ لَا يُتْبِعُونَ مَآ أَنفَقُواْ مَنًّا وَلَآ أَذًى لَّهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٢٦٢﴾ قَوْلٌ مَّعْرُوفٌ وَمَغْفِرَةٌ خَيْرٌ مِّن صَدَقَةٍ يَتْبَعُهَآ أَذًى وَٱللَّهُ غَنِىٌّ حَلِيمٌ ﴿٢٦٣﴾ ﴾:

واتــە: ئەوانەی ســامانەکانیان دەبەخشــن لە پێنــاو گوێڕایەڵــیو جێبەجێکردنــی فەرمانەکانی خــوا، ڕێگــە نــادەن ئەوەی بــە دوا دابێ کــە لێی کــەم دەکاتــەوەو تێکــی دەدات، لە منەت کــردن پێیــەوە بەســەر ئەو کەســەی کــە پێی دەبەخشــێ بــە دڵ بێ، یــان بە زمــان، بەوەی چاکەکانــی بەســەریدا بژمێــرێو داوای بەرانبــەر بۆ کردنی لــێ بکات، ئــازاری گوفتاریو کرداریــی نــەدات، ئــا ئەوانە نە ترســیان لەســەرەو نــە غەمباریش دەبــن، چاکەیان بــۆ دابین بــووەو خراپەیــان لەســەر لابراوە، چونکــە ئــەوان کارێکیان کــردوە بە پاکیو دڵســۆزیەوە بــۆ خوا ســەلامەتە لــە تێکــدەران ﴿ قَوْلٌ مَّعْرُوفٌ ﴾ واتە: دڵــەکان دەیزاننو ڕەتــی ناکەنەوە ڕقیــان لــێ نیــە، ئەمــە هەمــوو قســەیەکی بەڕێــز دەگرێتــەوە، دڵخۆشــی خســتنە نێــو دڵی مســوڵمانان، وەڵامدانــەوەی ســواڵکەر بــە قســەی جــوانو دوعا کردن بــۆی ﴿ وَمَغْفِرَةٌ ﴾ ئــەو کەســەی خراپەی لەگەڵــت کرد بە واز لــێ هێنانو لێبوردنــی، دەچێتە چــوار چێوەیەوە لێبــوردن لــە هەر شــتێک کــە لە کەســی ســواڵکەر دەردەچــێو نەگونجاوە، قســەی چاکو لێبوردەیــی چاکتــرە لــە ســەدەقەو چاکەیــەک کــە ئــازارو ئەزیەتی بــە دواوە بــێ، چونکە قســەی چــاک چاکەی وتەیــە، هەروەها لێبوردەیــش چاکەیــە بەوازهێنان لە تۆڵەســەندنەوە، هەردووکیــان چاکەنــو خراپەیــان تێــدا نیــە، هەردووکیــان باشــترو پلەدارترن لــە چاکە بە ســەدەقەو خێــر کردنێــک کــە ئــازارو ئەزیەتی منــەت کردنی بــە دوادا بێ.

تێگەیشــتن لەمــەدا ئەوەیــە بێگومــان هەر ســەدەقەو خێــر کردنێک کــە ئــازارو ئەزیەتی بە دواوە نەبــێ باشــترە لــە قســەی چــاکو لێبوردەیــی، چونکــە بــە ڕاســتی منــەت کــردن بە ســەدەقەو خێــر کــردن تێکــدەری خێرەکەیــەو حەرامــە، چونکــە منــەت کــردن تەنهــا بۆ خــوای بــەرزە بیــکات، چاکــەش هەمــوو هــی خوایــە، جــا مــرۆڤ نابــێ منەت بــکات بە نــازو نیعمەتەکانــی خــواو چاکەکانــیو پلــەو بەخشیشــەکانی ئــەو (چونکــە ئــەو چاکە لە

خـودی ئەو کـەس)ەوە نیە، هەروەها منەتـکار داوای کۆیلایەتیو بەندایەتـی دەکات لەوەی منەتـی بەسـەردا دەکات، زەلیلـیو بـە بەنـدە کردن بـۆ هیچ کەس نیـە، جگە لە خـوا، خوا بـێ نیـازو دەوڵەمەنـدە لـە هەموو دروسـت کراوەکانـی، هەموویان پێویسـتو هـەژارن بۆ لای ئـەو لـە هەموو حـاڵو کاتێکـدا، سـەدەقەو بەخشـینو گوێڕایەڵـیو جێبەجـێ کردنی فەرمانەکانتـان سـوودو بەرژەوەندیەکـەی دەگەڕێتـەوە بۆ خۆتـان ﴿وَٱللَّهُ غَنِيٌّ﴾ (خوا بێ نیـازو دەوڵەمەنـدە) لێیـان، لەگەڵ ئەوەشـدا ئەو (خوا) ﴿حَلِيمٌ﴾ە، (لەسـەرخۆیە) لەسـەر ئـەوەی سـەرپێچی دەکات، پەلـە نـاکات بـە تۆڵە لـێ سـەندنەوەی، لەگـەڵ بوونـی تواناو دەسـتەڵات بەسـەریدا، بـەڵام بەزەیـیو چاکەو لەسـەرخۆیی خوا سـزا بۆ سـەرپێچیکارانو تاوانبـاران پێـش ناخات، بەڵکـو مۆڵەتیـان دەداو ماوەیان پـێ دەداتو ئایەتیان بـۆ دەنێرێ، بەڵکـو بگەڕێنـەوە بـۆ لای خـواو پەشـیمان ببنەوە، جا کـە خوا زانـی خێریان تێـدا نەماوە ئایەتـەکان هیـچ سـودێکی نابێ بۆیـان، تۆڵەو پەندەکان سـوودیان پـێ ناگەیەنێـت، تۆڵەی خـۆی بۆیـان دادەبەزێنێو بـێ بەشـیان دەکات لە زۆری پاداشـتەکەی.

(٢٦٤): ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُبۡطِلُواْ صَدَقَـٰتِكُم بِٱلۡمَنِّ وَٱلۡأَذَىٰ كَٱلَّذِي يُنفِقُ مَالَهُۥ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۖ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ صَفۡوَانٍ عَلَيۡهِ تُرَابٞ فَأَصَابَهُۥ وَابِلٞ فَتَرَكَهُۥ صَلۡدٗاۖ لَّا يَقۡدِرُونَ عَلَىٰ شَيۡءٖ مِّمَّا كَسَبُواْۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٢٦٤﴾

خـوای پەروەردگـار بـە میهرەبانـیو بەزەیی خـۆی قەدەغەی کـردوە لە بەندەکانـی خێرو چاکەکانیـان هەڵبوەشـێننەوە بە منـەت کردنو ئـازاردان (لەبەرانبـەر خێر پێکـراودا)، ئەمە ئـەوە دەگەیەنـێ کە بە ڕاسـتی منەتو ئـازاردان خێرو سـەدەقە هەڵدەوەشـێنێتەوە، جا بەڵگە بەمـە دەهێنرێتـەوە لەسـەر ئەوەی کـردەوە خراپەکان کـردەوە چاکەکان هەڵدەوەشـێننەوە، وەک خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿وَلَا تَجۡهَرُواْ لَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ كَجَهۡرِ بَعۡضِكُمۡ لِبَعۡضٍ أَن تَحۡبَطَ أَعۡمَٰلُكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تَشۡعُرُونَ ٢﴾الحجـرات، (واتـە: بـە قسـەو بـە دەنگی بەرزو بـێ پەردە قسـە لەگـەڵ پێغەمبـەر ﷺ مەکـەن هەروەک قسـە کردنـی هەندێکتـان لەگـەڵ هەندێک، کارو کـردەوە چاکەکانتـان هەڵدەوەشـێنەوە ئێوەش هەسـتی پـێ ناکەن).

جـا هـەروەک چاکـەکان خراپـەکان لادەبـەن، هـەر ئاواشـە خراپـەکان ئـەو چاکانەی لە بەرانبەریانـن هەڵیـان دەوەشـێننەوە، وەک لـە شـوێنی دی دەفەرمـوێ: ﴿وَلَا تُبۡطِلُوٓاْ أَعۡمَٰلَكُمۡ ٣٣﴾محمـد، (واتـە: کارو کردەوەکانتـان هەڵمەوەشـێننەوە) ئەمـە هاندانـە لەسـەر تەواو کردنـی کارو کـردەوەکانو پاراسـتنیان لە هەر شـتێک کـە تێکیان بدەن، تاکـو کارەکان

بـە فیرۆ نەچـنو هەروا نـەڕۆن، کـە دەفەرمـوێ: ﴿كَٱلَّذِى يُنفِقُ مَالَهُۥ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ﴾ واتـە: ئێـوە ئەگـەر لە سـەرەتای ئـەم کارەدا مەبەسـتتان خوا بـووە، بە منـەت کـردنو ئـازاردان کردەوەکانتـان هەڵدەوەشـێتەوە، کارەکانتـان بـەرەو ڕیـا کردن دەبـات، وەک ئـەو کەسـەی کـە مەبەسـتی پێـی خـواو ڕۆژی دوایـی نەبێـت، ئەمـە هیچ گومانێـک نیـە لـەوەی کارەکەی لـە بنەڕەتـدا ڕەتکراوەیە، چونکـە مەرجی قبـووڵ بوونی هـەر کارێکـی خێـر، ئەوەیـە کـە تەنیـا بۆ خـوا بـێ، ئەویـش لـە ڕاسـتییدا کار کردنە بۆ خەڵکـی نەک بۆ خـوا، بۆیە کردەوەکانـی پووچەڵەو هەوڵەکەی سـوپاس کـراو نیە، وەک چـۆن نیەتەکـەی بەتاڵـە، کردەوەکەشـی بـە تـاڵ دەبێتـەوە، ﴿كَمَثَلِ صَفْوَانٍ﴾ (صفوان) بریتیـە لـە بەردی زۆر لـووس، ﴿عَلَيْهِ تُرَابٌ فَأَصَابَهُۥ وَابِلٌ﴾ واتە: بارانێکـی زۆرو بە خوڕو ﴿فَتَرَكَهُۥ صَلْدًا﴾ واتـە: هیـچ خـۆڵو گڵـی لەسـەر نەبـێ، هەر ئـاوا حاڵو بـاری ئەو ڕیابـازەش ئاوایـە، دڵـی ڕەقو توونـدە، وەک بـەردی لـووس، خێرکردنو بەخشـینەکەیو نموونەیـان لـە کارو کردەوەکانـی، وەک ئـەو خۆڵو گڵەیە کە لەسـەر بەردە لووسـەکەیە، ئەگـەر کەسـێکی نـەزان حاڵی ببینـێ گومـان دەکات کە ئـەوە زەوییەکی پاکو بـە پیتە، دەگونجـێ بـۆ ڕووەکو سـەوزایی، جـا ئەگـەر ڕاسـتیەکەی ئاشـکرا بوو، بە دیـار کەوت حـاڵو بارەکەی ئەو خۆڵـە دەڕواو لادەچێ، وە ڕووندەبێتەوە کە کـردەوەی وەکو تراویلکەو سـەراب چـەوت بینـی وایە، دڵەکـەی گونجاو نیـە بۆ ڕوواندنـی ڕووەکو چانـدنو نەشو نماکـردن لەسـەری، بەڵکو ئەو ڕیـاو ڕوپامایی تیایدایە ویسـتە پیسـەکانی هەیەتی قەدەغەی دەکـەن لـە سـوودو کەڵـک وەرگرتـن بـە شـتێک لـە کارو کردەوەکانـی، لەبـەر ئەمەیە ﴿لَّا يَقْدِرُونَ عَلَىٰ شَىْءٍ﴾ لـە کردەوەکانیـان کـە بـە دەسـتیان هێنـاوەو کردوویانـە، چونکـە ئـەوان لە غەیـری شـوێنی (گونجاوی) خۆیـان دایاننـاوە بـۆ بەدیهێنراوێکی وەک خۆیانیـان کـردوە، کـە نـە قازانجو سـوود نـە زەرەرو زیانیـان بە دەسـت نیە، لایانـداوە لە پەرسـتنی ئەوەی پەرسـتنەکەی سـوودو قازانجیان پـێ دەگەیەنێـت، خـوا دڵەکانیانی لاداوە لـە ڕێنمایـی، لەبەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ (واتە: بێگومان خـوا ڕێنمایی کۆمەڵـی بێبڕوایـان ناکات).

وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمُ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ
وَتَثْبِيتًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ كَمَثَلِ جَنَّةٍۭ بِرَبْوَةٍ أَصَابَهَا وَابِلٌ
فَـَٔاتَتْ أُكُلَهَا ضِعْفَيْنِ فَإِن لَّمْ يُصِبْهَا وَابِلٌ فَطَلٌّ
وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢٦٥﴾ أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَن تَكُونَ لَهُۥ
جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ لَهُۥ
فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَأَصَابَهُ ٱلْكِبَرُ وَلَهُۥ ذُرِّيَّةٌ
ضُعَفَآءُ فَأَصَابَهَآ إِعْصَارٌ فِيهِ نَارٌ فَٱحْتَرَقَتْ ۗ كَذَٰلِكَ
يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْـَٔايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢٦٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا
ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَنفِقُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّآ أَخْرَجْنَا
لَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ ۖ وَلَا تَيَمَّمُوا۟ ٱلْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ
وَلَسْتُم بِـَٔاخِذِيهِ إِلَّآ أَن تُغْمِضُوا۟ فِيهِ ۚ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ
حَمِيدٌ ﴿٢٦٧﴾ ٱلشَّيْطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِٱلْفَحْشَآءِ ۖ
وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلًا ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ
﴿٢٦٨﴾ يُؤْتِى ٱلْحِكْمَةَ مَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُؤْتَ ٱلْحِكْمَةَ فَقَدْ
أُوتِىَ خَيْرًا كَثِيرًا ۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢٦٩﴾

(٢٦٥): ﴿ وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمُ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ وَتَثْبِيتًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ كَمَثَلِ جَنَّةٍۭ بِرَبْوَةٍ أَصَابَهَا وَابِلٌ فَـَٔاتَتْ أُكُلَهَا ضِعْفَيْنِ فَإِن لَّمْ يُصِبْهَا وَابِلٌ فَطَلٌّ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢٦٥﴾ ﴾:

ئەمە نموونەیە بۆ ئەوانەی سامانیان بەخشیوە بە وردی کە بەخشینەکانیان نەش و نما دەکات و خێرو سەدەقەکانیان پێیەوە وەردەگیرێ، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمُ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ ﴾ واتە: مەبەستیان لەوەدا ڕەزامەندی پەروەردگاریانەو بردنەوەیە بە نزیک بوونەوە لێی، ﴿ وَتَثْبِيتًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ ﴾ واتە: بەخشینەکە بە دڵێکی فراوانو دەروونێکی ئاسودەو دەستکراوەوە دەرچووە، نەک دوو دڵیو لاوازی نەفس و دەروونێکی نەخۆشەوە، بەوشێوە بەخشین دوو دەرد تووشی دەکات: یان مرۆڤ مەبەستی پێی ڕێزو پیاهەڵدانی خەڵکیە بێگومان ئەوەش ڕووپامایيە، یان بە لاوازیو دوو دڵیو گومانەوە دەریدەکات، جا ئەوانە سەلامەتن لەم دوو دەردو بەڵایە، ئەوان تەنها لە پێناو ڕەزامەندی خوا بەخشیویانە، نەک بۆ هیچ مەبەستێکی تر، وە بە دڵو دەرونێکی دامەزراوەوە ئەم کارە دەکەن، جا نموونەی بەخشینی ئەوانە ﴿ كَمَثَلِ جَنَّةٍ ﴾ (وەک وێنەی باخێکە) واتە: زۆری دارو درەختو زۆریو چڕوپڕیو سێبەرەکان، لەبەر داپۆشینی ئەوەی کە تیایدایە، ئەو باغو بەهەشتە ﴿ بِرَبْوَةٍ ﴾ واتە: شوێنی بەرزو دیارو ئاشکرا بۆ خۆر لە سەرەتای ڕۆژو ناوەڕاستیو دوایی دا، بەروبوومەکەی زۆرترین بەروبوومو چاکترینیانە، لە جێگای ئەوەنیە دابەزیبێ لە خۆرو با ﴿ أَصَابَهَا ﴾ واتە: ئەو باغو (بەهەشتە)ی لەو شوێنە بەرزو دیارو ئاشکرایەیە، ﴿ وَابِلٌ ﴾ بارانی زۆرو بە خوڕو لێی بدات ﴿ فَـَٔاتَتْ أُكُلَهَا ضِعْفَيْنِ ﴾ واتە: بەروبوومەکانی چەند هێندە بێتەوە لەبەر باشی زەویەکەیو بوونی

هۆکارەکانی کە ئەوە پێویست دەکەن، بوونی ئاوی زۆر کە نەش‌و نمای پێ دەکات‌و تەواوی دەکات.

﴿ فَإِن لَّمْ يُصِبْهَا وَابِلٌ فَطَلٌّ ﴾ واتە: بارانی کەم بەس بێ بۆ چاک‌و باش کردنی ڕواندنکەی، ئەمە حاڵ‌و باری بەخشەرەکانە، ئەوانەی زۆر دەبەخشن‌و کەم دەبەخشن، هەریەکەیان بە گوێرەی حاڵی خۆی بۆی زیاد دەکرێ‌و پیت‌و نەش‌و نمای بۆ دەکرێت، بۆ ئەوەی بەخشیوەیەتی تەواوترین نەش‌و نماو زیاد کردن، ئەوەی نەش‌و نمای پێ دەکاو زیادی دەکات بۆیان ئەوە بە بەزەیترە لە خۆت بۆ خۆت، ئەوەیە کە بەرژەوەندی تۆی دەوێت‌و تۆ ناتەوێت، ئەی خوایە ئەگەر بوونی باخ‌و بێستانێکی وا لەو دونیایەدا بەو سیفەتانەوە هەبووایە ورەو هیممەتەکان خێرا دەبوون بۆی‌و هەریەکە لێی کۆدەبوونەوەو قەڵەباڵغیان دەکرد، کوشتارو بەگژ یەکداچوون لە لای دەبوو، لەگەڵ نەمانی ئەو دونیایەو کە پڕە لە دەردو بەڵاو توندی کۆسپ‌و ماندوبوونەکانی، جا ئەو پاداشتەی خوا باسی کرد هەروەک ئەوە وایە بڕوادار تەماشای بکات بە چاوی بینایی‌و بڕوا(عین البصیرة)، بەردەوامەو جۆرەها دڵخۆشکەرو ئاسوودە بەخشەکانی تیادایە، لەگەڵ ئەوەش دەبینی دڵ‌و دەروونەکان لێ وەستاون‌و پاڵکەوتوون هێزو تواناکان لە خواستنی کپ‌و کوژاوەن، ئەوە وا دەبینی نەویستنە بۆ دواڕۆژو نازو نیعمەتەکانی، یان بڕوا لاوازیە بە بەڵێنەکانی خواو ئومێد بە پاداشتەکانی؟! ئەگەرنا ئەگەر بەندە تەواو دڵنیابێ لەوەو بڕوای پێی هەبێ، بە پاکی تامەزرۆیی بۆی دەبوژێتەوەو زیندوو دەبنەوە، ورەو هیمەت‌و هێزو توانای ڕووی تێدەکەن، دڵ‌و دەروونی نەرم‌و نیان دەکەن، بۆ ئەوەی بە خواستی خۆی بەخشینەکانی زۆر بکات، بە ئومێدی دەست کەوتنی پاداشتی زۆر، لەبەر ئەمەیە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾ کارو کردەوەی هەر کەسێک دەزانێ، وە سەرچاوەی ئەو کارەشی دەزانێ، پاداشتی لەسەر ئەوە دەداتەوە بە تەواوترین پاداشت. پاشان خوا ﷻ فەرموویەتی:

(٢٦٦): ﴿ أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَن تَكُونَ لَهُ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ لَهُ فِيهَا مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ وَأَصَابَهُ الْكِبَرُ وَلَهُ ذُرِّيَّةٌ ضُعَفَاءُ فَأَصَابَهَا إِعْصَارٌ فِيهِ نَارٌ فَاحْتَرَقَتْ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الْآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢٦٦﴾ ﴾:

ئەم نموونە هێنراوەتەوە بۆ کەسێک کە کارێکی کردوە لە پێناو خوا ﷻ لە خێر کردن، یان جگە لەوە، پاشان کارێک دەکات کارە چاکەکەی تێکدەدات، نموونەی ئەو

کەســە وەکـو نموونەی خـاوەن باخێـک وایە کـە باخەکەی هەمـوو بەروبوومێکـی تێدایە، دارخورمـاو ترێـی تایبـەت کـردوە تیادا لەبـەر باشـیو پلەیانو سـوودو قازانجـی زۆریان، چونکـە ئـەو دووانە خـۆراکو بژێـونو میوەجـاتو شـیرینن، ئەو بـاخو بێسـتانە ڕووبارە لەبـەر ڕۆیشـتووەکانی تیادا بوو کە ئـاوی دەدان بەبـێ خەرجیو تێچوون، کـە خاوەنەکەی زۆر دڵـی پـێ خۆشو ئاسـوودە بوو، لە پاشـان بە تەمەنـدا چووبوو لاواز بوو لـە کارکردن، وە پێداگریەکەشـی زیـاد کـرد، منداڵی لاوازی هەبـوو نەیاندەتوانی یارمەتـی باوکیان بدەن، بەڵکـو باربـوون بەسـەریەوە، ژیانو بژێـویو بەخێو کردنـی خۆیو ئەوان لەسـەر ئەو باخو بێسـتانەوە بـوو، جا لـەو حاڵەدا بوو ئـاوا بوو، ئـەو باخو بێسـتانەی تووشـی گەردەلول بوو، واتـە: ئـەو بایە بەهێزەی کە دەسـووڕێ لە پاشـان بەرز دەبێتـەوە، ئەو گەردەلولە ئاگریشـی تیـادا بـوو، هەمـوو ئـەو باخـەی سـووتاند، جـا مەپرسـە لـەوەی کـە تووشـی ئەو کەسـە بـە تەمەنـەدا چوو بـوو، لە غـەمو پـەژارەو دڵتەنگی، ئەگـەر خـەمو دڵتەنگـی خاوەنەکەی ئەنـدازە بکرایـە بیکوشـتبایە ئەوە خەمەکەی دەیکوشـت، هـەر ئەوها ئەو کەسـەی کارێکی کردبـێ لە پێنـاو خوا بەڕاسـتی کارەکانی وەکـو تۆیە بۆ چانـدنو بەروبووم، بـەردەوام بەو شـێوەیە، تـا لـە کارەکەی بـاخو بەهەشـتێکی وەسـفکراو بەوپـەڕی جوانیو نرخـەوە بۆی دابیـن دەبـێ، ئەو تێکدەرانـەی کە کاروکـردەوەکان تێکـدەدەن، وەکـو گەردەلولەکە وان کـە ئاگـری تێدا بـوو، جا بەنـدە پێویسـتی زیاتری هەیـە بـە کردەوەکەی ئەگـەر مرد، لە حـاڵو بارێـک بێـت کە توانـای بەسـەر کارەوە نەبـێ لەگەڵ ئـەوە، کارەکـەی دەبینێ کە ئومێـدی پێـی هەبـوە، کـە قازانـجو سـوودی هەبێ بـۆی، هەمـووی بـوو بە تـۆزی بە با چـوو، ﴿ وَوَجَدَ ٱللَّهَ عِندَهُۥ فَوَفَّىٰهُ حِسَابَهُۥۗ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ٣٩ ﴾النور. واتە: (لە ڕۆژی دواییـدا) دەیبینـێ خـوا ئامادەیـە لەلایـەوە، ئنجا خوا بـە چاکی پاداشـتی دەداتـەوە، وە خوا لێپرسـینەوەی خێرایە).

ئەگـەر مـرۆڤ ئـەوە بزانـێو وێنـای ئـەو دۆخـە بـکات، وە کەمتریـن ژیـریو عەقڵـی هەبـێ هەڵنەدەسـتاو جورئـەت نـاکات لەسـەر خراپـەکاری بـە سـەرنجامێکی خراپـەوە سـەربنێتەوەو دوایـی ئاخـی بـۆ هەڵبکێشـی، بـەڵام لاوازی ئیمـانو ژیریو کەمـی بەرچاو ڕوونـی خاوەنەکـەی دەگەیەنێتـە ئـەو حاڵەتـە کـە ئەگـەر لەشـتێکەوە دەرچوێت هێشـتا عەقـڵ نایگرێـت، ئەوەنـدە گـەورەو ترسـناکە، لەبـەر ئەمەیە خـوا ﷻ فەرمانی کـردوە بە بیرکردنـەوەو هانـی خەڵکـی داوە لەسـەریو فەرموویەتـی: ﴿ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ

﴿ٱلْأَيَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ﴾(واتـە: ئـاوا خوا ئایەتەکانـی خۆی بۆتـان ڕوون دەکاتەوە بـۆ ئـەوەی تێبفکـرن‌و بیـر بکەنەوە).

(٢٦٧-٢٦٨): ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّآ أَخْرَجْنَا لَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ ۖ وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ وَلَسْتُم بِـَٔاخِذِيهِ إِلَّآ أَن تُغْمِضُواْ فِيهِ ۚ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴿٢٦٧﴾ ٱلشَّيْطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِٱلْفَحْشَآءِ ۖ وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلًا ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٦٨﴾﴾

خـوا ﷻ فەرمـان بـە بەنـدە بڕوادارەکانـی دەکات بـە بەخشـین لـە ڕزقی پـاک‌و خاوێن‌و حەڵاڵـەکان ئـەوەی بۆیان ئاسـان کـردون لـە بەدەسـتهێنانی، وە لەوەش کە لـە زەوی بۆی دەرهێنـاون، هـەروەک منەتی کـردوە بەسـەرتانەوە بە ئاسـانکاریی دەسـتەبەر کردنەکەی، دەی ئێـوەش لێـی ببەخشـن‌و سوپاسـگوزاری خـوا بکـەن، وە هەنـدێ مافـی براکانتـان جێبەجـێ بکـەن کە پێویسـتە لەسـەرتان، بۆ پاککردنـەوەی ماڵەکانتـان، ئەو ماڵە ببەخشـن کـە زۆر خۆشـتان دەوێ، بـە پێچەوانـەی ئەوانـەی کـە حەزتـان پێـی نیـەو بـۆ خۆتانتان نـاوێ، مەگـەر بـە چاوپۆشـین‌و لێخۆشـبوون بـێ ﴿وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ حَمِيدٌ﴾ خـوا بـێ نیـازو دەوڵەمەنـدە لێتـان، سـوودو خێـر کردنەکانتـان تەنهـا بـۆ خۆتـان دەگەڕێتەوە، لەگەڵ ئەوەشـدا ئەو ستایشـکراوە لەسـەر ئـەوەی فەرمانتان پـێ دەکات، لـە فەرمانە چاک‌و ستایشـکراوەکان‌و کارو خەسـڵەتە ڕاسـت‌و دروسـتەکان، لەسـەرتانە فەرمانەکانی جێبەجێ بکـەن، چونکـە هێزی دڵ‌و ژیانـی دەروونتانـەو بەختەوەریـی گیانەکانـە، ئاگاداربن لەوەی شـوێن شـەیتانی دوژمنتان نەکەون، کە فەرمانتان پـێ دەکات بە خۆگرتنەوەو دەتانترسـێنێ بـە هـەژاریو پێویسـتی ئەگەر ببەخشـن، ئەمـە دڵسـۆزیو ئامۆژگـاری نیە بۆتـان، بەڵکو ئەمـە ئەوپـەڕی فێـڵ‌و تەڵەکـە بازیـە لێتـان دەکات ﴿إِنَّمَا يَدْعُواْ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُواْ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٦﴾﴾فاطر. (واتـە: بێگومان شـەیتان تەنیـا کۆمەڵەکەی خۆی بانـگ دەکات تاکو لـە دۆزەخیـەکان بن‌و ببنـە خاوەنـی ئاگر).

بەڵکـو گوێڕایـەڵ‌و جێبەجێکاری فەرمانەکانـی پەروەردگارتان بن، کـە فەرمانتان پێدەکات بـە بەخشـین بەشـێوەیەک کـە ئاسـان بێـت بۆتـان‌و زیانتان پـێ نەگـات لەگـەڵ ئەوەش ئـەو ﴿يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً﴾ بـۆ گوناهەکانتـان، وە پاککردنـەوە بـۆ کـەم‌و کورتیەکانتـان ﴿وَفَضْلًا﴾(فـەزڵ)و چاکـەی بۆتان لـە دونیـاو دوارۆژدا، وە بە دڵ‌و سـینگی فروانەوە، وە خۆشـی دڵ‌و جەسـتەو نـاو گـۆڕ، دەسـتەبەبوونی پاداشـتەکەی‌و سـەرکەوتنی ڕۆژی

دوایـی، ئەمـە بۆ خـوا قورس‌و گـەورە نیـە، چونکە ئـەو ﴿ وَٰسِعٌ ﴾ بەخشـش‌و گەورەیی چاکەکاریـی فراوانـە ﴿ عَلِيمٌ ﴾ بـەوەی لـە ئێـوە دەردەچێ، لـە بەخشـینەکان زۆربێ یان کـەم، نهێنـی بـێ یـان ئاشـکرا، پاداشـتان دەداتەوە لـە فروانـی‌و بەخششـی‌و چاکەکانی، با بەنـدە بروانێتـە دڵ‌و دەروون‌و خـۆی بۆ لای کامە لـە بانگ کەرەکان لادەکاتـەوەو روو لە کامەیـان دەکات، بێگومـان ئـەو دوو دەقـە چەنـد کارێکی مـەزن لە خۆیـان دەگرن:

لەوانە: هاندان لەسەر بەخشین.

لەوانە: روون کردنەوەی هۆکارەکان کە پێویستن بۆ ئەوە.

لەوانـە: پێویسـت بوونـی زەکات لـە هـەردوو نەختینـەکان (زێـڕو زیـو)و کەلـو پەلـی بازرگانـی بە گشـتی، چونکە هەمـوو دەچنە چوارچێـوەی فەرموودەی خـوا: ﴿ مِن طَيِّبَٰتِ مَا كَسَبْتُمْ ﴾.

لەوانـە: پێویسـت بوونـی زەکات لەوانەی کە لـە زەوی دەردەچن لـە دانەوێڵـەو بەروبووم‌و کانزاکان.

لەوانـە: زەکات لەسـەر ئەوەیـە کـە چانـدن دەکاو بەروبومی دەبـێ، نەوەک لەسـەر خاوەن زەوی لەبـەر فەرمـوودەی خـوا: ﴿ أَخْرَجْنَا لَكُم ﴾ ئـەوەی بۆی لـە زەویـەوە دەرچوو ئەوە لەسـەری پێویسـت دەبێ.

لەوانـە: سـامان‌و کـەل‌و پەلـەکان کە دانـراون بـۆ هەڵگرتـن لـە زەوی‌و زارو خانووبەرەو کـەل‌و پەلـی قـاپ‌و قاچـاغ‌و نموونـەی ئەوانـەش زەکاتیـان تیـادا نیـە، بەهەمـان شـێوە قـەرزەکان‌و داگیر کـراوەکان‌و نموونـەی ئەوانیـش ئەگەر نادیـار بوو، یان لـەلای یەکێک بـوو کـە خاوەنەکـەی نەیدەتوانـی لـە ژێـر دەسـتیەوە دەری بچوێنـێ زەکاتـی تیـادا نیە، چونکـە خـوا بەخشـینی پێویسـت کـردوە لـەو سـامانانەی کـە نـەش‌و نماکـردن تیایاندا بەرهـەم دێـت کە لـەزەوی دەردەچن، سـامان‌و کـەل‌و پەلەکانـی بازرگانیش کـە بە نیازی نـەش‌و نماکردنـە، بـەڵام سـامانەکانی کـە لەوانـە نین کـە نەدارین بـۆ ئەوە، دەسـەڵات‌و توانایـان نەبـێ بەسـەریاندا ئـەوە ئـەو مانایەی تێـدا نیە.

لەوانە: ماڵی خراپ قەدەغەکراوە دەربهێنری، وە دروستیش نیە بۆ زەکاتدان.

لە پاشان خوا ﷻ فەرموویەتی:

(٢٦٩): ﴿ يُؤْتِى ٱلْحِكْمَةَ مَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُؤْتَ ٱلْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِىَ خَيْرًا كَثِيرًا ۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢٦٩﴾ ﴾:

کاتێـک خـوا ﷻ ئەم فەرمانــە مەزنەی کرد کــە نهێنیــەکانو حیکمەتەکانی لــە خۆ گرتوە، بێگومــان ئــەو فەرمانــە بــۆ هەمــوو کەســێ دەســتەبەر نابــێ، بەڵکــو بــۆ ئــەو کەســە دەبێ کــە خــوا منەتــی کردبــێ بەســەریداو حیکمەتــی پێــی دابــێ، ئەویش زانســتی بە ســوودو کاری چاکو ناســینی نهێنیەکانی یاســاو شــەریعەتو حوکمەکانێتی، بێگومان ئەو کەســەی خــوا حیکمەتــی پێدابــێ، ئەوە خێــرو چاکــەی زۆری پێــداوە، چ خێرو چاکەیــەک مەزنترە لــەو خێــرو چاکەیــەی کــە بەختــەوەری هــەردوو جیهــان (دونیــاو دوارۆژ)ی تێدابــێ، وە رزگــار بــوون لــە بەدبەختیەکانــی! ، وە تایبەت کــردن بەم بەخشــشو پلەی تێدایــە، بەوەی کــە لــە میــرات گرانــی پێغەمبەرانــە، تــەواو کامــڵ بوونی لەســەر حیکمــەت وەســتاوە، جا تەواویەتیەکــەی بــە تەواوبوونــی هــەردوو هێــزی زانســتیو کرداریەتــی (العلــم والعمــل) تەواویەتــی توانای زانســتی بــە کاروکــردەوەی چاکەیــەو وازهێنانە لــە خراپە، بەوشــێوەیە دەتوانــێ قســەو کــردارەکان بپێکــێ، وە کارەکان لە جێگاو شــوێنی خۆیان دابنــێ، وە بەبێ ئــەوە ئەمــە ناتوانی ئــەوە بکات(واتــە: بەبێ زانســت ناتوانــێ کــردەوە ئەنجامبدات).

کاتێ کە خوا ﷻ مرۆڤەکانی سروشــتاندوە لەســەر پەرســتنی خۆیو خۆشەویســتی بۆ خێرو چاکــەو هەقو ڕاســتی، خــوا ڕەوانەکراوانی ناردوە بە یادخەســتەنەوەیان بەوەی لە سروشــت (فطــرة)و عەقــڵو ژیریان چەســپیوەو دامــەزاوە، ئەوانەی کــە نایزانن بە تێرو تەســەلی بۆیان بــاس بکەن، خەڵکی بوون بە دوو بەشــەوە: بەشــێکیان وەڵامــی بانگەوازیەکەیــان داوەتەوە، ئەوانــە بیریــان کەوتۆتەوە ئەوەی ســود گەینــەرە بۆیــانو کردوویانە، ئەوەش زیان بەخشــە بۆیــان وازیان لێهێنــاوە، ئەوان کــە خاوەنی ژیریو تێگەیشــتنی تەواون.

بەشێکیشــیان وەڵامــی بانگەوازیەکەیانیــان نەداوەتــەوە، بەڵکــو وەڵامــی ئەوەیــان داوەتەوە کــە بەســەر سروشــت (فطرة)تیــان دا هاتووە لــە تێکچــون، وازیان هێنــاوە لــە گوێڕایەڵیو جێبەجــێ کردنــی فەرمانەکانــی پەروەردگــاری بەنــدەکان، جــا ئەوانە لە خــاوەن ژیریەکان نیــن لەبــەر ئەمەیــە خــوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ﴾ (واتە: بیر ناکەنــەوەو بەبیریانــدا نایەتــەوە تەنها خــاوەن ژیریــەکان نەبن).

وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن نَّفَقَةٍ أَوْ نَذَرْتُم مِّن نَّذْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ
يَعْلَمُهُۥ ۗ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿٢٧٠﴾ إِن تُبْدُوا۟
ٱلصَّدَقَٰتِ فَنِعِمَّا هِىَ ۖ وَإِن تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا
ٱلْفُقَرَآءَ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۚ وَيُكَفِّرُ عَنكُم مِّن
سَيِّـَٔاتِكُمْ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٢٧١﴾ ۞ لَّيْسَ
عَلَيْكَ هُدَىٰهُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يَشَآءُ ۗ وَمَا
تُنفِقُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَلِأَنفُسِكُمْ ۚ وَمَا تُنفِقُونَ إِلَّا
ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ ٱللَّهِ ۚ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِنْ خَيْرٍ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ
وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٢﴾ لِلْفُقَرَآءِ ٱلَّذِينَ أُحْصِرُوا۟
فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا يَسْتَطِيعُونَ ضَرْبًا فِى ٱلْأَرْضِ
يَحْسَبُهُمُ ٱلْجَاهِلُ أَغْنِيَآءَ مِنَ ٱلتَّعَفُّفِ تَعْرِفُهُم
بِسِيمَٰهُمْ لَا يَسْـَٔلُونَ ٱلنَّاسَ إِلْحَافًا ۗ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِنْ
خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٢٧٣﴾ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُم
بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ سِرًّا وَعَلَانِيَةً فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ
رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٢٧٤﴾

(٢٧٠): ﴿ وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن نَّفَقَةٍ أَوْ نَذَرْتُم مِّن نَّذْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُهُۥ ۗ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿٢٧٠﴾ ﴾

﴿ وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن نَّفَقَةٍ أَوْ نَذَرْتُم مِّن نَّذْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُهُۥ ﴾ ئەمە پاداشتی لەسەر بەخشینەكان تیادایە، لە واجبو سوننەتەكان، كەمو زۆرەكان، كە خوا فەرمانی پێیان كردوە، وە هەروەها ئەو نەزرانەی كەسێك خۆی پێوە پابەند كردوەو خستویەتیە ئەستۆی خۆی، بێگومان خوا ﷻ دەیانزانێو هیچی لێ شاراوە نیە، دەزانێ ئەوەی لێ دەرچووەو سەرچاوەی گرتووە، ئایا بە دڵسۆزیو ئیخلاص بۆ خوا ئەنجامی داوە، یان بۆ غەیری ئەو، ئەگەر بۆ خواو ڕەزامەندی ئەو بێ پاداشتی لەسەر وەردەگرێ بە پاداشتێكی زۆر مەزنو گەورە، ئەگەر بەندە ئەوەی لەسەریەتی لە بەخشینەكانی نەیبەخشی بێ، وە وەفای نەبووبێ بەرانبەر بە نەزرەكان، یان نیازو مەبەستی پێیان ڕازی كردنی بەدی هێنراوەكان بێت، ئەوە ستەمكارەو شتی لە جگە لە شوێنی خۆی داناوە، شایانی تۆڵەی زۆر گەورەیە، كەسیش لە بەدیهێنراوانو خەڵكی بە كەڵكی نایەنو سەری ناخەن، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴾ (واتە: ستەمكاران پشتیوانانیان بۆ نیە).

(٢٧١): ﴿ إِن تُبْدُوا۟ ٱلصَّدَقَٰتِ فَنِعِمَّا هِىَ ۖ وَإِن تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا ٱلْفُقَرَآءَ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۚ وَيُكَفِّرُ عَنكُم مِّن سَيِّـَٔاتِكُمْ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٢٧١﴾ ﴾

﴿ إِن تُبْدُوا۟ ٱلصَّدَقَٰتِ ﴾ واتە: (ئەگەر خێرو چاكەكانتان) بە دیار خستنو ئاشكرا بوونو زانران، مەبەستیش ڕەزامەندی خوا بوو ﴿ فَنِعِمَّا هِىَ ﴾ واتە: ئەوە شتێكی زۆر باشە، ﴿ هِىَ ﴾ هاتنە جێی مەبەست پێیان ﴿ وَإِن تُخْفُوهَا ﴾

واتــە: (وە ئەگــەر) بیشــارنەوەو بەنهێنــی بیانبەخشــن ﴿ وَتُؤْتُوهَا ٱلْفُقَرَآءَ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ﴾ ئەمــە ئــەوەی لێوەردەگیــرێ کــە بێگومــان خێرکــردن بــە هــەژاران بــە نهێنــی باشــترە لــە خێرکردنــی ئاشــکرا، بــەڵام ئەگــەر ســەدەقەکان بــە هــەژاران نــەدرێ، ئــەوە (مفهــوم)و تێگەیشــتنی دەقەکــە ئەوەیــە کــە نهێنــیو شــاردنەوە چاکتــر نیــە لــە ئاشــکرایی، ئــەوەش دەگەڕێتــەوە بــۆ بەرژەوەنــدی، جــا ئەگــەر لــە ئاشــکرا کردنــی خێــرو چاکــە، ئاشــکرا کــردن بێــت بــۆ دروشــمەکانی ئاییــنو بەدەســتهێنانی پەیــڕەوی کــردنو نموونــەی ئــەوە، دیــارە کــە ئــەوە باشــترە لــە شــاردنەوەو بــە نهێنــی ئەنجامدانــی، فەرمــوودەی خــوا بەڵگەیــە کە دەفەرمــوێ: ﴿ وَتُؤْتُوهَا ٱلْفُقَرَآءَ ﴾ لەســەر چاکــەکارو خێرخــوازە، بگــەڕێ بــەدوای ئەوانــەی کــە پێویســتیان پێیەتــی خێــرو چاکەکــەی بــدات بــە ئــەوان، بــا نەیــدا بــە پێداویســتێکو لــەوێ پێداویســتێکی تــر هەبــێو پێویســتر پێــی.

کاتێــک خــوا ﷻ بــاس دەکات کــە خێرکــردن چاکــە بــۆ خێرکــەر، دیــارە دەســتەبەر بوونــی پاداشــتیش لەخــۆ دەگــرێ، بۆیــە فەرموویەتــی: ﴿ وَيُكَفِّرُ عَنكُم مِّن سَيِّـَٔاتِكُمْ ﴾ ڕەتکردنــەوەو لادانــی تۆڵــەی تێدایــە ﴿ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴾ (وە خــوا شــارەزایە بــەوەی دەیکــەن) لــە چاکــەو خراپــە، زۆر یــان کــەم، مەبەســت لــەوە پاداشــتو تۆڵــە ســەندنەوەیە (پاداشــت بــۆ چاکــەکاران، ســزا بــۆ خراپــەکاران).

(٢٧٢-٢٧٤): ﴿ لَّيْسَ عَلَيْكَ هُدَىٰهُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يَشَآءُ ۗ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَلِأَنفُسِكُمْ ۚ وَمَا تُنفِقُونَ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ ٱللَّهِ ۚ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِنْ خَيْرٍ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٢﴾ لِلْفُقَرَآءِ ٱلَّذِينَ أُحْصِرُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا يَسْتَطِيعُونَ ضَرْبًا فِى ٱلْأَرْضِ يَحْسَبُهُمُ ٱلْجَاهِلُ أَغْنِيَآءَ مِنَ ٱلتَّعَفُّفِ تَعْرِفُهُم بِسِيمَٰهُمْ لَا يَسْـَٔلُونَ ٱلنَّاسَ إِلْحَافًا ۗ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٢٧٣﴾ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُم بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ سِرًّا وَعَلَانِيَةً فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٢٧٤﴾ ﴾:

﴿ لَّيْسَ عَلَيْكَ هُدَىٰهُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يَشَآءُ ﴾ خــوا ﷻ بــە پێغەمبەرەکــەی ﷺ دەفەرمــوێ: هیدایــەت دانــی خەڵکــی لەســەر تــۆ نیــە، بەڵکــو تەنهــا ڕاگەیاندنــی ڕوونو ئاشــکرات لەســەرە، هیدایــەت دان بــە دەســتی خــوای گەورەیــە، ئەمــە بەڵگــەی ئــەوەی تێدایــە کــە بەڕاســتی بەخشــین هــەروەک چــۆن لەســەر مســوڵمانە، ئــاوا لەســەر

کافریشـــە، هەرچەنـــد ئەگـــەر هیدایەتیشـــی وەرنەگرتبـــێ، لەبـــەر ئەوەیـــە فەرموویەتـــی: ﴿ فَلِأَنفُسِكُمْ ﴾ واتـە: سـوودو قازانجـی بـۆ ئێـوە دەگەڕێتـەوە، ﴿ وَمَا تُنفِقُونَ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ ٱللَّهِ ﴾ ئـەو هەواڵـە دەربـارەی بەخشـینەکانی بڕوادارانـە کـە لـە بڕوایانـەوە دەرچـووەوە سـەرچاوەی گرتـووە، کـە تەنهـا لەبـەر خـوا ﷻ بـووە، چونکـە بڕواکانیـان قەدەغەیـان دەکات لـە مەبەسـتی نـزمو بـێ نـرخ، دڵسـۆز بونیـان لەبـەر خـوا بـۆ پێویسـت دەکات، ﴿ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِنْ خَيْرٍ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ ﴾ ڕۆژی قیامـەت پاداشـتەکانتان وەردەگرنـەوەو پێیـان دەگـەن، ﴿ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ ﴾ واتـە: هیـچ کـەم نابێتـەوە لـە کارو کردەوەکانتـان بـە قـەد گەردیلەیەکیـش، هەروەکـو لـە خراپەکانیشـتان بۆتـان زیـاد ناکـرێ، دوای ئـەوەی باسـی ئەوانـەی کـرد کـە پێیـان دەبەخشـرێ، کـە لـە پێشـترینی خەڵکـن بـۆ بەخشـین، بـە شـەش خەسـڵەت وەسـفیان دەکات:

یەکەمیان: هەژاری.

دووەمیـان: فەرمـوودەی خـوا: ﴿ أُحْصِرُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، واتـە: کـورت هەڵاتـن لەسـەر گوێڕایەڵـیو جێبەجێکردنـی فەرمانەکانـی خـوا لـە جەنـگو جیهـادو غەیـری ئەویـش، ئەوانـە ئامـادەن بـۆ ئـەوەو خۆیـان بـۆی یـەکلا کردوەتـەوە.

سـێیەم: (جەنـگو جیهاد)دەستەوسـانی کـردوون لـە گەشـتو سـەفەر کـردنو گـەڕان بـەدوای ڕزقو ڕۆزی فەرموویەتـی: ﴿ لَا يَسْتَطِيعُونَ ضَرْبًا فِى ٱلْأَرْضِ ﴾ واتـە: (ناتوانـن) گەشـت بکـەن بـۆ بەدەسـتهێنانو کەسـابەت کـردن.

چـوارەم: ﴿ يَحْسَبُهُمُ ٱلْجَاهِلُ أَغْنِيَآءَ مِنَ ٱلتَّعَفُّفِ ﴾ (ئـەوەی نەیانناسـێ، وا دەزانـێ دەوڵەمەنـدن لەبـەر داوانەکـردنو خـۆ بەهـەژار پێشـان نەدانیـان) ئـەوە ڕوونکردنەوەیـە بـۆ ڕاسـتێتی ئارامگرتنیـانو چاکـیو پاکیەتیـان.

پێنجـەم: ئـەو فەرموویەتـی: ﴿ تَعْرِفُهُم بِسِيمَٰهُمْ ﴾ (تـۆ دەیانناسـی بـە شـێوەیان) واتـە: بـەو نیشـانەی کـە خـوا لـە وەسـفکردنیان باسـی کـردوە، ئەمـە ئـەوە ڕەتناکاتـەوە، فەرموودەکـەی: ﴿ يَحْسَبُهُمُ ٱلْجَاهِلُ أَغْنِيَآءَ ﴾ نـەزانو نەشـارەزا بـە بـارو دۆخیـان تێگەیشـتنو زیرەکـی ئـەوەی نیـە تەنهـا بـە بینیـن بیانناسـێ، بـەڵام تێگەیشـتەو ڕوونـاس تەنهـا بـەوەی ببینـێ بـە نیشـانەکانیانەوە دەیانناسـێ.

شەشـەم: فەرمـوودەی خـوا: ﴿ لَا يَسْـَٔلُونَ ٱلنَّاسَ إِلْحَافًا ﴾ واتـە: داوا لـە خەڵـک

ناکەن بە پێ داگریی، بەڵکو ئەگەر پرسیاریان لێ دەرچوو ئەگەر پێداویست بوون بۆ ئەوە پێداگری ناکەن لەسەر ئەوەی پرسیاریان لێ کردوە، ئەوانە لە پێشترینو شایانترینی خەڵکن بۆ خێر پێکردن، لەبەر ئەو وەسفە جوانەی کە وەسفیان پێکراوە، جا هەرچی بەخشینو چاکەشە وەکو ئەوەی کە هەیە لەسەر هەرکەسێک بێت، ئەوە خێرو چاکەیەو باشەیە خاوەنەکەی پاداشتی لەسەر وەردەگرێتەوە، لەبەر ئەوەیە فەرموویەتی: ﴿وَمَا تُنفِقُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ﴾ لە پاشان باسی حاڵی خێرکەرەکانی کردوە لە هەموو کاتەکانو لەسەر هەموو حاڵو بارەکان فەرموویەتی: ﴿ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُم﴾ واتە: لە پێناو ڕەزامەندی ئەودا، نەوەک لە حەرامکراوەو ناپەسەندو ئارەزووەکانی خۆیان ﴿بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ سِرًّا وَعَلَانِيَةً فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ﴾ واتە: پاداشتێکی مەزنیان لە چاکە بۆ هەیە لەلایەن پەروەردگاری بە بەزەییەوە، ﴿وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ﴾ لەو کاتەی بێباکەکان ترسان ﴿وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ ئەگەر سنوور بەزێنەکانی غەمبار بوون، بەراوە دەبن بە دەستەبەر بوونی مەبەستی خوازراویان، ڕزگار دەبن لە خراپەو لێ ترساوەکان، کاتێ کە خوا ﷻ حاڵو باری چاکەکارانی بەندەکانی بە جۆرەها بەخشین تەواو کرد، باسی حاڵی ستەمکارو خراپەکارانی کرد لەوپەڕی خراپەکاری لەگەڵ بەندەکانیدا، فەرموویەتی:

الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبَوٰا لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ الَّذِي
يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطَٰنُ مِنَ الْمَسِّ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوٓا إِنَّمَا الْبَيْعُ
مِثْلُ الرِّبَوٰا وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَوٰا فَمَن جَآءَهُۥ
مَوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ فَانتَهَىٰ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُۥٓ إِلَى اللَّهِ وَمَنْ
عَادَ فَأُولَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ (٢٧٥) يَمْحَقُ
اللَّهُ الرِّبَوٰا وَيُرْبِي الصَّدَقَٰتِ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ كَفَّارٍ أَثِيمٍ
(٢٧٦) إِنَّ الَّذِينَ ءَامَنُوا وَعَمِلُوا الصَّٰلِحَٰتِ وَأَقَامُوا الصَّلَوٰةَ
وَءَاتَوُا الزَّكَوٰةَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ
وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ (٢٧٧) يَٰٓأَيُّهَا الَّذِينَ ءَامَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ
وَذَرُوا مَا بَقِيَ مِنَ الرِّبَوٰٓا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ (٢٧٨) فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا
فَأْذَنُوا بِحَرْبٍ مِّنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ
أَمْوَٰلِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ (٢٧٩) وَإِن كَانَ
ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيْسَرَةٍ وَأَن تَصَدَّقُوا خَيْرٌ لَّكُمْ
إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ (٢٨٠) وَاتَّقُوا يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى
اللَّهِ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ (٢٨١)

(٢٧٥-٢٨١): ﴿الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبَوٰا لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ الَّذِي يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطَٰنُ مِنَ الْمَسِّ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوٓا إِنَّمَا الْبَيْعُ مِثْلُ الرِّبَوٰا وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَوٰا فَمَن جَآءَهُۥ مَوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ فَانتَهَىٰ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُۥٓ إِلَى اللَّهِ وَمَنْ عَادَ فَأُولَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ
(٢٧٥) يَمْحَقُ اللَّهُ الرِّبَوٰا وَيُرْبِي الصَّدَقَٰتِ
وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ كَفَّارٍ أَثِيمٍ (٢٧٦) إِنَّ الَّذِينَ
ءَامَنُوا وَعَمِلُوا الصَّٰلِحَٰتِ وَأَقَامُوا الصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا الزَّكَوٰةَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ (٢٧٧)
يَٰٓأَيُّهَا الَّذِينَ ءَامَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَذَرُوا مَا
بَقِيَ مِنَ الرِّبَوٰٓا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ (٢٧٨) فَإِن لَّمْ
تَفْعَلُوا فَأْذَنُوا بِحَرْبٍ مِّنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَٰلِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا
تُظْلَمُونَ (٢٧٩) وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيْسَرَةٍ وَأَن تَصَدَّقُوا خَيْرٌ لَّكُمْ إِن
كُنتُمْ تَعْلَمُونَ (٢٨٠) وَاتَّقُوا يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللَّهِ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ
وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ (٢٨١)﴾:

﴿الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبَوٰا لَا يَقُومُونَ﴾ خـوا ﷻ هەوڵـدەدا دەربارەی ڕیباخـۆران‌و خراپی دوارۆژیـان‌و توونـدی‌و سـەرەو خوار بوونیـان، ئەوان هەڵناسـنەوە لە گۆڕەكانیـان لە ڕۆژی دواییـدا ﴿إِلَّا كَمَا يَقُومُ الَّذِي يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطَٰنُ مِنَ الْمَسِّ﴾ (مەگـەر وەک کەسـێک) واتـە: شـەیتان بـە زەویـدا دەدات تووشـی شـێتی دەکات، کە لـە گۆڕەكانیان هەڵدەسـنەوە بـێ هۆش‌و سـەرگەردان‌و شـڵەژاوو شـپرزەن، چاوەڕوانی سـزای گـەورەو تۆڵـەی بە ئازار دەکـەن، هەروەکـو ژیـری‌و عەقڵیان سـەراو ژێر بوەتـەوە ﴿قَالُوٓا إِنَّمَا الْبَيْعُ مِثْلُ الرِّبَوٰا﴾ ئەمـەش نابـێ، مەگـەر بۆ کەسـێک کـە زۆر جاهیـل‌و نەفام بێ، یان کەسـێک خـۆی گێل بـکات کەڵلـەڕەق بـێ، خـوا پڕ بە پێسـتی حاڵـی خۆیان پاداشـتیان دەداتـەوە، ئا بەم شـێوە وەک شـێتیان لـێ دێ، وە ڕەنگە مەبەسـت لە وتەی خـوا: ﴿لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ الَّذِي

﴿يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ مِنَ ٱلۡمَسِّ﴾ کاتێ کە عەقڵو ژیریان لەدەستدا لە دوای بە دەستهێنانی سووەکانیان(ڕیبا)،و بووچوونو عەقڵیان سووکو لاواز بوو، تا وایان لێهات لە هەستو جوڵەو ڕەفتاردا لە شێت دەچوون لە نەبوونی ڕێکو پێکیو داڕنین لە عەقڵو هۆشو ڕەوشتو ئەدەبی مەزنی، خوا وەڵامیان دەداتەوە بە حیکمەتی مەزنی خۆی ﴿وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلۡبَيۡعَ﴾ (خوا کڕینو فرۆشتنی ئاسایی حەڵاڵ کردوە) واتە: لەبەر بەرژەوەندی گشتیو پێویستی زۆری ژیان پێی، وە بەدەست هێنانی زیان لە قەدەغەکردنیدا، ئەمە بنەمایە لە حەڵاڵ کردنی هەموو جۆرە هەڵسوکەوتەکانی دەستکەوتو کەسابەت، تا بەڵگە دێت بۆ قەدەغە کردنی مرۆڤ ﴿وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْ﴾ لەبەر ئەوە زوڵمو ستەمو سەرەنجامی خراپی تێدایە، ڕیباش دوو جۆرە:

یەکەم: ڕیبای (سوود) دواخستنو قەرز، وەک کڕینو فرۆشتنی سوود (ڕیبا) بەوەی لە عیللەکەی هاوبەشە لەگەڵی بە دواخستنو قەرز، ئەوەی لە ئەستۆیەتی بیکاتە سەرمایە، (بسلم): (سەلەم واتە: فرۆشتنی شتێک کە لەبەر چاونەبێو ناونیشانی بوترێ هەر لەم دانیشتنەدا پارەکەی بدرێت).

دووەم: وە ڕیباو سوودی زیادە (فضل) ئەویش بریتیە لە کڕینو فرۆشتنی ئەو شتەی ڕیبای تێدایە لە ڕەگەزی خۆیو زیادەی تێدایە، هەردوو ڕیباکە حەرامکراون بە قورئانو فەرمووده، زانایان یەکدەنگن لەسەر ڕیبای دواخستنو قەرز (نسیئة)، وە ئەو کەسەی ڕێگای داوە بە ڕیبای زیادە (فضل) دەگمەنە، پێچەوانەی کۆمەڵە دەقێکی زۆری کردوە، بەڵکو ڕیبا لە گوناهە گەورەو مەترسیدارەکانە، ﴿فَمَن جَآءَهُۥ مَوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّهِۦ﴾ واتە: پەندو بیرخستنەوەو ترساندنە لە ئەنجامدانی ڕیباو سووخۆریی، لەسەر دەستی ئەوەی خوا بۆ پەندو ئامۆژگاری بۆی ناردووەو دەریخستووە، وەک بەزەییەک لە خواوە بۆ ئامۆژگاری کراو پەند پێدراو بیانوو بڕ کردنی ﴿فَٱنتَهَىٰ﴾ (کەواتە: ئەو کەسە باز بێنێ) لە کارەکەی ﴿فَلَهُۥ مَا سَلَفَ﴾ (ئەوەی پێشی بۆ خۆیەتی) واتە: ئەو مامەڵەو کڕینو فرۆشتنانەی کە لە پێشتر ئەو کەسە کردوویەتی پێش ئەوەی پەندو ئامۆژگاریەکەی پێ گەیشتبێ. ئەمەش وەک پاداشتێک لە پێناو ئەوەی ئامۆژگاریەکەی وەرگرتوە، بە تێگەیشتن لە دەقەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەگەر واز نەهێنێ بە کردەوەی سەرەتاو کۆتایی سزا دەدرێ ﴿وَأَمۡرُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾ لە سزاو تۆڵەکەیو لەوەی داهاتوو لە کارو بارەکانی تر، ﴿وَمَنۡ عَادَ﴾ (هەر کەس بگەڕێتەوە سەر)

ئەنجامدانــی ئــەم کارە دوای واز لــێ هێنانیو پەندو ئامۆژگاریەکە ســوودی پــێ نەگەیاندبێ، بەڵکو ســوور بــێ لەســەر ئــەم کارە ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾ (واتە: ئــا ئەوانە هاوەڵــی دۆزەخن، بــە هەمیشــەیی تێــدا دەمێننەوە).

زانایــان ڕاو بۆچوونــی جیاوازیــان هەیە لە دەقەکانی هەڕەشــەو تۆڵــە، کە بــە ڕواڵەتەکانیان هەمیشــە کردنــی خــاوەن گوناهــە گەورەکانی لــە دۆزەخدا، ئــەو گوناهانەی کــە نزمترن لە هاوبــەش دانــانو شــیرک بۆ خوا، باشــتر وایــە بوتــرێ: ئــەو کاروبارانەی کە خوا هەمیشــە بوونــی لــە ئاگردا لەســەر داناون، پێویســتکارو خوازیاری بۆ ئــەوە، بەڵام پێویســتکار ئەگەر بەربەســتێک نەبــێ قەدەغــەی بــکات ئــەوە لەســەری پێویســت دەبــێ، بێگومان زانــراوە بە قورئــانو فەرمــوودەو کــۆ دەنگی پێشــینانی ئوممــەت کە بە ڕاســتی یەکتاپەرســتیو ئیمان قەدەغــەی خاوەنەکانیــان دەکــەن بــۆ هەمیشــەیی لــە ئاگــردا بمێننــەوە، جا ئەگــەر مرۆڤ یەکتاپەرســت نەبوایــە، ئــەوە کاروکردەوەکــەی شــیاو بــوو بــۆ هەمیشــە مانــەوەی لە ناو دۆزەخــدا، بــە بێ تەماشــا کردنــی کوفرەکەی.

پاشــان خــوای گــەورە دەفەرمــوێ: ﴿ يَمۡحَقُ ٱللَّهُ ٱلرِّبَوٰاْ ﴾ واتە: (خــوا ڕیباو ســوود نابووت دەکات) لایدەبــات، وە پیــتو بەرەکەتەکەشــی لادەبــات، خــودی بــێ یــان وەســفی بــێ، دەبێتــە هۆکاریــش بۆ ڕوودانی بەڵاو ناخۆشــیو نەهێشــتنی بەرەکــەت تێــدا، وە ئەگەر لێی ببەخشــرێ (خاوەنەکــەی) پاداشــتی لەســەر وەرناگــرێ، بەڵکــو دەبێتــە زەخیرە بــۆی لە نێو ئاگــردا ﴿ وَيُرۡبِي ٱلصَّدَقَٰتِۗ ﴾ واتــە: نــەشو نمای پێدەکاو پیــتو بەرەکەتی لەو ســامانەی کــە لــێ دەرکــراوە دادەنێتو پاداشــتی خاوەنەکەی زیــاد دەکات، ئەمەش لەبــەر ئەوەیە کە پاداشــتو تۆڵە لــە جۆرو ڕەگەزی کارو کردەوەکەیە، چونکە ســووخۆر بە ڕاســتی ســتەمی لــە خەڵکــی کردووەو ســامانو پــارەی بە شــێوەیەکی ناشــەرعی لێ بــردوون، بە نەهێشــتنو ڕۆیشــتنیماڵو ســامانەکەی ســزا دەدرێ، چاکەکاریش بۆ خەڵکیو لەگــەڵ خەڵکی بە هەر جــۆرە چاکــە کردنێک بێ ئــەوە پەروەردگاری لەو بەخشــندەترە، چاکــەی لەگەڵدا دەکات، هــەروەک ئــەو چاکەی لەگــەڵ بەندەکانی خوا کــردوە ﴿ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ كَفَّارٍ ﴾ (خوا ئەو کەســانەی خۆشــناوێ ســپڵەن) بۆ نــازو نیعمەتەکانی خوا، ئەوەی لەســەری پێویســت کراوە لــە خێــرو صەدەقــەکان نایــکات، بەندەکانــی خــوا لــە خــۆیو خراپەکانی ســەلامەت نابن، ﴿ أَثِيمٍ ﴾ واتــە: بێگومــان ئــەوەی کردوویەتی هــۆکارە بۆ ئــەو گوناهەو تۆڵەو ســزاکەی.

کاتێــک باســی ســووخۆران دەکات، شــتێکی زانــراوە ئەگــەر ئــەوان بــڕوادار بوونایــە

بڕواکەیـان سـوودی پـێ دەگەیاندن، ئەو شـتەی ڕوویـدا لێیـان ڕووی نەدەدا، باسـی حاڵو بـاری بـڕواداران‌و پاداشـتەکانیانی کردوە، بـە ئیماندار ئەوانـی دواندووەو سـووخواردنی لێ قەدەغـە کـردوون، ئەگەر بڕوادار بن، ئەوانـە ئەوانەن کە پەندو ئامۆژگـاری پەروەردگاریان وەردەگـرن‌و بـۆ فەرمانەکانـی ملکەچـن، فەرمانی پێـدان خۆپارێزبن‌و لێی بترسـن، لە کۆی خۆپارێـزی‌و لـە خـوا ترسـانیان ئەوەیـە کـە وازبێنـن لەوەی مـاوە لە ڕیبـاو سـوودا، واتە: مامەڵـەو کڕیـن‌و فرۆشـتنەکانی ئێسـتا کـە هەیـە، بەڵام ئـەوەی ڕۆیشـتووەو تـێ پەڕیوە، ئـەوەی پەنـدو وانەی وەرگرتبێ ئـەوە خوا لـەوەی ڕابردووە، لێی خۆشـبووە، بـەڵام ئەوەی پەنـدو ئامۆژ گـاری خوایـی وەرنەگرتبـێ، ئـەوە دژایەتـی پەروەردگاری دەکات‌و شـەڕی ڕاگەیانـدوە لەگەڵ خـوا، بێگومان ئەو کەسـە دەستەوسـان‌و لاوازە، ناتوانـی دژایەتی خوای زاڵ‌و کارلەجـێ بـکات، ئەو خوایەی کە جڵەوی سـتەمکار درێـژ دەکات‌و ماوەی پێدەدات‌و فەرامۆشـی نـاکات تا دەیگرێت بـە گرتنی زاڵ‌و بـە توانای بەهێـز ﴿ وَإِن تُبۡتُمۡ ﴾ (ئەگەر پەشـیمان ببنـەوە) لە ڕیبـاو سـووخۆری ﴿ فَلَكُمۡ رُءُوسُ أَمۡوَٰلِكُمۡ ﴾ واتـە: دابیەزێنن بەسـەریدا ﴿ لَا تَظۡلِمُونَ ﴾ ئـەوەی مامەڵەتان لەگـەڵ کردبوو بە وەرگرتنـی زیادەی ئەوەی کـە ڕیبایـە ﴿ وَلَا تُظۡلَمُونَ ﴾ بە کەم کردنـی سـەرمایەکانتان ﴿ وَإِن كَانَ ﴾ (ئەگەر کەسـی) قەرزار ﴿ ذُو عُسۡرَةٍ ﴾ نـەدار بوو، نەیبوو بیداتـەوە، ﴿ فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيۡسَرَةٍ ﴾ ئەوە لەسـەری پێویسـتە مۆڵەتی بـدات، تا توانای دانـەوەی قەرزەکـەی دەبێ ﴿ وَأَن تَصَدَّقُواْ خَيۡرٌ لَّكُمۡۖ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴾ جـا چ بـە هەڵگرتنـی قەرزەکە لەسـەری‌و نەویسـتنەوەی هەمـوو قەرزەکـە، یان عەفـوو کردنی لـە هەندێ لـە قەرزەکە.

﴿ وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا تُرۡجَعُونَ فِيهِ إِلَى ٱللَّهِۖ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا كَسَبَتۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴾ ئـەم دەقـە لـەو دەقانەیـە کە لـە کۆتایی هاتنـە خـوارەوەی قورئـان دابەزیون، کراوەتـە کۆتایی بڕیـارو حوکـم‌و فەرمـان‌و قەدەغەکـراوەکان، چونکـە بەڵێنی پاداشـتی تێدایە لەسـەر خێرو چاکـە، هەڕەشـەی تێدایـە لەسـەر کاری خراپـە، جا هەر کەسـێک کـە زانـی دەگەڕێتەوە بـۆ لای خـوا پاداشـت‌و تۆڵـەی بۆ هەیە، لەسـەر بچـوک‌و گەورەو دیـارو شـاراوەکان، وە دڵنیابـوو خـوا بـە ئەنـدازەی گەردیلەیـەک سـتەمی لێنـاکات، ئـەوە حەزو ترسـی لەسـەر پێویسـت دەبێـت (حەز بـۆ کاری چاک‌و بەدەسـتهێنانی بەهەشـت، ترس لـە کاری خراپ چوونـە نـاو دۆزەخ) ئەمـەش بەبێ هەبوونی زانسـت‌و زانیاریی لـە دڵدا دەربـارەی ئەوە هیچ ڕێگایـەک نیـە بۆ (ڕزگـار بوون).

(٢٨٢): ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيۡنٍ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى فَٱكۡتُبُوهُۚ وَلۡيَكۡتُب بَّيۡنَكُمۡ كَاتِبُۢ بِٱلۡعَدۡلِۚ وَلَا يَأۡبَ كَاتِبٌ أَن يَكۡتُبَ كَمَا عَلَّمَهُ ٱللَّهُۚ فَلۡيَكۡتُبۡ وَلۡيُمۡلِلِ ٱلَّذِي عَلَيۡهِ ٱلۡحَقُّ وَلۡيَتَّقِ ٱللَّهَ رَبَّهُۥ وَلَا يَبۡخَسۡ مِنۡهُ شَيۡـٔٗاۚ فَإِن كَانَ ٱلَّذِي عَلَيۡهِ ٱلۡحَقُّ سَفِيهًا أَوۡ ضَعِيفًا أَوۡ لَا يَسۡتَطِيعُ أَن يُمِلَّ هُوَ فَلۡيُمۡلِلۡ وَلِيُّهُۥ بِٱلۡعَدۡلِۚ وَٱسۡتَشۡهِدُواْ شَهِيدَيۡنِ مِن رِّجَالِكُمۡۖ فَإِن لَّمۡ يَكُونَا رَجُلَيۡنِ فَرَجُلٞ وَٱمۡرَأَتَانِ مِمَّن تَرۡضَوۡنَ مِنَ ٱلشُّهَدَآءِ أَن تَضِلَّ إِحۡدَىٰهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحۡدَىٰهُمَا ٱلۡأُخۡرَىٰۚ وَلَا يَأۡبَ ٱلشُّهَدَآءُ إِذَا مَا دُعُواْۚ وَلَا تَسۡـَٔمُوٓاْ أَن تَكۡتُبُوهُ صَغِيرًا أَوۡ كَبِيرًا إِلَىٰٓ أَجَلِهِۦۚ ذَٰلِكُمۡ أَقۡسَطُ عِندَ ٱللَّهِ وَأَقۡوَمُ لِلشَّهَٰدَةِ وَأَدۡنَىٰٓ أَلَّا تَرۡتَابُوٓاْ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً حَاضِرَةٗ تُدِيرُونَهَا بَيۡنَكُمۡ فَلَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَلَّا تَكۡتُبُوهَاۗ وَأَشۡهِدُوٓاْ إِذَا تَبَايَعۡتُمۡۚ وَلَا يُضَآرَّ كَاتِبٞ وَلَا شَهِيدٞۚ وَإِن تَفۡعَلُواْ فَإِنَّهُۥ فُسُوقُۢ بِكُمۡۗ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱللَّهُۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿٢٨٢﴾﴾:

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيۡنٍ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى فَٱكۡتُبُوهُۚ وَلۡيَكۡتُب بَّيۡنَكُمۡ كَاتِبُۢ بِٱلۡعَدۡلِۚ وَلَا يَأۡبَ كَاتِبٌ أَن يَكۡتُبَ كَمَا عَلَّمَهُ ٱللَّهُۚ فَلۡيَكۡتُبۡ وَلۡيُمۡلِلِ ٱلَّذِي عَلَيۡهِ ٱلۡحَقُّ وَلۡيَتَّقِ ٱللَّهَ رَبَّهُۥ وَلَا يَبۡخَسۡ مِنۡهُ شَيۡـٔٗاۚ فَإِن كَانَ ٱلَّذِي عَلَيۡهِ ٱلۡحَقُّ سَفِيهًا أَوۡ ضَعِيفًا أَوۡ لَا يَسۡتَطِيعُ أَن يُمِلَّ هُوَ فَلۡيُمۡلِلۡ وَلِيُّهُۥ بِٱلۡعَدۡلِۚ وَٱسۡتَشۡهِدُواْ شَهِيدَيۡنِ مِن رِّجَالِكُمۡۖ فَإِن لَّمۡ يَكُونَا رَجُلَيۡنِ فَرَجُلٞ وَٱمۡرَأَتَانِ مِمَّن تَرۡضَوۡنَ مِنَ ٱلشُّهَدَآءِ أَن تَضِلَّ إِحۡدَىٰهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحۡدَىٰهُمَا ٱلۡأُخۡرَىٰۚ وَلَا يَأۡبَ ٱلشُّهَدَآءُ إِذَا مَا دُعُواْۚ وَلَا تَسۡـَٔمُوٓاْ أَن تَكۡتُبُوهُ صَغِيرًا أَوۡ كَبِيرًا إِلَىٰٓ أَجَلِهِۦۚ ذَٰلِكُمۡ أَقۡسَطُ عِندَ ٱللَّهِ وَأَقۡوَمُ لِلشَّهَٰدَةِ وَأَدۡنَىٰٓ أَلَّا تَرۡتَابُوٓاْ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً حَاضِرَةٗ تُدِيرُونَهَا بَيۡنَكُمۡ فَلَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَلَّا تَكۡتُبُوهَاۗ وَأَشۡهِدُوٓاْ إِذَا تَبَايَعۡتُمۡۚ وَلَا يُضَآرَّ كَاتِبٞ وَلَا شَهِيدٞۚ وَإِن تَفۡعَلُواْ فَإِنَّهُۥ فُسُوقُۢ بِكُمۡۗ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱللَّهُۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿٢٨٢﴾

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيۡنٍ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى فَٱكۡتُبُوهُ﴾ ئەمە دەقی ئایەتی قەرزە کە درێژترین دەقەکانی قورئانە، کۆمەڵە بڕیارێکی گەورەو بەرزی لە خۆ گرتووە:

یەکەمیان: هەموو جۆرەکانی قەرز لە سەلەمو هاوشێوەکانی دروستە، چونکە خوای گەورە هەواڵی داوە دەربارەی ئەو قەرزانەی کە بڕواداران لە نێوانی یەکتردا ئەنجامی دەدەن، بە پێی یاسای شەرعی، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر دروستی.

دووەمو سێیەم: پێویستە قەرزی سەلەم بۆ لەوەو دوا بێت، وە پێویستە لەبەر چاوو دیاری کراو بێت، دروست نیە بۆ ئێستا، وە بۆ کاتێکی دیار.

چوارەم: فەرمان کردن بە نووسینی هەموو کاروبارە قەرزیەکان، یان واجبو پێویستە،

یــان چــاکو ڕێگــە پێــدراوە، لەبەر ئــەوە نووســین زۆر پێویســتە، چونکــە بە بێ نووســین هەڵــەو بیــر چوونەوەو کێشــەو گرفت لــە نێوانی ئــەو دوو لایەنــەدا ڕوودەدات.
پێنجەم: فەرمانی بە نووسەر کردوە کە بنوسێت.
شەشــەم: دەبێــت نووســەر لە ناخــەوە کەســێکی دادپــەروەر بێت، بــۆ ئەوەی نووســینەکەی جێگــای بایــەخ بێت، وە نابێت فاســق بێت، چونکە نە قســەی وەردەگیریو نە نووســینەکەی جێگــای بایەخە.
حەوتــەم: پێویســتە لەســەری دادپەروەر بــێ لــە نێوانیاندا، مەیلی بــۆ لای هیچکامیــان نەبێت بــە هــۆی خزمایەتی، یــان هاوڕێیەتی، یــان هاوشــێوەی ئەوانە.
هەشــتەم: دەبێــت نووســەر شــارەزابێت بە نووســینی گرێبەســتەکان، وە ئەوەی کە پێویســتە لەســەر هــەر یەکێک لە ئــەوان، ئــەوەی متمانە بە دەســت دێنێــت، چونکە هیــچ ڕێگایەک نایگەیەنێــت بــە دادپــەروەری تەنها بەوە نەبێت، ئەمــەش لە وتەی خوای گــەورە وەرگیراوە: ﴿ وَلۡيَكۡتُب بَّيۡنَكُمۡ كَاتِبُۢ بِٱلۡعَدۡلِۚ ﴾
نۆیــەم: ئەگەر نووســراوێکی متمانــە پێکراوی دەســتکەوت کاری پــێ دەکات، ئەگەر ئەوو شــایەتەکانی مردبوون.
دەیــەم: کــە دەفەرمــوێ: ﴿ وَلَا يَأۡبَ كَاتِبٌ أَن يَكۡتُبَ ﴾ واتــە: ڕێگری ناکرێت لە کەســێک خــوا منەتــی خــۆی پێبەخشــیوە بــە شــارەزابوون لە نووســین، ئەگەر هەســتێت بە نووســینی گرێبەســتی نێــوان دوو کــەس، وەک چــۆن خــوای گــەورە چاکــەی لەگەڵــدا کــردوە بــە فێربوونــی ئــەو زانســتە، پێویســتە ئەویــش چاکە بکات لــە نێوان ئەوانــەدا کە پێویســتیان بە نووســینی ئــەوە، وە نابــێ ڕێگــری بکات لە نووســینی گرێبەســت لــە نێوانیاندا.
یــازدە: فەرمانــی کــردوە بــە نووســەر کــە جگە لە هــەق هیــچ شــتێکی دی نەنووســێت لە قەرزەکە.
دوازدە: ئەوەی کە گرێبەستەکە پڕ دەکاتەوە ئەو کەسەیە کە قەرزەکەی لەسەرە.
ســێزدە: فەرمانــی پێکــردوە کە ســەرجەم ئــەو مافانــە ڕوون بکاتــەوە کە بەســەریەوەیە، وە هیچــی لــێ کــەم نەکاتەوە.
چــواردە: بە دڵنیایی دان پێدانانی مرۆڤ لەســەر نەفســی خــۆی قبوڵ کــراوە، چونکە خوای گــەورە فەرمانــی کردوە بــەوەی ئەگــەر قەرزارەکــە خوێنــدەواری نەبوو ئەوە با کەســێکی تــر قەرزەکە بنووســێ، ئەگەر لەســەر زمانی قــەرزار قەرزەکە نووســرا، ئــەوە ناوەڕۆکی ئەو

قـەرزە جێگیــر دەبــێ، ئەگــەر لــە دوای ئەوە بانگەشــەی ئــەوە بــکات هەڵەی کــردوە، یان نەیزانیــوە ئــەوە وتەکەی لــێ وەرناگیرێ.

پازدەیــەم: ئــەو کەســەی کــە مافێک لــەو مافانەی لەســەرە کــە بریتیە لــە بەشــێکی دیاری کــراو بــە ئەنــدازەو وەســفی لە زۆری‌و لــە کەمی، بە ڕاســتی وتەکانــی وەرگیــراوە، چونکە خــوای گەورە کــەم کردنەوەی ئــەو مافەی لێ قەدەغە نەکــردوە، ئەوەندە وتــەی وەرگیراوە کە لە ســنووری هــەق‌و ڕاســتیدا بێ.

شــازدە: حەرامــە لەســەر ئــەو کەســەی کــە مافێــک لــە مافەکانــی بەســەرەوەیە لێــی کەم بکاتــەوە، بــە هــەر ئەندازەیــەک بێ.

حەڤــدە: ئــەوەی کە لە توانایــدا نیە نووســینەکە بخوێنێتــەوە، یان بینووســێت لەبــەر منداڵی، یــان کــەم عەقڵی یان هاوشــێوەی ئەوانە، ئــەوە خاوەن دارەکــەی لە جێگای ئەو دەینوســێ‌و دانی پێــدا دەنێ.

هــەژدە: پێویســتە خاوەنــدار دادپەروەربــێ وەک چــۆن پێویســتە لەســەر ئــەو کەســەی کە مافــی بەســەرەوەیە دادپەروەربێ‌و لێــی کەم نەکاتــەوە، لەبەر ئەوە خوای گــەورە دەفەرموێ: ﴿ بِٱلۡعَدۡلِ ﴾.

نــۆزدە: مەرجــە خاوەندار دادپــەروەر بێت، چونکــە پڕکردنەوە بــە دادپەروەری کە باســکرا نابــێ لەلایەن کەســێکی فاســقەوە بێ.

بیست: جێگیر بوونی خاوەن دارێتی لە ماڵ‌و ساماندا.

بیســت‌و یــەک: بە ڕاســتی هــەق‌و ماف لەســەر منداڵ‌و کــەم عەقــڵ‌و شــێت‌و لاوازە نەک لەســەر خاوەندار.

بیســت‌و دوو: دان پێدانانی منداڵ‌و کەم عەقڵ‌و شــێت‌و شێتۆکەو هاوشــێوەکانی دانامەزرێت، چونکــە خــوای گــەورە فەرمانی کــردوە بــە خاوەندارەکانیــان بۆیان پــڕ بکەنــەوە، وە هیچ ئەرکێکی نەخســتۆتە سەرشــانی ئەوان وەک ڕەحمەتێک بۆیان، لە ترســی ئــەوەی ماڵەکانیان بەهــەدەر بدەن.

بیست‌و سێ: دروستی مامەڵەی خاوەندار لە ماڵی ئەوانەی کە باسمان کرد.

بیســت‌و چــوار: بەڵگەیــە لەســەر ڕێگە پێدانــی فێربوونی ئەم زانســتە کــە لە نێــوان یەکتردا دەنووســرێ، چونکە مەبەســت لەمــەدا دادپــەروەری‌و بەدەســتهێنانی متمانەیە، (ئــەو کارەی کــە تەنهــا بەوە نەبــێ تــەواو نابێ ئــەوە ڕێگە پێــدراوە).

بیســتو پێنــج: فێربوونی نووســین ڕێگــە پێــدراوە بەڵکو فــەرزی کیفایەیــە، چونکە خوای گــەورە لــە نووســینی قــەرزو هاوشــێوەکانیدا فەرمانــی پێکردوە، وە ئــەوەش نایەتــە جێ بە فێربــوون نەبێ.

بیســتو شــەش: فەرمــان کــراوە بە شــایەت گرتــن بــۆ گرێبەســتەکان، ئــەم فەرمانەش بۆ ســوننەتە، چونکــە مەبەســت لەوەدا هاندانــە بۆ پاراســتنی مافــەکان، ئــەوەش دەگەڕێتەوە بۆ بەرژەوەنــدی ڕاســپێراو، ئەگەر خەرجکــەر خاوەنداری هەتیــو بێ، یان وەقــف کراوبێ، یان هاوشــێوەی ئــەوە، کــە پێویســتە بپارێزرێــت، دەرکەوێــت کە شــایەت گرتن بۆ پاراســتنی هــەقو مافەکە پێویســتە.

بیســتو حــەوت: ئەنــدازەی شــایەتی دان لە مــاڵو ســامانو هاوشــێوەکانی، بریتیــە لە دوو پیــاو، یــان پیاوێــکو دوو ئافــرەت، وە بــە بەڵگەی ســوننەت هاتــووە، کە شــایەتێک وەر دەگیرێــت لەگــەڵ ســوێندی داواکەر.

بیســتو هەشــت: بێگومان شــایەتی منداڵ قبــووڵ ناکرێــت، چونکە دەقەکە باس لە وشــەی پیاو دەکات.

بیســتو نۆ: شــایەتی دانــی تایبەتە بە ماڵو ســامان، لە شــتەکانی تــردا وەرناگیرێت، چونکە خــوای گــەورە شــایەتیانی وەرنەگرتــووە تەنها لەگــەڵ پیــاودا نەبێــت، وە دەوترێت: خوای گــەورە دوو ئافرەتــی لە ئاستی یەک پیــاودا باس کردوە، لەبــەر ئەو حیکمەتەی کە باســی کــردوە، ئەویــش دیارە یەکســانە ئەگــەر لەگەڵ پیــاودا بن، یان بــە تەنها، خــوا زاناترە.

ســی: شــایەتی کۆیلــەی باڵغ وەردەگیرێت وەک شــایەتی کەســی ئــازاد، لەبەر گشــگیری مانــای دەقەکــە: ﴿ وَٱسۡتَشۡهِدُواْ شَهِيدَيۡنِ مِن رِّجَالِكُمۡ ﴾ وە کۆیلــەی باڵــغ لــە پیاوان.

ســیو یــەک: شــایەتی دانــی بێبــڕوا نێر بن، یــان مێ وەر گیــراو نیــە، چونکە لــە ئێمە نین، چونکە بنەمای شــایەتی لەســەر عەدالەتــە، ئەویش دادپــەروەر نیە.

ســیو دوو: بەڵگەیە لەســەر فــەزڵو چاکەی پیاو بەســەر ئافرەتەوە، وە پیاوێــک بەرانبەرە بە دوو ئافــرەت لەبەر هێزی پاراســتنیو ئەویش لەبەر ناتەواوی پاراســتنی.

ســیو ســێ: ئــەو کەســەی شــایەتیەکەی بیــر چووبوویــەوە، پاشــان بیــری کەوتــەوە ئەوە شــایەتیەکەی وەرگیــراوە، لەبــەر فەرمایشــتی: ﴿ فَتُذَكِّرَ إِحۡدَىٰهُمَا ٱلۡأُخۡرَىٰ ﴾.

ســیو چــوار: لە مانــای دەقەکە ئــەوە وەردەگیرێت، ئەگەر ترســا لــەوەی شــایەتیەکەی بیر بچێــت لــە مــافو واجباتەکاندا، ئەوە پێویســتە بینووســێتەوە، چونکە (مَـا لا يَتِـمُّ الْوَاجِـبُ إِلاَّ

بە فَهُوَ وَاجِبٌ).

سـیو پێنج: پێویسـتە لەسـەر شـایەت ئەگەر بانگکـرا بۆ شـایەتیو هیـچ بیانوویەکی نەبوو بچـێ، دروسـت نیە بۆی یاخـی بێت، لەبەر فەرمـوودەی خوای گـەورە: ﴿ وَلَا يَأْبَ الشُّهَدَاءُ إِذَا مَا دُعُوا ﴾.

سـیو شـەش: ئەوەی کە وەسـفی ڕاسـتەقینەی شـایەتی دانی تێدانیە پێویسـت نیە لەسـەری وەلاّمـی بداتـەوە، چونکـە هیچ سـوودێکی تێدانیـە، لەبەر ئەوە ئـەو لە شـایەتەکان نیە.

سـیو حـەوت: قەدەغەکردنـی خـۆ بێ تاقـەت کردنو سسـتی توانـدن لە نووسـینی قەرزدا بـە گشـتی، لە منـداڵو گـەورە، وە سـیفەتی خۆ دواخسـتن، وە هەمـوو ئەوا کۆسـپانەی لە پێـش ئەو گرێبەسـتەدا دروسـت بکرێت.

سـیو هەشـت: ڕوون کردنـەوەی حیکمـەتو ڕێگـە پێدانـی نووسـینو شـایەتی دان لـە گرێبەسـتەکاندا، بەڕاسـتی ئەو کارە ﴿ أَقْسَطُ عِندَ اللَّهِ وَأَقْوَمُ لِلشَّهَادَةِ وَأَدْنَىٰ أَلَّا تَرْتَابُوا ﴾ بـە ڕاسـتی ئەمـە دادپـەروەری دەگرێتـە خـۆ، چونکـە یاسـای بەندەکانـە، وە شـایەتیەک بنووسـرێت باشـترو بەهێزتـرو تەواوتـرە، دوورتـرە لـە گومـانو دوو دڵـی بیرچوونـەوەو کێشـمە کێشـمو ڕکابەری.

سـیو نـۆ: لـەم دەقەدا ئـەوە وەردەگیرێـت هەر کەسـێک گومان لە شـایەتی دانـی بکرێت دروسـت نیە بانـگ بکرێت بـۆ شـایەتیدان، بەڵکو پێویسـتی بـە دڵنیایی هەیە.

چـل: کـە دەفەرمـوێ: ﴿ إِلَّا أَن تَكُونَ تِجَارَةً حَاضِرَةً تُدِيرُونَهَا بَيْنَكُمْ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَلَّا تَكْتُبُوهَا ﴾ بەڵگەیـە لـە سـەر ڕێگـە پێـدان لـە وازهێنانـی نووسـین، ئەگـەر بازرگانیەکـە حـازر بـە حـازر بوو (دەسـت بە دەسـت بـوو)، لەبەر ئـەوە زۆر پێویسـت بە نووسـین ناکات.

چـلو یـەک: ئەگەر چـی ڕێگـە دراوە بە نە نووسـینی بازرگانی حـازر، بەڵام شـایەتی دان دیاری کـراوە، چونکە دەفەرمـوێ: ﴿ وَأَشْهِدُوا إِذَا تَبَايَعْتُمْ ﴾

چـلو دوو: قەدەغـە کـردن لـە زیـان گەیاندن بـە نووسـەر، بـەوەی کاتێک بانـگ بکرێ سـەرقاڵ بـێ بـە کارێکی تـرەوەو ئەرکی سـەر شـانی قـورس بکرێت.

چـلو سـێو چـلو چوارو چـلو پێنـج: قەدەغـە کردنـی زیانـدان لە شـایەت، بـەوەی لە کاتێکـدا بانـگ بکـرێ نەخۆش بـێ، یان سـەرقاڵ بێت بە کارێکـی ترەوە، یان هاوشـێوەی ئـەوە، ئەمـە لەسـەر وتـەی خـوای گـەورە: ﴿ وَلَا يُضَارَّ كَاتِبٌ وَلَا شَهِيدٌ ﴾ فیعلە کـە بـە

(مبنـی للمجهـول) هاتـوە، وە ئەگـەر بكرێـت بـە (مبنـی للمعلـوم) ئـەوە قەدەغـە كردنی شـایەتو نووسـەر دەگەیەنێـت كە زیان لە خـاوەن ماف نـەدەن، بە خۆ گرتنـەوە، یان داوا كردنـی كرێیەكـی قـورسو گـران، ئـەم دووانە: چـلو چـوارو چلو پێنـج بوون.

چـلو شـەش: بـە ڕاسـتی ئەنجامدانی ئـەم حـەرام كراوانە لە نیشـانەی فاسـق بوونـە، لەبەر فەرمایشـتی خـوای گـەورە: ﴿ وَإِن تَفۡعَلُواْ فَإِنَّهُۥ فُسُوقُۢ بِكُمۡ ﴾.

چـلو حـەوت: وەسـفەكانی تـاوانو بـڕواو ئیمـانو دووڕوویو دژایەتـیو دۆسـتایەتیو هاوشـێوەی ئەمانـە بـەش بـەش دەبێـت لە مرۆڤـدا، هەنـدێ جار مـاددەی تـاوانو جگە لە تاوانـی تێـدا كۆدەبێتـەوە، وە بە هەمان شـێوە بڕواو كوفـر وەك دەفەرموێ: ﴿ فَإِنَّهُۥ فُسُوقُۢ بِكُمۡ ﴾ نەیفەرمـوو (فأنتم فاسقون) واتـە: ئێوە لادەرن، یان (فُسَّـاق) واتـە: زۆر لادەرن.

چـلو هەشـت: هەقـی خۆیەتی پێـش بخرێت، چونكـە بابەتەكەی لـە پێشـە، ئەویش مەرج گرتنـی دادپەروەریـە لـە شـایەتدا، وەك خـوای گـەورە دەفەرمـوێ: ﴿ مِمَّن تَرۡضَوۡنَ مِنَ ٱلشُّهَدَآءِ ﴾.

چـلو نـۆ: بـە ڕاسـتی لـە دادپەروەریـدا نەریـت بە مـەرج وەرگیـراوە لـە هەموو شـوێنو كاتێكـدا، هـەر كەسـێك لـە لای خەڵكـی وەربگیرێـتو خۆشـیان بوێـت شایەتیشـی وەردەگیرێـت.

پەنجا: ئەوەی لێ وەردەگیرێت كە شایەتی كەسی نەناسراو وەرناگیرێت هەتا نەناسرێت.

وَإِن كُنتُمْ عَلَىٰ سَفَرٍ وَلَمْ تَجِدُوا كَاتِبًا فَرِهَانٌ مَّقْبُوضَةٌ
فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُم بَعْضًا فَلْيُؤَدِّ الَّذِي اؤْتُمِنَ أَمَانَتَهُ وَلْيَتَّقِ
اللَّهَ رَبَّهُ وَلَا تَكْتُمُوا الشَّهَادَةَ وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُ
آثِمٌ قَلْبُهُ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ (٢٨٣) لِّلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ
وَمَا فِي الْأَرْضِ وَإِن تُبْدُوا مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ
يُحَاسِبْكُم بِهِ اللَّهُ فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَاءُ
وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (٢٨٤) آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ
مِن رَّبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ
وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِ وَقَالُوا
سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ (٢٨٥) لَا يُكَلِّفُ
اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ
رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَا إِن نَّسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ
عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِنَا رَبَّنَا
وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا
وَارْحَمْنَا أَنتَ مَوْلَانَا فَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ (٢٨٦)

(٢٨٣): ﴿وَإِن كُنتُمْ عَلَىٰ سَفَرٍ وَلَمْ تَجِدُوا كَاتِبًا فَرِهَانٌ مَّقْبُوضَةٌ فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُم بَعْضًا فَلْيُؤَدِّ الَّذِي اؤْتُمِنَ أَمَانَتَهُ وَلْيَتَّقِ اللَّهَ رَبَّهُ وَلَا تَكْتُمُوا الشَّهَادَةَ وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُ آثِمٌ قَلْبُهُ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ (٢٨٣)﴾:

﴿وَإِن كُنتُمْ عَلَىٰ سَفَرٍ﴾ واتە: ئەگەر ئێوە لە گەشتدا بوونو ﴿وَلَمْ تَجِدُوا كَاتِبًا﴾ (نووسەرێک نەبوو) لە نێوانتاندا بنوسێتو گرێبەستەکە تەواو بکات ﴿فَرِهَانٌ مَّقْبُوضَةٌ﴾ واتە: خاوەن ماف وەری دەگرێتو دەبێتە بارمتەیەک لە لای هەتا هەقەکەی بۆ دەهێنێتەوە، ئەم دەقە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ڕەهنی وەرنەگیراو گرێبەستی تێدا ناکرێت، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بارمتەدەر (قەرزارەکە)و بارمتە وەرگر ئەگەر جیاوازیان هەبوو لە ئەندازەی ئەو شتەی کە دەکرێت بە بارمتە، ئەوە وتە تەنها وتەی بارمتە وەرگرە، لەبەر ئەوە خوای گەورە ڕەهنی لە بری نووسین داناوە بۆ ئەوەی خاوەن ماف کەسی بەرانبەری پێ ببەستێتەوە، لێرەدا ئەگەر وتەی بارمتە وەرگر وەرنەگیرێت لە ئەندازەی قەرزەکەدا ئەوە هیچ مانایەک لە ڕەهنەکەدا بەجێ نایەت، لە کاتێکدا ئەگەر مەبەست لە ڕەهن بەستنەوە بێت ئەوە دروستە لەگەشتو شوێنی نیشتەجێبووندا، لەبەر ئەوە خوا باسی گەشتی کردوە، چونکە پێویست بە نووسین ناکات، ئەمە هەمووی ئەگەر خاوەن ماف حەزی کرد جەخت لە مافەکەی خۆی بکاتەوە، ئەگەر خاوەن ماف ئەمین بوو لەقەرزپێدراوەکە، وە حەزی کرد مامەڵەی لەگەڵ بکات بە بێ بارمتە، ئەوە پێویستە لەسەر ئەو کەسەی کە مافەکە لایەتی بە تەواوی مافەکەی خۆی پێبدات، بەبێ ئەوە ستەمی لێ بکاتو لێی کەم بکاتەوە ﴿وَلْيَتَّقِ اللَّهَ رَبَّهُ﴾ لە پێدانی مافەکە، بە باشترین شێوە پاداشتی بداتەوە، چونکە گومانی باشی بۆ بردوە ﴿وَلَا تَكْتُمُوا الشَّهَادَةَ﴾ چونکە ماف لەسەر شایەتی بوونیاد دەنرێت، ناکرێت بشارێتەوە، دیارە شاردنەوەی لە تاوانە گەورەکانە، چونکە واز لە هەواڵێکی ڕاستەقینە

دەهێنێ، لەبەر ئەمە دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُۥٓ ءَاثِمٌ قَلْبُهُۥ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾ بێگومان ئەم بڕیارە جوانانە کە خوای گەورە ڕێنمایی بەندەکانی پێدەکات، پڕە لە حیکمەتی گەورەو بەرژەوەندی گشتی، وە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەگەر خەڵک بە ڕێنمایی خوا بجوڵێنەوە، ئەوە دنیایان باش دەبێت لەگەڵ چاکبوونی ئاینیان، چونکە پڕە لە دادپەروەریو بەرژەوەندیو پاراستنی مافەکانو لەناو بردنی ڕقو کینەو دژایەتی یەکدی. سوپاسو ستایش بۆ ئەو خوایەی وەک چۆن پێویستە ستایشی مەزنیو گەورەیی بکرێت، هەرگیز وەسفکردنی لە ژماردن نایەت.

(٢٨٤): ﴿لِّلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَإِن تُبْدُوا۟ مَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ ٱللَّهُ ۖ فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٨٤﴾﴾:

ئەمە هەواڵێکە لەلایەن خواوە کە هەرچی لە ئاسمانەکانو زەویدایە هی ئەوە، هەموویان بەدیهێنراوی ئەون، ڕۆزیاندەداو بەرژەوەندی دنیاو دواڕۆژیان بەڕێوەدەبات، ئەوان موڵکو بەندەی ئەون، ناتوانن نە زیانو نە سوود بە خۆیان بگەیەنن، بەهەمان شێوە نە مردنو ژیانو زیندووبوونەوەش ، ئەو پەروەردگاریانەو خاوەنیانە بە حیکمەتو داناییو دادپەروەریو چاکەی خۆیو کاروباریان بەڕێوە دەبات، بێگومان فەرمانی پێکردوونو قەدەغەشی لێکردوون، وە لە داهاتوودا لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکات لەسەر ئەوەی بەنهێنیو ئاشکرا ئەنجامیان داوە ﴿فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ﴾ ئەوە بۆ کەسێکە کە هۆکارەکانی لێ خۆشبوونی تێدابێ، وە سزای کەسی گوناهباریش دەدات بە هۆی گوناهەکەی ئەگەر بیەوێ ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ هیچ شتێک دەستەوسانی ناکات، بەڵکو هەموو بەدیهێنراوەکان ژێرباری تواناو دەسەڵاتو ویستو ئەندازەگیریو پاداشتی ئەون.

(٢٨٥): ﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَـٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِۦ ۚ وَقَالُوا۟ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۖ غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٢٨٥﴾﴾:

خوا ﷻ هەواڵدەدا دەربارەی بڕوابوونی پێغەمبەر موحەممەد ﷺو بڕوادارانیش لە گەڵیدا، وە گەردن کەچیو گوێڕایەڵیو پاڕانەوەیان لە پەروەردگاریان، لەگەڵ ئەوەدا داوای لێبووردنیش دەکەن، جا هەواڵیدا ئەوان بڕوایان هێناوە بە خواو فریشتەکانو کتێبەکانو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، ئەمەش بڕوا بوون بە هەموو ئەوانە دەگرێتەوە کە خوا هەواڵی پێیانداوە، وە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێداون، دەربارەی سیفەتە تەواوەکانیو وەسفە بەرزو بەڕێزەکانی بە

کورتی‌و درێژیەوە، بە پاک ڕاگرتنی خوا لە وێنە بۆ دانان‌و وپەک خستنی سیفەتەکانی، وە بە پاک ڕاگرتنی لە هەموو سیفەتە ناتەواوەکان.

وە هەروەها بڕوابوون بە فریشتەکان کە لە شەریعەتەکانی تردا بە درێژی‌و کورتی باسکراون، وە هەروەها بڕوا بوون بە هەموو پێغەمبەران‌و کتێبەکان، واتە: بە هەموو ئەوانەی پێغەمبەران هەواڵیان پێداوە، ئەوەش کە لە کتێبەکاندا باس کراون لە هەواڵ‌و فەرمان‌و قەدەغەکراوەکان، بێگومان ئەوان جیاوازی ناخەنە نێوان هیچ یەکێک لە پێغەمبەران، بەڵکو بڕوا بە هەموویان دەهێنن، چونکە ئەوان نێوەندن لە نێوان خواو بەندەکانی، کافر بوون بە هەندێکیان کافر بوون بە هەموویانە، بەڵکو کافر بوونە بە خوا، ﴿ وَقَالُواْ سَمِعْنَا ﴾ ئەوەی فەرمانت پێمان کردوەو لێمانت قەدەغە کردوە ﴿ وَأَطَعْنَا ﴾ ئەوە بۆ تۆیە (فەرمان‌و قەدەغە)، لەوانە نەبوون کە وتیان: بیستمان‌و سەرپێچیمان کرد.

کاتێ کە بەندە هەردەبێ کەم‌و کورتی لێیەوە بەدی بێت دەربارەی مافەکانی خوای بەرز، ئەو بە بەردەوام پێویستی بە لێبوردن‌و لێ خۆشبوونی خوا هەیە، وتیان: ﴿ غُفْرَانَكَ ﴾، واتە: داوای لێبوردنت لێ دەکەین لە کەمتەرخەمی‌و گوناهەکانمان، ئەو کەم‌و کورتیی‌و عەیبانەی پێی وەسف کراوین لایبەرە ﴿ وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ ﴾ واتە: سەرچاوەی گەڕانەوەی هەموو بەدیهێنراوەکان لە لای تۆیە، هەر خۆت پاداشت‌و سزایان دەدیت، بەوەی کردوویانە لە چاکەو خراپە.

(٢٨٦): ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ۚ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا ٱكْتَسَبَتْ ۗ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا ۚ رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَآ إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِنَا ۚ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦ ۖ وَٱعْفُ عَنَّا وَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَآ ۚ أَنتَ مَوْلَىٰنَا فَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٨٦﴾ ﴾:

﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ۚ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا ٱكْتَسَبَتْ ﴾ کاتێ ئەم دەقە هاتە خوار: ﴿ وَإِن تُبْدُواْ مَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ ٱللَّهُ ﴾ زۆر قورس بوو لەسەر مسوڵمانان بۆیە گومانیان برد کە ئەوەی دەکەوێتە ناو دڵەوە لە هەر شتێک جێگیرو ناجێگیرەکان کە بە سەریاندا دێت دەژمێردرێ‌و گوناهبار دەبن، خوا هەواڵی پێدان بەم دەقە کە ئەو داوا لە هیچ کەسێک ناکات مەگەر ئەوەی لە توانایدا هەیە، واتە: فەرمان‌و کارێک کە لە هێزو وزەو توانای ئەودا بێ، هیچ ئەرکێک ناخاتە ئەستۆیان کە لە توانایاندا نەبێ، وەک فەرموویەتی: ﴿ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِى ٱلدِّينِ مِنْ حَرَجٍ ﴿٧٨﴾ ﴾الحج.

بنەمای فەرمان‌و قەدەغەکراوەکان لەو کاروبارانە نین کە نارەحەتن لەسەر دڵەکان، بەڵکو ئەوانە

خۆراکو بژێون بۆ ڕووحەکانو دەرمانن بۆ جەستەکان، وە پارێزەرن لە زیان، جا خوای گەورە فەرمانی بە بەندەکانی داوە بەوەی کە فەرمانی پێیانداوە وەک بەزەییو چاکەیەک لەگەڵیاندا، لەگەڵ ئەمەشدا ئەگەر هەندێک لە بیانووەکان ئەوانەی جێ گومانی نارەحەتین بوونی هەبوو، ئەوە کار ئاسانی دەستەبەر دەبێت، یان بە نەهێشتنی لە ئەستۆی داوالێکراو، یان بە هەندێکی وەک ئەوەی سوک کراوە بۆ نەخۆشیو گەشتیارو جگە لەوانیش.

پاشان خوا ﷻ هەواڵیداوە کە هەر کەسێک کارێکی چاک ئەنجام بدات پاداشتو خێرەکەی هەر بۆ خۆیەتی، وە هەر خراپەیەکیشی کرد بە زیانی خۆیەتیو ڕووبەڕووی خۆی دەبێتەوە، هیچ کەس گوناهی کەسی دیکە هەڵناگرێ، وە چاکەکانی هیچ کەسێ بۆ غەیری خۆی ناچێت، هێنانی وشەی چاکە (خیر) بە (کسب) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کاری خێر بۆ مرۆڤ بە کەمترین هەوڵو کۆشەش دەستەبەر دەبێ، تەنها بە نیازو نیەتی دڵ.

بۆ کاری خراپ (شر) (اکتسب)ەی هێناوە بۆ ئەوەی بەڵگەبێت لەسەر ئەوەی کاری خراپ لەسەر مرۆڤ نانوسرێت تا ئەنجامی نەداتو هەوڵو کۆشەشەکەی نەیەتەدی.

لەو کاتەی خوا ﷻ هەواڵیدا دەربارەی بڕوای پێغەمبەر ﷺ، وە بڕوادارانی لەگەڵیدان، هەموو کەسێ لەسەر کردەوەکەی پاداشت دەدرێتەوە، مرۆڤیش لە بەردەم تووش بوونە بە کەمتەرخەمیو هەڵەو لەبیرچونەوە، هەواڵیداوە کە ئەو ئێمە ڕاناسپێرێت مەگەر بەوەی لە تواناماندابێتو بتوانین ئەنجامی بدەین، هەواڵیدا دەربارەی داوای بڕواداران بەوە کە لە لەبیریان دەچێتەوەو بە هەڵە ئەنجامی دەدەن، بێگومان پێغەمبەر ﷺ هەواڵیداوە خوا فەرموویەتی: (قد فعلتُ) واتە: بە دڵنیاییی وامکردوە، وەک وەڵامدانەوە بۆ وەڵامدانەوەیەک بۆ ئەم پاڕانەوەیە، دەفەرموێ: ﴿ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذۡنَآ إِن نَّسِينَآ أَوۡ أَخۡطَأۡنَا ﴾ جیاوازی لە نێوانیاندا: بێگومان (النسیان) لەبیر چوونەوە: فەرامۆش کردنی دڵە لەوەی فەرمان پێکراوە وازی لێ دێنی بە هۆی لە بیرچوونەوە.

وە (الخطأ) هەڵە: ئەوەیە نیەتی ئەنجامدانی شتێ دەکات وا دەزانی دروستە، پاشان ئەنجامدانی کارەکەی بۆ دەردەکەوێ کە دروست نیە، ئەو دووانە بە ڕاستی خوا ئۆممەتی ئیسلامی لـێ عەفو کردوون کە لێیان ڕووبدات، وەک بەزەیی پێیانو چاکە کردن لەگەڵیاندا، لەسەر ئەو بنچینە هەر کەس نوێژ بکات بە جلو بەرگی داگیرکراو، یان پیس، یان بیری چوویێ پیسی سەر جەستەی بووە، یان بە لە بیرچوونەوە قسە بکات لە نوێژدا، یان بە لە بیرچوونەوە ڕۆژوو بشکێنێ، یان لە قەدەغە کراوێک لە قەدەغەکراوەکانی ئیحرام (لە حەج یان عومرە) ئەوەی کە فەوتاندنی تیادا نەبێ، ئەوە عەفوەو بوردراوە.

هەروەها ئەوەی سوێندی خواردبێ لەسەر شتێکو دوایی سوێندەکە نەباتە سەر بە لەبیرچوونەوە ئەوە سوێندەکەی ناشکێو هیچی لەسەر ناکەوێ، هەروەها ئەگەر هەڵەی کرد کەسێکی فەوتاند، یان سامانێکی فەوتاند، ئەوە گوناهبار نابێ، بەڵکو دەستەبەر بوونو بەرپرسیاریەتی بژاردنی دەکەوێتە سەر، هەروەها ئەو شوێنانەی ناوی خوا هێنان تێیدا پێویستە ئەگەر مرۆڤ ناوی خوای نەهێنا بە لە بیرچوونەوە هیچ زیانی نیە.

﴿ رَبَّنَا وَلَا تَحۡمِلۡ عَلَيۡنَآ إِصۡرٗا ﴾ واتە: ڕاسپاردە نارەحەتەکان ﴿ كَمَا حَمَلۡتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِنَا ﴾ بێگومان خوا ﷻ وای کرد، خوا سووکو ئاسانی کرد لەسەر ئەم ئۆممەتە لە فەرمان پێکراوەکان لە پاکو خاوێنیەکانو پەرستشەکان، کە لەسەر غەیری ئەمان سووکی نەکردبوو ﴿ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلۡنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦ ﴾ (خوای گەورە) وای کرد، سوپاسو ستایش بۆ (خوا) ﴿ وَٱعۡفُ عَنَّا وَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَآ ﴾ بە لێبوردنو لێ خۆش بوون، بەم دووانە لاچوونی ناخۆشیو خراپەکانی بە دەست دێن، بە بەزەیش چاک بوونی کارەکان دەستەبەر دەبن ﴿ أَنتَ مَوۡلَىٰنَا ﴾ واتە: پەروەردگارمانو پادشاو خاوەنمانو پەرستراومانە، ئەو خوایەی! کە بەردەوام سەرپەرشتیو فەرمانڕەوایەتیمان دەکەی لەوکاتەوەی کە ئێمەت هێناوەتە بوونو دروستکردووین، نازو نیعمەتەکانت بەسەرمانەوەیەو دووبارە دەبنەوە گەیشتوون بە ژمارەی کاتەکان، پاشان نیعمەتت بەسەرماندا کردوە بە نیعمەتی مەزنو خەڵاتی گەورە، کە بریتیە لە نیعمەتی ئیسلام کە هەموو نیعمەتەکان بە دوای ئەودا دێن، داوات لێ دەکەین ئەی پەروەردگارا، ئەی خاوەنو گەورەمان تەواوی نازو نیعمەتت برێژی بەسەرماندا سەرمان بخەی بەسەر کۆمەڵی کافرەکان، ئەوانەی بێبڕوا بوون بە تۆو بە ڕەوانەکراوانت، وە ڕکابەری خاوەن ڕێبازو ئاینەکەتیان کردوە، فەرمانتیان شکاندووەو بەڵێنیان هەڵوەشاندۆتەوە، سەرمان بخەو توانادارمان بکە بەسەریان بە بەڵگەی ڕوونو هێزی شمشێرو بەوەی لەسەر زەوی دەسەڵاتمان بکەوێتە دەستو ئەوان ڕیسوا بکەی، وە نیعمەتی ئیمانمان پێی ببەخشی کە سەرکەوتنیان پێ دەستەبەر دەبێ، سوپاسو ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییان.

تەفسیری سووڕەتی (البقرة) بە پشتیوانی خوا تەواو بوو

صەڵاتو سەلام لەسەر پێغەمبەری خوا بێ.


بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
الٓمٓ (١) ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَيُّ ٱلْقَيُّومُ (٢) نَزَّلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ
بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَأَنزَلَ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ (٣) مِن
قَبْلُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَأَنزَلَ ٱلْفُرْقَانَ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ
لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ ذُو ٱنتِقَامٍ (٤) إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَخْفَىٰ
عَلَيْهِ شَىْءٌ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِى ٱلسَّمَآءِ (٥) هُوَ ٱلَّذِى يُصَوِّرُكُمْ
فِى ٱلْأَرْحَامِ كَيْفَ يَشَآءُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ (٦) هُوَ
ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ مِنْهُ ءَايَٰتٌ مُّحْكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ
ٱلْكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٌ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ
مَا تَشَٰبَهَ مِنْهُ ٱبْتِغَآءَ ٱلْفِتْنَةِ وَٱبْتِغَآءَ تَأْوِيلِهِۦ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُۥٓ
إِلَّا ٱللَّهُ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِى ٱلْعِلْمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلٌّ مِّنْ عِندِ
رَبِّنَا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ (٧) رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ
إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ (٨) رَبَّنَآ
إِنَّكَ جَامِعُ ٱلنَّاسِ لِيَوْمٍ لَّا رَيْبَ فِيهِ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ (٩)

# تەفسیری سوورەتی (آل عمران)
## مەدەنییە (٢٠٠) ئایەتە
## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

سەرەتای (ئەم سوورەتە) تاکو ئایەتەکانی هەشتاو ئەوەندە، دەربارەی گفتوگۆ کردنو پوچەڵ کردنەوەی ڕێبازی گاورەکان دابەزیوە، وە بانگیان دەکات بۆ دینی ڕاست کە دینی ئیسلامە، وەک چۆن پێشتر هێنامان، (ئایەتەکانی) سەرەتای سوورەتی بەقەرە دابەزیوە بۆ گفتوگۆو موناقەشە کردنی جولەکەکان:

(١-٦): ﴿ الٓمٓ (١) ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَيُّ ٱلْقَيُّومُ (٢) نَزَّلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَأَنزَلَ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ (٣) مِن قَبْلُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَأَنزَلَ ٱلْفُرْقَانَ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ ذُو ٱنتِقَامٍ (٤) إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَخْفَىٰ عَلَيْهِ شَىْءٌ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِى ٱلسَّمَآءِ (٥) هُوَ ٱلَّذِى يُصَوِّرُكُمْ فِى ٱلْأَرْحَامِ كَيْفَ يَشَآءُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ (٦) ﴾

خوای بەرز بە باسی پەرستراوێتی خۆی دەست پێدەکات، بە ڕاستی ئەو تەنها خۆی پەرستراوی هەقەو هیچ پەرستراوێکی دیکە نیە جگە لەو، کە ناگونجێ غەیری خوا بکرێت بە پەرستراوو عیبادەتی بۆ بکرێ، وە هەموو پەرستراوێکی جگە لەو پووچو باتڵن، خوا خۆی پەرستراوی بە هەقە، کە وەسف کراوە بە سیفەتەکانی پەرستراوێتی، دیارە هەموو سیفەتەکانیش سەرچاوەکەیان دەگەڕێنەوە بۆ دوو سیفەت، ئەوانیش: ژیان (الحیاة)، ڕاگرە (القیوم)، جا (الحي): ئەو پەرستراوەیە کە خاوەنی ژیانی مەزنو تەواوە، کە پەیوەست کراوە بە هەموو ئەو سیفەتانەی ژیان پێی تەواوو کامڵ نابێ تەنها بەوە نەبێ، وەک: بیستنو بینینو تواناو هێزو دەسەلاتو شکۆو مەزنیو هەمیشە مانەوە، بەردەوام بوون ﴿ ٱلْقَيُّومُ ﴾ ڕاگری نەفسی خۆیەتی بێ نیازە لە هەموو بەدیهێنراوەکانی،

وە ڕاگـری جگـە لـە خۆشـیەتی، بۆیـە هەمـوو بەدیهێنـراوەکان پێویسـتیان پێیەتـی، لـە دروسـتکردنو ئامادەکـردنو یارمەتیدانـدا، هـەر خـۆی مشـووری دروسـت کراوانـی خۆی دەخـواتو بەڕێوەیـان دەبـات، هـەر ئـەو لاشـەو دڵو ڕووحی دروسـت کـراوەکان بەڕێوە دەبات.

وە لـە ڕاگـری خوای بـەرز بۆ بەندەکانـی، وە میهرەبانـی پێیان ئەوەیـە کە کتێبـی دابەزاندوە بـۆ سـەر پێغەمبەرەکـەی موحەممەد ﷺ کـە گەورەتریـنو مەزنتریـن کتێبە هەمـوو هەقو ڕاسـتیەکان لـە هـەواڵو فەرمانـەکانو قەدەغەکـراوەکان دەگرێتـە خـۆی، ئـەوەی هەواڵـی پێداوە ڕاستە، ئـــەوەیشی بڕیـــاری لـەســـەر داوە دادپەروەریە، وە بە هەقو ڕاستی دایبەزاندوە بـۆ ئەوەی خەڵکی هەڵسـن بـە عیبادەتـی پەروەردگاریـانو فێری کتێبەکـەی بن، ﴿ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ ﴾ (واتـە: کتێبەکانـی پێـش خـۆی بە ڕاسـت دادەنـێ)، لـە کتێبەکانی پێشـین، کتێبەکانـی پێـش خـۆی بە ڕاسـت دەزانێ (پێش دەسـتکاری کرانیـان)، ئەوەی ئەو شـایەتی بـۆ بـدات ئەوە وەرگیراوە، ئەوەیشـی ئەو ڕەتـی کردبێتەوە ئـەوە ڕەتکراوەیـە، قورئان هەموو ئـەو شـتانەی لـە خۆ گرتـووە کـە سـەرجەم پێغەمبەران لەسـەری کۆکـن، ئەویش شـایەتی دانـە بۆی بە ڕاسـتی، خـاوەن کتێبـەکان ناتوانـن کتێبەکەیان بەڕاسـت دابنێن ئەگـەر بڕوا بە قورئـان نەکـەن، بە ڕاسـتی کوفـر کردنیان بە قورئـان، بڕوابوون بـە کتێبەکـەی خۆیانیان لێ هەڵدەوەشێنێتەوە.

پاشـان خـوای بـەرز دەفەرمـوێ: ﴿ وَأَنزَلَ ٱلتَّوْرَىٰةَ ﴾ (تەوراتی دابەزاندووە) بۆ سـەر مووسـا، ﴿ وَٱلْإِنجِيلَ ﴾ بۆ سـەر عیسـا ﴿ مِن قَبْلُ ﴾ (لە پێش دابەزاندنـی قورئان)، ﴿ هُدًى لِّلنَّاسِ ﴾ بـۆ ڕێنمایـی خەڵکـی، ڕواڵەتـی ئایەتەکـە دەگەڕێتـەوە بـۆ هـەر یەکێـک لەوانەی پێشـوو، واتـە: خـوا ﷻ قورئـانو تـەوراتو ئینجیلی دابەزانـدووە بۆ هیدایەتـی خەڵکی لـە گومڕایی، جـا هـەر کەسـێک ڕێنمایـیو هیدایەتی خـوا ﷻ وەربگـرێ ئـەوە هیدایـەت دراوە، وە هەر کەسـێکیش ئـەو ڕێنماییـە وەرنەگـرێ ئـەوە لەسـەر گومڕایـی خـۆی دەمێنێتـەوە، ﴿ وَأَنزَلَ ٱلْفُرْقَانَ ﴾ واتـە: ئـەو بەڵگـە ڕوونو سـەلماندنە یەکلاکەرەوانـەی کـە ئامـاژەن بـۆ هەمـوو مەبەسـتو داخوازیـەک، بـە هەمـان شـێوە درێژەی پێـداوەو ڕاڤـەی کردوە ئـەوەی خەڵکی پێویسـتی پـێ هەیـە، هەتا حوکـمو بڕیارەکانی بـە ڕوونو ئاشـکرایی هێناوە، تـا هیچ کەس پاسـاوو بیانـووی نەمێنێ لـە بڕواهێنان بە ئایەتو نیشـانەکانی، لەبەر ئەمـە فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ ﴾ واتـە: پـاش ئەوەی ڕوونـی کردۆتەوەو هۆیەکانـی لابردوە، ﴿ لَهُمْ

عَذَابٌ شَدِيدٌ ﴾ (هیچ کـەس ناتوانێ ئەنـدازەی بکات، وە دەرک بە وەسـفی ناکرێ) ﴿ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ ﴾ بـە هێـزە، هیـچ شـتێکی لێگیـر نابـێو بێ توانـا نیـە بەسـەریدا، ﴿ ذُو ٱنتِقَامٍ ﴾ بۆ کەسێک کە سـەرپێچی بـکات، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَخْفَىٰ عَلَيْهِ شَيْءٌ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ ﴾ ئەمە ئـەوە دەسـەلمێنێ کـە زانسـتی خـوا دەوری هەمـوو زانیاریەکانـی داوە بە گشـتی، ئاشـکراو شـاراوە، دیـارو پەنهـان، وە لـە نێو ئەوانەشـدا کۆرپەلـە لە سـکی دایکیدا کە چـاوی مرۆڤ نابینـێو درکـی پێناکات، زانیاریشـیان پێی ناگات، ئـەوە خوای تاکو تەنهـا ڕێکی دەخات بـە چاکتریـن ڕێکخسـتن، وە ئەنـدازەی دەکات بـە جوانتریـن ئەنـدازە کـردن، لەبـەر ئەمە فەرموویەتـی: ﴿ هُوَ ٱلَّذِي يُصَوِّرُكُمْ فِي ٱلْأَرْحَامِ كَيْفَ يَشَآءُ ﴾ (واتـە: ئـەو خوایـە زاتێکـە شـێوەتان دەکێشـێ لـە مندالدانەکانـدا چۆنی بوێ) لـە دروسـتکردنی تەواوو ناتـەواو جوانو ناشـیرینو نێرو مـێ، ﴿ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾ ئەم دەقانە جێگیـر کردنو دیاریکردنی پەرسـتراوێتی خـوا لـە خۆدەگـرن، وە بەتـالو پـووچ کردنـەوەی پووچی جگە لـەو دەگرنە خـۆ، وە لـە نێـو ئەوەشـدا ڕەتکردنـەوەی گـاورەکان ئەوانـەی پێیـان وایـە عیسـای کوڕی مەریەم پەرسـتراوە.

وە جێگیرکردنـی ژیانێکـی کامـلو ڕاگرێکی تـەواو دەگرێتە خۆی، ئەم دوو وەسـفە هەموو سـیفەتە پیرۆزەکانـی خـوا ﷻ لـە نێویاندا جێـی دەبێتـەوە، هەروەها شـەریعەتە گـەورەکان، بێگومـان ڕەحمـەتو هیدایەتـە بـۆ خەڵکـی، خەڵکـی دابـەش دەکات بـۆ دوو کۆمـەڵ: هیدایەتـدراوو گومـڕا بـوو، وە سـزای ئـەو کەسـانەی کـە هیدایەتـی پـێ وەرناگـرن، وە چەسـپاندنی بەرفراوانـی زانسـتی خـواو جێبەجێکردنـی مەشـیئەتو ویسـتو حیکمەتـی.

(٧-٩): ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ مِنْهُ ءَايَٰتٌ مُّحْكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٌ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنْهُ ٱبْتِغَآءَ ٱلْفِتْنَةِ وَٱبْتِغَآءَ تَأْوِيلِهِۦ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلْعِلْمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٧﴾ رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ ﴿٨﴾ رَبَّنَآ إِنَّكَ جَامِعُ ٱلنَّاسِ لِيَوْمٍ لَّا رَيْبَ فِيهِ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ ﴿٩﴾ ﴾:

دەفەرمـوێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ ﴾ قورئانی پیرۆز هەموو دەقەکانی ڕوونو ڕۆشـنن (محکـم)، وەک خوای بەرز فەرموویەتـی: ﴿ كِتَٰبٌ أُحْكِمَتْ ءَايَٰتُهُۥ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ ﴿١﴾ ﴾ هـود. (واتـە: ئەمـە کتێبێکە ئایەتەکانـی تۆکمەو قایم کـراون، دوایـی ڕوونکراونەوە لەلایـەن خـوای کارزانـی شـارەزاوە)، ئـەم قورئانـە ئەوپـەڕی وردەکاریـیو پتەویـیو

دادپەروەریـیو چاکـە دەگرێتـەوە، ﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ۝٥٠ ﴾المائـدة. (واتـە: جـا ئایـا حوکمـی کـێ لـە هـی خـوا چاکتـرە، بـۆ کۆمەڵێـک بڕوایەکـی پتـەوو بەرچاوڕوونانەیـان هەبـێ؟!)، وە هەمووی لەیەک چووە موتەشـابیهە، لە جوانـیو ڕەوانبێژیو بـە ڕاسـت دانانـی هەندێکی بـۆ هەندێکی دیکـە، وە بێـژەو ماناکانـی وەکو یەکتـرن، بەڵام ڕۆشـنو ناڕۆشـن (الأحکام والتشابه) کە لەم دەقەکەدا باسـکراوە، بێگومـان قورئان هەروەکو خوا باسـی کـردوە ﴿ مِنْهُ ءَايَٰتٌ مُّحْكَمَٰتٌ ﴾واتـە: ماناو مەبەسـتەکانی ڕوونە، هیـچ ناڕوونیو ئاڵۆزیەکـی تێدانیـە، ﴿ هُنَّ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ ﴾ واتـە: بنچینـەی قورئانە، هەمـوو دەقێکی لەیەکچوو دەگەڕێتـەوە بـۆ لای، ئەو ئایەتانـە زۆرینـەی قورئانن، ﴿ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٌ ﴾ واتـە: ماناکانی شـپرزەن لـەلای زۆرێ لە عەقڵو بیـرەکان، چونکە دیلالەتـی کورتە (مجمـل)ن، یان هەندێ بـە هەڵـە لێـی تێدەگـەنو مەبەسـتەکەی ناپێکن، جا بـە پووختی ئەوەیـە لە قورئانـی پیرۆزدا ئایەتـی ڕوونو ئاشـکرا هەیـە بۆ هەموو کەسـێک، ئەو دەقانـە زۆرینەی قورئانـن، وە کۆمەڵە ئایەتێکـی تێدایـە ماناکانـی ئاڵـۆزە بەلای خەڵکـەوە، لێـرەدا پێویسـتە دەقـە لەیەکچووەکان بیرێنـەوە بـۆ لای دەقـە ڕۆشـنەکان، وە شـاراوەکان بـۆ لای ئاشـکراکان، ئـا بـەم ڕێگایـە هەندێکـی بەڕاسـتدانەری هەندێکـی دیکەیـە، وە دژ یەکـو پێچەوانـە لە نێوانیانـدا ڕوونادات، بـەڵام لێـرەدا خەڵکـی دەبـن بـە دوو دەسـتەوە: یەکـەم: ﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ ﴾ (ئنجا ئەوانـەی لـە دڵیانـدا چەوتـی هەیـە) واتە: لـە ڕێگـای ڕاسـت لایانـداوەو بـەردەوام نەبوون، چونکـە مەبەسـتەکانیان خـراپو تێکچوە، گومراوو سەرلێشـێواو بـوون، وە دڵیان لـە ڕێگەی هیدایەتـەوە بـۆ گومڕایـی لایـداوە، ﴿ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنْهُ ﴾واتـە: واز لـە دەقـە موحکەمو ڕوونـەکان دەهێنـن، شـوێنی دەقـە ناڕوونـەکان دەکـەون، وە کارەکـە پێچەوانـە دەکەنەوە، دەقـە موحکەمەکانیـش دەگێڕنەوە بۆ لای دەقـە موتەشـابیهەکان! ﴿ ٱبْتِغَآءَ ٱلْفِتْنَةِ ﴾(واتە: بۆ تێکدانـی بیـرو بـاوەڕی مسـوڵمانان)، بێگومـان دەقە لە یەکچـوو موتەشـابیهەکان دەبنە هۆی ئاشـووب بـە هۆی ئەو ناڕۆشـنیەی لە ماناکەیانـدا هەیە، ئەگەرنـا ئایەتە موحکەمـە ڕوونەکان بـە هیـچ شـێوەیەک نابنە مایـەی ئاشـووب، چونکە هەقو ڕاسـتی تێـدا ڕوونە بۆ کەسـێ کە بیـەوێ شـوێنی بکەوێ.

وە وتـەی خـوا ﷻ: ﴿ وَٱبْتِغَآءَ تَأْوِيلِهِۦ ۗ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُ ﴾ ڕاڤەکارانـی قورئـان لـە وەسـتان لەسـەر نـاوی (الله) لـە ڕسـتەی: ﴿ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُ ﴾ دوو قسـەیان هەیە: زۆربـەی زانایـان لەسـەر وشـەی (الله) دەوەسـتن، وە هەندێکیـان ناوەسـتنو عەطفـی دەکەن

بەسەر: ﴿ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ ﴾ هەمووی دەگونجێ، مەبەست لە (التأويل) ئەگەر مەبەست پێی حەقیقەتو ناوەڕۆکی زانست بێ، ئەوە چاکترو تەندروستتر وایە لەسەر وشەی ﴿ إِلَّا ٱللَّهُ ﴾ بوەستێ، چونکە لەیەکچوو تەنها خوا ﷻ زانستی هەیە بە ناوەڕۆکو حەقیقەتەکەی، وەکو حەقیقەتی سیفەتەکانی خواو چۆنیەتی، وە حەقیقەتی ئەو وەسفانەی کە باسی لێوە دەکرێ لە ڕۆژی دواییدا وە نموونەی ئەوانەش، ئەمانە هیچ کەس نایزانێ جگە لە خوا نەبێ، چونکە ڕووبەڕوو بوونەوەی شتێکە مانای دەستەبەر نابێ، وەکو چۆن پرسیار کرا لە پێشەوا مالک دەربارەی وتەی خوا ﷻ ﴿ ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ ﴿٥﴾ ﴾ طه، دەربارەی چۆنیەتی (إستوى) پرسیاری لێکرا، پێشەوا مالیک وتی: (إستوى) شتێکی زانراوە، چۆنیەتیەکەی نادیارە، بڕوا پێ بوونی واجبە، پرسیار کردن دەربارەی شتێکی داهێنراوو بیدعەیە.

بە هەمان شێوە هەموو سیفەتەکانی دیکەی خوا ئەگەر پرسیار دەربارەی چۆنیەتیەکەیان کرا دەبێ بەم شێوەیە وەڵام بدرێتەوە، هەر ئەوە بوترێ کە ئیمام پێشەوا وتی، ئەو سیفەتە زانراوە، وە چۆنێتێکەی نادیارە، بڕوابوون پێی واجبو پێویستە، وە پرسیارکردن دەربارەی بیدعەیە.

خوا ﷻ هەواڵی پێداوین دەربارەی، بەڵام هەواڵی پێنەداوین دەربارەی چۆنیەتەکەی. پێویستە لەسەرمان لەو شوێنە بوەستین کە بۆمان دیاری کراوە، جا مرۆڤی چەوتو لادەر شوێنی ئەو دەقە لەیەکچووانە دەکەوێ، خۆی تووشی شتانێک دەکات کە پەیوەندی بەوەوە نیە، وە ئەرکێک دەخەنە سەرشانیان کە پێویست ناکات زانیاریان دەربارەی هەبێ، چونکە ئەو دەقانە کەس مانایان نازانێ تەنها خوا ﷻ نەبێ، دووەم: بەڵام ئەوانەی دامەزراون لە زانستی شەرعیدا، بڕوایان پێی هەیەو ماناکانی دەگەڕێننەوە بۆ لای خواو ملکەچی دەبن. وە ئەگەر مەبەست لە (التأويل) تەفسیر کردنو ڕوون کردنەوەو ئاشکرا کردن بێ، ئەو کات ڕاسترو چاکتر وایە ﴿ وَٱلرَّٰسِخُونَ ﴾ (عطف) بکرێتە سەر (الله)، ئەو کاتە مانای ئایەتەکە ئاوای لێدێ، واتە: خوا هەواڵیداوە تەفسیری دەقە لە یەکچووەکانو گێڕانەوەیان بۆ لای دەقە ڕوونو ڕۆشنەکانو لابردنی هەر گومانێک لەسەری، کەس نایزانێ تەنها خوا نەبێ، وە ئەو زانایانەش کە دامەزراوو ڕۆچوون لە زانیاریدا، بڕوایان بە هەمووی هەیە، دەیگێڕنەوە بۆ دەقە ڕۆشنەکان، وە دەڵێن: ﴿ كُلٌّ ﴾ لە دەقە ڕۆشنو لەیەکچووەکان ﴿ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَا ﴾ ئەوەی لەلای خواوە بێت دژیەکو پێچەوانە نیە، بەڵکو پڕاو پڕە،

هەندێکـی پشـت ڕاسـتی هەندێکـی دیکـەی دەکاتـەوە، وە هەندێکی شـایەتی بـۆ هەندێکی دیکـەی دەدات، وە هەروەهـا ئاگادارکردنـەوەی تێدایـە لەسـەر بنچینەیەکی گـەورە، ئەویش ئەوەیـە کـە دوای زانیویانە کە هەموو لەلایەن خواوە هاتووە، تووشـی ئیشـکالو ئاڵۆزی بوون لە شـتێکی کورتی لەیەکچوو موتەشـابیە، بـە دڵنیاییەوە دەزانـن ئەو ئاڵۆزیـە دەگێردرێتەوە بۆ دەقـە ڕۆشـنەکان، ئەگـەر چـی ڕووی ئەوەشـیان نەزانی، کاتێ خـوا ﷻ هانـی دان بۆ ملکەچ بـوونو بڕوابـوون بـە بڕیـارو حوکمەکانی، سـەرکۆنەو سەرزەنشـتی کردن لە شـوێنکەوتنی دەقـە لەیەکچووەکان، فەرمـووی: ﴿ وَمَا يَذَّكَّرُ ﴾ واتـە: ئامۆژگاری وەرناگرن بـە ئامۆژگاری خـواو فێـر نابـن جگـە لـە ﴿ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴾ واتـە: خـاوەن عەقـڵو هۆشـەکان، کاکڵەو پاڵفتـەی نەوەکانی ئـادەم، ئامۆژگاریو بەبیـر هێنانەوە دەگاتـە عەقڵەکانیان، ئەوەی سـوودی هەیـە بۆیـان کاری پێدەکـەن، ئەوەیشـی زیانی هەیە بۆیـان لێی دووردەکەونـەوە، بەڵام جگە لـە ئـەوان بیرکردنەوەیـان وەک توێـکڵ وایە هیـچ بەرهەمێکی لێ بەدەسـت نایـەت، ئەوانە سەرزەنشـکردنو یادکردنـەوە سـوودیان پێناگەیەنێت، چونکە عەقڵیان بۆ شـتی چـاک بەتاڵە.

پاشـان خـوا هەواڵـی داوە دەربـارەی ئەوانەی دامـەزراوو ڕۆچوون لـە ناو زانسـتو زانیاریدا، ئـەوان دەپاڕێنـەوەو دەڵێـن: ﴿ رَبَّنَا لَا تُزِغۡ قُلُوبَنَا بَعۡدَ إِذۡ هَدَيۡتَنَا ﴾ (ئـەی پەروەردگارمـان) دڵەکانمـان لامـەدە لەڕێـی ڕاسـت بـە هـۆی نەزانیـنو نکوولـی کردنـی خۆمانـەوە، بەڵکو ڕێگـای ڕاسـتمان پێنیشـان بـدە، بۆ ئـەوەی ڕێنماییـکارو هیدایەتـدەر بین بۆ ڕێگای ڕاسـتی، جێگیرمـان بکـە لەسـەر ڕێنمایـی خـۆتو بمانپارێـزە لـەو تاقیکردنەوەیـەی کـە لادەرانت پێـی تاقـی کردۆتـەوە ﴿ وَهَبۡ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحۡمَةً ﴾ واتـە: (وە لەلایەن خۆتـەوە) بەزەییەکی مەزنمـان پێببەخشـەو سـەرکەوتوومان بـکات بـۆ خێـرو چاکـەکانو بمانپارێزێ لـە هەموو خراپـەکان ﴿ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡوَهَّابُ ﴾ واتـە: بەخشـینت بەرفراوانـەو خاوەن چاکـەی زۆریت کە چاکـەو بەخشـندەییت هەمـوو گیاندارێکـی گرتوەتەوە.

﴿ رَبَّنَآ إِنَّكَ جَامِعُ ٱلنَّاسِ لِيَوۡمٖ لَّا رَيۡبَ فِيهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخۡلِفُ ٱلۡمِيعَادَ ﴾ پاداشتیان دەداتەوە بـە کردەوەکانیـان چـاک بـە چاکە، خراپـیش بە خراپـە، خوای مەزن وەسـفی دامـەزراوانو ڕۆچووانـی کـردوە لە زانسـتدا بە حەوت سـیفات، ئەوانەش ناونیشـانی خۆشـبەختی بەندەیە:

یەکـەم: زانسـت، بە ڕاسـتی ئەوە ڕێگای گەیشـتنە بۆ لای خـوا، بە هۆی زانسـتو زانیارییەوە بڕیارو شـەریعەتەکانی خوا ﷻ ڕوون دەبێتەوە.

دووەم: دامەزراوەیـیو ڕۆچـوون لـە زانسـتدا، ئەمـەش ئەندازەیەکـی زیاترە بەسـەر زانسـتی

ڕووتــەوە، بەڕاســتی ڕۆچــوو لــە زانســتو زانیاریــی دا وا دەخــوازی زانــا بێت بــە حەقیقەتی زانســت، وردبیــنو شــارەزا بێ، خوا ﷻ ئاشــکراو نهێنی زانســتی فێــر کردبێــت، ڕۆچوویێت لەنــاو نهێنــی شــەریعەت بە زانیاریــیو حاڵو کــردەوە.

سـێیەم: خــوا وەســفی کــردوون بــە ئیمــان لــە هەمــوو کتێبەکەیــدا، وە وەســفی کــردوون بــە گەڕانــەوەی دەقــە لەیــەک چــووەکان بــۆ لای دەقــە ڕوونــەکان، بــە وتــەی خــۆی: ﴿ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَا ﴾. (واتــە: دەڵێــن: بڕوامــان پێــی هێناوە هەمــووی لە لایەن پەروەردگارمانەوەیە).

چــوارەم: ئــەوان داوای لێبوردنو ســەلامەتی دەکەن لەو بــەڵاو تاقیکردنەوەیــەی کە لادەرانو نالەباران تووشــی بوون.

پێنجــەم: دان پێدانانیــان بــە فــەزڵو منەتــی خــوا ﷻ بەســەریانەوە بــە هیدایەتــدان، وەک فەرموویەتــی: ﴿ رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا ﴾، (واتــە: ئەی پەروەردگارمــان! دڵمان لامەدە لــە ڕێگــای ڕاســت، پاش ئــەوەی کــە هیدایەتــت داوین).

شەشــەم: ئــەوان لەگــەڵ ئەمەشــدا داوای میهرەبانــی خــوا ﷻ دەکــەن، کــە هەمــوو خێرێک لــە خــۆ دەگــرێو هەمــوو شــەڕێک دوور دەخاتــەوە، وە داوایــان لێکــردوە بە نــاوی مەزنی (الوهاب) بەخشــەرو بەخشــندە.

حەوتــەم: خــوا ﷻ هەواڵیــداوە دەربارەی بــە ئیمان بــوونو دڵنیاییان بە ڕۆژی دواییو ترســان لێــی، ئەم بــڕواو دڵنیاییــە دەبێتە مایەی کردەوەیــەک دوور بێت لە هەڵخلیســکان.

إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَن تُغۡنِيَ عَنۡهُمۡ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُهُم
مِّنَ ٱللَّهِ شَيۡـٔٗاۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ وَقُودُ ٱلنَّارِ ﴿١٠﴾ كَدَأۡبِ ءَالِ
فِرۡعَوۡنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ
بِذُنُوبِهِمۡۗ وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿١١﴾ قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ
سَتُغۡلَبُونَ وَتُحۡشَرُونَ إِلَىٰ جَهَنَّمَۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ ﴿١٢﴾
قَدۡ كَانَ لَكُمۡ ءَايَةٞ فِي فِئَتَيۡنِ ٱلۡتَقَتَاۖ فِئَةٞ تُقَٰتِلُ فِي
سَبِيلِ ٱللَّهِ وَأُخۡرَىٰ كَافِرَةٞ يَرَوۡنَهُم مِّثۡلَيۡهِمۡ رَأۡيَ
ٱلۡعَيۡنِۚ وَٱللَّهُ يُؤَيِّدُ بِنَصۡرِهِۦ مَن يَشَآءُۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ
لَعِبۡرَةٗ لِّأُوْلِي ٱلۡأَبۡصَٰرِ ﴿١٣﴾ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ
مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلۡبَنِينَ وَٱلۡقَنَٰطِيرِ ٱلۡمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ
وَٱلۡفِضَّةِ وَٱلۡخَيۡلِ ٱلۡمُسَوَّمَةِ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ وَٱلۡحَرۡثِۗ ذَٰلِكَ
مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلۡمَـَٔابِ ﴿١٤﴾ ۞ قُلۡ
أَؤُنَبِّئُكُم بِخَيۡرٖ مِّن ذَٰلِكُمۡۖ لِلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ عِندَ رَبِّهِمۡ
جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَأَزۡوَٰجٞ
مُّطَهَّرَةٞ وَرِضۡوَٰنٞ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴿١٥﴾

**پاشان خوای بەرز فەرموویەتی:**

**(١٠- ١٣):** ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَن تُغۡنِيَ عَنۡهُمۡ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيۡـٔٗاۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ وَقُودُ ٱلنَّارِ ﴿١٠﴾ كَدَأۡبِ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمۡۗ وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿١١﴾ قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ سَتُغۡلَبُونَ وَتُحۡشَرُونَ إِلَىٰ جَهَنَّمَۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ ﴿١٢﴾ قَدۡ كَانَ لَكُمۡ ءَايَةٞ فِي فِئَتَيۡنِ ٱلۡتَقَتَاۖ فِئَةٞ تُقَٰتِلُ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَأُخۡرَىٰ كَافِرَةٞ يَرَوۡنَهُم مِّثۡلَيۡهِمۡ رَأۡيَ ٱلۡعَيۡنِۚ وَٱللَّهُ يُؤَيِّدُ بِنَصۡرِهِۦ مَن يَشَآءُۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبۡرَةٗ لِّأُوْلِي ٱلۡأَبۡصَٰرِ ﴿١٣﴾﴾

**خوا ﷻ هەواڵ دەدات، بێبڕوایان بە خواو بە پێغەمبەرانی ئەوانەی دژایەتیو نکوولیان لە دینو کتێبی خوا دەکرد، لە ڕاستیدا شایستەی تۆڵەو توووند ترین سزان، بە هۆی کوفرو تاوانەکانیانەوە،ماڵو سامانو منداڵەکانیان هەرگیز کەڵکو سوودیان پێ ناگەیەنن، ئەگەر چی لە دونیایاندا بە هۆی ئەوانەوە زیانو نارەحەتی زۆریان بەسەردا هاتووە، وە دەڵێن: ﴿نَحۡنُ أَكۡثَرُ أَمۡوَٰلٗا وَأَوۡلَٰدٗا وَمَا نَحۡنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿٣٥﴾﴾سبأ. (واتە: ئێمە ماڵو سامانمان زیاترە لە ئێوە، وە ئێمە هەرگیز سزا نادرێین)، لە ڕۆژی قیامەتدا شتانێکیان بۆ دەردەکەوێ لە خواوە، کە هەرگیز بیریان لێ نەکردووەتەوە ﴿وَبَدَا لَهُمۡ سَيِّـَٔاتُ مَا كَسَبُواْ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿٤٨﴾﴾الزمر، (واتە: وە بۆیان دەرکەوت چی خراپەیان کردوە، ئەو سزای گاڵتەیان پێ دەکرد دەوری گرتن)، ماڵو منداڵ هیچ قیمەتێکی نیە لە لای خوا، بەڵکو بەندە تەنها ئیمان بوونی بەخواو کردەوە چاکەکانی سوودی پێدەگەیەنن، هەر وەکو خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُكُم بِٱلَّتِي تُقَرِّبُكُمۡ عِندَنَا زُلۡفَىٰٓ إِلَّا مَنۡ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ جَزَآءُ ٱلضِّعۡفِ بِمَا عَمِلُواْ وَهُمۡ فِي ٱلۡغُرُفَٰتِ ءَامِنُونَ ﴿٣٧﴾﴾سبأ، (واتە: وە سامانو منداڵتان شتێک نین لای ئێمە پلەو پایەتان نزیک بکەنەوە، مەگەر ئەوەی بڕوای هێنابێو کردەوەی چاکی ئەنجامدابێ، بۆ ئەوانە پاداشتی دوو**

بەرانبەر هەیە، بە هۆی ئەو چاکانەی کردوویانە، وە ئەوان لە کۆشکە بەرزەکانی بەهەشت لە هێمنیو ئاسایش دان).
لێرەدا خوا ﷻ هەواڵی داوە کە بە دڵنیایی بێبڕوایان سووتەمەنی دۆزخن، بە هەمیشەییو بەردەوامی پەیوەستن پێیانەوە، ئەم حاڵەتە خوای مەزن باسی کردوە کە ماڵو منداڵ بە هیچ شێوەیەک سوودیان نابێ بۆ بێبڕوایان بێ نیازیان ناکات، ئەمە سوننەتو نەریتی خوایە لە گەلەکانی پێشوودا، وەکو ئەوەی بەسەر فیرعەونو پێش فیرعەون دوای ئەودا لە فیرعەونە سەرکێشو لە سنوور دەرچووەکان، ئەوانە خاوەنی ماڵو دەسەڵاتو سەربازی زۆر بوون، کاتێ نیشانەکانی خوایان بە درۆ داناو نکوڵیو لاساریان لە پەیامی پێغەمبەران کرد، خوا ﷻ سزای دان بە هۆی گوناهەکانیانەوە، بە دادپەروەری خۆی نەک بە ستەم، خوا تۆڵەی سەختە بۆ هەر کەسێ هۆکارەکانی سزا بەسەر خۆیدا پێویست بکات، ئەویش کوفرو تاوانە بە جیاوازی جۆرو پلەکانیانەوە، پاشان خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ قُل ﴾ ئەی موحەممەد بڵێ: ﴿ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ سَتُغْلَبُونَ وَتُحْشَرُونَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴾ (واتە: بەوانەی کە بێبڕوان لەمەولا ئەشکێنو ژێر دەکەون، وە کۆ دەکرێنەوە بەرەو دۆزەخ کە خراپترین شوێنە)، ئەم دەقە ئاماژەیەکە بۆ بڕواداران بەسەرکەوتنو زاڵ بوون، ئاگادار کردنەوەشە بۆ بێبڕوایان، بەڕاستی هەر وەکو چۆن هەواڵی دا ڕوویدا، خوا ﷻ بڕوادارانی سەرخست بەسەر دوژمنەکانیاندا، لە بێبڕوایانی بتپەرستو جوولەکەو گاورەکان، بە دڵنیاییەوە خوای بەرز بەندەو سەربازە بڕوادارەکانی سەردەخات تا ڕۆژی دوایی، لەم دەقەدا پەندو ئامۆژگاری بە دی دەکرێت، وە نیشانەیەکە لە نیشانەکانی قورئان کە بە چاو دەبینرێ.
خوا ﷻ هەواڵی داوە بێبڕوایان لەگەڵ ئەوەدا لەم دنیایەدا دەشکێنو ژێر دەکەون، لە ڕۆژی دواییشدا کۆدەکرێنەوەو بەرەو هەڵدێر دەبرێن، ئەمە ئەو شوێنەیە کە بۆ خۆیان ئامادە کردوە، ناخۆشترین شوێن شوێنی ئەوانە، وە خراپترین سزاو تۆڵەش، سزاو تۆڵەی ئەوانە.
﴿ قَدْ كَانَ لَكُمْ ءَايَةٌ ﴾ واتە: پەندو ئامۆژگاریەکی مەزن (بۆ ئێوە) ﴿ فِى فِئَتَيْنِ ٱلْتَقَتَا ﴾ (لەو دوو دەستەی دایان بەیەکدا)، ئەمەش لە ڕۆژی بەدر بوو ﴿ فِئَةٌ تُقَـٰتِلُ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾ (دەستەیەک لە پێناوی خوادا دەجەنگان) ئەوانیش پێغەمبەرو هاوەڵانی بوون، ﴿ وَأُخْرَىٰ كَافِرَةٌ ﴾ واتە: کافرانی قوڕەیش ئەوانەی کە لە ماڵەکانیان دەرچوون بە لووت بەرزیو شانازی بە خۆ کردنەوە بۆ ڕووپاماییو بەرچاوی خەڵک، وە خەڵکیان لادەدا لە ڕێگەی خوا، خوا ﷻ هەردوو دەستەو تاقمەکەی کۆ کردەوە لە ڕۆژی بەدر، بتپەرستان چەند

هێندەی بڕواداران بوون، لەبەر ئەمە فەرموویەتی: ﴿ يَرَوْنَهُم مِّثْلَيْهِمْ رَأْيَ ٱلْعَيْنِ ﴾ واتە: بڕواداران بێبڕوایانیان دەبینی لەوان زیاترن، دوو هێندەی خۆیان زیاتریش، خوا ﷻ جەخت لەمە دەکاتەوە بە وتەی خۆی فەرموویەتی: ﴿ رَأْيَ ٱلْعَيْنِ ﴾ (بە بینینی چاو) خوا ﷻ بڕوادارانی سەرخست یارمەتیدان بەسەرکەوتنی خۆی، دوژمنانی تێکشکاندو پیاو ماقوڵو دەسەڵاتدارە گەورەکانیان لەناو برد، بڕێکی زۆریانی لێ دەستگیر کرد، ئەوەش تەنها لەبەر ئەوە بوو خوای گەورە ئاینەکەی سەردەخاتو ئەوەیشی بێبڕوایە زەلیلو سەرشۆڕی دەکات، بەڕاستی ئەم یارمەتیە پەندی تێدایە بۆ ئەوانەی خاوەن ژیرینو عەقڵێکی کاملن.

چونکە ئەوانە دەستەی سەرکەوتوو سەرخراون لە لایەن خواوە (الطائفة المنصورة)، بەردەوام هەقو ڕاستیان لەگەڵدایە، دەستەکەی دیکە بەتاڵو پووچە، ئەگەرنا هەر کەسێک بە ڕووکەش تەماشای هۆکارە دیارەکان بکات، لە ڕووی ژمارەو ئامادەکاریەوە، جەختدەکاتەوە کە سەرکەوتنی ئەم دەستە کەمە بەسەر ئەو دەستە زۆرو زەبەلاحەدا شتێکی ئەستەمو مەحاڵە، بەڵکو لە ئەوپەڕی مەحاڵیدایە، بەڵام لە پشتی ئەم هۆکارەی کە بە چاو دەبینرێ، هۆکاری مەزنتر هەیە، کەس نایبینی جگە لەوانە نەبێ کە خاوەن بەرچاوێکی ڕوونینو ئیمانیان بە خوا هەیەو تەنها پشت بە ئەو دەبەستنو متمانەیان بە خوا هەیە کە تەنها ئەویان بەسە. ئەویش عیززەتو سەرخستنی بەندە بڕوادارەکانیەتی بەسەر دوژمنانی بێبڕوادا.

(١٤-١٥): ﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلْبَنِينَ وَٱلْقَنَٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلْفِضَّةِ وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ وَٱلْأَنْعَٰمِ وَٱلْحَرْثِ ۗ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلْمَـَٔابِ ﴿١٤﴾ قُلْ أَؤُنَبِّئُكُم بِخَيْرٍ مِّن ذَٰلِكُمْ ۚ لِلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَأَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ وَرِضْوَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿١٥﴾ ﴾

خوا دەفەرموێ: ﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلْبَنِينَ وَٱلْقَنَٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلْفِضَّةِ وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ وَٱلْأَنْعَٰمِ وَٱلْحَرْثِ ﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدا کە بە ڕاستی خۆشی ژیانی دونیای بۆ مرۆڤ جوان ڕازاندۆتەوە، ئەم شتانەیشی تایبەت کردووەو باسی لێوە کردوون، چونکە مەزنترینی خۆشیو ئارەزووەکانی دونیان، جگە لەمانەش شوێنی ئەوانە دەکەون لەو خۆشیانەی کە باسکراون، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا ﴿٧﴾ ﴾الكهف، (واتە: بێگومان ئێمە هەرچی لەسەر زەویدا هەیە کردوومانە بە هۆی ڕازاندنەوە) دوای ئەوەی ئەوانەی جوانی کردوە بۆ خەڵکی دەیانهێنێتو باسیان

دەکات، ئنجا باسی ئەو پاڵنەرانە دەکات کە مرۆڤەکان دەورووژێنن بۆ بەدەستهێنانی ئەو شتانە، نەفسی مرۆڤەکانی پێوە گیرۆدە دەبێو دڵیان مەیلی بۆ لای ئەو جوانیانە دەجووڵێنێ، خەڵکی بە گوێرەی واقیع بوون بە دوو بەشەوە:

بەشی یەکەم: چینێک لە خەڵکی جوانی دنیایان کردوەتە مەبەستو ئامانج، تا بیر کردنەوە ئەوەی بە دڵیاندا دێت لە کردەوەی ئاشکراو پەنهان لە پێناو ئەو مەبەستە دایە، بەڕاستی (دنیا) سەرقاڵو (بێئاگا)ی کردوون لەو مەبەستەی کە لە پێناویدا دروستکراون، بوون بە ئاژەڵو ماڵات تەنها خەمیان چێژ وەرگرتنە لە خۆشیەکانی دنیا، ئیتر بیر ناکەنەوە ئەو ماڵو سامانەیان چۆن بە دەستهێناوەو لە چیدا خەرجی دەکەن، ئا ئەوانە ئەو ماڵو سامانە دەبێتە توێشوویەک بۆیان بۆ ماڵی بەدبەختیو ناخۆشیو سزاو ئازار.

بەشی دووەم: (کەسانێکن) لە مەبەستو خۆشیەکانی دونیا جوان تێدەگەن، وە دەزانن خوا ﷻ کردوویەتی بە بەڵاو تاقیکردنەوە بۆ بەندەکانی، بۆ ئەوەی بزانی کێ گوێڕایەڵیو ڕەزامەندی خوا پێش دەخات بەسەر حەزوو ئارەزوەکانی دنیادا، دنیایان کردوە بە وەسیلەو ڕێگایەک بۆ ئەوەی بیانگەیەنێت بە دوارۆژ، وە لەزەتی لێوەردەگرن بە شێوەیەک خوا پێی ڕازی بێ، بە جەستەیان هاوەڵی دەکەنو بە دڵەکانیان لێی دووردەکەونەوە، وە دەزانن ئەو لەززەتو خۆشیە وەکو ئەوەیە خوا ﷻ دەربارەی فەرموویەتی: ﴿ذَٰلِكَ مَتَـٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا﴾ (واتە: ئەوانە خۆشی ئەم ژیانی دنیایەن)، جا ئەوانە ئەو نازوو نیعمەتانە دەکەن بە پردێک بۆ ژیانی دوارۆژ، وە بازرگانیەک ئومێدی سوودو قازانجی گەورەی لێ دەکەن بۆ ژیانی دوارۆژ، ئا ئەوانە ئەو لەززەتو خۆشیانە دەبن توێشوویەک بۆیان بۆ لای پەروەردگاریان.

لەم دەقەدا دڵدانەوەی هەژارانی تێدایە ئەوانەی کە توانایان نیە بگەن بەو خۆشیو لەززەتانەی بەو شێوەی دەوڵەمەندەکان توانایان هەیە، ئاگادار کردنەوەشی تێدایە بۆ ئەو کەسانەی پێی لە خۆبایی دەبن، ئامۆژگاریشە بۆ ئەو خاوەن عەقڵو ژیرانە کە دونیا بە کەم تەماشا بکەن.

تەواوی ئەوانە، خوا ﷻ هەواڵیداوە لە پاش ئەوانە دەربارەی ماڵی مانەوە کە بەهەشتە داهاتووی لە خوا ترسانو پارێزکارانە، وە هەواڵیداوە ئەو ماڵە چاکترە لە سەرجەم ئەوانەی باسکرا، ئەویش ئەو بەهەشتە بەرزو کۆشکو تەلارە ڕازاوانەی کە دیمەنێکی یەکجار عەجیبو سەرنجڕاکیشیان هەیە، وە دارو درەختی جۆراو جۆر بەروو بوومی جیاوازە، وە چەندین چەمو ڕووبار بە ژێر درەختەکانیدا دەڕوات بە پێی ویستو ئارەزووی خۆیان، خێزانەکانیان پاکو بێگەردن لە هەموو پیسی ناتەواویو شتی قێز لێکراوی دیارو نادیار، لەگەڵ مانەوەی هەتا هەتایی کە بەوە

نیعمەتەکان تەواو دەبێ، لەگەڵ ڕەزامەندی خوا ﷻ کە گەورەترینی نیعمەتەکانە، دەی قیاسی ئەم ماڵە مەزن گەورەیە بکە بەو ماڵە بێنرخە، پاشان خۆت چاکترینیان بۆ خۆت هەڵبژێرە، وە ئەمە بخە ڕوو بۆ دڵت، بزانە کامیان چاکترە لەوی دیکەیان؟

﴿وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ﴾ زانایە بەوەی لە دڵیاندایە، لە سیفەتە چاکەکانو سیفەتە خراپەکان، وە ئەوەیشی شایستەیە بە بارودۆخیان، بیەوێ هەر کەسێ سەرکەوتوو بکات سەرکەوتووی دەکات، وە هەر کەسێ سەرشۆڕ بکات سەرشۆڕی دەکات. ئەو بەهەشتەی خوا ﷻ وەسفی کردوە بە جوانترین وەسف کردن، هەروەها وەسفی ئەوانەیشی کردوە کە شایستەی ئەو بەهەشتەن، ئەوانیش ئەوانەن کە لێی دەترسنو خۆیان دەپارێزن، بە بەجێهێنانی ئەوەی خوا ﷻ فەرمانی پێکردوەو واز هێنان لەوەی خوا قەدەغەی کردوە، لە پاڕانەوەکانیاندا دەڵێن:

ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ إِنَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا
وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ١٦ ٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلۡقَٰنِتِينَ
وَٱلۡمُنفِقِينَ وَٱلۡمُسۡتَغۡفِرِينَ بِٱلۡأَسۡحَارِ ١٧ شَهِدَ ٱللَّهُ
أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَأُوْلُواْ ٱلۡعِلۡمِ قَآئِمَۢا
بِٱلۡقِسۡطِۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ١٨ إِنَّ ٱلدِّينَ
عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُۗ وَمَا ٱخۡتَلَفَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ
إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلۡعِلۡمُ بَغۡيَۢا بَيۡنَهُمۡۗ وَمَن يَكۡفُرۡ
بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ١٩ فَإِنۡ حَآجُّوكَ
فَقُلۡ أَسۡلَمۡتُ وَجۡهِيَ لِلَّهِ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِۗ وَقُل لِّلَّذِينَ أُوتُواْ
ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡأُمِّيِّـۧنَ ءَأَسۡلَمۡتُمۡۚ فَإِنۡ أَسۡلَمُواْ فَقَدِ ٱهۡتَدَواْۖ
وَّإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّمَا عَلَيۡكَ ٱلۡبَلَٰغُۗ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ ٢٠
إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَيَقۡتُلُونَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ
بِغَيۡرِ حَقّٖ وَيَقۡتُلُونَ ٱلَّذِينَ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡقِسۡطِ مِنَ
ٱلنَّاسِ فَبَشِّرۡهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ٢١ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ حَبِطَتۡ
أَعۡمَٰلُهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ٢٢

(١٦-١٧): ﴿ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ إِنَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ١٦ ٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلۡقَٰنِتِينَ وَٱلۡمُنفِقِينَ وَٱلۡمُسۡتَغۡفِرِينَ بِٱلۡأَسۡحَارِ ١٧﴾:

سەركەوتنیان بۆ ئیمان هێنان كردوەتە هۆكارو وەسیلەیەک بۆ منەتی خوا ﷻ بەسەریانەوە، تا لە گوناهەكانیان خۆش بێ، وە بیانپارێزی لە شەڕو خراپەو شوێنەوارەكانی، ئەویش سزای ئاگرە، پاشان بە دوورو درێژی باسی وەسفەكانی پارێزكاریی‌و تەقوای كردوە، فەرموویەتی: ﴿ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ (خۆڕاگران) ئەوانەی ئارام دەگرن لەسەر ئەوەی خوا پێی خۆشە لە گوێڕایەڵی كردن، وە ئارام دەگرن لە نارەحەتی واز هێنان لە تاوان، وە لەسەر قەزاو قەدەرە بە ئێشەكان ﴿وَٱلصَّٰدِقِينَ﴾ (ئەوانە ڕاستگۆن)، لە ئیمانیان‌و گوفتارەكانیان‌و بارودۆخیاندا ﴿وَٱلۡمُنفِقِينَ﴾ (بەخشەران)، ئەوانەی خوا ﷻ ڕزق‌و ڕۆزی پێداون بە جۆرەها نەفەقەو ماڵ‌و دارایی دەبەخشن بە خزم‌و نزیكان‌و غەیری وانیش، ﴿وَٱلۡمُسۡتَغۡفِرِينَ بِٱلۡأَسۡحَارِ﴾ (ئەوانەی داوای لێخۆش بوون دەكەن لە پێش بەیانیاندا) كە باسی سیفەتە ستایش كراوەكانیانی كرد، باسی خۆ بە كەم دانانی نەفس‌و دەروونیانی كرد، ئەوان خۆیان بە خاوەن پلەو پایە نازانن، بەڵكو بە شێوەیەک تەماشای خۆیان دەكەن كە تاوانبارو كەمتەرخەمن، بۆیە داوای لێخۆشبوون لە پەروەردگاریان دەكەن، چاودێری ئەو كاتانە دەكەن كە دوعای تێدا قبووڵە، ئەویش كاتی پارشێوە، حەسەنی بەصری وتوویەتی: نوێژەكانتان درێژ بكەنەوە بۆ كاتی پارشێو پاشان دابنیشن‌و لە پەروەردگارتان بپاڕێنەوە.

ئەم دەقانە چەند شتێكیان لە خۆ گرتوە لە بارودۆخی خەڵكی لە دنیادا، دونیا چێژو خۆشیەكی كاتیە كۆتایی پێدێ، پاشان وەسفی بەهەشتی كردوە لەوەی تیایدایە لە

نــازوو نیعمەتــەکان، وە بــەراوردی نێوانــی دنیاو دوارۆژی کــردوە، چاکــەی دوارۆژی داوە بەســەر دنیــادا، ئاگادارمــان دەکاتەوە کە پێویســتە دوارۆژ هەڵبژێریــنو کاری بۆ بکەین، وە وەســفی خەڵکــی بەهەشــتی کــردوە، ئەوانیش کەســانی پارێــزکارن، پاشــان تەفصیلی داوەو بــە تێرو تەســەلی باســی نیشــانەکانە خۆپارێزیو تەقــوای کردوە، ئا بەو نیشــانەو ســیفەتانە مــرۆڤ دەتوانــێ نەفــسو دەروونــی هەڵســەنگێنێ، ئایا ئــەو لە خەڵکــی بەهەشــتە یان نا؟

(١٨-٢٠): ﴿ شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَأُو۟لُوا۟ ٱلْعِلْمِ قَآئِمًۢا بِٱلْقِسْطِ ۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ
ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١٨﴾ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَٰمُ ۗ وَمَا ٱخْتَلَفَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ
إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ ۗ وَمَن يَكْفُرْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ
﴿١٩﴾ فَإِنْ حَآجُّوكَ فَقُلْ أَسْلَمْتُ وَجْهِىَ لِلَّهِ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِ ۗ وَقُل لِّلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْأُمِّيِّۦنَ ءَأَسْلَمْتُمْ ۚ
فَإِنْ أَسْلَمُوا۟ فَقَدِ ٱهْتَدَوا۟ ۖ وَّإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَٰغُ ۗ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿٢٠﴾ ﴾:

دەفەرمــوێ: ﴿ شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَأُو۟لُوا۟ ٱلْعِلْمِ ﴾ (واتــە: خــوا شــایەتی دەدات کــە بــە ڕاســتی هیــچ پەرســتراوێک نیە تەنها ئــەو نەبێ، وە فریشــتەکانیش شــایەتی دەدەن، وە زانایانیــش)، ئەمــە چەســپاندنە لــە لایــەن خــوای بــەرزەوە بــۆ یەکتاپەرســتی بە مەزنتریــن ڕێگــا کە پێویســتە بــۆ ئەو چەســپاندنە، ئەویش شــایەتی دانی خوایە، وە شــایەتی دانــی تایبــەت مەندترینــی دروســتکراوەکانە، ئەوانیــش فریشــتەکانو خاوەن زانســتەکانن، بەڵام شــایەتی خــوای مەزن لــەوەی کە هێناویەتــی لە بەڵگەو ســەلماندنی یەکلاکــەرەوە لە یەکتاپەرســتی خۆی، وە لەســەر ئەوەی هیچ پەرســتراوێک ڕاســتو ڕەوا نیــە جگە لە خۆی نەبــێ، جــا لــەو پێنــاوەدا بەڵگەکانــی جــۆراو جۆر کــردوون، لــە ئاســۆی دنیاو لــە خودی مرۆڤــەکان خۆیانــدا نیشــانیان دەدات کــە بەڵگــەن لەســەر ئەم بنەمــا مەزنە، جــا ئەگەر هەر کەســێک هەڵســتێت بە چەســپاندنی یەکتاپەرســتی، ئەوە بە هــەر جۆرێک بێت خوا ســەری دەخات بەســەر بتپەرســتو نکوڵیکەردا، بە هەمان شــێوە نــازوو نیعمەتــە مەزنەکانی کە هەر نیعمەتێــک لــەلای بەنــدەکان هەبێت ئــەوە تەنها لە لایــەن خواوەیە، کەس بــەلاو نارەحەتی دوورناخاتــەوە تەنهــا خــوا نەبــێ، هیچ یەکێک لــە بەدیهێنــراوەکان ناتوانن ســوودو زیان بە خۆیــانو غەیــری خۆیــان بگەیەنن، ئەمــە بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەیە لەســەر پێویســتبوونی یەکتاپەرســتیو پووچی هاوبــەش دانان.

بــەڵام شــایەتی فریشــتەکان بە یەکتاپەرســتی، ســوود لــە هەواڵەکانی خــوا ﷻ وەردەگرین دەربــارەی ئەوە، بــە هەمان شــێوە هەواڵــی پێغەمبەرانیش.

بەڵام شایەتیدانی خاوەن زانست، لەبەر ئەوەیە، ئەوان سەرچاوەن خەڵکی بۆ لای ئەوان دەگەڕێنەوە بۆ کاروباری ئاینیان، بەتایبەت بۆ مەزنترین کاروو گەورەترین‌و بەڕێزترینیان، ئەویش یەکتاپەرستیە، هەموویان لەسەرەتاوە بۆ کۆتایی یەکدەنگن لەسەر ئەوە، وە بانگەوازیان بۆ کردووەو ڕێگاکانی یەکتاپەرستیان بۆ خەڵکی ڕوون کردوەتەوە، پێویستە لەسەر خەڵکی پەیوەست بن بەم فەرمانەوە کە شایەتی لەسەر دراوەو کاری پێ بکەن، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بەڕێزترین زانست، زانستی یەکتاپەرستیە، چونکە خوا ﷻ بە خۆی شایەتی بۆ داوە، وە تایبەتمەندترینی بەدیهێنراوەکانی شایەتیان بۆ داوە، شایەتیدانیش ڕەواو دروست نیە تەنها بە زانست‌و دڵنیایی نەبێت، بە جۆرێک بێت وەکو ئەوەی بە چاو ببینرێ، ئەمە دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی هەر کەسێک نەگەیشتە ئەم پلەو پایە لە زانستی یەکتاپەرستیدا، ئەوە پێی ناوترێ خاوەن زانست.

ئەم دەقە بەڵگەیە لەسەر ڕێزو شەرەفی خاوەن زانست‌و زانایان، لە چەندین ڕوویێکەوە:

یەکەم: خوا لە ناو هەموو خەڵکیدا زانایانی تایبەت کردوە بۆ شایەتی دان لەسەر گەورەترین شت کە شایەتی بۆ بدرێ.

دووەم: خوا شایەتی دانی خاوەن زانستی خستۆتە ڕیزی شایەتی دانی خۆی‌و فریشتەکانی، ئەم فەزڵ‌و گەورەییە بەسە بۆ خاوەن زانست.

سێیەم: خوا کردوونی بە خاوەنی زانست، ئەوانی داوەتە پاڵ زانست، چونکە ئەوان پێی هەڵدەستن، هەر ئەوان بەو زانستە وەسف دەکرێن.

چوارەم: خوای مەزن زانایانی کردوە بە شایەت‌و بەڵگە بەسەر خەڵکی، وە خەڵکی پابەند کردوە بە کار کردن بە شتێک کە ئەوان شایەتیان بۆ داوە، ئەوان بوونەتە هۆکار بۆ ئەوە، بۆیە هەر کەسێک کار بەم یەکتاپەرستیە بکات، زانایان لە پاداشتی ئەو کەسەدا بەشدار دەبن، ئەوەش بەڕاستی فەزڵ‌و چاکەی خوایە دەیدا بە هەر کەسێک خۆی بیەوێ.

پێنجەم: بە شایەت دانانی خاوەن زانست لەلایەن خواوە ئەوە دەگەیەنێ کە خوا خاوەن زانستی تەزکیە کردووەو بە دادگەری داناون، وە ئەوە دەگەیەنێ کە خاوەن زانست جێی متمانەی ئەو کەسانەن کە لە ژێر چاودێری ئەواندان، کاتێ بڕیار لەسەر یەکتاپەرستی دەدەن، دوایی بڕیار لەسەر دادگەری بوونیشی دەدەن، دەفەرموێ: ﴿ قَآبِمًۢا بِٱلْقِسْطِ ﴾ واتە: بەردەوام بە دادپەروەر وەسف دەکرێ، لە کردەوەکانی‌و بەڕێوەبردنیدا لە نێوان

دروستکراوەکانیدا، خوا لەسەر ڕێگەیەکی ڕاستە، لە هەر شتێک کە فەرمانی پێدەکاتو قەدەغەی دەکات، وە لە هەر شتێک دروستی کردووەو ئەندازەی کردوە، پاشان دووبارە یەکتاپەرستی خۆی دەچەسپێنێو دەفەرموێ: ﴿ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴾ (واتە: هیچ پەرستراوێکی هەق نیە جگە لە خوا کە بالأدەستی کاربەجێیە).

بزانە بە ڕاستی ئەم بنچینەیە، بریتیە لە یەکتاپەرستی خواو بە تاک دانانی لە پەرستندا، چەندین بەڵگەی نەقلیو عەقلی لەسەر ئەم بابەتە هەن، هەتا لە پێش چاو خاوەن عەقڵو خاوەن ژیرییەکان ڕوونترە لە ڕووناکی خۆر، بەلأم بەڵگەی نەقلی: هەموو ئەوەی لە کتێبی خواو فەرمـوودەی پێغەمبەرەکەیدایە، لە فەرمانکردن پێیو چەسپاندنی، وە خۆشویستنی شوێنکەوتووانیو ڕق لێبوونەوە لەوەی کە پێی هەڵناسێو سزادانیان، وە سەرزەنشتی شیرکو ئەوانەیشی کە هاوبەش دادەنێن، هەموو ئەوانە لە بەڵگەی نەقلین لەسەر یەکتاپەرستی، هەتا وادەبینرێ کە خەریکە هەموو قورئان بەڵگەبێ لەسەر ئەوە.

بەلأم بەڵگەی عەقلی کە دەرکی پێ دەکرێ بە بیرو هۆشو عەقڵ، قورئانی پیرۆز لە زۆر شوێندا ئاماژەی بەوە کردوە، لە مەزنترینیان: دان پێدانانە بە پەروەردگاریتی خوا، بەڕاستی هەر کەسێک بزانێ خوا بەدیهێنەرو ڕۆزیدەرو ڕێکخەری هەموو کاروبارەکانە، ئەوەی بۆدەردەکەوێ کە تەنها ئەو پەرستراوەو نابێ پەرستش بۆ غەیری ئەو بکرێ، کە ئەمە ڕوونترینی شتەکانو مەزنترینیانە، خوا ﷻ بەڵگەیەکی زۆری هێناوەتەوە لە قورئان دەربارەی ئەوە.

وە لە بەڵگە عەقڵیەکانی دیکە کە پێویستە تەنها خوا بپەرسترێ بە تاک دانانێتی لە بەخشینو لابردنی نارەحەتیەکان، چونکە ئەگەر هەر کەسێک بزانێ نیعمەتە ئاشکراو پەنهانەکان، وە زۆرو کەمەکان، هەموویان لەلایەن خواوەیە، وە هەر ناخۆشیو بەلأو نارەحەتیەک بەسەریدا دێ تەنها خوا ﷻ دەتوانێ لایبدات، وە هیچ یەکێک لە بەدیهێنراوەکان دەسەلأتی بەسەر نەفسی خۆیدا نیە، لە بەدەستهێنانی نیعمەتو ڕەتکردنەوەی خراپەکان، بۆی دەردەکەوێو دڵنیا دەبێ لە پووچترینی پووچەکانە، وە بەندایەتیش نابێ بکرێ تەنها بۆ ئەو خوایە نەبێ کە تاکو تەنهایە، لە پێدانی بەرژەوەندیەکانو دوورخستنەوەی زیانەکان، ئا لەبەر ئەمەیە خوای بەرزو مەزن بەڵگەیەکی زۆری هێناوەتەوە لە کتێبەکەیدا.

هەروەها لە بەڵگە عەقڵیەکانی دیکە لەسەر یەکتاپەرستی: ئەوەیە کە خوا هەواڵی پێداوە

دەربارەی ئەو پەرستراوانەی کە دەپەرسترێن لە غەیری ئەو، بەوەی کە هیچ قازانجو زیانێکیان نیە، وە ناتوانن بێجگە لە خۆیان سەربخەن، تەنانەت ناتوانن خۆشیان سەربخەن، ئەو پەرستراوانە نە دەبیستنو نەدەبینن، وە ئەگەر گریمان بیستن ئەوە هیچ سوودێکیان نیە، وە غەیری ئەوانەش لەو سیفەتانەی کە بەڵگەن لەسەر ناتەواوی ئەو پەرستراوانە، ئەوەی هەواڵی پێداوە دەربارەی نەفسی مەزنی، لە سیفەتە بەرزو جوانەکانو، وە تواناو زاڵبوون، وە جگە لەو سیفاتانەی کە دەناسرێنەوە بە بەڵگەی بیستنو عەقڵی، هەر کەسێک ئەمانەی بە تەواوی زانی، بۆی دەردەکەوێ کە بە ڕاستی عیبادەت شایستە نیە بۆ هیچ کەسێک غەیری پەروەردگاری مەزن، کە خاوەن هەموو تەواویەکە، وە هەموو گەورەییو، هەموو ستایشو، هەموو تواناو هەموو بڵندیەکە، نەک بۆ بەدیهێنراوە بەڕێوەبراوە ناتەواوەکان کە کەرو لاڵنو بێ عەقڵن.

هەروەها یەکێکی تر لە بەڵگە عەقڵیەکان لەسەر یەکتاپەرستی: ئەوەیە کە مرۆڤەکان هەر لە دێر زەمانەوە بە چاوی خۆیان دەیبینن چ ڕێزێک دراوە بە خاوەن یەکتاپەرستیو چۆن سەرزەنشتو سزای بتپەرستان دراوە، ئەمەش تەنها لەبەر ئەوەیە کە خوا یەکتاپەرستی داناوە بۆ گەیشتن بە هەموو ڕێگایەکی خێرو کردوویەتی بە مایەی لاچوونی هەموو خراپەو شەڕێکی دینیو دنیایی، وە شیرکو کوفری کردۆتە هۆکاری بۆ سزادانی دینیو دنیایی، لەبەر ئەمەیە کاتێ خوای بەرز ئەگەر باسی چیرۆکی پێغەمبەرانی کردبێ، لەگەڵ ئۆممەتە گوێڕایەڵو سەرپێچی کارەکاندا، هەواڵی داوە دەربارەی سزای سەرپێچی کارانو ڕزگار کردنی پێغەمبەرانو ئەوانەی شوێنیان کەوتوون، پاش هەموو چیرۆکێک فەرموویەتی: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً﴾ واتە: پەندو ئامۆژگاریە بۆ ئەو کەسانەی کەڵکی لێوەردەگرن، جا دەزانن تەنها یەکتاپەرستی خوا ﷻ ڕزگاریان دەکات، وە وازهێنان لێی دەبێتە مایەی لەناوچوون، ئەمانە کۆمەڵە بەڵگەیەکی گەورەی عەقڵیو نەقڵین کە ئاماژەن لەسەر ئەم بنەما مەزنە ئەویش یەکتاپەرستیە، بێگومان خوا ﷻ لە کتێبەکەیدا زۆر جەختی لەسەر کردۆتەوە، وە گۆڕیویەتیو جۆراوجۆری کردوە، تا لە ناو بچێ ئەو کەسەی بەلای خواوە لەناو چووە لە ڕێی بەڵگەوە، وە بۆ ئەوەش بژی ئەوەی بەلای خواوە دەژی لە ڕووی بەڵگەوە، سوپاسو ستایش هەر بۆ خوایە.

کاتێ کە بڕیاریدا تەنها ئەو پەرستراوی ڕاستەقینەیە، ئنجا عیبادەتو ئاینی ڕوونکردەوە، کە دیاری دەکرێ بۆ ئەوەی پەرستشی پێ بکرێ ئەویش ئیسلامە، ئیسلامیش بریتیە لە

تەسلیم بوون بە خوا ﷻ بە یەکتاپەرستیو گوێڕایەڵی کردنی بەو شێوەیەی پێغەمبەران بانگەشەیان بۆ کردووەو کتێبە پیرۆزەکان هانی خەڵکیان لەسەر داوە، خوا ﷻ ئەو خوایەیە هیچ ئاینێکی دیکە جگە لە ئیسلام لە هیچ کەسێک قبووڵ نیە، دڵسۆزی بۆ خوا ﷻ لە خۆشەویستیو ترسو ئومێدو گەڕانەوەو پاڕانەوەو شوێنکەوتنی پێغەمبەرەکەی لە خۆدەگرێ، ئا ئەمە دینی هەموو پێغەمبەرانە، هەر کەسێکیش شوێنیان بکەوێ ئەوە لەسەر ڕێگای پێغەمبەرانە، بەڵام خاوەن کتێبەکان جیاوازی کەوتە نێوانیان دوای ئەوەی کە کتێبەکانیان جەختیان کردبووە لەسەر کۆبوونەوە بۆ لای دینی خوا، ئەم لادانەشیان بە هۆی گومرابوونو ستەمکردن لە دەروونی خۆیانەوە بووە، ئەگەرنا ئەوان هۆکاری گەورەیان بۆ هات کە ئیسلامە، کە پێویست بوو شوێنی بکەونو واز لە دووبەرەکی بهێنن، ئەمەش لە ئەنجامی کوفریانەوەیە، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا ٱخۡتَلَفَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلۡعِلۡمُ بَغۡيَۢا بَيۡنَهُمۡۗ وَمَن يَكۡفُرۡ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ﴾(واتە: جیاوازی لە نێوانیان پەیدا نەبوو، مەگەر لە دوای ئەوەی زانستو زانیاری تەواویان بۆ هاتووە ئەمەش بە هۆی دنیاپەرستیو ستەمکردنیان بوو لە نێو خۆیان، جا هەر کەس بڕوای بە فەرمانو ئایەتەکانی خوا ﷻ نەبێت، ئەوە بێگومان خوا بە خێرایی حیسابی خۆی دەکات لەگەڵیدا)، پاداشتی هەموو کەسێک دەداتەوە بە پێی کردەوەکانی، بە تایبەت کەسێک واز لە هەقو ڕاستی بهێنێ پاش ئەوەی ناسیویەتی، بە ڕاستی ئەمە شایستەی هەڕەشەی توندو سزای بە ئێشە، پاشان خوا فەرمانی کردوە بە پێغەمبەرەکەی ﷺ لە کاتی گفتوگۆو بەڵگە هێنانەوە لەگەڵ گاورەکانو غەیری وانیش، ئەوانەی فەزڵی غەیری ئیسلام دەدەن بەسەر ئیسلامدا، پێیان بڵێ: ﴿أَسۡلَمۡتُ وَجۡهِيَ لِلَّهِ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِ﴾ (واتە: ڕووم سپارد بە خواو ملکەچی بووم لەگەڵ ئەوانەی پەیڕەوی من دەکەن) واتە: منو شوێنکەوتووانم دانمان بەوەداناوەو چەسپاندوومانەو شایەتیمان داوەو مسوڵمان بووینو وازمان هێناوە لە هەموو ئاینەکانی تر جگە لە ئیسلام، وە جەختمان کردۆتەوە لەسەر پووچیان، ئەمە دەبێتە هۆی بێ ئومێد بوونی ئەو کەسەی چاوی تەماحی بریوەتە ئێوە، وە نوێبوونەوەیە بۆ ئاینەکەتان کاتێ کە گومانو دوودڵی دێتە پێش، وە بەڵگەشە لەسەر ئەو کەسەی کاروبارەکانی لا تێپەڕ دەبێ، لەبەر ئەوەی پێشتر باسکرا خوا ﷻ شایەتیداوە لەسەر یەکتاپەرستی خۆی بە خاوەن زانستو زانیاری لە بەندەکانی، بۆ ئەوەی بیانووی غەیری خۆیان ببڕنو ببنە

بەڵگــە بەســەریانەوە، پێشــەواو زانــاو بەرێزترینیــان پێغەمبەرمــان موحەممــەدە ﷺ، لە دوای ئــەو شــوێنکەوتووەکانیەتی بــە پێــی جیــاوازی پلــەو پایــەو دەرەجەکانیان، ئــەوان خاوەنی زانســتی ڕاســتەقینەو عەقڵــی تــەواون، کە هیــچ یەکێک لــە بەدیهێنــراوەکان پێــی ناگاتو لێیشــیان نزیــک نابێتەوە، جا ئەگەر یەکتاپەرســتیو ئاینــی خوا ﷻ جێگیــرو ڕوون بوویەوە بــە بەڵگــەی ئاشــکرا، وە تەواوتریــنو زاناترینــی بەدیهێنــراوەکان پێی هەســتا، بەمــە یەقین بــە دەســت دێو هەمــوو گومــانو دوو دڵیەک لادەچــێو نامێنــێ، وە دەردەکــەوێ جگە لە ئیســلام هەمــوو ئاینەکان پــووچو باتڵن، لەبــەر ئەمــە فەرموویەتی:

﴿ وَقُل لِّلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ ﴾ (واتــە: ئــەی موحەممــەد! بــە خــاوەن کتێبــەکان بڵــێ) لــە گــاوروو جولەکەکان، ﴿ وَٱلۡأُمِّيِّـۧنَ ﴾ بتپەرســتانی عەرەبو غەیــری وانیش، ﴿ ءَأَسۡلَمۡتُمۡۚ فَإِنۡ أَسۡلَمُواْ ﴾ بــەو شــێوەیەی کە بڕواتان پێــی هێنا ﴿ فَقَدِ ٱهۡتَدَواْ ﴾، (ئــەوە هیدایەتیان وەرگــرت) وەک ئێــوەنو بــوون بــە بــرای ئێــوە، هــەرچ (مافێــک) بــۆ ئەوانە بۆ ئێوەشــە، هــەر (ئەرکێــک) لەســەر وانە لەســەر ئێوەشــە، ﴿ وَّإِن تَوَلَّوۡاْ ﴾ ئەگــەر ڕوویــان وەرگێڕا لــە ئیســلامو ڕازی بوون بــەو ئاینــەی کــە پێچەوانەیەتــی، ﴿ فَإِنَّمَا عَلَيۡكَ ٱلۡبَلَٰغُۗ ﴾ (واتە: تــۆ تەنهــا ڕاگەیاندنت لەســەرە)، پاداشــتت لای خــوا ﷻ جێگیر بــووە، حوججــەو بەڵگەت بەســەریانەوە پێویســت کــردوە، لەپــاش ئەمــە هیچــی تــر نەماوەتەوە تەنهــا ئەوە نەبێ ســزا بدرێــن لەســەر تاوانەکانیــان، بۆیە فەرموویەتــی: ﴿ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴾ (واتــە: خوا بینایە بە بەنــدەکان).

(٢١-٢٢): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَيَقۡتُلُونَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ بِغَيۡرِ حَقّٖ وَيَقۡتُلُونَ ٱلَّذِينَ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡقِسۡطِ مِنَ ٱلنَّاسِ فَبَشِّرۡهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ٢١ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ٢٢ ﴾:

ئەوانــەی کە خــوا ﷻ هەواڵــی دەربارەیان داوە لــەم دەقــەدا، تاوانبارترینی نێــو مرۆڤەکانن، جــا چ تاوانێــک مەزنتــرە لــە کوفــر کــردن بــە ئایەتەکانــی خــوا ﷻ، کــە بەڵگەیەکــی یەکلاکــەرەوەن لەســەر ڕاســتی، هــەر کــەس کوفریــان پــێ بــکات دیــارە ئــەوە لەوپەڕی بێبڕوایــیو عینادیو سەرکێشــی دایــە، پێغەمبەرانی خوایان دەکوشــت کە هــەق وابوو پاش پەرســتنی خــوا ﷻ مافــی ئــەوان لەبەرچاو بگــرن، ئــەو پێغەمبەرانەی کــە خــوا گوێڕایەڵی کردنیــانو ئیمــان پێهێنانیانــی واجب کــردوە، وە پێویســتی کــردوە ڕێزیان لــێ بگیرێ، بە مــەزن تەماشــا بکرێن، بــەڵام ئەوان پێچەوانــەی هەموو ئەمانــە جووڵانــەوە، وە هەروەها ئەو

کەسانەیان دەکوشت کە فەرمان دەکەن بە دادپەروەری، ئەویش فەرمان بە چاکەو قەدەغە کردنە لە خراپە، کە حەقیقەتەکەی بریتیە لە چاکە کردن لەگەڵ فەرمان پێکراوانو ئامۆژگاری کردنیان، ئەوان بە خراپترین شێوە لە بەرانبەریدا وەستان، بە هۆی ئەم تاوانو سەرپێچیەیانەوە شایستەی خراپترین تۆڵە بوون، ئەویش سزای بە ئێشە، کە هیچ کەس ناتوانێ وەسفی بکاتو ئەندازەی بکات، بە ئێشە بۆ جەستەو دڵو ڕووحەکان.

وە ئەو جۆرە کەسانە کردەوەکانیشیان پووچ دەبێتەوە کە خۆیان بوونەتە هۆکار، وە هیچ کەسێک نیە بتوانێ ڕزگاریان بکات لە سزای خوا ﷻ، هیچ کەس ناتوانێ بە قەد تۆزقاڵێک سزایان لەسەر سووک بکات، ئەوان بێ ئومێد بوون لە هەموو خێرێک، هەموو شەڕو خراپەیەکیان بەدەست هێنا، ئەم بارودۆخە سیفەتی جوولەکەو هاوشێوەکانیانە، خوا ڕوویان ناشرین بکات لەسەر ئەو بوێریو کەللەڕەقیەی کە بەرانبەر خواو پێغەمبەرانو پیاوچاکان نواندوویانە.

أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيبًا مِّنَ الْكِتَابِ يُدْعَوْنَ إِلَىٰ كِتَابِ اللَّهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ وَهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٢٣﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا لَن تَمَسَّنَا النَّارُ إِلَّا أَيَّامًا مَّعْدُودَاتٍ وَغَرَّهُمْ فِي دِينِهِم مَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ ﴿٢٤﴾ فَكَيْفَ إِذَا جَمَعْنَاهُمْ لِيَوْمٍ لَّا رَيْبَ فِيهِ وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٥﴾ قُلِ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَن تَشَاءُ وَتَنزِعُ الْمُلْكَ مِمَّن تَشَاءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَاءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَاءُ بِيَدِكَ الْخَيْرُ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٦﴾ تُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَتُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ وَتُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَتُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَتَرْزُقُ مَن تَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٢٧﴾ لَّا يَتَّخِذِ الْمُؤْمِنُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِن دُونِ الْمُؤْمِنِينَ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَلَيْسَ مِنَ اللَّهِ فِي شَيْءٍ إِلَّا أَن تَتَّقُوا مِنْهُمْ تُقَاةً وَيُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفْسَهُ وَإِلَى اللَّهِ الْمَصِيرُ ﴿٢٨﴾ قُلْ إِن تُخْفُوا مَا فِي صُدُورِكُمْ أَوْ تُبْدُوهُ يَعْلَمْهُ اللَّهُ وَيَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٩﴾

(٢٣-٢٥): ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيبًا مِّنَ الْكِتَابِ يُدْعَوْنَ إِلَىٰ كِتَابِ اللَّهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ وَهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٢٣﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا لَن تَمَسَّنَا النَّارُ إِلَّا أَيَّامًا مَّعْدُودَاتٍ وَغَرَّهُمْ فِي دِينِهِم مَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ ﴿٢٤﴾ فَكَيْفَ إِذَا جَمَعْنَاهُمْ لِيَوْمٍ لَّا رَيْبَ فِيهِ وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٥﴾﴾ :

خوا هەواڵ دەدات دەربارەی حاڵی خاوەن کتێبەکان، ئەوانەی خوا ﷻ نیعمەتی پێبەخشین بە دابەزاندنی کتێب، جا پێویست وابوو ئەوان لە پێش هەموو خەڵکیەوە گوێڕایەڵی فەرمانو بڕیارەکانیان بکردایە، جا خوا ﷻ هەواڵی دەربارەی ئەوان داوە، ئەگەر بانگ بکرێن بۆ لای کتێبی خوا ﷻ دەستەیەک لەئەوان پشت هەڵدەکەنو ڕوو وەردەگێڕن، پشت هەڵدەکەن بە جەستەو بە دڵەکانیان ڕوو وەردەگێڕن، بەڕاستی ئەمە ئەوپەڕی سەرکۆنە کردنە، وە لە نێویاندا ئاگادار کردنەوەی ئێمەیە کە وەکو ئەوان هەڵسوکەوت نەکەین، ئەگینا هەمان ئەو سەرکۆنە کردنەو سزایەی ئەوانمان تووش دەبێ، بەڵکو پێویست وایە لەسەر هەموو کەسێک ئەگەر بانگ بکرێ بۆ لای کتێبی خواو گوێڕایەڵی بکاو ملکەچی بۆ بنوێنێ، وەک خوا فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ﴿٥١﴾﴾النور، (واتە: قسەی ئیمانداران تەنها ئەوەیە کاتێ بانگ بکرێن بۆ لای خواو پێغەمبەرەکەی بۆ ئەوەی بڕیار بدات لە نێوانیاندا دەڵێن: بیستمانو گوێڕایەڵین)، هۆکاری ئەوەی کە خاوەن کتێبەکان لە خۆبایی بوون، بوێری کردنیان بوو لەسەر سەرپێچی کردنی خواو دەیانوت: ﴿لَن تَمَسَّنَا النَّارُ إِلَّا أَيَّامًا مَّعْدُودَاتٍ وَغَرَّهُمْ فِي دِينِهِم مَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ﴾ (واتە: هەرگیز ئاگر بەر لەشمان ناکەوێت

تەنهـا چەنـد ڕۆژێکـی ژمێـرراو نەبێـت، وە فریویـان خـوارد لـە ئاینەکەیانـدا بـەو درۆیانـەی کـە هەڵیاندەبەسـت)، ئـەو درۆیـەی هەڵیانبەسـت وایاندەزانـی حەقیقـەتو ڕاسـتیە، بۆیـە لەسـەر ئـەوە کارو کردەوەیـان ئەنجـام دەدا، خۆیـان نەپاراسـت لـە قەدەغەکـراوەکان، نەفـسو دەروونیـان هەڵیخەڵەتانـدن، کـە داهاتـووی ئـەوان بـۆ بەهەشـتە، بێگومـان لەسـەر ئـەو قسـەیە درۆیـان کـرد، ئـەوە تەنهـا بوختـانو درۆیـە، بەڵکـو چارەنووسـیان خراپتریـن چارەنووسـە، بۆیـە خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ فَكَيْفَ إِذَا جَمَعْنَاهُمْ لِيَوْمٍ لَّا رَيْبَ فِيهِ ﴾ واتـە: دەبـێ حاڵیـان چـۆن بـێ، لـەو تـاوانو خراپانـەی کـە پێشـی خۆیـان خسـتووە، حاڵەتێکـە ناتوانـرێ وەسـف بکـرێ، وە نازانـرێ چەنـد خراپـە، چونکـە ئـەو ڕۆژە پاداشـت دانـەوەی نەفـسو دەروونەکانە لەسـەر ئـەوەی کردوویەتـی، بـە دادپـەروەری نـەک بـە سـتەم، بێگومـان زانـراوە ئـەو پاداشـت دانەوەیـە بـە پێـی کردەوەکانـە، وە لـە کردەوەکانیشـیان ئەوەمـان بـۆ ڕوون دەبێتـەوە لـە هەمـوو خەڵکـی زیاتـر سـزا دەدرێـن.

(٢٦-٢٧): ﴿ قُلِ ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلْمُلْكِ تُؤْتِى ٱلْمُلْكَ مَن تَشَآءُ وَتَنزِعُ ٱلْمُلْكَ مِمَّن تَشَآءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَآءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَآءُ ۖ بِيَدِكَ ٱلْخَيْرُ ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٦﴾ تُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَتُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ ۖ وَتُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَتُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ ۖ وَتَرْزُقُ مَن تَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٢٧﴾ ﴾:

خـوای گـەورە بـە پێغەمبەرەکـەی ﷺ دەفەرمـوێ: ﴿ قُلِ ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلْمُلْكِ ﴾ واتـە: (ئـەی موحەممـەد بڵـێ:) تـۆ پادشـاو دەسـەڵاتداری فەرمانـڕەوای هەمـوو پادشـاکانی، سـیفەتی دەسـەڵاتداریی ڕەهـا هـەر بـۆ تۆیـە، هـەر هەمـوو موڵکـی سـەروو خـواروو هـی تۆیـە، بەڕێوەبـردنو ڕێکخسـتنی هـەر لەلایـەن تۆوەیـە، پاشـان درێـژەی داوە بـەو بەڕێوەبردنانـەی کـە تەنهـا خـوای مـەزن دەتوانـی بەڕێوەیـان ببـات، فەرموویەتـی: ﴿ تُؤْتِى ٱلْمُلْكَ مَن تَشَآءُ وَتَنزِعُ ٱلْمُلْكَ مِمَّن تَشَآءُ ﴾ (واتـە: هـەر کەسـێ خـۆت بتـەوێ موڵکـی پـێ ئـەدەی هەرکەسـێکیش خـۆت بتـەوێ موڵکـی لێدەسـەنیتەوە) .

لـەم دەقـەدا ئاماژەیـەک بـەدی دەکـرێ کـە خـوا ﷻ دەسـەڵات دەسـێنێتەوە لـە کیسـراو قەیصـەرەکانو ئەوانەیشـی شـوێنی ئـەوان کەتـوون، دەیـدات بـە ئوممەتـی موحەممـەد ﷺ، بێگومـان ئـەوەی کـرد، سـوپاسو سـتایش بـۆ خـوا،

جـا پێدانـی دەسـەڵاتو لێسـەندنەوەی بـە ویسـتو ئیـرادەی خـوای بـەرزە، ئەمـە هیـچ تێکگیراتێکـی نیـە لەگـەڵ ئـەو سـوننەتانەی کـە خـوای پەروەردگـار خـۆی دەیانرووێنـێ لـە هـۆکارە دینـیو دنیاییـەکان کـە دەبنـە هـۆی مانـەوەی دەسـەڵاتدارەکان، وە هەندێکیشـی دەبنـە هـۆی نەمانـی ئـەو دەسـەڵاتدارانە، هەمـوو ئەوانـە بـە ویسـتو ئیـرادەی خوایـە، هیـچ هۆکارێـک نیـە سـەربەخۆ بـێ بـە خۆیـەوە، بەڵکـو هەمـوو هـۆکارەکان شـوێنکەوتووی قـەزاو قـەدەرن، یەکێـک لـەو هۆکارانـەی کـە خـوا کردوویەتـی بـە هـۆکاری بـە دەسـت هێنانـی دەسـەڵات بریتیـە لـە ئیمـانو کـردەوەی چـاک، لـە نێویانـدا یەکدەنگـی بڕوادارانـە، وە خـۆ ئامادەکردنیانـە بـەوەی لـە توانایـان دایـە، وە ئارامگرتـنو نەبوونـی دووبەرەکـی، خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ كَمَا ٱسْتَخْلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴿٥٥﴾ ﴾النـور، (واتـە: خـوا بەڵێنـی داوە بەو کەسـانەتان کـە ئیمانیـان هێنـاوەو کـردەوە چاکەکانیـان ئەنجامـداوە کـە بێگومـان دەیانکاتـە جێنشـین لـە زەویـدا هـەروەک ئیماندارانـی پێـش ئەوانـی کردە جێنشـین).

خـوا ﷻ هەواڵـی داوە کـە ئیمـانو کـردەوەی چـاک هۆکارێکـن بـۆ دەسـەڵات لەسـەر زەویـدا، وە خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَيَّدَكَ بِنَصْرِهِۦ وَبِٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٢﴾ وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ ﴾الأنفـال، (واتـە: ئـەوە خـوات بەسـە، هـەر ئـەو بـە یارمەتـی خـۆیو بـە هـۆی بڕوادارانـەوە پشـتگیری کـردووی . وە بـە جۆرێـک دڵیانـی پێکـەوە گـرێ داوە، کـە هەرچـی مـاڵو سـامان لـە زەویدایـە بەخشـیبات ئـاوا دڵیانت پێکـەوە جـۆش نـەدەدا)، وە خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَٱثْبُتُوا۟ وَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٤٥﴾ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَنَٰزَعُوا۟ فَتَفْشَلُوا۟ وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ ۖ وَٱصْبِرُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٤٦﴾ ﴾الأنفـال، واتـە: (ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! هـەر کات بەرەنگـاری کۆمەڵێـک لـە بێبڕوایـان بوونـەوە چەسـپاوبن، وە زۆر یـادی خـوا بکـەن، بەڵکـو سـەرفرازو سـەرکەوتوو بـن . وە فەرمانبەریـی خـواو پێغەمبەرەکـەی بکـەنو لـە نێـو خۆتانـدا ناکـۆک مەبـن، ئەگەرنـا دەدۆڕێـنو هێـزو پێزتـان نامێنـێ، وە خۆڕاگربـن بـە دڵنیایـی خـوا خۆڕاگرانـی خۆشـدەوێن).

خـوا هەواڵـی داوە یەکبوونـی دڵـی بـڕواداران‌و جێگیربوونیـانو نەبوونـی تەفرەقـەو

دووبەرەکـی لـە نێوانیانـدا، هۆکارێکـی گەورەیە بـۆ سـەرکەوتنیان بەسـەر دووژمنەکاندا، تـۆ ئەگـەر تەماشـای دەوڵەتـی ئیسـلامی بکـەی دەبینـی گەورەتریـن هـۆکار کـە بووەتـە مایـەی لـە دەسـتدانی موڵـکو دەسـەڵاتیان، وازهێنانیـان بـووە لـە ئایـن، وە جیـاوازیو دووبەرەکـی، کـە بووەتـە مایـەی ئـەوەی دوژمنیـان تەماحیـان تێبکـەن، ئەمـەش وای لێکـردوون هـەر بـە خۆیانـەوە خەریـک بـن، پاشـان فەرموویەتـی:

﴿ وَتُعِزُّ مَن تَشَآءُ ﴾ بـە گوێڕایەڵـی کردنـت، ﴿ وَتُذِلُّ مَن تَشَآءُ ﴾ بـە سـەرپێچی کردنـت، ﴿ بِيَدِكَ ٱلْخَيْرُ ﴾واتـە: هەمـوو خێـرو چاکەیـەک هـەر بـە دەسـتی خۆتـە، ﴿ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴾ هیـچ کارێـک لـە کارەکان ڕێگریـت لـێ نـاکات، بەڵکـو هەمـوو شـتەکان لـە ژێـر دەسـەڵاتو قودرەتـی تـۆ دان ﴿ تُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَتُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ ﴾ واتـە: شـەو دەبەیتـە نێـو ڕۆژ، وە ڕۆژیـش دەبەیتـە نێـو شـەو، لـە ئەنجامـی ئـەم چوونـە نێـو یەکتریـەوە، هەریـەک لـە: وەرزەکانو تیشـکو ڕووناکـیو سـێبەرو سسـت بـوونو بڵاوبوونـەوە دروسـت دەبـنو ڕوودەدەن، ئـا ئەوانـە گەورەتریـن بەڵگـەن لەسـەر قـودرەتو توانـاو مەزنـیو بەزەیـی خـوا ﷻ، ﴿ وَتُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ ﴾(واتـە: زینـدوو لـە مـردوو دەردێنـیٚ) وەک دەرهێنانـی جووچکـە لـە هێلکـە، وە دەرهێنانـی درەخـت لـە تۆوەکەیـدا، وە مرۆڤـی ئیمانـدار لـە مرۆڤـی کافـر ﴿ وَتُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ ﴾ (واتـە: وە مـردوو لـە زینـدوو دەردێنـیٚ)، وەک دەرهێنانـی هێلکـە لـە باڵنـدە، تـۆو لـە دارو‌ودرەخـت، بێبـروا لـە بـڕوادار، ئەمـەش گەورەتریـن بەڵگەیـە لەسـەر توانـاو دەسـەڵاتی خـوا، بـە ڕاسـتی هەمـوو شـتەکان لەلایـەن خـواوە ژێربـار خـراونو بەڕێوەدەبرێـن، وە هیـچ دەسـەڵاتێکیان نیە لـە بەڕێوەبردنـدا، جـا بەدیهێنانـی دژەکان لـە لایـەن خـواوە، وە بەدیهێنانـی شـتێک لـە شـتێکی دیکـەی پێچەوانـەی خـۆی، بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی بەدیهێنـراو بـێ دەسـەڵاتو بـێ توانایـە، ﴿ وَتَرْزُقُ مَن تَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴾ واتـە: هـەر کەسـێکیش خـۆت بتـەوێ ڕزقو ڕۆزی دەدەی، بـە شـێوەیەک کـە حیسـابی بـۆ نەکردبـێ یـان هەوڵـی بـە دەسـتهێنانی نەدابـێ، پاشـان خـوای بـەرزو مـەزن دەفەرمـوێ:

(٢٨-٣٠): ﴿ لَّا يَتَّخِذِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْكَـٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَلَيْسَ مِنَ ٱللَّهِ فِى شَىْءٍ إِلَّآ أَن تَتَّقُوا۟ مِنْهُمْ تُقَىٰةً ۗ وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفْسَهُۥ ۗ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿٢٨﴾ قُلْ إِن تُخْفُوا۟ مَا فِى صُدُورِكُمْ أَوْ تُبْدُوهُ يَعْلَمْهُ ٱللَّهُ ۗ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ

كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٩﴾ يَوْمَ تَجِدُ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ مِنْ خَيْرٍ مُّحْضَرًا وَمَا عَمِلَتْ مِن سُوٓءٍ
تَوَدُّ لَوْ أَنَّ بَيْنَهَا وَبَيْنَهُۥٓ أَمَدًۢا بَعِيدًا ۗ وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفْسَهُۥ ۗ وَٱللَّهُ رَءُوفٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿٣٠﴾ ﴾:

دەفەرمـــوێ: ﴿ لَّا يَتَّخِذِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ ئەمـــە قەدەغـــە كردنـە لەلایـەن خـوای مەزنـەوە بـۆ بـڕواداران، دەربـارەی دۆسـتایەتی‌و پشـتیوانی بێبڕوایـان بـە خۆشویسـتن‌و سەرخسـتن‌و یارمەتیدانیـان، لـە هـەر كاروباڕێكـی مسـوڵمانان، وە هەرەشەیشـی كـردوە لەسـەر یارمەتیدانیـان، فەرموویەتـی: ﴿ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَلَيْسَ مِنَ ٱللَّهِ فِى شَىْءٍ ﴾ (واتـە: هـەر كەسـێك لـە فەرمانـی خـوا دەرچـێ‌و كافـر بكاتـە دۆسـتی خـۆی، ئـەوە هیـچ پەیوەندیەكـی ئیمانـی بـە خـواوە نیـە) بـە ڕاسـتی ئـەوە لـە لای خـوا ﷻ یەكلابووەتـەوە، ئـەو كەسـە لـە ئاینـی خـوادا هیـچ بەشـێكی نیـە، چونكـە ئـەوە كۆنابێتـەوە لەگـەڵ ئیمانـدا، لەبـەر ئـەوەی ئیمـان فەرمـان بـە خاوەنەكـەی دەكات بـە دۆسـتایەتی خـواو پشـتیوانی بـڕواداران‌و سەرخسـتنیان، لەسـەر بەرپـا كردنـی دینـی خـواو جیهـاد كـردن لـە پێناویـدا، خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ﴿٧١﴾ ﴾ التوبـة، (واتـە: ئیمانـداران لـە پیـاوان‌و ئافرەتـان هەندێكیـان دۆسـت‌و پشـتیوانی هەندێكیانن)، هـەر كەسـێك بێبڕوایـان بكاتـە دۆسـت جگـە لـە ئیمانـداران، ئـەو بێبڕوایانـەی كـە دەیانـەوێ نـووری خـوا بكوژێننـەوەو دۆستەكانی خـوا تووشـی فیتنـەو بـەڵا بكـەن، ئـەوە لـە حزبـی بـڕواداران دەردەچـێ‌و، دەچێتـە نـاو حزبـی كافرانـەوە. وە خـوا ﷻ دەفەرمـــوێ: ﴿ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُۥ مِنْهُمْ ﴿٥١﴾ ﴾ المائـــدة، (واتـــە: هـــەر كەســـێك پشـتیوانی‌و دۆسـتایەتی ئـەوان بـكات ئـەوە لەوانـە)، ئـەم ئایەتـە بەڵگەیـە لەسـەر دوور كەوتنـەوە لـە بێبڕوایـان‌و هاوڕێتـی‌و تێكـەڵاوی كردنیـان، هەروەهـا مەیـل‌و ئـارەزوو كردنیـان، دروسـت نیـە دەسـەڵات بـدرێ بـە كەسـێكی بێبـڕوا لـە پلـەو پایەیـەك لـە وڵاتـی مسـوڵماناندا، وە نابـێ پشـتی پـێ ببەسـترێ لـە سـەر ئـەو كارانـەی كـە بەرژەوەنـدی گشـتی مسـوڵمانانی تێدایـە، خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ إِلَّآ أَن تَتَّقُوا۟ مِنْهُمْ تُقَىٰةً ﴾ (واتـە: مەگـەر بـۆ خۆپاراسـتن بـێ لێیـان) ئەگـەر لـە نەفسـی خۆتـان ترسـان ئـەوە بۆتـان دروسـتە كارێـك بكـەن كـە خوێنـی خۆتانـی پـێ بپارێـزن لـە (التقیة) خۆپاراسـتن بـە زمـان‌و دەرخسـتنی ئـەو شـتەی كـە دەبێتـە هـۆی پاراسـتنتان، پاشـان خـوای بـەرزو مـەزن دەفەرمـوێ:

﴿ وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفْسَهُۥ ﴾ واتــە: خۆتــان تووشــی تــووڕە بوونــی خــوا مەکــەن بــەوەی کــە ســەرپێچی ئــەو بکــەنو ئەویــش لــە بەرانبــەردا ســزاتان بــدات لەســەر ئــەم ســەرپێچی کردنەتــان ﴿ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ ﴾ واتــە: گەڕانــەوەی بەنــدەکان لــە ڕۆژی کۆکردنــەوەدا کــە ڕۆژی قیامەتــە، کردەوەکانیــان ســەرژمێر دەکاو بــە گوێرەی ئــەو کردەوانــەش پاداشــت یــان ســزایان دەدات، جــا تکایــە ئاگاداربــن لــە ئەنجامدانــی کــردەوەی خــراپو قێــزەون کــە ببێتــە مایــەی ئــەوەی شایســتەی ســزای خواتــان بــکات، کار بــۆ ئــەو شــتە بکــەن کــە دەبێتــە مایــەی بەدەســتهێنانی پاداشــت، پاشــان خــوا هەواڵمــان پێــدەدا دەربــارەی فراوانیــی زانســتو زانیــاری خــۆی، بــە تایبــەت لــەوەی لــە نەفــسو دەروونەکانــدا دەگــوزەرێ، لەوەیشــی لــە ئاســمانەکانو زەویدایــە بــە گشــتی، وە لــە تــەواوی قــودرەتو توانــای، ئــەم دەقــە ڕێنمایــی تێدایــە بــۆ خاوێن کردنــەوەی دڵــەکان لــە هەمــوو کاتێکــدا، هەســت کــردن بــە زانســتی خــوا ﷻ لــە هەمــوو کاتێکــدا، تــا ببێتــە مایــەی ئــەوەی بەنــدە شــەرم لــە پەروەردگــاری بــکات، کــە ببینــێ دڵــی بووەتــە جێگایــەک بــۆ کوفرێکــی پیســی بــێ نرخــی دوورخــراوە، بەڵکــو بیــرو هــزری خــۆی ســەرقاڵ بــکات بــەو شــتەی لــە خــوا ﷻ نزیکــی دەکاتــەوە، لــە بیــر کردنــەوە تێرامــان لــە دەقێــک لــە قورئانــی پیــرۆز، یــان لــە ســوننەتێکی پێغەمبــەر ﷺ، یــان لێکۆڵینــەوە بــکات لــە زانســتێکدا ســوودی بــۆی هەبێــت، یــان بیــر بکاتــەوە لــە بەدیهێنراوەکانــی خــوا ﷻو نــازوو نیعمەتەکانــی، یاخــود ئامۆژگــاری بەندەکانــی خــوا.

لــە نێــو ئــەو هەواڵانــەی کــە خــوای بەرزومــەزن دەربــارەی زانســتو دەســەڵاتو توانــای فراوانــی خــۆی پێیداویــن هەواڵــی شــتێکمان پێــدەدا کــە پێویســتی ئــەم زانســتو زانیاریــەی خۆیەتــی کــە ئەویــش بریتیــە لــە پێدانــەوەی ســەرەنجامی ئــەو کاروکردەوانــەی کــە بەندەکانــی کردوویانــە، شــوێنی ئــەم ئەنجــام وەرگرتنــەوەش ڕۆژی دواییــە، لــەو ڕۆژەدایــە کــە خــوا ئەنجامــی کــردەوەی هــەر یەکێــک بــە خاوەنەکــەی دەداتــەوە. لەبــەر ئــەوە دەفەرمــوێ:

يَوۡمَ تَجِدُ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا عَمِلَتۡ مِنۡ خَيۡرٖ مُّحۡضَرٗا وَمَا عَمِلَتۡ
مِن سُوٓءٖ تَوَدُّ لَوۡ أَنَّ بَيۡنَهَا وَبَيۡنَهُۥٓ أَمَدَۢا بَعِيدٗاۗ وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ
نَفۡسَهُۥۗ وَٱللَّهُ رَءُوفُۢ بِٱلۡعِبَادِ ٣٠ قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ
فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ
رَّحِيمٞ ٣١ قُلۡ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَۖ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ
ٱلۡكَٰفِرِينَ ٣٢ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰٓ ءَادَمَ وَنُوحٗا وَءَالَ إِبۡرَٰهِيمَ
وَءَالَ عِمۡرَٰنَ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ٣٣ ذُرِّيَّةَۢ بَعۡضُهَا مِنۢ بَعۡضٖۗ وَٱللَّهُ
سَمِيعٌ عَلِيمٌ ٣٤ إِذۡ قَالَتِ ٱمۡرَأَتُ عِمۡرَٰنَ رَبِّ إِنِّي نَذَرۡتُ لَكَ
مَا فِي بَطۡنِي مُحَرَّرٗا فَتَقَبَّلۡ مِنِّيٓۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ٣٥
فَلَمَّا وَضَعَتۡهَا قَالَتۡ رَبِّ إِنِّي وَضَعۡتُهَآ أُنثَىٰ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا وَضَعَتۡ
وَلَيۡسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلۡأُنثَىٰۖ وَإِنِّي سَمَّيۡتُهَا مَرۡيَمَ وَإِنِّيٓ أُعِيذُهَا بِكَ
وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ٣٦ فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ
حَسَنٖ وَأَنۢبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنٗا وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّاۖ كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيۡهَا
زَكَرِيَّا ٱلۡمِحۡرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزۡقٗاۖ قَالَ يَٰمَرۡيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَاۖ
قَالَتۡ هُوَ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِۖ إِنَّ ٱللَّهَ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيۡرِ حِسَابٍ ٣٧

﴿يَوۡمَ تَجِدُ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا عَمِلَتۡ مِنۡ خَيۡرٖ مُّحۡضَرٗا﴾ واتە: (ڕۆژێک دێت هەموو کەس دەبینێت هەر کارێکی خێری کردبێ ئامادەیە) هەموو کردەوەکانی دەبینێتەوە، تەنانەت بەقەد مسقاڵە زەڕرەیەکیش کەمی نەکردوە، وەکو چۆن خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿فَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٍ خَيۡرٗا يَرَهُۥ ٧﴾الزلزلة. (الخير): ناوێکی کۆکەرەوەیە بۆ هەموو کردەوەیەکی چاک بچووک بێت یان گەورە لە خوا نزیکت بکاتەوە. هەروەک (السوء) ناوێکی کۆکەرەوەیە بۆ هەموو کردەوەیەکی خراپ بچووک بێت یان گەورە ببێتە مایەی توورەیی خوا ﷻ ﴿وَمَا عَمِلَتۡ مِن سُوٓءٖ تَوَدُّ لَوۡ أَنَّ بَيۡنَهَا وَبَيۡنَهُۥٓ أَمَدَۢا بَعِيدٗا﴾ واتە: (وە هەر کارێکی خراپی کردبێ، ئاوات دەخوازێت لە نێوان ئەوو کارە خراپەکەیدا) ماوەیەکی زۆر دوور ببوایە، ئەمەش لەبەر زۆر خەفەت خواردنو دڵ تەنگ بوونیەتی لە ئەنجامی ئەو کارانە، دەی با بەندە ئاگادار بێ لە ئەنجامدانی کردەوەی خراپ، کە سەرنجام تووشی خەفەتو دڵتەنگی دەبێت، با هەتا توانای هەیە وازی لێبهێنێ پێش ئەوەی بڵێ: ﴿أَن تَقُولَ نَفۡسٞ يَٰحَسۡرَتَىٰ عَلَىٰ مَا فَرَّطتُ فِي جَنۢبِ ٱللَّهِ ٥٦﴾الزمر، (واتە: ئەی مەخابن لەسەر ئەوەی کەمتەرخەمیم کرد بۆ گەیشتن بە نزیکی لە خوا)، ﴿يَوۡمَئِذٖ يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَعَصَوُاْ ٱلرَّسُولَ لَوۡ تُسَوَّىٰ بِهِمُ ٱلۡأَرۡضُ ٤٢﴾النساء، (واتە: لەو ڕۆژەدا بێبڕوایانو ئەوانەی سەرپێچی پێغەمبەریان کردوە خۆزگە دەخوازن بە زەویەوە تەخت کرابان)، ﴿وَيَوۡمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيۡهِ يَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي ٱتَّخَذۡتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلٗا ٢٧ يَٰوَيۡلَتَىٰ لَيۡتَنِي لَمۡ أَتَّخِذۡ فُلَانًا خَلِيلٗا ٢٨﴾الفرقان، (واتە: ڕۆژێکە کە ستەمکار گەز دەکات بە هەردوو دەستی خۆیداو دەڵێ خۆزگە لەگەڵ پێغەمبەردا ڕێگەی ڕاستم بگرتایە بەر، ئای تیاچوون بۆ من خۆزگە فلان کەسم نەکردایە بە هاوەڵو خۆشەویستی خۆم). هەروەها فەرموویەتی: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَنَا قَالَ يَٰلَيۡتَ بَيۡنِي وَبَيۡنَكَ بُعۡدَ ٱلۡمَشۡرِقَيۡنِ فَبِئۡسَ ٱلۡقَرِينُ ٣٨﴾الزخرف، (واتە: هەتا کاتێ (دەمرێ)و دێتەوە لامان دەڵێ: خۆزگە نێوانی منو تۆ

بە قەد نێوانی ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا بووایە، ئای چ هاوڕێیەکی خراپ بوویت)، جا سوێند بەخوا واز هێنان لە هەموو حەزوو ئارەزوو و لەززەتێک ئەگەر چی چەندە گرانو ئەستەم بێت بەسەر نەفسو دەروونندا، ئاسانترە لە موعاناتو ناخۆشی ڕۆژی دوایی، بەڵام ئینسان بەهۆی زوڵم ستەمو نەفامیەوە تەنها تەماشای ئێستا دەکات، عەقڵێکی کامڵو تەواوی نیە تێبینی سەرەنجامی کاروبارەکان بکات، تا پێشی بخات ئەوەی سوودی هەیە بۆی چی لە ئێستادا چی لە داهاتوودا، وە دوور بکەوێتەوە لەوەی زیانی هەیە بۆی لە ئێستاو لە داهاتوودا، پاشان خوای گەورە دووبارە ئاگادارمان دەکاتەوە بە نەفسی خۆی، وەکو بەزەییو میهرەبانییەک بۆمان، لەبەر ئەوەی زۆرمان بەسەردا تێنەپەڕی ئەوسا دڵمان ڕەق ببێ، وە بۆ ئەوەی بۆمان کۆبکاتەوە لە نێوان هاندانێکی پێویستو بۆ ئومێدو کردەوەی چاک، وە ترساندنێکی پێویست بۆ واز هێنان لە گوناهو تاوان، فەرموویەتی: ﴿وَيُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفْسَهُ ۗ وَاللَّهُ رَءُوفٌ بِالْعِبَادِ﴾ داوا لە خوا دەکەین منەتی خۆی بکات بەسەرماندا، بەوەی وریا بین لێی بە بەردەوام، هەتا کردەوەیەک نەکەین ببێتە مایەی توورەییو خەشمو قینی.

(٣١): ﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (٣١)﴾:

ئەم ئایەتە پێویست بوونی خۆشەویستی خوای تێدایە، وە نیشانەو دەرئەنجامو بەرهەمەکانیشی، جا فەرموویەتی: ﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ﴾ واتە: ئەگەر ئێوە بانگەشەی ئەم پلە بەرزە دەکەن، هیچ پلەیەکی دیکە لەسەرووی ئەوەوە نیە، تەنها بانگەشە بەس نیە تیایدا، بەڵکو پێویستە ڕاستگۆی بێت لە وتنیدا، نیشانەی ڕاستگۆیی شوێنکەوتنی پێغەمبەرە ﷺ لە هەموو کارووبارەکانیدا، لە وتەکانو کردەوەکانیدا، لە بنچینەکانی ئاینو لقو پۆکانی، بە ئاشکراو بە پەنهان، هەرکەسێک شوێنی پێغەمبەر ﷺ بکەوێت، ئەوە سەلماندویەتی خوای خۆش دەوێ، خوای گەورەش ئەوی خۆش دەوێ، لەگوناهەکانیشی دەبووری، میهرەبانی خۆی دەبارێنێ بەسەریدا، ڕاستو ڕەوانی دەکات لە هەموو جوڵانو وەستانیدا، هەرکەسێ شوێنی پێغەمبەر نەکەوتبێ ئەوە خوای خۆش ناوێ، چونکە خۆشویستنی خوا شوێنکەوتنی پێغەمبەرەکەی لەسەر پێویست دەکات، ئەگەر شوینکەوتن نەبوو بەڵگەیە لەسەر نەبوونی خۆشەویستی، ئەو کەسە درۆ دەکات ئەگەر بانگەشەی بۆ بکات، لەگەڵ ئەوەدا بانگەشە سوودی نیە، بەبێ مەرجەکەی، بەم دەقە هەموو دروستکراوەکان دەپێورێت، جا بەئەندازەی شوینکەوتنیان بۆ پێغەمبەر ﷺ خۆشویستنو ئیمانیان هەیە بەخوا، وە بە پێچەوانەشەوە چەندە شوێنکەوتنی کەمتر بێت، ئەوەند کەمتر خوای خۆش دەوێت.

(٣٢): ﴿قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا فَإِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْكَافِرِينَ (٣٢)﴾:

ئەمە فەرمانە لەلایەن خوای مەزنەوە بۆ بەندەکانی بە فەرمانێکی گشتی، ئەویش گوێڕایەڵی خواو

پێغەمبەرەكەیەتی، كە ئیمانو یەكتاپەرستی دەچنە نێویەوە، وە ئەوەیشی لە لقو پۆكانی ئیمانو یەكتاپەرستیە لە كردەوەكانو وتە ئاشكراو پەنهانەكاندا، بەڵكو دەچێتە ناو گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەكەی دوور كەوتنەوە لە هەموو ئەوانەی قەدەغەیان كردوە، چونكە دوور كەوتنەوە لێیان بەجێهێنانی فەرمانی خواو پێغەمبەرەكەیەتی، هەركەسێ گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەكەی بكا ئەوە لە سەركەوتووانە، ﴿ فَإِن تَوَلَّوْا ﴾ واتە: پشتیان هەڵكرد لە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەكەی، هیچ شتێكی تر نیە بگەڕێنەوە بۆلای تەنها كوفرو هەموو شەیتانێكی یاخیو دوورخراوە نەبێ، ﴿ كُتِبَ عَلَيْهِ أَنَّهُۥ مَن تَوَلَّاهُ فَأَنَّهُۥ يُضِلُّهُۥ وَيَهْدِيهِ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٤﴾ ﴾الحج، (واتە: لەسەری نووسراوە (بڕیار دراوە) كە بێگومان هەر كەسێک خۆشی بوێ (شوێنی بكەوێ) ئەوە بە ڕاستی گومڕای دەكات، وە ڕێنمایی خەڵک دەكات بۆ سزای ئاگری هەڵگیرساوی دۆزەخ). لەبەر ئەمە فەرموویەتی: ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴾ (واتە: بێگومان خوای گەورە بێبڕوایانی خۆش ناوێ ) بەڵكو ڕقی لێیانەو خەشمو قینی خۆی دادەبارێنێ بەسەریاندا، وە بە توندترین شێوە سزایان دەدات، وەک ئەوەی ئەم دەقە پیرۆزە ڕوونكردنەوەو لێكدانەوەی شوێنكەوتنی پێغەمبەری خوا بێ، ئەوەش بە گوێڕایەڵی خواو گوێڕایەڵی پێغەمبەرەكەی دەبێ، ئەمە شوێنكەوتنی ڕاستەقینەیە.

پاشان خوای بەرز دەفەرموێ:

(٣٣-٣٧): ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰٓ ءَادَمَ وَنُوحًا وَءَالَ إِبْرَٰهِيمَ وَءَالَ عِمْرَٰنَ عَلَى ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٣٣﴾ ذُرِّيَّةًۢ بَعْضُهَا مِنۢ بَعْضٍ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٣٤﴾ إِذْ قَالَتِ ٱمْرَأَتُ عِمْرَٰنَ رَبِّ إِنِّى نَذَرْتُ لَكَ مَا فِى بَطْنِى مُحَرَّرًا فَتَقَبَّلْ مِنِّىٓ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٥﴾ فَلَمَّا وَضَعَتْهَا قَالَتْ رَبِّ إِنِّى وَضَعْتُهَآ أُنثَىٰ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ وَلَيْسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلْأُنثَىٰ ۖ وَإِنِّى سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ وَإِنِّىٓ أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيْطَـٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٣٦﴾ فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٍ وَأَنۢبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا ۖ كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا ٱلْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًا ۖ قَالَ يَـٰمَرْيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَـٰذَا ۖ قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٧﴾ ﴾

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰٓ ءَادَمَ وَنُوحًا وَءَالَ إِبْرَٰهِيمَ وَءَالَ عِمْرَٰنَ عَلَى ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴾خوای گەورە هەواڵ دەدات بە هەڵبژاردنی ئەوەی هەڵیبژاردوە لە دۆستانو پاڵفتەكراوانو خۆشەویستانی، واتە: خۆشەویستانی خۆی، وە هەواڵی داوە كە ئەو ئادەمی هەڵبژاردوەو ڕێزداری كردوە، واتە: هەڵیبژاردووە بەسەر سەرجەم بەدیهێنراوەكاندا، بە دەستەكانی خۆی دروستی كردوەو لە ڕووحی خۆیەوە فووی بەبەردا كردوە، وە فەرمانی بە فریشتەكان كردوە كڕنووشی بۆ بەرن، وە لە بەهەشتدا جێنشینی كردوە، وە زانستو لەسەرخۆییو فەزڵو چاكەی داوە بەسەر هەموو بەدیهێنراوەكاندا، لەبەرئەمەیشە فەزڵی

نەوەکانیشی داوە، وەکو فەرموویەتی: ﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٖ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلٗا ﴿٧٠﴾ ﴾الإسراء (واتە: سوێند بە خوا بێگومان ڕێزمان لە نەوەی ئادەم گرت، لە وشکانیو دەریادا هەڵمان گرتن، وە ڕۆزی پاکو خاوێنمان پێداون، وە فەزڵمان داون بەسەر زۆرێک لەو شتانەی کە دروستمان کردوون بە فەزڵێکی گەورە).

وە نووحی هەڵبژاردووەو کردوویەتی بە یەکەمین نێردراوی سەر زەمین کاتێ کە بتەکان پەرستراون، وە سەرکەوتووی کردوە لە ئارامگرتنو سوپاسگوزاریو دەعوەو بانگەواز بۆلای خوا ﷻ لە هەموو کاتەکاندا، ئەمەش بووەتە مایەی هەڵبژاردنو ڕێزلێنانی، وە خوا خەڵکی زەوی نغرۆ کرد بە هۆی نزاو پاڕانەوەی نووحەوە، وە ئەوانەی لەگەڵ نووح دابوون ڕزگاری کردوون، لەو کەشتیەی کە پڕ بوو (لە مرۆڤو هەموو جۆرە گیاندارێک)، تەنها نەوەکانی نووحی هێشتنەوە لەسەر زەوی، وە خوا سوپاسو ستایشی بۆ هێشتەوە، کەلە هەموو کاتو سەردەمێکدا وەسف دەکرێ.

وە ئیبراهیمی هەڵبژاردوە، ئەویش ئیبراهیمی دۆستو خۆشەویستی خوایە، کە تایبەتی کردوە بە خۆشەویستی خۆیو پلەو پایەی(خلة) پێبەخشیوە، نەفسی خۆی ڕووبەڕووی ئاگر کردەوە، منداڵەکەی کردە قوربانی،ماڵو سامانەکەیشی تەرخان کرد بۆ میوانان، بە درێژایی شەو ڕۆژ دەپاڕایەوە بە ئاشکراو بەنهێنی، خوا ﷻ کردوویەتی بە سەرمەشقو پێشەوا بۆ دوای خۆی، وە لەنەوەی ئەودا پێغەمبەرانی داناوەو کتێبی بۆناردوون، مەبەست لە خانەوادەی ئیبراهیم: هەموو ئەو پێغەمبەرانە دەگرێتەوە کە نێردراون لە دوای ئەو، چونکە هەموویان لەنەوەی ئەون، وە خوا ﷻ تایبەتی کردوون بە جۆرەها فەزڵو چاکە هەتا پێی بوون بە بەڕێزترینو گوڵبژێری بەدیهێنراوەکان،

لە نێوانیاندا گەورەو سەرمەشقی نەوەکانی ئادەم پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ بەڕاستی خوای گەورە لەئەودا هەموو سیفەتە تەواوەکانی کۆکردەوە، کە پەرتەوازە بوو لەلای بەدیهێنراوەکان، ئەو پێشەوا مەزنە لە نەوەی ئیبراهیمە ؈.

وە خوا ﷻ خانەوادەی عیمرانی هەڵبژاردو ڕێزداری کردن، کە ئەویش باوکی مەریەمی کچی عیمرانە، یان باوکی مووسای کوڕی عیمرانە سەلامی خوای لێبێ، بەڕاستی ئەم ماڵانە کە خوا ﷻ باسی کردوون هەڵبژاردەو گوڵبژێری ناو هەموو جیهانن،

خوا ﷻ چاکسازییو سەرکەوتنی نەوەی پێغەمبەرانی بە ڕیزبەندی هێناوە: ﴿ ذُرِّيَّةَۢ بَعْضُهَا مِنۢ بَعْضٖ ﴾ (واتە: نەوەیەکن هەندێکیان لە هەندێکیان کەوتوونەتەوە) گونجانو لەیەکچوون

هەیە لە نێوانیاندا، لە دروستکردنو خوورەوشتی جوان، هەروەکو چۆن خوا ﷻ کاتێ کە باسی کۆمەڵێ لە پێغەمبەرانی کردوە، لە چوارچێوەی ئەم ماڵە گەورەو مەزنانەدا فەرمووییەتی: ﴿وَمِنْ ءَابَآئِهِمْ وَذُرِّيَّـٰتِهِمْ وَإِخْوَٰنِهِمْ ۖ وَٱجْتَبَيْنَـٰهُمْ وَهَدَيْنَـٰهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٨٧﴾﴾الأنعام (واتە: وە هەر لە وەچەی وی بوون، زۆرێک لە باب‌و باپیرانیان‌و وەچەیان‌و برایەکانیان، وە هەڵمان بژاردن‌و بەرەو ڕاستە ڕێ ڕێنماییمان کردن). ﴿وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ خوا دەزانێ کێ شایستەی هەڵبژاردنە هەڵیبژاردووە، وە ئەوەیشی شایستەی ئەوە نیە ڕیسواو سەرشۆڕی دەکات، ئەمە بەڵگەیە لەسەرئەوەی ئەو پێغەمبەرانە خوا ﷻ هەڵیبژاردوون چونکە زانیویەتی ئەوان شایستەی ئەو مەقامەن، فەزڵ‌و چاکەی خۆی ڕشتووە بەسەریاندا.

لە سوودو و حیکمەتی ئەو چیرۆکەی بۆی باسکردووین دەربارەی هەواڵی پێغەمبەرانی پاڵفتەکراو ئەوەیە ئێمە خۆشمان بوێن‌و پەیرەویان بکەین، وە داوا بکەین لە خوا ﷻ سەرکەوتوومان بکات وەکو چۆن ئەوانی سەرکەوتوو کردوە، وە بەردەوام بەو شێوە تەماشای خۆمان بکەین کە ئێمە لە خواری ئەوانەوەین، ناتوانین ببینە خاوەنی سیفاتە بەرزوو جوانەکانی ئەوان، دیارە ئەمەش لە بەزەیی خوایە بۆ ئەوان، دەرخستنی پیاهەڵدانی ئەوانە لە لای پێشین‌و دوایین، ئای لە بەخشین‌و سەخاوەت‌و بەزەیی خوا چەندە گەورەیە!! ئای چ سوودو قازانجێکی زۆر لە مامەڵە کردن لەگەڵ خوادا بەدەست دێت!! ئەگەر خوا جگە لەو ستایش کردن‌و باس کردنەی ڕێزی ئەوان بۆ خەڵکی تا هەتایەو، باس کردنی ڕەوشت‌و ئاکاری جوانیان تا ئەبەد هیچی تریان پێ نەدا ئەوە ئەو فەزڵ‌و گەورەییە هەموو شتێکە بۆ ئەوان.

کاتێ باسی فەزڵ‌و چاکەی ئەم ماڵە بەڕێزانەی کردوە، دوای دێتە سەر باسی ئەوانەی کە بەسەر مەریەمی دایکی عیسادا هاتووە، وە چۆن خوا ﷻ بەبەزەیی بووە لەگەڵیدا لە پەروەردە کردن‌و پێگەیاندنیدا، فەرموویەتی: ﴿إِذْ قَالَتِ ٱمْرَأَتُ عِمْرَٰنَ﴾ واتە: دایکی مەریەم کاتێ کە سکپڕ بوو: ﴿رَبِّ إِنِّى نَذَرْتُ لَكَ مَا فِى بَطْنِى مُحَرَّرًا﴾ واتە: ئەوەی لە ناو سکمدایە نەزرم کردوە بۆ تۆ، بۆ خزمەتکردنی ماڵەکەی تۆ ﴿فَتَقَبَّلْ مِنِّىٓ﴾ واتە: دە تۆش ئەم کارە پیرۆزەم لێ وەربگرە ﴿إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴾ (واتە: بەڕاستی تۆ بیسەری دوعاکانی منی، وە لە نیازو مەبەستم دەزانی، ئەمە لە کاتێکدا مەریەم لە سکیدا بوو پێش ئەوەی دایبنا ﴿فَلَمَّا وَضَعَتْهَا قَالَتْ رَبِّ إِنِّى وَضَعْتُهَآ أُنثَىٰ﴾ (جا کاتێک کە سکەکەی دانا وتی: پەروەردگارم خۆ من کچم بوو)، وەک ئەوەی چاوی لەوەبێ کوڕ بێ، چونکە بەتوانا ترە بۆ خزمەتکردن‌و پلەوپایەی بەرزتر ، لە قسەکەیدا جۆرێک لە پاساو هێنانەوە بەدی دەکرێ بۆ پەروەردگاری، خوا فەرمووی: ﴿وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ﴾

واتە: پێویست بە ڕاگەیاندنی ناکات، بەڵکو زانستی خوا پەیوەستە پێیەوە، بەر لەوەی دایکی بزانێ چیە ﴿وَلَيْسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلْأُنثَىٰ وَإِنِّى سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ﴾(واتە: کوڕیش وەک کچ نیە، بێگومان منیش ناوم نا مەریەم)، ئەم دەقە بەڵگەیە لەسەر فەزڵی نێر بەسەر مێ، وە بەڵگەیە لەسەر ناونان لەکاتی لەدایک بووندا، وە لەسەرئەوەی دایک دەتوانێ ناوی منداڵەکەی بنێ ئەگەر باوک پێی ناخۆش نەبێ ﴿وَإِنِّىٓ أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾ دوعای بۆ خۆیو کۆرپەکەی کرد کە خوا بیانپارێزێ لە شەیتانی نەفرین لێکراو ﴿فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٍ﴾ واتە: ئەو نەزرەی دایکی مەریەم کردبووی خوا قبووڵی کرد،وە مەریەمو منداڵەکەی پاراست لە شەیتان ﴿وَأَنۢبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا﴾ واتە: بە پەروەردەیەکی چاکو جوان پێی گەیاند، لە ڕووی بەدیهێنانو خووڕەوشتەوە، زەکەریاشی کرد بە چاودێرو سەرپەرشتیاری ﴿وَكَفَّلَهَا﴾ زەکەریا سەرپەرشتی ئەو منداڵەی کردکە مەریەم بوو، ئەمەش لە سۆزو بەزەیی خوایە بۆ ئەوەی پەروەردەی بکات بە باشترین شێوە، ئەویش بە عیبادەتی خوا پێگەیشت پێشی هەموو ئافرەتانی تر کەوت، یەکلا بوویەوە بۆ بەندایەتی کردنی پەروەردگاری، پەیوەست بوو بە شوێنی نوێژەکەیەوە، ﴿كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا ٱلْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًا﴾ (هەر کات زەکەریا بڕۆشتایە سەردانی مەریەم بکردیایە لە شوێنی خوا پەرستیەکەیدا خۆراکی لەلا دەبینی)، واتە: خۆراکێکی لەلا دەبینی بەبێ هەوڵو ماندووبوون، بەڵکو ڕزقو ڕۆزییەک بوو خوا بۆی فەراهەم هێنابوو، وە ڕێزێک بوو خوا ﷻ پێی بەخشیبوو، زەکەریا پێی ووت: ﴿أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَا قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ﴾ (ئەمەت لە کوێ بوو؟ مەریەم ووتی: ئەوە لەلایەن خواوەیە)، بە فەزڵو چاکەی خۆی ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ واتە: بەبێ ئەوەی بەندە هەستی پێ بکاو هەوڵی بۆ بدا، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا ۝٢ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ﴾ الطلاق، (واتە: وە هەر کەسێک پارێزکار بێ خوا دەروی لێ دەکاتەوە، وە ڕزقو ڕۆزی دەدات لەلایەکەوە کە بەخەیاڵیدا نەهاتووە). ئەم ئایەتە دەبێتە بەڵگە بۆ چەسپاندنی کەرامەتو ڕێزی دۆستانی خوا ﷻ کە لەدەرەوەی عادەتو نەریتە، هەروەکو چۆن بە موتەواترو یەک لەدوای یەک فەرموودەیەکی زۆر دەربارەی ئەو بابەتە هاتووە، بە پێچەوانەی ئەوەی کە ڕەتی دەکاتەوە، کاتێ زەکەریا عليه السلام ئەو فەزڵو منەتەی خوای بینی بەسەر مەریەمەوە لەگەڵ ئەو هەموو ڕێزەدا لە ڕزقو ڕۆزی خۆش کە خوا ﷻ پێی بەخشیوە بەبێ هەوڵو ماندووبوون، ئارەزووی ئەوەی کرد کە خوا منداڵێکی پێ بدات، لەبەر ئەمە خوای ﷻ دەفەرموێ:

هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُۥ قَالَ رَبِّ هَبْ لِي مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةً
طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ الدُّعَاءِ ﴿٣٨﴾ فَنَادَتْهُ الْمَلَائِكَةُ وَهُوَ قَائِمٌ
يُصَلِّي فِي الْمِحْرَابِ أَنَّ اللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَىٰ مُصَدِّقًا بِكَلِمَةٍ
مِّنَ اللَّهِ وَسَيِّدًا وَحَصُورًا وَنَبِيًّا مِّنَ الصَّالِحِينَ ﴿٣٩﴾ قَالَ رَبِّ
أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَامٌ وَقَدْ بَلَغَنِيَ الْكِبَرُ وَامْرَأَتِي عَاقِرٌ قَالَ
كَذَٰلِكَ اللَّهُ يَفْعَلُ مَا يَشَاءُ ﴿٤٠﴾ قَالَ رَبِّ اجْعَل لِّي آيَةً
قَالَ آيَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ النَّاسَ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ إِلَّا رَمْزًا وَاذْكُر
رَّبَّكَ كَثِيرًا وَسَبِّحْ بِالْعَشِيِّ وَالْإِبْكَارِ ﴿٤١﴾ وَإِذْ قَالَتِ
الْمَلَائِكَةُ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَاكِ وَطَهَّرَكِ وَاصْطَفَاكِ
عَلَىٰ نِسَاءِ الْعَالَمِينَ ﴿٤٢﴾ يَا مَرْيَمُ اقْنُتِي لِرَبِّكِ وَاسْجُدِي
وَارْكَعِي مَعَ الرَّاكِعِينَ ﴿٤٣﴾ ذَٰلِكَ مِنْ أَنبَاءِ الْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ
وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلَامَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ
وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يَخْتَصِمُونَ ﴿٤٤﴾ إِذْ قَالَتِ الْمَلَائِكَةُ
يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِّنْهُ اسْمُهُ الْمَسِيحُ عِيسَى
ابْنُ مَرْيَمَ وَجِيهًا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَمِنَ الْمُقَرَّبِينَ ﴿٤٥﴾

(٣٨-٤١): ﴿هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُۥ قَالَ رَبِّ هَبْ لِي مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ الدُّعَاءِ ﴿٣٨﴾ فَنَادَتْهُ الْمَلَائِكَةُ وَهُوَ قَائِمٌ يُصَلِّي فِي الْمِحْرَابِ أَنَّ اللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَىٰ مُصَدِّقًا بِكَلِمَةٍ مِّنَ اللَّهِ وَسَيِّدًا وَحَصُورًا وَنَبِيًّا مِّنَ الصَّالِحِينَ ﴿٣٩﴾ قَالَ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَامٌ وَقَدْ بَلَغَنِيَ الْكِبَرُ وَامْرَأَتِي عَاقِرٌ قَالَ كَذَٰلِكَ اللَّهُ يَفْعَلُ مَا يَشَاءُ ﴿٤٠﴾ قَالَ رَبِّ اجْعَل لِّي آيَةً قَالَ آيَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ النَّاسَ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ إِلَّا رَمْزًا وَاذْكُر رَّبَّكَ كَثِيرًا وَسَبِّحْ بِالْعَشِيِّ وَالْإِبْكَارِ ﴿٤١﴾﴾:

دەفەرمــوێ: ﴿هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُۥ قَالَ رَبِّ هَبْ لِي مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ الدُّعَاءِ ﴿٣٨﴾ فَنَادَتْهُ الْمَلَائِكَةُ وَهُوَ قَائِمٌ يُصَلِّي فِي الْمِحْرَابِ﴾ (واتــە: زەکەریــا عليه السلام لــە پەروەردگــاری پاڕایــەوە کــە کوڕێکــی سروشــت پاکــی پــێ ببەخشــێ، واتــە: خووڕەوشــتی پــاک بــێ، ئــەدەبو ئــاکاری جــوان بــێ، بــۆ ئــەوەی بــە هۆیانــەوە بەخششــەکانی دنیــاو دوا ڕۆژی پــێ تــەواو بــکات، خــواش دوعاکــەی گیراکــرد، کاتــێ کــە ئــەو لــە میحــراب لــە شــوێنی نوێژەکەیــدا پەرستشــی دەکــرد، فریشــتەکان بانگیــان کــردو وتیــان:

﴿أَنَّ اللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَىٰ مُصَدِّقًا بِكَلِمَةٍ مِّنَ اللَّهِ﴾ (بــە ڕاســتی خــوا مــوژدەت دەداتــێ (بــە کوڕێــک) کــە نــاوی یەحیایــە، بەڕاســتدانەری ) عیســا عليه السلام، چونکــە عیســا بــە وشــەی خــوا لــە دایــک بــووە ﴿وَسَيِّدًا﴾ واتــە: ئــەو کــوڕە پێشــەوایە، واتــە سیفاتە جوانــەکان بەدەســت دەهێنــێ، ئــەو ســیفاتانەی کــە شایســتەی ئــەوەن پێــی ببــێ بــە ســەیدو گــەورە، بــۆ هەمــوو کاروبــارەکان بگەڕێنەوە بــۆلای ئــەو ﴿وَحَصُورًا﴾(واتە: وە جڵەوگــری نەفســی خۆیەتــی) ڕێگــری لێکــراوە بچێتــە لای ئافرەتانــەوە، لــە دڵیــدا هیــچ ئارەزوویەکــی نیــە بــۆ ئافرەتــان، چونکــە ســەرقاڵ بەخزمــەت کــردنو پەرســتنی

پەروەردگـــاری ﴿وَنَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ﴾ (واتــە: یەکێکــە لــە پێغەمبەرانــی چــاک کــردار)، چ موژدەیــەک مەزنتــرە لــە موژدەپێدانــی ئــەم منداڵــە، تەنهــا بوونــی ئــەو منداڵە خــۆی لــە خۆیــدا موژدەیــە، چونکــە خاوەنــی سـیفاتی بــەرزوو تــەواوە وە یەکێکیشــە لــە پێغەمبــەرە پایــەدارەکان، زەکەریــاش لــە ئــەو پــەڕی خۆشـیدا وتــی: ﴿رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَـٰمٌ وَقَدْ بَلَغَنِيَ ٱلْكِبَرُ وَٱمْرَأَتِي عَاقِرٌ﴾ (واتــە: زەکەریــا وتــی: ئــەی پەروەردگــارم مــن چــۆن منداڵــم دەبێــت لــە کاتێکــدا بەڕاسـتی پیــری یەخــەی گرتــووم وە ژنەکەیشــم نەزۆکــە) هەریــەک لــەم دوو شــتە(پیریو نــەزۆک بــوون) ڕێگــرن لــە هاتنــە بوونــی منــداڵ، جــا ئەگـــەر هـــەردوو هۆکارەکـــە بەیەکـــەوە بوونیـــان هەبـــوو بـــەم حاڵـــەوە منــداڵ چــۆن دەبــێ؟ خــوا هەواڵــی پێــدەدا کــە ئــەم منــداڵ بوونــەی بــە شــێوەیەکە لــە عـــادەتو نەریـــت بەدەرە(خارقــا للعـــادە)، ﴿كَذَٰلِكَ ٱللَّهُ يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ﴾(کاری خــوا بــەو شــێوەیەیە چــی بــوێ دەیــکا) هەروەکــو چــۆن خــوا ﷻ بوونــی منداڵــی گرێــداوە بــە هۆکارەکانــەوە کــە یەکێــک لەوانە(پیتاندنــی هێلکــەی ئافرەتــە لەلایــەن تــۆوی پیاوەکەیــەوە)، ئەگــەر بیــەوێ بەدیبهێنــێ بەبــێ هیــچ هۆکارێــک، ئــەوە بێگومان دەیهێنێتــە بــوون، چونکــە هیــچ شــتێکی لێگیــر نابــێ، جــا زەکەریــا پەلــەی کــرد لــەم کارەدا بۆئــەوەی دڵ ئارامــی تــەواو بەدەســت بهێنــێ، وتــی: ﴿رَبِّ ٱجْعَل لِّيٓ ءَايَةً﴾ واتــە: پەروەردگــار! نیشــانەیەکم بــۆ دابنــێ لەســەر بوونــی ئــەم منداڵــە، خــواش پێــی فەرمــوو: ﴿قَالَ ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَـٰثَةَ أَيَّامٍ إِلَّا رَمْزًا﴾ واتـــە: زمانـــت دەبەســـترێ لەقســەکردن لەگــەڵ خەڵکیــدا، بــێ ئــەوەی هیــچ بــەلاو ئافاتــێ بەســەر زمانتــدا هاتبــێ، توانــات نیــە قســەیان لەگەڵــدا بکــەی تەنهــا بــە ئامــاژەو هێمــا نەبــێ، ئەمــە نیشــانەیەکی گەورەیــە کــە نەتوانــی قســەبکەی، وە هۆکارێکــی سەرســووڕهێنەرە، ئەویــش ئەوەیــە کــە وەک چــۆن ڕێگــری کــرد لــە هــۆکارەکان لەگــەڵ بوونیانــدا، هــەر ئــەو دەیهێنێتــە بــوون بەبــێ هــۆکار، بۆئــەوەی ئــەوە ببێتــە بەڵگــە کــە هەمــوو هــۆکارەکان دەچنــەوە نێــو قــەزاو قــەدەری خۆیــەوە، جــا ڕێگــری لێکــرد لــە قســەکردن بۆمــاوەی ســێ ڕۆژ، وە فەرمانــی پێکــرد زۆر یــادی پەروەردگــاری بــکات لــە ئێــوارانو بەیانیــان، تــا کاتــێ هاتــە دەر لــە شــوێنی نوێژەکەیــەوە بــۆ نــاو خەڵکەکــە.

﴿فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ أَن سَبِّحُوا۟ بُكْرَةً وَعَشِيًّا ﴿١١﴾﴾مریــم، (بــە ئامــاژە بــە گەلەکــەی وت: بەیانیـــانو ئێـــواران زیکـــری خـــوا بکـــەن)، لـــە ســـەرەتای ڕۆژو کۆتاییەکـــەی.

(٤٢-٤٤): ﴿ وَإِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ يَـٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰكِ وَطَهَّرَكِ وَٱصْطَفَىٰكِ عَلَىٰ نِسَآءِ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٤٢﴾ يَـٰمَرْيَمُ ٱقْنُتِى لِرَبِّكِ وَٱسْجُدِى وَٱرْكَعِى مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴿٤٣﴾ ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلَـٰمَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يَخْتَصِمُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾:

خـوای گـەورە ئامـاژە بـە بـەرزی پلـەو پایـە مەریـەم دەکات، وە فریشـتەکان دەربـارەی ئـەم گەورەییـە لەگەڵـی دەدوێـنو پێـی دەڵێـن: ﴿ يَـٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰكِ ﴾ واتـە: تـۆی هەڵبـژاردووە، ﴿ وَطَهَّرَكِ ﴾ وە پاکـی کردیتیـەوە لـە هەمـوو ئـەو شـتانەی کـە ناتـەواون ﴿ وَٱصْطَفَىٰكِ عَلَىٰ نِسَآءِ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴾ (واتـە: هەڵیبـژاردووی لەنـاو ئافرەتانـی جیهانـدا) هەڵبژاردنـی یەکەمیـان: دەگەڕێتـەوە بـۆ سـیفاتە جوانـەکانو کـردەوە بەرزەکانـی، وە هەڵبژاردنـی دووەم: دەگەڕێتـەوە بـۆ هەڵبژاردنـی مەریـەم بەسـەر هەمـوو ئافرەتانـی جیهانـەوە، یـان ئـەو جیهانـەی ئـەو تیایـدا ژیـاوە، یـان هەمـوو جیهـان بـە گشـتی، وە ئەگـەر چەنـد ئافرەتێکـی تـر بەشـداری بـکا لـەم فـەزڵو چاکەیـەدا وەکـو خەدیجـەو عائیشـەو فاتیمـە، ئـەو هەڵبژاردنـەی ئایەتەکە باسـی کـردوە هەڵناوەشـێنێتەوە، کاتـێ فریشـتەکان هەواڵیـان ‌دا بـەوەی کـە خـوا هەڵیبـژاردووەو پاکـی کردۆتـەوە، ئەمـە بووبـە نازوونیعمەتێکـی مـەزنو چاکەیەکـی بـێ پایـان کـەوا پێویسـت دەکا لەسـەری سوپاسـگوزارو شـوکرانە بژێربـێ، لەبـەر ئەمەیـە فریشـتەکان پێیـان فەرمـووە: ﴿ يَـٰمَرْيَمُ ٱقْنُتِى لِرَبِّكِ ﴾ (القنـوت): بریتیـە لـە بـەردەوام بوونـی عیبادەتکـردن بـە خۆبەکـەم زانیـنو ملکەچیـەوە ﴿ وَٱسْجُدِى وَٱرْكَعِى مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴾ سـوژدەو چەمانـەوی تایبـەت کـردوە لەبـەر فـەزڵو ڕێزیـان، وەلەبـەر ئـەوەی بەڵگـەن لەسـەر ئەوپـەڕی ملکەچـی بۆخـوا ﷻ، ئـەوەی خـوا ﷻ فەرمانـی بـە مەریـەم کـرد ئەویـش لەبەرانبـەردا شـوکرانە بژێـرو گوێڕایـەڵ بـوو، کاتێـک خـوا هەواڵـی بـە پێغەمبەرەکـەی دا دەربـارەی مەریـەم ﷺ، وە چـۆن هەواڵـی تایبـەت بـە حـاڵو بارودۆخـی مەریەمـی بـۆ گواسـتۆتەوە؟ ئـا ئەمانـە لـە هەواڵـە پەنهـانو غەیبەکانـە، کـە کـەس نایزانـێ تەنهـا بـە وەحـیو نیگـا نەبـێ، خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ ﴾ (ئـەوەی پێـت وتـرا لـە هەواڵـە پەنهانەکانـن بـە وەحـی بـۆت دەنێریـن، وە تـۆ لـە لای ئـەوان نەبوویـت) ﴿ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلَـٰمَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ ﴾ (کاتێـک کـە قەڵەمەکانیـان هاوێشـت کامیـان سەرپەرشـتی مەریەمیـان بەردەکـەوێ)، کاتـێ کـە

دایکـی لەگـەڵ خۆیـدا بـردی بـۆ (بیـت المقـدس) بـۆلای ئەوانـەی کـە کاروباریـان بەدەسـتە، ئەوانیـش دەمەقاڵێیـان کـرد لـە نێـوان یەکتـردا کـە کامیـان دەسـتەبەری مەریەمـی بەردەکـەوێ، لەنـاو یەکتـردا تیرووپشـکیان بۆکـرد، بـەوەی قەڵەمەکانیـان بهاوێـژن بۆنـاو دەریاکـە، جـا هـەر کامیـان قەڵەمەکـەی ئـاو نەیبـرد ئـەوە کەفالەتـی مەریـەم لـە ئەسـتۆ بگـرێ، ئەمـەش بـۆ زەکەریـا ڕوویـدا کـە پێغەمبـەرو باشـترینیانە.
کاتـێ کـە تـۆ هەواڵـت پێـدان ئـەی موحەممـەد ﷺ بـەم هەواڵانـەی کـە نـە تـۆ دەیزانـیو نەگەلەکـەت دەیزانـن، بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی تـۆ ڕاسـتگۆیتو نێـردراوی ڕاسـتەقینەی لـە لایـەن خـواوە، بۆیـە پێویسـتە لەسـەریان ملکەچـی تـۆ بکـەنو فەرمانەکانـت جێبەجـێ بکـەن، هەروەکـو چـۆن خـوای بـەرز فەرموویەتـی: ﴿ وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلْغَرْبِيِّ إِذْ قَضَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَى ٱلْأَمْرَ ﴿٤٤﴾ ﴾ [القصص] (واتـە: تـۆ ئـەی موحەممـەد لـەلای خۆرئـاوای کێـوی طـور نەبوویـت کاتـێ کـە فەرمانـی پێغەمبەرایەتیمـان دا بـە مووسـا).

(٤٥-٥٨): ﴿ إِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِّنْهُ ٱسْمُهُ ٱلْمَسِيحُ عِيسَى
ٱبْنُ مَرْيَمَ وَجِيهًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٤٥﴾ وَيُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِى ٱلْمَهْدِ وَكَهْلًا وَمِنَ
ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٤٦﴾ قَالَتْ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِى وَلَدٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِى بَشَرٌ قَالَ كَذَٰلِكِ ٱللَّهُ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ
إِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٤٧﴾ وَيُعَلِّمُهُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ
﴿٤٨﴾ وَرَسُولًا إِلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَنِّى قَدْ جِئْتُكُم بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ أَنِّىٓ أَخْلُقُ لَكُم مِّنَ ٱلطِّينِ
كَهَيْـَٔةِ ٱلطَّيْرِ فَأَنفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيْرًۢا بِإِذْنِ ٱللَّهِ وَأُبْرِئُ ٱلْأَكْمَهَ وَٱلْأَبْرَصَ وَأُحْىِ
ٱلْمَوْتَىٰ بِإِذْنِ ٱللَّهِ وَأُنَبِّئُكُم بِمَا تَأْكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِى بُيُوتِكُمْ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم
مُّؤْمِنِينَ ﴿٤٩﴾ وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَىَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعْضَ ٱلَّذِى حُرِّمَ
عَلَيْكُمْ وَجِئْتُكُم بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿٥٠﴾ إِنَّ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبُّكُمْ
فَٱعْبُدُوهُ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٥١﴾ فَلَمَّآ أَحَسَّ عِيسَىٰ مِنْهُمُ ٱلْكُفْرَ قَالَ مَنْ أَنصَارِىٓ إِلَى ٱللَّهِ
قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَٱشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٥٢﴾ رَبَّنَآ ءَامَنَّا
بِمَآ أَنزَلْتَ وَٱتَّبَعْنَا ٱلرَّسُولَ فَٱكْتُبْنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٥٣﴾ وَمَكَرُوا۟ وَمَكَرَ
ٱللَّهُ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَٰكِرِينَ ﴿٥٤﴾ إِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَىٰٓ إِنِّى مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَىَّ وَمُطَهِّرُكَ مِنَ
ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَجَاعِلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوكَ فَوْقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ثُمَّ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ
فَأَحْكُمُ بَيْنَكُمْ فِيمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٥٥﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَأُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا فِى

ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٥٦﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ
فَيُوَفِّيهِمْ أُجُورَهُمْ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٧﴾ ذَٰلِكَ نَتْلُوهُ عَلَيْكَ مِنَ ٱلْءَايَٰتِ وَٱلذِّكْرِ ٱلْحَكِيمِ
﴿٥٨﴾ ﴾:

﴿ إِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِّنْهُ ٱسْمُهُ ٱلْمَسِيحُ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ ﴾: خـوای بـەرز هـەواڵ دەدات فریشـتەکان مژدەیـان دا بـە مەریـەم ﷺ بـە مەزنتریـن مـژدە، ئەویـش وشـەی خوایـە، وە بەنـدەو نێردراوێتـی عیسـای کـوڕی مەریـەم، نـاو نـراوە بـە وشـەی خـوا، چونکـە بـە وشـەیەک هاتـە بـوون لـە لایـەن خـوای مەزنـەوە، وە لەبـەر ئـەوەی حاڵەتـی بوونەکـەی لـە دەرەوەی هـۆکارەکان بـووە، خـوا کردوویەتی بـە یەکێـک لـە نیشـانەکانی خـۆیو، یەکێـک لـە شـتە سەرسـوڕهێنەرەکانی نێـو درووسـتکراوانی، خـوا جبریـل سـەلامی خـوای لـێ بـێ نـارد بـۆ لای مەریـەم، فـووی کـرد بـە گیرفانـی ئـەو شـتەی کـە مەریـەم بـە خۆیـدا دابـوو، ئـەم فـووە پاکـو خاوێنـە چـووە نێـو لاشـەیو بـڵاو بوویـەوە لەلایـەن ئـەو فریشـتە پـاکو چاکـەوە کە جبریلـە سـەلامی خـوای لێبـێ، خـوا ئـەم ڕووحـە پاکـەی نێـو لاشـەی مەریەمـی گەورە کـردو گەشـەی پێـدا، هـەروەک چـۆن خـوا ئـەو مـاددە ڕووحانیـەی دروسـت کـرد، ئـاواش بـوو بـە کەسـێکی ڕووحانـی، لەبـەر ئـەوە نـاوی نـراوە ڕووحـی خـوا ﴿ وَجِيهًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ﴾ واتـە: خـاوەن ڕێـزو پلـەو پایـەی بـەرزە لـە دنیـاو دواڕۆژدا، خـوا کردوویەتـی بـە یەکێـک لـە پێغەمبەرانـی خـاوەن عـەزم ئەوانـەی خـاوەن شـەریعەتی مـەزنو شـوێنەکەوتوون، وە ناوبانگـی دەرکـردوە لـە خۆرهـەڵاتو خۆرئـاوادا، وە لـە دواڕۆژیشـدا بەڕێـزو تـکاکارە لـە لای خـوا ﷻ، شـەفاعەتو تـکا دەکات وەکـو براکانـی لـە پێغەمبـەرانو نێـردراوان، فـەزڵو چاکـەی دەردەکـەوێ بەسـەر زۆربـەی جیهانیانـدا، لەبـەر ئەوەیـە یەکێکـە لـە نزیکانـی بارەگـای خـوا، بەڵکـو سـەلامی خـوای لـێ بێـت لـە گـەورەی نزیکانـی خوایـە.

وَيُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِي ٱلۡمَهۡدِ وَكَهۡلٗا وَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ٤٦
قَالَتۡ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي وَلَدٞ وَلَمۡ يَمۡسَسۡنِي بَشَرٞۖ قَالَ كَذَٰلِكِ
ٱللَّهُ يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۚ إِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ
٤٧ وَيُعَلِّمُهُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَ
٤٨ وَرَسُولًا إِلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ أَنِّي قَدۡ جِئۡتُكُم بِـَٔايَةٖ مِّن
رَّبِّكُمۡ أَنِّيٓ أَخۡلُقُ لَكُم مِّنَ ٱلطِّينِ كَهَيۡـَٔةِ ٱلطَّيۡرِ فَأَنفُخُ
فِيهِ فَيَكُونُ طَيۡرَۢا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۖ وَأُبۡرِئُ ٱلۡأَكۡمَهَ وَٱلۡأَبۡرَصَ
وَأُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۖ وَأُنَبِّئُكُم بِمَا تَأۡكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ
فِي بُيُوتِكُمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لَّكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ٤٩
وَمُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيَّ مِنَ ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَلِأُحِلَّ لَكُم
بَعۡضَ ٱلَّذِي حُرِّمَ عَلَيۡكُمۡۚ وَجِئۡتُكُم بِـَٔايَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ
فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ٥٠ إِنَّ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُوهُۚ
هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ ٥١ ۞ فَلَمَّآ أَحَسَّ عِيسَىٰ مِنۡهُمُ
ٱلۡكُفۡرَ قَالَ مَنۡ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِۖ قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ نَحۡنُ
أَنصَارُ ٱللَّهِ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَٱشۡهَدۡ بِأَنَّا مُسۡلِمُونَ ٥٢

﴿ وَيُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِي ٱلۡمَهۡدِ وَكَهۡلٗا ﴾ (واتە: لە بێشکەداو بە گەورەییش لەگەڵ خەڵکیدا قسە دەکات) مەبەست لەم قسە کردنەدا قسەی ئاسایی نیە کە خەڵکی عادەتیان پێوە گرتووە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە بەجۆری قسەیان لەگەڵدا دەکات سوودی هەیە بۆیانو سەرفرازیان دەکات، ئەویش قسەکردنی پێغەمبەرانە، بەم جۆرە بانگی خەڵکی دەکات بۆ لای پەروەردگاریان، وە لە قسەکردنی لەگەڵیاندا نیشانەیەکی مەزن بەدی دەکرێ لە نیشانەکانی خوا ﷻ کە بڕواداران سوودی لێوەردەگرن، وە دەبێتە بەڵگەو حوججە بەسەر کەللەڕەقو عینادەکانەوە، بەڕاستی عیسا ﷺ نێرراوی پەروەردگاری جیهانیانە، وە بەندەی خوایە، وە بۆ ئەوەیشی ببێتە هۆی پاکی بۆ دایکیو سەربەرزیی خانەوادەکەی لە بەرانبەر ئەو تۆمەتە ناشرینانەی دراونەتە پاڵی ﴿ وَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾ (واتە: وە لە پیاوچاکانیشە)، واتە: منەت دەکات بەسەریدا بە چاکەخوازی، لەوەی کە کردوویەتی بەسەریاندا، وە دەیخاتە نێو ئەوانەوە، ئا لەمەدا چەندین مژدە بەدی دەکرێت بۆ مەریەم ﷺ، لەگەڵ ستایشکردن بە باسی مەسیح ﷺ.

﴿ قَالَتۡ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي وَلَدٞ وَلَمۡ يَمۡسَسۡنِي بَشَرٞ ﴾ (مەریەم وتی: ئەی پەروەردگارم! من چۆن ڕۆڵەم دەبێت لە کاتێکدا کە پیاو نەهاتۆتە لام). منداڵ بە شێوەیەکی ئاسایی نایەتە بوون مەگەر لەدوای جووت بوونی پیاو لەگەڵ ئافرەتدا، ئەمەش جێگای سەرسوڕمان بوو بەلای مەریەمەوە، گومانی نەبوو لە قودرەتو توانای خوای بەرز ﴿ قَالَ كَذَٰلِكِ ٱللَّهُ يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۚ إِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴾ (واتە: جبریل فەرمووی: بەو شێوەیە کە دەیڵێ، خوا هەر شتێکی بوێت دروستی دەکات، کاتێک کە بڕیاری شتێکی دا، هەر ئەوەندەی دەوێت پێی بڵێت: ببە، ئیتر دەبێت)، خوا ﷻ هەواڵیدا بە مەریەم ﷺ ئەم کارە لە دەرەوەی باوی خەڵکە، خوا هەر شتێکی بوێ بەدی بهێنێ پێی دەڵێ: ببە ئیتر دەبێ، هەرکەسێک لەمە دڵنیا بێ سەرسوڕمانی نامێنێ، لە حیکمەتەکانی خوا ئەوەیە کە بە پلەبەندی هەواڵ بە بەندەکانی دەدا لە هەواڵێکی نامۆوە دەچێتە

سەر هەواڵێکی نامۆتر، سەرەتا باسی لە دایک بوونی یەحیای کرد لە دایکو باوکێک یەکێکیان پیربوو چووبوە ناو ساڵەوە ئەوەی دیکەیان نەزۆک بوو، پاشان باسی شتێکی سەرسوورهێنەتری کرد، ئەویش بەدیهێنانی عیسا ﷺ بوو لە دایکێکی بێ باوک، بۆ ئەوەی بە بەندەکانی نیشان بدات کە خوا هەر شتێکی بوێ دەیکات، وە هەر شتێکی بوێ بووە، وە هەر شتێکی نەوێ نابێ.

پاشان خوا ﷻ باسی فەزڵو منەتی مەزنی خۆی دەکات بەسەر مەریەمەوە ﷺ، فەرموویەتی: ﴿ وَيُعَلِّمُهُ ٱلْكِتَٰبَ ﴾ (واتە: خوا فێری کتێبی دەکات)، دەگونجی مەبەست پێی ڕەگەزی کتێب بێت، ئەو کاتە باس کردنی تەوراتو ئینجل تایبەت دەبن، لەبەر حورمەتو ڕێز لەخۆ گرتنیان بۆ هەموو بڕیارو شەریعەتەکان، کە پێغەمبەرانی نەوەکانی ئیسرائیل بڕیاریان پێداوەو خەڵکیان فێر کردوە، لەبەر ئەوە فێر بوونی بێژەو ماناکانی دەچنە نێویەوە.

وە دەگونجێ مەبەست لە وتەی خوای بەرز ﴿ وَيُعَلِّمُهُ ٱلْكِتَٰبَ ﴾ نووسین بێت، لەبەر ئەوە نووسین یەکێکە لە مەزنترین نیعمەتەکانی خوا بەسەر بەندەکانیەوە، لەبەر ئەمەیە خوا ﷻ منەت دەکات بەسەر بەندەکانیدا بە فێر بوونیان بە هۆی قەڵەمەوە لە سەرەتای یەکەم سورەت کە دایبەزاندووە فەرموویەتی: ﴿ ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ﴿١﴾ خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ مِنْ عَلَقٍ ﴿٢﴾ ٱقْرَأْ وَرَبُّكَ ٱلْأَكْرَمُ ﴿٣﴾ ٱلَّذِى عَلَّمَ بِٱلْقَلَمِ ﴿٤﴾ ﴾العلق. (واتە: ئەی موحەممەد بخوێنە بە ناوی پەروەردگارتەوە، کە هەموو شتێکی دروست کردوە* مرۆڤی دروست کردوە لە خوێنێکی بەستوو * بخوێنە پەروەردگاری تۆ لە هەموو کەس بەخشندەترە * ئەوەی کە (مرۆڤی) فێر (ی نووسین) کردوە بە قەڵەم)، وە مەبەستیش لە حیکمەت لەم دەقەدا: زانینی نهێنی شەرعە، وە دانانی شتەکانە لە جێگای خۆیاندا، ئەو کات ئەویش دەبێتە منەتێک بەسەر عیسا ﷺ، بە فێربوونی کتێبو زانستو حیکمەت، ئائەمە کەماڵو تەواویە بۆ مرۆڤ، پاشان باسی تەواویەکی دیکەو فەزڵێکی زیاتری کردوە بەسەریدا، لەو فەزڵو چاکانەی کە پێی بەخشیوە، جا فەرموویەتی: ﴿ وَرَسُولًا إِلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴾ واتە: خوا ﷻ عیسای نارد بۆلای ئەم گەلە بەڕێزە کە لەسەردەمی خۆیاندا ئەوان بەڕێزترینی جیهان بوون، بانگەشەی دەکردن بۆلای خوا ﷻ، وە خوا ﷻ کۆمەڵە نیشانەیەکی پێدا ئاماژەبێ بۆ ئەو گەلە کە ئەو نێردراوە لە لایەنی خواوە بە هەقو ڕاستی، لەبەرئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ أَنِّى قَدْ جِئْتُكُم بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ ۖ أَنِّىٓ أَخْلُقُ لَكُم مِّنَ ٱلطِّينِ ﴾ واتە: (پێیان دەڵێت): بە ڕاستی من نیشانەیەکم بۆ هێناون لە پەروەردگارتانەوە، کە من لە قوڕ شتێکتان بۆ دروست دەکەم لە وێنەی باڵندە)، واتە: وێنەی دەکەم لەسەر شێوەی باڵندە ﴿ فَأَنفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيْرًۢا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ﴾ واتە: ( فووی پیادەکەم تا دەبێتە) باڵندەیەکی گیاندار بە ویستی خوا ﷻ،

﴿ وَأُبْرِئُ ٱلْأَكْمَهَ ﴾ بریتیە لەو کەسەی کە بە کوێری لەدایک دەبێ ﴿ وَٱلْأَبْرَصَ ﴾ بە ویستی خوا ﷻ، ﴿ وَأُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ بِإِذْنِ ٱللَّهِ وَأُنَبِّئُكُم بِمَا تَأْكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِي بُيُوتِكُمْ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٤٩﴾ ﴾ (وە مردووانیش زیندوو دەکەمەوە بە فەرمانی خوا، وە هەواڵتان پێدەدەم چی دەخۆن‌و چی هەڵدەگرن لە ماڵەکانتاندا، بەڕاستی لەم موعجیزانەدا بەڵگەی بەهێز هەیە بۆ ئێوە، (لەسەر ڕاستی پێغەمبەرێتی من) چ نیشانەیەک گەورەترە لەوەی بێ گیان بکرێتە گیاندار، وە چارەسەری جۆرە نەخۆشیەکی جەستەیی وەکو کوێری‌و بەڵەکی، کە پزیشکەکان لە چارەسەر کردنیدا دەستەوسانن، وە زیندووکردنەوەی مردوو، وە هەواڵدەی دەربارەی هەندێ مەسەلەی نادیار غەیبی؟ هەر یەک لەم شتانە خۆی بە تەنها نیشانەیەکی مەزنە، جا چۆن هەموویان پێکەوە کۆببنەوەو هەندێکیان هەندێکی دیکەیان بەڕاست بزانن؟! بەڕاستی ئەوانە دڵنیایی پێویست دەکەن‌و بانگەشەن بۆ ئیمان.

﴿ وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ ﴾ واتە: ئەوەم هێناوە لە ڕەگەزی تەوراتە کە موسا ؑ هێناویەتی، وە نیشانەی ڕاستگۆ ئەوەیە هەواڵەکەی وەکو هەواڵی ڕاستگۆیان بێ، هەواڵ بە ڕاستی بدا، و فەرمان بە دادپەروەری بکات، بەبێ هیچ جیاوازیی‌و تێکگیرانێک، بە پێچەوانەی ئەو کەسەی کە بانگەشەی درۆینە دەکات، بە تایبەت مەزنترین بانگەشە ئەویش بانگەشەی پێغەمبەرایەتیە، ئەوەی درۆ دەکات لە بانگەشەی پێغەمبەرایەتیدا، هەردەبێ درۆکەی بۆ هەموو کەس دەربکەوێ، چونکە پێچەوانەی هەواڵی ڕاستگۆیانە، ئەمەش بەزەیی خوای میهرەبانە بۆ بەندەکانی، کە هەرگیز ڕاستگۆو درۆزن لە بانگەشەی پێغەمبەرایەتیدا لەیەک ناچن، بە پێچەوانەی هەندێ کاروباری سەرەتایی، ئەمە دەگونجێ ڕاستگۆو درۆزن تیایدا لەیەک بچن، بەڵام پێغەمبەرایەتی هیدایەتی خەڵک یان گومرابوونیان، یان خۆشبەختی‌و بەدبەختیان تیایدا بوونیات دەنرێ، بێگومان زانراوە ڕاستگۆ لە بانگەشە کردنی پێغەمبەرایەتیدا لە تەواوترینی دروستکراوانی خوایە، وە درۆزنیش لە خراپترین‌و بێقیمەترینی دروستکراوەکانی خوایە،وە درۆزنترین‌و ستەمکارترینیانە، حیکمەتی خوا وایە بۆ بەندەکانی بەشێوەیەک جیاوازی لە نێوانیاندا کردوە بۆ هەموو کەسێکی عاقڵ بەڕوونی دەردەکەوێ. پاشان عیسا ؑ هەواڵی داوە، بەڕاستی شەریعەتی ئینجیل شەریعەتێکە سووکەو کارئاسانی تێدایە، جا فەرموویەتی: ﴿ وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعْضَ ٱلَّذِي حُرِّمَ عَلَيْكُمْ ﴾ (واتە: بۆتان حەڵاڵ دەکەم هەندێ لەوانەی کەلەسەرتان قەدەغە کرابوو)، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی زۆربەی بڕیارو حوکمەکانی تەورات نەسخ نەکراوەتەوە لە لایەن ئینجیلەوە، بەڵکو ئینجیل تەواوی کردوەو دانێ پێداناوە ﴿ وَجِئْتُكُم بِـَٔايَةٍ مِّن

﴿رَبِّكُمْ﴾(واتە: وە بەڵگەم بۆ هێناون لەلایەن پەروەردگارتانەوە)، هەموو ئەمانە بەڵگەن لەسەر ڕاستی منو پێویست بوونی شوێنکەوتنم، مەبەست لەهەموو ئەوانەی باسکرا وتەی خوای بەرزە کە فەرموویەتی: ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ﴾ (لە خوا بترسن) بە ئەنجامدانی ئەوەی خوا فەرمانی پێکردوەو واز هێنان لەوەی خوا ﷻ قەدەغەی کردوە، وە گوێڕایەڵی من بکەن، چونکە گوێڕایەڵی پێغەمبەر گوێڕایەڵی خوایە، ﴿إِنَّ اللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ فَاعْبُدُوهُ﴾ (بە ڕاستی خوا پەروەردگاری منو پەروەردگاری ئێوەیە دەی بیپەرستن)، بەڵگەی هێناوەتەوە بە یەکتاپەرستی پەروەردگاریّتی کە هەموو کەسێک دانی پێدادەنا، لەسەر یەکتاپەرستی پەرستراوێتی کە بتپەرستان نکوڵی لێدەکەن، وەک چۆن خوا ﷻ دروستی کردووینو ڕزقو ڕۆزی پێداوین، نازوو نیعمەتەکانی ڕشتووە بەسەرماندا بەئاشکراو بە پەنهان، دەی با تەنها ئەو پەرستراومان بێ، بیپەرستین بە خۆشەویستیو ترسو ئومێدو پاڕانەوەو پشت پێ بەستنو هەموو جۆرەکانی پەرستش.

ئەم دەقە بەڵگەیە لەسەر ڕەت کردنەوەی قسەی گاورەکان کە وتوویانە: عیسا پەرستراوە یا کوڕی خوایە، ئەمە دان پێدانانی خۆیەتی عليه السلام بەوەی کە ئەو بەندەیەکی بەرێوەبراو و دروستکراوی خوایە، وەک چۆن فەرموویەتی: ﴿إِنِّي عَبْدُ اللَّهِ آتَانِيَ الْكِتَابَ وَجَعَلَنِي نَبِيًّا ﴿٣٠﴾﴾مریم، (واتە: من بەندەی خوامو پەڕاوی ئینجیلم پێدەداو دەمکاتە پێغەمبەر)، وە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ أَأَنْتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ اتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَٰهَيْنِ مِنْ دُونِ اللَّهِ قَالَ سُبْحَانَكَ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِي بِحَقٍّ إِنْ كُنْتُ قُلْتُهُ فَقَدْ عَلِمْتَهُ﴾ المائدة، تا ئەوەی دەفەرموێ: ﴿مَا قُلْتُ لَهُمْ إِلَّا مَا أَمَرْتَنِي بِهِ أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ ﴿١١٧﴾﴾المائدة، وە وتەی خوا ﷻ﴿هَٰذَا﴾ واتە: بەندایەتی کردن بۆ خۆپارێزیو گوێڕایەڵی کردنی پێغەمبەرەکەی ﴿صِرَاطٌ مُسْتَقِيمٌ﴾ (ڕێگای ڕاستە) دەیگەیەنێتە لای خوا ﷻو بەهەشتەکەی، بێجگە لە لەو ڕێگایە، هەموو ڕێگاکانی دیکە دەیگەیەنێتە دۆزەخ.

﴿فَلَمَّا أَحَسَّ عِيسَىٰ مِنْهُمُ الْكُفْرَ﴾ واتە: (کاتێ) بینی ئەوان ملکەچی نابنو گوێڕایەڵی ناکەن، وتیان: ئەمە جادوویەکی ڕوونو ئاشکرایە، ویستیان بیکوژن، لەو پێناوەشدا هەوڵی زۆریاندا ﴿قَالَ مَنْ أَنْصَارِي إِلَى اللَّهِ﴾ (عیسا عليه السلام وتی) کێ پشتیوانیم لێدەکاتو لەگەڵمدا هەڵدەستێ بۆ سەرخستنی ئاینی خوا؟ ﴿قَالَ الْحَوَارِيُّونَ﴾ پشتیوانانی وتیان ﴿نَحْنُ أَنْصَارُ اللَّهِ﴾ (واتە: ئێمە پشتیوانو سەرخەری دینی خواین)، دەنگی خۆیان خستە پاڵ دەنگی عیساو بەو کارە هەڵسانو وتیان:

رَبَّنَآ ءَامَنَّا بِمَآ أَنزَلْتَ وَٱتَّبَعْنَا ٱلرَّسُولَ فَٱكْتُبْنَا مَعَ
ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٥٣﴾ وَمَكَرُوا۟ وَمَكَرَ ٱللَّهُ ۖ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَٰكِرِينَ
﴿٥٤﴾ إِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَىٰٓ إِنِّى مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَىَّ وَمُطَهِّرُكَ
مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَجَاعِلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوكَ فَوْقَ ٱلَّذِينَ
كَفَرُوٓا۟ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ۖ ثُمَّ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ فَأَحْكُمُ
بَيْنَكُمْ فِيمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٥٥﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟
فَأُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَمَا لَهُم
مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٥٦﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ
فَيُوَفِّيهِمْ أُجُورَهُمْ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٧﴾ ذَٰلِكَ نَتْلُوهُ
عَلَيْكَ مِنَ ٱلْءَايَٰتِ وَٱلذِّكْرِ ٱلْحَكِيمِ ﴿٥٨﴾ إِنَّ مَثَلَ
عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ ۖ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ
كُن فَيَكُونُ ﴿٥٩﴾ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْمُمْتَرِينَ
﴿٦٠﴾ فَمَنْ حَآجَّكَ فِيهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ فَقُلْ تَعَالَوْا۟
نَدْعُ أَبْنَآءَنَا وَأَبْنَآءَكُمْ وَنِسَآءَنَا وَنِسَآءَكُمْ وَأَنفُسَنَا
وَأَنفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٦١﴾

﴿ءَامَنَّا بِٱللَّهِ﴾ (بروامان هێناوە بەخوا)، ﴿فَٱكْتُبْنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ﴾ (دەسا تۆش لەگەڵ ئەوانەدا بماننووسە) کە شایەتیەکی ڕاستەقینە دەدەن ئەویش شایەتیدانە بە یەکتاپەرستی خواو بەڕاستدانانی پێغەمبەرەکەی، هەڵسان بەو شتانەی کە ئەو دوو شایەتیە دەیخوازن، کاتێ لەگەڵ عیسادا هەڵسان بۆ سەرخستنی دینی خواو پیادەکردنی شەریعەتەکەی، دەستەیەک لە بەنی ئیسرائیل بروایان پێهێناو دەستەیەکی دیکە بێبڕوا بوون، ئەو دوو دەستەیە لەناو یەکتردا بەشەڕ هاتن خوا یارمەتی برواداارانیداو سەریخستن بەسەر دوژمنەکانیاندا، لەبەرئەمە خوا ﷻ لێرەدا فەرموویەتی: ﴿وَمَكَرُوا۟﴾ (واتە: بێبڕوایان ویستیان پێغەمبەری خوا بکوژنو نوورو ڕووناکی خوا بکوژێننەوە ﴿وَمَكَرَ ٱللَّهُ﴾ (خوا ﷻ فرووفێڵی پووچەڵ کردنەوە) وەکو پاداشتێک بۆیان لەسەر پیلان گێڕیان ﴿وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَٰكِرِينَ﴾ (خوا ﷻ پیلانەکانی ڕەت کردەوە بەسەر خۆیاندا) بە خەسارەتمەندیەوە ڕوویان وەرگێڕا. ﴿إِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَىٰٓ إِنِّى مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَىَّ وَمُطَهِّرُكَ مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ (واتە: کاتێ خوا فەرمووی من تۆ دەمرێنمو بەرزت دەکەمەوە بۆلای خۆم وە پاکت دەکەمەوە لە ئەوانەی کە بێبڕوا بوون) خوا عیسای بەندەو پێغەمبەری خۆی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان، شێوەی ڕەنگی خستە سەر کەسێکی تر، ئەوانیش ئەو کەسەیان گرت کە شێوەی خراوە سەر عیسا ﷺ پاشان کوشتیانو لە خاچیانداو هەڵیانواسی، تووشی گوناهێکی مەزن بوون، چونکە نیەتیان وابوو ئەوان پێغەمبەری خوایان کوشتووە، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ ﴿١٥٧﴾﴾ النساء (واتە: لە کاتێکدا نەشیان کوشتبوو وە هەڵیشیان نەواسیبوو بەڵکو لێیان گۆڕا).

وە ئەم دەقە بەڵگەیە لەسەر بەرزیو بڵندی خوای گەورەو قەرارگرتنی لەسەر عەرش بە هەقیقی، هەروەکو چۆن بەڵگەکانی قورئان ئاماژەی پێدەکەن، هەروەها فەرموودەکانی پێغەمبەر کە

ئەهلی سوننە وەریان گرتوەو بڕوایان پێی هەیەو تەسلیمی بوون، بێگومان خوا ﷻ بەهێزو بەتواناو زاڵە، لە بەهێزی ئەو ئەوەیە ڕێگری لە نەوەکانی ئیسرائیل کرد پاش ئەوەی هەموو توانایەکیان خستەکار بۆ کوشتنی عیسا ﷺ وەکو چۆن فەرموویەتی: ﴿وَإِذۡ كَفَفۡتُ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَنكَ إِذۡ جِئۡتَهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّبِينٞ ١١٠﴾ المائدة، (واتە: وە بیر بکەرەوە کاتێ ڕێگری نەوەکانی ئیسرائیلم لێکردیت (بتکوژن) کاتێکیش موعجیزەکانت بۆیان هێنا جا ئەوانەی بێبڕوا بوون وتیات: ئەمە هیچ نیە جگە لە جادوویەکی ئاشکرا) حەکیمو کارلەجێیە شتەکان لەجێگای خۆیدا دادەنێ، خوا ﷻ گەورەترین حیکمەتی داناوە لە شوبهاندنی کوژراوەکە بە عیسا لای بەنی ئیسرائیل تا کەوتنە گومانەوە، هەروەکو چۆن خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِ لَفِي شَكّٖ مِّنۡهُۚ مَا لَهُم بِهِۦ مِنۡ عِلۡمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّۚ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينَۢا ١٥٧﴾ النساء (واتە: ئەوانەی بێگومان دووبەرەکیان تێکەوت دەربارەی عیسا ﷺ لە کوشتنەکەیدا» بە گومانن هیچ زانیاریەکیان دەربارەی نیە جگە لە شوێنکەوتنی گومان نەبێ وە بە ڕاستیو بێگومان نەیانکوشتووە).

پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَجَاعِلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوكَ فَوۡقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِۖ﴾ ( واتە: پەیڕەوانی ڕاستەقینەی تۆ بەرزدەکەمەوە بەسەر بێبڕوایاندا تا ڕۆژی دوایی) لە پێشەوە باسکرا کە بێگومان خوا ﷻ بڕوادارانی سەرخستووە بەسەر بێبڕوایاندا، پاشان گاورەکان شوێنکەوتەی عیسا ﷺ بەبەردەوام زاڵبوون بەسەر جولەکەدا، چونکە گاورەکان نزیکتربوون لە شوێنکەوتنی عیسا لە جولەکەکان، هەتا خوا ﷻ پێغەمبەرەکەمان موحەممەد ﷺ نارد پاش ئەوە مسوڵمانان بوون بە شوێنکەوتەی ڕاستەقینەی عیسا ﷺ، خوا ﷻ پشتیوانی لێکردن سەریخستن بەسەر گاورەکانو جوولەکەو سەرجەم بێبڕوایان، هەندێ جار لە هەندێ سەردەمدا دەبینرێ بێباوەڕان لە گاورەکانو جگە لە ئەوانیش سەردەکەون بەسەر مسوڵماناندا، دیارە ئەمە حیکمەتێکی تێدایە لە لایەن خوا ﷻ، وە سزاو تۆڵەیشە لەسەر وازهێنانیان لە شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ ﴿ثُمَّ إِلَيَّ مَرۡجِعُكُمۡ﴾ واتە: چارەنووسی هەموو بەدیهێنراوەکان بەگشتی بۆلای (خوایە) ﴿فَأَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡ فِيمَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ﴾ هەر یەکەو بانگەشەی ئەوە دەکات کە هەق لەلای ئەوەو ئەو ڕاست دەکاو غەیری ئەویش هەڵەیە، ئەمە تەنها بانگەشەیەکە پێویستی بە سەلماندن هەیە، پاشان هەواڵی داوە دەربارەی بڕیاردانی لەنێوانیاندا بە دادپەروەری، جا فەرموویەتی: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ واتە: بێبڕوا بوون بە خواو ئایەتو پێغەمبەرانی ﴿فَأُعَذِّبُهُمۡ عَذَابٗا شَدِيدٗا فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ﴾ بەڵام سزای دونیا ئەوەیە کە تووشی کردوون لە پێک

دادانو سزای بینراوو کوشتنو زەلیل بوون، وە جگە لەوانەش کە بەسەریاندا هاتووە نموونەیەکن بۆ سزای دوارۆژ، بەڵام سزای ڕۆژی دوایی بریتیە لە ڕووداو بەڵای گەورەو بەهێز، کە سزای ئاگرو تووڕەبوونی خواو مەحروم کردنیانە لەو پاداشتەی دەدرێ بە چاکەکاران ﴿ وَمَا لَهُم مِّن نَّـٰصِرِينَ ﴾(واتە: کەسێک نیە ڕزگاریان بکات)وە سەریان بخات لە سزای خوا، نە ئەوانەی کە پێشتر گومانیان وابوو دەبنە تکاکار بۆیان لای خوا، نە ئەوانەشی کە غەیری خوا کردبوویانن بە دۆستو پشتیوانی خۆیان، نە هاوڕێو خزمەکانیشیان، وە خۆشیان ناتوان خۆیان سەربخەن.

﴿ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ واتە: ئەوانەی بڕوایان هێناوە بە خواو فریشتەکانو کتێبەکانو پێغەمبەرانو زیندوو بوونەوەی دوای مردن، وە جگە لەوانەش ئەوانەی خوا ﷻ فەرمانی پێکردوە بە بڕواپێهێنان، ﴿ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ ﴾ (وە کردەوەی چاکیان ئەنجامداوە بە دڵو بە زمانو بە جەستە) ، بە پێی ئەو شەریعەتەی پێغەمبەران هێناویانە، تەنها مەبەستیان ڕەزامەندی خوا ﷻ بووە ﴿ فَيُوَفِّيهِمْ أُجُورَهُمْ ﴾ (خوا بە تەواوی پاداشتیان دەداتەوە)، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەوان لە دنیادا بەدەستی دەهێنن پاداشتی کردەوەکانیان، لە ڕێزو سەربەرزیو سەرکەوتنو ژیانێکی شەرەف مەندانە، وە لە ڕۆژی دوایشدا ئەو کارو کردەوە چاکانەی ئەنجامیانداوە بە چاوی خۆیان بە جوانترین شێوە دەیبینن،هەرکەسێ بە پێی کاروو کردەوەی خۆی پاداشت دەدرێتەوە، وە خوا ﷻ بە فەزڵو بەخشندەیی خۆی بۆیان زیاد دەکات ﴿ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴾ (واتە: وە بێگومان خوا ستەمکارانی خۆش ناوێ)، بەڵکو ڕقی لێیانەو تووشی خەشمو قینو تووڕەییو خۆیان دەکات ﴿ ذَٰلِكَ نَتْلُوهُ عَلَيْكَ مِنَ ٱلْـَٔايَـٰتِ وَٱلذِّكْرِ ٱلْحَكِيمِ ﴾ (واتە: ئەو بەسەرهاتانەی کە ئەیانخوێنینەوە بەسەرتدا ئەی موحەممەد! لە ئایەتان قورئانی پڕ لە حیکمەتن)، ئەمە منەتێکی گەورەیە بەسەر پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ وە لەسەر ئۆممەتەکەی، بەوەی کە ئەم قورئانە پڕ لە حیکمەتەی بۆ دابەزاندوون، قورئانێکی پتەوو جێی دڵنیاییە، حوکمەکانو حەڵاڵو حەرامو هەواڵی پێغەمبەرانی پێشووتری بەتێرو تەسەلی بۆ باس کردوون، وە هەموو ئەو بەڵگەو نیشانەو موعجیزە ڕوونانەی بۆ باس کردووین کە لەسەر دەستی پێغەمبەراندا ڕوویان داوە، ئەم قورئانە هەموو ئەو شتانەی بۆ تۆمار کردووین لەوەی تایبەتە بە هەواڵو لەوەشی تایبەتە بە ئەحکامەکان، بە هۆی هەموو ئەوانەی تیایدان زانستو پەندو ئامۆژگاریو جێگیر بوونی دڵەکان بە دەست دێت کە ئەوە مەزنترین میهرەبانی پەروەردگاری بەندەکانە.

(٥٩-٦٠): ﴿ إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٥٩﴾ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿٦٠﴾ ﴾:

خوا ﷻ هەواڵ دەداتو بەڵگە دەهێنێتەوە بۆ دەمکوتکردنی گاورەکان، ئەوانەی شتێک دەدەنە پاڵ عیسا ﷺ کە هەق نیە، بە بێ بەڵگەو سەلماندن یان گومانێک، بەڵکو بە بۆچوونی ئەوان عیسا ﷺ باوکی نیە بۆیە شایستەی ئەوەیە کوڕی خوا ﷻ بێت، یاخود بەشدار بێت لە پەروەردگاریەتیدا، بەڕاستی ئەم وتەیەی ئەوانە بە گومانیش دانانرێ نەک بە بەڵگە، چونکە دروستکردنی بە هەمان شێوە لە نیشانەکانی خوایە کە بەڵگەن لەسەر یەکتاپەرستی خواو بەڕێوەبردنی، هەموو هۆکارەکان بە پێی ویستو شوێنی ئیرادەی ئەو دەکەون، ئەوە دەبێتە بەڵگە بۆ پێچەوانەو دژی قسەکانی ئەوان، وە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هیچ شتێک شایستەی ئەوە نیە بکرێت بە هاوبەش بەشێوەیەک لە شێوەکان، لەگەڵ ئەمەدا خوا ﷻ ئادەم ﷺ دروستکردوە لە خۆڵ، نەلە دایکو نە لە باوک، جا ئەگەر دروست نەبێ ئادەم بکرێتە هاوبەش، بە بۆچوونی گاورەکان، ئەوە عیسا ﷺ لەپێشترە کە دروست نیە، چونکە مەسیح ﷺ دروستکراوە لە دایکێک بە بێ باوک، جا ئەگەر ڕەوا بێ بانگەشەی پێغەمبەرایەتیو پەرستراوێتی لە مەسیحدا، ئەوە بۆ ئادەم لەپێشترە، لەبەر ئەمە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٥٩﴾ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ ﴾ واتە: ئەوەی ئێمە هەواڵمان پێداوی دەربارەی مەسیح ئەوە ڕاستەو لە بەرزترین پلەی ڕاستگۆییە، چونکە لەلایەن پەروەردگارتەوەیە لە ڕیزی ئەو پەروەردە تایبەتەی تۆو ئوممەتەکەتە لەلایەن پەروەردگارتەوە بەهۆی باس کردنی هەواڵی ئەو پێغەمبەرانە سەلامی خوایان لێبێ، ﴿ فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴾ واتە: (لەو کەسانە مەبە کە) گومانیان هەیە لە هەر هەواڵێک کە پەروەردگارت پێت دەدا، ئەم دەقەو ئەوەیشی لە دوای ئەو دێت بەڵگەن لەسەر بنچینەیەکی مەزن: ئەویش ئەوەیە هەرشتێک بەڵگەی لەسەر بوو کە هەقو ڕاستە، بەندە پابەند بوو پێیەوە لە سەرەباسەکانی عەقیدەو جگە لە ئەوانیش، ئەوە پێویستە پابەند بێت بەوەی هەرشتێک پێچەوانەی بوویەوە ئەوە بەتاڵو پووچەڵە، وە هەر گومانێک بەسەریدا بێت ئەوە پووچەڵو بەتاڵە، جا یەکسانە بەندە بتوانێت چارەسەری بکات یان نەتوانێ، پێویست ناکات تانە لەو شتە بدات کە بۆی سەلمێنراوەو پێشتر عیلمی پێ هەبووە بە هۆی ئەوەی کە ناتوانێ گومانەکە شی بکاتەوە، چونکە هەر شتێک پێچەوانەی هەق بوو ئەوە پووچە، خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿ فَمَاذَا بَعْدَ ٱلْحَقِّ إِلَّا ٱلضَّلَٰلُ ﴾یونس. بەم قاعیدەو بنچینە شەرعیە زۆرێ لە ئاڵۆزیەکان بۆ مرۆڤ چارەسەر دەبێ، کە ئەهلی کەلام هێناویەتیو، (منطق) یەکانیش ڕێکیان خستووە، ئەگەر گومانەکەی بۆ شی بوویەوە ئەوە کارێکی چاکە، ئەگەرنا پێویستە بە بەڵگەو سەلماندنی خۆی ڕوون بکاتەوەو بانگەشەی بۆ بکات.

(٦١-٦٣): ﴿ فَمَنْ حَآجَّكَ فِيهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ فَقُلْ تَعَالَوْا۟ نَدْعُ أَبْنَآءَنَا وَأَبْنَآءَكُمْ وَنِسَآءَنَا وَنِسَآءَكُمْ وَأَنفُسَنَا وَأَنفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٦١﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْقَصَصُ ٱلْحَقُّ ۚ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٦٢﴾ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٦٣﴾ ﴾:

واتــە: ﴿ فَمَنْ ﴾ (هــەر کەسـێک) مشـتومڕو ﴿ حَآجَّكَ ﴾ دەمەدەمێــی لەگــەڵ کــردی دەربــارەی عیســا ، پێــی وابــوو کە عیســا لەســەرووی پلــەی پەرســتراوێتیەوەیە، بەڵکــو بــەرزی کردوەتــەوە لەســەرووی پلــەو پایــەی خۆیــەوە ﴿ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ ﴾ (واتــە: دوای ئــەوەی زانیوتــە) بــەوەی عیســا بەنــدەو نێــردراوی خوایە، وە ڕوونــت کــردەوە بــۆ ئــەو کەســەی مشــتو مــڕت لەگەڵــدا دەکا بــە پێــی ئــەو بەڵگانەی کەلــە لاتە، لەســەر ئــەوەی ئەو بەنــدەی خوایــەو خــوا ﷻ نازونیعمەتی بەســەردا ڕشـتووە، بەڵگەیــە لەســەر عینــادیو کەللەڕەقــی ئــەو کەســەی کــە شــوێنت ناکــەوێ لــەم زانستە دڵنیاکــەرەوەدا، جــا لــەو دەمەقاڵێیــەدا هیــچ ســوودێک نــە بــۆ تــۆ دەمێنێتــەوە نە بــۆ ئەو، چونکــە هەقو ڕاســتی ڕوون بوویەوە مشــتو مڕکردنیشــی دەربــارەی ئەو تەنهــا عینادیو دژایەتیکردنــی خــواو پێغەمبەرەکەیەتــی، مەبەســتی ئەوەیە شــوێنی هەواو ئــارەزوو بکەوێ، نــەک شــوێنی ئەوەی خــوا ﷻ دایبەزانــدووە، ئەمە هیــچ چارەســەرێکی نیە، بۆیــە خوا ﷻ فەرمانــی بــە پێغەمبەرەکەی کردوە مشــتو مڕەکــەی بگوازێتەوە بۆ دوعــاو نەفرین کردن، جــا هەموویــان لەلای خوا دوعــا دەکــەنو دەپاڕێنەوە، کە نەفرینو ســزای خــۆی دابارێنێ بەســەر درۆزنترینی ئەو دەســتەیە، خۆیو خۆشەویســترین کەســی لــە خێــزانو منداڵەکانی، پێغەمبــەری خــوا بانگــی کــردن بۆ ئــەو دوعــاو نەفرینە(حەســەنو حوســێنو فاطیمــەی ی لەگــەڵ خۆیــدا هێنــا، بــەڵام بێبڕوایــان کەســیان لەگــەڵ خۆیاندا نەهێنــاو) پشــتیان تێکرد، چونکــە زانیــان ئــەوان ئەگــەر نەفریــن بکــەن ئــەو نەفرینــە دەگەڕێتەوە بــۆ مــاڵو منداڵی خۆیــان، وە کاتــێ کــە دەگەڕێنــەوە دەبینــنو خــوا ﷻ ســزای بۆ پێــش خســتوونو ماڵو منداڵیــان لەناوچــووە، بۆیــە ڕازی بــوون بــەو ئاینەیــان لەگــەڵ ئــەوەدا دەیانزانــی بەتــاڵو پووچــە، ئەمــەش ئەوپــەڕی فەســادوو عینادیــە، لەبەرئەمەیــە خــوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُفْسِدِينَ ﴾ (واتــە: ئنجــا ئەگــەر پشــتیان هەڵکــرد ئــەوە بە ڕاســتی خوا ئاگــادارە بــە کــردەوەی بــەدکاران) ســزایان دەدا لەســەر ئەمە بــە توندترین ســزا.


إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْقَصَصُ ٱلْحَقُّ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ
ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٦٢﴾ فَإِن تَوَلَّوْا فَإِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ بِٱلْمُفْسِدِينَ
﴿٦٣﴾ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْا إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍ بَيْنَنَا
وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ
بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْا فَقُولُوا ٱشْهَدُوا
بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٦٤﴾ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تُحَآجُّونَ فِىٓ إِبْرَٰهِيمَ
وَمَآ أُنزِلَتِ ٱلتَّوْرَىٰةُ وَٱلْإِنجِيلُ إِلَّا مِنۢ بَعْدِهِۦٓ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ
﴿٦٥﴾ هَٰٓأَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ حَٰجَجْتُمْ فِيمَا لَكُم بِهِۦ عِلْمٌ فَلِمَ
تُحَآجُّونَ فِيمَا لَيْسَ لَكُم بِهِۦ عِلْمٌ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ
لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦٦﴾ مَا كَانَ إِبْرَٰهِيمُ يَهُودِيًّا وَلَا نَصْرَانِيًّا
وَلَٰكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٦٧﴾
إِنَّ أَوْلَى ٱلنَّاسِ بِإِبْرَٰهِيمَ لَلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ وَهَٰذَا ٱلنَّبِىُّ وَٱلَّذِينَ
ءَامَنُوا وَٱللَّهُ وَلِىُّ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٨﴾ وَدَّت طَّآئِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ
لَوْ يُضِلُّونَكُمْ وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿٦٩﴾ يَٰٓأَهْلَ
ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَأَنتُمْ تَشْهَدُونَ ﴿٧٠﴾

وە خوا ﷻ هەواڵیداوە ﴿إِنَّ هَٰذَا﴾ ئەو چیرۆکەی خوا ﷻ بۆ بەندەکانی گێڕاوەتەوە بریتیە لە ﴿ٱلْقَصَصُ ٱلْحَقُّ﴾ هەموو ئەو چیرۆکانەی بۆیان باسدەکرێ، ئەگەر پێچەوانەو دژی قورئان بێ ئەوە بەتاڵو پووچە، ﴿وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُ﴾ ئەو پەرستراوی حەقیقیە، کە پەرستن دروست نیە تەنها بۆ ئەو نەبێ، وە هیچ یەکێک لە بەندەکان شایستەی ئەوە نیە بپەرسترێ تەنانەت بە قەد مسقاڵە زەڕەیەکیش ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ﴾ (واتە: بەڕاستی تەنها خوا باڵادەستە) کە زاڵە بەسەر هەموو شتێکدا، وە هەموو شتێکیش ملکەچی ئەوە ﴿ٱلْحَكِيمُ﴾ کار لە جێیە هەموو شتەکان لە جێگای خۆیدا دادەنێ، وە حیکمەتی تەواوی هەیە لە تاقیکردنەوەی بڕواداران بەبێبڕوایان، کوشتاریان دەکەنو مشتومڕیان دەکەنو جیهادیان دەکەن بە کردارو بە گوفتار.

(٦٤): ﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْا إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْا فَقُولُوا ٱشْهَدُوا بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٦٤﴾﴾

﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ﴾ بە خاوەنانی کتێب بڵێ لە جوولەکەو گاورەکان ﴿تَعَالَوْا إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ﴾ (وەرن با لەسەر ئەو وشەیە کۆببینەوە، کە سەرجەم پێغەمبەران و نێردراوان لەسەری یەکدەنگن)، وە کەس پێچەوانەی نەکردوە تەنها کەللەڕەقانو گومڕایان نەبێ، ئەو وشەیە تایبەت نیە بەیەکێکمان جگە لەویتر، بەڵکو هاوبەشە لە نێوان ئێمەو ئێوەدا، بەڕاستی ئەمە دادپەروەریە لە قسەکردنو، بە ویژدان بوونە لە مشتومڕکردندا، پاشان تەفسیری ئەو وشەیەی کردوەو فەرموویەتی: ﴿أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا﴾ بەتاکو تەنهایی بەندایەتی بۆبکەینو تایبەتی بکەین بە

خۆشەویستی‌و تـرس‌و ئومێـد، وە نەیکەین بـە هاوبەش هیچ یەکـێ لە پێغەمبەرو، فریشـتەو، پیاوچـاکو، بـتو، گیاندارو بـێ گیـان ﴿ وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ (وە هەندێکمـان هەندێکمـان بـە پەروەردگار دانەنێین جگە لە خـوا)، بەڵکو هەمـوو گوێڕایەڵی بۆ خـواو بـۆ پێغەمبەرەکەی بـێ، گوێڕایەڵی دروسـتکراوەکان نەکەین لەسـەرپێچیکردنی خوادا، چونکـە ئەمـە وادەکات دروسـتکراوەکان بگەنە ئاسـتی پەروەردگارێتی، جا ئەگـەر خاوەنانی کتێـبو غەیـری ئەوانیـش بـۆ ئـەوە بانگ کـران، ئەگـەر بەدەمیەوە هاتـن ئەوا وەکـو ئێوە وان، ئـەوەی بـۆ ئێوەیـە بـۆ ئەوانیشـە، وە ئەوەیشـی لەسـەرتانە لەسـەر ئەوانیشـە، وە ئەگـەر ڕوویـان وەرگێڕا پشـت گوێیان خسـت ئـەوە کەللەڕەقن‌و شـوێنی هەواو ئـارەزووی خۆیان کەوتـوون، ئێوەش بە ڕاشـکاوی پێیان بڵێن ئێمە مسـوڵمانین، وە لەوەیە سـوود لەو شـایەتیەدا ئـەوە بـێ ئێوە ئەگـەر ئەوەیان پـێ بڵێـن، لەکاتێکدا ئێـوە خاوەن زانسـتی ڕاسـتەقینەن، ئەوە دەبێتە پێویسـت بوونی بەڵگـەو حوجەیەکی زیاتر بەسـەریانەوەو بیانوویان دەبـڕێ، هەروەکو چـۆن خـوا ﷻ خـاوەن کتێبـەکان دەکات بە حوجـەو بەڵگە بەسـەر ئینـکارو نکوڵیکەران، هەروەهـا بـۆ ئەوەیـە ئەگـەر ئێـوە مسـوڵمان بـوون‌و ئیمانتـان هێنا خـوا ناتانگـرێ بە هۆی مسـوڵمان نەبوونـی خەڵکانـی دیکەوە، لەبـەر پـاک نەبوونەوەیـان‌و پیس‌و چەپەڵـی ناخیان، وەک خوای بـەرزو مەزن فەرموویەتـی: ﴿ قُلْ ءَامِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوْ لَا تُؤْمِنُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ مِن قَبْلِهِۦٓ إِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ سُجَّدًا ﴿١٠٧﴾ ﴾ الإسراء، (واتـە: ئـەی موحەممەد پێیـان بڵێ باوەڕ بـەم قورئانـە بێنـن یـان باوەڕی پـێ نەهێنن بەڕاسـتی ئەوانـەی کـە زانیاریان پێبەخشـراوە لە پێـش ئـەم قورئانـەدا کاتێ بخوێنرێتەوە بەسـەریاندا بە چەسـپانی دەکەون بە ڕوودا بە سـوژدە بـردن). بێگومـان لـە کاتـی هاتنـی گومـان و دوودڵـی بەسـەر بیروبـڕوا و ئیمانـدا، ئەوەی پێویسـتە لەسـەر بـڕوادار بڕوای تـازە بکاتەوەو ئیسـلامەتی خۆی ئاشـکرا بکا، هـەواڵ بدا بە دڵنیایـی خـۆی‌و شـوکری نـازوو نیعمەتەکانی پەروەردگـاری بکات.

(٦٥-٦٨): ﴿ يَـٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ لِمَ تُحَآجُّونَ فِىٓ إِبْرَٰهِيمَ وَمَآ أُنزِلَتِ ٱلتَّوْرَىٰةُ وَٱلْإِنجِيلُ إِلَّا مِنۢ بَعْدِهِۦٓ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٥﴾ هَـٰٓأَنتُمْ هَـٰٓؤُلَآءِ حَـٰجَجْتُمْ فِيمَا لَكُم بِهِۦ عِلْمٌ فَلِمَ تُحَآجُّونَ فِيمَا لَيْسَ لَكُم بِهِۦ عِلْمٌ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦٦﴾ مَا كَانَ إِبْرَٰهِيمُ يَهُودِيًّا وَلَا نَصْرَانِيًّا وَلَـٰكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٦٧﴾ إِنَّ أَوْلَى ٱلنَّاسِ بِإِبْرَٰهِيمَ لَلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ وَهَـٰذَا ٱلنَّبِىُّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ وَلِىُّ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٨﴾ ﴾:

کاتـێ جوولەکەکان بانگەشـەی ئەوەیان کـرد کە ئیبراهیـم جوولەکەیەو لە ئەوانـە، بەهەمان

شێوە گاورەکانیش وتیان: ئەو گاورە، لەسەر ئەوە مشتو مڕوو دەمە دەمێیان دەکرد، خوای گەورە دەمە دەمێ و بەڵگەهێنانەوەکەیانی ڕەت کردەوە لە سێ ڕووەوە، یەکەم: مشتومڕکردنیان دەربارەی ئیبراهیم ؑ مشتومڕکردنە لە کارێکدا کە پەیوەندی بە ئەوانەوە نیەو هیچ زانیاریەکیان دەربارەی نیە، کەوابوو ناکرێ و ڕێگەیان پێنادرێ گفتوگۆو دەمە دەمێ لە کاروبارێکدا بکەن کە ئەوان بێگانەن تێیدا، ئەوان دەمە دەمێیان دەکرد لە بڕیارەکانی تەوراتو ئینجیلدا، یەکسانە هەڵەبن یان ڕاست، چونکە ئەوان هیچ بەڵگەیەکیان نەبوو دەربارەی ئیبراهیم.

دووەم: جوولەکەکان دەدرێنە پاڵ تەورات، گاورەکانیش دەدرێنە پاڵ ئینجیل، تەوراتو ئینجیلیش دوای ئیبراهیم دابەزیون، دەی چۆن ئیبراهیم دەدەنە پاڵ خۆیان، لەکاتێکدا ئەو لە پێش ئەوانەوە بووەو پێشتر بووە بەسەریانەوە، ئایا ئەمە لە عەقڵدا جێی دەبێتەوە؟! لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿أَفَلَا تَعۡقِلُونَ﴾ واتە: ئەگەر ئێوە عەقڵتان بخەنە کار لەوەی دەیڵێن، ئەوە ئەو قسانەتان نەدەکرد.

سێیەم: خوای گەورە خەلیلو خۆشەویستی خۆی بەری کردوە لە جوولەکەو گاورو بتپەرستان، وە کردوویەتی بە یەکتاپەرستی ملکەچی مسوڵمان، وە نزیکترین کەس لە ئۆممەتی ئیبراهیم ؑ ئەو کەسەیە بڕوای پێدەهێنێ، ئەم پێغەمبەرە کە موحەممەدە ﷺ و ئەوانەی ئیمانیان پێ هێناوە لەگەڵیدا تەنها ئەوان بەڕاستی شوێنی کەوتوون، ئەوان نزیکترن لە ئیبراهیمەوە لە غەیری خۆیان، وە خوا ﷻ سەرخەرو هاوکارو پشتیوانیانە، بەڵام هەرکەسێ میللەتی ئیبراهیمی پشت گوێ خستبێ وەک جولەکەو گاورو بتپەرست، نە ئەوان لە ئیبراهیمنو نە ئیبراهیمیش لەوانە، هیچ سوودێکیان پێ ناگەیەنێ خۆدانەپاڵ ئیبراهیم، کە بەتاڵە لە هەموو ڕاستیەک.

ئەو دەقانە قەدەغە کردنی مشتو مڕو دەمە دەمێ بێ زانست دەگرێتەوە، هەر کەسێک بەبێ زانیاری دەربارەی شتێک قسە بکات ئەوە قسەی لە کاروبارێکدا کردوە نەبۆ ئەو دەگونجێ و نەڕێگای پێدەدرێ قسەی تیابکات.، بەهەمان شێوە هاندان دەگرێتەوە لە سەر فێربوونی زانستی مێژوو، بێگومان ئەو زانستە ڕێگایەکە بۆ ڕەتکردنەوەی زۆرێک لەو قسە پڕوو پووچو بانگەشانەی کە پێچەوانەی زانستی مێژوون.

(٦٩-٧٤): ﴿ وَدَّت طَّآئِفَةٞ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ لَوۡ يُضِلُّونَكُمۡ وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ وَمَا يَشۡعُرُونَ ٦٩ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَكۡفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَأَنتُمۡ تَشۡهَدُونَ ٧٠ يَٰٓأَهۡلَ

ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تَلْبِسُونَ ٱلْحَقَّ بِٱلْبَٰطِلِ وَتَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٧١﴾ وَقَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ءَامِنُواْ بِٱلَّذِىٓ أُنزِلَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَجْهَ ٱلنَّهَارِ وَٱكْفُرُوٓاْ ءَاخِرَهُۥ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٧٢﴾ وَلَا تُؤْمِنُوٓاْ إِلَّا لِمَن تَبِعَ دِينَكُمْ قُلْ إِنَّ ٱلْهُدَىٰ هُدَى ٱللَّهِ أَن يُؤْتَىٰٓ أَحَدٌ مِّثْلَ مَآ أُوتِيتُمْ أَوْ يُحَآجُّوكُمْ عِندَ رَبِّكُمْ قُلْ إِنَّ ٱلْفَضْلَ بِيَدِ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٧٣﴾ يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٤﴾﴾

﴿وَدَّت طَّآئِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَوْ يُضِلُّونَكُمْ﴾: خـوا بەنـدە بڕواداره‌كانـی ئاگادار دەكاتەوە لـە فرووفێڵـی ئـەم كۆمەڵـە پیسـە لـە خاوەنانـی كتێـب، ئـەوان حەزیـان دەكـرد ئێـوەی مسـوڵمان گومرابكـەن، هەروەكـو خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعْدِ إِيمَٰنِكُمْ كُفَّارًا ﴿١٠٩﴾﴾البقرة، (واتـە: زۆر لـە خـاوەن نامـەكان ئاواتەخـوازن كە بتانكەنـەوە بەبێ بـڕوا دوای بڕواهێنانتان )، ئـەوەی زانراوەو دیارە هەركەسـێک حـەز لە شـتێ بـكا، هەوڵو كۆششـی بـۆ دەكا بۆئـەوەی بەدەسـتی بهێنێ، جا ئەم دەسـتەیە هەوڵو كۆششـیان دەكرد مسـوڵمانان گومرابكەن، تووشـی گومـانو دوودڵیان بكـەن بەهـەر شـێوەیە لـە تواناياندايـە، بەڵام لـە بەزەیـیو میهرەبانی خـوا ئەوەیە كـە فێڵو تەڵەكـەی خـراپ تەنهـا زیـان بـە خاوەنەكـەی دەگەیەنـێ، خـوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ﴾ هـەوڵو كۆششـیان لـە گومراكردنـی بڕواداراندا دەبێتـە مایـەی ئـەوەی زیاتـر خۆیـان گومرا بن، وە سـزای دۆزەخیـان زیاتر بۆ پێویسـت بكـرێ، خوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ زِدْنَٰهُمْ عَذَابًا فَوْقَ ٱلْعَذَابِ بِمَا كَانُواْ يُفْسِدُونَ ﴿٨٨﴾﴾النحل، (واتـە: ئەوانـەی بێبـڕوا بـوونو خەڵكیشـیان لاداوە لـە ڕێگـەی خـوا جگە لـە سـزاكەی خۆیان سـزایان بـۆ زیـاد دەكەیـن، لەبەر ئـەوەی كە خراپەكارییـان دەكـرد) ﴿وَمَا يَشْعُرُونَ﴾ (بـەم ڕاسـتیەش هەسـت ناكـەن) ئـەوان هـەوڵو كۆشـش دەدەن زیـان بەخۆیـان بگەیەنن، بێگومـان ئەوان زیـان بەئێـوە ناگەیەنن، ﴿يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَأَنتُمْ تَشْهَدُونَ﴾ چـی وایلێكـردوون كوفر بـە ئایەتەكانـی خـوا ﷻ بكەن، لەگـەڵ ئـەوەدا دەزانـن ئـەوەی لای ئێوەیە باتـڵو پووچە، ئەوەیشـی كـە موحەممـەد ﷺ بـۆی هێنـاون هـەقو ڕاسـتیەو هیـچ گومانێكتان تیایـدا نیە، بەڵكـو خۆتـان شـایەتی بـۆ دەدەن، وە هەندێكتان بـۆ هەندێكتانی ئاسـان دەكەن لـە هەندێ كاتـدا، ئەوە قەدەغـە كردنیانـە لـە گومـرا بوونیـانو سەرزەنشـتیان دەكاو هەڕەشـەیان لێ دەكات لەسـەر گومـڕا كردنـی خەڵكـی لەلایـەن ئەوانـەوە، فەرموویەتی:

﴿ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَلۡبِسُونَ ٱلۡحَقَّ بِٱلۡبَٰطِلِ وَتَكۡتُمُونَ ٱلۡحَقَّ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴾ (واتـە: ئـەی خـاوەن کتێبـەکان بـۆ پۆشـاکی درۆدەکـەن بـە بـەر ڕاسـتیدا وە ڕاسـتەکە دەشـارنەوە لـە کاتێکـدا خۆشـتان ئەمـە دەزانـن) خـوا ﷻ سەرزەنشـتی کـردوون لەسـەر ئـەوەی بـەرگ‌و پۆشـاکی هـەق دەکەنـە بـەری پـووچ‌و نـاڕەوا، وە لەسـەر شـاردنەوەی هـەق‌و ڕاسـتی، چونکـە ئەوان بـەم دووکارە شـوێنکەوتووانی خۆیـان گومـڕاو سەرلێشـێواو دەکـەن، بێگومـان زانایـان ئەگـەر پۆشـاکی هـەق بکەنـە بەر پـووچ‌و باتـڵ وە جیـاوازی‌و جیـاکاری لەنێوانیانـدا نەکـەن، بەڵکـو بـە نادیـاری‌و شـاراوەیی بیهێڵنـەوە، وە هـەق‌و ڕاسـتی بشـارنەوە کە پێویسـتە لەسـەریان دەریبخـەن، ئەو کات هـەق دەشـاردرێتەوەو پووچیـش ئاشـکرا دەبێ، لـەم حاڵەتـەدا خەڵکی سـادەو عەوام ئەوانـەی ڕاسـتیان دەوێ هیدایـەت وەرناگـرن، هەتـا هەقەکەیان بـۆ نەگوازرێتـەوەو پێیان ڕانەگەیەنـرێ، مەبەسـت لـە خـاوەن زانسـت ئەوەیە کـە هەق‌و ڕاسـتی بۆ خەڵکی ئاشـکرا بکـەن، هـەق لـە بەتـاڵ جیا بکەنـەوە، وە پـاک‌و پیس و حـەڵاڵ‌و حـەرام‌و بیرووبـاوەڕی ڕاسـتەقینەو بیرووبـاوەڕی پـووچ لەیەکتـر جیابکەنـەوە، بۆئـەوەی ببێتـە مایـەی هیدایەت بۆئـەو کەسـانەی بـەدوای هیدایەتـدا دەگەڕێـن، وە گومڕاکەرانیـش بگەڕێنەوەو پەشـیمان ببنـەوە، وە حوججـەو بەڵگـەی خـوا ﷻ لەسـەر نکوڵیـکاران پێویسـت ببـێ.



يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَلۡبِسُونَ ٱلۡحَقَّ بِٱلۡبَٰطِلِ وَتَكۡتُمُونَ ٱلۡحَقَّ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ٧١ وَقَالَت طَّآئِفَةٞ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ ءَامِنُواْ بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَجۡهَ ٱلنَّهَارِ وَٱكۡفُرُوٓاْ ءَاخِرَهُۥ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ٧٢ وَلَا تُؤۡمِنُوٓاْ إِلَّا لِمَن تَبِعَ دِينَكُمۡ قُلۡ إِنَّ ٱلۡهُدَىٰ هُدَى ٱللَّهِ أَن يُؤۡتَىٰٓ أَحَدٞ مِّثۡلَ مَآ أُوتِيتُمۡ أَوۡ يُحَآجُّوكُمۡ عِندَ رَبِّكُمۡۗ قُلۡ إِنَّ ٱلۡفَضۡلَ بِيَدِ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٞ ٧٣ يَخۡتَصُّ بِرَحۡمَتِهِۦ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ٧٤ ۞وَمِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ مَنۡ إِن تَأۡمَنۡهُ بِقِنطَارٖ يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيۡكَ وَمِنۡهُم مَّنۡ إِن تَأۡمَنۡهُ بِدِينَارٖ لَّا يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيۡكَ إِلَّا مَا دُمۡتَ عَلَيۡهِ قَآئِمٗاۗ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَالُواْ لَيۡسَ عَلَيۡنَا فِي ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ سَبِيلٞ وَيَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ٧٥ بَلَىٰۚ مَنۡ أَوۡفَىٰ بِعَهۡدِهِۦ وَٱتَّقَىٰ فَإِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَّقِينَ ٧٦ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشۡتَرُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَأَيۡمَٰنِهِمۡ ثَمَنٗا قَلِيلًا أُوْلَٰٓئِكَ لَا خَلَٰقَ لَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ وَلَا يَنظُرُ إِلَيۡهِمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ٧٧

﴿ وَإِذۡ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ لَتُبَيِّنُنَّهُۥ لِلنَّاسِ وَلَا تَكۡتُمُونَهُۥ فَنَبَذُوهُ وَرَآءَ ظُهُورِهِمۡ ﴿١٨٧﴾ ﴾آل عمـران، (واتـە: کاتـێ کە خـوا پەیمانـی لەوانە وەرگرت کـە نامەیان پێبەخشـرابوو دەبـێ ئەو نامەیـە ڕوون بکەنەوە بۆ خەڵکی‌و نەیشـارنەوە بەڵام ئـەوان فڕێیان دایە پشـتی خۆیانەوە).

پاشـان خـوا هەواڵ دەدا لەسـەرئەوەی بـە بیری ئەم دەسـتەو تاقمـە پیس‌و بۆگەنـەدا هاتوو

ویستیان فـروو فێـڵ بەرانبەر بـە بـڕواداران بکـەن ﴿ وَقَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ ءَامِنُواْ بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَجۡهَ ٱلنَّهَارِ وَٱكۡفُرُوٓاْ ءَاخِرَهُۥ ﴾ واتـە: بچنـە نـاو ئاینەکەیانەوە و بـاوەڕ بهێنـن لـە سـەرەتای ڕۆژدا، بـە شـێوەی فرووفێڵکـردن، لـە کۆتای‌و ئاخـری ڕۆژدا پەشـیمان ببنـەوەو بەدرۆیـان بخەنـەوە ﴿ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ﴾ (بەڵکو مسـوڵمانان بگەڕێنەوە) لـە ئاینەکەیـان‌و پەشـیمان ببنـەوە، بڵێـن: ئەگـەر ئیسـلام ڕاسـت بوایـە ئەوانـەی خـاوەن کتێبـن چـۆن لێـی پەشـیمان ئەبوونـەوە، ئەمەی کـە ویسـتیان بیکـەن بەرانبەر بـڕواداران سەرسـام بـوون بوو بە نەفـس‌و دەروونی خۆیـان، وە وایـان دەزانی خەڵکی گومانی باشـیان بۆدەبـەن‌و شـوێنی قسـەو کردەوەکانیان دەکـەون لەوەی کـە دەیڵێن‌و دەیکـەن، بەڵام خوا ئـەوە قەبـووڵ نـاکاو خـۆی زۆر لـەوە بەگەورەتـر دەگـرێ، ڕووناکـی خۆی هـەر تەواو دەکات ئەگـەر کافرانیـش حـەزی پێ نەکـەن‌و پێیـان ناخۆش بـێ. ﴿ وَلَا تُؤۡمِنُوٓاْ إِلَّا لِمَن تَبِعَ دِينَكُمۡ ﴾ (واتـە: متمانەتـان بە کەس مەکـەن‌و دڵنیامەبن‌و کەس بەڕاسـت مەزان، جگە لەو کەسـەنەبێ کەلەسـەر دینـی خۆتانـە)، وە ڕازوو نیازتان بشـارنەوە بێگومـان ئەگەر ئێوە هـەواڵ بـدەن بـە غەیری خۆتـان وە جگـە لەوانـەش لەسـەر ئاینەکەتانـن، ئـەوە ئەوانیش وەکـو ئێوە زانسـت بەدەسـت دەهێنـن، یان لـە لای خوا ﷻ دەبن بە شـایەت بەسـەرتانەوە کـە بەڵگەو حوجەتان لەسـەر پێویسـت کراوەو بیانووتـان نەماوە، وە ڕێنماییتـان بۆ ڕوون بوەتـەوەو شـوێنی نەکەوتـوون، پوختـەی باسـەکە ئەوەیە: ئـەوان وایان دەزانـی ئەگەر ئەو زانیاریـەی لایانـە بـە ئیماندارانـی ڕانەگەیەنـن ئـەوا زانیاریان پـێ ناگات، چونکە زانسـت بەبۆچوونـی ئـەوان هەردەبـێ لـە لای ئەوانـەوە بـێ، وە دەبـێ ئـەوان ببنە بەڵگـەو حوجەجە بەسـەر ئیماندارانـەوە، خـوا ﷻ ئەمـەی ڕەت کردەوە بەسـەریاندا بـەوەی ﴿ ٱلۡهُدَىٰ هُدَى ٱللَّهِ ﴾ (هیدایـەت هـەر هیدایەتـی خوایـە)، کرۆکـی هیدایـەت تەنهـا لـە لای خوایـە، بـۆ هـەر کەسـێ بیـەوێ هیدایـەت وەربگـرێ، بێگومـان هیدایـەت یـان زانینی هەقـە، یا پێشخسـتنێتی بەسـەر هەمـوو شـتێکی دیکـەدا، وە هیـچ زانیاریـەک نیە جگە لەو زانسـتەی پێغەمبـەران هێناویانـە، وە هیـچ کەس سـەرکەوتوو نابێ تەنها مەگەر خوا ﷻ سـەرکەوتوی بـکات، خـاوەن کتێبەکانیـش زانسـتیان پێنـەدرا تەنهـا تۆزێکـی کـەم نەبێ، بـەڵام ئەوان لـە سـەرکەوتن بێبەشـن، لەبـەر پیسـی ڕازو نیـازوو مەبەسـتەکانیان، بـەڵام ئـەم ئوممەتـە بەڕاسـتی بۆیـان دەسـتەبەر بـوو -سـوپاس‌و سـتایش بۆ خـوا ﷻ- لـە هیدایەتـی خوا ﷻ لـەو زانسـت‌و زانیاریانـەی لەگـەڵ کـردەوە پێکردنـدان، بوە مایـەی ئەوەی پێـش بکەون

بەسەر هەموو کەسێکدا، ئەوان بوونە ڕێنمایی کار کە بە فەرمانی خوا ﷻ ڕێنماییان دەکرد، ئەمەش دیارە لە فەزڵو چاکەو مەزنی خوایە بۆیان، لەبەرئەمە فەرموویەتی: ﴿ قُلۡ إِنَّ ٱلۡفَضۡلَ بِيَدِ ٱللَّهِ ﴾ (واتە: تەنها خوای گەورە چاکە لەگەڵ بەندەکانیدا دەکات بە جۆرەها چاکە) ﴿ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُ ﴾ هەر کەسێک بە هۆکارەکانی هەستێت ﴿ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ ﴾ خاوەنی فەزڵی زۆرو چاکەکانە، ﴿ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴾ زانایە بەوەی کێ شایستەی ئەو چاکەیە پێی دەبەخشێ، وە کێ شایستەی نیە لێی دەگرێتەوە، ﴿ يَخۡتَصُّ بِرَحۡمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ ﴾ (ڕەحمەتو میهرەبانی خۆی تایبەت دەکات بۆهەر کەسێ بیەوێت)، بەبەزەیی ڕەهای وای لێدەکات هەر لە دنیادا پەیوەندی دروست بکات لەگەڵ دوارۆژ، ئەویش نیعمەتی دینو تەواو کاریەکانێتی ﴿ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ﴾ (واتە: خوا ﷻ خاوەن چاکەو فەزڵو بەهرەی زۆر مەزنە) کە وەسفکاران ناتوانن وەسفی بکەن، وە بە ختوورە بە دڵی هیچ کەسێکدا نایە، بەڵکو فەزڵو چاکەی خوا ﷻ گەیشتۆتە ئەو شوێنەی کە زانستی پێی گەیشتووە، پەروەردگارمان! دەوری هەموو شتێکت داوە بە میهرەبانیو زانست).

(٧٥-٧٧): ﴿ وَمِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ مَنۡ إِن تَأۡمَنۡهُ بِقِنطَارٖ يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيۡكَ وَمِنۡهُم مَّنۡ إِن تَأۡمَنۡهُ بِدِينَارٖ
لَّا يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيۡكَ إِلَّا مَا دُمۡتَ عَلَيۡهِ قَآئِمٗاۗ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَالُواْ لَيۡسَ عَلَيۡنَا فِي ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ سَبِيلٞ وَيَقُولُونَ
عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ٧٥ بَلَىٰۚ مَنۡ أَوۡفَىٰ بِعَهۡدِهِۦ وَٱتَّقَىٰ فَإِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَّقِينَ ٧٦ إِنَّ
ٱلَّذِينَ يَشۡتَرُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَأَيۡمَٰنِهِمۡ ثَمَنٗا قَلِيلًا أُوْلَٰٓئِكَ لَا خَلَٰقَ لَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ
ٱللَّهُ وَلَا يَنظُرُ إِلَيۡهِمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ٧٧ ﴾:

﴿ وَمِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ ﴾ خوای بەرزو مەزن هەواڵ دەدا دەربارەی حاڵی خاوەن کتێبەکان لە دەستپاکیو خیانەتدا لەماڵو سامان، کاتێ باسی خیانەتی کردوون لە ئایندا، وە فێڵکردنو شاردنەوەی هەقو ڕاستی، هەواڵی داوە هەم خیانەتکارو هەم بە وەفاو دەستپاکیان تیایاندا ﴿ مَنۡ إِن تَأۡمَنۡهُ بِقِنطَارٖ ﴾ ئەویش ماڵو سامانێکی زۆرە ﴿ يُؤَدِّهِۦٓ ﴾ (دەیداتەوە) جا ئەگەر ماڵە کە کەم بێت ئەوە لەپێشترە، وە تیایاندا هەیە ﴿ وَمِنۡهُم مَّنۡ إِن تَأۡمَنۡهُ بِدِينَارٖ لَّا يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيۡكَ ﴾ (وە هەی واشیان تێدایە ئەگەر دینارێکی لا دابنێی ناتداتەوە)، ئەگەر ماڵو سامانەکە زۆر بێت ئەوە لە پێشتر بۆ نەدانەوەی، ئەوەی بووەتە مایەی ئەوەی ناپاکیو بێ وەفایی لە گەڵتاندا، ئەوان پێیان وایە کە ﴿ لَيۡسَ ﴾ لەسەریان ﴿ فِي ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ سَبِيلٞ ﴾ واتە: (لە خواردنی ماڵی ئەو نەخوێندەوارانە)، گوناهیان ناگات

ئەگــەر ماڵەکانیــان پێنەدەنــەوە، لەبەر ئــەوەی بە بۆچوونی پــووچو بۆگەنیــان زۆر بەکەمیان دادەنــان، خۆیــان لە ئەوپــەڕی مەزنیدا تەماشــا دەکرد، لــە حەقیقەتدا خۆیان ڕیســواو زەلیلو بــێ نرخــن، هیــچ ڕێزێکیان بــۆ نەخوێنــدەوارەکان دانەدەنا، ئــەو کارەیان بۆ خۆیــان بەرەوا دەبینــی، دوو شــتیان پێکــەوە کۆ کــردەوە خواردنی قەدەغەکــراوو بە حەڵاڵ زانینــی، ئا ئەمە درۆ بــوو بەدەم خواوە، چونکە زانــا کە قەدەغەکراوێک حــەڵاڵ دەکات لای خەڵکی زانراوە ئــەو بڕیــارە لــە لایەن خــواوە دەدات، لــە خۆیەوە قســە ناکات، جــا ئەگەر لە خۆیــەوە بێت ئــەوە درۆیە، بۆیە فەرموویەتــی: ﴿وَيَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ (واتە: درۆ بــۆ خــوا هەڵدەبەســتن، وە خۆیــان دەزانــن کــە درۆ ئەکــەن)، ئەمــە مەزنترین تاوانــە بەدەم خــواوە بە بێ زانســت.

پاشــان بۆچوونــە پووچەکەیانی ڕەتکــردەوە، فەرمــووی: ﴿بَلَىٰ﴾ (واتە: نەخێــر وانیە)، بەو جــۆرە نیــە کە پێتان وایــە، ماڵی نەخوێندەواران بخــۆن بە ناهەق، بەڵکو خواردنــی ماڵی ئەوان مەزنتریــن تاوانــە توندتریــن ســەرپێچیە ﴿مَنْ أَوْفَىٰ بِعَهْدِهِۦ وَٱتَّقَىٰ﴾ (واتــە: هەر کەســێک پەیمانــی خــۆی بەجــێ بێنێتو پارێــزکاری بکات)، پەیمان: ئــەو پەیمانــە دەگرێتەوە کە لە نێوانــی بەنــدەو پەروەردگــاری دایە، ئەویــش هەموو ئەو مافانەیــە کە خوا پێویســتی کردوە لەســەر بەندەکــەی لــە مافەکانی خــۆی، هەروەها پەیمانــی نێــوان بەنــدەو بەندەکانی تریش دەگرێتــەوە، تەقــوا لــەم جێگایەیــەدا بە مانــای خۆپاراســتن دێت لــەو ســەرپێچیانەی کە لە نێــوان بەنــدەو پەروەردگاریدایــە، وە لــە نێــوان بەنــدەو بەندەکانی تــر دایە، جا هەرکەســێ بەوشــێوەیە بــوو، ئــەوە لــە خۆپارێزانو لــە خواترســانە، خوا ﷻ خۆشــی دەوێن، یەکســانە ئەگــەر لــە نەخوێنــدەوارەکان بێــت، یــان غەیری ئــەوان، جــا هەرکەســێ بڵــێ: گوناهمان ناگــات لــە خواردنی ماڵی ئــەو نەخوێندەوارانــە، ئەوە پەیمانی خــۆی بەجێنەهێنــاوەو تەقوای خــوای نەکــردوە، لەوانــە نیــە کــە خــوا ﷻ خۆشــی دەویــن، بەڵکــو لەوانەیە کــە خوا ﷻ ڕقــی لێیانــە، جا ئەگــەر نەخوێنــدەوارەکان بزانن بە بەوەفابــوون بە پەیمانــەکانو بە تەقوای خــوا ﷻو بوێــری نەکــەن لەســەر ماڵــە قەدەغەکــراوەکان، ئەوانە لــە خۆشەویســتانی خواو لەخــوا ترســانن، ئەوانەن بەهەشــتیان بۆ ئامــادە کــراوە، وە باشــترینی بەدیهێنراوەکانی خواو بەڕێزترینیانــن، بــە پێچەوانەی ئەوانــەی دەیانووت: گوناهمــان ناگات لە خواردنــی ماڵی ئەم نەخوێندەوارانــە، ئەوانــە دەچنە نێــو وتەی خــوا ﷻ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَٰنِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا﴾ (بێگومــان ئەوانەی پەیمانی خواو ســوێندەکانیان بە نرخێکی کەم دەفرۆشــن)،

وە دەچێتــە نێــو ئــەم دەقــەوە هەمــوو ئەوکەســانەی لە دنیــادا شــتێ وەردەگرن لــە بەرانبەر وازهێنانــی هەنــدێ لەو شــتانەی کە مافــی خوان بەســەر بەندەکانیەوە، یاخود مافــی خەڵکین، هەروەهــا ئــەو کەســەی ســوێند دەخــوا بۆ ئــەوەی ماڵی کەســێکی بێتــاوان بۆ خــۆی ببات، ئــەوە دەچێتــە نێو ئــەم دەقــەوە، جــا ئــەو کەســانە: ﴿لَا خَلَٰقَ لَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ﴾ واتە: هیچ بەشــێکی چاکەیــان نیە لــە دنیــادا ﴿وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ﴾ (واتــە: وە خوا قســەیان لەگەڵ نــاکات) لــە ڕۆژی دواییــدا لەبەر ئــەوەی لێیــان تووڕەیە، چونکــە هــەواو ئارەزوویان پێش خســتووە بەســەر ڕەزامەندی پەروەردگاریاندا ﴿وَلَا يُزَكِّيهِمۡ﴾ واتــە: پاکیان ناکاتەوەو لــە گوناهیان خــۆش نابێــت، وە عەیبو کــەمو کوڕیەکانیان لــێ لانابات ﴿وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾ واتــە: ســزایەکی بــە ئێــش بــۆ دڵو جەســتەکان، ئەویش ســزای تورەیــیو پەردە پۆشــیە، وە ســزای دۆزەخ، داوا دەکەیــن لە خــوا بمانپارێزی.


وَإِنَّ مِنْهُمْ لَفَرِيقًا يَلْوُۥنَ أَلْسِنَتَهُم بِٱلْكِتَٰبِ لِتَحْسَبُوهُ
مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمَا هُوَ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَيَقُولُونَ هُوَ مِنْ
عِندِ ٱللَّهِ وَمَا هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَيَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ
وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٧٨﴾ مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُؤْتِيَهُ ٱللَّهُ ٱلْكِتَٰبَ
وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ ثُمَّ يَقُولَ لِلنَّاسِ كُونُوا۟ عِبَادًا لِّى مِن
دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِن كُونُوا۟ رَبَّٰنِيِّۦنَ بِمَا كُنتُمْ تُعَلِّمُونَ
ٱلْكِتَٰبَ وَبِمَا كُنتُمْ تَدْرُسُونَ ﴿٧٩﴾ وَلَا يَأْمُرَكُمْ أَن
تَتَّخِذُوا۟ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ وَٱلنَّبِيِّۦنَ أَرْبَابًا ۗ أَيَأْمُرُكُم بِٱلْكُفْرِ بَعْدَ
إِذْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿٨٠﴾ وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلنَّبِيِّۦنَ لَمَآ ءَاتَيْتُكُم
مِّن كِتَٰبٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا
مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِۦ وَلَتَنصُرُنَّهُۥ ۚ قَالَ ءَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ
عَلَىٰ ذَٰلِكُمْ إِصْرِى ۖ قَالُوٓا۟ أَقْرَرْنَا ۚ قَالَ فَٱشْهَدُوا۟ وَأَنَا۠ مَعَكُم
مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٨١﴾ فَمَن تَوَلَّىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ
ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٨٢﴾ أَفَغَيْرَ دِينِ ٱللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُۥٓ أَسْلَمَ مَن فِى
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴿٨٣﴾

(٧٨): ﴿ وَإِنَّ مِنْهُمْ لَفَرِيقًا يَلْوُۥنَ أَلْسِنَتَهُم بِٱلْكِتَٰبِ لِتَحْسَبُوهُ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمَا هُوَ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَيَقُولُونَ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَمَا هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَيَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٧٨﴾ ﴾:

﴿ وَإِنَّ مِنْهُمْ لَفَرِيقًا يَلْوُۥنَ أَلْسِنَتَهُم بِٱلْكِتَٰبِ ﴾: خوا هەواڵ دەدات دەستەیەک لە خـاوەن کتێبەکان لە کاتـی خوێندنەوەی کتێبەکانیانـدا جۆرێـک زمانیـان بەیەکـدا دەدەن، واتـە: ماناکـەی دەگـۆڕنو لـە مەبەسـتی خـۆی لایـدەدەن، ئەمـەش گۆڕینو دەسـتکاریکردنی بێـژەو واتاکانی دەگرێتـەوە، لـە ڕاسـتیدا مەبەسـت لـە کتێـب ئەوەیە وشـەو بێژەکانـی بپارێزرێو دەسـتکاری نەکـرێ، وە لە مەبەسـتی تێگاو خەڵکـی تێبگەیەنێ، بەڵام ئەوان ئـەو بابەتەیان پێچەوانـە کـردەوە، دەمیان بـادەداو خەڵکیان بەهەڵـە تێدەگەیاند، یان درێژیـان کردۆتەوەو فراوانیـان کـردوە، یـا دەریان بڕیـوە، جا نموونـەی درێژ کردنـەوە خـوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ لِتَحْسَبُوهُ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ ﴾ واتـە: زمانیـان پێـچ پێـدەدەنو دەمیـان لار دەکەنـەوە، وەهـەمو گومانێکتـان لا دروسـت دەکـەن گوایـە ئەوە لـە لایەن خواوەیـە، لەکاتێکـدا ئەوە مەبەسـت نیـە، وە نموونـەی دەربڕیـن وەک خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ وَيَقُولُونَ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَمَا هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَيَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴾ (واتـە: وە دەڵێـن ئەوە لـە لایـەن خواوەیـە لـە کاتێکدا ئـەوە لە لایەن خـواوە نیـە، وە درۆ بـەدەم خـواوە دەکەن خۆشـیان دەزانـن) ئەمـە مەزنتریـن تاوانە لەوەی قسـەی بەدەم خـواوە بکات بەبێ زانسـت، ئەوانـە درۆ بـەدەم خواوە دەکـەن، ڕەتکردنەوەی مانای ڕاسـتیو جێگیرکردنـی مانای پووچ پێکـەوە کۆدەکەنـەوە، وە ئـەو وشـانەی کە بەڵگەن لەسـەر هەق ڕاسـتی بۆ مانـای پووچو بەتـاڵ بەکاریدەهێنـن، لەگـەڵ ئـەوەدا زانسـتیان پێـی هەیە.

(٧٩-٨٠): ﴿ مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُؤْتِيَهُ ٱللَّهُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ ثُمَّ يَقُولَ لِلنَّاسِ كُونُوا۟

عِبَادًا لِّي مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِن كُونُواْ رَبَّٰنِيِّـۧنَ بِمَا كُنتُمۡ تُعَلِّمُونَ ٱلۡكِتَٰبَ وَبِمَا كُنتُمۡ تَدۡرُسُونَ
﴿٧٩﴾ وَلَا يَأۡمُرَكُمۡ أَن تَتَّخِذُواْ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ أَرۡبَابًاۗ أَيَأۡمُرُكُم بِٱلۡكُفۡرِ بَعۡدَ إِذۡ أَنتُم مُّسۡلِمُونَ
﴿٨٠﴾ ﴾:

ئـەم دەقـە دابەزیـوە لە وەڵامدانـەوەی ئەو كەسـانەی لە خـاوەن كتێبن، كاتـێ پێغەمبەر ﷺ فەرمانـی كـرد بـە بڕواهێنـان پێـیو گوێڕایەڵیكردنـی ئـەوان بەرپەرچیان دایـەوەو وتیان: ئـەی موحەممـەد ئایـا دەتـەوێ تـۆ لەگەڵ خـوادا بپەرسـتین؟ كـە وتەی خـوا ﷻ: ﴿ مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُؤۡتِيَهُ ٱللَّهُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحُكۡمَ وَٱلنُّبُوَّةَ ﴾ (واتـە: ڕەوا نیەو ئەسـتەمە مرۆڤێك كـە خـوا منەتی كردبێ بەسـەریداو كتێبـی بـۆ دابەزاندبێ، وە فێـری زانسـتو زانیاریەكی كردبـێ پێشـتر نەیزانیبـێ، وە كردبێتیـە نێـردراو بۆناو خەڵكی، كـە ﴿ يَقُولَ لِلنَّاسِ كُونُواْ عِبَادًا لِّي مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ (واتـە: بـە خەڵكـی بڵـێ ببن بە بەنـدەی من لە جیاتـی خوا ﷻ) بـە ڕاسـتی ئەمـە لـە ئەسـتەمترینی ئەسـتەمەكانە كـە یەكـێ لـە پێغەمبـەران شـتی وابڵێ، چونكـە ئەمـە خراپترینـی فەرمانەكانـە، وە پێغەمبەرانیـش تەواوترینی نـاو مرۆڤایەتین، بۆیە فەرمانەكانیـان گونجـاوە لەگـەڵ پلـەو پایەیانـدا، ئـەوان فەرمـان ناكـەن تەنهـا بـەو كارە بـەرزوو جوانانـە نەبێ، ئـەوان مەزنترینی نـاو مرۆڤایەتین لـە قەدەغەكردنی كارە ناشـرینو قیزەونـەكان، لەبەرئەمـە فەرموویەتـی: ﴿ وَلَٰكِن كُونُواْ رَبَّٰنِيِّـۧنَ بِمَا كُنتُمۡ تُعَلِّمُونَ ٱلۡكِتَٰبَ وَبِمَا كُنتُمۡ تَدۡرُسُونَ ﴾ بەڵكـو فەرمـان بـە خەڵكـی دەكـەن بەوەی كـە ملكەچـی تەواوی فەرمانەكانـی خـوا ﷻ بن، مەبەسـت لە (رَبّانین)، واتە: زاناو حەكیمو لەسـەرخۆ، مامۆسـتای خەڵكـی و پەروەردكەریـان، خەڵكـی فێـر بكەن بە زانسـتی بچـووك لە پێش گـەورەكان، وە خۆیـان كاری پێبكـەن، ئـەوان خەڵكی فێری زانسـتو، كـردەوەو، فێر كـردن دەكەن، ئـا ئەم سـیانە چەقی خۆشـبەختی مرۆڤایەتین، وە بە لە دەسـتدانی شـتێك لەمانـە ناتەواویو بۆشـایی دروسـت دەبـێ، وە پیتی (بـ) لە وتەی خـوا: ﴿ بِمَا كُنتُمۡ تُعَلِّمُونَ ﴾ تـا كۆتایی، ئـەم (بـاء)ە، (بـاء السَّببية)ی پـێ دەوتـرێ، واتـە: بـائی هـۆكار، واتـە: بە هـۆی ئەوەی خەڵكـی فێردەكـەن لـەو زانسـتەی كـە هەیانـە، وە خۆشـتان فێـری كتێبی خواو سـوننەتی پێغەمبەرەكـەی دەبـن، كـە بە خوێنـدنو وانە وتنەوە زانسـتان دەچەسـپێو دەمێنێتـەوە، بەو شـێوەیە دەبن بـە (رَبّاني).

﴿ وَلَا يَأۡمُرَكُمۡ أَن تَتَّخِذُواْ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ أَرۡبَابًا ﴾ وە (فەرمانتـان پـێ ناكات كە فریشـتەو پێغەمبـەران بكـەن بـە پەرسـتراوی خۆتـان)، ئەمـە گشـتاندنە دوای تایبـەت كـردن، واتە:

فەرمانتــان پــێ نــاکات بــە بەندایەتــی نەفســی خــۆی، وە بــە بەندایەتــی هیــچ یەکێــک لە دروســتکراوانی خــوا لــە فریشــتەکانو پێغەمبەرانــی خــواو جگــە لــە ئەوانیــش ﴿أَيَأۡمُرُكُم بِٱلۡكُفۡرِ بَعۡدَ إِذۡ أَنتُم مُّسۡلِمُونَ﴾ (واتــە: چــۆن فەرمانتــان پێ دەکات بێ بڕوا بــن، دوای ئەوەی ئێــوە بــڕوادار بــوون)؟ ئەمە بە هیــچ شــێوەیەک نابێو وە عەقــڵ نایبڕێ کەســێک خوا ﷻ منەتــی پێغەمبەرایەتــی کردبێ بەســەریداو قســەی لــەو جۆرە بــکات، جا هەرکەســێ ئەوان لەکــەدار بکات بەجۆرێ لەو قســەو قســەڵۆکانە، ئەوە بە ڕاســتی تاوانێکی مــەزنو کوفرێکی زیانبەخشــی ئەنجامداوە.

(٨١-٨٢): ﴿وَإِذۡ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ لَمَآ ءَاتَيۡتُكُم مِّن كِتَٰبٖ وَحِكۡمَةٖ ثُمَّ جَآءَكُمۡ رَسُولٞ مُّصَدِّقٞ لِّمَا مَعَكُمۡ لَتُؤۡمِنُنَّ بِهِۦ وَلَتَنصُرُنَّهُۥۚ قَالَ ءَأَقۡرَرۡتُمۡ وَأَخَذۡتُمۡ عَلَىٰ ذَٰلِكُمۡ إِصۡرِيۖ قَالُوٓاْ أَقۡرَرۡنَاۚ قَالَ فَٱشۡهَدُواْ وَأَنَا۠ مَعَكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٨١﴾ فَمَن تَوَلَّىٰ بَعۡدَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿٨٢﴾﴾:

خــوا ﷻ هــەواڵ دەدات کــە پەیمانی لــە پێغەمبەران وەرگرتــووە، وە بەڵێنی پتــەوو بەهێزی لێوەرگرتــوون، بەهــۆی ئــەو کتێبەی کە بۆ نــاردوون، وە بە هۆی ئــەو حیکمەتە جیاکەرەوە لــە نێــوان هەقو پــووچو هیدایــەتو گومڕایــی، بێگومان خــوا ﷻ پێغەمبەرێکــی بۆ ناردن بەڕاســتدانەری ئــەو کتێبانەیــە کــە بــۆ ئێــوە هاتــووە، پێویســتە ئیمانــی پێبهێننو بەڕاســتی بزانــن، وە دەبــێ هەواڵــی ئــەم پێغەمبــەرەش بگەیەنــن بــە گەلەکانی خۆتــانو بەڵێنیــان لێ وەربگــرن، خــوا ﷻ پێویســتی کردوە لەســەر پێغەمبــەران (علیهم الســلام) هەندێکیــان بڕوا بــە هەندێکیــان بهێننو هەندێکیان بەڕاســت دانــەری هەندێکی دیکەیان بــن، چونکە ئەوەی لــە لای هەموویانــە لــە لای خواوە بۆیــان دابەزیوە (لە یەک ســەرچاوەوە)، هەرشــتێکیش لە لایەن خواوە بێت پێویســتە بەڕاســت دابنرێتو بــڕوای پێبهێنرێت، هەمــوو پێغەمبەران وەکو یــەک شــت وان، بۆیە زانرا بەڕاســتی موحەممــەد ﷺ کۆتــا پێغەمبەرانە، هەمــوو پێغەمبەران (علیهــم الســلام) ئەگــەر بگەشــتبان پێــی، ئەوە پێویســت بــوو لەســەریان بــڕوای پێبهێننو شــوێنی بکــەونو ســەری بخــەن، موحەممــەد ﷺ دەبــووە پێشــەواو ڕابــەرو سەرمەشــقیان، ئــەم دەقــە پیــرۆزە لەمەزنترینــی بەڵگەکانــە لەســەر بــەرزی پلــەو پایــەی گەورەیــی ڕێزو حورمەتــی، بێگومــان ئــەو چاکترینــی نێــو پێغەمبــەرانو گەورەترینیانــە، کاتــێ خــوا ﷻ پەیمانــی داپێدانانــی لــە پێغەمبــەران وەرگــرت: ﴿قَالُوٓاْ أَقۡرَرۡنَا﴾ واتــە: ئــەوەی فەرمانت پێکردیــن وەرمان گرتو خســتمانە سەرســەرو ســەرچاومان ﴿قَالَ﴾ خوا پێــی فەرموون:

﴿ فَٱشۡهَدُواْ ﴾ شـایەتی بدەن لەسـەر خۆتانو لەسـەر گەلەکانتان بـەوە، فەرمووی: ﴿ وَأَنَا۠ مَعَكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ۝٨١ فَمَن تَوَلَّىٰ بَعۡدَ ذَٰلِكَ ﴾ (واتـە: وە منیـش لەگـەڵ ئێـوە یەکێکم لە شـاهیدان * جـا ئەوەی پشـتی هەڵکـرد دوای) ئـەم پەیمـانو بەڵێنە جەخت لەسـەر کراوە، لـە دانپێدانـانو شـایەتیدان بـە خـواو پێغەمبەرەکـەی ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴾ (واتـە: کەواتـە هـەر ئەوانـن دەسـتەی دەرچـووان لـە فەرمانـی خـوا)، جـا بـە پێـی ئەمە هەرکەسـێک بانگەشـەی ئـەوە بکات کە ئەو لـە شـوێنکەوتەی پێغەمبەرانە (علیهم السـلام) وەکـو جولەکەو گـاورەکانو شـوێنکەوتووانیان، بە ڕاسـتی ئـەم پەیمانە پتـەوو بەهێزەیان پشـتگوێ خسـتووە، لەبـەر ئەو لە سـنوور دەچوونەیـان، شایسـتەی ئەوەن بۆ هەمیشـەیی لە دۆزەخـدا بمێننـەوە، ئەگـەر بڕوا بـە موحەممـەد ﷺ نەهێنن.

(٨٣): ﴿ أَفَغَيۡرَ دِينِ ٱللَّهِ يَبۡغُونَ وَلَهُۥٓ أَسۡلَمَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ طَوۡعٗا وَكَرۡهٗا وَإِلَيۡهِ يُرۡجَعُونَ ﴾:

﴿ أَفَغَيۡرَ دِينِ ٱللَّهِ يَبۡغُونَ ﴾:(واتـە: ئایـا داواکارانو ئارەزوومەنـدان داوای ئاینێ دەکەن بیجگـە لـە ئاینـی خـوا)؟ ئەمـە نـە دەبـێو نـە دەگونجـێ، چونکـە هیـچ ئاینێـک چاکتر نیـە لـە ئاینـی خـوا ﴿ وَلَهُۥٓ أَسۡلَمَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ طَوۡعٗا وَكَرۡهٗا ﴾ (واتە: لـە کاتێکـدا هەرچـی لـە ئاسـمانو زەویدا هەیە تەسـلیمی خـوان بیانـەوێ یـان نەیانەوێ) دروسـتکراوان هەموویـان ملکـەچو ژێر بارو تەسـلیمی فەرمانی خوای گەورەن بە ویسـتو ئـارەزووی خۆیـان، ئەوانیـش بڕوادارانـی گوێڕایەڵن بۆ عیبـادەت کردنـی پەروەردگاریان، ﴿ وَكَرۡهٗا ﴾ ناچـارن، ئەوانـەش هەمـوو دروسـتکراوەکانن، تەنانـەت بـێ بڕوایانیش، ملکـەچو تەسـلیمی قـەزاو قەدەری خـوای مەزنـن، ناتوانن لێـی دەربچن، ناشـتوانن ڕێگری لێبکـەن، گەڕانـەوەو سـەرەنجامی هەموو دروسـتکراوەکان تەنها بۆ لای خوایـە، دادوەری لە نێوانیانـدا دەکاتو پاداشـتیان دەداتـەوە لـە نێوان فـەزڵو چاکـەو دادپەروەریدا.

قُلْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ
وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ
وَعِيسَىٰ وَٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ
وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ ٨٤ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن
يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ٨٥ كَيْفَ
يَهْدِى ٱللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا۟ بَعْدَ إِيمَٰنِهِمْ وَشَهِدُوٓا۟ أَنَّ
ٱلرَّسُولَ حَقٌّ وَجَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ
ٱلظَّٰلِمِينَ ٨٦ أُو۟لَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُمْ أَنَّ عَلَيْهِمْ لَعْنَةَ ٱللَّهِ
وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ٨٧ خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يُخَفَّفُ
عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ٨٨ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِنۢ
بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ٨٩ إِنَّ ٱلَّذِينَ
كَفَرُوا۟ بَعْدَ إِيمَٰنِهِمْ ثُمَّ ٱزْدَادُوا۟ كُفْرًا لَّن تُقْبَلَ تَوْبَتُهُمْ
وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلضَّآلُّونَ ٩٠ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ
كُفَّارٌ فَلَن يُقْبَلَ مِنْ أَحَدِهِم مِّلْءُ ٱلْأَرْضِ ذَهَبًا وَلَوِ
ٱفْتَدَىٰ بِهِۦٓ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ٩١

(٨٤): ﴿ قُلْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ ﴿٨٤﴾ ﴾:

هاوشێوەی ئەم دەقە لە سوورەتی بەقەرەدا هاتووەو لەوێدا باسمان لێوە کردوە. پاشان خوا ﷻ فەرموویەتی:

(٨٥): ﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٨٥﴾ ﴾:

واتە: هەرکەسێک بێجگە لە ئاینی ئیسلام هەر ئاینێک هەڵبژێرێ، کە خوا ﷻ پێی ڕازی بووە بۆ بەندەکانی، ئەوە کردەوەکانی ڕەتدەکرێتەوەو لێی وەرناگیرێ، چونکە ئاینی ئیسلام، ملکەچ بوونو دڵسۆزی بۆ خواو بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ لە خۆ دەگرێ، هەر کەسێ بە ئیسلامەوە نەگەڕێتەوە بۆ لای خوا ﷻ، ئەوە بە هۆکاری ڕزگار بوون لە سزای خواو بە دەستهێنانی پاداشت نەگەڕاوەتەوە، وە هەر ئاینێکی دیکە جگە لە ئیسلام پووچە.

(٨٦-٨٨): ﴿ كَيْفَ يَهْدِى ٱللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا۟ بَعْدَ إِيمَٰنِهِمْ وَشَهِدُوٓا۟ أَنَّ ٱلرَّسُولَ حَقٌّ وَجَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٦﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُمْ أَنَّ عَلَيْهِمْ لَعْنَةَ ٱللَّهِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿٨٧﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴿٨٨﴾ ﴾:

ئەمە لە بابەتی بە دوور زانینە، واتە: شتێکی دوورە خوا ﷻ هیدایەتی گەلێک بدات کە کوفرو گومراییان هەڵبژاردووە، دوای ئەوەی بروایان هێناوەو شایەتیان داوە کە پێغەمبەر ﷺ هەقو ڕاستە لە و پەیامەی بۆی هێناون، بە بەڵگەی ئاشکراو یەکلاکەرەوە ﴿ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ (واتە: وە خوا ڕێنمایی گەلی ستەمکاران ناکات)،

ئـا ئەوانـە سـتەمیان کـردو وازیـان لـە هـەقو ڕاسـتی هێنا پـاش ئـەوەی ناسـیبوویان، وە شـوێنی پـووچ کەوتن لەگەڵ ئـەوەدا دەیانزانی پووچـە، ئەمیش بەهۆی ئەوەی سـتەمکاروو گومـڕاو شـوێنی هـەواو ئارەزوویـان کەوتبـوون، ئائەوانـە خـوا ﷻ سـەرکەوتوویان ناکا بـۆ ڕێنمایـی کـردن چونکە کەسـێ ئومێـدی هیدایەتـی لێدەکرێ هەق نەناسـێو سـووربێ لەسـەر دۆزینـەوەی، ئائەمـە ئەسـتەمە خـوا ﷻ هۆکارەکانـی هیدایەتـی بۆ دەسـتەبەر بکاو بیپارێـزێ لـە هۆکارەکانـی گومڕابوون.

پاشـان هەواڵـی داوە دەربـارەی سـزای کەللەڕەقـە سـتەمکارەکان لـە دونیـاو دوارۆژدا، جا فەرموویەتـی: ﴿ أُوْلَـٰٓئِكَ جَزَآؤُهُمۡ أَنَّ عَلَيۡهِمۡ لَعۡنَةَ ٱللَّهِ وَٱلۡمَلَـٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجۡمَعِينَ ﴿٨٧﴾ خَـٰلِدِينَ فِيهَا لَا يُخَفَّفُ عَنۡهُمُ ٱلۡعَذَابُ وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ ﴾ (واتـە: ئەوانـە سـزایان ئەوەیـە نەفرینـی خواو فریشـتەو هەموو خەڵکیان لەسـەرە، لـەو (نەفرینەدا) دەمێننـەوە بە یەکجاری، سـزایان لێ سـووک ناکرێت، وە مۆڵەتیش نادرێن)، واتە: سـزایان لەسـەر سـووک ناکرێت بـۆ تەنهـا سـاتێکیش، نـەک بـە لابردنـی ، یـان لابردنـی هەندێـک لـەو نارەحەتیە ﴿ وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ ﴾ (واتـە: مۆڵـەت نادرێـن) چونکە کاتـی مۆڵەت پێـدان کۆتایـی پێهاتووە، بەڕاسـتی خـوا بیانووی پێـدان، وە ئەوەنـدەش تەمەنی درێژ کـردن کە بتوانن بیـر بکەنەوە ، ئەگـەر چاکەو خێریـان پێوەبووایە ئەوە هیدایـەت دەدران، ئەگەر دووبـارەش بگەڕێنرێنەوە بـۆ دونیـا دووبارە دەچنەوە سـەر ئـەو خراپەو سـتەمەی پێشـتر دەیانکرد.

(٩٠-٩١): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بَعۡدَ إِيمَـٰنِهِمۡ ثُمَّ ٱزۡدَادُواْ كُفۡرٗا لَّن تُقۡبَلَ تَوۡبَتُهُمۡ وَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلضَّآلُّونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَمَاتُواْ وَهُمۡ كُفَّارٞ فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡ أَحَدِهِم مِّلۡءُ ٱلۡأَرۡضِ ذَهَبٗا وَلَوِ ٱفۡتَدَىٰ بِهِۦٓۗ أُوْلَـٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ وَمَا لَهُم مِّن نَّـٰصِرِينَ ﴿٩١﴾ ﴾ خـوا ﷻ هـەواڵ دەدا هەرکەسـێ بـێ بـڕوا بـێ دوای بـڕوا هێنانـی، پاشـان بـێ بڕوابیەکـەی زیاتـر بـێ لـە بێ بڕوایـی پێشـووی، بەهـۆی ڕۆچوونی لە گومڕایی سەرلێشـێواییدا، وە بەردەوام بوونی لەسـەر وازهێنـان لـە ڕێنمایی هیدایـەت، ئەوە خـوا ﷻ تەوبەیـان لێوەرناگرێو سەرکەوتووشـیان نـاکات بـۆ تەوبەکـردن، بەڵکو ماوەیـان دەدات تا لەسەرکێشـی خۆیاندا سـەر لێشـێواو بن، خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ وَنُقَلِّبُ أَفۡـِٔدَتَهُمۡ وَأَبۡصَـٰرَهُمۡ كَمَا لَمۡ يُؤۡمِنُواْ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٖ ﴿١١٠﴾ ﴾ الأنعام،(واتـە: دڵو چاویـان وەردەگێڕیـنو لادەدەیـن هەروەکـو لەسـەرەتاوە بڕوایـان بە قورئـان نەهێنـا)، هەروەهـا فەرموویەتـی: ﴿ فَلَمَّا زَاغُوٓاْ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمۡ ﴿٥﴾ ﴾الصـف، (واتـە: جـا کاتێـک لایاندا لە هـەق خواش دڵـی وەرگێـڕان) گونـاهو تاوانـەکان خراپەی

دیکـە بـەدوای خۆیانـدا بەرهـەم دێنن، بەتایبەت کەسـێ دەستپێشـخەری بـکات بۆ کوفری مـەزن، وەکـو وازهێنـان لە ڕێگـای ڕاسـت، بێگومـان بەڵگەو حوججەی لەسـەر پێویسـت کـراوەو بیانـووی نەمـاوە، خـوا ﷻ نیشـانەکانی بـۆ ڕوون کردوەتـەوە، ئەم کەسـە خۆی هەوڵـدەدا بـۆ بڕینی هۆکارەکانـی ڕەحمەتی پەروەردگـاری، خۆی دەرگای تەوبەی بەسـەر خۆیـدا داخسـتووە، لەبـەر ئەمەیە گومڕایـی کورت هەڵهێنـاوە لەم تاقمەدا، جـا فەرمووویەتی: ﴿ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلضَّآلُّونَ ﴾ (واتـە: ئەوانـەن گومڕایان) چـی گومڕاییەک لـەوە مەزنترە لـە گومڕایـی ئەو کەسـەی وازی لـە ڕێگـای ڕاسـت هێنابـێ دوای بەرچاو ڕوونـی تەواو، ئـەو بـێ بڕوایانـە ئەگـەر بـەردەوام بن لەسـەر بـێ بڕواییـان تا مـردن، ئـەوە لەناوچوونو بەدبەختـی هەتـا هەتاییان تووش دەبێ، هیچ شـتێ سـوودی نابـێ بۆیان، ئەگەر کەسـێکیان پـڕ بە هەمـوو زەوی زێڕی هەبێت بیبەخشـێ لە بریی ئـەوەی ڕزگاری بێ، هیچ سـوودێکی بـۆی نابـێ، بەڵکو بەردەوام لە سـزای بە ئـازاردان، هیچ تـکاکارو یاریدەدەرو پشـتیوانێکیان نابـێ ڕزگاریـان بـکات لە سـزای خوا، بـێ ئومێد بوون لـە هەمـوو خێرێـک، وە مانەوە بۆ هەمیشـەیی لەنـاو سـزاو خەشـمو قینی خـوادا، پەنـا دەگرین بەخـوا ﷻ لـە بارودۆخیان.


لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ ۚ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِن شَىْءٍ
فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٩٢﴾ ۞ كُلُّ ٱلطَّعَامِ كَانَ حِلًّا لِّبَنِىٓ
إِسْرَٰٓءِيلَ إِلَّا مَا حَرَّمَ إِسْرَٰٓءِيلُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ مِن قَبْلِ أَن تُنَزَّلَ
ٱلتَّوْرَىٰةُ ۗ قُلْ فَأْتُوا۟ بِٱلتَّوْرَىٰةِ فَٱتْلُوهَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ
﴿٩٣﴾ فَمَنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ
هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٩٤﴾ قُلْ صَدَقَ ٱللَّهُ ۗ فَٱتَّبِعُوا۟ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا
وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٩٥﴾ إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِى
بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٦﴾ فِيهِ ءَايَٰتٌۢ بَيِّنَٰتٌ مَّقَامُ
إِبْرَٰهِيمَ ۖ وَمَن دَخَلَهُۥ كَانَ ءَامِنًا ۗ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ
مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ۚ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ
﴿٩٧﴾ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ شَهِيدٌ
عَلَىٰ مَا تَعْمَلُونَ ﴿٩٨﴾ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تَصُدُّونَ عَن
سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ تَبْغُونَهَا عِوَجًا وَأَنتُمْ شُهَدَآءُ ۗ وَمَا ٱللَّهُ
بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٩٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِن تُطِيعُوا۟ فَرِيقًا
مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ يَرُدُّوكُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ كَٰفِرِينَ ﴿١٠٠﴾

(٩٢): ﴿لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ ۚ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِن شَىْءٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٩٢﴾﴾

ئەمە هاندانێکە لە لایەن خواوە بۆ بەندەکانی لەسەر بەخشین لە ڕێگاکانی خێرو چاکەدا، جا فەرموویەتی: ﴿لَن تَنَالُوا۟﴾ ناگەن بە پلەی چاکە (البر) کە بریتیە لە: هەموو خێرێک، لە جۆرەکانی گوێڕایەڵیو جۆرەکانی پاداشت، کە خاوەنەکەی دەگەیەنن بە بەهەشت ﴿حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ﴾ (واتە: هەتا هەندێ لەو ماڵو داراییەی کە خۆشتان دەوێ نەیبەخشن) واتە: لەو ماڵانەتان کە بەنرخو گرانبەهان، کە نەفسو دەروونتان حەزی پێدەکا، جا ئەگەر ئێوە خۆشەویستی خواتان پێش خست بەسەر خۆشەویستی ماڵو سامانەکانتان، وە خەرجتانکرد لە ڕەزامەندی ئەودا، ئەوە بەڵگەیە لەسەر ڕاستی ئیمانو چاکی دڵەکانتانو لە خوا ترسانتان، دەچێتە نێو ئەم بەخشینەوە: بەخشینی ماڵە بەنرخەکان، وە بەخشینی ماڵە لەکاتێکدا خاوەنەکەی پێویستی بەو بەخشینە بێ، وە بەخشین لەکاتی لەش ساغیدا.

ئەم دەقە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بەندە بە پێی بەخشینی لەوانەی خۆشی دەوێ چاکەی دەست دەکەوێ، وە بە پێچەوانەوە لە چاکەی کەم دەکات بە پێی ناتەواویو خۆشنەویستنی ئەو ماڵەی کە دەیبەخشێ، کاتێ کە بەخشین بە هەرجۆرێ بێ خاوەنەکەی پاداشت دەدرێتەوە، یەکسانە ئەگەر زۆربێ یان کەم، خۆشەویست بێ بەلای نەفسەوە یان نا، وە وتەی خوا ﷻ ﴿لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ﴾ لەبەرئەوەی کەسێ واتێنەگا خێرو چاکە ئەگەر بەم شێوەیە نەبێ ئەوە سوودی نیە، خوا پارێزی کردوە لەم جۆرە خەیاڵە بە وتەی خۆی کە فەرموویەتی: ﴿وَمَا تُنفِقُوا۟ مِن شَىْءٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ﴾ (وە هەرچی ببەخشن لە چاکە ئەوە بێگومان خوا ئاگای لێیەتی)،

لەسەرتان تەنگ ناکات، بەڵکو پاداشتتان دەداتەوە بە پێی نیازو نیەتەکانتان، وە بە پێی سوودی ئەو ماڵەی دەیبەخشن.

(٩٣-٩٥): ﴿ كُلُّ ٱلطَّعَامِ كَانَ حِلًّا لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِلَّا مَا حَرَّمَ إِسْرَٰٓءِيلُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ مِن قَبْلِ أَن تُنَزَّلَ ٱلتَّوْرَىٰةُ ۗ قُلْ فَأْتُوا۟ بِٱلتَّوْرَىٰةِ فَٱتْلُوهَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٩٣﴾ فَمَنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٩٤﴾ قُلْ صَدَقَ ٱللَّهُ ۗ فَٱتَّبِعُوا۟ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٩٥﴾ ﴾:

ئەمە ڕتدانەوەیە لەسەر جولەکەکان، دەربارەی ئەو گومانە پووچەیان کە پێیان وابوو نەسخ دروست نیە، بێبڕواییان کرد بە عیساو پێغەمبەر (علیهما السلام) چونکە ئەوان هەندێ برگەیان هێنابە پێچەوانەی هەندێ لە ئەحکامو بڕیارەکان تەورات بە حەڵاڵ کردنو قەدەغەکردن، لەویژدانی تەواو لە کاتی موشتوو مڕ کردن لەگەڵیاندا پەیوەست کردنیانە بەوەی لەناو کتێبەکەیاندایە کە تەوراتە، هەموو جۆرەکانی خواردەمەنی حەڵاڵ بووە بۆ نەوەکانی ئیسرائیل، ﴿ إِلَّا مَا حَرَّمَ إِسْرَٰٓءِيلُ ﴾ (بێجگە لەوەی (إسرائیل) حەرامی کرد)، ئەویش یەعقوب بوو ﴿ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ ﴾ (واتە: بەبێ ئەوەی خوای گەورە قەدەغەی بکات) بەڵکو خۆی قەدەغەی کرد لەسەر نەفسی خۆی، کاتێ تووشی نەخۆشی سەخت بوو، کە ناوی (عرق النِّسا)یە نەزری کرد لەسەر خۆی ئەگەر خوا شیفای بدا، ئەوە خۆشترین خواردن لەسەر خۆی حەرام بکات، هەندێ شتی لە خۆی حەرام کرد لەوەی کە باسی دەکەن: گۆشتی حوشترو شیرەکەی، منداڵەکانیشی لەسەرئەوە چاویان لێ کرد، ئەو ڕووداوە پێش دابەزینی تەورات بوو، پاشان لە تەوراتدا حەرام کردنی هەندێ شت دابەزی، جگە لەوەی یعقوب حەرامی کردبوو لەسەر نەفسی خۆی کە پێشتر حەڵاڵو پاک بوو بۆیان، هەروەکو خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ فَبِظُلْمٍ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَٰتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ ﴿١٦٠﴾ ﴾النساء، (بەهۆی ستەمکرنەوە لە لایەن جولەکەکانەوە حەرامامان کرد لێیان چەند خۆراکێکی خاوێن کە حەڵاڵ کرابوو بۆیان) خوا فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ کرد، ئەگەر جولەکەکان نکۆڵیان لەوە کرد فەرمانیان پێ بکا بە ئامادەکردنی تەورات، لە پاش ئەمە ئەوان بەردەوام بوون لەسەر ستەمکردنو نکوولیان، ﴿ فَمَنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾ (واتە: ئنجا لە دوای ئەمە هەر کەس درۆ بە دەم خواوە هەڵبەستێ کەواتە: ئەوانە خۆیان ستەمکارن)، چ ستەمێک لەوە مەزنترە

كەسێك بانگ بكرێ بۆ دادوەری كردن بە كتێبەكەی خۆی لە نێوانیاندا ئەو ڕێگری لێبكات، بەهۆی عینادیو لووت بەرزیو سەركەشییەوە، ئەمە مەزنترین بەڵگەیە لەسەر ڕاستی پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺ وە هاتنی نیشانە ڕوونو جۆراوجۆرەكان لەسەر ڕاستی ئەو و ڕاستی ئەو پەیامەی كە هەواڵی پێداوە، دەربارەی ئەو كاروبارانە كە كەس نایزانی تەنها بەوە نەبێ خوا ﷻ هەواڵی لێبدات، لەبەر ئەمە فەرموویەتی: ﴿ قُلْ صَدَقَ ٱللَّهُ ﴾ (ئەی موحەممەد! بڵێ: خوا ڕاستی فەرموو)، واتە: لەوەی هەواڵی پێداوەو دادوەری تێدا كردوە، ئەمەش فەرمانێكە لە لایەن خواوە بۆ پێغەمبەرەكەیو ئەوانەیشی شوێنی دەكەون بە زمانیان بڵێن: خوا ڕاستی فەرموو، لە ناخو بیرووباوەڕیاندا بڕوایان بەو شایەتیە هەبێ كە پشت ڕاست كراوەتەوە بە بەڵگەی یەكلاكەرەوە، ئەم شایەتیە ڕووبەڕووی ئەوانە بكەنەوە كە نكوڵی لێدەكەن، لێرەدا ئەوەت بۆ دەردەكەوێ ئەوەی ئیمانی لە هەموو خەڵكی دیكە بەهێزترە ئەو كەسەیە عیلمو یەقینی زیاتری هەبێ بەبەڵگە تێرو تەسەلە بیستراویو عەقڵیەكان، پاشان فەرمانی پێكردوون شوێن میللەتی ئیبراهیم ﷺ بكەون لە یەكتاپەرستیو وازهێنان لە شیركو هاوەڵدانان، كە ئەوە چەقی خۆشبەختیە، وە بە وازهێنان لێی بەدبەختیو گومرایی بەدەست دەهێنێ.

ئەم دەقە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە جولەكەو غەیری ئەوانیش لەوانەی كە لەسەر میللەتی ئیبراهیم نین، موشریكو هاوەڵدانەرنو یەكتاپەرست نین.

كاتێ فەرمانی پێكردوون بە شوێنكەوتنی میللەتی ئیبراهیم لە یەكتاپەرستیداو وازهێنان لە هاوەڵدانان، فەرمانی پێكردوون بە شوێنكەوتنیو بەمەزندانانی ماڵی حەرام بە حەجكردنو غەیری ئەویش، جا فەرموویەتی:

(٩٦-٩٧): ﴿ إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِى بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٦﴾ فِيهِ ءَايَٰتٌۢ بَيِّنَٰتٌ مَّقَامُ إِبْرَٰهِيمَ ۖ وَمَن دَخَلَهُۥ كَانَ ءَامِنًا ۗ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ۚ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٧﴾ ﴾

خوا ﷻ هەواڵ دەدات دەربارەی ڕێزو گەورەیی ئەم ماڵە پیرۆزە (بيت الحرام)، كە ئەو ماڵە یەكەمین ماڵ بوو بۆ مرۆڤ سازی كرد بەندایەتی پەروەردگاریان دەكەن تیایدا، ئەویش لە گوناهەكانیان خۆشدەبێو چاوپۆشی لە لارو وێریان دەكات، هەندێ جۆر لە پەرستشو گوێڕایەڵیو نزیك بوونەوە لە خوای خۆیان بەدەست دەهێنن، بەهۆی ئەو ماڵە پیرۆزەوە كە دەبێتە مایەی نزیكبوونەوەیان لە پەروەردگاریانو بەدەستهێنانی

پاداشــتو ڕزگاربــوون لــە ســزای خــوا ﷻ، لەبەرئەمەیــە فەرموویەتــی: ﴿ مُبَارَكًا ﴾ واتە: جێگایەکــی پیــرۆزە، پڕ لــە خێرو ســەرچاوەی ژیانە، کە ســوودی تێدایە بۆ دیــنو دنیایان.
هــەروەک چــۆن خــوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ لِّيَشْهَدُواْ مَنَٰفِعَ لَهُمْ وَيَذْكُرُواْ ٱسْمَ ٱللَّهِ فِىٓ أَيَّامٍ مَّعْلُومَٰتٍ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلْأَنْعَٰمِ ﴿٢٨﴾ ﴾الحـج، (واتــە: تــا ئامادەی جۆرەهــا ســوودو قازانجــی خۆیــان بــن، وە ناوی خــوا ببــەن کاتــێ قوربانی ســەردەبڕن لە ڕۆژانێکــی دیــاری کــراودا لەســەر ئــەو ئاژەڵانەی خــوا پێیــداون)، ﴿ وَهُدًى لِّلْعَٰلَمِينَ ﴾ (وە هیدایەتــە بــۆ جیهانیــان)، هیدایــەت دوو جــۆرە: هیدایــەت لــە زانینــدا، وە هیدایەت لە کــردەوەدا، جــا هیدایــەت لــە کــردەوەدا ئاشــکراو دیارە، کــە بریتیە لــە هەموو ئــەو جۆرە پەرســتنانەی خــوا تایبــەت بە خــۆی داینــاون، بــەڵام هیدایەتی لە زانســتو زانیاریــدا: وا لە خاوەنەکــەی دەکات بــە هۆیــەوە زانســتو زانیــاری بەرانبەر هەقو ڕاســتی بە دەســت بێنێ بــە هۆی ئــەو ئایەتە ڕوونو ڕۆشــنانەوە کە خوای پەروەردگار باســی کــردوە، فەرموویەتی:
﴿ فِيهِ ءَايَٰتٌۢ ﴾ چەند بەڵگەیەکی ڕونو ئاشــکراو ســەلماندنی یەکلاکەرەوەی تێدایە لەســەر جۆرەهــا زانســتی پەرســتراوێتیو داواکاریە بەرزەکان، وەک بەڵگە لەســەر یەکتاپەرســتیو، میهرەبانــیو، حیکمەتومەزنــیو، تــەواوی زانســتو بەرفراوانی بەخشــندەیی، وە ئەوەیشــی خــوا ﷻ منەتــی کردوە بەســەر دۆســتو یــارانو پێغەمبەرانیدا، جــا لەو نیشــانانە: ﴿ مَّقَامُ إِبْرَٰهِيمَ ﴾ (شــوێن وەســتانەکەی ئیبراهیم)، دەگونجێ مەبەســتی پێی ئەو شــوێنە دیاریکراوە بــێ، ئەویــش ئــەو بەردەیــە کــە ئیبراهیمــی خەلیل عليه السلام لەســەری وەســتابوو، بۆ دروســت کردنــی کەعبــە کاتــێ ماڵەکەی بەرز کــردەوە، ئەو بــەردە بە دیــواری کەعبەوە نووســاوە، کاتــێ کــە پێشــەوا عومــەر هات خــوا لێــی ڕازی بێ، خســتیە ئەو جێگایــەی ئێســتا لێیەتی، وە دەقەکــە دەربارەی وتراوە: شــوێنەواری شــوێن پێیەکانــی ئیبراهیمە، شــوێن پێیەکانی لەو بــەردەدا دەرچــوو، ئەم شــوێنەوارەش ماوەتەوە تا ســەرەتاکانی ئەم ئۆممەتە، ئەم نیشــانەیەش لــەو شــتانەیە کــە لــە بــاوی خەڵکدا نیــن (خــارق للعـادة)، وە وتــراوە: بــە ڕاســتی دەقەکە ئــەوەی تێدایــە کــە خوا لــە دڵەکاندا داینــاوە مەزنــیو ڕێــزوو بەحورمەتدانانی ئــەو ماڵە.
وە دەگونجــێ مەبەســت لــە شــوێن وەســتانەکەی ئیبراهیــم بــە شــێوەی تاکی پاڵــدەر (مفرد مضـاف) هاتــووە، مەبەســتی پێــی هەمــوو شــوێن وەســتانەکانی بــێ لــە بەجێهێنانــی هەموو خواپەرســتیەکانیدا، جــا ئەگــەر بــەم جــۆرە لێکــی بدەینــەوە ئەوە هەمــوو بەشــەکانی حەج نیشــانەی ڕوونو ئاشــکران، وەک تــەوافو چــوونو هاتــن لــە نێــوان صەفــاو مــەروە، وە

وەستان لە عەرەفەو موزدەلیفەو رەجم کردن، وە هەموو دروشمەکانی دیکە، وە نیشانەو بەڵگەی ئەو شوێنە: ئەوەیە خوا لە ناو دڵەکاندا بە مەزن دایناوە، رێزو پێزێکی ئێجگار گەورەی هەیە لە دڵی خەڵکیدا، خەڵکی لە پێناویدا نەفس و ماڵە گرانبەهاکانیان دەبەخشن تا بگەن پێی، وە لە پێناویدا بەرگەی هەموو ناخۆشیەکانی گەیشتن بەو شوێنە دەگرن، سەرەڕای ئەوانەش چەندەها نهێنی سەرنج ڕاکێش و مانای بەرزی لە خۆ گرتوون، وە لە کردەوەکانی کە لەو شوێنەدا ئەنجام دەدرێن، حیکمەت و بەرژەوەندی ئێجگار زۆری تێدایە، کە مرۆڤەکان بێتوانا بیانژمێرن، یەکێکی تر لە نیشانە ڕوونەکانی مەقامی ئیبراهیم هەرکەسێک بچێتە ناو کەعبەوە ئەوە ئەمین و پارێزراوە، هەم لەڕووی شەرعەوە هەم لە ڕووی قەدەرەوە، لەڕووی شەرعەوە خواو پێغەمبەرەکەی ئیبراهیم فەرمانیان کردوە بە ڕێزگرتنی و لاقەو دەستکاری نەکردنی ئەو کەسەی دەچێتە نێویەوە، تەنانەت قەدەغەکردن گەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە ڕاوکردن و برینی دارووددرەخت و گژووگیاکانی گرتۆتەوە، بەشێک لە زانایان ئەم دەقەیان کردۆتە بەڵگە کە ئەگەر هەرکەسێ تاوانێک ئەنجام بدا، پاشان پەنا بباتە بەر ماڵی پیرۆز ئەوە ئەمین دەبێ و حەدی لەسەر نادرێ هەتا لێی دەردەچێ، وە پارێزراو بوونی ئەو شوێنە لە ڕووی قەدەری خواوە لەوەدایە خوای پەروەردگار بە قەزاو قەدەری خۆی وای لە دەروونی خەڵکی کردوە هەتا ئەگەر ئەو کەسە هاوبەشدانەریش بێ کە دەچێتە ئەو شوێنە ڕێزی ئەو شوێنە بگرێ، تەنانەت یەکێ لە ئەوان لەگەڵ ئەو هەموو دەمارگیری و ڕەگەز پەرستیەدا بکوژی باوکی دەبینی لەناو ماڵی پیرۆزدا لاقەی نەدەکرد، وە لە پیرۆز دانانی هەرکەسێ بیەوێ ئازار بە کەعبە بگەیەنێ، خوا ﷻ سزای بۆ پێش دەخات هەروەکو چۆن سزای بۆ خاوەن فیلەکان پێش خست، وە جگە لە ئەوانیش، بەڕاستی وتەیەکی جوانی (ابن القیم)م بینی حەزم کرد لێرەدا باسی بکەم لەبەر زۆری پێویست بوون پێی، فەرموویەتی:

سوودو وەدەستهاتوو: ﴿ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ﴾(واتە: بۆ خوا هەیە بەسەر ئادەمیەوە حەج کردنی ماڵی خوا، هەرکەسێک کە توانای گەیشتنی هەبێت بۆی). ﴿ حِجُّ ٱلْبَيْتِ ﴾(مبتدأ) خەبەرەکەی لە یەکێک لەو دوو مەجرورەیە لە پێش خۆیەوە کە بریتین لە ﴿ وَلِلَّهِ ﴾، ﴿ عَلَى ٱلنَّاسِ ﴾[91] ئەویشی ماناکە دەخوازێ،

---

٩١) لله: لام/ حرف جر، الله: اسم مجرور، (على الناس) على: حرف جر، الناس: اسم مجرور.

ئەوەیە لە وتەی خوا ﷻ: ﴿ عَلَى ٱلنَّاسِ ﴾بێت، چونکە بۆ ئەرکو پێویست بوونە (وجوب)، وە ئەرکو پێویست بوونیش ﴿ عَلَى ﴾دەخوازێ، وە دروستیشە ئەمەش بخوازێ لە وتەی خوا ﷻ: ﴿ وَلِلَّهِ ﴾لەبەر ئەوە پێویست بوونو شایستە بوون لە خۆ دەگرێت، ئەم تەقدیرە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە خەبەر وێستگەو شوێنی سوودە، وە پێشخستنی لەم شوێنەدا لە نیەتی دواکەوتنە، چاکتر وایە بەم شێوەیە بێت ﴿ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ ﴾وتەی یەکەم بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە بوترێ: (حج البیت علی الناس) زۆرتر بەکار دێت لە بەشی پێویست بووندا (وجوب) لەوەی کە بوترێ: (حج البیت لله)، واتە: هەقو پێویستە بۆ خوا ﷻ چاک بیری لێبکرەوە.

لەسەر ئەمە لە پێشخستنی مەجروری یەکەمدا ﴿ وَلِلَّهِ ﴾بەبێ ئەوەی خەبەر بێت دوو سوودی هەیە: یەکەمینیان: ئەو ناوە بۆ واجب بوونو پێویست بوونی حەجە، بۆیە لەپێشترە پێش بخرێت لە باسکردنی پێویستبووندا، دەقەکە سێ شت لەخۆ دەگرێ بە پێی واقیع:

یەکەم: پێویستکەری ئەم فەرزە (ئەویش خوای مەزنە) بۆیە لە سەرەتاوە بەوە دەستی پێکردوە.

دووەم: جێبەجێکەری ئەرکەکە، ئەویش ئەوەیە کە فەرز کراوە بەسەریدا کە مرۆڤەکانن.

نیسبەتو دانەپاڵ، دانە پاڵی حەج بۆ لای خوا تایبەت بوون بە ئەو دەگرێتەوە، وە پێویست بوونیش دەگرێتەوە لەسەر بەندەکان

سوودی دووەم: ناوی مەجرور ﴿ وَلِلَّهِ ﴾لەو ڕووەی ناوی خوای مەزنە، پێویستە گرنگی بدرێ بە پێشخستنی، لەبەر ڕێزی ئەم فەرزەی کە خوا ﷻ پێویستی کردوە، بۆئەوەی لەدەست نەچێ، دیارە ئەوەی خوا ﷻ پێویستی بکات، وەکو ئەوە نیە کەسێکی دیکە پێویستی بکات.

بەڵام وتەی خوا ﷻ: ﴿ مَنِ ﴾ئەوە (بدل)[١٠١]، هەندێ لە خەڵکی کەوتوونەتە هەڵەوە دەڵێن: ئەوە بکەرە (فاعل)ە بە چاوگ (مصدر)، وەک ئەوەی بڵێ: (أن یحج البیت من

---

١٠١) بدل: بابەتێکە لە زانستی نەحودا دەخوێنری، پێناسەی: (التابع المقصود بالحکم بلا واسطة)، (بدل) شوێنی (مبدل منە) دەکەوێت لە (إعراب)دا، ئەگەر (مبدل منە) مرفوع بوو، ئەوە (بدل)یش مەرفوع دەبێ.... هتد، نموونە: زارني محمدٌ عمُّكَ. زارني: فعل ماضي، ن: نون الوقایة/ ي/ مفعول بە، محمدٌ: فاعل، مبدل منە، عمُّكَ: بدل مرفوع، لێرەدا دەبینین بەدەل هەمان ڕەفعەی (مبدل منە)ی وەرگرتووە. وەرگێڕ.

استطاع إليـه سـبيلاً) ئەم بۆچوونـە لاوازە لە چەنـد ڕوویەكەوە: یەكەم: حـەج كردن فەرزی (عیـن)ە، ئەگـەر مانـای ئایەتەكە ئـەوە بێ كە باسـی كردوە، ئـەوە ئەوەی لـێ وەردەگیرێ كـە فەرزی كیفایەیـە، بەمانای ئەوە دێـت ئەگەر ئەوانـەی لەتوانایاندایە حەجیـان كرد ئەوە لەسـەر غەیـری ئەوانیش دەكـەوێ، ماناكە بەم شـێوە لەیەك دەدرێتـەوە: (ولله علـى الناس حـج البيت مستطيعهم) واتـە: بـۆ خـوا هەیـە بەسـەر ئادەمیـەوە حـەج كردنی ماڵـی خوا، تەنهـا ئەوانـە كـە لـە توانایانـدا هەیە. جـا ئەگـەر ئەوانەی لـە توانایانـدا هەیـە حەجیان بە جێهێنـا ئـەوە فەرزەكە لەسـەر بـێ توانـاكان دەكەوێ، ئەمـە بەو شـێوەیە نیـە، بەڵكو حەج فـەرزی (عیـن)ە لەسـەر هەمـوو تاكێك پێویسـتە، ئـەوەی كە حەجـی كردوەو ئەوەیشـی دانیشـتووە، بـەڵام خوا بیانـووی بۆ ئەوانـە هێناوەتـەوە كە بێ توانان لەسـەری سـزا نادرێن داواشـیان لـێ ناكرێ بـە بەجێهێنانی، جـا ئەگەر حەجی كرد تەنها فەرزەكە لەسـەر نەفسـی خـۆی دەكەوێ، حەجكردنـی ئەوانە توانایـان هەیە نابێتە مایـەی هەڵگرتنی لەسـەر ئەوانەی بێتوانـان، ئەگـەر ڕوونكردنـەوەی زیاتـرت دەوێ، ئەگـەر بڵـێ: واجبە لەسـەر دانیشـتوانی شـارۆچكەیەك ئـەو دەسـتەی توانـای هەیە بـۆ جیهاد كردن، جیهـاد بكەن، جـا ئەگەر ئەو دەسـتەیە جیهادیـان كرد ئـەوە ئەو ئەركـە هەڵدەگیرێ لەسـەر غەیری ئەوان، بـەڵام ئەگەر وتت: پێویسـتە لەسـەر هەمـوو خەڵكی بەگشـتی جیهاد بـكات ئەوانـەی لەتوانایاندایە، ئەوە واجـب بوون پەیوەنـدی هەیـە بەهەموویانەوە، ئەوەیشـی لەتوانایـدا نیە لەسـەری دەكەوێ، جـا داڕشـتنی ئـەم دەقە بـەم جۆرەیە، بەڕاسـتی ئەمـە داڕشـتنێكی سـەیرو داهێنـەرو جوانە سـەرنجی بدەو لێـی ڕابمێنە.

ڕووی دووەم: دانـە پاڵـی چـاوگ (إضافـة المصـدر) بۆ لای بكـەر (فاعل) ئەگـەر بینرا ئەوە لـە پێشـترە لـە دانە پاڵی بـۆ لای (مفعول)، لـەم بنەمایە لادان نیـە تەنها بە بەڵگەیـە نەقڵكراو نەبـێ، جـا ئەگـەر (مَنْ) بكـەر ( فاعل) بـوو، ئەوە سـەرچاوەكە (المصـدر) دەدرێتـە پاڵی، ئەوجـا دەوتـرا: ( ولله علـى النـاس حـج البيـت مـن استطاع) وە هەڵگرتنـی بۆسـەر بابەتی (يعجبنـي ضربُ زيـدٍ عمـراً) وە لەوەیشـی جیای دەكاتـەوە لە نێوان چـاووگـو (مصدر) بكەر (فاعل)كـەی، دراوە پـاڵ بە كارتێكـراو (المضاف اليـه بالمفعول) وە ئاوەڵ فەرمـان (الظرف) نیـش دەخرێتـە سـەر نووسـراوی پەسـەندكراو، ئەمیـش خوێندنـەوەی (ابـن عامـر) (قتل أولادهـم شـركائهم)، نەگەڕێتـەوە بـۆلای، وە ئەگـەر جێگیـر بـوو بەڕاسـتی (مَـنْ) بەدەلی

هەندێکــە (بـدل البعـض مـن الـكل)[112] ئــەوە پێویســتە ڕاناوێک (ضمیر) هەبــێ بگەڕێتەوە بــۆ وشــەی (النـاس) وەک ئــەوەی وترابــێ: (مَـن استطاع منهـم) لابردنــی ئــەم ڕانــاوە لە زۆر شــوێنی قســەکردنو ڕســتەدا شــتێکی چاک نیە، بــەڵام لــەم جێگایەدا لــە قوڕئاندا زۆر جــوانو گونجــاوە، لەبەر ئــەم هۆکارانە:

یەکــەم: بەڕاســتی (مَـن) بــۆ عاقــڵ بەکارهاتــووە، وەکــو ناوێکــی (مبــدل منــه) بەیەکەوە بەســترا بێ.

دووەم: (مَـن) نــاوی (موصولـة)، کــە تایبەتتــرە لــە نــاوی یەکــەم، جــا ئەگــەر گەیاندنەکە گشــتگیر بوایــە، ئــەوە لابردنــی ئــەو ڕانــاوەی دەگەڕێتــەوە شــتێکی ناشــرین دەبــوو، وە نموونــەی ئەمــە: ئەگــەر بڵێــی: (رأیـت أخوتـك مـن ذهـب الی السـوق منهـم) ئــەوە شــتێکی ناشــرین دەبــوو، چونکــە ئەو کەســەی دەچێ بۆ بــازاڕ گشــتگیرترە لە بــراکان، وە بەهەمان شــێوە ئەگــەر بڵێی: (ألبس ثیـاب ماحسـن وجمل) وە باســی ڕاناوی نەکردوە، ئــەوە دوورترە لــە ڕێگەپێــدان، چونکــە بێــژەی (مــا أحســن) گشــتگیرترە لە (الثیـاب) جــلو بەرگ.

وە بابەتــی (بـدل البعـض مـن الـكل) دەبــێ تایبەتربــێ لــە (مبـدل منـه) جا ئەگەر گشــتگیر بــوو، وە داتەپــاڵ ڕاناوێــک یان کورتــت هەڵهێنا بــە ڕاناوێــک بگەڕێتەوە بۆ یەکــەم، ئەوە گشــتگیری هەڵدەگیــرێو تایبەتمەندی دەمێنــێ، وە لە جوانی لابردنی (مضاف) لەم شــوێنەدا لەبەرئەوەیــە ڕســتەکە دورو درێژ نەبێتــەوە بە (الصلة والموصول).

بــەڵام (مجرور) لــە وتەی خوا: ﴿وَلِلَّهِ﴾ دەگونجــێ دوو ڕووی هەبــێ: یەکەمینیان: ئەوەیە لــە جێگــای (من ســبیل) لە ڕێگــا، وەکو ئــەوە وایە ســیفەیەکی نەناســراو بێ پێشــکەوتبێ بەســەریدا، چونکــە ئەگــەر دوابکــەوێ ئەوە لــە جێگای ســیفەتی (لســبیل) لەبەر ئــەو ڕێگا دەبێــت. دووەم: یــان ئەوەیــە پەیوەســت کرابــێ بە (بسـبیل) بــە ڕێگــا، ئەگــەر بڵێی: چۆن دەبــێ پەیوەســت بکرێ پێیــەوە لەگەڵ ئــەوەدا مانــای (فعل) ناگەیەنــێ، وتراوە: (الســبیل) لێــرەدا عیبــارەت لــەوە دەکات کــە بگاتــە ماڵی پیــرۆزی خوا ﷻ، بــە خواردنو پێویســتی ڕێگــاو بــان، ئــەوە ئــەو کاتــە بۆنی فعلــی لێــوەدێ، مەبەســت (الســبیل) لێــرەدا بــە مانای ڕێگــا نەهاتــووە، کەواتــە دەگونجــێ مەجرور بکــرێ، وە پێش خســتنی (مجــرور) جوانیو ئیعجــازی بێــژە دەخــوازێ، ئەگــەر چــی شوێنەکەیشــی بــۆ دواکەوتنــە (التأخیر) چونکــە ڕاناوێکــە دەگەڕێتــەوە بــۆ ماڵی پیــرۆز، وە مەبەســتیش لە ماڵی پیــرۆزدا تەنهــا خەمخۆریە،

---

١١٢) نموونە: (حفظت القرانَ ثلثَهُ) لێرەدا ڕاناوی (ثلثَهُ) دەگەڕێتەوە بۆ (القران). وەرگێڕ.

ئـەوان پێشـی دەخەن لە قسـەکانیاندا ئـەوەی بە لایانەوە گرنگـەو ڕوونکردنەوەی پێویسـتە، ئەمەش بۆچوونی (السـهیلی) بەڕاسـتی ئەمە دوورە، بەڵکو ڕاسـت ئەوەیە لـە پەیوەندی (جار ومجـرور)دا ڕوویەکـی دیکـە لـەو دووانە چاکترێ، وە شایسـتە نیـە بە دەقەکـە تەنها ئەمە نەبـێ، وە تەنهـا ئەمەش فـەرزو پێویسـتە، مەفهومی وتـەی خـوا ﷻ: ﴿ عَلَى ٱلنَّاسِ ﴾ واتە: پێویسـتە بـۆ خـوا ﷻ لە سـەر خەڵکـی حەجکـردن، ئـەوە هەقێکی پێویسـتە بـۆ خوا ﷻ، بـەلام هەڵواسـینی بـە (سـبیل) وە کردنی بە حاڵ بـۆ حەج لە ئەوپـەڕی دووریدایە، سـەرنج بـدەو ڕابمێنـە، بە بـەردەوام بەخەیاڵـدا ئایەت لـەو ئایەتەدا، وەکو ئـەوە وایە بڵـێ: (بۆ خوا پێویستە لەسـەرت نوێژو و زەکاتو ڕۆژوو).

لـە سـوودو نهێنیەکانی ئەم دەقە بەڕاسـتی خوا ﷻ، ئەگەر باسـی شـتێ بکات کە پێویسـت بـێ ئەنجـام بـدرێ یـان قەدەغـەی بـکات، زۆر جار بـە بێـژەی فەرمـانو قەدەغـە کردن دەیهێنـێ، وە هەروەهـا بـە بێـژەی واجب بوونو نووسـینو (کتابة)و (تحریم)، بـۆ نموونە: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ ﴿١٨٣﴾﴾ البقرة، ﴿ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةُ ﴿٣﴾﴾ المائـدة،﴿ قُلْ تَعَالَوْاْ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ ﴿١٥١﴾﴾ الأنعـام.

وە لـە حەجـدا بـەم بێژەیـە هێنایەتـی کـە بەڵگەیـە لەسـەر جەختکردنـەوە لـە دە ڕووەوە: یەکەمینیـان: خـوا ﷻ نـاوی خـۆی پێشخسـتووە، وە (لــ) شایسـتە بـوونو تایبەکردنـی خسـتووەتە سـەری، پاشـان باسـی ئەوەی کردوە کـە فەرزی کردوە لەسـەریان، بە شـێوەی گشـتی (العمـوم) پیتـی (علـی)ی خسـتووەتە سـەری، کردویەتـی بـە (بـدل) بـۆ ئەوانەی کـە توانـای حـەج کردنیان هەیە، پاشـان باسـی ڕێگـای (السـبیل) بە نەناسـراو هێنـاوە لە سـیاقی ( شرط)دا، وەکـو ئاگـادار کردنەوەیـەک کـە حـەج پێویسـتە بـە هـەر ڕێگایەک ئاسـان بکرێـت، لـە ئامادەکردنـی بژێـوی یـان ماڵو سـامان، فـەرز بوونـی هەڵواسـیوە بە بەدەسـتهێنانی ئـەوەی پێـی دەوتـرێ ڕێگا (سـبیل)، پاشـان بەدوایـدا مەزنترین هەڕەشـەی کـردوە بە کوفـر، وەکو فەرموویەتـی: ﴿ وَمَن كَفَرَ ﴾ (واتە: هەر کەسـێ بێبـڕوا بێ) واتە: بەهـۆی پابەنـد نەبوونـی ئـەم ئەرکـەو وازهێنـان لێی، پاشـان خوا ﷻ باسـەکەی بـە مەزن دانـاوەو هەڕەشـە دەکات بـەوەی کـە ئـەو بـێ نیـازە لـەوە، خوا خۆی بـێ نیازی سـتایش کـراوە، پێویسـتی بـە هیـچ کـەس نیـە، بـەلام بـە بـاس کردنی بـێ نیـازی خـۆی لێرەدا جـۆرێ لـە ڕاگەیانـدنو تووڕەیـیو پشـتتێکردنی تێدایـە، کـە خۆی لـە خۆیـدا مەزنترین هەڕەشـە لەخـۆ دەگـرێ، پاشـان جەخـت لەسـەر ئـەوە دەکاتـەوە، بە بـاس کردنـی ناوی

جیهانیـان (العالمیـن) بەگشـتی، نەیفەرمـووە: (فـإن اللـه غنـي عنـه) واتـە: بەڕاسـتی خوا بێ نیـازە لێـی. چونکـە ئەگـەر خـوا ﷻ بـێ نیـاز بـێ لـە هەمـوو جیهانیان، ئـەوە بـێ نیازی تـەواوە لـە هەمـوو ڕووەکانەوە، ئەمـە ڕەوان بێژ تـرە بۆ مەزنـی توڕەیی خـوا ﷻ، بەرانبەر بەوکەسـەی واز لـە مافەکانـی دەهێنـێ کـە پێویسـتی کـردوە لەسـەریان، پاشـان جەختی لەسـەر ئـەم مانا کردوەتـەوە بە ئامـرازی (إن) کـە بەڵگەیە لەسـەر جەختکردنـەوە، ئا ئەمە دەرووە مەزنـی ئـەم فـەرزە دەخوازن.

وە سـەرنج بـدە لـە نهێنـی (بدل) لـەم دەقەدا کـە دوو جار باسـی پێویسـت بوونـی دانەپاڵ (الإسـناد) دەکات، جـارێ بـە دانەپاڵـی بـۆ لای هەمـوو خەڵکـی، وە جـارێ بـە دانەپاڵـی تایبـەت بـۆ لای کەسـانەی کـە تواناى حـەج کردنیان هەیـە، ئەمە لـە سـوودەکانی (بدل) ە، بەهێـز کردنـی مانـاو جەختکردنـەوەی بە دووبـارە کردنـەوەی دانەپاڵ (الإسـناد)، لەبەر ئەمەیـە لـە نیەتـی دووبارەکردنـەوە ئەو کەسـەیە کـە پێی هەڵدەسـتێ.

پاشـان سـەرنج بـدەو ڕابمێنە لـە دەقەکەدا لـە ڕوونکردنـەوە دوای ئاڵۆزی، وە درێـژە پێدان دوای کورتکردنـەوە، وە چـۆن ئـەوەی لەخـۆ گرتووە لـە دوو وێنـەی هاوشـانی یەکتردا، وەکـو گرنگـی پێـدانو جەختکردنـەوە لـە پلـەو پایەی، پاشـان سـەرنج بدە چۆن دەسـتی کـردوە بـە باسـکردنی چاکەکانـی ئـەم ماڵـەو پلـەو پایـەی بـە بـەرز ڕاگرتـووە، بەوەی نەفـسو دەروونـەکان کەمـەن کیـش بکرێن بـۆ پیـرۆزی حەجکـردن، جـا فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ ﴾تـا کۆتایـی دەقەکە، وەسـفی ماڵی پیـرۆزی خوای کردوە (بیـت الحرام) بـە پێنج سـیفات:

یەکەم: لەپێشترین ماڵی سەر زەویە.

دووەم: ئـەو ماڵـە پیـرۆزو بەپیتو بەرەکەتـە، بەرەکەتیـش بریتیە لە: خێـرو چاکەی زۆرو بـەردەوام بـوون، لەماڵەکانـی هەمـوو جیهانـدا لـەو ماڵە پیـرۆز ترو پـڕ خێر ترو بـەردەوام ترو بەسـوود تر نیە بـۆ بەدیهێنـراوەکان.

سـێیەم: ئەو ماڵـە هیدایەتو ڕێنماییە، وە وەسـفی کـردوە بە چاوگ(مصـدر) ، تەنانەت بەو شـێوە باسـی کردوە کە سـەرچاوەی خودی هیدایەتە.

چـوارەم: ئـەو ماڵـە چەندیـن بەڵگـەی ڕوونو ئاشـکرای لەخۆگرتـووە، کە زیاتـرە لە چل نیشانە.

پێنجـەم: نـاوی ئـەو ماڵە پڕە لە ئاسـایشو ئارامـی، وە لە وەسـفکردنیدا بەم سـیفاتانە وای لە

نەفسو دەروونەکان کردوە کە بێن بۆ خزمەتی ئەوماڵە پیرۆزە بۆ حەج کردن، لە شوێنە دوورەکانەوە ولاتەکانی خۆیان جێبهێڵنو بچن بۆ ئەو پەرستشە، پاشان بەدوای ئەوەدا بە چەندین بەبەڵگەی ڕوونو ئاشکرا ڕوونی کردۆتەوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر گرنگی پێدانی خوا ﷻ بۆ ئەم ماڵە پیرۆزە، وە هاندان بە یادکردنەوەیو بەگەورە تەماشاکردنی، وە بەرزکردنەوەی پلەو پایەی، بەڕاستی ئەگەر ئەو ماڵە هیچ شەرەفو حورمەتێکی نەبوایە تەنها ئەوە نەبێ کە خوا ﷻ داویەتیە پاڵ نەفسی خۆی، وەکو فەرموویەتی: ﴿وَطَهِّرۡ بَيۡتِيَ ﴿٢٦﴾﴾ الحج. ئەوە بەس بوو، ئەوە ئەم دانەپاڵە بەس بوو بۆ شەرەفو حورمەتی، ئائەم دانەپاڵە بووە مایەی ئەوەی دڵی خەڵکی جیهان ڕابکێشێ بۆ لای ئەو ماڵە، وە دڵەکانیانی بردووە بۆ لای ئەو زنجیرە، وە تامەزۆری بینینی، ئائەمە جێگای ئومێدو پاداشتی ئەوانەیە کە ئارەزووی دەکەن، هەرگیز لێی بێزار نابن، هەر جارێ زیارەتی بکەن خۆشەویستیو حەزوو تامەزرۆییان بۆی زیاتر دەبێ، نە لە نزیکی شیفایان بۆ دێ، وە نە لە دووری ئۆقرە دەگرن، هەروەک وتراوە:

أطوف به والنفس بعد مشوقة ... إليه وهل بعد الطواف تداني
وألثم منه الركن أطلب برد ما ... بقلبي من شوق ومن هيمان
فوالله ما ازداد إلا صبابة ... ولا القلب إلا كثرة الخفقان
فيا جنة المأوى ويا غاية المنى ... ويا منيتي من دون كل أمان
أبت غلبات الشوق إلا تقربا ... إليك فما لي بالبعاد يدان
وما كان صدى عنك صد ملالة ... ولي شاهد من مقلتي ولسان
دعوت اصطباري عنك بعدك والبكا ... فلبى البكا والصبر عنك عصاني
وقد زعوا أن المحب إذا نأى ... سيبلى هواه بعد طول زمان
ولو كان هذا الزعم حقا لكان ذا ... دواء الهوى في الناس كل زمان
بلى إنه يبلى والهوى على ... حاله لم يبله الملوان
وهذا محب قاده الشوق والهوى ... بغير زمام قائد وعنان
أتاك على بعد المزار ولو ونت ... مطيته جاءت به القدمان

(٩٨-١٠١): ﴿قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَكۡفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا تَعۡمَلُونَ ﴿٩٨﴾ قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنۡ ءَامَنَ تَبۡغُونَهَا عِوَجٗا وَأَنتُمۡ شُهَدَآءُۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ﴿٩٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ فَرِيقٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ يَرُدُّوكُم

بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡ كَٰفِرِينَ ﴿١٠٠﴾ وَكَيۡفَ تَكۡفُرُونَ وَأَنتُمۡ تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ وَفِيكُمۡ رَسُولُهُۥۗ وَمَن يَعۡتَصِم بِٱللَّهِ فَقَدۡ هُدِيَ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿١٠١﴾﴾:

خـوای بـەرز سەرزەنشـتی خـاوەن کتێبـەکان دەکات لـە جوولەکـەو نەصرانیـەکان لەسـەر کوفـر کردنیـان بـە ئایەتەکانی خـوا کـە بـۆ پێغەمبەرەکانـی دابەزانـدوە، ئـەو ئایەتانەی کە کردوونـی بـە هـۆکاری بەزەیی هاتنـەوەو هیدایـەت وەرگرتنـی بەندەکانـی، ئـەو ئایەتانەی کـە بەندەکانـی دەتوانـن بیکـەن بـە هـۆکاری دۆزینەوەی هەمـوو ئـەو داواکاریـە گرنگ‌و زانیاریـە بـە سـوودانەی کـە داوای دەکـەن، ئـەم بێبڕوایانـە دەربـارەی ئایەتەکانی خـوا دوو شـتیان لـە خۆیانـدا کۆکردۆتـەوە: بێبـڕوا بـوون پێـی، وە ڕێگرتن‌و کۆسـپ خسـتنە بەردەم ئـەو کەسـانەی کـە بڕوایـان بە ئایەتـەکان هێنـاوە، هەروەهـا دەسـتکاریی کـردن‌و گۆڕینی ئایەتەکانیـش کاری دووەمیانـە، کە دەشـزانن ئا ئـەم کارەیان گەورەترین کوفـرەو توندترین سـزایان بـۆ پێویسـت دەکات، (وەک لە شـوێنی دی دەفەرمـوێ:) ﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ زِدۡنَٰهُمۡ عَذَابٗا فَوۡقَ ٱلۡعَذَابِ بِمَا كَانُواْ يُفۡسِدُونَ ﴿٨٨﴾﴾النحـل، بۆیە لێرەدا دەیانترسـێنێ بەوەی کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ﴾ بەڵکو خـوا دەوری کارو کـردەوەو نیـەت‌و فێڵـە خراپەکانـی ئێـوەی داوە، وە لەسـەر ئـەو کردەوانەشـتان خراپتریـن سـزاتان دەداتـەوە، وەک ئـەوەی بەڵێنی پێداون‌و هەڕەشـەی لێتان کردوە، ئەمەشـی لە ئەنجامی بەزەیـی‌و بەخشـین‌و چاکەی خۆیـەوە دووبارە کردۆتەوە، وە بڕوادارانیشـی لە فێـڵ‌و تەڵەکەی ئـەو خـاوەن کتێبانە ئاگـادار کردۆتەوە نـەوەک فێڵیان لێبکرێ‌و هەسـتیش بە خۆیـان نەکەن، ئنجـا دەفەرمـوێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ فَرِيقٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ يَرُدُّوكُم بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡ كَٰفِرِينَ﴾ ئەمـەش بـە هـۆی ئیرەیـی‌و دژایەتـی‌و دوژمنایەتیـان بـۆ ئێوە وە لەبـەر زۆر سـووربوونیان لەسـەر هەڵگەڕانەوەتان لـە ئایینەکەتان، وەک خوای گـەورە دەفەرموێ: ﴿وَدَّ كَثِيرٞ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ لَوۡ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِكُمۡ كُفَّارًا حَسَدٗا مِّنۡ عِندِ أَنفُسِهِم مِّنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلۡحَقُّۖ ﴿١٠٩﴾﴾البقـرة، (واتـە: زۆرێک لە خـاوەن کتێبەکان بـە هۆی حەسـوودیی یەکـەوە کە لـە دەروونیاندایە پاش ئـەوەی کە هەقیان بـۆ ڕوون بۆتەوە، پێیـان خۆشـە کە لـە دوای ئیمـان هێنان هەڵتـان بگێڕنـەوەو کافرتـان بکەنەوە).

پاشـان خوا ﷻ باسـی گەورەترینی هۆکاری دامـەزراوی‌و جێگیریی بڕواداران دەکات لەسـەر ئیمانەکەیـان، هەڵنەخلیسـکانیان لە ئاسـت ئـەو یەقین‌و بڕوایەی کـە هەیانە، کە ئەمە لە شـتە هـەرە دوورەکان، وە دەفەرموێ:

وَكَيْفَ تَكْفُرُونَ وَأَنتُمْ تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ وَفِيكُمْ
رَسُولُهُۥ وَمَن يَعْتَصِم بِٱللَّهِ فَقَدْ هُدِىَ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٠١﴾
يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم
مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ وَٱعْتَصِمُوا۟ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا۟ وَٱذْكُرُوا۟
نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَآءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ
فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِۦٓ إِخْوَٰنًا وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ
ٱلنَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ
تَهْتَدُونَ ﴿١٠٣﴾ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى ٱلْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ
بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾
وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ تَفَرَّقُوا۟ وَٱخْتَلَفُوا۟ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ
وَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٠٥﴾ يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ
وُجُوهٌ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسْوَدَّتْ وُجُوهُهُمْ أَكَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ
فَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿١٠٦﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱبْيَضَّتْ
وُجُوهُهُمْ فَفِى رَحْمَةِ ٱللَّهِ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿١٠٧﴾ تِلْكَ ءَايَٰتُ
ٱللَّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِٱلْحَقِّ وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٨﴾

﴿ وَكَيْفَ تَكْفُرُونَ وَأَنتُمْ تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ وَفِيكُمْ رَسُولُهُۥ وَمَن يَعْتَصِم بِٱللَّهِ فَقَدْ هُدِىَ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٠١﴾ ﴾:

واتــە: پێغەمبەری خوا لــە نێوانتاندایەو هەموو دەق‌و ئایەتەکانــی پەروەردگارتــان بەســەردا دەخوێنێتــەوە لــە هەمــوو کاتێکــدا، ئەویش بریتیــە لــەو دەقــە ڕوون‌و ئاشــکرایانەی کــە هیــچ گومانێــک ناهێڵێتــەوە، ئــەوەی پێویســتە دەیبڕێتــەوەو یــەکلای دەکاتــەوە، وە گومــان ناهێڵێــت بــە شــێوەیەک لــە شــێوەکان، بــە تایبــەت ئــەوەی کــە ڕوونی دەکاتــەوە باشــترین دروســتکراوی خــواو زاناترینیان‌و زمــان پاراوترینیان‌و ئامۆژگاری کارترینیــان‌و بە ســۆزترینیانە بە بــڕواداران، زۆر ســووره لەســەر ڕێنمایــی دروســتکراوەکان‌و ڕێ پێشــاندانیان بــە گرتنــە بــەری هەمــوو ڕێگــاکان کــە توانــای هەیە بەســەریدا، دەی درووددو ســڵاوی خوای لەســەر بێت، بە ڕاســتی ئامۆژگــاری کــردو ئــەوەی لەســەری بــوو بــە ڕوونــی گەیانــدی، وە لە دڵــی هیچ کەســێدا پرســیارو قســەیەکی نەهێڵایــەوە، وە ڕێگەی خۆش کردوە بۆ ئەو کەســەی بــە دوای چاکەدا بگــەڕێ، پاشــان خــوای گــەورە هەواڵــی داوە هەرکەســێک پەنــای پێبگرێــت‌و پشــتی پــێ ببەســتێت، وە بەرهەڵســتی بــکات بــە هێــزو توانــاو ســۆزی خــوا لە هەمــوو خراپەیــەک، وە داوای هــاوکاری و پشــت بەســتن بکات لەســەر هەمــوو خێرو چاکەیــەک، ﴿ فَقَدْ هُدِىَ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾ بێگومــان خــوای گــەورە دەیگەیەنێــت بــەو ئامانجەی کە ویســتی لەســەرە، چونکــە بە ڕاســتی کــۆی کردوەتەوە لە نێــوان شــوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا لــە گوفتارەکانی و کردارەکانــی و بارودۆخەکانــی، وە پەناگرتــن بــە خــوای گــەورە.

(١٠٢-١٠٣): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾
وَٱعْتَصِمُوا۟ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا۟ وَٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَآءً فَأَلَّفَ بَيْنَ
قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِۦٓ إِخْوَٰنًا وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ

لَكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ ﴿١٠٣﴾ ﴾:

ئەمــە فەرمانــە لــە لایــەن خوای گــەورەوە بــۆ بەنــدە بڕواداره‌كانــی كــە پارێزكار بــن و لێی بترســن، بەشـێوەیەک كە شایســتەی ئــەو بێت، وە بــەردەوام بن لەســەری و پابەندو چەســپاو بــن هەتــا مــردن، بێگومان هەركەسـێک لەســەر شـتێک بژیت لەســەر ئــەوە دەمرێــت، هەر كەسـێک لــە كاتی تەندروسـتیو لەش ســاغیدا چوســتو چــالاکو بــەردەوام بێت لە ســەر پاریــزكاریو گوێڕایەڵــی كردنــی پەروەردگاری، ئەوە خوای میهرەبان باشـترین ســەرەنجامی پێدەبەخشـێت، بــە مەرجێ بــەردەوام بێت بە تەواوی، خــوای گەورە لەســەرە مەرگدا جێگیری دەكاتو ســەرەنجامی مردنــی پــڕ دەكات لــە خێر، وە باشـترین لــە خواترســان و خۆپارێزی پێدەبەخشـێت وەک (ئیبنــو مەســعود دەڵێ: بریتیە لەوەی كــە گوێڕایەڵی بكرێتو ســەرپێچی نەكرێــت، یــادی بكرێــتو لــە بیــر نەكرێــت، بــەردەوام سوپاســگوزاری بكــرێو ســپڵەیی بەرانبــەر نــەكات) ئــەم دەقە ئاشــكرای دەكات كــە خوای گەورە چەندە شایســتەی پەرستنە، بــەلام ئــەوەی كە پێویســتە لەســەر بەنــدە وەک خــوای میهرەبــان دەفەرمــوێ: ﴿ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ ﴿١٦﴾ ﴾التغابــن، درێــژە پێــدانو وردەكاری تەقــوای خــوا كە پەیوەنــدی هەیە بە دڵ و دەروونو ئەندامەكانــی جەســتەوە زۆر زۆرە، لــەوەدا كــۆی دەكاتــەوە جێبەجێكردنی ئەوەی كــە خــوا فەرمانــی پێكــردوەو وازهێنان لــە هەموو ئەو شــتانەی كە خــوا قەدەغــەی كردوە.

پاشــان خوای گــەورە فەرمانی پێكــردوون بەوەی كــە هاوكاریان بكات لەســەر پارێزكاریو لــە خــوا ترســان، ئەویــش بریتیە لــە كۆدەنگــیو پەنا گرتــنو دەســتگرتن بە ئاینی خــوا، وە تێبگــەن كــە بانگــەوازی بــڕواداران یەک شــتە، ئەویــش ئەوەیە پەیوەســتو ناكــۆک نەبن، چونكە بە ڕاســتی لە یەكدەنگی مســوڵمانانەندا لەســەر ئاینەكەیانو پەیوەســت بوونــی دڵەكانیان دنیــاو دوارۆژیــان بــاش دەكات، وە بــە كۆدەنگــی زاڵ دەبــن بەســەر هەمــوو كارێكــدا، ئەو بەرژەوەندیانــە بــە دەســت دێنن كە لەســەری پەیوەســت بوون وەســتاوە كە لە ژمــارە نایەت، لــە هــاوكاری یەكتر لەســەر چاكــەو خواپەرســتی، وەک چۆن بــە دوو بەرەكــیو جیاوازیو دژایەتــی یەكتر كەلێن دەكەوێتــە ڕێبازو یاســاكانیانەوەو پەیوەندیان دەترازێــتو دەپچرێت، تــا وای لــێ دێــت هەموو تاكێــک بــۆ خــۆی كار دەكات، هەوڵــدەدات بەرژەوەنــدی هەواو ئــارەزووی خــۆی تێر بــكات، تەنانەت ئەگــەر بە زەرەری گشــتیش تــەواو بێت.

پاشــان خوای میهرەبــان باس لە نازو نیعمەتەكانــی خۆی دەكاتو فەرمانیان پــێ دەكات یادی بكەنــەوە، وەک دەفەرمــوێ: ﴿ وَٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ كُنتُمۡ أَعۡدَآءٗ ﴾ كــە هەندێكتــان

هەندێکــی ترتــان دەکوشــت، وە هەندێکتان لە ماڵــی هەندێکی ترتــان دەبرد، تەنانــەت لە نێو هۆزێکــدا هەندێــک دژایەتــی هەندێکــی تــری دەکــرد، وە خەڵکی یــەک شــوێن دژایەتیو شــەڕو کوشــتار لە نێوانیاندا ڕووی دەدا (مەبەســتی مەدینەیــە)، لە شــەڕو خراپەیەکی گەورەدا بــوون، ئــا ئەمــە حاڵــی عــەرەب بوو پێــش هاتنــی پێغەمبــەر ﷺ کاتێــک کە خــوای گەورە خەڵاتــی کردنو نــاردی بۆ نێویانو بڕوایان پێی هێناو، لەســەر ئیســلام کۆبوونــەوەو، دڵەکان لەســەر بــڕواو ئیمــان پەیوەســت بــوون، وەک یــەک کەســیان لێهات، لــە پەیوەســت بوونی دڵەکانیــانو پشــتگیریو دۆســتایەتی هەندێکیــان بــۆ هەندێکــی تریــان، لەبــەر ئەمــە خوای میهرەبــان فەرموویەتــی: ﴿ فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِۦٓ إِخْوَٰنًا وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ ﴾ بەڕاســتی ئێــوە ئاگرتــان بــۆ خۆتــان مســۆگەر کردبوو، هیــچ نەمابوو لــە نێوانی ئێــوەو ئەودا مەگــەر ئەوە نەبێت کــە بمردنایەو بڕۆشــتباناتە دۆزەخــەوە، ﴿ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا ﴾ (ڕزگــاری کــردن) بەو منەتــەی کە کردی بەســەرتاندا لە بــڕوا هێنان بــە پێغەمبەرموحەممەد، ﴿ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ ﴾ واتــە: ڕوونی دەکاتەوەو شــی دەکاتەوە، ڕاســتیو پووچیتان بــۆ ئاشــکرا دەکات، وە هیدایــەتو گومراییتــان بــۆ ڕوون دەکاتــەوە، ﴿ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴾ بە ناســینی هــەقو ڕاســتیو کارپێکردنــی، ئــەم دەقە بەڵگەیە لەســەر ئــەوەی خوای گــەورە پێی خۆشــە بەندەکانــی یــادی نیعمەتەکانــی بکەنــەوە بــە دڵ و زمانیان، ئەمــەش بۆ ئەوەیــە زیاتر سوپاســگوزار بــنو خۆشــیان بوێت، بە هەمان شــێوە حــەز دەکات چاکەو بەخشــندەیی خۆی زیاتــر بڕژێنێــت بەســەریاندا، بە ڕاســتی گەورەترینــی نیعمەتی خوا بــۆ بەندەکانــی ڕێنمایی کردنیانــە بــۆ ئیســلامو شــوێنکەوتنی پێغەمبــەر ﷺ و یــەک دەنگــی بــڕوادارانو نەبوونــی جیــاوازیو دووبەرەکی.

(١٠٤-١٠٥): ﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى ٱلْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ تَفَرَّقُوا۟ وَٱخْتَلَفُوا۟ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٠٥﴾ ﴾:

واتــە: پێویســتە لەســەر ئێوە ئەی ئــەو بڕوادارانــەی کە خوا چاکــەی خۆی بەســەریاندا داباران بــە ئیمــان هێنانو دەســتگرتنیان بــە ئاینی خــواوە، ﴿ أُمَّةٌ ﴾ واتــە: کۆمەڵێک (تــان هەبن)، ﴿ يَدْعُونَ إِلَى ٱلْخَيْرِ ﴾ (کــە بانگــەوازی بــۆ چاکــە بکــەن) ناوێکــی گشــتگیرە بــۆ هەمــوو نزیــک بوونەوەیــەک لــە خــواو دورکەوتنەوەیەک لە خەشــمو قیــنو تووڕەیی، ﴿ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ ﴾ بریتیــە لــە هەمــوو ئەوانــەی کــە بــە عەقــڵو بــە شــەرع چاکــە، ﴿ وَيَنْهَوْنَ عَنِ

﴿ ٱلْمُنكَرِ ﴾ بریتیــە لــە هەمــوو ئەوانــەی کە بە عەقڵو بە شــەرع خراپــە، ئا ئەمە ڕێ پێشــاندانە لەلایــەن خوای گــەورەوە بۆ بــڕواداران کە کۆمەڵێک هەڵسـن بە بانگەواز بـۆ لای ئاینی خوا، وە هاندانــی خەڵکــە بـۆ لای دینەکەی، ئەمە ئــەو زانایانە دەگرێتــەوە کە خەڵکــی فێری ئاینی ئیســلام دەکــەن، بە هەمان شــێوە ئــەو ئامۆژگاریکارانە دەگرێتــەوە کە بانگــەوازی ئاینەکانی تــر دەکــەن بـۆ هاتنــە نــاوەوەی ئیســلام، وە بانگــی لادەران دەکەن بـۆ هاتنە ڕیــزی فیکری مســوڵمانان، بانگەشــەی موجاهیــدان دەکات کە لە پێناو خوادا کۆشــش بکەن، وە بانگەشــەی ئەوانــەش دەکات کە ئاگایان لە یاســا ڕێســاکانی ئیســلام نیــەو پابەند بوونیان بە شــەرعی خوا وەک: پێنــج فــەرزەی نوێــژو زەکاتو ڕۆژوو گرتــنو حــەج کــردن هاوشــێوەی ئەمانە کە دروشــمی ئیســلامن، وە هەروەها کێشــانەو پێوانــەکان، وە هەروەهــا ڕێنمایی خەڵکــی بازاڕو ڕێگرتنیــان لــە غــەش و فێــل کــردن و مامەڵەی پــڕو پــووچ، وە هەموو ئــەم کارانــە فەرزی کیفایــەن، وەک چــۆن ئایەتەکــە ئامــاژەی پــێ دەکات دەفەرمــوێ: ﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ ﴾ واتــە: پێویســتە لــە ئێــوە کۆمەڵێــک پێک بێت ئــەو مەبەستە بهێننــە دی، ئەوەی کــە ڕوونە فەرمــان کردنــە بە کارێــک، ئەو شــتە نایەتە بەرهــەم هەتا فەرمانــی پێنەکرێت، هەر شــتێک لەســەر ئەمــە بونیــاد بنرێــت ئــەوە فەرمانی پێکــراوە، بـۆ نموونــە: وەک: خــۆ ئامادەکردن بۆ جیهــاد بــە هەمــوو جۆرەکانــی ژماردنەوە، بەوە زاڵ دەبن بەســەر دوژمنداو ئیســلام ســەر بەرز دەبێــت، وە فێربوونــی زانســت کــە تەنها بــەوە بانگەواز بـۆ لای خێرو چاکە بە دەســت دێت، وە ئامــرازەکانو مەبەســتەکانیو دروســت کردنــی قوتابخانــە بۆ فێرکــردنو ڕێ پێشــاندان، وە هــاوکاری زانایــان لەســەر جێبەجێکردنــی شــەرع لــە نــاو خەڵکــدا بــە گوفتارو کــردارو مــاڵ، وە هــەر شــتێکی دی پەیوەنــدی هەبێــت بــەو بابەتانەوە، وە ئــەو دەســتەو کۆمەڵەی کە ئامــادەن بـۆ بانگــەواز بـۆ لای خێــرو فەرمــان کــردن بە چاکــەو ڕێگــری کردن لــە خراپە، ئەوانــە خەڵکانــی تایبەتــی نــاو بڕواداران، هــەر بۆیە خــوای گــەورە دەربارەیــان دەفەرموێ: ﴿ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾ ئەوانە ســەرکەوتوو ســەرفرازن بــەوەی کە داوایــان لێکراوە، ڕزگاربــوون لــەوەی کە لێی ترســاون.

پاشــان قەدەغــەی کــردوە خۆیــان لێــک بچوێنــن بــە خــاوەن کتێبــەکان، لــە جیاوازیــیو دووبەرەکیــان لــە نێــو یەکتــردا، ﴿ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ تَفَرَّقُوا۟ وَٱخْتَلَفُوا۟ ﴾ بــە ڕاســتی جیاوازیــان یەکێکە لــە شــتە سەرســوڕهێنەرەکان، ﴿ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ ﴾ کە پێویســتە جیــاوازی دووبەرەکــی وەلا بنێــن، ئەوان لە پێشــترن لە خەڵکی بــە پابەند بوونیان بــە ئاینەوە،

کارەکەیـان پێچەوانـە کـردەوە، لە کاتێکـدا ئەوان خاوەن زانسـتو زانیاری بوون سـەرپێچی فەرمانـی خوایـان کـرد، لەبەر ئەوە شـایانی سـزای زۆر سـەخت بوون، تـا لەبـەر ئەمە خوای گـەورە دەفەرمـوێ: ﴿ وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿١٠٥﴾ ﴾.

(١٠٦-١٠٨): ﴿ يَوۡمَ تَبۡيَضُّ وُجُوهٞ وَتَسۡوَدُّ وُجُوهٞۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسۡوَدَّتۡ وُجُوهُهُمۡ أَكَفَرۡتُم بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡ فَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡفُرُونَ ﴿١٠٦﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱبۡيَضَّتۡ وُجُوهُهُمۡ فَفِي رَحۡمَةِ ٱللَّهِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿١٠٧﴾ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ نَتۡلُوهَا عَلَيۡكَ بِٱلۡحَقِّۗ وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلۡمٗا لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠٨﴾ ﴾

خـوای گـەورە بارودۆخی ڕۆژی قیامـەت ڕایدەگەیەنێت لە پاداشـت دانەوە بـە دادپەروەریو چاکـە، وە هەریەکـە لـە هانـدانو ترسـاندن لـە خـۆ دەگرێـت کە وا لـە مـرۆڤ دەکەن لە نێوانـی تـرسو ئومێـددا بژیـت، دەفەرمـوێ: ﴿ يَوۡمَ تَبۡيَضُّ وُجُوهٞ ﴾ ئـەوە ڕوخسـاری ئـەو کەسـانەیە کـە کامـەرانو چاکەخـوازن، ئەوانـەی کـە دەسـتیان بـە کتێبی خوای گـەورەوە گرتـووە، ﴿ وَتَسۡوَدُّ وُجُوهٞ ﴾ ئـەوە ڕوخسـاری خەڵکـی خراپـەکارو بەدبەختانـە (کـە ڕەش هەڵگـەڕاون)، ئـەو خەڵکـەی کـە جیـاوازی و ناکۆکـی لـە نـاو یەکتـردا بەرپا دەکـەن، ئا ئەوانـە ڕوخسـاریان ڕەش هەڵدەگەڕێـت، بە هۆی ئەوەی ڕیسـواییو زەلیلی لـە ناخیاندا بەدی دەکرێـت، وە ئەوانـەی کـە ڕوخسـاریان سـپی دەبێتەوە، لـە دڵیانـدا خۆشـیو کامەرانی نازو نعمـەت و شـادمانی بـە دی دەکرێـت کـە شـوێنەوارەکەی لـە ڕوخسـاریاندا دەردەکەوێت، وەک خـوای گـەورە فەرمـوێ: ﴿ وَلَقَّىٰهُمۡ نَضۡرَةٗ وَسُرُورٗا ﴿١١﴾ ﴾الإنسـان، ڕوو گەشـی لە دەمو چاویانـداو خۆشـی لـە دڵەکانیاندایـە، وەک خـوای میهرەبـان دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ كَسَبُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ جَزَآءُ سَيِّئَةِۭ بِمِثۡلِهَا وَتَرۡهَقُهُمۡ ذِلَّةٞۖ مَّا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنۡ عَاصِمٖۖ كَأَنَّمَآ أُغۡشِيَتۡ وُجُوهُهُمۡ قِطَعٗا مِّنَ ٱلَّيۡلِ مُظۡلِمًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾یونـس.

﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسۡوَدَّتۡ وُجُوهُهُمۡ ﴾ (واتە: پاشـان ئەوانەی کە ڕوخسـاریان ڕەش هەڵگەڕاوە) پێیـان دەوتـرێ: لـە ڕووی سەرزەنشـتو تووڕدانـەوە: ﴿ أَكَفَرۡتُم بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡ ﴾ واتـە: چۆن کوفـرو گومراییتـان هەڵبژارد بەسـەر ئیمان و ڕێنمایـی دا؟ وە چۆن وازتان لـە ڕێگەی ژیری هێناو ڕێگەی خراپەکارییو سـەرپێچیتان گرتەبـەر؟ ﴿ فَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡفُرُونَ ﴾ کەواتـە: هیـچ شـایەنی ئێـوە نیـە جگە لـە دۆزەخو ئاگر نەبـێ، وە شـایانی هیچ نیـن جگە لە ڕیسـواییو سەرشـۆڕیو شـەرمەزاری نەبێ، ﴿ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱبۡيَضَّتۡ وُجُوهُهُمۡ ﴾ (بەڵام ئەوانەی کە ڕوخسـاریان سـپیو گـەشو جوانە) ئەوە بە باشـترین شـێواز پێشـوازیان لـێ دەکرێتو گەورەتریـن موژدەیـان دەدرێتـێ، مـژدەی بەهەشـتیان پـێ دەدرێ، مـژدەی خوا لـێ ڕازی

بــوونو بەزەیی خوای میهرەبــان، ﴿ فَفِى رَحْمَةِ ٱللَّهِ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾ بۆ هەتــا هەتایی لە ژێر ڕەحمەتــی خوادا دەمێننەوە، بەهەشــت نیشــانەیەکە لە نیشــانەکانی ڕەحمەتی خــوای میهرەبان، تیایــدا دەمێننــەوە لە نــازو نیعمەتی زۆرو بەرفــراوان جێگیر دەبــن بە هەمیشــەیی، وە ژیانێکی خــۆش لە نزیــک بــە بەزەییترینو بە ســۆزترینی بە ســۆزەکان بەســەر دەبەن.

کاتێک خوای گەورە بڕیاری ســزاو پاداشــتی ڕوونکــردەوە بۆ پێغەمبەرەکــەی ﷺ فەرمووی: ﴿ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ نَتْلُوهَا ﴾ (ئەوانــە ئایەتەکانــی خوایــە بەســەرتدا دەیخوێنینــەوە) واتــە: دەیخوێنینــەوە ﴿ عَلَيْكَ بِٱلْحَقِّ ﴾ چونکە بە ڕاســتی فەرمان پێکــراو قەدەغەکراوەکانی خوای گەورە گشــتگیرن لە دانایی و ســۆزو پاداشــتو ســزا، بە هەمان شــێوە پڕە لە داناییو ســۆزو دادگەریــیو دوورە لــە هەموو جۆرە ســتەمێک، لەبەر ئەمــە خوای گــەورە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِّلْعَٰلَمِينَ ﴾ خــوای گــەورە هیــچ ســتەمێکی ناوێــتو لای پەســند نیــە بەرانبەر هیــچ کەســێک لە دروســتکراوەکانی بکــرێ، هیچ کەســێک ناتوانێــت لە چاکــەی خوا کەم بکاتــەوە، هیچ ســتەمکارێک جگــە لە مافی خۆی ســتەمی لێناکرێــت، بەڵکو هەموو پاداشــت وەردەگــرن بــە گوێــرەی کردارەکانیان، پاشــان خوای گــەورە دەفەرموێ:

وَلِلَّهِ مَا فِي السَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَإِلَى اللَّهِ تُرْجَعُ الْأُمُورُ
﴿١٠٩﴾ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ
وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلَوْ ءَامَنَ أَهْلُ
الْكِتَٰبِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُم مِّنْهُمُ الْمُؤْمِنُونَ وَأَكْثَرُهُمُ
الْفَٰسِقُونَ ﴿١١٠﴾ لَن يَضُرُّوكُمْ إِلَّا أَذًى وَإِن يُقَٰتِلُوكُمْ
يُوَلُّوكُمُ الْأَدْبَارَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ ﴿١١١﴾ ضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ
الذِّلَّةُ أَيْنَ مَا ثُقِفُوا إِلَّا بِحَبْلٍ مِّنَ اللَّهِ وَحَبْلٍ مِّنَ النَّاسِ
وَبَاءُو بِغَضَبٍ مِّنَ اللَّهِ وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ الْمَسْكَنَةُ ذَٰلِكَ
بِأَنَّهُمْ كَانُوا يَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ اللَّهِ وَيَقْتُلُونَ الْأَنبِيَاءَ
بِغَيْرِ حَقٍّ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا وَّكَانُوا يَعْتَدُونَ ﴿١١٢﴾ ۞ لَيْسُوا
سَوَاءً مِّنْ أَهْلِ الْكِتَٰبِ أُمَّةٌ قَائِمَةٌ يَتْلُونَ ءَايَٰتِ اللَّهِ
ءَانَاءَ الَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ ﴿١١٣﴾ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ
الْءَاخِرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ
وَيُسَٰرِعُونَ فِي الْخَيْرَٰتِ وَأُولَٰٓئِكَ مِنَ الصَّٰلِحِينَ ﴿١١٤﴾ وَمَا
يَفْعَلُوا مِنْ خَيْرٍ فَلَن يُكْفَرُوهُ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالْمُتَّقِينَ ﴿١١٥﴾

(۱۰۹): ﴿ وَلِلَّهِ مَا فِي السَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَإِلَى اللَّهِ تُرْجَعُ الْأُمُورُ ﴿١٠٩﴾ ﴾:
واتــە: هەرچی لە نێو ئاســمانەکانو زەویدایە خــوا خاوەنیانــە، ئــەو خوایەی کە دروســتی کــردوونو ڕزقو ڕۆزیان پێــدەداتو قەزاو قــەدەرو چارەنوســیان هەر لــە لای خۆیەتی چــۆن بیەوێت بەو شــێوەیە دیــاری دەکات، لــە فەرمــانو ڕێســاو یاســاکاندا، وە هەموو بــۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە لــە ڕۆژی دوایی دا پاداشــتیان دەداتــەوە بەپێــی کردەوەکانیان، کردەوە باشــەکانو خراپەکان.

(۱۱۰- ۱۱۲): ﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلَوْ ءَامَنَ أَهْلُ الْكِتَٰبِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُم مِّنْهُمُ الْمُؤْمِنُونَ وَأَكْثَرُهُمُ الْفَٰسِقُونَ ﴿١١٠﴾ لَن يَضُرُّوكُمْ إِلَّا أَذًى وَإِن يُقَٰتِلُوكُمْ يُوَلُّوكُمُ الْأَدْبَارَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ ﴿١١١﴾ ضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ الذِّلَّةُ أَيْنَ مَا ثُقِفُوا إِلَّا بِحَبْلٍ مِّنَ اللَّهِ وَحَبْلٍ مِّنَ النَّاسِ وَبَاءُو بِغَضَبٍ مِّنَ اللَّهِ وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ الْمَسْكَنَةُ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا يَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ اللَّهِ وَيَقْتُلُونَ الْأَنبِيَاءَ بِغَيْرِ حَقٍّ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا وَّكَانُوا يَعْتَدُونَ ﴿١١٢﴾ ﴾

خــوای گــەورە لــەم ئایەتانەدا ستایشــی ئــەم ئوممەتــە دەکاتو ڕایدەگەیەنێت کە باشــترین ئوممەتێکــن کــە خوای گــەورە هێناویەتیــە مەیدان، لەبەر ئــەوەی نەفــسو دەروونی خۆیان پــڕ کــردوە لــە ئیمــانو ســەرجەم فەرمانەکانــی خــوا جێبەجــێ دەکــەن، وە ئیمانــی تەواو کــردوون، چونکــە فەرمــان بــە چاکــە دەدەنو قەدەغــەی خراپە دەکــەن، ئەمــە بانگەوازی خەڵکــە بــۆ لای خــوای میهرەبان، وە جیهادو کۆششــیان تەنهــا بۆ ئەو مەبەســتەیە، وە ئەوەی لــە توانایانــدا بێت لــە وەڵامدانــەوەی گومڕاکانو لە ســنوور دەرچــوان وەڵامــی دەدەنەوەو دریغــی ناکــەن، ئــا لەبــەر ئەمەیە بوون بــە چاکتریــن ئوممــەت، وەک چۆن لــە دەقەکەی پێشــوودا خــوای گــەورە فەرمــووی: ﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ

﴿وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ﴾ فەرمانــە لــە لایــەن خــوای گــەورەوە، وە فەرمانیش فەرمــان پێکراو لەوەیــە جێبەجێــی بکاتو پێی هەســتێت لەوەشــە پێی هەڵنەسێت، لەم دەقــەدا خوای گەورە هەواڵــی داوە کە بەڕاســتی ئەم ئوممەتە بە ئەرکی ســەر شــانی خۆیان هەســتاونو گوێڕایەڵی فەرمانــی پەروەردگاریــان کــردوە، بۆیە شــایانیانە فەزڵو چاکەیان بدرێت بەســەر ســەرجەم گــەلو نەتەوەکانــی دیکــەدا، ﴿وَلَوۡ ءَامَنَ أَهۡلُ ٱلۡكِتَٰبِ لَكَانَ خَيۡرٗا لَّهُم﴾لێــرەدا خــوای گەورە بــە نەرمو نیانــی بانگی خاوەنانــی کتێب دەکات بــۆ لای ئیمــان هێنان، بەڵام ئیمانیــان نەهێنــا جگــە لــە کەمێکیــان نەبــێ، زۆربەیــان گوناهبــارو تاوانکارو دەرچــوون لە فەرمانــی خــوا، دژایەتــی دۆســتانی خــوا دەکەن بــە هەموو جــۆرەکان، بەڵام خــوای گەورە بــە ســۆزو بەزەیــی خــۆی بــۆ بــڕواداران هەمــوو فێــڵو تەڵەکەکانیانــی ڕەت کردوەتەوە، بــڕواداران لــە لایــەن ئەوانــە هەرگیز زیانیــان پێناگات نــە بــە ئاینەکەیان نە بە جەســتەیان، تەنهــا ئــەوە نەبێ بە زمان قســەو قســەلۆکی بێ مانــا دەکەن، هیــچ دوژمنێک بێبــەش نابێت لە قســەو جنێــوی دوژمنەکەی، ئەگــەر ڕووبەڕووی بــڕواداران ببنەوەو بجەنگن ئەوە پشــتیان تێدەکــەنو هەڵدێــن، پاشــان پشــت هەڵکردنو سەرشــۆڕیان بــەردەوام دەبێ، لــەوەو دواش ســەرکەوتوو نابــن لە هیچ کاتێکــدا، لەبەر ئەمە خوای گەورە هەواڵی داوە بەڕاســتی ســزایان دەدات بــە زەلیلــی لــە ناخەکانیانــداو سەرشــۆڕی لە شــوێنو جێگایــان بە ئاشــکرا، هەرگیز ئــارامو نیشــتەجێ نابــنو دڵنیــا نابــن، ﴿إِلَّا بِحَبۡلٖ﴾ واتــە: (مەگــەر بــە) پەیمانێک ﴿مِّنَ ٱللَّهِ وَحَبۡلٖ مِّنَ ٱلنَّاسِ﴾ جوولەکــە دەبێــت یــان لــە ژێــر دەســەڵاتی مســـوڵمانانداا بحەوێنەوە ســەرانەیان بەســەر شــۆڕی لێ وەربگیرێت، یان لە ژێر دەســەڵاتی نەصرانیەکان، وە بێگومان ﴿وَبَآءُو﴾ (گەڕانــەوە شایســتەی) ﴿بِغَضَبٖ مِّنَ ٱللَّهِ﴾(خەشــمو قینــی خوا بــوون) ئەمە گەورەتریــن ســزایە، هــۆکاری ئــەوەی کە بەم حاڵە گەیشــتن خــوای گەورە باســی کردوە دەفەرمــوێ: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَانُواْ يَكۡفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾(چونکــە ئەوانــە بڕوایان نەبوو بە ئایەتەکانــی خــوا) کە دایبەزانــد بۆ پێغەمبەرەکــەی موحەممەد کە ڕاســتەو هیــچ گومانێکی تێــدا نیــە، لەگەڵ ئەوەشــدا نکووڵیو ســەرپێچیان دەکــرد، ﴿وَيَقۡتُلُونَ ٱلۡأَنۢبِيَآءَ بِغَيۡرِ حَقّٖ﴾ واتــە: لــە بەرانبەر ئــەوەی کــە پێغەمبــەران چاکەیان لەگەڵــدا دەکردن بە باشــترین شــێوە، ئەوانــە (واتــە: کافــرەکان) بــە خراپترین شــێوە مامەڵیــان لەگــەڵ (پێغەمبەرانــدا) دەکردن، ئەویــش بریتــی بوو لــە کوشــتن، ئایا هیچ شــتێک هەیە لــەو تاوانــە گەورەتر بــێ؟ هەموو ئەوانــە بە هــۆی ســەرپێچیکردنو لە ســنوور دەرچوونیانــەوە بوو، ئــەو تاوانــە وای لێکردن

كە نەترسن لە بێبڕوایی‌و كوفر كردن بە خواو كوشتنی پێغەمبەران.

(١١٣-١١٥): ﴿لَيْسُوا سَوَاءً مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ أُمَّةٌ قَائِمَةٌ يَتْلُونَ آيَاتِ اللَّهِ آنَاءَ اللَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ ﴿١١٣﴾ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَأُولَٰئِكَ مِنَ الصَّالِحِينَ ﴿١١٤﴾ وَمَا يَفْعَلُوا مِنْ خَيْرٍ فَلَن يُكْفَرُوهُ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالْمُتَّقِينَ ﴿١١٥﴾﴾:

كاتێك خوای گەورە حاڵی ئەو كۆمەڵە تاوانبارەی لە جوولەكەو نەصرانییەكان وەسف كرد، وە كردار و سزاكانیانی باس كرد، ئنجا باسی ئۆممەتی خاوەن ڕاستە شەقام دەكاتو كردارو پاداشتەكانیان ڕوون دەكاتەوە، هەواڵی داوە ئەو دوو تاقمە وەك یەكتر نین لای ئەو، بەڵكو ئەوەندە جیاوازی لە نێوانیادا هەیە هەژمار ناكرێ، ئەو كۆمەڵە تاوانبارە لە پێشەوە وەسفكرا، بەلام كۆمەڵەی بڕواداران، خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێ: لە (نێو) وان هەن ﴿أُمَّةٌ قَائِمَةٌ﴾واتە: یەكسان لەسەر ئاینی خواو فەرمانەكانی جێبەجێ دەكەن، لەوانە نوێژەكانیان لە كاتی خۆیدا دەكەن، ﴿يَتْلُونَ آيَاتِ اللَّهِ آنَاءَ اللَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ﴾ ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی نوێژەكانیان لە شەودا، وە خوێندنی كتێبی پەروەردگاریانو كڕنۆشو سوجدە بردنیان بۆ خوای گەورە، ﴿يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ﴾ واتە: وەك ئیمانی بڕواداران باوەڕێك لەسەر دان پێدانان بە هەموو پێغەمبەران بێت كە خوا ناردوونی، وە هەموو كتێبێك كە خوا دایگرتبێت، وە ئیمان هێنانی بە ڕۆژی دوایی تایبەت كردوە، چونكە ئیمانی ڕاستەقینە بە ڕۆژی دوایی بڕوادار هاندەدات بۆ ئەوەی زیاتر لە خوا نزیك ببێتەوەو واز لە هەموو شتێك بهێنێت كە سزای لەسەر دەدرێ: ﴿وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ﴾ بەو شێوەیە ئیمانیان تەواو جێگیر دەبێ، ئنجا خەڵكی بانگ دەكەن بۆ ئەو ڕێگایەو ئەوەی چاك بێت پێشانی دەدەنو فەرمانی پێ دەكەن، وە ئەوەی خراپ بێ لێی قەدەغە دەكەن، لەوانە گرنگی دانیان بە خاوەن ئاینەكانی تر بە بڕوا هێنان بە پێغەمبەر موحەممەد ﷺ پاشان خوای گەورە وەسفیان دەكات بە سیفەتە بەرزەكان: ﴿وَيُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ﴾واتە: ئەوان دەستپێشخەری دەكەن بە دوای هەڵێكدا دەگەڕێن، وە لە یەكەم كاتدا ئەگەر توانایان بێت ئەنجامی دەدەن، ئەمەش لەبەر ئەوەیە زۆر تامەزرۆی خێرو چاكەن، چونكە زانیاریان هەیە بە سودو قازانجو داهاتووی پرشنگدار لە لای خوای گەورە، ئەوانە خوای گەورە وەسفی كردوون بەو سیفەتە بەرزو جوانانەو كردارە

بەرزانـە، ﴿ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾ئەوانـەی کـە خوای گـەورە دیانخاتە ناو ڕەحمـەتو میهربانی خۆیـەوەو لێیـان خـۆش دەبـێ، وە فەزڵو چاکـەی خـۆی بەسـەریاندا دەبارێنـێ، وە ئەوانە هـەر خێـرو چاکەیـەک بکـەن زۆر بێت یـان کـەم، ﴿ فَلَن يُكۡفَرُوهُ ﴾خـوای گەورە ڕەنـج بە خەسـاریان نادات‌و بە فیـڕۆ ناچێت، بەڵکو بە باشـترین شـێوە پاداشـتیان دەداتەوە، بـەڵام پاداشـتی کردەوەکان پەیوەندیـان هەیە بە دڵـی خاوەنەکەیەوە لە بـڕواو پارێزکاریی، لەبـەر ئەمـە خـوای میهرەبـان دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلۡمُتَّقِينَ ﴾ وەک چـۆن دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلۡمُتَّقِينَ ٢٧ ﴾المائـدة (بێگومـان خـوا کـردەوەی چاک لـە پارێزکاران قبـووڵ دەکات).


إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَن تُغۡنِيَ عَنۡهُمۡ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُهُم مِّنَ
ٱللَّهِ شَيۡـًٔاۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ١١٦
مَثَلُ مَا يُنفِقُونَ فِي هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا كَمَثَلِ رِيحٖ فِيهَا
صِرٌّ أَصَابَتۡ حَرۡثَ قَوۡمٖ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَأَهۡلَكَتۡهُۚ وَمَا
ظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ وَلَٰكِنۡ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ١١٧ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ بِطَانَةٗ مِّن دُونِكُمۡ لَا يَأۡلُونَكُمۡ خَبَالٗا
وَدُّواْ مَا عَنِتُّمۡ قَدۡ بَدَتِ ٱلۡبَغۡضَآءُ مِنۡ أَفۡوَٰهِهِمۡ وَمَا تُخۡفِي
صُدُورُهُمۡ أَكۡبَرُۚ قَدۡ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِۖ إِن كُنتُمۡ تَعۡقِلُونَ
١١٨ هَٰٓأَنتُمۡ أُوْلَآءِ تُحِبُّونَهُمۡ وَلَا يُحِبُّونَكُمۡ وَتُؤۡمِنُونَ بِٱلۡكِتَٰبِ
كُلِّهِۦ وَإِذَا لَقُوكُمۡ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوۡاْ عَضُّواْ عَلَيۡكُمُ
ٱلۡأَنَامِلَ مِنَ ٱلۡغَيۡظِۚ قُلۡ مُوتُواْ بِغَيۡظِكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ
ٱلصُّدُورِ ١١٩ إِن تَمۡسَسۡكُمۡ حَسَنَةٞ تَسُؤۡهُمۡ وَإِن تُصِبۡكُمۡ
سَيِّئَةٞ يَفۡرَحُواْ بِهَاۖ وَإِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ لَا يَضُرُّكُمۡ كَيۡدُهُمۡ
شَيۡـًٔاۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطٞ ١٢٠ وَإِذۡ غَدَوۡتَ مِنۡ أَهۡلِكَ
تُبَوِّئُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ مَقَٰعِدَ لِلۡقِتَالِۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ١٢١

(١١٦-١١٧): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَن تُغۡنِيَ عَنۡهُمۡ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيۡـًٔاۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ١١٦ مَثَلُ مَا يُنفِقُونَ فِي هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا كَمَثَلِ رِيحٖ فِيهَا صِرٌّ أَصَابَتۡ حَرۡثَ قَوۡمٖ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَأَهۡلَكَتۡهُۚ وَمَا ظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ وَلَٰكِنۡ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ١١٧ ﴾:

خوای گەورە هەواڵ دەدات بە راستی ئەوانەی کافرن هەرگیز ماڵو منداڵیان فریایان ناکەوێ لە خەشمو قینی خوا رزگاریان نابێ، مانای ئەوەیە بەرگری لە سزای خوا ناکاتو وەک چۆن سودو کەڵکی نیە، وەک خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُكُم بِٱلَّتِي تُقَرِّبُكُمۡ عِندَنَا زُلۡفَىٰٓ إِلَّا مَنۡ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ جَزَآءُ ٱلضِّعۡفِ بِمَا عَمِلُواْ وَهُمۡ فِي ٱلۡغُرُفَٰتِ ءَامِنُونَ ٣٧ ﴾ سبأ، (واتە: نە ماڵتانو نە نەوەتان نابنە هۆی ئەوەی کە بە تەواوی نزیکتان بخەنەوە لە ئێمە، مەگەر کەسێک بڕوای هێنابێتو کارو کردەوەی چاکی ئەنجام دابێ)، بەڵکو ماڵو منداڵەکانیان دەبن بە توێشوویەک بۆ ناو دۆزەخ، وە دەبن بە بەڵگە لەسەریان کە خوای گەورە زیاتر نازو نیعمەتی خۆی داباراندوە بەسەریاندا، پێویست بوو لەسەریان سوپاسگوزاری بکەن، وە سزا دەدرێن لەسەر ئەوەی کە بە کاری خۆیان لە دنیادا هەڵنەساون، لەبەر ئەمە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾ پاشان خوای گەورە نموونەیەک دەهێنێتەوە دەربارەی بەخشینی بێبڕوایان بۆ دژایەتی کردنی ئاینی خوا، بەڵام بە تاڵ دەبێتەوەو دەپوکێتەوە، وەک نموونەی کەسێک وایە کشتوکاڵێکی کردبێت چاوەڕوانی ئەنجامەکەی بکات، لە کتوپڕێکدا ڕەشەبایەکی زۆر سارد بدات بەسەر کێڵگەکەیداو هەمووی تیابچێت، تەنها ماندووبوون ئاخو خەفەت هەڵمژێت، بە هەمان شێوە ئەو بێبڕوایانە خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُمۡ

لِيَصُدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيۡهِمۡ حَسۡرَةٗ ثُمَّ يُغۡلَبُونَۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحۡشَرُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾الأنفال، ﴿ وَمَا ظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ ﴾ خوای گەورە ستەمی لێنەکردوون بە پووچ کردنەوەی کردەوەکانیان، ﴿ وَلَٰكِنۡ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴾ بەڵکو هەر خۆیان ستەمیان لە خۆیان کردوە، کاتێک کە بێبڕوا بوون بە ئایەتەکانی خواو پێغەمبەرەکەیان بە درۆ خستوەتەوەو سوور بوونە لەسەر کوژاندنەوەی ئەو بانگەوازە، ئەم کارانە بووە مایەی ئەوەی کردەوەکانیان پووچ ببێتەوە.

پاشان خوای گەورە دەفەرموێ:

(١١٨-١٢٠): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ بِطَانَةٗ مِّن دُونِكُمۡ لَا يَأۡلُونَكُمۡ خَبَالٗا وَدُّواْ مَا عَنِتُّمۡ قَدۡ بَدَتِ ٱلۡبَغۡضَآءُ مِنۡ أَفۡوَٰهِهِمۡ وَمَا تُخۡفِي صُدُورُهُمۡ أَكۡبَرُۚ قَدۡ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِۖ إِن كُنتُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴿١١٨﴾ هَٰٓأَنتُمۡ أُوْلَآءِ تُحِبُّونَهُمۡ وَلَا يُحِبُّونَكُمۡ وَتُؤۡمِنُونَ بِٱلۡكِتَٰبِ كُلِّهِۦ وَإِذَا لَقُوكُمۡ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوۡاْ عَضُّواْ عَلَيۡكُمُ ٱلۡأَنَامِلَ مِنَ ٱلۡغَيۡظِۚ قُلۡ مُوتُواْ بِغَيۡظِكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿١١٩﴾ إِن تَمۡسَسۡكُمۡ حَسَنَةٞ تَسُؤۡهُمۡ وَإِن تُصِبۡكُمۡ سَيِّئَةٞ يَفۡرَحُواْ بِهَاۖ وَإِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ لَا يَضُرُّكُمۡ كَيۡدُهُمۡ شَيۡـًٔاۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطٞ ﴿١٢٠﴾ ﴾

خوای گەورە قەدەغەی کردوە لەسەر بەندە بڕوادارەکانی متمانە بکەن بە دووڕووەکان لە خاوەن کتێبەکانو هاوشێوەکانیان، نهێنیەکانیان لەلا باس بکەن، یان هەندێ کارو فەرمان بخەنە ژێر دەستیان، لەبەر ئەوەی ئەوان ئەو دوژمنەن کە دڵەکانیان پڕە لە دژایەتیو ڕقو کینە کە لەسەر زمانیان دەرکەوتووە، ﴿ وَمَا تُخۡفِي صُدُورُهُمۡ أَكۡبَرُ ﴾ ئەوەی کە لێیان دەبیستیت، لەبەر ئەمەیە ﴿ لَا يَأۡلُونَكُمۡ خَبَالٗا ﴾ واتە: درێخی ناکەن بۆ ئەوەی زیانتان لێبدەنو ئازارتان پێبگەیەنن، وە هەموو هۆکارەکان دەگرنە بەر بۆ ئەوەی زەرەرتان لێبدەنو یارمەتی دوژمنانتان دەدەن بۆ لە ناوبردنی ئێوە، خوای گەورە بە ئیمانداران دەفەرموێ: ﴿ قَدۡ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ ﴾واتە: ئەوەی لە قازانجی دینو دنیای ئێوەدایە، ﴿ إِن كُنتُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴾ واتە: (ئەگەر عەقڵو ژیریتان بخەنە کار) بیانناسنەوەو دۆستو دوژمن لە یەکتر جیا بکەنەوە، نابێت متمانە بە هەموو کەسێک بکرێت، بەڕاستی کەسی عاقڵ ئەگەر تووشی بەڵا بوو تێکەڵاوی دوژمنی کرد، با تێکەڵاویەکەی تەنها بە ڕووکەش بێت، با ئەوەی لە ناخیدایە بۆی ئاشکرا نەکات تەنانەت ئەگەر خۆیشی هێنایە پێشەوەو سوێندی بۆ خوارد کە ئەو لە دۆستەکانیەتی. خوای گەورە بڕواداران ئاگادار دەکاتەوە کە خۆیان بپارێزن لە دووڕوەکان بە

تایبەت لە خاوەن کتێبە ئاسمانیەکان، وە روونی دەکاتەوە کە چەندە قین ئەستورن بەرانبەر بە بڕواداران: ﴿ هَٰٓأَنتُمۡ أُوْلَآءِ تُحِبُّونَهُمۡ وَلَا يُحِبُّونَكُمۡ وَتُؤۡمِنُونَ بِٱلۡكِتَٰبِ كُلِّهِۦ ﴾ واتە: لە رەگەزی هەمان کتێبە کە خوای گەورە دایبەزاندوە بۆ سەر پێغەمبەران، کەچی ئەوان بڕوا بە کتێبەکەی ئێوە ناکەن کە قورئانە، بەڵکو کاتێک بگەن بە ئێوە ئیمانی خۆیان ئاشکرا دەکەن، ﴿ وَإِذَا لَقُوكُمۡ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوۡاْ عَضُّواْ عَلَيۡكُمُ ٱلۡأَنَامِلَ مِنَ ٱلۡغَيۡظِۚ ﴾ (کاتێک کە بە تەنها دەبن) لێواری پەنجەیان دەگەزن ئەوەندە رق ئەستورو داخ لە دڵن، ﴿ قُلۡ مُوتُواْ بِغَيۡظِكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴾ (دەی بۆ خۆتان لە داخانا بمرن بەڕاستی خوا زۆر زانایە بەوەی کە لە ناو سینەکاندایە)، ئا ئەمە مژدەیەکی تێدایە بۆ ئیمانداران، بریتیە لەوەی ئەوانەی کە دەیانەوێت زەرەر بدەن لە ئێوە تەنها خۆیان زەرەرمەند دەبن، وە ئەو رقو کینەی هەیانە ناتوانن جێبەجێی بکەن، بەڵکو بەردەوام ئازار دەچێژن هەتا دەمرنو دەگوازرێنەوە لە سزای دونیا بۆ سزای دوا رۆژ.

﴿ إِن تَمۡسَسۡكُمۡ حَسَنَةٞ ﴾ وەک سەرکەوتن بەسەر دوژمنداو بەدەست هێنانی ماڵو سامانو دەستکەوت ﴿ تَسُؤۡهُمۡ ﴾ واتە: بێبڕوان پێیان ناخۆش دەبێتو دڵتەنگ دەبن ﴿ وَإِن تُصِبۡكُمۡ سَيِّئَةٞ يَفۡرَحُواْ بِهَاۖ وَإِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ لَا يَضُرُّكُمۡ كَيۡدُهُمۡ شَيۡـًٔاۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطٞ ﴿١٢٠﴾ ﴾ ئەگەر دەست بەو هۆکارانەوە بگرن کە خوای گەورە پەیمانی داوە سەرتان بخات ئەویش بریتیە لە - ئارامگرتنو خۆپارێزی - پیلانو تەڵەکەی ئەوان هیچ زیانێکتان پێناگەیەنێت، بەڵکو خوای گەورە فێڵو تەڵەکەیان لەناو دەبات، چونکە خوا دەوری پیلانیانی داوە بە زانستو دەسەڵاتی خۆ، بێبڕوان هیچ رێگا چارەیەکیان نیە، وە هیچ شتێک لەخوا ناشاردرێتەوە.

(١٢١-١٢٢): ﴿ وَإِذۡ غَدَوۡتَ مِنۡ أَهۡلِكَ تُبَوِّئُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ مَقَٰعِدَ لِلۡقِتَالِۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٢١﴾ إِذۡ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمۡ أَن تَفۡشَلَا وَٱللَّهُ وَلِيُّهُمَاۗ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴿١٢٢﴾ ﴾:

ئەم ئایەتانە لە میانەی جەنگی ئوحوددا دابەزیون، چیرۆکەکەی بەناوبانگە لە کتێبەکانی ژیاننامەو مێژوودا باس کراوە، وە دەکرێت حیکمەتی باسکردنی لەم شوێنەدا، وە بەهەمان شێوە لە ناو ئەم باسەدا رووداوی (بدر)یش باسکراوە، لەبەر ئەوەبێت کە خوای گەورە پەیمانی داوە بە بڕواداران ئەگەر ئارام بگرنو خۆپارێزی بکەن سەریان دەخات بەسەر دوژمنداو فێڵو تەڵەکەی دوژمنان هەڵدەوەشێنێتەوە،

ئـەوە حوکمێکـی گشـتیەو پەیمانێکی ڕاسـتەقینەیە دێتـە دی ئەگەر مەرجەکانـی جێبەجێ بکرێـت، خـوای گـەورە دوو نموونـەی دەربـارەی ئـەو دوو چیرۆکـە هێناوەتـەوە، کـە بێگومـان خـوای گـەورە ئیماندارانـی لـە جەنگی بەدردا سـەر خسـت، چونکـە ئارامگرو خـۆ پارێـز بـوون، وە دوژمنی بەسـەردا سەرخسـتن کاتێک لـە لایـەن هەندێکیانەوە کەم تەرخەمـی کـرا بەرانبەر بە تەقـواو خۆپارێـزی، وە یەکێک لە حیکمەتەکانـی کۆکردنەوە لـە نێـوان ئـەو دوو بەسـەرهاتەدا ئەوەیـە کە بـە دڵنیایی خـوای میهرەبـان ئـەو بەندانەی خـۆش دەوێـت کاتێـک توشـی بەڵایـەک دەبـن، یـادی ئـەوە بکەنـەوە کـە خۆشـیان دەوێـت، بێگومـان بەڵاکەیـان لەسـەر سـوک دەکرێـت، وە سوپاسـی خوا بکەن لەسـەر ئـەو نـازو نیعمەتـە گەورەیـە، کە لـە ڕاسـتیدا خێـری تێدایـە بۆ ئـەوان، بەڵاو ناخۆشـی بـە نیسـبەتی خۆشویسـتراوە شـتێکی زۆر ئاسـانە، خـوای گەورە ئامـاژەی بـەم حیکمەتە کـردوە لـە وتەکەیـدا ﴿أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَدۡ أَصَبۡتُم مِّثۡلَيۡهَا قُلۡتُمۡ ﴿١٦٥﴾﴾ آل عمـران، پوختـەو کورتـەی بەسـەرهاتی جەنگـی ئوحـود ئەوەیـە کاتێـک بێبڕوایـان لـە جەنگی بەدردا بەسـەر شـۆڕیەوە شکسـتیان خـوارد و گەڕانەوە بۆ شـاری مەککە، ئەویش لـە سـاڵی دووەمـی کۆچیدا بـوو، بت پەرسـتانی قورەیـش خۆیـان ئامادە کرد بـە هەموو ئامرازێکـی خـۆ ئامادەکـردن لـە ڕووی ژمـارەو ماڵو پیـاوو سـەرجەم پێداویسـتیەکانی جەنـگ، لەگـەڵ کۆبوونەوەی ئـەو هەموو ڕقـەی هەیانبوو بەرانبـەر بە ئیمانداران، پاشـان لـە شـاری مەککـەوە بە سـێ هـەزار سـەربازەوە ڕوویان کـردە مەدینـە، هەتا لـە نزیک مەدینـە جێگیـر بـوون، پێغەمبـەری خوا دەرچوو بـۆ ڕووبـەڕوو بوونەوەیان پـاش ڕاوێژو کۆبوونـەوە هەتـا یـەک دەنـگ بـوون لەسـەر دەرچـوون، پێغەمبـەر دەرچوو بـە هەزار پیـاوەوە، کاتێـک کەوتنـە ڕێ ئەندازەیـەک ڕێگایـان بڕی لە نیـوەی ڕێگـا عەبدوڵڵای کـوڕی ئوبەیـی دووڕوو بە سـێیەکی سـەربازەکانەوە گەڕانـەوە بۆ مەدینـە، خەریک بوو لـە نیـوەی ڕێگـا ئـەو دوو دەسـتەش لـە ئیمانـداران بگەڕێنـەوە، ئەوانیـش بریتـی بوون لـە هـۆزی (بني سلمة) نەوەکانـی سـەلەمەو (بنو حارثة) نەوەکانـی حاریسـە، بـەڵام خـوا جێگیـری کـردن، کاتێـک گەیشـتن بـە ئوحـود پێغەمبەری خـوا ڕێکی خسـتن لە شـوێنەکانی خۆیـان دایمەزراندنو پشـتیاندا بـە کێوی ئوحـودەوە، پێغەمبـەر پەنجا پیاوی لـە هاوەڵەکانـی جێگیـر کـرد لەسـەر کێـوی ئوحـود لەبـەر ئـەوەی دوژمن لە پشـتەوە زیانیـان لێنـەدات، پێـی فەرمـوون ئەو شـوێنە بە هیچ شـیوەیەک چـۆڵ ناکـەن، کاتێک

مسـولْمانانو بـت پەرسـتان ڕووبـەڕووی یەکتـر بوونـەوە بـت پەرستەکان شکسـتێکی خراپیـان خـوارد، سـەنگەرەکانیان بەجێهێشـتو مسـولْمانان دوایـان کەوتـن لێیانیـان دەسـتگیر دەکـردنو دەکوشـت، کاتێـک ئەو هاوەڵانـەی سـەر کێوەکە کـە پێغەمبەری خـوا جێگیـری کردبـوون، ئـەو سـەرکەوتنەیان بینـی، هەندێکیـان بەهەندێکـی تریـان وت: دەسـتکەوت، دەسـتکەوت، بـۆ دابنیشـین لێـرەدا کـە دەزانیـن بـت پەرسـتان تێک شـکاون، سـەرکردەکەیان عەبدوڵـلای کـوڕی جوبەیـر ئامۆژگاری کردن کـە ئەو کارە سـەرپێچیە، بـەلام ئـەوان ئاوڕیان لـێ نەدایەوە، کاتێک شـوێنەکانی خۆیانیـان چۆڵ کرد، جگـە لـە چەند کەسـێکی کـەم کەس لەسـەر کێوەکـە نەمایـەوە لەوانە سـەرکردەکەیان عەبدوڵـلای کـوڕی جوبەیـر، کۆمەڵـە ئەسـپێک لـە بـت پەرسـتان هاتنـە ئەو شـوێنەو پشـتیان لـە مسـولْمانان گـرت، مسـولْمانانیش تووشـی ئـەو بەلایـە بـوون، ئەوە بـوو بە مایـەی کەفارەتـی سـەرپێچیەکەیانو سـزایان وەرگـرت، ئـەوەی ڕوویـدا ڕوویـدا لـە کوشـتنو کـوژران لێیان، پاشـان مسـولْمانان ڕوویـان کردە سـەر کێوی ئوحـود، خوای گـەورە دەسـتی بـت پەرسـتانی لـێ دوور خسـتنەوەو گەڕانـەوە بـۆ ولاتەکـەی خۆیان، پێغەمبـەری خـواو هاوەڵانـی گەڕانـەوە بـۆ مەدینـە، خـوای گـەورە فەرمـووی: ﴿ وَإِذْ غَدَوْتَ مِنْ أَهْلِكَ ﴾ (الغـدو) لێرەدا دەرچوونی گشـتگیرە، مەبەسـت لـە دەرچوونی دەمەو بەیـان نیـە، چونکـە پێغەمبـەر ﷺ دوای نوێـژی هەینـی دەرچـوو، ﴿ تُبَوِّئُ ٱلْمُؤْمِنِينَ مَقَٰعِدَ لِلْقِتَالِ ﴾ واتـە: پێگـەی گونجـاوی جەنگـت بـۆ بـڕوادارەکان دیـاری دەکرد، ئـەم دەقـە ئەوەی لـێ وەردەگیرێـت کە گەورەترین وەسـفە بـۆ پێغەمبەری خـوا، چونکە ئـەو ڕاسـتەوخۆ شـوێنی بۆ بـڕواداران دیاری کـرد، ئەمەش تـەواوی زانسـت و زانیاریو بیـر تیـژیو بەرزی ورەو بـە توانایـی پێغەمبەر ﷺ دەردەخـات، کە ڕاسـتەوخۆ خۆی بەو کارانـە هەڵدەسـتا، ﴿ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾، بە ڕاسـتی خوا بیسـەری هەموو بیسـتراوەکانە، بـە شـێوەیەک کـە هەرچـی گفتوگـۆی بـڕوادارانو دووڕووەکان بێـت دەیبیسـێت، هەروەهـا زاناترینـە بە نیەتـی دڵی بەندەکان، پاداشـتیان دەداتـەوە بە تەواوترین پاداشـت، بـە هەمـان شـێوە خـوا بیسـەرو زانایە بـە ئێـوە، دەتانژێنێـت، کاروبـاری ژیانتـان ڕێک دەخـات، وە پشـتگیریتان دەکات بـە سـەرکەوتن، وەک بە مووسـاوو هاروونـی فەرموو: ﴿ إِنَّنِي مَعَكُمَآ أَسْمَعُ وَأَرَىٰ ﴿٤٦﴾ ﴾ طـە، (واتـە: بێگومـان مـن لەگەڵتانـم، دەبیسـمو دەبینـم)، یەکێکـی دی لـە سـۆزو بەزەیـی چاکەکانـی خـوا بەرانبـەر بـە ئیمانـداران

إِذْ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمْ أَن تَفْشَلَا وَٱللَّهُ وَلِيُّهُمَا وَعَلَى ٱللَّهِ
فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١٢٢﴾ وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ
فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ
أَلَن يَكْفِيَكُمْ أَن يُمِدَّكُمْ رَبُّكُم بِثَلَٰثَةِ ءَالَٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ
مُنزَلِينَ ﴿١٢٤﴾ بَلَىٰٓ إِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ وَيَأْتُوكُم مِّن فَوْرِهِمْ
هَٰذَا يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُم بِخَمْسَةِ ءَالَٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُسَوِّمِينَ
﴿١٢٥﴾ وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ لَكُمْ وَلِتَطْمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِۦ
وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴿١٢٦﴾ لِيَقْطَعَ طَرَفًا
مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَوْ يَكْبِتَهُمْ فَيَنقَلِبُوا۟ خَآئِبِينَ ﴿١٢٧﴾
لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ
ظَٰلِمُونَ ﴿١٢٨﴾ وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ يَغْفِرُ لِمَن
يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا
ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَأْكُلُوا۟ ٱلرِّبَوٰٓا۟ أَضْعَٰفًا مُّضَٰعَفَةً ۖ
وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٣٠﴾ وَٱتَّقُوا۟ ٱلنَّارَ ٱلَّتِىٓ أُعِدَّتْ
لِلْكَٰفِرِينَ ﴿١٣١﴾ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٣٢﴾

کاتێـک کە ﴿هَمَّت طَّآئِفَتَانِ﴾ خەریک بـوو دوو دەسـتە لـە ئێـوە پەشـێمان ببنەوە، ئەوانیـش بریتی بوون لە نەوەکانی سـەلەمەو نەوەکانـی حاریسـە وەک لـە پێشـەوە باس کرا، خـوای گـەورە نیعمەتی خـۆی جێگیر کـرد لەسـەر سـەرجەم بـڕواداران‌و دڵیانـی دامەزرانـد لەسـەر فەرمانداریـی، لەبـەر ئەمە دەفەرمـوێ: ﴿وَٱللَّهُ وَلِيُّهُمَا﴾ واتـە: یـارو یـاوەرو پشـگیری پشـت پـێ بەسـتوانە، ئـەوەش سـۆزی خۆیەتی بـە دۆسـتەکانی‌و سەرخسـتنیانە بۆ ئـەوەی کە چاکە بـۆ دنیاو دوا ڕۆژیـان، وە پاراسـتوونی لـەوەی کـە دەبێـت بە مایـەی زەرەرو زیانیـان، یەکێک لـە پشـگیری خوا بـۆ ئـەو دوو هـۆزە ئەوە بـوو کاتێـک هات بـە خەیاڵیاندا ئەو تاوانـە گەورە ئەنجام بـدەن ئەویش: پەشـێمان بوونەوەو ڕاکـردن‌و بـە جێهێشـتنی پێغەمبـەر ﷺ بـوو، خوا پارسـتنی لەگەڵ ئـەو ئیمانەی کـە هەیانە، وەک دەفەرمـوێ: ﴿ٱللَّهُ وَلِىُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ﴾ البقـرة، (واتە: خـوا پشـت‌و پەنـای بڕوادارانـە لـە تاریکایـەکان دەریـان دێنێت بـەرەو ڕووناکی)، پاشـان دەفەرمـوێ: ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ﴾ لـەم دوو دەقـەدا فەرمان کردنی تێدایە بە پشـت بەسـتن کـە گرنگی دانـی دڵە بـۆ بەدەسـتهێنانی چاکـەکان‌و دوور خسـتنەوەی خراپەکان لە متمانـە بوون بە خودا، بێگومان پشـت بەسـتن بـە پێی ئیمانـی خاوەنەکەیەتی، تـا چەند ئیمان بـەرز بێت پشـت بەسـتن بەهێزتر دەبێ، وە بەڕاسـتی بڕواداران لە پێشـترن بە پشـت بەسـتن بـە جگـە لـە خۆیان، بـە تایبەت لـە کاتـی نارەحەتیداو لـە کاتی جەنـگ کـردن بەرانبەر بە دوژمنـدا، ئـەوان ناچـارن بە پشـت بەسـتن‌و داوای یارمەتی لێکـردن لـە پەروەردگاریان، وە داوای سەرخسـتن، وە خۆبـەری کـردن‌و شـانازی نەکـردن بـە هێـزو توانای خۆیان، پشـت بەسـتن بـە هێزو تواناو دەسـەڵاتی خوا، بەو شـێوەیە سـەریان دەخـات‌و بـەڵاو نارەحەتیان لێ دوور دەخاتەوە.

(١٢٣- ١٢٦): ﴿ وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ تَقُولُ
لِلْمُؤْمِنِينَ أَلَن يَكْفِيَكُمْ أَن يُمِدَّكُمْ رَبُّكُم بِثَلَٰثَةِ ءَالَٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُنزَلِينَ ﴿١٢٤﴾ بَلَىٰٓ إِن تَصْبِرُوا۟
وَتَتَّقُوا۟ وَيَأْتُوكُم مِّن فَوْرِهِمْ هَٰذَا يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُم بِخَمْسَةِ ءَالَٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُسَوِّمِينَ ﴿١٢٥﴾ وَمَا
جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ لَكُمْ وَلِتَطْمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِۦ وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴿١٢٦﴾ ﴾:

ئەمــە منەتــی خوایە بەســەر بەنــدە بروادارەکانی خۆیدا، وە یادخســتنەوەیەکە بە ســەرکەوتنیان لــە ڕۆژی بــەدردا هەرچەنــدە لاوازو کــەم بــوون لــە ڕووی ژمــارەو کەرســتەی جەنگیەوەو لەگــەڵ ئەوەشــدا دوژمنەکانیان لە ژمارەو کەرســتەی جەنگیــەوە لەوان زۆرتر بــوون، جەنگی بــەدر دەکەوێتــە ســاڵی دووەمــی کۆچیەوە، پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ســێ ســەدو ئەوەند کەســەوە، تەنهــا حەفتــا حوشــتریان پــێ بــوو لەگــەڵ دوو ئەســپدا، دەرچــوون لــە مەدینە بــۆ ڕێگرتن لــە کاروانیەکــەی قورەیــش کە لــە شــام دەگەڕایەوە، بــت پەرســتانی مەککە بــەم پیلانەیان زانــی، خۆیــان ئامــادە کرد بــۆ ڕزگــار کردنــی کاروانیەکەیان، درچــوون بە نزیکــەی هەزار ســەربازەوە لەگــەڵ کەرســتەی تــەواوو چەکــی چــاکو ئەســپێکی زۆر، لەگەڵ مســوڵمانانداا گەیشــتن بــە یەکتــر لــە نزیــک ئاوێک پێــی دەوتــرا (بدر) کــە دەکەوێتــە نێــوان مەککەو مەدینــەوە، کوشــتار لــە نێوانیانــدا دەســتی پێکرد، خوای گەورە مســوڵمانانی ســەر خســت بە سەرخســتنێکی گــەورە، حەفتا ســەربازیان لە بت پەرســتەکان کوشــت ژمارەیــەک لە گەورە پیــاوو دەســەڵاتداریان تێــدا بوو، وە حەفتا کەســیان بە دیل لێ گرتنو دەســتیان گرت بەســەر ســەربازگەکەیاندا. (إن شـاء اللـه) ئــەم چیرۆکە لــە ســوورەتی ئەنفالدا بــاس دەکەین، چونکە لــەوێ شــوێنی خۆیەتــی بــاس بکرێــت، بەڵام ئــەوەی لێــرەدا خوای مەزن باســی کــردوە بۆ ئەوەیــە بیخاتــەوە بیری بــاوەڕداران هەتا سوپاســگوزار بــن، لەبەر ئەمــە دەفەرموێ: ﴿ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾ چونکــە هەر کەســێک لە خوا ترســا بێ ئەوە سوپاســگوزاری کردوە، وە هــەر کەســێک واز لــە خواترســان بهێنێت ئەوە سوپاســگوزاری خــوای نەکردوە.

کاتێــک تۆ ئــەی موحەممەد ﷺ لە ڕۆژی بەدردا بە بروادارانت دەفەرموو مژدەی ســەرکەوتنت پــێ دەدان: ﴿ أَلَن يَكْفِيَكُمْ أَن يُمِدَّكُمْ رَبُّكُم بِثَلَٰثَةِ ءَالَٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُنزَلِينَ ﴿١٢٤﴾ بَلَىٰٓ إِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ وَيَأْتُوكُم مِّن فَوْرِهِمْ هَٰذَا ﴾ (واتــە: ئایــا ئەوەنــدە بەس نیە کــە پەروەردگارتان بە ســێ هــەزار فریشــتە کۆمەکتان بــکاتو دایانبەزێنــێ، بەڵێ ئەگــەر خۆڕاگربــنو خۆپارێز بــن هەر ئیســتا دێن بۆ لاتــان)، مەبەســتی جەنگی بــەدرە، ﴿ يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُم بِخَمْسَةِ ءَالَٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُسَوِّمِينَ ﴾ (واتــە: پەروەردگارتــان پێنج هەزار فریشــتەی نیشــانەدارتان بــۆ ڕەوانە

دەکات بـۆ ئەوەی کۆمەکیتان بکات)، مەبەسـتی لە فریشـتەی نیشـانەدار ئەوەیە کە شـارەزاو بەتوانـان لـە شـەرکردندا، بـۆ هاوکاریـان سـێ مەرجـی دانـاوە: ئارامگرتن «لە خواترسـانو خۆپارێـزی» هاتنـی فریشـتە بۆ لە نـاو بردنی بت پەرسـتەکان، ئـەم بەڵێنە بـە دابەزاندنی ئەو فریشـتانەیە کە باسکراون.

بـەلام بۆ پەیمانی سـەرکەوتنو هەڵوەشـانەوەی فێڵی دوژمنـان خوای گـەورە دوو مەرجی بۆ دانـاوە، وەک چۆن لە پێشـەوە بـاس کرا لە وتـەی ﴿ وَإِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ لَا يَضُرُّكُمۡ كَيۡدُهُمۡ شَيۡـًٔاۚ ﴿١٢٠﴾ ﴾آل عمران، واتـە: ئارامگرتـنو خۆپارێـزی، ﴿ وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشۡرَىٰ لَكُمۡ ﴾ (ئـەو فریشـتانە لـە لایـەن خـواوە تەنهـا) مژدەیـەک بـوو دڵەکانتان خـۆش بکات ﴿ وَلِتَطۡمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِۦۗ وَمَا ٱلنَّصۡرُ إِلَّا مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ ﴾ کەواتـە: پشـت بە هۆکارەکان مەبەسـتن، بەڵکـو هـۆکارەکان ئارامیەکـە بۆ دڵەکانتان، بەلام سـەرکەوتنی ڕاسـتەقینە دژایەتـی ناکرێ، ئـەوە تەنهـا لە ویسـتی خوادایە بیەوێ هەر کەسـێک سـەر بخات سـەری دەخات، بە ڕاسـتی ئەگـەر بیەوێـت ئـەو بەنـدە سـەر دەخـات کـە سـەرجەم هۆکارەکانـی گرتۆتـە بـەر، ئەوە سـوننەتو پرۆگرامی خوایە لەسـەر زەویـدا، وە ئەگەر بیەوێت بەندە لاوازەکانی سـەر دەخات بـۆ ئەوەی بـۆ بەندەکانـی ڕوون بکاتەوە کە بەڕاسـتی فەرمـانو بڕیار تەنها لـە لای خۆیەتی، لەبـەر ئەمەیـە دەفەرمـوێ: ﴿ عِندِ ٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ﴾ هیـچ دروسـتکراوێک ناتوانێـت ڕێگـری لـێ بـکات، بەڵکـو دروسـتکراوەکان ملکەچـی ژێر ویسـتو فەرمانی ئـەون، ﴿ ٱلۡحَكِيمِ ﴾ کاربەجێیـەو هەمـوو شـتێک لـە جێگای خۆیـدا دادەنێـت، وە خـاوەن دانایە لە سەرخسـتنی بێبڕوایـان هەنـدێ جار بەسـەر بڕواداراندا سەرخسـتنێکی کاتی، نەک بـەردەوام، وەک خوای گەورە دەفەرمـوێ: ﴿ ذَٰلِكَ وَلَوۡ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَٱنتَصَرَ مِنۡهُمۡ وَلَٰكِن لِّيَبۡلُوَاْ بَعۡضَكُم بِبَعۡضٍ ﴿٤﴾ ﴾ محمد.

(١٢٧): ﴿ لِيَقۡطَعَ طَرَفًا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَوۡ يَكۡبِتَهُمۡ فَيَنقَلِبُواْ خَآئِبِينَ ﴿١٢٧﴾ ﴾:

خـوای گـەورە هەواڵـی داوە کە سەرخسـتنی بەندە بڕوادارەکانـی تەنها لەبـەر دوو هۆکارە: لە هێـزی کافـرەکان دابڕێـت هەتـا سـەرکوتو نابوتیان بـکات بە کوشـتن بێت، یـان بە دیل گرتن، یان دەسـتگرتن بەسـەر وڵات، یان دەسـتکەوتو ماڵ، مسـوڵمانان بـەوە بەهێز دەبنو بـت پەرسـتانیش زەلیلو سەرشـۆڕ دەبن، لەبەر ئـەوە بەرگری کـردنو دژایەتـی کردنیان لە بەرانبـەر ئیسـلام پێک دێت لە کەسـەکانیانو چەکـو مـاڵو ئەرزەکانیان، بەم شـتانە دەتوانن بەرگـریو شـەڕ بکـەن، بڕینی هەندێـک لەوانە بڕینـی هەندێک لە هێزو دەسـەلاتیانە.

کاری دووەم: بێبڕوایـان لەبـەر زۆری هێـزو دەسـەلاتیان تەماعی مسـوڵمانان دەکەن، نەفسو

ئارەزووویـان بـەوە جـۆش دەکـەن، وە سـوور دەبـن لەسـەری ئەوپـەڕی سـوربوونو مـاڵو سـەروەتو سـامانیان بـۆ ئەم مەبەسـتە خەرج دەکـەن، خوای گـەورە بڕواداران سـەر دەخات بەسـەریانداو بەسەرشـۆڕی دەیانگەڕێنێتـەوە بە بـێ ئەوەی بگەن بـە ئامانجەکانیـان، بەڵکو بە زەرەرو خـەمو پـەژارەوە دەگەڕێنـەوە، وە ئەگەر تەماشـای واقیع بکەی دەبینیت سـەرکەوتنی خـوا بـۆ بـڕواداران لـە نێوانـی ئـەم دوو کارەدایە، بـەدەر لـەم دووانە نیـە، یان سـەرکەوتن بەسـەریاندا، یان سـەر شـۆڕ دەبن.

(١٢٨-١٢٩): ﴿ لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١٢٨﴾ وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٩﴾ ﴾:

کاتێک ئەوەی کە لە ڕۆژی ئوحوددا ڕوویدا ڕوویدا، وە ئەو بەڵایەی هات بەسەر پێغەمبەر ﷺدا، خـوای گـەورە پلـەو پایـەی پێی بـەرز کردەوە، سـەری برینـدار بـوو ددانی پیرۆزی شـکاو رووخسـاری خوێنـاوی بـوو، پاشـان فەرمـووی: {كَيْفَ يُفْلِحُ قَوْمٌ شَجُّوا نَبِيَّهُمْ} (أخرجه البخاري برقم: (٣٨٤١)، ومسلم برقم: (٤٧٤٦))، (واتـە: گـەلو هۆزێک چۆن سـەردەکەون پێغەمبەرەکەیـان خوێنـاوی بکـەن؟) پاشـان نـزای کـرد لـە هەندێ لـە دەسـەڵاتدارانی بت پەرسـتان لەوانە: ئەبو سـوفیانی کـوڕی حەربو صەفوانـی کوڕی ئومەیەو سوهەیلی کوڕی عەمـرو حاریسـی کوڕی هیشـام، خوای گەورە ئەو ئایەتـی داگرت قەدەغەی لێـی کرد نزایان لـێ بـکات بە نەفرین کـردنو لە ڕەحمـەتو میهرەبانی خـوا دەریان بـکات ﴿ لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ ﴾ بەڵکـو ئـەوە لەسـەر تۆیـە پەیامەکـە بگەیەنیـتو ڕێنمایـی خەڵـک بکەیتو سـوور بیـت لەسـەر قازانجیـان، بێگومـان بڕیـار تەنها لـە لای خوایـە ئـەو کاری بەندەکانی بـەڕێ دەخات، هەر کەسـێک ویسـتی لەسـەر بێـت ڕێنمایی دەکات، هەر کەسـێک ویسـتی لەسـەر بێـت گومـڕاو سەرلێشـێواوی دەکات، دەی تـۆ نزایان لـێ مەکە، بەڵکـو کاری ئەوان دەگەڕێتـەوە بـۆ لای پەروەردگاریـان، ئەگـەر پێویسـت بـکات خـوا بـە دانایی خـۆی لێیان خـۆش دەبێت بە مسـوڵمان بـوون منـەت دەکات بەسـەریاندا، وە ئەگەر پێویسـت بکات خوا بـە دانایـی خـۆی لەسـەر بێبـڕوای دەیانهێڵێتـەوەو ڕێنماییان نـاکات، چونکە بەڕاسـتی ئەوان ئـەو کەسـانە بوون سـتەمیان لـە خۆیان کـردو تەنها خۆیـان هۆکار بوون لەسـەر ئـەو کارە، بێگومـان خـوا لەوانـەو لـە کۆمەڵێکـی تریـش خۆش بـوو کـە دیـاری کرابـوون، ڕێنمایی کـردن بـۆ لەسـەر ڕێگای ئیسـلام خوا لێیـان ڕازی بێـت، ئەم ئایەتـە بەڵگەیە لەسـەر ئەوەی، ویسـتی خـوا زاڵە بەسـەر ویسـتی بەندەکانی، وە بەنـدەی خوا چەنـدە پلەو پایەی بـەرز بێتەوە

لەوەیــە شــتێک هەڵبژێرێــت خێــرو چاکە لــە غەیری ئــەوەدا هەبێــت، وە پێغەمبــەر ﷺ هیچ شــتێکی لــە کارو بــاری بەنــدەکان بە دەســت نیــە، ئەوە کەســانی تر هــەر هیچیان نیــە، ئەمە گەورەتریــن وەڵامدانەوەیــە بــۆ ئەو کەســانەی کە خۆیــان هەڵدەواســن بــە پێغەمبەرانەوە یان پیاوچــاکان، بەڕاســتی ئەمە شــیرکو هاوەڵدانانــە بۆ خواو کــەم عەقڵیە، واز لــەوە دەهێنن کە هەمــوو کارەکانــی بەدەســتە، دەپاڕێنــەوە لەوەی کــە تۆزقاڵە زەڕەیەک شــتی بە دەســت نیە، بەڕاســتی ئەمــە گومڕاییەکی زۆر دورە، تەماشــا بکە کاتێــک خوای میهرەبان باســی لێبوردنی خــۆی دەکات لــەو بــت پەرســتانە کارەکــە دەداتــە پاڵ خــۆی، باس لــەوە ناکات کــە ئەوان هــۆکار بوونــە بۆ ئــەو لێخۆشــبوونە، ئەمــە بەڵگەیە لەســەر ئەوەی کــە خوای گــەورە خاوەن نــازو نیعمەتــی تەواوە بــۆ بەندەکانی بەبێ بوونی هیــچ هۆکارێک یان ئامرازێــک، وە کاتێک باســی ســزا دەکات باسی ســتەمیان دەکات، بە وشــەی (فـ) کە لەگەڵ وشــەی (العذاب) سزادا هاتــوە، کە مەبەســت لــەو (فـ) لــە زمانــی عەرەبیدا بــۆ هۆکارێکــە وەک دەفەرمــوێ: ﴿ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١٢٨﴾ ﴾ ئەمــەش بەڵگەیــە لەســەر تــەواوی دادپــەروەریو حیکمەتی خــوا، حیکمەتــی بەو شــێوەیە ســزا لە جێگــای خۆیــدا دادەنێت، هەرگیز ســتەم لــە بەندەکەی نــاکات، بەڵکــو بەنــدە خــۆی ســتەم لــە خــۆی دەکات، وە کاتێــک نەفــی ئــەوە دەکات لــە پێغەمبەرەکــەی کــە هیــچ شــتێک لــە کاروبــاری بەندەکانــی بــە دەســت نیــە، بڕیــاردان لە کاروبــارەکان تەنهــا لــە لای خۆیەتــی، دەفەرمــوێ: ﴿ وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ﴾ لــە فریشــتەکانو مــرۆڤو جنۆکــەو گیانــدارو بێ گیــانو هەموو ئەوانــەی لە ئاســمانەکانو زەویدایــە بــە گشــتی، هەمــووی موڵکــی خوایــەو دروســتکراوی ئەوەو لــە ژێــر فەرمانی ئەو دایــە، بــە ئەنــدازەی تۆزقاڵــە زەڕەیەک کــەس هیچی بە دەســت نیــە، کەواتە: ئەگــەر هەموو وەک یەکتــر هیچیــان بە دەســت نەبێــت، دەبێ لــە چاوەڕوانی ڕەحمــەتو لێبوردنو ســزای خــوادا بــن، ئــەوەی ویســتی لەســەر بێت لێی خــۆش دەبێت بــە هیدایــەتو ڕێنمایــی کردنی بــۆ ئیســلام، دوایی منەت دەکات بەســەریدا بــە خۆ دوورگرتنی لــە تاوانو پاشــان لێی خۆش دەبێــت، ﴿ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ﴾، بــەوەی دەیداتــە دەســتی ئەو ئــارەزووە نەفامو ســتەمکارەی کــە هانــی دەدات بــۆ کاری خراپــە، پاشــان کاری خراپــە دەکاتو لەســەری ســزا دەدرێت، پاشــان بــە دوو نــاوی پیــرۆزی خــۆی کۆتایــی بــە ئایەتەکە هێنــاوە، کــە ئامــاژە دەکەن بە ســۆزو ڕەحمــەتو لێبوردەیی خوا بە گشــتی، وەک دەفەرمــوێ: ﴿ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ ئەمە گەورەتریــن مــژدەی تێدایــە کــە ڕەحمەتی خوا زاڵە بەســەر خەشــمو قیــنو تووڕەیەکەی، وە

لێبوردنـی زاڵە بەسـەر تۆڵەکردنەوەیـدا، ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسـەر بارودۆخـی خەڵک، تیایاندا هەیـە خـوا لێی خـۆش دەبـێ، وە تیایاندا هەیە خـوا سـزای دەدات، خوای گـەورە ئایەتەکەی کۆتایـی پـێ نەهێناوە بـە دوو ناو یەکێکیـان ئاماژە بە ڕەحمـەت بکاتو ئـەوی تریان ئاماژە بـە توورەیـی بکات، بەڵکـو بە دوو نـاو کۆتایی پێهێنـاوە هەردووکیـان ئاماژە بـە ڕەحمەت دەکـەن، خـوا ئەوەندە سـۆزو ڕەحمەتی هەیـە بەرانبەر بـە بەندەکانی، وە لـە بەندەکانی خۆش دەبێـت کـە بـە بـای خەیاڵیانـدا نەهاتبێو لـە وەسـفکردندا نیـە، ئێمـەش داوا دەکەین خوای گـەورە بـە ڕەحمەتـی خـۆی دامـان پۆشـێتو لەگـەڵ بەندەکانـی بە سـۆزو بەزەیـی خۆی بمانخاتـە ڕیـزی پیاوچاکان.

بەشـی یەکەم لەم تەفسـیرە پیرۆزە ئاسـانەدا بە پشـتیوانی خوای گەورە، تەواو بوو، سـوپاسو سـتایش بـۆ ئـەو، وە داوای فـەزڵو چاکەی زیاتری لـێ دەکـەم، وە بە دوایـدا بەرگی دووەم دێـت، سـەرەتای بەم ئایەتـە پیرۆزە دەسـتی پێـدەکات: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأۡكُلُواْ ٱلرِّبَوٰٓاْ أَضۡعَٰفٗا مُّضَٰعَفَةٗ ﴾ ئەویـش لـە بـەرواری (٢٩) لـە مانگـی (ربیع الأول) لـە سـاڵی (١٣٤٣هـــ) بـە قەڵەمـی کۆکـەرەوەی (عبـد الرحمـن بن نـاصر بن عبـد اللـه السـعدي) خوا لە خـۆیو دایـکو بـاوکو بـرا مسـوڵمانەکانی لێـی خـۆش بێـت، وە سـوپاسو سـتایش بۆ پەروەردگـاری جیهانیان.

(١٣٠-١٣٦): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأۡكُلُواْ ٱلرِّبَوٰٓاْ أَضۡعَٰفٗا مُّضَٰعَفَةٗۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ (١٣٠) وَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِيٓ أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ (١٣١) وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ (١٣٢) وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ (١٣٣) ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ (١٣٤) وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً أَوۡ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ لِذُنُوبِهِمۡ وَمَن يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمۡ يُصِرُّواْ عَلَىٰ مَا فَعَلُواْ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ (١٣٥) أُوْلَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُم مَّغۡفِرَةٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَجَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ وَنِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ (١٣٦) ﴾:

لـە پێشـەکی ئەم تەفسـیرەدا باسـی ئەوەمـان کرد کە: بەڕاسـتی بەنـدەی خوا پێویسـتە ئاگای لـە فەرمـان پێکـراوەکانو قەدەغـە لێکـراوەکان بێت، هـەم بۆ خـۆی ئنجا خەڵکیش پـێ فێر بـکات، وە ئەگـەر خـوا فەرمانێکی پێکرد، پێویسـتە لەسـەری یەکەم جار سـنوورو پێناسـەی ئـەو فەرمانـە بزانـێ، وە بزانێـت ئـەوەی کـە فەرمانـی پێکـراوە بـۆ ئەوەیـە کاری پێبکات،

ئەگــەر ئــەوەی زانــی كۆشــش دەكاتو پشــت دەبەســتێت بــە خــوا هەم بــۆ خۆیو هــەم بۆ جگــە لــە خۆی، بە پێــی توانا بانگەشــەی بــۆ دەكات، بە هەمان شــێوە ئەگەر كارێكی لەســەر قەدەغە بكرێت، پێویســتە ســنووری بزانێت، وە بە هەمان شــێوە پێویســتە بزانێت چی شــتێك پەیوەنــدی پێــوە هەیــە چیــش پەیوەنــدی پێــوە نیە، پاشــان كۆشــش بكاتو پشــت بــە خوا ببەســتێت لە نەكردنیدا، بەراســتی پێویســتە ئاگــاداری ئەمە بێت لە هەمــوو فەرمانەخوایەكانو قەدەغــە لێكراوەكانیدا.

وە ئــەم دەقــە پیرۆزانــە، بــێ گومــان گشــتگیرە لەســەر كۆمەڵــە فەرمــانو نیشــانەیەك لــە نیشــانەكانی خێــر كە خوای گــەورە فەرمانــی پێكــردوە، وە هانیداوین لەســەر ئەنجامدانی، وە هەواڵــی داوە بــە پاداشــتی شــوێنكەوتوانی، وەهانی داویــن لەســەر واز لێهێنان لــە خراپەكان.

وە لەوەیــە حیكمــەت لــەم دەقــەدا كــە (خــوا زاناترینــە لە خســتنە نــاوی ئــەم ئایەتانــە لەناو چیرۆكــی ئوحــودا ئــەوە بێــت، وەك لــە پێشــەوە باســكرا خــوای گــەورە پەیمانــی داوە بە بەنــدە باوەڕدارەكانــی، بەراســتی ئەوان ئەگــەر ئارام بگرنو تەقــواو خۆپارێزیــان هەبێت) خوا بەســەر دوژمنــدا ســەریان دەخــات، وە دۆژمنیان بــۆ سەرشــۆڕ دەكات، وەك چــۆن لە وتەی خــوای گــەورەدا هاتــوە: ﴿ وَإِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ لَا يَضُرُّكُمۡ كَيۡدُهُمۡ شَيۡـًٔاۗ ١٢٠ ﴾آل عمــران، پاشــان دەفەرمــوێ: ﴿ بَلَىٰٓۚ إِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ وَيَأۡتُوكُم مِّن فَوۡرِهِمۡ هَٰذَا يُمۡدِدۡكُمۡ رَبُّكُم ١٢٥ ﴾آل عمران، وەك چــۆن بلێــی نەفسو ئارەزووەكان بە پەرۆشــن بە نیشــانەكانی تەقواو خۆپارێــزی كــە ســەركەوتنو خۆش گوزەرانــی بەوانەوە بە دەســت دێت، خوای گــەورە ئەم دەقانــەی بــاس كــردوە، كــە گرنگترین نیشــانەكانی تەقــواو خۆپارێزیــە كە ئەگــەر بەندەی خــوا پێــی هەڵســێت، ئەوە بۆ بەشــەكانی تــر بە شــێوەیەكی ئاســایی دەتوانێت پێی هەســتێت.

بەڵگــە لەســەر ئــەوەی كــە باســمان كــرد، خــوای گــەورە باســی وشــەی (التقوى) لەم ســێ دەقانــەی لای خــوارەوە دەكات: جارێــك بــە ڕەهایــی دەفەرمــوێ: ﴿ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ ﴾ وە دوو جــار كــۆتو ئەنــدازە كــراوی، وە دەفەرمــوێ: ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ﴾، (پارێز لە خــوا بكەن)، ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ﴾ خــوای گــەورە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ ئــەوەی لە قورئاندا هاتــوە بــە دەســتەواژەی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ ئــەو كارە ئەنجــام بــدەن، یــان واز لــەو كارە بهێنــن، بەڵگەیــە لەســەر ئــەوەی كە ئیمان تاكــە هۆكارە كــە دەمانبات بــۆ فەرمانبەریی كردنــیو دوور كەوتنــەوە لــە قەدەغــە كراوەكانی، چونكــە ئیمان بریتیــە لە بەڕاســت دانانی تــەواو بــەوەی كــە پێویســتە بــە ڕاســتی بزانیــت، كــە پەیوەنــدە بــە كردارەكانی ســەرجەم

ئەندامەکانی جەستەوە، قەدەغەی لێکردن لە خواردنی ڕیباو سوود بە چەند قاتو بەسەر یەکەوە، ئەمە ئەوەیە کە نەفامەکان لە سەردەمی نەفامیدا خوویان پێوە گرتبوو، ئەوەی کە گوێ بە حوکمە شەرعیەکان نادات، ئەگەر قەرزی بە لای کەسێکەوە بێت، گوێ بەوە نادات کە لەسەری گران بکات، وەک دەڵێت: ئەگەر ئەتوانیت قەرزەکەم بدەرەوە ئەگەرنا ئەوە لە ماوەیەک بۆ ماوەیەکی تر زیاد دەبێت لەسەرت، دوایی قەرزار وای لێ دێت تەنها ماوەی جارێک فریای ئەوە دەکەوێت تەنها زیادەکە بداتەوە.

کە دەفەرموێ: ﴿ أَضۡعَٰفٗا مُّضَٰعَفَةٗۖ ﴾ ئاگادار کردنەوەیە لەسەر ناشرینیو دزێوی بە زۆرکردنی پارەوو چەندین قات لەسەر یەکتر، وە هۆشیار کردنەوەیە بۆ حیکمەتی قەدەغە کردنی، بە ڕاستی حەرام کردنی سوودو ڕیبا، حیکمەتەکەی ئەوەیە خوای مەزن ڕێگری کردوە لەوەی کە ستەمی تێدایە، فەرمانی بە قەرزار کردوە تەنها قەرزەکە بداتەوە، ئەوەی دەمێنێت لە گەردنیدا تەنها قەرزەکەیە، ناچار کردنی لە سەرووی قەرزەکە ستەمێکی کەڵەکە کراوە، بۆیە پێویستە لەسەر بڕواداری پارێزکار وازی لێ بهێنێتو بە هیچ شێوەیەک نزیکی نەکەوێتەوە، چونکە واز هێنان لێی لە پێویستیەکانی پارێزکاریە.

سەرکەوتنو سەرفراز بوون لەسەر تەقواو پارێزکاری وەستاوە، لەبەر ئەمەیە دەفەرموێ: ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ١٣٠ وَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِيٓ أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ ١٣١ ﴾ بە واز هێنان لەوەی کە دەبێتە مایەی ئەوەی بتخاتە دۆزەخەوە، لە بێبڕواییو سەرپێچی کردن بە هەموو جۆرەکانیەوە، بە دڵنیایی تاوان بە گشتیو تاوانە گەورەکان بە تایبەتی مرۆڤ بەرەو بێبڕوایی دەبات بەڵکو لە سیفەتی ئەو بێبڕوایانەیە کە خوا ئاگری دۆزەخی بۆیان دیاری کردوە، وازهێنان لە تاوانو سەرپێچی ڕزگاری دەکات لە دۆزەخ، وە لە تووڕەیی خوا دەیپارێزێت، وە کرداری چاکو گوێڕایەڵی کردن ڕەزامەندی خوای میهرەبان بەدەست دەهێنێت، لەگەڵ ئەوەشدا چوونە ناو بەهەشتو بەدەستهێنانی سۆزی خوا، ئا لەبەر ئەمەیە دەفەرموێ: ﴿ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ ﴾ بە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانو دورکەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکان ﴿ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ ﴾ گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی لە هۆکارەکانی بەدەست هێنانی ڕەحمەتە، وەک خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَرَحۡمَتِي وَسِعَتۡ كُلَّ شَيۡءٖۚ فَسَأَكۡتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ ١٥٦ ﴾ الأعراف

۞ وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا
ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ ١٣٣ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ
فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ
عَنِ ٱلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٣٤ وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ
فَٰحِشَةً أَوۡ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ
لِذُنُوبِهِمۡ وَمَن يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمۡ يُصِرُّواْ عَلَىٰ مَا
فَعَلُواْ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ١٣٥ أُوْلَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُم مَّغۡفِرَةٞ مِّن
رَّبِّهِمۡ وَجَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ وَنِعۡمَ
أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ ١٣٦ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُمۡ سُنَنٞ فَسِيرُواْ
فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ
١٣٧ هَٰذَا بَيَانٞ لِّلنَّاسِ وَهُدٗى وَمَوۡعِظَةٞ لِّلۡمُتَّقِينَ ١٣٨
وَلَا تَهِنُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ
١٣٩ إِن يَمۡسَسۡكُمۡ قَرۡحٞ فَقَدۡ مَسَّ ٱلۡقَوۡمَ قَرۡحٞ مِّثۡلُهُۥۚ وَتِلۡكَ
ٱلۡأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيۡنَ ٱلنَّاسِ وَلِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
وَيَتَّخِذَ مِنكُمۡ شُهَدَآءَۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ١٤٠

پاشان خوای گەورە فەرمانی پێکردوون بە پەلە بن‌و پێشبڕکێ بکەن تا دەگەنە لێخۆشبونی‌و بە دەستهێنانی بەهەشتەکەی، کە پانتایەکەی ئاسمانەکان‌و زەوی گرتۆتەوە، دەی دەبێ درێژیەکەی چۆن بێت! کە خوا ئامادەی کردوە بۆ پارێزکاران، ئەوان بە ڕاستی شایانی ئەوەن، وە کردارەکانی خۆپارێزی دەیگەیێنێتە ئەو بەهەشتە.

پاشان وەسفی لە خواترسان‌و خۆپارێزانی کردوە، دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ ﴾، واتە: لە حاڵەتی ناخۆشی‌و خۆشیدا، ئەگەر حاڵیان زۆر باش بێت درێخی ناکەن، وە ئەگەر حاڵیان قورس بێت هیچ خێرو چاکەیەک بە کەم نازانێت، هەرچەندە کەمیش بێت، ﴿ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ ﴾ واتە: ئەگەر کەسێک ئازارێکیان بدات پێویست بکات تووڕە بن، ئەوەیە کە دڵەکانیان پڕ دەبێت لە تۆڵە سەندنەوە بە زمان‌و بە کردار، ئەوانە کار ناکەن لەسەر سروشتی مرۆڤایەتی، بەڵکو ئەوەی لە دڵیاندایە لە تووڕەیی ڕق‌و کینە دەیخۆنەوەو ئارام دەگرن لە ڕووبەڕووبوونەوەی کاری خراپ لەگەڵ بەرانبەرەکەیان. ﴿ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِ ﴾ دەچێتە چوار چێوەی لێخۆش بوون لە خەڵک، وە لێخۆش بوون لە هەموو ئەو کەسانەی خراپەت لەگەڵ دەکەن بە گوفتار بێت، یان بە ڕەفتار.

وە لێبوردن بەهێزترو باشترە لە تووڕەیی خواردنەوە، چونکە لێبوردن واز هێنانە لە تۆڵە کردنەوە، لەگەڵ چاوپۆشی کردن لە تاوانبار، ئەمە تەنها لە کەسێکدا دەبێت کە بە خوڕەوشتی جوان خۆی ڕازاندبێتەوەو دوور کەوتبێتەوە لە خوڕەوشتی خراپ‌و ناشرین، وە دەبورێت لە بەندەکانی خوا، بە سۆزە بۆیان، چاکە خوازە لەگەڵیان، حەز ناکات شەڕو ناخۆشی بێتە ڕێگایان، بێگومان خوا لێی خۆش دەبێت‌و پاداشتی تەنها لە لای پەروەردگاری بەخشندەیە، نەک لە لای بەندەی هەژار، وەک دەفەرموێ: ﴿ فَمَنۡ عَفَا وَأَصۡلَحَ فَأَجۡرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ٤٠ ﴾ الشوری، پاشان باسی حاڵەتێک دەکات گشتگیرترە لە هەمووی، وە چاکترو بەرزترو

گەورەترە، ئەویش بریتیە لە چاکەکاریی (الإحسان) خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾ چاکە دوو جۆرە: چاکە لە بەندایەتی کردنی پەروەردگاردا، وە چاکە لەگەڵ دروستکراوەکاندا، چاکە لە بەندایەتی کردنی پەروەردگاردا، پێغەمبەر ڕوونی کردوەتەوە وەک دەفەرموێ: {أَنْ تَعْبُدَ الله كَأَنَّكَ تَرَاهُ، فَإِنَّكَ إِنْ لا تَكُنْ تَرَاهُ، فَإِنَّهُ يَرَاكَ} (أخرجه أحمد برقم: (٩٤٩٧)، والبخاري برقم: (٥٠)، ومسلم برقم: (٩) عن أبي هريرة)، (واتە: بەندایەتی خوا بکەی وەک ئەوەی کە دەیبینیت، ئەگەر نەتبینی ئەوە بێگومان ئەو تۆ دەبینێت).

بەڵام چاکە بەرانبەر بە دروستکراوەکان، بریتیە لە گەیاندنی قازانجی ئاینیو دنیایی پێیانو دوور خستنەوەی شەڕو خراپەی ئاینیو دنیایی لێیان، دەچێتە ئەو چوار چێوەوە، فەرمان بە چاکەو قەدەغە کردنی خراپەو فێر کردنی نەفامەکانیانو ئامۆژگاری بێئاگاکانیانو ئامۆژگاری بۆ هەموویانو هەوڵدان بۆ یەکخستنی یەکدەنگیانو گەیاندنی خێرو چاکەو بەخشینەکان ئەوەی کە پێویستەو ئەوەی کە پێویست نیە، بە جیاوازی ڕەنگ بۆیانەوە.

بەهەمان شێوە دەچێتە چوار چێوەی چاکە لەگەڵ دروستکراوەکاندا، بەخشندەییو وازهێنان لە ئازاردانو خۆ بەدورگرتن لە هەر شتێک ببێتە مایەی ئێشو ئازار بە خەڵکی، وەک چۆن خوا وەسفی پارێزکارانی پێدەکات لەم دەقانەدا، هەرکەسێک بەو کارانە هەڵسێت، ئەوە بە هەقی خواو هەقی بەندەکانی هەستاوە.

پاشان باس لە داوای لێبوردنی بەندەکان دەکات لە پەروەردگاریان لە سەرپێچی کردنو تاوانەکانیان، دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا۟ فَٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ﴾ واتە: تاوانی بچوک بێت یان گەورە، پەلە دەکەن بۆ داوای لێخۆشبوونو یادی خوا دەکەنەوە، وە لەسەر ئەو بەڵێنانەی کە داویەتی بە سەرپێچیکەرانو ئەو بەڵێنەی داویەتی بە پارێزکاران، ئنجا داوای لێخۆشبوون دەکەن، وە پاراستنی عەیبو ناتەواویەکانیان لەگەڵ خۆ دارنیان لێیو پەشێمان بوونە لە ئەنجامدانی، لەبەر ئەمە دەفەرموێ: ﴿ وَلَمْ يُصِرُّوا۟ عَلَىٰ مَا فَعَلُوا۟ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴾، ﴿ أُو۟لَٰٓئِكَ ﴾ ئەوانە وەسفکراون بەو سیفەتانەی کە باسکرا ﴿ جَزَآؤُهُم مَّغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ ﴾ هەموو شتێکی خراپیان لەسەر لا دەبات ﴿ وَجَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ﴾ وە بە هەشتانێک هەموو نازو نیعمەتو خۆشیەکی بێ سنووری تێدایە، وە کۆشکی بەرزو نایابو زۆر سەرنج ڕاکێشی تێدایە، وە باخی بە بەرهەمو ڕووباری سەرنجڕاکێش بە بەردەم کۆشکەکانیاندا دەڕوات، بە ڕاستی ئەوە خۆشترین شوێنی نیشتەجێ بوونە، ﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَا ﴾ ژیانی هەمیشەیی دەبەنە سەر، جێگۆڕکێیان پێناکرێت، وە نازو نیعمەتەکانیان هەرگیز

کەم ناکات، ﴿وَنِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ﴾ کاری کەمیان بۆ خوا کردوە بەڵام پاداشتی زۆریان لە بری وەرگرتووە، فـ(عند الصباح يحمدُ القومُ السرى) واتە: لە بەرەبەیاندا خەڵکی سوپاسی شەورۆیی دەکات، وە لە کاتی پاداشتدا کرێکار مافی خۆی وەردەگرێ بە تەواوەتی.

ئا ئەم ئایەتانە لە بەڵگەکانی ئەهلی سوننەو جەماعەیە، لەسەر ئەوەی کردەوەکان لە چوار چێوەی ئیمان دان بە پێچەوانەی کۆمەڵەی (المرجئة)، لە سوورەتی (الحديد) هاوشێوەی ئەم دەقانە ئاماژەی پێکراوە، وەک خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿سَابِقُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا كَعَرۡضِ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ أُعِدَّتۡ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ ۝٢١﴾ الحدید، باسی هیچی نەکردوە جگە لە زاراوەی بڕوا بە خواو بە پێغەمبەرەکەی نەبێت، وە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ﴾ پاشان وەسفی پارێزکاران دەکات بەم دوو کردارە ئەویش بریتیە لە ماڵو جەستەیان، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، ئەو پارێزکارانەی وەسف کراون بەو سیفەتانە، بریتین لەو بڕوادارانەی کە لە سوورەتی (الحديد)دا باسکراون. پاشان خوای گەورە دەفەرموێ:

(١٣٧-١٣٨): ﴿قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُمۡ سُنَنٞ فَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ۝١٣٧ هَٰذَا بَيَانٞ لِّلنَّاسِ وَهُدٗى وَمَوۡعِظَةٞ لِّلۡمُتَّقِينَ ۝١٣٨﴾

ئەم دەقە پیرۆزانەو ئەوەیشی کە لە دوایان دێت لە چیرۆکی ئوحوددا، خوای گەورە دڵی بڕواداران دەداتەوەو پێیان ڕادەگەیەنێ کە لە پێش ئەوان چەندین چەرخو سەدە هەبوونو تاقی کراونەتەوە، بڕواداران لە ئەوان تاقیکرانەوە بە شەڕ کردن لەگەڵ بێبڕوایاندا، بەردەوام لەو نێوانەدا بوون، هەتا سەرەنجام بۆ لە خواترسانو خۆپارێزان بوو، وە سەرکەوتنیش تەنها بۆ بەندە بڕوادارەکانی خوا بوو، وە کۆتا شت ئەوە بوو درۆزنەکان دەرکەوتنو خوا سەرشۆڕی کردن بە سەرکەوتنی پێغەمبەرەکەیو شوێنکەوتوانی ﴿فَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ﴾ بە جەستەو دڵەکانتان ﴿كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ﴾ بێگومان بێبڕوایان نابینن ئیللا سزادراون بە جۆرەها سزای دنیایی، وڵاتیان داروخاو داتەپی، زیانەکانیان لە لای هەموو کەس ڕوونە، وە تاجی دەسەڵاتو شکۆو سەربەزیان کۆتایی پێهات، ئایا ئەمە گەورەترین بەڵگە نیە! وە گەورەترین شایەتی دان نیە لەسەر ڕاستی پێغەمبەرایەتی؟!

حیکمەتی لە تاقیکردنەوەی بەندەکانیدا تەنها بۆ دەرکەوتنی ڕاستگۆکانە لە درۆزنەکانیان، لەبەر ئەمە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿هَٰذَا بَيَانٞ لِّلنَّاسِ﴾ واتە: بەڵگەیەکی ئاشکرایە، ڕاستیو پووچ بۆ خەڵک دەردەخات، وە کۆمەڵی بەختیارو کامەران لە کۆمەڵی بەدبەختو

نەگبەت جیا دەكاتەوە، ئا ئەوە ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە خوا بەسەر درۆزناندا هێناویەتی.
﴿ وَهُدًى وَمَوْعِظَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ ﴾، چونكە بە ڕاستی پارێزكارانو لە خوا ترسان سوودو كەڵكیان لەو دەقانە وەرگرتووە، ڕێنماییان دەكات بۆ ڕێگای چاكەو هیدایەت دان، وە ئامۆژگاریان دەكاتو دووریان دەخاتەوە لە ڕێگای گومڕایی‌و سەر لێشیواوی، بەڵام بۆ خەڵكانی تر تەنها ئاگادار كردنەوەیەو دەبێتە بەڵگە لەسەریان، بۆ ئەوەی هەر كەس لەوانە كە لە نێو دەچێت هیچ بیانویەكی نەبێ.
ڕەنگە مەبەست لەم ڕستە: ﴿ هَٰذَا بَيَانٌ لِّلنَّاسِ ﴾ قورئانی پیرۆز بێت، بە ڕاستی قورئان ئاگاداركردنەوەیە بۆ هەمووان بە گشتی، ڕێنمایی بەخش‌و ئامۆژگاریشە بۆ خۆپارێزان بە تایبەتی، هەردوو واتاكە تەواوو ڕاستن.
(١٣٩- ١٤٣): ﴿ وَلَا تَهِنُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَنتُمُ الْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٣٩﴾ إِن
يَمْسَسْكُمْ قَرْحٌ فَقَدْ مَسَّ الْقَوْمَ قَرْحٌ مِّثْلُهُ ۚ وَتِلْكَ الْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ النَّاسِ وَلِيَعْلَمَ
اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَاءَ ۗ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ الظَّالِمِينَ ﴿١٤٠﴾ وَلِيُمَحِّصَ اللَّهُ الَّذِينَ
آمَنُوا وَيَمْحَقَ الْكَافِرِينَ ﴿١٤١﴾ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمِ اللَّهُ الَّذِينَ جَاهَدُوا
مِنكُمْ وَيَعْلَمَ الصَّابِرِينَ ﴿١٤٢﴾ وَلَقَدْ كُنتُمْ تَمَنَّوْنَ الْمَوْتَ مِن قَبْلِ أَن تَلْقَوْهُ فَقَدْ رَأَيْتُمُوهُ وَأَنتُمْ
تَنظُرُونَ ﴿١٤٣﴾ ﴾:

خوای گەورە هانی بڕواداران دەداتو هیمەتیان بەرز دەكاتەوەو دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَهِنُوا وَلَا تَحْزَنُوا ﴾ واتە: كۆڵ مەدەنو لاواز مەبن لە هێزو تواناتاندا، وە لە دڵیشەوە خەمبار مەبن، كاتێک بەڵایەكتان تووش دەبێت، چونكە خەمبار بوون لە دەروونو لاوازی لە جەستەكاندا، بەڵایەكی زیاترتان دێنێتە سەرو دەبێتە مایەی ئەوەی دوژمنەكانتان بەهێز بكات.
بەڵكو هانی دڵەكانتان بدەنو فێری ئارامگرتنیان بكەنو ئەوەی خەمو بێتاقەتیە لێیان دوور بخەنەوە، وە بەهێز بن لە كاتی جەنگتان بەرانبەر بە دوژمنان، خوای گەورە باسی ئەوە دەكات كە قەت نابێتو ڕەوا نیە بۆ بڕواداران تووشی بێتاقەتی‌و خەمباری ببن، چونكە ئەوان لە بڕوادا پلەو پایەیان بەرزەو چاوەڕوانی سەركەوتنو پاداشتی خوا دەكەن، بڕواداری ڕاستەقینە ئەوەیە كە خوای گەورە بەڵێنی پێداوە بە پاداشتی دنیاو دوا ڕۆژ بۆیە نابێت خەمبار بێت.
وە لەبەر ئەمەیە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَأَنتُمُ الْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾ پاشان دڵیان دەداتەوە بەو شكستەی كە خواردوویانە بە دەست بت پەرستان، وە حیكمەتی گەورەی خۆی لەو بارەوە بۆ ڕوون كردوونتەوە، دەفەرموێ: ﴿ إِن يَمْسَسْكُمْ قَرْحٌ فَقَدْ مَسَّ الْقَوْمَ قَرْحٌ

مِّثۡلُهُۥۚ ﴾ ئێوەو ئەوان یەکسانن لە زام برینداا، بەڵام ئەوەی ئێوە چاوەڕوانی دەکەن لە لای خوا دەستان بکەوێت کە بەهەشتە ئەوان بە تەما نین، وەک چۆن خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ إِن تَكُونُواْ تَأۡلَمُونَ فَإِنَّهُمۡ يَأۡلَمُونَ كَمَا تَأۡلَمُونَۖ وَتَرۡجُونَ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا يَرۡجُونَۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ١٠٤ ﴾النساء (واتە: وە لە لێخەفتانی خەڵکی (کافری دوژمنتان) سستیو بێهێزیی مەکەن، چونکە ئەگەر ئێوە ئێشتان پێدەگات ئەوە بێگومان ئەوانیش وەک ئێوە ئێشیان پێدەگات، وە ئێوەش ئومێدێکتان بە خوا هەیە (وە چاوەڕوانییەکتان هەیە) کە ئەوان ئەو ئومێدەیان نیە، وە خوا زانای کاربەجێیە).

یەکێک لە حیکمەتەکانی خوای گەورە ئەوەیە، کە ئەم دنیایە دەبەخشێت بە ئیماندارو کافر، وە چاکو خراپ، چەرخو ڕۆژگار دەگێڕێت لە نێو مرۆڤەکاندا، ڕۆژێک بۆ ئەم تاقمەو ڕۆژێکی دی بۆ تاقمێکی تر، چونکە ئەم دنیایە کاتیەو بەسەر دەچێت، بە پێچەوانەی ڕۆژی دوایی، کە تەنهاو تەنها بۆ بڕواداران، ﴿ وَلِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ ئەمەش بە هەمان شێوە لەو حیکمەتانەیە کە خوای گەورە بەندەکانی تووشی شکستو بەڵاو نارەحەتی دەکات، بۆ ئەوەی باوەڕدارو دووڕوو جیا بکاتەوە لەیەکتر، چونکە ئەگەر سەرکەوتن بەردەوام هەر بۆ بڕواداران بێت لە هەموو کاتەکاندا، کەسانێک دەهاتنە نێو ئیسلامەوە کە حەزیان پێی نەبوو، بەڵام ئەگەر لە هەندێ کاتدا جۆرێک لە نارەحەتیو بەڵا تووشی بڕواداران بوو، بڕواداری ڕاستەقینە جیا دەبێتەوە کە حەزی لە ئیسلامەو ئیسلام خوازە.

﴿ وَيَتَّخِذَ مِنكُمۡ شُهَدَآءَۗ ﴾ بە هەمان شێوە ئەمەش هەندێکی ترە لە حیکمەتەکان، چونکە شەهیدی لە لای خوا بەرزترین پلەیە، وە ئەم پلەیەش بە دەست نایەت لە دوای بە دەست هێنانی هۆکارەکانی نەبێت، ئەمەش لە ڕەحمەتی خوای گەورەیە بۆ بەندە بڕوادارەکانی، کە هەندێ هۆکاری بۆ دەست نیشان کردوون نەفسو هەواو ئارەزوو حەزی پێی نیە، بۆ ئەوەی ئەو پلەو پایە بەرزەیان بە نسیب بکات، ﴿ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ ئەوانەی کە ستەم لە نەفسو هەواو ئارەزوویان دەکەنو دانیشتوونو ناچن بۆ شەڕ کردن لە پێناو خوادا، ئەمە وەک ئەوە وایە سەرزەنشتی دووڕووەکان بکات، کە ئەوان بوغزێنراون لە لای خوا، لەبەر ئەوە خاوی کردنەوە لە شەڕ کردن لە پێناو خوادا، وەک دەفەرموێ: ﴿ وَلَوۡ أَرَادُواْ ٱلۡخُرُوجَ لَأَعَدُّواْ لَهُۥ عُدَّةٗ وَلَٰكِن كَرِهَ ٱللَّهُ ٱنۢبِعَاثَهُمۡ فَثَبَّطَهُمۡ وَقِيلَ ٱقۡعُدُواْ مَعَ ٱلۡقَٰعِدِينَ ٤٦ ﴾التوبة (واتە: ئەگەر ویستبایان بێنەدەر بۆ جەنگ، پێداویستیەکانیان بۆ ئامادە دەکرد، بەڵام خوا پێی ناخۆش بوو دەربچن، بۆیە عەزیمەتو ئیرادەی خاوکردنەوە وە پێیان وترا: وەک بڵێی فەرمانیان پێکرابێ، لەگەڵ دانیشتواندا دابنیشن)،

وَلِيُمَحِّصَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَيَمْحَقَ الْكَافِرِينَ ﴿١٤١﴾ أَمْ
حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمِ اللَّهُ الَّذِينَ جَاهَدُوا
مِنكُمْ وَيَعْلَمَ الصَّابِرِينَ ﴿١٤٢﴾ وَلَقَدْ كُنتُمْ تَمَنَّوْنَ الْمَوْتَ مِن
قَبْلِ أَن تَلْقَوْهُ فَقَدْ رَأَيْتُمُوهُ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴿١٤٣﴾ وَمَا مُحَمَّدٌ
إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ
انقَلَبْتُمْ عَلَىٰ أَعْقَابِكُمْ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ
اللَّهَ شَيْئًا وَسَيَجْزِي اللَّهُ الشَّاكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ وَمَا كَانَ
لِنَفْسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ كِتَابًا مُّؤَجَّلًا وَمَن يُرِدْ
ثَوَابَ الدُّنْيَا نُؤْتِهِ مِنْهَا وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ الْآخِرَةِ نُؤْتِهِ مِنْهَا
وَسَنَجْزِي الشَّاكِرِينَ ﴿١٤٥﴾ وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيٍّ قَاتَلَ مَعَهُ
رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ فَمَا وَهَنُوا لِمَا أَصَابَهُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَمَا ضَعُفُوا
وَمَا اسْتَكَانُوا وَاللَّهُ يُحِبُّ الصَّابِرِينَ ﴿١٤٦﴾ وَمَا كَانَ قَوْلَهُمْ إِلَّا أَن
قَالُوا رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسْرَافَنَا فِي أَمْرِنَا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا
وَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ ﴿١٤٧﴾ فَآتَاهُمُ اللَّهُ ثَوَابَ
الدُّنْيَا وَحُسْنَ ثَوَابِ الْآخِرَةِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ ﴿١٤٨﴾

﴿ وَلِيُمَحِّصَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا ﴾ ئەمەش لە حیکمەتەکانی خوای گەورەیە کە بە ڕاستی خوا ئیمانداران بەو (جەنگو جیهادە) پاک بکاتەوە لە تاوانو کەمو کوڕیەکانیان، وە هەروەها بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بە ڕاستی شەهیدبوونو کوشتن لە پێناوی خوادا دەبێتە مایەی پاک بوونەوە لە تاوانەکانو ناتەواویەکان دەشارێتەوە، وە ئیمانداران پاک دەکاتەوە جگە لە دووڕووەکان، وە ڕزگاریان دەبێت لێیانو بەو هۆیەوە بڕوادارو دووڕو لە یەکتر جیا دەکەنەوە.

پاشان خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمِ اللَّهُ الَّذِينَ جَاهَدُوا مِنكُمْ وَيَعْلَمَ الصَّابِرِينَ ﴿١٤٢﴾ ﴾ ئەمە پرسیارکردنێکی نکوولیی لێکەرانەیە، واتە: وا گومان نەبەن، وە وا نەیەت بە خەیاڵتاندا کە بچنە بەهەشتەوە بەبێ ماندوو بوونو نارەحەتی لە پێناوی خواداو بە دەستهێنانی ڕەزامەندی ئەو، چونکە بە ڕاستی بەهەشت بەرزترین داواکاریە، وە باشترینی ئەو شتانەیە کە لە پێناویدا کێبڕکێ بکرێت، وە هەتا داواکراو گەورە بێت هۆکارەکەی گەورەتر دەبێتو کار بۆ پێگەیشتنی گرانتر دەبێت، ناگات بە حەوانەوە هەتا واز لەوانە نەهێنێت، وە ناگات بە نازو نیعمەت هەتا واز لە خۆشی نەهێنێت، بەڵام ناخۆشیەکانی دونیا کە بەسەر بڕواداردا دێت لە پێناوی خوادا، بە ئامادەکردنی نەفسو ئارەزوو وەرزش کردن لەسەری پێچەوانە دەبێتەوە، نارەحەتیەکان دەبن بە چێژو خۆشی لە لای ئەو کەسانەی کە ژیرو خاوەن بینایین، بەو ڕێگادا دەڕۆن بەبێ ماندوو بوون، ئەوەیش فەزڵو چاکەی خوایە دەیبەخشێت بە هەر کەسێک کە بیەوێت.

پاشان سەرزەنشتی بڕواداران دەکات لەسەر نەبوونی ئارامی بەوەی کە ئاواتیان پێ دەخواستو حەزیان دەکرد بە دەستی بهێنن، دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ كُنتُمْ تَمَنَّوْنَ الْمَوْتَ مِن قَبْلِ أَن تَلْقَوْهُ ﴾ بۆیە زۆرێک لە هاوەڵان خوایان لێ ڕازی بێت، کە جەنگی بەدریان لە دەست چوو بوو،

ئاواتی ئەوەیان دەخواست خوای گەورە وێنایەکی لەو جۆرەیان بە نسیب بکات، هەتا هەموو تواناکانی خۆیانیان تێدا خەرج بکەن.

خوای گەورە پێیان دەفەرموێ: ﴿ فَقَدۡ رَأَيۡتُمُوهُ ﴾ واتە: ئەوەی ئاواتتان بۆ دەخواست بە چاوی خۆتان بینیتان ﴿ وَأَنتُمۡ تَنظُرُونَ ﴾ ئەی بۆ ئارامتان نەگرت؟ ئەمە حاڵەتێکە ناگونجێتو جوان نیە، بە تایبەت بۆ کەسێک ئاوات بە شتێک بخوازێت، وە ئاواتەکەی هاتبێتە دی، پێویستە لەسەری تواناکانی خەرج بکاتو هەموو تواناکانی لەو بوارەدا بەتاڵ بکاتەوە. ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئاوات خواستنی شەهادەت دروستە، چونکە خوای گەورە ڕەزامەند بوو لەسەر ئاواتەکانیان، وە نکوڵی لێ نەکردن، بەڵکو نکوڵی ئەوەی لێکردن کە کار نەکەن بە پێویست بوونی ئەوەی کە لەسەریانە.

(١٤٤- ١٤٥): ﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِ ٱلرُّسُلُۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوۡ قُتِلَ ٱنقَلَبۡتُمۡ عَلَىٰٓ أَعۡقَٰبِكُمۡۚ وَمَن يَنقَلِبۡ عَلَىٰ عَقِبَيۡهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيۡـٔٗاۗ وَسَيَجۡزِي ٱللَّهُ ٱلشَّٰكِرِينَ ١٤٤ وَمَا كَانَ لِنَفۡسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِ كِتَٰبٗا مُّؤَجَّلٗاۗ وَمَن يُرِدۡ ثَوَابَ ٱلدُّنۡيَا نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَا وَمَن يُرِدۡ ثَوَابَ ٱلۡأٓخِرَةِ نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَاۚ وَسَنَجۡزِي ٱلشَّٰكِرِينَ ١٤٥ ﴾:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِ ٱلرُّسُلُ ﴾ واتە: موحەممەد ﷺ داهێنەرێک نیە لە ناو پێغەمبەراندا، بەڵکو لە ڕەگەزی ئەو پێغەمبەرانەیە لە پێشی ئەو ڕابوردوون، کاریان بریتیە لە گەیاندنی پەیامی خوا بۆ مرۆڤەکان، بۆ هەمیشەیی نامێننەوە، وە مانەوەیان مەرج نیە بۆ فەرمانبەرداریی فەرمانەکانی خوا، بەڵکو پێویستە لەسەر هەموو ئوممەتەکان بەندایەتی بۆ خوا بکەن لە هەموو کاتو دۆخێکدا، لەبەر ئەمە دەفەرموێ: ﴿ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوۡ قُتِلَ ٱنقَلَبۡتُمۡ عَلَىٰٓ أَعۡقَٰبِكُمۡ ﴾ پاشگەز دەبنەوەو واز دەهێنن لە بڕواهێنان، یان جیهاد کردنو هاوشێوەکانی، ﴿ وَمَن يَنقَلِبۡ عَلَىٰ عَقِبَيۡهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيۡـٔٗا ﴾ تەنها زیان بە خۆی دەگەیەنێ، ئەگەرنا خوا پێویستی بە کەس نیە، ئاینی خۆی بەرپا دەکاتو بەندەکانی باڵادەست دەکات، کاتێک خوا سەرزەنشتی ئەو کەسە دەکات کە پاشگەز دەبێتەوەو هەڵدەگەڕێتەوە بۆ دواوە، وەسفی ئەو کەسەش دەکات کە پابەندە لەگەڵ پێغەمبەرەکەیو گوێڕایەڵی پەروەردگاری دەبێ.

پاشان دەفەرموێ: ﴿ وَسَيَجۡزِي ٱللَّهُ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴾ سوپاس گوزارییش تەنها بە بەندایەتی کردن دەبێ بۆ خوا لە هەموو حاڵێکدا.

ئەم ئایەتە پیرۆزە، ئاماژەیەکە لە لایەنی خواوە کە بڕواداران لەسەر یەک حاڵەت بنو گۆڕانکاری نەیەت بەسەر ئیمانیاندا، یان بەسەر بەشێک لە ئیمانیان بە هۆی لە دەستدانی

سەرۆکێک هەرچەندە گەورە بێت، ئەویش تەنها بە خۆ ئامادە کردن دەبێ لە هەموو کارێک لە کاروبارەکانی ئایندا، ئەمەش بە بانگەوازی خەڵکی شارەزا دەبێ لەو بوارەدا، ئەگەر کەسێک شتێکی لە دەستدا کەسێکی تر بۆی تەواو دەکات، وە پێویستە بڕواداران بە گشتی مەبەستیان بەرپا کردنی ئاینی خوا بێتو جیهاد کردن لەو پێناوەدا، بە پێی توانا، نابێ مەبەستیان سەرۆکێک جگە لە سەرۆکێکی تر بێ، بەو شێوەیە کارەکانیان ڕابی دەبێو فەرمانەکانیان جێگیر دەکرێت.
وە لەم ئایەتەدا گەورەترین بەڵگە بەدی دەکرێت لەسەر ڕێزو شکۆی ئەبو بەکرو هاوەڵەکانی خوا لێیان ڕازی بێ، ئەوانەی کە لە پێناوی خوادا شەڕی هەڵگەڕاوەکانیان کرد پاش پێغەمبەر ﷺ چونکە ئەوان سەر مەشقی سوپاسگوزارانن.
پاشان خوای گەورە هەواڵ دەدات کە بە ڕاستی نەفسەکان هەریەکەو پەیوندی هەیە بە کاتو ئاکامێکی دیاریکراوەوە، بە ویستو قەزاو قەدەری خوا، هەر کەسێک قەدەری وا بوو کە بمرێت، بێگومان دەمرێت ئەگەر بەبێ هوکاریش بێت، وە هەر کەسێک خوا ویستی بمێنێ، هەرچی بەسەردا بێت سەرەنجام دەمێنێت، پێش هاتنی ئاکامی دیاریکراوی هیچ شتێک ناتوانێت مردنی پێش بخات، چونکە قەزاو قەدەری خوا وایە هەر کەسێک سەرەنجامی دیاری کراوە، وەک دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمۡ لَا يَسۡتَأۡخِرُونَ سَاعَةٗ وَلَا يَسۡتَقۡدِمُونَ ٣٤﴾ الأعراف.
پاشان خوا هەواڵیداوە کە لە پاداشتو دەستکەوتی دنیاو دوارۆژ دەدات بە مرۆڤ، بە پێی ویستی خۆیان، دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لِنَفۡسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِ كِتَٰبٗا مُّؤَجَّلٗاۗ وَمَن يُرِدۡ ثَوَابَ ٱلدُّنۡيَا نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَا وَمَن يُرِدۡ ثَوَابَ ٱلۡأٓخِرَةِ نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَا﴾، (وە لە شوێنی دیکە) دەفەرموێ: ﴿كُلّٗا نُّمِدُّ هَٰٓؤُلَآءِ وَهَٰٓؤُلَآءِ مِنۡ عَطَآءِ رَبِّكَۚ وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ مَحۡظُورًا ٢٠ ٱنظُرۡ كَيۡفَ فَضَّلۡنَا بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖۚ وَلَلۡأٓخِرَةُ أَكۡبَرُ دَرَجَٰتٖ وَأَكۡبَرُ تَفۡضِيلٗا ٢١﴾ الإسراء.
﴿وَسَنَجۡزِي ٱلشَّٰكِرِينَ﴾ پاداشتیانی دیاری نەکردوە تا ئاماژە بێ بۆ زۆریو گەورەیی، وە بزانرێ پاداشت بە ئەندازەی سوپاسگوزاریە کەمو زۆرو چاک.
(١٤٦-١٤٨): ﴿وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيّٖ قَٰتَلَ مَعَهُۥ رِبِّيُّونَ كَثِيرٞ فَمَا وَهَنُواْ لِمَآ أَصَابَهُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَمَا ضَعُفُواْ وَمَا ٱسۡتَكَانُواْۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ ١٤٦ وَمَا كَانَ قَوۡلَهُمۡ إِلَّآ أَن قَالُواْ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسۡرَافَنَا فِيٓ أَمۡرِنَا وَثَبِّتۡ أَقۡدَامَنَا وَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ١٤٧ فَـَٔاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ ثَوَابَ ٱلدُّنۡيَا وَحُسۡنَ ثَوَابِ ٱلۡأٓخِرَةِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٤٨﴾:
ئەمە دڵدانەوەیە بۆ بڕواداران‌و هاندانە بە پەیڕەوی کردنیان، وە کار کردن وەک ئەوان، بە ڕاستی ئەمە کارێکە کە لە پێشتر ڕوویداوە، بەڵام سوننەتو ڕێبازی خوا لەسەر ئەمە بەردەوامە،

دەفەرموێ: ﴿ وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيٍّ ﴾ واتە: زۆر لە پێغەمبەران ﴿ قَـٰتَلَ مَعَهُۥ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ ﴾ واتە: کۆمەڵە خەڵکانێکی زۆر لە شوێنکەوتووانیان، ئەوانەی کە پێغەمبەران پەروەردەیان کردن بە ئیمانو کردەوەی چاک، ڕووبەڕووی کوشتنو برینداركردنو شتی تر بوونەوە.

﴿ فَمَا وَهَنُواْ لِمَآ أَصَابَهُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَمَا ضَعُفُواْ وَمَا ٱسْتَكَانُواْ ﴾ واتە: دڵەکانیان بێهێزو لاواز نەبوو، وە سستو دەستە پاچەو زەلیلی ژێر دەستی دوژمن نەبوون، بەڵکو ئارامیان گرتو جێگیر بوونو هانی خۆیانیاندا، ئا لەبەر ئەمەیە دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴾ (واتە: وە خوا ئارامگرانی خۆشدەوێ).

پاشان باسی وتەکانیان دەکاتو، باسی داوا کردنی سەرکەوتن لە پەروەدگاریان، دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ قَوْلَهُمْ ﴾ واتە: لەم شوێنو مەنزڵگایە ناخۆشە، ﴿ إِلَّآ أَن قَالُواْ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسْرَافَنَا فِيٓ أَمْرِنَا ﴾ (الإسراف): زێدەڕۆییو لە سنوور تێپەڕاندنە بۆ لای ئەو شتەی کە حەرام کراوە، زانیان کە تاوانو زێدەڕۆیی کردن لە گەورەترین هۆکارەکانی سەرشۆڕیو زەلیلیە، وە دوورکەوتنەوە لێیان یەکێکە لە هۆکارەکانی سەرکەوتن، بۆیە داوای لێخۆشبوونیان لە پەروەردگاریان کردوە.

پاشان ئەوان لەسەر ئەو ماندووبوونو تێکۆشانە پاڵیان نەدایەوە، بەڵکو لەگەڵ ئەوەشدا تەنها پشتیان بە خوا بەستو نزایان کرد خوای مەزن پێیەکانیان جێگیر بکات لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمندا، وە سەرکەوتوویان بکات بەسەر دوژمناندا، ئەوان دوو شتیان پێکەوە کۆ کردبوویەوە: ئارامگرتنو واز هێنان لە دژەکەی، وە داوای لێخۆشبوونو سەرکەوتنی پەروەردگار، بێگومان خوا سەری خستنو سەرەنجامی دنیاو دوا ڕۆژی پێ بەخشین.

﴿ فَـَٔاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا ﴾ لە سەرکەوتنو دەستکەوت، ﴿ وَحُسْنَ ثَوَابِ ٱلْـَٔاخِرَةِ ﴾ ئەویش سەرکەوتنە بە ڕەزامەندی پەروەردگاریانو ژیانێکی بەردەوام کە دوورە لە هەموو ناخۆشیەک، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە ئەوان چاکترین کردەوەیان بۆ خوا ئەنجامدا، خوایش پاداشتی دانەوە بە باشترین شێوە، لەبەر ئەمە دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾ (واتە: چاکەکار) لە بەندایەتی کردنی خواداو مامەڵە لەگەڵ دروستکراوەکاندا، وە لە چاکەکاریی ئەوەیە کە لە کاتی جیهاد کردن لەگەڵ دوژمندا وەک ئەو کەسانە جیهاد بکات کە وەسف کراون.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ
يَرُدُّوكُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ فَتَنقَلِبُواْ خَٰسِرِينَ
﴿١٤٩﴾ بَلِ ٱللَّهُ مَوْلَىٰكُمْ ۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلنَّٰصِرِينَ ﴿١٥٠﴾ سَنُلْقِى
فِى قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلرُّعْبَ بِمَآ أَشْرَكُواْ بِٱللَّهِ
مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا ۖ وَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ ۚ وَبِئْسَ
مَثْوَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٥١﴾ وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ ٱللَّهُ
وَعْدَهُۥٓ إِذْ تَحُسُّونَهُم بِإِذْنِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلْتُمْ
وَتَنَٰزَعْتُمْ فِى ٱلْأَمْرِ وَعَصَيْتُم مِّنۢ بَعْدِ مَآ أَرَىٰكُم
مَّا تُحِبُّونَ ۚ مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن
يُرِيدُ ٱلْءَاخِرَةَ ۚ ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْ ۖ
وَلَقَدْ عَفَا عَنكُمْ ۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ
﴿١٥٢﴾ ۞ إِذْ تُصْعِدُونَ وَلَا تَلْوُۥنَ عَلَىٰٓ أَحَدٍ
وَٱلرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ فِىٓ أُخْرَىٰكُمْ فَأَثَٰبَكُمْ
غَمًّۢا بِغَمٍّ لِّكَيْلَا تَحْزَنُواْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا
مَآ أَصَٰبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٥٣﴾

**پاشان خوای گەورە دەفەرموێ:**

**(١٤٩-١٥١):** ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَرُدُّوكُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ فَتَنقَلِبُواْ خَٰسِرِينَ ﴿١٤٩﴾ بَلِ ٱللَّهُ مَوْلَىٰكُمْ ۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلنَّٰصِرِينَ ﴿١٥٠﴾ سَنُلْقِى فِى قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلرُّعْبَ بِمَآ أَشْرَكُواْ بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا ۖ وَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ ۚ وَبِئْسَ مَثْوَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٥١﴾﴾

ئەمە قەدەغە کردنی خوای گەورەیە بۆ بڕواداران کە گوێڕایەڵی بێبڕوایان بکەن، لە دووڕووەکانو بت پەرستان، ئەگەر گوێڕایەڵیان بکەن تەنها زیانیان دەست دەکەوێت، چونکە ئەوان نیازیان ئەوەیە بیانگەڕێننەوە بۆ بێبڕوایی کە سەرەنجامی پەشیمانیو زەرەرمەندییە.

پاشان هەواڵیداوە کە ئەو گەورەو سەرخەریانە، لە ئایەتەکەدا ئاماژەی پێکردووەو مژدەی داوە کە ئەو لە داهاتویەکی نزیکدا کارەکانی بە میهرەبانی خۆی بۆیان بەرێ دەخات، دەیانپارێزێ لە هەموو جۆرەکانی شەڕو خراپەکاریەک.

وە هەر لەو چوار چێوەدا هانی بڕوادارانی داوە کە تەنها خوا بکەن بە دۆستو پشتیوانیان، لە نیشانەکانی پشتیوانی کردنی خوا بۆ بڕواداران ئەوەیە کە ترسی خستوەتە دڵی دوژمنان بێبڕوا، ئەو ترسە ڕێگریان لێ دەکات کە زۆرێک لە پیلانەکانیان جێبەجێ نەکەن، بۆ نموونە: کاتێک کە بت پەرستانی قورەیش لە جەنگی ئوحود گەڕانەوە ڕاوێژیان کرد لە نێوان خۆیاندا، وتیان: چۆن وازیان لێ بهێنین لە کاتێکدا ئەوان بە دەستی ئێمە شکستیان هێنا، بەڵام خوای مەزن ترسی خستە دڵەکانیانەوە بەسەر شۆڕیو خەجاڵەتیەوە گەڕانەوە.

گومانی تێدا نیە ئەمە باشترین سەرکەوتنە، وەک لە پێشتر باسمان کرد سەرکەوتنی خوا بۆ بڕواداران لەبەر دوو هۆکارە: یان بۆ دابڕینو لە نێو بردنی بەشێک لە بێبڕوایانە،

یـان بۆ ئەوەیـە خەفەتبارو نـا ئومێدو خەجاڵەتیـان بکات بە سەرشـۆڕی بگەڕێنـەوە، دووەم بۆ جەنگـی ئوحودە.

پاشـان باسـی هـۆکاری ئـەو ترسـە دەکات کـە خسـتیە دڵـی بێبڕوایانـەوە، دەفەرمـوێ: ﴿بِمَآ أَشۡرَكُواْ بِٱللَّهِ مَا لَمۡ يُنَزِّلۡ بِهِۦ سُلۡطَٰنٗا﴾ واتـە: لەبـەر ئـەوەی جگـە لـە خـوا بتیـان دانابوو دەیانپەرسـتن، لە پەرسـتنی ئـەو بتانـەدا تەنها شـوێنی هـەواو ئارەزووەکانیان دەکەوتـن بەبـێ بەڵگـەو ڕێنمایـی، وە دابـڕان لـە پشـتیوانی خـوای بە سـۆزو بـە بەزەیی. لـە لایەکـی دیکەوە بتپەرسـت لە بـڕوادار دەترسـێت، چونکە هیـچ پەناگەیەکـی دەروونی نیـە پەنای بـۆ بەرێت کـە لـە ناخۆشـیو تەنگەتاویەکاندا ڕزگـاری بکات.

ئەمـە حاڵیەتـی لـە دنیـا، لـە دوارۆژیشـدا خراپتریـن سـەرەنجامی دەبێـت، ئـا لەبـەر ئەمە دەفەرمـوێ: ﴿وَمَأۡوَىٰهُمُ ٱلنَّارُۖ﴾ واتە: شـوێنی نیشـتەجێ بوونیـانو پەناگەیانـە، وە لێی ڕزگـار نابـن، ﴿وَبِئۡسَ مَثۡوَى ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ بـە هـۆی تـاوانو دژایەتـی کردنیانەوە ئاگـر بـووە بـە جێگایان.

(١٥٢): ﴿وَلَقَدۡ صَدَقَكُمُ ٱللَّهُ وَعۡدَهُۥٓ إِذۡ تَحُسُّونَهُم بِإِذۡنِهِۦۖ حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلۡتُمۡ وَتَنَٰزَعۡتُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِ وَعَصَيۡتُم مِّنۢ بَعۡدِ مَآ أَرَىٰكُم مَّا تُحِبُّونَۚ مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنۡيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلۡأٓخِرَةَۚ ثُمَّ صَرَفَكُمۡ عَنۡهُمۡ لِيَبۡتَلِيَكُمۡۖ وَلَقَدۡ عَفَا عَنكُمۡۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ (١٥٢)﴾:

کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَلَقَدۡ صَدَقَكُمُ ٱللَّهُ وَعۡدَهُۥٓ﴾ (خـوا بەڵێنەکـەی لەگەڵتـان ڕاسـت بردەسـەر) واتـە: بـە سـەرکەوتن، ئێوەی سەرخسـت بەسـەر ئەوانـدا، هەتا پشـتیان تێکـردنو تێکشـکانو کەسـانێکی زۆرتـان لێ کوشـتن، هەتا خۆتـان بوون بە هـۆکار کە پشـتیوانی دوژمنەکانتـان کـرد لەسـەر خۆتان، ئەمـەش لە کاتێکـدا بوو کە شکسـتتان هێنا بـە هـۆی لاوازیو بـێ توانایتـان، ﴿وَتَنَٰزَعۡتُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِ﴾ کـە فەرمانـی خواتان واز لێهێنـاو ئـاژاوەو دووبەرکیتان تێکـەوت، هەندێکتان دەیوت: لە شـوێنی خۆمـان دەمێنینەوە کـە پێغەمبـەر ﷺ بۆی دیـاری کردوویـن، وە هەندێکی تر دەیـوت: چی بکەیـن لێرەدا کە دوژمن شـکاوەو ترس لەسـەرمان نەماوە، سـەرپێچی پێغەمبەر ﷺتان کـردو فەرمانی ئەوتان شـکاند پـاش ئـەوەی کە خـوا ئەوەی کـە لـە جەنگەکـەدا پێتان خۆش بـوو پیشـانی دان، سـەرکەوتن لـە سـەرەتای جەنگەکـەداو، زەلیلـی دوژمنەکانتان بـوو، ئەو کەسـەی کە خوا نـازو نیعمەتێـک دەڕێژێـت بەسـەریدا کە خۆی پێی خۆشـە، ئەو نـازو نیعمەتـە گەورەترە

لەوانـی تـر، بۆیە پێویستە لەسەری لەم حاڵەتەدا بە تایبەتو لە هەمـوو حاڵەتەکانی تردا بـە گشـتی، فەرمانبەرداریی فەرمانـی خـواو پێغەمبەرەکەی بێ.

﴿مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا﴾ ئـەو کەسـانە بوون کە خـوا ئەوەی بۆ پێویسـت کردن کـە پێویسـتی کـرد. (واتـە: ئـەو کەسـانە بـوون کـە فەرمانـی پێغەمبەریان ﷺ شـکاند)، ﴿وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلْآخِرَةَ﴾ ئەوانە بوون کە پابەند بوون بە فەرمانی پێغەمبەرەوە ﷺ، وە جێگیر بوون لە جێبەجێ کردنی فەرمانەکاندا.

﴿ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ﴾ کاتێـک خـوای گـەورە هەندێ لـەو ڕەفتارانەی بینـی لێتان، ئنجـا دەسـتی ئێـوەی کۆتـا کـردو تـێ شـکان، ئەمـەش تاقـی کردنەوەیەکـە لـە لایـەن خـواوە، بـۆ ئـەوەی بـڕوادارو بێبـڕوا دەربکەوێـت، وە گوێڕایەڵو سـەرپێچیکار لـە یەکتر جیابکرێتـەوە، وە لەبـەر ئـەوەی پاکتان بکاتـەوە لەو سـەرپێچییەی کە ئەنجامتـان داوە، بۆیە دەفەرمـوێ: ﴿وَلَقَدْ عَفَا عَنكُمْ ۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ واتـە: خـاوەن چاکـەی گەورەیـە بەسـەرتانەوە، لـەو ڕووەی کـە منەتـی کردوە بەسـەریاندا بە ئیسـلامو، هیدایەتـی داون بـۆ ئاینەکەیو لـە تاوانەکانیان خۆش بووەو لەسـەر بەڵاو موسـیبەتەکانیان پاداشـتی داونەتەوە.

وە یەکێکـی تـر لـە چاکەکانی خوای گـەورە ئەوەیـە هیچ بەڵایـەک ناهێنێت بەسـەریاندا ئیلـلا خێـری تێدایە بۆ ئـەوان، ئەگەر خۆشـی بهێنێـت بەسـەریاندا سوپاسـگوزاری دەکەن، خـوای گەورەش پاداشـتی سوپاسـگوزاریان دەداتەوە، وە ئەگـەر نارەحەتی بێت بەسـەریاندا ئـارام دەگرن، خـوای گـەورە پاداشـتی ئارامگرانیان پێ دەبەخشـێت.

(١٥٣-١٥٤): ﴿إِذْ تُصْعِدُونَ وَلَا تَلْوُۥنَ عَلَىٰٓ أَحَدٍ وَٱلرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ فِىٓ أُخْرَىٰكُمْ فَأَثَٰبَكُمْ غَمًّۢا بِغَمٍّ لِّكَيْلَا تَحْزَنُوا۟ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا مَآ أَصَٰبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٥٣﴾ ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنۢ بَعْدِ ٱلْغَمِّ أَمَنَةً نُّعَاسًا يَغْشَىٰ طَآئِفَةً مِّنكُمْ ۖ وَطَآئِفَةٌ قَدْ أَهَمَّتْهُمْ أَنفُسُهُمْ يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ ظَنَّ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ۖ يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ مِن شَىْءٍ ۗ قُلْ إِنَّ ٱلْأَمْرَ كُلَّهُۥ لِلَّهِ ۗ يُخْفُونَ فِىٓ أَنفُسِهِم مَّا لَا يُبْدُونَ لَكَ ۖ يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ مَّا قُتِلْنَا هَٰهُنَا ۗ قُل لَّوْ كُنتُمْ فِى بُيُوتِكُمْ لَبَرَزَ ٱلَّذِينَ كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقَتْلُ إِلَىٰ مَضَاجِعِهِمْ ۖ وَلِيَبْتَلِىَ ٱللَّهُ مَا فِى صُدُورِكُمْ وَلِيُمَحِّصَ مَا فِى قُلُوبِكُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿١٥٤﴾﴾:

خـوای گـەورە باسـی حاڵیـان دەکات لە کاتی تێ شـکان لە شـەڕی ئوحودو سـەر زەنشـتیان دەکات لەسـەر ئـەو کارە، دەفەرمـوێ: ﴿إِذْ تُصْعِدُونَ﴾ واتـە: کاتێـک کە شـپرزە بـوونو پەلەتـان دەکـرد لـە ڕاکردنـدا ﴿وَلَا تَلْوُونَ عَلَىٰٓ أَحَدٍ﴾ واتـە: هـەر یەک لە ئێـوە ڕایدەکـردو بـە ڕێـی کەس نەدەوەسـتاو ئـاوڕی لە کـەس نەدەدایـەوە، بەڵکـو هیچ لە بیرتانـدا نەبـوو جگـە لـە ڕاکـردن نەبێتو ڕزگـار بوون لە کوشـتار.

لـە ڕاستیشـدا مەترسـی گـەورە لەسـەرتان نەبـوو، ئێـوە کۆتـا کـەس نەبـوون کـە دوژمن بـە دوایانـدا بێـتو ڕووبـەڕووی جەنگ ببنـەوە، بەڵکـو ﴿وَٱلرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ فِىٓ أُخْرَىٰكُمْ﴾ واتـە: پێغەمبـەر لـە دواتانـەوە بانگـی دەکـردنو دەیفەرمـوو: {إليَّ عبـاد الله} واتـە: بێـن بـە دەممـەوە ئـەی بەندەکانی خوا! کەسـتان لاتـان لێ نەکـردەوەو نەڕۆیشـتن بۆ لای، ڕاکـردن بۆ خۆی سەرزەنشـتی پێویسـت دەکات لەسـەر خاوەنەکـەی، وە بانگ کردنی پێغەمبـەر ﷺ کـە پێویسـتە پێش بخرێت بەسـەر نەفسـدا دواکەتن لێی شایسـتەی گەورەترین لۆمەو سەرزەنشـتیە.

﴿فَأَثَٰبَكُمْ﴾ (خـوای گەورە) پاداشـتی دانەوە لەسـەر کردەوەکانتان، ﴿غَمًّۢا بِغَمٍّ﴾ واتـە: خەمێـک خەمێکـی تـری بـە دوای خۆیـدا هێنا: خەمـی لە دەسـتدانی سـەرکەوتنو لە دەسـتدانی دەسـتکەوت، وە خەمـی تـێ شـکانتان، وە خەمێـک هەمـووی خەمەکانـی لەبیـر بردنـەوە، ئەویـش ئـەوە بوو بیسـتتان کـە موحەممـەد ﷺ کوژرا.

بـەڵام خوا بە سـۆزو بەزەیی خۆی هەمـوو ئەمانەی کرد بـە ڕەحمەت بۆ بەنـدە بڕوادارەکانی، وەک دەفەرمـوێ: ﴿لِّكَيْلَا تَحْزَنُوا۟ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ﴾ (تاکـو دڵتەنـگ نەبـن بۆ ئـەوەی لـە دەسـتتاندا) لـە سـەرکەوتن، ﴿وَلَا مَآ أَصَٰبَكُمْ﴾ لـە تێشـکانو بەزینو کوشـتنو بریندار بوون، ئەگەر گەیشـتن بەو ڕاسـتیەی کـە موحەممەد ﷺ نەمـردووە، هەموو ئـەو بەڵایانـە ئاسـان دەبێت، وە شـاد دەبنەوە بـە بینینی کە هەموو بەڵاکان لەسـەرتان ئاسـان دەکات، وە هەمـوو ناخۆشـیو بـەڵاکان دنیایەک حیکمـەتو نهێنی تێدایە.

هەمـوو ئەمانـە دەرچـووە لـە زانسـتو زانیـاریو کەماڵـی خـوا بـە کردەوەکانـی ئێـوە، وە ئـەوەی ئاشـکرای دەکـەنو ئـەوەی دەیشـارنەوە، لەبـەر ئەمەیـە دەفەرمـوێ: ﴿وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾، دەگونجێـت مانـای: ﴿لِّكَيْلَا تَحْزَنُوا۟ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا مَآ أَصَٰبَكُمْ﴾ واتـە: خـوای گەورە ئەم خەمو بەڵایەی لەسـەرتان نووسـی بێت، بۆ ئەوەی نەفسـتان ڕابێت لەسەر ناخۆشـیو ئارامگرتن لەسەری، وە نارەحەتیەکان سووک بێت لەسەرتان:

ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنۢ بَعْدِ ٱلْغَمِّ أَمَنَةً نُّعَاسًا يَغْشَىٰ طَآئِفَةً
مِّنكُمْ ۖ وَطَآئِفَةٌ قَدْ أَهَمَّتْهُمْ أَنفُسُهُمْ يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيْرَ
ٱلْحَقِّ ظَنَّ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ۖ يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ مِن شَىْءٍ ۗ
قُلْ إِنَّ ٱلْأَمْرَ كُلَّهُۥ لِلَّهِ ۗ يُخْفُونَ فِىٓ أَنفُسِهِم مَّا لَا يُبْدُونَ لَكَ ۖ
يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ مَّا قُتِلْنَا هَٰهُنَا ۗ قُل لَّوْ كُنتُمْ
فِى بُيُوتِكُمْ لَبَرَزَ ٱلَّذِينَ كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقَتْلُ إِلَىٰ مَضَاجِعِهِمْ ۖ
وَلِيَبْتَلِىَ ٱللَّهُ مَا فِى صُدُورِكُمْ وَلِيُمَحِّصَ مَا فِى قُلُوبِكُمْ ۗ
وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿١٥٤﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْا۟ مِنكُمْ
يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ إِنَّمَا ٱسْتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ بِبَعْضِ
مَا كَسَبُوا۟ ۖ وَلَقَدْ عَفَا ٱللَّهُ عَنْهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿١٥٥﴾ يَٰٓأَيُّهَا
ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَقَالُوا۟ لِإِخْوَٰنِهِمْ إِذَا
ضَرَبُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ أَوْ كَانُوا۟ غُزًّى لَّوْ كَانُوا۟ عِندَنَا مَا مَاتُوا۟
وَمَا قُتِلُوا۟ لِيَجْعَلَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ حَسْرَةً فِى قُلُوبِهِمْ ۗ وَٱللَّهُ يُحْىِۦ
وَيُمِيتُ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١٥٦﴾ وَلَئِن قُتِلْتُمْ فِى سَبِيلِ
ٱللَّهِ أَوْ مُتُّمْ لَمَغْفِرَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَحْمَةٌ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿١٥٧﴾

﴿ ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنۢ بَعْدِ ٱلْغَمِّ ﴾ کە تووشتان بوو ﴿ أَمَنَةً نُّعَاسًا يَغْشَىٰ طَآئِفَةً مِّنكُمْ ﴾ گومانی تێدا نیە ئەمە ڕەحمەتی خوایە بۆ بڕواداران، وە چاک کردنو جێگیر کردنی دڵەکانیانە، وە ئارام بەخشیەکی زیاترە، چونکە ئەوەی دەترسێت وەنەوزەو خەوە نوچکەی بۆ نایەت، بە پێچەوانەی ئەوەی کە ترس لە دڵیدایە، ئەگەر ترس نەمێنێت دەکرێت خەوە نوچکە بیباتەوە.

وە ئەم دەستەیەی کە خوا نیعمەتی خۆی ڕشتوە بەسەریاندا بە وەنەوزە، ئەو باوەڕدارانەیە کە هیچ خەمێکیان نیە جگە لە بەرپاکردنی ئاینی خوا نەبێ، وە ڕەزامەندی خواو پێغەمبەرەکەیو ﷺ بەرژەوەندی برا مسوڵمانەکانیان.

بەڵام دەستەکەی دیکە ئەوانەی کە ﴿ قَدْ أَهَمَّتْهُمْ أَنفُسُهُمْ ﴾ هیچ خەمێکیان نەبوو جگە لە خۆیان، لەبەر دووڕوویی، یان ئیمان لاوازیان، لەبەر ئەمە وەنەوزەو خەو نوچکەیان لێ نەکەوت، بە پێچەوانەی ئەوانی ترەوە کە خەوە نوچکەیان لێکەوت دەیانوت: ﴿ هَل لَّنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ مِن شَىْءٍ ﴾ ئەمە پرسیار کردنێکی نکوولی لێکەرانەیە، واتە: ئێمە لەم کارەدا هیچ شتێکمان نیە، واتە: سەرکەوتنو دەرکەوتن، گومانی خراپیان بۆ خواو دینەکەیو پێغەمبەرەکەی برد، وە گومانیان وابوو خوای گەورە پێغەمبەرەکەی سەرناخات، وە ئەم شکستە جیاکەرەوەو دادوەرە لەسەر دینی خوا.

خوای گەورە لە وەڵامیاندا فەرمووی: ﴿ قُلْ إِنَّ ٱلْأَمْرَ كُلَّهُۥ لِلَّهِ ﴾ ئەم فەرمانە فەرمانی قەدەری خوا دەگرێتەوە، وە فەرمانی شەرعیش دەگرێتەوە، وە هەموو شتەکان بە قەزاو قەدەری خوایە، دەرەنجامەکەی سەرکەوتنو سەربەرزییە بۆ دۆستانو پشتیوانانی خواو ئەو کەسانەی کە گوێرایەڵی دەکەن، وە ئەگەر هەرچی بەسەریان بێت لە ژیاندا، ﴿ يُخْفُونَ ﴾ (دەیشارنەوە) مەبەستی دووڕووەکانە ﴿ فِىٓ أَنفُسِهِم مَّا لَا يُبْدُونَ لَكَ ﴾ پاشان ئەوەی باسکردوە کە

دەیشارنەوە، دەفەرموێ: ﴿ يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ ﴾ واتە: ئەگەر ئێمە لەو ڕووداوەدا شتێکمان بە دەست بووایە، ﴿ مَّا قُتِلْنَا هَـٰهُنَا ﴾ (ئەوە لێرەدا نەدەکوژراین).

ئەمە نکوولیە لە لایەن ئەوانەوەو بە درۆ خستنەوەی قەدەری خوایەو بە کەم زانینی بۆ چوونی پێغەمبەر ﷺو هاوەڵەکانیەتی، وە بە پاک زانینی دەروونی خۆیانە، خوای گەورە، وەڵامیانی دایەوە بەو فەرمایشتەی: ﴿ قُل لَّوْ كُنتُمْ فِى بُيُوتِكُمْ ﴾ کە ماڵەکان جێگای کوشتن نین: ﴿ لَبَرَزَ ٱلَّذِينَ كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقَتْلُ إِلَىٰ مَضَاجِعِهِمْ ﴾ هۆکارەکان چەندە گەورە بن لە کاتێکدا سوودیان هەیە ڕووبەڕووی قەزاو قەدەر نەبنەوە، ئەگەر ڕووبەڕووی قەدەر بوونەوە هیچ سوودێکیان نامێنێت، بەڵکو پێویستە ئەوە بێتە جێ کە لە (لوح المحفوظ ) دیاری کراوە لە مردنو ژیان، ﴿ وَلِيَبْتَلِىَ ٱللَّهُ مَا فِى صُدُورِكُمْ ﴾ واتە: بۆ ئەوەی خوا تاقی بکاتەوە ئەوەی کە لە سنگتان دایە لە دووڕوویی‌و ئیمانو لاوازی ئیمان، ﴿ وَلِيُمَحِّصَ مَا فِى قُلُوبِكُمْ ﴾ لە خوتخوتەکانی شەیتان، وە ئەوەی کاریگەری لەسەر هەیە لە سیفەتە خراپو پەستەکان.

﴿ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴾ واتە: ئەوەی لە سینەو دەروونەکاندایە، ئەوەی دەیشارێتەوە، لە زانستو حیکمەتی خوا وایە ئەندازەیەک لە هۆکارەکان دەبنە مایەی ئەوە نهێنیەکانی نێو دڵەکان ئاشکرا ببن.

پاشان خوای گەورە دەفەرموێ:

(١٥٥): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْا۟ مِنكُمْ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ إِنَّمَا ٱسْتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ بِبَعْضِ مَا كَسَبُوا۟ ۖ وَلَقَدْ عَفَا ٱللَّهُ عَنْهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿١٥٥﴾ ﴾:

خوای گەورە لەم دەقەدا هەواڵ دەربارەی حاڵی ئەوانە دەدات کە تێشکانو ڕایان کرد لە ڕۆژی ئوحودا، وە چی شتێک وای لێیان کرد ڕابکەن، وە ئەوە لە گومڕا کردنو ڕازاندنەوەی شەیتان بوو، وە شەیتان زاڵ بوو بەسەریاندا بە هۆی هەندێ لە تاوانەکانیان، ئەوان خۆیان شەیتانیان خستە ناو دەروونی خۆیانەوە زاڵیان کرد بەسەر خۆیاندا، ئەگەر پابەند بوونایە بە گوێڕایەڵی پەروەردگاریانەوە ئەوە دەسەڵاتی نەدەبوو بەسەریاندا.

خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ عِبَادِى لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَـٰنٌ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْغَاوِينَ ﴿٤٢﴾ ﴾ الحجر. پاشان هەواڵی داوە کە لێیان خۆش بووە، دوای ئەوەی ئەو کارەیان کرد کە پێویست بوو لەسەری سزا بدرێن، ئەگەر بیگرتنایە لە ناوی دەبردن.

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ ﴾ بۆ ئەو کەسانەی کە تاوانو هەڵەیان ئەنجامداوە، بۆ ئەوەی سەرکەوتوویان بکات لە تەوبە کردنو داوای لێخۆشبوون: ﴿ حَلِيمٌ ﴾ پەلە ناکات لە سزادانی ئەو کەسەی

کە سەرپێچی دەکات، بەڵکو بە سۆزەوە مامەڵەی لەگەڵ دەکاتو بانگی دەکات بۆ داوای لێخۆشبوونو ڕوو تێکردنی.

پاشان ئەگەر داوای لێخۆشبوونی کردو گەڕایەوە لێی قبووڵ دەکات، بە شێوەیەک تەماشای دەکات وەک ئەوەی تاوانی نەکردبێت، وە هیچ عەیبێکی لێنەوەشابێتەوە، سوپاسو ستایش تەنها بۆ خوا لەسەر چاکەکانی.

(١٥٦-١٥٨): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَقَالُواْ لِإِخْوَٰنِهِمْ إِذَا ضَرَبُواْ فِى ٱلْأَرْضِ أَوْ كَانُواْ غُزًّى لَّوْ كَانُواْ عِندَنَا مَا مَاتُواْ وَمَا قُتِلُواْ لِيَجْعَلَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ حَسْرَةً فِى قُلُوبِهِمْ وَٱللَّهُ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ (١٥٦) وَلَئِن قُتِلْتُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوْ مُتُّمْ لَمَغْفِرَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَحْمَةٌ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ (١٥٧) وَلَئِن مُّتُّمْ أَوْ قُتِلْتُمْ لَإِلَى ٱللَّهِ تُحْشَرُونَ (١٥٨) ﴾:

خوای گەورە قەدەغەی کردوە لە بەندە بڕوادارەکانی خۆیان بچوێنن بە بێبڕوایەکان ئەوانەی کە بڕوایان بە پەروەردگاریان نیە، بڕوایان بە قەزاو قەدەریش نیە لە دووڕووەکانو هاوشێوەکانیان. قەدەغەی لێ کردوە لە خۆچواندن بە بێبڕوایان لە هەموو شتێکو بە تایبەت لەم کارەدا، ئەویش ئەوەیە کە ئەوان بە برا بڕوادارەکانیان دەڵێن، یان بە برای دایکو باوکیان دەڵێن: ﴿ إِذَا ضَرَبُواْ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾ واتە: گەشت بکەن ﴿ أَوْ كَانُواْ غُزًّى ﴾ واتە: غەزا بکەن، پاشان کوشتن یان مردن بێت بەسەریاندا، دژی قەدەر دەوستنەوەو دەڵێن: ﴿ لَّوْ كَانُواْ عِندَنَا مَا مَاتُواْ وَمَا قُتِلُواْ ﴾ (واتە: ئەگەر لای ئێمە بوونایە نە دەمردنو نە دەکوژران)، بە ڕاستی ئەمە درۆیە لە لایەن ئەوانەوە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ قُل لَّوْ كُنتُمْ فِى بُيُوتِكُمْ لَبَرَزَ ٱلَّذِينَ كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقَتْلُ إِلَىٰ مَضَاجِعِهِمْ (١٥٤) ﴾آل عمران، بەڵام ئەم درۆیە سوودی بە دووڕووەکان نەگەیاند، مەگەر ئەوە نەبێت ئەو وتەو بیرو باوەڕە ببێت بە ئاخو مەراقێک لە دڵەکانیاندا، ئنجا بەڵاکەیان بەو هۆیەوە بۆ زیاتر بکات، بەڵام بڕواداران دەزانن ئەمە بە قەدەرو ویستی خوا بووە، بڕوای پێدەکەنو خۆیان دەدەن بە دەستەوە، پاشان خوا دڵەکانیان ڕێنمایی دەکاتو جێگیر دەکات، بە هۆی ئەوەوە بەڵاکەیان لەسەر سووک دەکات.

خوا فەرموویەتی: ﴿ وَٱللَّهُ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ﴾ واتە: ئەو زاتە تاکو تەنهایە بەوە، ئەگەر قەزاو قەدەر هات خۆپاراستن هیچ سوودێکی نابێت.

﴿ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾ خوا پاداشتیان دەداتەوە بە کردەوەکانیانو بە بەدرۆدانانیان.

وَلَئِن مُّتُّمْ أَوْ قُتِلْتُمْ لَإِلَى ٱللَّهِ تُحْشَرُونَ ﴿١٥٨﴾ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ
لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ۖ
فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِى ٱلْأَمْرِ ۖ فَإِذَا عَزَمْتَ
فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ ﴿١٥٩﴾ إِن يَنصُرْكُمُ ٱللَّهُ
فَلَا غَالِبَ لَكُمْ ۖ وَإِن يَخْذُلْكُمْ فَمَن ذَا ٱلَّذِى يَنصُرُكُم مِّنۢ
بَعْدِهِۦ ۗ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١٦٠﴾ وَمَا كَانَ لِنَبِىٍّ أَن
يَغُلَّ ۚ وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۚ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ
نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١٦١﴾ أَفَمَنِ ٱتَّبَعَ رِضْوَٰنَ
ٱللَّهِ كَمَنۢ بَآءَ بِسَخَطٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأْوَىٰهُ جَهَنَّمُ ۚ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ
﴿١٦٢﴾ هُمْ دَرَجَـٰتٌ عِندَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿١٦٣﴾ لَقَدْ
مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ
يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ
وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴿١٦٤﴾ أَوَلَمَّآ
أَصَـٰبَتْكُم مُّصِيبَةٌ قَدْ أَصَبْتُم مِّثْلَيْهَا قُلْتُمْ أَنَّىٰ هَـٰذَا ۖ
قُلْ هُوَ مِنْ عِندِ أَنفُسِكُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٦٥﴾

پاشان خوای گەورە هەواڵی داوە بە کوشت چوون لە پێناوی ئەودا، یان مردن هیچ ناتەواویەکی تێدا نیە، بەڕاستی دەبوو لەو پێناوەدا پێشبڕکێکەران پێشبڕکێیان بکردایە، چونکە هۆکارێکە بۆ گەیاندنیان بۆ لێخۆش بوونو میهرەبانی خوا، بەڕاستی ئەوە لە هەموو دونیا باشترە کە مرۆڤ کۆی دەکاتەوە.

بە هەمان شێوە دروستکراوەکان ئەگەر بمرن، یان بە کوشت بچن بە هەر شێوەیەک بێت، ئەوە سەرەنجام گەڕانەوەیان تەنها بۆ لای خوایە، هەر کەسەو بە پێی کردەوەکانی خۆی پاداشت دەداتەوە.

دەی کەواتە ڕاکردنو هەڵهاتن بۆ کوێ جگە لە لای خوا، دروستکراو هیچ پەناگەیەکی نیە، جگە لەوەی کە دەست بگرێت بە ئاینی خواوە.

(١٥٩): ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ۖ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِى ٱلْأَمْرِ ۖ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ ﴿١٥٩﴾ ﴾:

بە هۆی بەزەیی‌و ڕەحمەتی خواوەیە بۆ تۆ ئەی موحەممەد ﷺو هاوەڵەکانت، خوای گەورە منەتی کردوە بە سەرتدا کە لەگەڵیاندا هێمنو نەرمو نیان بوویو باڵی بەزەیت بۆ نەوی کردنو بە جوانترین ڕەوشت مامەڵەت لەگەڵیاندا دەکرد، لەبەر ئەمە کۆبوونەوە لە دەورتو خۆشیان ویستی‌و فەرمانەکانی تۆیان جێبەجێ دەکرد.

﴿ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ ﴾ ئەگەر تۆ بەد خوو، دڵ ڕەقو بێ بەزەیی بویتایە، ﴿ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ﴾ (لێت دوور دەکەوتنەوە) چونکە ڕەوشتی خراپ دەیانتۆرێنێو

ڕق ئەستوریان دەکات، بەڵام ڕەوشتو ئاکاری جوان لە لایەن سەرۆکەوە لە پایە سەرەکیەکانی ئاینە، خەڵکی ڕادەکێشێو حەزیان دەجوڵێنێت بۆ لای ئاینی خوا، لەگەڵ ئەوەدا خاوەنەکەی پاداشتی تایبەت وەردەگرێت.

وە خوو ڕەوشتی ناشرین لە لایەن سەرۆکەوە دەبێتە هۆی دورکەوتنەوەی خەڵکی لە دینو ڕقیان لێی دەبێتەوە، لەگەڵ ئەوەی خاوەنەکەی سەرزەنشت دەکرێتو لەسەری سزا دەدرێت، جا ئەمە پێغەمبەری خوایەو مەعصومە، خوا ئەوە دەربارەی دەڵێت، ئەی جگە لە ئەو دەبێ چۆن بێت؟!

ئایا ئەمە لە ئەوپەڕی پێویستیەکانو گرنگترینیان نیە، وە پەیڕەوکردن بە ڕەوشتە جوانەکانی، وە مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵک بەوەی پێغەمبەر ﷺ مامەڵەی پێ کردوە، لە نەرمو نیانیو ڕەوشتی جوانو پەیوەندیو برایەتی، وەک جێبەجێکردنی فەرمانی خواو ڕاکێشانی بەندەکان بۆ لای دینی خوا؟

پاشان خوا فەرمانی بە پێغەمبەر ﷺ کردوە کە ببورێت لێیان لە بەرانبەر ئەو کەمتەرخەمیەی کە نواندوویانە لە هەقیدا، وە داوای لێخۆش بوونیان بۆ بکات لەو کەمتەرخەمیەی کە بەرانبەر پەروەردگاریان کردوویانە، ئەوکات لێبوردن چاکە خوازی پێکەوە کۆ دەکاتەوە.

﴿ وَشَاوِرْهُمْ فِي ٱلْأَمْرِ ﴾ واتە: ئەو کارانەی کە پێویستی بە ڕاوێژو تێڕوانینو بیرکردنەوە هەیە، چونکە لە ڕاوێژ کردن سوودو بەرژەوەندی ئاینیو دنیایی هەیە کە لە ژماردن نایەت، لەوانە:

- ڕاوێژکردن لەو جۆرە بەندایەتیەیە کە مسوڵمان پێی نزیک دەبێتەوە لە خوا.

- لە ڕاوێژکردندا بەخشندەیی بۆ بیرۆکەکانیان، وە لا بردنی ئەو شتانەیە لە دڵەکاندا ڕوو دەدەن پاش بەسەرهاتەکان، چونکە هەر کەسێک فەرمانی هەبێت بەسەر خەڵکیدا، ئەگەر خاوەن بۆچوونو ڕێزدارەکانی کۆ کردەوەو ڕاوێژی پێکردن لە ڕووداوێکدا، نەفسیان ئارام دەبێتەوەو خۆشیان دەوێت، وە بۆشیان دەردەکەوێت کە زۆردار نیە بەسەریانەوە، بەڵام تەماشای بەرژەوەندی گشتی دەکات، ئەوانیش لە بەرانبەردا هەرچی تواناو دەسەڵاتیان هەیە بۆ گوێڕایەڵی دەیخەنە کار، چونکە دەزانن ئەو کار بۆ بەرژەوەندی گشتی دەکات، بە پێچەوانەی کەسێک کە وا نەبێت، (ڕاوێژ بە چوار دەوری نەکات) بێگومان ئەوان خۆشیان

دەوێــت خۆشەویســتیەکی ڕاســتەقینە، بــەڵام گوێڕایەڵــی ناکــەن، وە ئەگــەر گوێڕایەڵــی بکــەن، بــە باشــی جێبەجێــی ناکــەن.
- بەڕاســتی ڕاوێــژ بیــرو هــزرەکان ڕوونــاک دەکاتــەوە، بــە هــۆی ئــەو کارانــەی کــە بــۆی داڕێــژراوە، ئــەوەش دەبێتــە مایــەی زیاتــر بەهێزبوونــی عەقڵــەکان.
- ڕاوێــژ کــردن بــە زۆری بۆچوونــی چــاک دەپێکێــت، هەنــدێ جــار ڕاوێــژکار هەڵــە دەکات لــە کارەکەیــدا، ئەگــەر هەڵــەی کــرد، یــان ئــەوەی داواکــراوە بەدەســتی نەهێنــا، ئــەوە سەرزەنشــت ناکرێــت.
ئەگــەر خــوای گــەورە بــە پێغەمبەرەکــەی ﷺ بفەرمــوێ، کــە تەواوتریــن و کامڵتریــن پیــاوی نــاو مرۆڤەکانــەو زاناترینیانــەو خــاوەن بەهێزتریــن بۆچوونــە: ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي ٱلْأَمْرِ﴾ دەبــێ بــۆ جگــە لــە ئــەو ڕاوێــژ چەنــدە گرنــگ بێــت؟! پاشــان خــوای گــەورە دەفەرمــوێ: ﴿فَإِذَا عَزَمْتَ﴾ واتــە: (ئەگــەر بڕیارێکتــدا) لەســەر کارێــک لــە کارەکان پــاش ڕاوێژ کــردن تیایــدا، ئەگــەر پێویســت بــە ڕاوێــژ بــکات ﴿فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ﴾ پشــت بەهێــزو دەســەڵاتی خــوا ببەســتە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ﴾ خــوا ئــەو کەســانەی خۆشــدەوێت کــە پشــتی پــێ دەبەســتن.
(١٦٠): ﴿إِن يَنصُرْكُمُ ٱللَّهُ فَلَا غَالِبَ لَكُمْ ۖ وَإِن يَخْذُلْكُمْ فَمَن ذَا ٱلَّذِى يَنصُرُكُم مِّنۢ بَعْدِهِۦ ۗ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١٦٠﴾﴾
واتــە: ئەگــەر خــوا بــە یارمەتــی و پشــتیوانی خــۆی ســەرتان بخــات، ﴿فَلَا غَالِبَ لَكُمْ﴾ ئەگــەر هەمــوو ســەر زەوی کۆببێتــەوە لەســەرتان بــە هەمــوو ژمــارەو کەرەســتەی جەنگی پێویســتەوە ســەرناکەون بــە ســەرتاندا، چونکــە کــەس ناتوانێــت زاڵ بێــت بەســەر خــوای گــەورەدا، بێگومــان خــوا زاڵــە بەســەر بەندەکانــداو تەختــی نێوچاوانیانــی گرتــوە، هیــچ گیاندارێــک ناجوڵێــت بــە ویســتی ئــەو نەبێــت، وە لــە جوڵــە ناکەوێــت بــە ویســتی ئــەو نە بێت.
﴿وَإِن يَخْذُلْكُمْ﴾ بتانداتــە دەســتی هــەواو ئارەزووتانــەوە، ﴿فَمَن ذَا ٱلَّذِى يَنصُرُكُم مِّنۢ بَعْدِهِۦ﴾ پێویســتە ســەری بــۆ بنوێنــن، ئەگــەر هەمــوو دروســتکراوەکانیش پشــتیوانتان بــن.
وە لــە چــوار چێــوەی ئەمــەدا فەرمانکردنــە بــە داواکردنــی ســەرکەوتن لــە خــواو پشــت پــێ بەســتنی، وە خــۆ بــەری کــردن لــە هەمــوو هێــزو دەســەڵاتێک، لەبــەر ئەمــە

دەفەرمــوێ:﴿ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴾ پێشخســتنی کار تیاکــراو بــۆ کــورت هەڵهێنــان (حصــر)ە، واتــە: (علــی الله توکلــوا) تەنهــا پشــت بــە خــوا ببەســتن، پشــت بــە جگــە لــەو مەبەســتن، چونکــە تەنهــا ئــەو ســەرخەرە، پشــت بەســتن پێــی یەکتاپەرستیە، وە پشــت بەســتن بــە جگــە لــە خــوا هــاوەڵ بڕیاردانــەو هیــچ ســوودی نیــە بــۆ خاوەنەکــەی، بەڵکــو زیانــی هەیــە.

وە ئــەم ئایەتــە فەرمــان دەکات بــە پشــت بەســتن تەنهــا لەســەر خــوا، کــە بێگومــان ئەمــەش بــە پێــی ئیمانــی کەســەکەیە.

(١٦١): ﴿ وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّ وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١٦١﴾ ﴾:

(الغلــول): بریتیــە لــە شــاردنەوەی شــتێ لــە دەســتکەوتو غەنیمــەت، وە خیانەتکردنــە لــە هەمــوو ئەوشــتانەی لــە ئەســتۆی ئینســاندایە، ئــەوەش بــە یەکدەنگــی زانایــان حــەرام یاســاغ کــراوە، بەڵکــو لــە تاوانــە گەورەکانــە، وەک چــۆن ئــەم دەقــەو غەیــری ئــەم دەقــەش بەڵگەیــە لەســەری‌و ئامــاژەی پێــدەکات، جــا خــوا هەواڵــی داوە کــە بێگومــان نابــێ‌و ناگونجــێ بــە پێغەمبەرێــک خیانــەت بــکات، چونکــە خیانــەت لــە گەورەتریــن گوناهەکانــەو ناشــرینترین عەیبەکانــە.

خــوای مــەزن پێغەمبەرەکانــی خــۆی پاراســتووە لــە هەمــوو ئەوانــەی ناشــرین‌و لەکەداریان دەکان، وە کردوونــی بــە چاکترینــی نــاو خەڵکــی‌و پاکتریــن نەفســی پێــداون‌و پــاک ڕایگرتــوون لــە هەمــوو کــەم‌و کــوڕی‌و ناتەواویــەک، وە لــە ئاســت‌و پێگــەی پەیامەکــەی دایناــون، وە کانــزای حیکمەتــی ﴿ ٱللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُۥ ﴿١٢٤﴾ ﴾ الأنعام. (واتــە: خــوا چــاک دەزانێــت پەیــام‌و پێغەمبــەری خــۆی لــە کــوێ دادەنێــت).

مــرۆڤ تەنهــا یــەک پێغەمبەریــان بناســێت، ئــەو دڵنیــا دەبێــت لــە ســەلامەتی ئــەوان لــە هــەر پەڵــەو لەکەیــەک، وە پێویســتی بــە بەڵگــە نیــە لــەوەی دوژمنایــان دەربارەیــان وتویانــە، چونکــە ناســینی بــەوەی کــە پێغەمبــەرن ڕەتکەرەوەیــە بــۆ هەمــوو ئــەو گومانانە کــە دەدرێنــە پاڵیــان، بۆیــە بــە دەســتەواژەیەک هێناویەتــی کــە کاری لــەو شــێوە لــە ئــەوان ناوەشــێتەوە، فەرموویەتــی: ﴿ وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّ ﴿١٦١﴾ ﴾ واتــە: خیانــەت لــە ئەوانــدا بوونــی نیــە، ئەســتەمە خــوای گــەورە کەســانێک بــۆ پێغەمبەرایەتــی هەڵبژێرێــت خیانــەت بکــەن.

پاشـان باسـی هەڕەشـەی کـردوە لەسـەر ئـەو کەسـەی خیانـەت دەکات، فەرموویەتـی: ﴿ وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ﴾ واتـە:
واتـە: دەیگرێتـە کۆڵـەوە لەسـەر شـانی، جـا ئـاژەڵ بێـت، یـان هـەر کەرەستەیەکی تـر، پێـی سـزا دەدرێـت لـە ڕۆژی دواییـدا، ﴿ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ ﴾ ئـەو کەسـەی کـە خیانەتـی کـردوە، یـان هـەر کەسێکی تـر، هەرچـی کردبێـت پاداشـت دەدرێتـەوە بـاش بـێ، یـان خـراپ ﴿ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴾ واتـە: خراپەکانیـان بـۆ زیـاد ناکرێـت، وە لـە کـردەوە چاکەکانیشـیان کـەم ناکرێـت.
بڕوانـەو سـەرنجی جوانـی ئـەم خۆپاراستنە بـدە لـەم دەقـە پیـرۆزەدا، کاتـێ کـە باسـی سـزای خیانەتـکار دەکات، کـە لـە ڕۆژی قیامەتـدا بـەو خیانەتـەوە ئامـادە دەبێـت، وە کاتێـک کـە دەیەوێـت باسـی پاداشـتی بـکات تەنهـا باسـی خیانەتکارەکـە نـاکات، بەڵکـو بـە گشـتی بـاس دەکات.
(١٦٢-١٦٣): ﴿ أَفَمَنِ ٱتَّبَعَ رِضْوَٰنَ ٱللَّهِ كَمَنۢ بَآءَ بِسَخَطٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأْوَىٰهُ جَهَنَّمُ ۚ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٦٢﴾ هُمْ دَرَجَـٰتٌ عِندَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿١٦٣﴾ ﴾
خـوای گـەورە هەواڵـی داوە یەکسـان نیـە کەسێک شـوێنی ڕەزامەنـدی خـوا کەوتبـێ، لەگـەڵ کەسێکدا بـە دوای تـاوان کەوتبێـتو خـوای لـە خـۆی تـووڕە کردبـێو شایسـتەی خەشـمو تووڕەیـی خـوا بـێ، ئـەم دوو دەسـتە لـە حوکمـی خـوادا یەکسـان نیـن، وە لـە لای مرۆڤیـش بـە هەمـان شـێوە: ﴿ أَفَمَن كَانَ مُؤْمِنًا كَمَن كَانَ فَاسِقًا ۚ لَّا يَسْتَوُۥنَ ﴿١٨﴾ ﴾السجدة، (واتـە: ئایـا کەسێک کـە بـڕوای هێنـاوە، وەک کەسێکە کـە لادەرە؟ وەک یـەک نیـن).
ئـا لەبـەر ئەمەیـە لێـرەدا دەفەرمـوێ: ﴿ هُمْ دَرَجَـٰتٌ عِندَ ٱللَّهِ ﴾ واتـە: هەمـوو ئەوانـە پلـەو پایەکانیـان جیـاوازە بـە پێـی جیـاوازی کردەوەکانیـان، ئەوانـەی کـە شـوێنی ڕەزامەنـدی خـوا کەوتـوون تێدەکۆشـن بـۆ پلـەو شـوێنی بـەرز لـە بەهەشـتدا، خـوای گـەورە لـە چاکـەی خـۆیو بـە پێـی کردەوەکانیـان پێیـان دەبەخشـێت، وە ئەوانـەی کە شـایانی خەشـمو تووڕەیـی خـوای گـەورەن هـەوڵ ئـەدەن خراپتریـنو نزمتریـن شـوێن بـۆ خۆیـان مسـۆگەر بکـەن هەتـا خـواری خـوارەوە، هـەر یەکـەو بـە پێـی کـردەوەی خـۆی، خـوای گـەورە بینـەری کردارەکانیانـە، هیـچ شـتێک لـە کردارەکانیـان لـە خـوا ون نابێـت، بەڵکـو خـوا دەیزانـێ، وە لـە (لـوح المحفـوظ)دا جێگیـری کردوە، وە فریشـتەی

دەستپاکو بەڕێزی بۆ کردوە بە وەکیل کە بینووسنو بیپارێزنو ڕێکی بخەن.

(١٦٤): ﴿لَقَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿١٦٤﴾﴾:

ئەم منەتەی کە خوای گەورە کردوویەتی بەسەر بەندەکانیدا گەورەترین نیعمەتە، بەڵکو بنچینەی نیعمەتەکانە، ئەویش منەت کردنیەتی بەسەریاندا بەم پێغەمبەرە زۆر بەڕێزە صەڵاتو سەلامی خوای لەسەر، کە خوا بە بۆنەی ئەوەوە لە گومرایی ڕزگاری کردن، وە پاراستنی لە لە ناوچوون، دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ﴾ ڕەچەڵەکی دەناسنو حاڵی دەزانن، وە زمانی لە نەتەوەو هۆزی خۆیانە، ئامۆژگاریکارە بۆیان، نەرمو نیانە لە گەڵیاندا لە خەمیاندایە، دەقەکانی قورئانیان بەسەردا دەخوێنێتەوەو فێریان دەکاتو ماناکانی قورئانیان بۆ ڕوون دەکاتەوە ﴿وَيُزَكِّيهِمْ﴾ پاکیان دەکاتەوە لە هاوەڵ بڕیار دانو سەرپێچی کردنو ڕەفتاری نامۆو سەرجەم ڕەفتارە خراپەکانی تر.

﴿وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ﴾ لێرەدا یان هەمان کتێبە کە قورئانی پیرۆزە، کە دەفەرموێ: ﴿يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ﴾ یان مەبەست لە ئایاتەکان نیشانە گەردوونیەکانن، یان مەبەست لە (کتاب) لێرەدا: نووسینە، ئەو کاتە خوای گەورە منەت دەکات بەسەریاندا بە فێر کردنی کتێبو نووسین کە لە ڕێگایەوە زانست درکیان پێدەکرێتو دەپارێزرێن.

﴿وَٱلْحِكْمَةَ﴾ بریتیە لە: سوننەت، کە هاوشانی قورئانە، یان دانانی شتەکانە لە جێگای خۆیانداو زانیاری دەربارەی نهێنیەکانی شەریعەت، خوای گەورە بۆی کۆکردنەوە لە نێوان فێر بوونی ئەحکامەکانو چۆنیەتی جێبەجێ کردنیان، وە سوودو قازانجو بەرهەمەکانیشی بۆ ڕوونکردنەوە، بەم هەموو کارە گەورەوە پێشی هەموو دروستکراوەکان کەوتنو بوون بە زانای خواناسو لە خوا ترس.

﴿وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلُ﴾ پێش هاتنی ئەم پێغەمبەرە ﴿لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴾ واتە: ئەو ڕێگایەی دەیانگەیێنێت بە خوا نەیاندەزانی، وە نەیادەزانی چۆن دەروونیان پاک بکەنەوە، بەڵکو هەر شتێک نەفامیانی جوان بکردایە شارەزا بوون لێی، ئەگەر پێچەوانەی عەقڵی هەموو جیهانیش بووایە.

وَمَآ أَصَٰبَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ فَبِإِذۡنِ ٱللَّهِ وَلِيَعۡلَمَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ
(١٦٦) وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ نَافَقُواْۚ وَقِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ قَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ
أَوِ ٱدۡفَعُواْۖ قَالُواْ لَوۡ نَعۡلَمُ قِتَالٗا لَّٱتَّبَعۡنَٰكُمۡۗ هُمۡ لِلۡكُفۡرِ يَوۡمَئِذٍ
أَقۡرَبُ مِنۡهُمۡ لِلۡإِيمَٰنِۚ يَقُولُونَ بِأَفۡوَٰهِهِم مَّا لَيۡسَ فِي قُلُوبِهِمۡۚ
وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا يَكۡتُمُونَ (١٦٧) ٱلَّذِينَ قَالُواْ لِإِخۡوَٰنِهِمۡ وَقَعَدُواْ
لَوۡ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُواْۗ قُلۡ فَٱدۡرَءُواْ عَنۡ أَنفُسِكُمُ ٱلۡمَوۡتَ إِن
كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ (١٦٨) وَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ
أَمۡوَٰتَۢاۚ بَلۡ أَحۡيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمۡ يُرۡزَقُونَ (١٦٩) فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ
ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ وَيَسۡتَبۡشِرُونَ بِٱلَّذِينَ لَمۡ يَلۡحَقُواْ بِهِم
مِّنۡ خَلۡفِهِمۡ أَلَّا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ (١٧٠) ۞يَسۡتَبۡشِرُونَ
بِنِعۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضۡلٖ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ
ٱلۡمُؤۡمِنِينَ (١٧١) ٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعۡدِ مَآ أَصَابَهُمُ
ٱلۡقَرۡحُۚ لِلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ مِنۡهُمۡ وَٱتَّقَوۡاْ أَجۡرٌ عَظِيمٌ (١٧٢)
ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدۡ جَمَعُواْ لَكُمۡ فَٱخۡشَوۡهُمۡ
فَزَادَهُمۡ إِيمَٰنٗا وَقَالُواْ حَسۡبُنَا ٱللَّهُ وَنِعۡمَ ٱلۡوَكِيلُ (١٧٣)

(١٦٥-١٦٨): ﴿ أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَدۡ أَصَبۡتُم مِّثۡلَيۡهَا قُلۡتُمۡ أَنَّىٰ هَٰذَاۖ قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ (١٦٥) وَمَآ أَصَٰبَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ فَبِإِذۡنِ ٱللَّهِ وَلِيَعۡلَمَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ (١٦٦) وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ نَافَقُواْۚ وَقِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ قَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوِ ٱدۡفَعُواْۖ قَالُواْ لَوۡ نَعۡلَمُ قِتَالٗا لَّٱتَّبَعۡنَٰكُمۡۗ هُمۡ لِلۡكُفۡرِ يَوۡمَئِذٍ أَقۡرَبُ مِنۡهُمۡ لِلۡإِيمَٰنِۚ يَقُولُونَ بِأَفۡوَٰهِهِم مَّا لَيۡسَ فِي قُلُوبِهِمۡۚ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا يَكۡتُمُونَ (١٦٧) ٱلَّذِينَ قَالُواْ لِإِخۡوَٰنِهِمۡ وَقَعَدُواْ لَوۡ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُواْۗ قُلۡ فَٱدۡرَءُواْ عَنۡ أَنفُسِكُمُ ٱلۡمَوۡتَ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ (١٦٨) ﴾:

ئەمە دڵنەواییەکە لە لایەن خواوە بۆ بەندە بروادارەکانی، کاتێک کە تووشیان بوو لە ڕۆژی ئوحودداو حەفتا کەسیان لێ کوژرا، خوا دەفەرموێ: ئێوە ﴿ قَدۡ أَصَبۡتُم مِّثۡلَيۡهَا ﴾ لە جەنگی بەدردا دوو ئەوەندەتان بە ئەوان کرد، حەفتا پیاوی گەورەتان لێکوشتن‌و حەفتا پیاوتانیش لێ بە دیل گرتن، با ئەم بەڵایە بە گەورە وەر نەگرن‌و دڵنەوایی یەکتر بکەن‌و بەڵاکەیان لەسەر سووک بێت، لەگەڵ ئەوەدا ئێوەو ئەوان یەکسان نین، کوژراوانی ئێوە لە بەهەشتە کوژراوانی ئەوان لە دۆزەخە.

﴿ قُلۡتُمۡ أَنَّىٰ هَٰذَا ﴾ واتە: لە کوێوە تووشمان بووەو تێشکاین؟ ﴿ قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡ ﴾ کە کاتێک دووبەرەکیتان تێکەوت‌و سەرپێچیتان کرد دوای ئەوەی خوا هەندێک شتی نیشاندان کە حەزتان لێدەکرد، بگەڕێنەوە بۆ سەرزەنشتکردنی دەروونتان، وە بە ئاگا بن لەو هۆکارانەی کە دەبنە مایەی ئەوەی شکست بێنن. ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴾ دەخیلە بە گومانی خراپ بردن، بە ڕاستی خوا بە توانایە لە سەر سەرخستنتان، بەڵام لە لای خوا گەورەترین حیکمەت هەیە لە تووشبونتان بەو بەڵاو نارەحەتیانە، وەک دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَۖ وَلَوۡ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَٱنتَصَرَ مِنۡهُمۡ وَلَٰكِن لِّيَبۡلُوَاْ بَعۡضَكُم بِبَعۡضٖ (٤) ﴾محمد پاشان خوای گەورە هەواڵی داوە ئەوەی کە دوو چاری ئێوە بووەوە لەو ڕۆژەی کە ئەو دوو کۆمەڵە گەیشتن بە یەکتر کە بریتی

بوون لە: کۆمەڵی بڕواداران‌و کۆمەڵی بت پەرستان لە جەنگی (ئوحود) لە کوشتن‌و تێ شکان، بەڕاستی ئەوە بە ویستی خواو قەزاو قەدەری ئەو بوو، قەزاو قەدەری خوا کە هات ڕەتکردنەوەی نیەو دەبێت هەر ڕوو بدات.

وە فەرمانی قەدەری، ئەگەر جێبەجێکرا، هیچ نامێنێتەوە جگە لە خۆ بەدەستەوەدان نەبێت، وە خوای گەورە ئەو قەدەرەی هێناوە لەبەر حیکمەتێک‌و سوودێکی زۆر گەورە، وە بێگومان بۆ ئەوەی مرۆڤی بڕوادار لە دووڕوو جیا بکرێتەوە، ئەوانەی کاتێک فەرمانی کوشتاریان پێکرا ﴿ وَقِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ قَـٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾ واتە: (پێیان وترا) لە پێناو دینی خواداو پارێزگاری لێکردنی‌و لە پێناو ڕەزامەندی خوادا، ﴿ أَوِ ٱدْفَعُواْ ﴾ (یان) بەرگری لە شەرەف‌و وڵاتەکەتان بجەنگن، با ئەگەر نیەتی چاکتانیش نەبێت.

بەر پەرچیان دایەوەو بیانوویان هێنایەوە بەوەی کە ﴿ قَالُواْ لَوْ نَعْلَمُ قِتَالًا لَّٱتَّبَعْنَـٰكُمْ ﴾ ئەگەر بمانزانیبایە جەنگ هەیە شوێنتان دەکەوتین، ئەوان لەمەدا درۆیان کرد، چاک دەیانزانی‌و دڵنیابوون، بە ڕاستی ئەو بت پەرستانە دڵیان پڕ لە قین‌و تووڕەییە بەرانبەر بە بڕواداران کە لە جەنگی بەدردا چییان بەسەر هێنان، وە ئەوان ماڵ‌و سامانیان خەرج کرد، وە بۆ ئەو مەبەستە ئەوەی پێویست بوو لە پیاوو خۆئامادە کردن کۆیان کردەوە، وە بە هێزێکی گەورەی پڕ چەکەوە ڕوویان کردە بڕواداران بۆ کوشتار کردن لە بەرانبەریان، ئەگەر ئەمە حاڵ‌و دۆخیان بێت، چۆن بیر دەکرێتەوە کە جەنگ لە نێوانی ئەوان‌و بڕوادارانەدا ڕوونەدات؟ بە تایبەت بڕوادارانیش لە شاری مەدینە دەرچوونەو خۆیان بۆ ئەوان ئامادە کردوە، ئەمەش مەحاڵە، بەڵام دووڕووەکان وا گومانیان برد ئەم بیانووە بازاڕی بڕواداران گەرم دەکات‌و قەناعەتیان پێ دەکەن.

خوا دەفەرموێ: ﴿ هُمْ لِلْكُفْرِ يَوْمَئِذٍ ﴾ واتە: لەو ڕۆژەدا کە وازیان لە بڕواداران هێنا، ﴿ أَقْرَبُ مِنْهُمْ لِلْإِيمَـٰنِ ۚ يَقُولُونَ بِأَفْوَٰهِهِم مَّا لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْ ﴾، ئەمە تایبەتە بە دووڕووەکان، بە زمانیان بڕوا ئاشکرا دەکەن، ئەوەی لە ناخیاندایە دەریناخەن‌و دەیشارنەوە. وە لەوانە کە دەڵێن: ﴿ لَوْ نَعْلَمُ قِتَالًا لَّٱتَّبَعْنَـٰكُمْ ﴾ ئەوان بەڕاستی دەیانزانی کوشتار ڕوودەدات. ئەم دەقە دەکرێتە بەڵگە بۆ بنچینەی: (إرتكاب أخف المفسدتين لدفع أعلاهما، وفعل أدنى المصلحتين للعجز عن أعلاها) واتە: ئەنجامدانی سوکترین خراپە بۆ پاڵنان بە بەرزترینیانەوە، وە کردنی کەمترین بەرژەوەندی، لەبەر نەتوانینی بەرز ترینیان، لەبەر ئەوە دووڕووەکان فەرمانیان پێکرا بوو کە لە پێناو ئایندا بجەنگن، ئەگەر نەیانتوانی با لە پێناوی ماڵ‌و منداڵ‌و خاکیاندا بجەنگن، ﴿ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يَكْتُمُونَ ﴾ ئاشکرای دەکات بۆ بەندە بڕوادارەکانی‌و لەسەری سزای داون،

پاشان خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ قَالُواْ لِإِخْوَٰنِهِمْ وَقَعَدُواْ لَوْ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُواْ ﴾ دوو شتیان لەگەڵ یەکتردا کۆ کردەوە: دواکەتن لە جیهاد کردنو بیانووگرتنو بە درۆ خستنەوە بە قەزاو قەدەری خوا، خوا لە وەڵامدانەوەیاندا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ فَٱدْرَءُواْ ﴾ (واتە: ئەی موحەممەد پێیان بڵێ) بەرگری بکەن، ﴿ عَنْ أَنفُسِكُمُ ٱلْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٦٨﴾ ﴾ ئەوان ئەگەر بە گوێی ئێوەیان بکردایە نە دەکوژران، ئەوە لەدەسەڵاتی ئێوەدا نیە و ناتوانن بەرگری لێ بکەن. ئەم ئایەتانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە بەندەی خوا هەندێ جار نیشانەیەکی کوفرو نیشانەیەکی باوەڕی تێدا کۆ دەبێتەوە، هەندێ جار لە یەکێکیانەوە نزیکترە بە پێچەوانەی ئەوی تر.

(١٦٩-١٧٠): ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِٱلَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُواْ بِهِم مِّنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١٧٠﴾ يَسْتَبْشِرُونَ بِنِعْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضْلٍ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٧١﴾ ﴾

ئەم دەقە پیرۆزانە چاکەی شەهیدانو ڕێزی ئەوانی تێدایە، وە ئەو منەتو چاکەی کە خوا دایباراندوە بەسەریاندا، لە چوار چێوەی ئەوانەیشدا دڵدانەوەو سەرەخۆشی زیندووەکانە لەسەر کوژراوەکانیان، وە هاندانیان لەسەر کوشتار کردن لە پێناوی خواداو ڕووبەڕوو بونەوەی شەهیدی، وەک دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾ واتە: لە جیهاد کردنی دوژمنانی خوادا، تەنها مەبەستیان بەرز ڕاگرتنی وشەی خوا (لا إِلَه إلاَّ الله) بێت، ﴿ أَمْوَٰتًۢا ﴾ واتە: با نەیەت بە خەیاڵتدا، بە بیرتدا کە ئەوان مردوونو لەناوچوونو چێژی دنیایان لە دەست داوە، کە مرۆڤ خۆی لێی دەپارێزێت، بۆیە دەترسێت لە کوشتارو خۆی دەپارێزێت لە شەهیدی! ﴿ بَلْ ﴾ بەڵکو ئەوان بە دەستیان هێنا گەورەتر لەوەی کێبرکێکاران کێبرکێی لەسەر دەکەن، ئەوان: ﴿ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ ﴾ (زیندوون لە لای پەروەردگاریان) لەماڵی ڕێزداری پەروەرگاردان، وە وشەی: ﴿ عِندَ رَبِّهِمْ ﴾ بەرزی پلەو پایەیان دەگەیەنێت، وە نزیکیان لە پەروەردگاریان، ﴿ يُرْزَقُونَ ﴾ لە جۆرەها نیعمەت کە لە وەسف کردن نایەت، مەگەر تەنها خوا وەسفی بکات، لەگەڵ ئەمەدا، ﴿ فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ﴾ واتە: زۆر دڵخۆشو کامەرانو ئاسوودەن بەو نازو نیعمەتەی خوا پێی بەخشیون، ئەویش لەبەر جوانیو زۆریو گەورەیی بەهەشتە، وە ئەوپەڕی چێژ وەرگرتنە لە ناو بەهەشت، وە هیچ بەرەنگار بونەوەیەکی تێدا نیە، خوای گەورە دوو شتی بۆ کۆ کردنەوە ئەویش چێژ وەرگرتنی جەستە بە ڕزقو ڕۆزی زۆر چاک، وە چێژ وەرگرتنی دڵو ڕووح بەو خۆشیەی کە لە چاکەو فەزڵی خۆی پێی

بەخشیون، هەتا نازو نیعمەتو دڵخۆشی بۆ تەواو کردن، هەتا وایان لێ هات: ﴿ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِالَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُوا بِهِم مِّنْ خَلْفِهِمْ ﴾ هەندێکیان مژدە دەدەن بە هەندێکی تریان بە گەیشتنی براکانیان، ئەو برایانەی کە هێشتا پێیان نەگەیشتوون، بێگومان ئەوانیش بەو نازو نیعمەتە دەگەن کە براکانیان پێی گەیشتن.

﴿ أَلَّا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾ واتە: مژدە دەدەن بە لابردنی مەترسی لە سەریانو هیچ خەمو پەژارەیەکیان بۆ پێش نایەت، ﴿ يَسْتَبْشِرُونَ بِنِعْمَةٍ مِّنَ اللَّهِ وَفَضْلٍ ﴾ واتە: هەندێکیان مژدە دەدەن بە هەندێکی تریان گەورەترین مژدە، ئەویش بریتیە لە: نیعمەتو چاکەو ڕێزی پەروەردگاریان ﴿ وَأَنَّ اللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُؤْمِنِينَ ﴾ بەڵکو زیادی دەکات بە چەندین قات کە کۆششەکانیان هەرگیز پێی ناگات.

ئەم دەقانە خۆشی چێژی ژیانی بەرزەخ (دوای مردنی ژیانی نێو گۆڕ) دەسەلمێنن، وە شەهیدان بەرزترین پلەو پایەیان هەیە لە لای پەروەردگاریان، وە بە هەمان شێوە بەڵگەیە لەسەر گەیشتنی ڕووحی بروادارانی چاکەخواز بە یەکتری، وە چاکەی هەندێکیان بەسەر یەکترەوە، وە مژدە دانی هەندێکیان بە هەندێکیان.

(١٧٢-١٧٥): ﴿ الَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِلَّهِ وَالرَّسُولِ مِن بَعْدِ مَا أَصَابَهُمُ الْقَرْحُ ۚ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا مِنْهُمْ وَاتَّقَوْا أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٢﴾ الَّذِينَ قَالَ لَهُمُ النَّاسُ إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُوا لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَانًا وَقَالُوا حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ ﴿١٧٣﴾ فَانقَلَبُوا بِنِعْمَةٍ مِّنَ اللَّهِ وَفَضْلٍ لَّمْ يَمْسَسْهُمْ سُوءٌ وَاتَّبَعُوا رِضْوَانَ اللَّهِ ۗ وَاللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَظِيمٍ ﴿١٧٤﴾ إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ الشَّيْطَانُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَاءَهُ فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧٥﴾ ﴾:

کاتێک کە پێغەمبەر ﷺ لە جەنگی ئوحود گەڕایەوە بۆ مەدینە، بیستی کە ئەبو سوفیانو ئەوانەی لەگەڵیدان لە بت پەرستان دەیانەوێت بگەڕێنەوە بۆ شاری مەدینە، فەرمانی بە هاوەڵانی کرد بە دەرچوون، ئەوانیش دەرچوون لەگەڵیدا، لەسەر ئەو برینەی کە پێیانەوە بوو، بۆ وەڵامدانەوەی خواو پێغەمبەرەکەی، هەتا گەیشتنە (حمراء الأسد) دواتر کەسێک هات بۆ لایانو پێی وتن: ﴿ إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُوا لَكُمْ ﴾ (خەڵک بۆتان کۆبوونەتەوە) دەیانەوێت لە ڕیشە دەرتان بهێننو لە ناوتان بەرن، بە شێوەیەکی ترس ئامێز، بەڵام ئەو قسەیە هیچ کاریگەریەکی نەبوو جگە لەوە نەبێت کە ئیمانیان زیاتر دامەزراو چاکتر پشتیان بە خوای گەورە بەست، ﴿ وَقَالُوا حَسْبُنَا اللَّهُ ﴾ واتە: (وتیان:) خوامان بەسە، ﴿ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ ﴾ ئەو باشترین یارمەتیدەر (و کارپێ سپێردراوە)، کە دەسەڵاتی هەیە بەسەر ڕێکخستنو بەرژەوەندی کاروباری بەندەکانی،

فَانقَلَبُواْ بِنِعۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضۡلٖ لَّمۡ يَمۡسَسۡهُمۡ سُوٓءٞ وَٱتَّبَعُواْ
رِضۡوَٰنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضۡلٍ عَظِيمٍ ﴿١٧٤﴾ إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ
يُخَوِّفُ أَوۡلِيَآءَهُۥ فَلَا تَخَافُوهُمۡ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿١٧٥﴾
وَلَا يَحۡزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡكُفۡرِۚ إِنَّهُمۡ لَن يَضُرُّواْ ٱللَّهَ
شَيۡـٔٗاۗ يُرِيدُ ٱللَّهُ أَلَّا يَجۡعَلَ لَهُمۡ حَظّٗا فِي ٱلۡأٓخِرَةِۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ
عَظِيمٌ ﴿١٧٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلۡكُفۡرَ بِٱلۡإِيمَٰنِ لَن يَضُرُّواْ ٱللَّهَ
شَيۡـٔٗاۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١٧٧﴾ وَلَا يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّمَا
نُمۡلِي لَهُمۡ خَيۡرٞ لِّأَنفُسِهِمۡۚ إِنَّمَا نُمۡلِي لَهُمۡ لِيَزۡدَادُوٓاْ إِثۡمٗاۖ وَلَهُمۡ
عَذَابٞ مُّهِينٞ ﴿١٧٨﴾ مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ عَلَىٰ مَآ أَنتُمۡ
عَلَيۡهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلۡخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُطۡلِعَكُمۡ
عَلَى ٱلۡغَيۡبِ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَجۡتَبِي مِن رُّسُلِهِۦ مَن يَشَآءُۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ
وَرُسُلِهِۦۚ وَإِن تُؤۡمِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَلَكُمۡ أَجۡرٌ عَظِيمٞ ﴿١٧٩﴾ وَلَا يَحۡسَبَنَّ
ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ هُوَ خَيۡرٗا لَّهُمۖ
بَلۡ هُوَ شَرّٞ لَّهُمۡۖ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُواْ بِهِۦ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ وَلِلَّهِ
مِيرَٰثُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ﴿١٨٠﴾

﴿ فَانقَلَبُواْ ﴾ واتـە: ئنجـا مسـوڵمانان گەڕانـەوە، ﴿ بِنِعۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضۡلٖ لَّمۡ يَمۡسَسۡهُمۡ ﴾، پاشـان هـەواڵ گەیشـت بـە بت پەرسـتەکان کە پێغەمبـەرو هاوەڵەکانی دەرچـوون بۆ گیانیان، وە پەشـێمان بوویەوە ئـەوەی کە دواکـەوت لە بـڕواداران، خوای گـەورە ترسـی خسـتە نـاو دڵیانـەوە، هەتا گەڕانـەوە بۆ شـاری مەککە، وە بـڕواداران بـە نیعمـەتو فەزڵـی خـوا گەڕانـەوە، کـە خـوا منەتـی خـۆی کـرد بەسـەریاندا بەسـەرکەوتن لەو دەرچوونەی بەو حاڵەوەو پشـت بەسـتنیان بە پەروەردگاریان، پاشـان خـوای گەورە پاداشـتی غەزایەکـی تەواوی پێیـان بەخشـی، بە هـۆی ئەوەی بـە چاکی گوێڕایەڵـی پەروەردگاریـان کـرد، وە خۆیـان پاراسـت لە سـەرپێچی کردنی، پاداشـتێکی گەورەیـان هەیـە، ئەوەیـش فـەزڵو گەورەیـی خوایە لەسـەریان.

پاشـان خـوای گـەورە دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ يُخَوِّفُ أَوۡلِيَآءَهُۥ ﴾ بـە ڕاسـتی ئـەو کەسـەی لـە بـت پەرسـتان کـە ویسـتی بـڕواداران بترسـێنێت، وتی: بە ڕاسـتی ئـەوان بۆ ئێـوە خۆیـان کـۆ کردوەتـەوە، بانگ کەرێـک بوو لـە بانگ کەرانی شـەیتان، (شـەیتان) دۆسـتانی خۆی دەترسـێنێت، ئەوانەی کـە ئیمانیان نیە، یـان لاوازە، ﴿ فَلَا تَخَافُوهُمۡ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴾ واتـە: لـە بت پەرسـتان مەترسـن دۆسـتەکانی شـەیتان، چونکـە تەختی نێوچاوانیـان بـە دەسـتی خوایـە، هیچ ناکەن بە ویسـتی خـوا نەبێـت، بەڵکو لە خوا بترسـن کـە دۆسـتانی خۆی سـەر دەخـات، ئەوانـەی کە لێـی دەترسـنو فەرمانبـەرداری دەکەن.

ئـەم دەقە ترسـان لە خـوای تـاکو تەنهـا پێویسـت دەکات، وە یەکێکە لە پێویسـتیەکانی ئیمـان، بـە پێـی ئیمان بەنـدە لە خـوا ترسـانی لـە دڵ دەبێت، وە ترسـی چـاک ئەوەیە کە ڕێگـری بکات لـە بڕوادار خـۆی لـە قەدەغە کـراوەکان بپارێزێت.

(١٧٦-١٧٧): ﴿ وَلَا يَحْزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلْكُفْرِۚ إِنَّهُمْ لَن يَضُرُّوا۟ ٱللَّهَ شَيْـًٔاۗ يُرِيدُ ٱللَّهُ أَلَّا يَجْعَلَ لَهُمْ حَظًّا فِى ٱلْـَٔاخِرَةِۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱشْتَرَوُا۟ ٱلْكُفْرَ بِٱلْإِيمَٰنِ لَن يَضُرُّوا۟ ٱللَّهَ شَيْـًٔا وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٧٧﴾ ﴾:

پێغەمبەر ﷺ سوور بوو لەسەر ڕێنمایی دروستکراوەکانو زۆر هەوڵی دەدا، ئەگەر هیدایەتیان وەر نەگرتبایە خەمبار دەبوو، خوای گەورە فەرمووی: ﴿ وَلَا يَحْزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلْكُفْرِ ﴾ لە زۆر حەز لێکردنیانو سووربوونیان لەسەر بێبڕوای ﴿ إِنَّهُمْ لَن يَضُرُّوا۟ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ﴾ چونکە خوا سەرخەری ئاینی خۆیەتی، وە پشتگیری تەواو لە نێردراوەکەی دەکات، بەبێ ئەوان فەرمانی خۆی جێبەجێ دەکات، کەواتە: گوێیان مەدەرێو دڵت پێیان خۆش نەبێت، تەنها خۆیان زەرەرمەندنو کۆشش دەکەن بۆ ئەوەی زیان بە خۆیان بگەیەنن، بە لە دەستدانی ئیمان لە دنیاداو بە دەست هێنانی سزای سەخت لە ڕۆژی دواییدا، لەبەر بێ نرخیو بە کەم زانینیان لە لای خوا، وە ویستی خوا لەسەر ئەوەیە کە هیچ پاداشتێکیان نەبێت لە ڕۆژی دواییدا، سەرشۆڕی کردوونو سەرکەوتووی نەکردوون لە بەرانبەر ئەوەدا دۆستانی سەربەرز کردوە، وە هەر کەسێک خوا خێری بوێت بە دادپەروەریو حیکمەتی خۆیەتی، وە دەزانێت ئەوانە هیدایەت وەرناگرن، وە قبووڵی ڕێ پێشاندان ناکەن، لەبەر خراپی خو ڕەوشتیانو خراپی نیەتەکانیان.

پاشان خوای گەورە هەواڵ دەدات ئەوانەی کە کوفرو بێبڕواییان هەڵبژارد بەسەر ئیمان هێنان، زیان بە خوا ناگەیەنن، وە حەزیان لێیەتی بە حەز لێکردنێک، وەک کەسێک چۆن حەز لە شتێک بکات ئامادەیە بە پارەش بێت بیکڕێت، ﴿ لَن يَضُرُّوا۟ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ﴾ چۆن زیان بە خوا دەگەیەنن کە ئەوان ئەوپەڕی کەمتەرخەمیان دەکرد لە بڕوا هێناندا، وە ئەوپەڕی حەزیان لە بێبڕوایی دەکرد بە پەروەردگاری خاوەن بەزەیی؟! خوا پێویستی بەوان نیە. بێگومان بۆ سەرخستنی ئاینەکەی بەندەگەلێکی پاکو پاڵفتەی هەن، جگە لەوان، وە بۆسەرخستنی ئاینەکەی ئامادەی کردوە، ئەو کەسەی کە پێی ڕازییە لە بروادارییی، هەروەها خاوەنی عەقڵ سالاریو بەهێزییە، وەک خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ قُلْ ءَامِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوْ لَا تُؤْمِنُوٓا۟ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ مِن قَبْلِهِۦٓ إِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ سُجَّدًا ﴿١٠٧﴾ ﴾الإسراء.

(١٧٨): ﴿ وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّمَا نُمْلِى لَهُمْ خَيْرٌ لِّأَنفُسِهِمْۚ إِنَّمَا نُمْلِى لَهُمْ لِيَزْدَادُوٓا۟ إِثْمًاۚ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٧٨﴾ ﴾:

واتــە: هەرگیــز ئەوانــەی کوفریــان کــردوە بــە پەروەردگاریــانو ئاینەکەیان پشــت گوێ خســتووەو دژایەتــی پێغەمبەرەکەیــان کردوە بــا وا گومان نەبــەن، کە ئێمە لە دنیــادا وازمان لــێ هێنــاونو تۆڵەیان لێناکەینــەوەو مۆڵەتمان داون خێــری تێدایە بۆیانو خۆشــمان دەوێن! نەخێــر وانیــە، بــەو شــێوەیە نیــە کە ئــەوان گومــان دەبــەن، بەڵکــو ئەوە بــۆ شــەڕێکە خوا دەیەوێــت بۆیــان بەرپــا بکات، وە ســزادانی زیاتــرەو تۆڵەیە بۆیــان، لەبەر ئەمــە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا نُمۡلِي لَهُمۡ لِيَزۡدَادُوٓاْ إِثۡمٗاۚ وَلَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ﴾ خوای گەورە مۆڵەتی ســتەمکار دەدات هەتــا ســتەمی زۆر دەبێــت، وە بێبڕواییــان یەک لە دوای یــەک دەبێت، هەتا ئەگــەر ڕاپێچی کــرد بــە ڕاپێچکردنێکــی زاڵو بــە توانــا، دەی بــا بــە ئاگابــن ســتەمکارەکان لــە مۆڵــەت پێدانیــان، بــا وا گومــان نەبــەن لە ژێر دەســتی خــوا ڕزگاریــان دەبێت.

(١٧٩): ﴿مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ عَلَىٰ مَآ أَنتُمۡ عَلَيۡهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلۡخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُطۡلِعَكُمۡ عَلَى ٱلۡغَيۡبِ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَجۡتَبِي مِن رُّسُلِهِۦ مَن يَشَآءُۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۚ وَإِن تُؤۡمِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَلَكُمۡ أَجۡرٌ عَظِيمٞ ١٧٩﴾:

واتــە: حیکمەتــی خــوا بــەو شــێوە نیــە کــە واز لــە بــڕواداران بهێنێت هــەر وەکــو ئەوەی ئێســتا ئێــوە لەســەرین (دڵســۆزو دڵــڕەش) پیــسو پــاک، بەبــێ جیاکردنەوە، هەتــا پیسو پــاک لە یــەک جیا بکاتــەوە، وە بڕوادار لــە دووڕوو، درۆزن لە ڕاســتگۆ، بە هــۆی جۆرەها تاقیکردنەوەو پێشــهاتەوە.

وە بــە هەمان شــێوە لــە حیکمەتی خوا نیــە، کە غەیبو پەنهان ئاشــکرا بکات بــۆ بەندەکانی، حیکمەتــی خــوا بــەو شــێوەیە کــە بەندەکانی تاقــی بکاتــەوەو تووشــی بەڵایان بــکات هەتا پیــس لــە پاک جیــا دەکاتــەوە، بە جۆرەهــا بــەڵاو تاقیکردنەوە، خــوای گــەورە پێغەمبەرانی نــاردووە فەرمانــی کردوە بــە گوێڕایەڵــی کردنیان، ملکــەچ بوون بۆیــانو بــاوەڕ پێهێنانیان، وە پەیمانــی داوە لەســەر ئیمانــدارانو لە خواترســان بە پاداشــتی گەورە، ئنجــا خەڵکی بە پێی شــوێنکەوتنیان بۆ پێغەمبــەران کردوە بە دوو بەشــەوە: گوێڕایەڵی کارانو ســەرپێچی کاران، بــڕوادارانو دووڕووەکان، مســوڵمانانو بێبڕوایــان، لەبــەر ئــەوە ڕێکــی بخات بۆیان لەســەر پاداشــتو ســزا، وە هەتا دادگەریو چاکەو حیکمەتی بۆ دروســتکراوەکان ئاشــکرا بکرێت.

(١٨٠): ﴿وَلَا يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ هُوَ خَيۡرٗا لَّهُمۖ بَلۡ هُوَ شَرّٞ لَّهُمۡۖ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُواْ بِهِۦ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ١٨٠﴾:

واتــە: بــا ئەوانــەی وا ڕەزیلی دەکــەن وا گومان نەبەن، واتــە: دەیگرنەوە ئــەوەی کە لە لایانە کــە خــوا پێی بەخشــیون بــە چاکەی خــۆی، لــە مــاڵو ســامانو ناوبانگو زانســتو جگە لەوانــە، وە فەرمانــی پێکــردوون لــە جێگــای خۆیدا بەکاریــان بهێنــن بەبێ ئــەوەی زیان لە بەندەکانــی بــدەن، ئەوان ڕەزیلــی لێ دەکــەنو دەیگرنەوە، دەیشــارنەوە لــە بەندەکانی خوا، وا گومــان دەبــەن ئــەوە خێــری تێدایــە بــۆ ئــەوان، نەخێــر، بەڵکو شــەڕی تێدایە بــۆ دینو دنیایــان، لــە ئیســتاو لــە داهاتــودا، ﴿ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا۟ بِهِۦ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ﴾ واتــە: ئەوەی کــە ڕەزیلــی پێدەکەن دەبێتە کــۆت لە گەردنیانــدا، ســزای پێدەدرێن، وەک لــە فەرموودەی صەحیحــدا هاتوە: {عَـنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُـولُ اللّـهِ ﷺ: «مَنْ آتَاهُ اللَّـهُ مَالاً، فَلَمْ يُـؤَدِّ زَكَاتَهُ، مُثِّـلَ لَـهُ مَالُـهُ يَـوْمَ الْقِيَامَةِ شُـجَاعًا أَقْرَعَ، لَهُ زَبِيبَتَـانِ يُطَوَّقُهُ يَـوْمَ الْقِيَامَةِ، ثُـمَّ يَأْخُذُ بِلِهْزِمَتَيْـهِ، (يَعْنِي: شِـدْقَيْهِ)، ثُـمَّ يَقُـولُ: أَنَـا مَالُكَ، أَنَـا كَنْزُكَ»، ثُـمَّ تَـلا: ﴿ وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ ﴾» (رَوَاهُ أَحْمَد برقـم: (٨٦٤٦)، وَالبُخَـارِيُّ برقـم: (١٤٠٣)، وَالنَّسَـائِي فِي (الكُبرى) برقم: (٢٢٦١)}.

واتــە: ئەبــو هوڕەیــرە خــوا لێــی ڕازی بــێ، دەڵــێ: پێغەمبــەری خــوا ﷺ فەرموویەتــی: هەر کەســێک خــوا مــاڵو ســامانێکی پێبــدات، زەکاتەکەی لێنــەدات، لــە ڕۆژی دوایــی دا ئەو مــاڵو ســامانەی کــە زەکاتــی لێنەداوە بــۆی دەبێتــە نێــرە مارێکی کەچــەڵ. (ئــەو مارانەی کەچەڵــنو تووکــی ســەریان نیــە، ژەهرەکەیــان زۆر پیســە)، دوو خاڵــی ڕەشــی لە پشــت چاویەتــی (هەروەهــا ئەو مارانــەی کە خاڵــی ڕەش لە پشــت چاویانە ژەهریان زۆر پیســە)، ئــەو مــارە لــە گەردنــی دەئاڵێ لــە ڕۆژی دوایــی دا، پاشــان شــەویلگەکانی دەگــرێ (یانی کــە لــە ملی ئــاڵا، ئنجــا پــارووی لــە هــەردوو شــەویلگەکانی دەدات) دوایــی پێــی دەڵێ: مــن ماڵەکەتــم، مــن خەزنەکەتــم (واتە: ئەو ماڵــەم کە خەزنــت دەکــردمو کۆتدەکردمەوە) دواییــش ئــەو ئایەتــەی خوێنــدەوە: ﴿ وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ ﴾، ئەوانە پێیــان وا بوو کە چرووکیەکەیان ســوودی دەبێت بۆیانو ســەربەرز دەبــن، بەڵام کارەکــە پێچەوانە بوویەوە، وە بــوو بــە گەورەترین زیــانو هۆکاری ســزادانیان.

﴿ وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ واتــە: خــوای گــەورە خاوەنــی هەمــوو موڵکێکــە، وە هەمــوو موڵــکو ســامانێک بــۆ لای خاوەنەکــەی دەگەڕێتــەوە، بەنــدەکان هیچیــان بــە دەســتەوە نامێنێــت، نــە درەمو نــە دینار، وە نە هیچ شــتێک لــە ماڵو دارایــی، وەک خوا ﷻ دەفەرمــوێ: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَرِثُ ٱلْأَرْضَ وَمَنْ عَلَيْهَا وَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ ﴿٤٠﴾ ﴾مریــم، ســەرنج بــدەو بزانە چــۆن باســی هــۆکاری ســەرەتاییو هــۆکاری کۆتایــی دەکات، هەر یــەک لــەو دووانە وا

پێویسـت دەکات یـان وا بـە مـرۆڤ دەفەرمـوێ: کـە ڕەزیلی نـەکات لەو شـتەی کە خوا پێی دەبەخشـێت.

سـەرەتا هەواڵـی داوە: ئـەوەی کە لـە لای بەندەیەو لە دەسـتیدایە فـەزڵو چاکـەو نیعمەتی خوایـە، موڵکـی بەنـدە نیە، بەڵکـو ئەگەر فـەزڵو چاکەی خـوا نەبێت بەسـەریەوە، هەرگیز پێـی ناگـات، وەگرتنـەوەی ئـەو ماڵە ئـەوە دەگەیەنێـت فەزڵو چاکـەی خـوا دەگرێتەوە، وە لەبـەر ئـەوە چاکـە کردنـی خـوا چاکـە کـردن پێویسـت دەکات لەگـەڵ بەندەکانیدا، وەک خـوای گـەورە دەفەرمـوێ: ﴿ وَأَحْسِن كَمَآ أَحْسَنَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ ﴾القصـص، ئەگـەر هەرکەسـێک بزانێـت ئەوەی لە دەسـتی دایـە چاکەو فەزڵی خوایە، بەربەسـتی ئـەو چاکەیە نـاکات کـە زیانی نەبێت بـۆی، بەڵکو سـوودی دەبێت بـۆ دڵو ماڵو سـامانیو زیادکردنی ئیمانیو پاراسـتنی لـە بـەڵاو موصیبەتەکان.

پاشـان باسـی دووەمـی کردوە ئـەوەی کە بـە دەسـتی بەندەکانـە هەمـووی دەگەڕێتەوە بۆ لای خـواو، هـەر بۆ خـوای بـەرزە، بێگومان ئـەو باشـترینی میراتگرانـە، هیـچ مانایەک بۆ ڕەزیلـی نیـە بە هیچ شـێوەیەک، هەمـوو دەڕواتو لـە دەسـتت دەچێـت، دەگوازرێتەوە بۆ لای کەسێکی دی.

پاشـان باسـی سـێیەمی کردوە کە هۆکاری پاداشـتیە دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴾ ئەگـەر خـوا شـارەزا بێت بـە کردەوەکانتـان بە گشـتی، کەواتـە: دەبێت لەسـەر کردەوەی چـاک پاداشـت بداتـەوەو لەسـەر کـردەوەی خراپیش سـزا بدات، هەر کەسـێک مسـقاڵە زەڕەیـەک ئیمانـی هەبێـت لـە بەخشـین دوا ناکەوێت کە پاداشـتی لەسـەر دەدرێتـەوە، وە ڕازی نابێـت بـە خۆگرتنـەوە لـە بەخشـین کە بـە هۆیەوە سـزا دەدرێت.


لَقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ
سَنَكْتُبُ مَا قَالُواْ وَقَتْلَهُمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَنَقُولُ
ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿١٨١﴾ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ
وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿١٨٢﴾ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ
عَهِدَ إِلَيْنَآ أَلَّا نُؤْمِنَ لِرَسُولٍ حَتَّىٰ يَأْتِيَنَا بِقُرْبَانٍ
تَأْكُلُهُ ٱلنَّارُ ۗ قُلْ قَدْ جَآءَكُمْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِى بِٱلْبَيِّنَٰتِ
وَبِٱلَّذِى قُلْتُمْ فَلِمَ قَتَلْتُمُوهُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ
﴿١٨٣﴾ فَإِن كَذَّبُوكَ فَقَدْ كُذِّبَ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ جَآءُو
بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُنِيرِ ﴿١٨٤﴾ كُلُّ نَفْسٍ
ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ۗ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۖ
فَمَن زُحْزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدْخِلَ ٱلْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ ۗ وَمَا
ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلْغُرُورِ ﴿١٨٥﴾ ۞ لَتُبْلَوُنَّ فِىٓ
أَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ
ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓاْ أَذًى كَثِيرًا ۚ
وَإِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿١٨٦﴾

(١٨١-١٨٢): ﴿ لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ ۘ سَنَكْتُبُ مَا قَالُواْ وَقَتْلَهُمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَنَقُولُ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿١٨١﴾ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿١٨٢﴾ ﴾:

خوای گەورە هەواڵ دەدات دەربارەی یاخیو سەرکێشەکان، ئەوانەی کە خراپترینو ناشرینترینو چەپەڵترین قسەیان کرد (وتیان: خوا هەژارەو ئێمە دەوڵەمەندین) بێگومان خوای گەورە دەینوسێتو دەیپارێزێت لەگەڵ کردەوە ناشرینەکانیاندا ئەویش بریتیە لە: کوشتنی پێغەمبەران، وە لە داهاتوویەکی زۆر نزیکدا سزایان دەدات بە توندترین سزا، بێگومان بەو جولەکە دەغەڵانە دەوترێ لە بری ئەوەی کە وتویانە: (خوا هەژارەو ئێمە دەوڵەمەندین) ﴿ وَنَقُولُ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴾ سزای سووتێنەر کە جەستەیان دەبڕێت تا دەگاتە دڵەکانیان، بێگومان سزادانیان ستەم کردن نیە لێیان لە لایەن خوای مەزنەوە، چونکە بەڕاستی ﴿ لَيْسَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿١٨٢﴾ ﴾ خوای گەورە پاکو بێگەردە لە هەموو ستەم لێکردنێک. ئەو سزایە تەنها بۆ ئەوەیە کە جوولەکەکان ڕیسوایی سەرشۆڕیان بۆ خۆیان پێشخستووە، کە پێویست بکات سزا بدرێنو بێبەش بکرێن لە پاداشت.

توێژەرەوانی قورئان باسی ئەوەیان کردوە کە ئەم دەقە لەسەر قەومێک لە جوولەکە دابەزیوە، لەوانە: (فنحاص بن عازوراء) کە سەرۆکی زاناکانی جوولەکە بوو لە مەدینە، وە ئەو کاتێک ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەی بیست: ﴿ مَّن ذَا ٱلَّذِى يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا ﴿٢٤٥﴾ ﴾البقرة، وە کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَقْرَضُواْ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا ﴿١١﴾ ﴾الحديد، ئەو قسەی لە ڕووی لووت بەرزیو خۆ بە گەورە زانیيەوە کردوە، خوا ناشرینی بکات، خوا دەربارەیان، دەدوێت کە ئەوان لە شتی خراپدا داهێنان دەکەن، لەگەڵ ئەوەدا ئەوان لەو بوارەدا هاوشێوەی ئەو کارە قێزەونە پێشینەیان هەیە، بێگومان ئەوەش هەروەک کارەکانی دیکەیان وایە، وەک دەفەرموێ: ﴿ وَقَتْلَهُمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ

﴿ بِغَيۡرِ حَقّٖ ﴾ مەبەست لەم وابەستە کردنە، ئەوەیە ئەوان وێرایان دەستیان بچێتە خوێنی پێغەمبەران لەگەڵ ئەوەدا باش دەیانزانی چەندە کارێکی قێزەونو خراپ ئەنجام دەدەن، لە نەفامیان نەبوو، وە لە گومڕایی‌و سەر لێشوانیشیاندا نەبوو، بەڵکو لە یاخی بوونو نکووڵی‌و سەرسەختیاندا بوو.

(١٨٣-١٨٤): ﴿ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ عَهِدَ إِلَيۡنَآ أَلَّا نُؤۡمِنَ لِرَسُولٍ حَتَّىٰ يَأۡتِيَنَا بِقُرۡبَانٖ تَأۡكُلُهُ ٱلنَّارُۗ قُلۡ قَدۡ جَآءَكُمۡ رُسُلٞ مِّن قَبۡلِي بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَبِٱلَّذِي قُلۡتُمۡ فَلِمَ قَتَلۡتُمُوهُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ١٨٣ فَإِن كَذَّبُوكَ فَقَدۡ كُذِّبَ رُسُلٞ مِّن قَبۡلِكَ جَآءُو بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُنِيرِ ١٨٤ ﴾:

خوای گەورە هەواڵ دەدات دەربارەی حاڵی ئەو بوختانکارانە کە دەیانوت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَهِدَ إِلَيۡنَآ ﴾ واتە: خوا پەیمانی داوە بە ئێمەو وەسیەتی بۆ کردووین کە: ﴿ أَلَّا نُؤۡمِنَ لِرَسُولٍ حَتَّىٰ يَأۡتِيَنَا بِقُرۡبَانٖ تَأۡكُلُهُ ٱلنَّارُ ﴾ (جولەکەکان) دوو شتیان پێکەوە کۆ کردەوە، درۆ کردن بە ناوی خوای گەورەوەو، وە کورت هەڵهێنانی نیشانەی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەران، لە شێوەی ئەم بوختانە روونە، وە ئەوان ئەگەر بڕوا بە پێغەمبەرێک نەکەن ئەوە خوا قوربانیەکەیان بۆ ناهێنێتە خوارەوە ئاگر بیسوتێنێت، ئەوان لەوەدا فەرمانبەرداری پەروەردگاریانن، پابەندن بە پەیمانەکانیەوە، بێگومان زانراوە هەر پێغەمبەرێک کە خوا ناردبێتی پشتیوانی کردوە بە نیشانەی روونو ئاشکراو بەڵگەدار خەڵکی لەسەر ئەو شێوەیە بڕوایان هێناوە، کورتی نەکردوەتەوە لەسەر ئەوەی کە (جوولەکەکان) باسی لێوە دەکەن، لەگەڵ ئەمەدا بەڕاستی بوختانێکیان وتووە پابەند نەبوون پێیەوەو قسەیەکی پووچو بێ مانایان کردوەو کاریان پێنەکردوە، لەبەر ئەوە خوا فەرمان بە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکات کە پێیان بڵێ: ﴿ قُلۡ قَدۡ جَآءَكُمۡ رُسُلٞ مِّن قَبۡلِي بِٱلۡبَيِّنَٰتِ ﴾ (پێغەمبەرانی پێش من بە نیشانەو بەڵگەوە هاتن بۆ لاتان کە) بەڵگەو نیشانەن لەسەر ڕاستگۆییان، ﴿ وَبِٱلَّذِي قُلۡتُمۡ ﴾ بەوەی کە هات بۆتان ئاگر بیخوات، ﴿ فَلِمَ قَتَلۡتُمُوهُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴾ واتە: لە بانگەشە کردنیان بە بڕوا هێنان بەو پێغەمبەرەی کە دێت بە قوربانیەکەوە کە ئاگر دەیخوات، بەڕاستی بەمە ڕوون بوویەوە، درۆکەیانو نکووڵی‌و قسە دژ یەکەکانیان.

پاشان دڵی پێغەمبەرەکەی ﷺ دەداتەوە دەفەرموێ: ﴿ فَإِن كَذَّبُوكَ فَقَدۡ كُذِّبَ رُسُلٞ مِّن قَبۡلِكَ ﴾ واتە: ئەمە سروشتی ستەمکارانە، وە پیشەیان ئەوەیە کە بێبڕوایی دەکەن بە خواو پێغەمبەرەکانیانو بە درۆیان دەخەنەوە، بە دۆرخستنەوەی پێغەمبەرانیان لە بەر ئەوە نیە کە پێغەمبەران کەم تەرخەمبوون، یان بەڵگەی ڕوونکەرەوەیان لەبەر دەستدا نەبوو، بەڵکو بەڕاستی ﴿ جَآءُو بِٱلۡبَيِّنَٰتِ ﴾ واتە: بە بەڵگەی عەقڵی‌و سەلماندنی نەقڵی (دەق)، ﴿ وَٱلزُّبُرِ ﴾ کتێبی

ڕوونکراوەو دابەزێنراو لە ئاسمانەوە، کە کەس ناتوانێت بیهێنێت جگە لە پێغەمبەران نەبێ، ﴿وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُنِيرِ﴾ بۆ حوکمو دەقە شەرعیەکان، وە ڕوون کردنەوەی هەموو شتە جوانەکان کە عەقڵ دەیگرێتە خۆ، وە ڕووناک کەرەوەیە بە هەمان شێوە بۆ هەواڵە ڕاستەکان، ئەگەر ئەمە خووو پیشەیان بێت بۆ هەموو پێغەمبەران کە ئەمە وەسفەکەیانە، کەواتە: با کاروباری ئەوان خەمبارو بێتاقەتت نەکاتو گرنگی مەدە بە بارو دۆخیان.

(١٨٥): ﴿كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۗ وَإِنَّمَا تُوَفَّوۡنَ أُجُورَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۖ فَمَن زُحۡزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدۡخِلَ ٱلۡجَنَّةَ فَقَدۡ فَازَۗ وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلۡغُرُورِ ١٨٥﴾:

ئەم دەقە پیرۆزە باس لە خۆگرتنەوە لە دنیاو نەمانی دەکات کە بۆ هیچ کەس نامێنێتەوە، وە ئارزووەکی فریودەرە، بە زرقو بریقی تووشی فیتنە دەکرێتو پێی هەڵدەخەڵەتێنرێت، وە بە جوانیەکانی یاخی دەکرێت، پاشان دونیا دەگوازرێتەوە، وە بەجێدەهێڵرێت بۆ شوێنی نیشتەجێ بوونی هەمیشەیی، کە کەسەکان لەسەر کردەوەکانیان پاداشت وەردەگرن لەم دنیایەدا لە چاکەو خراپە، ﴿فَمَن زُحۡزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ﴾ واتە: سەرکەوتنی بە دەست هێنا لە ئاگری دۆزەخو گەیشتن بە بەهەشتەکانی پڕ لە نازو نیعمەت کە (شتی وای) تێدایە چاو نەیبینیوەو گوێ نەیبیستووەو بە خەیاڵیشدا نەهاتووە، مانای دەقەکە ئەوەیە کە هەر کەسێک دوور نەخرێتەوە لە ئاگری دۆزەخ، وە نەچێتە بەهەشتەوە، ئەوە سەرکەوتوو نەبووە، بەڵکو بۆ هەتا هەتایی تیاچووە، وە بۆ هەتا هەتایە سزا دەدرێت.

وە لەم دەقەدا ئاماژەیەکی جوانو سەرنجڕاکیش هەیە بۆ خۆشیو ناخۆشی ژیانی دوای مردن (بەرزەخ)، وە بە دڵنیایی ئەوان کاریان ئەنجامداوە هەندێ پاداشت دەدرێنەوە بە بۆنەی کردارەکانیانەوە، وە نموونەیەکیان پێشکەش دەکەن بە پێی ئەوەی کە ڕابردووە، ئەمە تێدەگەین لە ڕستەی: ﴿وَإِنَّمَا تُوَفَّوۡنَ أُجُورَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾ واتە:بە تەواوی پاداشتی کردەوەکانتان پێ دەدرێ، ئەمەش تەنها لە ڕۆژی دواییدا دەبێ، بەڵام بە هەمان شێوە لە خوار ئەوەوە لە پاش مردن لە ژیانی بەرزەخ پاداشت وەردەگرن. هەندێ جار پێش دەکەوێت لە دنیادا وەک خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡأَدۡنَىٰ دُونَ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡأَكۡبَرِ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ٢١﴾ السجدة.

(١٨٦): ﴿لَتُبۡلَوُنَّ فِيٓ أَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡ وَلَتَسۡمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُوٓاْ أَذٗى كَثِيرٗاۚ وَإِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ذَٰلِكَ مِنۡ عَزۡمِ ٱلۡأُمُورِ ١٨٦﴾:

خوای گەورە پەیام دەداتو قسە لەگەڵ بڕواداراندا دەکات کە بێگومان لە داهاتوویەکی نزیکدا تاقی دەکرێنەوە لە ماڵەکانیان، لەو خەرجیانەی کە پێویستەو چاکە، وە بە هەمان شێوە لە ڕووبەڕووبونەوەی لە ناو چوونی ماڵەکانیان لە ڕێگای خوادا، وە نەفەسو ڕووحیان لە سەپاندن، بە سەپاندنی بارە قورسەکان لەسەر زۆربەی خەڵکی، وەک جیهادو تێکۆشان لە ڕێگای خوادا، وە ڕووبەڕووبونەوەی نارەحەتیو کوشتنو بە دیل گرتنو بریندار بوون، وە ئەو نەخۆشیانەی کە تووشی دەبێت لە نەفسیدا، یان ئەو کەسانەی کە خۆشی دەوێن.

دەفەرموێ: ﴿ وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟ أَذًى كَثِيرًا ﴾ لە تانەدان لێتان، وە لە ئاینەکەتان، وە لە قورئانەکەتان، وە لە پێغەمبەرەکەتان، ئەم پەیامە بۆ بەندە بڕوادارەکان چەندین سوودی هەیە:

لەوانە: حیکمەتی خوا وا پێویست دەکات، هەتا بڕواداری ڕاستگۆ لە ناڕاستگۆ جیا بکرێتەوە.

لەوانە: خوای گەورە ئەم بەڵایانەیان بە سەر دێنێ، چونکە دەیەوێت خێرو پلەو پایەیان پێ ببەخشێتو پاکیان بکاتەوە لە تاوان، وە بە هۆی ئەوەوە بڕوایان بەهێز بکاتو دڵنیاییان لەلا دروست بکات.

بێگومان خوا هەواڵی دەربارەی ئەوە پێداون، وەک دەفەموێ: ﴿ قَالُوا۟ هَٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ ۚ وَمَا زَادَهُمْ إِلَّآ إِيمَٰنًا وَتَسْلِيمًا ﴿٢٢﴾ ﴾ الأحزاب.

لەوانە: خوای گەورە هەواڵی پێداون بۆ ئەوەی دەروونیان لەسەر ئەوە ڕابێت، وە ئارام بگرن ئەگەر ڕوویدا، چونکە خۆیان بۆ ئەوە ئامادە دەکەن، ئەوکات هەڵگرتنی چارەسەری ئاسان دەبێت، وە پەنا دەبەنە بەر ئارامگرتنو لە خوا ترسان، لەبەر ئەمەیە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ ﴾ ئەگەر ئارام بگرن لەسەر تیاچوونی ماڵو داراییو ڕووحتان (خۆێشتان)دا لەو بەڵاو تاقیکردنەوانەی کە هات بەسەرتاندا، وە لەسەر ئازاردانی ستەمکاران، وە لەخوا بترسنو خۆتان بپارێزنو ئارامی لەسەر بگرن، بەوەی کە تەنها مەبەستتان ڕەزامەندیو نزیک بوونەوە بێت لە خوای گەورە، بە مەرجێک لە ئارامگرتنەکەتاندا سنووری خوا پێشێل نەکەن، لە جێگایەکدا ئارام بگرن کە حەڵاڵ نیە بۆتان، بەڵکو لەو شوێنەدا وا پێویست دەکات تۆڵە لە دوژمنی خوا بکەنەوە، ﴿ فَإِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴾ واتە: ئەو کارانەی کە پێویستە لەسەری پابەند بێتو کێبڕکێی لەسەر بکرێت، بە ڕاستی ئەمە تەنها لەگەڵ خاوەن هەڵوێستەکانو، وره بەرزەکاندا دەگونجێت، وەک چۆن خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٣٥﴾ ﴾ فصلت.



وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ لَتُبَيِّنُنَّهُۥ لِلنَّاسِ
وَلَا تَكْتُمُونَهُۥ فَنَبَذُوهُ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ وَٱشْتَرَوْا۟ بِهِۦ ثَمَنًا
قَلِيلًا فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ ﴿١٨٧﴾ لَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَآ
أَتَوا۟ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُوا۟ بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا۟ فَلَا تَحْسَبَنَّهُم
بِمَفَازَةٍ مِّنَ ٱلْعَذَابِ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٨٨﴾ وَلِلَّهِ مُلْكُ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٨٩﴾ إِنَّ فِى
خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ
لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا
وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ
رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٩١﴾
رَبَّنَآ إِنَّكَ مَن تُدْخِلِ ٱلنَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُۥ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ
أَنصَارٍ ﴿١٩٢﴾ رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِى لِلْإِيمَٰنِ أَنْ
ءَامِنُوا۟ بِرَبِّكُمْ فَـَٔامَنَّا رَبَّنَا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا
سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلْأَبْرَارِ ﴿١٩٣﴾ رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَىٰ
رُسُلِكَ وَلَا تُخْزِنَا يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّكَ لَا تُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ ﴿١٩٤﴾

**(١٨٧-١٨٨):** ﴿وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ لَتُبَيِّنُنَّهُۥ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُۥ فَنَبَذُوهُ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ وَٱشْتَرَوْا۟ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ ﴿١٨٧﴾ لَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَآ أَتَوا۟ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُوا۟ بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا۟ فَلَا تَحْسَبَنَّهُم بِمَفَازَةٍ مِّنَ ٱلْعَذَابِ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٨٨﴾﴾:

پەیمان:بریتیە لە گرێبەستێکی قورس‌و توونـدو تـۆڵو سەنگین، وە ئـەم پەیمانـە خـوای گـەورە وەری گرتـووە لـە هەمـوو ئەوانەی کـە کتێبـی ئاسـمانی بۆ دابەزانـدوون‌و فێـری زانسـت‌و زانیـاری کـردوون، کە بـۆ خەڵکی ڕوونـی بکاتەوە ئـەوەی کـە فێری بـووە نەیشارێتەوە لێیان بـە پێـی پێویسـت، وە کەمتەرخەمـی‌و ڕەزیلـی نـەکات لـە گەیاندنیـدا، بە تایبـەت ئەگەر داوای لـێ بکـەن، بـە تایبەتتـر ئەگەر وا پێویسـت بـکات، چونکە بە ڕاسـتی هەرکەسـێک زانسـت‌و زانیـاری لەلا بێت پێویسـتە بـۆ خەڵکی ڕوون بکاتـەوەو هەق‌و ڕاسـتی لە ناهەق‌و باتـڵ ئاشـکرا بـکات.

بێگومـان ئەوانـەی کـە سـەرکەوتوو سـەربەرز بـوون بـە جوانتریـن شـێوە بـەم ئەرکـە هەسـتاون، وە خەڵکیـان فێـر کـردوە لـەوەی کـە فێـری بـوون تەنهـا لەبـەر ڕەزامەنـدی پەروەردگاریـان‌و سـۆزو بەزەییـان بـۆ خەڵـک‌و ترسـانیان هەبووە لـە تاوانی شـاردنەوەی ئـەو زانسـت‌و زانیاریـەی کـە فێـری بوون.

بـەڵام خـاوەن کتێبەکان لـە جوولەکەو نەصرانییـەکان‌و ئەوەی لـە وان دەچێـت، پەیمان‌و گرێبەستەکانیان خسـتە پشـتی خۆیانـەوە، بەرگـەی قورسـاییەکانیان نەگـرت، پاشـان ڕاستیەکانیان‌شـاردەوەو پـووچ‌و بەتاڵەکانیـان ئاشـکرا کـرد، وێرایـان سـنوورەکانی خوا پێشـێل بکـەن، کەمتەرخەمیـان کرد بەرانبەر بـە مافەکانی خـواو مافەکانی خەڵـک، وە بەو شـاردنەوە هـەرزان فرۆشـیان کـرد، هەندێـک لـە دەسـەڵاتەکانی دنیاو مـاڵ‌و سـامانی بێ

نرخیـان بـە دەسـتیان هێنـا، لە خەڵکی سـووکـو ڕیسـواکانیان کە شـوێنی هـەواو ئارەزوو کـە وتبـوون، ئارەزووەکانیـان پێش خسـتبوو بەسـەر هەقـدا، ﴿ فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ ﴾ بە ڕاسـتی خراپتریـنو بـێ نرخترپـن شـتێکە کە کڕیویانـە لە بریـدا، ئەوەی کە بـوو بە هۆی ئـەوەی پشـتی تێبکـەن بریتـی بوو لـەوەی کە لـە کتێبەکانـی خوادا باسـی هەقو ڕاسـتی تێـدا بوو کـە مایەی خۆشـبەختی دونیـاو دوا ڕۆژیان بوو، ئـەوە گەورەتریـن بەرژەوەندیە، بـێ نرخـیو سـووکیو گومراییان هەڵبـژارد، وە وازیـان لە بـەرزو بەڕێزەکان هێنـا، لەبەر بەدبەختـیو بـێ ڕێزیـان، وە لەبـەر ئـەوەی کـە ئـەوان تەنهـا بـۆ ئـەو مەبەسـتە بۆگەنانە دروستکراون.

پاشـان خوای گەورە دەفەرمـوێ: ﴿ لَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَآ أَتَوا ﴾ واتە: لە خراپەکان، وە قسـەی پووچو کردارە پووچەکان.

﴿ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُوا بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا ﴾ واتە: (حەز دەکەنو پێیان خۆشـە) سـوپاس بکرێن لەسـەر ئـەو کارە چاکانـەی کە ئەنجامیان نـەداوە، کە هـەق وایە باس نەکرێن، دوو شـتیان پێکـەوە کـۆ کردەوە، کـردارو گوفتـاری خراپ، بـە هەمان شـێوە دڵیان بەوە خـۆش بوو، وە حەزیـان بـە سـوپاس کردن دەکرد لەسـەر کاری خێـرو چاکە کە ئەنجامیـان نەدابوو.

﴿ فَلَا تَحْسَبَنَّهُم بِمَفَازَةٍ مِّنَ ٱلْعَذَابِ ﴾ واتـە: هەرگیـز وامەزانـە لـە دەسـتی سـزا بـە سـەلامەتی ڕزگاریـان دەبێـت، بەڵکـو ڕزگاریـان نابێتو شـایانیانەو لـە داهاتوویەکی زۆر نزیکـدا پێـی دەگـەن، لەبـەر ئەمەیـە خـوای گـەورە دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ دەچێتـە چـوار چێـوەی ئـەم دەقە پیـرۆزەوە خـاوەن کتێبـەکان ئەوانـەی کە دڵیـان خۆش بـووە بـەو زانسـتەی لـە لایان هەیـەو ملکـەچ نەبوون بـۆ پێغەمبـەری خـوا ﷺ، وە گومانی ئەوەیـان بـردووە کە ئـەوان ڕاسـتن لە حـاڵو وتەکانیانـدا، وە بـە هەمان شـێوە هەر یەک لەوانەیـش دەگرێتـەوە کـە داهێنـان (بدعة)یان کـردوە بە زمان بێـت، یان بە کـردار، دڵی پێـی خـۆش بـووەو بانگـەوازی بـۆ کـردوە، وە گومانـی ئـەوەی بـردووە کە ئەو لەسـەر هەقـەو پێچەوانەکـەی لەسـەر ناهەقـە، وەک چـۆن ئەوە حاڵـی خـاوەن بیدعەکانە.

وە دەقەکـە بـە هەمـان شـێوە بەڵگەیـە بـە تێگەیشـتن لێـی کە هەر کەسـێک حـەز بکات سـوپاسو وەسـف بکرێت لـە کارێکـی چاکداو لـە شـوێنکەوتنی هەقدا، ئەگەر مەبەسـتی ڕووپامایـیو ناوبانـگ نەبێت، ئەوە سەرزەنشـت ناکرێت، بەڵکو ئەمە لەو کارە پێویسـتیانەیە کـە خوا هەواڵـی داوە پاداشـتی چاکەخـوازان دەداتەوە لە کـردارو گوفتارەکانیـان، وە ئەو

پاداشـتی بەنـدە دڵسـۆزەکانی دەداتـەوە کـە لێـی پاڕاونەتـەوەو داوایـان لێکـردوە، وەک ئیبراهیـم ﷺ دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱجْعَل لِّي لِسَانَ صِدْقٍ فِي ٱلْآخِرِينَ ﴿٨٤﴾ ﴾ الشعراء، وە وەک خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ سَلَٰمٌ عَلَىٰ نُوحٍ فِي ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧٩﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِي ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٨٠﴾ ﴾ الصافات، وە وەک بەندەکانـی خوا کە دەڵێـن: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَٱجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴿٧٤﴾ ﴾ الفرقان، ئەمـە لـە نیعمەتەکانـی خوایـە لەسـەر بەندەکـەی، وە منەتـی ئـەوە کە پێویسـت بە سـوپاسو ستایشـی دەکات.

(١٨٩): ﴿ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٨٩﴾ ﴾:

واتـە: هەرچـی لـە ئاسـمانەکانو زەویـدا هەیـە تەنهـا خـوا خاوەنیەتـی لـە هەمـوو جۆرو بەشـەکانی دروسـتکراو، وە هەر خۆی فەرمانڕەواو سـەرداریانەو کارەکانیـان ڕادەپەڕێنێتو ڕێکـی دەخـات بـە کەماڵی هێزو دەسـەڵاتیو بـە داهێنەرترین ڕێخسـتن، هیـچ یەکێک لە دروسـتکراوەکان ناتوانێـت بەرگـری لێ بـکات، وە هیچ کـەس ناتوانێت لـە کاری بخات.

(١٩٠-١٩٤): ﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِي ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٩١﴾ رَبَّنَآ إِنَّكَ مَن تُدْخِلِ ٱلنَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُۥ ۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿١٩٢﴾ رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِي لِلْإِيمَٰنِ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِرَبِّكُمْ فَـَٔامَنَّا ۚ رَبَّنَا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلْأَبْرَارِ ﴿١٩٣﴾ رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَىٰ رُسُلِكَ وَلَا تُخْزِنَا يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ إِنَّكَ لَا تُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ ﴿١٩٤﴾ ﴾:

خوای گـەورە هـەواڵ دەدات: ﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِي ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾ لـە چـوار چێـوەی ئـەم دەقـەدا هانـی بەندەکانـی داوە لەسـەر بیرکردنـەوە لـە ئاسـمانەکانو زەوی، وە وردبوونـەوە لـە دروسـتکراوو نیشـانەکانی.

وە وشـەی: ﴿ لَءَايَٰتٍ ﴾ی بە ئاڵۆزی هێنـاوە، نەیفەرمووە: (علی المطلب الفلاني) واتە: لەسـەر داواکاری فڵانکـەس، هەتـا ئامـاژە بێت بـۆ گشـتگیریو زۆری نیشـانەکانی، وە لەبەر ئەوە بەڕاسـتی چەندین دەقی سـەر سـوورهێنەری تێدایە بینەران دڵخـۆش دەکات، وە بیرکەرەوان قایـل دەکاتو قەناعەتیـان پـێ دێنێ، وە دڵی ڕاسـتگۆیان بـە لای خۆیدا ڕادەکێشـێ، وە دڵە گەشـاوەکان ئاگـادار دەکاتەوە لەسـەر جێبەجێ کردنی داواکاریـە خوایەکان.

بـەڵام درێـژەی ئـەوەی کـە لـە دەقەکـەدا هاتـوە، ئەوەیە: کـە بۆ هیـچ دروسـتکراوێک

نیـە نیشـانەکانی خـوا کـورت بکاتـەوەو دەوری هەندێکی بدات، وە بە گشـتی، ئـەوەی لە ئاسـمانەکانو زەویـدا هەیە لـە گەورەیـیو بەرفراوانیو ڕێکخسـتی ڕێڕەوو جوڵـە، بەڵگەیە لەسـەر گەورەیـی دروسـتکراوەکەیو بەرفراوانـی دەسـەڵاتی، وە ئـەوەی کـە تیایدایـە لە پتەویـیو وردەکاریـی لە دروسـتکراوداو جوانـی دیمەنـەکان بەڵگەیە لەسـەر دانایی خوای گـەورەو دانانـی هەموو شـتەکان لە جێگـای خۆیانـدا، وە بەڵگەیە لەسـەر زانسـتی فراوانی، وە ئەوەیشـی تیایدایـە سـوودو قازانجـی هەیە بۆ دروسـتکراوەکان، بەڵگەیە لەسـەر سـۆزو ڕەحمـەتو چاکـەی خوا کـە پێویسـت دەکات سوپاسـی بکرێت. هەمـوو ئەمانـە بەڵگەیە لەسـەر پەیوەندی دڵ بە دروسـتکەرەکەیو داهێنەرەکەیو تێکۆشـان بۆ ڕەزامەندیو هاوەڵی بـۆ پەیـدا نەکرێـت لە کەسـێک کـە هیچی بە دەسـت نیـە، تەنانەت بـە ئەندازەی کێشـی گەردیلەیـەک نـە بـۆ دەروونـی خۆی نـە بـۆ خەڵکیش، نە لـە ئاسـمانەکانو نە لـە زەوی، خـوای گـەورە دەقەکانی تایبەت کـردوە بە (أولي الألبـاب) خاوەن ژیریو هۆشـمەندەکان، چونکـە سـیفەتەکانی ئـەوان بریتیـە: ﴿ يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ ﴾ لـە هەمـوو کاتەکانیاندا: ﴿ قِيَـٰمٗا وَقُعُودٗا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمۡ ﴾ ئەمـە هەمـوو جـۆرە زیکرەکان دەگرێتـەوە بە زمانو بـە دڵ، لەو چـوار چێوەشـدا نوێـژ کـردن بە پێـوە، ئەگـەر نەیتوانی بـە دانیشـتنەوە، ئەگـەر نەیتوانی با لەسـەر تەنیشت.

وە (یەکێکـی دی لـە سـیفەتەکانی) ئەوانـە: ﴿ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلۡقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾ واتـە: لەبـەر ئـەوە بیکـەن بـە بەڵگە بۆ ئـەوەی کە پێویسـتە لـە ئاسـمانەکانو زەویـدا، وە ئەمـە بەڵگەیە لەسـەر ئـەوەی کە بیرکردنەوە خواپەرسـتیەو لە سـیفەتەکانی دۆسـتانی خواو خواناسـانە، ئەگـەر بیریـان کـردەوە، دەزانن کە خـوای گەورە ئاسـمانو زەوی بـە گاڵتەو هاوەنتـە دروسـت نەکـردوون، پاشـان دەڵێـن: ﴿ رَبَّنَا مَا خَلَقۡتَ هَٰذَا بَٰطِلٗا ﴾ ئـەم هەموو دروسـتکراوانە بـە بـێ هـوودەو بـێ ئامانج لەگـەڵ گەورەیـی تـۆدا نەگونجێـت، بەڵکو بە هـەقو لـە پێناو هـەقو ڕاسـتی دروسـتت کردوە.

﴿ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴾ بـەوەی کـە بمانپارێزیـت لـە تاوانـەکانو یارمەتیمـان بدەیـت بـۆ کـردارە چاکـەکان، هەتـا بەو هۆیـەوە ڕزگارمان بێـت لە ئاگـر، وە پرسـیاری خەڵکی ناو بەهەشـتیش دەگرێتـە خـۆ، پاش ئەوەی خـوا ڕزگاری کردن لـە ئاگری دۆزەخ بەهەشـتیان بەدەسـت هێنـا، بـەڵام کاتێـک تـرس لـە دڵەکانیـان دەنیشـێت داوا لـە خـوا دەکـەن بـە گرنگتریـن شـت، ﴿ رَبَّنَآ إِنَّكَ مَن تُدۡخِلِ ٱلنَّارَ فَقَدۡ أَخۡزَيۡتَهُۥ ﴾ واتـە: چونکـە ڕیسـوایی لە

لایـەن خـواوە بەسـەرهاتووە، وە لە لایەن فریشـتەو خواناسـانەوە دووچاریی سەرشـۆڕیەک بووەتـەوە ڕزگـاری نابێـت لێی، وە کەسـیش نیـە ڕزگاری بـکات لەبەر ئەمەیـە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا لِلظَّـٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴾ ڕزگاریـان بـکات لـە سـزای خـوا، ئەمـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی ئەوانە دەچنە دۆزەخ بە هۆی سـتەمی خۆیانـەوە، ﴿ رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِى لِلْإِيمَـٰنِ ﴾ ئەویـش پێغەمبـەرە ﷺ، واتـە: خەڵکـی بانـگ دەکرد بـۆ لای یەکتاپەرسـتیو هانـی دەدان، وە بـۆ فێـر بوونـی بنەمـاو لقەکانـی ئیسـلام، ﴿ فَـَٔامَنَّا ﴾ واتـە: وەڵاممـان دایەوەو دەسـت پێشـخەریمان کـردو بە پەلە ڕۆشـتین بە دەمیـەوە، ئەمە پەیامێکـە لە لایەن ئەوانـەوە بـەوەی کـە خوا منەتی کـردوە بەسـەریاندا، وە نـزا کردنە کە لێیان خـۆش بێتو تاوانەکانیـان بسـڕێتەوە، چونکە بە ڕاسـتی کردەوە چاکـەکان تاوانەکان دەسـڕنەوە، وە ئەو کەسـەی بـە بڕواهێنـان منەتی کـرد بەسـەریاندا، لـە داهاتوویەکـی نزیکدا منـەت دەکات بەسـەریاندا بە ئاسایشـی تەواو.

﴿ وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلْأَبْرَارِ ﴾ ئـەم پاڕانەوەیـە هاندان لەسـەر کاری چـاکو واز هێنان لە کاری خـراپ دەگرێتـە خـۆ، بـە ئەنجامدانـی دەبێـت بـە یەکێک لـەو کەسـانەی کـە ڕزگاریان بـوو، وە بەردەوامـی لەسـەریو پابەنـد بوونـی هەتا مـردن. وە کاتێک باسـی سـەرکەوتن دەکـەن لە لایـەن خواوە کە بـڕوای پێبەخشـیون، وە گەیاندوونـی بە تـەواوی نیعمەتەکان، ئنجـا داوای پاداشـت دەکـەن لەسـەری، ئـەوە بۆیـان جێبەجی بـکات لەسـەر پەیمانەی کە پێـی داون لەسـەر زمانـی پێغەمبەرەکانـی لـە سـەرکەوتن لـە دنیـادا، وە بەدەسـت هێنانـی ڕەزامەنـدی خـواو چوونـە بەهەشـت لـە ڕۆژی دواییدا، بە ڕاسـتی خـوای گـەورە پەیمانی خـۆی ناشـکێنێت، خوای گەورەیـش وەڵامـی دانـەوەو پاڕانەوەکەیانی قبووڵ کـرد، لەبەر ئەمـە دەفەرموێ:

فَٱسۡتَجَابَ لَهُمۡ رَبُّهُمۡ أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٖ مِّنكُم مِّن
ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰۖ بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖۖ فَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَأُخۡرِجُواْ
مِن دِيَٰرِهِمۡ وَأُوذُواْ فِي سَبِيلِي وَقَٰتَلُواْ وَقُتِلُواْ لَأُكَفِّرَنَّ
عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ وَلَأُدۡخِلَنَّهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا
ٱلۡأَنۡهَٰرُ ثَوَابٗا مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلثَّوَابِ ١٩٥
لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي ٱلۡبِلَٰدِ ١٩٦ مَتَٰعٞ قَلِيلٞ
ثُمَّ مَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ ١٩٧ لَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ
رَبَّهُمۡ لَهُمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا
نُزُلٗا مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِۗ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لِّلۡأَبۡرَارِ ١٩٨ وَإِنَّ مِنۡ
أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ لَمَن يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ
وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِمۡ خَٰشِعِينَ لِلَّهِ لَا يَشۡتَرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ
ثَمَنٗا قَلِيلًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ
سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ١٩٩ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱصۡبِرُواْ
وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٢٠٠
[redacted]

(١٩٥): ﴿ فَٱسۡتَجَابَ لَهُمۡ رَبُّهُمۡ أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٖ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰۖ بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖۖ فَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَأُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ وَأُوذُواْ فِي سَبِيلِي وَقَٰتَلُواْ وَقُتِلُواْ لَأُكَفِّرَنَّ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ وَلَأُدۡخِلَنَّهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ ثَوَابٗا مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلثَّوَابِ ١٩٥ ﴾:

خوای گەورە دوعاکەیانی قبووڵ کرد، دوعای بەندایەتیو دوعای داواکردن، وە دەفەرموێ: من لە بیری ناکەمو زایەی ناکەم کردەوەی هەر یەکێک لە ئێوە نێر بێت یان مێ، هەمووان لە داهاتوویەکی نزیکدا پاداشتی کردەوەکانیان بە تێرو تەواوی وەردەگرنەوە، ﴿ بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖ ﴾ واتە: هەمووتان لە سنوورێکدا یەکسانن لە پاداشتو سزا، ﴿ فَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَأُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ وَأُوذُواْ فِي سَبِيلِي وَقَٰتَلُواْ ﴾ ئەوانە دوو شتیان پێکەوە کۆکردۆتەوە ئەویش: ئیمان هێنانو کۆچ کردن، وە بە دابڕانی خۆشەویستان لە خاکو سەروەتو سامان، تەنها لەبەر ڕەزامەندی پەروەردگاریان، وە لە پێناوی خوادا جیهادیان کردوە.

﴿ لَأُكَفِّرَنَّ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ وَلَأُدۡخِلَنَّهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ ثَوَابٗا مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِ ﴾ ئەوەی کە دەیبەخشێت بە بەندەکەی پاداشتی بێ پایانە لەسەر کردەوەی کەم.

﴿ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلثَّوَابِ ﴾ (وە لە لای خوا باشترین پاداشت هەیە) لەوەی چاو نەیبینیوە، گوێ نەیبیستووەو بە ختوڕەش بە دڵی هیچ کەسێکدا نەهاتووە، وە خۆ نزیک کردنەوە لێی بەوەی کە لە توانای بەندە دایە.

(١٩٦-١٩٨): ﴿ لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي ٱلۡبِلَٰدِ ١٩٦ مَتَٰعٞ قَلِيلٞ ثُمَّ مَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ ١٩٧ لَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ رَبَّهُمۡ لَهُمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا نُزُلٗا مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِۗ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لِّلۡأَبۡرَارِ ١٩٨ ﴾:

مەبەست لەم دەقەدا دڵدانەوەی بڕوادارانە، لە هەر شتێک کە کافرو بێبڕوایان بە دەستیان هێناوە

لە خۆشی دنیاو چێژ وەرگرتنیان لێی، وە گەڕانیان لە نێو وڵاتاندا بە جۆرەها بازرگانیو کارو کەسابەتو چێژو خۆشی بینین، وە جۆرەها سەربەرزیو سەرکەوتن لە هەندێ کاتدا بە ڕاستی ئەمانە هەمووی ﴿ مَتَٰعٞ قَلِيلٞ ﴾ (خۆشیەکەی کەمن چونکە) ئەو خۆشیو نازوو نیعمەتانە نە جێگیرنو نە بەردەوامن، بەڵکو چێژێکی کەمی پێ وەردەگرن، وە لەسەری سزایەکی گەورە دەدرێن، ئەمە بەرزترین حاڵەتە کە بۆ بێبڕوایان هەیە لە دنیادا.

بەڵام ئەوانەی پارێز لە خوا دەکەنو ئیمانیان هێناوە، لەگەڵ ئەوەی لە دنیادا سەربەرزیو ڕێز بە دەست دێنن، ﴿ لَهُمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ﴾ ئەگەر وا دابنرێت ئەوان لە ژیانی دنیادا تووشی هەموو ناخۆشیەکو نارەحەتیو تەنگە تاویو کولە مەرگیەک بووبن، ئەمە بەراورد ناکرێ بە بەهەشتی خۆشو پڕ لە نازو نیعمەتی کامەرانی، وەک خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لِّلۡأَبۡرَارِ ﴾ ئەوانەن کە دڵەکانیان پاک بووەتەوەو بەو هۆیەوە زمانو کردارەکانیشیان جوان بوون، خوای بە بەزەیی خۆی پاداشتی گەورەی داونەتەوە، سەرکەوتنی بەردەوامیان بەدەست هێناوە.

(١٩٩-٢٠٠): ﴿ وَإِنَّ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ لَمَن يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِمۡ خَٰشِعِينَ لِلَّهِ لَا يَشۡتَرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنٗا قَلِيلًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ١٩٩ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱصۡبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٢٠٠ ﴾:

بە ڕاستی هەندێ کەس هەن لە خاوەنانی کتێب خوا سەرکەوتووی کردوون لەسەر خێرو چاکە ئیمان بە خوا دێنن، وە هەروەها ئیمان بە قورئانیش کە بۆ ئێوە ڕەوانە کراوە، وە بەو کتێبانەش (کە پێشتر) ڕەوانە کراوە، بە ڕاستی ئەمە ئیمانی سوود گەیەنەرە (بە خاوەنەکەی)، نەک وەک هەندێ کەس ئیمان بە هەندێ لە پێغەمبەرانو کتێبەکان دێنێو ئیمان بە هەندێکی دی ناهێنێ، وە لەبەر ئەمە کاتێک کە بڕواکەیان گشتیو ڕاستەقینە بوو، سوودی هەبوو بۆیانو ترسی خوا لە دڵەکانیاندا جێگیر بوو بە ملکەچیەوە فەرمانەکانیان جێبەجێ دەکردو لەسەر سنوورەکانی خوا دەوەستان.

لە ڕاستیدا ئەوانە خاوەن کتێبو زانستن وەک چۆن خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا يَخۡشَى ٱللَّهَ مِنۡ عِبَادِهِ ٱلۡعُلَمَٰٓؤُاْ ٢٨ ﴾فاطر، (واتە: بێگومان لە نێو بەندەکانی خوا تەنیا زانایان وەک پێویست لە خوا دەترسن) لە تەواوی ترسیان لە خوا، ﴿ لَا يَشۡتَرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنٗا قَلِيلًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ﴾دونیا پێش ناخەن بەسەر ئایندا، وەک چۆن لە ڕێ لادەرەکان ئایەتەکانی خوایان دەشاردەوەو بە نرخێکی کەم دەیانفرۆشت.

بەڵام ئەوانەی کە ژیرو هۆشمەند بوون دەیانزانی کە گەورەترین زەرەر ئەوەیە ڕازی بێت بە کۆکردنەوەی ماڵو سامانو بایەخ نەدان بە دینداری، وە شوێنکەوتنی تێرکردنی نەفسو ئارەزوو، واز هێنان لە ڕاستی کە گەورەترین بەشە لە دنیاو دوا ڕۆژدا، هەر بۆیە شوێنی هەقو ڕاستی کەوتوونو ڕوونیان کردوەتەوەو بانگەشەیان بۆ کردوە، وە خەڵکیان ئاگادار کردوەتەوە لە شتە پووچو بێ بنەماکان، خوای گەورەیش لەسەر ئەوە پاداشتی دانەوە، وە پەیمانی پێدان بە پاداشتی بێ پایانو نەبڕاوەو مژدەی پێداون لە نزیکی خۆی جێگایان بۆ دابین بکات، ئەوانیش لەبەرانبەر ئەو پەیمانەدا کەمتەرخەمیان نەکردوە، چونکە ئەوە لە داهاتوویەکی نزیکدا دەبێو ئەوە نزیکە ڕووبدات (کە ئەم پاداشتە وەربگرن).

پاشان هانی بڕوادارانی داوە لەسەر ئەو شتەی کە دەیانگەیەنێت بە سەرکەوتنو خۆشبەختی لە دنیاو دوا ڕۆژدا، وە بە حەقیقەتی ئەو ڕێگایەی کە دەیگەیەنێت بەو ئامانجە ئەویش پابەند بوونە بە ئارامگرتنەوە، کە بریتیە لە کۆتو بەندکردنی نەفسو دەروون لەسەر ئەوەی کە حەزی لێیەتی لە وازهێنان لە سەرپێچیکردن، وە لە ئارامگرتن لەسەر بەڵاکان، وە لەسەر جێبەجێ کردنی ئەو فەرمانە قورسو گرانانەی کە بەسەر نەفسو دەروونەوەیە، فەرمانیان پێدەکات بە ئارامگرتن لە هەموو ئەوانەدا (المصابرة) واتە: بەردەوامیو جیانەبوونەوەو بەرگری کردن لە بەرانبەر دوژمندا لە هەموو حاڵەتەکاندا.

وە (المرابطة) واتە: بریتیە لە پاراستنو پابەند بوون لەو شوێنەی کە مەترسی ئەوەی لێدەکرێ دوژمن پێی بگات، وە دەبێت چاودێری دوژمن بکەنو بەرهەڵستیان لێ بکەن لە گەیشتن بەو شوێنە، بەڵکو سەرکەوتوو بن، وە بێگومان سەرکەوتوو دەبن لە بە دەستهێنانی دنیاو دواڕۆژدا وە ڕزگاریان دەبێت لەو شتانەی کە ئازاریان دەدات.

کەواتە لەمەوە زانرا هیچ ڕێگایەک نیە بۆ سەرکەوتن بە بێ ئارامگرتنو دان بە خۆدا گرتنو شەونخوونی لە پێناوی خوادا. هیچ کەس سەرکەوتوو نەبووە مەگەر بە جێبەجێ کردنی ئەو ڕێگایانە نەبێ، وە هیچ کەسێک سەرکەوتنی لە دەست نەداوە مەگەر کەمو کوڕیەک هەبووە لەو شتانەدا.

تەفسیری سوورەتی (آل عمران) بە پشتیوانیو تەوفیقی خوا تەواو بوو
صەڵاتو سەلام لەسەر پێغەمبەری خوا بێ.

* * * * * *

# تەفسیری سوورەتی (النساء)
## مەدەنییە (١٧٦) ئایەتە
## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا
زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ
بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾ وَءَاتُوا۟ ٱلْيَتَٰمَىٰٓ أَمْوَٰلَهُمْ ۖ
وَلَا تَتَبَدَّلُوا۟ ٱلْخَبِيثَ بِٱلطَّيِّبِ ۖ وَلَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَهُمْ إِلَىٰٓ أَمْوَٰلِكُمْ ۚ إِنَّهُۥ
كَانَ حُوبًا كَبِيرًا ﴿٢﴾ وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا۟ فِى ٱلْيَتَٰمَىٰ فَٱنكِحُوا۟
مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ ۖ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا۟
فَوَٰحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَلَّا تَعُولُوا۟ ﴿٣﴾ وَءَاتُوا۟
ٱلنِّسَآءَ صَدُقَٰتِهِنَّ نِحْلَةً ۚ فَإِن طِبْنَ لَكُمْ عَن شَىْءٍ مِّنْهُ نَفْسًا فَكُلُوهُ
هَنِيٓـًٔا مَّرِيٓـًٔا ﴿٤﴾ وَلَا تُؤْتُوا۟ ٱلسُّفَهَآءَ أَمْوَٰلَكُمُ ٱلَّتِى جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ
قِيَٰمًا وَٱرْزُقُوهُمْ فِيهَا وَٱكْسُوهُمْ وَقُولُوا۟ لَهُمْ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴿٥﴾ وَٱبْتَلُوا۟
ٱلْيَتَٰمَىٰ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغُوا۟ ٱلنِّكَاحَ فَإِنْ ءَانَسْتُم مِّنْهُمْ رُشْدًا فَٱدْفَعُوٓا۟
إِلَيْهِمْ أَمْوَٰلَهُمْ ۖ وَلَا تَأْكُلُوهَآ إِسْرَافًا وَبِدَارًا أَن يَكْبَرُوا۟ ۚ وَمَن كَانَ
غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ ۖ وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ فَإِذَا
دَفَعْتُمْ إِلَيْهِمْ أَمْوَٰلَهُمْ فَأَشْهِدُوا۟ عَلَيْهِمْ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبًا ﴿٦﴾

(١): ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾﴾:

خوای گەورە سەرەتای ئەم سوورەتەی بە فەرمان كردن دەست پێكردو بە پارێزكاریی‌و سوور بوون لەسەر بەندایەتی‌و فەرمانكردن بە پەیوەندی خزمایەتی‌و جەختكردنەوە لەسەریان، وە هۆكاری پێویست بوونی هەریەك لەوانەی روون كردوەتەوە، بێگومان ئەوەی لە پارێزكاران پێویست دەكات ئەوەیە كە: ﴿رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم﴾ ڕزقو ڕۆزی پێداون، وە پەروەردەی كردوون بە نیعمەتە هەرە گەورەكان لە نێویاندا ئەوە كە دروستی كردوون، ﴿مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا﴾ بۆ ئەوەی بۆی ببێ، وە لە پاڵیدا بحەسێتەوە، وە ئەو نیعمەتە بەو كامڵ‌و تەواو دەبێ‌و پێی دڵخۆش دەبێ.

بە هەمان شێوە ئەوەی كە پێویستە بۆ پارێزكاریی پاڕانەوەیە لێی‌و بە گەورە زانینیەتی، (لە پێویستیەكانی لە خواترسان ئەوەیە لێی بپارێنەوەو بە گەورەی بزانن)، هەتا ئەگەر بتانەوێت كارەكانتان ڕایی بكرێت، داوا لە خوا دەكەن.

هەروەها هەواڵی داوە بەوەی كە چاودێرە بەسەر بەندەكانیەوە لەكاتی جووڵەو وەستاندا، وە لە كاتی كاری نهێنی‌و ئاشكرایاندا، وە لە سەرجەم بارووودۆخەكانیان چاودێرە بەسەریانەوە، ئەوەی كە پێویستە بۆ چاودێریكردن لە بەندەدا هەبێت بریتیە لە شەرمكردن لە خواو پارێزیكردن لێی، وە بە هەمان شێوە هەواڵی داوە كە ئەو لە یەك نەفس دروستی كردوون، وە بڵاوەی پێكردوون لەسەر زەویدا، لەگەڵ ئەوەدا كە دەگەڕێنەوە

بـۆ یـەک ڕەچەڵـەک کـە ئەویش ئادەمـە، ئەمەیـش تەنها لەبـەر ئەوەیـە بە سـۆزو نەرمو نیـان بـن بەرانبـەر بە یـەک، دیارە ئەمـەش بە لـە خواترسـانو خۆپارێـزی دەبێـت، وە بە فەرمانکـردن بـە بەجێهێنانـی پەیوەنـدی خزمایەتـیو، قەدەغەکردنـی پچڕاندنی بـۆ ئەوەی ئـەم ڕاسـتیە دەربکەوێـت، وەک چۆن پێویسـتە کە مرۆڤ هەسـتێ بە بەجێهێنانـی فەرمانی دروسـتکراوەکەی بە هەمان شـێوە پێویسـتە هەسـتێت بە ڕێکخسـتنی پەیوەندیەکەی لەگەڵ خەڵکیـداو مافەکانیـان بپارێـزێ بە تایبـەت خزمو کەس، بەڵکو هەسـتان بـە جێبەجێکردنی مافەکانیـان کـە بریتیـە لە جێبەجـێ کردنی مافی خـوا کە فەرمانـی پێکردوە، بیـر بکەرەوە کـە چـۆن خـوا ﷻ ئەم سـوورەتەی دەسـت پێکردوە بـە فەرمان کـردن بە لە خواترسـانو خۆپارێـزی، وە جێبەجێکردنـی پەیوەنـدی خزمایەتیو ژنو مێردایەتی، پاشـان هەریەک لەم بابەتانـەی بـە درێژی باسـکردوە لە سـەرەتای سـوورەتەکەوە بۆ کۆتاییەکـەی وەک چۆن بلێـی هەموو سـوورەتەکە لەسـەر ئـەم کارانە بوونیـات نراوە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا ﴾ ئاگادارکردنەوەیەکـە بـۆ لەبـەر چاوگرتنـی مافـی پیـاوانو ژنـان بەسـەر یەکتـرەوە، وە جێبەجێکردنـی بـەو پێیـەی کـە ئافرەتان لـە پیاوان دروسـتکراونو لـە نێوانی ئەمـانو ئەواندا نزیکتریـن ڕەچەڵک هەیـەو بەهێزترین پەیوەندی هە یە.

(٢): ﴿ وَءَاتُوا۟ ٱلْيَتَـٰمَىٰٓ أَمْوَٰلَهُمْ ۖ وَلَا تَتَبَدَّلُوا۟ ٱلْخَبِيثَ بِٱلطَّيِّبِ ۖ وَلَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَهُمْ إِلَىٰٓ أَمْوَٰلِكُمْ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ حُوبًا كَبِيرًا ﴿٢﴾ ﴾:

ئەمـە یەکـەم شـتێکە کـە خـوا ﷻ وەسـیەتی پێکـردوە لـە مافـی دروسـتکراوەکاندا لـەم سـوورەتە پیـرۆزەدا ئەویـش بریتیـە لەو هەتیوانـەی کە باوکیان لە دەسـت داوە لـە قۆناغی منداڵیـدا کـە لـەو قۆناغـەدا هەڵناسـتن بـە ئەنجامدانـی بەرژەوەندیەکانی خۆیـان، خوای بە سـۆزو بـە ڕەحـم فەرمانـی کـردوە بـە بەندەکانـی کـە لەگەڵیانـدا چـاک بـن، وە توخنی مـاڵو سـەروەتو سـامانیان نەکەونـەوە مەگـەر بە باشـترین شـێوە نەبـێ، وە سـەروەتو سـامانیان بدرێتـێ کاتێـک کە بالـغ بوونو پێگەیشـتن. ﴿ وَلَا تَتَبَدَّلُوا۟ ٱلْخَبِيثَ ﴾ کـە بریتیە لـە خواردنـی ماڵـی هەتیـو بـە ناهـەق ﴿ بِٱلطَّيِّبِ ﴾ بریتیـە لـە ماڵـی حـەڵاڵ کـە هیـچ کێشـەیەکی تێدانیـەو نابێتـە مایەی هیـچ گرفتێـک ﴿ وَلَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَهُمْ إِلَىٰٓ أَمْوَٰلِكُمْ ﴾ واتە: لەگـەڵ ماڵەکانـی خۆتاندا.

ئاگادارکردنەوەیەکـی تێدایـە لـە پیسـیو ناشـرینی خواردنـی ماڵـی هەتیو بەم شـێوەیە کە

لـە ڕاسـتییدا مرۆڤ پێویسـتی بـەو ماڵە نیـە، چونکە خـوا ڕزقو ڕۆزی بـۆ دیاریکردوە هەر کەسـێک بویرێـت ماڵـی هەتیو (بخـوات) ئەوە بەڕاسـتی ئەو کارە ﴿ حُوبًا كَبِيرًا ﴾ سـتەمو تـاوانو گوناهێکـی گەورەیـە، وە لە گۆڕینـی خواردنی ماڵی پیسـە بە پاک، بە شـێوەیەک کـە خاوەنـدار لـە ماڵی پاکـی هەتیو ببـاتو بیخـوات لە بـری ئـەوەدا پارێزگاری لـە ماڵە پیسـەکەی خـۆی بـکات، وە ئەم دەقـە بە هەمان شـیوە بەڵگەیە لەسـەر خاوەندارێتی بەسـەر هەتیـوەوە، هەروەهـا بەڵگەیە لەسـەر فەرمانکردن بە چاکە لـە ماڵی هەتیـودا، چونکە پێدانی ماڵەکـەی بـە تەواوەتـی بریتیە لە پاراسـتنی وە هەسـتان بەو ئەرکەی کە لەسـەر شـانێتی لە بەرژەوەنـدی هەتیـوو ماڵەکـەی، وە دووچاری کێشـەو گرفتو مەترسـی نەکاتەوە.

(٣-٤): ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَىٰ فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ مَثْنَىٰ وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ ۖ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَلَّا تَعُولُوا ﴿٣﴾ وَآتُوا النِّسَاءَ صَدُقَاتِهِنَّ نِحْلَةً ۚ فَإِن طِبْنَ لَكُمْ عَن شَيْءٍ مِّنْهُ نَفْسًا فَكُلُوهُ هَنِيئًا مَّرِيئًا ﴿٤﴾ ﴾

ئەگـەر ترسـان لـە ئەنجامنەدانی دادپـەروەری لەگـەڵ کچە بـێ باوکەکاندا کە لـە ماڵتانو لـە ژێـر سەرپەرشـتی خۆتاندان (کـە بیانکەن بە هاوسـەری ژیانتـان) وە لەوە ترسـان مافی خۆیانیـان پێبـدەن، لەبـەر ئـەوەی کـە خۆشـتان ناوێن، ئـەوە لـە ئافرەتانی تر کـە حەڵاڵن بۆتـان ژن مـارە بکـەن، ﴿ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ ﴾ واتـە: ئـەوەی کـە هەڵیدەبژێـرنو حەزتـان لێیەتـی، لـە دینـداران، خـاوەن سـەروەتو سـامان، خـاوەن جوانی، خـاوەن ڕێزو ڕەچەڵـەک، وە جگـە لەوانەش هەر سـیفەتێکی تـر کە دەبێتـە مایەی هەڵبژاردنـی لە لایەن خۆتانەوە.

باشـترینی ئـەو سـیفەتانە بریتیە لە سـیفەتی دینـداری وەک پێغەمبەر ﷺ دەفەرمـوێ: {تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لأَرْبَعٍ: لِمَالِهَا وَلِحَسَبِهَا وَجَمَالِهَا وَلِدِينِهَا، فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ، تَرِبَتْ يَدَاكَ} (أخرجه البخاري برقم: (٤٨٠٢)، ومسلم برقم: (١٤٦٦)).

واتـە: ئافـرەت لەبەر چوار شـت مـارە دەکرێـت: لەبەر مـاڵو دارایـی، لەبەر جوانـی، لەبەر بنەماڵـەو ڕەچەڵەکـی، لەبـەر ئاینـی، دەسـت بگـرە بە خـاوەن ئاینـەوە دەسـتت دەچێت بە خێردا.

لـەم ئایەتـەدا ئەوەمـان بـۆ دەردەکەوێـت کە پێویسـتە لەسـەر مسـوڵمان پیش مـارە برین دیـاری بـکات، بەڵکـو ڕێگای پێی دراوە ئەو کەسـەی کـە دەیەوێت مارەی بکات سـەیری بـکات، تاکو لەسـەر کارامەیـی هەڵیبژێرێت.

پاشـان باسـی ئـەو ژمـارە دەکات کە ڕێگـە پێـدراوە بۆ مارە کـردن، دەفەرمـوێ: ﴿ مَثۡنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ ﴾ واتـە: هـەر کەسـێک حـەز دەکات دوو ژن بهێنێـت بـا بیهێنێـت، وە هەر کـەس حـەز دەکات سـێ ژن بهێنێت بـا بیهێنێت، وە هەر کەسـێک حـەز دەکات چوار ژن بهێنێـت بـا بیهێنێـت، با لـەوە زیاتـر نەبێت، چونکە لـە ڕیزبەندیـی سـوپاس‌و پێزانین دایە، بـە یـەک دەنگـی زانایان دروسـت نیە زیاتـر لەوەی خـوا ﷻ باسـی کردوە.

وە لەبـەر ئـەوە پیاو ئـارەزووی بە ئافرەتێـک کۆتایی نایـەت، بۆی حەڵاڵ کـراوە یەکێک لـە دوای ئـەوی تـر هەتـا دەگات بـە چـوار دانـە، چونکە پیـاو بە چـوار ژن پێویسـتی بە کەسـی تـر نیـە مەگـەر زۆر بە کەمـی، وە لەگەڵ ئەمـەدا بۆی حـەڵاڵ کراوە بـە مەرجێک بزانێت کە سـتەم نـاکات‌و مافیان دەسـتەبەر دەکات.

ئەگـەر لـە شـتێک لەمانە ترسـا کـە نەتوانێـت دادپـەروەر بێـت لە نیـوان هاوسـەرەکانیدا بـا یـەک ژن مـارە بـکات، یـان ئـەو کەنیزەکەی کـە لە لایەتـی، پێویسـت نیە لەسـەری شـەوەکان دابـەش بـکات لـە کەنیزەکـدا، ﴿ ذَٰلِكَ ﴾ واتـە: لـە تەنهـا یـەک ژنـدا، یـان کەنیزەکێـک، ﴿ أَدۡنَىٰٓ أَلَّا تَعُولُواْ ﴾ واتـە: سـتەم نەکـەن.

لێـرەدا مـرۆڤ ڕووبـەڕووی ئـەوە دەبێتـەوە کە لێی دەترسـێت ئەویـش سـتەم‌و تاوانە، وە هەڵنەسـان بـە ئەرکی سـەر شـانی-ئەگەر چـی ڕێگـە پێدراویش بێت- بەڕاسـتی پێویسـت نـاکات ڕووبـەڕووی ئەو کێشـە ببێتـەوە، بەڵکو ئەوە پێویسـتە سـەرفرازو لەش سـاغ بێت، چونکـە سـەرفرازی باشـترین شـتێکە کە بەنـدەی خوا پێـی دەدرێت.

وە کاتێـک زۆربـەی خەڵکی سـتەم لە ژنان دەکـەن‌و مافەکانیان دەخۆن بـە تایبەت مارەیی کـە شـتێکی زۆرە، وە بە یەکجـار دەدرێت بە ژنەکـە، فەرمانی پێکردوون‌و جەختی لەسـەر ئـەوە کردوەتەوە کـە بدرێت بە ئافرەتـان ﴿ صَدُقَٰتِهِنَّ ﴾ واتـە: مارەییەکانیان، ﴿ نِحۡلَةٗ ﴾ واتـە: لـە دڵـەوە دەر بچێت‌و بـە خۆشـیەوە پێی بـدات، نەکـەن کەمتەرخەمی تێـدا بکەن‌و دوای بخـەن، یـان هەندێکی لـێ کەم بکەنـەوە، ئەمە بەڵگەیە لەسـەر ئەوە کـە مارەیی دەبێ بدرێـت بـە ئافرەتەکـە، ئەگەر لـە تەمەنی پێویسـتدا بوو، بە گرێبەسـت دەبێت بـە خاوەنی، چونکـە دراوەتـە پاڵی ئەو درانە پاڵەشـی خاوەنێتـی دەگرێتەوە.

﴿ فَإِن طِبۡنَ لَكُمۡ عَن شَيۡءٖ مِّنۡهُ ﴾ واتـە: لـە مارەیـی ﴿ نَفۡسٗا ﴾ بـە ویسـتی ڕەزامەنـدی خۆی هەرچەنـدە بێـت، هەرکات بێـت، زوو بیدات، یـان دوایبخات بەبێ ناخۆشـی ﴿ فَكُلُوهُ هَنِيٓـٔٗا مَّرِيٓـٔٗا ﴾ واتـە: هیچ کێشـەو گرفتێکـی تێدانیە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَٱنكِحُوا۟ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ﴾ بەڵگەیە لەسـەر ئەوە فەرمـان نەکراوە ئافرەتـی خراپەکار مـارە بکرێت، بەڵکو قەدەغە کراوە، وە ئافرەتی بت پەرسـتو خراپەکار، وەک چـۆن خوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَا تَنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ ﴿٢٢١﴾ ﴾ البقرة، (واتە: ئافرەتانـی هاوبـەش دانەر مارە مەکـەن، هەتا بروا دێنـن) وە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ ﴿٣﴾ ﴾ النور، (واتـە: ئافرەتـی داوێنپیسو زیناکەر مـارەی ناکات مەگەر کەسـێکی زیناکەر یان هاوبـەش دانەر).

(٥): ﴿ وَلَا تُؤْتُوا۟ ٱلسُّفَهَآءَ أَمْوَٰلَكُمُ ٱلَّتِى جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ قِيَٰمًا وَٱرْزُقُوهُمْ فِيهَا وَٱكْسُوهُمْ وَقُولُوا۟ لَهُمْ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴿٥﴾ ﴾:

(السفهاء) کـۆی (سـفیه) بریتیـە لـەو کەسـەی کـە نازانێت بـە جوانـی مامەڵە بـکات، یان عەقڵـی تـەواو نیـە وەک شـێت یـان شـێتۆکە، یـان جـاری پێنەگەیشـتووە، وەک منداڵو کەسـی ناژیـر، خـوا ﷻ قەدەغەی کـردوە لەسـەر سەرپەرشـتیاران ماڵی ئەم جۆرە کەسـانە بـدەن بـە دەسـتیانەوە، چونکە هێشـتا کەم عەقڵن مەترسـی ئەوەیـان لێدەکرێـت بەهەدەری بـدەن، چونکە خوا مـاڵو داراییەکانـی بۆ خزمەت کردنـی بەندەکان داناوە بـۆ بەرژەوەندی دنیـاو دوارۆژیـان، وە ئەوانـە ناژیـرو کـەم عەقڵن، بۆیـە ناتوانن ئـەو ماڵە لـە بەرژەوەندی خۆیانـدا بـەکار بێنن. بۆیـە فەرمانی کـردوە بە سەرپەرشـتیاران مـاڵو سـامانەکەیان نەدەن بـە دەسـتیانەوە، بەڵکو پێویسـتیەکانیان بـۆ تەواو بکەن لـە رزقو رۆزیو جـلو بەرگ، وە مامەڵـەی جوانیـان لەگەڵـدا بکـەنو پەیمانیان بدەنێ کە ئەگـەر گەورە بـوون ماڵەکانیان پێ دەدەنـەوە، وە دڵیـان راگیـر بکەن، خـوا ﷻ ئەو مـاڵو سـامانە دەداتە پاڵ سەرپەرشـتیاران، ئـەم دانـە پاڵـە خۆی لـە خۆیـدا ئاماژەیەکە بـۆ ئەوەی کە پێویسـتە لەسـەریان چـۆن ماڵو سـامانی خۆیـان دەپارێـزن، بە هەمان شـێوە پێویسـتە ماڵو سـامانی هەتیوانیـش بپارێزن.

وە ئـەم ئایەتـە بەڵگەیە لەسـەر ئـەوەی کە خەرجی هەر یەک لە شـێتو منـداڵو کەم عەقڵ لـە ماڵەکـەی خۆی بۆ خـەرج دەکرێـت، ئەگەر ماڵیـان هەبوو، لەبەر رسـتەی: ﴿ وَٱرْزُقُوهُمْ فِيهَا وَٱكْسُوهُمْ ﴾ بـە هەمـان شـێوە بەڵگەیە لەسـەر ئـەوەی کە وتـەی سەرپەرشـتیار قبووڵ دەکرێـت ئەگـەر بڵێـت ئەوەنـدە پارەم بۆی خـەرج کـردوە، چونکە خـوا ﷻ کردوونی بە دەسـت پـاک بەسـەر بـە ماڵەکانیانـەوە، وە پێویسـتە متمانە بە وتەی سـەر راسـتو ئەمین بکرێت.

(٦): ﴿ وَٱبْتَلُوا۟ ٱلْيَتَٰمَىٰ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغُوا۟ ٱلنِّكَاحَ فَإِنْ ءَانَسْتُم مِّنْهُمْ رُشْدًا فَٱدْفَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ أَمْوَٰلَهُمْ ۖ وَلَا

تَأۡكُلُوهَآ إِسۡرَافٗا وَبِدَارًا أَن يَكۡبَرُواْۚ وَمَن كَانَ غَنِيّٗا فَلۡيَسۡتَعۡفِفۡۖ وَمَن كَانَ فَقِيرٗا فَلۡيَأۡكُلۡ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ فَإِذَا دَفَعۡتُمۡ إِلَيۡهِمۡ أَمۡوَٰلَهُمۡ فَأَشۡهِدُواْ عَلَيۡهِمۡۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبٗا ﴿٦﴾ ﴾:

(الإبتلاء): بریتیــە لــە تاقیکردنەوە، بەو شـێوەی کە ماڵەکـە هەندێکی بدرێت بـە هەتیوەکە کـە لـە نزیک قۆناغـی ژیریدایە، هەتـا بزانرێـت ئەتوانێت مامەڵـەی پێوە بـکات، ئەگەر لە حاڵەتێکـدا نەیتوانـی بـە تەندروسـتیەوە مامەڵەی پێـوە بـکاتو پارەکەی بە هــەدەردا، ئەوە ماڵەکـە لـە لای سەرپەرشـتیار دەمێنێتــەوەو پێـی نـادات هەتـا ژیـرو عاقڵ دەبێـت، ئەگەر تەمەنیشـی گەورە بێت.

ئەگـەر ژیریـیو تێگەیشـتنی دەرکـەوتو گەیشـتە قۆناغـی ژن هێنـان، یـان شـوکردن، ﴿ فَٱدۡفَعُوٓاْ إِلَيۡهِمۡ أَمۡوَٰلَهُمۡ ﴾ بـە تـەواویو بـێ کـەمو کورتـی ﴿ وَلَا تَأۡكُلُوهَآ إِسۡرَافٗا ﴾ واتە: سـنوور مەشـکێنن ئەوەنـدەی کـە ڕێگـە پێـدراوە لـە لایـەن خـواوە، زێدەڕۆیـی مەکـەن تیایـدا، ﴿ وَبِدَارًا أَن يَكۡبَرُواْ ﴾ واتـە: وە ماڵەکانیـان مەخـۆن کاتێـک ئـەوان منداڵن کە لە داهاتــوودا نەتوانـن لێتـان وەربگرنــەوە، وە نەتوانن بــەر هەڵسـتیتان لێ بکەن لـە خواردنیدا، ئــەم دەسپێشـخەریە زۆرێـک لـە سەرپەرشـتیاران دەگرێتــەوە کـە لە خـوا ناترسـنو هیچ سـۆزو بەزەییەکیـان نیە لـە دڵدا بەرانبــەر بەوانەی کە لە ژێر دەسـتیان دان، ئەمـە بە هەڵێک دەزانـن شـتێکیان تیایـدا دەسـت بکەوێـتو پەلـە بکـەن هەتـا زوو ماڵـە حەرامەکەیان بە دەسـت بکەوێـت، خـوا ﷻ بـە تایبەت ئەمــەی قەدەغــە کردوە.

(٧): ﴿لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ ۚ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا ﴿٧﴾﴾:

عەرەب لە سەردەمی نەفامیدا بە هۆی خۆبەزل زانین‌و دڵ ڕەقیانەوە میراتیان نەدەدا بە لاوازەکان، وەک ئافرەتان‌و منداڵان، بەڵکو دەیاندا بە پیاوە بەهێزەکان، چونکە ئەوان- بە گومانی خۆیان- پیاوی ناو شەڕو کوشتار تاڵانکاری‌و دزیکردن بوون، خوای بە ڕەحم‌و بە بەزەیی ویستی یاسایەک بۆ بەندەکانی دابڕێژێت، پیاوان‌و ئافرەتانیان یەکسان بکات، وە بە هێزو لاوازەکانیان، هەتا فەرمانێکی کورت‌و پوختی پێشکەش

لِلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالْأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَاءِ نَصِيبٌ
مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالْأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ ۚ نَصِيبًا
مَّفْرُوضًا ﴿٧﴾ وَإِذَا حَضَرَ الْقِسْمَةَ أُولُو الْقُرْبَىٰ وَالْيَتَامَىٰ
وَالْمَسَاكِينُ فَارْزُقُوهُم مِّنْهُ وَقُولُوا لَهُمْ قَوْلًا مَّعْرُوفًا
﴿٨﴾ وَلْيَخْشَ الَّذِينَ لَوْ تَرَكُوا مِنْ خَلْفِهِمْ ذُرِّيَّةً ضِعَافًا
خَافُوا عَلَيْهِمْ فَلْيَتَّقُوا اللَّهَ وَلْيَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٩﴾ إِنَّ
الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَىٰ ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِي
بُطُونِهِمْ نَارًا ۖ وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا ﴿١٠﴾ يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي
أَوْلَادِكُمْ ۖ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنثَيَيْنِ ۚ فَإِن كُنَّ نِسَاءً
فَوْقَ اثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ ۖ وَإِن كَانَتْ وَاحِدَةً فَلَهَا
النِّصْفُ ۚ وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن
كَانَ لَهُ وَلَدٌ ۚ فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُ وَلَدٌ وَوَرِثَهُ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ الثُّلُثُ ۚ فَإِن
كَانَ لَهُ إِخْوَةٌ فَلِأُمِّهِ السُّدُسُ ۚ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِي بِهَا
أَوْ دَيْنٍ ۗ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ لَا تَدْرُونَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ لَكُمْ
نَفْعًا ۚ فَرِيضَةً مِّنَ اللَّهِ ۗ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١١﴾

کردن، هەتا نەفس‌و دەروونەکان لەسەری ڕابێن، پاشان درێژە پێدان دێت دوای کورتەکان، دەروونەکان بە ڕوویدا کرانەوە، وە دڵتەنگی ڕۆیی کە سەرچاوەکەی عادەتێکی ناشرین‌و خراپ بوو، دەفەرموێ: ﴿لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ﴾ واتە: (پیاوان) بەش‌و پشک (ی خۆیان هەیە) ﴿مِّمَّا تَرَكَ﴾ واتە: بەجێی هێڵراوە، ﴿ٱلْوَٰلِدَانِ﴾ واتە: باوک‌و دایک ﴿وَٱلْأَقْرَبُونَ﴾ گشتیە پاش تایبەتی، ﴿وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ﴾.

وەک ئەوە وایە بوترێ: ئایا ئەو بەشە دەگەڕێتەوە بۆ عورف‌و عادەت، یان بەخشش‌و خەڵاتێکی کەمیان بدەنێ بە قەد ویستی ئەوان؟ یان شتێکی دیاریکراو؟ خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿نَصِيبًا مَّفْرُوضًا﴾ واتە: بێگومان دیاری کردوە بۆی خوای زاناو دانا، وە لە داهاتوویەکی نزیکدا باس دەکرێت.

بە هەمان شێوە لێرەدا خەیاڵێکی بێ بنەمای تر هەیە، ڕەنگە کەسێک وا گومان بیات کە ئافرەتان‌و منداڵان بەشیان نیە مەگەر لە ماڵی زۆرو کەڵەکە بوودا نەبێت، خوا ﷻ ئەو گومانەی ڕەواندوەتەوە بەم ڕستە موبارەکە: ﴿قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ﴾ (ماڵەکە کەم بێ، یان زۆر) پاکی‌و بێگەردی بۆ باشترینی دادگەران.

(٨): ﴿ وَإِذَا حَضَرَ ٱلْقِسْمَةَ أُوْلُواْ ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينُ فَٱرْزُقُوهُم مِّنْهُ وَقُولُواْ لَهُمْ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴿٨﴾ ﴾

ئەمە یەکێکە لە فەرمانە جوانو گەورەکانی خوایە کە دڵ بە لای خۆیدا ڕادەکێشێت، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا حَضَرَ ٱلْقِسْمَةَ ﴾ واتە: (ئەگەر لە کاتی) دابەشکردنی میرات (ئەوانە لەوێ بوون) ﴿ أُوْلُواْ ٱلْقُرْبَىٰ ﴾ واتە: ئەو خزمانەی کە میرات نابەن بە بەڵگەی ﴿ ٱلْقِسْمَةَ ﴾ چونکە میرات بەران لەوانەن کە ماڵ دابەش دەکرێت بەسەریاندا، وە ﴿ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينُ ﴾ واتە: ئەو هەژارانەی کە شایستەن ﴿ فَٱرْزُقُوهُم مِّنْهُ ﴾ واتە: شتێک لەو ماڵەیان پێ بدەن، ئەو ماڵە کە هاتۆتە ژێر دەستان بەبێ هەوڵو تەقەلاو ماندو بوونو نارەحەتیو کولەمەرگی، چونکە دەروونیان حەزی لێیەتیو دڵیان بۆی دەجوڵێت، دڵەکانیان ناچار کردوە کە حەز لەو نازو نیعمەتە بکەن، کە زەرەری نیە بۆ ئێوەو، سوودی هەیە بۆ ئەوان.

لەو مانایەدا ئەمە وەردەگیرێت کە هەر کەسێک بزانێت، یان تەماشای شتێک بکات لەبەر دەستی مرۆڤدا بێت، پێویستە لەسەری پێی بدات بە پێی توانا، وەک چۆن پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {إِذَا أَتَى أَحَدَكُمْ خَادِمُهُ بِطَعَامِهِ، فَإِنْ لَمْ يُجْلِسْهُ مَعَهُ، فَلْيُنَاوِلْهُ أُكْلَةً أَوْ أُكْلَتَيْنِ، أَوْ لُقْمَةً أَوْ لُقْمَتَيْنِ} (أخرجه أحمد برقم: (٧٧٩٢)، والبخاري برقم: (٥١٤٤)، ومسلم برقم: (١٦٦٣)).

واتە: ئەگەر یەکێک لە ئێوە خزمەتکارەکەی هات بۆ لای بە خواردنەوە، با دایبنشێنێت لەگەڵ خۆیدا، ئەگەر داینەنیشاند لەگەڵ خۆی، با پاروویەک یان دوو پارووی بداتێ.

هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر کاتی بەرو بووم بهاتبایەتە پێش، دەیانهێنا بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ ئەویش پیرۆزی لەسەر دەکرد، (واتە: داوای بەرەکەتی بۆ دەکرد)، ئنجا تەماشای منداڵترین کەسی دەکردو پێی دەبەخشی، دەیزانی ئەو منداڵە بە تامەزۆرییەوە تەماشای دەکات، ئەمە هەمووی ئەگەر بەخشین گونجاو بوو، ئەگەر ئەوە نەگونجا- لەبەر ئەوەی مافی کەم عەقڵانی تێدا بوو، یان شتێک لەوە گرنگتر بوو- با پێیان بڵێ: ﴿ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴾ ڕەتیان دەکاتەوە ڕەتکردنێکی جوان، بە وتەی چاک، جگە لە وتەی خراپو نارێک.

(٩-١٠): ﴿ وَلْيَخْشَ ٱلَّذِينَ لَوْ تَرَكُواْ مِنْ خَلْفِهِمْ ذُرِّيَّةً ضِعَٰفًا خَافُواْ عَلَيْهِمْ فَلْيَتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلْيَقُولُواْ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلْيَتَٰمَىٰ ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِى بُطُونِهِمْ نَارًا وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا ﴿١٠﴾ ﴾

وتراوە: ئەم وتارە بۆ کەسێکە کە ئامادە بێت لە کاتی کۆچکردنی کەسێکداو ستەم لە وەسیەتەکەی بکات، خوا ﷻ فەرمانی بە دادپەروەری کردوە لە وەسیەتدا، وە بە یەکسانی

تیایدا، بە بەڵگەی ئەم ڕستەیە: ﴿ وَلْيَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴾ واتە: گوفتاری بە جێ کە لەگەڵ دادپەروەریو چاکەدا بگونجێت، ئەوان فەرمانیان پێکراوە بەوەی هەر کەسێک کە دەیەوێ وەسیەت بکات بۆ منداڵەکانی، وەسیەتێکی باشو دروست.

وتراوە: مەبەست لەمەدا سەرپەرشتیاری کەم عەقڵەکانە، لە شێتو منداڵو لاوازەکان، کە مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت لە بەرژەوەندی دینو دنیایان بەو شێوەیەی کە بۆ خۆیان حەز دەکەن لە دوای مردنیان مامەڵەیەکی جوانو تەندروست لەگەڵ منداڵەکانیاندا بکرێ ﴿ فَلْيَتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ﴾ لە سەرپەرشتی کردنیان بۆ کەسانی تر، واتە: بە شێوەیەک مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن کە لە خواترسانو خۆپارێزی پێوە دیار بێت، بە جۆرێک کە ئازاریان نەدەنو گاڵتەیان پێ نەکەن، بەڵکو پەروەردەیان بکەن بە خواپەرستی.

وە کاتێک کە فەرمانی کردوە بە سەرپەرشتیاران کە بەو کارە هەستن قەدەغەی لێکردوون لە خواردنی ماڵی هەتیو، وە بەڵێنی داوە بە سزایەکی زۆر سەخت، وەک دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلْيَتَٰمَىٰ ظُلْمًا ﴾ واتە: (ئەوانەی ماڵی هەتیوان دەخۆن) بە ناهەق، ئەم پەیوەند کردنە لەوەی پێشووەوە دەردەکرێ، لەوەی کە دروستە سەرپەرشتیار بە هەژاری، وە بە شێوەیەکی دروست، بەبێ زێدەڕۆیی ماڵی هەتیو بخوات، وە بە هەمان شێوە دروستە ئەو خواردنەی کە دەیخۆن تێکەڵی یەکتری دەکەن، هەر کەسێک بە ستەم ئەو ماڵە بخوات ﴿ إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِى بُطُونِهِمْ نَارًا ﴾ واتە: بە ڕاستی ئەوانەی کە ماڵی هەتیویان خواردووە ئەوە ئاگرێکیان خواردووەو ئەو ماڵە دەبێ بە ئاگر لە سکیاندا، بێگومان هەر خۆیان هۆکاری ئەوە بوون ﴿ وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا ﴾ واتە: ئاگرێکی سووتێنەری گڕگرتوو، بەڵگەیە لەسەر پیسیو ناشرینی خواردنی ماڵی هەتیو، ئەوە دەبێتە مایەی پێویست بوونی چوونە نێو دۆزەخیان، وە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە (خواردنی ماڵی هەتیو) یەکێکە لە تاوانە گەورەکان.

(١١-١٢): ﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِىٓ أَوْلَٰدِكُمْ ۖ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۚ فَإِن كُنَّ نِسَآءً فَوْقَ
ٱثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ ۖ وَإِن كَانَتْ وَٰحِدَةً فَلَهَا ٱلنِّصْفُ ۚ وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا
ٱلسُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُۥ وَلَدٌ ۚ فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُۥ وَلَدٌ وَوَرِثَهُۥٓ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ ٱلثُّلُثُ ۚ فَإِن كَانَ لَهُۥٓ
إِخْوَةٌ فَلِأُمِّهِ ٱلسُّدُسُ ۚ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِى بِهَآ أَوْ دَيْنٍ ۗ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ لَا تَدْرُونَ أَيُّهُمْ
أَقْرَبُ لَكُمْ نَفْعًا ۚ فَرِيضَةً مِّنَ ٱللَّهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١١﴾ وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ
أَزْوَٰجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ ۚ
مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ ۚ وَلَهُنَّ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِن لَّمْ يَكُن

لَكُمْ وَلَدٌ فَإِن كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ ٱلثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُم مِّنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ تُوصُونَ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمْرَأَةٌ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ فَإِن كَانُوٓا۟ أَكْثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمْ شُرَكَآءُ فِى ٱلثُّلُثِ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَىٰ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ غَيْرَ مُضَآرٍّ وَصِيَّةً مِّنَ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٌ ﴿١٢﴾

ئەم ئایەتانەو ئەو دەقەی کە لە کۆتایی ئەم سووڕەتەدا دێن کۆمەڵە دەقێکن کە باس لە میرات دەکەن بە ڕاستی لەگەڵ فەرمودەی عەبدوللای کوڕی عەباسدا هاتوە، سەرجەم فەرمانەکانی میرات دەگرێتە خۆ وەکو چۆن لەداهاتویەکی نزیکدا باس دەکرێت کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {أَلْحِقُوا الْفَرَائِضَ بِأَهْلِهَا، فَمَا بَقِيَ فَهُوَ لأَوْلَى رَجُلٍ ذَكَرٍ} (أخرجه البخاري برقم: (٦٣٥١)، ومسلم برقم: (١٦١٥)).

واتە: میراتەکان بگەیەنن بە خاوەنەکانیان، ئەوەی کە مایەوە با بۆ نزیکترین پیاوی نێرینە بێ). هەڵبەتە جگە لە میراتی داپیرە نەبێ کە لێرەدا باس نەکراوە. بەڵام لە کتێبی (السنن) جێگیر کراوە لە ڕێگای (موغیرەی کوڕی شوعبە، وە موحەممەدی کوڕی مەسلەمە)، وەک دەفەرموێ: {أَنَّ النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم أَعْطَى الْجَدَّةَ السُّدُسَ} (أخرجه الطبراني في الأوسط برقم: (٦٩٢٨)) واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ شەش یەکی دا بە داپیرە. لەگەڵ یەک دەنگی سەرجەم زانایان لەسەر ئەو بابەتە.

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِىٓ أَوْلَٰدِكُمْ﴾ واتە: منداڵەکانتان، ئەی دایکو باوکان کۆمەڵە سپاردەیەکتان لایە خوا ﷻ وەسیەتی لەسەر کردوون کە بە بەرژەوەندی دنیاو دوا ڕۆژیانەوە هەستن، فێری زانستو زانیاریو ڕەوشتو ئاکاریان بکەن، وە دوریان بخەنەوە لە شتی خراپو پڕوو پوچ، وە فەرمانیان پێ بکەن بە گوێڕایەڵی خواو بەردەوام بوون لەسەر خۆپارێزی، وەک چۆن خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ ﴿٦﴾﴾التحريم.

منداڵەکان لە لای دایکو باوکەکان وەسیەتیان بۆ کراوە. یان هەڵدەستن بە جێبەجێ کردنی ئەو وەسیەتە، یان وازی لێدەهێننو لە بیری دەکەن، ئەو کات تووشی هەڕەشەو سزا دەبن، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خوا بەرانبەر بە بەندەکانی لە دایکو باوکیان بەسۆزترە بۆیان، وەک چۆن وەسیەتی کردوە بۆ دایکو باوکان، لەگەڵ ئەو پەڕی سۆزیاندا بەرانبەر بە منداڵەکانیان.

پاشان باس لە چۆنیتی دابەشکردنی ماڵ (ی میرات) دەکات، وەک دەفەرموێ: ﴿لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ﴾ واتە: منداڵانی پشت، وە منداڵانی کوڕ، بەشی نێرینەیەکیان بە ئەندازەی

بەشی دوو مێینەیە، بە مەرجێک خاوەن بەشیان لەگەڵدا نەبێ، یان ئەوەی کە لە بەشەکان ماوەتەوە بە هەمان شێوە دابەشی دەکەن، زانایان لەسەر ئەوە یەک دەنگن، وە لەگەڵ بوونی منداڵی پشتدا ئەوە ئەوان دەبن بە میراتگر، وە لەم حاڵەتەدا بۆ منداڵانی کوڕ هیچ بەشێک نیە، لە کاتێکدا منداڵانی پشت نێر بن یان مێ بن، ئەمە لەگەڵ کۆکردنەوەی نێرو مێکاندا، وە لێرەدا دوو حاڵەت هەیە: بە تەنیا بوونی نێرینەکان، لە داهاتوویەکی نزیکدا حوکمی دێتە پێش، وە بە تەنها بوونی مێینەکان، وەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَإِن كُنَّ نِسَآءً فَوۡقَ ٱثۡنَتَيۡنِ﴾ واتە: کچانی پشت، یان کچانی کوڕ، لە سێ دانە زیاتر بن، ئەوە ﴿فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ وَإِن كَانَتۡ وَٰحِدَةً﴾ واتە: ئەگەر یەک کچ بوو، یان کچی کوڕ بوو ﴿فَلَهَا ٱلنِّصۡفُ﴾ ئەمەش بە یەک دەنگی زانایان.

ئەوەی ماوە کە بڵێین: ئەمە چ سوودێکی تێدایە کە بڵێین بۆ دوو کچ دوو نیوەیان بەردەکەوێ، یان دوو لەسەر سێ پاش یەک دەنگی زانایان لەسەر ئەمە.

وەلأم ئەوەیە: سوود وەردەگیرێت لە وتەی خوا ﷻ: ﴿وَإِن كَانَتۡ وَٰحِدَةً فَلَهَا ٱلنِّصۡفُ﴾ واتە: ئەگەر لە یەک دانە زیاتر بوو، بەشەکە دەگوازرێتەوە بۆ نیوە، ئەوسا هیچ شتێک نامێنێ جگە لە سێیەک نەبێ، بە هەمان شێوە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِ﴾ واتە: ئەگەر کچو کوڕێکی لە پاش خۆی بەجێهێشت ئەوە کوڕەکە دوو لەسەر سێ دەبا، خوا ﷻ هەواڵی داوە کە بە قەد دوو ئافرەت دەبات، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بۆ دوو کچ دوو لەسەر سێ هەیە.

بە هەمان شێوە ئەگەر کچ دوو لەسەر سێی برد لەگەڵ براکەیدا - کوڕەکە زیاتر زەرەر دەکات لە خوشکەکەی - ئەگەر بەشی خۆی ببات لەگەڵ خوشکەکەیدا ئەوە باشترو گونجاوترە، وە هەروەها وتەی خوا ﷻ دەربارەی دوو خوشک ﴿فَإِن كَانَتَا ٱثۡنَتَيۡنِ فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ﴾ النساء، باس لە دوو خوشک دەکات ئەگەر ئەو دوو خوشکە لەگەڵ دووریاندا لە یەکتر دوو لەسەر سێ ببەن، ئەوە دوو کچە لەگەڵ نزیک بوونیان لە پێشترن ئەو مافەیان پێ بدرێ، پێغەمبەر ﷺ دوو لەسەر سێی داوە بە دوو کچەکەی سەعد، وەک چۆن لە فەرمایشتی صەحیحدا هاتووە، ئەوە ماوە کە بوترێت: سوود لەم دەقەدا ﴿فَوۡقَ ٱثۡنَتَيۡنِ﴾ کامەیە؟

دەوترێت: سوودێکی تر لەم دەقەدا ئەوەیە -خواش زاناترە- بۆ ئەوەی بزانرێت ئەو بەشەی کە بریتیە لە دوو لەسەر سێ، زیاد نابێت بە ڕێژەی ئافرەتان لە سەروی دوو کەسەوە، بەڵکو لە دوو بەرەو سەرەوە دەبێت، بە هەمان شێوە دەقەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوە، ئەگەر کچی مردووەکە

تەنها بوو، بەرانبەر بە کچە کوڕی مردووەکە، یان کچانی کوڕی مردووەکە، ئەوە کچی مردووەکە نیوەی بەر دەکەوێت، ئەوە دوو لەسەر سێ دەمێنێتەوە کە خوا دیاری کردوە بۆ کچەکان، یان کچانی کوڕی مردوو شەش لەسەر یەک دەبەن، وە لەبەر ئەمەیە پێی دەوترێت شەش یەک، تەواوکەری دوو لەسەر سێیە، وە هاوشێوەی ئەوە کچە کوڕی مردوو لەگەڵ کچانی کوڕ، کە خوا ﷻ دەربارەی دایبەزاندووە. دەقەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە هەر کاتێک کچانی مردوو، یان کچانی کوڕی مردوو دوو لەسەر سێیان بەرکەوت، ئەوە جگە لە ئەوەی کە لە خوار ئەوانەوەیە لە کچانی کوڕ هیچی تریان بەر ناکەوێ، چونکە خوا تەنها دوو لەسەر سێی بۆ دیاری کردوون، وە هەموو ئەم فەرمانانە یەکدەنگی زانایانی لەسەرە.

کە دەفەرموێ: ﴿مِمَّا تَرَكَ﴾ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە میراتگران هەرچی لە پاش مردوو بەجێدەمێنێ دەبێ بە میراتیان، لە ماڵو سامانو خانووبەرەو زێڕو زیوو هاوشێوەی ئەوانە، تەنانەت خوێنباییش لە دوای مردنی پێویست دەبێت، وە هەروەها قەرزەکان کە لە گەردندان.

پاشان باسی میراتی دایکو باوک دەکاتو دەفەرموێ: ﴿وَلِأَبَوَيۡهِ﴾ واتە: دایکو باوک ﴿لِكُلِّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا ٱلسُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُۥ وَلَدٞ﴾ واتە: منداڵی باوک، یان منداڵی کوڕی مردوو، نێر بێت، یان مێ، یەک بێت، یان چەند کەسێک، ئەوە دایک لە شەش یەک زیاتری بەر ناکەوێت، لەگەڵ یەکێک لە منداڵەکان.

وە باوک لەگەڵ نێرینەکاندا لە ئەوان، شەش یەک زیاتر بەر ناکەوێت، ئەگەر منداڵەکە مێ بێ، یان زیاتر لە مێیەک بوو، وە لە پاش بەشەکان هیچ نەمایەوە-وەک باوکو دایکو دوو خوشک- وە هیچ عەصەبەیەکیش نەمابوو، ئەگەر شتێک مایەوە لە پاش بەشی کچ یان کچەکان، ئەوە باوک شەش یەک دەبات بە بەش، ئەوەی دەمێنێتەوە دەبێت بە عەصەبە، چونکە ئێمە بەشەکانماندا بە خاوەنەکانیان، ئەوەی کە مایەوە بۆ نزیکترین کەسی پیاو دەبێ، ئەوە لە پیشترە لە براو مامو هاوشێوەکانی ﴿فَإِن لَّمۡ يَكُن لَّهُۥ وَلَدٞ وَوَرِثَهُۥٓ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ ٱلثُّلُثُۚ﴾ واتە: ئەوەی ماوەتەوە بۆ باوکە، چونکە ماڵەکەی داوەتە پاڵ باوکو دایکەوە پێکەوە، پاشان بەشی دایکی جیا کردوەتەوە، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە، ئەوەی کە دەمێنێتەوە دەدرێت بە باوک. وە لەمەوە ئەو فێر دەبێ کە باوک -لەگەڵ نەبوونی منداڵدا- بەشی نیە، بەڵکو بەش بە عەصەبە دەبات هەموو ماڵەکە، یان ئەوەی ماوەتەوە لە پاش دابەشکردنەکە، بەڵام ئەگەر لەگەڵ باوکدا یەکێک لە ژنەکان مایەوە، ئەو ژنە بەشی خۆی دەبات، پاشان دایک سێیەکی مانەوەکەی دەبات، وە باوکیش ئەوەی ماوەتەوە دەیبات.

بەڵگە لەسەر ئەمە فەرمودەی خوای گەورەیە: ﴿وَوَرِثَهُۥٓ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ ٱلثُّلُثُ﴾ واتە: دایکی سێیەک دەباتو ئەوی تریشی بۆ باوکی دەبێ، ئەوە لەم دوو حاڵەتەدا، یان شەش یەک بۆ ژنو دایکو باوک، یان چوارێکە لە ژنو دایکو باوک، دەقەکە ئاماژە نیە لەسەر میراتگری دایک بە سێیەک بە تەواوی لەگەڵ نەبوونی منداڵدا، هەتا بوترێت: ئەو دوو وێنەیە جیا کراوەتەوە لەمە. ئەوە ڕوون دەبێتەوە بەوەی کە پیاو یان ژن وەری دەگرێت لە ئاستی وەرگرتنی غەرامە دایە، ڕاستەوخۆ لە ماڵەکە دەبێت، وە ئەوەی دەمێنێتەوە بۆ باوکو دایکێتی. لەبەر ئەوە ئەگەر سێیەکی ماڵەکە بدەین بە دایک، ئەوە دەبێت زیاتر بدرێت بە باوک لە مەسەلەی پیاوەکەدا، یان دەبێ زیاتر بدرێت بە باوک لە مەسەلەی ژنەکەیدا زیاتر بێت لە نیوەی شەش یەک ئەمەیش هاوشێوەی نیە، بێگومان وا باشترە یەکسان بکرێتەوە لەگەڵ باوکدا، یان دوو ئەوەندی دایکی پێبدرێت.

﴿فَإِن كَانَ لَهُۥٓ إِخْوَةٌ فَلِأُمِّهِ ٱلسُّدُسُ﴾ جا براکان لە یەک دایکو باوک بن، یان باوکی یان دایکی، بەربەست (حجب) کرابوون بە باوک، یان باپیرە، (بەڵام هەندێ جار وتراوە: مەبەست لە ڕووکەشی دەقەکە نیە).

کە دەفەرموێ: ﴿فَإِن كَانَ لَهُۥٓ إِخْوَةٌ﴾ گشتگیرە بۆ جگە لە میراتگران، بە بەڵگەی ئەوەی بەربەست (حجب) نەکراوە بە نیوە نایگرێتەوە، لەسەر ئەمە براکان لە سێ یەک بەربەست ناکات، جگە لەو برایانە نەبێت کە میرات دەبەن، وە حیکمەت لە بەربەست بوونیان لە سێ یەک، لەبەر ئەوەیە کە شتێکیان لەو ماڵە بۆ بە دەست بێت، ئەوەش بوونی نیە، خوا زاناترە، بەڵام بەو مەرجەی دوو کەس زیاتر بن، لێرەدا ئاڵۆزیەک دروست دەبێت، ئەویش هێنانی وشەی (الإخوة) براو خوشکان بە کۆ، وە وەڵامی ئەوە دەدرێتەوە بەو شێوەی کە مەبەست لەو کۆکردنەوەدا تەنها بۆ ژمارەیەو بۆ دووانە، هەندێ جار وشەی کۆ بەکار دێت، بەڵام مەبەستی پێی دووە، وەک چۆن لە فەرمایشتی خوای گەورەدا هاتووە دەربارەی داوودو سولەیمان (علیهما السلام) دەفەرموێ: ﴿وَكُنَّا لِحُكْمِهِمْ شَٰهِدِينَ ۝٧٨﴾ الأنبیاء.

وە دەربارەی برای دایکی دەفەرموێ: ﴿وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمْرَأَةٌ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ فَإِن كَانُوٓا۟ أَكْثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمْ شُرَكَآءُ فِى ٱلثُّلُثِ﴾ بە هەمان شێوە وشەی کۆی بەکارهێناوە کە مەبەستی پێی لە دوو زیاترە، ئەمەیش بە یەک دەنگی زانایان، ئەگەر کەسێک بمرێت، دایکو باوکو خوشک بەجێ بهێڵێت، ئەوە دایکەکە شەش یەکی بەر دەکەوێتو ئەوەی دەمێنێ بۆ باوکەکە دەبێت، حەجبی کردوون لە

سێ یەک، لەگەڵ ئەوەدا باوک هەموویانی حەجب کردوە، (بە مەرجێک لەسەر شێوەیەکی تر بێ، دایک سێ یەک بباتو ئەوەی دەمێنی بۆ باوک بێ).
پاشان دەفەرموێ: ﴿ مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصِي بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍۗ ﴾ واتە: ئەم بەشە میراتیانە لە کاتێکدا شایستەی میراتگرانە، دوای لێ دەرهێنانی قەرزی خوا لەسەر مردووەکە، یان قەرزی مرۆڤەکان، وە پاش وەسیەت کە کەسی مردوو وەسیەتی پێ کردوە، ئەوەی کە دەمێنێتەوە ئەوەماڵی بە جێماوە کە شایستەی میراتگرانە. وە وەسیەتی پێش خستووە لەگەڵ ئەوەدا دەکەوێتە دوای قەرزەوە، ئەمەیش لەبەر گرنگیەکەیەتی، وە لە بەر ئەوە ئەستەمە لە لای میراتگر کە هەستیت بە جێبەجێکردنی وەسیەتەکە، ئەگەرنا پێویستە قەرزەکان لە پێش وەسیەت جێبەجێ بکرێن، لە پارەی سەرەکی ماڵ، بەڵام وەسیەت دروستە لە سێ یەک یان کەمتر، بۆ کەسێکی نەناسراو جگە لە میراتگر، بەڵام ئەگەر وەسیەتەکە لەوە زیاتر بوو جێبەجێ ناکرێ، مەگەر بە پرسی میراتگر، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ءَابَآؤُكُمۡ وَأَبۡنَآؤُكُمۡ لَا تَدۡرُونَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ لَكُمۡ نَفۡعٗاۚ ﴾ ئەگەر خوا ﷻ ئەندازەی میراتی بگێڕایەتەوە بۆ عەقڵو ویستەکانتان، ئەوە زیان ڕووی دەدا هەر خوای زانا دەیزانێت، چونکە عەقڵەکان ناتەواون، نازانن کامە شایستەو چاکە لە هەموو کاتو شوێنێکدا، نەیدەزانی کام منداڵ، یان کام دایکو باوک بۆ ئەوان بە کەڵکەو دەتوانێت ویستەکانی دنیاو دوارۆژیان بۆ دەستەبەر بکات، ﴿ فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴾، واتە: ئەو خوایە فەرزی کردوە کە زانیاریەکەی دەوری هەموو شتەکانی داوە، وە شەریعەتەکەی پڕە لە دانایی، وە بە جوانترین شێوە ئەندازەگیری کردوە، عەقڵ ناتوانێت پەی بەو حوکمانە ببات کە پڕن لە بەرژەوەندی لە هەموو کاتو شوێنو دۆخێکدا دەگونجێت.

﴿ وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَٰجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن
لَّهُنَّ وَلَدٌ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ ٱلرُّبُعُ مِمَّا
تَرَكْنَ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ
وَلَهُنَّ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّكُمْ وَلَدٌ
فَإِن كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ ٱلثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُم
مِّنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ تُوصُونَ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ وَإِن كَانَ
رَجُلٌ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمْرَأَةٌ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ
وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ فَإِن كَانُوٓا۟ أَكْثَرَ مِن ذَٰلِكَ
فَهُمْ شُرَكَآءُ فِى ٱلثُّلُثِ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَىٰ
بِهَآ أَوْ دَيْنٍ غَيْرَ مُضَآرٍّ وَصِيَّةً مِّنَ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ
عَلِيمٌ حَلِيمٌ ﴿١٢﴾ تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ
وَرَسُولَهُۥ يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا
ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ
﴿١٣﴾ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُۥ
يُدْخِلْهُ نَارًا خَٰلِدًا فِيهَا وَلَهُۥ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٤﴾

﴿ وَلَكُمْ ﴾ ئـەی پیاوان ﴿ وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَٰجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ ﴾ منـداڵ دەچێتـە ئـەم چـوار چێـوەوە، کە بە مـەرج گیـراوە بە بـوونو نەبوونـی، منداڵی مردووەکـە، یان منداڵی کـوڕی مردووەکە، نێـر بێـت یان مێ، یـەک منداڵ یـان زیاتر، لـەو باوکـە بێـت یـان لـە جگـە ئـەو، وە منداڵـی کـچ لـە میراتگـری دەردە کرێـت.

پاشـان خـوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمْرَأَةٌ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ ﴾واتـە: لـە دایـک، وەک چۆن لە هەنـدێ خوێندنـەوە (القـراءات) هاتوە، وە زانایان یەک دەنگن لەسـەر ئەوەی کە مەبەسـت لـە بـراکان لێرەدا بـرای دایکیـە، ئەگـەر پیاوێک یـان ئافرەتێک منـداڵو بـاوکو باپیرو بـراو خوشـکی نەبوو، مەبەسـت لە (کەلالـە) ئەمەیە، (بـێ کەس) وەک چـۆن ئەبو بەکری صیدیـق خـوا لێـی ڕازی بێـت) شـی کردوەتـەوە، وە بێگومان لەسـەر ئەوە یـەک دەنگی دروسـت بوو لـە لای زانایان، سـوپاس بـۆ خوا.

﴿ فَلِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ ﴾ واتـە: (بـۆ هەر یەک) لە براو خوشـک ﴿ ٱلسُّدُسُ ﴾ شـەش یەک هەیـە ﴿ فَإِن كَانُوٓا۟ أَكْثَرَ مِن ذَٰلِكَ ﴾ واتـە: زیاتر لە یـەک کەس بوون ﴿ فَهُمْ شُرَكَآءُ فِى ٱلثُّلُثِ ﴾ واتـە: ئـەوە لە سـێ یـەک زیاتریـان بەرناکەوێـت، با لە دوو کـەس زیاتریـش بن، وە بەڵگـەش ئەم فەرمایشـتەیە: ﴿ فَهُمْ شُرَكَآءُ فِى ٱلثُّلُثِ ﴾ بێگومـان نێرینـەو مێینەکانیـان وەک یەکتـر میـرات دەبـەن، لەبـەر وشـەی (التشـریک) مەبەسـت پێی هاوبەشـیو یەکسانیە.

وە وشـەی ﴿ كَلَٰلَةً ﴾ بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی لقـەکان لـە نـەوەی منداڵـەکان بـۆ خـوارەوەو بنچینـەکان لـە ڕەگـەزی نێرینە (بـاوک، بابا) بۆ سـەرەوە، بەشـی منداڵی دایک

لــە کار دەخــەن، بە بوونــی ئەوان منداڵــی دایک بەشــی بەرناکەوێت لە میراتگــری بە یەک دەنگــی زانایان.

وە ڕســتەی: ﴿ فَهُمْ شُرَكَآءُ فِي ٱلثُّلُثِ ﴾ ئاماژەیــە بــۆ ئەوەی کە بــرای دایکو باوکی ئــەو مەســەلەی کە ناونراوە بــە (الحمارية) لە کار دەخــات، ئەویش بریتیە لــە: مێرد، دایک، بــرای دایکــی، بــرای دایــکو باوکــی. بۆ پیــاو نیوە، بــۆ دایک شــەش یەک، بۆ خوشــکی دایــک شــەش یــەک، وە برای دایکــی باوکی بێ بــەش دەکرێــت، چونکە خوا ســێ یەکی داوەتــە پــاڵ برایــان لە دایــک، ئەگەر بەشــداری بە بــرا دایــکو باوکیەکان بکرێــت، ئەوە کۆکردنەوەیــە لــە نێــوان دوو شــتدا کــە خــوا حوکمەکــەی جیــا کردوەتــەوە، بــە هەمان شــێوە بــرای دایکــی خاوەن فــەرزن، وە دایــکو باوکــی بنچینــەن (عصبة)ن. پێغەمبەر ﷺ دەفەرمــوێ: {أَلْحِقُـوا الْفَرَائِـضَ بِأَهْلِهَـا، فَـمَا بَقِيَ فَهُـوَ لأَوْلَى رَجُلٍ ذَكَـرٍ} (أخرجه البخـاري برقم: (٦٣٥١)، ومسـلم برقم: (١٦١٥)).

واتــە: میراتــەکان بگەیەنــن بــە خاوەنەکانیــان، ئــەوەی کــە مایەوە با بــۆ نزیکتریــن پیاوی نێرینــە بێ).

وە خــاوەن فــەرزەکان ئەوانــەن کــە خوا شــکو بەشــیانی دیاری کــردوە، لــەو بابەتە دوای وان هیــچ شــتێک نامێنێتــەوە، وە ئــا ئەوەش ڕاســتە لەمەدا.

بــەڵام بەشــی براو خوشــکە دایکو باوکیــەکان، یان باوکیــەکان، باس کراوە لە فەرمایشــی خــوای گەورەدا ﴿ يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي ٱلْكَلَٰلَةِ ﴿١٧٦﴾ ﴾النسـاء، خوشــکێک بە تەنهــا دایــکو باوکــی بێ، یــان باوکی بێ، نیــوەی بەر دەکەوێــت، وە ئەگــەر دووان بوون ئــەوە ســێ یەکیــان بەردەکەوێــت، وە یــەک خوشــکی دایــکو باوکــی لەگەڵ خوشــکی باوکیــدا، یــان چەنــد خوشــکێک، نیــوەی بــەر دەکەوێت، ئــەوەی کــە دەمێنێتەوە لە ســێ یەکەکــە بــۆ خوشــکەکەیە، یان بــۆ خوشــکە باوکیەکانــە، ئەویــش بریتیە لە شــەش یەک کــە تەواوکــەری ســێ یەکــە، وە ئەگــەر خوشــکە دایــکو باوکیەکان ســێ یەکیــان برد، ئــەوە بەشــی خوشــکانی باوکی دەکەوێــت واتە: (بێ بەش دەبن)، وەک لە پێشــەوە باســمان کــرد دەربــارەی کچــە دایکو باوکیــەکانو کچانی کــوڕ، وە ئەگــەر میراتگــرەکان چەند خوشــکو برایــەک بــوون، ئەوە بــۆ هــەر نێرینەیەک بــە ئەنــدازەی دوو مێینەیە.

ئەگــەر بوترێــت: ســوود وەر دەگیرێــت لــە حوکمــی میراتــی بکــوژ، وە کۆیلــە، وە

پێچەوانــەکاری لــە ئاینــدا، (المُبعـض)[١٢] وە نێرە مــووک، وە داپیرە لەگەڵ بــرا دایکیەکاندا، وە(العـول)، وە ڕەتکــردن، وە پەیوەنــدی خزمایەتــی، وە پاشــماوەی بنچینــە (عصبـة)، وە خوشــکانێ لــە دایکێکــی تــر، لەگەڵ کچــان، یــان کچانی کــوڕ، لــە قورئاندا یــان نەخێر؟ دەوترێــت: بڵــێ، چەندیــن ئاگادارکردنــەوەو ئامــاژەی تێدایــە تێگەیشــتن لێــی گرانــە بــۆ کەســێک بیری لــێ نەکاتــەوەو ڕانەمێنی تیایــدا، کە ئامــاژە دەکات بۆ هەمــوو ئەوانەی کە بــاس کــراوە، بەڵام بکــوژو پێچەوانە لــە ئاینــدا، دەزانرێت ئەمانە بــەش لە میــرات نابەن لە حیکمەتەکانــی خــوای گەورەیــە لە دابەشــکردنی ماڵدا لەســەر میراتگر، بە پێــی نزیکبوونو قازانجــی دنیــاو دوارۆژیــان. خوای گــەورە ئامــاژەی بەم حیکمەتــە کردوە کــە دەفەرموێ: ﴿ لَا تَدۡرُونَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ لَكُمۡ نَفۡعٗا ﴾ بەڕاســتی زانــراوە کــە بکوژ گەورەتریــن زیانی داوە لــە کــوژراو، دەی هیــچ زیــان لــەوە گەورەتــر نیــە، بۆیە دەبێــت لێــی بێبــەش بکرێت، وە دەزانرێــت کــە کوشــتن گەورەترین ڕێگــرە لە میــرات بــردن، وە دەبێتە مایــەی پچراندنی پەیوەنــدی خزمایەتــی، خــوا ﷻ دەربــارەی دەفەرمــوێ: ﴿ وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ ٧٥ ﴾الأنفـال، لەگــەڵ ئــەوەدا ئەو یاســا شــەرعیە جێگیــر بووە، ئــەوەی: (ئەو کەســەی کــە پەلــە بــکات لە شــتێکدا پێــش کاتی خــۆی، ســزا دەدرێــت بە بێبــەش بوون لێــی). وە بــەم بنچینەو هاوشــێوەی ئەمــە دەزانرێت ئــەوەی پێچەوانــەی ئاینی مــردوو بێت، هیــچ میراتیەکــی پــێ نادرێــت، لەبــەر ئــەوە دژ یەکــی پێویســتی کــردوە کــە گەیاندنــی پەیوەنــدی خزمایەتیــەو ڕەچەڵەکــە، وە بەرهەڵســتی کــردوە کــە بریتیــە لــە هەڵبژاردنــی ئاینێکــی تــر، لە هەمــوو ڕوویەکەوە جیــاوازە، لێرەدا جیــاوازی ئاینو پەیوەنــدی خزمایەتی پێکــەوە لــە دابەشــکردنی پێدانــی میراتــدا کۆناکرێتــەوە، وە ئەمــە ئەوەمان بــۆ دەردەخات کــە مافــی مســوڵمان لە پێشــترە لــە مافی خزمایەتــی بێبــڕوای دنیایــی، ئەگەر مســوڵمانێک بمرێــت، ماڵەکــەی دەگوازرێتــەوە بۆ ئەو کەســەی کە لە پێشــترە بۆی، ئەمەش فەرمایشــتی خــوای گەورەیە: ﴿ وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ ٦ ﴾الأحزاب، بەو شــێوە دەبێــت یــەک ئاینیــان هەبێــت، بــەڵام ئەگەر لــە ئایندا جیــاواز بوون، ئــەوە برایەتــی ئاینی بەهێزتــرە لــە برایەتــی ڕەچەڵەک. ئیبنــول قەییم لــە کتێبی (جلاء الإفهـام)دا دەڵــێ: (بیر لەم واتایــە بکــەرەوە لــە دەقــی میراتــدا، خــوا ﷻ باس لــە واتــای میرات لــە یەکتــر گرتن بە وشــەی ژن (الزوجـة) تەعبیری کردوە نەک (المـرأة) وەک دەفەرموێ: ﴿ وَلَكُمۡ نِصۡفُ

---

١٢) (المُبعض) ئەو کەسەیە کە بەشێکی کۆیلەیەو بەشێکی تری ئازادە. وەرگێڕ.

مَا تَـرَكَ أَزْوَاجُكُمْ ﴾ ئەمـە ئاگـادار کردنەوەیـە بـەوەی کە ئـەم دابەشـکردنە تەنها بە خێزانداریـە (الزوجية) کە هاوشـێوە بوونو پەیوەندی دروسـت دەکات. وە بـڕوادارو بێبڕوا، تێکەڵبـوونو پەیوەنـدی لـە نێوانیانـدا نیە، بۆیە میـرات لە نێوانیانـدا نیە، وە نهێنی وشـەکانی قورئـان لە تـاکو پێکهاتـەکان لە سـەرووی عەقڵـی مرۆڤەکانەوەیە).

بـەڵام کۆیلـە میـرات نابـاتو میراتی لـێ نابرێـت، ئەوەی کـە بۆچـی میراتی لـێ نابرێت ڕوونـە، چونکـەماڵێکی نیـە میراتی لێ ببرێـت، بەڵکو ئەوەی لە لایەتی هـی گەورەکەیەتی، بـەڵام دەربـارەی ئـەوەی کە میرات نابـات، چونکە هیچی بە دەسـت نیە، ئەگەر هەرچیشـی هەبێـت بـۆ گەورەکەیەتـی، وە ئەو هیچـی مردووەکـە نابێـت، ئەگەرنا وەک ئـەوە دەبوو کـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ﴾، یـان ﴿ وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَـرَكَ أَزْوَاجُكُمْ ﴾، یـان ﴿ فَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ ﴾ وە هاوشـێوەی ئەمانـە، بۆ کەسـێکە موڵکایەتـی بـۆ هەبێـت، بەڵام کۆیلـە خاوەنی هیچ شـتێک نیـە، بۆیـە میراتی بۆ نیـە. بـەڵام کەسـێک هەندێکی ئازاد بێـت هەندێکی کۆیلـە، ئەوە حوکمەکانـی جیاوازە، بە ئەنـدازەی ئـەوەی کە ئـازادە شایسـتەیەتی، بە پێی ئـەوەی کە خوا ﷻ بـۆی دیاریکردوە لە میراتـدا، چونکـە ئەوەندە ئـازادی تێدایە، کـە شایسـتەی موڵکایەتیە، وە بە ئەنـدازەی ئەوەی کۆیلایەتـی تێدایـە شایسـتەی میرات نیـە، کەواتـە (المُبعض) میـرات دەبـاتو میراتی لێ دەبرێـت، وە ئەنـدازەی ئـەو ئازادیەی کە هەیەتـی حەجب دەکرێت، وە ئەگـەر کۆیلەیەک سوپاسـکراو بێتو سەرزەنشـتکراو بێت، پاداشـتی وەرگرتبێتو سـزا درابێت، بـە ئەندازەی ئـەوە پێویسـتیەکانی بـۆ جێبەجی دەکرێـت، ئەمەش هەر بەو شـێوەیە.

ئنجـا ئـەوەی کە نێرەموو کـە (الخنثى) لـە یەکێک لەمانـە دەرناچێت، یان ئەوەیـە نێرینەیی ڕوونـە، یـا مێینەیـی ڕوونو ئاشـکرایە، یـان ئاڵۆزە، ئەگـەر ڕوون بـوو، ئەوە دیـارەو هیچ کیشـەی تێـدا نیـە، ئەگـەر نێرینـە بـوو حوکمـی نێرینـەی هەیـە، وە ئـەو دەقانـەی کـە دەربـارەی ئـەوە هاتـووە دەیگرێتەوە، وە ئەگـەر مێینـەی ڕوون بوو، ئەوە حوکمـی مێینەی هەیـە، سـەرجەم ئـەو دەقانەی دەربـارەی مێینە هاتـوون دەیگرێتـەوە. وە ئەگـەر ئاڵۆز بوو، ئەگـەر نێـرو مێـی تێدا یەکسـان بوو لـە وەرگرتنـی میراتـدا-وەک برای دایـک- ئەوەش ڕوونـەو هیـچ گرفتێکی نیـە، بەڵام ئەگەر میـرات وەرگرتنە کـەی جیاواز بوو بـە ئەندازەی نێرینەیـیو بـە ئەنـدازەی مێینەیـی، وە هیـچ ڕێگایەکمـان لەبەردا نەبـوو بگەین پێـی، پێی نادەیـن زیاتـر لـە دوو شـێوە، لەبـەر ئەوە سـتەم لەو کەسـانە نەکەین کـە میراتـی لەگەڵدا

دەبـەن، وە کەمتریشـی پێنادەیـن، لەبـەر مەترسـی ئـەوەی سـتەمی لێنەکەیـن، پێویسـتە ناوەندگیـری لـەو دوو کارەدا بکەیـن، وە دادپەروەرتریـن ڕێگایەک لـەو دوو ڕێگا بگرینە بـەر، خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ٱعۡدِلُواْ هُوَ أَقۡرَبُ لِلتَّقۡوَىٰ ﴿٨﴾﴾المائدة، وە هیـچ ڕێگـەو شـێوازێکی دیکـەی دادپەروەرانەمـان جگـە لەمە نیـە کە باسـکرا، ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَا ﴿٢٨٦﴾﴾البقرة، وە دەفەرمـوێ: ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ﴾التغابـن.

ئنجـا (میراتـی داپیـرە) بـرا دایـکو باوکیـەکان، یان باوکـی، ئایـا میراتی لەگەڵـدا دەبەن یـان نایبـەن؟ بێگومـان لە نامەکەی ئەبـو بەکری صیددیق ئامـاژە بەوە کراوە، کە بەڕاسـتی باپیـرە حەجبـی برا باوکیو دایکیـەکان دەکات، یان بـرای باوکی یان دایکـی، وەک چۆن بـاوک هەموویـان حەجـب دەکات. وە ڕوونکردنـەوەی ئـەوە بەو شـێوە دەبێت: بەڕاسـتی بـا پیـرە بـە بـاوک دەژمێردرێـت لـە چەندیـن شـوێنی قورئانـدا هاتـوە، وەک خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿إِذۡ حَضَرَ يَعۡقُوبَ ٱلۡمَوۡتُ إِذۡ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعۡبُدُونَ مِنۢ بَعۡدِي قَالُواْ نَعۡبُدُ إِلَٰهَكَ وَإِلَٰهَ ءَابَآئِكَ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ ﴿١٣٣﴾﴾البقرة، وە یوسـف ﷺ کـە دەفەرموێ: ﴿وَٱتَّبَعۡتُ مِلَّةَ ءَابَآءِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ ﴿٣٨﴾﴾یوسـف، خـوا ﷻ باپیرەو باپیرەی باوکـی بـە باوک نـاو هێنـاوە، ئەمە بەڵگەیە لەسـەر ئـەوەی کە باپیـرە پلەو پایـەی باوکی هەیـە، میـرات دەبـات وەک چۆن بـاوک دەیبـات، وە حەجـب دەکات وەک چۆن باوک حەجـب دەکات، زانایـان یەکدەنگـن لەسـەر ئـەوەی کـە باپیـرە هەمـان حوکمـی باوکی هەیـە لـە کاتـی نەبوونی باوکـدا، لـە میراتی لەگـەڵ منداڵـەکانو جگـە لەوان، لـە نەوەی بـراو مـامو منداڵەکانیـان، وە سـەرجەم بڕگەکانی میرات، بە هەمان شـێوە پێویسـتە حوکمی لـە حەجـب کردنی برای جگـە لە دایکی هەبێـت. وە ئەگەر کـوڕی کوڕ لە ئاسـتی کوڕی باوکـیو دایکیـدا بێت، ئەی بـۆ باپیرە لە ئاسـتی باوکدا نەبێـت؟ وە ئەگـەر باپیرەی باوک لەگـەڵ بـرازای مـردوودا، زانایـان یەک دەنگبن لەسـەر ئـەوەی کە حەجبـی دەکات، ئەی بـۆ باپیـرەی مردوو بـرای مردوو حەجـب نەکات؟ هیـچ بەڵگەیەک نیە لەسـە ئـەوەی کە بـرایمـردوو لەگـەڵ باپیـرەدا میـرات ببـەن، نـە دەق، نە ئامـاژە، نـە ئاگادارکردنـەوە، نە قیاسـی ڕاستەقینە.

ئنجـا باسـی (العـول) بێگومـان سـوود لـە حوکمەکـەی وەردەگیرێـت لـە قورئانـدا، لەبەر ئـەوەی خـوا ﷻ فەرزی کـردوە، وە بۆ خـاوەن میراتەکان بەشـی دیاری کـردوە، ئەوانیش لـە دوو حاڵـەت تێناپەڕن: یـان هەندێکیـان حەجبی هەندێکیـان دەکەن، یـا حەجبی ناکەن.

ئەگــەر هەندێکیــان حەجبی هەندێکیانی کرد، ئــەوە حەجب کراو دەردەچێت، وە شایســتەی هیــچ بەشــێک نابێــت، وە ئەگــەر هەندێکیــان هەندێکیــان حەجــب نەکــەن خاڵی نیــە، یان گشــت بەشــە بەجێماوەکــە ناگرێتــەوە، یــان دەیگرێتــەوە بەبــێ زیــادو کەم، یان بەشــەکە زیاتــرە لەســەر ماڵــە بەجێماوەکــە. لــە دوو حاڵەتەکــەی یەکەمــدا هەموو کەســێک بەشــی خــۆی دەبــات، وە لــە حاڵەتــی کۆتاییدا بریتیە لــەوەی ئەگەر بەشــەکان زیاتر بــوون لە ماڵە بەجێماوەکــە، ئــەوە لــە دوو حاڵەت تێپەڕ نــاکات: یان هەندێ لە بەشــی میراتگــرەکان کەم دەکەینــەوە کــە بۆی دیاری کــردوە، بەشــەکانی ئەوانی تری پــێ تەواو دەکەیــن، ئەمەیش پێــش خســتنە بەبــێ پێشــخەر (ترجیــح بغیــر مرجــح)، بێگومــان کــەم کردنــەوەی بەشــی یەکێکیــان لــە پێشــتر نیــە لە بەشــی ئەوەی تــر، حاڵەتــی دووەم دیــاری دەکرێــت، ئەویش بریتیــە لــە: ئێمــە بــە قەد پێویســت هەمــوو دانەیــەک بەشــی خــۆی پێدەدەین، وە دابەشــی دەکەیــن بەســەریاندا وەکو قــەرزە زیــادەکان لەســەر ماڵی قــەرزار، وە هیــچ ڕێگایەک نیە بمانگەیەنێــت بــەوە تەنها بــە (العول) نەبێــت، لێرەوە زانــرا کە عەول لە بەشــەکاندا خوا ﷻ ڕوونی کردوەتەوە لە کتێبەکەیدا.

وە بــە پێچەوانــەی ئــەم ڕێگایەی ســەرەوە کە باســمان کــرد (رد) دەناســرێت، ئەگــەر ماڵە بــە جێماوەکە بەشــی خاوەن بەشــەکانی پــڕ نەکــردەوە، وە شــتێک مایەوە مافی عەســەبەی نزیــکو دووری تێــدا نەبــوو، ئــەوە گەڕانــەوەی ئەو ماڵــە پێــی دەوترێت: پێش خســتن بە بــێ پێشــخەر (ترجیــحٌ بغیــر مرجــح)، وە ئەگــەر بیــدەن بــە یەکێکــی تــر جگە لــە خزمی مردووەکــە تاوانەو لادانەو دژی فەرمایشــتی خوایە کــە دەفەرموێ: ﴿ وَأُوْلُوا۟ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِى كِتَٰبِ ٱللَّهِ ﴿٧٥﴾ ﴾ الأنفــال، دیــاری کــردوە هەمــوو خــاوەن بەشــەکان بەشــی خۆیــان پــێ بدرێــت، بــە ئەنــدازەی بەشــەکانیان. لــە کاتێکــدا ژنو مێــرد لە خزمــان نین، نابێــت لــە مافــی خۆیــان زیاتریــان پــێ بدرێت(ئەمە لای ئــەوەی کــە بەشــی ژنو مێرد لە میراتیــدا بــە (رد) (واتــە: ڕەتکردنــەوە) نــادات، ئەوانــەش بۆ چوونــی زۆربــەی زانایانە کە کار بــە (رد) دەکــەن، کەواتــە: لەســەر ئەمــە هــۆکاری (رد) ئەوەیــە دەبێت خــاوەن بەش خــزم بێــت، وە لەســەر بۆچوونێکــی تــر ژنو مێرد وەک خــاوەن بەشــەکانی دیکەن، وەک چــۆن بــە (العول) بەشــەکەیان کەم دەبێــت، بە هەمان شــێوە بــە (رد) زیاد دەبێــت، هۆکار لێــرەدا ئەوەیــە کــە ئەمانیش خاوەن بەشــن، ئەمــە ئاشــکراو ڕوونترە لــە ئامــاژەی قورئانو ســوننەتو قیاســی ڕاســتو تەواو، خــوا زاناترە.

بـە هەمـان شـێوە بەمـە دەزانرێـت (میراتی خـاوەن خزمـان) ئەگەر مـردوو خـاوەن بەش، یـان عەسـەبەی لێ بەجـێ نەمابـوو، کارەکە دەمێنێتـەوە لە نێـوان ئەوەی ماڵو سـامانەکەی بگەڕێتـەوە بـۆ (بیت المال) خەزێنـەی دەوڵـەت بـۆ قازانجـی خەڵکی، یـان بگەڕێتـەوە بۆ خزمەکانـی کـە ئامـاژەن بـە میراتگـری کـە هیچ گومـان لـە خزمایەتیانـدا نیـە، وە بەڵگە لەسـەر ئەوە فەرمایشـتی خوای گەورەیە کە دەفەرمـوێ: ﴿وَأُوْلُواْ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ ۝٧٥﴾ الأنفال، وە ئەگـەر میراتگریـان دیاری کـرا، ئەوە بێگومـان زانراوە کە ئـەوان هیـچ بەشـێکی دیاریکراویـان نیـە لـە کتێبـی خـوادا، وە لـە نێوانی ئەوانو کەسـی مـردوودا تەنهـا ناوەندیارێـک (وسیط)ێک هەیـە بە هۆی ئـەوەوە بوون بە خـزم، لەو پلەو پایـەی خۆیانـدا دەمێننەوە. خـوا زاناترە.

ئنجـا (میراتـی ئـەوەی ماوەتـەوە لـە عەسـەبە) وەک کـوڕو بـراو منداڵەکانیـان، وە مـامو منداڵەکانی...هتـد، بە ڕاسـتی پێغەمبەر ﷺ دەفەرمـوێ: {أَلْحِقُوا الْفَرَائِضَ بِأَهْلِهَا، فَمَا بَقِيَ فَهُوَ لأَوْلَى رَجُلٍ ذَكَرٍ} (أخرجه البخاري برقم: (٦٣٥١)، ومسلم برقم: (١٦١٥)) واتە: میراتەکان بگەیەنـن بـە خاوەنەکانیـان، ئـەوەی کە مایـەوە با بـۆ نزیکترین پیـاوی نێرینـە بێ).

وە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَٰلِيَ مِمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ ۝٣٣﴾ النساء، ئەگـەر میراتەکانمـان بـە خاوەنەکانیاندا، ئەوە ئەو کەسـەی بە عەسـەبە مـاڵ دەبات هیچـی بـەر ناکەوێـت، وە ئەگـەر شـتێک بمێنێتـەوە، ئـەوە کـێ لە پێشـترە لای عەسـەبە دەدرێـت بـە ئەو، وە بـە پێـی ڕوو پلەکانیـان دەبێت.

ڕووەکانـی عەسـەبەکان بریتین لە پێنج دانە: کوڕ، پاشـان باوک، پاشـان بـراو منداڵەکانیان، پاشـان مامـەو منداڵەکانیان، پاشـان (الولاء) کـێ نزیکتر بێـت ئەوە پێـش دەخرێت، ئەگەر لـە یـەک لاوە بـوو کێ پلـەی نزیکترە، ئەگەر لـە پلـەدا وەک یەکتر بوون کـێ بەهێزترە، ئەویـش دایکو باوکـە، ئەگەر لە هەمـوو ڕووەکانـەوە وەک یەکتر بوون ئـەوە هەموویان بەشـدار دەبن. خـوا زاناترە.

بـەڵام بوونـی ئەو خوشـکانەی کـە لە دایکێکـی دیکـەن لەگەڵ کچـی مردووەکـەدا، یان کچانـی کـوڕی مـردوو عەسـەبەکان، ئـەوەی مایەوە لە بەشـەکان پـاش دابەش کـردن بۆ ئـەوان دەبێـت، چونکـە لـە قورئاندا شـتێک نیە کـە ئاماژە بکات بـەوەی کە خوشـکان بێ بـەش دەکرێـن بە هـۆی کچانی مردووەکـە. ئەگـەر کارەکە بەو شـێوەیە بوو، وە شـتێک مایـەوە پـاش ئـەوەی کـە کچـەکان بەشـی خۆیان بـرد، ئـەوە دەدرێـت بە خوشـکەکان،

ناگەڕێتــەوە بۆ عەســەبەیەک دوورتــر بێت لەوان وەک کــوڕی براو مامــە، وە ئەوەی لەوان دوورترە. خــوا زاناترە.

(١٣-١٤): ﴿ تِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِۚ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ يُدۡخِلۡهُ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ وَذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿١٣﴾ وَمَن يَعۡصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُۥ يُدۡخِلۡهُ نَارًا خَٰلِدٗا فِيهَا وَلَهُۥ عَذَابٞ مُّهِينٞ ﴿١٤﴾ ﴾:

درێــژەی ئــەو بابەتانــەی کە خــوا ﷻ باســی کرد ســنووری خوای گــەورەن، (مســوڵمان) پێویســتە لەســەریان بوەســتێت، وە ئەو ســنوورانە نەشــکێنێتو کەمتەرخەمیان تێــدا نەکات، وە بــە هەمان شــێوە ئــەو دەقە بەڵگەیە لەســەر ئــەوەی وەســیەتی میراتگر نەسـخ کراوەتەوە بــە ویســتی خــوای کاربەجێ، چونکــە لە بری ئەوەدا بەشــی بۆ دیــاری کردوون لــە میرات. پاشــان خــوا ﷻ دەفەرمــوێ: ﴿ تِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِ ﴾ وەســیەت بۆ میراتگر بــە زیاتر لە مافــی خــۆی دەچێتە چوار چێوەی ســنوور بەزاندنەوە، لەگەڵ ئەم فەرمایشــتەی پێغەمبەردا ﷺ کــە دەفەرموێ: {فَلا وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ} (أخرجه أحمد برقـم: (٢٢٣٤٨)، والترمذي برقـم: (٢١٢٠) وصحَّحَهُ الألباني).

واتە: میراتگر هیچ وەسیەتێکی بۆ نیە.

پاشــان بــاس لــە گوێڕایەڵی کــردنو ســەرپێچی کردنــی خــواو پێغەمبەرەکــەی دەکات بە گشــتی، لەبــەر ئــەوەی بچێتە چــوار چێوەی گشــتیەوە لــە پابەند بــوون بە یاســای میراتەوە، دەفەرمــوێ: ﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ﴾ بــە فەرمانبــەرداری فەرمانەکانــی، کــە گرنگترینیــان گوێڕایەڵــی کردنیەتی لە یەکتاپەرســتیدا، پاشــان فەرمانەکان بــە پێی جیاوازی پلەکانیــانو دوورکەوتنــەوە لە قەدەغەکراوەکان کــە گەورەترینیان شــیرکو هاوەڵدانانە بۆ خوا، پاشــان ســەرپێچیەکان لەســەر جیاوازی پلەکانیــان، ﴿ يُدۡخِلۡهُ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ﴾ هــەر کەســێک فەرمانــەکان جێبەجێ بکات، وە دوور بکەوێتــەوە لــە قەدەغەکــراوەکان، ئــەوە دەچێتە بەهەشــتەوەو رزگــاری دەبێت لە ئاگــری دۆزەخ ﴿ وَذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴾ ســەرکەوتنێکە کــە بە هۆیــەوە رزگاری بــووە لــە تووڕەیــیو ســزای خــوا ﷻ، وە ســەرکەوتووە بــە بەدەســت هێنانــی پاداشــتو ڕەزامەنــدی خــوا، بــە چێــژو لەزەتێکــی هەتــا هەتایــی کە لــە توانای کەسدا نیە وەســفی بــکات. کــە دەفەرمــوێ: ﴿ وَمَن يَعۡصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُۥ يُدۡخِلۡهُ نَارًا

خَـٰلِدًا فِيهَا وَلَهُۥ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴾ دەچنە چوار چێوەی سەرپێچییەوە هەر یەک لە کوفرو بێبڕوایی‌و هەموو ئەو تاوانانەی لە خوار ئەوەوەیە، هیچ لێکچوون شوبهاندنێکی تێدا نیە بە خەواریجەکان کە تەکفیری سەرپێچیکاران دەکەن. بە ڕاستی خوا ﷻ چوونە بەهەشتی پەیوەست کردوە بە گوێڕایەڵی کردنی خۆی‌و پێغەمبەرەکەی، وە بە هەمان شێوە چوونە ناو دۆزەخیشی پەیوەست کردوە بە سەرپێچی کردنی خواو، سەرپێچی پێغەمبەرەکەی، هەر کەسێک بە تەواوی گوێڕاڵی بکات ئەوە دەچێتە بەهەشت بەبێ سزادان، وە هەر کەسێک سەرپێچی خواو پێغەمبەرەکەی بکات بە تەواوی لەگەڵ ئەوەدا هاوەڵی بۆ دابنێ ئەوە دەچێتە دۆزەخو بە هەمیشەیی تێیدا دەمێنێتەوە، وە هەر کەسێک سەرپێچی‌و گوێڕایەڵی تێدا کۆببێتەوە، ئەوەندە چاکەی هەبێت شایستەی پاداشت بێت، بە هەمان شێوە لە بەرانبەردا ئەوەندە خراپەی هەبێت شایانی سزاو تۆڵە بێت، سەرجەم دەقەکان بەڵگەن لەسەر ئەوەی یەکتاپەرستەکان کە گوێڕایەڵی خوایان کردوە، بە یەکتاپەرستی بۆ هەمیشەیی لە دۆزەخدا نامێننەوە، چونکە یەکتاپەرستی ڕێگرە لە مانەوەیان بۆ هەمیشەیی لە نێو دۆزەخدا.

وَٱلَّٰتِي يَأۡتِينَ ٱلۡفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمۡ فَٱسۡتَشۡهِدُواْ عَلَيۡهِنَّ
أَرۡبَعَةٗ مِّنكُمۡۖ فَإِن شَهِدُواْ فَأَمۡسِكُوهُنَّ فِي ٱلۡبُيُوتِ
حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلۡمَوۡتُ أَوۡ يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلٗا ١٥
وَٱلَّذَانِ يَأۡتِيَٰنِهَا مِنكُمۡ فَـَٔاذُوهُمَاۖ فَإِن تَابَا وَأَصۡلَحَا
فَأَعۡرِضُواْ عَنۡهُمَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ تَوَّابٗا رَّحِيمًا ١٦
إِنَّمَا ٱلتَّوۡبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٖ
ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٖ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡۗ
وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ١٧ وَلَيۡسَتِ ٱلتَّوۡبَةُ لِلَّذِينَ
يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلۡمَوۡتُ
قَالَ إِنِّي تُبۡتُ ٱلۡـَٰٔنَ وَلَا ٱلَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمۡ كُفَّارٌۚ
أُوْلَٰٓئِكَ أَعۡتَدۡنَا لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا ١٨ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ لَا يَحِلُّ لَكُمۡ أَن تَرِثُواْ ٱلنِّسَآءَ كَرۡهٗاۖ وَلَا تَعۡضُلُوهُنَّ
لِتَذۡهَبُواْ بِبَعۡضِ مَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ
مُّبَيِّنَةٖۚ وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ فَإِن كَرِهۡتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ
أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَيَجۡعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيۡرٗا كَثِيرٗا ١٩

(١٥-١٦): ﴿وَٱلَّٰتِي يَأۡتِينَ ٱلۡفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمۡ فَٱسۡتَشۡهِدُواْ عَلَيۡهِنَّ أَرۡبَعَةٗ مِّنكُمۡۖ فَإِن شَهِدُواْ فَأَمۡسِكُوهُنَّ فِي ٱلۡبُيُوتِ حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلۡمَوۡتُ أَوۡ يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلٗا ١٥ وَٱلَّذَانِ يَأۡتِيَٰنِهَا مِنكُمۡ فَـَٔاذُوهُمَاۖ فَإِن تَابَا وَأَصۡلَحَا فَأَعۡرِضُواْ عَنۡهُمَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ تَوَّابٗا رَّحِيمًا ١٦﴾

واتە: ئەو ئافرەتانەی ﴿وَٱلَّٰتِي يَأۡتِينَ ٱلۡفَٰحِشَةَ﴾ واتە: زیناو داوێنپیسی دەکەن، وە وەسفی کردوە بە فاحیشە لەبەر خراپیو قێزەونیو ناشرینی کارەکە ﴿فَٱسۡتَشۡهِدُواْ عَلَيۡهِنَّ أَرۡبَعَةٗ مِّنكُمۡ﴾ واتە: لە پیاوە برواداره دادپەروەرەکانتان ﴿فَإِن شَهِدُواْ فَأَمۡسِكُوهُنَّ فِي ٱلۡبُيُوتِ﴾ (ئەگەر شایەتیاندا) زیندانیان بکەن لە دەرچوونیان لە ماڵ لەبەر ئەوەی کە تۆمەتبارن، بە هەمان شێوە زیندانی حەپس کردن، یەکێکە لە سزاکان ﴿حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلۡمَوۡتُ﴾ واتە: ئەمە ئەوپەڕی زیندانیە ﴿أَوۡ يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلٗا﴾ واتە: ڕێگایەک جگە لە زیندانی کردن لە ماڵدا. وە ئەم دەقە نەسخ نەکراوە، هەڵنەوەشێنراوەتەوە، بەڵام دادەنرێت هەتا کاتی دیاریکراو، لە سەرەتای ئیسلامدا بەم شێوەیە بوو، هەتا خوا ﷻ ڕێگەچارەی بۆ دۆزینەوە، ئەویش بەردباران کردنی خێزاندار بوو، قامچی لێدانی گەنج (بێ هاوسەر).

﴿وَٱلَّذَانِ يَأۡتِيَٰنِهَا﴾ بە هەمان شێوە ئەو دووانەی کاری خراپ دەکەن ﴿مِنكُمۡ﴾ لە پیاوانو ئافرەتان ﴿فَـَٔاذُوهُمَا﴾ ئازاریان بدەن بە زمانو سەرزەنشتیان بکەنو لێیان بدەن لێدانێک ببێتە مایەی ئەوەی واز لەو کارە قێزەونە بهێنن، کەواتە: ئەگەر پیاوان ئەو فاحیشەیان ئەنجامدا ئازار دەدرێن، بەڵام ئافرەتان زیندانی دەکرێنو سزاش دەدرێن. زیندانی کردن هەتا مردنە، وە ئازاردان کۆتایی دێت بە داوای لێبوردنو خۆ چاک کردن، وە لەبەر ئەمە خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿فَإِن تَابَا﴾ واتە: گەڕانەوە لەو تاوانەی

کـە کردوویانــەو پەشـێمان بوونەوە، وە جەختیــان کردەوە لەســەر ئەوەی جارێکــی تر ئەو کارە نەکـەن، ﴿ وَأَصۡلَحَا ﴾ چاکەیـان کـرد کـە بەڵگـە بێت لەســەر ڕاسـتیو دروسـتی تەوبەکردنیـان ﴿ فَأَعۡرِضُواْ عَنۡهُمَآ ﴾ واتـە: واز لـە ئازاردانیـان بهێنـن ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ تَوَّابٗا رَّحِيمًا ﴾ واتـە: زۆر لێبوردەیـە بەرانبـەر بە تاوانبـارانو هەڵـەکاران، زۆر بە ڕەحمو بەزەیـیو خـاوەن چاکەیە- لـە چاکەکانی- سـەرکەوتووی کـردوون لە تەوبەکـردنو لێی قبـووڵ کردوون لـەو تاوانانەی کـە پێشـتر کردوویانە.

لـەم دوو دەقەکـەدا ئـەوە دەردەکەوێت کە بەڵگەی سـەلماندنی زینا پێویسـتە چـوار پیاوی بـڕوادار بـێ، وە ئـەوە باشـترو چاکتـرە بـە مـەرج گرتنـی عەدالەت لـەو چوار شـایەتەدا، چونکـە خـوا ﷻ زۆر جەختـی کردوەتەوە لـەم کارە خـراپو قێزەونە کە زینایـە، تەنانەت شـایەتی ئافرەتـی بـە تەنهـا نـاوێ، بەهەمـان شـێوە لەگـەڵ ئافرەتانیشـدا، وە نابێ لـە خوار چـوار کەسـەوە بێ.

وە پێویسـتە شـایەتیەکەیان بـە ڕوونی ڕابگەیەنـن، وەک چۆن فەرمودە ڕاسـتەکان بەڵگەن لەسـەر ئـەو بابەتـە، وە ئـەم دەقـەش ئامـاژەی پـێ دەکات: ﴿ فَٱسۡتَشۡهِدُواْ عَلَيۡهِنَّ أَرۡبَعَةٗ مِّنكُمۡ ﴾ بەمـەش قایـل نەبـووە هەتـا دەفەرمـوێ: ﴿ فَإِن شَهِدُواْ ﴾ واتـە: پێویسـتە شـایەتیەکی ڕوونو ئاشـکرا بـێ بـە چـاو ببینـرێ، نـەک بە کینایـەو ئامـاژە کردن.

(١٧-١٨): ﴿ إِنَّمَا ٱلتَّوۡبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٖ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٖ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴿١٧﴾ وَلَيۡسَتِ ٱلتَّوۡبَةُ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلۡمَوۡتُ قَالَ إِنِّي تُبۡتُ ٱلۡـَٰٔنَ وَلَا ٱلَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمۡ كُفَّارٌۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَعۡتَدۡنَا لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا ﴿١٨﴾ ﴾:

تەوبـەو گەڕانـەوە بـۆ لای خـوا بـە دوو جـۆر دەبـێ: خـوا یارمەتـی بـدات بـۆ گەڕانەوە، وە قبـووڵ کردنـی پـاش ئـەوەی کە لـە بەندەکـەدا بینی، لێـرەدا هەواڵـی داوە کـە داوای لێخۆشـبوونی شایسـتە لەسـەر خـوا، مافێکە خوا لەسـەر خـۆی دانـاوە، ڕێزو شـکۆیە کە لە لایـەن خۆیـەوە بـۆ هـەر کەسـێک تاوانێک بـکات ﴿ بِجَهَٰلَةٖ ﴾ بـە نەفامیەک کـە ئاگای لـە دەرەنجامـی نەبووبێ کـە دەبێتـە مایەی توورەیـیو سـزای خـوا، وە نەفامیـەک لە لایەن تاوانبـارەوە کـە خوا دەیبینێـتو چاودێـری دەکات، وە نەفامیەکـی تر بـەوە لێکدەدرێتەوە بـڕوای لاواز بـووە، یان نەیماوە، بـەم جۆرە هەموو سـەرپێچیکارێک نەفامـە، ئەگەر زانایش بێـت کـە ئەو شـتە حـەڕامو قەدەغەکـراوە، بەڵکـو زانینی بـە حـەڕام مەرجە بۆ سـەرپێچی

کـردن (واتـە: هەتـا نەزانێـت حەرامـە ناوترێـت سـەرپێچی کـردوە) بۆیە لەسـەری سـزا دەدرێت.

﴿ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٍ ﴾دەگونجێـت ماناکـە بـەو شـێوە بـێ کـە تەوبـە بکـەن پێش مـردن، چونکـە بـە دڵنیایـی خـوا تەوبـە لـە بەنـدەی خـۆی قبـووڵ دەکات پێـش مردن، بـەڵام پـاش ئامادەبوونی مـردن بە هیچ شـێوەیەک تەوبە لە سـەرپێچیکاران قبـووڵ ناکات، وە گەرانـەوەش لـە سـەرپێچیکاران وەرناگرێـت، وەک دەفەرمـوێ: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَدۡرَكَهُ ٱلۡغَرَقُ قَالَ ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِيٓ ءَامَنَتۡ بِهِۦ بَنُوٓاْ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَأَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴿٩٠﴾ ﴾یونس (واتـە: هەتـا کاتێک کە خنکانـی گەیشـتێ «فیرعەون» وتی: بـڕوام هێنا کـە جگە لەوەی بەنـو ئیسـرائیل ئیمانیـان پێهێنـاوە، هیچ پەراسـتراوێکی دیکە نیـە، وە من لـە گەردنکەچانم بـۆ خـوا)، وە دەفەرمـوێ: ﴿ فَلَمَّا رَأَوۡاْ بَأۡسَنَا قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَحۡدَهُۥ وَكَفَرۡنَا بِمَا كُنَّا بِهِۦ مُشۡرِكِينَ ﴿٨٤﴾ فَلَمۡ يَكُ يَنفَعُهُمۡ إِيمَٰنُهُمۡ لَمَّا رَأَوۡاْ بَأۡسَنَاۖ سُنَّتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي قَدۡ خَلَتۡ فِي عِبَادِهِۦۖ ﴿٨٥﴾ ﴾غافر.

وە لێـرەدا دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَيۡسَتِ ٱلتَّوۡبَةُ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ﴾واتـە: سـەرپێچیەک کـە کوفـر نەبـێ.

﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلۡمَوۡتُ قَالَ إِنِّي تُبۡتُ ٱلۡـَٰٔنَ وَلَا ٱلَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمۡ كُفَّارٌۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَعۡتَدۡنَا لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا ﴾لەبـەر ئـەوەی تەوبـە لـەم حاڵەتەدا تەوبـەی ناچارییە، بۆیـە سـوودی نابێ بـۆ خاوەنەکـەی، تەنها تەوبەی بـە ئیرادەو ئـارەزووەوە سـوودی هەیە، وە دەگونجـێ مانـای ڕسـتەی ﴿ مِن قَرِيبٍ ﴾(ئـەوە بـێ) واتـە: تەوبە کردنەکـەی نزیک بێـت لەو تاوانـەی کـە ئەنجامیداوە، کـە پێویسـتە تەوبەی لەسـەر بکرێ.

واتاکـەی بـەم شـێوەیە دێـت: هـەر کەسـێک دەستپێشـخەری بـکات دوای ئەنجامدانـی تاوانەکـە، وە پەشـێمان ببێتـەوە ئـەوە بێگومان خـوا لێی خـۆش دەبێت. بـە پێچەوانەی ئەو کەسـەی بەردەوامە لەسـەر تـاوانو سـەرپێچی، هەتـا وای لێدێت تـاوان دەبێتە سـیفەتێکی چەسـپاو تێیدا، بە ڕاسـتی زۆر قورسـە لەسـەری تەوبـەی لێ بـکات، بە زۆری ئەو کەسـانە سـەرکەوتوو نابـن لە تەوبە کـردنو گەڕانەوە بۆ لای خـوا، وە هۆکارەکانی ئاسـان ناکات، وەک کەسـێک تـاوان ئەنجـام دەدات لەسـەر زانیـاریو دڵنیایـی تـەواو، وە کەمتەرخەمـی دەکات لـەوەی کـە خـوا دەیبینێت، ئـەوە بە ڕاسـتی خۆی دەرگـای ڕەحمـەتو میهرەبانی لـە خۆی داخسـتووە.

بەڵـێ، هەنـدێ جار خـوا بەندەکـەی سـەرکەوتوو دەکات، کـە بەردەوامە لەسـەر تاوانو سـەرپێچی کـردن بە ئەنقەسـتو بـە دڵنیایـی، لە تەوبـە کردنێکی ڕاسـتەقینە، کـە دەبێتە مایـەی ئـەوەی خـوا هەمـوو تاوانەکانـی بسـڕێتەوە، بـەڵام ڕەحمەتـی خـوا بـۆ یەکـەم نزیکتـرە، بۆیـەش بەمە کۆتایـی بە ئایەتەکـە هێنـاوە: ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ لـە زانیـاری خـوا ﷻ ئەوەیـە کـە دەزانێـت بـە پێـی ئەوە کـە شایسـتەیە بـە حیکمەتی خـۆی، وە لـە حیکمـەتو بەزەییەکانی سـەرکەوتووی دەکات، هەر کەسـێک شایسـتەی ئـەوە بێت، وە سـەر شـۆڕی دەکات ئەگـەر حیکمەتو دادگـەری خـوا وا بخوازێت، خوا زاناترە.

(١٩-٢١): ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُواْ ٱلنِّسَآءَ كَرْهًا ۖ وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُواْ بِبَعْضِ مَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَـٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ ۚ وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُواْ شَيْـًٔا وَيَجْعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا ﴿١٩﴾ وَإِنْ أَرَدتُّمُ ٱسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَّكَانَ زَوْجٍ وَءَاتَيْتُمْ إِحْدَىٰهُنَّ قِنطَارًا فَلَا تَأْخُذُواْ مِنْهُ شَيْـًٔا ۚ أَتَأْخُذُونَهُۥ بُهْتَـٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴿٢٠﴾ وَكَيْفَ تَأْخُذُونَهُۥ وَقَدْ أَفْضَىٰ بَعْضُكُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ وَأَخَذْنَ مِنكُم مِّيثَـٰقًا غَلِيظًا ﴿٢١﴾﴾:

لـە سـەردەمی نەفامیـدا ئەگـەر کەسـێک بمردابووایـە پێـش ژنەکـەی، کەسـێکی نزیکی هەبووایـە وەک بـرای پیاوەکـە، یـان ئامـۆزای، یـان هاوشـێوەی ئەمانـە، ئـەو لـە هەموو کـەس لە پێشـتر بـوو ببێتـە خاوەنـی ژنەکـە، وە دەیتوانـی بیپارێزی لـە خەڵکـی نەهێڵێت شـوو بـکاتو ڕێگـری لێ بکات، جـا ئەگەر پێی خـۆش بووایە، یـان پێی ناخـۆش بووایە، ئەگـەر پێـی خـۆش بووایـە لەسـەر مارەییەک دەیخواسـت بە ئـارەزووی خـۆی، وە ئەگەر ژنەکـە نـاڕازی بووایـە ڕێگریـی لێدەکـرد لە شـوو کـردن، ڕێگەی نـەدەدا شـوو بکاتەوە مەگـەر کەسـێک خـۆی ویسـتی لەسـەری بووایـە، وە هەنـدێ جـار ڕێگری دەکـرد لە بە شـوودانی هەتا شـتێکی لـە میراتەکە پـێ نەدابووایـە، یان مارەییەکـەی، وە بە هەمان شـێوە کەسـێک ڕێگـری لـە ژنەکـەی دەکرد لە بـەر ئەوەی حـەزی لێی نەبـوو هەتا بەشـێک لە سـامانەکەی پـێ بـدات، خـوا ﷻ قەدەغـەی کرد لەسـەر بـڕواداران تەنهـا لـە دوو حاڵەتدا نەبـێ: ئەگـەر خـۆی ڕازی بوو هاوسـەرگیریی لەگەڵ کەسـێکی نزیکـی مێردەکەی بکات، وەک چـۆن مەفهوومـی وشـەی ﴿كَرْهًا﴾ ئـەوە دەگەیەنـێ، یان تـا تاوانو فاحیشـەیەکی قێـزەون ئەنجـام بـدات، وەک: زینا، قسـەی ناشـرینو نامـۆ بـە مێردەکـەیو ئازاردانی (لێ

دەبیستریٚ)، ئەوە لەم حاڵەتەدا دروستە ڕێگری لێ بکات، وەک سزایەک لەسەر ئەو کردارە خراپەی، وە مافی خۆی لێ وەربگرێت، ئەگەر ڕێگریەکە شەرعی بوو دادگەرانە بوو[١٣].

پاشان دەفەرموێ: ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ئەمیش مامەڵە دەگرێتەوە بە گوفتارو کردار، پێویستە لەسەر پیاو مامەڵەی جوان لەگەڵ ژنەکەیدا بکات، وەک هاوڕێی چاک، وە دەست هەڵبگرێت لە ئازاردانی، وە چی لە توانای دایە لە چاکە دریٚغی نەکات، پێویستە لەسەر پیاو بەرانبەر بە ژنەکەی چاکە بە چاکە بداتەوە لەو کاتو شوێنەدا، ئەمەش بە پێی حاڵەتەکان گۆڕانکاریی بەسەردا دێ.

﴿فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَيَجْعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا﴾ واتە: ئەی پیاوان پێویستە لەسەرتان دەستبەرداری خێزانەکانتان نەبن، با حەزیشتان لە چارەیان نەبێ، ڕەنگە ئەمە خێرێکی زۆری تێدا بێت بۆتان، لەوانە جێبەجێ کردنی فەرمانی خواو قبووڵ کردنی وەسیەتی کە خۆشگوزەرانی دنیاو دواڕۆژی تێدایە.

وە لەوانە: زۆر کردن لە نەفسی خۆی لەگەڵ ئەوەی کە خۆشی ناوێت، بەڕاستی خۆگرتنو تێکۆشانی نەفسو دەروونی تێدایە، وە خۆ ڕازاندەوەیە بە ئاکارو ڕەوشتە بەرزەکان، وە خۆشەویستی بە دوای خۆیدا دێنێت، وە ئەمە ڕاستیەکی ڕوونە، وە ڕەنگە بە بۆنەی ئەوەوە منداڵێکی چاکی پێ ببەخشێ، کە قازانجی هەبێت بۆ دنیاو دواڕۆژی، ئەمە هەمووی لەگەڵ ئەوەدایە کە مرۆڤ بتوانێ خۆی لە تاوان بپارێزێ.

---

١٣) ئەگەر ژن داوێن پیسی کرد دەکرێ مێردەکەی بۆ ماوەیەک ڕایبگرێ هەتا لە بەردەم دادگا بە یاسای ئیسلام (ملاعنة) لە یەکتر جیادەکرێنەوە، وە بە هەمان شێوە ئەگەر ژنەکە قسەی ناشرینی بە مێردەکەی وت، مێردەکەی پاش ئەوەی دەگەڕێت بە دوای هۆکارەکانیدا خێزانەی ئازاد دەکات لەوەی دەیەوێت یان نایەوێت، پیاو مافی ئەوەی نیە لەسەر قیەی ناشرین خیزانی هەڵبواسێت نە تەلاقی بداتو نە لای خۆی بیهێڵێتەوە، ئەمە ستەمە، ستەمیش لە ئیسلامدا ڕەتدەکرێتەوە، وە (عضل) بەو مانایە نایەت کە پیاو بە ویستی خۆی ڕێگری لە ژن بکات بۆ زەواج، باشترین بەڵگە خێزانی (ثابت)ی کوڕی قەیسی کوڕی شەماسە بۆ ئەو مەسەلە. مەبەستی شێخ هەر ئەوەیەو هیچی تر. والله أعلم. وەرگێر.

وَإِنْ أَرَدتُّمُ ٱسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَّكَانَ زَوْجٍ وَءَاتَيْتُمْ
إِحْدَىٰهُنَّ قِنطَارًا فَلَا تَأْخُذُوا۟ مِنْهُ شَيْـًٔا ۚ أَتَأْخُذُونَهُۥ
بُهْتَـٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ٢٠ وَكَيْفَ تَأْخُذُونَهُۥ وَقَدْ أَفْضَىٰ
بَعْضُكُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ وَأَخَذْنَ مِنكُم مِّيثَـٰقًا غَلِيظًا
٢١ وَلَا تَنكِحُوا۟ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ
إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ فَـٰحِشَةً وَمَقْتًا وَسَآءَ
سَبِيلًا ٢٢ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَـٰتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ
وَأَخَوَٰتُكُمْ وَعَمَّـٰتُكُمْ وَخَـٰلَـٰتُكُمْ وَبَنَاتُ
ٱلْأَخِ وَبَنَاتُ ٱلْأُخْتِ وَأُمَّهَـٰتُكُمُ ٱلَّـٰتِىٓ أَرْضَعْنَكُمْ
وَأَخَوَٰتُكُم مِّنَ ٱلرَّضَـٰعَةِ وَأُمَّهَـٰتُ نِسَآئِكُمْ
وَرَبَـٰٓئِبُكُمُ ٱلَّـٰتِى فِى حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ
ٱلَّـٰتِى دَخَلْتُم بِهِنَّ فَإِن لَّمْ تَكُونُوا۟ دَخَلْتُم بِهِنَّ فَلَا
جُنَاحَ عَلَيْكُمْ وَحَلَـٰٓئِلُ أَبْنَآئِكُمُ ٱلَّذِينَ مِنْ
أَصْلَـٰبِكُمْ وَأَن تَجْمَعُوا۟ بَيْنَ ٱلْأُخْتَيْنِ إِلَّا
مَا قَدْ سَلَفَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ٢٣

وە ئەگـەر زانـی جیابوونـەوە تاکـە چارەسـەرە، وە خۆگرتنـەوە هیچ چارەسـەر نیـە، پێویسـت نـاکات خـۆی بگرێتـەوە، بەڵکـو هـەر کاتێـک ﴿ وَإِنْ أَرَدتُّمُ ٱسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَّكَانَ زَوْجٍ ﴾ واتـە: ویسـتی لەسـەر ئـەوە بـێ لـە خێزانەکـەی جیاببێتـەوەو ئافرەتێکـی تـر بخـوازێ، ئـەوە هیـچ گیروگرفتێکـی تێـدا نیـەو گوناهبـار نابـێ، بـەڵام ئەگەر ﴿ وَءَاتَيْتُمْ إِحْدَىٰهُنَّ ﴾ واتـە: جیابوونـەوە، یان ئەوەی کـە دەیخوازێ ﴿ قِنطَارًا ﴾ واتـە:ماڵێکی زۆری پـێ بـدات ﴿ فَلَا تَأْخُذُوا۟ مِنْهُ شَيْـًٔا ﴾ واتـە: بەڵکو بۆیـان ئامادە بکەنو دوای مەخـەن، وە ئـەم ئایەتـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی کە حەرام نیـە مارەیی هەر چەنـدە زۆر بێ، بەڵام باشـترو شایسـتەتر ئەوەیە شـوێن پێغەمبـەر ﷺ بکەویـن لـە کەم کردنـەوەی مارەییدا، ئـەوەی کە دەکرێت بـە بەڵگە ئەوەیـە کـە خـوا ﷻ هەواڵـی داوە لەسـەر ئەوەی مرۆڤـەکان ئـەم کارە دەکـەنو نکووڵی لـێ نەکـردوون لێشـی قەدەغە نەکـردوون، ئـەوەش بەڵگەیە لەسـەر ئەوەی کە حـەرام نیە، بـەڵام هەنـدێ جـار خـوا ﷻ مارەیـی زۆر قەدەغـە دەکات، ئەگەر هاتـوو زیانێکـی ئاینی تێدابـێ، وە هیـچ قازانجێکـی نەبـێ.

پاشـان دەفەرمـوێ: ﴿ أَتَأْخُذُونَهُۥ بُهْتَـٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴾ واتـە: بـە ڕاسـتی ئەمـە حەڵاڵ نابـێ، ئەگـەر بـە چەندەهـا جـۆر فێڵـی شـەرعی حەڵاڵی بکـەن (کە لـە شـەرعیش دا فێڵ بوونـی نیـە)، چونکـە گوناهەکـەی دیارو ئاشـکرایە.

وە خـوا ﷻ حیکمەتـی ئـەوەی ڕوون کردۆتـەوە وەک دەفەرمـوێ: ﴿ وَكَيْفَ تَأْخُذُونَهُۥ وَقَدْ أَفْضَىٰ بَعْضُكُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ وَأَخَذْنَ مِنكُم مِّيثَـٰقًا غَلِيظًا ﴾ (واتـە: وە چۆن چۆنـی وەریدەگرنـەوە لـە حاڵێکدا کـە چوونەتـە لای یەکدی، پێشـتر پەیمانێکـی پتەویان لێتـان وەرگرتبوو).

ڕوونکردنـەوەی بـەو شـێوەیە ژن پێـش گرێبەسـتی هاوسـەرگیری حەرامـە لـە پیـاو، وە ڕازی نەبـووە بـەوەی کـە حەلاڵـی بـێ مەگەر بـەو مارەییـە نەبێ کـە پێـی دەدات، ئەگەر جـووت بـوو لەگەڵیاو چووە لای کە پێشـتر لەسـەری حەرام بـووەو ڕازی نەبـووە بەوە ئیلا بەومارەییـە نەبـێ ئەوە پێویسـتە ئـەو مارەییەی پێ بـدرێ، چـۆن دەچێتـە لای ئافرەتێکەوە لـە بـری مارەییەکـدا کە جـارێ پێی نـەدراوە، چـۆن دەکـرێ کارەکە بکـرێو پارەکەش بـە قـەرز بمێنێتـەوەو پارەکـەش لـە کۆتایـی دا پێـی بـدرێ، ئەمـەش گەورەترین سـتەمە لـە ئافـرەت دەکـرێ، بـە هەمـان شـێوە خـوا ﷻ پەیمـانو بەڵێنێکـی قورسـی لـە پیاوان وەرگرتـووە بـۆ پێدانی مافـی ئافرەتـان، پاشـان دەفەرموێ:

(٢٢) ﴿ وَلَا تَنكِحُوا۟ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَمَقْتًا وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٢٢﴾ ﴾:

ئـەو ئافرەتانە مەخـوازن کە باوکتـان خواسـتوونی ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً ﴾ واتە: چونکە کارێکـی دزێـوو ناشـرینو زۆر قێزەونـە ﴿ وَمَقْتًا ﴾ تووڕەییـە لەلایـەن خـواو لە لایەن خەڵکـەوە بـە هـۆی ئـەوەی کـە کوڕەکـە ژنی باوکـی مـارە دەکات، یـان باوکەکـە ئەو کارە دەکات لـە بەرانبـەر کوڕەکـەی، لەگـەڵ ئەوەشـدا فەرمـان کـراوە بـەوەی کە چاک بێـت لەگـەڵ باوکیـدا ﴿ وَسَآءَ سَبِيلًا ﴾ واتـە: خراپتریـن ڕێگایە بۆ ئەو کەسـەی کە گرتویەتیـە بـەر، چونکە ئـەوە لە پاشـماوەکانی نەفامییە، کە ئیسـلام فەرمانی پـێ کردوە بە خۆپاراسـتنو خـۆ بەری کـردن لێی.

(٢٣-٢٤): ﴿ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَٰتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَٰتُكُمْ وَعَمَّٰتُكُمْ وَخَٰلَٰتُكُمْ وَبَنَاتُ ٱلْأَخِ وَبَنَاتُ ٱلْأُخْتِ وَأُمَّهَٰتُكُمُ ٱلَّٰتِىٓ أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَٰتُكُم مِّنَ ٱلرَّضَٰعَةِ وَأُمَّهَٰتُ نِسَآئِكُمْ وَرَبَٰٓئِبُكُمُ ٱلَّٰتِى فِى حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ ٱلَّٰتِى دَخَلْتُم بِهِنَّ فَإِن لَّمْ تَكُونُوا۟ دَخَلْتُم بِهِنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ وَحَلَٰٓئِلُ أَبْنَآئِكُمُ ٱلَّذِينَ مِنْ أَصْلَٰبِكُمْ وَأَن تَجْمَعُوا۟ بَيْنَ ٱلْأُخْتَيْنِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٢٣﴾ وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ ۖ كِتَٰبَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ ۚ وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَآءَ ذَٰلِكُمْ أَن تَبْتَغُوا۟ بِأَمْوَٰلِكُم مُّحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَٰفِحِينَ ۚ فَمَا ٱسْتَمْتَعْتُم بِهِۦ مِنْهُنَّ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً ۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا تَرَٰضَيْتُم بِهِۦ مِنۢ بَعْدِ ٱلْفَرِيضَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٢٤﴾ ﴾:

ئـەم ئایەتە پیرۆزانـە ئەمانە دەگرنە خۆ: حەرامکـراوەکان بە ڕەچەڵـەک، حەرامکراوەکان بە

شـیردانو شـیر خـواردن، حەڕامکراوەکان بـە خزمایەتـی، حەڕامکراوەکان بـە کۆکردنەوە (ی دوو خوشـک)، وە لەسـەر حەڵاڵکـراوەکان لـە ئافرەتانـدا، بـەڵام حەڕامکـراوەکان لە ڕەچەڵەکـدا بریتیـن لـە حـەوت دانـە کـە خوا ﷻ باسـی کـردوون: دایـک، هەمـوو ئەو کەسـانە دەگرێتـەوە کە لـە داوێنی دایکـەوە لە دایک بـوون، وە ئەگەر دووریـش بێت، وە دەچێتـە چوارچێـوەی کچەوە، خوشـکی دایـکو باوکی، یان لـە باوکی یان لـە دایکی، وە پـوور خوشـکی باوک، یان خوشـکی باپیـرە، میمک (پلـک): بریتیە لە هەموو خوشـکێکی دایـک، یـان خوشـکی داپیـرە، وە بـۆ سـەرەوە بەشـە میـرات بیات، یـان نەیبـات، کچانی بـرا، کچانـی خوشـک هەتـا خـوارەوە، ئەمانـە هەموویـان حەڕامکراوەکانـن بـە نـەژاد بە یـەک دەنگـی زانایـان وەک چۆن لـە دەقـی ئایەتەکەدا هاتـووە، وە جگـە لەوانـە دەچێتە چوارچێـوەی ﴿ وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَآءَ ذَٰلِكُمْ ﴾ وەک: کچـی پوور: کچە خوشـکی باوک، وە کچـە مـام، کچـە خـاڵ، وە کچە خوشـکی دایک.

ئنجـا حەڕامکـراوەکان لـە ڕێگـەی شـیردانەوە خـوا ﷻ باسـی کـردوە، لەوانـە: دایـک، خوشـک، وە حەڕامبوونـی دایـک لەگەڵ ئەوەدا کە شـیرەکە هی ئەو نیە، هی خاوەن شـیرە، بەڵگەیـە بـە ئامـاژە کـە خاوەن شـیر دەبێ بە بـاوک بۆ شـیر پێـدراو، ئەگـەر باوکایەتیو دایکایەتی جێگیر بوو، ئەوە لەسـەر لقو پۆکانیشـی دەچەسـپێت، وەک خوشـکەکانیان، وە ڕەچەڵـەکو لقەکانیـان، وە پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەفەرموێ: {يَحْـرُمُ مِنَ الرَّضَـاعِ مَا يَحْـرُمُ مِنَ النَّسَـبِ} (أخرجـه أحمد برقـم: (٣١٤٤)، والبخاري برقـم: (٢٥٠٢)).

واتـە: ئـەوەی لـە ڕێگـای شـیردانەوە حـەڕام بێت، ئـەوە بـە ڕەچەڵەکیـش حـەڕام دەبێت. قەدەغـە کـراو پەرشو بـڵاو دەکات بـە بۆنەی شـیردانەوە، وە ئەوەیشـی کە شـیری هەیە وەکو چـۆن خزمایەتـی بـڵاو دەبێتـەوە، وە لـە منداڵی شـیرەخۆرەوە تەنها بـۆ وەچەکانی، بـەڵام بـە مەرجێک شـیر دانەکـە پێنج جـار بێت لە مـاوەی دوو سـاڵدا، وەک لە سـوننەتدا هاتوە کـە پێغەمبـەر ﷺ ڕوونـی کردۆتەوە.

ئنجـا حەڕامکـراوەکان لـە ڕێگای خزمایەتیـەوە بریتین لە چـوار: حەڵاڵی بـاوکان هەرچەند بـۆ سـەرەوە بـێ، حەڵاڵـی منـداڵان هەرچەنـد بـۆ خـوارەوە بـێ، میراتگربن، یـان حەجب کـراو بـن، دایکانـی ژن هەرچەنـدە بـۆ سـەرەوە بـێ، ئـەم سـێ دانـە قەدەغـە دەکرێـن بە بەسـتنی گرێبەستی هاوسـەرگیری.

چـوارەم: (الربیبـة) کچی ژنی خۆیەتـی، هەرچەندە بۆ خـوارەوە بێ، ئەمە حـەڕام نابێت هەتا

نەچێتە لای ژنەکەیـەوە، وەک لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ وَرَبَٰٓئِبُكُمُ ٱلَّٰتِي فِي حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ ٱلَّٰتِي دَخَلۡتُم بِهِنَّ ﴾زۆربـەی زانایـان دەڵێن: کـە دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّٰتِي فِي حُجُورِكُم ﴾ ئـەم پێوەنـدە بە زۆریە، تێگەیشـتن لە دەقەکـە نیە، چونکـە ڕەبیبە حەڕام دەبێـت ئەگـەر چـی لە کۆشـی ئـەودا نەبێـت، بەڵام بـۆ ئـەم پەیوەنـد کردنە دوو سـوود هەیە:

یەکەمیـان: ئاگـادار کردنـەوەی تێدایە لە حیکمەتـی قەدەغەکردنی ڕەبیبـە، وە چونکە کچی ژنەکـەی لە پلـەی کچی خۆیدایە ناشـرینە ڕێگـای پێبدرێت.

دووەمیـان: بەڵگـەی تێدایە لەسـەر ئەوەی کە دروسـتە بـە تەنها لەگـەڵ ڕەبیبـەدا بمێنێتەوە، چونکـە لـە پلـەی ئەوەدایە لە کۆشـی پیاوەکـەدا بێـت وەک یەکێـک لە کچەکانـی. خوا زاناترە.

ئنجـا ئەوانـەی کە حەڕام کـراون بە هـۆی کۆکردنـەوەی دوو ژن لەگەڵ یەکتـردا پێکەوە لـە لای یـەک پیاو، بێگومان خـوا ﷻ کۆکردنەوەی دوو خوشـکی پێکـەوە قەدەغەکردوە، وە پێغەمبـەر ﷺ قەدەغـەی کـردوە کـۆ کردنەوە لـە نێـوان ژنو پورەکەیـدا (ئافرەتێکو خوشـکی باوکی ئافرەتەکە)، یـان میمـک (پلک)ەکەیدا[١٤].

چونکـە لـە نێوانـی هەریـەک لـەو دوو ژنـەدا خزمایەتـی قەدەغەکـراو هەیـە، ئەگـەر وا دابنرێـت یەکێکیـان نێـرەو ئـەوی تریـان مێیـە حەڕامـە لـە یەکتر مـارە بکرێـن، کەواتە: حەڕامـە پێکـەوە کۆبکرێنـەوە، وە لەبەر ئەوەش ئـەو کارە دەبێتە هۆی دابـڕانو لە ناوبردنی پەیوەنـدی خزمایەتـی، وە لـە حـەڕام کراوەکانـی ژنو ژنخوازیدا.

١٤) {لاَ تُنْكَحُ الْمَـرْأَةُ وَخَالَتَهَـا وَلاَ الْمَـرْأَةُ وَعَمَّتَهَـا} (أخرجـه مالـك برقـم: (١١٠٨)، والبخـاري برقـم: (٤٨٢٠)، ومسـلم برقـم: (١٤٠٨) مـن حديـث أبـو هريـرة).

* وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡۖ كِتَٰبَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡۚ وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَآءَ ذَٰلِكُمۡ أَن تَبۡتَغُواْ
بِأَمۡوَٰلِكُم مُّحۡصِنِينَ غَيۡرَ مُسَٰفِحِينَۚ فَمَا ٱسۡتَمۡتَعۡتُم بِهِۦ
مِنۡهُنَّ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةٗۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ فِيمَا
تَرَٰضَيۡتُم بِهِۦ مِنۢ بَعۡدِ ٱلۡفَرِيضَةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا
حَكِيمٗا (٢٤) وَمَن لَّمۡ يَسۡتَطِعۡ مِنكُمۡ طَوۡلًا أَن يَنكِحَ
ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ فَمِن مَّا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُم مِّن
فَتَيَٰتِكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۚ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِإِيمَٰنِكُمۚ بَعۡضُكُم
مِّنۢ بَعۡضٖۚ فَٱنكِحُوهُنَّ بِإِذۡنِ أَهۡلِهِنَّ وَءَاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ
بِٱلۡمَعۡرُوفِ مُحۡصَنَٰتٍ غَيۡرَ مُسَٰفِحَٰتٖ وَلَا مُتَّخِذَٰتِ
أَخۡدَانٖۚ فَإِذَآ أُحۡصِنَّ فَإِنۡ أَتَيۡنَ بِفَٰحِشَةٖ فَعَلَيۡهِنَّ نِصۡفُ
مَا عَلَى ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ مِنَ ٱلۡعَذَابِۚ ذَٰلِكَ لِمَنۡ خَشِيَ ٱلۡعَنَتَ
مِنكُمۡۚ وَأَن تَصۡبِرُواْ خَيۡرٞ لَّكُمۡۗ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ
(٢٥) يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُبَيِّنَ لَكُمۡ وَيَهۡدِيَكُمۡ سُنَنَ ٱلَّذِينَ
مِن قَبۡلِكُمۡ وَيَتُوبَ عَلَيۡكُمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ (٢٦)

﴿ وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ ﴾ واتە: خاوەن هاوسەرەکان، ئەوانە قەدەغەیە مارەبڕینیان، چونکە لە گەردنی پیاوێکدان، هەتا جیادەکرێنەوەو سووری مانگانەیان تەواو دەبێ ﴿ إِلَّا مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ ﴾ واتە: کەنیزەک، ئەگەر ئافرەتێکی بێبڕوای خاوەن مێرد دەستگیر بکرێ حەڵاڵە بۆ مسوڵمانان پاش دڵنیایی، بەڵام ئەگەر کەنیزەکێکی بە شوو دراو بفرۆشرێت، یان خۆی پێشکەش بکات، ئەوە مارە برینەکەی هەڵناوەشێتەوە، چونکە خاوەنی دووەم لە جێگای یەکەمدایە، وەک بەسەرهاتی بوریرە خوا لێی ڕازی بێ، کاتێک کە پێغەمبەر ﷺ سەرپشکی کرد[١٥].

کە دەفەرموێ: ﴿ كِتَٰبَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ ﴾ واتە: دەستی پێوە بگرنو ڕێنمایی لێ وەربگرن، چونکە بە ڕاستی شیفاو نووری تێدایەو بە درێژی باسی حەڵاڵو حەرامکراوەکانی تێدا یە.

وە دەچێتە چوار چێوەی فەرمایشتی: ﴿ وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَآءَ ذَٰلِكُمۡ ﴾ هەر شتێک باس نەکرابێت لەم دەقەدا بێگومان حەڵاڵەو پاکە، بەڵام ئەوەی حەرام دیاری کراوە، وە حەڵاڵ سنووری بۆ نیە دیاری نەکراوە، ئەویش ڕەحمێکە لە لایەن خواوەو ئاسانکاریکە بۆ بەندەکان.

کە دەفەرموێ: ﴿ أَن تَبۡتَغُواْ بِأَمۡوَٰلِكُم ﴾ بە ویستی خۆتان حەزتان لە کێیە لەو ئافرەتانەی کە حەڵاڵ کراون بۆتان خوازبێنیان بکەن لە کاتێکدا خۆتان ﴿ مُّحۡصِنِينَ ﴾ واتە: داوێن پاک بن لە زینا داوێن پیس نەبن.

﴿ غَيۡرَ مُسَٰفِحِينَ ﴾ (السفح): دەوترێ: (سفح الماء في الحلال والحرام) واتە: ئاوی

---

١٥) (أخرجه البخاري برقم: (٥٢٨٣)، وأحمد برقم: (١٨٤٤) من حديث إبن عباس).

خـۆی لـە حـەڵاڵو حەرامـدا دەرێژێـت، واتـە: زیناکـەران، زیناکـەر ناتوانێـت ژنەکـەی بپارێزێـت، چونکـە ئـارەزووی لـە حـەرامو قەدەغەکـراودا خاڵـی دەکاتـەوە، حـەزی بـۆ حـەلاڵ کەمتـر دەبێتـەوە، ئـەو کات ناتوانێـت پارێـزەری ژنەکـەی بێـت، وە بـە هەمـان شـێوە دەبێتـە بەڵگـە لەسـەر ئـەوەی کـە مارە نـاکات جگە لـە داوێن پـاک نەبێـت، لەبەر ئەوەی خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ٱلزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ ﴿٣﴾﴾النور.

دەفەرمـوێ: ﴿فَمَا ٱسْتَمْتَعْتُم بِهِۦ مِنْهُنَّ﴾ واتـە: لەوانەی هاوسـەرگیریتان لەگەڵدا کردوون ﴿فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾ واتـە: مارەییەکەیـان (پێبـدەن) بەرانبـەر بـە چێـژ وەرگرتن، هـەر بۆیـە ئەگـەر پیـاو بچێتـە لای ژنەکەیـەوە مارەییەکـە پێویسـت دەبێـت لەسـەری ﴿فَرِيضَةً﴾ واتـە: پاداشـتی مارەییەکان فەرز کراوە لە سـەرتان لەلایەن خـوای گەورەوە، نـەک وەکـو بەخشـینو کۆمەکی ئەگـەر بیەوێـت جێبەجێی بـکات ئەگەر بیەوێـت ڕەتی بکاتـەوە، یان مانـای وتەی ﴿فَرِيضَةً﴾ واتـە: دیارکراوە لـە لایەن خۆتانەوە، پێویسـتە لە سـەرتان هیچی لـێ کـەم نەکەنەوە.

﴿وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا تَرَٰضَيْتُم بِهِۦ مِنۢ بَعْدِ ٱلْفَرِيضَةِ﴾واتـە: گوناهبـار نابـن ئەگەر زیاتـر لـە سـەرووی مارەییـەوە بـدەن بـە ژنەکانتـان، یـان هەندێکی لـێ کەم بکەنـەوە بە ڕەزامەنـدی هـەردوولاو لـە دڵـەوە دەربچێـت لـە پـاش دیاریکردنـی مارەیی ئەمە قسـەی زۆرێـک لـە توێژەرەوانـی قورئانـە، وە زۆربەیـان وتوویانـە: ئـەم دەقـە دەربـارەی چێـژ وەرگرتـن (متعة) لـە ئافرەتان دابەزیوە لە سـەرەتای ئیسـلامەوە، پاشـان پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغـەی کـردو فەرمانی بە وەسـتاندنی کرد، پاشـان ئەگەر ئـەو ماوەیەی کە لـە نێوانیاندا بـوو تەواو بووایـەت ڕازی دەبوون دوای دیاریکردنی مارەییەکە، هیچ کێشـەیەکیان لەسـەر نیە، خـوا زاناترە.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ واتـە: تـەواوی زانسـتو تـەواوی حیکمـەتو دانایـی، لـە زانسـتو داناییەکانـی ئـەم شـەریعەتەی بـۆ دانـاون، وە ئەم سـنوورەی بۆ دیـاری کردوون کـە جیاکارە لـە نێـوان حـەڵاڵو حەرامدا.

(٢٥): ﴿وَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ مِنكُمْ طَوْلًا أَن يَنكِحَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ فَمِن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم مِّن فَتَيَٰتِكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ ۚ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَٰنِكُم ۚ بَعْضُكُم مِّنۢ بَعْضٍ ۚ فَٱنكِحُوهُنَّ بِإِذْنِ أَهْلِهِنَّ وَءَاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ مُحْصَنَٰتٍ غَيْرَ مُسَٰفِحَٰتٍ وَلَا

﴿ مُتَّخِذَٰتِ أَخْدَانٍۚ فَإِذَآ أُحْصِنَّ فَإِنْ أَتَيْنَ بِفَٰحِشَةٍ فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى ٱلْمُحْصَنَٰتِ مِنَ ٱلْعَذَابِۚ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِيَ ٱلْعَنَتَ مِنكُمْۚ وَأَن تَصْبِرُوا۟ خَيْرٌ لَّكُمْۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٥﴾ ﴾.

پاشـان خوا سـبحانه وتعالـی هەر کەسـێکە مارەیـی هاوسـەرگیریی ئافرەتانـی داوێن پاکی پـێ نـەدرا، واتـە: ئافرەتانـی ئـازاد، وە لە خۆشـی ترسـا تووشـی گوناهو تـاوان بـێ، واتە: زینـا کـردن، یـان نارەحەتیەکـی زۆر، وە بۆی دروسـتە هاوسـەرگیریی لەگـەڵ کەنیزەکە بـڕوادارەکان بـکات، ئەمـە بە پێـی ڕواڵەتـی حاڵەتەکـە ئەگەرنا خـوا زاناترە بە بـڕواداری ڕاسـتگۆ لـە غەیری خـۆی، وە کاروبارەکانی دونیا لەسـەر ڕواڵەتی شـتەکان مامەڵەی لەگەڵ دەکـرێ، بـەڵام ئەحکامەکانو کاروبارەکانی دوارۆژ لەسـەر بنچینەی شـارەوەو پەنهانەکانە. ﴿ فَٱنكِحُوهُنَّ ﴾ واتـە: کەنیزەکـەکان ﴿ بِإِذْنِ أَهْلِهِنَّ ﴾ واتـە: گەورەکانیـان، یـەک دانـە، یـان چەنـد دانەیـەک ﴿ وَءَاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ﴾ واتـە: بـا کەنیزەکیش بـن، پێویسـتە مارەییـان پـێ بدرێت وەک چـۆن دەدرێت بـە ئافرەتی ئازاد. بەڵام دروسـت نیـە مارەکردنـی کەنیـزەک مەگـەر ﴿ مُحْصَنَٰتٍ ﴾ داوێـن پـاک بـن لـە زینـا ﴿ غَيْرَ مُسَٰفِحَٰتٍ ﴾ واتـە: بە ئاشـکرا زینا نەکەن ﴿ وَلَا مُتَّخِذَٰتِ أَخْدَانٍ ﴾ واتە: دۆسـتداری بـە پەنهانـی نەکـەن (وەک چۆن بـە ئاشـکرا نایکەن).

بـە پوختـی بەڕاسـتی دروسـت نیە بۆ مسـوڵمانی ئـازاد کۆیلە مارە بـکات، مەگـەر بە چوار مـەرج کـە خوا ﷻ لـە قورئاندا باسـی کـردوە: بڕوابوونیـان، وە داوێن پاکیان بە ئاشـکراو نهێنـی، وە لـە توانایـدا نەبێـت ئافرەتـی ئـازاد مـارە بـکات، وە لەوە بترسـێت کە تووشـی داوێـن پیسـی ببێـت، ئەگـەر ئەم مەرجانـەی تێـدا هاتە جێ دروسـتە مارەیـان بکات.

وە لەگـەڵ ئەمـەدا ئارامگرتـن لـەوە باشـترە کـە مارەیـان بـکات، لەبـەر ئـەوە منداڵەکانی ڕووبـەڕووی کۆیلایەتـی دەبنـەوە، وە جۆرێـک لـە بە کـەم زانیـنو عەیبەی تێدایـە، ئەمە ئەگـەر لـە توانایدا بوو ئـارام بگرێت، بەڵام ئەگـەر ئارامی نەگرت لە شـتە قەدەغەکراوەکان ئیلـلا بـەوە نەبێـت کە مارەیان بـکات، ئەوە پێویسـتە ئەنجامی بدات، وە لەبـەر ئەمە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَأَن تَصْبِرُوا۟ خَيْرٌ لَّكُمْۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾.

وە کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَإِذَآ أُحْصِنَّ ﴾ واتـە: ئەگـەر کەنیزەکـەکان شـوویان کـرد، یـان مسـوڵمان بـوون ﴿ فَإِنْ أَتَيْنَ بِفَٰحِشَةٍ فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى ٱلْمُحْصَنَٰتِ ﴾ (پاشـان خراپەیەکـی ئاشـکرایان کـرد وەک زینـا ئـەوە) نیـوەی ئافرەتـە ئازادەکانیـان لەسـەرە

﴿ مِنَ ٱلۡعَذَابِ ﴾ (لـە سـزاداندا). وە ئـەو سـزایە دەبـێ جیابکرێتەوەو بـەش بکرێت کـە بریتیـە لـە: جەڵد لێـدان، لێیـان دەدرێـت پەنجا جەڵـد، بـەڵام ڕەجم لەسـەر کەنیزەک نیـە، لەبـەر ئـەوە بەش ناکرێت، لەسـەر قسـەی یەکـەم ئەگـەر ژنیـان نەهێنا بـوو تۆڵەیان (حد)یـان لەسـەر نیـە، تەنهـا سەرزەنشـت دەکرێـنو دوور دەخرێنـەوە لـە فاحیشـە، وە لەسـەر قسـەی دووەم: ئەگـەر کەنیزەکە بێبـرواکان کاری فاحیشـە ئەنجام بـدەن، بە هەمان شـێوە سەرزەنشـت دەکرێـن، وە بـەم دوو ناوە پیـرۆزە ئەم ئایەتـە پیرۆزەی تـەواو کردوە ﴿ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ چونکـە ئـەم حوکمانـە ڕەحمـەتو ڕێزو چاکـەی خوایە بـۆ بەندەکان، کارەکانـی لەسـەر تەنگ نەکـردوون، بەڵکو گەیشـتوەتە ئەوپـەڕی بەرفراوانـی، وە لەوەیە لـە باسـکردنی لێخۆشـبووندا لە پاش باسـی تۆڵەو سـزادا (حـد) ئاماژەیەک بێـت بۆ ئەوەی کـە بـە هـۆی تۆڵەکانـەوە (حـدود) خـوا لـە تاوانـی بەندەکانی خـۆش بێـت، وەک چۆن لەوبـارەوە فەرمـوودە هاتـووە، وە حوکمـی کۆیلە کە باسـکراوە وەک حوکمـی کەنیزەک وایـە، چونکە جیـاوازی نیـە لـە نێوانیاندا.

(٢٦-٢٨): ﴿ يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُبَيِّنَ لَكُمۡ وَيَهۡدِيَكُمۡ سُنَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ وَيَتُوبَ عَلَيۡكُمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿٢٦﴾ وَٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡكُمۡ وَيُرِيدُ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلشَّهَوَٰتِ أَن تَمِيلُواْ مَيۡلًا عَظِيمٗا ﴿٢٧﴾ يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمۡۚ وَخُلِقَ ٱلۡإِنسَٰنُ ضَعِيفٗا ﴿٢٨﴾ ﴾:

خـوا ﷻ هەواڵ دەدات بە منەتـی گەورەو چاکەی فراوانی خۆی، وە جـوان پەروەردەکردنی بەندەکانـیو ئاسـانی ئاینەکەیو دەفەرمـوێ: ﴿ يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُبَيِّنَ لَكُمۡ ﴾ واتـە: ئەوەی کە پێویسـتتان پێـی دەبێـت لە ڕوونکردنـەوەی هەق لە ناهەقو پـووچ، وە لە حـەڵاڵو حەڕام. ﴿ وَيَهۡدِيَكُمۡ سُنَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ ﴾ ئەو نیعمەتانەی کە ڕشـتوویەتی بەسـەریاندا لـە پێغەمبـەرانو شـوێنکەوتووانی، لـە ژیانـە سـتایش کراوەکانیانـداو لـە کـردارە پـڕ ماناکانیانـدا، وە سـەرکەوتنی تەواویان لە سـەرجەم بوارەکاندا، هەر بۆیە ئەوەی ویسـتویەتی جێبەجێـی کـردوەو ڕوونـی کردووتـەوە، وە بە شـێوەیەک ڕوونـی کردوەتەوە کە پێشـتر بـەو شـێوەیە ڕوون نەکراوەتـەوە، وە ڕێنماییەکـی مەزن لـە زانسـتو کردارەکانیاندا.

﴿ وَيَتُوبَ عَلَيۡكُمۡ ﴾ واتـە: نـەرمو نیـان بـووە بۆتان لـە سـەرجەم بارودۆخەکانتانـدا، وە لە دارشـتنی شـەریعەتدا هەتـا توانیوتانـە سـەرکەوتوو بین لە بەرانبەر سـنوورەکانی خـوادا، وە ڕازی کـردوون بـەوەی کـە پێی بەخشـیون، پاشـان تاوانەکانتانی کەم کردوەتـەوە، ئەمەش

بــە هــۆی ئــەوەی کــە خــوا کار ئاســانی بــۆ کــردوون، وە یەکێکی تــر لــە ڕەحمەتەکانی خــوا ﷻ ئەوەیــە ئــەوان کاتــێ کە تــاوان دەکــەن ئــەوە دەرگاکانــی ســۆزو بەزەیی خۆی دەکاتــەوە بەڕوویانــدا، وە ڕێنمایــی دڵەکانیــان دەکات بــۆ ملکەچ بــوونو لێــی دەپاڕێنەوە، پاشــان تەوبەیــان لــێ قبــووڵ دەکات بــە قبووڵکردنــی ئــەوەی کــە خــوا ســەرکەوتووی کردوون.

کــە دەفەرمــوێ: ﴿ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾ واتــە: تــەواوی کاربەجێــی، لــە زانیاریەکانی کە فێــر کــردوونو پێشــتر نەتــان دەزانــی، وە لەوانە ئــەو هەموو ســنوورەی بۆ داڕشــتوون، وە لــە دانایــیو کاربەجێــی لەو کەســە خــۆش دەبێت کــە حیکمــەتو دانایيو ســۆزو بەزەیی وا دەخوازێــت، وە سەرشــۆڕو زەلیلــی دەکات کە حیکمــەتو دادپــەروەری وا بخوازێ هەر کەسێک شایســتەی تەوبەو گەڕانــەوە نەبێت.

وَٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡكُمۡ وَيُرِيدُ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ
ٱلشَّهَوَٰتِ أَن تَمِيلُواْ مَيۡلًا عَظِيمٗا ٢٧ يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُخَفِّفَ
عَنكُمۡۚ وَخُلِقَ ٱلۡإِنسَٰنُ ضَعِيفٗا ٢٨ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
لَا تَأۡكُلُوٓاْ أَمۡوَٰلَكُم بَيۡنَكُم بِٱلۡبَٰطِلِ إِلَّآ أَن تَكُونَ
تِجَٰرَةً عَن تَرَاضٖ مِّنكُمۡۚ وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡۚ إِنَّ
ٱللَّهَ كَانَ بِكُمۡ رَحِيمٗا ٢٩ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ عُدۡوَٰنٗا
وَظُلۡمٗا فَسَوۡفَ نُصۡلِيهِ نَارٗاۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ
يَسِيرًا ٣٠ إِن تَجۡتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنۡهَوۡنَ عَنۡهُ نُكَفِّرۡ
عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَنُدۡخِلۡكُم مُّدۡخَلٗا كَرِيمٗا ٣١
وَلَا تَتَمَنَّوۡاْ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعۡضَكُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖۚ لِّلرِّجَالِ
نَصِيبٞ مِّمَّا ٱكۡتَسَبُواْۖ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٞ مِّمَّا ٱكۡتَسَبۡنَۚ
وَسۡـَٔلُواْ ٱللَّهَ مِن فَضۡلِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيۡءٍ
عَلِيمٗا ٣٢ وَلِكُلّٖ جَعَلۡنَا مَوَٰلِيَ مِمَّا تَرَكَ ٱلۡوَٰلِدَانِ
وَٱلۡأَقۡرَبُونَۚ وَٱلَّذِينَ عَقَدَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ فَـَٔاتُوهُمۡ
نَصِيبَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدًا ٣٣

کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡكُمۡ ﴾واتە: لێخۆش بوونێک کە پەرتەوازەییتان کۆبکاتەوە، وە دوورتان بۆ نزیک بکاتەوە.

﴿ وَيُرِيدُ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلشَّهَوَٰتِ ﴾ واتە: شوێنی ئارەزووەکانیان دەکەون بە هەر شێوەیەک لایان بدات، وە ئەوەی ڕەزامەندی خۆشەویستەکانی تێدا بێت جێبەجێی دەکەن، وە بەندایەتی ئارەزوەکانیان دەکەن لە هاوشێوەی کافرو سەرپێچیکاران کە نەفس‌و هەواو ئارەزوویان پێش خستووە بەسەر گوێڕایەڵی پەروەردگاریاندا.

ئا ئەوانە دەیانەوێ: ﴿ أَن تَمِيلُواْ مَيۡلًا عَظِيمٗا ﴾ واتە: لابدەن لە ڕێگای ڕاست، وە ڕێگای ئەو گومراکەرانە بگرنە بەر کە خوا خەشم‌و قینی خۆی بەسەردا ڕشتوون، ئەوانە دەیانەوێ لە فەرمانبەرداری پەروەردگارتان لاتان بدەن، بۆ فەرمانبەرداری شەیتانەکان، وە لە پابەند بوونی سنوورەکانی خۆش بەختی لە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خوای گەورەدا بەرەو ڕێگای گومراکەران، ئەگەر زانیتان خوا ﷻ فەرمانتان پێ دەکات بەوەی کە بەرژەوەندی‌و سەرکەوتن‌و خۆشبەختی ئێوەی تێدایە، وە بە ڕاستی ئەوانەی کە شوێنی ئارەزووەکانیان کەوتوون داواتان لێدەکەن بە شتێک کە زەرەرمەندی دنیاو دوا ڕۆژتانی تێدایە، بەڵام ئیوە باشترینی ئەو دوو ڕێگایەتان هەڵبژارد.

﴿ يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمۡ ﴾ واتە: خوا دەیەوێ کارتان لەسەر ئاسان بکات، واتە: بە ئاسانی ئەو کارەی کە فەرمانی پێکردوون‌و ئەوەیشی کە قەدەغەی لێکردوون، پاشان لەگەڵ ئەوەدا لە هەندێ لە شەریعەتەکاندا کە نارەحەتی تێدابوو خوا کار ئاسانی کرد بۆ ئێوە بە پێی پێویستیەکانتان وەک مردارەوە بوو، خوێن، هاوشێوەیان، بە تایبەت بۆ کەسی ناچارو بێ چارە لە ئێوە، وە مارەکردنی کەنیزەک بۆ پیاوی ئازاد بەو مەرجانەی

کە لە پێشـەوە باسـکران، دیـارە ئەمەش تەنهـا لەبەر ڕەحمەتـی تەواوی خـوای پەروەردگارو چاکەی گشـتگیریەتی، وە زانسـتی تـەواوو دانایـیو کاربەجێی ئەوە بـە لاوازی مرۆڤەکان لە هەمـوو بارودۆخەکانـدا، لاوازی پێکهاتە، لاوازی ویسـت، لاوازی عەزیمـەت، لاوازی ئیمانو لاوازی ئارامگرتـن، وا گونجـاوە کـە خوا ﷻ لەسـەریان سـووک بکات، لـەوەی کە لاوازن کـە لە توانـای ئیمـانو ئارامگرتـنو هێزی ئەوانـدا نیە.

(٢٩-٣٠): ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأْكُلُوٓاْ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ ۚ وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴿٢٩﴾ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ عُدْوَٰنًا وَظُلْمًا فَسَوْفَ نُصْلِيهِ نَارًا ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴿٣٠﴾ ﴾:

خـوا ﷻ قەدەغـەی کـردوە لـە بـڕواداران کـە ماڵو سـامانی یەکتـر لـە نێوانی یەکتـردا بە نـاڕەوا بخـۆن، وە خواردنـی مـاڵ بـە داگیـرکاریو دزی کـردنو قومـار کردنو ئـەو کارو کەسـابەتانە دەگرێتـەوە کـە پـڕ لـە فرتو فێڵـە، تەنانـەت خواردنـی ماڵی خۆت بـە ناهەقو ئیسـرافو دەسـت بڵاویـەوە دەچێتـە ئـەو چوارچێـوەوە، چونکە ئەمـە نـاڕەواو ناهەقە.

پاشـان خـوا ﷻ کاتێـک کـە حەرامـی کـردوە ماڵی یەکتـر لـە نێوانـی یەکتریدا بە نـاڕەوا بخـورێ لـە بەرانبـەردا بازرگانـیو کەسـابەتێک کـە فـرتو فێڵـی تێـدا نەبـێو مەرجـە شـەرعیەکانی تێـدا بـێ دروسـتەو هیـچ کێشـەی تێـدا نیە.

﴿ وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْ ﴾ واتـە: بـا هەندێکتـان هەندێکـی ترتـان نەکـوژن، وە بـا کـەس نەفسـی خـۆی نەکـوژێ، وە دەچێتـە ئـەو چوارچێوەیـەوە کەسـێک نەفسـی خۆی تووشـی مەترسـی لـە نێوچـوون دەکات ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴾ واتـە: وە لـە ڕەحمەتـی خوای پەروەردگارەوەیـە کـە نەفـسو ماڵـی پاراسـتوون وە قەدەغەی لێکـردوون بە فیـڕۆی بدەن، وە یاسـاو ڕێسـاکانی ڕێکخسـتووە بـە پێـی تۆڵەو سـزا (حدود)، وە سـەرنج بدە لـەم کورت کردنـەوەو کۆکردنـەوە لـە فەرمایشـتەکەیدا ﴿ لَا تَأْكُلُوٓاْ أَمْوَٰلَكُم ﴾، ﴿ وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْ ﴾ تەماشـای بکـە چـۆن ماڵی جگە لە تـۆی گرتۆتـەوە وە ماڵی خۆت، وە کوشـتنی نەفسـت وە کوشـتنی کەسـانی تـر بـە کوردترین دەسـتەواژە لـە ڕسـتەی: (لا یـأکل بعضکم مـال بعـض) واتـە: بـا هەندێکتـان ماڵـی هەندێکتـان نەخـۆن (وَلاَ يَقْتـلُ بَعْضُكُمْ بَعْضَـاً) واتـە: بـا هەندێکتـان هەندێکتـان نەکـوژن، لەگـەڵ کورتی ئەم دەسـتەواژەدا لەسـەر ماڵو نەفسـی غەیـری خۆتـان، لەگـەڵ دانەپاڵـی مـاڵو نەفسـی سـەرجەم بـڕواداران، ئەمە بەڵگەیە لەسـەر ئـەوەی کـە بـڕواداران لە سـۆزو بەزەییو نـەرمو نیانـیو بەرژەوەنـدی وەکو یەک جەسـتە

وان، چونکـە ئیمـانو بـڕوا کۆیان دەکاتـەوە لەسـەر بەرژەوەندیـە ئاینـیو دنیاییەکان.
وە کاتێـک کـە خـوا ﷻ نەهـی کـردوە لـە خواردنـی مـاڵ بـە ناهـەق کـە دەبێتـە مایەی ئەوپـەڕی زەرەر لەسـەر ئەو کەسـەی کـە دەیخواو ئەو کەسەیشـی کـە ماڵەکـەی دەخورێ، لـە بەرانبـەردا بـۆی حـەڵاڵو ڕەوا کـردوون کـە بەرژەوەنـدی ئەوانـی تێدایـە لـە جۆرەها کەسـابەتو بازرگانی، وە جۆرەها پیشـەو بـە کرێـدان، وەک دەفەرموێ: ﴿إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَـٰرَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ﴾ واتـە: بێگومـان ئـەوە ڕەوایـە بـۆ ئێوە.
وە مەرجـی ڕەزامەنـدی لەگەڵ ئـەوەدا کە بازرگانی بێـت، ئاماژەیە بەوەی کە ئەو گرێبەسـتە، گرێبەسـتی ڕیبـاو سـوود نەبێـت، چونکـە ڕیبـاو سـوود بازرگانـی نیـە، بەڵکـو پێچەوانەی مەبەسـتەکەیەتی، بێگومـان کڕینو فرۆشـتن دەبێت هەریـەک لە کڕیارو فرۆشـیار ڕازی بن بـەو بازرگانیـە بە ئـازادی خۆیان.
وە لـە تـەواوی ڕەزامەندیـدا دەبێـت ئـەو شـمەکە دیار بێـت، چونکـە ئەگەر دیارو ئاشـکرا نەبێـت، ڕەزامەنـدی دروسـت نابێت لەسـەر پێدانـی، چونکە شـتێک دیـاری نەکرابێت، ئەوە لـە قورمـار دەچێت، کڕینو فرۆشـتنی شـتی نادیار بـە هەموو جۆرەکانیـەوە خاڵی بـە تاڵە لە ڕەزامەنـدی، بۆیـە بە هیـچ شـێوەیەک دانامەزرێت.
وە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی کـە گرێبەسـتەکان دادەمەزرێن لە سـەر بنەمای گوفتـارو کردار، چونکـە خـوا ڕەزامەنـدی بە مـەرج گرتـووە، بـە هـەر ڕێگایـەک ڕەزامەندی دروسـت بوو گرێبەسـتەکەش دروسـت دەبـێ، پاشـان ئـەم ئایەتە پیـرۆزەی بەمە تەواو کـردوە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا﴾ وە لـە ڕەحمەتـی خوا ئەوەیە کە خوێنو ماڵو ناموسـیانی پاراسـتووە، وە قەدەغـەی لێکردوون سـنوورەکانی پێشـێل بکەن.
پاشـان دەفەرمـوێ: ﴿وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ﴾ واتـە: هـەر کەسـێک ماڵـی خەڵـک بـە ناهـەق بخـواتو یەکێـک بکوژێـت ﴿عُدْوَٰنًا وَظُلْمًا﴾ واتـە: نـە بـە نەفامـیو نەزانیـن نـە بـە بیرچوونـەوە ﴿فَسَوْفَ نُصْلِيهِ نَارًا﴾ واتـە: ئاگرێکـی گـەورەو ترسـناک، چونکـە بـە نەناسـراو هاتوە بەڵگەیە لەسـەر ئـەوە ﴿وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا﴾ (واتە: وە ئەوەش لەسـەر خـوای پەروەردگار زۆر ئاسـانە).
(٣١): ﴿إِن تَجْتَنِبُوا۟ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلًا كَرِيمًا ﴿٣١﴾﴾
ئەمـە لـە فـەزڵو چاکەکانـی خـوای گەورەیە بەسـەر بەنـدە بڕوادارکانـی، پەیمانـی پێداون

ئەگەر لە تاوانە گەورەکان دوور بکەونەوە کە لێیان قەدەغە کراوە، ئەوە لە هەموو تاوانەکانیان خۆش دەبێت، وە دەیانخاتە شوێنێکی چاکو ڕێزدارەوە کە بەهەشتە، کە تیایدا هەیە ئەوەی چاو نەیبینیوە، وە گوێ نەیبیستووە، وە بە ختووورەش بە دڵی مرۆڤدا نەهاتووە.

ئەنجام نەدانی ئەوانە کارانەی خوا فەرزی کردوە، وەک: پێنج نوێژەکان، وە جومعە، وە ڕۆژی ڕەمەزان، دچێتە چوار چێوەی تاوانە گەورەکانەوە، وەک پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {الصَّلَوَاتُ الْخَمْسُ، وَالْجُمُعَةُ إِلَى الْجُمُعَةِ، وَرَمَضَانُ إِلَى رَمَضَانَ، مُكَفِّرَاتٌ مَا بَيْنَهُنَّ إِذَا اجْتَنَبَ الْكَبَائِرَ} (رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٩١٨٦)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٣٣)، وَأَبي عوانة برقم: (٢٦٩٥) من حديث أَبي هُرَيْرَةَ)

واتە: پێنج نوێژە فەرزەکان، وە جومعە بۆ جومعە، وە ڕەمەزان بۆ ڕەمەزان، گوناهەکانی نێوانیان دەسڕنەوە، مادام پارێزکاری کرابێ لە گوناهە گەورەکان.

وە باشترین شتێک کە تاوانی گەورەی پێ دیاری بکرێت، ئەوەیە کە تاوانی گەورە لە دنیادا تۆڵەی (حد)ی بۆ دیاری کراوە، یان هەڕەشەی لێکراوە بۆ دواڕۆژ، یا نەفی ئیمان لێکراوە، یان نەفرین (لعنة)ی لێکراوە، یان غەزەبو خەشمو قین (غضب)ی لێگرتووە.

(٣٢): ﴿ وَلَا تَتَمَنَّوْاْ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍۚ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبُواْۖ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبْنَۚ وَسْـَٔلُواْ ٱللَّهَ مِن فَضْلِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٣٢﴾ ﴾:

خوا ﷻ قەدەغەی دەکات لە بڕواداران کە هەندێکیان ئاوات بخوازن بەو پلەو پایەی کە فەزڵی هەندێکیانی داوە بەسەر ئەوی تردا لەو شتانەی کە دەکرێت ببێ، یان ئەوانەی کە ناکرێت ببێ، با ئافرەتان ئاوات بە تایبەتمەندیەکانی پیاوان نەخوازن، کە بەوە فەزڵو باوی داون بەسەر ئافرەتاندا، وە با هەژار، یان ناتەواو ئاوات بە دەوڵەمەندو تەواو نەخوازن، ئاواتێکی ڕووتو پەتی، چونکە ئەمە دەبێتە ئێرەیی‌و حەسوودی، ئاوات خواستنی نیعمەتی خوایە کە ڕشتویەتی بەسەر کەسێکی تردا کە بۆ تۆ بێ‌و لەوی دارنێت.

ئەمە دەبێتە مایەی ئەوەی کە تووڕەیی بە لای خۆیدا ڕابکێشێتو بەردەوامی بکات لە تەنبەڵی‌و خەیاڵپلاوی کە کارو داهێنان بە دوای خۆیدا نادووانە: مرۆڤ بۆ خۆی کۆشش بکاتو هەوڵ بدات بۆ بەدەستهێنانی ئەو شتەی کە لە بەرژەوەندی دنیاو دواڕۆژیدایە، وە داوا لە خوا ﷻ بکات لە فەزڵو چاکەی خۆی، وە پشت بە خۆی‌و بە کەسی

دیکـەش نەبەسـتێت جگـە لە خـوای تاکو تەنهـا نەبێ، ئـا لەبەر ئەمـە خـوا ﷻ دەفەرموێ:
﴿ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبُوا ﴾ واتـە: لـە کردارەکانیان لەوەی کە بە دەسـتی دەهێنن
﴿ وَلِلنِّسَاءِ نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبْنَ ﴾ واتـە: هـەر یـەک لـە ئەوان ئـەوە بـە دەسـت دێنێت کە کۆششـی بـۆ دەکاتو مانـدوو دەبێت لـە پێناویدا.

﴿ وَاسْأَلُوا اللَّهَ مِن فَضْلِهِ ﴾ واتـە: لـە هەمـوو بەرژەوەندیەکانتانـدا لـە دیـنو دنیـا، ئەمە کەماڵـی بەنـدەی خوایـەو ناونیشـانی خۆشـبەختیەتی، نـەک وەک کەسـێک واز لـە کارو کـردەوە دەهێنێـت، یـان خـۆی دەدات بە دەسـتی نەفسو ئـارەزووی خۆیـەوە، وەک ئەوەی کـە پێویسـتی بە پەروەردگـاری نەبێت، یان ئـەو دوو کارە پێکـەوە کۆ دەکاتەوە، بە ڕاسـتی ئەمـە سەرشـۆڕو ڕیسـواو زەرەرمەندە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا ﴾ دەیبەخشـێت بـە کەسـێک شایسـتەی بـێ، وە لـە کەسـێکی دەگرێتـەوە کـە شایسـتەی نەبـێ.

(٣٣): ﴿ وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَالِيَ مِمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالْأَقْرَبُونَ ۚ وَالَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَانُكُمْ فَآتُوهُمْ نَصِيبَهُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدًا (٣٣) ﴾

واتـە: ﴿ وَلِكُلٍّ ﴾ لـە خەڵکـی ﴿ جَعَلْنَا مَوَالِيَ ﴾ واتە: دەیگرنـە ئەسـتۆو دەیانگرێتە ئەسـتۆ بـە سـەربەرزیو سـەرکەوتنو پشـتگیری کردن لـە کارەکانـدا ﴿ مِمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالْأَقْرَبُونَ ﴾ ئەمـە هەمـوو خزمـەکان دەگرێتەوە لـە ڕەچەڵـەکو لقەکانو ئـەوەی لە دەوریاندایـە، هەمـوو ئەوانـە میراتگرن لـە ڕێگـەی نزیکیەوە.

پاشـان باسـی جۆرێکی تر دەکات لە میراتگـر دەفەرموێ: ﴿ وَالَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَانُكُمْ ﴾ واتـە: ئەوانـەش کە پەیمانتـان لەگەڵ هەن لەسـەر سەرخسـتنو هاوکاریو بەشـداریکردن بە مـاڵو سـامانو جگـە لەوانـەش، هەمـوو ئەمانـە لـە نیعمەتەکانـی خوایـە لەسـەر بەندەکانی، کاتێـک کـە بـە دەسـتەجەمعی هەندێکتان هـاوکاری ئەویتـر دەکـەن، بەتەنها ئـەو کارە بۆ هەندێکتـان ئەنجـام نادرێت.

دەفەرمـوێ: ﴿ فَآتُوهُمْ نَصِيبَهُمْ ﴾ واتـە: میراتگـرەکان بەشـی خۆیانیـان پـێ بـدەن، ئەوە کـە پێویسـتە پێـی هەسـتێت لە سەرخسـتنو پشـگیریو هـاوکاری لەسـەر سـەرپێچی خوا نەبێـت، وە پێدانـی میـرات بۆ خزمـە نزیکەکان لـە میراتگـران ﴿ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدًا ﴾ واتـە: بەسـەر هەمـوو شـتێکدا ئاگادارە، بە زانسـتی بۆ هەمـوو کارەکان، وە بینـەری جوڵـەی بەندەکانیەتیو بیسـەری هەمـوو دەنگەکانیانە.

ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَىٰ
بَعْضٍ وَبِمَآ أَنفَقُوا۟ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ فَٱلصَّٰلِحَٰتُ قَٰنِتَٰتٌ
حَٰفِظَٰتٌ لِّلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ ٱللَّهُ وَٱلَّٰتِى تَخَافُونَ
نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَٱهْجُرُوهُنَّ فِى ٱلْمَضَاجِعِ
وَٱضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلَا تَبْغُوا۟ عَلَيْهِنَّ سَبِيلًا
إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا ﴿٣٤﴾ وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا
فَٱبْعَثُوا۟ حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِۦ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَآ إِن
يُرِيدَآ إِصْلَٰحًا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيْنَهُمَآ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا
خَبِيرًا ﴿٣٥﴾ ۞ وَٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا۟ بِهِۦ شَيْـًٔا
وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا وَبِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ
وَٱلْجَارِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْجَارِ ٱلْجُنُبِ وَٱلصَّاحِبِ بِٱلْجَنۢبِ
وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ إِنَّ ٱللَّهَ
لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخْتَالًا فَخُورًا ﴿٣٦﴾ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ
وَيَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبُخْلِ وَيَكْتُمُونَ مَآ ءَاتَىٰهُمُ
ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿٣٧﴾

(٣٤): ﴿ ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ وَبِمَآ أَنفَقُوا۟ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ فَٱلصَّٰلِحَٰتُ قَٰنِتَٰتٌ حَٰفِظَٰتٌ لِّلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ ٱللَّهُ وَٱلَّٰتِى تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَٱهْجُرُوهُنَّ فِى ٱلْمَضَاجِعِ وَٱضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلَا تَبْغُوا۟ عَلَيْهِنَّ سَبِيلًا إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا ﴿٣٤﴾ ﴾:

خـوا ﷻ هەواڵـی داوە کـە ﴿ ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ ﴾ واتـە: سەرپەشـتیارو کاربەدەسـتن بەسـەر ژنەکانیـان، بـە پابەنـد کردنیـان بـە مافـی خـوا ﷻ، لـە پارێزگـاری لەسـەر فـەرزو ئەرکـەکان، وە دوورخسـتنەوەیان لە شـتی خـراپو پـڕو پووچ، پێویسـتە لەسـەر پیاوان بەوکارە هەسـتن، وە بە هەمان شـێوە مشـوور خـۆرن بەسـەریانەوە بـە هـۆی ئـەوەی لـە سـامانەکانیان خـەرج دەکـەنو جـلو بەرگـو شـوێنی نیشـتەجێ بوونیـان بـۆ دابیـن دەکـەن.

پاشـان هـۆکاری پێویسـت دەربـارەی کار بـە دەسـتی پیـاوان بەسـەر ئافرەتانـەوە بـاس دەکاتو دەفەرمـوێ: ﴿ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ وَبِمَآ أَنفَقُوا۟ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ ﴾ واتـە: چاکـەی پیـاوان بەسـەر ئافرەتانەوە، جـا فەزڵو چاکـەی پیـاوان بەسـەر ئافرەتانەوە لـە چەنـد ڕوویەکـەوە: لـەو ڕووەی سەرپەرشـتیاری تایبەتە بـە پیـاوان، وە پێغەمبەرایەتی، وە پەیامـی خـوا، وە تایبەتمەندیـان بـە زۆرێـک لە پەرستشـەکان، وەک جیهـاد کردن، وە جـەژنو جومعـەکان. وە لـە ڕووی عەقڵـەوە تایبەتـی کردوون بـە هێمنـیو ئارامگرتن، وە بـە هەمـان شـێوە زۆرێک لـە بەخشـینەکان پیاوانی تێـدا تایبەت کـراوەو جیـا دەکرێنەوە لـە ئافرەتان.

وە لەوەیـە ئەمە نهێنی فەرمایشـتی خـوا ﴿ وَبِمَآ أَنفَقُوا۟ ﴾ لابردنی (مفعول بـە) ئاماژەیەک بێـت بـۆ گشـتگیری بەخشـین، لـە هەمـوو ئەمانـە وا زانـراوە پیـاو وەک سەرپەرشـتیارو

گـەورەی ژنەکـەی وایـە، ئـەو لـە لای مێردەکەی دیـلو خزمەتـکارە، کاری پیـاو ئەوەیە کـە چاودێـری فەرمانەکانی خـوا ﷻ بکات.
وە کاری ئافـرەت جێبەجـێ کردنـی فەرمانەکانـی پەروەردگاریەتـی، پاشـان گوێڕایەڵـی مێردەکـەی، وە لەبـەر ئەمـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَٱلصَّٰلِحَٰتُ قَٰنِتَٰتٌ ﴾ واتـە: ئەوانـەن گوێڕایەڵـی خـوا ﷻ دەکـەن ﴿ حَٰفِظَٰتٌ لِّلۡغَيۡبِ ﴾ واتـە: گوێڕایەڵـی مێردەکانیانـن تەنانـەت لـەو کاتەشـدا کـە لـە پێـش چاویـان نادیـارن، مێردەکـەی بـە نەفسـی خـۆی دەپارێزێـتو ماڵیشـی دەپارێزێـت، ئەمەش بـە پارێزگـاریو یارمەتی خوا دەبـێ بۆ ئەوان، نـەک بـە ئازایەتی نەفسـی خۆیـان، چونکە بەڕاسـتی نەفس فەرمـان بە خراپـە دەکات، هەر کەسـێک پشـت بە خـوا ببەسـتێت، خـوا دەیپارێزێـت لـە کاری دنیـاو دوا ڕۆژ.
پاشـان دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱلَّٰتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ ﴾ واتـە: خۆیان بـەرز دەگرن لـە بەرانبەر بە گوێڕایەڵـی کردنـی مێردەکانیـان، سەرکێشـی دەکـەن، بـە شـێوەیەک کە بـە گوفتارو بە کـردار سـەرپێچی دەکات، پێویسـتە لەسـەر مێرد بـە ئاسـانترین ڕێگە فێـری ئەدەبی بکات ﴿ فَعِظُوهُنَّ ﴾ واتـە: ئامۆژگـاری دەکات بـەوەی حیکمەتـی خـوا وا دەخوازێـت لە ژن گوێڕایەڵـی مێردەکـەی بـکاتو بـە هیچ شـێوەیەک نابێت سـەرپێچی بـکات، وە هانی دەدات لەسـەر پاداشـتی گوێڕایەڵـی کـردنو دەیترسـێنێت لەسـەر سـەرپێچیکردن، ئەگەر کۆتایـی پـێ هێنـا ئـەوە کارێکـی زۆر باشـە، ئەگەرنا جێگـای لێ جیـا دەکاتەوە لە سـەر سـەرجێیی لەگەڵیـدا ناخەوێـتو ناچێتـە لایـەوە، بـە ئەندازەی ئـەوەی کە پێویسـتە، ئەگەر هـەر بـاش نەبوو، لێـی دەدا، بـەڵام لێدانێـک کە لەشـی بریـنـدارو عەیبدار نـەکات. ئەگەر بـە یەکێـک لـەم کارە ئامانج بەدەسـت هـاتو گوێڕایەڵی کـرد (زۆر باشـە) ﴿ فَلَا تَبۡغُواْ عَلَيۡهِنَّ سَبِيلًا ﴾ واتـە: ئـەوەی حەزتان لێدەکرد هاتە جـێ، ئیتر واز لە سەرزەنشـتکردنیان بهێنـنو هیـچ ڕێگایـەک لە دژیان مەگرنە بەر لەسـەر ئـەو کارانەی کە پێشـتر کردوویانە، وە ئـەو ناتەواویانـەش بپۆشـن کە بە باسـکردنی شـەڕو ئـاژاوەی لێدەکەوێتەوە.
﴿ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا ﴾ واتـە: بـەرزو بڵنـدی ڕەهـا تەنهـا بـۆ خوایە لـە هەموو ڕووەکانـەوە، بـەرزی زاتـی، بـەرزی قـەدەر، بـەرزی زاڵـیو دەسـەڵاتی، گەورەیـەو هیچ گەورەیـەک نیـە بەسـەریەوە خـۆی لە هەمـوو گەورەتـرە، وە کەس لـەو شـکۆمەندتر نیە، خـودو سـیفەتی زۆر گـەورەو بـەرزو بڵندە.
(٣٥): ﴿ وَإِنۡ خِفۡتُمۡ شِقَاقَ بَيۡنِهِمَا فَٱبۡعَثُواْ حَكَمًا مِّنۡ أَهۡلِهِۦ وَحَكَمًا مِّنۡ أَهۡلِهَآ إِن يُرِيدَآ

إِصۡلَٰحٗا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيۡنَهُمَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرٗا ﴿٣٥﴾ ﴾:

﴿ وَإِنۡ خِفۡتُمۡ شِقَاقَ بَيۡنِهِمَا ﴾ ئەگەر ترسان لە تێکچوونی نێوان ژنو مێرد لە دوورکەوتنەوەو لە یەکتر پشتی تێکرد هەتا کەلێن کەوتە نێوانیان ﴿ فَٱبۡعَثُواْ حَكَمٗا مِّنۡ أَهۡلِهِۦ وَحَكَمٗا مِّنۡ أَهۡلِهَآ ﴾ واتە: دوو ناوبژیوانی عاقڵو دادپەروەرو تێگەیشتوو، کێشەی نێوان ژنو مێردەکە بزانن، ئەمە وەردەگیرێت لە وشەی (الحَکَم) ناوبژیوان، چونکە پێی ناوترێت ناوبژیوان هەتا ئەو سیفەتانەی تێدا نەبێت، هەر یەکە لەو دوو ناو بژیوانە تەماشای هاوەڵەکەی دەکات، پاشان هەردووکیان ڕێگای پێویست بۆ ئەو مەبەستە دەگرنە بەر، ئەگەر یەکێکیان نەیتوانی ئەوە بکات، ئەوە قەناعەت بە مێردەکەی تر دەکەن ڕازی بێ بەوەی کە خوا ئاسانی کردوە لە ڕزقو ڕۆزی، وە بە هەر شێوەیەک بتوانن بگەن بە یەکگرتنو ئاشتیو ڕێککەوتن نابێت دریغی بکەن. بەڵام ئەگەر کار گەیشتە ئەوەی کە ناتوانن پێکەوە ڕێک بکەونو کۆکو تەبابن، مەگەر بە دژایەتیو شەڕو دابڕانو سەرپێچی خوا، وە بینیان کە جیابوونەوە باشترین چارەسەرە، جیایان دەکەنەوە، وە مەرج نیە ڕەزامەندی مێردەکە وەربگیرێت، وەک چۆن دەقەکە ئاماژەی پێدەکات، کە بە ڕاستی خوای گەورە بە دوو ناوبژیوان ناوی هێناوە، وە ناوبژیوانیش بڕیار دەدات، وە ئەگەر بڕیار بەسەرا دراویش ڕازی نەبێ. وە لەبەر ئەمە دەفەرموێ: ﴿ إِن يُرِيدَآ إِصۡلَٰحٗا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيۡنَهُمَآ ﴾ واتە: بە هۆی بۆچوونی جوانو قسەی سەرنجڕاکێش نێوانیان چاک دەکەنەوە ﴿ بَيۡنَهُمَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرٗا ﴾، واتە: زانایە بە سەرجەم ئاشکراو نهێنیەکان، وە لە زانستی ئەو ئەوەیە کە ئەم بڕیارە گەورانەی بۆ ئێوە دارشتووە، لەگەڵ ئەو شەریعەتە جوانە.

(٣٦-٣٨):﴿ وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗا وَبِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡجَارِ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡجَارِ ٱلۡجُنُبِ وَٱلصَّاحِبِ بِٱلۡجَنۢبِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخۡتَالٗا فَخُورًا ﴿٣٦﴾ ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ وَيَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبُخۡلِ وَيَكۡتُمُونَ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦۗ وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٗا مُّهِينٗا ﴿٣٧﴾ وَٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُمۡ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۗ وَمَن يَكُنِ ٱلشَّيۡطَٰنُ لَهُۥ قَرِينٗا فَسَآءَ قَرِينٗا ﴿٣٨﴾ ﴾:

خوا ﷻ فەرمان بە بەندە بڕوادارەکانی دەکات بە بەندایەتی کردنی بە تاکو تەنهاو هاوەڵی بۆ بڕیار نەدەن، ئەویش ئەوەیە شان بدەنە ژێر عیبادەت کردنی پەروەردگارەوە،

ملکەچـی فەرمانـەکانو قەدەغـە لێکراوەکانـی بـن، بـە خۆشویسـتنو زەلیلـیو دڵسـۆزی تـەواوەوە، لـە هەموو پەرستشـە ئاشـکراو نهێنیەکاندا، وە قەدەغـەی کردوە لێیان هاوبەشـی بـۆ بڕیـار بـدەن، نـە شـیرکی بچـووکو نە شـیرکی گـەورە، نـە فریشـتەو نـە پێغەمبەرو نـە پیاوچـاک نە هیچ شـتێکی تـر لـە دروسـتکراوەکان نەکەنە هاوبەشـی، بەڵکو پێویسـتە دڵسـۆزیو عیبـادەت بۆ ئـەو خوایە بێت کە خاوەنـی کەماڵی ڕەهایە لە هەمـوو ڕووەکانەوە، هەمـوو کارەکان هەڵدەسـوڕێنێتو کـەس شـەریکو هاوەڵی نیـە، وە کەس پشـتیوانی لێ نـاکات، پـاش ئـەوەی فەرمانـی بە عیبـادەت کردنـی کـردوە، پاشـان فەرمانی کـردوە بە مافەکانـی دروسـتکراوەکان، لـە نزیکتـرەوە بـۆ نزیـک، پاشـان دەفەرمـوێ: ﴿ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا ﴾ واتـە: لەگـەڵ دایـکو باوکتـان چـاک بـن بـە وتـەی جـوانو لـە سـەرخۆو نـەرمو نیـانو کـرداری جـوان، بـە جـێ بەجێکردنـی فەرمانەکانیـانو دوورکەوتنـەوە لە قەدەغەکراوەکانیـان، وە ڕێزگرتـن لەو کەسـانەی کە ئەوان خۆشـیان دەوێـن، وە پەیوەندی سـۆزداری لەگەڵیانـدا سـۆزدار نابێـت ئیللا دەبـێ لە ئەوانـەوە دەسـت پێبکەیت.

﴿ وَبِذِى ٱلْقُرْبَىٰ ﴾ بـە هەمان شـێوە لەگـەڵ نزیـکانو خزمانیش چاک بـن، ئەمە هەموو خزمـان دەگرێتـەوە، نزیـک بن یـان دوور، دەبێ لەگەڵیان چـاک بێت بە گوفتـارو کردار، وە نابێـت پەیوەنـدی خزمایەتی بپچڕێنێـت بە گوفتاریی یـان بە کرداری.

﴿ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ ﴾ واتـە: ئەوانـەی کە باوکیان لە دەسـت داوە لـە منداڵیدا، ئەمانـە مافیان هەیە بەسـەر بروادارانـەوە خـزمو کەس بـن، یان خزم نەبـن، بە دەسـتەبەرییو بـە خێوکردنیانو چاکـە لەگەڵیانـداو پەروەردەکرنیان بە جوانترین شـێوە، لـە بەرژەوەندی دنیـاو دوارۆژیان.

﴿ وَٱلْمَسَـٰكِينِ ﴾ ئەوانـەن کـە توانای تەواویـان نیە بەسـەر ئەوەندەی بەشـیان بکات بۆیە خـوای گـەورە فەرمانی کردوە بـە چاکە کردن لەگەڵیانـداو پڕکردنەوەی پێویسـتیەکانیانو گرنگی پێدانیانو هەسـتان بەوەی کە پێویسـتە لەسـەریان.

﴿ وَٱلْجَارِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ ﴾ واتـە هاوسـێی نزیـک کـە دوو مافی هەیـە، مافی هاوسـێیەتی، مافـی خزمایەتـی، مافـە لەسـەر هاوسـێکەی چاک بێـت لەگەڵیـدا ﴿ وَٱلْجَارِ ٱلْجُنُبِ ﴾، واتـە بـە هەمـان شـێوە ئـەو هاوسـێیەی کە خزم نیـە، هەتـا هاوسـێکەت دەرگـای نزیکتر بێـت لێـت ئـەوە مافی زیاترە لەسـەرت، پێویسـتە لەسـەر هاوسـێ دیـاریو خێـرو چاکەو ئامۆژگـاریو وتـەی جوانو کـرداری باش لەگـەڵ هاوسـێکەیدا بکات، وە بـە دوور بێ لە هـەر شـتێک کـە دەبێتـە مایـەی ئازاردانی بـە زمان بێـت، یان بـە کردار.

﴿ وَٱلصَّاحِبِ بِٱلۡجَنۢبِ ﴾ وتـراوە: مەبەسـت پێـی هاوڕێـی سـەفەرە، وە وتراویشـە: ژنـە، وە دەشـڵێن: هاوڕێیـە بە گشـتی، دەكرێـت ئەمە ڕاسـترینیان بێـت، چونكـە هاوڕێی هەمیشـەیین هاوڕێـی سـەفەر دەگرێتـەوە، وە بـە هەمـان شـێوە ژنیـش دەگرێتەوە.
هـاوڕێ بەرانبـەر بـە هاوڕێكـەی مافی هەیە لە هـاوكاری كردنی لـە بواری ئاینـیو دنیایدا وە ئامۆژگـاری كردنـی وە بـە وەفـا بـوون لەگەڵیـدا، لـە خۆشـیو ناخۆشـیدا لـە ڕۆژانی تەنگانـەدا، وە ئـەوەی بـۆ خـۆی پێی خۆشـە دەبـێ بـۆ هاوڕێكەیشـی پێی خـۆش بێت، وە ئـەوەی بـۆ خۆی پێی ناخۆشـە دەبێ بۆ هاوڕێكەشـی پێی ناخـۆش بێت، هەتـا هاوڕێیەتیەكە بەهێزتـر بێـت مافەكان زیاتـر دەبن.
﴿ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ ﴾ بریتیـە لـەو گەشـتیارەی یـان ئـەو بێگانـەی كە لـە وڵاتێكـی ترەوە هاتـووەو پێویسـتی بـە پـارە هەیـە، یـان پێویسـتی بە پـارە نیـە لـە هـەردوو حاڵەتەكەدا پێویسـتە لەسـەر بڕواداران پێویسـتیەكانی بـۆ پڕبكەنەوە، چونكـە ئەو لە وڵاتـی خۆیدا نیە، هەتـا بگـات بـە ئامانجەكانـی، یان بگـات بە بەشـێك لـە ئامانجەكانـی (وە پێویسـتە زۆر ڕێزی لـێ بگیـرێو دڵـی ڕابگیرێ).
﴿ وَمَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ ﴾ واتـە: لـە مـرۆڤو ئاژەڵـەكان، وە پڕكردنـەوەی پێویسـتیو ناتەواویەكانیـان بـە پشـتیوانی كردنیان لەسـەر ئەو شـتەی كـە لـە تواناياندا نیـە، وە تەمبێ كردنیـان لـەوەی كـە بەرژەوەنـدی ئەوانـی تێدایـە، بێگومـان هەر كەسـێك هەسـتێت بە جێبەجێكردنـی ئـەم فەرمانانـە ئـەوە ملكەچـی بـۆ خـوا نوانـدووەو فەرمانەكانـی جێبەجێ كـردوە، وە سـەلماندوویەتی كـە خۆبەكەم زانـە بەرانبەر بـە بەندەكانی خـواو جێبەجێكاری فەرمانەكانـی پەروەردگارێتـی، بەڕاسـتی ئەمـە شایسـتەی پاداشـتێكی بـێ پایانـەو پیاهەڵدانێكـی شایسـتەو جوانـە. هـەر كەسـێك بـەم كارانـە هەڵنەسـێت ئـەوە بەندەیەكـە پشـتی لـە پەروەردگاری كـردوە، فەرمانەكانـی ئەوی جێبەجـێ نەكردوە، ملكەچـی بۆ خوا نەنوانـدووە، بەرانبـەر بـە بەندەكانـی خۆی بەكـەم نەزانیـوە، بەڵكو ئـەوە كەسـێكی لووت بـەرزەو موعجیبـە بـە خۆی، شـانازی بـە وتەی خۆیـەوە دەكات، ئـا لەبەر ئەمـە دەفەرموێ:
﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخۡتَالٗا ﴾ واتـە: سـەری بـە خۆی سـووڕدەمێنێو لووت بەرزە لـە ئاسـتی خەڵكیـدا ﴿ فَخُورًا ﴾ واتـە: شـانازی بـە خۆیـەوە دەكات لـە خۆ بـە گەورە زانیـنو، نكوڵـی بەرانبـەر بەندەكانـی خوا.
ئەوانـە كـە شـانازی بە خۆیانـەوە دەكـەنو خۆبـەزل زانینیـان تیادایە، ئـەو سـیفەتە خراپە

ڕێگریـان لـێ دەکات هەسـتن بـە جێبـە جـێ کردنـی مافـەکان، وە لەبـەر ئەمـە خوا ﷻ سەرزەنشـتیان دەکات بـە وتـەی: ﴿ ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ ﴾ واتـە: ئەوانـە ڕێگـری دەکـەن لەو مافانەی کە پێویسـته لەسـەریان، ﴿ وَيَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبُخۡلِ ﴾ بـە گوفتارو کرداریان ﴿ وَيَكۡتُمُونَ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ ﴾ واتـە: لـەو زانسـتەی کـە گومڕاکەرانی پـێ هیدایـەت دەدرێ، وە نەفامانی پـێ ڕێنمایی دەکرێ، لێیان دەشـارنەوە، وە ئەوەی پووچو بـێ مانـا بێـت بۆیان ئاشـکرا دەکەن هەتـا نێوان ئـەوانو ڕاسـتی دووربکەوێتـەوە، پێکەوە کـۆ کردنـەوەی ڕەزیلـی بە مـاڵو ڕەزیلـی بـە زانسـت، وە زەرەر دان لە خۆیـانو زیاندان لـە خەڵکـی تر، ئـا ئەمە سـیفەتی بێبڕوایانـە، لەبەر ئەمـە خـوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴾ واتـە: وەک چـۆن لـووت بەرزیان کـرد بەسـەر بەندەکانی خـواداو بەرگریـان کـرد کـە بگـەن بـە مافەکانیـان، لـە ڕەزیلـیو چروکـی وەرنەگرتنی ڕێنمایـی، خـوای گـەورەش سەرزەنشـتی کردن بە سـزای بە ئێشو سەرشـۆڕی بـەردەوام، دەی پەنـا بـە تۆ ئـەی خودایە لـە هەمـوو خراپەیەک.

وَٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ
وَلَا بِٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ۗ وَمَن يَكُنِ ٱلشَّيْطَٰنُ لَهُۥ قَرِينًا فَسَآءَ
قَرِينًا ﴿٣٨﴾ وَمَاذَا عَلَيْهِمْ لَوْ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَأَنفَقُوا۟
مِمَّا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِهِمْ عَلِيمًا ﴿٣٩﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ
مِثْقَالَ ذَرَّةٍ ۖ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَٰعِفْهَا وَيُؤْتِ مِن لَّدُنْهُ
أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٤٠﴾ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍۭ بِشَهِيدٍ
وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا ﴿٤١﴾ يَوْمَئِذٍ يَوَدُّ ٱلَّذِينَ
كَفَرُوا۟ وَعَصَوُا۟ ٱلرَّسُولَ لَوْ تُسَوَّىٰ بِهِمُ ٱلْأَرْضُ وَلَا يَكْتُمُونَ
ٱللَّهَ حَدِيثًا ﴿٤٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقْرَبُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ
سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُوا۟ مَا تَقُولُونَ وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِى
سَبِيلٍ حَتَّىٰ تَغْتَسِلُوا۟ ۚ وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَآءَ
أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ أَوْ لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمْ تَجِدُوا۟ مَآءً
فَتَيَمَّمُوا۟ صَعِيدًا طَيِّبًا فَٱمْسَحُوا۟ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ ۗ
إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا غَفُورًا ﴿٤٣﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ
ٱلْكِتَٰبِ يَشْتَرُونَ ٱلضَّلَٰلَةَ وَيُرِيدُونَ أَن تَضِلُّوا۟ ٱلسَّبِيلَ ﴿٤٤﴾

پاشان خوا ﷻ هەواڵ دەدات دەربارەی ئەو بەخشینەی کە دەیبەخشن لە پێناو ڕیاو ئێرەیی‌و ناوبانگداو بڕوایان پێی نیە، دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ﴾ واتە: لەبەر ئەوەی ببینن‌و وەسفیان بکەن‌و بە گەورەیان بزانن ﴿وَلَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ﴾ واتە: بەخشینەکەیان لە سۆنگەی دڵسۆزی‌و بڕوا بە خوا بوون چاوەڕوانی پاداشتەوە دەرناچێت، واتە: ئەمە لە هەنگاوەکان‌و کردارەکانی شەیتانە، کە تاقم‌و کۆمەڵەکەی بۆ دەکات، بۆ ئەوەی ببنە هاوەڵانی ئاگرو هەڵگیرساوی دۆزەخ، وە ئەو بەخشینانەی کە دیبەخشن لە سۆنگەی هاوڕێیەتی‌و دۆستایەتی شەیتانەوەیە لەبەر ئەمە دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَكُنِ ٱلشَّيْطَٰنُ لَهُۥ قَرِينًا فَسَآءَ قَرِينًا﴾ واتە: بە ڕاستی خراپترین هاوڕێ‌و دۆستە کە دەیەوێت هاڕێکەی لە نێو ببات، وە ئەوپەڕی هەوڵ دەدات بۆ ئەو مەبەستە. وەک چۆن ئەوەی ڕەزیلی دەکات لەوەی کە خوا پێی بەخشیوە، وە ئەوە دەشارێتەوە کە خوا بەو هۆیەوە منەتی خۆی دەکات بەسەریدا، سەرپێچیکارو تاوانبارەو پێچەوانەی فەرمانی پەروەردگاری دەجوڵێتەوە، بە هەمان شێوە ئەوەی لە پێناو غەیری خوا بەخشێت‌و بەندایەتی بۆ غەیری خوا بکات، بێگومان تاوانبارو سەرپێچی پەروەردگاری کردوە، وە شایستەی سزادانە، چونکە خوا تەنها فەرمانی بە گوێڕایەڵی‌و فەرمانداری فەرمانەکانی خۆی کردوە لەسەر شێوەی دڵسۆزی وەک دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أُمِرُوٓا۟ إِلَّا لِيَعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ﴿٥﴾﴾ البينة. ئەم کردارە قبووڵ کراوەو شایستەو پیاهەڵدان‌و پاداشتە، لەبەر ئەمە خوا ﷻ جەخت دەکاتەوە لەسەری کە دەفەرموێ:

(٣٩): ﴿وَمَاذَا عَلَيْهِمْ لَوْ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِهِمْ عَلِيمًا ﴿٣٩﴾﴾:

واتــە: چ زیانێکیــان بەر دەکــەوت؟ وە چ نارەحەتیەکیان دەکەوتە ســەر؟ ئەگــەر ئیمانیان بــە خــوا بهێنایــە کــە لێــرەدا بریتیــە لــە دڵســۆزیی، وە بیــان بەخشــیایە لەو ماڵــەی کە خــوا پێــی بەخشــیون، هەتا دڵســۆزیو بەخشــینیان پێکەوە کــۆ بکردایەتەوە. لــە کاتێکدا دڵســۆزیو ئیخــلاص نهێنیەکــە لــە نێــوان بەنــدەو خــوادا، کەس پــەی پێنابــات جگە لە خــوا، خــوا ﷻ ڕایگەیانــدووە کــە زانایــە بــە هەمــوو بارودۆخــەکان، وەک دەفەرموێ: ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ بِهِمْ عَلِيمًا ﴾ (واتــە: وە خــوا پێیــان زانایە).

(٤٠-٤٢): ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَٰعِفْهَا وَيُؤْتِ مِن لَّدُنْهُ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٤٠﴾ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا ﴿٤١﴾ يَوْمَئِذٍ يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَعَصَوُا۟ ٱلرَّسُولَ لَوْ تُسَوَّىٰ بِهِمُ ٱلْأَرْضُ وَلَا يَكْتُمُونَ ٱللَّهَ حَدِيثًا ﴿٤٢﴾ ﴾:

خــوا ﷻ هەواڵــی داوە دەربــارەی تــەواوی دادپــەروەریو چاکــەی بەســەر بەندەکانەوە، وە خــۆی بــە پــاک ڕاگرتــووە لــە هەمــوو ئەوانــە، لــە ســتەمکردن زۆر بێت یــان کەم، دەفەرمــوێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ ﴾ واتــە: خوا ســتەم ناکات لە کــەم کردنەوەی چاکــەی بەندەکانــی، یــان لــە تاوانەکانی زیاد بــکات، وەک چــۆن دەفەرموێ: ﴿ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ﴿٨﴾ ﴾ الزلزلة.

کــە دەفەرمــوێ: ﴿ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَٰعِفْهَا ﴾ واتــە: لــە بەرانبــەرەوە بــۆ زیاتــر، بە پێــی بــارودۆخو قازانجــی بەنــدە، وە بارودۆخــی خاوەنەکەی لە دڵســۆزیو خۆشویســتنی تــەواوی تەنها بــۆ خوا.

﴿ وَيُؤْتِ مِن لَّدُنْهُ أَجْرًا عَظِيمًا ﴾ واتــە: زیاتــر لــەو کارەی کــە بەنــدەی خــوا ئەنجامی داوە، لــە پارمەتــی هــاوکاری خوایــیو بەردەوامــیو پێدانــی خێــرو بێری بێ ســنوور.

پاشــان دەفەرمــوێ: ﴿ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا ﴾ واتــە: حاڵــی بەنــدەکان دەبــێ چــۆن بێــت لــە کاتێکــدا کــە دادپــەروەری دادپــەروەران بــە تــەواوی زانســتو تــەواوی دادپەروەریــیو تەواویــی حیکمەتیــەوە بە شــایەتی پاکترین دروســتکراوەکانی کــە بریتین لە پێغەمبــەران لەگــەڵ دانپێدانانی حوکم بەســەر دراوەدا؟! ئەمــە خوایە کە دادوەرە، کــە گەورەتریــنو دادپەروەرتریــنو باڵاترینیانە. ئــەوەی کــە دەمێنێتــەوە حوکــم بەســەردراوەکانن، کــە دان بــەوەدا دەنێــن خــوا خاوەن

تـەواوی چاکـەو دادپەروەریـە، وە خـاوەن سـوپاس‌و ستایشـی بـێ پایانـە، لـەو ڕۆژەدا کۆمەڵێـک خۆشـبەخت دەبن بە سـەرکەوتن‌و سـەربەرزی ڕزگـار بـوون، وە کۆمەڵێک تیادەچـن‌و بە سەرشـۆڕی‌و ڕیسـوایی‌و سـزای زۆر سـەخت.

بۆیـە دەفەرمـوێ: ﴿ يَوْمَئِذٍ يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُوا وَعَصَوُا الرَّسُولَ ﴾ واتـە: هـەر یـەک لـە مانەیـان کۆکردوەتـەوە کوفر بـە خـواو پێغەمبەرەکـەی، وە سـەرپێچی پێغەمبەر ﷺ ﴿ لَوْ تُسَوَّىٰ بِهِمُ الْأَرْضُ ﴾ واتـە: بخرێنـە نـاو زەویـەوەو ببـن بە خـۆڵ‌و نەمێنـن، وەک چـۆن خـوا ﷻ (لـە سـەر زاری کافـران) دەفەرمـوێ: ﴿ وَيَقُولُ الْكَافِرُ يَا لَيْتَنِي كُنتُ تُرَابًا ﴿٤٠﴾ ﴾النبأ، (واتـە: بێبـڕوا دەڵێ هـاوار بـۆ من، خۆزگە خـۆڵ دەبـووم)، ﴿ وَلَا يَكْتُمُونَ اللَّهَ حَدِيثًا ﴿٤٢﴾ ﴾ واتـە: دان بـەوەدا دەنێـن کە کردوویانـەو زمان‌و پێیەکانیان شـایەتی لەسـەر کردەوەکانیـان دەدەن، لـەو ڕۆژەدا پاداشـتی ڕاسـتەقینەی خۆیـان وەردەگرن، وە ئـەو کات دەزانـن بـە ڕاسـتی خـوا هەر خـۆی زاتێکی ڕاسـت‌و دروسـت‌و ئاشـکرایە.

بـەڵام ئـەوەی کـە هاتـوە دەربـارەی بێبـڕواکان کـە کوفرەکەیـان دەشـارنەوە نکوڵـی دەکـەن، ئەمـە لـە هەنـدێ شـوێنی ڕۆژی دواییـدا دەبێ، کـە وا گومـان دەبـەن نکوڵی کردنیـان ڕزگاریـان دەکات لـە سـزای خـوا، بـەڵام کاتێـک ڕاسـتیەکانیان بۆ ئاشـکرا دەبێـت‌و ئەندامەکانی جەسـتەیان دێنە گۆو شـایەتیان لەسـەر دەدەن، ئـەو کات کارەکان دەردەکـەون‌و هیـچ شـوێنێک نامێنێـت بـۆ شـاردنەوە کـە سـوودیان پێبگەیەنێ.

(٤٣): ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَقْرَبُوا الصَّلَاةَ وَأَنتُمْ سُكَارَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُوا مَا تَقُولُونَ وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِي سَبِيلٍ حَتَّىٰ تَغْتَسِلُوا ۚ وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَاءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ الْغَائِطِ أَوْ لَامَسْتُمُ النِّسَاءَ فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا فَامْسَحُوا بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَفُوًّا غَفُورًا ﴿٤٣﴾ ﴾:

خـوا ﷻ قەدەغـەی کـردوە لـە بـڕواداران کـە نزیـک نوێـژ بکەونـەوە لـە کاتێـکدا کـە سەرخۆشـن، هەتـا بزانن چـی دەڵێـن، ئەمـە ئـەوە دەگرێتەوە دروسـت نیە کەسـی سـەرخۆش نزیکـی شـوێنی نوێژ کـردن بکەوێتـەوە، وەک مزگـەوت، بێگومـان نابێـت سـەرخۆش بچێتـە نێو مزگەوتەوە، وە گشـتگیر بـۆ نوێژکردن، بە هیچ جۆرێک دروسـت نیـە بـۆ سـەرخۆش نوێژکردن‌و عیبـادەت کـردن، چونکە عەقڵـی لە جێگای خـۆی نیەو نازانێـت چـی دەڵێـت، لەبـەر ئەمە خوا ﷻ دیـاری کردوەو پەیوەسـتی کـردوە بە بوونی زانسـتەوە، ئـەم دەقـە پیـرۆزە نەسـخ کراوەتـەوەو هەڵوەشـێنراوەتەوە بـە قەدەغە کردنی

مـەیو شـەڕاب بـە ڕەهایی، بێگومـان مەی لە سـەرەتای ئیسـلامەوە حەرام نەبوو، پاشـان خـوا ﷻ قەدەغـەی کـرد لەسـەر بەندەکانـی، بـە ئایەتـی: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا ﴿٢١٩﴾ ﴾ البقرة. (واتـە: پرسـیارت لێدەکەن دەربـارەی مەی (شـەڕاب)و قومار بڵـێ: گوناهێکی گەورەیان تێدایـە، هەنـدێ سـوودو بەرژەوەندیـش بـۆ خەڵـک بـەلاَم گوناهەکەیـان گەورەترە لە قازانجەکەیان).

پاشـان خـوای گەورە لە کاتـی ئامادەبوونـی نوێژدا قەدەغـەی لێکردن شـەڕاب بخۆنەوە، وەک چـۆن لـەم دەقـەدا باسـی دەکات، پاشـان قەدەغـەی کـرد بـە ڕەهایی لـە هەموو کاتەکاندا لـەو فەرمایشـتەی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ ﴿٩٠﴾ ﴾ المائدة. (واتـە: ئـەی ئەوانـەی ئیمانتان هێناوە شـەڕابو قومـارو بتـەکانو زەلەمـەکان[16]، هەمـوو ئەوانـە پیسـن لـە کـردەوەی شـەیتانن، لێیان دوور کەونەوە).

وە لەگـەڵ ئەمـەدا بـە ڕاسـتی قەدەغـە بوونـی قورسـە لـە کاتـی ئامـادە بوونـی نوێژدا، چونکـە ئـەم مەفسـەدە گەورەیە دەگرێتـە خۆی، کـە بریتیە لـە ڕووحو مەبەسـتی نوێژ، کـە خشـوعو ئامـادە بوونـی دڵـە لـە نوێـژدا، چونکـە بـە ڕاسـتی مـەی دڵ سـەرخۆش دەکاتو ڕێگـری دەکات لـە یـادی خـواو لـە نوێژ کـردن، وە لـە مانای ئـەم دەقە ئەوە وەردەگیرێـت کـە نابێت مـرۆڤ بچێتە نـاو نوێژەوە لە کاتـی خەوبردنەوەکـی قوڵدا کە خاوەنەکـەی نەزانێت چـی دەڵێتو چـی دەکات، بەڵکو ئاماژە بەوە دەکات ئەو کەسـەی کـە دەیەوێـت نوێـژ دابەسـتێت، پێویسـتە خـۆی داببڕێت لە هەموو شـتێک کـە دەبێتە مایـەی سـەرقاڵ کردنـی، وەک: ئەو کەسـەی کە میـز سـەغڵەتی دەکاتو دەسـتنوێژی هەیـە، بـەو شـێوەیە نوێژەکـەی دەکات، یـان لـە کاتێکـدا کە زۆر برسـی بێـتو دڵی بـۆ خـواردن بچێـت، وە خواردنیش ئامـادە بێت، وەک لـە فەرموودەی صەحیحـدا هاتوە.

پاشـان دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِي سَبِيلٍ ﴾ واتـە: نزیـک نوێـژ مەکەونـەوە لـە کاتێکـدا کـە لەشـتان گرانـە مەگەر لـەم حاڵەتـەدا نەبێـت، ئەویش تێپـەڕ بوونە بـە نێو مزگەوتـدا، وە لـە مزگەوتـدا نامێننـەوە ﴿ حَتَّىٰ تَغْتَسِلُوا ﴾ واتـە: ئەگـەر خۆتان شـۆرد، ئەمـە ئەوپـەڕی قەدەغەکردنـە لە نزیـک بوونەوە لـە نوێژ بۆ کەسـی لەش گـران، تەنها

---

١٦) (أزلام): شتێک بووە بۆ یانسیب بەکاریان هێناوە.

تێپەڕبوون بە نێو مزگەوتدا بۆ کەسی لەش گران حەڵاڵە.

﴿ وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ أَوْ لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمْ تَجِدُوا۟ مَآءً فَتَيَمَّمُوا۟ ﴾ خوا ڕێگەی بە نەخۆش داوە تەیەمموم بکات بە ڕەهایی لەگەڵ هەبوونو نەبوونی ئاودا، وە هۆکارەکەش بریتیە لە نەخۆشی کە ڕێگرە لە بەکارهێنانی ئاو، بە هەمان شێوە گەشت کردنیش، ئەویش گومانی ئەوەی لێدەکرێت ئاو دەست نەکەوێت، ئەگەر گەشتیار ئاوی دەست نەکەوت، یان ئەوەندەی دەست کەوت بە پێی پێویستی خۆی، لە خواردن هاوشێوەی، ئەوە دروستە تەیەمموم بکات. بە هەمان شێوە ئەگەر مرۆڤ بێ دەست نوێژ بوو، بە میز کردن، یان دەست بە ئاو گەیاندن، یان دەستبازی لەگەڵ خیزانەکانیدا، ئەوە ڕێگەی پێدراوە کە تەیەمموم بکات ئەگەر ئاوی دەست نەکەوێت، لە شوێنی خۆیدا بێت، یان لە سەفەر، وەک چۆن دەقەکە بە گشتی ئاماژەی پێ دەکات.

بە پوختی: خوا ﷻ ڕێگای بە تەیەمموم داوە لە دوو حاڵەتدا: کاتێک ئاو دەست نەکەوێت، ئەمە بە ڕەهایی لە شوێنی نیشتەجێبوونو سەفەردا، وە حاڵەتی نارەحەتی بە بەکارهێنانی بە هۆی نەخۆشیەوە.

توێژەرەوانی قورئان بۆچوونی جیاوازیان هەیە دەربارەی مانای: ﴿ أَوْ لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ ﴾ ئایا مەبەست لەمەدا جووت بوونە؟ ئەو ئایەتەکە دەبێتە بەڵگەیەک بۆ دروستی تەیەمموم، وەک چۆن فەرموودەیەکی زۆر لەو بارەوە هاتوە، یان مەبەست پێی: تەنها دەست لێدانە، ئەوەش ئەگەری هاتنە خوارەوە (المذي) لێدەکرێت، کە بریتیە لە دەست بەرکەوتنێک بە ئارەزووەوە، کەواتە: ئایەتەکە دەبێتە بەڵگە بۆ شکاندنی دەستنوێژ؟ شەرعزانەکان ئەم دەقەیان کردوەتە بەڵگە ﴿ فَلَمْ تَجِدُوا۟ مَآءً ﴾ بە پێویست بوونی گەڕان بە دوای ئاودا لە چوونە نێو کاتی نوێژەوە، وتوویانە: لەبەر ئەوەی نەیفەرمووە (لم یجد) بۆ کەسێک کە بە دوایی ئاودا نەگەڕێت، بەڵکو نایەتەجێ هەتا بە دوای ئاودا نەگەڕێت، وە هەروەها بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئاوی گۆڕاو بە هۆی شتێکەوە لە پاکیەکانو بەکارهێنانی دروستە، بەڵکو دەبێت خۆی پێ پاک بکاتەوە، چونکە دەچێتە چوار چێوەی فەرمایشتی: ﴿ فَلَمْ تَجِدُوا۟ مَآءً ﴾ ئەمە ئاوە، وە بەو شێوە تەماشای دەکەین کە ئاوێکی ڕەها نیە (ماء غیر مطلق) وە لەوەدا قسە هەیە.

وە ئـەم دەقـە پیـرۆزە بەڵگەیـە لەسـەر ڕەوا کـردنو ڕێگە پێدانـی ئەم حوکمـە گەورە، کـە خـوا ﷻ بـە هـۆی ئـەوەوە منەتی خـۆی ڕشـتووە بەسـەر ئـەم ئوممەتـەدا، ئەویش ڕێگـە پێـدانو بە ڕەوا کردنـی تەیەمومە، بێگومـان زانایان یەکدەنگن لەسـەر ئەوە. وە بە ڕاسـتی تەیەمـوم پێویسـتە بـە خۆڵێکی پـاک بێـت، ئەویش بریتیـە لە هـەر خۆڵێک کە لەسـەر ڕووی زەوی بێـت، یەکسـانە ئەگەر تـۆزی هەبێت یـان نەبێـت، وە دەگونجێت مەبەسـتی پێـی تـۆز بێـت، چونکـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿فَٱمۡسَحُواْ بِوُجُوهِكُمۡ وَأَيۡدِيكُم مِّنۡهُۚ ۝٦﴾المائدة. ئـەوەی کە تـۆزی پێوە نەبێت مەسـحی لەسـەر ناکرێت. وەک خـوا دەفەرمـوێ: ﴿فَٱمۡسَحُواْ بِوُجُوهِكُمۡ وَأَيۡدِيكُمۡ﴾ ئەمە شـوێنی مەسـح کردنی تەیەمومە: ڕووخسـار بە گشـتی، وە دەسـتەکانتان هەتا ئانیشـکتان وەک چـۆن فەرموودە ڕاسـتەکان بەڵگـەن لەسـەری، وە سـوننەتە بـە یـەک جـار بێـت، وەک فەرموودەکـەی عەممـار ئامـاژەی پێـدەکات، وە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی کـە تەیەمومـی لـەش گران وەک تەیەمومـی کەسـی بـێ دەسـتنوێژ وایە، بە ڕووخسـارو دەسـتەکانە.

سوودە وەدەست هاتووەکان:

بزانە کە یاسـاکانی پزیشـکی لەسـەر سـێ بنەما بەندە: پاراستنی تەندروسـتی لە زیانەکان، وە خـۆ بەتـاڵ کردنـەوە لێیـان، وە خۆپاراسـتن لێیـان، بێگومان خـوا ﷻ لـە کتێبەکەیدا ئامـاژەی پێکردوە. هەرچی دەربارەی پاراسـتنی تەندروسـتیو خۆپاراسـتنە لـە زیانەکان، بێگومـان فەرمانـی بـە خـواردنو خواردنـەوە کـردوە، بـە بـێ زێـدەڕەوی تێـدا کردن، وە گەشـتیارو نەخـۆش ڕێگەیـان پێـدراوە کـە ڕۆژوو نەگـرن، ئەمەش لەبەر پاراسـتنی تەندروسـتیان، بـە بەکارهێنانی ئـەوەی کە چاکە بۆ جەسـتە، لـە ڕووی دادپەوەریەوە، وە پاراسـتنی نەخـۆش لەوەی کـە زیانـی پێدەگەیێنێت.

هەرچـی دەربـارەی خـۆ بەتاڵکردنەوەیـە لـە شـتە زیانبەخشـەکان، خـوا ﷻ ڕێگـەی بە ئـەو کەسـە داوە کە لـە حەجـدا ئیحرام دەبەسـتێت سـەری بتاشـێت ئەمەش لەبـەر ئەوە پارێـزارو بێـت لـە نەخۆشـی، وە هەروەهـا بەڵگەیـە لەسـەر خۆ بەتـاڵ کردنـەوە لەوەی کـە لەوە لە پێشـترە، لـە میز کردنو سـەرئاو کـردنو ڕشـانەوەو، مەنـیو خوێنو جگە لەوانـە، ئیمامـی ئیبنو قەییـم ئامـاژەی پێکـردوە ڕەحمەتی خـوای لێبێت.

وە دەقەکە بەڵگەیە لەســەر ئەوەی کە پێویسـتبوونی ڕووخسـارو دەسـتەکان، وە بەڕاسـتی دروسـتە تەیەممـوم کـردن، ئەگەر لـە کۆتایی کاتەکەشـدا نەبێـت، وە داوای گـەڕان بە

دوای ئـاودا نـاكات مەگـەر لـە پاش بوونی هـۆكاری پێویسـت بوون، خـوا زاناترە.
پاشـان ئایەتەكـەی بەمە تـەواو كـردوە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا غَفُورًا﴾ واتـە: زۆر لێبوردەو لێخـۆش بـووە بـۆ بەندەكانی، بـەوەی كە كاری بۆ ئاسـان كـردوون بە ئەوپەڕی ئاسـان كـردن، بە شـێوەیەک كـە جێبەجـێ كردنی گـران نیە بۆ مسـوڵمان.
وە یەكێكـی تـر لـە لێبوردنەكانـی ئەوەیـە كە ڕەحمـی بـەم ئوممەتە كردوە بـە پاكیو بەكارهێنانـی خـۆڵ لە بری ئـاو، لە كاتێكدا كە ئاو دەسـت نەكەوێـت. وە یەكێكی تر لە لێبوردنەكانـی ئەوەیـە كە دەرگای لێخۆشـبوونی هەرگیز بـە ڕووی بەنـدە تاوانبارەكانیدا داناخـاتو بانگیـان دەكات بۆ لای لێخۆشـبوونی، وە یەكێكی تر لـە لێبوردنەكانی ئەگەر بـڕوادار بـە قـەد زەوی تـاوان ئەنجام بدات پاشـان بچێتـە لای خوای گـەورەو هاوەڵی بۆ دانەنابێـت، خوای گـەورە بە قـەد پانتایی زەوی بە لێخۆشـبوونەوە دەچێتـە پیریەوە.
(٤٤-٤٦): ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَـٰبِ يَشْتَرُونَ ٱلضَّلَـٰلَةَ وَيُرِيدُونَ أَن تَضِلُّوا۟ ٱلسَّبِيلَ ﴿٤٤﴾ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِأَعْدَآئِكُمْ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَلِيًّا وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ نَصِيرًا ﴿٤٥﴾ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ وَيَقُولُونَ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا وَٱسْمَعْ غَيْرَ مُسْمَعٍ وَرَٰعِنَا لَيًّۢا بِأَلْسِنَتِهِمْ وَطَعْنًا فِى ٱلدِّينِ ۚ وَلَوْ أَنَّهُمْ قَالُوا۟ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَٱسْمَعْ وَٱنظُرْنَا لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَقْوَمَ وَلَـٰكِن لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٤٦﴾ ﴾:
ئەمـە سەرزەنشـت كردنە بـۆ ئەوانەی ئەهلـی كتێبـن، وەک دەفەرموێ: ﴿أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَـٰبِ﴾وە لـەو چوارچێـوەدا ئاگـادار كردنەوەیـە بـۆ بەندەكانی كە ئـەوان یاخی نەبـنو وەک ئـەوان نەكەونـە نـاو شـیركەوە، هەواڵـی داوە ئەوان لـە ناخـی خۆیاندا﴿يَشْتَرُونَ ٱلضَّلَـٰلَةَ﴾ واتـە: حەزیـان لێ دەكـرد ئەوپەڕی حەز لێكردن، وە بۆ ئەو مەبەسـتە مـاڵو سـامانیان خـەرج دەكـرد، فەزڵـی گومڕاییـان دەدا بەسـەر ڕێنمایـی داو بێبڕوایش بەسـەر ئیمانداو بەدبەختیش بەسـەر خۆشـبەختیەوە، وە لەگەڵ ئەمەدا ﴿وَيُرِيدُونَ أَن تَضِلُّوا۟ ٱلسَّبِيلَ﴾. ئـەوان سـوورن لەسـەر گومڕاكردنتـان بە ئەوپـەڕی سـووربوون، تواناكانی خۆیـان لـەو مەبەسـتەدا بەكارهێنا، بـەڵام كاتێ خـوا پشـتیوانی بڕوادارانەو سـەرخەریانە بـۆی ئاشـكرا كـردوون ئـەوان چەنـدە لەسـەر گومڕایـیو سەرلێشـێواوین، لەبـەر ئەمە دەفەرموێ:

وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِأَعۡدَآئِكُمۡۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَلِيّٗا وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ نَصِيرٗا ٤٥
مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ وَيَقُولُونَ
سَمِعۡنَا وَعَصَيۡنَا وَٱسۡمَعۡ غَيۡرَ مُسۡمَعٖ وَرَٰعِنَا لَيَّۢا بِأَلۡسِنَتِهِمۡ
وَطَعۡنٗا فِي ٱلدِّينِۚ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ قَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَا وَٱسۡمَعۡ وَٱنظُرۡنَا
لَكَانَ خَيۡرٗا لَّهُمۡ وَأَقۡوَمَ وَلَٰكِن لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفۡرِهِمۡ فَلَا يُؤۡمِنُونَ
إِلَّا قَلِيلٗا ٤٦ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ ءَامِنُواْ بِمَا نَزَّلۡنَا
مُصَدِّقٗا لِّمَا مَعَكُم مِّن قَبۡلِ أَن نَّطۡمِسَ وُجُوهٗا فَنَرُدَّهَا
عَلَىٰٓ أَدۡبَارِهَآ أَوۡ نَلۡعَنَهُمۡ كَمَا لَعَنَّآ أَصۡحَٰبَ ٱلسَّبۡتِۚ وَكَانَ أَمۡرُ
ٱللَّهِ مَفۡعُولًا ٤٧ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ
ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفۡتَرَىٰٓ إِثۡمًا عَظِيمًا
٤٨ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُمۚ بَلِ ٱللَّهُ يُزَكِّي مَن يَشَآءُ
وَلَا يُظۡلَمُونَ فَتِيلًا ٤٩ ٱنظُرۡ كَيۡفَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَۖ
وَكَفَىٰ بِهِۦٓ إِثۡمٗا مُّبِينًا ٥٠ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيبٗا
مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡجِبۡتِ وَٱلطَّٰغُوتِ وَيَقُولُونَ
لِلَّذِينَ كَفَرُواْ هَٰٓؤُلَآءِ أَهۡدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ سَبِيلًا ٥١

﴿ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَلِيّٗا ﴾ واتە: حاڵی بەندەکانی بەڕێ دەخات، وە لەگەڵیاندا نەرمو نیان دەبێت لە هەموو کارەکانیاندا، وە چی بۆ خۆشبەختیان باش بێ بۆیان ئاسان دەکات ﴿ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ نَصِيرٗا ﴾ سەریان دەخات بەسەر دوژمنەکانیاندا، وە ئەوەی پێویست بێ بۆیان ڕوون دەکاتەوەو پشتیوانیان دەکات لەسەر جێبەجێ کردنی، پشتیوانی خوا پڕە لە خێرو سەرکەوتن بە دوای خۆیدا دەهێنێت.

پاشان چۆنیەتی گومڕایی‌و نکوڵیان دەردەخات، وە دەرخستنی ناهەق بەسەر هەقدا، دەفەرموێ: ﴿ يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ ﴾ یان بە گۆڕانی وشەکە، یان واتاکەی، یان هەردووکیان، یەکێک لەو گۆڕینانە بریتیە لە دابەزاندنی ئەو سیفەتانەی لە کتێبەکەیاندا باسکراوە کە ناگونجێت‌و بەڕاست دانانرێ مەگەر تەنها بۆ موحەممەد ﷺ نەبێت، ئەوان وا خەڵکی چەواشە دەکەن کە مەبەستی پێی پێغەمبەر ﷺ نیە، بەڵکو مەبەست پێی کەسێکی ترە، وە ئەو هەقیقەتە دەشارنەوە.

ئەمە حاڵیانە لە زانستدا کە خراپترین حاڵە، ئەوەی ڕاستی بێت هەڵیان گێڕایەوەو هەق‌و ڕاستیان لە جێگای ناڕاستی داناو سەرە ڕای ئەوەش دژایەتی هەقیان دەکرد، بەڵام حاڵیان لە کارپێکردن‌و ملکەچ بووندا ئەوان ﴿ وَيَقُولُونَ سَمِعۡنَا وَعَصَيۡنَا ﴾ واتە: (دەڵێن) قسەکەمان بیست‌و سەرپێچی فەرمانەکانتمان کرد، ئەمەش ئەوپەڕی بێبڕوایی‌و بەرهەڵستیە لە بری ملکەچ بوون.

وە بە ناشرینترین شێوە قسەیان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەکرد، هەتا بڵێی دوور بوون لە ئەدەب، دەیانوت: ﴿ وَٱسۡمَعۡ غَيۡرَ مُسۡمَعٖ ﴾ مەبەستیان ئەوە بوو: گوێ

بگــرە قــەت گوێــت لــێ نەبێــت ئــەوەی كــە حــەزی لــێ دەكــەی، بەڵكــو لێمــان ببیســتە ئــەوەی حــەزی لــێ ناكەیــت.

﴿ وَرَٰعِنَا ﴾ (واتــە: چــاك گوێمــان بــۆ بگــرە، بــەڵام بــە زمانــی جوولەكــە واتــە: تۆ خراپترینمانــی) مەبەســتیان لــەم وتــەدا ئــەوە بــوو: عەیبــی ناشــرین بــوو، وە وا گومانیان دەبــرد بــەو زمــان پیســەیان دەتوانــن تانــە لــە دیــن بــدەنو عەیــب لــە پێغەمبــەر ﷺ دەر بخــەن، وە لــە نــاو یەكتــردا مەبەســتە بۆگەنەكەیــان ئاشــكرا دەكــرد، بۆیــە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ لَيًّۢا بِأَلۡسِنَتِهِمۡ وَطَعۡنًا فِي ٱلدِّينِۚ ﴾.

پاشــان ڕێنمایــی كــردوون بــۆ لای ئــەوەی كــە خێــری تێدایــە بۆیــان، وەك دەفەرمــوێ: ﴿ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ قَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَا وَٱسۡمَعۡ وَٱنظُرۡنَا لَكَانَ خَيۡرًا لَّهُمۡ وَأَقۡوَمَ ﴾ بــە ڕاســتی ئــەم دەقــە دەســتەواژەیەكی جــوان دەگرێتــە خــۆ لــە چۆنیەتــی قســەكردن لەگــەڵ پێغەمبــەردا ﷺ كــە پــڕە لــە ئەوپــەڕی ئــەدەبو گوێڕایەڵــی تــەواو، وە داواو پرســیار كــردن بــە جوانتریــن شــێوە كــە شایســتەی پێغەمبــەر ﷺ بــێ. دەبــوو بــەم شــێوەیە مامەڵەیــان لەگــەڵ پێغەمبــەردا ﷺ بكردبایــەت، بــەڵام چونكــە سروشــتیان پــاك نەبــوو، بۆیــە خــوای گــەورە دووری خســتنەوە لەبــەر بێبڕوایــیو چاوقایمــی خۆیــان، لەبــەر ئەمــە دەفەرمــوێ: ﴿ وَلَٰكِن لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفۡرِهِمۡ فَلَا يُؤۡمِنُونَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴾.

(٤٧): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ ءَامِنُواْ بِمَا نَزَّلۡنَا مُصَدِّقٗا لِّمَا مَعَكُم مِّن قَبۡلِ أَن نَّطۡمِسَ وُجُوهٗا فَنَرُدَّهَا عَلَىٰٓ أَدۡبَارِهَآ أَوۡ نَلۡعَنَهُمۡ كَمَا لَعَنَّآ أَصۡحَٰبَ ٱلسَّبۡتِۚ وَكَانَ أَمۡرُ ٱللَّهِ مَفۡعُولًا ٤٧ ﴾:

خــوا ﷻ فەرمــان بــە خــاوەن كتێبــە پیــرۆزەكان دەكات لــە جوولەكــەو گــاور، كــە ئیمــان بێنــن بــە پێغەمبــەر موحەممــەد ﷺ وە بــەو قورئانــەی كــە بــۆی دابەزانــدوون، كــە لــە ســەرووی كتێبەكانــی ترەوەیــە كــە پێشــتر دابەزێنــراونو بــە ڕاســت دانــەری ئــەم كتێبانەیــە، وە هەواڵیــان داوە دەربــارەی، كاتێــك كــە هــەواڵ پێــدراو هــات پێویســتە بــڕوای پــێ بكــەن. وە بــە هەمــان شــێوە ئــەوان ئەگــەر بــڕوا بــەم قورئانــە نەكــەن، ئــەوە بڕوایــان بــەو كتێبانــە نیــە كــە لــە ژێــر دەســتیاندایە، چونكــە كتێبــی خــوا هەندێكــی بەراســت دانــەری هەندێكــی تــرە، وە هەندێكــی لەگــەڵ هەندێكــی تریــدا دەگونجێــت، بانگەشــەی بڕواهێنــان بــە هەندێــكو بــڕوا نەهێنــان بــە هەندێكــی دیكــە بانگەشــەیەكی بــە تــاڵو بــێ بنەمایــەو ناكرێــت بــاوەڕی پــێ بكرێــت.

وە لـە ڕستەی: ﴿ ءَامِنُواْ بِمَا نَزَّلْنَا مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَكُم ﴾ هانـی داون، وە ئەوان وا پێویست بـوو لـە پێش هەمـوو کـەس دەسپێشـخەریان بکردایـە بـە هـۆی ئـەو زانسـتەی کـە خـوا پێـی بەخشـیبوون، وە بـە هـۆی ئـەو کـە بـۆی ناردبـوون، لەبـەر ئەمـە پەیمانـی داوە لەسـەر بـڕوا نەهێنانیـان وەک دەفەرمـوێ: ﴿ مِّن قَبْلِ أَن نَّطْمِسَ وُجُوهًا فَنَرُدَّهَا عَلَىٰٓ أَدْبَارِهَآ ﴾ ئەمـەش پاداشـت لـە بەرانبـەر ئـەو کردەوانـەی کـە کردوویانـە، وەک چـۆن وازیـان لـە ڕاسـتی هێنـاو شـوێن بەتـاڵو ناهـەق کەوتـوونو ڕاسـتیەکانیان هەڵگێڕاوەتـەوەو شـێواندوویانن، ئـەوەی کـە پووچـە کردوویانـە بـە هـەقو ڕاسـتی، وە ئـەوەی کـە هـەقو ڕاسـتیە کردوویانـە بـە پـووچ، بۆیـە پاداشـت دراونەتـەوە لـە بـری ئـەو کـردەوە خراپانەیـان کـە ئەنجامیـان داوە. بـە سـاف کردنـی ڕووخسـاریان، وەک چـۆن هـەقو ڕاسـتیان داپۆشـی، وە هەروەهـا ڕووخسـاریانی خسـتە پشـتی سـەریانەوە ئەمـەش ناشـرینترین شـێوەیە.

﴿ أَوْ نَلْعَنَهُمْ كَمَا لَعَنَّآ أَصْحَـٰبَ ٱلسَّبْتِ ﴾ بـەوەی کـە لـە ڕەحمەتـی خـوێ دەریـان بـکات، وە سـزایان بـداتو بیانـکات بـە مەیمـون، وەک چـۆن وەی کـرد لـە براکانیـان، ئەوانـەی کـە لـەڕۆژی شـەممەدا دەسـتدرێژیان کـرد (وەک لـە شـوێنی دی خـوا دەفەرمـوێ:) ﴿ فَقُلْنَا لَهُمْ كُونُواْ قِرَدَةً خَـٰسِـِٔينَ ﴾البقـرة، ﴿ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا ﴾ وەک ئـەو ئایەتـەی دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّمَآ أَمْرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيْـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٨٢﴾ ﴾یـس.

(٤٨): ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفْتَرَىٰٓ إِثْمًا عَظِيمًا ﴿٤٨﴾ ﴾

خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات لـە هیـچ کەسـێک خـۆش نابێـت هاوەڵـی بـۆ دابنێـت لـە دروسـتکراوەکان، وە بێجگـە لـەوە لـە هەمـوو تاوانـەکان خـۆش دەبێت، بچـووک بن، یـان گـەورە، ئەویـش لـە کاتێکـدا ویسـتی لەسـەر بێـتو حیکمەتەکـەی بیخوازێـت. ئـەو تاوانانـەی جگـە لـە هاوبـەش دانـان، خـوا هـۆکاری زۆری دانـاوە بـۆ لێخۆشـبوونیان، وەک چاکـەکان کـە دەبنـە مایـەی سـڕینەوەیان، وە موسـیبەتو بـەڵاکان کـە دەبنـە کەفـارەت لـە دنیـادا، وە بـەرزەخ (نێو گـۆڕ)، وە ڕۆژی قیامـەت، وە پاڕانـەوەی بـڕواداران هەندێکیـان بـۆ هەندێکـی تـر، وە شـەفاعەتو تـکای تـکاکاران، وە لـە سـەرووی هەمـوو ئەمانـەوە ڕەحمـەتو بەزەیـی خـوا بـۆ

ئیمانـــداران‌و یەکتاپەرســـتان.

ئەمــە بــە پێچەوانــەی هاوبەشــدانانە، چونکــە بەڕاســتی هاوەڵدانــەر دەرگاکانــی لــێ خۆشــبوونی لەســەر خــۆی داخســتووە، عیبــادەت‌و خواپەرســتی هیــچ ســوودو بەهایەکی نیــە بەبــێ یەکتاپەرســتی، وە بــە هەمــان شــێوە بەڵاکانیــش ســوودیان نیــە بۆ مــرۆڤ لە ڕۆژی دواییــدا، ﴿ مِن شَٰفِعِينَ ﴿١٠٠﴾ وَلَا صَدِيقٍ حَمِيمٍ ﴿١٠١﴾ ﴾الشعراء. وە لەبــەر ئەمــە خــوا ﷻ دەفەرمــوێ: ﴿ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفْتَرَىٰٓ إِثْمًا عَظِيمًا ﴾ واتــە: تاوانێکــی گــەورەی هەڵبەســتووە، چ ســتەمێک لــەوە گەورەتــرە دروســتکراوێک کــە لــە خۆڵێکــی ناتــەواو دروســتکراوە لــە هەمــوو ڕووەکانــەوە، هــەژارە بــە هەمــوو مانــای هــەژاری، هیچــی بەدەســت نیــە، نــە قازانــج نــە زەرەر نــە مــردن‌و نــە ژیــان‌و نــە زیندووکردنــەوە، بچوێنرێــت بــە دروســتکەری هەمــوو دروســتکراوەکان، کــە کامــڵ‌و تــەواوە لــە هەموو ڕووەکانــەوە، پێویســتی بــە هیــچ دروســتکراوێک نیــە، بــە دەســتیەتی ســوودو زیــان، بەخشــین‌و ڕێگــری کــردن، وە هــەر نــازو نیعمەتێــک لای هــەر دروســتکراوێک بێــت تەنهــا لــە لای ئــەوەوە هاتــووە، ئایــا ســتەمێک هەیــە لەمــە گەورەتــر بێــت؟ لەبــەر ئەمەیــە دۆزەخــی ســەپاندووە بەســەر خاوەنەکەیــدا بێبەشــی کــردوە لــە پاداشــت ﴿ إِنَّهُۥ مَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ ٱلْجَنَّةَ وَمَأْوَىٰهُ ٱلنَّارُ ﴿٧٢﴾ ﴾المائـدة، ئــەم دەقــە بــۆ کەســێکە کــە تەوبــەی نەکردبــێ. بــەڵام ئــەو کەســەی کــە دەگەڕێتــەوەو داوای لێخۆشــبوون دەکات، ئــەوە بێگومــان خــوا لــە گشــت تاوانەکانــی تریــش‌و هاوبــەش دانانەکەشــی خــۆش دەبــێ، وەک خــوا ﷻ دەفەرمــوێ: ﴿ قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ﴿٥٣﴾ ﴾الزمــر، واتــە: بــۆ کەســێک کــە بگەڕێتــەوەو داوای لێخۆشــبوون بــکات.

(٤٩-٥٠): ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُم ۚ بَلِ ٱللَّهُ يُزَكِّى مَن يَشَآءُ وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٤٩﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ ۖ وَكَفَىٰ بِهِۦٓ إِثْمًا مُّبِينًا ﴿٥٠﴾ ﴾:

ئەمــە سەرســووڕمانە لــە لایــەن خــوای گــەورەوە بــۆ بەندەکانــی، وە سەرزەنشــت کردنیشــە بــۆ ئــەو کەســانەی کــە تەزکیــەی نەفســی خۆیــان دەکــەن، خۆیــان بــە چــاک لــە قەڵــەم دەدەن لــە جوولەکــەو گــاوەرەکان، وە ئەوانــەی شــوێنیان کەوتــوون، وە جوولەکـــەو گـــاورەکان دەیانـــوت: ﴿ نَحْنُ أَبْنَٰٓؤُا۟ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥ ﴿١٨﴾ ﴾المائــدة. (واتــە: ئێمــە ڕۆڵــەی خوایــن)، وە دەیانــوت: ﴿ لَن يَدْخُلَ ٱلْجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوْ

نَصَٰرَىٰ ﴿١١١﴾ ﴾البقرة. (تەنیا جوولەکەو گاور دەچنە بەهەشت) بێگومان ئەوە بانگەشەیەکی بێ بەڵگەیە، وە بەڵگەی ڕوون ئەوەیە کە قورئان هەواڵی پێداوە وەک دەفەرموێ: ﴿ بَلَىٰ مَنۡ أَسۡلَمَ وَجۡهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحۡسِنٞ فَلَهُۥٓ أَجۡرُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ وَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿١١٢﴾ ﴾البقرة.

ئەوانە، ئەو کەسانەن کە خوا ﷻ تەزکیەی کردوون، بۆیە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ بَلِ ٱللَّهُ يُزَكِّي مَن يَشَآءُ ﴾ واتە: بە ئیمانو کرداری چاک، وە خۆ بە دوور گرتن لە خووڕەوشتە ناپەسەندەکانو خۆ ڕازاندنەوە بە سیفەتە جوانەکان. بەڵام ئەوانە ئەگەر چی وەسفی خۆیان بکەنو بڵێن خوا ﷻ ئێمەی جیا کردوەتەوە، ئەوە درۆ دەکەن لەوەدا، بە هۆی ستەمو کوفریانەوە، نەک خوا ستەمیان لێ بکات، وە لەبەر ئەمە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يُظۡلَمُونَ فَتِيلًا ﴾ ئەمە گشتیە، واتە: بە هیچ شێوەیەک ستەمیان لێ ناکرێت، تەنانەت بە ئەندازەی ئەو دەزووەی کە لە ناو خورمادا هەیە.

وە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ٱنظُرۡ كَيۡفَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ ﴾ واتە: بە تەزکیەی نەفسی خۆیان، چونکە ئەمە گەورەترین بوختانە لەسەر خوا، چونکە تێوەڕۆکی خۆ بە پاک زانینیان، هەواڵی ئەوەیان دابوو کە هەرچی ئەوان دەیکەن لە لایەن خواوەیەو ڕاستە، وە ئەوەی بڕوادارانو مسوڵمانان لەسەری دەڕۆن پووچو بەتاڵە، ئەمە گەورەترین درۆیە، وە هەڵگێڕانەوەی ڕاستیەکانە، ڕاستی کردنە پووچو پووچ کردنە ڕاستیە، وە لەبەر ئەمە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَكَفَىٰ بِهِۦٓ إِثۡمٗا مُّبِينًا ﴾ واتە: ئاشکراو دیارە، شایانی سزایەکی سەختو بە ئێشە.

(٥١-٥٧): ﴿ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيبٗا مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡجِبۡتِ وَٱلطَّٰغُوتِ
وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ هَٰٓؤُلَآءِ أَهۡدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ سَبِيلًا ﴿٥١﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُۖ
وَمَن يَلۡعَنِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ نَصِيرًا ﴿٥٢﴾ أَمۡ لَهُمۡ نَصِيبٞ مِّنَ ٱلۡمُلۡكِ فَإِذٗا لَّا يُؤۡتُونَ ٱلنَّاسَ نَقِيرًا ﴿٥٣﴾
أَمۡ يَحۡسُدُونَ ٱلنَّاسَ عَلَىٰ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦۖ فَقَدۡ ءَاتَيۡنَآ ءَالَ إِبۡرَٰهِيمَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ
وَءَاتَيۡنَٰهُم مُّلۡكًا عَظِيمٗا ﴿٥٤﴾ فَمِنۡهُم مَّنۡ ءَامَنَ بِهِۦ وَمِنۡهُم مَّن صَدَّ عَنۡهُۚ وَكَفَىٰ بِجَهَنَّمَ سَعِيرًا ﴿٥٥﴾
إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِنَا سَوۡفَ نُصۡلِيهِمۡ نَارٗا كُلَّمَا نَضِجَتۡ جُلُودُهُم بَدَّلۡنَٰهُمۡ جُلُودًا غَيۡرَهَا لِيَذُوقُواْ
ٱلۡعَذَابَۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمٗا ﴿٥٦﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَنُدۡخِلُهُمۡ جَنَّٰتٖ
تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ لَّهُمۡ فِيهَآ أَزۡوَٰجٞ مُّطَهَّرَةٞۖ وَنُدۡخِلُهُمۡ ظِلّٗا ظَلِيلًا ﴿٥٧﴾ ﴾:

ئەمــە لــە سـیفەتە ناشـرینەکانی جوولەکەیــەو ئێرەیـی بردنیانــە بــە پێغەمبــەری خــوا ﷺ و بــڕواداران، بــە ڕاسـتی خورەوشـتە ناپەسـندەکانیانو سروشـتە پیسـەکانیان هانیـدان لــە واز هێنــان لــە ئیمــان بــە خــوا، لــە بــری ئــەوەدا باوەڕیــان بــە شـتی بــێ نــرخو بــێ کەڵــکو بەرنامــەی غەیــری خــوا کــرد، لــەو چــوار چێوەشــدا جادووگــەرو فاڵچیــەکانو بەندایەتــی غەیــری خــواو گوێڕایەڵــی شــەیتان، بــە هەمــان شـێوەی بــێ بڕوایــیو ئێرەیــی بردنیــان بــوو بــە مایــەی ئــەوەی ڕێگــای بێبــڕواکان هەڵبژێــرن لــە بــت پەرســتان بەســەر ڕێگــای ئیماندارانــدا وەک دەفەرمــوێ: ﴿ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾ واتــە: لەبــەر خاتــری ئــەوان، وە کاســە لێســی بــۆ کردنیــان، وە ڕقبوونیــان لــە ئیمــان: ﴿ هَٰٓؤُلَآءِ أَهۡدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ سَبِيلًا ﴾ واتــە: ڕێبازیــان ڕاسـترە، ئــای چەنــدە گەمــژەن چەنــدە سەرســەختن چەنــدە کــەم عەقڵــن!! ئایــا بڵــێ وا گومانیــان بردبێــت کــە کەســی عاقڵــی پــێ لەخشــتە بــەرن، یــان دەیخەنــە عەقڵــی کەســانی نەفامــەوە، ئایــا ئاینێــک بــە چــاک دەزانرێــت بــڕوای بــە بــت پەرسـتی بێــت! وە بــەردەوام بێــت لەســەر قەدەغەکردنــی پاکــەکانو ڕێگــە بــدات بــە شـتە پیســەکان، وە حەڵاڵکردنــی بەشـێکی زۆر لــە قەدەغــە کــراوەکان، وە بەرپــا کردنــی سـتەم لــە خەڵکــیو یەکســان کردنــی دروسـتکەر لەگــەڵ دروسـتکراوەکان، وە بێبڕوایــی کــردن بــە خــواو پێغەمبــەرانو کتێبەکانــی، بەســەر دینێکــەوە لەســەر بەندایەتــی خــوای بــە بەزەییــەوە بونیــاد نــراوە، وە دڵســۆزی بــۆ خــوا لــە ئاشــکراو نهێنیــدا، وە بێبڕوایــی بــەوەی کــە بەندایەتــی دەکرێــت لــە بــتو شــەیتانەکانو درۆزنــان، وە جەخــت دەکاتــەوە لــە پەیوەنــدی خزمایەتــیو چاکــە بەرانبــەر بــە هەمــوو دروسـتکراوەکانی، وە بەرپاکردنــی دادپــەروەری لــە نــاو خەڵکیــدا، وە قەدەغــە کردنــی هەمــوو پیســیو خراپەیــەک، وە ڕاسـتگۆیی لــە هەمــوو گوفتــارو کردارەکانــدا، ئایــا ئەمــە وەک ئــەوی تــر وایــە. بەڕاسـتی خاوەنــی ئــەم قســەیە یــان نەفامتریــن مرۆڤــەو لاوازتریــن عەقڵــی هەیــە، یــان لــە گەورەتریــن سەرســەختەکانیانو ســەرپێچی کارترینیانــە بەرانبــەر بــە هــەق. ئەمــە حەقیقەتــە، لەبــەر ئەمــە خــوا ﷻ دەفەرمــوێ:

أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُۖ وَمَن يَلۡعَنِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ نَصِيرًا ﴿٥٢﴾
أَمۡ لَهُمۡ نَصِيبٞ مِّنَ ٱلۡمُلۡكِ فَإِذٗا لَّا يُؤۡتُونَ ٱلنَّاسَ نَقِيرًا ﴿٥٣﴾ أَمۡ
يَحۡسُدُونَ ٱلنَّاسَ عَلَىٰ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦۖ فَقَدۡ ءَاتَيۡنَآ
ءَالَ إِبۡرَٰهِيمَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَءَاتَيۡنَٰهُم مُّلۡكًا عَظِيمٗا ﴿٥٤﴾
فَمِنۡهُم مَّنۡ ءَامَنَ بِهِۦ وَمِنۡهُم مَّن صَدَّ عَنۡهُۚ وَكَفَىٰ بِجَهَنَّمَ سَعِيرًا ﴿٥٥﴾
إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِنَا سَوۡفَ نُصۡلِيهِمۡ نَارٗا كُلَّمَا نَضِجَتۡ
جُلُودُهُم بَدَّلۡنَٰهُمۡ جُلُودًا غَيۡرَهَا لِيَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ
عَزِيزًا حَكِيمٗا ﴿٥٦﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَنُدۡخِلُهُمۡ
جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ لَّهُمۡ فِيهَآ
أَزۡوَٰجٞ مُّطَهَّرَةٞۖ وَنُدۡخِلُهُمۡ ظِلّٗا ظَلِيلًا ﴿٥٧﴾ ۞إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ
أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن
تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا
بَصِيرٗا ﴿٥٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي
ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ
تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ﴿٥٩﴾

﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ ﴾ واتە: لە ڕەحمەتی خۆی بە دووری گرتوونو سزای خۆی بۆ حەلاڵ کردوون. ﴿ وَمَن يَلۡعَنِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ نَصِيرًا ﴾ واتە: (خوا) پشتی تێدەکات، (ئەو کەسەش) دوای بەرژەوەندیەکانی دەکەوێتو دیپارێزێت لە هەموو مەترسیەک کە لە دەستی دەربێنێ، ئەمەش ئەوپەڕی سەرشۆڕیو ریسواییە.

﴿ أَمۡ لَهُمۡ نَصِيبٞ مِّنَ ٱلۡمُلۡكِ ﴾ واتە: هەر کەسێک بیانەوێت فەزڵی بدەن بەسەر ئەوەدا کە دەیانەوێت، ئەمە تەنها لەبەر هەواو ئارەزوەکانیانە، لە پاشان ببن بە هاوبەشی خوا لە ڕێکخستنی موڵکایەتیدا، ئەگەر بەو شێوە بووایە ئەوە خۆیان دەگرتەوەو ڕەزیلیان دەکرد بە ئەوپەڕی ڕەزیلی، وە لەبەر ئەمە دەفەرموێ: ﴿ فَإِذٗا ﴾ واتە: ئەگەر پشکیان هەبووایە لە دەسەلاتو پادشایی ﴿ لَّا يُؤۡتُونَ ٱلنَّاسَ نَقِيرًا ﴾ واتە: (نەیان دەبەخشی بە ئەندازەی توێکڵە خورمایەک) شتێک، یان کەمتریش، ئەمە وەسفی جوولەکەیە لە زۆر ڕەزیلیدا، ئەگەر وا دابنرێت ئەوان بەشداربن لەگەڵ خوادا لە موڵکو داراییدا، ئەمە تەنها پرسارکردنێکی نکوولی لێکەرانەیە، (ئەگەرنا وەلامەکە) لای هەموو کەسێک ڕوونو ئاشکرایە.

﴿ أَمۡ يَحۡسُدُونَ ٱلنَّاسَ عَلَىٰ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ ﴾ واتە: ئایا ئەوە وای لێکردوون کە دەیانوت ئێمە لە گەڵ خوادا بەشدارین، هەر کەسێک خۆیان بیانەوێت چاکەی بدەن بەسەر کەسێکی تردا؟ یان حەسوودیو ئێرەیی بە پێغەمبەری خواو ﷺ ئیمانداران وای لێکردوون، لەسە ئەو فەزڵو چاکەی کە داویەتی بەسەریاندا، ئەوە شتێکی داهێنراو نامۆ نیە لە فەزڵو چاکەی خوا. ﴿ فَقَدۡ ءَاتَيۡنَآ ءَالَ إِبۡرَٰهِيمَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَءَاتَيۡنَٰهُم مُّلۡكًا عَظِيمٗا ﴾ خوا ﷻ نیعمەتی خۆی ڕشتووە بەسەر ئیبراهیمو نەوەکانیدا لە پێغەمبەرایەتیو کتێبو پادشایەتی، وە ئەو پاشادیەتیەی کە بەخشیویەتی بە پێغەمبەرەکانی وەک داوودو

سـولەیمان، نیعمەتـی خـوا بەردەوامـە لەسـەر بـڕواداران، ئیتـر چـۆن نکوڵـی نیعمەتەکانـی دەکەن، بە پێغەمبەرایەتیو سـەرکەوتنو پادشـایەتی بۆ موحەممەد ﷺ باشـترینی دروسـتکراو بەڕێزتریـنو گەورەترینو زاناترینیان لە خواناسـیداو لە خواترسـترینیان؟! ﴿فَمِنۡهُم مَّنۡ ءَامَنَ بِهِۦ﴾ واتـە: (هەیانـە ئیمانیـان هێناوە) بـە موحەممەد ﷺ ئـەوە بەو ئیمان هێنانە خۆشـبەختی دنیـاو دوارۆژی بـە دەسـتهێناوە ﴿وَمِنۡهُم مَّن صَدَّ عَنۡهُۚ﴾ لـە سەرکەشـیو لـووت بەرزیو حەسـوودیدا، ئەوانـە لـە دنیـادا سـەر لێشـێواون، تووشـی بـەڵاو ناخۆشـی بـوون بـە هۆی شـوێنەواری سـەرپێچی کردنیانەوە.

﴿وَكَفَىٰ بِجَهَنَّمَ سَعِيرًا﴾ ئاگرێکـی هەڵگیرسـاوە بـۆ ئـەوەی کـە بێبـڕوا دەبێ بـە خوا، وە نکوڵـی پێغەمبەرایەتـی پێغەمبـەران دەکات لە جوولەکەو گاورو هاوشـێوەکانیان، لە گشـت چینەکانـی بێبڕوایـان، وە لەبـەر ئەمـە دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِنَا سَوۡفَ نُصۡلِيهِمۡ نَارًا﴾ واتـە: ئاگرێکی گـەورەو هەڵگیرسـاوو زۆر گـەرمو بەتین.

﴿كُلَّمَا نَضِجَتۡ جُلُودُهُم﴾ واتە: پێسـتیان سووتا ﴿بَدَّلۡنَٰهُمۡ جُلُودًا غَيۡرَهَا لِيَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَ﴾ واتـە: لەبـەر ئـەوە ئەوپـەڕی سـزا بدرێـن، وەک چـۆن بێبڕوایـیو سەرسـەختیان دووبارە بووەتـەوە، هەتـا بـووە بـە وەسـفو خوێـک بۆیـان، بـە هەمان شـێوە سـزاش لەسـەریان دووبـارە دەبێتـەوە بـە پێـی کردەوەکانیـان، بۆیـەش دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا﴾ واتـە: خـاوەن عیززەتێکی گەورەیە، وە خـاوەن حیکمەتە لە دروسـتکراوەکانیدا، وە لـە فەرمانو پاداشـتو سـزایدا.

﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ واتـە: (ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوە) بـە خـوا، وە ئـەوەی پێویسـتە لـە بنەماکانـی ئیمـانو ئیسـلام ﴿وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ ئەوانـەی کـە پێویسـتو ئەوانـەی کـە چاکـە ﴿سَنُدۡخِلُهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ لَّهُمۡ فِيهَآ أَزۡوَٰجٞ مُّطَهَّرَةٞ﴾ (دەیانخەینـە چەند بەهەشـتێک کە ئاویـان بە ژێردا دەڕۆنو بە هەمیشـەیی تێیدا دەمێننـەوە)، (مُّطَهَّرَةٞ) واتـە: (ئافرەتانی بەهەشـت دوورن) لە ڕەوشـتە خراپـەو نابەجێکان، وە خوڕەوشـتی ناشـرین، وە ئـەو ڕەوشـتانەی لـە ئافرەتانی دنیـادا هەیە، لە هەموو پیسـیو عەیـبو ناتـەواوی (هیچـی لـە ئافرەتانی بەهەشـت نین).

(٥٨-٥٩): ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا ﴿٥٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ

ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ﴿٥٩﴾ ﴾:

ئەمانەتـەکان: هەمـوو ئـەو شـتانەیە کە سـپاردە کـراون بـە مـرۆڤ، وە فەرمانـی پێکراوە بەرپایـان بـکات، خـوا ﷻ فەرمانـی کردوە بـە دانەوەی هەموویـان، بە تـەواوی‌و بێ کەم‌و کورتـی‌و بـێ دواکەتن، دەسـەڵاتەکان بە گشـتی دەچنە چوارچێـوەی ئەم دەقـەوە لە ماڵ‌و سـامان‌و داریـی‌و سـەرجەم فەرمـان پێکـراوەکان‌و ئەوانـەش کە تەنهـا خوا پێـی دەزانێت.

شـارەزایانی فیقهی ئیسـلامی دەڵێن: هەر کەسـێک سـپاردەیەک بدرێتە لای، پێویسـتە وەک خـۆی پارێزگـاری لـێ بـکات، وتوویانە: چونکـە ناتوانێـت بیداتەوە بـە پاراسـتنی نەبێت، بۆیە پاراسـتنی واجبە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا ﴾ بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی کـە نابێـت بدرێـت بە دەسـتی متمانـە پـێ نەکـراو، وە ئەوەیشـی دەبێـت بە وەکیلـی دەبێت هەمـان پلەی هەبێـت، ئەگەر بیـدات بە دەسـتی جگـە لـە خاوەنەکەی ئـەوە سـپاردەکەی نەگەیانـدوە، ﴿ وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِۚ ﴾ ئەمـە هەمـوو دادوەریـەکان دەگرێتـەوە، لـە بـواری خوێن، مـاڵ‌و سـامان‌و نامـووس، جـا ئەگـەر کـەم بێـت یـان زۆر، بـۆ نزیـک بێـت یـان دوور، پیـاو بـاش بـێ، یـان پیـاو خـراپ، دۆسـت بـێ، یـان دوژمن، مەبەسـت لـە (العـدل) کە خـوا فەرمانـی پێکـردوە، بریتیە لە شـەریعەتی ئیسـلام کە لەسـەر زمانـی پێغەمبەرەکەی ﷺ ڕوونکراوەتـەوە، لـە سـزاو تۆڵـەو حوکمـەکان، مەبەسـت لـە (العـدل) ئەمەیە کـە دەبێت کاری پـێ بکرێـت، وە کاتێـک دەرکـەوت کە ئـەم فەرمانانە چـاک‌و دادگەریـی تێدایە، دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا ﴾ ئەمـە پیاهەڵدانـە لـە لایەن خواوە بـۆ فەرمانەکانـی‌و قەدەغەکراوەکانـی، کـە بەرژەوەندی هـەردوو دنیای تێدایـە، زیانەکانی دوور دەخاتـەوە، چونکـە دانەرەکەی بیسـەرو بینەرە، کە هیچ شـتێک لەو ناشـاردرێتەوە، وە ئـەوەی ئـەو دەیزانـێ بـۆ بەرژەوەنـدی بەندەکانـی دەیزانێت خۆیـان نایزانن.

پاشـان فەرمانـی بـە گوێڕایەڵـی خـۆی‌و گوێڕایەڵـی پێغەمبەرەکـەی ﷺ کـردوە، بـە شـێوەیەک فەرمانەکانیـان جێبەجـێ بکـەن لـە پێویسـت‌و سـوننەتدا، وە دوور بکەونەوە لە قەدەغەکراوەکانیـان، وە فەرمانـی کـردوە کـە گوێڕایەڵی کاربەدەسـتانتان بکـەن، ئەوانیش بریتیـن لە: دەسـەڵاتداران بەسـەر خەڵکـدا لـە فەرمانـڕەواکان‌و دادوەران‌و زانایـان، چونکە خەڵکـی کاری دنیـاو دوارۆژیـان ڕێـک نایـەت بـە گوێڕایەڵـی‌و ملکەچیکردنیـان نەبێت، گوێڕایەڵـی بێـت بـۆ خـوا، وە بـە ویسـتی خۆیشـی بێت، بـەڵام بـە مەرجێـک فەرمان بە

سـەرپێچی کردنـی خوا نـەکات، ئەگەر فەرمانیـان بەوە کرد، ئـەوە گوێڕایەڵی دروسـتکراو ناکرێـت لـە سـەرپێچی کردنـی دروسـتکەردا، وە لەوەیە ئەمە نهێنـی لابردنـی فیعلە کە بێ، کاتێـک خـوا فەرمانـی کـردووەو وشـەی (طاعة)ی داوەتـە پـاڵ خـۆی، بـە هەمان شـێوە داویەتیـە پـاڵ پێغەمبەریـش ﷺ، چونکـە پێغەمبـەر ﷺ فەرمان نـاکات تەنها بـە گوێڕایەڵی خـوا نەبێت، ئـەوەی گوێڕایەڵـی بکات ئـەوە گوێڕایەڵی خـوای کردوە، بەڵام دەسـەڵاتدار مەرجـی گوێڕایەڵیـان ئەوەیە بـۆ سـەرپێچی نەبێت.

پاشـان فەرمانـی کـردوە بـەوەی ئەگـەر دووبەرەکیتان تێکـەوت لـە بنەماکانی ئایـن، یان لقەکانـی ئـەوە بیگێڕنـەوە بۆ لای خـواو پێغەمبەرەکەی ﷺ، واتە: بۆ لای قورئانو سـوننەت، چونکـە ڕۆڵـی یەکلاکەرەوەیـان هەیـە لە سـەرجەم بابەتـە خیلافیەکانـدا، یان بە ئاشـکراو ڕوون، یـان بـە گشـتی، یـان بـە ئاماژە، یـان بە ئاگـادار کردنـەوە، یـان بە واتای گشـتی قیاسـی لەسـەر دەکرێت، چونکە بنەمای ئاین لەسـەر قورئانو سـوننەت وەسـتاوە، بڕوا بەرپا نابێـت بـەو دووانـە نەبـێ، گەڕانەوە بـۆ لایان مەرجە لـە ئیمانـدا، بۆیە خـوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ﴾ ئەمـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی هەر کەسـێک بابەتی جیـاوازی نەگەڕێنێتـەوە بۆ لای ئـەو دووانە، بـۆ یەکلاکردنەوە، ئـەوە بڕواداری ڕاسـتەقینە نیـە، ئـەوە بـڕوای بە تاغـووتو گومڕایـی هەیـە، وەک چۆن دەقەکـەی پاش ئەوە باسـی دەکات، ﴿ذَٰلِكَ﴾ واتـە: گەڕانـەوە بـۆ لای خـواو پێغەمبـەر ﴿خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا﴾ بـە ڕاسـتی فەرمانـی خـواو پێغەمبەرەکـەی ﷺ چاکتریـنو دادپەروەرتریـنو گونجاوترین فەرمانـە بۆ خەڵکـی لە کاری دنیـاو دوارۆژو سـەرەنجامیان.

أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ
وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓا۟ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ
وَقَدْ أُمِرُوٓا۟ أَن يَكْفُرُوا۟ بِهِۦ وَيُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمْ
ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴿٦٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ
ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ رَأَيْتَ ٱلْمُنَٰفِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ
صُدُودًا ﴿٦١﴾ فَكَيْفَ إِذَآ أَصَٰبَتْهُم مُّصِيبَةٌۢ بِمَا
قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ثُمَّ جَآءُوكَ يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنْ أَرَدْنَآ إِلَّآ
إِحْسَٰنًا وَتَوْفِيقًا ﴿٦٢﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَعْلَمُ ٱللَّهُ مَا
فِى قُلُوبِهِمْ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَعِظْهُمْ وَقُل لَّهُمْ فِىٓ
أَنفُسِهِمْ قَوْلًۢا بَلِيغًا ﴿٦٣﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا
لِيُطَاعَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ
جَآءُوكَ فَٱسْتَغْفَرُوا۟ ٱللَّهَ وَٱسْتَغْفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ
لَوَجَدُوا۟ ٱللَّهَ تَوَّابًا رَّحِيمًا ﴿٦٤﴾ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ
حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا۟ فِىٓ
أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾

(٦٠-٦٣): ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ
أَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن
قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓا۟ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ
وَقَدْ أُمِرُوٓا۟ أَن يَكْفُرُوا۟ بِهِۦ وَيُرِيدُ
ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴿٦٠﴾
وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ
وَإِلَى ٱلرَّسُولِ رَأَيْتَ ٱلْمُنَٰفِقِينَ يَصُدُّونَ
عَنكَ صُدُودًا ﴿٦١﴾ فَكَيْفَ إِذَآ
أَصَٰبَتْهُم مُّصِيبَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ
ثُمَّ جَآءُوكَ يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنْ أَرَدْنَآ إِلَّآ
إِحْسَٰنًا وَتَوْفِيقًا ﴿٦٢﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ
يَعْلَمُ ٱللَّهُ مَا فِى قُلُوبِهِمْ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ
وَعِظْهُمْ وَقُل لَّهُمْ فِىٓ أَنفُسِهِمْ قَوْلًۢا
بَلِيغًا ﴿٦٣﴾ ﴾:

خـوا ﷻ سەرسـوڕمانی خـۆی دەردەبـڕێ لـە حاڵەتـی دووڕووەکان ﴿ ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ﴾ کـە بڕوایـان هێناوە بەوەی کـە پێغەمبـەر ﷺ هێناویەتی، وە بەوەی کـە پێش ئەو هاتـوە، وە لەگـەڵ ئەمەشـدا ﴿ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓا۟ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ ﴾ هەر کەسـێک کار بە شـەریعەتو بەرنامـەی خوا نـەکات ئـەوە تاغووتە.

لـە کاتێکدا ئـەوان ﴿ وَقَدْ أُمِرُوٓا۟ أَن يَكْفُرُوا۟ بِهِۦ ﴾ ئـەم بڕوایە چـۆن کۆدەکرێتەوە؟ بڕوا هێنـان ملکەچـی دەگرێتـەوە بـۆ شـەرعی خـوا، وە فەرمانبـەرداری لـە هەمـوو کارەکاندا، هـەر کەسـێک خـۆی بە بـڕوادار بزانێـتو فەرمان بـە بەرنامـەی غەیری خوا بـکات، ئەوە درۆی کـردوە لـە ئیمانەکەیـدا، ئەمـەش لـە گومڕاکەرانی شـەیتانە، لەبەر ئەمـە دەفەرموێ: ﴿ وَيُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴾ (ئەوە شـەیتان دەیـەوێ گومڕایی بکاتو زۆر دووری بخاتـەوە) لـە هەق.

﴿ فَكَيْفَ ﴾ ئایـا حاڵـی ئـەو گومڕایانـە چـۆن بـێ ﴿ إِذَآ أَصَٰبَتْهُم مُّصِيبَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ﴾ لـە سـەرپێچی، لەوانـە فەرمانکـردن بـە جگـە لـە بەرنامـەی خـوا؟!

﴿ ثُمَّ جَآءُوكَ ﴾ بیانـوو بێنـنـەوە، لـەو ڕەفتـارەی کـە کردوویانەو بڵێـن: ﴿ إِنْ أَرَدْنَآ إِلَّآ

إِحۡسَٰنٗا وَتَوۡفِيقًا ﴾ واتــە: مەبەســتمان هیــچ نەبــوو تەنهــا چاکــە نەبێت، جگە لــە چاکەو یەکخســتنەوە نەبــێ یەکخســتنەوە نەبێ لــە نێوانیاندا هیچمان مەبەســت نەبوو کــە لەمەدا درۆ دەکــەن، بێگومــان هەمــوو چاکەیــەک لــە فەرمانی خــواو پێغەمبەر ﷺدایــە، ﴿ وَمَنۡ أَحۡسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكۡمٗا لِّقَوۡمٖ يُوقِنُونَ ٥٠ ﴾المائـدة. وە لەبــەر ئەمــە دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَعۡلَمُ ٱللَّهُ مَا فِي قُلُوبِهِمۡ ﴾ واتــە: لــە دووڕوویو مەبەســتی خــراپ ﴿ فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ ﴾ واتــە: ڕوویــان لــێ وەرگێــڕە گــوێ مــەدە ئەوانــەی کــە کردوویانــە ﴿ وَعِظۡهُمۡ ﴾ واتە: فەرمانــی خوایــان بــۆ ڕوون بکــەوە، لەگەڵ هاندانیــان بۆ ملکەچ بــوون بۆ خواو ترســاندیان لــە ســەرپێچی خــوا ﴿ وَقُل لَّهُمۡ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ قَوۡلَۢا بَلِيغٗا ﴾ واتە: ئامۆژگاریــان بکە بە نهێنی، چونکە ئەوە زووتر مەبەســت دەپێکێت، وە ڕەوانو کاریگەرترە لە دوورخســتنەوەیان لــەو کــردارەی پێشــتر لەســەری بــوون، ئەمــەش بەڵگەیە لەســەر ئــەوەی ئەو کەســەی کە ســەرپێچیو تــاوان دەکات، لەگەڵ ئــەوەدا لێی دوور دەکەوێتــەوە، بێگومان بــە نهێنی دەبێ ئامۆژگــاری بکــرێ، ئامۆژگاریەکــی برایانە کــە گومانی ئــەوەی لێ بکرێــت دەرەنجامێکی هە بێ.

(٦٤-٦٥): ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ إِذ ظَّلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ جَآءُوكَ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ ٱللَّهَ وَٱسۡتَغۡفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ لَوَجَدُواْ ٱللَّهَ تَوَّابٗا رَّحِيمٗا ٦٤ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيۡنَهُمۡ ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَرَجٗا مِّمَّا قَضَيۡتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسۡلِيمٗا ٦٥ ﴾:

خــوا ﷻ هەواڵێــک دەدات لــە چــوار چێوەیــدا فەرمانکــردنو جەختکردنەوەیــە لەســەر گوێڕایەڵــیو ملکەچــی کردنــی فەرمانەکانــی پێغەمبــەر ﷺ، چونکــە مەبەســت لــە ناردنــی پێغەمبەرانــدا بــۆ گوێڕایەڵــیو ملکەچی فەرمانەکانیانــە لە هەموو فەرمــانو قەدەغەکراوێکدا، وە دەبێــت فەرمانــەکان بــە گــەورە تەماشــا بکــەن. بەڕاســتی ئەمــە پاکــیو پارێــزراوی پێغەمبــەران دەگرێتــەوە، لــەو پەیامــەی کــە ڕایدەگەیەنــن لــە لایــەن خــوای گــەورەوە بۆ خەڵکــی، چونکــە خــوا بــە ڕەهایی فەرمانــی کردوە بــە گوێڕایەڵــی کردنیان، ئەگــەر ئەوان پارێــزراو بــن شــەریعەت بــە هەڵــە بــۆ خەڵــک ڕوون ناکەنەوە.

وە کــە دەفەرمــوێ: ﴿ بِإِذۡنِ ٱللَّهِ ﴾ واتــە: گوێڕایەڵــی کــردن لــە لایــەن گوێڕایەڵــی کــراوەوە تەنهــا بــە قــەزاو قــەدەری خــوا دەبــێ، ئەمــەش بەڵگەیە لەســەر قەزاو قــەدەر، وە هاندانە لەســەر پشــت بەســتن بــە خــوا، وە ئاشــکرای دەکات ئەگــەر خوا یارمەتــی مرۆڤ

نـەدات ئـەوە ناتوانێـت گوێڕایەڵـی پێغەمبـەر بکات.
پاشـان بـاس لـە شـکۆو ڕێـزو گەورەیـی خـۆی دەکات، وە بانگکردنی ئەو کەسـانەی کە تاوانیـان ئەنجامـداوە، کە دان بـە تاوانەکەیانـدا بنێن‌و داوای لێخۆشـبوون بکـەن‌و بپاڕێنەوە لـە خوا، وەک دەفەرمـوێ: ﴿وَلَوۡ أَنَّهُمۡ إِذ ظَّلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ جَآءُوكَ﴾ واتـە: دانیان بە تاوانەکانیانـدا بنایـەو وازیان لـێ بهێنایە.
﴿فَٱسۡتَغۡفَرُواْ ٱللَّهَ وَٱسۡتَغۡفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ لَوَجَدُواْ ٱللَّهَ تَوَّابٗا رَّحِيمٗا﴾ واتـە: ئـەوە خـوا پەشـێمانی وەردەگـرێ‌و بـە بەزەییـە، وە ڕەحمـی پێ دەکـردن بە وەرگرتنـی تەوبەو سـەرکەوتووی دەکـردن‌و پاداشـتی دەدانـەوە لەسـەری، ئـەم هاتنـە بـۆ لای پێغەمبـەر ﷺ تایبەتـە بـەو کاتەی کـە زیندوو بـوو، چونکە سـیاقی ئایەتەکـە وا دەخوازێـت، لێبوردن لە لایـەن پێغەمبـەری خـواوە نابێـت تەنها مەگـەر لە ژیانـدا بێت، بـەڵام پاش مردنـی، داوای هیچـی لێناکرێـت بەڵکـو داواکردن دەبێتـە شـیرک‌و هاوەڵدانان.
پاشـان خـوا سـوێند دەخـوات کـە ئـەو کەسـانە بـڕوادار نین هەتـا تـۆ نەکەنـە دادوەر لە هـەر ئـاژاوەو دووبەرەکیەکـدا کە دەکەوێتـە نێوانیانەوە، واتـە: لە هەمـوو دوو بەرەکیەک، بـە پێچەوانـەی مەسـەلەکانی یـەک دەنگـی، چونکـە ئەوە پشـت دەبەسـتێت بـە قورئان‌و سـوننەت، تەنهـا ئـەم دادوەریـە بەس نیـە بەڵکو دەبێت هەسـت نەکـەن کە لـە دەروونیاندا بێزاریـەک بـەدی بکرێـت، لـەو دادوەریـەی کە کـراوە لـە نێوانیاندا.
دادپـەروەری لـە پلـەو پایـەی ئیسـلام، وە هیـچ بێـزار نەبێت لـە پلەو پایـەی ئیمانـدا، وە خۆدانـە دەسـت ئەو پلـەو پایەی چاکـە، هەر کەسـێک ئەم پلـەو پایانەی بە تـەواوی بڕی، ئـەوە پلەکانـی ئاینی بـە تەواوەتی بڕیوە، هـەر کەس واز لـەم دادوەریە بهێنێت بە گشـتی‌و پابەنـد نەبێـت پێیـەوە، ئـەوە کافـرە، وە هـەر کـەس وازی لـێ بێنێـت لەگەڵ ئـەوەی کە پابەنـدە، ئـەوە حوکمی هاوشـێوەی سـەرپێچیکارانی هەیە.

وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنِ اقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ أَوِ اخْرُجُوا مِن
دِيَارِكُم مَّا فَعَلُوهُ إِلَّا قَلِيلٌ مِّنْهُمْ وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُوا مَا يُوعَظُونَ
بِهِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا ﴿٦٦﴾ وَإِذًا لَّآتَيْنَاهُم
مِّن لَّدُنَّا أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٦٧﴾ وَلَهَدَيْنَاهُمْ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا
﴿٦٨﴾ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَٰئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ
عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ
وَحَسُنَ أُولَٰئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾ ذَٰلِكَ الْفَضْلُ مِنَ اللَّهِ وَكَفَىٰ
بِاللَّهِ عَلِيمًا ﴿٧٠﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا خُذُوا حِذْرَكُمْ
فَانفِرُوا ثُبَاتٍ أَوِ انفِرُوا جَمِيعًا ﴿٧١﴾ وَإِنَّ مِنكُمْ لَمَن لَّيُبَطِّئَنَّ
فَإِنْ أَصَابَتْكُم مُّصِيبَةٌ قَالَ قَدْ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيَّ إِذْ لَمْ أَكُن
مَّعَهُمْ شَهِيدًا ﴿٧٢﴾ وَلَئِنْ أَصَابَكُمْ فَضْلٌ مِّنَ اللَّهِ لَيَقُولَنَّ كَأَن
لَّمْ تَكُن بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُ مَوَدَّةٌ يَا لَيْتَنِي كُنتُ مَعَهُمْ
فَأَفُوزَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧٣﴾ ۞ فَلْيُقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ الَّذِينَ
يَشْرُونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا بِالْآخِرَةِ وَمَن يُقَاتِلْ فِي سَبِيلِ
اللَّهِ فَيُقْتَلْ أَوْ يَغْلِبْ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٧٤﴾

(٦٦-٦٨): ﴿ وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنِ اقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ أَوِ اخْرُجُوا مِن دِيَارِكُم مَّا فَعَلُوهُ إِلَّا قَلِيلٌ مِّنْهُمْ وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُوا مَا يُوعَظُونَ بِهِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا ﴿٦٦﴾ وَإِذًا لَّآتَيْنَاهُم مِّن لَّدُنَّا أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٦٧﴾ وَلَهَدَيْنَاهُمْ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿٦٨﴾ ﴾:

خوا ﷻ رایدەگەیەنێت ئەگەر فەرمانی بکردایە لەسەر بەندەکانی بە ئەنجامدانی ئەو کارانەی کە قورسن لەسەر دەروونیان، لە کوشتنی نەفسەکانو دەرچوون لە نیشتیمانیان، ئەوەیان نەدەکرد مەگەر کەمێکیان نەبێ، دەی با سوپاسگوزاری خوا بکەنو ستایشی بکەن، لەسەر ئەوەی کە کار ئاسانی بۆ کردوون لە فەرمانەکانداو ئەنجامدانیان قورسو گران نیە. وە لەمەدا ئاماژەیەک هەیە کە پێویستە بەندە تێبینی ئەوە بکات، پێچەوانەی شتە خراپەکان بجولێتەوە، هەتا عیبادەت کردنی لەسەر سووکو ئاسان بێتو زیاتر بتوانێت ستایشی پەروەردگاری بکات.

پاشان هەواڵ دەدات دەربارەی ئەوە کە ئەگەر ئەوان بە پێی ئامۆژگاری ئێمە رەفتاریان بکردایە، واتە: ئەوەی دراوە بەسەریاندا لە هەموو کاتێکدا بە گوێرەی خۆی کاریان پێ بکردایە، هیممەتی خۆیان بخستایەتە گەر، وە نەفسو دەروونیان بۆ ئەو مەبەستە ئامادە بکردایە، ئەوە نەفسو دەروونیان نەیدەروانیە شتێک کە پێی نەگات، ئەمە ئەوەیە کە پێویستی دەکات لەسەر بەندە تەماشای ئەو حاڵەتە بکات کە پێویستە لەو کاتەدا پێی هەستێت، پاشان قۆناغ بە قۆناغ هەتا دەگات بەوەی کە بۆی دیاری کراوە لە زانستو کردار لە کاری دنیاو دوا رۆژ. ئەمە بە پێچەوانەی کەسێک کە حەزی لە شتێک بێتو پێی نەگات، وە فەرمانیشی پێ نەکات، ئەوە بێگومان ناگات بەو مەبەستە، بە هۆی بڵاوە پێکردنی ورەی، وە تەنبەڵی کردنو نەبوونی چالاکی، پاشان باسی ئەوە دەکات ئەگەر ئامۆژگاریەکانیان وەر بگرتایە چوار شتیان دەست دەکەوت:

یەکـەم: خێریان دەسـت دەکـەوت، وەک لە دەقەکـەدا هاتـوە: ﴿ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ ﴾ واتە: دەبـوون بـەو کەسـانەی کە وەسـف کـراون، لـەو کارە چاکانەی کـە فەرمانیـان پێکراوە، واتـە: سـیفەتی خراپەکارانیـان لـێ نەرێنـی دەکرا، چونکـە جێگیـر بوونی شـتێک نەرێنی دژەکـەی دەردەخات.

دووەم: دامـەزراوو چەسـپیوو دەبـوون، بـە ڕاسـتی خوا ﷻ بـڕواداران چەسـپاو دەکات بە هۆی ئـەو ئیمانـەی کـە هەیانـە، کـە بریتیـە لـە هەسـتان بـە جێبەجـێ کردنـی ئـەو ئامۆژگاریانە، ئەوجـا لـە دنیـادا جێگیریـان دەکات لـە کاتـی هاتنـی فیتنـەدا لـە فەرمـان پـێ کـراوەکانو قەدەغـە لێکـراوەکانو بـەڵاو نارەحەتیـەکان، ئنجـا پاداشـتی لـە جیاتـی وەردەگـرن، وە خوا سـەرکەوتوویان دەکات بـۆ کاری خێـرو چاکـەو وازهێنـان لەوەی کـە خـراپو بوغزێنراوە، کـە دەروون حـەز لـە ئەنجامدانـی دەکات، وە لە کاتی بەڵاو موسـیبەتدا، کە مـرۆڤ حەزی پێ نـاکات، خـوا سـەرکەوتووی دەکات بە جێگیـر بوون بە ئارامـیو ڕەزامەندیو سـتایش کردن. لـە لایەن خـواوە یارمەتـی دادەبەزێت بۆ هەسـتان بـەو کارە، وە پابەند بوون لە ئایندا بەدەسـت دەهێنێـت لـە کاتـی مردنـداو لـە نـاو گـۆڕدا. وە هەروەهـا بـڕواداری پابەنـد بـەو فەرمانانەی کـە پێی کـراوە، بـەردەوام ڕاهێنان دەکات لەسـەر کارە شـەرعیەکان، هەتا لەگەڵیـدا ڕا دێتو حـەزی لـێ دەکات، هەتا ئـەوە دەبێتە پشـتیوانیەک لەسـەر پابەندبوونـی بـە عیبادەتەکانەوە.

سـێیەم: کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذًا لَّآتَيْنَاهُم مِّن لَّدُنَّا أَجْرًا عَظِيمًا ﴾ واتە: پاداشـتێک لە ئێسـتاو داهاتـوودا، کـە بـۆ ڕووحو دڵو جەسـتەیە، وە ژیانـی نەبڕاوە، لـەوەی کە چـاو نەیبینیوەو گـوێ نەیبیسـتووەو بـە ختـورەش بە دڵی هیـچ کەسـێکدا نەهاتوە.

چـوارەم: ڕێنمایـی بـۆ ڕێگـای ڕاسـت، وە ئـەم ڕێنماییە گشـتیە پـاش ئەوەی کـە تایبەت کـراوە، ئەمـەش لەبـەر ڕێزی ڕێنمایـی بۆ لای ڕێگای ڕاسـت، لـەو چوار چێوەیدا زانسـتی ڕاسـتەقینە دەگرێتە خۆ، وە خۆشویسـتنی پەسـند کردنـیو کار پێکردنـی، وە خۆش بەختی سـەرکەوتنیش لەسـەر ئـەوە وەسـتاوە، هەر کەسـێک خوا هیدایەتـی بدات بـۆ لای ڕێگای ڕاسـت ئـەوە سـەرکەوتوو بـووە بـۆ هەمـوو خێرێـکو هەمـوو خراپەیەکـی لـێ دوور خراوەتەوە.

(٦٩-٧٠): ﴿ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَٰئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُولَٰئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾ ذَٰلِكَ الْفَضْلُ مِنَ اللَّهِ ۚ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ عَلِيمًا ﴿٧٠﴾ ﴾:

واتــە: هــەر کەســێک گوێڕایەڵــی خــواو پێغەمبــەر ﷺ بــکات، بە پێــی تواناو بــە ئەندازەی ئــەوەی کــە پێویسـتە لەســەری، لــە نێرو مــێو لە گــەورەو بچــوک ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم ﴾ واتــە: ئــەو نیعمەتــە گــەورەی کــە خۆشــبەختی ســەرکەوتن بــە دوای خۆیــدا دەهێنێــت ﴿ مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ﴾ ئــەو پێغەمبەرانــەی خــوا بەرێــزی کــردوون بــە هۆی وەحــی خۆیــەوە، وە هەڵبــژاردوون بــە ناردنیــان بۆ ناو خەڵــکو بانگەوازیان بــۆ لای دینی خــوا ﷻ، ﴿ وَٱلصِّدِّيقِينَ ﴾ ئەوانــەن کە بــە هۆی بەڕاســت زانینــی پەیامــی پێغەمبەرانەوە ئــەو ناوەیــان لــێ نــراوە، لــە پاشــان هەقیــان ناســیوە، وە بەوپەڕیــی دڵنیاییــەوە بەڕاســتیان زانیــون، وە لــە خۆیانــدا بەرپایــان کردوە بــە گوفتارو کــردارو بانگەواز کــردن بۆ لای خوا ﴿ وَٱلشُّهَدَآءِ ﴾ ئەوانــەی کــە لــە پێنــاوی خــواداو بۆ بــەرز ڕاگرتنی وشــەی (الله) شــەهید کــراون ﴿ وَٱلصَّٰلِحِينَ ﴾ ئەوانــەی دەرەوەو ناوەوەیــان چــاک بــووە، ئنجــا بــە کــردەوە ســەلماندوویانە، هەر کەســێک گوێڕایەڵی خوا بکات ئەوە لەگەڵ پێغەمبەرانو ڕاســتگۆیانو شــەهیدانو پیــاو چاکاندایــە ﴿ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقٗا ﴾ بــە کۆبوونەوە لەگەڵیانــدا لە بە هەشــتەکانی پــڕ لــە نــازو نیعمــەت، وە حەســانەوە لــە نزیکیانو لــە نزیکــی پەروەردگاری جیهانیــان ﴿ ذَٰلِكَ ٱلۡفَضۡلُ مِنَ ٱللَّهِ ﴾ کــە بە دەســتیان هێنــاوە ﴿ مِنَ ٱللَّهِ ﴾ تەنها خــوا ســەرکەوتووی کــردوون لەســەر ئــەو ڕێبــازەو پشــتیوانی لــێ کــردوون، وە ئەوەندە پاداشــتی پــێ بەخشــیون کــە کردارەکانیــان لەو ئاســتەدا نیە.

﴿ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ عَلِيمٗا ﴾ لــە حاڵــی بەندەکانــی دەزانێــت، وە دەزانێــت کام لــە بەندەکانــی شــایانی ئــەو پاداشــتە گەورەیەیــە، کــە بە دڵو بە جەســتە بــەو کــردەوە چاکانە هەســتاوە.

(٧١-٧٤): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ خُذُواْ حِذۡرَكُمۡ فَٱنفِرُواْ ثُبَاتٍ أَوِ ٱنفِرُواْ جَمِيعٗا ﴿٧١﴾ وَإِنَّ
مِنكُمۡ لَمَن لَّيُبَطِّئَنَّ فَإِنۡ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَالَ قَدۡ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيَّ إِذۡ لَمۡ أَكُن مَّعَهُمۡ شَهِيدٗا ﴿٧٢﴾ وَلَئِنۡ
أَصَٰبَكُمۡ فَضۡلٞ مِّنَ ٱللَّهِ لَيَقُولَنَّ كَأَن لَّمۡ تَكُنۢ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُۥ مَوَدَّةٞ يَٰلَيۡتَنِي كُنتُ مَعَهُمۡ فَأَفُوزَ
فَوۡزًا عَظِيمٗا ﴿٧٣﴾ فَلۡيُقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يَشۡرُونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا بِٱلۡأٓخِرَةِۚ
وَمَن يُقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيُقۡتَلۡ أَوۡ يَغۡلِبۡ فَسَوۡفَ نُؤۡتِيهِ أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴿٧٤﴾ ﴾:

خــوا ﷻ فەرمــان دەکات بــە بەنــدە بڕوادارەکانــی کــە ئاگــاداری خۆیــان بــن لــە دوژمنە بێبڕواکانیــان، ئەمــە هەمــوو وەرگرتنــی هۆکارێــک دەگرێتەوە کە پشــتی پێ دەبەســترێت لــە جەنگــدا لــە بەرانبەر بە دوژمــنو بەرگری لــە فێڵو تەڵەکەیــان، لە دروســتکردنی قەڵاو ســەربازگەو خەنــدەقو فێربوونــی جەنگ کــردن، وە فێر بوونی پیشەســازی کە ســوود بەو

مەبەستە دەگەیەنێت، وە هەر شتێک ببێتە هۆی ئەوە مسولْمانان پێش بخاتو دوژمن بوەستێنێت، وە لەبەر ئەمەیە دەفەرموێ: ﴿فَٱنفِرُواْ ثُبَاتٍ﴾
واتە: بە جیاجیا تاقم تاقم، با کۆمەڵێکتان هێرش بیات، کۆمەڵێکیشتان جێگیربن ﴿أَوِ ٱنفِرُواْ جَمِيعًا﴾ هەموو بە پێی قازانجی بروادارانە بۆ ئارامی مسولْمانانە، وە ئەم دەقەش هاوتای وشەی خوای گەورەیە ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ ﴿٦٠﴾﴾ الأنفال.
پاشان هەواڵیداوە دەربارەی ئیمان لاوازو تەوەزەلەکان کە لە جیهاد خۆیان دوا دەخەن، دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ مِنكُمْ﴾ واتە: ئەی بڕواداران ﴿لَمَن لَّيُبَطِّئَنَّ﴾ واتە: خۆی دوا دەخات لە جیهاد کردن لە پێناو خوادا لەبەر لاوازیو بێ هێزیو ترسنۆکی، ئەمیش لەشی ساغە، وە وتراوە مانای: بێجگە لە خۆی پەشێمان دەکاتەوە لە کوشتار، ئەوانەش بریتین لە دووڕووەکان، بەڵام لە پێشترە، لەبەر دوو هۆکار:
یەکەمینیان: کە دەفەرموێ: ﴿مِنكُمْ﴾ قسە لەگەڵ بڕواداراندا دەکات.
دووەم: لە کۆتای ئایەتەکەدا دەفەرموێ: ﴿كَأَن لَّمْ تَكُنۢ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُۥ مَوَدَّةٌ﴾ بە ڕاستی بێبڕواکان لە بت پەرستانو دووڕووەکان، خوا ﷻ لە نێوانی ئەوانو بڕواداراندا سۆزو خۆشەویستی نەهێشتووە، ئەمە ڕاستیەو گومانی تێدا نیە، بێگومان بڕواداران دوو بەشن: (یەکەم) ڕاستگۆن لە ئیمانەکەیاندا، لە پێناوی خوادا جیهاد دەکەن، (دووەم) ئیمانیان لاوازە، هاتوونەتە نێو ئیسلامەوە، ئیمانیان ئەوەندە بەهێز نیە بتوانن جیهاد بکەن، وەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّا ۖ قُل لَّمْ تُؤْمِنُواْ وَلَٰكِن قُولُوٓاْ أَسْلَمْنَا ﴿١٤﴾﴾ الحجرات. پاشان باسی مەبەستی ئەوانە دەکات کە خۆیان لە جیهاد دوا دەخست، دیارە هەموو مەبستەکانیان دنیایی بوو، وەک دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ أَصَٰبَتْكُم مُّصِيبَةٌ﴾ واتە: ئەگەر تێکشکانو کوژراوتانداو لە هەندێ حاڵەتدا دوژمن سەرکەوت بەسەرتاندا، کە لەوەدا حیکمەتی خوای تێدایە.
﴿قَالَ﴾ ئەو کەسەی کە لە جیهاد دواکەوتووە ﴿قَدْ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَىَّ إِذْ لَمْ أَكُن مَّعَهُمْ شَهِيدًا﴾ بە عەقڵو ئیمانە لاوازەکەی خۆی وا بیر دەکاتەوە کە دانیشتنو نە چوون بۆ جیهاد کە ئەو هەموو بەڵاو نارەحەتیەی تێدایە نیعمەتە، بەڵام نازانێت نیعمەتی حەقیقیو ڕاستەقینە ئەوەیە کە خوا یارمەتیت بدات بۆ ئەو عیبادەتە گەورەیە کە بڕوای پێ زیاد دەبێت، وە مرۆڤ دەپارێزێت لە سزاو دۆڕاندن، وە پاداشتی گەورەی پێ بە دەست دێنێت لەگەڵ ڕەزامەندی خوا ﷻ، بەڵام دانیشتنو نەچوون بۆ جیهاد،

ئەگـەر چـی کەمێـک پشـوو دەدات، بەڵام لـە دوایـدا ماندووبوونێکـی زۆر دەکێشـێتو ئـازاری گەورەشـی تـووش دەبێـت، وە لـە دەسـتی دەچێـت ئـەوەی کـە موجاهیـدان بـە دەسـتیان هێناوە.

پاشـان دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَئِنْ أَصَـٰبَكُمْ فَضْلٌ مِّنَ ٱللَّهِ ﴾ واتـە: سـەرکەوتنو دەسـتکەوت ﴿ لَيَقُولَنَّ كَأَن لَّمْ تَكُنۢ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُۥ مَوَدَّةٌ يَـٰلَيْتَنِى كُنتُ مَعَهُمْ فَأَفُوزَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴾ واتـە: ئاواتـی ئـەوە دەخوازێـت لـە دەسـتکەوتەکاندا لەگەڵیاندا بـەژدار بێت، هیـچ حەزوو مەبەسـتێکی نیـە لـەوەدا، وەک ئـەوە وایـە لە ئەوان نەبـێ، ئـەی کۆمەڵی بـڕواداران! وەک ئـەوە وایـە لە نێوان ئێوەو ئەودا سـۆزو خۆشەویسـتی ئیمانـی نەبێ، کە وا پێویسـت دەکات بـڕواداران بەشـدار بن لە هەمـوو بەرژەوەندیەکانیاندا، وە دوورخسـتەوەی زیان، دڵخۆشـن بە بەدەسـتهێنانی سـەرکەوتنو دەسـتکەوتەکان ئەگەرچی ئەو سـەرکەوتنانە خۆیان بەدەستیان نەهێنابـێ، سـەرجەم بـڕواداران هـەوڵو کۆشـش دەکـەن بۆ بەرژەوەنـدی دینـیو دنیایان، بـەڵام ئەمـە تەنهـا ئاوات بـۆ دنیـای دەخوازێو بـەس، ئـەو ڕووحـە ئیمانیەی کە باسـکرا تێـدا نیە.

وە لـە سـۆزی خوا ﷻ بەرانبەر بـە بەندەکانی ئەوەیە کە ڕەحمەتی خـۆی لێیان ناگرێتەوە، وە دەرگایـان بەسـەردا داناخات، بەڵکو هەر کەسـێک کارێکـی نارێک ئەنجام بـدات، فەرمانی پێـدەکات ناتەواویەکـەی پڕ بکاتـەوەو دەروونی کامڵ بـکات، لەبەر ئەمـە فەرمانی کردوە بـە ئەوانـە بە دڵسـۆزیو دەرچـوون لـە پێناوی خـوادا، دەفەرمـوێ: ﴿ فَلْيُقَـٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يَشْرُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا بِٱلْـَٔاخِرَةِ ﴾ ئەمـە بۆچوونێکـە لـە بۆچوونـەکان دەربـارەی ئـەم ئایەتە، وە بێگومـان ئەم بۆچوونە ڕاسـترینیانە.

وە وتـراوە: مانـای ئەوەیـە، با لە پێناوی خوادا کوشـتار بکـەن، ئەو بڕوادارانەنـە کە ئیمانیان پتـەوەو ڕاسـتگۆن لـە ئیمانەکەیانـدا ﴿ ٱلَّذِينَ يَشْرُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا بِٱلْـَٔاخِرَةِ ﴾ واتـە: دنیایان دەفرۆشـن، لەبـەر دواڕۆژ کە حەزیـان لێیەتی.

بـە ڕاسـتی دەقەکە قسـە لەگـەڵ ئەوانـەدا دەکات، چونکـە دەروونیـان ئامـادەو جێگیرە بۆ جیهـادی دوژمنـان، بـە بڕوای پتـەوو تـەواوەوە ئامادەنـە بۆ ئەو مەبەسـتە.

بـەڵام ئەوانـەی تەنبەڵـیو تەوەزەلیان کرد لـە جیهاد کردن، بـە لایانەوە قـورسو گران نیە ئەگـەر دەربچن یان دابنیشـن، ئەمەش هاوشـێوەی ئەو ئایەتەیـە: ﴿ قُلْ ءَامِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوْ لَا تُؤْمِنُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ مِن قَبْلِهِۦٓ إِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ سُجَّدًا ﴿١٠٧﴾ ﴾ الإسراء.

وە (لە شـوێنی دی) دەفەرمـوێ: ﴿ فَإِن يَكْفُرْ بِهَا هَٰٓؤُلَآءِ فَقَدْ وَكَّلْنَا بِهَا قَوْمًا لَّيْسُوا۟ بِهَا بِكَٰفِرِينَ ﴿٨٩﴾ ﴾الأنعام. وە وتـراوە: مانـای ئایەتەکـە ئەوەیـە: بـا بجەنگـن لـە پێناوی خـوادا دژ بە بێبـڕواکان، ئەوانـەی کـە دونیـا دەفرۆشـن بـە دواڕۆژ، لـەم ڕووەوە بەم شـێوەی لـێ دێت ﴿ ٱلَّذِينَ ﴾ دەکەوێتـە مەحەللـی نەصبـەوەو دەبێت بـە مەفعول.

﴿ وَمَن يُقَٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾ بجەنگێـت لـە ڕێـی خوادا بـە فەرمانی خـواو پێغەمبەرﷺ، وە کەسـەکە دڵسـۆز بێـت بـۆ خـوا، مەبەسـتی تەنهـا خوابـێ ﴿ فَيُقْتَلْ أَوْ يَغْلِبْ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴾ بـڕوای پتـەو دەکەیـن لەگەڵ دەسـکەوتو وەسـفی چاک، وە پاداشـتی موجاهیـدەکان کە لە پێنـاوی خوادا جیهاد دەکەن، خوا ﷻ پێیان دەبەخشـێت لە بەهەشـت، کـە چـاو نەیبینیبـێ‌و گـوێ نەیبیسـتبێ‌و بە ختووره بـە دڵی هیـچ کەسـێکدا نەهاتبێ.


وَمَا لَكُمْ لَا تُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلظَّالِمِ أَهْلُهَا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا ﴿٧٥﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱلطَّٰغُوتِ فَقَٰتِلُوٓا۟ أَوْلِيَآءَ ٱلشَّيْطَٰنِ ۖ إِنَّ كَيْدَ ٱلشَّيْطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا ﴿٧٦﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّوٓا۟ أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقِتَالُ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَخْشَوْنَ ٱلنَّاسَ كَخَشْيَةِ ٱللَّهِ أَوْ أَشَدَّ خَشْيَةً ۚ وَقَالُوا۟ رَبَّنَا لِمَ كَتَبْتَ عَلَيْنَا ٱلْقِتَالَ لَوْلَآ أَخَّرْتَنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ ۗ قُلْ مَتَٰعُ ٱلدُّنْيَا قَلِيلٌ وَٱلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ لِّمَنِ ٱتَّقَىٰ وَلَا تُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٧٧﴾ أَيْنَمَا تَكُونُوا۟ يُدْرِككُّمُ ٱلْمَوْتُ وَلَوْ كُنتُمْ فِي بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ ۗ وَإِن تُصِبْهُمْ حَسَنَةٌ يَقُولُوا۟ هَٰذِهِۦ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَقُولُوا۟ هَٰذِهِۦ مِنْ عِندِكَ ۚ قُلْ كُلٌّ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ فَمَالِ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلْقَوْمِ لَا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثًا ﴿٧٨﴾ مَّآ أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ ۖ وَمَآ أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٍ فَمِن نَّفْسِكَ ۚ وَأَرْسَلْنَٰكَ لِلنَّاسِ رَسُولًا ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿٧٩﴾

(٧٥): ﴿ وَمَا لَكُمْ لَا تُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلظَّالِمِ أَهْلُهَا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا ﴿٧٥﴾ ﴾:

ئەمە هاندانێکە لە لایەن خواوە بۆ بەندە بڕوادارەکانی، وە هەڵنانو گەرم کردنیانە لەسەر جەنگ لە پێناوی خوادا، وە بە ڕاستی ئەوە بۆیان دیاری کرا، وە سەرزەنشتێکی گەورە ڕووبەڕوویان دەبێتەوە ئەگەر وازی لێ بێنن، دەفەرموێ: ﴿ وَمَا لَكُمْ لَا تُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾ لەگەڵ ئەوەشدا کە لاوازو چەوساوەکان لە پیاوانو ئافرەتانو ئەوانەی کە توانایان نیە لەبەر بێ هێزیو پیریانو بە هیچ جۆرێک ڕێ دەرناکەن، لەگەڵ ئەمەشدا بەڕاستی گەورەترین ستەمیان چەشت بەدەستی دوژمنەکانیان، ئەوان نزایان دەکرد کە خوا ڕزگاریان بکات لەم شارە کە خەڵکەکەی ستەمکاری نەفسی خۆیانن، بە بێبڕواییو هاوبەش دانان بۆ خوا، وە ئازاردانی بڕواداارانو ڕێگری لە بڵاوبوونەوەی دینی خوا، وە ڕێگری لە بانگەوازو کۆچکردن لە پێناوی خوادا.

وە داوایان دەکرد لە خوا کە سەرخەرێکو یارمەتی دەرێکیان بۆ بنێرێت، ڕزگاریان بکات لەو شارەی کە خەڵکەکەی ستەمکارن، ئەوجا جیهاد کردنتان لەم ڕووەوە لە بەشی کوشتارو دوور خستنەوەی خراپەکاران لەماڵو منداڵتان، لە بەشی ئەو جیهادە نیە کە بریتیە لە تەماحکردنی بێبڕواکانو لەناو بردنیان، بەڕاستی ئەگەر چی پاداشتێکی گەورەی هەیەو ئەوەی دوا بکەوێت لۆمە دەکرێت، جیهاد کردنێک بۆ ڕزگار کردنی لاوازەکانتان بێت پاداشتی زۆرترو گەورەترەو سوودی زیاترە، چونکە لە بەشی دوورخستنەوەی دوژمنانە.

(٧٦): ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱلطَّٰغُوتِ فَقَٰتِلُوٓاْ أَوۡلِيَآءَ ٱلشَّيۡطَٰنِۖ إِنَّ كَيۡدَ ٱلشَّيۡطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا ﴿٧٦﴾ ﴾

خـوا ﷻ رایدەگەیەنێـت کە بڕواداران کوشـتار دەکەن لە ڕێگـای ئەودا ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱلطَّٰغُوتِ ﴾ کـە بریتیـە لە شـەیتان. وە لەو چـوار چێوەدا چەند یاسـایەک هەیە:

لەوانـە: بـە جیهـاد کردن بە پێـی بـڕوای بەندەو دڵسـۆزیو شـوێنکەوتنێتی، جیهـاد کردن لـە پێنـاو خوادا لە شـوێنەوارە پێویسـتیەکانی ئیمانـە، وەک چۆن کوشـتار لە پێنـاو نارەواو بەرنامـەی غەیری خوا بەشـێکە لـە کوفرو پێویسـتیەکانی.

لەوانـە: ئـەوەی جیهـاد دەکات لە پێناوی خـوادا پێویسـتە جۆرێک لە ئارامگرتـنو بەهێزی تێـدا بێـت کە لە کەسـانی تـردا نەبێت، ئەگەر دۆسـتانی شـەیتان ئـارام دەگرنو کوشـتار دەکـەن، لـە کاتێکـدا لەسـەر پووچـن، شـوێنکەوتوانی هەق لـە پێشـترن بۆ ئەو مەبەسـتە، وەک چـۆن خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ إِن تَكُونُواْ تَأۡلَمُونَ فَإِنَّهُمۡ يَأۡلَمُونَ كَمَا تَأۡلَمُونَۖ وَتَرۡجُونَ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا يَرۡجُونَۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١٠٤﴾ ﴾النسـاء.

لەوانـە: ئـەوەی لـە پێناو خـوا دەجەنگێت پشـت بـە پەنایەکی بەهێـز دەبەسـتێ، کە خوای گەورەیـە، هـەر ئـەوەش ڕاسـتە، دەی خاوەنی هێـزو پەنای قایـم، داوای ئـەوەی لێدەکرێت ئارامگـریو جێگـری لـە خۆیدا بەرپا بـکات، کە ئەو مەرجە پێویسـت ناکات لە کەسـێکدا هەبێـت لـە پێنـاو بەرنامەیەکـی پووچـدا بجەنگێت، کـە هیچ حەقیقـەتو سـەرەنجامێکی باشـی نیـە ﴿ فَقَٰتِلُوٓاْ أَوۡلِيَآءَ ٱلشَّيۡطَٰنِۖ إِنَّ كَيۡدَ ٱلشَّيۡطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا ﴾ وە فێڵ بریتیـە: لە گرتنە بـەری ڕێگـای شـاراوە بۆ زیـان گەیاندن بـە دوژمن، شـەیتان هەرچەنـدە فێڵـی زۆر بێت، هـەر لـە لاوازیدایە، کە کەمتریـن هەقو ڕاسـتی ئەنجام نـادا، وە ناشـتوانێت بەندەکانی خوا هەڵبخەڵەتێنێ.

(٧٧-٧٩): ﴿ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمۡ كُفُّوٓاْ أَيۡدِيَكُمۡ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقِتَالُ إِذَا فَرِيقٞ مِّنۡهُمۡ يَخۡشَوۡنَ ٱلنَّاسَ كَخَشۡيَةِ ٱللَّهِ أَوۡ أَشَدَّ خَشۡيَةٗۚ وَقَالُواْ رَبَّنَا لِمَ كَتَبۡتَ عَلَيۡنَا ٱلۡقِتَالَ لَوۡلَآ أَخَّرۡتَنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٖ قَرِيبٖۗ قُلۡ مَتَٰعُ ٱلدُّنۡيَا قَلِيلٞ وَٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لِّمَنِ ٱتَّقَىٰ وَلَا تُظۡلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٧٧﴾
أَيۡنَمَا تَكُونُواْ يُدۡرِككُّمُ ٱلۡمَوۡتُ وَلَوۡ كُنتُمۡ فِي بُرُوجٖ مُّشَيَّدَةٖۗ وَإِن تُصِبۡهُمۡ حَسَنَةٞ يَقُولُواْ هَٰذِهِۦ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِۖ وَإِن تُصِبۡهُمۡ سَيِّئَةٞ يَقُولُواْ هَٰذِهِۦ مِنۡ عِندِكَۚ قُلۡ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِۖ فَمَالِ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلۡقَوۡمِ لَا يَكَادُونَ يَفۡقَهُونَ حَدِيثٗا ﴿٧٨﴾ مَّآ أَصَابَكَ مِنۡ حَسَنَةٖ فَمِنَ ٱللَّهِۖ وَمَآ أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٖ فَمِن نَّفۡسِكَۚ وَأَرۡسَلۡنَٰكَ لِلنَّاسِ رَسُولٗاۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدٗا ﴿٧٩﴾ ﴾

مسـولْمانان لـە شـاری مەککـە فەرمانیان پـێ کرابوو بـە نوێـژ کـردنو زەکات دان، واتە: هـاوکاری هـەژاران، نـەک ئـەو زەکاتـەی کـە ئـەو مەرجانە لـە خـۆ دەگرێـت، چونکە زەکات لـە شـاری مەدینـە فەرز کـراوە، وە بە هەمان شـێوە فەرمانیـان پێ نەکرا لـە پێناوی دژ بـە دوژمنانـی ئیسـلام بجەنگـن، لەبەر چەند سـوودێک:

لەوانـە: حیکمەتـی خـوا وا ئەخـوازێ شـەرعو یاسـا بـۆ بەندەکانـی دا بنێ بە شـێوەیەک، بـاری سەرشـانیان گـران نـەکات، دەسـت پێـدەکات لـە گرنگترینـەوە بۆ گرنـگ، وە لە ئاسـانترینەوە بۆ ئاسـان.

لەوانـە: ئەگەر کوشـتاریان لەسـەر فەرز بکرایـە لەگەڵ بوونی ئـەو ژمارە کەمـەو خۆئامادە نەکردنـەدا، بەرانبـەر بـە زۆری ڕێـژەی دوژمنانیان، ئـەو کات دەبووە هۆی ئەوەی ئیسـلام بـە یەکجـار قووت بدرێـت، لەبـەر بەرژەوەندیەکی گـەورە بەرژەوەندیـە بچووکەکان وەلا نـراوە، وە بـۆ هەمـوو فەرمانەکان بەم شـێوە دەبێـت: هەندێ لە بـرواداران حەزیـان دەکرد لـەو کاتـەدا کوشـتاریان لەسـەر پێویسـت بێت, کە لـەو کاتەدا گونجـاو نەبوو، بـەلاّم لەو کاتـەدا ئـەوە گونجاو بـوو کە فێری یەکتاپەرسـتیو مێژوو و بەخشـینو هاوشـێوەی ئەوانە بیـن، وەک خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُوا۟ مَا يُوعَظُونَ بِهِۦ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا ﴿٦٦﴾﴾النساء.

بـەلاّم کاتێـک کـە کۆچیـان کـرد بـۆ مەدینـەو ئیسـلام بەهێز بـوو کوشـتاریان لەسـەر پێویسـت بـوو لـە کاتی گونجـاوی خۆیـدا. هەندێـک لەوانە کە پێشـتر داوای کوشـتاریان دەکـرد، لـە ترسـی خەڵکـیو لاوازی ئیمانیانـدا دەیانـوت: ﴿رَبَّنَا لِمَ كَتَبْتَ عَلَيْنَا ٱلْقِتَالَ﴾ دابەزینـی فەرمانـی جەنگ نیگەرانی کـردنو وە تانەیان لە کاری خوا دا، ئەوە پێویسـت بوو لەسـەریان دەبـوو پێچەوانـەی ئەم دۆخـە بجوڵانایەتـەوە کە بریتیە لـە: خۆ بە دەسـەوەدانی فەرمانەکانـی خـوا، وە ئارامگرتـن لەسـەر فەرمانەکانـی، بـەلاّم ئـەوەی پێویسـت بـوو لەسـەریان پێچەوانەیـان کـردەوە، دەیانـوت: ﴿لَوْلَآ أَخَّرْتَنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ﴾واتـە: خۆزگە دوات دەخسـتین لـە جەنـگ بـۆ ماوەیەکـی کـەم.نـەک لە ئیسـتادا، ئەمـە حاڵـی زۆرێک لەوانەیـە کـە هێمنو لەسـەرخۆ نیـن، وە پەلە دەکـەن لە شـتێکدا پێش هاتنـی کاتی خۆی، بـە زۆری ئـەو جۆرە کەسـانە لەکاتی پێویسـتدا ئـارام ناگـرن، وە ناتوانن ئـەو ئەرکە بخەنە سەرشـانی خۆیـان،بەڵکو زۆر بـێ ئارامن.

پاشـان خـوا ﷻ سـەرەڕای ئـەوە ئامۆژگاری ئەوانـە دەکات کە لـە جەنـگ دواکەوتوون،

دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ مَتَٰعُ ٱلدُّنۡيَا قَلِيلٞ وَٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لِّمَنِ ٱتَّقَىٰ ﴾ واتە: چێژ وەرگرتن لە خۆشیەکانی دنیاو حەوانەوەکان کەمن، وە خستنە ئەستۆی نارەحەتیەکان لە پێناوی خوادا لە ماوەیەکی کەمدا، ئاسان دەبێ لەسەر دەروونی مرۆڤ، لەبەر ئەوەی ئەگەر بیزانیایە ئەو نارەحەتیانەی کە تووشی دەبێ درێژ خایەن نیە، ئەوە لەسەری ئاسان دەبوو، ئەی چۆن دەبێ دنیاو دوارۆژ هاوشانی یەک تەماشا بکرێت، لەگەڵ ئەوەدا کە دوارۆژ باشترە لە دونیا لە خودی خۆیو لە چێژ وەرگرتن وە لە کاتێدا: لە خودی خۆیدا وەک پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {إِنَّ مَوْضِعَ سَوْطٍ فِي الْجَنَّةِ لَخَيْرٌ مِنْ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا} (أخرجه الحاكم برقم: (٣١٧٠)، وقال: صحيح على شرط مسلم، والترمذي برقم: (٣٠١٣) وقال: حسن صحيح).

واتە: بێگومان شوێنی قامچیەک لە بەهەشت باشترە لە هەموو دنیاو ئەوەی تێیدایە. وە چێژ وەرگرتن: خاوێنترە لە هەموو شتەکان.

بەڵکو ئەوەی بە خەیاڵی مرۆڤدا دێ لەزەتی بەهەشت لەسەر هەموو لەزەتەکانەوەیە، وەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَلَا تَعۡلَمُ نَفۡسٞ مَّآ أُخۡفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعۡيُنٖ ١٧ ﴾السجدة.

وە خوا ﷻ لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی دەفەرموێ: {أَعْدَدْتُ لِعِبَادِيَ الصَّالِحِينَ مَا لاَ عَيْنٌ رَأَتْ، وَلاَ أُذُنٌ سَمِعَتْ، وَلاَ خَطَرَ عَلَى قَلْبِ بَشَرٍ} (أخرجه مُسْلِمٌ برقم: (٧٠٦٣)).

واتە: ئامادەم کردوە بۆ بەندە چاکەکانم (لە بەهەشت دا) نازو نیعمەتی وا نە هیچ چاوێک بینیویەتی، وە نە هیچ گوێیەک بیستوویەتی، وە نە بە خەیاڵو دڵی هیچ کەسێکیش داهاتوە.

بەڵام لەزەتی دنیا: تیکەڵاو کراوە بە جۆرەها شت، ئەگەر بەراورد بکرێت بە ناخۆشیەکان، وە خەمو خەفەتو ئازارەکان ئەوە ڕێژەیەکی زۆر کەم خۆشی تێدایە. بەڵام کاتەکەی: بە ڕاستی دونیا کۆتایی پێ دێ وە تەمەنی مرۆڤ لە چاو ژیانی دنیادا زۆر کەمە، وە دوا ڕۆژیش هەمیشەو بەردەوامە، وە ئەوانەی تێیدان بۆ هەتا هەتایی دەمێننەوە، ئەگەر کەسی ژیرو عاقڵ بیر لەم ژیانە بکاتەوەو تاوتوێیان بکاتو ڕاستیەکان بێنێتە پێش چاو دەزانێ کامیان باشترەو شایانترە هەوڵی بۆ بدرێو کوششی بۆ بکرێ، ئالەبەر ئەمە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لِّمَنِ ٱتَّقَىٰ ﴾واتە: خۆی لە شیرکو سەرجەم گوناهەکان بپارێزێ ﴿ وَلَا تُظۡلَمُونَ فَتِيلًا ﴾واتە: هەوڵدانتان بۆ دوارۆژ، بە دڵنیاییەوە بەرهەمەکەی دەبیننەوە بە بێ کەمو کورتی. پاشان هەواڵی داوە خۆپاراستن لە

قـەدەر هیچ سـوودێکی نیـە، وە ئەوەی کە دادەنیشـێت لە جیهـاد کردن دانیشـتنەکەی هیچ سـوودێکی پـێ ناگەیەنێـت، دەفەرمـوێ: ﴿ أَيْنَمَا تَكُونُوا يُدْرِككُّمُ الْمَوْتُ ﴾واتـە: لـە هەر کاتو شـوێنێکدا بـن. ﴿ وَلَوْ كُنتُمْ فِي بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ ﴾ واتە: کۆشـکی قایمو خانـووی بەرز. وە هەمـوو ئەمانـە هاندانـە لەسـەر جیهاد کردن لـە پێنـاوی خـوادا، جارێک بە هاندانو باسـی فـەزڵو پاداشـتی، وە جارێـک بـە ترسـاندن لـە سـزای وازهێنـان لێـی، وە جارێکـی تر بە هەواڵـدان کـە دانیشـتن هیـچ سـوودێکیان پێناگەیەنێـت، وە جارێکـی تر بە ئاسـان کرنو کـورت کردنـەوەی ڕێگاکەی.

خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات دەربـارەی ئەوانـەی کـە نازانـن، ئەوانـەی کـە دژایەتـی پەیامـی پێغەمبـەران دەکـەن، ئەوانـە ئەگـەر خۆشـیو چاکە هاتـە ڕێیان، لـەماڵو سـامانو زۆری منـداڵ، دەیانـوت: ﴿ هَٰذِهِۦ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ﴾ وە ئەگـەر ناخۆشـیو نارەحەتیـەک بهاتبایەتـە ڕێگایـان، لـە هـەژاریو نەخۆشـیو مردنی منـداڵو خۆشەویسـتان، دەیانـوت: ﴿ هَٰذِهِۦ مِنْ عِندِكَ ﴾ واتـە: بـە هـۆی ئـەو پەیامەیـە کە بـۆت هێناویـن ئـەی موحەممەد ﷺ ڕەشـبین بـوون بەرانبـەر بـە پێغەمبەر وەک چۆن ڕەشـبین بـوون بەرانبەر بـە پێغەمبەرانـی تر، وەک چـۆن خـوا هەواڵ دەدات دەربـارەی گەلی فیرعەون، ئەوان بە مووسـا ﷺ یان وت: ﴿ فَإِذَا جَآءَتْهُمُ ٱلْحَسَنَةُ قَالُوا۟ لَنَا هَٰذِهِۦ ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَطَّيَّرُوا۟ بِمُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ ﴿١٣١﴾ ﴾ الأعـراف. وە دەربـارەی گەلی صالـح دەفەرمـوێ: ﴿ ٱطَّيَّرْنَا بِكَ وَبِمَن مَّعَكَ ﴿٤٧﴾ ﴾النمل. وە گەلی یاسـین (گوندنشـینەکانی ئەنتاکیـا) بە پێغەمبەرانی خۆیانیـان وت: ﴿ إِنَّا تَطَيَّرْنَا بِكُمْ ۖ لَئِن لَّمْ تَنتَهُوا۟ لَنَرْجُمَنَّكُمْ ﴿١٨﴾ ﴾یـس.

کاتێـک کـە دڵیان هاوشـێوەی یەک بـوو، زمانو کرداریشـیان هـەر لەیەکتـر دەچوو، وە بـە هەمـان شـێوە هەر کەسـێک بـە دەسـتهێنانی شـەڕو خراپە یـان نەمانـی خێر بداتـە پاڵ پەیامـی پێغەمبـەران، یـان لـە قینـا ئـەوە بـکات، ئـەوە لـە چوارچێوەی ئەو سـەر زەنشـتە خراپـە دایە.

خـوا ﷻ لـە وەڵامیاندا دەفەرمـوێ: ﴿ قُلْ كُلٌّ ﴾لە چاکـەو خراپە، وە خێرو شـەڕ ﴿ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ ﴾واتـە: بە قـەزاو قـەدەرو دروسـتکردنی (لە لایـەن خواوەیـە) ﴿ فَمَالِ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلْقَوْمِ ﴾ واتـە: ئەوانـەی کە ئەو قسـە بێ مانـاو پووچەیـان کـرد ﴿ لَا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثًا ﴾واتە: بـە گشـتی لـە قسـە تێناگەنو لێیشـی نزیـک نابنـەوە، یـان تێناگەن بـە شـێوەیەکی لاواز نەبێـت. بـە هـەر حاڵ ئـەوە سەرزەنشـت کردنـە بۆ ئـەوان، سـەرکۆنەکردنیانە لـەوەی کە

تێنا گـەن‌و هیـچ تێگەیشـتنێکیان نیە دەربـارەی خـواو پێغەمبەرەکەی ﷺ، ئەویـش بە هۆی بێبڕوابـوون‌و پشـت تێکردنیانـەوە، وە لـە چـوار چێوەی ئەوەدا وەسـفی ئەوانـە دەکات کە لـە بەرنامـەی خـواو پێغەمبەرەکـەی تێدە گـەن، وە جەخت دەکاتەوە لەسـەری‌و بـە هەمان شـێوە لەسـەر ئـەو هۆکارانـەی دەیانگەیەنێت بەو مەبەسـتە، لـە ڕوونکردنـەوەی وتەکانی‌و بیـر کردنـەوە لێیـان، وە گرتنـە بـەری ئـەو ڕێگایانەی کـە دەیگەیەنێـت پێـی، ئەگەر لە خـوا تێبگەشـتنایە دەیانزانـی کامـە خێـرەو کامە شـەڕە، کامە چاکـەو خراپەیـە، هەمووی بـە قـەزاو قـەدەری خوا دەبێـت، هیچ لەو چوارچێـوە دەرناچێـت، وە پێغەمبـەران نابنە هۆی شـەڕو خراپـە، نـە خۆیـان‌و نە ئـەو پەیامـەی کـە هێناویانە، چونکـە بۆ چاککردنـی دین‌و دنیـاو دوارۆژی بەنـدەکان نێردراون.

پاشـان دەفەرمـوێ: ﴿ مَّآ أَصَابَكَ مِنۡ حَسَنَةٖ ﴾واتـە: لە دیـن‌و دنیادا﴿ فَمِنَ ٱللَّهِ ﴾خـوا ﷻ بەو نیعمەتانـە منەتـی کردووەو ئاسـانی کـردوە بـە ئاسـانکردنی هۆکارەکانـی ﴿ وَمَآ أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٖ ﴾ واتـە: لـە دیـن‌و دنیـادا ﴿ فَمِن نَّفۡسِكَ ﴾ واتـە: بـە هۆی تـاوان‌و ئـەوەی خۆت بە دەسـتت هێناوە، وە لێخۆشـبوونی خـوا زۆرترە. خـوا ﷻ دەرگاکانی چاکەی بـۆ بەندەکانی کردوەتـەوە وە فەرمانـی پێکـردوون بچنـە ناو خێـرو چاکەکانیـەوە، وە پێـی ڕاگەیاندوون کـە سـەرپێچی ڕێگـرە لـە فەزڵی خـوا، ئەگـەر بەندەیـەک ئەنجامیدا بـا تەنها سەرزەنشـتی دەروونـی خـۆی بـکات، چونکـە ئـەوە ڕێگرە لە گەیشـتنی فـەزڵ‌و چاکـەی خوا ﷻ.

پاشـان هەواڵـی داوە لـە گشـتگیری پەیامـی پێغەمبەرەکـەی موحەممـەد ﷺ‌و دەفەرمـوێ: ﴿ وَأَرۡسَلۡنَٰكَ لِلنَّاسِ رَسُولٗاۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدٗا ﴾ لەسـەر ئـەوەی تـۆ پێغەمبـەری خوای بەڕاسـتی، خـوا پشـتیوانی لێکـردووی بـە سـەرکەوتن‌و موعجیـزەو بەڵگـەی ڕوون‌و ئاشـکرا، ئەمـە گەورەترین شـایەتیە بە گشـتی، وەک خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ قُلۡ أَيُّ شَيۡءٍ أَكۡبَرُ شَهَٰدَةٗۖ قُلِ ٱللَّهُۖ شَهِيدُۢ بَيۡنِي ﴿١٩﴾ ﴾الأنعام. ئەگـەر زانـی خـوا ﷻ خاوەن زانسـتی تەواوە، خاوەن دەسـەڵاتی ڕەهـاو حیکمەتـی گەورەیە، وە یارمەتـی پێغەمبەرەکەی داوە بەوەی کە داویەتی، وە سـەری خسـتووە بـە سەرخسـتنێکی گـەورە، دڵنیـا دەبـێ کـە ئـەوە پێغەمبـەری خوایـە، ئەگەر نا هەندێ قسـەی بـە دەمـەوە هەڵببەسـتێت، بێگومان بە دەسـتی ڕاسـت تۆڵـەی لێدەکرێتەوە، پاشـان ڕەگـی دڵـی دەردەهێنرێت.

مَن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ ٱللَّهَ وَمَن تَوَلَّىٰ فَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ
عَلَيْهِمْ حَفِيظًا ﴿٨٠﴾ وَيَقُولُونَ طَاعَةٌ فَإِذَا بَرَزُوا۟ مِنْ عِندِكَ
بَيَّتَ طَآئِفَةٌ مِّنْهُمْ غَيْرَ ٱلَّذِى تَقُولُ وَٱللَّهُ يَكْتُبُ مَا يُبَيِّتُونَ
فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا
﴿٨١﴾ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ
لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَٰفًا كَثِيرًا ﴿٨٢﴾ وَإِذَا جَآءَهُمْ أَمْرٌ مِّنَ ٱلْأَمْنِ
أَوِ ٱلْخَوْفِ أَذَاعُوا۟ بِهِۦ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُو۟لِى ٱلْأَمْرِ
مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسْتَنۢبِطُونَهُۥ مِنْهُمْ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ
عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ لَٱتَّبَعْتُمُ ٱلشَّيْطَٰنَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٣﴾
فَقَٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفْسَكَ وَحَرِّضِ ٱلْمُؤْمِنِينَ
عَسَى ٱللَّهُ أَن يَكُفَّ بَأْسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَٱللَّهُ أَشَدُّ بَأْسًا
وَأَشَدُّ تَنكِيلًا ﴿٨٤﴾ مَّن يَشْفَعْ شَفَٰعَةً حَسَنَةً يَكُن لَّهُۥ
نَصِيبٌ مِّنْهَا وَمَن يَشْفَعْ شَفَٰعَةً سَيِّئَةً يَكُن لَّهُۥ كِفْلٌ مِّنْهَا
وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ مُّقِيتًا ﴿٨٥﴾ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا۟
بِأَحْسَنَ مِنْهَآ أَوْ رُدُّوهَآ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ حَسِيبًا ﴿٨٦﴾

(٨٠-٨١): ﴿مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ ٱللَّهَ وَمَن تَوَلَّىٰ فَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا ﴿٨٠﴾ وَيَقُولُونَ طَاعَةٌ فَإِذَا بَرَزُوا۟ مِنْ عِندِكَ بَيَّتَ طَآئِفَةٌ مِّنْهُمْ غَيْرَ ٱلَّذِى تَقُولُ وَٱللَّهُ يَكْتُبُ مَا يُبَيِّتُونَ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿٨١﴾﴾: واتـە: هەر کەسـێک گوێڕاڵـی پێغەمبەر ﷺ بـکات لـە فەرمـان پێکـراوو قەدەغـە لێکراوەکانیـدا ﴿فَقَدْ أَطَاعَ ٱللَّهَ﴾ (ئـەوە گوێڕایەڵـی خـوای گـەورەی کـردوە) چونکە فەرمـان ناکاتو قەدەغـەش ناکات بـە فەرمانی خـوا نەبـێ، ئەمـە پارێـزراوی پێغەمبـەر ﷺ دەگەیەنێـت، چونکە خوا ﷻ فەرمانـی کـردوە بـە گوێڕایەڵـی کردنی بە ڕەهایـی، کەواتـە: ئەگـەر ئـەو لـە هەمـوو ئەوانە کـە بـڵاوی دەکاتـەوە لە لایـەن خواوە پارێـزراو نەبێـت، فەرمانـی نەدەکـرد بـە گوێڕایەڵـی بەڕەهایـی، لەسـەر ئـەوە مەدحـی نەدەکـرد. ئەمە لەو مافە بەشـدارکراوانەیە، بەڕاسـتی مافەکان بە گشـتی سـێ دانەیە: یەکەم: مافێکـە تایبـەت بـە خوا ﷻ، بـۆ هیچ یەکێک لـە بەندەکانی نیـە، ئەویـش بەندایەتیکردنو گەڕانەوەیـە بۆ لای بە ئارەزوو ویسـتی خۆی، وە هەرشـتێکیش بە دوای ئـەودا بێت. دووەم: تایبەتـە بـە پێغەمبەر ﷺ ئەویش پشـتیوانی کـردنو ڕێز لێگرتنو سەرخسـتنێتی. سـێیەم: ئەم بەشـە هاوبەشـە، ئەویش ئیمان بە خـواو پێغەمبەرەکەیەتـی ﷺ وە خۆشویسـتنو گوێڕایەڵی کردنیـان، وەک چـۆن خوا ﷻ ئەم مافانـەی کۆ کردوەتەوە لە فەرمایشـتێکی: ﴿لِّتُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ وَتُسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٩﴾﴾ الفتح.

هـەر کەسـێک گوێڕایەڵـی پێغەمبـەر ﷺ بکات، ئـەوە بەڕاسـتی گوێڕایەڵی خـوای کردوە، وە پاداشـتو چاکـەی بۆ دەنووسـرێت لەسـەر ئـەوەی کە ڕێکخـراوە لـە گوێڕایەڵی خوادا ﴿وَمَن تَوَلَّىٰ﴾ وە هـەر کەسـێک پشـت هەڵبـکات لـە گوێڕایەڵـی کردنی خـوا، ئەوە بە ڕاسـتی تەنهـا زیان بـە خۆی دەگەیەنـێ ﴿فَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا﴾ واتـە: چاودێری

کردارەکانیـان بکەیـت، بەڵکـو ئێمە تۆمان ناردووە بـە گەیەنەرو ئامۆژگاری کار، بەراسـتی ئەرکی سەرشـانی خۆتت ڕاپەڕاند، وە پاداشـتت پێویسـت بوو لەسـەر خوا، یەکسـانە ئەگەر ئـەوان ڕێنمـووی وەر بگـرن یان وەر نەگـرن، وەک چـۆن خوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ فَذَكِّرۡ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٞ ٢١ لَّسۡتَ عَلَيۡهِم بِمُصَيۡطِرٍ ٢٢ ﴾الغاشیة.

پێویسـتە گوێڕایەڵـی خـواو پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـە ئاشـکراو بـە نهێنـی بێـت، لـە کۆڕو کۆمـەڵو تەنهاییـدا بێت، بـەڵام ئەوەی لەناو کـوڕو کۆمەڵـدا پابەند بوونی نیشـان دەداتو لـە تەنهاییـدا، یان لەگـەڵ هاوپیشـەکانی تریدا واز لـە گوێڕایەڵـی دێنێـتو پێچەوانەکەی دەجووڵێتـەوە، بـە ڕاسـتی ئـەو گوێڕایەڵیـە هیـچ سـوودێکی نیـە، بێگومـان لـەو کۆمەڵـە دەچێـت کـە خـوا دەربارەیـان دەفەرمـوێ: ﴿ وَيَقُولُونَ طَاعَةٞ ﴾ واتـە: گوێڕایەڵی بۆ خـوا ئاشـکرا دەکەن لـە کاتێکـدا لـە لای تـۆدان ﴿ فَإِذَا بَرَزُواْ مِنۡ عِندِكَ ﴾ واتـە: ئەگەر لای تـۆ دەرچـوونو تەنهـا بوونـەوەو کەوتنـە دۆخێکەوە کـەس پێیانـی نەدەزانی ﴿ بَيَّتَ طَآئِفَةٞ مِّنۡهُمۡ غَيۡرَ ٱلَّذِي تَقُولُ ﴾ واتـە: شـەو دەکەنەوەو پشـت دەکەن جگە لـە گوێڕایەڵی هەمـوو شـتێک دەکـەن، لای ئـەوان هیـچ تاوانێک نیە جگـە لە سـەرپێچی نەبێـت. وە کە دەفەرمـوێ: ﴿ بَيَّتَ طَآئِفَةٞ مِّنۡهُمۡ غَيۡرَ ٱلَّذِي تَقُولُ ﴾ بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی ئـەو کارەی لەسـەری جێگیر بـوون تەنهـا گوێڕایەڵی نەبـوو، چونکە بە شـەو دەمانەوەو پلانیـان دادەناو یەک دەنـگ دەبوون لەسـەری.

پاشـان خـوا هەڕەشـەی لـە کردارەکانیـان کـرد، وەک دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱللَّهُ يَكۡتُبُ مَا يُبَيِّتُونَ ﴾ واتـە: لەسـەریان دەپارێزێت، وە لە داهاتوودا پاداشـتیان دەداتـەوە بە تەواوترین شـێوە، ئەم ئایەتـە هەڕەشـەیە بۆیان.

پاشـان فەرمانـی کردوە بـە پێغەمبەرەکـەی ڕووبەڕوویـان ببێتـەوەو توندو تیژیـان لەگەڵدا نـەکات، بەڕاسـتی ئەوان زیان بەو ناگەیەنن، ئەگەر پشـت بە خوا ببەسـتێت لە سـەرکەوتنی ئاینەکەیـداو بەرپـا کردنی شـەریعەتەکەیدا، لەبەر ئەمە خـوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴾.

(٨٢): ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلۡقُرۡءَانَۚ وَلَوۡ كَانَ مِنۡ عِندِ غَيۡرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ ٱخۡتِلَٰفٗا كَثِيرٗا ٨٢ ﴾:

خـوا ﷻ فەرمـان دەکات بـە بیر کردنـەوە لە کتێبەکـەی، ئەویـش بریتیە لە بیـر کردنەوە لـە واتاکانـیو قـووڵ بوونـەوەو تێڕامـان تیایـدا، بێگومـان بیـر کردنـەوە لـە دەقەکانـی قورئـان، کلیلـی زانسـتو زانیاریەکانـە، وە بەمە هەموو خێرێک بەدەسـت دێتو سـەرجەم

زانستەکان لەوێـوە سـەرچاوە دەگـرن، وە بەمـە ئیمـان لـە دڵـدا زیـاد دەکاتو ڕیشـە دادەکوتـێ. بەڕاسـتی پەروەردگـارو پەرسـتراوی بە جوانی دەناسـێت، وە ئەوەشـی خۆی لێ دەپارێزرێـت لـە سـیفەتی ناتـەواوی، وە ڕاسـتە ڕێگای هیدایەت دەناسـێت، بەهەمان شـێوە سـیفەتی خەڵکەکەشـی دەناسـێت، وە دوژمن دەناسـێت لەسـەر شـێوەی ڕاسـتەقینە، وە ئەو ڕێگایانـە کـە دەیگەیەنێـت بە سـزا، بەهەمان شـێوە شـوێن کەوتوانی دەناسـێت، وە ئەوەی بـە دەسـتیانەوەیە لـە هـۆکاری سـزا. وە هەتـا مـرۆڤ زیاتـرو قووڵتر بیـری لـێ بکاتەوە، زانسـتو زانیـاریو کـرداری زیاتـر دەبێت، لەبـەر ئەوەیـە خوا فەرمانـی بە بیـر کردنەوە کـردووەو جەختی لەسـەر دەکاتەوە، وە هەواڵـی داوە قورئان بۆ ئەو مەبەسـتە دابەزیوە، وەک دەفەرموێ: ﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿٢٩﴾ ﴾ص. وە هەروەهـا دەفەرمـوێ: ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلۡقُرۡءَانَ أَمۡ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقۡفَالُهَآ ﴿٢٤﴾ ﴾محمـد.

لـە سـوودەکانی بیرکردنـەوە لـە قورئانـی پیرۆز: مـرۆڤ بە بیرکردنـەوە دەگـات بە پلەی دڵنیایـی، وە بـە پلـەی زانسـت کـە بـۆی دەر دەکەوێـت بەڕاسـتی قورئـان وتـەی خوایە، لەبـەر ئـەوەی هەندێکـی هەندێکـی تر تـەواو دەکات، لـە قورئانـدا هەریەک لـە فەرمانو چیـرۆکو هـەواڵ دەبینێت، کـە لە چەندین شـوێنی قورئاندا هاتووە، هەموویـان تەواوکەرو بەڕاسـت دانـەری یەکتریـن، هەندێکـی دژی ئەوی تر نیە، ئـا بەمە کامڵیو تـەواوی قورئان دەزانرێـت، وە لـە لایـەن ئەو کەسـەوە هاتووە کـە زانسـتی دەوری هەموو شـتەکانی داوە. لەبـەر ئەمـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَوۡ كَانَ مِنۡ عِندِ غَيۡرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ ٱخۡتِلَٰفٗا كَثِيرٗا ﴾ واتـە: کاتێـک کە لە لایـەن خواوەیـە هیـچ دووبەرەکیەکی تێـدا نیە.

(٨٣): ﴿ وَإِذَا جَآءَهُمۡ أَمۡرٞ مِّنَ ٱلۡأَمۡنِ أَوِ ٱلۡخَوۡفِ أَذَاعُواْ بِهِۦۖ وَلَوۡ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنۡهُمۡ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسۡتَنۢبِطُونَهُۥ مِنۡهُمۡۗ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ لَٱتَّبَعۡتُمُ ٱلشَّيۡطَٰنَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٨٣﴾ ﴾.

ئەمـە تەمێکردنـە لـە لایـەن خـواوە بـۆ بەندەکانی لەسـەر ئـەم کـردارەی کە شـیاو نەبوو، بەڕاسـتی پێویسـتە لەسـەریان ئەگەر فەرمانێکی گرنگیان بۆ هات، پەیوەندی بە بەرژەوەندی گشـتیەوە هەبـوو، بە دڵخۆشـی کردنی بـڕواداران یان ترسـاندنیان بـە بەڵاو ناخۆشـیەکان، کـە پابەنـد بـن، وە پەلـە نەکـەن لـە بـڵاوە پێکردنـی ئـەو هەواڵـەدا، بەڵکـو بیگەڕێننەوە بـۆ پێغەمبـەر ﷺ، وە بـۆ ئـەو لایەنەنانەی کـە پەیوەنـدی دارن بەو بـوارە، ئەوانـەی خاوەن بۆچـوونو زانسـتو ئامۆژگـاری کارن، وە ئەوانـە کـە لە کارو بـارەکان تێدەگـەن، وە لە

بەرژەوەنـدیو پێچەوانەکانـی دەزانـن. ئەگـەر زانیان بە بـڵاوە پێکردنی ئەو هەواڵە خۆشـی دەخەنـە دڵـی بڕوادارانـەوەو دوژمنانیـان پـێ دەترسـێنن، ئـەو کارە دەکەن، ئەگـەر زانیان کـە بەرژەوەنـدی تێـدا نیـە، یـان بەرژەوەنـدی تێدایـە بـەڵام زیانـی زیاترە، ئـەوە بڵاوی ناکەنـەوە، لەبـەر ئەمـە دەفەرمـوێ: ﴿لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسْتَنۢبِطُونَهُۥ مِنْهُمْ﴾ واتـە: بـە عەقڵـی تیـژو بیکردنـەوەی جوان لـە هەواڵەکـە تێدەگەن.

ئـەم دەقـە بەڵگەیە لەسـەر بنەمایەکـی ڕەوشـتی، ئەویش ئەوەیـە ئەگـەر لێکۆڵینەوەیەک لە کارێـک لـە کارەکان کـرا، بدرێت بە دەسـتی شایسـتەترین کەسـەوە لەو بـوارەدا، کەس لـە خۆیـەوە بە بێ زانسـت خۆی تـێ هەڵنەقورتێنێـت، چونکە ئـەوە نزیکترە لـە پێکانەوەو کەمتریـش گومانـی هەڵـەی لێدەکرێـت. وە بە هەمان شـێوە بەڵگەیە لەسـەر پەلـە نەکردن لـە بـڵاوە پێکردنـی هەواڵـدا لە کاتـی بیسـتنیدا، وە فەرمـان کردن بـە ڕامانو سـەرنجدان پێـش قسـەکردندا، وە تەماشـاکردنی ئایا سـوودو بەرژەوەنـدی تێدایە، ئەوەی لە پێشـتر بوو پێشـی دەخـاتو ئەندازەگیری بـۆ کارەکە دەکات.

پاشـان خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ﴾ واتـە: لە سـەرکەوتنو تەمێکـردنو فێرکردنتانـدا کـە پێشـتر نەتـان دەزانـی ﴿لَٱتَّبَعْتُمُ ٱلشَّيْطَٰنَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ چونکـە مـرۆڤ بە سروشـتی خـۆی سـتەمکارو نەفامـە، دەروونـی تەنهـا فەرمانـی خراپی پێـدەکات، ئەگـەر گەڕایـەوە بـۆ لای خـواو پشـتی پێـی بەسـت، لـەو بـوارەدا کۆششـی کـرد، خـوا ﷻ بەزەیـی دەڕێژێـت بەسـەریدا، وە سـەرکەوتووی دەکات بۆ هەمـوو خێرو چاکەیـەکو لـە شـەیتانی نەفریـن لـێ کـراو دەیپارێزێت.

(٨٤): ﴿فَقَٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفْسَكَ ۚ وَحَرِّضِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَكُفَّ بَأْسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ وَٱللَّهُ أَشَدُّ بَأْسًا وَأَشَدُّ تَنكِيلًا ﴿٨٤﴾﴾:

ئـەم دۆخە باشـترین دۆخەکانی بەندەیە کە کۆشـش بکات بۆ جێبەجێ کردنـی فەرمانەکانی خـوا ﷻ لـە جیهاد کردنو هاوشـێوەی، وە خەڵکی لەسـەر هانبـدات، بەڕاسـتی هەندێ جار ئـەم دووانـە یان یەکێک لـەم دووانە لـە بەنـدەدا نامێنێت، لەبـەر ئەمە خـوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَقَٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفْسَكَ﴾ واتـە: تـۆ دەسـەڵاتت نیـە جگـە لە نەفسـی خـۆت نەبێـت، هەرگیـز فەرمانت پێ ناکرێـت بە کاری کەسـێکی تر.

﴿وَحَرِّضِ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ (وە بـڕواداران هـان بدە) لەسـەر جەنگ کردن، ئەمـە هەموو کارێک دەگرێتـەوە کـە چالاکـی بـڕواداران بگرێتـە خـۆ، وە بەهێز کردنـی دڵـەکانو زانیـاری بە

لاوازی دوژمنـانو تێکشـکانیان. وە ئـەو پلـەو پاداشـتەی کـە خـوا ﷻ بـۆ جەنگـاوەران داینـاوە، وە ئـەو سـزایەی بـۆ دواکەوتـوان دیاری کـراوە، ئەمـەو هاوشـێوەکانی هەمووی دەچنـە چوارچێـوەی هاندان لەسـەر شـەڕکردن لـە پێنـاوی خوادا.

﴿ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَكُفَّ بَأْسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ﴾ واتـە: بەکوشـتار کردنتـان لە پێنـاوی خوادا وە هاندانـی هەندێکتان بـۆ هەندێکی تـر ﴿ وَٱللَّهُ أَشَدُّ بَأْسًا ﴾ واتە: خوا خـاوەن بەهێزترین هێـزو عیزەتە.

﴿ وَأَشَدُّ تَنكِيلًا ﴾ واتـە: تۆڵـەی بەتینـە بەرانبـەر بـە گوناهبـار. وە بەتینـە بـۆ جگە لە تاوانباریـش، ئەگـەر بیەوێـت بەهێزی خـۆی سـەردەکەوێ بەسـەر بێبڕوایاندا کـە هیچیان ناهێڵێتـەوە، بـەڵام لـە حیکمـەتو دانایـی خـوا ﷻ ئەوەیە کـە هەندێکیـان بـە هەندێکیان تاقـی دەکاتـەوە، تـا بزانرێـت کـێ جیهـاد دەکات، وە بـە ویسـتی خـۆی ئیمانـی چاکو بـە سـوود بـە دەسـت دێنێـت، نـەک ئیمانـی زۆرە ملێو ناچـاری کـە هیچ سـوودێکی بۆ خاوەنەکـەی نیە.

(٨٥): ﴿ مَّن يَشْفَعْ شَفَـٰعَةً حَسَنَةً يَكُن لَّهُۥ نَصِيبٌ مِّنْهَا ۖ وَمَن يَشْفَعْ شَفَـٰعَةً سَيِّئَةً يَكُن لَّهُۥ كِفْلٌ مِّنْهَا ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ مُّقِيتًا ﴿٨٥﴾ ﴾

مەبەسـت لە تکاو شـەفاعەت لێرەدا هاوکاریکردنـە لە کارێک لە کارەکاندا، هەر کەسـێک تـکاو شـەفاعەت بکات بـۆ کەسـێکی تـر، وە لەگەڵـدا کارێکی چاکـەش ئەنجـام بدات، وە هەروەهـا تکاکـردن بـۆ ئەو سـتەم لێکراوانەی کـە سـتەمیان لێکراوە، ئەویش پاداشـت وەردەگرێـت لـە بـری ئـەو هاوکاریکردنە، بـە پێـی هـەوڵو ماندووبـوونو بەرژەوەندی، بەبـێ ئـەوەی لـە پاداشـتی تـکاکار کەم بکاتـەوە، وە هـەر کەسـێک هاوکاری کەسـێک بـکات لـە کارێکـی خراپـدا، ئەویـش بەشـێکی دەبێـت لـە سـزای ئـەو خراپەیە بـە پێی هاوکاریکردنـی، لـەم دەقـەدا هاندانێکـی گـەورە بـەدی دەکرێ لەسـەر هـاوکاری کردنی یەکتـری بـۆ خێرو تەقـوای خوا، وە دوورخسـتنەوە لـە هـاوکاری یەکتر لە تاوانو شـەڕو دووبەرەکیـدا. وە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ مُّقِيتًا ﴾ واتـە: شـایەتو پارێـزەرە، چاودێـرە بەسـەر هەمـوو کردەوەکانەوە، پاداشـتی هەمـووان دەداتەوە، پاداشـتی هەمـوو ئەوانـە دەداتەوە کە شایسـتەن.

(٨٦): ﴿ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا۟ بِأَحْسَنَ مِنْهَآ أَوْ رُدُّوهَآ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ حَسِيبًا ﴿٨٦﴾ ﴾:

سـڵاوکردن بریتیـە لـەو دەربڕینەی کە لە نێـوان یەکێک لەو دوو کەسـەدا دروسـت دەبێ

کـە دەگـەن بەیەکتر، لەسـەر بنەمـای ڕێزگرتن، وە هەر وشـەیەک لە سـڵاو کـردن بچێ لـە ڕووگەشـیو هاوشـێوەکانیدا. بەرزترین جۆرەکانی سـڵاو کـردن ئەوەیە کەلە شـەرعدا هاتـووە بـە دەسـت پێکـردن بە وشـەی (السـلام) سـڵاو، خـوا ﷻ فەرمانـی بە بـڕواداران کـردوە هەرکاتێـک سـڵاو لەیەکتـر دەکـەن ئـەوە بەباشـترین شـێوە وەڵامـی بدەنـەوە، بـە وشـەی جـوانو دەم بـە پێکەنینەوە، یـان هاوشـێوەی ئـەوە، وە تێگەیشـتن لـەم دەقەدا قەدەغەکردنـی وەڵام نەدانـەوەی سـڵاوکردنە بـە گشـتی، یـان وەڵامدانـەوەی بـە کەمتر. وە لـە دەقـە پیرۆزەکـەدا ئـەوە وەردەگیرێت، هاندان لەسـەر دەسـپێکردنی سـڵاوکردن لە دوو ڕووەوە: یەکەمینیـان: خـوا ﷻ فەرمانـی کـردوە بـە وەڵامدانـەوە بـە چاکترین شـێوە یـان بـە هاوشـێوەی خـۆی، ئەمەش ئـەوە دەگەیەنـێ کە سـڵاوکردن پێویسـتە لـە ڕووی شـەرعەوە، دووەم: ئـەوەی سـوودی لێوەردەگیـرێ لـە (أفعـل التفضیـل) بریتیە لە (أحسـن) کـە بەڵگەیـە بۆ بەشـداری کـردن لـە سـڵاوکردندا وە وەڵامدانەوەی بـە چاکترین شـێوە، وە بـە گشـتی لـە ئایەتەکـە جیادەکرێتـەوە، هەر کەسـێک سـڵاو بـکات لە کەسـێک کە فەرمانـی پێنەکرابـێ بە وەڵامدانـەوەی، وەک سـەرقاڵ بوون بـە خوێندنـەوەی قورئان، یان گوێگرتـن لـە جومعە، یـان نوێژکردنو هاوشـێوەی ئەوانە، ئەوە بەڕاسـتی پێویسـت ناکات وەڵامـی سـڵاوەکەی بداتـەوە، بـە هەمان شـێوە ئـەوەش جیادەکرێتـەوە کە خـوا فەرمانی کردبێـت بـە وازهێنـان لێیو سـڵاو لێنەکردنـی، ئەویش ئەو سـەرپێچیکارەیە کـە تەوبەی نەکـردوە بـە دوورکەوتنـەوە لێـی ڕادەچەڵەکێت، بەڕاسـتی ئـەو کەسـە وازی لێدەهێنرێو سـڵاوی لێناکـرێو وەڵامـی سـڵاوی نادرێتـەوە ئەویـش لەبـەر بەرژەوەنـدی گـەورە. وە دەچێتـە چـوار چێـوەی وەڵامدانەوەی هەموو سـڵاوێک کـە خەڵکـی لەگەڵیـدا ڕاهاتبێت، کـە لـە ڕووی شـەرعەوە قەدەغەی لـێ نەکرابێت، ئەوە فەرمانـی پێکراوە بـە وەڵامدانەوەی یـان بەجوانتریـن شـێوە، پاشـان خـوا ﷻ پەیمانـی داوەو هەڕەشـەی کـردوە لـە هەمـوو کارە چـاکو خراپـەکان بـە وتـەی ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَىۡءٍ حَسِيبًا﴾ کـرداری بەندەکان دەپارێـزێ، لـە چاکو خـراپو بچووکو گەورە، پاشـان پاداشـتیان دەداتەوە بە ویسـتو فـەزڵو دادپـەروەریو دانایـی خۆی.

ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ فِيهِۗ
وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثٗا ﴿٨٧﴾ ۞ فَمَا لَكُمۡ فِي ٱلۡمُنَٰفِقِينَ
فِئَتَيۡنِ وَٱللَّهُ أَرۡكَسَهُم بِمَا كَسَبُوٓاْۚ أَتُرِيدُونَ أَن تَهۡدُواْ مَنۡ
أَضَلَّ ٱللَّهُۖ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلٗا ﴿٨٨﴾ وَدُّواْ لَوۡ تَكۡفُرُونَ
كَمَا كَفَرُواْ فَتَكُونُونَ سَوَآءٗۖ فَلَا تَتَّخِذُواْ مِنۡهُمۡ أَوۡلِيَآءَ حَتَّىٰ
يُهَاجِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَخُذُوهُمۡ وَٱقۡتُلُوهُمۡ حَيۡثُ
وَجَدتُّمُوهُمۡۖ وَلَا تَتَّخِذُواْ مِنۡهُمۡ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرًا ﴿٨٩﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ
يَصِلُونَ إِلَىٰ قَوۡمِۢ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُم مِّيثَٰقٌ أَوۡ جَآءُوكُمۡ حَصِرَتۡ
صُدُورُهُمۡ أَن يُقَٰتِلُوكُمۡ أَوۡ يُقَٰتِلُواْ قَوۡمَهُمۡۚ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ
لَسَلَّطَهُمۡ عَلَيۡكُمۡ فَلَقَٰتَلُوكُمۡۚ فَإِنِ ٱعۡتَزَلُوكُمۡ فَلَمۡ يُقَٰتِلُوكُمۡ
وَأَلۡقَوۡاْ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَمَ فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمۡ عَلَيۡهِمۡ سَبِيلٗا ﴿٩٠﴾
سَتَجِدُونَ ءَاخَرِينَ يُرِيدُونَ أَن يَأۡمَنُوكُمۡ وَيَأۡمَنُواْ قَوۡمَهُمۡ كُلَّ
مَا رُدُّوٓاْ إِلَى ٱلۡفِتۡنَةِ أُرۡكِسُواْ فِيهَاۚ فَإِن لَّمۡ يَعۡتَزِلُوكُمۡ وَيُلۡقُوٓاْ
إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَمَ وَيَكُفُّوٓاْ أَيۡدِيَهُمۡ فَخُذُوهُمۡ وَٱقۡتُلُوهُمۡ حَيۡثُ
ثَقِفۡتُمُوهُمۡۚ وَأُوْلَٰٓئِكُمۡ جَعَلۡنَا لَكُمۡ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٗا مُّبِينٗا ﴿٩١﴾

**(٨٧):** ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ فِيهِۗ وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثٗا ﴿٨٧﴾ ﴾:

خـوا ﷻ هەواڵـی داوە کە تـاکو تەنهایەو هیـچ پەرسـتراوێکی تـر نیـە جگە لـە ئەو نەبـێ، لەبـەر ئـەوە لـە زاتو سـیفەتیدا تـەواوە، وە لەبـەر ئـەوە بـە تەنهـاو بـێ هاوەڵە لە دروسـتکردنو ڕێکخسـتنی کارو بارەکانـدا، وە خـاوەن نیعمەتـی ئاشـکراو نهێنیـە. بۆیـە پێویسـتە بپەرسـترێت، وە خـۆی لـێ نزیـک بکرێتـەوە لـە هەمـوو جـۆرە بەندایەتیەکانـدا، تەنها ئەو شایسـتەی یەکتاپەرسـتیە، وە پاداشـتی بەندەکانـی دەداتـەوە لـەو بەندایەتیـەی کـە ئەنجامیان داوە یـان وازیـان لـێ هێنـاوە، لەبـەر ئـەوە سـوێند بە شـوێنی پاداشـتدانەوە دەخـوات، کە بریتیـە لـە ڕۆژی دوایـی، دەفەرمـوێ: ﴿ لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ ﴾ هەمووتـان یەکـەمو کۆتاتـان لە یەک ئاسـتو پلەو پایـەدان لـە ﴿ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ فِيهِ ﴾ واتە: هیـچ گومانێکی تیدا نیە لـە هیـچ ڕوویەک لـە ڕووەکانەوە، بـە بەڵگەی عەقڵـیو بیسـتراو، بەڵگەی عەقڵـی: ئەوەی کـە دەیبینیـن لە زینـدوو کردنـەوەی زەوی پـاش مردنی، وە لـە دروسـتکردنی یەکەم کە دروسـتبوونی جـاری دووەم لـە پێشـترو ئاسـانترە، وە یەکێکی تر لـەو حیکمەتانەی کە خوا دروسـتکراوی بـە بـێ ماناو پووچ دروسـت نەکردوە، ئەوەیە کە دروسـتی کردوون پاشـان دەیانمرێنێـت. بـەڵام بەڵگــەی بیسـتراو: بریتیـە لە هەواڵی ڕاسـتی ڕاسـتگۆکان، وە سـوێند خواردنیەتـی لەسـەری، وەک دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثٗا ﴾ وە بـە هەمـان شـێوە خـوا ﷻ فەرمانـی کـردوە بـە پێغەمبەرەکـەی لـە چەندین شـوێنی قورئانـدا، وەک دەفەرمـوێ: ﴿ زَعَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَن لَّن يُبۡعَثُواْۚ قُلۡ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتُبۡعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلۡتُمۡۚ وَذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ﴿٧﴾ ﴾ التغابـن. وە لـە دەقـی: ﴿ وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثٗا ﴿٨٧﴾ ﴾، هـەر لـەم سـوورەتەدا دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ قِيلٗا ﴿١٢٢﴾ ﴾ النسـاء. هەواڵێکـە کە بەڕاسـتی گێڕانەوەو

هـەواڵو قسـەکانی لـە بەرزتریـن پلەی ڕاسـتگۆیی دایـە، هەر شـتێک دەربارەی زانسـتو مەعریفـەو کـردارەوە بوترێـت پێچەوانـەی ئـەو هەواڵانـە بێـت کـە خـوا داویەتـی، ئەوە پـووچو بـێ ماناو بێ سـوودە، چونکـە دژی هەواڵی ڕاسـتەقینەی پێغەمبـەرە ﷺ بۆیە نابێت پێـی بوترێت ڕاسـت.

(٨٨-٩١): ﴿ فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ وَاللَّهُ أَرْكَسَهُم بِمَا كَسَبُوا ۚ أَتُرِيدُونَ أَن تَهْدُوا
مَنْ أَضَلَّ اللَّهُ ۖ وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُ سَبِيلًا ﴿٨٨﴾ وَدُّوا لَوْ تَكْفُرُونَ كَمَا كَفَرُوا فَتَكُونُونَ
سَوَاءً ۖ فَلَا تَتَّخِذُوا مِنْهُمْ أَوْلِيَاءَ حَتَّىٰ يُهَاجِرُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْا فَخُذُوهُمْ وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ
وَجَدتُّمُوهُمْ ۖ وَلَا تَتَّخِذُوا مِنْهُمْ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿٨٩﴾ إِلَّا الَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَىٰ قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم
مِّيثَاقٌ أَوْ جَاءُوكُمْ حَصِرَتْ صُدُورُهُمْ أَن يُقَاتِلُوكُمْ أَوْ يُقَاتِلُوا قَوْمَهُمْ ۚ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَسَلَّطَهُمْ
عَلَيْكُمْ فَلَقَاتَلُوكُمْ ۚ فَإِنِ اعْتَزَلُوكُمْ فَلَمْ يُقَاتِلُوكُمْ وَأَلْقَوْا إِلَيْكُمُ السَّلَمَ فَمَا جَعَلَ اللَّهُ لَكُمْ عَلَيْهِمْ
سَبِيلًا ﴿٩٠﴾ سَتَجِدُونَ آخَرِينَ يُرِيدُونَ أَن يَأْمَنُوكُمْ وَيَأْمَنُوا قَوْمَهُمْ كُلَّ مَا رُدُّوا إِلَى الْفِتْنَةِ
أُرْكِسُوا فِيهَا ۚ فَإِن لَّمْ يَعْتَزِلُوكُمْ وَيُلْقُوا إِلَيْكُمُ السَّلَمَ وَيَكُفُّوا أَيْدِيَهُمْ فَخُذُوهُمْ وَاقْتُلُوهُمْ
حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ ۚ وَأُولَٰئِكُمْ جَعَلْنَا لَكُمْ عَلَيْهِمْ سُلْطَانًا مُّبِينًا ﴿٩١﴾ ﴾

مەبەسـت لـە ئـەو دووڕووانـەی کە باسـکراون لەم دەقـە پیرۆزانـەدا: ئـەو دووڕووانەیە کە ئیسـلامەتیان ئاشـکرا کـردووەو لەگـەڵ بێبڕواییشـدا کۆچیـان نەکـردوە، لە نـاو هاوەڵاندا (خـوا لێیـان ڕازی بێـت) گومانێـک دروسـتبوو دەربـارەی ئـەو دووڕووانـە، هەندێکیـان خـۆی دەپاراسـت لـەوەی کە شـەڕیان بەرانبـەر بـکاتو پەیوەندیـان بپچڕێنێـت، بە هۆی ئـەوەی بڕواهێنانیـان ئاشـکرا کـرد بـوو، وە هەندێکـی تر بـارو دۆخیانیان دەزانـی بە هۆی کردەوەکانیانـەوە، بۆیـە فەرمانـی بێبڕواییـان دا بەسـەریاندا. پاشـان خـوا ﷻ هەواڵی دا کە هیـچ پێویسـت نـاکات لێـان بکەونـە گومـانو دوو دڵیـەوە، بەڵکـو حاڵی ئـەوان ڕوونو ئاشـکرایەو ئاڵـۆز نیە، بە ڕاسـتی ئـەوان دووڕوون، بێبڕواییـان چەند جار بوەتـەوە، وە پێیان خۆشـە ئێـوەش وەک ئـەوان بێبـڕوا ببنـەوە، ئەگـەر ئەمەتان بە تـەواوی لێـان بینی ﴿ فَلَا تَتَّخِذُوا مِنْهُمْ أَوْلِيَاءَ ﴾(کەواتـە ئـەوان بـە دۆسـت مەگرن) ئەمـەش ئەوە پێویسـت دەکات کـە خۆشـیانیان نەوێـن، چونکە دۆسـتایەتی بەشـێکە لە خۆشەویسـتی.

بە هەمان شـێوە پێویسـتە لەسـەر مسـوڵمانان ڕقیان لێیان ببێتـەوەو دژایەتیـان بکەن، چونکە قەدەغەکـردن لـە شـتێک فەرمـان کردنە بـە پێچەوانەکـەی، ئـەم کارە کاتییـە هەتا کۆچ دەکـەن، بـەڵام ئەگەر کۆچیان کـرد، ئەوە ئەوەی بۆ مسـوڵمان پێویسـتە بکرێـت بەهەمان

شێوە بۆ ئەوانیش پێویستە دەکرێت لە سەرجەم مافەکاندا، وەک چۆن پێغەمبەر ﷺ حوکمی ئیسلامی جێبەجێ دەکرد بۆ هەموو کۆچکەران، جا ئەگەر برواداریکی راستەقینە بوایە یان رووکەش، ئەوان ئەگەر کۆچ نەکەنو پشتی تێبکەن ﴿ فَخُذُوهُمْ وَٱقْتُلُوهُمْ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ ﴾ واتە: لە هەر کاتو لە هەر شوێنێکدا بێت، ئەمە لەو کۆمەڵە بەڵگەیە کە ئاماژە دەکەن لەسەر نەسخی کوشتار لە مانگەکانی حەرامدا، ئەمە وتەی زۆربەی زانایانە، وە کۆمەڵی ناکۆکی کاران دەڵێن: ئەم دەقانە رەهان، دەخرێنە سەر کۆت کردنی شەڕ کردن لە مانگەکانی حەرامدا.

پاشان خوا ﷻ کوشتاری سێ دەستە جیا کردوەتەوە لە دووڕووەکان: دوو دەستە فەرمانی کردوە بە واز هێنان لێیان، یەکەم: ئەوانەی پەیوەندی دەکەن بە تیرەو هۆزێک لە نێوانی ئێوەو ئەواندا پەیمان بەستراوە بە نەکردنی جەنگ، ئەو کات حوکمیان هەمان حوکمی ئەوانەیە کە پەیمانتان لەگەڵدا بەستوون. دەستەی دووەم: کەسانێکن ﴿ حَصِرَتْ صُدُورُهُمْ أَن يُقَٰتِلُوكُمْ أَوْ يُقَٰتِلُوا۟ قَوْمَهُمْ ﴾ واتە: لەسەر دڵیان نارەحەتە جەنگتان لە دژ بکەنو جەنگ لە دژی تیرەو هۆزەکانیان بکەن، بە هەمان شێوە ئەم کۆمەڵەش فەرمان کراوە بە واز هێنان لێیان، خوا ﷻ باسی حیکمەتی ئەمەی بۆ کردووین وەک دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَسَلَّطَهُمْ عَلَيْكُمْ فَلَقَٰتَلُوكُمْ ﴾ بەراستی ئەوەی کە دەکرێ ببێت سێ شتە: یان ئەوەیە لە گەڵتان بن و شەڕ لە دژی دوژمنەکانتان بکەن، ئەمەش لە ئەواندا نیە، ئنجا لە دوو حاڵەتدا دەمێننەوە یان ئەوەیە لەگەڵ تیرەو هۆزەکەیاندا شەڕ لە دژ ئێوەدا بکەن، یان واز لە شەڕ کردن بهێنن لەگەڵ هەردوولادا، ئەوە ئاسانترین هەڵبژاردەیە بۆ ئێوە، ئەگەر خوا بیویستایە زاڵی دەکردن بەسەرتاندا، دەی سوپاس‌و ستایشی پەروەردگارتان بکەن، کە دەستیانی لە ئێوە گرتوەتەوە شەرتان لە دژ بکەن، بەراستی ئەوان: ﴿ فَإِنِ ٱعْتَزَلُوكُمْ فَلَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ وَأَلْقَوْا۟ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَمَ فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ عَلَيْهِمْ سَبِيلًا ﴾ (واتە: ئەگەر کافرەکان کەناریان گرت جەنگیان لە دژی ئێوە نەکرد، وە ئاشتیان لەگەڵ ئێوەدا بەرپاکرد ئەوە خوا رێگەی نەداوە کە لە دژی ئەوان بجەنگن).

دەستەی سێیەم: کەسانێکن تەنها بەرژەوەندی خۆیان لا مەبەستە، ئەوانەن کە خوا ﷻ دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿ سَتَجِدُونَ ءَاخَرِينَ ﴾ واتە: لەو دووڕووانەن ﴿ يُرِيدُونَ أَن يَأْمَنُوكُمْ ﴾ واتە: لەبەر ئەوەی کە لێتان دەترسن ﴿ وَيَأْمَنُوا۟ قَوْمَهُمْ كُلَّ مَا رُدُّوٓا۟ إِلَى ٱلْفِتْنَةِ أُرْكِسُوا۟ فِيهَا ﴾ واتە: بەردەوامن لەسەر بێ بڕوایی‌و دووڕوویی.

هـەر کاتێـک کۆسـپو تەگەرەیەک بێتـە ڕێگایـان، کوێر دەبن‌و سـەریان شـۆڕ دەکەن، وە کوفـرو دووڕوویـان زیاتـر دەبێـت، ئەمانـە لە شـێوەدا وەک دەسـتەی دووەمـن، بەڵام لـە حەقیقەتـدا پێچەوانەی ئەوانـن، چونکە دەسـتەی دووەم وازیان لە کوشـتاری بـڕواداران هێنـا وەک شـکۆو ڕێزێـک بۆیـان، نـەک لـە بـەر تـرس لە نەفسـی خۆیـان، بـەڵام ئەم دەسـتەیە وازیـان هێنـا لـە ترسـاندا نـەک لەبـەر ڕێـز، بەڵکـو ئەگـەر هەلێکیـان بـۆ هاتە پێـش بۆ کوشـتاری بـڕواداران، ئـەوە ئامـادەن، چونکـە هەلپەرسـتن، ئەمانە ئەگـەر ڕوون نەبێتـەوەو بـە تەواوەتـی ئاشـکرا نەبێـت وازهێنانیـان لە بـڕواداران لە شـەڕ کـردن دژیان، ئـەوە شـەڕیان لـە دژ دەکرێـت، وەک خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ فَإِن لَّمْ يَعْتَزِلُوكُمْ وَيُلْقُوٓاْ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَمَ ﴾ واتـە: وازهێنـان لـە ئاشـتی ﴿ وَيَكُفُّوٓاْ أَيْدِيَهُمْ فَخُذُوهُمْ وَٱقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ وَأُوْلَٰٓئِكُمْ جَعَلْنَا لَكُمْ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنًا مُّبِينًا ﴾ واتـە: بەڵگەیەکی ڕوون‌و ئاشـکرایە، لەبـەر ئـەوە دەسـتدرێژکارو سـتەمکار بـوون بەرانبەرتـان‌و وازیـان لـە ئاشـتی هێنابـوو، با لۆمـەی کـەس نەکـەن تەنها نەفسـی خۆیـان نەبێت.

وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلَّا خَطَـًٔا وَمَن قَتَلَ
مُؤْمِنًا خَطَـًٔا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ
إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَصَّدَّقُوا۟ فَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ عَدُوٍّ
لَّكُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَإِن كَانَ
مِن قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَـٰقٌ فَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ
أَهْلِهِۦ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ
شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ تَوْبَةً مِّنَ ٱللَّهِ وَكَانَ ٱللَّهُ
عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٩٢﴾ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا
فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَـٰلِدًا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ
وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمًا ﴿٩٣﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُوٓا۟ إِذَا ضَرَبْتُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُوا۟ وَلَا تَقُولُوا۟
لِمَنْ أَلْقَىٰٓ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَـٰمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا تَبْتَغُونَ
عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فَعِندَ ٱللَّهِ مَغَانِمُ كَثِيرَةٌ
كَذَٰلِكَ كُنتُم مِّن قَبْلُ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ
فَتَبَيَّنُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿٩٤﴾

(٩٢): ﴿ وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلَّا خَطَـًٔا وَمَن قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَـًٔا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَصَّدَّقُوا۟ فَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ عَدُوٍّ لَّكُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَإِن كَانَ مِن قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَـٰقٌ فَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ تَوْبَةً مِّنَ ٱللَّهِ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٩٢﴾ ﴾: ئەمە شـێوەیەکە لە شـێوەکانی خۆ گرتنەوە، واتـە: ئەسـتەمە بڕوادارێـک بڕوادارێکی تر بکوژێت بە ئەنقەسـت، چونکـە پێچەوانەی ئیمانــە بــە ئەوپەڕی پێچەوانە کردن، تاوانی کوشــتن تەنها لە کەســی بێبڕوا یــان تاوانبارێک کــە ئیمانــی لاواز بێــت لاوازیەکی زۆر گــەورە، وە لێی دەترسـێت تاوانی لــەوە گەورەتری لــێ بوەشـێتەوە. چونکــە ئیمانی ڕاسـتەقینە ڕێگری دەکات لــە بڕوادار لە کوشــتنی براکەی، کــە خــوا ﷻ کردوونــی بە بــرای ئیمانی، کە پێویســتە یەکتریــان خۆش بوێت‌و پشــتیوانی یەکتــر بکــەن، وەلابردنی هەمــوو نارەحەتی‌و ناخۆشــیەک لەســەر براکــەی، دەی چی لەوە نارەحەتترو قورســترە، لە کوشــتنی؟ پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمــوێ: {لاَ تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّاراً يَـضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَـابَ بَعْضٍ} (أخرجه البخـاري برقم: (١٢١)، ومسـلم برقم: (٦٥)).

واتــە: لــە پاش مــن مەگەڕێنــەوە بــۆ بێبڕوایــی، هەندێکتــان دەدەن لــە گەردنــی هەندێکی ترتــان)، زانــراوە کوشــتن لــە کوفــری کرداریــە، وە گەورەتریــن تاوانە لە پــاش هاوبەش دانــان بۆ خوا، وە کاتێــک خوا ﷻ دەفەرمــوێ: ﴿ وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا ﴾. (کوشــتنی ئیماندار) زاراوەیەکی گشــتگیرە بــۆ هەموو بارودۆخەکان، وە بە هیچ شــێوەیەک نابــێ کەسـێک براکــەی خــۆی بکــوژێ بە هــەر بیانویــەک بێ، بــەڵام خوا ﷻ کوشــتنی بــە هەڵــەی جیاکردۆتــەوە وەک دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا خَطَـًٔا ﴾ بە ڕاسـتی ئەو هەڵــەکارەی کە

مەبەستی کوشتن نەبووە تاوانبار نابێت، وە دەستدرێژیی نەکردۆتە سەر قەدەغەکراوەکانی خوا، بەڵام کاتێک کە کردارێکی ناشرین ئەنجام دەدات وێنای کردارەکە بەسە بۆ ناشرین بوونی، ئەگەر مەبەستیشی ئەوە نەبێ، خوا ﷻ فەرمانی کردووە بە کەفارەت و خوێن بایی، دەفەرموێ: ﴿وَمَن قَتَلَ مُؤۡمِنًا خَطَـًٔا﴾ یەکسانە ئەگەر بکوژ پیاو بێت یان ئافرەت، ئازاد بێ یان کۆیلە، مندال بێ یان گەورە، عاقل بێ یان شێت، موسولمان بێ یان کافر، وەک چۆن وشەی (مَنْ) ئاماژەیە بۆ گشتی، ئەمەش لە نهێنیەکانی هێنانە بە ووشەی (مَنْ) لەم شوێنەدا، بەڕاستی لە شێوەی ڕستەکەدا وا پێویست بوو کە بڵێت (فإن قتله) واتە: بە ڕاستی کوشتنی، بەڵام ئەمە دەستەواژەیەکە مانای (مَنْ) نادات. وە بە هەمان شێوە یەکسانە ئەگەر کوژراو نێر بێت یان مێ، مندال بێت یان گەورە، وەک چۆن دەرخستنی نەناسراو لەمیانەی مەرجدا (شرط) ئەو مانا دەدات، بە ڕاستی لەسەر بکوژ پێویستە ﴿فَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ﴾ ئازاد کردنی کۆیلەیەک کەفارەتە بۆ ئەوە، دەبێ لە سەروەت و سامانی خۆی بێ، ئەمەیش کۆیلەی گەورەو بچووک و نێرو مێ و ساغ و نەخۆش دەگرێتەوە لەسەر بۆچوونی هەندێ لە زانایان. بەڵام حیکمەت وا پێویست دەکات ئەو کۆیلەی کە لە بری کەفارەتەکەدا ئازاد دەکرێ عەیبدار نەبێ، چونکە مەبەست لە ئازادکردنی کۆیلە سوودو قازانج گەیاندنە بە ئازادکراوە، لەبەر ئەوەی خاوەنەکەی سوودو قازانجی هەیە بۆی، ئەگەر ئەو سوودو قازانجە بە هۆی ئازادکردنیەوە لە دەست بدات، دیارە مانەوەی لە کۆیلایەتیدا بۆ ئەو باشترە، بۆیە لەم حاڵەتەدا دروست نیە ئازاد بکرێت، لەگەڵ ئەوەدا کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ﴾ بەڵگەیە لەسەر ئەوە، بە ڕاستی ئازاد کردن بریتیە لە کورتکردنەوەی ئەو سوودو قازانجانەی کە بۆ جگە لە خۆیەتی دەبێت بۆ خۆی بێ، بەڵام ئەگەر کۆیلە هیچ قازانجێکی نەبوو وا نابینرێ پێویست بە ئازادکردنی بکات. بەڵام خوێن بایی: ئەوە پێویستە لەسەر تیرەو هۆزی بکوژی بەهەڵە، وە هاوشێوەو نیمچە ئەنقەست.

﴿مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦٓ﴾ بۆ دڵدانەوەیان، مەبەست لە (أهل) کەس و کارو میراتگرانیەتی، چونکە میراتی بۆ میراتگرانە، خوێن بایش لە چوارچێوەی ئەو ماڵە بەجێماوەیە، وە خوێن بایی بابەتێکی دوورو درێژە لە کتێبەکانی فقهیدا باس کراوە.

وە کە دەفەرموێ: ﴿إِلَّآ أَن يَصَّدَّقُواْۚ﴾ واتە: مەگەر میراتگرانی کوژراوەکە لە خوێن باییەکەی خۆش بن، ئەوجا لەسەری لا دەچێت، ئەوەش هاندانە بۆ لێبوردن، چونکە

خـوا نـاوی ناوە(صدقـە) واتـە: چاکـە، وە چاکـەش لـە هەمـوو کاتێکـدا گرنگە ﴿ فَإِن كَانَ ﴾ ئەگـەر کـوژراو ﴿ مِن قَوۡمٍ عَدُوٍّ لَّكُمۡ ﴾ واتـە: لـە بێبـڕوا شـەڕکەرەکان بێـت ﴿ وَهُوَ مُؤۡمِنٌ فَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤۡمِنَةٍ ﴾ واتـە: لەسـەرتان پێویسـت نیـە خوێـن بایی بـدەن بـە بنەماڵەکـەی، لەبـەر ئـەوە ڕێز لـە خوێـنو ماڵی خۆیـان ناگرن.

﴿ وَإِن كَانَ ﴾ وە ئەگـەر کوژراوەکـە ﴿ مِن قَوۡمِۭ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُم مِّيثَٰقٞ فَدِيَةٞ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦ وَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ مُّؤۡمِنَةٖ ﴾ ئەویـش لەبـەر ڕێـزی کـەسو کارەکـەی لەسـەر ئـەو بەڵێـنو پەیمانـەی کە لـە نێوانیانـدا هەیـە ﴿ فَمَن لَّمۡ يَجِدۡ ﴾ کۆیلـە یان نرخەکـەی، ئەگـەر نەیتوانیو بـاری دارایی سـەختو دژوار بوو، دەسـتکەوتی بەشـی پێویسـتیە بنەڕەتیەکانـی نەدەکـرد ﴿ فَصِيَامُ شَهۡرَيۡنِ مُتَتَابِعَيۡنِ ﴾ واتـە: بەبێ بیانـوو لـە نێوانـی ڕۆژەکانـدا ڕۆژ ناشـکێنێ، واتـە: (دوو مانـگ لەسـەر یـەک بـەڕۆژوو دەبێـت وەک مانگـی ڕەمـەزان) ئەگـەر بـە هـۆی بیانوویەکـەوە ڕۆژووی نەگـرت، ئەوە بیانووەکـە کاریگـەری لەسـەر بەردەوامـی ڕۆژووەکـە نـاکات، وەک نەخۆشـی، سـوڕی مانگانـەو هاوەشـێوەی ئەمانـە، وە پێویسـتە لەسـەری دەسـت بکاتـەوە بـە ڕۆژوو گرتـن.

﴿ تَوۡبَةٗ مِّنَ ٱللَّهِ ﴾ واتـە: ئـەم کەفارەتـەی کە خـوا ﷻ پێویسـتی کردوە لەسـەر بکوژ، تەوبـەو لێبوردنێکـە لـە لایەن خواوە بـۆ بەندەکانـیو ڕەحمەتێکە بۆیان، وە سـڕینەوەی ئەو کارەیـە کـە ئەنجامیـان داوە، لـە کـەمو کوڕیـی، پارێزگاری نەکـردن، وەک چـۆن حاڵی زۆربـەی بکوژانـی بـە هەڵەیە.

﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴾ واتـە: خـاوەن تەواوی زانسـتو تـەواوی حیکمەتە، لێـی ناشـاردرێتەوە بـە ئەنـدازەی گەردیلەیـەک لـە ئاسـمانەکانو لـە زەوی، وە لـەوەش بچووکتـرو لـەوەش گەورەتـر، لـە هـەر کاتێکـدا بێـت، وە هیچ شـتێک لە دروسـتکراوو شـەریعەتەکان لـە حیکمەتـی خـوا بەدەر نیـە، بەڵکـو ئەوەی کە دروسـتی کردوەو یاسـای بـۆ دارشـتووە، هەمـوو ئەمانـە دەچنـە چوارچێـوەی حیکمەتـی خـوای گـەورەوە، وە لـە زانسـتو حیکمەتـی خـوا ئەوەیە کە لەسـەر بکوژ پێویسـت بـکات، کەفارەتێکـی گونجاو لەسـەر ئـەو کارەی ئەنجامـی داوە، چونکـە ئەو بووەتـە هۆی لـە نێوچوونی نەفسـێکی ڕێز لێگیـراو، وە لـە بوونـەوە دەریهێنـاوە بـۆ نەبـوون، بۆیـە گونجـاوە کـە کۆیلەیـەک ئازاد بـکات، وە دەریبهێنێـت لـە بەندایەتـی بەنـدەوە بـۆ ئـازادی ڕەهاو تـەواو، ئەگـەر نەیتوانی بەندەیـەک ئـازاد بـکات، دوو مانـگ بـە دوای یەکدا بـە ڕۆژوو دەبێت، نەفـسو دەروونی

لـە کۆیلایەتـی حەزو ئـارەزوو دەردێنێـت بـۆ لای بەندایەتی خوای گـەورە، بـە واز هێنان لـە تـاوانو سـەرپێچی لەبـەر ئەوە لـە خوا نزیـک ببێتـەوە. خوا ﷻ ئـەو کاتـە نارەحەتو درێـژو دوورەی دیـاری کـردوە، لـە ژمـارەو بـە دوای یەکتـردا، وە ڕێگەی نـەداوە بخواو بخواتـەوە، لەبـەر ئـەوە نەگونجاوە، بـە پێچەوانـەی (الظهـار) وەک چۆن لـە داهاتوویەکی نزیکـدا باسـی لێـوە دەکەیـن، ئەگـەر خـوا ویسـتی لەسـەر بێـت. وە لـە حیکمەتەکانی بۆ بکـوژ خوێـن بایی پێویسـت کـردوە، ئەگەر چی هەڵەیشـە، لەبەر ئەوە سـەر زەنشـت بێت، وە بپارێزرێـت لـە زۆرێک لە کوشـتن بـە بەکارهێنانی هـۆکاری پارێزراو لـەوە. یەکێکی تـر لـە حیکمەتەکانـی خـوا ﷻ ئەوەیـە کـە خوێـن بایی پێویسـت کـردوە لەسـەر تیرو هـۆزی بکـوژی بـە هەڵـە بە یـەک دەنگی زانایـان، چونکـە بکـوژ گوناهبار نیـە هەتا ئەو خوێـن بایـی قورسـە بکەوێتە ئەسـتۆیو بیـدات، وا گونجاوە ئەوەی هەڵدەسـتێ بـەو کارە، لـە نێـوان هـەردوولادا هـاوکاریو سەرخسـتن هەبێـت، وە یارمەتیدانـی یەکتـر لەسـەر بە دەسـتهێنانی بەرژەوەندیـەکانو دوور خسـتنەوەی زیانەکان، (وە ڕەنگـە هۆکارێکی تر ئەوە بێـت کـە هۆزەکـەی ڕێگری ئـەوەی لێ دەکەن کـە بکوژرێـت)، وە ئەگەر بە پێـی توانلو تاقەتیـان خوێـن بابیە کە دابـەش بکرێت بەسـەریاندا بە دڵنیایی لەسـەریان سـووک دەبێت، بـە تایبـەت لە ماوەی سـێ سـاڵدا بێـت. وە یەکێکـی تر لـە حیکمەتەکانی خـوا ئەوەیە دڵی خاوەنـی بکـوژی داوەتـەوە بە خوێن بایی کە پێویسـتی کردوە لەسـەر بنەماڵـەی بکوژەکە.

(٩٣): ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدًا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمًا ﴿٩٣﴾ ﴾:

خـوا ﷻ لێـرەدا ڕایگەیانـدوە کـە ئیمانـدار دەسـتی ناچێتـە خوێنـی ئیماندار، وە کوشـتنی ئیمانـدار دەچێتـە چـوار چێـوەی (الكفـر العمـلي) کوفـری کرداریـەوە، وە لێـردا بـاس لە هەڕەشـەیەکی زۆر ترسـناک دەکات بـۆ بکـوژی ئەنقەسـت، دڵ دەخاتـە لەرزینـەوەو دەیتۆقێنێـت، وە کەسـانی عاقـڵو ژیـر دەوروژێنێـت. لـە جـۆری تاوانـە گـەورەکان (هەژمـاری کـردووەو) هیـچ تاوانێک ئەوەندی کوشـتن هەڕەشـەی زۆر توندی لەسـەر نیە، بەڵکـو سـزایەک نیـە هاوشێوەیەشـی بێـت، تەنها ئـەوە نەبێت کە هـەواڵ دراوە سـزاکەی دۆزەخـە، واتە: ئـەم تاوانـە گەورەیە خاوەنەکـەی شایسـتەی ئەوەیە کە بخرێتـە دۆزەخەوە کـە سـزایەکی بـە ئێـشو سـەختی تێدایە، وە لـە دەسـتدانی سـەرکەوتنو سـەرفرازی، وە سەرشـۆڕیو تووڕەیـی خوا، وە بەدەسـت هێنانی بێ ئومێـدیو زەرەرمەندی، پەنـا بە خوا لە

هــەر هۆکارێــک کە ببێتــە مایــەی دوورکەوتنەوە لــە ڕەحمەتی خــوا، ئەم هەڕەشــە کردنە هەمــان حوکمــی هەڕەشــەکانی تری هەیە، لە ســەر هەنــدێ تاوانــی گەورەو ســەرپێچی، بە هەمیشــەیی لــە نێــو دۆزەخدا، یان بێ بەشــبوونی لــە بەهەشــت. زانایان بۆچوونــی جیاوازیان هەیــە لــە لێکدانــەوەی ئــەم دەقەدا، لەگــەڵ ئــەوەدا یەکدەنگن لەســەر بە تاڵ کردنــەوەو بێ بنەمایــی بۆچوونــی خەواریــجو موعتەزیلەکان، کــە ئەوان پێیــان وایە بکوژی ئەنقەســت بۆ هەتــا هەتایــە لــە دۆزەخــدا دەمێنێتــەوە، ئەگەرچــی یەکتاپەرســتیش بێت، بــەڵام بۆچوونی تــەواو لــە لێکدانــەوەی دەقەکەدا ئەوەیە کە پێشــەوا ئیبــو قەیمی جــەوزی (ڕەحمەتی خوای لێبــێ) لــە کتێبی (المــدارج)دا دوای ئەوەی بۆچوونی زانایــان دەخاتــە ڕوو، وە پاش تانەدان لــە بۆچوونەکانیان لــەم بابەتەدا.

دەڵــێ: هەندێکیــان دەڵێــن: ئەم دەقانــەو هاوشــێوەکانیو ئەوەی تیایدا باســکراوە لە پێویســت بوونــی ســزا، هەنــدێ دەڵێــن: ئــەم دەقانــەو هاوشــێوەکانیان کــە خــوازەری زمانەوانــی تێــدا باســکراوە بــۆ ســزا، مەرج نیــە لەگەڵ بوونــی ئەو خــوازەری حوکمــەدا حوکمەکــە بێتە دی، چونکــە بێگومان حوکــم کاتێک بە هۆی خوازەرەکەیــەوە دێتە بوون، ئەگــەر ڕێگری نەبێت، ئامانجــی ئــەم دەقانــە ئەوەیە لێــرەدا کــە ڕایگەیەنێت ئــەو کارە هۆی ســزاو لــێ پێچینەوەیەو ســزا بــە دوای خۆیدا دێنــێ، بەڵگەکان ئــەوە دەردەخەن لە باســکردنی ڕێگریەکانــی مانەوەی بکــوژ لــە دۆزەخــدا بۆ هەتــا هەتایــی، هەندێکیــان بە یــەک دەنگــی زانایــان، وە هەندێکیان بــە دەق، تەوبــەو داوای لێخۆشــبوون بــە یەک دەنگــی دەبێتە بەربەســت، وە یەکتاپەرســتیش بــە دەقــە یەک لــە دوای یەکــەکان دەبێــت بە بەربەســت، بە هەمان شــێوە چاکە گــەورەکان دەیســڕنەوەو دەبنــە بەربەســت، وە بەڵاو موســیبەتە گــەورەکان دەبنە کەفارەتو بەربەســت، وە جێبەجێکردنــی ســزاکان (الحــدود) لــە دنیــادا بە بەڵگــەی دەق دەبنــە بەربەســت، وە هیچ ڕێگــە چارەیــەک نیــە بۆ لە کارخســتنی ئەم دەقانــە کەواتە دەبێ بە گشــتی کار بــە دەقەکان بکەیــن، لــە هــەردوو ڕووەوە، وە لێــرەدا هاوســەنگی دروســت دەبێت لــە نێــوان چاکەکانو خراپەکاندا، ئەمیش بە پێی پێویســت بوونی ســزاو بەربەســت، وە کارکردن بە پەســندترینیان.

دەڵێــن: لەســەر ئەمــە بەرژەوەندیەکانی هەردوو دنیــاو زەرەرو زیانەکانی بنیــات دەنرێت، وە لەســەر ئەمە حوکمە شــەرعیەکانیش بنیات دەنــرێ، وە فەرمانی قــەدەری، ئەویش حیکمەتی خــوای گەورەیــە لە بوونــەوەردا، وە خــوا ﷻ بــەو حیکمەتانەی هــۆکارو بوون بــە هۆکار گــرێ دەدات بــە فەرمانی خۆی.

بێگومـان خـوا ﷻ بـۆ هەموو دژێـک دژیەکێکی دروسـت کـردوە، بۆ ئـەوەی بەرپەرچی بداتـەوەو بەرگـری بـکات، وە لـە دوایدا دەسـەڵات بـۆ ئەوەیـان دەبێت کە سـەرکەوتوو دەبێـت. هێـز پێویسـتە بـۆ لـەش سـاغی، وە خوڕەوشـتی خـراپ بەربەسـتە لـە کـرداری سروشـتیو کاری هێـز، وە حوکـم بـۆ بەهێزترینیـان دەبێـت، بـە هەمـان شـێوە هێـزی چارەسـەرو نەخۆشـی، وە ئەگەر بەندە لەو نێوانی لەش سـاغیو نەخۆشـیەدا بێت، سـەرەنجام دانەیەکیـان سـەردەکەوێت بەسـەر ئـەوی تریاندا، ئەگەر هـەر کامەیان پێش کـەوتو زاڵ بـوو بەسـەر ئەوی تـردا، ئـەوە بێگومـان کاریگەری ئـەو زیاتـر دەبێت.

وە لێـرەدا خەڵک دەبێ بە دوو بەشـەوە، بەشـێکیان بۆ بەهەشـتو بەشـێکیان بـۆ دۆزەخ، وە بـە پێچەوانەشـەوە، وە ئـەوەی دەچێتـە دۆزەخـەزە پاشـان لێی دەردەچـێ، مانـەوەی بە پێی پێویسـت دەبـێ، وە هەر کەسـێک خـاوەن بینایيەکی تـەواو بێ هەمـوو ئەوانـە دەبینێ کە خـوا ﷻ لـە کتێبەکـەی باسـی کردوە، لـە بـاسو خواسـەکانی ڕۆژی دوایـی، هەتا وەک ئـەوە وایـە کـە بـە چـاوی خـۆی دەیبینـێ. وە دەزانرێت ئەمـە تەنها بـە ویسـتی خوایە لە تایبەتمەندیەکانـی، پەروەردگارێتـیو عیـزەتو حیکمەتـی ئـەوە، وە بە ڕاسـتی پێچەوانەی ئـەوە ئەسـتەمە، وە دانە پاڵی شـتێک کە شایسـتەی ئـەو نیە، ئـەوە دەگەیەنێـت کە کورت بیـر کردنەوەیـەک لـەو تێگەیشـتنەدا هەبێت. بە ڕاسـتی ئەمە ئـەو ئیمانەیە کـە خراپەکان دەسـوتێنێت، وەک چـۆن ئاگـر دار دەسـوتێنێت، وە هـەر کەسـێک خـاوەن ئـەم پلە بێت ئەسـتەمە بـەردەوام بێت لەسـەر تاوانکاری، ئەگەر چـی تاوانیش زۆر بـکات، چونکە ئەوەی لـە گەڵیدایـە لـە نووری ئیمـان هەمـوو کات فەرمانـی پێدەکات بـە تەوبـەو داوای لێخۆش بـوون، ئەمە خۆشەویسـترین دروسـتکراوە لەلایەن خـوا[١٧] لێـرەدا قسـەکانی کۆتایی هات (قـدس اللـه روحـه، وجـزاه عن الإسـلام والمسـلمين خيرا).

(٩٤): ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا ضَرَبْتُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُواْ وَلَا تَقُولُواْ لِمَنْ أَلْقَىٰٓ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَـٰمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا تَبْتَغُونَ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فَعِندَ ٱللَّهِ مَغَانِمُ كَثِيرَةٌ كَذَٰلِكَ كُنتُم مِّن قَبْلُ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ فَتَبَيَّنُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿٩٤﴾ ﴾

خـوا ﷻ فەرمـان بـە بەنـدە بڕوادارەکانـی دەکات، ئەگـەر دەرچـوون بۆ جیهاد کـردن لە پێنـاوی خـواداو بە دەسـتهێنانی ڕەزامەنـدی خوا، ئەوە با هەمـوو شـتێک ڕوون بکەنەوە، وە

١٧) مدارج السالكين.

پابەنـد بن لەسـەر هەموو کارە گومـان لێکراوەکان، چونکـە کارەکان دوو جـۆرن: ڕوونو نـاڕوون، ئـەوەی کـە ڕوونو ئاشـکرایە پێویسـت بـە شـیکردنەوە نـاکات، چونکـە ئـەوە کۆکردنـەوەی ئەنجامـە. بـەڵام ئـەو کارانـەی کە ئاڵـۆزو ناڕوونن، ئـەوە مرۆڤ پێویسـتی بـە جێگیـر بوونو سـاغکردنەوەو ڕوون کردنـەوە هەیە، لەبەر ئـەوە بزانێت ئایـە ڕووی تێ بـکات یـان نەیکات؟ بەڕاسـتی ڕامان لـەم کارانەدا سـوودو قازانجی زۆری هەیـە، وە دەبێتە مایـەی دوورخسـتنەوە لـە زۆرێـک لـە خراپەکاریەکان، تـا بەوە ئایـنو عەقڵو بـە هێزی مرۆڤـی مسـوڵمان دەردەکـەوێ، بـە پێچەوانـەی پەلـە کـردن لـە کارەکاندا پێـش ئەوەی حوکمەکـەی ڕوون ببێتـەوە، چونکـە ئەوە پەلکێشـی دەکات بـۆ لای ئەوەی کە پێویسـت نیـە، وەک چـۆن لەوانـەدا ڕوویدا کـە خوا سەرزەنشـتی کردن، لەسـەر ئەوەی کـە جێگیر نەبـوونو هەر کەسـێک سـڵاوی لێدەکردن دەیان کوشـتو مـاڵو سـەروەتەکەیان دەبرد، گومانـی ئەوەیـان دەبـرد کـە ئەوە بەسـە بۆ کوشـتنیان، بـەڵام لە هەمـان کاتدا ئـەوە هەڵە بـوو، لەبـەر ئەمە خوا ﷻ سەرزەنشـتی کردن بە ئایەتـی: ﴿ وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَنْ أَلْقَىٰٓ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَـٰمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا تَبْتَغُونَ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فَعِندَ ٱللَّهِ مَغَانِمُ كَثِيرَةٌ ﴾ واتـە: بـا ئـەم دونیـا کاتیـە واتـان لـێ نـەکات تاوانێـک ئەنجـام بـدەن بـەو هۆیـەوە، لە پاداشـتی دوارۆژ بەشـتان نەبێـت، بە ڕاسـتی ئـەوەی لای خوایـە دەمێنێتـەوەو چاکترە. ئەم دەقـە ئاماژەیـە بـۆ ئـەوەی ئەگەر کەسـێک حەزو ئـارەزووی بۆ شـتێک جولاّ، کـە بەرەو تـاوانو سـەرپێچی بیبـات، ئـەوا پێویسـتە قەدەغـەی دەروونـی بـکات، بـە بیـر هێنانەوەو ڕەزامەنـدیو خۆشەویسـتی خـوا، چونکـە ئـەوە هانـی دەروون دەدات بـۆ جێبەجێکردنـی فەرمانـی خوای گـەورە، ئەگـەر نارەحەتیـش بێت لەسـەر دەروونی.

پاشـان خـوای بـەرز باسـی حاڵیـان دەکات لە پێـش ئیسـلام: ﴿ كَذَٰلِكَ كُنتُم مِّن قَبْلُ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ ﴾ واتـە: چـۆن هیدایەتـی ئێوەیـدا کاتێک کە گومـڕا بوون، بـە هەمـان شـێوە هیدایەتـی کەسـانێکی تریش دەدات لـە پاش ئێـوە، وە هـەر وەک چۆن ڕێنمایـی لـە ئێـوەدا قۆنـاغ بـە قۆنـاغ دروسـت بوو، بـە هەمان شـێوە بـۆ جگە لـە ئێوەش هـەر وا دەبـێ. تەماشـا کردنی کەسـێک لەسـەر ئـەوەی کە پێشـتر چۆن بووە لـە عەیبو ناتـەواوی، وە مامەڵـە کـردن لەگەڵیـدا بـە حیکمـەتو ئامۆژگاری جـوان لـە گەورەترین هۆکارەکانـی سـوودی خۆی کەسـی بەرانبەرە، بۆیـە جارێکی تـر خوا فەرمانەکـە دووبارە دەکاتـەوە: ﴿ فَتَبَيَّنُوٓا۟ ﴾ ئەگـەر کەسـێک دەربچێـت بـۆ جیهاد کـردن لە پێنـاوی خوادا

دژ بــە دوژمنانــی خوا، وە خــۆی ئامادە بکات بــە هەموو جــۆرە ئامادەکاریەکــەوە، فەرمانی پێکــراوە کــە هەر کەســێک ســلاّوی لــێ دەکات، هەمــوو شــتێک ڕوون بکاتــەوە، لێرەدا بەڵگەکــە بەهێــزە کە لە ترســی کوشــتن، یان نەفســیدا ســلاّوی کردبێــت، بە ڕاســتی ئەوە پێویســتی بــە ڕوونکردنــەوەو جێگیــر بــوون دەکاتەوە، لــە هەمــوو کاتێکدا کــە دەکەوێتە نــاو جۆرێــک لــە گومانــەوە، مــرۆڤ جێگیــری دەکات هەتــا کارەکــەی تەواو بــۆ ڕوون دەبێتــەوەو ئەوەی کە ڕاســتو گونجاوە ئــەوە دەکات. ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا ﴾ پاداشــتی هەمــوو ئەو کەســانە دەداتــەوە بە پێــی کــردوەو نیەتەکانیان.

لَا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ وَالْمُجَاهِدُونَ
فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ بِأَمْوَالِهِمْ
وَأَنفُسِهِمْ عَلَى الْقَاعِدِينَ دَرَجَةً وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَىٰ وَفَضَّلَ اللَّهُ
الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ٩٥ دَرَجَاتٍ مِّنْهُ وَمَغْفِرَةً
وَرَحْمَةً وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ٩٦ إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ
ظَالِمِي أَنفُسِهِمْ قَالُوا فِيمَ كُنتُمْ قَالُوا كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الْأَرْضِ
قَالُوا أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُوا فِيهَا فَأُولَٰئِكَ مَأْوَاهُمْ
جَهَنَّمُ وَسَاءَتْ مَصِيرًا ٩٧ إِلَّا الْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ
وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ لَا يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلَا يَهْتَدُونَ سَبِيلًا ٩٨
فَأُولَٰئِكَ عَسَى اللَّهُ أَن يَعْفُوَ عَنْهُمْ وَكَانَ اللَّهُ عَفُوًّا غَفُورًا ٩٩ وَمَن
يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ يَجِدْ فِي الْأَرْضِ مُرَاغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً وَمَن
يَخْرُجْ مِن بَيْتِهِ مُهَاجِرًا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ يُدْرِكْهُ الْمَوْتُ فَقَدْ
وَقَعَ أَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ١٠٠ وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي
الْأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا مِنَ الصَّلَاةِ إِنْ خِفْتُمْ
أَن يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنَّ الْكَافِرِينَ كَانُوا لَكُمْ عَدُوًّا مُّبِينًا ١٠١

**(٩٥-٩٦):** ﴿لَّا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ۚ فَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ عَلَى الْقَاعِدِينَ دَرَجَةً ۚ وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَىٰ ۚ وَفَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٩٥﴾ دَرَجَاتٍ مِّنْهُ وَمَغْفِرَةً وَرَحْمَةً ۚ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٩٦﴾﴾.

واتــە: یەکســان نین ئەوانــەی لە بــڕواداران بــە نەفسو ماڵو ســامانیان لە پێنــاوی خوادا جیهادو تێکۆشــان دەکەن، لەگەڵ کەســێکدا دەرنەچــووە بۆ جیهــادو تێکۆشــان کردنو دژ بــە دوژمنانــی خــوا نەجەنگــاوە، ئــەم دەقــە هانی بــڕواداران دەدات بــۆ دەرچوون بــۆ تێکۆشــانو هانــدان لەســەر ئــەو کارە پیــرۆزە، وە دەیانترســێنێت لــە تەنبەڵــیو دانیشــتن لــە کاتی جەنــگو جیهاد کــردن بە بێ بیانــوو. بــەڵام خــاوەن پاســاوەکان، وەک: نەخــۆشو کوێرو شــەل، وە ئەو کەســەی هیچی نیــە بــۆ ئامادەکــردن، بە ڕاســتی ئەوانــە وەک ئەوانە نیــن کە بەبــێ بیانوو دانیشــتوون، هەر کەسـێک لــە خاوەن بیانــووەکان ڕازی بێت بە دانیشــتنو نیــازو نیەتی دەرچوونــی نەبێت لە پێنــاوی خــوادا جیهــادو تێکۆشــان بکات، وە ئەگەر بەربەســت لــە بەردەمیدا نەدەبــوو، هانی خــۆی نەدەدا لەســەر جیهادو تێکۆشــان کــردن، ئەوە هەمان پلــەو پایەی ئەو کەســەی هەیە کــە دانیشــتووە بەبــێ بیانوو. وە هــەر یەکێک لە خــاوەن بیانــووەکان نیەتی ئــەوەی هەبێت لــە پێنــاوی خــوادا دربچێت بــۆ جیهاد کــردن، ئەگەر لەبــەر بەربەســتێک نەبووایــە، ئاواتی ئــەوەی دەخواســت، لــە ناخــی خۆیدا باســی دەکــرد، ئــەوە وەک ئەو کەســە وایە لــە پێناو خــوادا دەرچــوو بێــت بۆ جیهادو تێکۆشــان، چونکە نیەتی پاک ئەگەر کەســەکە لــە توانایدا نەبــوو ئەنجامــی بــدات لە گوفتــار یان لە کــردار ئەوە خاوەنەکــەی پلەی بکەرەکــەی هەیە. پاشــان خــوا ﷻ بــە ڕوونی بــاس لە فــەزڵو چاکــەی تێکۆشــەران دەکات بەســەر ئەوانەی کــە دانیشــتوون بــە پلــە، واتە: بــەرزی، ئەمــە فەزڵە بــە کورتی، پاشــان خوا ﷻ بــە درێژی

ڕوونـی دەکاتەوەو پەیمانی لێخۆشـبوونو میهرەبانیان پێدەدات لە لایـەن پەروەردگاریانەوە، وە ڕەحمــەتو بەزەیـی خـۆی دەبارێنی بەسـەریاندا کە هەمـوو خێرێک لە خـۆ دەگرێتو هەمـوو خراپەیەکـی لێ بـە دوور دەکات، وە ئەو پلـەو پایانەی کە پێغەمبـەر ﷺ بە درێژی باسـی کردوە، لە فەرمـوودەی جێگیردا هاتوە فەرموویەتـی: {إِنَّ فِي الْجَنَّـةِ مِائَةَ دَرَجَـةٍ أَعَدَّهَا اللَّـهُ لِلْمُجَاهِدِيـنَ فِي سَـبِيلِهِ، كُلُّ دَرَجَتَـيْنِ مَـا بَيْنَهُمَا كَمَا بَيْنَ السَّـمَاءِ وَالأَرْضِ} (أَخْرَجَـهُ أَحْمَد برقم: (٨٤٥٥)، وَالبُخَـارِيُّ برقـم: (٢٦٣٧)، وَابْـنُ حِبَّانَ برقم: (٤٦١١) عَـن أَبِي هُرَيْرَةَ).

واتــە: بێگومــان لــە بەهەشــت ســەد پلە هەیــە، خوا بـۆ تێکۆشـەرانی ڕێـی خـۆی دایناون، نێوانـی هــەردوو پلەیەک وەک نێوانی ئاســمانو زەوی وایە، (واتە: نێــوان هەر دوو پلەیەک بــە قــەدەری ئاســمانو زەوی لێک دوورن، ســەد پلــەی ئاوا بۆ کەســانێکە کە لــە ڕێی خوادا فیداکاریـی دەکەنو سـەرو ماڵـی خۆیان دەبەخشــن لە بەهەشــتدا هەیە).

وە ئــەم پاداشــتەی کــە خوا ﷻ ڕێکی خســتووە لەســەر جیهادو تێکۆشــان، هاوتــای ئەوەیە کــە لــە ســوورەتی (الصــف)دا هاتووە لــەو ئایەتەی کــە دەفەرمــوێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ هَلۡ أَدُلُّكُمۡ عَلَىٰ تِجَٰرَةٖ تُنجِيكُم مِّنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ ١٠ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ١١ يَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡ وَيُدۡخِلۡكُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةٗ فِي جَنَّٰتِ عَدۡنٖۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ١٢﴾ الصـف

تەماشـای ئەم گواسـتنەوە جوانە بکە، لە ئاسـتێکەوە بۆ ئاسـتێکی بەرزتر، بەڕاسـتی جیاوازی لــە نێوان تێکۆشــەران جگــە لە ئەوان دەکات، پاشــان بە ڕاشــکاوی باس لە فــەزڵو چاکەی تێکۆشــەر دەکات بەســەر دانیشــتووەوە بــە پلەو پایــە، پاشــان دەیگوازێتەوە بــۆ چاکەکانی بــە لێبــوردنو ڕەحمــەتو چەندین پلــەو پایەی بــەرزو بڵند. ئەم گواســتنەوە لــە حاڵەتێکەوە بــۆ بەرزتر ئــەوە دەســەلمێنێت فەزڵو پیاهەڵدان دەســەلمێنێت، یــان دابەزین لــە حاڵەتێکەوە بــۆ خــوارەوە لــە پلەو پایــەدا، ئەمــە لــە کاتێکدایە لــە کاتــی لۆمــەو سەرزەنشــتکردندا، بە جوانتریــن دەســتەواژە کــە کاریگــەری دەبێــت لەســەر دەروون. بــە هەمــان شــێوە ئەگەر خــوا ﷻ فــەزڵو چاکەی شــتێک بدات بەســەر شــتێکی تردا، وە هــەر یەک لەوانــە خاوەن چاکــە بــن، پارێزگــاری دەکات بە بــاس کردنی چاکــەی هەمــووان، لەبەر ئەوە کەســێک وا هەســت نــەکات کە لۆمەو سەرزەنشــتی فەزڵ بەســەردا کراو دەکات، وەک چــۆن لێرەدا دەفەرمــوێ: ﴿وَكُلّٗا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلۡحُسۡنَىٰ﴾ وە وەک چــۆن لــەو دەقانــەی ســوورەتی (الصــف) دا بــاس دەکات: ﴿وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١٣﴾، وە وەک چــۆن لــە فەرمایشــتی خــوادا هاتــوە،

دەفەرمـوێ: ﴿ لَا يَسْتَوِي مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ ﴿١٠﴾ ﴾الحديـد. واتـە: ئـەوەی بەو شـێوە نەبێت.

پاشـان دەفەرمـوێ: ﴿ وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَىٰ ﴾ وە وەک چـۆن دەفەرمـوێ: ﴿ فَفَهَّمْنَاهَا سُلَيْمَانَ ۚ وَكُلًّا آتَيْنَا حُكْمًا وَعِلْمًا ﴿٧٩﴾ ﴾الأنبيـاء. پێویسـتە لەسـەر ئـەو کەسـەی کـە لێکۆڵینـەوە دەکات لەسـەر بـە چـاک دانانی نێـوان کەس‌و دەسـتەکان‌و کـردەوەکان، لەم خاڵـە ورد ببێتەوە.

وە بـە هەمـان شـێوە ئەگـەر لۆمـەو سەرزەنشـتی خەڵکـی‌و وتـە کانیانـی کـرد، بـاس لە چاکـەی هـەردوو لا بکات هەتا وەسـفکراو وا گومان نەبات کە سـیفەتی کەمـاڵ‌و تەواوی وەرگرتـووە، وەک چـۆن ئەگـەر بوترێـت: نەصرانی باشـترە لە ئاگر پەرسـت، بـا ئەوەش بڵێـت هەردووکیـان بێبـڕوان، وە بەڵگەیـە لەسـەر ئەوەی کوشـتن قێزەونترە لـە زینا، بەڵام هەردووکیـان سـەرپێچین، خـوا ﷻ و پێغەمبەرەکـەی قەدەغەو سـەرکۆنەیان کردوە.

وە کاتێـک خـوا ﷻ پەیمانـی داوە بە تێکۆشـەران بـە لێخۆشـبوون‌و دابارینـی ڕەحمەت‌و میهرەبانـی خۆی بەسـەریاندا، کە لـە دوو ناوی پیرۆزی خۆیەوە سـەرچاوە دەگـرن (الغفور الرحیـم) ئـەم دەقـەی بە ئەمانـە تـەواو کـردوە: ﴿ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ (واتـە: وە خوا زۆر لێبـوردەو بـە بەزەییە).

(٩٧-٩٩): ﴿ إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ ظَالِمِي أَنفُسِهِمْ قَالُوا فِيمَ كُنتُمْ ۖ قَالُوا كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الْأَرْضِ ۚ قَالُوا أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُوا فِيهَا ۚ فَأُولَٰئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَسَاءَتْ مَصِيرًا ﴿٩٧﴾ إِلَّا الْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ لَا يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلَا يَهْتَدُونَ سَبِيلًا ﴿٩٨﴾ فَأُولَٰئِكَ عَسَى اللَّهُ أَن يَعْفُوَ عَنْهُمْ ۚ وَكَانَ اللَّهُ عَفُوًّا غَفُورًا ﴿٩٩﴾ ﴾:

بـە ڕاسـتی ئەمـە هەڕەشـەیەکی تونـدە بـۆ کەسـێک کـە واز لـە کۆچکـردن بهێنێـت لە پێنـاوی خـوادا هەتا مـردن، ئەو فریشـتانەی کە رووحی دەکێشـن سەرزەنشـتی دەکەن، بەم سەرزەنشـتە گەورەیـە، وە پێیـان دەڵێـن: ﴿ فِيمَ كُنتُمْ ﴾ (بە گلەیـی‌و تانەدانـەوە): حاڵتان لە چیـدا بـوو؟ وە بـە چی شـتێک لە بت پەرسـتان جیـا دەکرانـەوە؟ بەڵکـو ڕەشـی ئەوانتان زیـاد کـرد، بەڵکـو خۆتـان دەردەخسـت بـۆ بـت پەرسـتان لەسـەر بـڕواداران، وە خێـرو پاداشـتێکی زۆرتـان لـە دەسـتچوو، جیهـادو تێکۆشـان لەگـەڵ پێغەمبەرەکەیـدا، وە لەگەڵ مسـوڵمانان بـوون‌و هاوکاریکـردن‌و پشـتیوانیکردنیان دژ بـە دوژمنانیان.

﴿ قَالُوا كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الْأَرْضِ ﴾ واتـە: لاوازو چەوسـاوە بوویـن، نەمـان دەتوانـی کـۆچ

بکەین، ئەوان لەم قسەیەدا ڕاست ناکەن، چونکە خوا سەرکۆنەی کردوون، وە هەڕەشەی لێکردوون، بێگومان خوا ﷻ ئەرک ناخاتە سەر شانی کەسێک کە لە توانایدا نەبێت. بەڵام ئەوانەی کە لە ڕاستیدا توانایان نیەو لاوازن، جیاکراونەتەوە، لەبەر ئەمە فریشتەکان پێیان دەڵێن: ﴿ أَلَمۡ تَكُنۡ أَرۡضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٗ فَتُهَاجِرُواْ فِيهَا ﴾ ئەمە ئیستفهامێکی تەقریریە، واتە: لای هەموو کەسێک جێگیر بووە کە بەڕاستی زەوی فراوانە، لە هەر شوێنێک نەیتوانی ئاینەکەی ئاشکرا بکات، ئەوە زەوی فراوانەو دەتوانێت لە شوێنێکی تر بانگەوازو خواپەرستی ئەنجام بدات.

خوا ﷻ دەربارەی ئەو کەسانەی کە هیچ بیانوویەکیان نیە دەفەرموێ: ﴿ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ أَرۡضِي وَٰسِعَةٞ فَإِيَّٰيَ فَٱعۡبُدُونِ ٥٦ ﴾العنكبوت. بە ڕاستی ئەوانە هیچ بیانوویەکیان نیە: ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا ﴾ وە ئەمەش وەک پێشوو، هەمان هۆکاری پێویست ڕوون دەکاتەوە، کە بێگومان کۆچ کردن دەچەسپێت لەگەڵ هاتنە جێی مەرجەکانداو نەمانی بەربەستەکان (وەک نەخۆشیو هاوشێوەی) وە هەندێ جار بەربەستێک دەبێتە ڕێگر.

وە ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە جیهادو کۆچ کردن لە گەورەترین ئەرکەکانە، وە واز هێنانیان لێی لە قەدەغەکراوەکانە، بەڵکو لە تاوانە هەرە گەورەکانە. وە هەروەها دەقەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هەرکەسێک بمرێت، ئەوە ڕزقو ڕۆزیو کارو ئەجەلی تەواو بووە کە بۆی دیاری کراوە، وە وشەی (التوفی) بەڵگەیە لەسەر ئەمە، چونکە ئەگەر شتێکی لەوانە بمایەتەوە ئەوە نەدەمرد. وە بە هەمان شێوە بەڵگەیە بۆ بڕوابوون بە فریشتەو وەسف کردنیان، چونکە خوا ﷻ ئەو وتارەی لە دواندنی ئەواندا هێناوە بە مەبەستی جێگیر بوونو ڕێزلێنانیان، وە بە مەبەستی باسکردنی لە شوێنی خۆیدا.

پاشان ئەوانەی کە بە ڕاستی لاوازن جیاکردوەتەوە، کە توانای تێکۆشانو جیهاد کردنیان نیە، بە شێوەیەک لە شێوەکان ﴿ وَلَا يَهۡتَدُونَ سَبِيلٗا ﴾ ئەوانە خوا ﷻ دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَعۡفُوَ عَنۡهُمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَفُوًّا غَفُورٗا ﴾ وشەی (عسی)و هاوشێوەکانی بە مانای ئەوە دێن پێویستە ڕوو بدات لە لایەنی خوای گەورەوە، بە ئەوپەڕی فەزڵو چاکەیەوە بەرانبەر بە بەندەکانی، وە لە بەکارهێنانی دەستەواژەی (عسی) (بەڵکو) بۆ ئەوانەی کرداری چاک دەکەن سوودێکی تێدایە، ئەویش بە پێی کردەوەکانی پاداشتی ناداتەوە، چونکە کردەوەکان لە ئاستی ئەوەدا

نیـن، بەڵکـو کەموکورتیـان تێدایە، شایسـتەی ئـەو هەموو پاداشـتە گەورانەی خـوا نیە. وە دەقەکـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی کە هـەر کەسـێک نەیتوانی بـە فەرمانێک هەڵبسـێت کە پێویسـتە، دیـارە ئـەو کەسـە بیانـووی وەر دەگیرێت، وەک چـۆن خوا ﷻ دەربـارەی ئەو کەسـانەی کە دەستەوسـانن لـە تێکۆشـانو جیهاد کردنـدا دەفەرمـوێ: ﴿لَّيْسَ عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْمَرِيضِ حَرَجٌ ﴿٦١﴾﴾ النـور. وە لـە گشـت فەرمانەکاندا هـەر دەفەرمـوێ: ﴿فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ مَا ٱسْتَطَعْتُمْ ﴿١٦﴾﴾ التغابـن.

پێغەمبەریـش ﷺ دەفەرمـوێ: {إِذَا أَمَرْتُكُمْ بِأَمْرٍ فَأْتُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ} (أخرجـه البخاري برقم: (٦٨٥٨)، ومسـلم برقم: (١٣٣٧)، والنسـائي برقم: (٢٦١٩)).

واتـە: ئەگـەر فەرمانـم پێکـردن بـە فەرمانێـک بـە گوێـرەی توانا لێـی وەر بگـرن. بەڵام مـرۆڤ بیانـووی بـۆ نیـە مەگـەر هەمـوو تواناکانی خـەرج بـکات، وە هەمـوو دەرگاکانی لـێ دابخرێـتو هیـچ چارەیەکیـان نەمێنێـت، لەبـەر ڕسـتەی: ﴿لَا يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً﴾ وە لـە دەقەکـەدا بێدارکردنەوەیـەک هەیـە کـە بەڵگـەی تێدایـە لەسـەر حـەجو عەمـرەو هاوشـێوەکانی- کـە پێویسـتیان بـە گەشـت کـردن هەیـە- لـە مەرجەکانـی توانایە.

(١٠٠): ﴿وَمَن يُهَاجِرْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدْ فِى ٱلْأَرْضِ مُرَٰغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً ۚ وَمَن يَخْرُجْ مِنۢ بَيْتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدْرِكْهُ ٱلْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٠٠﴾﴾:

ئـەم دەقـە بـاس لـە هانـدان دەکات بـۆ کۆچکـردن، وە هەرچـی بەرژەوەندیەکیـش کـە دەیگرێتەخـۆ، خـوای گـەورە پەیمانـی داوە -کـە بێگومـان ڕاسـتگۆیە لـە پەیمانەکانیدا- هەرکەسـێک کـۆچ بـکات لـە پێنـاو ڕەزامەنـدی ئـەودا، ئـەوە لەسـەر زەویـدا جێگـەو ڕێگەیەکـی خـۆشو فراوانـی دەسـت دەکەوێـت، لێـرەدا وشـەی (مُراغَـم) بەرژەوەنـدی دنیـاو دوا ڕۆژ دەگرێتـەوە، زۆرێـک لـە خەڵکـی وا دەبینن کۆچ کـردن لە پێنـاوی خوادا تووشـی مـاڵ وێرانیان دەکات، باروو دۆخو ئاسایشـیان لـێ تێک دەدات، لە شـوێنی خۆیان دەردەکرێـنو هۆگریـان نامێنێـت، پـاش ئـەوەی کـە دەوڵەمەنـد بـوون تووشـی هەژاری دەبـنو پـاش ئەوەی کـە سـەربەرز بـوون زەلیـل دەبن.

بـەڵام لـە ڕاسـتیدا بەو شـێوە نیـە، بـڕوادار هەتـا لە نـاو بـت پەرسـتاندا بێت، ئـەوە دینی لـە ئەوپـەڕی ناتەواوی دایـە، نەک لەو پەرستشـانەی وەک نوێـژو هاوشـێوەکانی، یان ئەو پەرستشـانەی لـە دوای ئەوانـەوە دێـن لە پلـە بەندیـدا وەک جیهادو تێکۆشـان کـردن، وە ئەوەشـی بـە دوای ئـەوەدا دێـت، بەڵام ئەو ئاینی لە مەترسـی دایـە، بە تایبـەت ئەگەر لاواز

بێـت. ئەگـەر لـە پێناوی خـوادا کۆچی کـرد دەتوانـێ دینی خـوا بەرپا بـکات، وە جیهادو تێکۆشـان بـکات دژ بـە دوژمنانـی خـوا، وە ڕکابەریـان بکات بە زمـانو بە کـردار، وە بە هەمـان شـێوە ڕزقو ڕۆزیەکـی زۆری دەسـت دەکەوێـت، ئەمـەش ڕوویـداوە وەک چۆن خـوا ﷻ باسـی کردوە.

هاوەڵانـی پێـەمبـەر ﷺ کاتێـک کۆچیـان کـرد لە مەککـەوە بۆ مەدینـە، تەنها لـە پێناوی خـوادا کۆچیـان کرد، مـاڵو منداڵو سـەروەتو سـامانیان هەموو بـە یەکجار بەجێهێشـت، بـەو کۆچکردنـە بڕوایـان بـە هێـز بـوو، وە بـڕوای تـەواو جیهـادو تێکۆشـانی گـەورەو سـەرکەوتنی دینـی خوایـان بەدەسـت هێنا، وە بـوون بە پێشـەوای سـەرجەم مرۆڤایەتی، وە هەروەهـا بە هـۆی کۆچکردنو ئـەو بڕوایەی کـە هەیان بـوو، ڕزگار کردنـی ناوچەکانو دەسـتکەوتی زۆریـان بە دەسـت هێنا، هەتا بـوون بە چاکتریـنو دەوڵەمەندتریـن کەس، بە هەمان شـێوە هەر کەسـێک هەمـان کاری ئەوان بکات، هەمـان دەسـتکەوتی ئەوانی دەبێت لـە ڕۆژی دواییدا.

پاشـان دەفەرمـوێ: ﴿وَمَن يَخۡرُجۡ مِنۢ بَيۡتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ واتـە: لە بـەر خوا ﷻو ڕەزامەنـدی ئـەو بێ، وە لەبەر خۆشویسـتنی پێغەمبەرەکەی ﷺو سەرخسـتنی دینـی خوا بێ، جگـە لـە هیچ مەبەسـتێکی تر ﴿ثُمَّ يُدۡرِكۡهُ ٱلۡمَوۡتُ﴾ بە کوشـتن بـێ، یان بە هەر شـێوەیەکی تـر بـێ، ﴿فَقَدۡ وَقَعَ أَجۡرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ﴾ واتـە: بێگومان پاداشـتی کۆچکەرێکی بە تـەواوی بۆ دەسـتەبەر دەبـێ، بـە زامنی خـوا ﷻ، لەبەر ئەوەی نیـەتو لێبڕانـی تەواوی هەبـووە، وە بە کرداریـش کاری بـۆ کـردوە، لـە میهرەبانی خـوا ﷻ بەرانبەر بەو کەسـەو هاوشـێوەکانی ئەوەیـە کـە بە تـەواوی پاداشـتیان دەداتـەوە، ئەگەر چـی کارەکەشـیان تـەواو نەکردبێت، وە لێـان خـۆش دەبێـت، لەو کـەمو کورتیـەی هەیانبووە لـە کۆچکردنو هاوشـێوەیدا. وە لەبـەر ئـەوە بـەم دوو نـاوە پیـرۆزە کۆتایی بـەم دەقـە هێنـاوە: ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا﴾ لـە بـڕواداران خـۆش دەبێت لـەو هەڵانەی کـە کردوویانە، بـە تایبەت ئەوانـەی کە داوای لێخۆشـبوونیان کردوەو پاشـگەز بوونەتەوە.

﴿رَّحِيمٗا﴾ بەرانبـەر بـە هەمـوو دروسـتکراوەکانی، میهرەبانیەک کە دروسـتی کردوونو لێیـان خـۆش بـووەو ڕزقو ڕۆزی پێـداون لـە ماڵو سـامانو منـداڵو هێزو توانـا، وە جگە لەوانـەش، بەرانبـەر بە بـڕواداران میهرەبانـە، کە سـەرکەوتووی کردوون لـە بڕواهێناندا، وە فێری زانسـتی کـردوون کە لـە ڕێگای ئەو زانسـتەوە دەگەن بـە دڵنیایـی، وە هۆکارەکانی

خۆشبەختی بۆ ئاسان کردوون، وە دەگەن بە میهربانی خوا بە باشترین دەستکەوت، دڵنیابن لە داهاتوویەکی نزیکدا میهرەبانیو ڕێزداری خوا دەبینن کە هەرگیز جاو نەیبینیوەو، گوێ نەیبیستووەو بە خەورەش بە دڵی هیچ کەسێکدا نەهاتوە، داوا لە خوا دەکەین بێ بەشمان نەکات بە هۆی خراپەکانمانەوە.

(١٠١-١٠٢): ﴿ وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي الْأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا مِنَ الصَّلَاةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا ۚ إِنَّ الْكَافِرِينَ كَانُوا لَكُمْ عَدُوًّا مُّبِينًا ﴿١٠١﴾ وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلَاةَ فَلْتَقُمْ طَائِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُوا أَسْلِحَتَهُمْ فَإِذَا سَجَدُوا فَلْيَكُونُوا مِن وَرَائِكُمْ وَلْتَأْتِ طَائِفَةٌ أُخْرَىٰ لَمْ يُصَلُّوا فَلْيُصَلُّوا مَعَكَ وَلْيَأْخُذُوا حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ ۗ وَدَّ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَاحِدَةً ۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰ أَن تَضَعُوا أَسْلِحَتَكُمْ ۖ وَخُذُوا حِذْرَكُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ أَعَدَّ لِلْكَافِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿١٠٢﴾ ﴾:

ئەم دوو دەقە بنەمان بۆ ڕێگە پێدان بە نوێژ کورت کردنەوەو نوێژی ترس، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي الْأَرْضِ ﴾ واتە: لە گەڕانو گەشت کردندا، ڕووالەتی ئایەتەکە ڕێگە پێدان (الرخصة) دەگەیەنێت بۆ هەموو گەشتێک، ئەگەر چی گەشتەکەش بۆ سەرپێچی بێ، ئەمە بۆچوونی پێشەوا ئەبو حەنیفەیە ڕەحمەتی خوای لێ بێت، بەڵام زۆربەی زانایان پێچەوانەی ئەم بۆ چوونەیان هەیە، ئەوانیش بریتین لە هەر سێ پێشەواکەو جگە لەوانیش، ڕێگایان نەداوە لە گەشتکردنی سەرپێچیدا، دەقەکەیان تایبەت (تخصیص) کردوە بە مانـاو گونجانەوە، چونکە بە ڕاستی ڕێگە پێدان ئاسانکاریەکە لە لایەن خواوە بۆ بەندەکانی، ئەگەر گەشتیان کرد نوێژەکانیان کورت بکەنەوەو ڕۆژوو نەگرن، وە سەرپێچیکار لە گەشتەکەیدا ناگونجێ ئاسانکاری بۆ بکرێ.

کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا مِنَ الصَّلَاةِ ﴾ واتە: هیچ نارەحەتیو تاوانێکتان لەسەر نیە لەوەدا، وە نەرێنی ئەوە ناکات کە نوێژی کورت کردنەوە چاکترە، لەبەر ئەوە نەرێنی کردنی نارەحەتی لابردنی هەندێ گومانو دوو دڵی دەگەیەنێت کە لە زۆربەی کەسەکاندا بە دی دەکرێت، بەڵکو نەرێنی (واجب) بوونی کورتکردنەوەش ناکات، وەک چۆن لە پێشەوە لە سوورەتی بەقەرەدا باسکرا، لە ئایەتی: ﴿ إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَائِرِ اللَّهِ ﴿١٥٨﴾ ﴾ البقرة. هەتا کۆتایی دەقەکە.

وە لابردنی گومانو دوو دڵی لەم شوێنەدا ڕوونو ئاشکرایە، لەبەر ئەوە نوێژ لە لای

بڕواداران لەسەر ئەم شێوەیە جێگیر بووە، وە لا ناچێت لەسەر دەروونی زۆربەیان تەنها بە باسی نەرێنی کردنی نەبێت. وە لێرەدا دوو بەڵگە دەخەینە ڕوو بۆ پێش خستنی کورت کردنەوەی نوێژ:

یەکەم: بەردەوام بوونی پێغەمبەر ﷺ لەسەر کورت کردنەوە لە هەموو گەشتەکانیدا.

دووەم: ئەمە لە بەشی بەرفراوانیو ڕێگە پێدانو میهرەبانی خوایە بۆ بەندەکانی، وە خوا ﷻ حەز دەکات بە دەم ڕێگە پێدراوەکانیەوە بچن، وەک چۆن پێی ناخۆشە بەدەم سەرپێچیەکانیەوە بچن.

وە دەفەرمویّ: ﴿أَن تَقۡصُرُواْ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ﴾ (هەندێ لە نوێژەکان کورت بکەنەوە) نەیفەرمووە هەموو نوێژەکان کورت بکەنەوە، لە بەر دوو سوود:

یەکەم: ئەگەر بیفەرمووایە نوێژەکان کورت بکەنەوە، ئەوە کورت کردنەوەکە بە شێوەیەک لە شێوەکان ڕێکو پێک نەدەبوو، لەوانەیە کەسێک گومانی ببردایەت ئەگەر هەموو نوێژەکانی بکردایە بە یەک ڕکات دروست دەبوو، بە ڕاستی هێنانی وشەی: ﴿مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ﴾ بۆ ئەوەیە هەتا ببێت بە بەڵگە کە کورت کردنەوەی نوێژ سنووردارە، دەگەڕێتەوە بۆ کرداری پێغەمبەرو ﷺ هاوەڵانی.

دووەم: بە ڕاستی (مِن) لێرەدا واتای (هەندێ) دەگەیەنێت، واتە: (هەندێ لە نوێژەکان) بۆ ئەوەی بزانرێت کورت کردنەوە بۆ هەندێ لە نوێژەکانە، نەک بۆ هەموویان، چونکە نوێژی بەیانیو ئیوارە کورت ناکرێنەوە، بەڵام ئەوەی کە کورت دەکرێتەوە تەنها نوێژە چواریەکانە، کە لە چوار ڕکات پێک دێن.

ئەگەر جێگیر بوو نوێژی کورت کردنەوە لە گەشتدا ڕێگە پێدراوە، ئەوە بزانە توێژەرەوانی قورئان بۆچوونی جیاوازیان هەیە لەم بەندار (قید)کردنەدا، ئەویش ڕستەی: ﴿إِنۡ خِفۡتُمۡ أَن يَفۡتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ﴾ ڕوواڵەتی دەقەکە وا دەردەخات کە کورت کردنەوەی نوێژ دروست نیە، تەنها لەبەر ئەم دوو هۆکارە نەبێت، گەشت کردن لەگەڵ ترسدا، پوختەی جیاوازیەکەیان بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە ئایا مەبەست لە وتەی: ﴿أَن تَقۡصُرُواْ﴾ کورت کردنەوەی ژمارەی ڕکاتەکانە بە تەنها؟ یان کورت کردنەوەی ژمارەی ڕکاتەکانو سیفەتیانە؟ ئاڵۆزیەکە لەسەر واتای یەکەمە.

بە ڕاستی ئەمە لای پێشەوای بڕواداران عومەری کوڕی خەتتاب (خوای لێ ڕازی بێت) ئاڵۆز بوو، هەتا پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! بۆچی

نوێژەکانمـان کۆبکەینـەوە کە ئیسـتا لە ئاسایشـداین؟ ئـەوە نیە خـوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ ﴾ پێغەمبـەری خوا ﷺ فەرمـووی: {صَدَقَةٌ تَصَـدَّقَ اللَّهُ بِهَـا عَلَيْكُمْ، فَاقْبَلُـوا صَدَقَتَـهُ} (أَخْرَجَـهُ أَحْمَـد برقـم: (١٦٨)، وَالبُخَـارِيُّ برقـم: (١)، وَمُسْـلِمٌ برقـم: (١٩٠٧)، وَأَبُـو دَاوُدَ برقـم: (٢٢٠١)، وَالتِّرمِـذِيُّ برقم: (١٦٤٧)، وَالنَّسَـائِيُّ برقم: (٣٤٣٧)، وَابْـنُ مَاجَهْ برقم: (٤٢٢٧)، وَابْـنُ حِبَّـانَ برقـم: (٣٨٨) وَغَيْرُهُم).

واتە: ئەوە چاکەیەکە خوا لەگەڵی کردوون، چاکەی خوا وەربگرن.

کەواتە: لەسـەر ئـەم فەرموودەیە، ئەم بەندار (قید) کردنە لەبەر ئـەوە هێنراوە کە پێغەمبەر ﷺ زۆربـەی گەشـتەکانی بۆ جیهادو تێکۆشـان دەردەچوو. وە سـوودێکی تـری تێدایە، ئەویش ڕوونکردنـەوەی حیکمـەتو بەرژەوەندیە لـە ڕەوا بوونـی ڕێگە پێدانی کـورت کردنەوەدا. لـەم دەقـەدا ئـەوەی ڕوونـی کردوەتـەوە کـە وا دەبینرێـت نارەحەتـی گونجاوە بـۆ ڕێگە پێـدان، ئەویـش بریتیـە لـە کۆکردنـەوەی گەشـتو تـرس، وە دەقەکـە ئـەوە ناگەیەنێت کـە تەنهـا لـە گەشـت کردنـدا نوێـژ کـورت داکرێتـەوە، کـە گەشـت کـردن گومانی نارەحەتـی لێدەکرێـت. بـەڵام لەسـەر ڕای دووەم: مەبەسـت لـە کـورت کردنـەوە: کورت کردنـەوەی ژمـارەو سـیفەت دەگەیەنێـت، بـە ڕاسـتی بەنـدار (قید) لەسـەر شـێوەی خۆی دەمێنێتـەوە، ئەگـەر گەشـتو ترس پێکـەوە کۆبوونەوە، ئەوە دروسـتە کـورت کردنەوەی ژمـارەو کـورت کردنەوەی سـیفەت، بـەڵام ئەگەر تەنها گەشـت بـوو ئەوە دروسـتە تەنها ژمـارە کـورت بکرێتـەوە. لەبەر ئـەوە لـە دوای ئەوە باس لـە نوێژی تـرس دەکات، وەک دەفەرموێ:

وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ
مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُوٓا۟ أَسْلِحَتَهُمْ فَإِذَا سَجَدُوا۟ فَلْيَكُونُوا۟
مِن وَرَآئِكُمْ وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَىٰ لَمْ يُصَلُّوا۟ فَلْيُصَلُّوا۟
مَعَكَ وَلْيَأْخُذُوا۟ حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ وَدَّ ٱلَّذِينَ
كَفَرُوا۟ لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ فَيَمِيلُونَ
عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَٰحِدَةً وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن كَانَ بِكُمْ
أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَن تَضَعُوٓا۟ أَسْلِحَتَكُمْ
وَخُذُوا۟ حِذْرَكُمْ إِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿١٠٢﴾
فَإِذَا قَضَيْتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ
جُنُوبِكُمْ فَإِذَا ٱطْمَأْنَنتُمْ فَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ
كَانَتْ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ كِتَٰبًا مَّوْقُوتًا ﴿١٠٣﴾ وَلَا تَهِنُوا۟ فِى
ٱبْتِغَآءِ ٱلْقَوْمِ إِن تَكُونُوا۟ تَأْلَمُونَ فَإِنَّهُمْ يَأْلَمُونَ كَمَا
تَأْلَمُونَ وَتَرْجُونَ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا يَرْجُونَ وَكَانَ ٱللَّهُ
عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١٠٤﴾ إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ لِتَحْكُمَ
بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُ وَلَا تَكُن لِّلْخَآئِنِينَ خَصِيمًا ﴿١٠٥﴾

﴿ وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾ واتــە: نوێــژت بــۆ کــردن، وە ئــەوەی کە پێویســتە لــە نــاو نوێژەکــەدا بۆیــان تەواو بکەیــت، وە ئــەوەی بــۆ خــۆت پێویســتە وەک پێشــەوا فێریــان بکــە.

پاشــان ئەمەی تەفسیر بــە ئایەتی: ﴿ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ ﴾ واتــە: دەســتەیەک ڕووبــەڕووی دوژمــن دەوەســتێت، وەک چــۆن دەقەکە لەمەو دوا بــاس لەوە دەکات: ﴿ فَإِذَا سَجَدُوا۟ ﴾ ئەوانــەی کە لەگەڵتدان، نوێژەکەیــان بــۆ تــەواوو بکە، لەبــری نوێژ ســوجدەی بەکار هێنــاوە، لەبەر ئــەوە بەڵگە بێــت بــۆ گەورەیــی ســوجدە، وە بێگومــان یەکێکــە لــە پایەکانــی نوێــژ، بەڵکــو گەورەترینیانــە.

﴿ فَلْيَكُونُوا۟ مِن وَرَآئِكُمْ وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَىٰ لَمْ يُصَلُّوا۟ فَلْيُصَلُّوا۟ ﴾ بریتیــن لــەو کۆمەڵەی کــە ڕووبەڕووی دوژمن وەســتا بــوون ﴿ فَلْيُصَلُّوا۟ مَعَكَ ﴾ بەڵگەیە لەســەر ئــەوەی کە فەرماندە لە شــوێنی خــۆی دەمێنێتەوە پــاش دوورکەوتنــەوەی کۆمەڵەی یەکەم، چاوەڕوانــی کۆمەڵــەی دووەم دەکات، ئەگــەر ئامــادە بــوون، ئــەو کاتــەی کە مــاوە بۆیان تــەواو دەکات، پاشــان لــە تەحییاتــدا چاوەڕێیــان دەکات هەتــا ڕکاتــی دووەمیــان دەکەن، پاشــان ســڵاو دەداتــەوە، ئەمــە یەکێکە لــە جۆرەکانی نوێــژی ترس.

بــەڵام ســەلمێنراوە لــە پێغەمبــەرەوە ﷺ بــە چەندیــن شــێوازی تــر ئــەو نوێــژەی کــردوە، هەمــووی دروســتە. بە هەمان شــێوە ئەم دەقە بەڵگەیە لەســەر ئــەوەی کە نوێــژی بە کۆمەڵ فەرزە لــە دوو ڕووەوە:

یەکــەم: خــوا ﷻ لــەو کاتــە نارەحەتیــەدا فەرمانی پێکــردوە، لە کاتــی ئەوپەڕی ترســدا لە دوژمــن، کە مەترســی ئــەوە دەکرێت لە نــاکاودا هێرش بکرێتە ســەریان، کەواتە پێویســت بوونــی لە کاتــی ئارامیدا زۆر لە پێشــترە.

دووەم: نوێــژ خوێنــان لــە نوێژی ترســدا واز لە زۆرێک لەو مــەرجو پێویســتیانە دەهێنن، وە زۆرێــک لەوانــەی کە نوێژ بە تــاڵ دەکەنەوە لەو کاتەدا چاوپۆشــی لێدەکرێت، ئەمەش تەنها لەبــەر فــەرز بوونی نوێــژی بە کۆمەڵــە، چونکە بەریەک کەوتــن نیە لە نێوان پێویســتو بە بــاش زانــراودا، ئەگــەر نوێژی بە کۆمــەڵ پێویســت نەبوایەت ئــەو فەرمانانــە وازلێنەدەهێنرا لــە بــەر ئەوە. بە هەمان شــێوە دەقەکــە بەڵگەی لەســەر ئەوەی کــە وا چاکترو لــە پێش ترە یــەک فەرمانــدە دیــاری بکرێــت بۆ نوێژ کــردن، خــۆ ئەگەر وا پێویســت بــکات بە چەند فەرماندەیــەک نوێــژ بکرێت ئاســاییە، ئەمەش لە پێنــاو یەکدەنگی بــڕواداران‌و نەبوونی دوو بەرەکــی، لەبــەر ئــەوە زیاتــر کاریگەری بــکات لە دڵــی دوژمنانیــان، وە خــوا ﷻ فەرمانی کــردوە بــە هەڵگرتنــی چەکەکانیــان‌و وریاییان لــە کاتی نوێژی ترســدا. ئەگەر چــی لە ناو نوێژەکــەدا چەنــد جوڵــەو ســەرقاڵ بوونێک هەبێــت، ئەوە بێگومــان لەبــەر بەرژەوەندیەکی گەورەتــرە کە بریتیــە لە کۆکردنــەوەی نێوان نوێژو جیهــادو تێکۆشــان، وە وریایی لەوەی دوژمــن زیــان نەدات لــە مســوڵمانان‌و پەلاماریان نەدات، لەبــەر ئەمەیە خــوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَدَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡ تَغۡفُلُونَ عَنۡ أَسۡلِحَتِكُمۡ وَأَمۡتِعَتِكُمۡ فَيَمِيلُونَ عَلَيۡكُم مَّيۡلَةٗ وَٰحِدَةٗ﴾ پاشــان خــوا ﷻ بیانــووی بــۆ ئەوانــە هێناوەتــەوە بــە هۆی نەخۆشــی، یــان بــاران بارینەوە چەکەکانیــان دادەنێن، بەڵام لەگــەڵ وریاییدا، دەفەرمــوێ: ﴿وَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ إِن كَانَ بِكُمۡ أَذٗى مِّن مَّطَرٍ أَوۡ كُنتُم مَّرۡضَىٰٓ أَن تَضَعُوٓاْ أَسۡلِحَتَكُمۡۖ وَخُذُواْ حِذۡرَكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٗا مُّهِينٗا﴾ لــەو ســزا ڕیســواکەرانەی کە خوا بــۆ بێبڕواکان ئامــادەی کردوە، ئەوەیــە کە خــوا فەرمانی بە حیــزب‌و کۆمەڵەکەی کردوە، بە کوشــتنیان‌و کوشــتارکردنیان لــە هەر شــوێنێک بەردەســتیان کەوتــن، وە بە دیــل بیانگــرن‌و گەمارۆیان بــدەن، وە بۆیان دابنیشــن لــە هەمــوو جێگایەکــەوە لــە چاوەڕوانیدا بــن، وە لە هەمــوو باردۆخەکانــدا وریان بــن‌و، لــە دوژمن بێ ئاگــا نەبن، نــەوەک هەندێ لــە مەرامەکانیــان بۆ بەدەســت بێت، دەی گەورەتریــن ســوپاس‌و ســتایش بۆ ئــەو خوایەی کە منەتــی کــردوە بەســەر بڕواداراندا، وە پشــتیوانی کــردوون بــە هــاوکاری‌و ڕێنماییەکانــی کە ئەگەر بــە تــەواوی جێبەجێی بکەن، هەرگیــز ئالآیــان دا ناچەمێت‌و هیــچ دوژمنێک لە دوژمنەکان ســەر ناکەوێت بە ســەریاندا. وە کــە دەفەرمــوێ: ﴿فَإِذَا سَجَدُواْ فَلۡيَكُونُواْ مِن وَرَآئِكُمۡ﴾ بەڵگەیە لەســەر ئەوە ئەم کۆمەڵــە هەمــوو نوێژەکانیان تــەواو دەکەن پێش ئەوەی بڕۆن بۆ شــوێنی بۆ ســەنگەرەکانی خۆیــان، وە پێغەمبــەر ﷺ لــە شــوێن خــۆی چاوەڕوانی دەســتەکەی تر دەکات پێش ســلاو

دانــەوە، لەبــەر ئەوە ســەرەتا باســی ئەو دەســتە دەکات کە نوێــژی لەگەڵدا دەکــەن، هەواڵی داوە کــە ئــەوان بــە هاوڕێی پێغەمبــەر ﷺ نوێــژ دەکەن، پاشــان کردارەکەی داوەتــە پاڵیان جگــە لــە پێغەمبــەر ﷺ، ئەمە بەڵگەیە لەســەر ئــەوەی کە باســمان کرد.

وە کــە دەفەرمــوێ: ﴿ وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَىٰ لَمْ يُصَلُّواْ فَلْيُصَلُّواْ مَعَكَ ﴾ بەڵگەیــە لەســەر ئــەوەی کە کۆمەڵی یەکــەم نوێژیان کــردوە، وە کۆمەڵی دووەم لەگــەڵ فەرماندەدان لــە ڕکاتــی یەکەمــدا، پێویســتە لەســەر فەرمانــدە چاوەڕوانیــان بــکات، هەتــا نوێژەکەیــان تــەواو بکەن، پاشــان ســڵاویان بــۆ دەداتــەوە، ئەمە ئاشــکرایە بۆ کەســێک ســەرنج بداتو تێرا بمێنێت.

(١٠٣): ﴿ فَإِذَا قَضَيْتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِكُمْ ۚ فَإِذَا ٱطْمَأْنَنتُمْ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ ۚ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتْ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ كِتَٰبًا مَّوْقُوتًا ﴿١٠٣﴾ ﴾

واتــە: ئەگــەر لــە نوێژەکەتــان بوونــەوە نوێژی تــرسو ئــەوەی هاوشــێوەی ئــەو نوێژەیە، ئــەوە یــادی خــوا بکەن لە هەمــوو حاڵێکــدا، لەبــەر چەند ســوودێک نوێژی ترســی تایبەت کــردوە بەوە:

لەوانــە: بە ڕاســتی ســەرکەوتنو چاکبــوونو خۆشــبەختی دڵ تەنها بــە گەڕانــەوە دەبێت بۆ لای خــوا لــە خۆشویســتنو پــڕ بوونــی دڵ بە یــادی خــواو ســوپاسو ســتایش کردنی، وە گەورەتریــن شــت ئــەم مەبەســتانەی تێدا بەدەســت بێت، بریتیە لــە نوێژ کــە حەقیقەتەکەی پەیوەنــدی نێــوان بەندەو خــوا دەگرێتەوە.

وە لەوانــە: بــە ڕاســتی نوێــژ حەقیقەتەکانــی ئیمــانو بڕوایــەو دڵنیایــی تــەواوە، لەبــەر گرنگیەکــەی لــە هەمــوو شــەوو ڕۆژێکــدا فــەرزی کــردوە، وە ڕوونــە کە نوێــژی ترس ئــەم هەمــوو جوانکاریانــەی تێــدا بە دەســت نایەت، بــە هۆی ســەرقاڵ بوونی دڵو جەســتەو ترســەوە، بۆیــە فەرمانــی کــردوە لــە پــاش ئــەوە بــاس بکرێت.

وە لەوانــە: بە ڕاســتی ترس دڵ تووشــی دڵە ڕاوکــێ دەکات، وە ترس دەبێتــە مایەی لاوازی، جــا ئەگــەر دڵ لاواز بــوو جەســتەش توانای بەرگــری کردنــی نامێنێت بەرانبەر بــە دوژمن، وە یــاد کردنــەوەی خوا لــە گەورەتریــن بەهێزکەرەکانی دڵە.

لەوانــە: یــاد کردنــەوەی خــوا -لەگــەڵ ئارامگرتــنو جێگیریــدا- دەبنە مایەی ســەرکەوتن بەســەر دوژمندا، وەک چــۆن خوا ﷻ دەفەرمــوێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَٱثْبُتُواْ وَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٤٥﴾ ﴾ الأنفال. لــەم حاڵەتــەدا فەرمانــی

کـردوە کـە زۆر یـادی خـوا بکرێـت، جگـە لە بـاس کردنـی چەندیـن فەرمانی تر.
کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَإِذَا ٱطْمَأْنَنتُمْ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾ واتـە: ئەگـەر ترسـتان نەمـاو ئارامی بـە دڵو دەروونو جەسـتەتاندا هـات، ئـەوە نوێژەکانتان بە تەواویو لەسـەر شـێوەی خۆی بـە ئاشـکراو بـە نهێنی ئەنجـام بدەن، بـە سـەرجەم پایـەو مەرجەکانیـەوە، وە بـە ئەوپەڕی گوێڕایەڵـیو ملکەچیەوە.
﴿ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتْ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ كِتَـٰبًا مَّوْقُوتًا ﴾ واتـە: دیاریکـراو بێـت لـە کاتـی خۆیـدا، ئەمـەش بەڵگەیە لەسـەر فـەرز بوونـی نوێـژ، وە کاتێکـی تایبەتی بە خـۆی هەیە، نوێژەکـە دانامەزرێـت لـە کاتی خۆیـدا نەبێت، ئەویش بریتیـە لەو کاتەی کـە جێگیر بووە لـە لای مسـوڵمانان، گەورەو بچووکـو زانـاو نەزانیان، چونکە ئەوەیان لـە پێغەمبەرەکەی ﷺ خۆیانـەوە وەرگرتـووە، وەک دەفەرمـوێ: {صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي} (أخرجه أحمـد برقم: (١٥٦٣٦)، والبخـاري برقـم: (٧٨٥)، ومسـلم برقـم: (٦٧٤)). واتـە: نوێژ بکەن بەو شـێوەی کە من نوێـژ دەکەم.
کـە دەفەرمـوێ: ﴿ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی کـە نوێـژ تـەرازووی بەنـدەی خوایـە، وە بـە پێی ئیمانی کەسـەکە نوێژەکـە جوانترو ڕێـکو پێکتـر دەبێت، وە بـە هەمـان شـێوە بەڵگەیە لەسـەر ئـەوەی ئەگـەر چـی بێبـڕواکان -پابەندن بە دەسـتووری ئیسـلامەوە، وەک ئەوانـەی کە بەڵێـن لـە گەردنیاندایە-بێگومان ئەوان فەرمانیـان پێنەکراوە بـە لـقو وردەکاریەکانـی ئاین، وەک نوێـژ کردن، وە فەرمانیـان پێناکرێـت، بەڵکو ئەگەر ئەنجامیشـی بـدەن دروسـت نیە هەتـا بـەردەوام بن لەسـەر بێبڕوایـی، ئەگەرچی لـە ڕۆژی دواییشـدا لەسەری سـزا دەدرێت.
(١٠٤): ﴿ وَلَا تَهِنُواْ فِى ٱبْتِغَآءِ ٱلْقَوْمِ ۖ إِن تَكُونُواْ تَأْلَمُونَ فَإِنَّهُمْ يَأْلَمُونَ كَمَا تَأْلَمُونَ ۖ وَتَرْجُونَ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا يَرْجُونَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١٠٤﴾ ﴾:
واتـە: لاوازو سسـت مەبـن لە بـە دواداگەڕانی دوژمناندا لـە بێبڕواکان، لە جیهادو تێکۆشـان کـردنو پابەندبوونتان لە سـەنگەرەکاندا، چونکە بەڕاسـتی لاوازی دڵ دەبێتـە مایەی لاوازی جەسـتە، وە بـەو هۆیـەوە ناتوانێـت لـە بەرانبەر دوژمندا چەسـپاو بـێ، بەڵکو بەهێـز بە توانا چـالاک بـن لە کاتی شـەڕ کردنتانـدا دژ بە دوژمنان، پاشـان باسـی دوو شـت دەکات کە دڵـی بڕواداراني پـێ بەهێز دەبێ:
یەکـەم: ئـەوەی کە تووشـتان دەبـێ لـە ناڕەحەتیو ئێـشو ئازارو بریـنو هاوشـێوەکانی،

بێگومـان ئەوانیـش بـە هەمـان شـێوەی ئێـوە ئێـش‌و ئازاریـان پـێ دەگـات، بەڕاسـتی لە جەوامێـری مرۆڤایەتـی‌و مەردایەتـی ئیسـلامەتی نیـە کـە ئێـوە لـە ئـەوان لاوازتـر بن، لە کاتێکـدا ئێـوەو ئـەوان هاوشـانی یەک بـوون، چونکـە نەریت وایـە ئەگەر شکسـت چەند جارێـک بـە دوای یەکتـردا بێت مـرۆڤ لاواز دەکات و بـەردەوام دوژمن سـەر دەکەوێت بەسـەریدا، نـەک کەسـێک جارێـک سـەربکەوێت‌و جارێکـی تر شکسـت بخوات.

دووەم: ئێـوە ئومێدتـان هەیـە بـە خـوا، ئـەوان ئـەو ئومێـدە لە خـوا ناکـەن، ئێـوە ئومێدی پاداشــت‌و ڕزگـار بـوون لە سـزا دەکـەن، بەڵکـو بـڕواداره تایبەتـەکان بە دوای پاداشـتی هــەرە بــەرزدا دەگەڕێــن، لــە ســەرکەوتنی خوایــی‌و جێبەجێ کــردن‌و بەرپا کردنــی ئاینی خوا لەسـەر زەویـداو بـەر فراوانکردنی قەڵەمـڕەوی ئیسـلام‌و ڕێنمایی کردنـی گومڕاکان‌و لەنـاو بردنـی دوژمنان. ئـەم ئاواتانـە وا دەکات لە بـڕوادار ئیمانی بەهێزتر بێـت‌و چالاکی‌و ئازایەتـی دەربکەوێـت، چونکـە ئـەوەی دەجەنگێـت بۆ ئـەوەی پاداشـتی دونیا بە دەسـت بهێنێـت وەک ئـەوە نیـە بجەنگێت بۆ ئەوەی پاداشـتی دنیـاو دوا ڕۆژ بە دەسـت بهێنێت، وە سـەرکەوتن بـە ڕەزامەندی خوای گـەورەو بەهەشـتەکەی، پاکی بۆ ئەو خوایـەی بیرۆکەی بەندەکانـی جیـاواز کـردوە، وە بـە زانسـت‌و دانایی خـۆی جیـای کردوونەتـەوە. وە لەبەر ئەمـە دەفەرمـوێ: ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ خـوا (خاوەنـی) زانیاریـی تـەواو حیکمەتی تەواوە.

(١٠٥-١١٣): ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ لِتَحۡكُمَ بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُۚ وَلَا تَكُن
لِّلۡخَآئِنِينَ خَصِيمٗا ﴿١٠٥﴾ وَٱسۡتَغۡفِرِ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿١٠٦﴾ وَلَا تُجَٰدِلۡ عَنِ
ٱلَّذِينَ يَخۡتَانُونَ أَنفُسَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ خَوَّانًا أَثِيمٗا ﴿١٠٧﴾ يَسۡتَخۡفُونَ مِنَ
ٱلنَّاسِ وَلَا يَسۡتَخۡفُونَ مِنَ ٱللَّهِ وَهُوَ مَعَهُمۡ إِذۡ يُبَيِّتُونَ مَا لَا يَرۡضَىٰ مِنَ ٱلۡقَوۡلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا
يَعۡمَلُونَ مُحِيطًا ﴿١٠٨﴾ هَٰٓأَنتُمۡ هَٰٓؤُلَآءِ جَٰدَلۡتُمۡ عَنۡهُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا فَمَن يُجَٰدِلُ
ٱللَّهَ عَنۡهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ أَم مَّن يَكُونُ عَلَيۡهِمۡ وَكِيلٗا ﴿١٠٩﴾ وَمَن يَعۡمَلۡ سُوٓءًا أَوۡ يَظۡلِمۡ نَفۡسَهُۥ
ثُمَّ يَسۡتَغۡفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿١١٠﴾ وَمَن يَكۡسِبۡ إِثۡمٗا فَإِنَّمَا يَكۡسِبُهُۥ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦۚ
وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴿١١١﴾ وَمَن يَكۡسِبۡ خَطِيٓـَٔةً أَوۡ إِثۡمٗا ثُمَّ يَرۡمِ بِهِۦ بَرِيٓـٔٗا فَقَدِ ٱحۡتَمَلَ بُهۡتَٰنٗا
وَإِثۡمٗا مُّبِينٗا ﴿١١٢﴾ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكَ وَرَحۡمَتُهُۥ لَهَمَّت طَّآئِفَةٞ مِّنۡهُمۡ أَن يُضِلُّوكَ
وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡۖ وَمَا يَضُرُّونَكَ مِن شَيۡءٖۚ وَأَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ
وَعَلَّمَكَ مَا لَمۡ تَكُن تَعۡلَمُۚ وَكَانَ فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكَ عَظِيمٗا ﴿١١٣﴾﴾

خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات کـە کتێبـی دابەزانـدووە بـۆ سـەر پێغەمبەرەکـەی بـە هـەق، واتــە: پاراســتوویەتی لــە شــەیتانەکان، کــە شــتێکی نــاڕەواو پووچــی تــێ بکــەن، بەڵکــو بـە هـەق دایبەزانـدووە، سـەرجەم هەواڵەکانـی نێویشـی هـەقو ڕاسـتن، وە فەرمـانو قەدەغەکراوەکانیشـی دادپـەروەرن (وەک دەفەرمـوێ:) ﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ﴿١١٥﴾ ﴾الأنعام. وە هەواڵـی داوە کـە بـۆ ئـەوە قورئانـی دابەزانـدووە دادوەری لـە نێـوان خەڵکیـدا بـکات، وە لە دەقێکی دیکـەدا دەفەرمـوێ: ﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ ﴿٤٤﴾ ﴾النحـل. دەکرێـت ئـەم دەقە بۆ بڕیاردانـی نێوانی خەڵکـی دابەزی بێت، لـە بـواری جیـاوازیو دووبەرەکیدا، وە سـەرجەم ئاینەکانـی تریش هەمان کاریـان هەبووە، وە دەگونجێـت ئـەم دوو دەقـە یـەک واتایـان هەبێـت، ئـەو کات مانای حوکم کـردن لە نێـوان خەڵکیـدا، سـەرجەم ئـەو بڕیارانە دەگرێتـەوە لە بوارەکانـی خوێنو نامـووسوماڵو سـامانو سـەرجەم مافەکانـی تر، وە لە بـواری بیروبـاوەڕو سـەرجەم بوارەکانـی بڕیارداندا. وە کە دەفەرموێ: ﴿ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُ ﴾ واتە: نەک بە هەواو ئارەزووی خۆت، بەڵکو بەو بڕیارەی کە خوا پێشانی داویتو فێری کردووی، وەک دەفەرموێ: ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ﴿٤﴾ ﴾النجم. ئەم دەقە بەڵگەیە لەسەر پاکیو پارێزراوی پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئەو پەیامەی کە ڕایدەگەیەنێت لە لایەن خوای گەورەوە لە هەموو بڕیارەکاندا.

وە هەروەهـا مەرجـە دادوەر خـاوەن زانسـتو دادپەروەری بێـت، لەبەر فەرمایشـی خوا ﷻ: ﴿ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُ ﴾ نەیفەرمـووە: (بمـا رأیت) واتـە: بەوەی کە بینیوتـە، (بەڵکو فەرموویەتی: بـەوەی خـوا پێشـانی داویـت). وە هەروەهـا خـوای گـەورە مەرجـی دانـاوە بۆ کەسـێک کـە دادوەری دەکاتو بڕیـار دەدات لـە نێو خەڵکیدا پێویسـتە خاوەن زانسـتو شـارەزایی بێـت لـە قورئانـدا، وە کاتێـک کـە فەرمانـی بـە دادوەری کـردوە لـە نێـوان خەڵکیـدا بە دادپـەروەری بجوڵێتـەوە، قەدەغـەی لێ کـردوە سـتەمو زۆرداری بـکات، وەک دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَكُن لِّلْخَآئِنِينَ خَصِيمًا ﴾ واتە: مشـتومڕ لەگەڵ کەسـێکدا مەکـە کە خیانەتیت بـۆ دەرکەوتـووە، کە بانگەشـە بۆ شـتێک بـکات مافی ئـەوی پێوە نەبـێ، یـان نکووڵی لە ڕاستی بـکات، جـا بزانێـت یان گومـان بیات کـە تۆ مشـتومڕی لەگـەڵ ناکەی.

ئەمـە بەڵگەیەکـی ڕوونـە لـە قەدەغەکردنـی مشـتومڕی بـێ بنەما، لـە بواری مافـی دنیاو مافـی دوارۆژ، لـە هەمـان کاتـدا بەڵگەیە لەسـەر ئەوە مشـتومڕ لەگەڵ کەسـێکدا سـتەمی لـێ نەبینرابێ.

وَٱسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا (١٠٦) وَلَا تُجَٰدِلْ
عَنِ ٱلَّذِينَ يَخْتَانُونَ أَنفُسَهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ
خَوَّانًا أَثِيمًا (١٠٧) يَسْتَخْفُونَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَلَا يَسْتَخْفُونَ
مِنَ ٱللَّهِ وَهُوَ مَعَهُمْ إِذْ يُبَيِّتُونَ مَا لَا يَرْضَىٰ مِنَ ٱلْقَوْلِ
وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطًا (١٠٨) هَٰٓأَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ
جَٰدَلْتُمْ عَنْهُمْ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فَمَن يُجَٰدِلُ ٱللَّهَ عَنْهُمْ
يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَم مَّن يَكُونُ عَلَيْهِمْ وَكِيلًا (١٠٩) وَمَن يَعْمَلْ
سُوٓءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُۥ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورًا
رَّحِيمًا (١١٠) وَمَن يَكْسِبْ إِثْمًا فَإِنَّمَا يَكْسِبُهُۥ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ
وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا (١١١) وَمَن يَكْسِبْ خَطِيٓـَٔةً
أَوْ إِثْمًا ثُمَّ يَرْمِ بِهِۦ بَرِيٓـًٔا فَقَدِ ٱحْتَمَلَ بُهْتَٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا
(١١٢) وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكَ وَرَحْمَتُهُۥ لَهَمَّت طَّآئِفَةٌ مِّنْهُمْ
أَن يُضِلُّوكَ وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَضُرُّونَكَ
مِن شَيْءٍ وَأَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَعَلَّمَكَ
مَا لَمْ تَكُن تَعْلَمُ وَكَانَ فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكَ عَظِيمًا (١١٣)

﴿ وَٱسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ ﴾ ئـەوەی کـە لـە لایەن تـۆوە دەرچـووە، ئەگـەر دەرچـوو بـێ ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ واتـە: لـە تاوانـی گـەورە خـۆش دەبێـت بـۆ هـەر کەسـێک داوای لێخۆشـبوونی لێ کردبێتو بەڕاسـتی گەڕابێتەوە، وە خوا سەرکەوتووی کردبێـت بـۆ ئەنجامدانی کـردەوەی چاک پـاش گەڕانەوەی، کە شایسـتەی پاداشـتو لابردنـی سـزاکەی بێت.

﴿ وَلَا تُجَٰدِلْ عَنِ ٱلَّذِينَ يَخْتَانُونَ أَنفُسَهُمْ ﴾ (الإختيـان) بـە مانـای خیانەت دێـت، وە خیانەتیـش بـە مانـای تـاوانو سـتەمو دەسـتدرێژیی دێـت، وە ئەمـەش بەڵگەیـە لەسـەر قەدەغەکردنی مشـتومڕ، لەسـەر کەسـێک تاوانێـک بـکاتو ڕووبەڕووی سـزا ببێتـەوە، بە تۆڵـە لێ سـەندنەوە، یان سەرزەنشـت کردن، بەڕاسـتی مشـتومڕ لەسـەر ئەوە ناکرێت بۆ ئەوەی سـزاکەی لەسـەر لابدرێـت، یـان سـووک بکرێتـەوە ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ خَوَّانًا أَثِيمًا ﴾ واتـە: زۆر خیانەتـکارو تاوانبـار، ئەگـەر نەرێنی خۆشەویسـتی کـرا، ئـەوە بێگومان دژەکـەی جێگیر دەبێ.

پاشـان قسـە لەسـەر ئەو خیانەتکارانـە دەکات کـە دەفەرموێ: ئـەوان ﴿ يَسْتَخْفُونَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَلَا يَسْتَخْفُونَ مِنَ ٱللَّهِ وَهُوَ مَعَهُمْ إِذْ يُبَيِّتُونَ مَا لَا يَرْضَىٰ مِنَ ٱلْقَوْلِ ﴾ بـە ڕاسـتی ئەمە لـە لاوازی بـڕواو ناتـەواوی دڵنیاییانـە، کـە ترسـی خەڵکـی لـە لای ئـەوان لە ترسـی خوا گەورەتـر بێـت، هەمـوو ڕێگاکان بـەکار دەهێنن چاک بێـت، یان خراپ، تەنهـا بۆ ئەوەی خەڵکـی لـە خۆیـان ڕازی بکەن، بـەڵام لەگەڵ ئـەوەدا زۆر بێ شـەرمانە سـنوورەکانی خوا دەشـکێنن، هـەر بە خەیاڵیشـیاندا نایەت کە خـوا ﷻ دەیانبینێتو ئاگـاداری کردەوەکانیانە، خـوای گـەورە بـە زانسـتی لەگەڵیاندایە لە هەمـوو بارودۆخەکانـدا، بە تایبەت کە بـە نهێنی لـە شـەودا تەگبیـر دەکەنو قسـەیەک دەکـەن کە خوا پێـی ڕازی نیـە، لە بـێ تاوانکردنی

تاوانبــارو تۆمەتبــار کردنــی بێ تــاوان، وە هــەوڵ دەدەن ئەوەی کــە لە شــەودا کردوویانە، بــەڕۆژ بیهێنـنــە خزمەت پێغەمبــەر ﷺ بۆ ئەوەی ڕازی بکەن، بەڕاســتی ئــەم نامەردانە کۆمەڵە تاوانێکیــان پێکــەوە کۆکــردەوەو بیریان لــەوە نەدەکردەوە کە خــوا چاودێرە بەســەر نهێنی زەوی‌و ئاســمان‌و ســەرجەم نهێنیەکانیــان‌و ئەوەشــی کــە لــە نــاخ‌و دەروونیاندایــە، لەبــەر ئەمــە خــوا ﷻ هەرەشــەیان لــێ دەکات بــە ڕســتەی: ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطًا﴾ واتــە: بە ڕاســتی خــوای ئاگادار بە زانســتی خــۆی دەوری کردەوەکانی ئەوانــی داوە، لەگەڵ ئەمــەدا ســزای بــۆ پێــش نەهێناون بەڵکــو نــەرم‌و نیانی لەگەڵــدا نوانــدن، وە ڕێگــای داوای لێخۆشــبوونی پــێ پێشــاندان‌و ئاگــاداری کردنــەوە لــە بــەردەوام بوون لەســەر ئــەو تاوانە، کــە دەبێتــە مایەی پێویســت بوونی ســزای بــە ئێــش ﴿هَٰٓأَنتُمۡ هَٰٓؤُلَآءِ جَٰدَلۡتُمۡ عَنۡهُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا فَمَن يُجَٰدِلُ ٱللَّهَ عَنۡهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ أَم مَّن يَكُونُ عَلَيۡهِمۡ وَكِيلٗا﴾ ئەوەتــا ئێــوە لــە ژیانــی دنیــادا بەرگریتــان لێکــردن، وە بەرگریەکەتــان بــوو بــە مایــەی نەهێشــتنی هەنــدێ لــەوەی کە لێی دەترســان، لە ســەر شــۆڕی‌و ڕیســوایی لــە لای خەڵک؟ ئــەی لــە ڕۆژی قیامەتــدا کــێ بەرگریــان لــێ دەکات، کاتێک کــە بەڵگەکان بەســەریاندا دەســەپێت، وە زمــان‌و دەســت‌و قاچەکانیــان کــە ئــەو کردەوانەیان پــێ کردوە شــایەتیان لەســەر دەدات؟ ﴿يَوۡمَئِذٖ يُوَفِّيهِمُ ٱللَّهُ دِينَهُمُ ٱلۡحَقَّ وَيَعۡلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ ٱلۡمُبِينُ ٢٥﴾ النــور. کــێ بەرگریــان لــێ دەکات بەرانبەر ئەو کەســەی کە خــاوەن نهێنی‌و ئاشــکراکانە وە چۆن شــایەت حاڵــی لەســەر ئامــادە دەکات کــە نەتوانێــت نکوولــی لــێ بــکات؟ وە لــەم دەقەدا ڕێنماییــەک بــەدی دەکرێــت بــۆ تاوتوێکردنــی نێــوان بەرژەوەنــدی دونیــا کــە پشــت بە وازهێنــان لــە فەرمانەکانی خوا دەبەســتێت، یان ئەنجامدانــی قەدەغەکراوەکانــی، وە لە نێوان لەدەســت دانــی پاداشــتی ڕۆژی دوایــی یان ســزاکەی بە دەســت بهێنێت، ئەو کەســەی کە دەروونــی فەرمانــی پێــدەکات بــە وازهێنان لــە فەرمانی خــوا دەڵێــت: ئاخــۆ فەرمانی خوای گــەورەت جــێ بەجێ نەکرد بــە هۆی تەنبەڵــی‌و تەوەزەلیــەوە، دەی ئەو قازانجــە چیە کە بە دەســتت هێنــا؟ چەندە پاداشــتی دنیات لە دەســت چوو؟ ئــەو وازهێنانە چی بــە دوای خۆیدا هێنــا لــە بەدبەختــی‌و گومڕایــی‌و زەرەرمەنــدی؟ وە بە هەمان شــێوە ئەگــەر دەروونی بانگی بــکات بــۆ تێرکردنــی ئــارەزووە قەدەغەکراوەکانــی، پێی دەڵێــت: ئەوە چیە ئــەوەی هەواو ئــارەزووت داوای لــێ کردیــت ئەنجامتــدا؟؟ بــە ڕاســتی چێژی تــەواو دەبێ، وە ئــەوەی بە جێــی دەهێڵێــت لــە خــەم‌و پەژارەو لــە دەســتدانی پاداشــت‌و بەدەســتهێنانی ســزایە، مرۆڤی

ژیــرو عاقــڵ چۆن لــەم ڕەفتارانــە بــە دوور نابێت.
ئەمــە لــە گەورترینیانە کە ســوود بــە بەندە بگەیەنێــت ئەگەر خــاوەن تێڕامان بێــت، خاوەن عەقڵێکــی ڕاســتەقینە بێــت، بــە پێچەوانــەی ئــەو کەســەی کە بانگەشــە بــۆ عەقــڵ گەرایی دەکات، بەڕاســتی ئەوە نەفامیو ســتەمە- خۆشــی لەززەتی کاتیو پشــووی ئێســتاو هەنووکە بە کاتــی بەردەســت دەبێت.
خــوا ﷻ دەفەرمــوێ: ﴿ وَمَن يَعۡمَلۡ سُوٓءًا أَوۡ يَظۡلِمۡ نَفۡسَهُۥ ثُمَّ يَسۡتَغۡفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴾ واتــە: هــەر کەســێک بوێرێتو نەترســێت لــە ســەرپێچی کردنو تــاوان ئەنجام بدات، پاشــان داوای لێخۆشــبوون لە خوا بــکات داواکردنێکی ڕاســتەقینە، ئــەوە دەگەیەنێت کــە دانی ناوە بــە تاوانەکەی خۆیداو پەشــێمان بووەتەوەو خــۆی لێی دارنیوە، ئەمە بەڕاســتی خــوا پەیمانــی پێــداوەو پێچەوانــەی پەیمانەکانــی نــاکات، بــە لێخۆشــبوونو لێبــوردن، لەو تاوانــەی کــە کردوویەتــی، وە ئــەو ناتەواویانەی بــۆ دەســڕێتەوە، وە دەیخاتە ســەر کردەوە چاکــەکان، وە لــە تەمەنیدا ســەرکەوتووی دەکاتو ناهێڵێت تاوان باڵی بەســەردا بکێشــێت، وە ئەگــەر لێــی خــۆش بــوو، لێی خــۆش دەبێت لەســەر ئەوەی کــە دامەزراوە لەســەری.
بزانــە بە ڕاســتی کــرداری خراپ بە گشــتی ســەرجەم ســەرپێچیەکان دەگرێتــەوە بچووک بــێ، یان گــەورە، وە لەبەر ئــەوە ناو نراوە بە (سوء) چونکــە خاوەنەکــەی پەلکێش دەکات بــۆ ســزادان، وە لەبــەر ئەوە لــە ناخیدا چــاک نیە.
بە هەمان شــێوە ســتەم کــردن لە دەروون بــە ڕەهایــی هاوەڵدانانو خوار ئــەوەش دەگرێتەوە لــە تــاوان کردن، بــەڵام ئەگەر یەکێکیــان گرێ درا بە ئــەوی ترەوە، ئەوە هەنــدێ جار هەر یەکــەو بــە شــێوەیەکی گونجاو لێکدانــەوەی بــۆ دەکرێت، لێــرەدا (عمل السوء) کرداری خــراپ، لێکدانــەوەی بــۆ دەکرێــت بــە مانای ســتەم (ظلم) کــە خراپەیــە لەگــەڵ خەڵکیدا، ئەویــش ســتەم لێکردنیانــە لــە خوێــنو مــاڵو ناموســیاندا. وە ســتەمی نەفــسو دەروون بە ســتەمو ســەرپێچی لێکدەدرێتــەوە، کە لــە نێوانی خواو بەنــدە دایە.
وە بۆیــە ســتەمی دەروون ناونــراوە بــە (ظلم) چونکــە مرۆڤ خاوەن نەفســی خــۆی نیە، بە هەر شــێوەیەک ویســتی هەڵســوکەوتی پێوە بکات، بێگومــان ئەوە موڵکی خــوای گەورەیە، ســپاردەی کردوەتە دەســتی بەندە، وە فەرمانی پێکردوە بە شــێوەیەکی دادپەروەرانە مامەڵەی لەگەڵــدا بــکات، بە پابەنــد کردنی بە ڕێگای ڕاســتەوە بە زانســتو کردار، هەوڵو کۆشــش دەکات فێــری فەرمانەکانــی بــکاتو بــە پێــی توانا کاریان پێ بکات، کۆشــش پــێ کردنی

جگە لەم ڕێگایە ستەم لە نەفس‌و دەروونی، وە خیانەتە، وە لادانە لەسەر ڕێگای ڕاست کە دژی ستەم‌و خراپەیە.

پاشان خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَكْسِبْ إِثْمًا فَإِنَّمَا يَكْسِبُهُۥ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ ﴾ ئەمە هەموو گوناهبارێک دەگرێتەوە، لە گوناهی بچووک یان گەورە، هەر کەسێک گوناهێک بکات ئەوە سزای دنیایی‌و دواڕۆژی تەنها بۆ خۆیەتی، دانابەزێتە سەر کەسێکی تر، وەک چۆن خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴿١٦٤﴾ ﴾الأنعام. (واتە: هیچ کەسێک گوناهی کەسێکی دیکە هەڵناگرێ).

بەڵام ئەگەر تاوان‌و سەرپێچیەکان زۆر ئاشکرا بوون، بەرهەڵستی لێ نەکرا (لە لایەن هیچ مسوڵمانێکەوە)، ئەوە سزاو گوناهەکان گشتگیر دەبن، بێگومان لە بڕیاری ئەم ئایەتە بەرێزە دەرناچێت، چونکە هەر کەسێک واز لە نکوڵی پێویست بهێنێت ئەوە ئەویش بەشدار دەبێت لەو گوناهە.

وە لەم دەقەدا دادپەروەری حیکمەتی خوا دەردەکەوێت، چونکە ئەو سزای کەس نادات بە گوناهی کەسێکی تر، وە بە هەمان شێوە تەنها بە ئەندازەی گوناهەکەی سزای دەدات، ئا لەبەر ئەمە دەفەرموێ: ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴾ واتە: خاوەن زانیاریی‌و حیکمەتی تەواوە.

لە زانیاریی‌و حیکمەتی خوا ﷻ ئەوەیە کە بە گوناه دەزانێت، وە دەزانێت بۆچی کردوویەتی‌و؟ چ هۆکارێک لە پشتیەوە بووە؟ وە چ سزایەک شایستەی ئەو گوناهەیە؟ وە لە حاڵەت‌و دۆخی تاوانبار دەزانێت، وە ئەوەش دەزانێت کە هۆکاری ئەو گوناهە دەروونی بووە کە هەمیشە بانگکەر بووە بۆ گوناح، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا گوناهبار بەردەوام یادی خوا دەکات داوای لێخۆشبوون دەکات، بێگومان خوا لەو گوناهەی خۆش دەبێ‌و سەرکەوتووی دەکات بۆ داوای لێبوردن. بەڵام ئەگەر بە بوێری‌و سەرسەختیەوە ئەو تاوانەی ئەنجامداو سنووری خوای بەزاندو شەرمی لە بینینی خوا نەکرد، وە سزای خوای پشت گوێ خست‌و سستی نواند، بەڕاستی ئەمە دوورە لە لێخۆشبوونەوەو دوورە لەوەی کە خوا هانی بدات بۆ ڕێگای تەوبەو لێخۆشبوون.

پاشان دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَكْسِبْ خَطِيٓـَٔةً ﴾ واتە: تاوانێکی گەورە ﴿ أَوْ إِثْمًا ﴾ یان گوناهێک بکات ﴿ ثُمَّ يَرْمِ بِهِۦ بَرِيٓـًٔا ﴾ واتە: پاشان کەسێکی تری پێ تۆمەتبار بکات، ئەگەر چی ئەو کەسەش گوناهبار بێت ﴿ فَقَدِ ٱحْتَمَلَ بُهْتَـٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴾ واتە:

بەڕاستی بوختانێکی خستووەتە سەر شانی خۆی بەرانبەر بە کەسێکی بێ تاوان، وە گوناهێکی ئاشکراو ڕوونی ئەنجام داوە، وە ئەمە بەڵگەیە لەسەر تاوانە گەورەکان کە خاوەنەکەی تیادەبات. بەڕاستی کۆمەڵە زیانێک دەگرێتە خۆ: بەدەست هێنانی خراپە (لە نێوان خۆیو خەڵکدا) وە گوناح (لە نێوان خۆیو خوادا)، پاشان بیخاتە ئەستۆی بێ خەتایەکەوە، پاشان ئەو درۆ ناشرینە بکات بۆ ئەوەی خۆی ڕزگاری بێت، وە تاوانبار کردنی بێ تاوان، پاشان ئەوەی کە لەسەری دادەمەزرێت لە سزای دنیایی، تاوان دەدرێتە پاڵ کەسێکی تر، پاشان لەسەر ئەوە یاسای بەسەردا جێ بەجێ دەکرێت. پاشان ئەوەی لەسەر ئەوە دادەمەزرێت لە قسەی خەڵکی بەرانبەر بە بێ تاوان بە دانەپاڵی شتی خراپو ناشایستە، داوا لە خوا دەکەین بمانپارێزێت لە هەموو خراپەیەک.

ئنجا باسی فەزڵو منەتی خۆی دەکات بەسەر پێغەمبەرەکەیەوە بە پاراستنو پارێزگاری لێکردنی لەو کەسانەی کە ویستوویانە گومرای بکەن، دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكَ وَرَحْمَتُهُ لَهَمَّت طَّائِفَةٌ مِّنْهُمْ أَن يُضِلُّوكَ ﴾ ئەم دەقە پیرۆزانە مانا لێکدەرەوانی قورئان باسیان لە هۆی دابەزینی کردوە، دەڵێن: خانەوادەیەک لە مەدینە دزییان کرد، کاتێک دزیەکەیان ئاشکرا بوو ترسان، ماڵە دزراوەکەیان بردو فڕێیان داوە ماڵی کەسێکی بێ ئاگاوە، دوایی دزەکە بە پشتیوانی هۆزەکەی ڕۆشتن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ داوایان لێکرد هاوڕێکەیان بێتاوان بکات لە بەرچاوی خەڵکیدا، وتیان: ئەو دزی نەکردوە، بەڵام ئەوەی کە دزی کردوە ئەو کەسەیە کە شتە دزراوەکە لە ماڵەکەیدا بووە، ئەو بێ تاوانە، پێغەمبەر ﷺ ویستی بێ تاوانی بکات، خوا ﷻ ئەم ئایەتانەی دابەزاند وەک ئاگادارکردنەوەیەکو ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستیە، هۆشیار کردنەوەو ترساندنێک بۆ پێغەمبەر ﷺ لە پارێزگاری کردن لە خیانەتکاران، بەڕاستی گومراکردن دوو جۆرە: گومرابوونێک لە نەزانی، ئەویش نەفامیە بەرانبەر بە ڕاستی، وە گومرابوونێک لە کرداردا، ئەویش کارکردنە بە پێچەوانەی ئەوەی کە پێویستە، خوا ﷻ پێغەمبەرەکەی لەم جۆرەیان پاراستووە. خوا ﷻ هەواڵی داوە کە فێڵو تەڵەکەکانیان دەگەڕێتەوە بۆ سەر خۆیان، وەک حاڵەتی هەموو فێڵبازێک، دەفەرموێ: ﴿ وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ ﴾ (کەسیان گومرا نەکرد جگە لە خۆیان) بەو فرتو فێڵە، وە نەگەیشتن بە ئامانجەکانیانو هیچیان بەدەست نەهێنا جگە لە بێبەش بوونو ڕیسواییو تاوانو خراپە. بەڕاستی ئەمە نیعمەتێکی گەورەیە بەسەر پێغەمبەرەوە کە نیعمەتی کردار لە خۆ

دەگرێــت، ئەویــش ســەرکەوتنە بــۆ ئەو کــردارەی کــە پێویســتەو پارێزگــاری لێکردنە لە هەمــوو قەدەغەکراوێک.

پاشــان باســی نیعمەتەکانی خــۆی دەکات لە زانســت بەســەریەوە، دەفەرموێ: ﴿ وَأَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ ﴾ واتــە: خــوا قورئانــی پیــرۆزی ناردوەتە خوارەوە بۆ ســەرت، کــە ڕوونکەرەوەیە بۆ هەموو شــتێک، وە زانســتی ســەرەتاکانو کۆتاییەکانــی تێدایە.

وە (الحكمـة) یــان ســوننەتە، وەک چــۆن هەنــدێ لــە زانایانــی پێشــین وتوویانە: بەڕاســتی ســوننەتی بــۆ دابەزیــوە وەک چــۆن قورئانــی بــۆ دابەزیوە، یــان زانســتی نهێنی شــەریعەتە کــە لــە زانینــی فەرمانەکان، وە دانانی شــتەکانە لــە جێگای خۆیانــدا، وە ڕێکخســتنی هەموو شــتێک بە پێــی خۆی.

﴿ وَعَلَّمَكَ مَا لَمۡ تَكُن تَعۡلَمُ ﴾ ئەمــە هەمــوو زانســتەکانی خــوا دەگرێتــەوە بــە گشــتی، بێگومــان پێغەمبــەر ﷺ وەک چــۆن خــوا ﷻ پێــش پێغەمبەرایەتی وەســفی کــردوە بەوەی: ﴿ مَا كُنتَ تَدۡرِي مَا ٱلۡكِتَٰبُ وَلَا ٱلۡإِيمَٰنُ ﴿٥٢﴾ ﴾ الشـوری.

هەروەهــا دەفەرمــوێ: ﴿ وَوَجَدَكَ ضَآلّٗا فَهَدَىٰ ﴿٧﴾ ﴾ الضحی. پاشــان بــەردەوام خوا ﷻ نیگــای بــۆ دادەبەزانــدو فێــری دەکــردو بۆی تــەواو دەکــرد، هەتا گەیشــتە ئەوپــەڕی پلە لــە زانســتدا، هیــچ کــەس لــە پێشــینو دوایــن ناتوانێــت بگــات بــەو ئامانجــە، هەتــا بوو بــە زاناتریــن خەڵــک بــە ڕەهایــی، وە لــە هەمــوو مرۆڤــەکان تەواوتر بــوو، ئا لەبــەر ئەمە دەفەرمــوێ: ﴿ وَكَانَ فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكَ عَظِيمٗا ﴾ چاکــەی خــوا ﷻ بەســەر پێغەمبەرەوە گەورەتــرە لــە چاکەی هەموو دروســتکراوەکان، وە شــێوەی چەشــنی ئــەو چاکانەی خوای گــەورە لــە توانای کەســدا نیــە لێــی بکۆڵێتــەوە، وە ژماردنی ئاســان نیە.

۞ لَّا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَاهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ
أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَاحٍ بَيْنَ النَّاسِ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ
ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا (١١٤) وَمَن
يُشَاقِقِ الرَّسُولَ مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَىٰ وَيَتَّبِعْ غَيْرَ
سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ ۖ وَسَاءَتْ
مَصِيرًا (١١٥) إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ
ذَٰلِكَ لِمَن يَشَاءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا
بَعِيدًا (١١٦) إِن يَدْعُونَ مِن دُونِهِ إِلَّا إِنَاثًا وَإِن يَدْعُونَ
إِلَّا شَيْطَانًا مَّرِيدًا (١١٧) لَّعَنَهُ اللَّهُ ۘ وَقَالَ لَأَتَّخِذَنَّ مِنْ
عِبَادِكَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا (١١٨) وَلَأُضِلَّنَّهُمْ وَلَأُمَنِّيَنَّهُمْ
وَلَآمُرَنَّهُمْ فَلَيُبَتِّكُنَّ آذَانَ الْأَنْعَامِ وَلَآمُرَنَّهُمْ
فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ اللَّهِ ۚ وَمَن يَتَّخِذِ الشَّيْطَانَ وَلِيًّا مِّن
دُونِ اللَّهِ فَقَدْ خَسِرَ خُسْرَانًا مُّبِينًا (١١٩) يَعِدُهُمْ
وَيُمَنِّيهِمْ ۖ وَمَا يَعِدُهُمُ الشَّيْطَانُ إِلَّا غُرُورًا (١٢٠) أُولَٰئِكَ
مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَلَا يَجِدُونَ عَنْهَا مَحِيصًا (١٢١)

(١١٤): ﴿ لَّا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَاهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَاحٍ بَيْنَ النَّاسِ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا (١١٤) ﴾

واتــە هیــچ چاکەیەک نیــە لە زۆربــەی چپە کردنــی خەڵکــی لە نــاو یەکتــردا، وە ئەگەر خێــری تێــدا نەبێــت، یــان هیــچ ســوودێکی نیە، وەک قســەی زیادەی ڕێگــە پێدراو، یان قســەکە شــەڕو خراپە وەک قســەی حەرامو قەدەغەکــراوە بــە هەمــوو جۆرەکانیــەوە. پاشــان خــوا ﷻ جیــای کردوەتــەوە وەک دەفەرمــوێ: ﴿ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ ﴾ لە ماڵو دارایــی، یــان زانســت، یــان هــەر ســوودو قازانجێــک بێــت، بەڵکــو ئــەو پەرستشــانەی کــە کورتکرانەتــەوە، وەک: تەســبیحو تەحمیدو هاوشــێوەکانیان. وەک چــۆن پێغەمبــەر ﷺ دەفەرمــوێ: {إِنَّ بِكُلِّ تَسْبِيحَةٍ صَدَقَةً، وَكُلِّ تَكْبِيرَةٍ صَدَقَةً، وَكُلِّ تَحْمِيدَةٍ صَدَقَةً، وَكُلِّ تَهْلِيلَةٍ صَدَقَةً، وَأَمْرٌ بِالْمَعْرُوفِ صَدَقَةٌ، وَنَهْيٌ عَنِ الْمُنْكَرِ صَدَقَةٌ، وَفِي بُضْعِ أَحَدِكُمْ صَدَقَةٌ} (أخرجه مسلم برقم: (١٠٠٦)).

واتــە: بێگومــان بــۆ وتنی: هەمــوو (ســبحان الله)یەک چاکــە هەیە، وە بــۆ وتنی هەمــوو (الله أكبر)ێــک چاکــە هەیــە، وە وتنی (لا إلـه إلا الله)یەک چاکــە هەیە، وە فەرمانکــردن بە چاکە چاکەیــە، وە قەدەغــە کردنــی خراپــە چاکەیــە، وە لــە جــووت بوونــی هــەر یەکێک لــە ئێوە لەگــەڵ خێزانەکەیــدا چاکەیە.

﴿ أَوْ مَعْرُوفٍ ﴾ بریتیــە لــە چاکەکاریــیو گوێڕایەڵی، وە هەموو شــتێکە کە بە پێی شــەرعو عەقــڵ بــاش بێــت، وە ئەگــەر فەرمان بە چاکــە بە تەنها هــات، وە بــە دواییدا قەدەغــە کردنی خراپــە نەهــات، ئــەوە مانــای قەدەغەکرنــی خراپــەش دەگەیەنێــت، لەبــەر ئــەوە واز هێنان لە قەدەغەکــراوەکان لــە کارە چاکەکانــە، بــە هەمــان شــێوە کاری چاکە تــەواو نابێــت بەبێ واز هێنان لــە خراپە.

بـەڵام ئەگـەر پێکـەوە هاتن ئەوە هەر یەکـەو مانای خـۆی دەگەیەنێت، چاکە مانـای کرداری چاکـە دەگەیەنێـتو قەدەغـە کردنی خراپەش مانـای دوور کەوتنـەوە لە خراپـە دەگەیەنێت. ﴿أَوْ إِصْلَٰحٍۭ بَيْنَ ٱلنَّاسِ﴾ چاکەکاریـیو ڕێکخسـتن تەنهـا لـە نێـوان دژدا دێتـە جێ کە کێشـەو ناکۆکـی لە نێوانیانـدا هەبێـت، وە ململانـێو ڕقو کینـەو ڕکابەریو شـەڕو خراپەو دووبەرەکـی بـە دوای خۆیـدا بەجـێ دەهێڵێـت، لەبەر ئەمە خـوا ﷻ جەخت دەکاتەوە لەسـەر هانـدان بـۆ چاکەکـردن لە نێـوان یەکتردا لە کێشـەی خوێنوماڵو سـامانو حەیاو شـەرەفدا، بەڵکـو لـە ئایینەکانیشـدا، وەک خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿وَٱعْتَصِمُوا۟ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا۟ ﴿١٠٣﴾﴾ آل عمـران.

وە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا۟ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا ۖ فَإِنۢ بَغَتْ إِحْدَىٰهُمَا عَلَى ٱلْأُخْرَىٰ فَقَٰتِلُوا۟ ٱلَّتِى تَبْغِى حَتَّىٰ تَفِىٓءَ إِلَىٰٓ أَمْرِ ٱللَّهِ ﴿٩﴾﴾ الحجـرات. وە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿وَٱلصُّلْحُ خَيْرٌ ۗ ﴿١٢٨﴾﴾ النسـاء. ئەوەی کـە نێوانی خەڵکی چاک دەکات باشـترە لـەوەی خواپەرسـتی بکات بـە نوێـژو ڕۆژوو خێرو چاکـە، وە چاکە خواز هەر دەبـێ کردارو مانـدوو بوونـی چاک بـکات. ئەوەی هـەوڵ بـۆ خراپـەکاری دەدات خوا ﷻ سـەرکەوتووی نـاکات، وە ناگـات بە ئاواتی خـۆی، وەک چۆن خـوای گەورە دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُصْلِحُ عَمَلَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٨١﴾﴾ یونـس. ئـەم کارانـە بـە هـەر شـێوەیەک بکرێـت هەر خێـرە، وەک چـۆن بەڵگەیە لەسـەر ئـەو هەڵاوێردنە.

بـەڵام پاداشـتی تەواو بـە پێی نیەتو دڵسـۆزیە، لەبەر ئەمـە خوای گـەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ بەڕاسـتی پێویسـتە لەسـەر بەنـدە مەبەسـتی ڕووکردنـە خـوا بێـت، وە بـە کرداریش دڵسـۆز بێـت لە هەمـوو کاتەکانـدا، وە لە هەموو بەشـێک لە بەشـەکانی خێـرو چاکەدا، لەبـەر ئەوە پاداشـتی گەورە بەدەسـت بهێنێتو لەگـەڵ دڵسـۆزیدا ڕابێـتو ببێت بە یەکێک لە دڵسـۆزانو پاداشـتی تەواوی دەسـت بکەوێت بەبێ کەمو کورتی، یەکسـانە مەبەسـتەکە هاتووەتـە دی، یان نەهاتووەتـە دی، چونکە نیەتەکە دامـەزراوەو بە پێی پێویسـت کرداریشـی بـۆ کراوە.

(١١٥-١١٦): ﴿وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلْهُدَىٰ وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ ٱلْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصْلِهِۦ جَهَنَّمَ ۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ﴿١١٥﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴿١١٦﴾﴾:

ئـەوەی پێچەوانـەی پێغەمبـەر ﷺ بجوڵێتـەوەو بەرهەڵسـتیو سەرکەشـی لـە بەرانبـەر ئـەوەدا

بـکات کـە هێناویەتـی ﴿ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ ﴾ بە بەڵگـەی قورئانیو فەرموودەی سـەلمێنراو ﴿ وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾ شـوێنی بیرو بڕواو کردارەکانیان بکەوێت ﴿ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ ﴾ واتـە: وازی لـێ دەهێنیـن لەسـەر ئـەوەی کـە بـۆ خـۆی هەڵیبــژاردووەو ڕیسـوای دەکەینو سـەرکەوتووی ناکەیـن بـۆ خێرو چاکە، چونکە ڕاسـتی بینیـوەو زانیویەتیو وازی لـێ هێناوە، ئـەوە پاداشـتی لـە لایـەن خـوای گـەورەوە دادپەروەریـە کـە لەسـەر گومرایـی بیهێڵێتەوەو گومراتـری بکات، وەک خوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ فَلَمَّا زَاغُوٓاْ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمۡ ۝٥ ﴾ الصف. وە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَنُقَلِّبُ أَفۡـِٔدَتَهُمۡ وَأَبۡصَٰرَهُمۡ كَمَا لَمۡ يُؤۡمِنُواْ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٖ ۝١١٠ ﴾ الأنعام بەڵگە لەسـەر تێگەیشـتن لـەم دەقەدا ئەوەیە کـە هەر کەسـێک دژایەتی پێغەمبـەر نەکاتو بە شـوێن ڕێبـازی ئیمانداران بکەوێت، بـەوەی کە تەنها مەبەسـتی بۆ خوا بێت، وە شـوێنکەوتنی سـوننەتی پێغەمبەر ﷺ بێتو لەگەڵ کۆمەڵی مسـوڵمانان‌دا بێت، ئەگەر گوناهێکیشـی کرد، یان ویسـتی بیـکات کە ئـەوەش دەروونی مرۆڤـەو زاڵبوونی ئەو سروشـتەیە، ئەوە خـوا ﷻ نایداتە دەسـت نەفـسو شـەیتانەکەیەوە، بەڵکو بـە میهرەبانی خۆی دایدەپۆشـیو منەتـی خۆی دەکات بەسـەریدا بەوەی کە پاراستوویەتی لە هەموو خراپەیەک، وەک خوا ﷻ دەربارەی یوسف عليه السلام دەفەرمـوێ: ﴿ كَذَٰلِكَ لِنَصۡرِفَ عَنۡهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلۡفَحۡشَآءَۚ إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُخۡلَصِينَ ۝٢٤ ﴾ یوسف. واتـە: بـە هـۆی دڵسـۆزیەوە لە خراپەو داوێن پیسـی بـە دوورمان کـرد، وە بە هەمـان شـێوە هەموو دڵسـۆزێک دەگرێتـەوە، وەک چۆن هەمـوو هۆکارەکان بەڵگەن لەسـەر ئەوە.

وە کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَنُصۡلِهِۦ جَهَنَّمَ ﴾ واتـە: سـزایەکی دەدەیـن سـزایەکی مـەزن، ﴿ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا ﴾ واتـە: پاشـەڕۆژێکی زۆر خراپ. بە ڕاسـتی ئەم هەڕەشـە بۆ ئەو کەسـانە دانـراوە کـە دژایەتـی پێغەمبـەر ﷺ دەکـەنو پێچەوانـەی ئیمانـداران دەجوڵێنـەوە، مەگـەر تەنهـا خـوا ﷻ خـۆی بیژمێرێـت، بە پێـی تاوانەکەیە بچـووک بێت یـان گـەورە، هەندێکی خاوەنەکـەی بـۆ هەتا هەتایی لـە دۆزەخدا دەهێڵێتـەوە، وە سەرشـۆڕی دەکات، وە هەندێکی لە خـوار ئەوەوەیـە، لەوەیـە دەقـی دووەم زیاتر درێــژە بەم ڕەهاییە بـدات. ئەویـش بریتیە لەوەی کـە بـە ڕاسـتی خـوا ﷻ لـە شـیرکو هاوەڵدانـان خـۆش نابێـت، چونکـە لەکـەدار کردنی پەروەردگـاری جیهانیـان لە خۆ دەگرێت لە یەکتاپەرسـتیدا، وە یەکسـان کردنی دروسـتکراو کـە هیچـی بـە دەسـت نیـە، نـە بـۆ دەروونی خـۆیو نـە بۆ کەسـانی تـر، لـە بەرانبـەر ئەو خوایـەی کـە خاوەنـی زەویو ئاسـمانە، وە خێـرو شـەڕ تەنهـا بـە دەسـتی خۆیەتـی، وە هەر

نــازو نیعمەتێــک هەبێــت لەم دنیایــەدا تەنها لــە لای ئەوەوەیــە، وە هیچ کــەس ناتوانێت بەلاو موسـیبەتی ڕەتبکاتــەوە بێجگــە لــە خــۆی نەبێــت، کــە کەمــاڵو تــەواوی تەنها هی ئــەوە لە هەمــوو ڕووەکانــەوە، وە دەوڵەمەنــدیو بــێ نیــازی تــەواوە لە هەمــوو ڕووەکانەوە. بە ڕاسـتی گەورەتریــن سـتەمو ئەوپــەڕی گومڕایــی ئەوەیــە کــە مرۆڤ بــە دڵســۆزی خوا نەپەرسـتێت کــە خــاوەن ئــەو ڕێــزو گەورەییــە، وە بەشــێک لــە خواپەرسـتیەکەی بــۆ خەڵکــی بێت، کە هیــچ سـیفەتێکی تەواویان نیــە، وە هیچ سـیفەتێکی بــێ نیــازیو دەوڵەمەندیان تێدانیــە، بەڵکو هیچیــان نیــە جگە لــە نەبــوون، نەبوونی بــوونو نەبوونــی تــەواویو نەبوونــی دەوڵەمەندی، ئا ئــەوە هــەژارە بــە مانای هــەژاری. بێگومــان ئەو تــاوانو ســەرپێچیانەی کە لە خوار شــیرکو هاوەڵدانانــەوەن، ئــەوە دەگەڕێتــەوە بــۆ ویســتی خــوا، ئەگــەر بیەوێت بــە ڕەحمــەتو دانایی خــۆی لێــی خۆش دەبێــت، وە ئەگــەر بیەوێــت بە دادپــەروەریو دانایــی خۆی ســزای دەدات، وە ئــەم دەقــە دەبێتــە بەڵگــە بۆ ئەوەی کــە یەکدەنگی ئــەم ئۆممەتــە بەڵگەیە، وە ئــەم ئۆممەتە پارێــزراوە لــە هەڵــە. وە مەبەســت لــەو وتــە ئەوەیــە: بــە ڕاسـتی هەڕەشــەی کردوە کــە هەر کەســێک پێچەوانــەی ڕێبــازی بــڕواداران بجوڵێتەوە سەرشــۆڕی بــکاتو بیخاتە نــاو ئاگرەوە، وە(سبیل المؤمنـين) ڕێبــازی بڕواداران، (ســبیل) تاکە هەموو بــڕواداران دەگرێتەوە لەســەر ئەو ڕێبــازە لــە بیرو باوەڕو کــردارەکان. ئەگەر یەکدەنگ بوون لەســەر پێویســت بوونی شــتێک، یــان بــە باشــیان زانینی، یان حــەرام بوونی، یــان بێزێنــراوی، یان ڕێگە پێــدراو، ئــەم ڕێگایانە، هــەر کەســێک پێچەوانەیــان بجوڵێتــەوە، پــاش یەکدەنگی ئــەوان لەســەری، ئــەوە ڕێگایەکی تــری گرتوتــە بــەر، وە بەڵگــە لەســەر ئــەوە فەرمایشــتی: ﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ﴿١١٠﴾ ﴾آل عمـران. بەڵگــە لــەم دەقــەدا ئەوەیە کــە بــە ڕاسـتی خوای گــەورە هەواڵــی داوە بڕواداران لــەم ئۆممەتــەدا فەرمان ناکــەن بە چاکە نەبێــت، ئەگــەر یەکدەنــگ بوون لەســەر پێویســت بوونی شــتێک، یان بــە باش زانینــی، ئەوە بێگومــان فەرمانــی پێکــراوە، بــە دەقی ئایەت دەیســەلمێنێت کــە چاکە، وە هیچ شــتێک نیە لە پــاش چاکــە جگــە لە خراپــە نەبێت، بــە هەمان شــێوە ئەگەر یەکدەنگ بوون لەســەر شــتێکی قەدەغەکــراو، ئــەوە قەدەغەیان لــێ کراوە.

وە هاوشــێوەی ئەو فەرمایشــتەی کــە دەفەرمــوێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ ﴿١٤٣﴾ ﴾البقـرة.

خــوا ﷻ هــەواڵ دەدات کــە ئەم ئۆممەتەی کــردوە بە ئۆممەتێکــی نێوەنجی واتــە: دادپەروەرو

هەڵبژێـردراو، تـا ببنـە چاودێر بەسـەر خەڵکـەوە، واتە: لـە هەموو شـتێکدا، ئەگەر شـایەتیاندا لەسـەر بڕیارێـک کـە خـوا فەرمانـی پێکردوە، یـان قەدەغەی کـردوە، یـان ڕێگـەی پێداوە، ئەوە بەڕاسـتی شـایەتیەکەیان پارێزراوە، چونکە زاناو شـارەزان بەوەی شـایەتیان لەسـەر داوە، وە دادپـەروەرن لـە شـایەتیدانەکەیاندا، ئەگـەر کارەکـە بـە پێچەوانـەی ئـەوە ببوایـە، ئەوە نە دادپـەروەر دەبـوون لـە شـایەتی دانەکەیانداو نە زاناو شـارزا دەبـوون پێی. وە کـە دەفەرموێ: ﴿ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ ﴿٥٩﴾ ﴾النسـاء. تێگەیشـتن لـە دەقەکە ئەوەیە ئەگەر دووبەرەکیـان نەبوو، بەڵکو یەکدەنگ بوون لەسـەری، ئەوان فەرمانیان پێنەکـراوە بیگەڕێننەوە بـۆ قورئـانو سـوننەت، وە ئەوە نابێـت تەنها بە پێـی قورئانو سـوننەت نەبێت، بۆیـە پێچەوانە نیـە. بە ڕاسـتی ئـەم بەڵگانـە دەیبڕنەوەو یـەکلای دەکەنـەوە، کە یـەک دەنگی ئـەم ئۆممەتە بەڵگەیەکـی بڕاوەیـە، ئـا لەبـەر ئەمە خـوا ﷻ قێزەونـی گومڕاکەرانـی ڕوون کردوەتـەوە، بە فەرمایشتی:

(١١٧-١٢١): ﴿ إِن يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ إِنَٰثٗا وَإِن يَدۡعُونَ إِلَّا شَيۡطَٰنٗا مَّرِيدٗا ﴿١١٧﴾ لَّعَنَهُ ٱللَّهُۘ وَقَالَ لَأَتَّخِذَنَّ مِنۡ عِبَادِكَ نَصِيبٗا مَّفۡرُوضٗا ﴿١١٨﴾ وَلَأُضِلَّنَّهُمۡ وَلَأُمَنِّيَنَّهُمۡ وَلَأٓمُرَنَّهُمۡ فَلَيُبَتِّكُنَّ ءَاذَانَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ وَلَأٓمُرَنَّهُمۡ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلۡقَ ٱللَّهِۚ وَمَن يَتَّخِذِ ٱلشَّيۡطَٰنَ وَلِيّٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ فَقَدۡ خَسِرَ خُسۡرَانٗا مُّبِينٗا ﴿١١٩﴾ يَعِدُهُمۡ وَيُمَنِّيهِمۡۖ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا ﴿١٢٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ مَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُ وَلَا يَجِدُونَ عَنۡهَا مَحِيصٗا ﴿١٢١﴾ ﴾

واتـە: ئـەو بـت پەرسـتانە ناپاڕێنـەوە تەنهـا لـە چەند بتێکـی مێینـە نەبێـت، ناونراون بـە ناوە مێینـەکان، وەک: (العُزى ومناة)و هاوشـێوەیان، ئـەوەی کـە ڕوونو ئاشـکرایە نـاو بەڵگەیە بـۆ نێـوەڕۆک، ئەگـەر ناوەکانیـان نـاوی ئافرەتـی ناتـەواو بـێ، بەڵگەیـە لەسـەر ناتـەواوی ناولێنـراوەکان بـەو ناوانـە، سـیفەتی تەواوی لـە دەسـت داوە، وە وەک چۆن خـوا ﷻ هەواڵی داوە لـە چەندیـن شـوێنی کتێبەکەیـدا ئامـاژەی پـێ کردوە کـە ئەوانـە ناتوانن هیچ شـتیک دروسـت بکـەنو ڕۆزی بـدەن، وە ناتوانـن پشـتیوانی لەوانـە بکەن کـە دەیانپەرسـتن، بەڵکو ناشـتوانن نـە قازانـجو نـە زیان بـە دەروونـی خۆیـان بگەیەنـن، وە ناتوانن خۆیان سـەر بخەن بەسـەر ئـەوەی کـە دەیەوێـت زیانیـان پێبگەیەنێت، وە نە بیسـتنیان هەیـە، نە بینیـنو نە دڵ، چـۆن دەپەرسـترێت ئەگـەر کەسـێک ئەمە وەسـفی بێـت، وە واز لە دڵسـۆز بـوون بهێنێت بۆ ئـەو خوایـەی کە خـاوەن نـاوە جوانەکانو سـیفەتە بەرزەکانە، وە سـوپاسو تەواویو شـکۆو

بڵنـدیو عیـزەتو جوانـیو میهرەبانیو چاكـەو چاكەكاریـیو تەنهایی بە دروسـت كردنو ڕێكخسـنو حیكمەتـی گـەورە لە فەرمانو دەسـەڵاتە؟! ئایا ئەمە لە ناشـرینترینی ناشـرینەكان نیـە، كـە بەڵگەیـە لەسـەر ناتـەواوی خاوەنەكەی، وە گەیشـتنی بە ئەوپـەڕی بـێ عەقڵی نزمی كـە هیـچ وێنا كەرێـك ناتوانێت وێنـای بكات، یان هیچ وەسـف كـەرێ ناتوانێـت ئەو كەم عەقڵیـە وەسـف بـكات؟! وە لەگـەڵ ئەوەشـدا بەندایەتیەكانیـان بـۆ ئـەم بتـە ناتەواوانەیـە. لە ڕاسـتیدا ئـەوان تەنها شـەیتانیان پەرسـتووە كـە دوژمنێكی سەرسـەختیانە دەیەوێت لـە ناویان ببـات، وە هەمـوو هەوڵێـك دەدات بـۆ ئەو مەبەسـتە، ئـەوەش ئەوپـەڕی دووربوونـە لە خوای گـەورە، لەبـەر ئـەوە خوا نەفرەتی لـێ كـردوەو دووری خسـتووەتەوە لە میهرەبانـی خۆی، وە هـەوڵ بـۆ دوورخسـتنەوەی بەندەكانـی خـوا دەدات لـە میهرەبانی خـوا ﴿إِنَّمَا يَدْعُواْ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُواْ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٦﴾﴾ فاطر. لەبـەر ئەمەیـە خـوای گـەورە هەواڵیـداوە دەربـارەی هەوڵەكانی شـەیتان لە بـە لاڕێدا بردنی بەندەكانو جوان كردنەوەی شـتە خراپـەكان بۆیان، وە ئـەو سـوێند دەخوات بە پەروەردگـاری دەڵـێ: ﴿لَأَتَّخِذَنَّ مِنْ عِبَادِكَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا ﴿١١٨﴾﴾ النسـاء. واتـە: بـە دیاریكراو بـە دڵنیایی شـەیتان ناتوانێت هەمـوو بەندەكان لە خشـتە بەرێت، وە بە ڕاسـتی بەندە دڵسـۆزەكان ئەو دەسـەڵاتی بەسـەریاندا نیە، بەڵام تەنها دەسـەڵاتی بەسـەر ئـەو كەسـانەدا هەیـە كە پشـتیان كردوەتـە خـواو گوێڕایەڵـی شـەیتانیان بەسـەر گوێڕایەڵی خـوادا پەسـند كـردوە. وە لـە جێگایەكـی تـردا سـوێند دەخـوات بـە گومراكردنیـان دەڵێ: ﴿وَلَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٣٩﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٤٠﴾﴾ الحجر. ئەمـە ئەوەیـە كـە ئـەو پیـسو چەپەڵـە گومانی بـۆ دەبـاتو جەختی لەسـەر دەكاتـەوە، خـوای گـەورە هەواڵ دەدات بـە ڕوودانـیو دەفەرمـوێ: ﴿وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُۥ فَٱتَّبَعُوهُ إِلَّا فَرِيقًا مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٠﴾﴾ سبأ.

ئەم بەشـە دیاریكراوەی كە شـەیتان سـوێندی پـێ خواردوە كـە هەڵیان دەبژێرێـت، باس لەوە دەكات كـە ئـەوەی خـۆی دەیوێتو مەبەسـتیەتی پێیـان، وەك دەفەرموێ: ﴿وَلَأُضِلَّنَّهُمْ﴾ واتـە: لە ڕێگای ڕاسـت، گومرا كردنێـك لە زانسـتو زانیارییو، گومراكردنێـك لە كرداردا ﴿وَلَأُمَنِّيَنَّهُمْ﴾ واتـە: لەگـەڵ گومرا كردنیانـدا، بە ئـاواتو خەیاڵی پووچەوە سـەرگەرمیان دەكـەم، ئـەو ئاواتـەی كـە ڕێنمایی كـراوەكان بە دەسـتیان هێناوە، بە ڕاسـتی ئەمـە ئەوپەڕی لـە خۆبایـی بوونـە، تەنهـا بـە گومـرا كردنیانـەوە نەوسـتاوە، هەتـا لە پێـش چاویـان جوانو ڕازاوەی كـردوە، ئەمـەش خراپـەو شـەڕێكی زیاترە بەسـەر شـەڕەكانیانەوە كە كـرداری ئەو

کەسانەیان کرد شایستەی سزادانن، مەبەستی جوولەکەو گاورو هاوشێوەکانیانە، خوا دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا۟ لَن يَدْخُلَ ٱلْجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوْ نَصَـٰرَىٰ ۗ تِلْكَ أَمَانِيُّهُمْ ﴿١١١﴾﴾البقرة، هەروەها دەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ زَيَّنَّا لِكُلِّ أُمَّةٍ عَمَلَهُمْ﴾الأنعام. وە دەفەرموێ: ﴿قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُم بِٱلْأَخْسَرِينَ أَعْمَـٰلًا ﴿١٠٣﴾ ٱلَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا ﴿١٠٤﴾﴾الكهف.

وە خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا دەربارەی دووڕووەکان دەفەرموێ: ﴿يُنَادُونَهُمْ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ وَلَـٰكِنَّكُمْ فَتَنتُمْ أَنفُسَكُمْ وَتَرَبَّصْتُمْ وَٱرْتَبْتُمْ وَغَرَّتْكُمُ ٱلْأَمَانِىُّ حَتَّىٰ جَآءَ أَمْرُ ٱللَّهِ وَغَرَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴿١٤﴾﴾الحديد.

وە کە دەفەرموێ: ﴿وَلَـَٔامُرَنَّهُمْ فَلَيُبَتِّكُنَّ ءَاذَانَ ٱلْأَنْعَـٰمِ﴾ واتە: بڕینی گوێی ئاژەڵان، وەک: بڕینی گوێی حوشترێک کە چوار سکی بکردایەو پێنجەمیان نێر بووایە، یان حوشترێک دوازدە سکی بکردایە هەمووی مێینە بووایە، یان حوشترێک یەکەمو دووەم سکی مێینە بووایە، یان حوشترێکی نێر لە پشتی دە سک لە دایک ببووایە، خوای گەورە ئاگاداری کردوونەتەوە بە هەندێ لەوانە مەبەستی پێی هەموویەتی، بەڕاستی ئەمەش جۆرێکە لە گومڕایی، ئەوەی کە خوا حەڵاڵی کردوە حەرامی دەکات، هەموو ئەو بیروباوەڕە خراپو بڕیارە نابەجێیانەش دەچنە ئەو چواچێوەیەوە، ئەوەش ئەوپەڕی سەرلێشیواویە.

﴿وَلَـَٔامُرَنَّهُمْ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ ٱللَّهِ﴾ ئەمە گۆڕانی شێوەی دەرەکی دەگرێتەوە بە خاڵ کوتانو برۆ لابردنو دەستکاری کاری کردنی جەستە بۆ جوانکاریو هاوشێوەکانی، کە شەیتان پێی گومڕایان دەکاتو دروستکراوی خوا دەگۆڕن. ئەوەش ئەوە دەگەیەنێت کە بە جوانی دروست نەکراون، وە تانە دانە لە حیکمەتی خوا، وە بڕوابوونە بەمە کە ئەوەی بە دەستیان دروستی دەکەن چاکترە لەوەی کە خوا دروستی دەکات، وە ئەوە دەگەیەنێت کە ڕازی نەبوون بە ڕێکخستنو بەڕێوەبردنی قەدەری خوای گەورە. وە هەروەها گۆڕانی ناخی کەسەکەش دەگرێتەوە، خوای گەورە بەندەکانی دروستکردوە بە پاکیو وەرگرتنی ڕاستیو ئاشکرا کردنی، شەیتانەکان هاتن بۆ لایان لەو ڕێبازە جوانە لایاندان، وە خراپەو هاوەڵدانانو بێبڕواییو تاوانو سەرپێچیان لەلا جوان کردن.

بەڕاستی هەموو کەسێک لەسەر پاکی لە دایک دەبێت، بەڵام باوکو دایکی دەیکەن بە جوولەکە، یان گاور، یان ئاگر پەرستو هاوشێوەی ئەوانە کە سروشتی ڕاستەقینەی

مرۆڤـەکان دەگۆڕێت کە خوا لەسـەری دروسـتی کردوون لە یەکتاپەرسـتیو خۆشەویسـتیو ناسـینی، بەڵام شـەیتان تێکی شـکاندن لەم بـوارەدا بە تێکشـکاندنی دڕندەو گـورگ بۆ مەڕی جیـا بـووەوە لەڕانە مـەڕ. ئەگەر سـۆزو بەزەیی خوا نەبووایـە بەرانبەر بە بەندەکانی، بەسـەریاندا دەهـات وەک چـۆن بەسـەر لـە ڕێدەرچووەکانـدا هـات، وە ئەمەی کە بـە سـەریاندا هات بە هۆی ئەوەوە بوو کە پشـتیان کردە پەروەردگارو پاکی دروسـتکراویان، وە پشـتیوانی کردنیان لـە دوژمنە سـەر سـەختەکەیان، بۆیـە دنیـاو دواڕۆژیان لـە دەسـتدا، وە گەڕانەوە بـە زیانێکی زۆر گـەورەوە، ئـا لەبـەر ئەمەیـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَن يَتَّخِذِ ٱلشَّيۡطَٰنَ وَلِيّٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ فَقَدۡ خَسِرَ خُسۡرَانٗا مُّبِينٗا ﴾ واتـە: چ زەرەرمەندیـەک لـەوە ئاشـکراترو گەورەتـرە، بـۆ کەسـێک دنیـاو دواڕۆژی بدۆڕێنـی، بە هۆی تـاوانو سـەرپێچیەکانی بۆ هەتا هەتایـی. وەک چـۆن کەسـێک بـە دوای ڕەزامەنـدی خـوادا بگەڕێـتو خـوا لە خـۆی ڕازی بـکات، ئەمـە ئەوپەڕی قازانجـی کردوەو سـەرکەوتوو بووە لە هـەردوو دنیادا، هەتا خواناسـی بـووە بـە بیلبیلـەی چاوەکانـی، پەروەردگارا هیـچ ڕێگریـەک نیە لە بـەردەم بەخشـینی تۆدا، وە هیـچ بەخشـەرێک نیـە ئەگەر تـۆ بەربەسـتی بکەیت، خوایـە بمانمرێنە بە مردنی کەسـێک پشـتوانیت لـێ کردبێـت، وە لێمـان ببورە بـە لێبوردنی کەسـێک کە لێـی بوراویت.

پاشـان دەفەرمـوێ: ﴿ يَعِدُهُمۡ وَيُمَنِّيهِمۡ ﴾ واتـە: شـەیتان بەڵێـن دەدات بـەو کەسـانە بـۆ گومراکردنیـان، ئـەم پەیمانـە خۆی لە خۆیـدا هەرەشـەش دەگرێتەوە وەک چـۆن دەفەرموێ: ﴿ ٱلشَّيۡطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلۡفَقۡرَ ﴿٢٦٨﴾ ﴾البقـرة. (شـەیتان) بەڵێنیـان پێـی دەدات ئەگـەر لـە پێناوی خـوادا ببەخشـن هـەژار دەبن، وە ئەگـەر جیهاد بکـەن دەکوژرێنو هاوشـێوەی ئـەم بەڵێنە بێ بنەمایانـە وەک چـۆن دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ يُخَوِّفُ أَوۡلِيَآءَهُۥ فَلَا تَخَافُوهُمۡ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿١٧٥﴾ ﴾آل عمـران. وە دەیانترسـێنێت بـە نەهاتنی میهرەبانـیو ڕەزامەندی خوا، هەتا ئـەوە لـە عەقڵو مێشـکیاندا جێگیـر بکاتو نەتوانـن کاری چـاک ئەنجام بـدەن، وە بە هەمان شـێوە ئـاواتو ئومێدیـان دەخاتە بەر کـە لە ڕاسـتیدا وەک سـەرابو تراویلکە وایـە کە هیچ ڕاسـتیەکی تێدانیـە، لەبـەر ئەمـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا ﴿١٢٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ مَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُ ﴾ واتـە: ئـەو کەسـەی ملکەچـی شـەیتان ببێـتو پشـت لـە خـوا بکاتو ببێتـە یەکێـک شـوێنکەوتووانی ئیبلیسو حیزبەکـەی، ئەوە جێگای ئاگـرە ﴿ وَلَا يَجِدُونَ عَنۡهَا مَحِيصٗا ﴾ واتـە: بـە هیچ شـێوەیەک دەربازیـان نابێـت، بەڵکو بۆ هەتـا هەتایی لـە دۆزەخدا دەمێننەوە.

وَالَّذِينَ ءَامَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَنُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ
تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا وَعْدَ اللَّهِ
حَقًّا وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللَّهِ قِيلًا (١٢٢) لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ
وَلَا أَمَانِيِّ أَهْلِ الْكِتَابِ مَن يَعْمَلْ سُوءًا يُجْزَ بِهِ
وَلَا يَجِدْ لَهُ مِن دُونِ اللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا (١٢٣) وَمَن
يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتِ مِن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ
فَأُولَٰئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ نَقِيرًا (١٢٤) وَمَنْ
أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ وَاتَّبَعَ
مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَاتَّخَذَ اللَّهُ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلًا (١٢٥) وَلِلَّهِ
مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ
مُّحِيطًا (١٢٦) وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي النِّسَاءِ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ
فِيهِنَّ وَمَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ فِي يَتَامَى النِّسَاءِ
اللَّاتِي لَا تُؤْتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ
وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الْوِلْدَانِ وَأَن تَقُومُوا لِلْيَتَامَىٰ بِالْقِسْطِ
وَمَا تَفْعَلُوا مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِهِ عَلِيمًا (١٢٧)

(١٢٢): ﴿وَالَّذِينَ ءَامَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَنُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا وَعْدَ اللَّهِ حَقًّا وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللَّهِ قِيلًا (١٢٢)﴾: خوا ﷻ کاتێک داهاتووی خراپەکارانی ڕوون کردەوە، باسی لە داهاتووی چاکەخوازان کرد، دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ ءَامَنُوا﴾ واتە: بڕوایان هەیە بە خواو فریشتەکانو کتێبە ئاسمانیەکانو ڕۆژی دوایی‌و چارەنووس (قدر) بە خێرو شەڕی، لەسەر ئەو شێوەی فەرمانیان پێکراوە، بە زانستو بەڕاستدانانو دانپێدانان ﴿وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ کە ئەو کردارە لە بڕواوە سەرچاوەی گرتبێت. ئەمە هەموو فەرمان پێکراوەکان دەگرێتەوە لەوەی کە واجبو سوننەتە، وە پێویستە ئەوەی بە زمانو ئەندامەکانی دەریدەبڕێتو ئەنجامی دەدات لە دڵەوە سەرچاوەی گرتبێت، لەسەر هەموو ئەوانە پاداشتی ڕێکخراو هەیە، بە پێی حاڵو پلەو تەواووی ئیمانو دڵسۆزیو کرداری چاک. وە لە دەستی دەچێت بە پێی هەموو کەمو کورتیەک لە ئیمانو کردەوەدا، ئەویش بە پێی زانستو حیکمەتو میهرەبانی خوا، بە هەمان شێوە پەیمانی ڕاستەقینەی خوا کە لە ڕێگای بە دواداچوونی قورئانو سوننەتەوە فێری دەبێت.

وە لەبەر ئەمە باسی پاداشتی ڕێکخراوی کردوە لەسەر ئەو کردەوانەو دەفەرموێ: ﴿سَنُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ﴾ کە تێیدا هەیە ئەوەی چاو نەیبینیوە، وە گوێ نەیبیستووە، وە بە خەووروەش بە دڵی مرۆڤدا نەهاتوە، لە هەموو جۆرەکانی خواردنو خواردنەوەی بە چێژو دیمەنی سەرنج ڕاکێشو خیزانی زۆر جوانو چاک، وە باڵەخانەی بەرزو ڕازاوەو باخی چڕو پڕو میوەی بە لەزەتی جۆراو جۆرو تازە، وە سەردانی یەکتریو باسکردنی ژیانی دنیایان، لە نێو بەهەشتەکاندا.

وە لــە هەموویــان گەورەتــرو بەرزتــر، ڕەزامەنــدی خوایــە لێیــان، وە چێــژ وەرگرتنــی ڕووحــەکان لــە نزیکــی خوای گــەورەو بینینی بە چــاوەکانو گوێبیســتی فەرمایشــتەکانی، کــە بــە ڕاســتی هەموو چێژو خۆشــیەکانی تــر لە بیــر دەباتەوە، ئەگەر ویســتی خــوا نەبێت کــە جێگیربن هەموویان لە خۆشــیدا دەمــردن. گەورەیی بۆ خــوا لەو هەموو نــازو نیعمەتانە، لــەو پلــەو پایــە بــەرزەی کــە خــوا پێــی بەخشــیون، دەبــێ چۆن ئــەو هەمــوو پاداشــتەیان وەرگرتبێــت کــە وەســفکەران ناتوانــن وەســفی بکــەن، وە تەواوکردنــی ئەوە مانــەوەی بۆ هەتــا هەتاییــە لــە ناو ئــەو بەهەشــتە بەرزانــەدا، وە لەبــەر ئەمە دەفەرمــوێ: ﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٗاۚ وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ قِيلٗا ﴾ بێگومــان خــوای گەورە ڕاســتی فەرموو کە فەرمایشــتەکانی گەیشــتوونەتە ئەوپــەڕی ڕاســتگۆیی، وە لەبــەر ئەمــە کاتــێ کــە وتەکانی ڕاســتنو هەواڵەکانــی هەقــن، ئــەوەی کــە دیلالەتی لەســەر دەکات پــڕاو پــڕەو دەیگریتە خــۆو بەردەوامــە، هــەر یــەک لەوانە مەبەســتن لــە وتەی خــوای گــەورەدا، بە هەمان شــێوە فەرمایشــتی پێغەمبەرەکەیشــی ﷺ چونکــە هــەواڵ نــادات بە فەرمانــی خوا نەبێت، وە قســە نــاکات بە ســروشو وەحــی ئــەو نەبێت.

(١٢٣-١٢٤): ﴿ لَّيۡسَ بِأَمَانِيِّكُمۡ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِۗ مَن يَعۡمَلۡ سُوٓءٗا يُجۡزَ بِهِۦ وَلَا يَجِدۡ لَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا ﴿١٢٣﴾ وَمَن يَعۡمَلۡ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ وَلَا يُظۡلَمُونَ نَقِيرٗا ﴿١٢٤﴾ ﴾:

﴿ لَّيۡسَ ﴾ واتــە: نــە فەرمانو نــە ڕزگار بوونو نەپــاک بوونەوە(تان بــۆ نیە) ﴿ بِأَمَانِيِّكُمۡ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ ﴾ (الأماني) بریتیــە لــە وتەی نــاو ناخ کە کــرداری لەگەڵدا نیــەو تەنهــا بانگەشــەیەو بــەس، ئەگەر هاوشــێوەی نمایــش بکرێــتو پێشــان بدرێت ئەوە هــەر وەک ئــەو جۆرەیــە، ئەمە گشــتیە لە هەمــوو کارێکدا، ئــەی کاری بڕواو خۆشــبەختی هەتاهەتایــی؟! بە ڕاســتی دەربارەی ئارەزوو ئاواتــی خاوەن کتێبە پیــرۆزەکان خوای گەورە هەواڵــی داوە دەربارەیان، کە ئەوان وتیــان: ﴿ وَقَالُواْ لَن يَدۡخُلَ ٱلۡجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوۡ نَصَٰرَىٰۗ تِلۡكَ أَمَانِيُّهُمۡۗ ﴿١١١﴾ ﴾البقرة. وە هــاو شــێوەی ئەوانەی کە نادرێنــە پاڵ کتێبو پێغەمبەرێــک ئــەوە لــە پێشــترن. وە بە هەمان شــێوە خــوای گەورە ئەوانەشــی کــە دەدرێنە پاڵ ئیســلام خســتووەتە هەمان چــوار چێوەوە، چونکە ئــەوە تەواوی دادپــەروەریو ویژدانە، بــە ڕاســتی دانــە پاڵی (ئەو ئــاواتو ئــارەزووە) بۆ لای هــەر ئاینێک هیچ ســوودێکی نابێت، ئەگــەر ئەو کەســە بەڵگە نەهێنێت بۆ ڕاســتی قســەکەی، لــە داهاتوودا کردارەکان ڕاســتیو

درۆی بانگەشـەکان دەردەخـەن، لەبەر ئەمـە خوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ مَن يَعۡمَلۡ سُوٓءٗا يُجۡزَ بِهِۦ ﴾ ئەمـە گشـتگیرە بۆ هەموو ئەوانـەی کار دەکەن، چونکە (سوء) گشـتگیرە بۆ هەموو تاوانێـک بچـووک بێـت، یان گـەورە، وە بە هەمان شـێوە گشـتگیرە بۆ هەموو پاداشـتێک کـەم بێ یـان زۆر، دنیایـی بێ یـان ڕۆژی دوایی.

وە خەڵکـی لـەم پلـەدا دەبنە چەندین بەشـەوە، کەس نازانێـت جگە لە خوای گـەورە نەبێت، هەیانـە تاوانـی کەمـەو هەیانـە زۆرە، هـەر کەسـێک هەمـوو کردەوەکانـی خـراپ بێتو لەگـەڵ ئەوەشـدا بێبـڕواو کافـر بـێ، ئەگەر بمرێـت بە بـێ داوای لێخۆشـبوون، پاداشـت دەدرێتـەوە بـەوەی بـە هەمیشـەیی لە نێـو دۆزەخـدا، وە هەر کەسـێک کردارەکـەی باش بێـت، وە لـە زۆربـەی دۆخەکانـی ژیانیـدا چاک بێـت، ئەگەر هەنـدێ جار هەنـدێ تاوانی بچووکـی ئەنجـام بدات، لەوەی کە تووشـی خـەمو خەفەتو هەنـدێ ناخۆشـیو بێتاقەتی لە جەسـتە، یـان لـە دڵی، یـان خۆشەویسـتەکەی، یان ماڵـیو هاوشـێوەکانی، بە ڕاسـتی ئەوانە دەبنـە کەفارەتـی تاوانەکانـی، ئەویش ئەوەیـە کە پاداشـت دەدرێتەوە لەسـەر کردارەکەی، خـوای گەورە بە سـۆزی خـۆی لەگەڵیـدا دەجوڵێتەوە، لـە نێوانی ئەم دوو حاڵەتـەدا پلەیەکی زۆر هەیـە. ئـەم پاداشـتە لەسـەر کـرداری خراپـە بە گشـتی، وە تایبەتـە بە ئەو کەسـانەی کـە داوای لێخۆشـبوونیان نەکـردوە، چونکـە تۆبـەکار لـە تـاوان وەک ئـەوە وایـە تاوانی نەکردبێـت، وەک چـۆن دەقەکان بەڵگەن لەسـەری.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَا يَجِدۡ لَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا ﴾ بـۆ لابردنـی هەنـدێ لەو گومانانـەی ئـەوەی کە شـایانی پاداشـت دانەوەیە لەسـەر کردوەکانـی لەوانەیە پشـتوانێکی هەبێـت، یـان سـەرخەرێک، یـان تکاکارێـک، بۆ ئـەوەی ئەو سـزایەی لـێ دوور بخاتەوە کـە شایسـتەیەتی، خـوای گـەورە هەواڵی داوە بـە نەبوونی ئەو جـۆرە شـتانە، بێگومان هیچ دۆسـتێکی نیـە داواکاریەکانـی بـۆ بـە دەسـت بهێنێـت، وە هیچ سـەرخەرێکی نیە سـزای لەسـەر لا ببـات، جگـە لە خـوای پەروەردگـار نەبێت.

﴿ وَمَن يَعۡمَلۡ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾ واتـە: هەمـوو کردارەکانـی دڵو جەسـتە دەچنـە ئەو چـوار چێوەیـەوە،وە بە هەمان شـێوە هەمـوو تاکێکی مـرۆڤو جنۆکە دەگرێتـەوە، گەورە بـێ یـان بچـووک، نێر بـێ یان مـێ، وە لەبـەر ئەمـە دەفەرمـوێ: ﴿ مِن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ ﴾ بـە ڕاسـتی ئەمـە مەرجـە بۆ هەمـوو کـردەوەکان، نـە دەبێتـە کردەوەیەکی چـاک، نـە وەردەگیرێـت، وە هیـچ پاداشـتێکی بۆ نانووسـرێت، وە هیچ سـزایەکی لەسـەر

لانابردرێـت، تەنهـا بە ئیمـان هێنـان نەبێت.

بێگومـان کـرداری بـێ ئیمان وەک لق‌و پـۆی دارێک وایە ڕیشـەکەی براێـت، یان وەک خانوویـەک وایـە لـە نێوەڕاسـتی دەریادا دروسـتکرابێت، بـڕوا بنەڕەتـە، وە ئـەو بنەمایەیە کـە هەمـوو شـتەکانی لەسـەر بنیـات دەنرێـت، ئـەم کـۆت‌و گرێدانە پێویسـتە بـۆ هەموو کردەوەیـەک بزانرێـت، چونکە کـردەوەکان گـرێ دراون بـە ئیمانەوە.

﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ ﴾ واتـە: ئەوانـەی برواهێنـان‌و کـردەوەی چاکیـان پێکـەوە کۆکردوەتـەوە ﴿ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ ﴾ واتـە: هەموو ئەو شـتانە دەگرێتـەوە کە نەفـس‌و دەروون ئارەزووی دەکـەن‌و چـاو پێـی تێـر دەبـێ ﴿ وَلَا يُظۡلَمُونَ نَقِيرٗا ﴾ واتـە: سـتەمیان لـێ ناکرێـت نە کـەم‌و نـە زۆر، لـەو کردەوانـەی کـە کردوویانـە، بەڵکـو پێـی دەگەن بـە تـەواوی‌و بێ کـەم‌و کورتـی، بـە چەندین قـات بۆیـان زیـاد دەکرێت.

(١٢٥): ﴿ وَمَنۡ أَحۡسَنُ دِينٗا مِّمَّنۡ أَسۡلَمَ وَجۡهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحۡسِنٞ وَٱتَّبَعَ مِلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ حَنِيفٗاۗ وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبۡرَٰهِيمَ خَلِيلٗا ١٢٥ ﴾:

هیـچ شـتێک لەوە باشـتر نیە کە مرۆڤ دڵسـۆزی بـۆ پەرسـتراوی ئەنجام بدات، کـە بریتیە لـە ڕوو کردنـە خـواو تەسـلیم بوونـی دڵ‌و ڕوو تێکردنی بە ملکەچی‌و دڵسـۆزی سـەرجەم ئەندامەکانی جەسـتە ﴿ وَهُوَ ﴾ لەگەڵ ئەو دڵسۆزی خۆ تەسـلیم کردنەدا ﴿ مُحۡسِنٞ ﴾ واتە: شـوێنی شـەریعەتی خـوا کەوتبێ، کـە پێغەمبەرانی پـێ نـاردووەو کتێبەکانـی دابەزاندووە، وە هەروەهـا کردوونـی بـە هەڵبژێـردراوی نـاو خەڵـک‌و شـوێنکەوتووانی ﴿ وَٱتَّبَعَ مِلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ ﴾ واتـە: ئایـن‌و شـەریعەتەکەی ﴿ حَنِيفٗا ﴾ واتـە: لای داوە لـە هاوبـەش دانان‌و ڕووی کردوەتـە یەکتاپەرسـتی، وە لـە دروسـتکراویش لایـداوە تەنهـا ڕووی کردوەتە خوا ﴿ وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبۡرَٰهِيمَ خَلِيلٗا ﴾ (خلة) بەرزتریـن پلـەی خۆشەویسـتیە، ئـەم پلەیـە بۆ دوو کـەس بـە دەسـت هاتـووە: موحەممـەدو ئیبراهیـم (علیهمـا السـلام)، بەڵام خۆشەویسـتی خـوا بـۆ هەمـوو بڕوادارانـە، لەبـەر ئەوە خـوای گـەورە ئیبراهیمی کـرد بە خەلیلـی خۆی، چونکـە ئـەو فەرمانـەی کە پێی کـرا جێبەجێی کرد، وە هەسـتا بـەو تاقیکرنـەوەی کە پێی تاقیکرایـەوە، لەبـەر ئـەوە خوای گەورە کـردی بە پێشـەوای خەڵک‌و بە خەلیلـی خۆی، وە لـە دنیـادا یادی بـە زیندووی هێشـتەوە.

(١٢٦): ﴿ وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٖ مُّحِيطٗا ١٢٦ ﴾:

ئـەم دەقـە پیـرۆزە ئەوەمان بـۆ ڕوون دەکاتەوە کـە خـوا ﷻ دەوری هەموو شـتێکی داوە،

هەواڵـی داوە کـە ئـەوەی ﴿مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ واتـە: هەمـووی موڵـکو بەنـدەی خوایـە، خـوای گەورەش تـاکو تەنهایە لـە بەڕێوەبردنـدا، بە ڕاسـتی زانیاریی خوا دەوری هەموو دروسـتکراوەکانی داوە، وە بە بینینی هەموو بینراوەکان، وە بە بیسـتنی هەموو بیسـتراوەکان، وە جێبەجێ بووە ویسـتو دەسـەڵاتی خوا بەسـەر هەموو دروسـتکراوەکاندا، وە ڕەحمەتـی ئـەرزو ئاسـمانی پـڕ کـردوە، وە هەمـووی دروسـتکراوەو هەمـوو شـتەکان ملکەچـی فەرمانەکانـی بوون.

(١٢٧): ﴿وَيَسۡتَفۡتُونَكَ فِي ٱلنِّسَآءِۖ قُلِ ٱللَّهُ يُفۡتِيكُمۡ فِيهِنَّ وَمَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ فِي يَتَٰمَى ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِي لَا تُؤۡتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ وَتَرۡغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ وَٱلۡمُسۡتَضۡعَفِينَ مِنَ ٱلۡوِلۡدَٰنِ وَأَن تَقُومُواْ لِلۡيَتَٰمَىٰ بِٱلۡقِسۡطِۚ وَمَا تَفۡعَلُواْ مِنۡ خَيۡرٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِهِۦ عَلِيمٗا ١٢٧﴾

واتـە: (الإستفتاء) داواکـەر داوای بەرپرسـیار دەکات بـۆ ئـەوەی بڕیـاری شـەرعی ڕوون بکاتـەوە دەربـارەی پرسـیار بۆ کـراو، خوای گـەورە هەواڵـی داوە کـە بڕواداران پرسـیار لـە پێغەمبـەر ﷺ دەکـەن، دەربـارەی ئـەو ئافرەتانـەی کـە لە لایانـن، بەڵام خـوای گەورە وەڵامی پرسـیارەکەی خسـتە ئەسـتۆی خۆیو دەفەرمـوێ: ﴿قُلِ ٱللَّهُ يُفۡتِيكُمۡ فِيهِنَّ﴾ واتـە: بزانـن خـوای گـەورە وەڵامتـان دەداتـەوە دەربـارەی ئـەو پرسـیارەو سـەرجەم ئەو شـتانەی کـە پەیوەندی بـە بارودۆخـی ئافرەتانەوە هەیـە، لە جێبەجـێ کردنـی مافەکانیانو واز هێنـان لـە سـتەم لێکردنیـان بە شـێوەیەکی گشـتیو تایبەت.

ئـەم بڕیارە گشـتیە هەمـوو فەرمانەکانی خـوا دەگرێتەوە لـە فەرمان کـردنو قەدەغەکردن لـە مافـی ئافرەتانی خێزانـدا، و بێجگـە لەوانەش لە منـداڵو گەورە.

پاشـان لە دوای بڕیاری گشـتی دەربارەی ئافرەتان، وەسـیەتو ئامۆژگـاری تایبەت کردوە، دەربـارەی ئەوانـەی کـە لاوازن لە کچـانو کوڕانی هەتیـو ئەمە گرنگیەکە لـە لایەن خوای گـەورەوە، وە سـەرکۆنە کردنـی ئەو کەسـانەیە کە بـە ناهەقو نـاڕەوا مافەکانیـان دەخۆن، دەفەرمـوێ: ﴿وَمَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ فِي يَتَٰمَى ٱلنِّسَآءِ﴾ واتـە: بـە هەمان شـێوە بـە سـەرتاندا دەخوێنرێتـەوە لـە قورئـان دەربـارەی ئافرەتانـی هەتیو ئەوانـەی ﴿ٱلَّٰتِي لَا تُؤۡتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ﴾ واتـە: ئەمـە بـاس لـە حاڵەتێـک دەکات کـە لـەو سـەردەمەدا ڕوویـداوە، ئەگـەر ئافرەتێکـی هەتیـو لـە لای پیاوێـک بوایـە، ئـەوە مافەکـەی پێشـێل دەکـردو سـتەمی لێدەکـرد، یان بـە خواردنـی هەمـوو ماڵەکەی یـان هەندێ لـە ماڵەکەی،

یـان ڕێگـری لێدەکـرد کە شـوو بـکاتو سـوود لـە مـاڵو داراییەکـەی وەربگرێـت، لە ترسـی ئـەوەی ماڵو سـامانەکەی لەژێر دەسـت دەرنەچێ ئەگەر شـووی کرد، یـان هەندێ لـە ماڵەکـەی دەبـرد کاتێک کە شـووی بکردایـە ئەو مەرجـەی لێوەردە گـرت، ئەمە ئەگەر بیەوێـت، یـان حـەزی لێ بـکات ئافرەتەکـە خـاوەن جوانیو سـەروەتو سـامان بێت، وە دادپـەروەر نەدەبـوو لـە مارەییەکەیـدا، بەڵکو ئەوەنـدەی پێ دەدا کە شایسـتەی ئـەو نەبوو، هەمـوو ئەمانە سـتەمن، دەچنە چوارچێـوەی ئەم ئایەتـەوە ﴿ وَتَرۡغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ ﴾واتە: حـەز ناکـەن مارەیـان بکـەن یـان شـوو بکـەن، وەک چـۆن لـە پێشـەوە ئامـاژەی پێکرا ﴿ وَٱلۡمُسۡتَضۡعَفِينَ مِنَ ٱلۡوِلۡدَٰنِ ﴾واتـە: وە داوای بریـارت لێدەکـەن دەربـارەی ئـەو منداڵـە بـێ دەسـتەڵاتانە، کـە مافەکانیـان لـە میـرات پـێ بـدرێ، وە نابێت دەسـت بگرن بەسـەر سەروەتو سـامانەکەیاندا بە شـێوەی سـتەمکارانەو داگیر کەرانە ﴿ مِنَ ٱلۡوِلۡدَٰنِ وَأَن تَقُومُواْ لِلۡيَتَٰمَىٰ بِٱلۡقِسۡطِ ﴾ واتـە:بـە دادپـەروەری تـەواو، ئەمـە ئـەوە دەگرێتەوە کە هەسـتن بـە جێبەجێکردنـی فەرمانـی خـواو ئـەوەی پێویسـتە لە سـەر بەندەکانی، بـە پلەی یەکـەم خاوەنەکانیان لـەم بابەتەدا بەرپرسـیارن، ناچاریـان دەکەن بەوەی کە خوا پێویسـتی کـردوە لەسـەریان جێ بەجێـی بکەن.

وە هەروەهـا ئـەوەش دەگرێتـەوە کـە گرنگی بدەن بـە بەرژەوەنـدی دنیاییان بەو شـێوەی کـە ماڵەکانیـان بـۆ بخەنـە ناو پـرۆژەوەو داوای باشـترین پشـکیان بـۆ بکـەن، وە بە هیچ شـێوەیەک نابـێ نزیکـی مـاڵو سـامانیان بکەونەوە مەگەر بە باشـترین شـێوە نەبـێ، وە بە هیـچ شـێوەیەک لەو سـەروەتو سـامانە نەبەخشـن بە هیـچ هاوڕێو کەسـێکی تـر جا بۆ بابەتـی ژنهێنـان بێـت، یان هـەر بابەتێکی تـر، بە ڕاسـتی ئەمـە ڕەحمەتی خـوای گەورەیە بـۆ بەندەکانـی، کاتـێ هانـی داون بە ئەوپـەڕی هانـدان لەسـەر بەرژەوەندی کەسـێک کە خـۆی نەتوانـی پێـی هەسـتێت جا لەبـەر لاوازی یـان کەم عەقڵـی بێت.

پاشـان خوای گـەورە بە گشـتی هانی داون لەسـەر چاکـەو چاکەکاریـی وەک دەفەرموێ: ﴿ وَمَا تَفۡعَلُواْ مِنۡ خَيۡرٖ ﴾ تایبـەت بـە هەتیوو هاوشـێوەکانی، جا یەکسـانە ئەگـەر چاکەکە لە سـەرووی پێویسـتەوە بـوو، یان پێویسـت بـوو، ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِهِۦ عَلِيمٗا ﴾واتە: خوای گـەورە بـە زانسـتی خـۆی دەوری هەمـوو چاکەکانـی داوە، کەم بـێ، یـان زۆر، چاک بێ یـان دژی بێ، پاداشـتی هەمـوو دەداتەوە هەریەکـەو بە پێـی کردارەکەی.

وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ مِنۢ بَعۡلِهَا نُشُوزًا أَوۡ إِعۡرَاضٗا فَلَا جُنَاحَ
عَلَيۡهِمَآ أَن يُصۡلِحَا بَيۡنَهُمَا صُلۡحٗاۚ وَٱلصُّلۡحُ خَيۡرٞۗ
وَأُحۡضِرَتِ ٱلۡأَنفُسُ ٱلشُّحَّۚ وَإِن تُحۡسِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ
كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا ١٢٨ وَلَن تَسۡتَطِيعُوٓاْ أَن تَعۡدِلُواْ
بَيۡنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوۡ حَرَصۡتُمۡۖ فَلَا تَمِيلُواْ كُلَّ ٱلۡمَيۡلِ فَتَذَرُوهَا
كَٱلۡمُعَلَّقَةِۚ وَإِن تُصۡلِحُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ
غَفُورٗا رَّحِيمٗا ١٢٩ وَإِن يَتَفَرَّقَا يُغۡنِ ٱللَّهُ كُلّٗا مِّن سَعَتِهِۦۚ
وَكَانَ ٱللَّهُ وَٰسِعًا حَكِيمٗا ١٣٠ وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَلَقَدۡ وَصَّيۡنَا ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن
قَبۡلِكُمۡ وَإِيَّاكُمۡ أَنِ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ وَإِن تَكۡفُرُواْ فَإِنَّ لِلَّهِ
مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَنِيًّا حَمِيدٗا
١٣١ وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا
١٣٢ إِن يَشَأۡ يُذۡهِبۡكُمۡ أَيُّهَا ٱلنَّاسُ وَيَأۡتِ بِـَٔاخَرِينَۚ وَكَانَ
ٱللَّهُ عَلَىٰ ذَٰلِكَ قَدِيرٗا ١٣٣ مَّن كَانَ يُرِيدُ ثَوَابَ ٱلدُّنۡيَا فَعِندَ ٱللَّهِ
ثَوَابُ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا ١٣٤

(١٢٨): ﴿وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ مِنۢ بَعۡلِهَا نُشُوزًا أَوۡ إِعۡرَاضٗا فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَآ أَن يُصۡلِحَا بَيۡنَهُمَا صُلۡحٗاۚ وَٱلصُّلۡحُ خَيۡرٞۗ وَأُحۡضِرَتِ ٱلۡأَنفُسُ ٱلشُّحَّۚ وَإِن تُحۡسِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا ١٢٨﴾:

واتە: ئەگەر ئافرەتێک ترسا لە گوێ پێنەدان، یان پشت هەڵکردنی پیاوەکەی، بە دەنگ بەرزەوە کردن بەسەریدا یان پشت تێکردنو دوورکەوتنەوە لێی، وە حەزی لێ نەکات، باشتر وایە لەم حاڵەتەدا هەردوولا ئاشتەواییەکی چاک بکەن، بەوەی کە ئافرەتەکە دەستبەرداری هەندێ لە مافەکانی خۆی بێ بۆ مێردەکەی بۆ ئەوەی کە لەگەڵیدا بمێنێتەوە، لێرەدا یان دەبێ ڕازی بێ بە کەمترین مافی خۆی لە خەرجیو بژێوی، یان پۆشاکو جلو بەرگ یان شوێنی نیشتەجێ بوون، یان دابەشکردنی شەوەکان بەسەریدا، بەوەی کە هەقی خۆی لە دەست دا، یان شەوو ڕۆژەکەی بدا بە مێردەکەی لەبەر زەرەرمەندی. ئەگەر لەم حاڵەتەدا هەردووکیان ڕێککەوتن ئەوە هیچ کێشەو گرفتێکی تێدانیە لەسەریان نە لەسەر پیاوەکەو نە لەسەر ژنەکە، ئەو کاتە بۆ ژنەکەی دروستە بەو حاڵەتەوە لەگەڵیدا بژی، ئەوە باشترە لە جیابوونەوە، لەبەر ئەمە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَٱلصُّلۡحُ خَيۡرٞۗ﴾ واتە: لە کۆی واتای گشتی بۆ ئەم مانایە، بە ڕاستی ئاشتەوایی لە نێوانی ئەوانەی مافیان هەیە بەسەریەکەوە لە هەموو ڕوویەکەوە باشترە لەوەی هەریەکەو پێداگری لە مافی خۆی بکات، لەبەر ئەوەی لەو ئاشتەواییەدا خۆشەویستیو تەبایی بمێنێ، وە لێبووردەیش لەبەرچاو بگیرێ.

ئاشتەوایی لە هەموو شتەکاندا دروستە مەگەر حەڵاڵی قەدەغە بکرێ، یان قەدەغەیە حەڵاڵ بکرێ، بێگومان بەوە ناوترێ ئاشتەوایی بەڵکو پێی دەوترێ ستەمو تاوان. باش بزانە هیچ بڕیارێک لە بڕیارەکان تەواوو کامڵ نابێ ئیللا بە بوونی پێویستیەکەی نەبێو نەبوونی

دژەکـەی، لە چوارچێوەی ئەوەشـدا ئـەو بڕیارە گەورەیە کـە پێی دەوترێت ئاشـتەوایی، خوای گـەورە ئەوەی کە پێویسـتە بۆ ئەو مەبەسـتە باسـی کـردوە، وە هەواڵی داوە کە ئاشـتەوایی پڕە لـە خێـرو چاکـە، وە خێرو چاکـەش هەموو کەسـێکی ژیرو عاقڵ حـەزی لێـدەکات، لەگەڵ ئـەوەدا خـوا فەرمانی پێکـردوەو بـرواداری هانداوە لەسـەر ئەوەی بـە دوایدا بگـەڕێو حەزی لـێ بکات. لەگـەڵ ئەوەدا دژەکەیشـی باس کـردوە وەک دەفەرمـوێ: ﴿ وَأُحۡضِرَتِ ٱلۡأَنفُسُ ٱلشُّحَّ ﴾ واتـە: نەفـسو دەروونـەکان لـە سـەر خۆگرتنـەوەو ڕەزیلـی ڕاهاتـوون، ئـەوەش بریتیـە لـەوەی کـە مرۆڤەکان حـەز بە بەخشـین ناکەن، بەڵام سـوورن لەسـەر مافـی خۆیان، دەروونەکان لەسـەر ئەو سروشـتەن، واتە: پێویسـتە لەسـەرتان بە لابردنو ڕیشـە کێشـکردنی ئـەو خووڕەوشـتە خراپـەی کە لە دروونتانـدا هەیە، وە لە بـری ئەوەدا دژەکـەی جێگیر بکەن، ئەویـش بریتیـە لە بەخشـندەیی‌و سـنگ فراوانـی، وە پێدانی ئـەو مافەیە کە لە ئەسـتۆتدایە، وە ڕازی بوونـت لەسـەر هەنـدێ لـەو مافـەی کە هـی تۆیە. هـەر کاتێـک مرۆڤ سـەرکەوتوو بـوو لەسـەر ئەو ڕەوشـتە بـەرزو بە نرخـە، ئـەو کات بە ئاسـانی دەتوانێـت کێشـەکانی نێوان خـۆی‌و نەیارەکـەی چارەسـەر بـکات، وە ڕێگـای بـۆ ئاسـان دەبێت بۆ گەیشـتن بـە ئامانج، بـە پێچەوانـەی کەسـێک کـە هەوڵی نـەداوە بـۆ لا بردنی ئـەو چرووکـی‌و ڕەزیلیـەی کە لە دەروونیدایـە، ئـەوە بەڕاسـتی گرانە لە سـەری ئاشـتی‌و ڕێککەوتـن، چونکە بە هەمـوو ماڵەکە نەبێـت ڕازی نابـێ، وە ڕازیش نابێت ئەوەی لەسـەر شـانیەتی بیداتەوە، جا ئەگەر نەیارەکەیشـی وەک ئـەو بێت ئـەوە کارەکـە گرانترو ئاڵۆزتـر دەبێ.

پاشـان دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِن تُحۡسِنُواْ وَتَتَّقُواْ ﴾ واتـە: ئەگـەر چاکـەکار بـن لـە بەندایەتـی کردنـی پەروەرگارتانـدا، کە بەنـدە بە شـێوەیەک خوا بپەرسـتێ وەک ئەوەی کـە دەیبینێت، ئەگـەر نەیبینـێ ئـەوە بێگومان خوا ئـەو دەبینێت، لـە هەمان کاتـدا لەگەڵ دروسـتکراوەکاندا چـاک بێـت، بـە هەمـوو ماناکانـی چاکـە، لـە بەخشـینی مـاڵو سـامان، یـان زانسـت، یان ناوبانـگ، یـان جگـە لەوانـە ﴿ وَتَتَّقُواْ ﴾ واتـە: لـە خـوا بترسـنو خۆپارێـزی بکـەن بـە ئەنجامدانـی هەمـوو فەرمـان پێکـراوەکانو وازهێنان لـە هەموو قەدەغە کـراوەکان ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا ﴾ واتـە: خـوای گەورە بە زانسـتو بە ئاگایـی دەوری هەموو کردەوەکانتانـی داوە، ئـەوەی کە ئاشـکرایەو ئـەوەی کە نهێنیـە، وە بۆتـان دەپارێزێت، وە بە چاکتریـن شـێوە پاداشـتتان دەداتەوە.

(١٢٩): ﴿ وَلَن تَسْتَطِيعُوٓاْ أَن تَعْدِلُواْ بَيْنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوْ حَرَصْتُمْ ۖ فَلَا تَمِيلُواْ كُلَّ ٱلْمَيْلِ فَتَذَرُوهَا كَٱلْمُعَلَّقَةِ ۚ وَإِن تُصْلِحُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٢٩﴾ ﴾

خوا ﷻ هەواڵ دەدات کە بە دڵنیایی پیاوان ناتوانن‌و لە توانایاندا نیە دادگەری تەواو لە نێوان خێزانەکانیاندا بکەن، چونکە دادگەری بە مانای بوونی خۆشەویستیە بە یەکسانی، وە مەیلی دڵی بۆ لای خێزانەکانی وەک یەکتر بێ، پاشان کار بەوە بکات، بێگومان ئەمەش ناگونجێت‌و نابێت، لەبەر ئەوە خوای لێبوردە لەوە خۆش بووە کە لە تواناادا نیە، وە قەدەغەی کردوە لەوەی دەگونجێت، کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَا تَمِيلُواْ كُلَّ ٱلْمَيْلِ ﴾ واتە: زۆر لامەکەنەوە بە یەکجاری بە لای یەکێکیاندا دایمەشکێنن، بە شێوەیەک کە مافی پێویستیان نەدەن‌و پێشێلی بکەن، بەڵکو هەرچی لە تواناتاندایە بەکاری بهێنن بۆ جێبەجێ کردنی دادگەری. لەوانە: وەک بژێوی‌و جل‌و بەرگ‌و پۆشاک‌و دابەش کردنی شەوەکان بەسەریانداو هاوشێوەی ئەمانە، پێویستە لەسەرتان لەوانەدا دادگەریان لەگەڵدا بکەن، بە پێچەوانەی خۆشەویستی جووت بوون‌و هاوشێوەی ئەوانە، بە ڕاستی ژن ئەگەر واز لە پیاوەکەی بهێنێت، لەو ڕووەی کە پێویستە بۆی، ئەوە وەک هەڵواسراوی لێ دێت کە پیاوی نەبێت، پاشان پشوو دەدات‌و ئامادە دەبێ بۆ زەواج، وە ئافرەتێکیش بێ مێرد بێت هەستێت بە جێبەجێ کردنی مافەکانی.

﴿ وَإِن تُصْلِحُواْ ﴾واتە: نێوانی خۆتان‌و خێزانتان چاک بکەن بە ناچار کردنی دەروونتان لەسەر کردارێک کە حەزی پێی نیە، وەک ئەرکی نێوان ژن‌و مێردو هەستان بە پێدانی مافەکانی یەکتر، وە هەروەها ئاشتەوایی بکەن لە نێوان خۆتان‌و خەڵکیدا، وە هەروەها ئاشتەوایی نێوان خەڵکی بکەن لەوەی کە جیاوازی‌و دووبەرەکی کەوتۆتە نێوانیان، دیارە ئەمە هانمان دەدات هەموو ڕێگاکان بگرینە بەر بۆ گەیشتن بە ئاشتەوایی ڕەها، وەک لە پێشەوە باسمان کرد.

﴿ وَتَتَّقُواْ ﴾واتە: فەرمانبەرداریی خوا بکەن بە جێبەجێ کردنی فەرمانەکان‌و وازهێنان لە قەدەغە لێکراوەکان، وە ئارامگرتن لەسەریان ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾(خوا) خۆش دەبێ لەو تاوانانەی کە ئەنجامتان داوە، وە لەو کەم‌و کورتیانەی لە بەرانبەر جێبەجێ کردنی فەرمانەکاندا هەتان بووە، وە لێتان خۆش دەبێ وەک چۆن بە سۆز بوون لەگەڵ خێزانەکانتانداو میهرەبان بوون بۆیان.

(١٣٠): ﴿ وَإِن يَتَفَرَّقَا يُغْنِ ٱللَّهُ كُلًّا مِّن سَعَتِهِۦ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ وَٰسِعًا حَكِيمًا ﴿١٣٠﴾ ﴾

ئەمــە حاڵەتی ســێیەمی نێــوان ژنو مێردە، ئەگــەر نەیانتوانی بگــەن بە ڕێککەوتن ئەوە ئاســاییە لــە یەکتــر جیاببنــەوە، دەفەرمــوێ: ﴿ وَإِن يَتَفَرَّقَا ﴾ واتە: بــە جیابوونەوەو تەڵاقــدان، یان بە هەڵوەشــانەوە، یــان بە خولــع (واتــە: ئافرەتەکە خۆی لــە پیاوەکە دادەڕنــیو دەڵێ: لــەو پیاوەم جیادەبمــەوەو لە گشــت مافەکانــم خۆش دەبم)، یان هاوشــێوەی ئەوانــە ﴿ يُغْنِ ٱللَّهُ كُلًّا ﴾ واتــە: لــە ژنو مێــرد ﴿ مِّن سَعَتِهِۦ ﴾ واتــە: لە چاکــەی بەرفراوانــی خۆی، بێگومــان خوای گــەورە ژنێکــی بــۆ دابیــن دەکات لــەو ژنــەی پێشــووی باشــتر بێــت، وە بــە هەمــان شــێوە خێزانەکەیشــی وا لــێ دەکات کە پێویســتی بەو پیــاوە نەبێت، وە ئەگەر لە مێردەکەیەوە بەشــی پێویســتی بــۆ دابیــن نەکرا لــە بژێــوی ژیان، ئــەوە بــە دڵنیایــی ڕزقو ڕۆزی لــەلای خوا ﷻ دابیــن کــراوە، وە دەکرێــت خوای گــەورە مێردێکــی باشــترو چاکتری بە نسیب بکات.

﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ وَٰسِعًا ﴾ واتــە: خــوای گــەورە خــاوەن چاکــەی زۆرو میهرەبانــی بەرفراوانــە، ڕەحمــەتو میهرەبانــیو چاکــەی گەیشــتووەتە ئــەو شــوێنەی کــە زانســتی پێی گەیشــتووە، بێگومــان زانســتو زانیــاری هەموو شــتێکی گرتۆتەوە. بــەڵام لەگەڵ ئەوەشــدا ﴿ حَكِيمًا ﴾ واتــە: بــە دانایی خۆی دەبەخشــێتو بــە دانایی خــۆی دەیگرێتــەوە، ئەگەر دانایی وا پێویســت بــکات لــە هەنــدێ لــە بەندەکانی دەیگرێتــەوە، چونکە ئــەو بەندە شایســتەی ئەو چاکــە نیە، بە دادگــەریو حیکمەتــی خــۆی لێی قەدەغــە کردوە.

(١٣١-١٣٢): ﴿ وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَلَقَدْ وَصَّيْنَا ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَإِيَّاكُمْ أَنِ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ وَإِن تَكْفُرُوا۟ فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَنِيًّا حَمِيدًا ﴿١٣١﴾ وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿١٣٢﴾ ﴾:

خــوا ﷻ هەواڵــی داوە دەربــارەی موڵــکو دەســەڵاتی گــەورەو بەرفراوانــی کە بــە جوانترین شــێوە ڕێکــی خســتووە، وە بە دەســتکاری کردنــی بە جۆرەهــا دەســتکاری بە قەدەر بــێ، یان بــە شــەرع بــێ. گۆڕینی شــەرعی ئەوەیە کە ئامۆژگــاری هەمــوو بەندەکانی کــردوە لە خاوەن کتێبەکانــی پێشــوو داهاتوو، بە تەقوای خــواو جێبەجێ کردنــی فەرمانەکانــیو دوورکەوتنەوە لــە قەدەغەکراوەکانــیو دارشــتنی ئەحکامــەکان، وە پاداشــتی ئــەو کەســە بداتــەوە ئەگــەر ئامۆژگاریەکانــی جێبەجێ بکات، وە ســزای ئەو کەســانە بدات کەوا پشــت گــوێ دەخەنو لە بیــری دەکەن بە ســزایەکی بە ئێــش، وە لەبەر ئەمە دەفەرمــوێ: ﴿ وَإِن تَكْفُرُوا۟ ﴾ واتە: بەوەی کــە واز لــە تەقــوای خــواو خۆپارێــزی بهێنن، وە هــاوەڵ بۆ خوا بڕیــار بدەن شــتانێک کە خوا بەڵگــەی لەســەری نــە ناردۆتــە خــوارەوە بۆتان، بەڕاســتی ئێــوە زیان بــە کــەس ناگەیەنن لەو

ڕەفتارەتانـدا جگـە لە خۆتـان نەبێ، وە زیـان بە خوا ناگەیەنـن، وە لە موڵکو دەسـەڵاتی کەم ناکەنـەوە، وە خـوای گەورە بەنـدە گەلێکی هەیە زۆر لە ئێـوە گەورە ترو باشـترن، گوێڕایەڵی دەکـەنو ملکەچـی فەرمانەکانی دەکـەن، لەبەر ئەمە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِن تَكْفُرُواْ فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَنِيًّا حَمِيدًا ﴾ واتـە: خـاوەن بەخشـندەیی تـەواوە کە لـە خەزێنـەی میهربانیـەوە دەرچـووە، کـە بەخشـین لێی کـەم ناکاتەوە، بـە درێژایی شـەوو ڕۆژ، جـا ئەگـەر هەمـوو ئەوانەی لـە نێو ئاسـمانەکانو زەویـدان یەکەمو کۆتا کەسـیان، هەر یەکێـک لەوانـە داوا بـکات هەتـا داواکاری نامێنێتو خواش پێی ببەخشـێ، ئـەوە لە موڵکو دارایـی خـوا کـەم نـاکات، چونکە خـوای گـەورە بەخشـندەو میهرەبانـە، بە ڕاسـتی خوا ﷻ هەر کاتێک بیەوێت شتێک بەدی بێنێت پێی دەڵێ ببە دەست بەجێ دەبێت.

وە لـە تـەواوی دەوڵەمەندی خوای گـەورە ئەوەیە کە بەڕاسـتی ئەو تەواوی وەسـفە جوانەکانی لـە خۆ گرتـووە، ئەگەر کـەمو کورتـی هەبووایە بە شـێوەیەک لە شـێوەکان، ئـەوە جۆرێک لـە هـەژاری دەدرایە پـاڵ تەواویەکـەی، بەڵکو هەمـوو سـیفەتەکانی تەواوی لە خـۆ گرتووە، وە لـەو سـیفەتانە تـەواوی خوایـە، وە لـە تـەواوی دەوڵەمەندیـدا ئەوەیـە کـە هیـچ هـاوەڵو منداڵێکـی بـۆ خـۆی هەڵنەبژاردووەو هیچ هاوبەشـێکی نیـە، وە لە تـەواوی دەوڵەمەندی ئەوەی کـە هەموو جیهان پێویسـتیان پێیەتی لـە هەموو بـارودۆخو کارو بارەکانیانـدا، وە داواکردنیان لـەو پێویسـتیە وردانـەی کە تایبەتـە بە کەسـەکانەوە، بێگومـان خـوا ﷻ داواکاریەکانیانی بۆ هێناوەتـە جـێو دەوڵەمەنـدو بـێ نیـازی کـردوون، وە بە نـەرمو نیانـی خۆی منەتـی کردوە بەسـەریانداو ڕێنمایی کردوون.

بـەڵام (الحمیـد) کـە یەکێکـە لـە نـاوە پیرۆزەکانـی خـوای گـەورە، ئاماژەیە بۆ ئـەوەی کە خوا شایسـتەی هەموو سـوپاسو ستایشـێکە، وە بە هەمان شێوە شایسـتەی هەموو خۆشویستنو پیاهەڵـدانو ڕێـز لێگرتنێکـە، وە لەبـەر ئـەوە سـیفەتی سـتایش کردنـی وەرگرتـووە چونکە لـە سـیفەتە جوانەکانـە، وە هەروەهـا لەبـەر ئـەو هەمـوو نـازو نیعمەتـە گەورانـەی کـە بـە دروسـتکراوەکانی بەخشـیوە، بـە ڕاسـتی هەموو کاتێک سـتایش کـراوە. ئای چەنـدە جوانو سـەرنج ڕاکێشـە هێنانی ئەم دوو ناوە پیرۆزە بەیەکـەوە (الغني الحمید) بەڕاسـتی خوای گەورە دەوڵەمەنـدو سـتایش کـراوە، لە دەوڵەمەندیدا سـیفەتی تـەواوی وەرگرتوە، وە بە هەمان شـێوە لە سـتایش کردنیشـدا.

پاشـان دووبـارەی کردوەتەوە کە هەرچـی لە ئاسـمانەکانو زەوی دایە موڵکی ئـەوە، وە تەنها

ئەو بەسەر هەموو شتەکانەوە پێ سپێردراوو چاودێرە، واتە: خوا زانایە بە ڕێکخستنی هەموو شتەکان لە ڕووی دانایی‌و حیکمەتەوە، ئەمەش لە تەواوی سیفەتی پێ سپێردراوە، چونکە پێ سپێردراو مانای ئەوەیە کە زانستی تەواوی هەبێت بەو شتەی کە پێی دەسپێردرێت، وە دەسەڵاتی لەسەر جێبەجێکردنو ڕێکخستنیدا هەبێ، وە دەبێ ئەو ڕێکخستنە لەسەر بنەمای دانایی‌و بەرژەوەندی بێت، ئەگەر هەر شتێک لەوە کەم بکات ئەوە لە کەمو کورتی پێ سپێردراو دەگەیەنێت، وە بەڕاستی خوای گەورە پاکو پارێزراوە لە هەموو ناتەواویەک.

(١٣٣-١٣٤): ﴿إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ أَيُّهَا ٱلنَّاسُ وَيَأْتِ بِـَٔاخَرِينَ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ ذَٰلِكَ قَدِيرًا ﴿١٣٣﴾ مَّن كَانَ يُرِيدُ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا فَعِندَ ٱللَّهِ ثَوَابُ ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ﴿١٣٤﴾﴾:

واتە: خوا ﷻ دەوڵەمەندو ستایش کراوە خاوەن دەسەڵاتی تەواوەو ویستی لە بەندەکانیدا جێبەجێکراوە ﴿إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ أَيُّهَا ٱلنَّاسُ وَيَأْتِ بِـَٔاخَرِينَ﴾ واتە: دەستەیەکی تر جگە لە ئێوە، ئەوان چاکتر فەرمانی خوا جێبەجێ بکەنو لە ئێوە باشتر بن، وە لەم دەقەدا ئاماژە بە هەڕەشەیەک دەکات بۆ خەڵکی لەسەر بەردەوام بوونیان لە بێبڕوایی‌و پشت کردنیان لە پەروەردگاریان، خوای گەورە هیچ پێویستی بەوان نیە ئەگەر گوێڕایەڵی نەکەن، بەڵام خوای گەورە مۆڵەتیان پێ دەدا بەڵام لە بیریان ناکات.

پاشان خوا ﷻ هەواڵی داوە کە هەر کەسێک هەموو مەبەستو ئامانجێکی دنیایی هەبێ، وە ویستی دوا ڕۆژی نەبێت، ئەوە بەڕاستی کۆششەکەی کوورت بینە، وە لەگەڵ ئەوەشدا پاداشتی دونیا بەدەست ناهێنێ جگە لەوەی کە خوا بۆی نووسیوە، چونکە بەڕاستی خوای گەورە خۆی خاوەن هەموو شتێکە، کە پاداشتی دنیاو دوارۆژی لەلایە، دەسا با داوا لەو بکەن وە تەنها پشت بەو ببەستن بۆ بەدەست هێنانی دنیاو دوارۆژیان، چونکە بەڕاستی کەس ناگا بەو پلەو پایە کە لەلای خودایە ئیلا بە فەرمانبەرداریی‌و گوێڕایەڵی خوا نەبێت، ناگەن بە کارەکانی دنیاو دوارۆژ تەنها پشت بەستن بە خوا نەبێت، وە گەڕانەوەیەکی خۆبەکەم زانانەو هەژارانە بۆ لای خوای گەورە بە بەردەوامی، وە خوای گەورە خاوەن حیکمەتو دانایە، بە دانایی خۆی هەر کەسێکی بوێ سەرکەوتووی دەکات، وە بیەوێ سەرشۆڕی بکات سەرشۆڕی دەکات، وە بە هەمان شێوە لە پێدانو پێنەدان، وە لەبەر ئەمە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا﴾.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ بِٱلْقِسْطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ وَلَوْ
عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَوِ ٱلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ إِن يَكُنْ غَنِيًّا أَوْ فَقِيرًا
فَٱللَّهُ أَوْلَىٰ بِهِمَا فَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلْهَوَىٰٓ أَن تَعْدِلُواْ وَإِن تَلْوُۥٓاْ
أَوْ تُعْرِضُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿١٣٥﴾ يَٰٓأَيُّهَا
ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلَّذِى نَزَّلَ
عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِن قَبْلُ وَمَن يَكْفُرْ
بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ فَقَدْ ضَلَّ
ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴿١٣٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ ثُمَّ ءَامَنُواْ ثُمَّ
كَفَرُواْ ثُمَّ ٱزْدَادُواْ كُفْرًا لَّمْ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغْفِرَ لَهُمْ وَلَا لِيَهْدِيَهُمْ
سَبِيلًۢا ﴿١٣٧﴾ بَشِّرِ ٱلْمُنَٰفِقِينَ بِأَنَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٣٨﴾ ٱلَّذِينَ
يَتَّخِذُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَيَبْتَغُونَ
عِندَهُمُ ٱلْعِزَّةَ فَإِنَّ ٱلْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا ﴿١٣٩﴾ وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِى
ٱلْكِتَٰبِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا
تَقْعُدُواْ مَعَهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُواْ فِى حَدِيثٍ غَيْرِهِۦٓ إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ
إِنَّ ٱللَّهَ جَامِعُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْكَٰفِرِينَ فِى جَهَنَّمَ جَمِيعًا ﴿١٤٠﴾

پاشان خوا ﷻ دەفەرموێ:

(١٣٥): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ بِٱلْقِسْطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَوِ ٱلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ إِن يَكُنْ غَنِيًّا أَوْ فَقِيرًا فَٱللَّهُ أَوْلَىٰ بِهِمَا فَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلْهَوَىٰٓ أَن تَعْدِلُواْ وَإِن تَلْوُۥٓاْ أَوْ تُعْرِضُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿١٣٥﴾ ﴾:

خوای بەرز فەرمان بە بڕواداران دەکات دەفەرموێ: ﴿ قَوَّٰمِينَ بِٱلْقِسْطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ ﴾وشەی (القوام) صیغەی موبالەغەیە، واتە: لە هەموو بڕیارەکاندا بە بەردەوام دادگەری بچەسپێنن، کە بریتیە لە دادگەری لە مافەکانی خواداو مافی بەندەکاندا، دادگەری لە مافەکانی خوادا ئەوە دەگەیەنێت کە نیعمەتەکانی خوا بەکارنەهێنی بۆ سەرپێچی کردنی، بەڵکو لە خواپەرستی گوێڕایەڵیدا بەکاریان بهێنێت، وە دادگەریش لە مافی بەندەکاندا ئەوەیە، هەموو ئەو مافانەی کە لە ئەستۆتە بە جوانترین شێوە جێبەجێی بکەیت، وەک چۆن داکۆکی لە مافەکانی خۆت دەکەیت، هەموو ئەو خەرجیانەی کە لە ئەستۆتدایە بە جوانترین شێوە بیدەیتەوە بە خاوەنەکانیان، بە هەمان شێوە قەرزەکانیش، وە بە شێوەیەک مامەڵە لەگەڵ خەڵکدا بکەیت بەو شێوەی کە خۆت پێت خۆشە مامەڵەت لەگەڵدا بکرێت، لە ڕەوشتو هاوکاریو جگە لەوانەش.

وە لە گەورەترین جۆرەکانی شایەتیدان لەسەر وتەو گفتوگۆکانە، نابێت بڕیار بە هیچ کام لەو دوو قسەیە بدات، یان هیچ کام لەو دوو ڕکابەرە، لەبەر ئەوە حەزی بۆ لای یەکیان دەجوڵێت، بەڵکو ڕێڕەوی دادگەری دەگرێتە بەر لە نێوانیاندا، وە بە هەمان شێوە لە دادگەری، شایەتیدانە بۆ هەر لایەک کە هەقو ڕاستی لەلا بێت، ئەگەر بەسەر نزیکترین کەستدا بکەوێت، یان بەسەر نەفسی خۆتدا، وە لەبەر ئەمە خوای دادگەر دەفەرموێ:

﴿ شُهَدَآءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَوِ ٱلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ إِن يَكُنْ غَنِيًّا أَوْ فَقِيرًا فَٱللَّهُ أَوْلَىٰ

بِهِمَا ﴾ واتـە: چاوپۆشـی لە دەوڵەمەنـد مەکەن لەبەر ئەوەی کـە دەوڵەمەنـدە، وە لە هەژاریش لەبـەر ئـەوەی کـە دڵتان بۆی دەسـووتێو دەتانـەوێ میهرەبانی بـۆ دەرببڕن، بەڵکو شـایەتی بۆ هـەق بدەن جـا بۆ هەر کەسـێک بێت. گەورەتریـن بەربەسـتو ڕێگری لەبەردەم شـایەتیداندا شـوێنکەوتنی ئارەزووەکانـە، وە لەبـەر ئەمـە خـوای گەورە ئاگـاداری کردوەتەوە بـە لابردنی ئـەو بەربەسـتە، بـە ڕسـتەی: ﴿ فَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلۡهَوَىٰٓ أَن تَعۡدِلُواْ ﴾ واتـە: شـوێنی ئارەزووەکانی نەفـسو دەروونتـان مەکـەون کـە پێچەوانـەی هەقو ڕاسـتیە، بەڕاسـتی ئەگـەر ئێوە شـوێنی بکـەون ئـەوە لـە ڕێگـای ڕاسـت لاتانـداوە، وە سـەرکەوتوو نەبـوون بـۆ دەسـتەبەر کردن، هـەواو ئـارەزوو، یان چـاوی خاوەنەکـەی کوێر دەکات، هەتا ڕاسـتی بە سـاختەو پووچو درۆ تێدەگـات، وە سـاختەو پـووچو درۆش بە ڕاسـتی، یان ئەوەیە هەقو ڕاسـتی دەناسـێتو وازی لێدەهێنێـت لەبـەر هـەواو ئارەزووی، هـەر کەسـێک ڕزگاری ببێـت لە ئـارەزووی دەروونی، ئـەوە سـەرکەتوو بووە بـۆ خێرو چاکـەو هیدایـەت دراوە بۆ سـەر ڕێگای ڕاسـت.

کاتـێ کـە ڕوونی کردوەتـەوە، (واجـب) بریتیە لە هەسـتان بـە دادگـەری، پێچەوانەکەی قەدەغـە کـردوە، لـە لار بوونـەوەی زمـان لەسـەر هـەقو لـە شـایەتیدانو هاوشـێوەکانی، گۆڕیـنو دەسـتکاری کردنـی وتـە لـە ڕاسـتیو شـیاو لـە هەمـوو ڕووەکانـەوە، یـان لـە هەنـدێ ڕووەوە، وە ئەمـەش دەچێتە چوارچێوەی گۆڕینی شـایەتیدانو تـەواو نەکردنی، یان لێکدانـەوەی شـایەتی بـە جۆرێکی تر، بەڕاسـتی ئەمـە دەم لار کردنەوەیەو لە ڕاسـتی لادانە. ﴿ أَوۡ تُعۡرِضُواْ ﴾ واتـە: واز لـە دادوەری بهێنـن، وەک وازهێنانی شـایەت لە شـایەتیدان، وە واز هێنانـی دادوەر لـە دادگایـی کردندا، کە پێویسـتە لەسـەری بەو کارە هەسـتێت ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا ﴾ واتـە: دەوری کردەوەکانتانـی داوەو بـە هەمـووی دەزانێـت، ئەوەی شـاراوەو ئەوەی ئاشـکرایە، بەڕاسـتی لەمـەدا هەڕەشـە کردنێکی توونـد هەیە بۆ ئەو کەسـانەی کـە شـایەتی بـە پێچەوانـە دەدەن، یان نایـدەنو گوێـی نادەنێ، وە ئەو کەسـەی فەرمـان بـە سـاختەو پـووچو بـێ مانـا دەکات لـە پێشـترە، یـان شـایەتی بـە درۆ دەدات، چونکـە ئەمـە گەورەتریـن تاوانـە، بێگومان ئـەو دووانەی پێشـوو تەنهـا وازیان لە ڕاسـتی هێنـا، بـەڵام ئەمـە وازی لە ڕاسـتی هێناو هەسـتا بـە شـایەتیدانی ناهەق.

(١٣٦): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلَّذِي نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِن قَبۡلُۚ وَمَن يَكۡفُرۡ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ فَقَدۡ ضَلَّ ضَلَٰلَۢا بَعِيدًا ١٣٦ ﴾:

بزانـە فەرمـان یـان ڕوو دەکاتە کەسـێک کـە هیچی ئـەوی تێدا نیـە، وە وەسـف نەکراوە بـە هیچ شـتێکی ئـەو، ئەمە دەبێتـە فەرمان بۆ ئـەو کەسـە، وە دەکەوێتە ئـەو چوارچێویەوە، وەک فەرمـان کـردن بە بڕوا لە بەرانبەر کەسـێکدا بـڕوای نەهێنابێ، وەک خـوا دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَـٰبَ ءَامِنُواْ بِمَا نَزَّلْنَا مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَكُم ﴿٤٧﴾ ﴾ یـان ڕوو دەکاتـە کەسـێک کـە لـەو چوارچێوەدایـە، ئـەم فەرمانـە بـۆ ئەوەیـە ڕاسـتی بکاتـەوە لەسـەر ئەو بەرنامەیـە، وە ئـەوەی بەدەسـتی نەهێنـاوە بەدەسـتی بێنێـت، وە لەوانـەدا ئەوەیـە کە خوای گـەورە باسـی کـردوە لەم دەقەدا لـە کاری بـڕواداران بە ئیمـان، ئەمە ئـەوە دەگەیەنێت کە ئیمانەکەیـان ڕاسـتتر بکەنەوە، بـە دڵسـۆزیی‌و ڕاسـتگۆیی‌و دوورکەوتنەوە لـە خراپەکان‌و گەڕانـەوە لە هەمـوو کـەم‌و کورتیەکان.

وە بـە هەمـان شـێوە فەرمانەکـە ئـەو بـڕوادارەش دەگرێتـەوە کـە ئەو شـتەی تێـدا نیە، لە زانیـاری‌و بـڕواو کار پێکردنـی، بێگومـان هەر دەقێـک بیبسـتێت‌و لە ماناکـەی تێبگات‌و بیروبـاوەڕی پێـی هەبێـت، بەڕاسـتی ئەوە ئـەو ئیمانەیە کە فەرمانـی پێکـراوە، وە بە هەمان شـێوە هەموو کـردارە ئاشـکراو نهێنیـەکان، هەمووی لـە ئیمانەوەیـە، وەک چـۆن کۆمەڵە دەقێکـی زۆر بەڵگـەن لەسـەر ئەوە، وە سـەلەفی ئەم ئۆممەتە لەسـەری یەک دەنگن. پاشـان بـەردەوام بـوون لەسـەر ئەوە هەتـا مـردن، وەک خوای گـەورە دەفەرمـوێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾آل عمـران. وە لێـرەدا فەرمانی کـردوە بـە بـڕوا هێنان بە خواو بـە پێغەمبەرەکـەی ﷺ، وە بـە قورئان‌و کتێبـە پیرۆزەکانی پێشـتر، ئەمانـە هەمووی پێویسـتە لەسـەر بڕوادار بـڕوای پێیـان هەبێت، چونکە بەنـدە نابێتە بـڕوادار بـەوە نەبێت، بە کورتـی پێش ئەوەی درێژەی باسـەکان پێی بگات، هەر کەسـێک بـڕوای هێنـا وەک چـۆن فەرمانی پێکـراوە، ئەوە هیدایەتـی وەرگرتوەو سـەرکەوتوو بووە.
﴿ وَمَن يَكْفُرْ بِٱللَّهِ وَمَلَـٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَـٰلًۢا بَعِيدًا ﴾واتە: چـی گومڕاییـەک لـەوە دوورتـرە کە واز لـە ڕێگای ڕاسـت بهێنێـت‌و ڕێگایـەک بگرێتە بـەر کە بـەرەو دۆزەخی ببـات؟! باش بزانـە بێبڕوایی‌و کوفرکـردن بە شـتێک لەمانەی کە باسـکران، وەک بێبڕوایـی وایە بـە هەموویان، لەبەر ئـەوە تەواوکەری یەکتریـن، وە لە بەر خـۆ گرتنەوە لـە بـڕوا هێنان بـە هەندێکیان جگـە لە هەندێکـی دیکە.

(١٣٧): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ ثُمَّ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ ثُمَّ ٱزْدَادُواْ كُفْرًا لَّمْ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغْفِرَ لَهُمْ وَلَا لِيَهْدِيَهُمْ سَبِيلًۢا ﴿١٣٧﴾ ﴾:

واتــە: هەر کەسـێک کوفـرو بێبڕوایـی لێ دووبـارە بوویەوە پاش ئـەوەی کە بـڕوای هێنا، پاشـان ڕێگـای ڕاسـتی گرتـە بـەرو ڕێنمایـی گرتەبـەر، پاشـان گومـڕا بوویەوەو لەسـەر بێبڕوایـی بـەردەوام بـوو بەڵکـو بێبڕوایەکـەی زیاتـر بـوو، ئەمە دوورە لـە ڕێنمایـیو ڕێ پێشـاندان بـۆ باشـترین ڕێگـا، وە دوورە لـە داوای لێخـۆش بـوون، چونکـە گەورەتریـن بەربەسـتی لەبـەردەم خـۆی داناوە کـە ڕێگریی لێ دەکات لە بەدەسـت هێنانی لێخۆشـبوون، بێگومـان بێبڕواییەکـەی دەبێتـە سـزاو سروشـتێک لاناچێـت، وەک خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ فَلَمَّا زَاغُوٓاْ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمۡ ﴿٥﴾ ﴾الصف. وە هەروەهـا دەفەرمـوێ: ﴿ وَنُقَلِّبُ أَفۡـِٔدَتَهُمۡ وَأَبۡصَٰرَهُمۡ كَمَا لَمۡ يُؤۡمِنُواْ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٖ ﴿١١٠﴾ ﴾الأنعـام.

ئـەم ئایەتـە ئامـاژە بـەوە دەکات ئەگـەر ئـەوان قـووڵ نەبوونایەتەوە لـە بێبڕواییـدا، بەڵکو بگەڕانایەتـەوە بـۆ ئیمـانو وازیان لـەو بێبڕواییـە بهێنایە کە لەسـەری بوون، ئـەوە بێگومان خـوا لێیان خـۆش دەبوو، ئەگـەر دووبـارەش هەڵبگەڕانایەتەوە، جـا ئەگەر ئەمـە بڕیار بێت بـۆ بێبڕوایـی، ئەی جگە لەمـە تاوانو سـەرپێچی کە بێگومـان لە خـواری کوفرەوەیە، ئەوە لـە پێشـترە، بەنـدەی خـوا ئەگـەر گەڕایەوەو پاشـان گەڕایـەوە بـۆ سـەرپێچکردن، خوای گـەورەش دەگەڕێتـەوە بـۆ لایو لێی خـۆش دەبێ.

(١٣٨-١٣٩): ﴿ بَشِّرِ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ بِأَنَّ لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٣٨﴾ ٱلَّذِينَ يَتَّخِذُونَ ٱلۡكَٰفِرِينَ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۚ أَيَبۡتَغُونَ عِندَهُمُ ٱلۡعِزَّةَ فَإِنَّ ٱلۡعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعٗا ﴿١٣٩﴾ ﴾:

(البشـارة): واتـە: مـژدەدان، بەکاردەهێنرێـت بـۆ خێـرو چاکەو بە هەمان شـێوە بۆ شـەڕو خراپـەش، بـەڵام بـە بەندو کـۆت کـردن، وەک چۆن خوای گـەورە دەفەرمـوێ: ﴿ بَشِّرِ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ ﴾واتـە: ئەوانـەی کە ئیسـلامەتیان ئاشـکرا کـردووەو کوفریان لە ناخـی خۆیاندا شـاردۆتەوە، بـە خراپترینو ناشـرینترین شـێوە مژدەیان پێدراوە بە سـزای بە ئـازار، ئەویش بـە هـۆی ئـەوەی کـە بێبڕواکانیـان خـۆش دەویسـتو پشـتگیریان دەکـردنو سـەریان دەخسـتن، لـە بەرانبەر ئەوەدا وازیان لە پشـتیوانی کردنی مسـوڵمانان هێنا، چی شـتێک وای لێکردن ئـەم کارە بکەن؟ ﴿ أَيَبۡتَغُونَ عِندَهُمُ ٱلۡعِزَّةَ ﴾ ئەمە حەقیقەتـی حاڵی دووڕووەکانە کـە گومانـی خراپیـان برد بـە خـوای گـەورەو دڵنیاییـان زۆر لاواز بـوو بە سـەرکەوتنی خوایـی بـۆ بەنـدە بڕوادارەکانـی، وە تەماشـای هەنـدێ هۆکاریـان دەکرد کـە لای کافران هەیـە، وە کـورت بیـن بـوون بەرانبەر بـەوەی کە لە پشـتی ئـەو هۆکارانەوە دەگـوزەرێ، هەتـا کافرەکانیـان کـرد بە دۆسـتو نزیکـی خۆیانو شـانازیان پێـوە دەکردنو سـەریان

دەخستن، بەلاّم لە ڕاستیدا عیزەتو گەورەیی هەموو بە تێکڕا لەلای خوایە، بەڕاستی تەویڵو نێوچاوانی بەندەکان بە دەستی خوداو ویستی ئەوە، خوای گەورە گرەنتی داوە بە سەرکەوتنی ئاینەکەیو بەندە بڕوادارەکانی، ئەگەرچی هەندێ کێشەو گرفت بە هۆی تاقیکردنەوەوە بهێنێتە ڕێگایانو دوژمن بەسەریاندا سەربخات بە سەرخستنێکی کاتی نەک بەردەوام، بەلاّم بە دڵنیایی سەرەنجامو داهاتوو تەنها بۆ بڕوادارانە. وە ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ترساندنێکی گەورە لە بە دۆست گرتنی بێبڕواکانو وازهێنان لە پشتیوانیکردنی مسوڵمانان، بێگومان ئەوە لە سیفەتی دووڕووەکانە، وە بەڕاستی ئیمان وا پێویست دەکات کە بڕوادارانت خۆش بوێو پشتیوانیان لێ بکەیتو ڕقت لە بێبڕوایان بێو دژایەتیان بکەی.

(١٤٠-١٤١): ﴿ وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي ٱلْكِتَٰبِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ
بِهَا فَلَا تَقْعُدُوا۟ مَعَهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا۟ فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِۦٓ ۚ إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ جَامِعُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ
وَٱلْكَٰفِرِينَ فِي جَهَنَّمَ جَمِيعًا ﴿١٤٠﴾ ٱلَّذِينَ يَتَرَبَّصُونَ بِكُمْ فَإِن كَانَ لَكُمْ فَتْحٌ مِّنَ ٱللَّهِ قَالُوٓا۟ أَلَمْ
نَكُن مَّعَكُمْ وَإِن كَانَ لِلْكَٰفِرِينَ نَصِيبٌ قَالُوٓا۟ أَلَمْ نَسْتَحْوِذْ عَلَيْكُمْ وَنَمْنَعْكُم مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۚ
فَٱللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ وَلَن يَجْعَلَ ٱللَّهُ لِلْكَٰفِرِينَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ سَبِيلًا ﴿١٤١﴾ ﴾:

واتە: بێگومان خوا ﷻ لەوەی کە دایبەزاندووە حوکمی شەرعی بۆ ئێوە ڕوون کردۆتەوە، کاتێک کە لە کۆڕو کۆمەڵی بێبڕواو سەرپێچیکاراندا دادەنیشن ﴿ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا ﴾ واتە: گاڵتەیان پێ دەکرێت، وە لەبەر ئەوە پێویستە لەسەر هەموو کەسێک کە دەقەکانی خوای بەسەردا دەخوێنرێ بڕوای پێ بهێنێو بە گەورەی بزانێو ڕێزی لێ بگرێ، مەبەست لە دابەزاندنی ئەمەیە کە خوای گەورە دروستکراوی دروستکردوە لەو پێناوەدا، دژی ئیمان بڕواپێ نەکردنێتیو بە کەم زانینو گاڵتە پێکردنێتی، وە دەچێتە چوارچێوەی ئەوەوە مشتومڕی بێبڕواو دووڕووەکان بۆ پووچ کردنەوەی ئایەتەکانی خواو سەرخستنی بێبڕواییەکەیانە. بە هەمان شێوە بیدعەچیەکان بە جیاوازی جۆرەکانیانەوە بەڕاستی بەڵگەهێنانەوەیان لەسەر ناڕاستیەکانیان، گاڵتەکردن بە ئایەتەکانی خوا لە خۆدەگرێت، چونکە ئەو دەقانە تەنها ئاماژە بە هەقو ڕاستی دەکەن، بەڵکو وە بە هەمان شێوە دەچێتە ئەو چوارچێوەیەوە دانیشتن لە کۆڕو کۆمەڵی تاوانبارانو سەرپێچیکاراندا کە لەو جۆرە شوێنانە گاڵتە بە فەرمانەکانی خواو قەدەغە لێکراوەکانی دەکرێ وە سنوورەکانی خوایان تێدا ناپارێزرێ کە خوای گەورە

بـۆ بەندەكانـی دیـاری كـردوە، وە ئـەم قەدەغەكردنـە بـەوە كۆتایی دێـت كـە لەگەڵیاندا دانەنیشـێت، ﴿حَتَّىٰ يَخُوضُواْ فِى حَدِيثٍ غَيْرِهِۦٓ﴾ واتـە: تـا دەچنە ناوباسـێكی تـرەوە جگە لە بـێ بـاوەڕی كـردن بە دەقەكانـی خـواو گاڵتەپێكردنیـان ﴿إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ﴾ واتـە:ئەگەر لەگەڵیانـدا دانیشـتن ﴿مِّثْلُهُمْ﴾ ئێـوەش وەك ئەوان وان، چونكە ڕازی بـوون بە بێبڕوایی‌و گاڵتەپێكردنـی ئەوان، وە ئـەوەی ڕازی دەبێ بە سـەرپێچی وەك بكەرەكەی وایە، بەهەرحاڵ هەر كەسـێك لـە كـۆڕو كۆمەڵێكدا دابنیشـێ سـەرپێچی خوای تێـدا بكرێ ئەوە پێویسـتە لـە سـەری نكوڵیـان بـكات، بە پێـی توانـا، یـان هەسـتێت‌و ئـەو شـوێنە بەجێبهێڵێ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ جَامِعُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْكَٰفِرِينَ فِى جَهَنَّمَ جَمِيعًا﴾وەك چـۆن كـۆی كردنـەوە لەسـەر بێبڕوایـی‌و پشـتگیری كـردن لێی، هیچ سـوودو كەڵكێكی نیـە دووڕووەكان بـە ڕووكەش لەگـەڵ بڕوادارانـدا بـن ﴿يَوْمَ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱنظُرُونَا نَقْتَبِسْ مِن نُّورِكُمْ ﴿١٣﴾﴾ الحدیـد. هەتـا كۆتایـی ئایەتەكە.

ٱلَّذِينَ يَتَرَبَّصُونَ بِكُمْ فَإِن كَانَ لَكُمْ فَتْحٌ مِّنَ ٱللَّهِ قَالُوٓاْ
أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ وَإِن كَانَ لِلْكَٰفِرِينَ نَصِيبٌ قَالُوٓاْ
أَلَمْ نَسْتَحْوِذْ عَلَيْكُمْ وَنَمْنَعْكُم مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۚ فَٱللَّهُ يَحْكُمُ
بَيْنَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ وَلَن يَجْعَلَ ٱللَّهُ لِلْكَٰفِرِينَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ
سَبِيلًا ﴿١٤١﴾ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَٰدِعُهُمْ وَإِذَا
قَامُوٓاْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُواْ كُسَالَىٰ يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ وَلَا يَذْكُرُونَ
ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٤٢﴾ مُّذَبْذَبِينَ بَيْنَ ذَٰلِكَ لَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ وَلَآ إِلَىٰ
هَٰٓؤُلَآءِ ۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلًا ﴿١٤٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۚ
أَتُرِيدُونَ أَن تَجْعَلُواْ لِلَّهِ عَلَيْكُمْ سُلْطَٰنًا مُّبِينًا ﴿١٤٤﴾ إِنَّ
ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا
﴿١٤٥﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ وَأَصْلَحُواْ وَٱعْتَصَمُواْ بِٱللَّهِ وَأَخْلَصُواْ
دِينَهُمْ لِلَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ وَسَوْفَ يُؤْتِ ٱللَّهُ
ٱلْمُؤْمِنِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٤٦﴾ مَّا يَفْعَلُ ٱللَّهُ بِعَذَابِكُمْ
إِن شَكَرْتُمْ وَءَامَنتُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ شَاكِرًا عَلِيمًا ﴿١٤٧﴾

پاشان باسی حه‌قیقه‌تی دۆستایه‌تی دووڕووه‌كان ده‌كات بۆ بێبڕوایان، وه‌ دژایه‌تیكردنیان بۆ ئیمانداران، ده‌فه‌رمووێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَتَرَبَّصُونَ بِكُمْ ﴾واته‌: چاوه‌ڕوانی سه‌ره‌نجامی ئێوه‌ ده‌كه‌ن، وه‌ هه‌تا لێده‌بنه‌وه‌ له‌ خێر یان شه‌ڕ، وه‌ بێگومان بۆ هه‌موو بارودۆخێك وه‌ڵامێكیان داناوه‌ به‌ پێی دووڕوویه‌كه‌یان ﴿ فَإِن كَانَ لَكُمْ فَتْحٌ مِّنَ ٱللَّهِ قَالُوٓاْ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ ﴾ ئاشكرای ده‌كه‌ن بۆتان كه‌ ئه‌وان له‌گه‌ڵ بڕوادارانـدان به‌ ئاشكراو به‌ نهێنی، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی پارێزراو بن له‌ توانج و تانه‌ لێدان، وه‌ له‌به‌ر ئه‌وه‌ی به‌شدار بن له‌گه‌ڵتان له‌ ده‌سكه‌وته‌كانتاندا ﴿ وَإِن كَانَ لِلْكَٰفِرِينَ نَصِيبٌ ﴾نه‌یفه‌رموه‌: (فتح) سه‌ركه‌وتن، چونكه‌ كافران هه‌رگیز سه‌ركه‌وتوو نابن به‌ به‌رده‌وامی، به‌ڵكو ئه‌وپه‌ڕی ئه‌وه‌ی كه‌ پێی ده‌گه‌ن له‌سه‌ركه‌وتن ته‌نها به‌شێكه‌و به‌رده‌وام نیه‌، به‌ڕاستی ئه‌مه‌ حیكمه‌تی خوایه‌. ئه‌گه‌ر به‌وشێوه‌یه‌ بوو ﴿ قَالُوٓاْ أَلَمْ نَسْتَحْوِذْ عَلَيْكُمْ ﴾ واته‌: ئایا ئێمه‌ سه‌رمان نه‌خستن به‌سه‌ر ئه‌واندا؟ ﴿ وَنَمْنَعْكُم مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ واته‌: دێنه‌ لاتان ده‌ڵێن ئایا ئێوه‌مان نه‌پاراست له‌ ده‌ستی بڕواداران به‌ هه‌موو شێوه‌یه‌ك له‌ شێوازه‌كانی به‌رگریكردن له‌ ساردكردنه‌وه‌و دانیشتن له‌ كوشتار، وه‌ بانگه‌شه‌ی سه‌ركه‌وتنی ئێوه‌مان نه‌كرد به‌سه‌ر ئه‌واندا، وه‌ بێجگه‌ له‌وانه‌ش ئه‌وانه‌ی كه‌ دیارو ڕوونه‌ له‌لایان.

﴿ فَٱللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾ خوای گه‌وره‌ پاداشتی بڕواداران ده‌داته‌وه‌ به‌ ئاشكراو به‌ نهێنی به‌ به‌هه‌شت، وه‌ سزای دووڕوو و بت په‌رسته‌كانیش ده‌داته‌وه‌ ﴿ وَلَن يَجْعَلَ ٱللَّهُ لِلْكَٰفِرِينَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ سَبِيلًا ﴾واته‌: سه‌ریان ناخات و ده‌سه‌ڵاتیان پێ نادات، به‌ڵكو به‌رده‌وام ده‌سته‌یه‌ك له‌ بڕواداران هه‌یه‌ له‌ سه‌ر ڕاستین سه‌رخراون (الطائفة المنصورة)ن، هه‌ر كه‌سێك بیه‌وێ زه‌لیلیان بكات و پێچه‌وانه‌یان بجوڵێت هیچ زیانێكیان پێناگه‌یه‌نێت.

وە بە بەردەوام خوای گەورە هۆکارەکانی سەرکەوتن بۆ بڕواداران فەراهەم دەهێنێت بۆ تێشکاندنی بێبڕواکان بە چاو دەبینرێت، تەنانەت هەندێ لە بڕواداران کە بێبڕواکان حوکمیان دەکەن ڕێزی تەواویان لێ دەگرنو بە کەم تەماشایان ناکەن، بەڵکو عیزەتی تەواویان هەیە لە لایەن خوای گەورەوە، دەی سوپاسو ستایش بۆ خوای گەورە لە سەرەتاو کۆتاییو ئاشکراو نهێنیدا.

(١٤٢-١٤٣): ﴿ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَٰدِعُهُمۡ وَإِذَا قَامُوٓاْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُواْ كُسَالَىٰ يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ وَلَا يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿١٤٢﴾ مُّذَبۡذَبِينَ بَيۡنَ ذَٰلِكَ لَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ وَلَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِۚ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلٗا ﴿١٤٣﴾ ﴾:

خوا ﷻ هەواڵ دەربارەی دووڕووەکان دەدات بەو شتە قیزەونو ناشرینەی کە لە سەری دەڕۆن، ئەویش بەکارهێنانی ئەو ڕێگایانەیە کە بە کاری دێنن بە نیەتی خۆیان بۆ هەڵخەڵەتاندنی خوای گەورە، واتە: بەوەی کە ئیمانو بڕوایان ئاشکرا دەکەنو کوفرو بێبڕواییان دەشارنەوە، وا گومانیان دەبرد بە بڕەودان بەو کارە بازاڕی خۆیان بەسەر خوادا گەرم دەکەنو خوا پێیان نازانێو ئاشکرایان ناکات بۆ بەندەکانی، بەڵام خوا هەڵوشێنەوەی فێڵی ئەوانە، بەم حاڵەش کە تێیدان تەنیا خۆیان دەخەڵەتێنن، چی خۆخەڵەتاندنێک لەوە گەورەترە کەسێک بچێت بۆ بەدەستهێنانی شتێک بەسەریدا بشکێتەوە بە زەلیلیو سەرشۆڕیو بێبەشی؟! وە هەروەها کەم عەقڵیو ناتەواوی خاوەنەکەی دەگەیەنێت، کە کۆی کردوەتەوە لە نێوان خراپەدا کە وایزانیوە چاکە، وە وای گومان بردوە ئەمە کەماڵی عەقڵو فێڵێکی ژیرانەیە، پاکیی بۆ ئەو خوایە کە نەفامیو سەرشۆڕی بەسەر خاوەنەکەیدا هێناوە. وە خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا دووڕووەکان هەڵدەخەڵەتێنێ (فێڵەکەیان پووچەڵ دەکاتەوە)، وەک لە فەرمایشتی خۆیدا باسی فەرمووە: ﴿ يَوۡمَ يَقُولُ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلۡمُنَٰفِقَٰتُ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱنظُرُونَا نَقۡتَبِسۡ مِن نُّورِكُمۡ قِيلَ ٱرۡجِعُواْ وَرَآءَكُمۡ فَٱلۡتَمِسُواْ نُورٗاۖ فَضُرِبَ بَيۡنَهُم بِسُورٖ لَّهُۥ بَابُۢ بَاطِنُهُۥ فِيهِ ٱلرَّحۡمَةُ وَظَٰهِرُهُۥ مِن قِبَلِهِ ٱلۡعَذَابُ ﴿١٣﴾ يُنَادُونَهُمۡ أَلَمۡ نَكُن مَّعَكُمۡ ﴿١٤﴾ ﴾الحدید. هەتا کۆتایی دەقەکە.

وە لە سیفەتەکانی دووڕووان ئەوەیە: ﴿ وَإِذَا قَامُوٓاْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ ﴾ئەگەر هەڵسن (بۆ نوێژ کردن) کە یەکێکە لە خواپەرستیە کرداریەکان ﴿ قَامُواْ كُسَالَىٰ ﴾بە تەنبەڵیو سستیەوە هەڵدەستنو بە بێزاریەوە ئەنجامی دەدەن، وە تەنبەڵی دروست نابێت مەگەر کەسێک حەز لە دڵیدا نەمێنێت، ئەگەر دڵەکانیان بە تاڵ نەبووایە لە حەز کردن بۆ لای خواو ئەوەی

کە لـە لایەتـی، تەنبەڵی‌و سستیان نەدەکرد.
﴿ يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ ﴾ئـا ئەمەیـە کـە نهێنیەکانیـان لەسـەری گۆشـەگیر کـردوە، وە ئەمـە سـەرچاوەی کردارەکانیانـە، کـە ڕووپامایـی‌و ڕیایـی بۆ خەڵـک دەکەن، مەبەستیان ئەوەیە خەڵـک بیانبینـێ‌و بـە گەورەیـان بزانـێ‌و ڕێزیان لێ بگـرێ، وە دڵسـۆزی بۆ خـوا نانوێنن، لەبـەر ئەمـە خـوای گـەورە دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَا يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ چونکـە دڵیـان پڕە لـە ڕووپامایـی، بەڕاسـتی یـادی خـوای گەورەو بـەردەوام بـوون لەسـەری، تەنها لـە لایەن بڕوادارێکـەوە دەبـێ کـە دڵـی پـڕ بێت لە خۆشەویسـتی‌و بـە گـەورە زانینی خـوای بەرزو مـەزن ﴿ مُّذَبْذَبِينَ بَيْنَ ذَٰلِكَ لَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ وَلَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ ﴾ واتـە: دوودڵ‌و دڵەڕاوکێیانـە لـە نێـوان دەسـتەی بـڕواداران‌و دەسـتەی بێبـڕواکان، نـە لـە بڕوادارانن بـە ئاشـکراو نهێنی، وە نـە لـە بێبڕواکانـن بـە ئاشـکراو نهێنـی، نـاخ‌و نهێنەکانیـان داوەتـە بێبـڕواکان، وە دەرەوە ئاشـکراکانیان داوە بـە بـڕواداران، بەڕاسـتی ئەمـە بـە گەورەتریـن گومڕایـی دادەنرێـت، خـوای گـەورە دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلًا ﴾واتـە: هەرگیـز نـە ڕێگایـەک دەدۆزێتـەوە بـۆ ڕێنمایـی‌و نە ئامرازێـک بۆ واز هێنـان لە خراپـەکاری، چونکە بەڕاسـتی دەرگـای میهرەبانـی بەسـەردا داخـراوە، وە لـە بـری ئەمـەدا هەمـوو ڕق‌و کینـەو تۆڵەکرندنەوەیـەک جێگای گرتوەتەوە، ئەم وەسـفە سەرزەنشـکراوانە بەڵگەن لەسـەر ئەوەی کـە بڕواداران وەسـف کـراون بـە پێچەوانەی ئەوەوە لە ڕاسـتگۆیی‌و دڵسـۆزی بە ئاشـکراو بـە نهێنـی، وە ئـەوەی لایـان ڕوون‌و ئاشـکرایە بریتیە لـە نوێـژ‌و یادکردنی خـوای گەورە، وە ئـەوان بەڕاسـتی خـوای گەورە ڕێنمایـی کردن، وە سـەرکەوتووی کردن لەسـەر ڕێگای ڕاسـت، ئـەوەی عاقڵ‌و ژیـرە بـا لـەم دوو کارە ڕابمێنـێ باشـترینیان هەڵبژێرێت.

(١٤٤): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۚ أَتُرِيدُونَ أَن تَجْعَلُوا۟ لِلَّهِ عَلَيْكُمْ سُلْطَٰنًا مُّبِينًا ﴿١٤٤﴾ ﴾.

کاتێـک خـوای گـەورە باسـی سـیفەتی دووڕووەکانـی کـردوە کـە بێبـڕواکان دەکەنـە پشـتیوانی خۆیـان لە جێگای بـڕواداران، قەدەغـەی کردوە کە بـڕواداران خۆیـان بچوێنن بە دووڕووەکان، بـە ڕاسـتی ئەمە پێویسـت کراوە لەبەر ئـەوە ﴿ تَجْعَلُوا۟ لِلَّهِ عَلَيْكُمْ سُلْطَٰنًا مُّبِينًا ﴾ واتـە: بەڵگەیەکی ئاشـکرا لەسـەر سـزادانتان، بە ڕاسـتی ئێمە ئاگادارمـان کردنەوەو (إنـذار) وە هەواڵمانـدا کـە چەنـدە خراپـەکاری دەگرێتـە خـۆ، بـەڵام ئـەوان هەر شـوێنی کەوتن هەتا سـزا لەسـەریان پێویسـت بوو. وە ئەم دەقە بەڵگەیە لەسـەر تەواوی دادپەروەری

خـوا، وە بێگومـان خوای گەورە سـزای کەسێک نـادات پێش ئـەوەی بەڵگەکانـی بۆ ڕوون نەکاتـەوە، وە ئاگادارکردنـەوەی تێدایە لەسـەر سـەرپێچی کـردن، کە بە ڕاسـتی بکەرەکەی دەیەوێـت بەڵگەیەکـی ڕوونو ئاشـکرا لـە دژی خـۆی بدا بە خـوای گەورە.

(١٤٥-١٤٧): ﴿ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴿١٤٥﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ وَأَصْلَحُوا۟ وَٱعْتَصَمُوا۟ بِٱللَّهِ وَأَخْلَصُوا۟ دِينَهُمْ لِلَّهِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَعَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَسَوْفَ يُؤْتِ ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٤٦﴾ مَّا يَفْعَلُ ٱللَّهُ بِعَذَابِكُمْ إِن شَكَرْتُمْ وَءَامَنتُمْ وَكَانَ ٱللَّهُ شَاكِرًا عَلِيمًا ﴿١٤٧﴾ ﴾

خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات دەربـارەی سـەرەنجامو داهاتـووی دووڕووەکان کە بەڕاسـتی ئەوان لـە خانـەو چینی هـەرە ژێـرەوەی ئاگـردان، وە لە خراپتریـن حاڵدان لە سـزاداندا، ئـەوان لە خـوارەوەی بێبڕواکانن، چونکـە هاوکاریو کۆمەکـی بێبڕوایانیان کرد لـە بێبڕوایی بەرانبەر بـە خـواو پێغەمبەرەکـەی، وە فێـڵو تەڵەکەی زۆریـان بەرانبەریـان بەکارهێنـا وە بەجۆرەها شـێوەو ڕێکاریـان گرتەبـەر بـۆ دژایەتی کردنـی بـڕواداران بە شـێوەیەک کە هەسـتی پێ ناکرێـت، هەتـا وایـان لە خۆیـان کرد سـەرجەم بڕیارەکانی ئیسـلامیان بەسـەردا بچەسـپێ، وە بـە هـۆی ئـەوو هاوشـێوەیەوە شایسـتەی توندتریـن سـزابوون، وە هیـچ ڕزگارکەرێک نیـە ڕزگاریـان بـکات لە سـزای خواو سـزای خۆیان لەسـەر کـەم بکاتـەوە، بەڕاسـتی ئەمە گشـتگیرە بـۆ هەمـوو دووڕووێـک تەنهـا کەسـێک نەبـێ خـوای گـەورە منەتـی خـۆی کردبێـت بەسـەریاندا بـە داوای لێخۆشـبوون لـە تاوانـەکان ﴿ وَأَصْلَحُوا۟ ﴾ خۆیـان چاک دەکـەن لـە ئاشـکراو نهێنیـدا ﴿ وَٱعْتَصَمُوا۟ بِٱللَّهِ ﴾ دەسـت دەگرێـت بـە ئاینی خـواوەو پەنـای بـۆ دەبـات لـە قازانـجو لـە زەرەردا ﴿ وَأَخْلَصُوا۟ دِينَهُمْ ﴾ کـە بریتیـە لە ئیسـلامو بـڕواو چاکـە ﴿ لِلَّهِ ﴾ مەبەسـتیان تەنها خوای گـەورە بوو لە کـردارە ئاشـکراو نهێنیەکاندا وە دوور بـوون لـە رووپامایـیو دوو ڕوویـی هـەر کەسـێک ئـەم سـیفەتانەی تێـدا هەبێت ﴿ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَعَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ واتـە: لـە دنیاو ژیانـی بـەرزەخو ڕۆژی دوایی ﴿ وَسَوْفَ يُؤْتِ ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴾ واتـە: کـەس بـە نێوەڕۆکـی نازانـێ جگـە لە خـوا نەبێ لـەوەی چـاو نەیبینیـوە، گـوێ نەیبیسـتووەو بە خەتورەش بـە دڵی هیـچ کەسـێکدا نەهاتووە، ورد ببـەرەوەو سـەرنج بدە کە چۆن پشـت بەسـتنو دڵسـۆزی تایبـەت کردوە بە باسـکردن لەگەڵ ئەوەدا، وە خسـتویەتیە چوارچێوەی ﴿ وَأَصْلَحُوا۟ ﴾ چونکە پشـت بەسـتنو دڵسۆزی لـە چوارچێـوەی چاکسـازیدایە لەبـەر ئـەوەی کـە زۆر گرنگـن، بـە تایبـەت لـەم شـوێنە

نارەحەتـەدا کـە باس لـە دوو ڕوویی دەکات لـە نێو دڵەکانـدا، هیچ شـتێک لای نابات جگە لـە پشـت بەسـتن بە خـواو بـەردەوام بوونو خـۆ بەکەم زانیـن نەبێـت، وە هەروەهـا بوونی دڵسـۆزی ڕێـک پێچەوانـەی دوو ڕوویـیـە، بۆیە باسـی ئەم دوانەی کردوە (پشـت بەسـتنو دڵسـۆزی) لەبـەر ئەوە هەموو کـردەوە ئاشـکراو نهێنیەکان لەسـەر ئەو دووانە وەسـتاون. وە سـەرنج بـدە کاتێک کە باسـی کـردوە کە ئەوانـە لەگـەڵ بڕوادارانـن، نەیفەرموو: (وَسَوْفَ يُؤْتِيهِم أَجْراً عَظِيْمَاً) لە داهاتوودا پاداشـتیان دەدەینەوە، بەڵکـو فەرموویەتی: ﴿ وَسَوْفَ يُؤْتِ ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴾ چونکـە ئـەم یاسـا پیرۆزە بـەردەوام خوای گـەورە دەریدەخاتو دووبـارەی دەکاتـەوە ئەگـەر لـە میانـەی هەندێ لە بەشـەکاندا هاتبوو، وە ویسـتی پاداشـت یـان سـزای لەسـەر ڕێـک بخـات، وە ئەو شـتە بەشـدار بوو لـە نێوان ئـەوو ئـەو ڕەگەزەی کـە پاداشـت دەیگرێتـەوە لـە بەرانبەر فەرمانە گشـتیەکەدا کـە دەکەوێتە چـوار چێوەی ئەو باسـەوە، وە هاوشـێوەی ئەو باسـە، وە لەبەر ئەوە وا گومـان نەبا فەرمانەکە تایبەتـە بە بڕیاری بەشـێک، ئەمـە لـە نهێنیەکانـی قورئانـە، تۆبـەکار لـە دوو ڕووەکان لەگـەڵ بڕواداراندایەو هەمان پاداشـتی ئەوانـی هەیە.

پاشـان خوای گەورە هەواڵـی داوە لە تـەواوی دەوڵەمەندیو میهرەبانیو بەخشـندەییو چاکە خـوازی، دەفەرمـوێ: ﴿ مَّا يَفْعَلُ ٱللَّهُ بِعَذَابِكُمْ إِن شَكَرْتُمْ وَءَامَنتُمْ ﴾ لـە کاتێکدا کـە خوای گەورە هەمیشـە خوا سوپاسـگوزاری زانایە، پاداشـتی ماندوو بـووان دەداتەوە لەبەر ئـەوەی هەوڵیـان داوەو مانـدوو بـوون، کە کـرداری چاک پیشـەیان بـووە، بـە جوانترینو چاکتریـن پاداشـت، وە هـەر کەسـێک لـە پێنـاوی خـوادا شـتێ واز لـێ بهێنێ، خـوا لەوە باشـتری پـێ دەدات، وە لەگـەڵ ئەوەدا شـارەزاو زانایـە بە ئاشـکراو نهێنـیو کردارەکانتان، وە ئـەوەی لێـی دەردەچێـت لـە دڵسـۆزیو ڕاسـتگۆییو پێچەوانـەی ئـەوە. بێگومـان خـوا تەوبـەو پەشـێمانیو گەڕانـەوەی لێتـان دەوێ، ئەگـەر گەڕانـەوە بـۆ لای لەبەر چی سـزاتان دەدات؟ بەڕاسـتی ئەوە هیچ سـوودێک وەرناگرێت لە سـزادانتاندا، بەڵکو سـەرپێچیکار زیان ناگەیەنێـت تەنهـا بـە دەروونی خۆی نەبێـت، وەک چۆن کـردەوەی گوێڕایەڵ بـۆ خۆیەتی. سـوپاسو سـتایش بریتیـە لـە ملکەچبوونـی دڵ، وە دانپێدانـان بـە نـازو نیعمەتەکانی خوای گـەورەو وە سـوپاس کـردن بـە زمـان وە گوێڕایەڵیش بـە جەسـتە، وە بە هەمان شـێوە لەو نـازو نیعمەتانـەی کە خوا ڕشـتویەتی بەسـەریدا نەیکات بـە هۆکارێک بۆ سـەرپێچی کردن.


لَّا يُحِبُّ ٱللَّهُ ٱلْجَهْرَ بِٱلسُّوٓءِ مِنَ ٱلْقَوْلِ إِلَّا مَن ظُلِمَ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعًا عَلِيمًا ﴿١٤٨﴾ إِن تُبْدُوا۟ خَيْرًا أَوْ تُخْفُوهُ أَوْ تَعْفُوا۟ عَن سُوٓءٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا قَدِيرًا ﴿١٤٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُوا۟ بَيْنَ ٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيَقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُوا۟ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١٥٠﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ حَقًّا ۚ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿١٥١﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَلَمْ يُفَرِّقُوا۟ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ أُو۟لَٰٓئِكَ سَوْفَ يُؤْتِيهِمْ أُجُورَهُمْ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٥٢﴾ يَسْـَٔلُكَ أَهْلُ ٱلْكِتَٰبِ أَن تُنَزِّلَ عَلَيْهِمْ كِتَٰبًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ۚ فَقَدْ سَأَلُوا۟ مُوسَىٰٓ أَكْبَرَ مِن ذَٰلِكَ فَقَالُوٓا۟ أَرِنَا ٱللَّهَ جَهْرَةً فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ بِظُلْمِهِمْ ۚ ثُمَّ ٱتَّخَذُوا۟ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ فَعَفَوْنَا عَن ذَٰلِكَ ۚ وَءَاتَيْنَا مُوسَىٰ سُلْطَٰنًا مُّبِينًا ﴿١٥٣﴾ وَرَفَعْنَا فَوْقَهُمُ ٱلطُّورَ بِمِيثَٰقِهِمْ وَقُلْنَا لَهُمُ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْبَابَ سُجَّدًا وَقُلْنَا لَهُمْ لَا تَعْدُوا۟ فِى ٱلسَّبْتِ وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَٰقًا غَلِيظًا ﴿١٥٤﴾

(١٤٨-١٤٩): ﴿ لَّا يُحِبُّ ٱللَّهُ ٱلْجَهْرَ بِٱلسُّوٓءِ مِنَ ٱلْقَوْلِ إِلَّا مَن ظُلِمَ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعًا عَلِيمًا ﴿١٤٨﴾ إِن تُبْدُوا۟ خَيْرًا أَوْ تُخْفُوهُ أَوْ تَعْفُوا۟ عَن سُوٓءٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا قَدِيرًا ﴿١٤٩﴾ ﴾: خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات کە پێـی خۆش نیە ئاشـکرا کردنـی قسـەی خـراپو نابەجێ، واتـە: پێـی تـووڕە دەبـێو سـزای دەداو خەشـمو تۆڵـەی خـۆی بەسـەرا دەڕێـژێ، ئەمـە هەمـوو قسـە خراپـەکان دەگرێتـەوە کـە دەبێتە مایـەی لەکەدار کـردنو خەمبار کـردنو جنێـوو تانـەدانو هاوشـێوەی ئەمانـە، بێگومـان ئەمانـە هەمـووی قەدەغە کـراوەو خـوای گـەورە حـەزی پێـی نیە. وە تێگەیشـتن لـە ئایەتەکە بەڵگەیە لەسـەر ئـەوەی خـوای گـەورە حـەزی لە قسـەی ڕێـکو پێکـە، وەک یادکردنو قسـەی چاکو نـەرمو نیان.

وە کـە دەفەرمـوێ: ﴿ إِلَّا مَن ظُلِمَ ﴾ واتە: دروسـتە بۆی دوعا لەو کەسـە بکات کە سـتەمی لێـدەکاو سـکاڵای لەسـەر بـکات، وە بە هەمان شـێوە دروسـتە بە ئاشـکرا خراپـە بەرانبەر ئـەو کەسـە بـکات کە خراپەی بـە ئاشـکرا لەگەڵدا کـردوە، بەبێ ئـەوەی درۆ بداتـە پاڵی، وە زیاتـر نەبـێ لـەوەی کە سـتەمی لێکـراوە، وە نابـێ جگە لەو کەسـەی سـتەمی لێکردوە سەرزەنشـتی بکات، لەگەڵ ئەوەشـدا لێبوردنو ڕووبەڕونەبونەوەی باشـترو لە پێشـترە، وەک خـوا دەفەرموێ: ﴿ فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٠﴾ ﴾ الشـوری.

﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعًا عَلِيمًا ﴾ لـە کاتێکـدا کـە ئایەتەکـە بـاس لـە قسـەی بـاشو خـراپو ڕێگەپێـدراو دەکات، خـوای گـەورە هەواڵیـداوە کـە بیسـەرەو سـەرجەم گوفتارەکانیـان دەبیسـتێت، دەی کەواتـە خۆتـان بپارێـزن، قسـەیەک مەکـەن خـوای گـەورە لـە خۆتان تـووڕە بکـەنو سـزاتان بـدات لە سـەری، وە هەروەهـا بەڵگـەی تێدایـە بۆ هاندان لەسـەر قسـەی چـاک ﴿ عَلِيمًا ﴾ زانایـە بـە نیەتەکانتـانو بـە سـەرچاوەی کردارەکانتـان.

پاشـان خـوای گـەورە دەفەرمـوێ: ﴿ إِن تُبۡدُواْ خَيۡرًا أَوۡ تُخۡفُوهُ ﴾ ئەمـە هەمـوو خێـرو چاكەیـەک دەگرێتـەوە بـە زمـانو بـە كـردار، بـە ئاشـكراو بەنهێنـی، لـە پێویسـتو ڕێگەپێـدراو.

﴿ أَوۡ تَعۡفُواْ عَن سُوٓءٖ ﴾ واتـە: لـەو كەسـەی كـە خراپە لـە بەرانبەرتان دەكات لە جەسـتەو لـە ماڵو لـە ئاموسـتان، ئێوە لێـی دەبوورن بەڕاسـتی پاداشـت لـە چەشـنی كردەوەیە، هەر كەسـێک لەبـەر خـوا لە كەسـێكی تـر خۆش ببـێ بێگومـان خوا لەو كەسـە خـۆش دەبێ، وە هـەر كەسـێک چاكە بكات خـوای گەورە چاكـەی لەگەڵدا دەكات لەبـەر ئەمەیە خوای گـەورە دەفەرمـوێ: ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوّٗا قَدِيرًا ﴾ واتـە: خـۆش دەبـێ لـە هەڵەو خلیسـانی بەندەكانـیو لـە تاوانـە گەورەكانیـان، خـوا بـە گەورەیی خـۆی بۆیان دادەپۆشـێ، پاشـان مامەڵەیـان لەگەڵـدا دەكات بـە لێبوردنی تـەواو بە پێی دەسـەڵاتو قودرەتـی ڕەهای خۆی، وە لـەم ئایەتـەدا ڕێنمایـی تێدایـە بۆ تێگەیشـتن لـە ناوەكانی خـوای گەورە، وە بە ڕاسـتی دروسـتكردنو فەرمـان تەنها لەلایـەن خواوەیەو تایبەتە بـە ئەو، بۆیە هـۆكاری فەرمانەكان گـرێ دەدات بـە نـاوە پیرۆزەكانی خۆیـەوە، وەک چۆن لەم دەقـەدا ئامـاژەی پێكردوە. كاتێـک كـە باسـی كـردەوەی چاكـەو لێبـوردن لـە خراپـەی كـردوە ئـەو یاسـایەی ڕێكخسـتوە كـە وامان لێـدەكات فێری نـاوە جوانەكانی ببین، وە بەڕاسـتی ئەو نـاوە جوانانە دەوڵەمەندمـان دەكات لـە باسـكردنی پاداشـتی تایبـەت.

(١٥٠-١٥٢): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡفُرُونَ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُواْ بَيۡنَ ٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيَقُولُونَ نُؤۡمِنُ بِبَعۡضٖ وَنَكۡفُرُ بِبَعۡضٖ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُواْ بَيۡنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١٥٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ حَقّٗاۚ وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٗا مُّهِينٗا ﴿١٥١﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَلَمۡ يُفَرِّقُواْ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ أُوْلَٰٓئِكَ سَوۡفَ يُؤۡتِيهِمۡ أُجُورَهُمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿١٥٢﴾ ﴾

لێـرەدا دووبـەش هەیـە كـە ڕوون كراوەتـەوە بۆ هەمـوو كەسـێک: بڕوابوون بـە خواو بە پێغەمبەرەكانـی بە گشـتیو بـە كتێبە ئاسـمانیەكانی، وە بێبڕوابوون بە وانـە هەمووی. ئەوەی ماوەتـەوە دەسـتەی سـێیەمە: بریتیە لەوەی كەوا گومـان دەبا بڕوای بە هەندێ لـە پێغەمبەران هەیـەو جگـە لـە هەندێكی تـر، وە واگومـان دەبات ئەمـە ڕێگایەكـە ڕزگـاری دەكات لە سـزای خـوا، بەڕاسـتی ئەمە تەنهـا هیـواو ئاواتێكـە، بێگومان ئەمانـە دەیانەوێ جیـاوازی لە نێوانـی خـواو پێغەمبەرەكانیـدا بكـەن. بەڕاسـتی هـەر كەسـێک بە تـەواوی پشـت لە خوا

بـكات ئـەوە پشـتی لە هەمـوو پێغەمبـەران كـردوە، وە هـەر كەسـێک دژایەتـی یەکێک لـە پێغەمبـەران بـكات ئـەوە دژایەتی خـوای کـردوە، وە دژایەتی هەمـوو پێغەمبەرانیشـی کـردوە، وەک چـۆن خـوای گـەورە دەفەرمـوێ: ﴿ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّلَّهِ ﴿٩٨﴾ ﴾البقرة. وە بە هەمـان شـێوە هـەر كەسـێک بێبڕوایی بـكات بـە پێغەمبەرێک ئـەوە بێبڕوایی بە سـەرجەم پێغەمبـەران کـردوە، بەڵکـو ئـەو پێغەمبەرەشـی کـە وا گومان دەبـات بڕوای پێـی کردوە، لەبـەر ئەمـە دەفەرمـوێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ حَقًّا ﴾ لەبـەر ئـەوە وا گومـان نەبـەن کە پلـەی ناوەندیـان هەیـە لـە نێوان ئیمـانو کوفـردا، چونکـە بێبـڕوان ئەگەرچی پێیـان وابێ کـە ئیمانیـان پێی هەیە، بە ڕاسـتی هەمـوو بەڵگەکان پێیان پێشـان دەدات لەسـەر بڕواهێنان بـەوەی کـە ئیمانیان پێـی هێناوە، بوونی هەیە یان هاوشـێوەی یان لە سـەرووی ئـەوەوە، بۆ ئـەو پێغەمبـەرەی کـە ئـەوان بێبڕواییان بەرانبـەر کردوە، وە هەمـوو گومانێک کە نیشـانی دەدەن ئـەوان پێغەمبـەری خـوای پـێ لەکـەدار دەکەن کـە بێبڕواییـان کـردوە بەرانبەری، هـاو شـێوەی بوونـی هەیـە یان لـەوە گەورەتر کـە بڕوایـان پێی هەیـە. لە پاش ئـەوە هیچ شـتێک نەمـاوە جگـە لـە هـەواو ئـارەزوو نەبێـت، وە تەنهـا بانگەشـە نەبێـت کـە هەموو کەسـێک دەتوانێـت بیـكات، وە کاتێک باسـی ئەوەی کردوە کـە ئەوان بەڕاسـتی بێبڕوان، باسـی لە سـزایەکی گشـتگیر کـردوە بۆیان، وە بـۆ هەمـوو بێبڕوایـەک، وەک دەفەرموێ: ﴿ وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴾ وەک چـۆن لـووت بەرزیـان نواندا بەرانبـەر بە بڕوا هێنـان بە خـوا، سەرزەنشـتیانی کرد بە سـزایەکی بـە ئێشو ڕیسـواکەر.

﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ ﴾ ئەمـە هەمـوو ئەوانـە دەگرێتەوە کە خـوا هەواڵی دەربارەی داوە، وە بـە هەمـوو ئەوانـەی کـە پێغەمبـەران هێناویانـە لـە هـەواڵو بڕیارەکانـدا ﴿ وَلَمۡ يُفَرِّقُواْ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ ﴾ بەڵکـو بڕوایـان بـە هەمـوو پێغەمبـەران هێنـاوە، ئەمە بەڕاسـتی بڕوایەکـی ڕاسـتەقینەو دڵنیاییەکـە لەسـەر بەڵگەی ڕوونو ئاشـکرا بنیـات نراوە.

﴿ أُوْلَٰٓئِكَ سَوۡفَ يُؤۡتِيهِمۡ أُجُورَهُمۡ ﴾ واتـە: پاداشـتی ئیمانەکەیان، وە ئەوەیشـی لەسـەری دادەمەزرێـت لـە کـردەوەی چـاکو گوفتـاری بەجێو ڕەوشـتی جـوان، هەمووی بـە پێی بارودۆخـی خـۆی، وە ڕەنگە ئـەوە نهێنی دانەپاڵی (إضافة) پاداشـت بێـت بۆ لایان ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴾ واتـە: لـە هەموو تاوانـەکان خۆش دەبـێو چاکـەکان وەردەگرێت.

(١٥٣-١٦٣): ﴿ يَسۡـَٔلُكَ أَهۡلُ ٱلۡكِتَٰبِ أَن تُنَزِّلَ عَلَيۡهِمۡ كِتَٰبٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِۚ فَقَدۡ سَأَلُواْ مُوسَىٰٓ أَكۡبَرَ مِن ذَٰلِكَ فَقَالُوٓاْ أَرِنَا ٱللَّهَ جَهۡرَةٗ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ بِظُلۡمِهِمۡۚ ثُمَّ ٱتَّخَذُواْ ٱلۡعِجۡلَ مِنۢ

بَعۡدِ مَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُ فَعَفَوۡنَا عَن ذَٰلِكَۚ وَءَاتَيۡنَا مُوسَىٰ سُلۡطَٰنٗا مُّبِينٗا ﴿١٥٣﴾ وَرَفَعۡنَا فَوۡقَهُمُ
ٱلطُّورَ بِمِيثَٰقِهِمۡ وَقُلۡنَا لَهُمُ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡبَابَ سُجَّدٗا وَقُلۡنَا لَهُمۡ لَا تَعۡدُواْ فِي ٱلسَّبۡتِ وَأَخَذۡنَا مِنۡهُم مِّيثَٰقًا
غَلِيظٗا ﴿١٥٤﴾ فَبِمَا نَقۡضِهِم مِّيثَٰقَهُمۡ وَكُفۡرِهِم بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَقَتۡلِهِمُ ٱلۡأَنۢبِيَآءَ بِغَيۡرِ حَقّٖ وَقَوۡلِهِمۡ قُلُوبُنَا
غُلۡفُۢۚ بَلۡ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَيۡهَا بِكُفۡرِهِمۡ فَلَا يُؤۡمِنُونَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿١٥٥﴾ وَبِكُفۡرِهِمۡ وَقَوۡلِهِمۡ عَلَىٰ مَرۡيَمَ
بُهۡتَٰنًا عَظِيمٗا ﴿١٥٦﴾ وَقَوۡلِهِمۡ إِنَّا قَتَلۡنَا ٱلۡمَسِيحَ عِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ رَسُولَ ٱللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ
وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمۡۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِ لَفِي شَكّٖ مِّنۡهُۚ مَا لَهُم بِهِۦ مِنۡ عِلۡمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّۚ وَمَا قَتَلُوهُ
يَقِينَۢا ﴿١٥٧﴾ بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيۡهِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمٗا ﴿١٥٨﴾ وَإِن مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤۡمِنَنَّ بِهِۦ
قَبۡلَ مَوۡتِهِۦۖ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يَكُونُ عَلَيۡهِمۡ شَهِيدٗا ﴿١٥٩﴾ فَبِظُلۡمٖ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمۡنَا عَلَيۡهِمۡ طَيِّبَٰتٍ
أُحِلَّتۡ لَهُمۡ وَبِصَدِّهِمۡ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ كَثِيرٗا ﴿١٦٠﴾ وَأَخۡذِهِمُ ٱلرِّبَوٰاْ وَقَدۡ نُهُواْ عَنۡهُ وَأَكۡلِهِمۡ أَمۡوَٰلَ ٱلنَّاسِ
بِٱلۡبَٰطِلِۚ وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ مِنۡهُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا ﴿١٦١﴾ ﴾

ئــەم داوایــەی کــە خــاوەن کتێبــەکان کردوویانە لــە پێغەمبەر ﷺ لــە ڕووی سەرســەختیو بەرهەڵســتیو پێشــنیارەوە بــووە، وە ئەم پرســیارەیان لەبەر ئــەوە کرد، کە بە ڕاســت زانینو بــە درۆ زانینــی لەســەر ئــەوە بوەســتێنن، ئەویــش بریتــی بــوو داوایــان کــرد قورئانیــان بە یــەک جــار بــۆ دابەزێنێــت، وەک چۆن تــەوراتو ئینجیــل دابــەزی، ئەمە ئەوپەڕی ســتەمە بەرانبــەر بــە پێغەمبەر ﷺ دەیکــەن، پێغەمبــەر ﷺ بەندەیەکی جێبەجێ کارە، هیچ شــتێکی لە فەرمــان بەدەســت نیــە، بەڵکــو هەمــوو فەرمانــەکان لە لایــەن خواوەیــە، تەنها خــوا نێردراو ڕەوانــە دەکات بە ویســتی خــۆی بۆ ســەر بەندەکانی، وەک چــۆن خوای گــەورە دەربارەی پێغەمبەر ﷺ کاتێ باســی ئەو دەقانە دەکات کە پێشــنیاری بتپەرســتەکان دەگرێتەوە لەســەر پێغەمبــەر ﷺ دەفەرمــوێ: ﴿ قُلۡ سُبۡحَانَ رَبِّي هَلۡ كُنتُ إِلَّا بَشَرٗا رَّسُولٗا ﴿٩٣﴾ ﴾الإسراء.

بــە هەمــان شــێوە تەنها دابەزینە کە بە شــێوەی یەکجار، یــان جیا جیا بووەتە ســەنگی مەحەک بــۆ بــڕوا هێنانەکەیــان، بــەڵام ئــەوە تەنها بانگەشــەیە، نــە بەڵگەیەکی لەســەرە نە شــیاوە، نە گومانــە، لــە کوێــدا هاتــووە لــە پێغەمبەرایەتــی پێغەمبەرانــدا ﷺ کــە بڵێت ئــەو پێغەمبەرەی کــە دێــت بۆ لاتــان بــە کتێبێک کە بــە جیاجیــا دادەبەزێــت بڕوای پــێ مەکەنو بەڕاســتی مەزانــن؟ بەڵکــو دابەزینــی قورئان بە جیاجیا بــە پێی بارودۆخــەکان بوو، کە بەڵگەیە لەســەر گەورەیــیو گرنگــی خوا بــەوەی کە دابەزیــوە بە ســەریدا، وەک چۆن خــوا ﷻ دەفەرموێ:
﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡلَا نُزِّلَ عَلَيۡهِ ٱلۡقُرۡءَانُ جُمۡلَةٗ وَٰحِدَةٗۚ كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَۖ وَرَتَّلۡنَٰهُ
تَرۡتِيلٗا ﴿٣٢﴾ وَلَا يَأۡتُونَكَ بِمَثَلٍ إِلَّا جِئۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ وَأَحۡسَنَ تَفۡسِيرًا ﴿٣٣﴾ ﴾الفرقان.

کاتێـک بـاس لە بیانوو پاسـاوە بـێ بنەماکانیـان دەکات، هەواڵی داوە کە ئەو هەڵسـو کەوتە نامـۆ نیە لـە لای ئـەوان، بەڵکو پێشـینەیان هەیـە لـەو کارە قێزەونانەدا کە لـەوە گەورەترە لەگـەڵ پێغەمبـەردا ﷺ گرتوویانەتـە بـەر، کـە بانگەشـەی ئەوەیـان دەکرد ئـەوان بڕوایان پێهێنـاوە، لـەو داوایـەی کـە لێیـان کـرد لـە بینینـی خـوا، وە هەروەهـا گوێرەکـە کردن بـە پەرسـتراو پـاش ئـەوەی نیشـانەکانیان بە چـاوی خۆیـان بینی کـە پێش ئـەوان کەس نەیبینـی بـوو، وە لـە خۆگرتنەوەو بەر هەڵسـتیان ئەوە بوو کـە کتێبە پیرۆزەکـەی خۆیانیان پـێ قبـووڵ نەبـوو کە بریتی بـوو لە تـەورات، هەتا کێـوی (طـور)ی بەرز کردەوە بەسـەر سـەریاندا، وە هەرەشـەیان لێکرا ئەگـەر بڕوا نەهێنن دەیدات بەسـەریاندا ئەوەیـان پێ قبووڵ بـوو لـە ڕووی ناچـاریو چـاو لـێ نووقاندنـەوە، وە بڕوایـەک هاوشـێوەی بـڕوا هێنان بە ناچـاری. وە یەکێکـی تـر لـە لادانەکانیـان ئـەوە بـوو کـە فەرمانیـان پـێ کـرا بچنـە ناو شـارەکەوە سـوژدەو کڕنووش بۆ خـوا ببەن، بەڵام ئەوان بـە کردارو بەگوفتـار پێچەوانەیان کـرد، وە دەسـت درێـژی کردنیان لـە ڕۆژی شـەممەدا لە بەرانبـەردا خوای گەورە سـزای دان بە ناشـرینترین سـزا.

فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَٰقَهُمْ وَكُفْرِهِم بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَقَتْلِهِمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ
بِغَيْرِ حَقٍّ وَقَوْلِهِمْ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ ۚ بَلْ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَيْهَا بِكُفْرِهِمْ
فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٥٥﴾ وَبِكُفْرِهِمْ وَقَوْلِهِمْ عَلَىٰ مَرْيَمَ بُهْتَٰنًا
عَظِيمًا ﴿١٥٦﴾ وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا ٱلْمَسِيحَ عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ
ٱللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ ۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ
ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ ۚ مَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّ ۚ
وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًۢا ﴿١٥٧﴾ بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيْهِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا
﴿١٥٨﴾ وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ۖ وَيَوْمَ
ٱلْقِيَٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا ﴿١٥٩﴾ فَبِظُلْمٍ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟
حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَٰتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ وَبِصَدِّهِمْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ
كَثِيرًا ﴿١٦٠﴾ وَأَخْذِهِمُ ٱلرِّبَوٰا۟ وَقَدْ نُهُوا۟ عَنْهُ وَأَكْلِهِمْ أَمْوَٰلَ
ٱلنَّاسِ بِٱلْبَٰطِلِ ۚ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٦١﴾ لَّٰكِنِ
ٱلرَّٰسِخُونَ فِى ٱلْعِلْمِ مِنْهُمْ وَٱلْمُؤْمِنُونَ يُؤْمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ
وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ ۚ وَٱلْمُقِيمِينَ ٱلصَّلَوٰةَ ۚ وَٱلْمُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ
وَٱلْمُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ أُو۟لَٰٓئِكَ سَنُؤْتِيهِمْ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٦٢﴾

وە هەروەها بەو پەیمانەی کە لێی وەرگرتن، بەڵام ئەوان ئەو پەیمانەیان فڕێدایە پشتی خۆیانەوەو بێ بڕواییان کرد بە نیشانەکانی خواو پێغەمبەرانیان کوشت بە ناهەق، وە لە وتە نابەجێیەکانیان کە دەیانوت: پێغەمبەر عیسا ﷺ یان کوشتووە هەڵواسیوە، بەڵام لە ڕاستیدا نە کوشتبوویان، نە هەڵیانواسی بوو، بەڵکو لێیان گۆڕاو کەسێکی تریان کوشت‌و هەڵیانواسی. وە بانگەشە کردنیان بەوەی کە دڵیان داپۆشراوە تێناگەن لەوەی کە پێیان دەڵێ، وە بە هۆی دژایەتی بەرهەڵستی کردنیان لە ڕاستی‌و بانگەواز کردنیان بۆ لای ئەوەی کە خۆیان لەسەری دەڕۆشتن لە گومرایی‌و سەرلێشێواوی، وە بە وەرگرتنی بەرتیل‌و ڕیباو سوود خواردنیان لەگەڵ ئەوەدا کە خوا لێی قەدەغە کردبوون‌و جەختی لەسەر کردبوویەوە.

ئەوانەی کە ئەو کارانەیان کرد نکوڵی ناکرێت کە پرسیار لە پێغەمبەر موحەممەد ﷺ بکەن کە لە ئاسمانەوە کتێبێکیان بۆ دابەزێنێ، بەڕاستی ئەم ڕێگایە باشترین ڕێگایە بۆ وەڵامدانەوەی نەیارە پووچەکان، ئەگەر جۆرێ لە بەهانەی پووچیان هێنایەوە هەتا بیکەن بە گومانێک بۆ ئەوو بۆ کەسانی تر لە وەڵامدانەوەی ڕاستیدا، ئەوە بۆی ڕوون دەکەیتەوە ئەو بارودۆخە خراپەو کردارە ناشرینانەی کە لەوە ناشرینترە لە لایەن ئەوەوە دەربچێت، لەبەر ئەوە هەموو بزانن کە ئەم ڕەخنە گرتنە لە دۆڵ‌و شێوێکی بێ نرخە، بە ڕاستی ئەوە پێشینەیەکی هەیە کە ئەمەشی خستوەتە پاڵ ئەوان.

وە بە هەمان شێوە ئەو ڕەخنە گرتنانەی لە سەر پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺ هەیانبوو، دەکرێت ڕووبە ڕووی هاوشێوە بکرێتەوە، یان لەوانەش بەهێزتر بێت کە بڕوایان بە پێغەمبەرایەتیان هێنابوو، ئەوەندە بەسە بۆ خراپەکاری ئەوان‌و لەناو بردنی بیرۆکە پووچەکانیان. وە هەموو ئەو ڕێکارو بیانووانەی کە گرتویانەتە بەر دانپێدانانی هەر

پێغەمبەرێــک کــە بڕوایــان پێ هێنــا بێت، بەڕاســتی ئەو بیانووانــەو هاوشــێوەکانیان بەڵگەن لەســەر پێغەمبەرایەتــی موحەممــەد ﷺ. وە کاتێک کە مەبەســت لــە هێنانی ئــەوەی کە خوا ژماردوونــی لــە ناشــرینی ئەم بــەراورد کردنــەدا، لەم شــوێنەدا بە درێــژی نەیهێنــاوە، بەڵکو ئامــاژەی پــێ کــردوە، وە گوێزایەتیــەوە لــە چەند شــوێنێکی تری شایســتەدا باســی کردوە جگــە لەم شــوێنە.
کــە دەفەرمــوێ: ﴿ وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ﴾ ڕەنگــە ئــەم ڕانــاوە لە ڕســتەی ﴿ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ﴾ بگەڕێتــەوە بۆ خاوەن کتێبــەکان. ئەوکات ماناکەی بەم شــێوەیەی لــێ دێــت: هەمــوو خــاوەن کتێبێــک، بــڕوا بهێنێت بــە عیســا ، بــەڵام بڕوایە کە هیچ ســوودی نیــە، چونکــە بــە ناچــاری بــڕوای پێــی هێنــاوە. هــاوکات ناوەڕۆکــی ئــەم دەقە، هەڕەشــە کــردنو ترســاندنیانە، بــۆ ئــەوەی بــەردەوام نەبن لەســەر ئــەم حاڵە، چونکــە پێش مردنیــان پەشــیمان دەبنــەوە، ئایــا دەبــێ حاڵیــان چۆن بێــت لــە ڕۆژی دواییــدا؟! وە ڕەنگە ڕاناوەکــە لــە ڕســتەی ﴿ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ﴾ بگەڕێتــەوە بــۆ عیســا ، ئــەو کات ماناکــە بــەو شــێوەی لــێ دێــت: هیچ کەس نیــە لە خاوەن کتێبــەکان ئیللا بڕوا دێنێ بە عیســای مەســیح، کاتــێ کــە قیامەت نزیــک دەبێتەوەو نیشــانە گەورەکانــی دەردەکەون، بەڕاســتی فەرموودە ڕاســتەکان زۆرن کــە دەربــارەی دابەزینــی عیســی هاتــوون، لــە کۆتایــی ئــەم ئوممەتــەدا. دەجــال دەکوژێــتو ســەرانەش دادەنێت، وە خاوەن کتێبــەکان لەگــەڵ بڕوادارەکاندا بڕوای پێدەهێنــن، وە لــە ڕۆژی دواییــدا عیســی دەبێتــە شــایەت بەســەر کردەوەکانیانــدا، ئایە ئەمە لەگــەڵ شــەرعی خــوادا دەگونجێــت یان ناگونجێــت؟!! وە لەو کاتەدا شــایەتی نــادات جگە لــە پووچــی هەموو ئەوانەی کە ئەوان لەســەری دەڕۆشــتن، ئــەوەی کە پێچەوانــەی قورئانە، وە کاتێــک پێغەمبــەر ﷺ بانگــی کــردن بــۆ لای قورئــان، بەوەمــان زانــی، لەبــەر ئــەوە بە تــەواوی دادپەروەری ڕاســتگۆی مەســیح مان دەزانی، کە بەڕاســتی ئەو شــایەتی نادات تەنهــا بــە ڕاســتی نەبێت، بــەڵام ئــەوەی کــە موحەممــەد ﷺ هێناویەتی ئــەوە ڕاســترە، وە جگــە لــەوە هەمــووی گومڕایی پــووچو خراپە.
پاشــان خــوای گــەورە هەواڵی داوە کە حەرامی کردوە لەســەر خاوەن کتێبــەکان زۆرێک لە پــاکو خاوێنــەکان کــە بۆیان حــەڵاڵ کرابوو، ئەمــە قەدغەکردنێکــە بۆ ســزادان، بە هۆی ســتەمو دەســت درێــژی کردنیانو دەژایەتــی کردنی خەڵکیان لــە ڕێبازی خــوا، وە ڕێگری لــێ کردنیــان لــە وەرگرتنــی هیدایــەتو ڕێنمایــی خــوای پەروەردگــار، وە لــە وەرگرتنی

ڕیبـادا کـە لێیـان قەدەغە کرابـوو، ڕێگایـان لە دەسـەڵاتداران دەگـرت لـە دادپەروەریدا، خـوای گـەورەش بـە پێـی کردەوەکانیـان سـزای دان، زۆرێـک لـە پـاکو خاوێنەکانـی لەسـەر قەدەغـە کـردن، کە ئەوانـە لە باری حـەڵاڵ بوونـدا بوون، لەبـەر ئەوەی کـە پاکە. بـەڵام قەدەغەکـراو لەسـەر ئـەم ئوممەتە، بەڕاسـتی دورخسـتنەوەیانە لە شـتە پیسـەکان کە زیانـی هەیە بـۆ ئایـنو دنیایان.

(١٦٢): ﴿ لَّٰكِنِ ٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ مِنۡهُمۡ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ يُؤۡمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَۚ وَٱلۡمُقِيمِينَ ٱلصَّلَوٰةَۚ وَٱلۡمُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ أُوْلَٰٓئِكَ سَنُؤۡتِيهِمۡ أَجۡرًا عَظِيمًا ﴿١٦٢﴾ ﴾:

کاتـێ کە باسـی ناتـەواویو کـەمو کوڕیی خـاوەن کتێبەکانی کـرد، لەگەڵ ئەوەدا باسـی وەسـف کراوانـی کـرد، دەفەرمـوێ: ﴿ لَّٰكِنِ ٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ ﴾واتـە: ئەوانـەی کـە زانسـت لـە دڵەکانیانـدا جێگیـر بـووە، وە دڵنیایـی دامـەزراوەو ڕۆ چـووە لە سـینەکانیاندا، هەتـا بڕوایەکی تەواوو گشـتگیری بۆ بەرهـەم هێنـاون ﴿ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ ﴾ وە کـردەوەی چاکـی بـۆ بە بەرهـەم هێناون لە بـە ئەنجامدانـی نوێژەکانو پێدانـی زەکات، ئـەو دووانە لە باشـترینی کردەوەکانو دڵسـۆزی بەندە بـۆ پەروەردگاریان دەسـەلمێنن، وە بـە هەمان شـێوە چاکە لەگـەڵ بەندەکانـی خـوادا، وە بڕوایان هێنـاوە بـە ڕۆژی دوایی، وە لـە هەرەشـەکان دەترسـانو هیـوا و ئومێدیان بە پاداشـتی نەبـڕاوەی خوای گـەورە هەبوو. ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ سَنُؤۡتِيهِمۡ أَجۡرًا عَظِيمًا ﴾ چونکـە کۆیـان کردەوە لە نێوان زانسـتو بـڕواو کردەوەی چـاکو بڕوابـوون بـە کتێبە ئاسـمانیەکانو پێغەمبەرانی پێشـوو وە ئەوانەشـی کـە لە پاش ئەوانـەوە هاتن.

إِنَّآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ كَمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ نُوحٍ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعْدِهِۦۚ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَٰرُونَ وَسُلَيْمَٰنَۚ وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا ﴿١٦٣﴾ وَرُسُلًا قَدْ قَصَصْنَٰهُمْ عَلَيْكَ مِن قَبْلُ وَرُسُلًا لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَۚ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا ﴿١٦٤﴾ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٦٥﴾ لَّٰكِنِ ٱللَّهُ يَشْهَدُ بِمَآ أَنزَلَ إِلَيْكَۖ أَنزَلَهُۥ بِعِلْمِهِۦۖ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَشْهَدُونَۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿١٦٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ قَدْ ضَلُّوا۟ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴿١٦٧﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَظَلَمُوا۟ لَمْ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغْفِرَ لَهُمْ وَلَا لِيَهْدِيَهُمْ طَرِيقًا ﴿١٦٨﴾ إِلَّا طَرِيقَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًاۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴿١٦٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُمُ ٱلرَّسُولُ بِٱلْحَقِّ مِن رَّبِّكُمْ فَـَٔامِنُوا۟ خَيْرًا لَّكُمْۚ وَإِن تَكْفُرُوا۟ فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١٧٠﴾

**(١٦٣-١٦٥):** ﴿ إِنَّآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ كَمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ نُوحٍ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعْدِهِۦۚ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَٰرُونَ وَسُلَيْمَٰنَۚ وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا ﴿١٦٣﴾ وَرُسُلًا قَدْ قَصَصْنَٰهُمْ عَلَيْكَ مِن قَبْلُ وَرُسُلًا لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَۚ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا ﴿١٦٤﴾ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٦٥﴾ ﴾

خوای گەورە هەواڵ دەدات کە ئەو نیگای بۆ بەندەی خۆیو پێغەمبەرەکەی ناردووە لە ئاینێکی گەورەوە بە هەواڵی ڕاستو دروست، وەک چۆن نیگای کردوە بۆ پێغەمبەران (علیهم السلام)، لەم دەقەدا چەند سوودو بەرهەمێک هەیە: لەوانە: بەڕاستی موحەممەد ﷺ یەکەم پێغەمبەر نیە کە نێردرابێ، بەڵکو خوای گەورە لەپێش ئەوەوە چەندین پێغەمبەری ناردوە، زۆرو فرە، بە خۆ گێل کردن لە پەیامەکەی هیچ مانایەک نادات بیجگە لە نەفامیو سەرسەختیو یاخی بوونی خاوەنەکەی نەبێت. وە لەوانە: بەڕاستی موحەممەد ﷺ نیگای بۆ هاتووە وەک چۆن نیگا بۆ ئەوانی تر هاتووە لە بنەماو دادپەروەری کە هەموویان لەسەری یەکدەنگن، وە بەڕاستی هەندێکیان بەڕاست دانەری هەندێکی تریانن، وە هەندێکیان لەگەڵ هەندێکی تردا دەگونجێن.

وە لەوانە: بەڕاستی موحەممەد ﷺ لە ڕەگەزو ڕەچەڵەکی پێغەمبەرانە، دەی با بڕوادار بڕوا بکات کە یەکێکە لە بڕا پێغەمبەرەکانی، بانگەوازی هەمان بانگەوازی ئەوانە، وە ڕەوشتیان وەک یەک وایە، یەک سەرچاوەو یەک ئامانجو یەک مەبەستیشیان هەیە. هەرگیزانە ئەوانە هاوتا ناکرێن بە نەفامانو درۆزنانو دەسەڵاتدارە ستەمکارەکان.

وە لەوانە: بەڕاستی لە باسکردنی ئەو پێغەمبەرانەو ژماردنیان، وە لە ناو هێنانو ستایش

کردنیـان، وە پیاهەڵدانـی ڕاسـتەقینە لـە ئـاکارە جوانەکانیانو شـیکردنەوەی بـارو دۆخیان، کـە بـڕوادار بـڕواری پێی زیـاد دەکات، وە خۆشەویسـتی بۆیـان زیاتر دەبێت، وە شـوێنی ڕێنماییەکانیـان دەکەوێـت، وە ئـەوەش دەبێتـە مایـەی بـە ڕاسـتدانانی ئـەو ئایەتانـەی کە خـوا لە سـوورەتی (الصافات)دا دەفەرموێ: ﴿ سَلَٰمٌ عَلَىٰ نُوحٍ فِي ٱلۡعَٰلَمِينَ ٧٩ ﴾ (واتە: سـەلام لەسـەر نووح لە نێو جیهانییان)، ﴿ سَلَٰمٌ عَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ ١٠٩ ﴾ (واتە: سـەلام لەسـەر ئیبراهیم)، ﴿ سَلَٰمٌ عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ١٢٠ ﴾ (واتە: سـەلام لەسـەر مووسـاو هـاڕوون)، ﴿ سَلَٰمٌ عَلَىٰٓ إِلۡ يَاسِينَ ١٣٠ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٣١ ﴾ (واتـە: سـەلام لەسـەر ئال یاسـین، ئا بەو شـێوە ئێمە پاداشـتی چاکـەکاران دەدەینەوە).

هەمـوو چاکـە خـوازێ بـە پێـی چاکەی خـۆی وەسـف دەکرێـت لەنـاو خەڵکیـدا، وە بە تایبـەت پێغەمبـەران، وە لەناویانـدا بەتایبـەت ئەوانـەی کـە ناویـان هاتووە، لە پلـەی هەرە بـەرزدان لـە چاکەخوازیـدا. کاتـێ باسـی بەشـداربوونیان دەکات بـەو نیگـای کـە بـۆی نـاردوون، بـاس لـە تایبەتمەندی هەندێکیـان دەکات، باس دەکات کـە داوود ﷺ زەبوری بـۆ دابەزیـوە، ئەویـش کتێبێکی ناسـراوە، وە زەبور کە خـوا تایبەتی کـردوە بە داوود ﷺ لەبـەر ڕێـزو شـەرەفێتی، وە خـوای گەورە قسـەی لەگـەڵ مووسـا دا کردوە بە قسـەکردن، واتـە: بـە دەربڕین لـە خواوە بۆ مووسـا ﷺ، نەک بـە هۆ یـان ناوبژیکارێـک، هەتا بەوە ناوبانگـی دەرکـردوە لـە لای هەموو جیهـان، پێی دەوتـرێ: (مـوسی كليـم الرحمن).

خـوای گـەورە باسـی لەوە کـردوە کە بەسـەر هاتـی هەنـدێ لـە پێغەمبەرانـی گێڕاوەتەوە بـۆ پێغەمبەرەکـەی، وە بەسـەرهاتی هەندێکیانـی نەگێڕاوەتـەوە، ئەمـەش بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی کـە پێغەمبـەران زۆرن، وە بێگومـان خـوای گـەورە دایبەزانـدن مـژدە دەربـن بۆ ئـەو کەسـانەی گوێڕایەڵـی خوا دەکـەنو شـوێنی پێغەمبەران دەکـەون، بە خۆشـبەختی لە دنیـاو دوارۆژدا، وە ترسـێنەرن بـۆ ئەو کەسـانەی کە سـەرپێچی خوا دەکـەنو پێچەوانەیان دەجوڵێنـەوە بـە بەدبەختـیو گومرایـی، تاکـو پـاش هاتنـی پێغەمبـەران خەڵـک بەڵگـەی لەسـەر خوا نەبێ، دەڵێـن: ﴿ مَا جَآءَنَا مِنۢ بَشِيرٖ وَلَا نَذِيرٖۖ فَقَدۡ جَآءَكُم بَشِيرٞ وَنَذِيرٞۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ١٩ ﴾المائـدة.

بـە ڕاسـتی خەڵکی هیـچ بیانوویەکیـان نەما بەسـەر خـوای گـەورەوە کـە پێغەمبەرانیان بە دوای یەکتـردا بـۆ بنێرێـت، ڕوونـی دەکەنـەوە ئـەو بابەتانـەی پەیوەندی بە ئایـنو ڕۆژی دواییانـەوە هەیـە، وە ڕێگاکانـی بەهەشـتو دۆزەخیـان پێنیشـان دەدەن، هەرکەسـێک لـە

پاش ئەمە بێ بڕوا بێت ئەوە با تەنها لۆمەو سەزەنشتی خۆی بکات. ئەمەش لە تەواوی عیزەتو دانایی خوایە، کە پێغەمبەرانی بۆ ناردوونو کتێبە پیرۆزەکانیشی بۆ دابەزاندوون، ئەویش بە هەمان شێوە لە فەزڵو چاکەی خوایە کە خەڵکی ناچار بوون پێویستیان بە پێغەمبەران هەبێت، ئەویش بە گەورە ترین پێویستی هەژمار دەکرێت، سوپاسو ستایش بۆ ئەو خوایە. وە داوای لێ دەکەین وەک چۆن دەست پێشخەری کرد بە نیعمەتی ناردنی پێغەمبەران بۆمان، بەهەمان شێوە تەواوی بکات بە سەرکەوتنو شوێنکەوتنیان، بەڕاستی خوا بەرێزو شکۆمەندە.

(١٦٦): ﴿ لَّٰكِنِ ٱللَّهُ يَشْهَدُ بِمَآ أَنزَلَ إِلَيْكَ ۖ أَنزَلَهُۥ بِعِلْمِهِۦ ۖ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَشْهَدُونَ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿١٦٦﴾ ﴾:

کاتێ کە باسی کرد، خوای گەورە نیگای بۆ پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ دابەزاندوە، وەک چۆن نیگای بۆ براکانی لە پێغەمبەران دابەزاندوە، لێرەدا خوای گەورە هەواڵ دەدات بە شایەتی بۆ پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرەکەی ﷺو ڕاستی ئەوەی کە لە ئاسمانەوە بۆی دابەزیوە، وە بەڕاستی خوا﴿ أَنزَلَهُۥ بِعِلْمِهِۦ ﴾دەگونجێ مەبەستی پێی زانستی خوای گەورە بێت، واتە: لە زانستەکانی خوای گەورە کە دایبەزاندووە: زانستی یەکتاپەرستیو بڕیارە شەرعیەکانو هەواڵە نادیارەکانە، کە فێری بەندەکانی کردوە. وە دەشێ مەبەست پێی ئەوە بێت کە بە زانینی خۆی دایبەزاندوە، وە ئەوە دەبێتە ئاماژەو ئاگادارکردنەوەیەک لەسەر شێوەی شایەتیدانی. وە واتاکەی بەم شێوە دەبێ: ئەگەر خوای گەورە ئەم قورئانەی دابەزاندوە کە فەرمانو قەدەغەکراوەکان لە خۆ دەگرێت، وە خوای گەورە بەوە دەزانێ، وە بەو بارودۆخەش دەزانێت کە تیایدا ناردوویەتی خوارەوە، وە بێگومان بانگی خەڵکی کردوە بۆ بەدەمەوە هاتنی، هەر کەسێک وەڵامی بداتەوەو بەڕاستی بزانێت ئەوە دۆستی خوایە، وە هەرکەسێک بە درۆی بخاتەوەو دژایەتی بکات ئەوە دوژمنیەتی، وە ماڵو سامانو خوێنی حەڵاڵ دەبێ، وە بەڕاستی خوای گەورە دینی خۆی پەرە پێدەداتو پشتیوانی لەو کەسەش دەکات کە سەری دەخاتو نزاکانی گیرا دەکات، وە دوژمنی بۆ زەلیلو ڕیسوا دەکات، وە دۆستانی خۆی بەدەستەجەمی سەردەخات. ئایا شایەتیەک هەیە لەم شایەتیدانە گەورەتر بێت؟!! وە ناگونجێت تانە لەم شایەتی دانە بدرێت، مەگەر لە پاش تانەدان لە زانستو قودرەتو دانایی خوا.

وە هەواڵی خوای گەورە دەربارەی شایەتی دانی فریشتەکان لەسەر ئەوەی کە دابەزیوە

بـۆ سـەر پێغەمبەرەکانی، بەهـۆی تـەواوی بڕوایانەوەیە، وە لەبـەر گەورەیی ئەم شـایەتی بۆ دراوەیـە. چونکە بەڕاسـتی کارە گەورەکان شـایەتیان لەسـەر نادرێت ئیلـلا تایبەتمەندەکان نەبێت، وەک چۆن خوای گەورە شـایەتی لەسـەر یەکتا پەرسـتی دەدات: ﴿ شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَأُو۟لُوا۟ ٱلْعِلْمِ قَآئِمًۢا بِٱلْقِسْطِ ۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١٨﴾ ﴾آل عمـران. وە تەنها خوا بەسـە بۆ شـایەتیدان.

(١٦٧-١٦٩): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ قَدْ ضَلُّوا۟ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴿١٦٧﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَظَلَمُوا۟ لَمْ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغْفِرَ لَهُمْ وَلَا لِيَهْدِيَهُمْ طَرِيقًا ﴿١٦٨﴾ إِلَّا طَرِيقَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴿١٦٩﴾ ﴾:

خـوای گـەورە هـەواڵ دەدات دەربارەی پەیامی پێغەمبـەران ﷺ وە هـەواڵ دەدات دەربارەی کۆتـا پێغەمبـەر موحەممـەد ﷺ، وە شـایەتی بۆ دەدات، فریشـتەکانیش شـایەتی بـۆ دەدەن، لەبەرئـەوە ئـەو فەرمانـە بڕیار لەسـەر دراوە جێگیر دەبێت، بۆیە پێویسـتە لەسـەر مرۆڤەکان بەڕاسـتی بزانن و شـوێنی بکـەونو بڕوای پـێ بهێنن.

پاشـان هەڕەشـەی کـردوە لەوانـەی کە بـێ بڕوایـی بەرانبەر دەکـەن، دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾ واتـە: دوو شـتیان پێکەوە کۆکـردەوە بێ بڕوابونی خـودی خۆیـان وە ڕێگـری کـردن لە خەڵـک بۆ ڕێگـای خوا.

بە ڕاسـتی ئەوانە گـەورەو پێشـەوای بێبڕواکانـن، وە بانگخوازانی ڕێگـای گومڕایین ﴿ قَدْ ضَلُّوا۟ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴾ چ گومڕاییـەک گەورەتـرە لـەوەی کـە مـرۆڤ خـۆی گومـڕا بـکاتو خەڵکیـش لـە ڕێگا لابـدات، بێگومان ئـەوە دوو تاوانی کەوتۆتە ئەسـتۆ، وە بە دوو زەرەرمەندیـەوە گەڕاوەتـەوەو دوو ڕێنمایـی لەدەسـت داوە، لەبـەر ئەمـە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَظَلَمُوا۟ ﴾ وە ئـەم سـتەمە زیادەیـە لەسـەر بێبڕواییـان، ئەگەرنـا بێبڕوایـی بە گشـتی مانای سـتەمیش دەگرێتەوە. مەبەسـت لە سـتەم لێـرەدا بریتیە لە کـرداری بێبڕوایو ڕۆچـوون تیایدا.

بـە ڕاسـتی ئەوانـە دوورن لـە لێخۆشـبون، وە دوورن کـە ڕێنمایـی وەربگـرن بـۆ ڕێگـای ڕاسـت، بۆیـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَظَلَمُوا۟ لَمْ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغْفِرَ لَهُمْ وَلَا لِيَهْدِيَهُمْ طَرِيقًا ﴿١٦٨﴾ إِلَّا طَرِيقَ جَهَنَّمَ ﴾لەبـەر ئـەوە لێخۆشـبونو ڕێنمایـی نایانگرێتـەوە، چونکـە بـەردەوام بوون لەسـەر گومڕایـیو بـێ بڕواییـان، هەتـا خـوای گەورە مـۆری لەسـەر دڵیانـداو دەرگاکانی ڕێنمایـی لێداخسـتن بـە هـۆی ئەو کـردارە قێزەونانـەی کـە ئەنجامیان دابـوو ﴿ وَمَا رَبُّكَ

بِظَلَّٰمٖ لِّلۡعَبِيدِ ﴿٤٦﴾ فصلت. ﴿ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٗا ﴿١٦٩﴾ ﴾ واتـە: خـوای گـەورە باکـی نیـە و بـێ نیـازە لێـان لەبەر ئەوەی چـاک نابن بـۆ خێرو چاکـە، وە هیچ شـایەنیان نیـە جگە لـەو بارودۆخـە نەبێ کـە خۆیـان هەڵیان بـژاردوە.

(١٧٠): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَكُمُ ٱلرَّسُولُ بِٱلۡحَقِّ مِن رَّبِّكُمۡ فَـَٔامِنُواْ خَيۡرٗا لَّكُمۡۚ وَإِن تَكۡفُرُواْ فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴿١٧٠﴾ ﴾:

خـوای گـەورە فەرمـان بـە هەمـوو خەڵکـی دەکات کـە بـڕوا بەبەنـدەو پێغەمبەرەکـەی موحەممـەد ﷺ بهێنـن. وە باسـی هـۆکاری پێویسـت بوونی بـڕوای کردوە پێی، وە سـودو قازانـج لـە بڕواپێهێنانیـداو، وە زەرەرو زیـان لـە بـڕوا پـێ نەبوونیـدا. ئـەو هـۆکارەی کە پێویسـتە بـۆ بڕواهێنـان بریتیـە لـە هەواڵـی خوای گـەورە کـە ئـەو پێغەمبەرە بەڕاسـتو هـەق ڕەوانـە کـراوە بـە شـەریعەتێکی ئاسـمانیەوە. بەڕاسـتی مرۆڤـی ژیرو عاقڵ هەسـت بـەوە دەکات کـە مانـەوەی خەڵک لەسـەر نەفامـیو بـێ بڕوایـی سـەرگەردانیان دەکات، وە بەتایبـەت ئەگەر پەیامیشـیان بـۆ دانەبەزیـێ، ئەمە ناگونجـێ لەگەڵ دانایـیو میهرەبانی خوادا.

لـە دانایـیو میهرەبانـی خوا ئەوەیـە کـە پێغەمبەرانیان بـۆ بنێـرێ وە فێـری جیاکردنەوەی ڕێنمویـی لـە گومڕاییان بـکات. بە تەنها تەماشـاکردنی پەیامەکـەی بەڵگەیەکـی تەواوە لە سـەر ڕاسـتی پێغەمبەرایەتیەکەی.

وە بـە هەمـان شـێوە تەماشـا کردنـی ئـەو شـەریعەتە گەورەیەو ئـەو ڕێگا ڕاسـتە، پـڕە لە هەواڵـی نادیـاری کۆنو داهاتـوو، وە هەواڵـی داوە دەربارەی خوای گـەورەو ڕۆژی دوایی، کـە نازانرێـت ئیلـلا لـە ڕێگـای نیگـاو پەیامـی پێغەمبـەران نەبێـت. وە ئـەوەی تێیدایە لە فەرمـان کـردن لەهەموو خێرو چاکەو دادپەروەریو خووڕەوشـتی جـوان. وە قەدەغەکردنی هەمـوو شـەڕو خراپەو گومڕایـیو سـتەمێک، وە هەموو خووڕەوشـتێکی ناشـرین لە درۆو سـەرپێچیکردن یـەکلای دەکاتـەوە ئەمـە لـەلای خـواوە هاتـووە، وە مـرۆڤ هەتـا تیایدا وردبێتـەوە بـڕواو دڵنیایی زیـاد دەکات، ئەمە هۆکارێکی ڕاسـتەقینەیە بـۆ بڕواهێنان، بەڵام بـڕوا هێنانـی سـوودو کەڵکـی بـۆ خاوەنەکـەی هەبێت، خـوای گـەورە هەواڵـی داوە کە قورئـان سـەرچاوەی خێرو چاکیـە، وە خێرو چاکەیـش پێچەوانەی شـەڕو خراپەیە. کەواتە بڕواهێنـان خێـرو چاکـەی تێدایـە بـۆ بـڕواداران لـە جەسـتەو دڵو دروونیاندا، وە لـە دنیاو دواڕۆژیانـدا. وە لەبـەر ئـەوە چەندیـن بەرژەوەندیو سـودو قازانجـی لەسـەر دادەمەزرێت،

وە هەمــوو پاداشــتێک لــە ئێســتاو داهاتــودا لــە بەرهەمەکانــی بڕواهێنانــە، لە ســەرکەوتن‌و ڕێنموویــی‌و زانســت‌و کرداری چاک‌و دڵ خۆشــی‌و بەهەشــت‌و ئــەو نــازو نیعمەتانەی کە لــە خــۆ دەگرێ، هەمــوو ئەوانە بە هــۆی بڕواهێنانەوەیە. وەک چۆن بەدبەختــی دنیاو دوارۆژ بەهــۆی نەبوونــی بــڕواو کەم‌و کورتــی لــە بڕواهێناندایە. ئنجا زیانــی نەبوونــی بڕواهێنان بە پێغەمبــەر ﷺ دەزانرێــت بــە هــۆی پێچەوانــەی ئەو شــتانەی کە لە ســەر بڕواهێنان باســکرا. وە بەڕاســتی مــرۆڤ تەنهــا زیــان بــە نەفــس‌و دەروونی خــۆی دەگەیەنــێ، خــوای گەورە دەوڵەمەنــدەو پێویســتی بە کــەس نیەو ســەرپێچی کردنی تاوانبــاران زیانی پــێ ناگەیەنێت، بۆیــە دەفەرمــوێ: ﴿فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ واتــە: هەمــوو دروســتکراوێک موڵکــی خوایــە، وە لــە ژێــر فەرمانــی ئەودایــە ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا﴾ (خــوا زانایە) بــە هەموو شــتێک ﴿حَكِيمًا﴾ (کاربەجێیــە) لــە دروســتکراوو فەرمانیدا.

بە ڕاستی خوا زۆر زانایە بەوەی کێ شایستەی هیدایەتە، وە کێ شایستەی نیە.

وە دانایە بەوەی کە هەر کەسێک ڕێنمایی بکات، یان گومڕای بکات.

يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ وَلَا تَقُولُواْ عَلَى
ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّۚ إِنَّمَا ٱلۡمَسِيحُ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ رَسُولُ ٱللَّهِ
وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلۡقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرۡيَمَ وَرُوحٞ مِّنۡهُۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ
وَرُسُلِهِۦۖ وَلَا تَقُولُواْ ثَلَٰثَةٌۚ ٱنتَهُواْ خَيۡرٗا لَّكُمۡۚ إِنَّمَا ٱللَّهُ
إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ سُبۡحَٰنَهُۥٓ أَن يَكُونَ لَهُۥ وَلَدٞۘ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلٗا ١٧١ لَّن يَسۡتَنكِفَ
ٱلۡمَسِيحُ أَن يَكُونَ عَبۡدٗا لِّلَّهِ وَلَا ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ٱلۡمُقَرَّبُونَۚ
وَمَن يَسۡتَنكِفۡ عَنۡ عِبَادَتِهِۦ وَيَسۡتَكۡبِرۡ فَسَيَحۡشُرُهُمۡ
إِلَيۡهِ جَمِيعٗا ١٧٢ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ
فَيُوَفِّيهِمۡ أُجُورَهُمۡ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضۡلِهِۦۖ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ
ٱسۡتَنكَفُواْ وَٱسۡتَكۡبَرُواْ فَيُعَذِّبُهُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا وَلَا
يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا ١٧٣ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ
قَدۡ جَآءَكُم بُرۡهَٰنٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ نُورٗا مُّبِينٗا
١٧٤ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَٱعۡتَصَمُواْ بِهِۦ فَسَيُدۡخِلُهُمۡ فِي
رَحۡمَةٖ مِّنۡهُ وَفَضۡلٖ وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَيۡهِ صِرَٰطٗا مُّسۡتَقِيمٗا ١٧٥

(١٧١): ﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ وَلَا تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّۚ إِنَّمَا ٱلۡمَسِيحُ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ رَسُولُ ٱللَّهِ وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلۡقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرۡيَمَ وَرُوحٞ مِّنۡهُۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۖ وَلَا تَقُولُواْ ثَلَٰثَةٌۚ ٱنتَهُواْ خَيۡرٗا لَّكُمۡۚ إِنَّمَا ٱللَّهُ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ سُبۡحَٰنَهُۥٓ أَن يَكُونَ لَهُۥ وَلَدٞۘ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلٗا ١٧١﴾:

خوا ﷻ قەدەغەی کردوە لە خاوەن کتێبە ئاسمانیەکان کە زێدەڕۆیی بەکەن لە ئایندا، ئەویش بریتیە لە سنوور دەرچوونو ئەندازەی پێویست کراو، وەک وتەی گاورەکان کە زێدەڕۆیان کرد بەرانبەر بە عیسا، وە بەرزیان کردەوە لە پلەو پایەی پێغەمبەرایەتیەوە بۆ پلەو پایەی پەروەردگارێتی کە ئەم پلەیە شایەنی هیچ کەس نیە جگە لە خوا نەبێت. وەک چۆن کەمتەرخەمی لە قەدەغەکراوەکاندا خراپە بە هەمان شێوە زێدەڕۆیش وەک ئەو وایە.

لەبەر ئەمە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّۚ﴾ وە ئەم ڕستەیە سێ شت لە خۆدەگرێ: دوو فەرمانی قەدەغەکراو کە بریتین لە درۆ کردن بە دەم خوای گەورەوە، وە قسەکردن بەبێ زانست لە ناوو سیفەتو کردارەکانی خوای گەورەدا، وە لە شەرعو پێغەمبەرانی. سێیەم: فەرمان پێکراوە، بریتیە لە قسەی هەق لە هەموو کارو بڕیارەکاندا، بێگومان ئەم یاسایە یاسایەکی گشتیە لە میانەی باسی عیسا ﵇دا هاتوە، بەڵگەیە لەسەر وتەی هەق، کە پێچەوانەی ڕێگای جولەکەو گاورەکانە، دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلۡمَسِيحُ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ رَسُولُ ٱللَّهِ﴾ واتە: بەرزترین لوتکەی مەسیح کە دەیگەیەنێتە پلەکانی کامڵ بوون لە ناو دروستکراوەکاندا بریتیە لە پلەی پێغەمبەرایەتی کە ئەوە بەرزترین پلەو گەورەترین پاداشتە ﴿وَكَلِمَتُهُۥٓ﴾ ئەو ﴿أَلۡقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرۡيَمَ﴾ واتە: وشەیەکە کە خوای گەورە قسەی پێکردوە بەو وشەیە بووە بە عیسا، تەنها وشەیەک

نەبــووە ئەمە دەچێتــە چوارچێــوەی پلەی بــەرزو بەرێزەوە.

وە بــە هەمــان شــێوە ڕســتەی ﴿ وَرُوحٌ مِّنْهُ ﴾ واتــە: لــەو ڕووحانەیــە کــە خوا دروســتی کــردوە، وە تــەواوی کــردوە بە ســیفەتە بــەرزو بڵنــدەکانو خووڕەوشــتە تــەواوەکان.

خــوای گــەورە ڕووحــی خــۆی کــە جبریلــە ﷺ ناردوویەتــی فــووی کردۆتــە داوێنــی مەریــەم (علیهــا الســلام)، دوو گیــان بوو بە ئیزنــی خوا، بە عیســا ﷺ کاتێک کە ڕاســتی عیســا ﷺ دەرکــەوت فەرمانــی کــرد بــە خــاوەن کتێبــەکان کە بــڕوای پــێ بهێنــن، وە قەدەغــەی لێکــردن کــە خــوا بکــەن بــە یەکێــک لــەو ســێ خوا کــە بریتیــن لــە: یەکەم عیســا، دووەم مەریــەم، ئەمــە قســەی گــاورەکان بوو خــوا ڕوویــان ڕەشو ناشــرین بکات، خــوای گــەورە فەرمانــی پێکــردن کــە واز بهێنــن، وە هەواڵیــدا کە ئــەوە بۆ ئەوان باشــترە، چونکــە بــە دڵنیایــی ئــەوە ڕێگــای ڕزگار بوونــە، وە جگە لــەو ڕێگایــە هەمــوو ڕێگاکانی تــر تیاچوونــە، پاشــان خۆی پــاک ڕاگرتــوە لە هــاوەڵ بۆ دانــانو منــداڵ دانە پــاڵ، وەک دەفەرمــوێ: ﴿ إِنَّمَا ٱللَّهُ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ﴾ واتــە: خــوا تەنهایــە لــە پەروەردگارێتیــدا، کــە نابــێ پەرســتش بکــرێ ئیلــلا بــۆ ئــەو نەبــێ ﴿ سُبۡحَٰنَهُۥٓ ﴾ واتــە: پاکــیو بێگەردی بــۆ خوا ﴿ أَن يَكُونَ لَهُۥ وَلَدٌ ﴾ (لــەوەی کــە ڕۆڵەی هەبێ)، چونکــە ﴿ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾ هەمــووان بەنــدەی خــوان، پێویســتیان بە ئــەو هەیە، بێگومــان نەشــیاوو مەحاڵە کــە هاوبەشــێکی هەبێ لــەوان، یــان منداڵێکــی هەبێ.

وە کاتــێ کــە خــوای گــەورە هەواڵیداوە پاشــای جیهانی ســەروو خــوارەوە، هەواڵیشــی داوە کــە بەرژەوەندیەکانــی دنیــاو دواڕۆژیــان بــە دەســتی ئــەوە، وە تەنهــا خــۆی دەیپارێزێو پاداشــتیان دەداتەوە.

(١٧٢-١٧٣): ﴿ لَّن يَسۡتَنكِفَ ٱلۡمَسِيحُ أَن يَكُونَ عَبۡدًا لِّلَّهِ وَلَا ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ٱلۡمُقَرَّبُونَۚ وَمَن يَسۡتَنكِفۡ عَنۡ عِبَادَتِهِۦ وَيَسۡتَكۡبِرۡ فَسَيَحۡشُرُهُمۡ إِلَيۡهِ جَمِيعًا ١٧٢ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَيُوَفِّيهِمۡ أُجُورَهُمۡ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضۡلِهِۦۖ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسۡتَنكَفُواْ وَٱسۡتَكۡبَرُواْ فَيُعَذِّبُهُمۡ عَذَابًا أَلِيمًا وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ١٧٣ ﴾:

کاتێــک کــە خــوا ﷻ باســی ڕۆچــوونو گومڕایــی گاورەکانی کــرد لە عیســا ﷺدا، وە بــاس لــەوە دەکات کــە عیســا ﷺ بەندەو پێغەمبــەری خوایە، لێرەدا باســی ئــەوەی کردوە کــە ئەو لاری نیە لەســەر بەندایەتیو پەرســتنی پەروەردگاری ﴿ وَلَا ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ٱلۡمُقَرَّبُونَ ﴾

خـوای گـەورە پاکی ڕاگرتون لـە لاری نەبون‌و لووت بـەرزی، وە بێگومـان نەرێنی کردنی شـتێک چەسـپاندنی پێچەوانەکەی دەگەیەنێ.
واتە: پێغەمبەر عیسـا ﷵ و فریشـتە نزیکەکانیش حەزیان لـە بەندایەتی پەروەردگاریانە، وە پێیـان خـۆش بوو، وە هەوڵیـان بۆدا بەوەی کە لـە توانای ئەواندا هەبێـت، بۆیە خوای گەورە شـەرەف‌و ڕێـزو سـەرکەوتنێکی گـەورەی پێبەخشـین، نـارازی نەبـوون کـە بەندایەتی بۆ پەروەردگاریـان بکەن، وە هەروەها لە دروسـتکراوێتیدا، بەڵکو وا خۆیان دەبینن کە هەژارن‌و پێویسـتیان بـە خوا هەیـە بە ئەوپـەڕی هەژاری، بـا وا گومـان نەبرێت کـە بەرزکردنەوەی عیسـا ﷵ یـان هاوشـێوەی ئەو لـە دروسـتکراوەکاندا، لە سـەروی ئـەو پلەوەیـە کە خوا پێـی بەخشـیوە، وە وای لێدەکات کە پێویسـتی بە بەندایەتـی نەبێ‌و سـیفەتی کەماڵ‌و تەواو وەربگـرێ، بەڵکـو ئەوە لـە خودی خۆیـدا ناتەواویـە، ئەوە جێگای سەرزەنشـت‌و سـزادانە، بۆیە دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَن يَسْتَنكِفْ عَنْ عِبَادَتِهِۦ وَيَسْتَكْبِرْ فَسَيَحْشُرُهُمْ إِلَيْهِ جَمِيعًا ﴾
واتـە: خـوا لـە داهاتوویەکـی نزیکـدا هەمـوو دروسـتکراوەکان کۆدەکاتـەوە ئەوانەی کە ڕازیـن‌و ئەوانـەی کـە لوت بـەرزن، وە بەنـدە بڕوادارەکانـی، بڕیار لـە نێوانیانـدا دەدات بە بڕیارێکـی دادگەرانەو پاداشـتی یـەکلا کەرەوە، پاشـان درێژەی بە بڕیارەکـەی داوە لەواندا دەفەرمـوێ: ﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾ واتـە: ئەوانە دوو شـتیان پێکەوە کۆکـردەوە بڕواهێنـان بـە خوای گەورە کـە فەرمانیـان پێکرابوو، وە کـردەوە چاکەکان لە پێویسـت‌و سـوننەتەکان، لە مافەکانی خـواو مافی بەندەکانـی ﴿ فَيُوَفِّيهِمْ أُجُورَهُمْ ﴾ واتە: ئـەو پاداشـتانەی کـە بۆی دیـاری کردوون لـە سـەر کردەوەکانیان، هەر کەسـەو بـە پێی بـڕواو کـردەوەی خـۆی ﴿ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضْلِهِۦ ﴾ لـەو پاداشـتەی کە بـە کردەوەکانی خۆیـان پێی ناگـەن، وە بە ختـورەش بە دڵیانـدا نەهاتوە.
وە دەچێتـە ئـەم چوارچێوەیـەوە کـە هەمـوو ئـەو شـتانە کـە لـە نـاو بەهەشـتدان لـە خـواردن‌و خواردنەوەکان‌و ژنهێنان‌و سروشـتی جوان‌و دڵخۆشـی‌و چێژەکانی دڵ‌و ڕووح‌و لەزەتەکانی جەسـتە. وە بەڵکو هەموو خێرێکی دنیاو دواڕۆژ دەچێتە ئەو چوارچێوەیەوە.
هەمـوو ئەوانـە لـە سـەر بڕواهێنان‌و کـردەوەی چـاک ڕێک دەخرێـن، ﴿ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسْتَنكَفُوا۟ ﴾ واتـە: لـە بەندایەتـی کردنـی خـوای گـەورەدا ﴿ فَيُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴾ ئەویـش خەشـم‌و قیـن‌و تووڕەیـی خوایـە، وە ئـەو ئاگـرە داگیرسـاوەیە کە دێ بەسـەر دڵانـداو هـوروژم دەباتە سـەریان.

﴿ وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴾ واتـه: هیـچ کـەس لە دروسـتکراوەکان نابینـن کـە پشـتیوانیان لـێ بـکات‌و ئـەوەی پێویسـتە بۆیـان بـەدی بهێنێت، وە کەسـێک نیـە سـەریان بخات، ئەو ترسـەیان لـێ دوور بخاتـەوە، بەڵکـو میهرەبانترینـی میهرەبانەکان وازیـان لێدەهێنێـت لە سـزادا بـن بۆ هەتـا هەتایە.

وە ئـەوەی خـوا بڕیـاری لەسـەردا هیـچ بەرگـری کەرێک نیـە بەرگـری لە بڕیـاری خوا بـکات، وە هیـچ کەسـێک ناتوانێـت فەرمانـی خـوا بگۆڕێت.

(١٧٤-١٧٥): ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُم بُرْهَـٰنٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ نُورًا مُّبِينًا ﴿١٧٤﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَٱعْتَصَمُوا۟ بِهِۦ فَسَيُدْخِلُهُمْ فِى رَحْمَةٍ مِّنْهُ وَفَضْلٍ وَيَهْدِيهِمْ إِلَيْهِ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿١٧٥﴾ ﴾

خـوا ﷻ منـەت دەکات بەسـەر هەمـوو خەڵکیدا بـەو قورئانەی کـە ناردوویەتـی بۆیان، وە هەتـا بیکاتـە بەڵگەیەکـی ڕوون‌و یەکلاکەرەوە بە سـەریانەوە، دەفەرمـوێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُم بُرْهَـٰنٌ مِّن رَّبِّكُمْ ﴾ ئەمـە هەمـوو بەڵگە عەقڵـی‌و نەقڵیەکان دەگرێتـەوە (وەک لە شـوێنی دی دەفەرمـوێ:) ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَـٰتِنَا فِى ٱلْـَٔافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ﴿٥٣﴾ ﴾ فصلت.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ مِّن رَّبِّكُمْ ﴾ ئاماژەیە لەسـەر ڕێزو گەورەیـی ئەو بەڵگە ئاشـکرایە، کە لـە لایەنـی پەروەردگارتانـەوە هاتـوە، ئـەو پەروەردگارەی کە پـەروەردەی ئاینـی‌و دنیایی کـردوون، یـەک لـەو پـەروەردە کردنانـەی کە شایسـتەی سـتایش‌و سـوپاس کردنیەتی، ئەوەیـە کـە بەڵگەی ڕوون‌و ئاشـکرای بـۆ نـاردوون، لەبەر ئـەوە ڕێنمایتان بکات بۆ سـەر ڕێگـای ڕاسـت‌و گەیشـتن بە بەهەشـتەکانی پـڕ لە نـازو نیعمەت.

﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ نُورًا مُّبِينًا ﴾ واتـە: ئەویـش بریتیـە لـەم قورئانە پیـرۆزە، ئـەو قورئانەی کـە زانسـتی پێشـین‌و دوایین لە خـۆ دەگرێـت، وە هەواڵە ڕاسـتگۆکان‌و فەرمـان کردن بە دادپـەروەری‌و چاکـەکاری لە خۆ دەگـرێ، وە قەدەغەکردنی هەموو سـتەم‌و خراپەکاریەک لـە خـۆ دەگـرێ، خەڵکـی لـە تاریکیـدان ئەگـەر دەسـت نەگـرن بـەم قورئانـەوە، وە لـە گومراییەکـی گـەورەدان، ئەگـەر پەلـە نەکـەن لە دەسـت گرتـن پێیـەوە، بـەڵام خەڵکی دابـەش کـردوە بـە پێـی بـڕوا بوون بـە قورئـان‌و سـوود وەرگرتـن لێـی، بـۆ دوو بەش:

﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ ﴾ واتـە: ئەوانـەی دانیـان بـە بوونـی خـوادا نـاوەو وەسـفی دەکـەن بـە تـەواوی، وە بـە پاکـی ڕادەگرن لـە هەمـوو کـەم‌و کورتیـەک‌و ناتەواویەک

﴿ وَٱعۡتَصَمُواْ بِهِۦ ﴾ واتە: پەنایان برد بۆ لای خواو تەنها پشتیان بە ئەو بەست، وە خۆیان بەری کرد لە هێزو بازووی خۆیان، وە پشتیان بە خوا بەست ﴿ فَسَيُدۡخِلُهُمۡ فِي رَحۡمَةٖ مِّنۡهُ وَفَضۡلٖ ﴾ واتە: دەیانخاتە ناو میهرەبانی تایبەتی خۆیەوە، سەرکەوتوویان دەکات لە چاکەخوازیداو پاداشتی زۆرو فرەیان دەداتەوە، وە لە بەڵاو خراپەکاری دوریان دەخاتەوە.

﴿ وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَيۡهِ صِرَٰطٗا مُّسۡتَقِيمٗا ﴾ واتە: سەرکەوتوویان دەکات بۆ فێربوونی زانستو کار پێکردنیو ناسینی ڕاستی. واتە: هەر کەسێک بڕوا بە خوا نەهێنێو پشتی پێ نەبەستێتو دەست بە قورئانەوە نەگرێت، خوای گەورە بێبەشی دەکات لە ڕەحمو میهرەبانی خۆی، وە فەزڵو چاکەی خۆی لێیان قەدەغە دەکات، وە نێوانی خۆیانو ئارەزووەکانیان چۆڵو جیادەکاتەوە، هەرگیز ڕێنمایی وەرناگرن، بەڵکو گومڕا دەبن بە گومڕا بوونێکی ڕوونو ئاشکرا، وە سزایان بۆ هەیە لەسەر وازهێنانیان لە بڕوا هێنانو نشوستیو هیوا بڕاوی، وە هیوا بڕاوو بێ ئومێدیان دەستگیرۆیی دەبێت. داوای لێبوردنو تەندورستی لە خوای گەورە دەکەین.




(١٧٦): ﴿يَسۡتَفۡتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفۡتِيكُمۡ فِي ٱلۡكَلَٰلَةِۚ إِنِ ٱمۡرُؤٌاْ هَلَكَ لَيۡسَ لَهُۥ وَلَدٞ وَلَهُۥٓ أُخۡتٞ فَلَهَا نِصۡفُ مَا تَرَكَۚ وَهُوَ يَرِثُهَآ إِن لَّمۡ يَكُن لَّهَا وَلَدٞۚ فَإِن كَانَتَا ٱثۡنَتَيۡنِ فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَۚ وَإِن كَانُوٓاْ إِخۡوَةٗ رِّجَالٗا وَنِسَآءٗ فَلِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۗ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ أَن تَضِلُّواْۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ ١٧٦﴾:

خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات كـە خەڵكی داوای فەتوایان لـە پێغەمبەری خـوا موحەممەد ﷺ كـردوە، بـە بەڵگـەی ئـەوەی دەفەرمـوێ: ﴿قُلِ ٱللَّهُ يُفۡتِيكُمۡ فِي ٱلۡكَلَٰلَةِ﴾ ئەویـش بریتیـە لـەوەی كەسـێک بمرێت، نـە منداڵـی هەبێـتو نـە منداڵی منـداڵ، وە نـە بـاوکـو باپیـر، بۆیـە دەفەرمـوێ: ﴿إِنِ ٱمۡرُؤٌاْ هَلَكَ لَيۡسَ لَهُۥ وَلَدٞ﴾ واتـە: نە نێـر، نە مێ، وە نـە منداڵـی پشـتو نـە منداڵی منـداڵ.

وە بـە هەمـان شـێوە باوکیشـی نەبێـت، بـە بەڵگـەی ئـەوەی بـراکان میـرات دەبـەن، وە خوشـكەكان بـە یـەک دەنگـی زانایـان لەگـەڵ باوكدا بـەش نابەن. ئەگـەر مـردو منداڵی نەبـوو، وە باوكیشـی نەبـوو ﴿وَلَهُۥٓ أُخۡتٞ﴾ واتـە: خوشـكێكی دایـکـو باوكـی، یـان باوكـی، یـان لـە دایكـی، ئـەوە لـە پێشـەوە حوكمەكـەی بـاس كرا.

﴿فَلَهَا نِصۡفُ مَا تَرَكَ﴾ واتـە: نیـوەی ماڵـی براكـەی دەبـات، لـە پـارەو خانوبـەرەو هاوشـێوەكانی، ئـەوەش دەكەوێتـە پـاش قـەرزو جێبەجـێ كردنـی وەسـیەتەوە، وەک لە پێشـەوە بـاس كرا.

﴿وَهُوَ﴾ واتـە: بـرای دایکـو باوكی، یـان باوكـی ﴿يَرِثُهَآ إِن لَّمۡ يَكُن لَّهَا وَلَدٞ﴾ واتە: بەشـی تایبەتی بـۆ دیاری نەكـراوە، چونكە عەصەبەیـە، میراتی خوشـكە مردوەكەی هەموو دەبـات، بـە مەرجێ خاوەن بەشـی لەگەڵـدا نەبێ، یـان عەصەبەیەكـی تر بەشـداری لەگەڵدا نـەكات، یان ئـەوەی ماوەتەوە لە بەشـەكان.

﴿ فَإِن كَانَتَا ﴾ واتـە: ئـەو دوو خوشـکە ﴿ ٱثۡنَتَيۡنِ ﴾ واتـە: دوو یـان زیاتـر ﴿ فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَۚ وَإِن كَانُوٓاْ إِخۡوَةٗ رِّجَالٗا وَنِسَآءٗ ﴾ واتـە: هەمـوو نێرینـەکان لـە بـرای جگـە دایکـی لەگـەڵ خوشـکەکاندا ﴿ فَلِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۗ ﴾ واتە: بۆ هـەر نێرینەیەک بە ئەنـدازەی بەشـی دوو مێینە هەیـە ﴿ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ أَن تَضِلُّواْۗ ﴾ واتـە: بڕیارەکانیتان بۆ روون دەکاتـەوە کـە پێویسـتتان پێیەتی، وەک چاکەیـەک لە لایەن خۆیـەوە، لەبەر ئەوەی ڕێنمایـی وەربگـرنو فێـری ئەحکامەکانـی ببـن، وە لەبەر ئـەوە ڕێگای ڕاسـت ون نەکەن، بە هـۆی نەفامـیو نەزانینتانەوە.

﴿ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ ﴾ (وە خـوا) زانایـە بـە نادیـارو سـەرجەم ئەوانـەی لە پێشـوودا ڕوویـداوەو لـە داهاتـوودا ڕوو دەدات، وە زانایـە بـە پێویسـتیەکانتان بۆیـە ئەوەتـان فێـر دەکات کـە سـوودو قازانجـی بەردەوامـی هەبێـت بۆتان، لـە هەمـوو کاتو شـوێنەکاندا.

تەفسیری سوورەتی (النساء) کۆتایی هات

سوپاسو ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانیان.

# ناوەڕۆک